# صلاحه دینی ئەیوبی

نوسینی

د/محمد علی الصلابی

وەرگێڕانی

جمیل قادر

سەرپەرشتی وەرگێڕان و پێداچونەوەی دەق

لۆن قادر

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الله الرحمن الرحيم

الإخوة في دار رهشنبيري كوردستان! السلام عليكم

ورحمة الله وبركاته؛ استجابة لطلبكم الكريم في رغبتكم

في ترجمة ما نشر من كتبي، فقد أذنت لكم.

ونرجو من الله تعالى أن يتقبل جهودكم وأن يوفقنا جميعاً

لخدمة الإسلام والمسلمين.

أخوكم في الله علي محمد الصلابي

ناسنامه ی کتێب


ناوی کتێب : **صەلاحەدینی ئەیوبی**

نوسینی : **د/ محمدعلی الصلابی**

وەرگێڕانی : **جمیل قادر**

سەرپەرشتی وەرگێڕان وپێداچونەوە دەق : **لهۆن قادر**

دیزاین : **ابراهیم معروف**

شوێنی چاپ :**دارالفکر – بیروت – لبنان**

چاپ : **یەکەم ........... ٢٠٠٨**

تیراژ : ٣٠٠٠

**ژمرەی سپاردنی ( ٢٣٢٧ )ی ساڵی ٢٠٠٨ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە**

# بەشی یەکەم: ئەو شاڵاوە خاچپەرستیانەی کە پێش دروستبونی دەوڵەتی ئەییوبی ڕویاندا

## باسی یەکەم: ڕەگ‌وڕیشە مێژویەکانی جەنگە خاچپەرستیەکان:

جێـی خۆیـەتی لەسـەرەتادا ئامـاژە بـەوە بـدەین کەجەنگـە خاچپەرسـتیەکان لـەنێوان موسڵمانەکان‌و گاورە ڕۆژئاواییەکان‌و خەڵکانی تردا لـەکۆتایی سـەدەی پێنجـەمی کۆچیدا دەستی پێ نەکردوە، هەروەك لەسەردەمی حەوتەمی کۆچیشدا کۆتایی پێ نـەهاتوە، بـەڵکو ئـەم شـاڵاوانە زنجیرەیەکەلەو ململانێی دورو درێـژەی، کەبەدەرکـەوتنی ئیـسلام[1] دەسـتی پێکـردو بەشـێوەیەکی بازنەیی‌و یـەك لـەدوای یـەك بـەردەوام بـوە لەسـەرەتای ئیـسلامەوە هـەتاوەکو دسـەردەمی نـوێ، ئەشـتوانین شـەش میحـوەرو قـوڵ دیـاری بکـەین کەئـەم ململانێیـە تیایـدا بـەردەوام بـوەو، لەهەرقۆڵێکەوە کەمێك هێوربوبێتەوە ئەوە لەشوێنێکی ترەوە گەرم بوە بەشێوەیەکی توندوتیـژترو گەرمتر توانا ئیسلامیەکانی لە روبەرێکی فراوانی زەویدا بەفیڕۆداوە[2] ئەو میحوەرو قوڵانـەش بـریتین لە:

### یەکەم: بیزەنتیەکان:

سەرتاکانی جموجوڵی بیزەنتـی دژ بەئیـسلام ئەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی سـەرەتایی ئیـسلام، ئەوەبوو هەر لەساڵی پێنجەمی کۆچیەوەو لەجەنگەکانی (دومة الجنـدل)و (ذات الـسلاسل)و (مؤتـةو تـةبوك)ەوە هـەتاوەکو هێرشـەکەی ئوسـامەی کـوڕی زەیـد (رضي الله عنه)، سـەربازگەی ڕۆمـی هەسـتی بەمەترسـی ئیـسلامی نـوێ کـرد کـە لەباشـورەوە دەهـات، بەتایبـەت دوای ئـەوەی ئـەو دەوڵەتـە تازەپێگەیشتوە توانی پەیوەندی زۆربەی هۆزە عەرەبیەکان بە سـەرانی پێشوویانەوە کەڕۆمـەکان بوون ببـچڕێت ئەگـەر چـی بیزەنتیـەکان لەسـەرەتاوە دەسـتپێشخەربون بـۆ جوڵانـەوە دژ بـەهێزە ئیسلامیەکان یان وەك کاردانەوەیەك ئەو کارەیان کردبێت، ئەوەهەمان دەرەنجامی هەیە کەئـەویش پـەی بردنـی ئـەم سـەربازگەیە بەقـەبارەو گـەورەیی ئـەم کۆسـپە نوێیـەو خـۆ ئامادەکردنـە بـۆ وەسـتاندن‌و پەکخستنی، ڕاسـتە ئـەو ئامادەکاریـە زۆرجـار وەك پێویـست نـەبوە، ڕەنگـە ئەمـەش بـەهۆی کـەمی‌و لاوازی ئـەو زانیاریانـەوە بـوو بێـت، کەفەرمانـدەی بیزەنتـی هەڵوێـستەکانی خـۆی لەسەربنیات دەنا، بەڵام دەرەنجام ئـەوە بـوە کەشـەڕلەم قوڵـەوە هەڵگیرسـاو پـاش کۆچـی دوایـی

[1] دروس وتأملات في الحروب الصليبية لأبي فارس ل٣٠.

[2] هجمات مضادة في التأريخ الاسلامسي د.عمادالدين ل٢٦.

پێغەمبەریش زیاتر کلّپەی زیاتر سەندو هێزەئیسلامیەکان چونە ئەو وڵاتانەوە کەڕۆمە بیزەنتیەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو،[1] دوای دەرکردنی بیزەنتیەکانیش لەسەرماڵو موڵکیان لەئاسیاو چەند ناوچەیەکی ئەفریقیا لەسەردەستی سەرکردایەتی راشدیندا کە لەقۆناغەکانی دواییدا چەندین هەوڵی گەمارۆدانو کاردانەوەی زۆرو دژە هێرشی لەلایەن ئەم سەربازگەیەوە لەوشکانیو دەریادا بەخۆوە بینی، بەڵام زۆربەی تێکشکا، ئەوەبوو دواتر بینزەنیتیەکان بۆ ماوەیەك دەستیان کورت بوبەوە لەچەند دەیەی دواییدا، بەهۆی ئەوڕاوەدونانە بەردەوامەی کە ئومەوییەکان ئەنجامیاندا،[2] سەرەتا لەموعاویەوە (ﷺ) دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەمەویو سەردەمی عبدالملك کوڕی مەروانو کوڕەکانی بەتایبەت وەلیدو سولەیمان. ئەمەش بەجوانی ڕونکراوەتەوە لەکتێبەکەمدا ( الدولة الأموية عوامل الازدهاروتدا عيات الأنهيار) هەروەها ئەو ڕاوەدونانە دوای ئەمەویەکانیش بەردەوام بوو لەشامو میسرو باکوری ئەفریقاداو بەتەواوی لەباکوری ئەفریقیاو ناوەڕاست وەدەرنران‌و، لەنیوە دورگەی ئەنادۆڵدا گەمارۆدران ئەمە جگە لەئەوروپا کەزێدی سەرەکیان بووە، بەم شێوەیە بەتێپەربونی کات مەترسی دژەهێرشەکانیان سنوردار بوو چونکە چڕبوبویەوە لەسنورو سەربازگەکانی ئەناچۆڵو جەزیرەی فوراتدا بێ ئەوەی بەرەو ناوەوە تێپەڕبکات، بەشێوەیەکی دەگمەن نەبێت، ئەمەش لەلایەکەوە بەهۆی وریایی سەرکردە ئیسلامیەکانەوەو، توندوتۆڵ کردنی سنورو لەلایەکی تریشەوە بەهۆی هەستانیان بە هێرشی بەردەوام دژبە دەوڵەتی بیزەنتیو پێشڕەوی زۆریان بەئاراستەی خودی قوستەنتینە، ئەمەش وای کرد کە ئیپراتۆری ڕۆمانی (زۆربەی کات) نەتوانێ جڵەوی کاربگرێتە دەستو ڕوبەری دژە هێرشەکانی زیاد بکات، تەنها لەسەرەتایی سەدەی چوارەمی کۆچیدا نەبێت.

لەوکاتەدا کە دەوڵەتی عەباسی لاواز بوو بوو، بەڵام دەرکەوتنی سلجوقیەکان گوڕوتینێکی باشی دا بەبزاوتی جیهادی ئیسلامیو، توانیان لەسەردەمی سوڵتانی سلجوقی ألب أرسلان دا سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر بڕبڕەی پشتی هێزە بیزەنتیەکاندا بەدەست بێنن لەجەنگی ملاژکرد لەساڵی ٤٦٣ ك دا، ئەم سەرکەوتنەش کۆتایی هێنا بەمەترسی دەوڵەتی بیزەنتیو دژە هێرشەکانیو، بارودۆخیش بەم شێوە بەردەوام بوو هەتاکو روخانی ئەم دەوڵەتە دوای چەند

---

[1] هەمان سەرچاوە

[2] هجمات مضادة ل ٥٦، ٣٧.

سەدەیەك لەسەردەستی عوسمانیەکان[1] ئەمەشم لەکتێبی الدولة العثمانية عوامل النهوض وأسباب السقوط داڕون کردۆتەوە.[2]

**دووەم: ئیسپانیەکان:**

گۆڕەپانی ئەندەلوسی هەر لەسەرەتاوە چەندین دژەهێرشی بەردەوامی بەخۆوە بینی کەلەباکورەوە دەهات، ئیسپانیەکانیش لەناوچە سەختەکاندا خۆیان قایم کردبوو، ئەم هێرشانەش ململانێیەکی سەختی لێکەوتەوە کەبەهۆیەوە سەرکردایەتی ئەمەوی توانی روبەڕوی دژە هێرشەکان ببێتەوە بۆ نزیکەی سێ سەدە ئەو هێرشانە سنوردار بکات لەچەند شوێنێکی بەر تەسکی نیوە دورگەی ئیبیریدا، پاشان تەوژمی بوژانەوەی ئیسلامی نوێ دوجار دەرکەوت، یەکەمیان لەسەردەستی دەوڵەتی "مورابطين"دا کەلەمەغریبەوە هاتبوون،[3] کەلە چەندین لاپەرەی پرسەروەریدا سەرکەوتنی مەزنی خۆیانیان لەجەنگی "الزلاقە" دا بەسەر گاورەکانی ئیسپانیادا لەساڵی ٤٧٩ك دا بۆ تۆمارکردین، دووەمیشیان لەسەر دەستی "الموحدين" کەپاش ئەوان هاتن‌و سەرکەوتنێکی مەزنیان تۆمار کرد بەسەر گاورەکاندا لەجەنگی ئەلئەرەك دا لەساڵی ٥٩١ك دا، کەلەسەر ڕوپەری ڕۆژگار بەناوی ئالتون تۆمارکرا،[4] بەمەش ئیسلام لەئەندەلوس داتوانی بۆ نزیکەی چوار سەدە لەبەرامبەر کۆسپەکاندا خۆراگربێت‌و ڕوبەڕوی دژە هێرشی ئیسپانیەکان ببێتەوە بەچەکێکی نیمچە یەکسان،[5] بەڵام موسڵمانەکان لەئەندەلوس دا وردەوردە دەستیان دایە خۆشگوزەرانی‌و دوبەرەکی‌و ناکۆکی خویناوی نێوانیان هێندەی ترلاوازی کردن، ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کەترازووی هێز لەبەرژەوەندی سەرکردایەتی گاورەکاندا بێت کەلەکۆتایی دا توانی دوایەمین قەوارەی ئیسلامی لەوێ بروخێنێت. کەمەملەکەتی غەرناطە بوو لەساڵی ٨٩٧ك دا، هەتاوەکو بێ وەستان (لەژێر دەسەڵاتی فردیناندو ئیزابیلا) درندانەترین قەسابخانەی ترسناك لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ئەنجام بدەن کە دەسەڵات‌و کڵێساو دادگاکانی لێکۆڵینەوە تیایدا بەشداربوون‌و توانیان بەهۆی ئەو شێوازانەیان کەهەموو بەها مرۆییەکانی تێپەڕاندبوو وێڕای تێپەڕاندنی بەها ئاینیەکان،

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٣٧

[2] الدولة العثمانية عوامل النهوض وأسباب السقوط١٢٥ – ١٤٠

[3] هجمات مضادةفي التأريخ الإسلامي ل٣٨

[4] هەمان سەرچاوە ٣٨٤،٣٨٣.

[5] هجمات مفادة ل٢٨.

قەواری ئیسلامی بسڕنەوە لەسەر نەخشەی ئیسپانیا کۆمەڵگای ئیسلامی بەزۆر لەناو کۆمەڵگەی گاوردا بتوێننەوە لەڕووی ئاینو رۆشنبیریو هەڵسو کەوتەوە.[1]

**سێیەم: بزوتنەوەی خاچپەرستی:**

بزوتنەوەی خاچپەرستی بریتیە لەکاردانەوەی ئاینی مەسیحی بەرامبەر بەئیسلام، رەگو ریشەشی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئیسلامو دەرچونی موسڵمانەکان لەدورگەی عەرەبو پێکدادانیان لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتی دا، ئەم بزوتنەوەیەش وەك زیندەوەرێك گەشەی کرد بەدرێژایی سەدەکانو هێشتا قۆناغێکی تێنەپەراندبوو قۆناغی دووەم بەدوایدا هات، ئەو ماوە زەمەنیەش کەکەوتبوە نێوان ساڵەکانی ٤٨٨ك – ٦٩٠ك / ١٠٩٥ز – ١٣٩١ز تەنها یەکێکە لەقۆناغەکانی، دەرکەوتنی ئەم قۆناغەش بەم شێوەمیە کەزاڵ بوو بوو بەسەر قۆناغەکانی تردا ئەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵی هۆکاری ئاڵۆزو بەیەکداچووکە لێکۆڵەر ئەتوانێ لەو هۆکارو پاڵنەرانەدا بیدۆزێتەوە کەبونە هۆی جڵەوشل کردن بۆ ئەو شاڵاوە خاچپەرستیەی کەلەم ماوەیەدا دەستی پێکرد،[2] مێژونوسانیش کۆکن لەسەر ئەوەی کەبزاوتی داگیرکاری خاچپەرستی کەلە رۆژئاوای ئەوروپادا سەری هەڵدا شێوازی هێرشی چەکداری وەرگرت بۆ سەرولاتانی موسڵمان لە شامو عێراقو ئەنادۆڵو میسرو تونس دا بۆ ریشەکێش کردنی ئیسلامو موسڵمانو لەناوبردنیانو گێڕانەوەی بەیتو لمقەدیس، رەگو ریشەی ئەم بزاوتەش هەڵقولاوی ئەو بارودۆخە ئاینیو کۆمەلایەتیو هزریو ئابوریو رامیاریە بوو کە لەسەردەمی یازدەدا لەئەوروپادا باوبوو و ئاینی کردە سوتەمەنیەك بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی،[3] کەواتە هێرشی خاچپەرستی شتێکی نوێ یان دیاردەیەکی نامۆیان کاتی نیە، بەڵکو جکارێکی بنەڕەتی یە،[4] بۆیە ئەڵێین: دیاریکردنی ماوەی بزوتنەوەی خاچپەرستی لەنێوان ساڵەکانی ٥٨٨ك بۆ ٦٩٠ك کارێکی هەڵەیەوەك دکتۆر سەعید عاشور ئەڵێت: بنەمایەکی راستو دروستی نیەو پشتی بەلێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی بزوتنەوەی خاچپەرستی نەبەستوە، بەڵکو چارەسەرێکی دوابڕاوەو تەنها بەشێکی ئەو بزوتنەوەیە ئەگرێتەوەو دەربڕی رەگو ریشەی نیە هەروەك دەربڕی پاشماوەو کلکەکانی نیە.[5] لەڕاستیدا خۆراگری موسڵمانان لەبەرامبەر ئەم شاڵاوەدا رەنگدانەوەیەکی مەزنی ئەو راستیەیە کە کاریگەری بیروباوەر

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] الحروب الصليبية في شمال افريقية وأثرها الحضارى ل١٠.

[3] تأريخ الحروب الصليبية، محمد سعيد عمران ل١٥.

[4] هجمات مضادة، ل٣٢.

[5] الحركة الصليبية، سعيد عاشور ٣٦٧.

بەردەوامە لەدڵو دەرونی موسڵمانانداهەندێ جار لەسەرئاستی لوتکەو زۆر جاریش لەسەر ئاستی خوارەوەدا، ئەم ماوەیە کۆمەڵێ تێکۆشەری پێگەیاند کەلەئاستێکی باڵای چالاکیو تواناداا بوون. ئەم تێکۆشەرانەش لەهەموو بەرەکاندا بڵاوبوبونەوە،و هەستان بەڕوبەڕوبونەوەی داگیرکەران لەهەموو کاتەکانداو بەدرێژایی دوو سەدە دەستبەرداری بەرگری کردن نەبوونو چۆکیان دانەداو چەکیان دانەنا، هەموو کاتێکیش ئامادەبوون بۆ سواربونی ئەسپەکانیانو دەرچون بەخێرایی بەرەو ئامانجەکان، جیهادیش تیۆرو هیواکان دیاری ناکەنو موجاهیدیش لەبۆشاییدا ناجولێتەوە، بەڵکو بەربەرەکانێ مێژوییە گەورەکان جیهاد دیاری دەکەنو تێکۆشەرانیش هەڵئەخەنو گیانی پاڵەوانێتیو قوربانیدانو شەهیدبوون لەموسڵماندا دروست دەکەن.[1]

**چوارەم: بزاوتی گەمارۆدانی خاچپەرستی:**

زۆری نەخایاند پاش لەناو بردنی دەسەڵاتی ئیسلامی لەئیسپانیادا ئەوروپا بەسەرکردایەتی ئیسپانیاو پورتوگالو پاش ئەوانیش بریتانیاو هۆڵەنداو فەرەنسا هەستا بەکردەی گەمارۆدانی بەناوبانگیان دژ بەجیهانی ئیسلام لەڕێی هێڵەکانی پشتەوە لەئەفریقاو ئاسیادا، ئەمەش هاوشێوەی ئەو بزوتنەوە ئیستعماریە کۆنەبوو کەدواتر جیهانی ئیسلامی دوچاری بوو و بەبەردەوامی هەتاوەکو ساڵانی دوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەوە بوو مەمالیکەکان لەشامو میسردا گەشتبونە قۆناغی ماندووبون، دۆزینەوەی ڕێگای دەریایی نوێش لەنزیک "رأس الرجاو الصالح – گورزێکی بەهێز بوو بۆ بازرگانیان – کەبەبڕبڕەی پشتی توانای داراییان دادەنرا – هەرچی عوسمانیەکانیشە ئەوە هەموو هەوڵەکانیان چڕ کردبویەوە بۆ داگیر کردنی ئەوروپا لەڕۆژهەڵاتەوە،ئەو پردەجوگرافیانەشیان نەبوو کەبەهۆیە بتوانن ئەو هەوڵی گەمارۆدانە لەسەرەتاکانیدا راگرن، بەڵام پاش چەند دەیەیەك کەوتنە جموجۆڵ بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەم هەوڵانە، لەگەڵ ئەمەشدا گەلو سەرکردە ئیسلامیەکانی ناوچەکە توانیان بەرگرییەکی توند بکەنو نمونەیەکی بەهێزبن بە ڕوبەڕوبونەوەی درێژخایەنیان بۆ ئەو دەستدرێژکاریەو زەرەرو زیانێکی گەورەوشیان بەدوژمن گەیاند بەدرێژایی پێگەو شوێنەکانی کەناردەریاکە داگیرکەران بەدوای کردنەوەی جێ پێیەکدا دەگەڕان تیایدا.[2] هەروەك عوسمانیەکانیش توانیان جیهانی ئیسلامی بپارێزن لە هێرشی پورتوگالیو ئیسپانی کەمەبەستی خنکاندنی بازرگانی ئیسلامی بوو، کاتێ ویستیشیان کەناری مەغریبی عەرەبی داگیربکەن عوسمانیەکان بەپەلە هەموو مەغریبیان کۆنترۆڵکرد جگە لەمەراکشو

---

[1] هجمات مضادة ل٣.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٧.

توانیان ڕوبەڕوی ئیسپانیەکان ببنەوە لەدەریای ناوەڕاستو دورگەو کەنارەکانیدا، بەم شێوەیەش هێزی دەریایی عوسمانی توانی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست بۆ ئیسلامو موسوڵمانان بپارێزێت، هەروەها عوسمانیەکان توانیان دەستبگرن بەسەر کەناری ڕۆژهەلاتی ئەفریقاو باکوری زەریای هیندی لەسەرەتایی سەدەی هەژدەداو ئەمەش ئەوروپیەکانی ترساند، ئەحمەدی کوڕی سەعیدیش توانی لەساڵی ۱۷٤٠ز ڕوبەڕویان بوەستێ لەعومان داو پورتوگالیەکان بێ هیوا بوون لەسەندنەوەی ئەم ناوچەیەلێی، عوسمانیش دوای ڕوخانی ئەندەلوس گەورەترین هێزی عەرەبی بوو، بوژانەوەشی لەساڵی ١٠٠٠ك وەهەتاوەکو ١٢٥٠ بەردەوام بوو، توانی دەست بگرێت بەسەر کەلێنەکانی دەریای سورو زەریای هیندیو کەنداوداو لەوێشەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ئەفریقیاو رأس الرجاو الصالح، بۆ چەند نەوەیەکیش خەڵکی عومان سەرکردەی ئەم سێ دەریامەزنەبوونو کەشتیگەلێکی گەورەشیان هەبوو کەهێرشی کردەسەر کەشتیگەلی حپورتوگگالیو لەهەموو کەلێنو سەربازگە هیندیو فارسیو ئەفریقیەکان دوری خستنەوە... بەلام ئینگلیزەکان خۆیان بۆ ڕانەگیرا بەرامبەر بەئەم دەوڵەتە دەریایەدا کەهەڕەشەی لەموڵکەکانیان دەکرد لەئاسیاو ئەفریقیاداو بەدرێژایی هەشتا ساڵ کاریان لەسەرلاواز کردنو لەناو بردنو بۆمبارانکردنی شارەکانی دەرکد[1].

**پێنجەم: ئیستعمار:**

پاشان دژە شەپۆلی ئەوروپی ڕوی کردە ناوچەکە لەسەردەستی هێزە ئیستیعماریەکان بەپاڵنەری شۆڕشی پیشەسازی کەپاڵپێوەنان بۆ گەڕان بەدوای بوارە زیندوەکانی کیشوەرە کۆنەکاندا لەپێناو ناساندنی کەلوپەلەکانیانو دەسخستنی ماددەی خامی پێویستو سود وەرگرتن لەوزە مرۆییە هەرزانەکان کەلە ئەفریقیادا کرابونە کۆیلە لەڕێگەی گواستنەوەیانەوە حبەشێوەی زۆرەملێ، ئەمەش بەبزوتنەوەی کۆچپێکردنی کۆیلەکان ناسراو بوو دائەنرێت بەیەکێك لە خاڵە ڕەشەکان لەمێژووی ململانێی نێوان ئەوروپاو ڕۆژهەلاتدا، لەئاکامیشیدا خەڵکانێکی زۆر لەڕۆڵەکانی گەلانی ئیسلامی لەئەفریقیاتیاچونو ئەم شەپۆلەش بەردەوام بوو بەسەرکردایەتی بەریتانیاو فەرەنسا هوڵەنداو بەلجیکاو ئیتاڵیاو ئەڵمانیا هەتاوەکو دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمو جیهانی ئیسلامیش نێچیری یەکەمی بوو، بەڵکو تاکە نێچیری بوو، بەچاوپۆشی کردن لەهەندێ ناوچە کەزۆرینەی خەڵکەکەی موسوڵمان نەبوون، ئامانجە ئابوریەکانیشی بەباکگراوندێکی خاچپەرستانەوە دەجولایەوەو لەچەندین شوێنیشدا ئەمەیان دەربڕیوە،و لەمێژوشیدا زیاتر لەبەڵگەیەکی پێشکەش کردوە، ئەوەبوو "گلادستون" سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بەراشکاوانە

[1] الاسلام وحركة التأريخ، أنور الجندي، ل٣٩٤ – ٣٩٣.

لەبـەردەم ئەنجومـەنی "العمـوم البریطـانی" دا لەکاتێکـدا کـەقورئانێکی بەدەسـتەوە بـوو وتـی: هەتاوەکو ئەمەلە دڵو هـزری موسـڵمانەکاندابێت هـەرگیز بەسـەریاندا زاڵنـابین،[1] کاتـێ سـەرکردەی خاچپەرستی بەریتانیش بەلوتبەرزییەوە هاتـە قودسـەوە دوای جـەنگی جیهـانی ، هاوپەیمانـەکانی بەریتانیاش پێشوازیان لێدەکرد بـەو پـەڕی ڕێـزو خۆشـحاڵیەوە بـەڵام ئـەو نـەیتوانی بـوغزی خـۆی لەئیـسلامو موسـوڵمانان بـشارێتەوەو خۆشـحاڵیو دڵخۆشـی خـۆی نیـشان دا وەك سـەرکردەیەکی خاچپەرستی سەرکەوتوو کەقودسو فەلەستینی داگیر کردوەو خستویەتیی ژێر چەپۆکی دەسەڵاتی خاچپەرستی بەریتاتیو ەتی: ئێستا جەنگەکانی خاچپەرستی کۆتـایی پێهـات،[2] مەبەستیشی لـەم دەستەواژەیە ئەوە بوو کەئامانجی جەنگـەکانی خاچپەرسـتی لـەداگیرکردنی قـودسو فەلەسـتین دا بەدی هـاتو دەسـەڵاتی خاچپەرستی بەسەرداسەپێنرا، ئەمـەش ئاماژەیـە بەشکستخواردنی ئـەو جەنگە خاچپەرستیانەی کە دوو سەدەی خایاندو تیایدا قودسو فەلەستین داگیرکرا لەسـاڵی ٤٩٢ك داو دواتـریش موسـڵمانەکان لەسـاڵی ٥٨٣ك ڕزگاربـان کـرد دیـارە لەجـەنگی جیهـانی یەکەمیـشدا خاچپەرستەکان گەشتن بەئامانجی خۆیانو دەسـتیان گـرت بەسـەر فەلەسـتینو قودسـدا، هەرچـی سەرکردەی خاچپەرستی فەرەنسیشە ئەوە چوەسەر گۆڕی صلاح الدین لەدیمەشقو لای گۆڕەکـەی وتی: ئەوەتا هاتینەوە ئەی سەلاحەدین،[3] هەروەها جەنگی خاچپەرسـتی بـەبێ وەسـتان بـەردەوام بوو و بەریتانیاش نیشتمانێکی لەسەرزەوی فەلەستین بۆ جولەکەدیاری کردو دەوڵەتێکی جولەکەی تیا دا ڕاگەیاندو ڕێوشوێنی ئیداریو سەربازیشی لەپێناودا گرتەبە، بەپرچەك کردنی جولەکەو دابین کردنی چەكو تەقەمەنی بۆیانو ڕاهێنانو مەشق پێکردنیان، تەنانەت هەنـدێ لەچەکەکانی سوپای بەریتانیاشـیان پـێ بەخـشین، بەتایبـەت کاتـێ کەبـەریتانیا کۆتـایی بەدەسـەڵاتی خـۆی هێنـا لەفەلەستین دا لە ١٥\٥\١٩٤٨ز بەڵکو زۆربەی شارو گوندە فەلەستینیەکانی دابەدەست جولەکـەوە هەتاوەکو دەوڵەتی جولەکـە ڕابگەیـەنن، لەهـەمان کاتیـشدا فەلەسـتینیە موسـڵمانەکانی لەمەشقو دەستخستنی چـەکیش بێبـەش یـان قەدەغـە کـردو سـزای تونـدی بڕیـاردا بـۆ هـەر فەلەسـتینیەك کەچـەكو تەقەمـەنی دەسـتبخاتو سـزای لەسـێدارەدانی بۆدانـا بـوو، ئـەوەبوو هـەزاران کـەس لەموجاهیدە موسڵمانەکان کران بەپـەتی سـێدارەی خاچپەرسـتە ئینگلیزەکانـدا، دەیـان هـەزاریش لەگۆشەی زیندانەکان توندکران،[4] هەروەها بزوتنەوەی داگیرکـای (ئیـستعمار) هاوکـاتو پەیوەسـت

---

[1] هجمات مضادة في التأريخ الاسلامى ل٤٠

[2] دروس متأملات في الحروب الصليبية ل٣٥

[3] هەمان سەرچاوە ل٤٣٤

[4] هجمات مضادة في التأريخ ل٤١

بوو ببزوتنەوەی مژدەدانی گاورەوە، بەهەر دوو بەشی کاسولیکیو پورتستانتی یەوە کەبەدرێژایی وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاوبوبویەوەو زەمینەسازی ئەکرد بۆ ئیستیعمار لەرێی چالاکیە جۆراوجۆرەکانیەوە،و دەرگای بۆ ئاوەڵا دەکردو لەژێر دەسەڵاتیدا لەرێژەیەکی زۆر یارمەتیو ئیمتیازات بەهرەمەند بوو،[1] بەڵام ئەم دژە هێرشە خاچپەرستیە بەئاستی تێنەپەڕیو گەلانی موسڵمان لەبەرامبەر ئیدارەی شەڕخوازو خۆسەپاندنی داگیرکەراندا چۆکی دانەداو بەڵکوقوڵی مەردانەیان لێ هەڵکردو توانا لەبن نەهاتوەکانی باوەڕیان خستە گەڕو بەقوربانیدانو عەشقەوە بەرەو پیری مەرگو شەهیدی دەچون، سەرباری کەمی توانا سەربازیو داراییەکانیان، بەم پێیەش کاری سەرسوڕهێنەریان ئەنجامدا کەڕۆژ ئاواییەکانی سەرسام کردو بووە کۆسپێك کەبەردەوامی جموجوڵیانی پەك خستبوو و توانیان ببنە تەلی دڕکاویو مین لەبەرپێیاندا، تەناتەت وەڵامدامەوەی ئەو ململانێ ئیستعماریو خاچپەرستیە چەند بزوتنەوەکی ئیسلامی رەسەنی بەرهەم هێنا کەلەباروذۆخێکی جیهادی دژواردا دروست بوو و دواتریش بەرەنگاربوونەوەی داگیرکاری کردە ئامانج لەپێناو ئازادکردنی زەویو مرۆڤ و بیرو باوەڕو، چوندین نمونەی ڕوبەڕوبونەوەی پێشکەش کرد کەڕۆژ ئاواییەکان پێش رۆژهەڵاتیەکان باسیان کردو چەندین لاپەڕەی سپیان لە مێژوودا تۆمارکرد،[2] ئێمەش وەك نموونە باس لەمحمد عبدالكريم الخطابي لەمەغريبو عبدالقادر الجزائریو کۆمەڵەی زانایانی موسوڵمان لەجەزائیر کە عبدالحمیدی کوڕی بادیسو محمد ئەلبەشیر الابراهیمی رابەرایەتیان دەکردو عمر موختار لەلیبیاو بزوتنەوە ڕزگاریخوازیەکانی تر کەپێویستیان بەپێنوسی راسگۆ هەیە بۆ نوسینەوەو لێکۆڵینەوەیو ئومەتیش زۆر پێویستی بەم لێکۆڵینەوە جیددیانە هەیە، بێگومان جەنگی خاچپەرستی کۆتایی نەهاتوەو کۆتایی نایەت، ئەوەش لەئەفغانستانو فەلەستین دا روودەدات بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەیلێین.

[1] هجمات نضادة في التأريخ ل٤١

[2] الحروب الصليبية ل٢١ — ٢٤ ئارنست باكر.

## باسی دووەم: گرنگترین هۆکارو پاڵنەرەکانی شاڵاوەکانی خاچپەرستی

کۆمەڵگەی ئەورووپی رۆژئاوایی لەم ماوەیەدا پڕبوو لەکێشەو جەنگی ناوخۆیی لەنێوان ئەمیرە دەرەبەگەکاندا، ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ خراپبوونی باری ئابوری‌و کۆمەڵایەتی لەرۆژئاوادا – ئەورووپا–[1] هەروەها ئەو ململانێ‌و ناکۆکییەی کەلەنێوان سەرانی جیهانی خاچپەرستی رۆژئاوا دا هەبوو لەوکاتەدا، کەئەوانیش پاپاو ئیمپراتۆربون کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر رەوتی روداوەکان، ئەوە بوو دەسەڵاتی پاپا زۆر بەهێزو دەستڕۆ یشتوو بوو لەم قۆناغەدا، ئەمەش بواری پێدابو کەببێتە هێزێکی جیهانی بەو مانایەی پاپا بوو بوویە سەرکردەی رۆحی سەرجەم گاورەکان لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوادا پێکەوە،[2] لەتەنیشت ئەو ناکۆکیە بەردەوامەی کەلەنێوان کڵێسای ئوسۆرزۆکسی رۆژهەڵاتو کاسولیکی رۆژئاوادا هەبوو، هەریەکەیان سوربوو لەسەر باڵادەست بونی بۆچونی خۆی بەسەرئەوی ترداو لەبەرئەم هۆیەش کاتێ بیرۆکەی جەنگی پیرۆز خرایە بەردەم پاپا ئوربانی دووەم (٤٧١ – ٤٩١ك) (١٠٧٨ – ١٠٩٧ز) هەلێکی باشی تیادا بەدی کرد بۆ کۆتایی هێنان بەناکۆکی نێوان دوکڵێسا کەو، دەستگرتن بەسەر کڵێسای ئورسۆرزۆکسی رۆژهەڵات داو ئاوێتە کردنی لەگەڵ کڵێسای رۆژئاوادا لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا، بەجۆرێك کەهەموو ئەمانە لەژێر پەردەی روبەڕوبونەوەی موسڵمانان‌و پاراستنی بیزەنتیەکان‌و گێرانەوەی زویە پیرۆزەکان لەفەلەستین دەکرا،[3] ئەمە وێڕای چەندین ئامانجی تر کەناوەندی پاپا ئەیویست بەدەستی بێنێت لەدەستگرتنی بەبیرۆکەی جەنگی پیرۆزوە، لەو ئامانجانەش رزگاربونت لەدەسەڵاتی گەورە دەرەبەگەکان لەرۆژئاوادا و کۆتایی هێنان بەجەنگە بەردەوامەکان لەرێی ئاراستە کردنی ئەم توانایانەو سود لێ وەرگرتنیان لەجەنگی پیرۆزدا، ئەمەش دەرگاو دەروازەی ژیانێکی باشترو بێ ناکۆکیان لەبەردەم دا والا دەکات،[4] بیروڕاکانیش جیاوازن لەسەر راڤەکردنی سروشتی بزوتنەوەی خاچپەرستی‌و پاڵنەرەکانی، هەندێکیان بەهۆکاری ماددی دەزانن‌و هەندێکیش پێیان وایە کە زادەی دڵگەرمی‌و دەمارگیری ئاینیە کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئەورووپای گرتبویەوە، پاڵنەری راستەقینەی ئەو جەنگانەش بریتی بووە لە ئارەزووی ئاینی ئاوێتە کراوبە مەبەستی تر وەك حەزی دامەزراندنی دەوڵەتو دەسخستنی سامانی زۆرو فراوان، زۆرینەی مێژونوسە کۆن‌و نوێکانیش ئەم جەنگانە بەجەنگی ئاینی‌و هۆکاری ئاینیش بەهۆکاری سەرەکی دادەنێن بۆ گێرانەوەی کۆڕی مەسیح‌و زەویە

---

[1] الحروب الصليبية (٣٢/١ سعيد عاشور.

[2] دور الفقهاء والعلماء في الجهاد ضد الصليبين في آسيا نقلي ل٣٢.

[3] مملكة بيت المقدس الصليبية، عمر كمال توفيق ل ١٨–١٩، ٣٢–٣٣.

[4] العدوان الصليبي على العالم الاسلامي صلاح الدين نوار ل٢٢.

پیرۆزەکـنو دەرهێنانیـان لـەژێر دەسـتی مـسولمانەکان، خـەڵکانێکی تـریش هـەن کەبەیـەکێك لەڕواڵەتـەکانی فراوانخـوازی ئـابوریو ئیستعماری دادەنـێن لەسـەدەکانی ناوەڕاسـت دا، ڕاسـتی مەسەلەکەش ئەوەیە کە جەنگەکانی خاچپەرستی دەرەنجامی کارلێکی کۆی ئـەو هـەموە هۆکارانـە بـوو، چـونکە لـەپێناو هۆکـاری رامیـاریو ئـابوریو کۆمەڵایەتیـدا بـەرپاکراو ئـاینی بـەکارهێنا وەك سوتەمەنیو هۆکارێك بۆ شاردنەوەی مەبەستەکانی تری، ناشکرێت لەکاریگەری پاڵنەری ئاینی کەم بکەینەوە لەو جەنگانەدا بەهیچ جۆرو شێوەیەك، ئەمەش بەردێژی باسی پاڵنەرو هۆکارەکانە:

**یەکەم: پاڵنەری ئاینی:**

پاڵنـەری ئاینی یەکێکـە لـەو هۆکـارە سـەرەکیانەی کـەپاڵینا بەکۆمـەڵانی خاچپەرسـتەوە بـۆ ناوجەرگەی شەڕو دروشمی سەرەکی جەنگـەکانی خاچپەرسـتی بـوو، ئـەوەی کـە گرنگـی پاڵنـەری ئـاینیش ئەسـەلمێنێ ئەوەیـە کـە ئـەوان نیـشانەی خاچیـان دانـابوو لەسـەر چـەکو کـەلو پەلـە تایبەتیـەکانیانو رویـان کـردە خـودی فەلەسـتین[1]، لەوکاتەشـدا بزوتنـەوەی بوژاندنـەوەی ئـاینی لەرۆژئاوای ئـەوروپادا سـەری هەڵـدا بـوو لەسـەدەی دەیـەمی زاینیـداو لەسـەدەی یـازدەدا گەشـتە چڵەپۆپەو توانی پلەو پایەی ناوەندی پاپا بەرزبکاتەوەو، حەماسەتی ئاینی لای خەڵك بوروژێنێت، کڵێساش سودی لەم حەماسەتە وەرگرت بۆ هەناسەهەڵکێشانێکی دەرەکی، کـاتێکیش کەبیرۆکـەی جەنگی خاچپەرستی سەری هەڵـدا کڵێساکان رۆژئـاوای ئـەوروپایان کـردە گۆڕەپـانێکی فـراوان بـۆ قۆستنەوەی چالاکی خەفەکراوو حەماسەتی رەهایان،[2] ئەمەش لەژێر ناوی رزگار کردنی قـودس دا بوو لەجەنگی موسڵمانەکان،[3] بەناوبانگترین ئەوکەسـانەش کەبانگهێـشتیان دەکـرد بـۆ جەنگـەکانی خاچپەرستی پاپا ئۆربانی دووەم — کەبەبەرپرسی یەکەم دادەنرێت لەبرەودانو بانگهێشت کردن بۆ جەنگ دژی موسوڵمانانو هاندان بۆ ناردنی شاڵاوی یەکەم بـەرەو وڵاتـی شـامو دیـارە بـارودۆخیش زۆر لەباربوو، بۆیە خێرا کۆبونەوەیەکی سازدالە شاری (کلیمنت) لەفەرەنساو کۆنگرەکەش دەڕۆژی خایاندو زیاتر لەسێ سەد کەس لەپیاوانی کڵێسا ئامادەی بـون،[4] هـەروەك شـازادەکان لەسـەرجەم شوێنەکانی ئەوروپاوە ئامادەی بوون، جگە لەنێردراوی ئیمپراتـۆری بێزەنتـیو شـارەکانی ئیتالیـا، پاپـاش تـوانی گـوێگرانی دڵگـەرم بکـات لەوتارەکەیـداو لەهـەموو گۆشـەیەکی کۆبونەوەکـەوە دەستەواژەی — خوا ئاوای دەوێ — بەرز بویەوەو ئامادەبوان خێرا نیشانەی خاچیان بەرزکردەوە،[1]

---

[1] الحروب الصليبية والاسرة الزنكية، شاكر أحد أبوزيدل ١٧.

[2] الحركة الصليبية (٢٠/١) سعيد عاشور الجهادء التجديد في القرن السادس الهجرى محمد حامد الناصر ل٨٠.

[3] الجهادء التجديد، محمد حامد ل٨٠.

[4] أثر الشرق الاسلامي في الفكر الأوروبي خلال الحروب الصليبية، ل٨١.

بەرزکردەوە،[1] هەروەها پاپا ئاماژەی کرد بەوەدا کە بە — مەترسی ئیسلامی ئاراستە کراو بۆ ئەوروپا لەڕێی قوستەنتینەوە ناوزەدی کردو رایگەیاند کە گاورەکانی رۆژهەلات بەدەست ستەمی موسڵمانەکانەوە دەناڵێنن‌و کڵێساو دێرەکانیشیان دوچاری کاولکردن بوەو ئامادەبوانی هان دابۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسڵمانەکان.[2]

دیارە ئەوەی کەپاپا ئاماژەی پێدا گوایە گاورەکانی رۆژهەلات دوچاری ستەملێکردن بوون قسەیەکی ناڕەوایەو لەگەڵ رۆحی ئیسلام‌و سروشتی بانگەواز بۆکردنیدا ناگونجێ، هەروەك ناگونجێ لەگەڵ مامەڵەو چاودێری بەسۆزو باش‌و پڕ بەمیهری ئیسلامدا.[3]

یەکێ لەو دروشمانەش کەلەم جەنگەدا بەرز کرایەوە ئەوە بوو کەحاجیە گاورەکان توشی دەستدرێژی‌و وەدەرنان بوون لەکاتێکدا کەبەرو بیت المقدس چون پێش جەنگەکانی خاچپەرستی ئەمەش قسەیەکی ناڕەوایە،[4] یەکێك لەگەورە مێژونوسە ئەوروپیەکان ئەڵێت: ئەو حاڵەتی وەدەرنانە تاکەکسیانەی کەگاورەکان توشی بوون لەوڵاتە ئیسلامیەکانی رۆژهەلات نزیك دا بەتایبەتی، بەهیچ شێوەیەك رەوانیە بکرێتە هۆکاری راستەقینە بۆ بزوتنەوەی خاچپەرستی، چونکە گاورەکان بەشێوەیەکی گشتی بەهرەمەندبوون لەرێژەیەکی زۆری ئازادی ئاینی‌و نا ئاینی لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئیسلامیدا، نەك تەنها بواریشیان پێدراوە کەکڵێسا کۆنەکانیان بپارێزن بەڵکو رێگەشیان پێدراوە کڵێساو دێری نوێ بنیات بنێن‌و لەکتێبخانەکانیشیدا کتێبی ئاینی جۆراو جۆر دەربارەی لاهوت کۆبکەنەوە.[5] هەروەك روخاندنی کڵێساو دێرەکان یان دەستبەسەراگرتنی هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە بەڵکو شائیعەو پروپاگەندەی یانەکانی پروپاگەندەی ناڕەوایەو ئەیەوێ بەرەیەکی جەنگ بەڕوی موسڵمانەکاندا والابکات‌و پێدەچێت ئەمە هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو بوبێت لەگوندێکی دیاریکراودا، کەبەهیچ شێوەیەك نابێت بکرێتە ئەسڵ لەمامەڵەی موسڵمانان لەگەڵ گاورەکان‌و کڵێساکانیان لەوڵاتانی ئیسلامیدا،[6] زیاتر لەمێژونوسێکی بەویژدان دان بەوەدا دەنێت کەئەو گاورانەی کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکان خۆشحاڵتر بوون لەو برایانەیان کەلە ناوچەرگەی خودی دەوڵەتی بیزەنتی دا ژیاون، هیچ بەڵگەیەکیشیان دەست نەکەوتوە لەسەر

---

[1] الشرق الادنى: السيد الباز العريني ل١٣ — ١٤.

[2] قصة حضارة (١٦/٤).

[3] الجهاد والتجديد ل٨١.

[4] الغزء الصليبي والعالم الاسلامي د. على عبدالحليم محمود ل١٠٨.

[5] الحركة الصليبية سعيد عاشور (٣٠/١).

[6] الغزو الصليبي والعالم الاسلامي ل١٠٩.

چەوساندنەوەی گاورەکان لەلایەن سلجوقیەکانەوە لەرۆژهەلات دا،[1] بەلام هاوارەکانی پاپا گەرمو بوغزاوی بوونو ئەقلانیەتو بیرکردنەوەی لەدەرەنجامە خراپەکانی وتە هەلەشەکانیدا نەبوو، ئەگینا واتای ئەم قسەیەی چیە کە ئەلێ بەلایەنگرانی: بڕۆنو بەربەریەکان بێزار بکەنو ولاتی پیرۆز لەبێ باوەڕان پاك بکەنەوەو بیکەنە مولکی خۆتان، چونکە ئەو زەویە وەك تەورات ئەلێ: شیرو هەنگوینمان بۆ دەردەدات.[2] هەروەها پاپا بەلێنی دا بەو کۆمەلانەی کەبەشداری لەجەنگ دادەکەن، کەسزا لەسەرتاوانبارانیان هەلگرێتو لەباج بیانبەخشێو هەروەها بەلێنی دا کەکلێسا سەرپەرشتی خێزانەکانیان بکات لەو ماوەیەدا کەلەوێ نین،[3] هەر لەخانەی پالنەری ئاینیش دا ئەتوانین بلاوبونەوەی کەراماتو موعجیزە — سەراسیمە — لەرۆژئاوادا کەکلێسا بلاوی دەکردەوەو ئەو باوەڕە دروست بوو کە دابەزینی مەسیح بۆ جاری دووەم بۆ سەرزەوی نزیکەو پێویستە داوای لێخۆشبون و کاری خێری زۆر ئەنجام بدرێت پێش دابەزینی، هەروەك بۆچونێکیش بلاوبوبویەوە کەپێویستە زەوی بگێڕینەوە بۆ ژێر دەستمان پێش گەڕانەوەی مەسیح.[4] هەموو ئەمانە ئەکرێت لەخانەی پالنەری ئاینی دا پۆلێن بکرێن. هەروەها پاپا ئەیزانی کە دلگەرمی حەماسەتی ئاینی گاورەکان ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت، بۆیە داوای سوێند خواردنی کرد لەسەر ئەوەی کەنوێژ ببەنە کلێسای قیامە هەروەهاوای بلاودەکردەوەکە نەفرین (شمشێری تورەیی) بەر هەر کەسێك دەکەوێت کەترسنۆکیو لاوازی بەسەریدازال بێت یان پشت هەلکات، هەڕەشەشی کردبەوەی کە هەرکەسێك بەدەم بانگەوازی کلێساوە نەچێتو بەڕێ نەکەوێت بەرەو ولاتی ئیسلامی ئەوە لەکلێسابێ بەش دەکرێت،[5] ئەمەش بەهۆی زیرەکیو توانای جۆشدانی لەسۆزو هەستی خەلکی بۆ خزمەتکردنی پرۆژەکەی، لەراستیدا کلێسا بەهۆی ئەو هەژمونەی کەبەسەر دلەکانەوە هەیبوو و کاریگەری لەسەر رۆژئاوای ئەوروپا هەبوو لەبانگەوازکردنیدا بۆ ئەم شالاوە لەم سەردەمانەدا، دەرەنجامی ئەم بانگەوازەی کلێساش خەلکی دەستە دەستە کەوتنەڕێ لەچەندین شالاوی زەبەلاحی خاچپەرستی یەك لەدوای یەکدا بەرەو رۆژهەلاتی ئیسلامی کەوتنەڕێ.[6] نابێت رقی خاچپەرستیش بەرامبەر بەئیسلامو شوێنکەوتونی لەبیربکرێت، چونکە زەویەکی لەژێر دەست دەرهێنان کەلەژێر رکێفی

---

[1] الحركة الصليبية (١/٣٨، ٣٦) .

[2] التأريخ الاسلامي والحضارة الاسلامية د. أحمد شلبي (٥/٤٣٨).

[3] أثر الشرق الاسلامي في الفكر الأوروبي ل٢٦.

[4] الوسيطفي تأريخ فلسطين في العصر الاسلامي الوسيط ل١٥٢.

[5] هەمان سەرچاوە ل١٥٣.

[6] تأريخ الوطن العربي والغزو الصليبي ل٢٢.

خۆیاندا بوو چەندین کۆیلەی لێ ئازاد کردن کەلەژێر دەستیاندا ئەینالاندو سامانێکی لێ سەندنەوە کەبەدەستیانەوە بوو، هەر بۆیە دنیایەك ڕق لەسنگیاندا کەڵەکەبوبووو ئاگری دوژمنایەتی لەدڵیاندا کڵپەی سەند بوو و بەدوای هەلدا دەگەڕان بۆگێڕانەوەی ئەو شتانەی کەلەدەستیان دا بوو دەتاوەکو تۆڵەی خۆیان لەو کەسانەبکەنەوە کەتوشی شکستیان کردنو دەوڵەتیان هەڵوەشاندنەوە.[1] ئەوەتا ڕۆژهەلاتناسی بەناوبانگ الامیرلیون کاتیانی (١٨٦٩ز – ١٩٣٦ز) کەزۆربەی سامانی دانا لەپێناو نوسینەوەی مێژووی فتوحاتی ئیسلامیدا لەکتێبە بەناوبانگەکەیدا، حولیات الاسلام نهێنی رقیان بەرامبەر ئیسلامو موسڵمانان رون دەکاتەوەو لەپێشەکی کتێبەکەیدا ئەڵێ: ئەو تەنها ئەیەوێ لەڕێی ئەم کارەیەوە لەنهێنی ئەم نەگبەتیەئیسلامیە بگات (کاناستروفیکا ئیسلامیکا) کەملیۆنەها شوێنکەوتوی لەشوێنە جیاجیاکانی سەرزەویدا لەئاینی گاور کردووتا ئێستاش بڕوایان بەپەیامی محمد (ﷺ) هەیە، وەك پێغەمبەرو نێردراوێك.[2] خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَى وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا نَصِيرٍ﴾ (البقرة١٢٠)، واتە: هەرگیز جولەکەو گاورەکان لەتۆ (ئەی محمد) (ﷺ)، ئەی ئیمانداران رازی نابن، هەتابەتەواوی شوێن ئاینو بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ: بەراستی هەر بەرنامەی خوا (ئاینی ئیسلام) شاسیتەی ئەوەیەکە هەموو لایەکمان شوێن بکەوین هیدایەتی راستو دروست هەرلای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزوەکانی ئەوان بکەوین پاش ئەوەی زانیاریو زانستیت پێگەشتووە، ئەوە بزانە کە لەلایەن خوا هیچ سەرپەرشتیاریو یارمەتیەکت دەست ناکەوێت). تەفسیری ئاسان ل١٩.

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَلا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (البقرة:٢١٧)، واتە: بێ گومان بێ باوەڕان بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتاواتان لێ بکەن لەدینو نابێتان پاشگەزببنەوە ئەگەر بۆیان بکرێت جاهەر کەس لەئێوە پاشگەز ببێتەوە لەئاینەکەیو بەکافریشی بمرێت ئائەو جۆرە کەسانەکارەکانیان پوچەڵ دەبێت لەدونیاو قیامەت داو ئەوا نەجێنشینی ناوئاگری دۆزەخنو ژیانی هەمیشەیی تیادا دەنەسەر. (تەفسیری ئاسان ل٣٤).

---

[1] أسباب الضعف في الامة الاسلامية ل١٥٧.

[2] الغزو الصليبي والعالم الاسلامي ل١١٠.

## دووەم: پاڵنەری رامیاری (سیاسی):

ئەو پاشاو شازادانەی کەبەشداربوون لەبزوتنەوەی خاچپەرستیدا شوێن چەند مەرامێکی سیاسی کەوتبون کەنەیانتوانی بیشارنەوە، چ پێش گەشتنیان بۆ شامو فەلەستین یان پاش جێگیر بونیان تیایدا، ئاشکراشەکە ڕژێمی دەرەبەگایەتی هەمیشە بەستراوە بەزەویەوە، چەندەش دەرەبەگایەتی گەورە بێتو زەویەکەی فراوان بێت هێندەش پلەو پایەی شازادە لەناو کۆمەڵگەدا بەرز تر دەبێت، لەژێر سایەی ئەم سیستمەشدا گرفتی گەورە کەڕوبەری شازادە یان سوار دەبویەوە بریتی بوو لەنەبونی زەوی بۆی، ئەمەش لەبایەخو دەسەلاتی کەم دەکردەوە، ئەمەش بوە هۆی مانەوەی ژمارەیەکی زۆر لەسوارو شازادەکان بەبێ زەوی، چونکە بنەمای سەرەکی لەم سیستمەدا ئەوەیە کەتەنها کوڕی گەورە میرات دەبات لەدەرەبەگ، ئەگەرخاوەنی زەوی مرد هەموو موڵکو زەویەکەی دەبێتە موڵکی کوڕە گەورەکەی،[1] کەواتە کوڕەکانی تر بەبێ زەوی دەمێننەوە، ئەمەش بارێکی خراپی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیەو، وایکردوە لەو سوارو شازادانەی کەبێ بەش کراون لەزەوی هەستن بەفێڵ کردن بۆ زاڵبون بەسەر ئەم کۆسپەدا لەڕێی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کچێکی میراتبەری دەرەبەگدا، یاخود پەنابەرن بۆ دەستدرێژیو جەنگ بۆ دەسخستنی زەوی دەرکەوتنی بزوتنەوەی خاچپەرستیش دەروازەیەکی نوێ بوو بۆ ئەو سوارو شازادانە، بۆیە خێرا بەدەم بانگەوازی پاپاوە چونو بەشداربوون لەو بزوتنەوەدا بەڵکو سەرکەوتوبن لەدامەزراندنی دەوڵەت بۆخۆیان لەرۆژهەلاتدا، هەتاوەکو قەرەبووی رۆژئاوای پێ بکەنەوە، ئەو سوارو شازادنەش کەزەویو موڵکیان هەبوو دابەشداریکردنیان لە بزوتنەوەی خاچپەرستی دا بەهەلێك دەزانی بۆ دەسخستنی دەسکەوتو سەروەری زیاتر، ئەگەر لەسەرچاوەکانی جەنگەکانی خاچپەرستی بکۆڵینەوە ئەبینین کەخواستی شازادەکانی لەهەڵمەتی یەکەم دا لەچەند دروالەتێکی سیاسیدا خۆی دەبینییەوە، جئەوان هەرلەرێگادا هەڵدەستان بەدابەش کردنی دەسکەوتەکانو پێش ئەوەی دەستی بەسەردا بگرن، دواتریش بەپشتیوانی پەروەردگار ئەبینین کەچۆن دەرگاوانەکانیان خۆیان قایم کرد دلەئەنطالیەدا چونکە هەریەکەیان دەیویست بۆ ئەوبێت، هەروەك هەرکەسێکیان توانیبێتی لەرێگادا کاسپیەك بۆ خۆی دابین بکات وازی دەهێنا لە بەشداری کردن لەگەڵ خاچپەرستەکان لەرۆشتنیاندا بەرەو بەیتولمەقدیس، ئەمەش ئامانجی سەرەکی شالاوەکە بوو زۆر جاریش ناکۆکی دەکەوتە نێوانیان (دوای جێگیر بونیان) لەسەر فەرمانڕەوایەتی ئیمارەتێك یان دەستگرتن بەسەرشارێکدا، پاپاش بەبێ سود هەولی دەدا بەشداری بکات لەیەکلا کردنەوەی

---

[1] أوربافي العصور الوسطى (٤٨/٣) شعيد عبدالفتاح عاشور الوسيط في تأريخ فلسطين ل١٥٤.

کێشەکان لەنێوان شازادەکانداو ئاگاداری ئەکردنەوە کەموسوڵمانەکان لەبۆسەدان بۆیان‌و ئەرکی خاچپەرستیانەشیان ئەوە دەخوازێ کەتەبابن بۆ دورخستنەوەی مەترسی لەخۆیان، بەلام هەموو ئەو بانگەشانە بێ هودەبوون، چونکە ئامانجی شازادەکان تایبەتی‌و سیاسی بوو، زۆریش گوێیان بەرەزامەندی‌و نارەزایی پاپا نەدەدا، تەنانەت هەندێك لەشازادەکان خۆیان لانەدەدا لەتێکەڵاوی کردنی هەندێ هێزی ئیسلامی ددراوسێ دژی برا خاچپەرستەکانیان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاڵنەری ئیمانی لایان زۆرجار لەبەرامبەر بەرژەوەندیە سیاسیەکانیادا لاوازبوە،[1] سەبارت بەئیمپراتۆری بیزەنتی (ئەلکسیوس)یش، ئەوە هیچ نەیارییەکی نەبوو بەرامبەر بەئامانجەکانی سەرکردەکانی شاڵاوەکە، چونکە ئەگەر دەوڵەتی بیزەنتی بتوانێت ئەو موڵکانەی بگرێتەوە کەپێش هێرشی تورکەکان بۆ سەریان هەیانبوە، ئەوە ئەکرێت لەودەوروبەردا میرنشینی گاور هەبێت کەببێتە بەربەست‌و ماف سەروەری هەبێت، بۆمسۆگەر کردنی دەسخستنی ئەو کارەش ئیمپراتۆرسور بوو لەسەر ئەوەی کەسوێندی وەفاداری دەستبکەوێت، بەم جۆرەش بەرژەوەندیەکانی هەردوولا یەکی گرت لەبەرپاکردنی جەنگداو دەستدرێژی کردنە سەرخاکی ئیسلامی لەڕاستیشدا ئاسان نیە بتوانین هۆکارە مادیەکان لەهۆکارە مەعنەویەکان جیابکەینەوە کەپاڵیان بەگاورەکانەوە نا بۆ جەنگەکانی خاچپەرستی، هەژاری‌و ئارەزووی دەسکەوت‌و رۆحی سەرکێشی چەند هۆکارێکن کەبارودۆخێکی لەبار ئەرەخسێنن بۆ جەنگ، بەلام ئەم هۆکارانە دەرنە دەکەوتن ئەگەر بیرۆکەی جەنگی پیرۆزو رزگارکردنی زەوی حەماسەتی ئاینی خەڵکیان نەوروژاندایە، ئاشکراشە کەبیرۆکەی جەنگ هەڵقوڵاوی سیاسەتی پاپاو سیاسەتی دەوڵەتی بیزەنتی‌و جەنگی ئیسپانیاو موسڵمانان بوو، ئەوەش کە راگەیاندنی جەنگی دژبە رۆژهەلاتی ئیسلامی ئاسان کرد، ئەوە بوو کە ئیسپانی‌و فەرەنسیەکان لەسەری راهاتبون لەجەنگیاندا دژ بە موسڵمانەکان لەولاتی ئەندەلوس، ئەم جەنگەش سیفەتی جەنگی پیرۆزی وەرگرت، چ لەلایەن موسڵمانەکانەوە بێت، بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی — المرابطون — لەمەغریبی ئیسلامیدا جیهادی ئاینیان راگەیاند، یان لەلایەن گاورەکانەوە لەو حاڵەتە دەرونیەدا کەهاوکات بوو لەگەڵ ئاراستەکردنی جەنگەکانی خاچپەرستی بەرەو رۆژهەلات، تەنانەت مێژوونوسی گەورە "ابن الأثير" تێڕوانینێکی گشتگیری هەبووە بۆ مەترسی‌و هەرەشەی دەرەکی‌و دەستدرێژی بۆ سەر هەر لایەنێك لەلایەنەکانی جیهانی ئیسلامی— چ لەرۆژئاوادا بێت یان لەرۆژهەلاتدا— و بەجۆگەیەکی داناوە کەدەڕژێتە روبارە گەورەکەوە، کەئەویش هێرشی رێکخراوی بێگانەیە بۆ سەر گەورەترین هێزی شارستانی لەسەدەکانی ناوەراستدا

---

[1] الوسيط في تأريخ فلسطين ل١٥٥

کەئەویش دەوڵەتی ئیسلامییە[1]، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە مێژوونوسی ناوبراو راشکاوانە باس لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەم شاڵاوە بەش بەشانە دەکات ( ئەندەلوس، صقلیە، شام، فەلەستین) کەلەپەرتەوازەیی و تەماعە خودییەکان و لەدەستدانی گیانی دەستپێشخەریدا خۆی دەبینییەوە کەفەرمانڕەواو موسڵمانانی پێشین و بنیاتنەرانی دەوڵەتی ئیسلامی پێ ناسرابوو[2]، ئاشکراشبوو کەکڵێسای رۆژاوایی زۆر دڵگەرم بۆ فراوانکردنی روبەری دەرەبەگایەتی و دەستگرتن بەسەر کڵێساکانی رۆژهەڵاتدا، وێڕای ئارەزوییان بۆ جەنگ کردن دژی موسڵمانان، هەروەها یەکێك لەراستییەکانی دەمارگیری ئاینی و بوونی چەند گروپێکی ئاینی بوو کە راستەوخۆ پەیوەستبوون بەکڵێساوە و کاریگەری بەهێزیان لەسەر ئەو جەنگانە هەبوو، لەوانەش سوارەکانی ئیستاریە کە پابەندبوون بە بەرگری کردن لەموڵك و ماڵی خاچپەرستەکان لەرۆژهەڵاتداو، پاراستنی شوێنە پیرۆزەکان و راستەوخۆ پەیوەندیان بەپاپاوە هەبوو، کڵێساکانی بەیتولمەقدسیش دەیەکی داهاتی تەرخان کردبوو بۆ هاوکاری کردنیان لەپێناو گەپاندنی ئەو ئەرکە بەناو ئاینییە، هەروەها دەزگای سوارەکانی ئەلداویەش[3] هەبوو، ئەمەو پاپاو پیاوانی کڵێسا توانای فشارخستنەسەرو هەڕەشەیان هەبوو بۆ هەر کەسێ کەداخوازییەکانی کڵێسا جێبەجێنەکات ئەمەش بەدەرکردنی بڕیاری بێبەشکردن لەنازو نیعمەتی رۆژی دوایی و رەتکردنەوەی پەرستشی لەدونیادا[4] بەرای ئەوان.

### سێیەم: پاڵنەری کۆمەڵایەتی:

جیاوازییەکی چینایەتی زۆر لەکۆمەڵگەی ئەورووپیدا لەسەدەکانی ناوەراستدا هەبوو چینەکانی پیاوانی ئاینی و جەنگاوەران و دەرەبەگو سوارەکان تیایدا بالادەست.بوون[5]، چینی جوتیارانیش زۆرینەی بێ دەسەلات بوون تاکەکانی لەخزمەت پڕکردنەوەی پێداویستی دووچینەکەی تردا بوون،جوتیاری ئەوەروپیش زۆر دەستەوسان و بێ دەسەلات بوو، چەندین ئەرکیشی روبەروو ئەبویەوە بەرامبەر بە خەڵکانی خاوەن زەوی و دەرەبەگ، پاپاش ئاگای لەبارودۆخی جوتیارە زەحمەتکێشەکان بوو و بەڵێنی پێدان کە ئەرکەکانیان بەرامبەر بەگەورەکانیان لەسەر هەڵگرێت و بەخێروبێری دەوڵەتی ئیسلامی فریویدان، هەزاران جوتیاریی لەئاستێکی نزمی گوزەراندا ژیانیان بەسەر دەبردو نیشتەجێی کوخبوون کەلەق و پۆپی درەخت دروستیان کردبووو سەرەکەشی بەقور

---

[1] الكامل في التأريخ له الوسط في تأريخ فلسطين ل ١٥٦.

[2] الوسط في تأريخ فلسطين ل ١٥٦

[3] جهاد المسلمين في الحرب الصليبية، د. فايد حماد عاشور ل ٨٦

[4] تأريخ الوطن العربي والغزو الصليبي ل٣٤

[5] الجهاد والتجديد ل ٨٤

گیرابوو، بەبێ ئەوەی پەنجەرەی تێدابێتو هیچ کەلوپەلێکیشی لەخۆنەگرتبوو، چونکە هەموو ئەو شتانەی کەجوتیار هەیبوو موڵکی گورە دەرەبەگەکەی بوو، هەروەها بێ بەشیش بوو لەموڵکی تایبەتو[1]، باری شانیان بەکۆمەڵێ ئەرکی خزمەتگوزاری قورس کرابووو کەدەبوو پێشکەشی گەورەودەرەبەگەکانیانی بکەن لەسەرجەم بوارەکاندا، ئەمەو وێڕای بێبەشکردنیان لەبەروبوومەکانیان بەم شێوەیەش رادەی ئەو بەدبەختیو بێ بەشیە دەردەکەوێت کەزۆرینەی گەلی ئەوروپاتیایدا دەژیان لەسەدەی یازدەی زاینی دا، کاتێ کەبانگهێشت کرا بۆ هێرشی خاچپەرستی، ئەم زۆرینەش هەلی خۆی لەم شالاوانەدا بەدی کرد بۆ ڕزگار بون لەو ژیانە گرانو پرلە سەر شۆڕیو سوکایەتییە، هەروەها مەترسیەکانی بەشداری کردنیان لەم هێرشەدا بەبەراورد لەگەڵ ئەو ژیانەی کەهەیانبوو بەکەم دەهاتە پێش چاو، جا ئەگەر مردن لەم جەنگەدا ئەوە رزگاریان بووە ئەگەر رزگاریشیان بوو ئەوە ژیانێکی باشتریانە دەستگیردەبێ باشتر لەوەی کەهەیانبوو[2]، هەروەها کلێسا دەیزانی چۆن یاری بەئەقڵی ئەوانە بکاتو دڵیان پڕ بکات لەرقو کینە دژ بەئیسلام، بەوەش دەیخەڵەتاندن کەبەیتولموقەدەسو گۆڕی پیرۆز رزگاردەکەنو خوای گەورەو باباش دەسخۆشیان لێ دەکەن بۆیە هیچ شتێك لەسەربڕینو کوشتن نەیدەگێرانەوە، بەڵکو کوشتنی موسڵمان چاکەیەك بوو کەخاچپەرست لەرۆژیی دواییدا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت[3].

**چوارەم: پاڵنەری ئابووری:**

چاو برینە خێروبێری رۆژهەلاتی ئیسلامی، یەکێك بوو لەبەهێزترین پاڵنەرەکانی جەنگەکانی خاچپەرستی دوای پاڵنەری ئاینی، پاپا (ئۆربان) یش لەوتارەکەیدا باسی گرنگی هۆکاری ئابووری کرد بۆ واقیعی ئەوروپا لەو کاتەداو وتی: نەهێڵن هیچ شتێك دەستەوسانتان بکات، چونکە ئەو زەویەی کەئێستا تیایدا نیشتەجێنو دەریاو چیاکان دەوریان داوەتە سکە بۆ خەڵکە زۆرەکەیو خەریکە نەتوانی خۆراکیان بۆ دابین بکات، لەبەر ئەمەش هەندێکتان ئەوانی ترتان سەردەبڕنو یەکتری دەخۆن..... ئۆرشەلیم زەویەکی بێ هاوتایە لەبەرو بومیدا، بەڵکو فردەوسی خۆشیەکانە[4] سەرجەم بەڵگەنامەکان ئاماژە بەخراپی بارودۆخی ئابوری دەکەن لەرۆژئاوای ئەوروپادا لەکۆتایی سەدەی یازدەیەمدا، فەرەنساش بەتایبەت بەدەست برسێتیو قاتوقرییەکی زۆرەوە دەیناڵاند پێش هەڵمەتی خاچپەرستی یەکەم، بۆیە رێژەی بەشداری فەرەنسییەکان تیایدا زیاتر بوو، دیارە

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] تأريخ الوطن العربي والغزو الصليبي ل٣٤

[3] أثر الشرق الأسلامي د. عبداللة العربيعي ل١٣٨

[4] أثر الشرق الاسلامي د. عبدلله الربيعي، ل:٣٤.

قەیرانەکە زۆر سەخت بوو و خەڵکی ناچارکردبوو کە گژوگیا بخۆن، ئەم دەنگەش بووە فریادڕەس‌و دەروازەیەکی نویٚ بۆ ئەو خەڵکە برسی‌و بیٚ بەشە بۆ رزگاربوون لەو بارودۆخە دژوارەی کەتیایدا بوون، ئەمەش هۆکاری ئەو راوو رووت‌وتالانییە بوو کە رووبەڕووی ئەم گەلە گاورانە بویەوە کە بەخاکی فەرەنسادا تێپەڕین[1]، هەروەها بەشداری ژمارەیەکی زۆر لەبازرگانی شارە ئیتاڵی‌و فەرەنسی‌و ئیسپانیەکان بەمەبەستی قۆستنەوەی هەل بوو بۆ دەستگرتن بەسەر ڕێگا بازرگانییەکانی شتومەکەکانی رۆژهەلات کە بوو بویە سەرچاوەی دەوڵەمەی بۆ ئەو کەسانەی کەپێوەی خەریك بوون، بۆیە کەشتیگەلەکانیان رۆڵی کاریگەریان بینی لەدەستگرتن بەسەر ناوەندە سەرەکییەکانی شامدا، جەنەویەکانیش یارمەتی فەرەنجەکانیان بۆ دەستگرتن بەسەر ئەنطاکییەدا لەساڵی (٤٩٠ك – ١٠٩٧ز) هەروەها بوندوقیەکان پاش دوو ساڵ رۆڵی بەرچاویان هەبوو لەدەسگرتنی لاتینەکانە بەسەر بەیتولمەقدیسدا، مەبەستی یەکەم‌و کۆتایی ئەم رەوەندانەش (جالیات) بریتی بوو لەقازانج‌و سودی ماددی‌و هۆکاری ئاینیشیان هێندە بەلایەوە گرنگ بوو کەبەرژەوەندییەکانی بەدی دەهێنا، ئەوەندەش بەسە بیزانین کەدروشمی بوندوقیەکان کە لەوسەردەمەدا پێی ناسرابوون: بایەکەمجار بوندوقی بین ئینجا گاور[2]، لەبەر ئەمەش کۆمارەکانی ئیتالیا هەستان (جەنەوا– بیزا–بوندوقییە) بەمۆرکردنی پەیماننامە لەگەڵ سەرکردەکانی خاچپەرستی لەرۆژهەلاتدا کە بەپێی ئەوە چەندین ئیمتیازاتی ئابووری گرنگیان دەسکەوت.

**پێنجەم: گۆرانی ترازوی هێز لەدەریای ناوەراستدا:**

ئەمەش لەناوەراستی سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە (یازدەی زاینی) دا لەبەرژەوەندی رۆژئاوای ئەورووپی ناوەندی بزوتنەوەی خاچپەرستی دیارە لاوازی دەوڵەتی بیزەتنی‌و نالاندنی لەژێر گورزی بەهێزی سلجوقییەکاندا وایکرد کە بە پەلە لەهانابەرێت بۆ ئەورووپا هەروەها تێکچوونی بارودۆخی موسڵمانان لەبەشی رۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا بەتایبەت لەئەندەلوس‌و حقلیەدا لەبەرامبەر ریشەوە ئاسانبوونی هۆکارەکانی هێزو دەرکەوتن لای دوژمنان وای لەرۆژئاوای ئەورووپی کرد بەچەندین شێوە یارمەتی گاورەکانی ئیسپانیابدات لەملمانێیاندا بەرامبەر بەموسڵمانانی ئەندەلوس ئەمەش مرابطین و موسوڵمانانی صقلیەی ناچارکرد کە داوای کۆمەکی ئەفریقیە بکەن، هەموو ئەمانە یارمەتی دەربوون بۆ ئەوەی کەبزوتنەوەی خاچپەرستی بچێتە قۆناغێکی نوێوەو سیفەتی جیهانی بوونی وەرگرت[3]، ناوەندی پاپاش پشتگیری ئەم جەنگەی دەکرد بەرازیبوون‌و

---

[1] الحركة الصليبية د. سعيد عاشور (١/٣٠ – ٣٢)

[2] الحروب الصليبية المقدمات السياسية د. عليه الجتروي ل٢٩٤.

[3] الحروب الصليبية في شمال أطريقية ل١٣،١٢،١١.

ئاراستەکردن و پشتیوانیکردن و پڕو پاگەندەو کۆمەکی مەعنەوی، ئەم جەنگە خاچپەرستیانەش پێش ڕاگەیاندنی شالاوی خاچپەرستی پاپا ئۆربانی دووەم ڕووەو ڕۆژهەلات لەسالی ٤٨٨ك-١٠٩٥[1]، ئەفرقیاش بەمانا مێژوویەکەی بەیەکێك لەگۆرەپانەکانی ئەم جەنگە دادەنرێت، بەوپێیە بەرەی جەنگی ئەفریقیا گۆرەپانێك بوو کەهێزە دوژمنکارەکانی خاچپەرستی تیایدا چالاك بوون بۆ ماوەی چەند سەدەیەك، ئەمەش لەچەند هێرشێکدا خۆی بینییەوە کەیەك لەدوای یەك دەکرانە سەری و خاچپەرستەکان بەلام ئەوان ورەیان دانەبەزی و شکست ئیرادەی لاواز نەکردن، هەروەك چۆن ولاتی مەغریبی ئیسلامی یەکەم ولاتێك بوون لەناو ولاتە ئیسلامییەکاندا کەئاگری ئیستعماری ئەوروپی نوێ سوتان، هەروەها هاولاتیانی بەشی رۆژئاوای جیهانی ئیسلامی لەناویشیاندا ئەفریقا یەکەم شوێنێك بوون کەگوزەری یەکەمی خاچپەرستانیان بەرکەوت هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی جوگرافی و مێژوویی کەگرنگترینیان نزیکی زۆربەیانە لەئەوروپای رۆژئاواوە ناوەندی بزوتنەوەی خاچپەرستی و زانیاری فراوانی ئەوروپییەکان دەربارەی بارودۆخی موسلمانەکان لەم ناوچەیەدا لەرووی رامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتییەوە بەهۆی ئاسانی پەیوەندیکردن لەنێوان هەردوولادا، هەروەها ئەو رق و کینە زۆرەی کەئەوروپییەکان هەیانبوو بەرامبەر بەموسلمانە مەغریبییەکان[2] بەتایبەت کەئەوان ئەرك و قورسایی جیهادیان لەئەوروپادا لەخەلکانی تر زیاتر دەگرتە ئەستۆ، هەروەها ئەوروپییەکانیش زیاتر هەستیان بەمەترسیان دەکرد ئەگەر یەکێتی و سەرکردایەتی دلسۆزیان بۆ فەراهەم ببوایە، لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە ئەوروپا هەمیشە لەبۆسەدابوو بۆ لێدان و بەدوای هەلدا دەگەرا بۆ هەلکوتانە سەریان، دوای چاوەروانییەکی زۆریش ئەم هەلەیان بۆ رەخسا لەناوەراستی سەدەی پێنجی کۆچییەوە (یازدەی زاینی) ، کاتێك کەبەشی رۆژئاوای جیهانی ئیسلامی توشی پارچە پارچەبوون بوو، بەرەبەرە بەرەو روخان دەچوو، هەلبەتە بارودۆخی براکانیشیان لەرۆژهەلاتدا لەوان باشتر نەبوو، ئەم پارچە پارچەبوون و ناکۆکییەش هۆکاری سەرەکی ئەو بەلایەبوو کەبەسەر موسلماناندا هات لەرۆژهەلات و رۆژئاوادا بەهەمان شێوە، دیارە ئەمرۆش تەواو لەدوێنێ دەچێ و پارچە پارچە بوونی عەرەب و موسلمانان ئەو دەرگا فراوانەیە کە دوژمنەکانیان لێیەوە دێنە ژورەوە بۆ لێدانیان لەمالەکانیاندا، ئەوە بوو

---

[1] الحروب الصليبية في شمال أفريقيا ل١٢.

[2] وشەی "المغاربة" بەخەلکی ولاتانی رۆژئاوای جیهانی ئیسلامی دەوترا کەئەندەلوس و دورگە ئیسلامییەکانی رۆژئاوای دەریای ناوەراست لەگەل ولاتانی مەغریبی عەرەبیەوە، نەك ئەوەی لەئێستادا دەوترێت و تەنها خەلکی ولاتی مەغریب دەگرێتەوە.

هێزه خاچپەرستەکان بەتەوژمێکی بەهێزەوە کەوتنەڕێو لەیەک کاتدا لەسێ بەرەوە هێرشیان دەهێنا لەئەندەلوس‌و صقلیەو ئەفریقیاوە.[1]

١- **ئەندەلوس**: بەرەی ئەندەلوس لەناوەڕاستی ئەو سەدەیەوە چالاکیەکی هەست پێکراوی هەبوو کەئەویش هێرشێکی بەهێزو بەردەوام بوو لەلایەن گاورە ئیسپانیەکانەوە بەسەرۆکایەتی پاشای قشتاله لەبۆ سەر موسڵمانانی ئەندەلوس، ئەوە بوو شارو پێگە ئیسلامیەکان یەک لەدوای یەک دەکەوتە دەستیانەوەو توانیان لەچەند جەنگێکدا سەربکەون بەسەر موسڵمانەکانداو ئەم سەرکەوتنانەش بەگیرانی شاری طلیطلة کۆتایی هات لەساڵی ٤٧٨ك دا لەسەردەستی ئەلفۆنسۆی شەشەم پاشای قشتاله ئەو کارەساتەی کەسەرتاپای جیهانی ئیسلامی ترساندو لەبەرامبەر ئەم فشارە بەردەوامەشدا لەلایەن گاورەکانی ئیسپانیاوە موسڵمانەکانی ئەندەلوسیش پەنایان برد بۆ "مورابطین" لەمەغریب دا، ئەوانیش پەیتاپەیتا کۆمەکیان دەنارد، هەرکەئەمیرەکەشیان یوسفی کوڕی تاشفین سەرکەوت بەسەر پاشماوەی بەرگریکارەکان لەمەغریبدا، لەڕێی دەریای سورەوە بەرەو ئەندەلوس بەکۆمەڵێکی زۆرەوە بەرێکەوت لەساڵی ٤٧٩ك دا گەیشت بە ئەلفۆنسۆی شەشەم‌و "مرابگین"و هاوکارەکانیان توانیان سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست بێنن‌و لاپەڕەیەکی پرشنگدار لەمێژووی جیهادی ئیسلامیدا تۆماربکەن، بەم سەرکەوتنەش هێرشی گاورەکانی ئیسپانیا وەستێنرا هەتاوەکو سەرلەنوێ بارودۆخی بۆ رەخسا.

٢- **صقلیه**: سەبارەت بەبەرەی صقلیەش ئەوە دەرکەوتنی نۆرمان وەک هێزێکی نوێ لەسەرگۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتی بوە هۆیا گۆڕینی هاوکێشەکانی هێز لەرۆئاوای دەریای ناوەڕاستدا لەبەرژەوەندی هێزەگاورەکان، هەرکە ئەوانە جێ پێیەکیان دەسکەوت لەباشوری ئیتاڵیاو جیسکاردیش گەورەترین سەرکردەیان دانپێدانانی پاپا نیقۆلای دووەمی مسۆگەر کرد لەکۆنگرەی مەلەگا لەساڵی ١٠٥٩ز داو پرۆژەکەی خۆی راگەیاند بۆ کۆکردنەوەی هێز دژی موسڵمانەکانی صقلیه لەپێناو ڕازیکردنی پاپا کەئەویش لەم کارەدا بەدی هاتنی ئامانجە خاچپەرستیەکانی خۆی بەدی دەکردو لەلایەکی تریشەوە مەترسی نۆرمانی لەموڵکەکانی خۆی دورودەخستەوە، بۆیە ئەم پرۆژەی هانداو وەک بەڵگەیەک بۆ ڕازیبون‌و پشتگیر یکردنی پاپا پەرچەمێکی پیرۆزی ناردبۆ جیسکارد هەتاوەکو خۆی سوپاکەی بەهۆی پیرۆزیەوە سەرکەوتن بەسەر موسڵمانەکاندا بەدەست بێنن، سوریش بوو

---

[1] الحروب الصليبية في شمال افريقية ل١٣.

لەسەر ئەوەی کە ئەو فتوحاتە چاوەڕوانکراوە کەلەبەر مەسیح دەکرێت گرنگترە لەناردنی دیاری بۆڕۆما[1]، ئەوە بوو ئەم دورگەیەش – صقلیە – لەساڵی ٤٨٤ك دا دەستی بەسەرداگیرا لەسەردەمی زجاری یەکەمدا پاشان هێزەکانی لەساڵی داهاتوودا هەڵیان کوتایە سەرما مالتاو داگیریان کردو بەردەوام بەدوای ھەلیشدا دەگەڕا بۆ پەلاماردانی ئەفریقیا[2].

٣- **ئەفریقیە (تونس):** بەرەی ئەفریقیاش پشکی خۆی لەدەستدرێژی خاچپەرستەکان بەرکەوت لەوکاتەدا بەھۆی ھێزێکی تازە پێگەیشتووەوەکە ئەویش شارە دەریایەکانی ئیتاڵیا بوو، ئەوە بوو ئەم شارانە ئامادەنەبونی ھێزە دەریاییەکۆنەکانیان لەدەریای ناوەڕاستدا قۆستەوە کەخۆی لەکەشتیگەلی ئیسلامیو بیزەنتی دا دەبینیەوە، ئەم دوو ھێزە سەرقاڵی گرفتە ناوخۆییەکانیان بوونو کەشتیگەلەکانیان لەودەریایانەدا بوون کەنزیک بوو لەکەنارەکانی ئەوروپاوە، یەکەم لەترسی کەشتیگەلی موجاھد ئەلعامری خاوەنی دانیە کەتوانی چالاکیان بۆ ماوەیەك رابگرێت، ھەرکە ئەو مەترسیەیان وەلانا لەناوەڕاستەکانی سەدەی ناوبراودا دەستیان دایە گەڕان بەناو ئاوەکانی دەریای دسپی ناوەڕاستدا لەڕۆژئاواوە، ھەروەھا ئەم شارانە ھەرلەسەرەتاوە ھێزی دەرياییان خستە خزمەتی ئامانجەکانی خاچپەرستەکانەوە بۆ بەدەست ھێنانی دەسکەوتی تايبەت بەخۆیان، ئەوە بوو بەھۆی ھاندانی "پاپا لاونی ھەشتەمەوە" ھاوپەیمانێتی جەنەواو بیزە دەستیان جگرت بەسەر دورگەی سەردینیای ئیسلامیدا لەساڵی ٤٤٢ك/ ١٠٦٣ز و میناو خانوەکانیان تێکداو دەسکەوتێکی زۆریان ھەبوو، ھەروەھا ئەم کەشتیگەلانەش بەشداریان کرد لە جەنگەکانی بەرەی صقلیەو بەرەی ئەندەلوس دا، بەم پێیەش ھاوکاربون لەراوەدونانی موسڵمانە ئەندەلوسیەکاندا لەرێگەی دەرياوەو پشکی خۆشیان برد لەدەسکەوتو، گەمارۆیەکی دەرياییان خستە سەر ئەلمریەو ئەو شارەش فیدیەیەکی زۆری داکە بە ١١٣ ھەزار دیناری ئاڵتونی مەزەندە دەکرا، ھەروەھا ڤالەنسیایشیان ناچارکرد کەباجێکی ھاوشێوە بدات کەبە ٢٠ ھەزار دیناری ئاڵتونی مەزەندە دەکرا بۆ ئەوەی خۆی لەتاڵان کردن[3]، بپارێزێت ھەروەھا چەندجارێك ھێرشیان کردە سەر دورگەکانی رۆژھەڵات (دورگەکانی بلیار)، لەئاکامی ئەمەشدا ھێزی دەریایی ئیتاڵیا بوو بەباڵادەست لەئاوەکانی دەریای سپی ناوەڕاست دا ئەمەش بەرەو سەرکەشی زیاتری بردن، ئەوە بوو چالاکیان ئاراستەی ئەفریقیا کرد کەتائەو کاتە ھێزێکی

---

[1] الحروب الصليبية في شمال افريقية ل١٤.

[2] ھەمان سەرچاوە ل١٥.

[3] القوى البحرية والتجارية في البحر المتوسط أرشيبالد لويس ل٣٧٢.

دەریایی هەبوو کە دەستی یارمەتیشی درێژدەکرد بۆ براکانیان لەصقلیەو شوێنەکانی تر، پاشان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بزوتنەوەی خاچپەرستی لەئەفریقادا، هێزێکی دەریایی گەورەکەلە کەشتیگەلی جەنەواو بیزا پێك هاتبوو بەپاڵپشتی تیپێکی شاری ئەمالفیو هێزێکی سەربازی تر کەپاپا بۆی ناردبون هەستان بەهێرشکردنە سەر شاری ئەلمەهدیە لەساڵی ٤٨٠ك/ ١٠٨٧ز دا واتە پاش دەستگرتن بەسەر طلیطلة دا بەدووساڵو پێش داگیرکردنی تەواوی صقلیە، ئەوە بوو توانیان تەواوی شارەکە داگیربکەن جگە لەقەلاکەی، بەدەستیشیانەوە مایەوە هەتاوەکو خاوەنەکەی تەمیمی کوڕی معزفدیەیەکی ماڵی زۆری پێدانو لەگەڵ داگیرکەراندا ڕێککەوتننامەیەکی مۆرکرد کەلەیەکێك لەبڕگەکانیدا هاتبوو کەتەمیم بەڵێنی داوە ڕوبەڕوی کەشتیە ئیتاڵیەکان نەبێتەوە لە ئاوەکانی ئەفریقیاداو چەندین دەستکەوتی بازرگانی لەولاتەکەیدا پێدان، کەدواتر باسی دەکەین، لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کەئەو هێرشە خاچپەرستیەی کەکرایە سەر بەشی ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی (یازدەی میلادی) داو بەسەرپەرشتی دەزگای پاپا لەسێ بەرەوە توندبوو کەئەفریقیا یەکێکیان بوو، گومانیش لەوەدانیە کەئەم هێرشە یەکێك بوو لەڕواڵەتەکانی بزوتنەوەی خاچپەرستی، ئەمەش ئەوە دووبات دەکاتەوە کەجەنگەکانی خاچپەرستی لەئەفریقیاپێش هێرشی خاچپەرستی بۆ ڕۆژهەلات دەستی پێ کردو ئەوەی کە ابن الاثیریش لەڕوداوەکانی ساڵی ٤٩١ك دا باسی دەکات سەلمێنەری ئەمەیە، لەو دەقەشەوە کەهێناویەتی ئەوەیتێدەگەین کە ئەو روداوانە بەیەکەوە بەستراونو یەك بزوێنەر ئەیانجوڵێنێتو سەرەتایەکیش بوون بۆ جەنگە خاچپەرستیەکان لەقۆناغێك لەقۆناغەکانی بزوتنەوەی خاچپەرستی داو، ئەڵێ: سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی فەرەنج[1] و بەهێزبونو دەرچونیان بەرەو ولاتی ئیسلامو دەستگرتنیان بەسەرهەندێکیدا لەساڵی چوار سەدو حەفتاو هەشت دا، ئەوە بوو طلیطلةو شوێنانێکی تریان کەوتە دەست.... پاشان لەساڵی چوار سەدو هەشتاو چواردا ڕویان کردە دورگەی صقلیەو دەستیان بەسەردا گرت،....پاشان بەرەو ئەفریقیا بەڕێ کەوتنو شتێکیان لێ داگیر کردو لێیان سەندرایەوە دواتر دەستیان بەسەر چەند شوێنێکی تردا گرت لەساڵی چوار سەدونەوەدا بەرەو ولاتی شام بەرێکەوتن،[2] سەرەڕای هاتنی زۆرینەی هێزەکانی بزوتنەوەی خاچپەرستی بەرەو ڕۆژهەلات، بەلام ئەوەنە

---

[1] فەرەنج: چەند هۆزێکی جێرمانین کە لەفەرەنسادا نیشتەجێ بوون.

[2] الكامل في التأريخ لة الحروب الصليبية في شمال أفريقيا ل١٧.

بوە ڕێگر لەبەردەم مانەوەی بیرۆکەی داگیرکردنی ئەفریقیا لە ئەندێشەو یادەوەری خاوەن بیرە خاچپەرستیەکانداو حەزی نۆرمان بۆ دەست بەسەردا گرتنی هەروەك خۆی مایەوە، هەتاوەکو ئەوەیان بۆ بەدیهات لەسەردەمی دجاری دووەم دا کەتوانی دەست بگرێت بەسەر زۆربەی کەنارەکانیدا لەترابلوس لەلای رۆژهەلاتەوە هەتاوەکو شاری تونس لەرۆژئاواوە ئەمەش لەساڵی ٥٤٣ك/ ١١٤٨ز دا، بەم شێوە جەنگی خاچپەرستی هەڵگیرسا لەبەرەی ئەفریقیادا لەکاتێکدا کەلەرۆژهەلاتیشدا لەگەرمەیدا بوو، نورمانیەکانیش تیایدا مانەوە هەتاوەکو عبدالمؤمن ی کوڕی علی سەرکردەی دەوڵەتی (موحدین) هەستا بەدەرکردنیان لەمەهدیە دواهەمین پێگەیان لەساڵی ٥٥٥ك/ ١١٦٠ز،[1] کاتێ کەهاوکێشەکانی هێزیش بەجۆرێك لەجۆرەکان لەمەغریبی ئیسلامیدا گۆڕا ئەمەیارمەتیدەر بوو بۆ دەرکەوتنی بەرەی بەرگری ئیسلامی لەرۆژهەلات دا لەسەردەمی نورالدین محمود زەنکیو صلاح الدینی الأیوبي دا، وەك دواتر ڕونی دەکەینەوە بەپشتیوانی پەروەردگار.

## شەشەم: پەنابردنی ئیمپراتۆری بیزەنتی بۆ پاپا ئۆربانی دووەم:

پەنابردنی ئیمپراتۆر ئەلکسیوس کومنین (١٠٨١ – ١١١٨ز) بۆ پاپا ئۆربانی دووەم دژبە سەلجوقیەکان، ئەم پەنابردنە یەکەمین جار نەبوو بەڵکو پێش ئەمەش ئیمپراتۆر (میخائیلی حەوتەم) پەنای برد بۆ پاپا (گریگۆری حەوتەم) پاش جەنگی ملاز کرد لە٤٦٣ك کەپێشتر باسکرا، ئاشکرایە هێرش کردن بۆ سەرتورکەکان یەکێك بوو لەو مەبەستانەی کەبانگهێشتی بیزەنتیەکان لەخۆی دەگرت، چونکە ئەنازۆل گرنترە لەبەیتولمەقدیس بەلای دەوڵەتی بیزەنتیەوە،[2] هەر بۆیە کاتێ پایتەختی بیزەنتیەکان کەوتە بەر هەڕەشەو مەترسی سلجوقیەکان، پێویست بوو لەسەر ئیمپراتۆرکە پەنابەرێت بۆ رۆژئاوا لەبەرامبەر یەکگرتنی هەردوو کڵێسای رۆژئاواو رۆژهەلاتدا، پاپا گریگۆری حەوتەمیش وەلامێکی دلخۆشکەری بۆ ئیمپراتۆر میخائیلی حەوتەم ناردەوە لەلایەکەوە بەپاڵنەری هاوسۆزی گاورانەو لەلایەکی تریشەوە بەپاڵنەری سیاسی، چونکە ئەو سوپایەش کەکۆی دەکاتەوە ناکۆکی نێوان دوو کڵێساکە لەناودەباتو دەسەلاتی دەزگای پاپایی زیاتر دەکات لەرۆژهەلاتدا وەك چۆن لەرۆژئاوادا زیادی کرد، بەلام ئەو جەنگەی کەلەنێوان گریگۆری حەوتەمو ئیمپراتۆر هێنری چوارەمدا ڕوی دا بوەرێگر لەبەردەم پرۆژەکەیدا کاتێ ئیمپراتۆر ئەلکسیۆس کۆمنین) جێگای ئیمپراتۆر میخائیلی حەوتەمی گرتەوە: نامەیەکی نارد بۆ پاپا ئۆربانی دووەمو

---

[1] الحروب الصليبية في شمال أفريقيا ل١٨.

[2] الحروب الصليبية د.علية الجتروي ل٢٥٣.

گەورە پیاوانی دەرەبەگ لەساڵی ٤٧٨ك، و بانگهێشتی کردن بۆ ناردنی کۆمەکی بۆ ڕزگار کردنی براکانیان لەرۆژهەلات داو پاراستنی قسطنطینیة لەمەترسی سەلجوقیەکان، [1] ئەلکسیۆسیش ئارەزووی لەوە بوو کەرۆژئاوا هەندێ سەربازی نان پەیداکەری بۆ بنێرێ بەلام پاپا ئۆرپانی نەیویست خۆی بخاتە خزمەت دەوڵەتی بیزەنتیەوە. بەڵکو ئەیویست دەزگای پاپاسەرپەرشتی ناردنی یارمەتیەکان بۆ گاورەکانی رۆژهەلات بکات، ئەم گۆرانگاریەش لەبیرۆکەدا ئەبێتە هۆی ئەوەی کەجیهانی لاتینی گاور سوپایەکی گەورە پێکەوە بنێت نەك چەند سەربازێك بەنانەسکێ بخاتە ژێر ڕکێفی شازادەکان، لەم هەڵوێستەی پاپادا بەرامبەر بەئیمپراتۆر میخائیلی حەوتەم گرنگی داهێنانو بیر کردنەوەو سود وەرگرتن لەهەڵەکانو بەکارهێنانی هۆکارەکان بۆ خزمەتی پرۆژەکەیان بەدی دەکەین، هەروەها پێویستە سودلەو هەموو وانە زۆرانە وەرگرین بۆ خزمەتکردنی پرۆژەی ئیسلامی، ئەم جیاوازیەش لەبیرکردنەوەدا هەر لەسەرەتاوە هێندە سەر ئێشەی بۆ دروست کردن کە بووە هۆی تێکچونی پەیوەندیەکان لەنێوان بیزەنتیو خاچپەرستەکاندا، لەڕووی مێژوییشەوە سەلمێنراوە کەبەرپرسی یەکەمی دروستبوونی بزوتنەوەی خاچپەرستی ئۆربانی دووەم بوو، چونکە ئەو هۆشداری هەڵگیرسانی ئەو شەڕانەی داوە. [2]

دەزگای کلێساش لەڕۆژئاوادا پاڵپشتی ئەم بانگەشەی بوو، هەموو مێژوونوسە لاتینیە هاوچەرخەکانیشی رۆڵی سەرەکی لەبەدیهێنانی ئەم بیرۆکەدا بۆ ئەو دەگێرنەوە. [3]

**حەوتەم: کەسایەتی پاپا ئۆربانی دووەمو پرۆژە گشتگیرەکەی بۆ شاڵاوی خاچپەرستی:**

ئۆربانی دووەم لەساڵی ٤٢٧ك/ ١٠٣٥ز لەشاتیون سیرمارن لەدایك بوەو ناویشی ئۆدۆیە، لەسەردەستی قدیس برنۆ خوێندویەتی کەسیستمی کارسوسیینی دامەزراندو لەساڵی (٤٦١ك/ ١٠٦٨ز) بو بەراهیب لەدێرکلونی نزیك ماکۆن، پەیوەندی کرد بەخزمەتکردنی پاپای خۆسەپێنو باوەڕدار، بەهۆی باوەڕی بەهێزیەوە بەسەرکەوتنی دەزگای پاپاجبەسەر ئیمپراتۆردا کەمەبەستمان پێی گریگۆری حەوتەمە، پاشان وەك کاردینالو ئوسقوف لاوستی دامەزرێنرا لەساڵی (٤٧٣ك/ ١٠٨٠ز)دامەزرێنراو خزمەتی کلێسای کرد لەئەڵمانیادا لەقۆناغی ٤٧٧ك/ ١٠٨٤ز هەتاوەکو (٤٧٨ك/ ١٠٨٥ز)، بەشێوەیەکی شەرعیش پشتگیری لەپاپا گریگۆری حەوتەم دەکرد لەکاتی ململانێکەیدا لەگەڵ هنری چوارەمدا، هەروەها ئۆربانی دووەم پەیوەندی کرد بەسینۆدس (کۆڕی کلێسا) لەساکسۆنی کەلەساڵی ٤٧٨ك/ ١٠٨٥ز بەسترا، لەکاتی کۆچی دوای پاپا فیکتۆری سێیەمیشدا لە

---

[1] الحروب والروم اللاتين (١/١٥٠).

[2] الحروب الصليبية د.علية الجتروي ل٢٥٤.

[3] هەمان سەرچاوە ل٢٥٤ نالعرب والروم اللاتين (١/٥٦).

١٦ی دیسەمبەری ١٠٨٧دا لەمونت کاسینو توانرا لەرێگەی کایمنتی سێیەمەوە دەستبگیرێت بەسەر ڕۆماداو ئۆربانی دووەم هەڵبژێردرا دوای دواخستنێکی زۆر لەتراکینای خواروی رۆما لەنزیک جانتاو ناوی ئۆربانی دووەم لێ نرا ٤٨١ك – ٤٩٣ك/ ١٠٨٨ز – ١٠٩٩ن).[1]

لەڕوانگەی ژیانی پڕ چالاکی ئەم پیاوەوە تێبینی ئەوە دەکەین کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر سەرجەم شوێنەکانی کلێسای دایك دا سەپاندوە، رەنگە هەڵوێستیشی بەرامبەر ئیسپانیا رەهەندێکی گرنگ بێت بۆمان، چونکە ئەم پاپایە پشتگیری جەنگی دەکرد لەدژی موسڵمانەکان، کاتێ ئیسپانیەکان توانیان هەندێ ناوچەی دوژمنەکانیان بخەنەژێر ڕکێفی خۆیانەوە ئەم پاپایە خێراکردی بەناوچەی نفوزو دەسەڵاتی کلێسای رۆما، بێگومان پشتگیری کردنی ئۆربانی دووەم بۆ جەنگ کردن دژی موسڵمانان پەیڕەو کردنی هەنگاوو ڕێنماییەکانی ئەلکسەندەری دووەم بوو، ئەمەش راستیەکی میحوەریمان بۆ دەوپات دەکاتەوە کەئەویش بونی ستراتیژێکی باڵا بوو لەلایەن دەزگای پاپاوە لەڕۆمادا کەبەئاراستەی هەنگاودەنێ و بەوردی لەسەدەی یازدەمی زاینی دا/ پێنجەمی کۆچی بەشێوەیەکی تایبەت جێبەجێی دەکات بەچاوپۆشین لەگۆڕانی پاپاکان، گرنگترین روخسارەکانی ئەم ستراتیژیەش بریتیە لە فراوانکردنی دەسەڵاتی کلێسای ڕۆماو یەکخستنی کلێساکان و دژایەتی کردنی ئیسلام لەهەر کوێیەك بێت وەك دوژمنی سەرسەختی ئەوان کەڕوبەروبونەوەی شتێکی حەتمیە پێویستە بەهەر نرخێك بێت هەوڵی سەرکەوتن بەسەریدا بدرێت،[2] تێبینی ئەوەش دەکرێت کە پەناهێنانە بەردەوامەکانی بیزەنتیەکان و سەرقاڵبونی پاپای پێش ئۆربانی دووەم بەچەندکاروبارێکەوە هەلومەرجی بۆ ئەم پاپایە ڕەخساند، لەکۆڕبەندێکیشدا پیاچنرا لەئیتالیا لەمارسی ١٠٩٥ز، ٤٨٨ك بەئاراستەی وەڵامدانەوەی بانگەوازی ئیمپراتۆر ئەلکسیوسی یەکەم کۆمنینوس هەنگاوی هەڵگرت(٤٧٤ – ٥١٢) (١٠٨١ – ١١١٨ز) بەڵام لەم کۆڕبەندەدا پاپا شکستی هێنا بانگهێشتیدا بۆ بەرپاکردنێکی جەنگێکی خاچپەرستی دژی موسڵمانەکان لەڕۆژهەڵاتدا.[3]

١- **ئۆربانی دووەم کوڕبەندێك بۆ کلێسا سازدەکات لەباشوری فەرەنسا :** شکستی کۆڕبەندی پیاچنرا ئەم پاپاسەرسەختەی کۆڵ پێنەدا لەبەدیهێنانی ئامانجەکەیدا بەگرتنەبەری هەموو هۆکارەکان، ئەوە بوو گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئەسڵی خۆی فەرەنسا لەپێناو هاوکاری کردنییدا بۆ سەرکەوتنی پرۆژەی داهاتووی، ئەم حەهەڵبژاردنەش بەڵگەبوو لەسەر زیرەکی بەتایبەت

---

[1] الحروب الكصليبية العلاقات بين الشرق والغرب، د. محمد مؤنس ل٦٣.

[2] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب د.محمد مؤنس ل٦٥.

[3] هەمان سەرچاوە ل٦٥.

کەباشوری موحافیزکارو سادەی فەرەنسا وەك ناوچەیەکی پەیوەندیدار بەو جەنگەوە وابوو کەئیسپانیەکان کردیانە سەر موسڵمانەکان لەئیسپانیادا، لەگەڵ ئەوەشدا کەباسکردنی ئەو بیرۆکەیە لەسەرزەوی فەرەنسا لەوانەیە راستەوخۆ سەرکەوتن بەدەست بێنێت چونکە نیشتمانی سەرەکی پاپایەو، ئەو شارەزاترەدەربارەی، بەتایبەت کە – لەهەمان کاتدا – خاوەن مێژویەکی تایبەتە لەگەڵ ئیسلامدا لەرێی جەنگی بواتیە کەلای موسڵمانەکان بەجەنگی (بلاگ الشهداء) ناسراوە لەساڵی (١١٤ك/ ٧٣٢ز) کەتیایدا موسڵمانەکان تێکشکان‌و هەڵکشانی ئیسلامی وەستێنراو نەیتوانی چیاکانی ئەلبرانس) ببرێت، لەرێی شیکردنەوەی وتاری پاپاشەوە لەکۆرپەندی کلیرمنت دا پەی بەوە دەبەین کە هەموو ئەو لایەنانە لەبیری ئەو پیاوە زیرەك‌و ئیرادە بەهێزەدا نەچووە لەوکاتەوە کە لەباوەشی بزوتنەوەی کارسۆسیانی گۆشەگیری توندوتیژدا پەروەردەبووە، هەرچۆنێك بێت، ئەوە پاپا بەرەو کلیرمنت فرانی باشوری فەرەنسا رۆشت‌و کۆرپەندێکی کڵێسایی گرێداو لەرۆژی دەیەمدا ئەو تۆرپەندەی سازدا کەتیایدا چەندین کێشەی تاوتوێ کرد کەبۆ کڵێسا گرنگبوو: هەروەها پاپا وتارێکی زۆر مەترسیداری پێشکەش بەئامادەبوان کرد ئەمەش لەرۆژی ٢٧ی نۆڤەمبەری ١٠٩٥ز دا.[1]

٢- **ئەو وتارەی کە پاپا ئۆربانی دووەم پێشکەشی کرد:** ئەو وتارەی کەپاپا ئۆربانی دووەم لەکۆرپەندی ئاینی دا پێشکەشی کرد کە لەکلیرمونت بەسترا لە ٤٨٨ك/ ١٠٩٥ز کاریگەری زۆری هەبوو لەدەرونی ئەو گاورانەدا کەلەوکۆرپەندەدا کۆبوبونەوە، ئەمە بوە هۆی گەرم کردن‌و تاودانیان‌و توشبونیان بەحاڵەتێك کەمێژوونوس گۆستان لۆبون لەکتێبی (حضارە العرب)دا بە : تاوێکی شێتی توندناوی دەبات،[2] ئەوە بوو پاپا وتی: ئەیی گەلی فەرەنسا، ئەی گەلی خۆشەویست‌و هەڵبژێردراوی پەروەردگار، لەدەوروبەری فەلەستین‌و شاری قوستەنتینیەوە چەند هەواڵێکی ناخۆشمان پێگەشتوەو رایئەگەیەنێت کەرەگەزێکی نەفرەت لێکراو کەدورترین کەسن لەخواوەو یاخی دبوون‌و دەستدرێژیان کردۆتە سەر ئەو وڵاتە، وڵاتی گاورەکان لەرۆژهەلاتداو، خوانی قوربانیە پیرۆزەکانیمان هەڵگێراوەتەوەو کڵێساکانیان تالان کردوەو پاشان هەستاوە بەتێکدان‌و سوتاندنی‌و هەندێ دیلیشیان راپێچی وڵاتی خۆیان کردەوەو ئەوانی تریشیان کوشتن دوای ئەوەی کەبەخراپترین شێوە ئازاریان داون‌و شوێنە

---

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل٦٦.

[2] حضارة العرب لە دورالفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الادنى وەرگیراوە ل٢٣٧.

پیرۆزەکانیان پیس کردوەو رەگو ریشەی ئیمپراتۆری بیزەنتیان دەرهێناوە،و چەندین هەرێمیان لێ داگیر کردوەکە رێبوار بەدوو مانگ ناتوانێ پیایدا تێپەڕێت، جائەگەر ئەرکی تۆڵەسەندنەوە بۆ ئەم ستەمکاریانەو گێرانەوەی ئەو زەویانە نەکەوێتە سەرشانی ئێوە ئەی لەسەرشانی کێیە؟ ئێوە ئەی ئەو گەلەی کەخوای گەورە لەجەنگدا لەهەموو کەسێکی تر زیاتر بەهرەی چێ بەخشیونو شکۆمەندیو ئازایەتیو توانای ملکەچ کردنی دوژمنانی کردۆتە تایبەتمەندیتان، دەسابا کارو کردەوەی پێشینەکانتان دڵتان بەهێزتر بکات — سەروەریەکانی شارلمانو خەڵکانی تر لەپاشاکانتان— باگۆڕی پیرۆزی مەسیح هیمەتتان بجولێنێ کەخواو پارێزەرمانە— ئەو گۆڕەی کەئێستا بەدەست چەند نەتەوەیەکی ناپاکەوەیە، هەروەها شوێنەوارە پیرۆزەکانی تریش کەپیسو گڵاوکراوە، نەهێڵن هیچ شتێك ساردتان بکاتەوە لەماڵو موڵك یان کاروباری خێزانەکانتان، چونکە ئەم زەویەی کەئێستا لەسەر نیشتەجێنو لەهەموو لایەکەوە لەدەریاو چیاوە دەورە دراوە تەسکەو شوێنی دانیشتوانە زۆرەکەی لەسەرنابێتەوە، خەریکە نەتوانێ خەڵکانێك ببەخشێ کەخۆراکتان بۆدابین بکەن، لەپێناو ئەمەشدا هەندێکتان ئەوانی ترتان سەردەبڕنو دەجەنگێنو زۆرێکتان تیادەچن لەجەنگەناوخۆییەکاندا، دڵتان پاك بکەنەوە لەکینەو لەوەخۆش بن کەلەنێوانتاندایە لەناکۆکیو رێگای گۆڕی پیرۆزبگرنەبەرو ئەو زەویە لەو رەگەزەپیسە بسێننەوەو بیکەنەوە بەموڵکی خۆتان، ئورشەلیم زەویەکی کەم وێنەیە لەبەروبومداو فێردەوسی خۆشیەکانە، ئەو شارە مەزنەی کەدەکەوێتە ناوەڕاستی جیهانەوە هاناتان بۆ دێنێت، ئێوەش هەستن بەو گەشتە بەئارەزوو دڵگەرمیەوە ئەوسا لەگوناهەکانتان پاك دەبنەوە، متمانەشیان هەبێت کەلەمەلەکوتی ئاسماندا سەروەریەکی نەبڕاوەتان دەست دەکەوێت،[1] بەم شێوەیە ئەم وتارە گڕاویەی کەپاپا پێشکەشی کرد کاریگەری زۆری هەبوو لەدەرونی گاورە ئامادەبوەکاندا، دوای ئەوەی کەپاپا وتارە بەناوبانگەکەی پێشکەش کرد هەموو ئامادەبوان بەیەك دەنگ هاواریان کرد: خوا ئاوای دەوێت.[2] هێشتا پاپا ئوربانی دووەم لەوتارەکەی نەبوبویەوە، یەکێك لەئوسقوفەکانی ئەدهمیردی مونتیلین هەستایەوەو لەبەرپێی پاپادا کڕنوشی بردو داوای مۆڵەتی لێکرد هەتاوەکو لەو هەڵمەتە پیرۆزەدا قبوڵی بکات، لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستە کاریگەرەشدا هەستو سۆزی ئامادەبوان جوڵاو بەسەدان کەس ڕژانە بەردەم

---

[1] قصة الحضارة (١٥/١٥،١٦) وثائق الحروب الصليبية ل٩٩—١٠٠.

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الادنى ل٣٣٧.

پاپاو وەکو ئەدهمیر بەدڵگەرمیەکی بێ وێنەوە داوای بەشداریان دەکردو خاچیان هەڵگرتبووو سوێندیان دەخوارد کەئەو شارە پیرۆزە ڕگار بکەن، هەروەها ئەو مێژوونوسە هاوچەرخە کە–رۆبەرتی راهیبە– باس لەڕوداوەکە دەکاتو دەڵێ: ئای لەو خەڵکە زۆرەی کە ئامادەبوون، لەهەموو تەمەنەکانو سەرجەم ئاستەکان خاچیان لەمل کرد لەکۆڕبەندی کلیرمۆنت دا، سوێندیان خوارد لەسەر ڕزگار کردنی ئەو شارە پیرۆزە،و ژمارەشیان گەشتە ٣٠٠ هەزار[1] لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستە گەرمو گوڕەی دەهمیریشدا پاپا ئۆربانی دووەم کردی بەنوێنەری تایبەتو جێگری خۆی هەتاوەکو بۆ هەموو خەڵکی رون بکاتەوە کەشاڵاوەکە لەژێر چاودێری کڵێسادایە، بەڵکو لەژێر چاودێری راستەو خۆی خۆیدایە.[2]

٣- **ئەوەی لەوتاری پاپا ئۆربانی دووەمەوە وەردەگیرێت:** د. أحمد مؤنس عوض هەستاوە بەلێکۆڵینەوەیەکی هۆشیارانە بۆ جەنگەکانی خاچپەرستیو سودی لەسەرچاوەکانیان وەرگرتوەو هەستاوە بەشیکردنەوەی وتاری پاپا لەرێی چواردەقەوە کەچوار مێژونوسی هاوچەرخ هێناویانە، کەئەوانیش فوشیە ئەلشارتریو روبیری راهیبو جویرت ئەلنوجتیو یودریك ئەلدولی ن، بۆچونێکیش هەیە کەفوشیە ئەلشارتری لەنێوان ئامادەبوانی کۆڕبەندی کلیرمنت دابوە، بەشێوەیەکی گشتیش، ئەتوانین بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەو دەقانەدا کەهاتون لەکتێبی هەر چوار نوسەرەکەدا لەپێناو گەشتن بەڕاستیەك کەپاپا رایگەیاند لەوتارە بەناوبانگەکەیدا، لەکاتی بەراوردکردنی ئەو دەقانەشدا ئەتوانین بگەینە ئم دەرەنجامە:

أ- **پاپا وتارەکەی ئاراستەی رەگەزی فەرەنجەکان کرد:** لەپێناو جەخت کردنەوە لەسەر ڕەهەندی نەتەوەییو رەگەزیدا، رونی کردەوە کەخوا تایبەتمەندی کردون بەپێگەی وڵاتەکەیانو بیروباوەڕی کاسۆلیکیان، هەروەك کاری دەکرد بۆ وەبیر هێنانەوەی رەهەندی مێژوییان چ لەرێی سەروەریەکانی شارلمانو شارل مارتلو ئەو خزمەتە گەورانەی کەپێشکەشی مەسیحیەتیان کردووە، بەجۆرێك کەگرنگی پاڵنەری –یادەوەری مێژوویی– دەرخست لەپێکهێنانی ئەو دیاردە مێژووییە مەزنەدا.[3]

ب- **پاپا ئامازەی دا بە بونی هەواڵی ناخۆش و نیگەرانکەرکەلەرۆژهەڵاتەوە هاتوە:** کورتەکەی ئەوەیە کەرەگەزێکی نەفرەت لێکراو کەلەڕەچەڵەکێکی نەفرەت لێکراوەو بەتەواوی نامۆن

---

[1] هەمان سەرچاوە ٣٣٧ا.

[2] الحرب الصليبية ل٥١ حسن حبشي دور الفقهاء ل٣٣٨.

[3] الكتاب المقدس العهد الجديد، متى الأصحاح (٣٨/٣٧/، ١٠)

لەخواو نەوەیەکن کەبەراستی بەدڵو گیانیان ڕویان نەکردۆتە خوا،[1] (مەبەستی بەمانەش تورکە سلجوقیەکانە) گاورە ڕۆژهەڵاتیەکانیان سەربڕیوەو کڵێساکانیان کردوەبە تەویلە بۆ ئەسپەکانیانو خوێنی ئەو گاورانەش بانگهێشتی گاورەکانی ڕۆژئاوا دەکات بۆ ڕزگارکردنیان لەدوژمنە بێ باوەڕەکانیان.

ج- **پاپا کاری دەکرد بۆ تەماع خستنە جیەریان بەرامبەر بەسامانەکانی ڕۆژهەڵات:** ڕونی کردەوە کەزەوی لە ئەوروپای ڕۆژئاواداو بەتایبەت لەفەرەنسا تەسك بوەتەوە بۆ دانیشتوانیو دواوی کرد لە خەڵکی کەروو لە زەوی کەنعان بنێن کەپڕە لەشیرو هەنگوین، ئەمەش بەڵگەیەکی رونو گومان هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی کەپاڵنەری ئابوری کاریگەری هەبووە لەبزوتنەوەی خاچپەرستی دا، ئەمەش بەراشکاوانە لەیەکەم ساتەکانی سەرهەڵدانیەوە ئاماژەی پێداوە.

د- **پاپا بەڵێنی بەهەرکەسێ دا کەچەك هەڵبگرێو بەرەو ڕۆژهەڵات بەڕێ بکەوێت کەلەگوناهەو تاوانەکانی خۆش بێت:** بەمانایەکی تر لێخۆشبونی کڵێسای پێشکەش کردن خۆ ئەگەر کەسێك شەهید بوو لەپێناو گەشتن بەئامانجەکانیدا ئەوە بەشەهیدێك لەشەهیدە پاکەکانی مەسیحیەت دادەنرێت، هەموو ئەم بەڵێنە هەڵخەڵەتێنەرانەش گرنگن لەسەردەمێکدا کە لایەنی سۆزداری ئاینی هەڕەمەکی باڵادەست بوو لەجیهانی ئەوروپای گاوردا.

هـ- **پاپا ئاماژەی بەبەیتولەقدیس دا کەبەهەشتی سەرزەوی و دڵی جیهانە:** لەدایك بوونی گەروەمان مەسیحی بەخۆوە بینیوە، هەروەها باسی ئەوەی کرد بۆ ئامادەبوان کەقودس هاناتان بۆ دێنێت هەتاوەکو لەژێرچەپۆکی بێ باوەڕان ڕزگاری بکەن، ئەمەوێ لێرەشدا ئەوە بڵێم کەئەو شارە میحوەرێکی زۆر گرنگبوە: لەپێناو وروژاندنی هەستی ئاینی لای گوێگرانی پاپاو لەزۆربەی ئەو دەقانەی کەبەدەستمان گەشتوە، لەو ووتارە ئەبینین کەبەیتولمەقدەس شوێنێکی دیارو سەرەکی هەیە، ئەمەش بەتەواوی مەسەلەیەکی لۆژیکیە بەهۆی پێگەو پیرۆزی ئاینیەوە، ئەوشارەی لەرووی خەونی بەکۆمەڵو تایبەتی حەجی گاورەکان بوو جلەو سەردەمەدا.

و- **سوربوونی پاپا لەسەر پاڵپشتیکردنی وتارەکەی بەچەند دەقێك کەلەکتێبی پیرۆزدا هاتوە لە پێناو وروژاندنی هەستی ئاینی گوێ گرانیدا:** یان بۆ ئەوەی کە بەرگی پیرۆزی تایبەت بکات بەبەروتارەکەیدا بەهۆی کاریگەری دەستەواژەکانی ئەو کتێبە لەکۆی ئەقلی ئەوروپی لەو سەردەمەدا، نمونەی ئەمەش ئەو دەستە واژەیەیەکە لەئنجیلی مەتتادا هاتوە: هەر کەسێك

---

[1] الحرزب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل٦٨

کەباڵیکێشابوو بەسەر هەڵسوکەوتی کۆمەڵگە رۆژئاواییەکاندا هەستی دەمارگیری‌و کینە بەرامبەر بەشوێنێکەو توانی ئاینەکانی تر بڵاوبوویەوەو بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو ئەم رق هەستانە شوێنکەوتوانی مەزهەبەکانی تریشی گرتەوە جگە لەمەزهەبی کاسۆلیکی بەڵگەی بەهێزیش هەیە لەسەر ئەمە لەناواخنی ئەو داستانە خاچپەرستییەدا کەناسراوە بەسرودی ئەنتاکییە کەبەشێوەیەکی راست ئەو گیانی تۆڵەسەندنەوەیەمان پیشان دەدات کە لەکۆمەڵگەی ئەوروپادا باوبووە دژ بەئەوەی کەپێی دەڵێن "بتپەرستە سەرشۆڕەکان" هەروەها ئەم هۆنراوەیە نەتەوە نەیارەکانی گاور تەنها لەموسڵمانەکاندا کورت ناکاتەوە، بەڵکو ئەم وەسفە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کەدان بەبیروباوەڕی کڵێسای کاسۆلیکی دا نانێن، ئەمەش بیرکردنەوەی خەڵکی ئەوروپای سەدەی یازدەمان بۆ دەخاتەڕوو، ئەم بیرکردنەوەیەش یەکێکە لەڕوخسارەکانی (ملامح) ئەو ئایدۆلۆژیا گشتی یەی کە بزوتنەوەی خاچپەرستی بەرهەم هێنا، لەڕاستیدا سەرکەوتنی ئۆربانی دووەم لەوە دا بوو کە ئەو وتارەی کەتیایدا بانگەوازی کرد بۆ شاڵاوی خاچپەرستی وەك ناوەندێك وابوو بۆ هەموو ئەو بیرۆکانەی کەچوارچێوەی ئایدولۆژی بزوتنەوەی کۆمەڵگەی رۆژئاوایی پێك دەهێنا لەوکاتەدا، ئەمە سەرباری جیاوازی زمانەوانی‌و داب‌و نەریتەکان.

بەم شێوەیە وەڵامدانەوەی جەماوەر بۆ وتارەکەی پاپا لەکلێرمونت دا تەنها کاردانەوە یەك نەبوو لەبەرامبەر ڕەوانبێژی وشەکانی دا، بەڵکو ئەم وەڵامدانەوەیە دەربڕی خۆشحاڵی ئەوا نەبوو بەو پرۆژە یەکەوەتەری هیوایانی پێکا بوو، ئەم جەنگە پیرۆزەش پەردەیەکی سەرسوڕهێنەر بوو کە هەموان ئەیانتوانی لەپشتیەوە بجولێنەوە لەپێناو مسۆگەر کردنی بەدیهێنانی خەونە دونیاییەکان‌و ڕزگار بونیان لەڕۆژی دواییدا، ئەشتوانین دەیان دەستەواژە لەسەرچاوە مێژوییەکان‌و نوسراوە هاوچەرخەکاندا بێنین کەخاچپەرستەکان وەك سوارەی مەسیح و پیاوانی مەسیح وەسف دەکات‌و بە"گەلی پیرۆز" و "گەلی پەروەردگار" ناویان دەبات، ئەمانەش چەند دەستەواژە یەکن کەئاماژە بەوە دەدەن کەبیرۆکەی جەنگی خاچپەرستی هێندە لەدەرونیاندا چەسپی بوو کەبڕوای تەواویان بەوە هەبوو کەبەشداری کردنیان لەم هەڵمەتەدا وەڵامدانەوەی داخوازی هیچ مرۆڤێك نیە بەخودی پاپاشەوە بەڵکو وەڵامدانەوەی فەرمانی پەروەردگارە.[1]

٤- **کۆبونەوەی راوێژکاری پاپا دوای وتارەکەی:** پاپا ئۆربانی دووەم لەگەڵ پیاوانی ئاینی گاوردا کۆبوویەوەو راوێژی پێکردن لەبارەی کۆکردنەوەی وزە فەرمی‌و جەماوەریەکان بۆ هێرشکردنە

---

[1] الخلفية الأيدولوجية للحروب الصليبية، د.قاسم عبدالله ل٢٥،٢٤.

سەر موسڵمانان، ئەوە بوو لەگەڵ ئوسقوفەکانیدا کۆبویەوەو دوای ئەم کۆبونەوە راوێژکاریەش ئەم بڕیارانەیان دا:

- هەر توانبارێك کە لەم جەنگە پیرۆزەدا بەشدار بێت ئەوە سزای تاوانەکەی لەسەر هەڵدەگیرێت.
- هەر ماڵێك چ خانوو بێت یان کەلو پەل لەلایەن جەنگاوەرێکی بەرێ کەوتوو بەرەو زەوی پیرۆز لەژێر چاودێریو پارێزگاری کلێسادا لەماوەی ئامادە نەبونیدا، .... بەگەڕانەوەش بەتەواوی بۆی دەگێڕدرێتەوە کاتێ کەدەگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی.
- پێویستە لەسەر هەموو بەشداربویەك کەهێمای خاچ هەڵبگرێت.
- پێویستە لەسەر هەرکەسێك کەخاچ هەڵدەگرێت بەڵێنەکەی بباتە سەرو بەرەو بەیتولمەقدیس بەرێ بکەوێت، ئەگەر پەشمان بویەوە ئەوە لەکلێسا دەردەکرێت.
- هەر ولاتێك کەلەدەست بێ باوەرەکان "موسڵمانەکان" دەسەندرێتەوە پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆ کلێسا.
- پێویستە لەسەر هەموو تاکێك کەئامادەی بەبێ جێشتنی ولاتەکەی بێت لە"جەژنی العذراء" (مەریەم) دا سلاوی خوای لێ بێت.
- پێویستە هەموو سوپاکان لەقوستەنتینە بەیەك بگەن، ئەوە بوو پاپا هەستاو ئوسقونەکانی بەم بڕیارانەوە ڕەوانە کرد تاوەکو پاشاکانی جیهانی گاورو شازادەکانیان لەرۆژئاوادا لێ ئاگادار بکەنەوە.[1]

٥- **هەڵمەتی پڕوپاگەندەی خاچپەرستی:** وتارەکەی پاپا ئۆربانی دووەم دەستپێکی قوناغێکی نوێو گرنگبوو لەشێوازەکانی پڕوپاگەندەی خاچپەرستیدا، کە لەسەر بنەمای گواستنەوەی کەسی بوو بۆ چەندین پێگەو دواندنی چەند چینێکی جیاواز لەمرۆڤەکان، ئەمەش رۆڵی کاریگەری هەبوو لەسەرخستنی ئەو پڕۆژەیەدا، ئەشتوانین تێبینی ئەوە بکەین کەهەڵمەتی یەکەمی خاچپەرستەکان بەتایبەت ئامادەسازی پروپاگەندەی بەئەوپەری لێهاتوویی و وردەکارییەوە بۆ کرابوو ئەمەش لەوتارەکەی پاپاوە دەستی پێکرد، بۆ ئەم مەبەستەش توانیان بانگخوازێکی زۆر کۆبکەنەوە بەمەش دەنگی بازنەی هزر فراوان بوو لەپێناو دواندنی سەرجەم توێژەکانی کۆمەڵگەی ئەورووپیدا هەریەکە بەپێی جیهانبینی خۆی، هەروەك پاپا ئۆربانی دووەم دوای سازدانی کۆربەندی کلیرمنت هەستا بەگواستنەوە بۆ شارەکانی

[1] دروس وتأملات في الحروب الصليبية ل١٨.

تورۆبۆرۆو نیمیزو نۆ مانگ لەوێدا مایەوەو بانگهێشتی بۆ پرۆژە نوێییەکەی دەکرد[1]، هەروەك هەستا بەناردنی چەندین وتار لەپێناو بانگهێشتکردن بۆ پرۆژە خاچپەرستییەکەیدا، لەوانەش ئەو نامانەی کەناردی بۆ سەرجەم باوەر داران بەمەسیحییەت- لەقەلاندروزداو بۆ پۆلوناو میزورو کونتات سردایناو سیللدنو بیسالونو وامبوریاس، تێبینیش دەکرێت کە ئەو وتارانە جیاناکرێنەوە لەرۆلی پاپا لەکۆربەندی کلیرمۆنتدا بەلکو تەواوکەرو درێژەپێدەرێکی راستەقینەی رۆلی پرۆپاگەندە کاریانەیەتی بۆ جەنگەکانی خاچپەرستی[2].

٦- **توانای رێکخستن لای ئۆربانی دووەم:** ئەو وتارانەی کەپاپا ناردنی لەپێناو پرۆژە خاچپەرستییەکەیدا، کۆمەلێ وردەکاریمان پێشکەش دەکەن کە لەوتارەکەی کلیرمونتدا نەهاتبوون لەنێوانیشیاندا دانپیادانانی بەرۆلی نوێنەری پاپا ئەدهیماد ئۆسقوفی لەبویدا، هەروەها جەخت لەسەر پێویستی گوێرایەلی فەرمانەکانی دەکات وەك فەرمانی خودی پاپا، تیاشیدا هاتووە کەبوارنادات بەراهیبو قەشەکان بۆ بەرێ کەوتن بەرەو رۆژهەلات بەبێ وەرگرتنی مۆلەتی ئۆسقوفەکانیان، بەهەمان شێوە پێشکەشکارانی دێرەکانیش بۆ خۆلادان لەیاخیبوونو پشێوی پێویستە پەی بەوە بەرن کەئەو سەرچاوە بەلگەنامەییانە کە لەبەردەستماندایە توانای رێکخستنی وردی پاپا ئۆربانی دووەممان بۆ دەردەخات ئەمەش دەیسەلمێنێت کە ئەو تێڕوانینێکی گشتگیری هەبووە بۆ پرۆژەی خاچپەرستی، لانی کەم لەقۆناغی سەرەتادا- هەروەها زۆر سووربووە لەسەر ئامۆژگاری ئەوانەی کەبەشدارن لەو گەشتەدا بەرەو رۆژهەلاتو گوێرایەلی کردنی کوێرانەی فەرمانەکانی خۆیو سەرکردە راستەو خۆکانییان، هەروەها هەست دەکەن کەپاپا داکۆکی کردووە لەبیرۆکەی یەکێتی جیهانی گاور. گوایە ئەوەی کە لەرۆژهەلاتدا بەسەر گاورەکاندا هات- بەپێی پروپاگەندەی ئەورووپی رق لەدل- ە مەسەلەیەکە جێی بایەخی دانیشتوانی ئەورووپای رۆژئاواییە، هەروەك یارمەتیدانی فەرەنسییەکانو گاورەکانی تر بۆ گاورەکانی رۆژهەلات بەشێکە لەئەرکەکانیان وەك گاور[3]، بەهەرحال ئەمە بەرهەمی سروشتی رۆلی ئەو رێکخستنو پلاندانانو پروپاگەندە یەیە کەپاپاو ئەو پیاوانەی کلێسا کە لەگەلیدا بەشداربوون لەهەلگیرساندنی جەنگی خاچپەرستیدا، ئەوەش کەیارمەتی دان بۆ ئەم مەبەستە هەلبژاردنی کاتی گونجاوبوو بۆ جەنگ.

---

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل٦٩.

[2] هەمان سەرچاوە ل٧٠.

[3] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق ولبغرب ل٧٠.

٧- **بوطرسی خواپەرست:** بوطرسی بەوتارەکەی پاپا کاریگەربوو بۆ خۆشی کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر خەڵك بەسواری گودرێژەێکەوە لەم شارەوە دەیگواستەوە بۆ ئەو شار بەپێی پەتیو دەگەڕاو جلو بەرگی کۆنو دڕاوی لەبەردەکرد، مێژوونوس رۆبەتی راهیب دەربارەی ئەڵێت: ئەم بوطرسە پێشەنگی جەنگی خاچپەرستی بووەو لەپارێزکاریدا لەقەشەو ئوسقۆفەکانی تر باشتربووە هەرگیز گۆشتو نانی نەخواردووە، بەڵکو تەنها ماسیو کەمێك شەربەتی ترێو هەندێ خۆراکی رەقی دەخوارد[1]، سەرباری رواڵەتی بوطرسی خواویستو حاڵی پەشێوو شێواوی، بەڵام کاریگەرییەکی هەبوو ژنو پاوی دوروژاندو خەڵکی بۆ لای رادەکێشا، بەمەش توانی پازدە هەزار کەس رابکێشێت بەلای خۆیدا لەو خەڵکە هەزارەی کەشاربەشار بەشوێنییەوەبوون بەدڵگەرمییەکی زۆرەوە، هەرچەندە زۆرینەیان شارەزای بەکارهێنانی چەكو سوارچاکی نەبوون، تەنانەت لەهیچ جەنگێکدا بەشدارییان نەکردبوو، بەڵام کاریگەربوونیان بەوشەکانی بوطرسی دونیانەویستو رواڵەتی وایلێکردن کەبەدڵگەرمییەکی کەم وێنەوە شوێنی بکەون بێ ئەوەی بیر لەهیچ ئەگەرێك بکەنەوە، چونکە ووتارەکانی ئاگرینو پڕگریانو هاوارو نەفرەت کردن لەبێباوەڕانو، بەڵێنی لێخۆشبونی پەروەردگاری تیابوو بۆ ئەوانەی کەبەرێ ئەکەون بۆ رزگار کردنی گۆڕی مەسیح، هەروەها رەوانبێژیو نواندنی سەرسورهێنەری کاریگەری زۆری هەبوو لەدڵی جەماوەردا.[2]

ئەوەی کەشیاوی ئاماژەپێدانە ئەوەیەکە مەوعیزەکاران رۆڵێکی بەرچاویان بینی هاوشێوەی رۆڵی بوطرسی پارێزگار لەپروپاگەندە کردن دا بۆ جەنگەکانی خاچپەرستی[3] خەڵکیش زۆر کاریگەربوون بەو مەوعیزەکارانە، مێژوونوس بودری باسی ئەم ماوەیە دەکات وەك کەسێك کە لەکاتی ئەم رووداوانەدا ژیاوە کەگاورەکان لەسەرسنگیان نیشانەی خاچیان وێنەدەکرد، بەئاسنی سوورکراوە هەتاوەکو دڵگەرمی خۆییان نیشان بدەنو خەڵکانی تریشو واتێبگەیەنن کەئەم شتانەیان لەرێگەی موعجیزەوە دەسکەوتووە[4]، بەم شێوەیە هەموان کەوتنە خۆ ئامادەکردن بۆ بەرێ کەوتن بەرەو زەوییە پیرۆزەکان لەشامدا دوای بیستنی ئەو وتانە، زۆربەشییان ماڵو موڵکی خۆییان ئەفرۆشت بۆ ئەو گەشتە هەتاوەکو خوای گەورە لەتاوانەکانییان خۆش بێتو لێیان رازی ببێت، باوکانیش خۆشحاڵبوون بەوەی کەمناڵەکانییان دەبینی بۆ جەنگ بەرێ دەکەوتن، هەروەها هاوسەرەکانیش زۆر

---

[1] دور الفقهاء المسلمين في الشرق الادنى في الجهاد ضد الصليبيين خلال الحركة الصليبية ل٢٣٩.

[2] حضارة العرب لةدور الفقهاء والعاماء ل٢٣٩ وەرگیراوە.

[3] دراسات في التأريخ العلاقات بين الشرق والغرب ل٢١.

[4] دوار الفقهاء والعماء ل٢٤٠.

خۆشحاڵبوون بەخۆ ئامادەکردنی مێردەکانیان بۆ بەرێکەتن بۆ جەنگ، بەم شێوە دڵگەرمی هەمووان بێ وێنەبوو، باوەڕیشییان زۆر بەهێز بوو بەم کارەیان[1]، بەئەندازەی ئەو دڵخۆشییەش کەئەوانە هەستییان پێدەکرد کەبەرێ کەوتنبوون بۆ گەشتنەوە بەشاڵاوی یەکەمی خاچپەرستییدا، بەهەمان ئەندازە ئەو خەڵکانەش دڵتەنگو نیگەرانبوون کەلەو شاڵاوەدا بەشدارنەبوون.[2]

٨- بێ ئاگایی موسڵمانان لەوەی کەبۆییان دادەڕێژرێت:

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا دەزگایەکی هەواڵگیری هەبوو کە توانیبووی هەموو دوژمنە ناوخۆییو نێودەوڵەتییەکانییان ببڕێت، هەروەك هەواڵگرو چاوساغەکانی موعاویە دزەیان کردبووە وڵاتی بیزەنتییەکانەوە، ئەمەشمان لەکتێبەکەمدا سەبارەت بەدەوڵەتی ئەمەوی روونکردۆتەوە، هەرچی دەوڵەتی عەباسیشە، ئەوە لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا هیچ وتارێکی حەماسی مان دەست نەکەوتوە لای هیچکام لەخەلیفە عەباسیو فاتمیەکان وەك کاردانەوەیەك بۆ وتارەکەی پاپا ئۆربانی دووەم، یان لانی کەم پیشانی بدات کەموسڵمانان بەوەیان زانیبێت کەلەکۆنگرەی کلیرمونتو پاشی داڕوی دا، لەوانەیە هۆکاری ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵبونی هەردوو دەوڵەتی عەباسیو فاتمی بەناکۆکی نێوانیانەوەو هەوڵدانی هەریەکێکیان بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەوی تردا هەتاوەکو باڵادەستی بۆ ئەوبێت، بۆیە لەخەوێکی قوڵدا بوون هەتاوەکو شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستی گشتە شام،[3] ئەوەش کەئەمە دوپات ئەکاتەوە ئەوەیە کەئیبن ئەلقەلانسی لەنوسینەکانیدا هێناویەتی کە هەواڵی خاچپەرستەکان هەتاوەکو ساڵی٤٩٠ك/١٠٩٧ز نەگەیشتبووە وڵاتی شام، لەم بارەیەوە ئەڵێت: تاکە کاردانەوەی ئیسلامی پێش گەشتنی شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستی بەوڵاتی شام لەلایەن سەلجوقیەکانەوە بوو لەئاسیای بچوکدا کاتێ توانیان بەئاسانی بەشی یەکەمی ئەو هێزە خاچپەرستیە لەناو بەرن کە بە "شاڵاوی گشتی" ناسرابوو، سەرباری ئەو کارە بەرگریکارییەی کەپێی هەڵدەستان بۆبەرگری کردن لەماڵو موڵکیان لەئاسیای بچوك دا،[4] وەك دواتر ڕونی دەکەینەوە بەپشتیوانی پەروەردگار، ئەوەبوو خاچپەرستەکان لەڕێی سەرکردایەتیەکی لێهاتوو ئامانجی رونو چالاکیو پشوودرێژیەوەو توانای وتاربێژیان بەکاردەهێنا بۆ دنانی کاریگەری لەسەر خەڵکیو هۆکاری زۆرییان دەگرتەبەر وەك هۆکاری ئابووریو رامیاریو کۆمەڵایەتیو ئاینی بۆ بزواندنی گەلانی رۆژئاوای ئەوروپا، هەروەها پلەو پایەی رۆحی پاپاش کاریگەری هەبوو لەسەر

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٤٠.

[2] هەمان سەرچاوەل٢٤٠.

[3] دور الفقهاء المسلمين في الشرقي الأدنى، ل٢٤١.

[4] هەمان سەرچاوە ل٢٤١.

جولاندنی هێزەکانیان بەرەو رۆژهەلات، توانی لەرێی پرۆژەیەکەوە کار بکات کەهەموو توانا و وزە دەسکەوتووەکانی تیادا خستبووە گەڕ.

## باسی سێیەم: هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی خاچپەرستی

پاش وتارەکەی پاپا ئۆربانی دووەم لەکلیرمۆنتی فەرەنسادا کەتیایدا بانگەوازی کرد بۆ جەنگی خاچپەرستی، داوای کرد لەپیاوانی کڵێسا کەبگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان، هەتاوەکو خەڵك هان بدەن بۆ جەنگ، پیاوانی کڵێساش زۆر هەوڵیاندا لەم بوارەدا، دەرەنجامی سروشتی ئەم رۆڵە پڕوپاگەندەکارییە گەورەیەش کەپاپاو دۆستەکانی پێی هەستان، بریتی بوو لەهەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی خاچپەرستی کەبوو بەدوو بەشەوە: هێرشی خەڵکی بەگشتی‌و هێرشی شازادەو سەرکردەکان، ئەم یەکەم شاڵاوەی خاچپەرستیەکانیش بەهەردوو بەشەکەیەوە گرنگییەکی بێ وێنەی پێ دراوە لەلایەن مێژوونوسە هاوچەرخەکانەوە بەتایبەت ئەوانەی کەتایبەتمەندبوون بەلێکۆڵینەوە لەجەنگەکانی خاچپەرستیدا، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەرەنجامە ترسناکانەی کە لەو هەڵمەتە کەوتەوە بەشێوەیەکی تایبەت‌و بووە هۆی دامەزراندنی چەندین ئەمارەتی خاچپەرستی لەرۆژهەڵاتدا کەهەندێکیان تەمەنیان لەدوو سەدە زیاتربوو،[1] هەروەها شاڵاوی خاچپەرستی تارادەیەکی باش سەرکەوتووبوو لەدامەزراندن‌و جێگیرکردنی چوار میرنشینی لاتینیدا: یەکەمیان لەسەروی فوراتەوەبوو بە "ئەلریها" ناسرابوو، دووەمیشیان لەسەروی شامەوە بەناوی ئەنتاکییە سێیەمیشیان لەکەناری شامدا "تەرابلوس"، چوارەمیشیان لەناوجەرگەی فەلەستین دا بوو کەبەیتولمەقدیسە،[2] ئەمە وێڕای چوار بارۆنی گەورە کەبریتی بوون لە: صەیداو یافاو عەسقەلان‌و جەلیل‌و دوانزە بەشەزەوی کەخاوەنەکانی لەپاشای خاچپەرستەوە وەریان گرت بەرامبەر بە ملکەچی نواندن‌و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی کەئەوانیش بریتی بوون لە: ئەرسوف‌و حەبرون‌و داروم‌و قەیساریەو نابلس‌و بیسان‌و حەیفاو تبنین بانیاس‌و کیفاو ئەللدو بەیروت،[3] شایانی باسیشە ئەو سەرکەوتنەی کەبەدەستیان هێنا ئەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك کەرۆڵیان هەبوو تیایدا لەوانە:

- نەبونی یەکێتی رامیاری (سیاسی) لەجیهانی ئیسلامیدا.
- ململانێ لەسەر دەسەڵات لەناو خانەوادەی سەلجوقیدا.
- هەبونی دەوڵەتی فاتمی شیعە لەناوچەکەدا.
- ڕوخانی خیلافەتی ئەمەوی لەئەندەلوس دا.
- رۆڵی گاورەکان ئەوانەی کەلەوڵاتی شام دا دەژیان.

---

[1] الحروب صليبية و العلاقال بين الشرق والغرب ل٧١.

[2] دور الفقهاء في الشرق الأدنى ل٣٧.

[3] هەمان سەرچاوە ل٢٧.

- هەڵوێستی هەندێ لەمیرنشینە عەرەبیەکان بەرامبەر بەشاڵاوی خاچپەرستی.
- ڕۆڵی کۆمەڵی ئیسماعیلی باطینی شیعە لەتەگەرەخستنە بەردەم جیهاد دژ بەخاچپەرستەکان.
- لاوازی دەوڵەتی بیزەنتی.
- ڕاهاتنی سوارەکانی فەرەنسا لەسەر جەنگ.
- کۆمەکە بەردەوامەکانی ئەوروپیەکان بۆ شاڵاوە خاچپەرستیەکە.
- تاکرەویو خۆسەپاندنی سیاسیو کاریگەری لەسەر ئاینو ژیان.
- سەرقاڵ بوونی هەندێ لەزانایانی ئوممەت بەتێگەشتن لەلقەکانی فیقهو مەسەلە شەرعیەلاوەکیەکان، باسی هەریەك لەم هۆکارە ئەشم بەوردی لەکتێبی "دولة السلاجقة والمشروع الاسلامي لمقاومة التغلغ الباطني والغزو الصليبي.[1]

**یەکەم: ئیستراتیژیەتی شاڵاوی خاچپەرستی پاش داگیر کردن:**

گرنگە بەلامانەوە لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین کەهێزە فەرەنسیە داگیرکەرەکان کەوای بۆ دانرابوو نەخشەی بۆ کێشراوە لەژینگەیەکی نامۆدابژی، پێویستی بەپەیڕەو کردنی کۆمەڵێ ستراتیژ بوو کەچاوەڕێی گەشە کردنی لێ دەکراو ئامانجی سەرەکیشی بریتی بوو لەدرێژەدان بەشێوازی داگیرکاری بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لەو ستراتیژیانەش:

- پارێزگاری کردن بەپێی تواناو بەهەموو شێوازەکانی لەگرنگترین هۆکار لەهۆکارەکانی سەرکەوتن کەبریتیە لەکارکردن بۆ هێشتنەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بەپەرتەوازەیی بەپێی توانا، چونکە ئەوە ئەگەری ڕووبەڕووبونەوەی وەك هێزێکی یەکگرتوو لەکۆڵ دەکاتەوە، لەوپێناوەشدا بەبەردەوامی کاری دەکرد بۆ داگیرکردنی چەند ناوچەیەکی گرنگ لەڕوی ستراتیژیەوە کە ەخزمەت بەجیاکردنەوەو دابڕینی هێزە ئیسلامیەکان بکات هەتاوەکو پێکگەشتنو یەکبونیان ڕونەدات، بۆئەم مەبەستەش هەستا بەداگیر کردنی شاری (الرها) لەپێناو ڕێگری کردن یان پەك خستنی پەیوەندی لەنێوان عیراقو شامدا، وەك چۆن دواتر ڕوی داو دەستیان گرت بەسەر چەند ناوچەیەکی باشوری شامو وەك ئەلکرکو شەوبەك بە مەبەستی پەکخستن یان کۆسپ دانان بۆ هاتوچۆکردن لەنێوان میسرو شامدا لەسەر ئاستی جوگرافیای سروشتی، سەبارەت بەجوگرافیای مرۆییش، ئەوە هێزە خاچپەرستەکان سوربون لەسەر درێژە پێدانی ململانێی ڕەگەزیو مەزهەبی لەنێوان لایەنەکانی دەوڵەتی ئیسلامی داو بۆ ئەمەش هۆکارەکانی ترساندنو موژدەدانیان بەکاردەهینا، لەگەڵ گرتنەبەری سیاسەتی هاوپەیمانێتی

---

[1] دولة السلاجقة ل٥٠٠ بۆ ٥٢٥.

کردن لەگەڵ هێزێکدا دژ بەهێزێکی تر، دوژمنایەتی نێوان دوولایەنی ئیسلامی شیعەو سوننەش تاڕادەیەك یارمەتیدەریان بوو، هەروەك بونی کەمینەیەکی گاوریش یارمەتیدەری بوو بۆ بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵیداو پیلان گێڕان دژ بەدەوروبەری ئیسلامی.

- هێزە خاچپەرستەکان هەوڵی داگیرکردنی ئەو ناوچانەیان دەدا کەپەیوەندی کردنی بەزێدی خۆیانەوە (ئەوروپای رۆژئاوایی) بۆ مسۆگەر دەکردن، بۆیە گرنگیان دەدا بە داگیرکردنی کەنارەکانی وڵاتی شام بۆ مسۆگەر کردنی ئەوکارە، بەپێی تواناش لەدەستگرتن بەسەر ناوچەکانی ناوەوە دا دوورکەوتنەوە لەترسی لەدەست دانی ئەو تایبەتمەندیەو هەتاوەکو لەلایەن هێزە ئیسلامیەکانەوە ئابلۆقە نەدرێن، لەبەر ئەگەری یەککگرتنی ئەو هێزانە لەداهاتودا کەئەمەش ئەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەبوون و مانەوەیان ئەوان لەداهاتوودا.
- هێزە خاچپەرستیەکان کاریان دەکرد لەسەر هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ چەند هێزێکدا کەبتوانێت یارمەتیان بدات لەقۆناغە جیاجیاکاندا، چ بەهۆی نەیاری دژایەتی ئەو هێزانە بێت بۆ واقیعی ئیسلامی یان بەئومێدی دەسکەوتنی چەند دەستکەوتێکی ئابوری، لەم بوارەشدا ئەتوانین تێبینی هاوپەیمانێتیان بکەین لەسەرەتا لەگەڵ بیزەنتیەکاندا پاشان لەگەڵ شارە ئیتاڵیەکان یان هەندێکیاندا، دواجاریش ئەگەری هاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ هێزە مەغولیەکاندا[1] کە دواتر مەترسیدار ترین هێز بوون کە هەرەشە لەقەوارەکانی ناوچەی ئیسلامی بکەن.
- هێزە خاچپەرستەکان لەسەرەتای دامەزراندنی قەوارەکانیان لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا سوربوون لەسەر چارەسەرکردنی گرفتی دانیشتوان کەبەدەست کەمیەوە دەینالاندا بەرامبەر چڕی دانیشتوانی ناوچە ئیسلامیەکاندا، هێزە خاچپەرستەکانیش لەسەر هەموو ئاستەکاندا کاریان بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە کردو هەموو هۆکارێکیان دەگرتە بەر کەشیاوی گەشەککردن بێت بەپێی پێویستی بارودۆخ و بەرەو پێش چونی، لەوانەش گرتنەبەری سیاسەتی کوشتن و کۆچ پێ کردنی موسڵمانەکان لەو ناوچانەی کەداگیریان دەکرد. پاشان دواتر وازیان لەمەهێنا لەچوارچێوەی سیاسەتی هێشتنەوەی دانیشتواندا ئەگەر خزمەتی بەرژەوەندییەکانی دەکرد، هەروەها هەوڵیان دەدا بۆ راکێشانی کۆچبەران بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خاچپەرستەکان چ لەرۆژئاوای ئەوروپاییدا یان لەناوچەکانی ئەرمینیا یاخود گاورەکانی ناوچە ئیسلامیەکانن هەروەها پەنایان برد بۆ بەسەربازیکردنی کۆمەڵگەی خاچپەرست برد هەتاوەکو کۆمەڵگە

---

[1] دراسات في تأريخ الأيوبيين والحمماليك ل٢٧.

بەهەموو چین و توێژەکانیەوە توانای ئەنجام دانی خزمەتی سەربازی هەبێت لەپێناو چارەسەر کردنی گرفتی کەمی دانیشتوان، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە گروپە ئاینیەکان لەکۆمەڵگەی گاوردا لەهەندێ قۆناغی ئامادەیی خاچپەرستەکاندا توندڕەوترین چین و توێژ بوون لەبواری سەربازیدا وەك گروپی ئەلداویەو ئسبتاریە.[1]

- هێزە خاچپەرستەکان گرنگیان دەدا بەخۆ تۆکمە کردن و قایمکاری سەربازی لەرێی تواناکانی خۆیانەوە یان بەسود وەرگرتن لەو ئەزمون و توانایانەی کە لەناوچە ئیسلامیەکاندا دەستیان کەوت، لەم قایمکاریانەشدا رەچاوی ئەوە کرابوو کە لەوێستگەی ئاگادار کردنەوەی خێرا بچێت و توانای دیاری کردنی جموجۆڵی دوژمنی هەبێت، بۆیە لەهەڵبژاردنی پێگەکانیدا رەچاوی ئەوە دەکرا کە بەرامبەر بەشارە ئیسلامیە گرنگەکان بێت یان لەو ناوچانە دابێت کەهەرەشەیە بۆسەر بەرژەندیە ئیسلامیەکان وەك ئەوەی کەلەنزیك رێگا بازرگانیەکانەوە بنیات نرابوو.
- هێزە خاچپەرستیەکان لەجەنگیاندا لەگەڵ لایەنی ئیسلامیداو بەسودوەرگرتن لەئەزمونی جەنگی رابردویان پشتیان بەجەنگی خێراو کتوپڕ دەبەست، ئەو جەنگەی کەپێویستی بەهێزی زۆرنیە بەهەمان ئەندازەش نەخشەی بۆ دەکێشرێ کەچەند ئامانجێکی هەڵبژێردراو بەپێی چەند پێوەرێکی کاتی حساب بۆکراو وەك پەیرەوکردنی شێوازی پەلاماردانی ناوچە کشتوکاڵیەکان لەوەرزی پێگەشتنی بەروبوم دا بەمەش هێزێکی سەربازی زۆری ناوێت بەڵام توانای گەیاندنی زیانێکی گەورەی بەلایەنی ئیسلامی هەیە.
- هێزە خاچپەرستەکان پەنایان دەبرد بۆ سیاسەتی رێککەوتن لەسەر ئاگر بەست و پێش کەشکردنی چەند تەنازولاتێك بۆ هەندێ لایەنی ئیسلامی لەپێناو یەکلابونەوە بۆ چەند هێزێکی ئیسلامی تر، ئەم ستراتیژیەش سەرکەوتوو بو لەکاتی پەرتەوازەبونی موسڵماناندا بەڵکو ئەوە بەرەو پشتگیری کردنی لایەنێك دژ بەلایەنێکی تری بردن، ئەمەش هەندێ جار لەسەر پێشنیاری خاچپەرستەکان بوو هەندێ جاریش بەبانگهێشت و خواستی لایەنێکی ئیسلامی.
- هێزە خاچپەرستەکان بەهەموو شێوەیەك کاریان دەکرد بۆ هێشتنەوەی گیانی جەنگە خاچپەرستیەکان بەبەهێزی بۆ مسۆگەر کردنی بەردەوامی شالاوە خاچپەرستیەکان و بەردەوامبونی پێشکەشکردنی یارمەتیەکان بەقەوارە خاچپەرستەکان لەرۆژهەلات دا، بۆیە سور بوون لەسەر پەیوەندی هەمیشەیی و بەردەوام لەگەڵ ئەوروپادا وەك هۆکارێك بۆ دەستە

---

[1] دراسات في تأريخ الأيوبيين والمماليك ل٢٨.

بەرکردنی کۆمەکیە مرۆیی و مادیەکان، پاشاکانی ئەوروپاش هەستیان کرد بەو بەرپرسیارێتیە گەورەیە بەرامبەر بەمیرنشینە خاچپەرستەکان لەئەوروپاداو پابەند بوون بەکۆمەکی و بەرگری لێ کردنیان.

- بەتێپەربونی کات هێزە خاچپەرستیەکان گرنگیان بەپەیڕەو کردنی ستراتیژیەتێك دەدا کەبریتی بوو لەوەی کە: مسۆگەر کردنی مانەوە یان لەولاتی شام ئەخوازێ کەدەستیگرن بەسەر میسردا یاخود لەگۆرەپانی ململانێ دووری بخەنەوە بەهەر شێوەیەك بوبێت، هەر بۆیە ئەبینین کەشالاوە خاچپەرستیەکانی دواتر بەشێك بوون لێی و بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی میسردەکران، چاودێری مێژووی بزوتنەوەی خاچپەرستیش تێبینی ئەوە دەکات کە توانیویانە هەندێ سەرکەوتن بەدەست بێنن بەسود وەرگرتن لەچەند حاڵەتێکی دوژمنکاری کەسەری هەڵدەدا لەنێوان دەسەلاتدارانی میسرو هەندێ ناوچەی ولاتی شام دا.
- هەندێ لایەنی خاچپەرست پەنایان دەبرد بۆ ئەنجامدانی شالاوی سەربازی بەمەبەستی لێدانی مەعنەویات و ورەی ئیسلامی و هەڕەشەکردن لەپیرۆزیەکانی موسڵمانان، وەك ئەوەی کەڕوی دا کاتێ هەندێ دلەو هێزانەی ئەمیری کرك و شەوبەك هەستا بەدەست درێژی کردنە سەر شوێنە پیرۆزەکان لەحیجازدا هەروەها پەنای برد بۆ لێدانی هەندی لەپایە ئابوری و ئاینیەکان وەك هەڕەشە کردن لەرێگاکانی بازرگانی و کاروانەکانی حەجی میسرنشینی کرك و شەوبەکی خاچ پەرست کەسەربە مەملەکەتی بەتولمەقدیسی خاچپەرست بوون و لەچەند قۆناغێکی دیاری کراودا ئەم رۆڵەیان بینی.
- ئیمارەتە خاچپەرستەکان و دەزگای پاپای پشتیوانی و هەندێ لەپیاوانی کلێسا و بیریاران بێ ئاگانەبون لەپەرەپێدانی بەستراتیژیەتێك کەدەرەنجامی شکستخواردنی ئەو ستراتیژیە سەربازیانە بوو کەبانگەوازی دەکرد بۆ هەولدان بۆ دەست بەسەراگرتن بەچەند رێگەیەکی دور لەشێوازی سەربازیەوە، بەلکو لەرێی بەگاورکردن و بانگەوازکردن بۆ زیادکردنی هەولەکانی مژدەدان و بلاوکردنەوەی ئاینی گاور لەنێون موسڵماناندا، دیارە ئێمە لێرەدا قسە لەسەر ئەگەری سەرکەوتنی یان شکستی ئەم ستراتیژە ناکەین بەو ئەندازەیەی کەمەبەستمانە ئاماژە بەوە بکەین کەئەوەیەکێك بوە لەو ئەلتەرناتیڤانەی کەفەرەنسیەکان هەولیان دەدا بەکاری بێنن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.
- هێزە خاچپەرستیەکان واخۆیان نیشان دەدا کەئەوان داکۆکیکارن لەئاینی گاور لەولاتی رۆژهەلاتدا بەچاوپۆشین لەجیاوازیە مەزهەبیەکانیان، تەنانەت بزوتنەوەی خاچ پەرستی وانیشان دەدا کەبۆ بەدەمەوە هاتنی بیزەنتیەکان هاتوە دژبە مەترسی ئیسلامی سەلجوقی،

هەروەك شالاوی خۆی بۆسەر زەویەكانی ناوچەئیسلامیەكانی واپیشان دەدا كەئامانج لێی رزگار كردنی گاورەكانی رۆژهەلاتە لەدەسەلاتای ئیسلامی، بەهۆی ئەمەشەوە هاوكاری ئەرمەنو سریانیەكانیان مسۆگەر كرد... لەسەرەتایی دەست بەسەراگرتنی ناوچە ئیسلامیەكاندا، بەلام ئەم ستراتیژیە كاتیە وردە وردەو بەتێپەربونی كاتو گرێدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ بزوتنەوەی باگنیەكاندا بەرەو نەمان رۆشت.١

ئەم ستراتیژیانە ئەگەرچی گشتیش بوبێت و تایبەت بێت بەهەموو گاورەكانەوە، بەلام ئەمە رێگر نەبوو لەبەرامبەر بەكارهێنانی ستراتیژی قۆناغبەندو تایبەت بەهەر میسرنشینێك بەپێی بارودۆخی، ئەمەش ئەوەدەگەیەنی كەرەنگە هەندێ میرنشین سیاسەیێكی پەیرەو كردبێت كەدژبێت لەگەڵ ئەو بنەماگشتیانەدا، لەخستنەرووی ئەم ستراتیژیانەشەوە بۆمان دەردەكەوێت كە سەركەوتنی هێزی ئیسلامی لەبەرەنگاربونەوەی ئەم مەترسیە خاچپەرستیەدا بەندە بەرادەی پەیڕەوكردنی ستراتیژیەتو شوێنكەوتنی چەند هۆكارێك كەمەترسی ئەو ستراتیژە خاچپەرستیانە كە بكاتەوە.

ئەمەش لەرانگەی پەیرەو كردنی ستراتیژیەتی دژو پێچەوانە یاخود رێگرتن لەپیادەكردنی ستراتیژەكانی دوژمن لەسەر ئەرزی واقیع.

ئەمە لەرێی پەرەسەندنی كاردانەوە ئیسلامیەكانەوە بەرامبەر بەهەرەشەی خاچپەرستی بەدی دەكرێت، هەر لەسەردەمی عمادالدین زنكی یەوە هەتاوەكو قۆناغی صلاح الدینی ئەیوبی وەك تەواوكاریەك بۆ ئەوەی لەسەردەمی دەولەتی مەملوكیدا بەئەنجام گەیەنرا، بەمەرجێ لەوە واتێ نەكەین كەئەم پەرەسەندنە لەكاردانەوەی ئیسلامیدا لەسەردەمی زەنكی ئەیوبیو مەملوكیدا هەمیشە لەچوارچێوەیەكی باشدا خۆی بینیبێتەوە، بەلكو ئەوەی كە هەندێ جارروی دەدا ئەوە بوو كەلایەنی ئیسلامی یان هەندێ لەهێزەكانی یان تاكەكانی یارمەتیدەر بوون بۆ سەركەوتنی ستراتیژەكانی خاچ پەرستان.٢

**دووەم: بزوتنەوەی بەرگری لەسەردەمی سەلجوقیدا:**

نسكۆی داگیركردنی قودس خەوی زۆر زاناو دادوەرو ئەمیری زڕاندو هۆشیان بەخۆیاندا هاتەوە،و لەراستی ئەو هێرشە گەشتن دوای ئەوەی كەمەترسی لەسەربون و پلەو پایەیان دروست كرد لەشارەكانی ئەو ولاتانەدا وێرای زەویو بیروباوەری ئیسلامی، بۆ یە زاناو دادوەرەكانی شام لەدیمەشقو حەلەبو ترابلوسەوە پەنایان هێنا بۆ دەسەلاتی ناوەندی لەبەغدادو میرنشینە

---

[1] دراسان في تأريخ الأيوبيين ل٣١.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣١.

ناوخۆییەکاندا بەو پێیەی کە هێزی سەربازی بەتوانای هەیە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو هێرشە[1]. وەلامدانەوەی ئەم زاناو دادوەرانەش لەولاتی شام دا بۆ هێرشی خاچپەرستی تەنها لەهانا هێنانو داوای فریاکەوتن دا، کورت نەبوبویەوە بەلکو لەوە تێپەری کرد بۆ چەندین شێوازی تر کەیەکێکیان نوسینە لەسەر جیهاد کردن دژ بەدوژمن، بۆ بەرهەمهێنانی بارودۆخی هزریو رۆشنبیرکردنی موسلمانان بەشێوەیەکی گشتی، ئەوە بوو گرنگیەکی زۆری پێدرا لەلایەن کۆمەلێك لەزانا یانەوە لەپێشو لەکاتی ئەم هێرشەدا، دیارە ئامادەکردنی هزریو بلاوکردنەوەی رۆشنبیری ئیسلامی بوو بوو بەیەکێك لەپێداویستییە سەرەکییەکانی سەرەکیەکان لەو سەردەمەدا، لەکاتێکدا کەولاتی شام لەململانێیەکی سیاسی مەزهەبیو سەربازیدا بوو کەڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر نوسینەوەی مێژوو لەرۆژهەلاتی ئیسلامیداو دەرکەوتنی چەندین کتێبو نوسراو دەربارەی ژیانی سولتانو پاشاو بنەمالە دەسەلاتدارەکانو ڕوداوەکانی جەنگو ململانێ لەگەل خاچپەرستەکاندا، بۆیە کۆمەلێك لەزانا یانو دادوەران لەهەولی روناکبیر کردنی کۆمەلگە ئیسلامیەکانیان دا بوون ، لەڕێی نوسراوو کتێبە دانراوەکانیانەوە ئەمەش بوو بەدوو کۆمەلە یەکەمیان گرنگی دەدابە نوسینی کتێبو ئامۆژگاری بەشێوەیەکی ئاساییو، رونکردنەوەی مەسەلەو پایەکانی ئاینی پیرۆزبۆ خەلکی، دووەمیش روی کردە هەلنانو هاندانو نوسین بۆ جیهادو هاندانی موسلمانان بۆی چونکە پەی بەئەو لاوازیە گشتیە برد بوو کەڕوی کرد بووە باوەڕی موسلمانانو وازهێنانیان لەکاروباری ئاینەکەیان، بۆ یەکتێبی زۆریان دانا لەپێشو لەپاش هێرشی خاچپەرستیەوە لەولاتی شام ئەوەش کەلێرە دا مەبەستمانە نوسینەکانی ئەو زانایانەیە کەهانی موسلمانانیان ئەدا بۆ جیهادو بزواندنی مسولمانان لەڕێی ئاینەوە بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەم شالاوە[2]، لەدیارترینی ئەو زانایانەش:

● **زانا عەلی کوڕی طاهیر السلمي** (٤٣١ – ٥٠٠ك/ ١٠٣٩ – ١١٠٦ز): عەلی کوڕی طاهیری کوڕی جەعفەری قەیسی سەلەمی دیمەشقی شافعی یە یەکێك بووە لەزانایانی ولاتی شام پاش هاتنی ئەو شالاوە بووبە مەو عیزەکارو هاندەر بۆ جیهاد لەڕێی ئەو وتارو وانانەی کەلەمزگەوتەکاندا ئەیوتەوە بۆ ئەم مەبەستەش بەشارەکانی شامو فەلەستیندا دەگەڕا ئەمەشی لەکتێبی (الجهاد)دا بەرجەستەکرد کەدوای رووخانی بەیتو المقدس لەسالی ٤٩٢ك – ١٠٩٨ز نوسی ئەمەش لەڕێی یەکێك لەوتارەکانیەوە کەتیایدا موسلمانان هاندەدا بۆ جیهاد کردن دژی ئەو شالاوە، موجاهیدانیش بەلایەوە ئەو کەسانەبوون کەدژ بەو کۆمەلە ئەجەنگنو بەسەریاندا

---

[1] موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصلبي ل٦٨.

[2] موقف فقهاء الشام وقضاها من الغزء الصليبي ل٩٣.

سەردەكەون و لە بەیتولمەقدیس و شوێنەكانی تر وەدەریان دەنێن،[1] هەروەها السلمی لەبەشەكانی یەكەمی كتێبە كەیدا گرنگی داوە بە زۆر مەسەلەو بیرۆكەی گرنگ كەولاتی شام و جیهانی ئیسلامی لەوكاتەدا تێی كەوتبوو، سەرەتاباسی لەو سیاسەتە خاچپەرستیە هەمەلایەنە كرد كەئەندەلوس و صقلیەو ولاتی شامی كردبوە ئامانج، ئەو بیرۆكەیەی كەمێژوونوسەكان بردیان و دواتر پەرەیان پێدا ئیبن الأثیر باس دەكات و دەڵێت: سەرەتا دەوڵەت و دەسەلاتی فەرەنسیەكان و بەهێزبون و هاتنیان بۆ ولاتی ئیسلام و دەستگرتنیان بەسەر هەندێكیدا لەساڵی چوارسەدو حەفتاو هەشت دا، ئەوە بوو شاری طلیطلة و چەند شوێنێكی تری ولاتی ئەندەلوسیان داگیر كرد... پاشان لەساڵی چوار سەدو هەشتاو چواردا دەستیان گرت بەسەر دورگەی صقلیەدا... كاتی ساڵی چوارسەدو نەوەد هات بەرەو ولاتی شام كەوتنەرێ،[2] السلمیش دەركی بەوە كرد كەلاوازی جیهانی ئیسلامی و پەرتەوازەیی و دابەشبونی هۆكاری سەرەكی سەركەوتنی هێرشی خاچپەرستیە لەرۆژهەلات یان رۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا نەك بەهێزی خاچپەرستەكان بێت: بەشێوەیەكی تایبەتیش باسی لەدابەش بونی سیاسی ولاتی شام دەكرد چونكە ئەو لەوێ ژیاوەو دەركی بەمەینەتیەكانی ئەوێ كردووە، بەتایبەت تەمەڵی نوندنی خەڵكەكەی لەجیهاد كردندا،[3] هەروەها السلمی بیرۆكەی بەردەوامی جیهادكردنی وەبیر موسڵمانان هێنایەوە چ لەجەنگدابێت یان لەئاشتیدا وەك بەشێك لەسیاسەتێكی گشتی كەپێویستە ئەمیرو خەلیفەكانی موسڵمانان پێی هەستن وەك مەرجێكی سەرەكی بۆ سەركەوتن لەروبەڕوبونەوەدا، هەموو ساڵێك لەسەر ئەمیری موسڵمان پێویستە كەهەستێت بەهەڵمەتێك لەدەرەوەی خاكی ئیسلامدا نەك بۆ تەماع و دەسكەوت بەڵكو بۆ پارێزگاری كردن لەولاتی ئیسلام بەرامبەر بەدەستدرێژی غەیری موسڵمانان و، ترساندن و پیشاندانی هێزی موسڵمانان بۆیان بەبەردەوامی، لەپێناو بەرجەستە كردنی ئەوڕایەی كەلەسەردەمی ئێستادادەڵێت: پێویستە هەمیشە شەر بگوێزرێتەوە بۆ خاكی دوژمن،[4] موسڵمانەكانی خستەوە كەئەم هەڵمەتە تەنها ئامانجی خاك و بیروباوەڕی خەڵك نیە، بەڵكو ئامانجی لەناوبردنی دەسەلات و دەركردنیانە لەو ولاتەی كەلەژێر دەستیاندابوە، ئەمەش

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٩٣.

[2] الكامل في التأريخ (٨/٣٩٧).

[3] موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل٩٤.

[4] موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل٩٥.

بەمەبەستی وروژاندن و هاندانیان بۆ جیهاد،[1] هەروەها داواشی کرد لەخەڵك بەگشتی کەیارمەتی ئەمیرو فەرماندە موجاهیدەکانیان بدەن ئەوانەی کەشوێنکەوتەی سەلەفی صالحن "پیاوچاکانی پێشین" بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو نەهامەتیەو وەدەرنانی خاچپەرستەکان،[2] خوێنەری کتێبی السلمی دەربارەی جیهاد راستەوخۆ لەقوڵی ئەو ئازارە دەگات کەئەم پیاوە بەدەستیەوە ناڵاندویەتی، وەك زانایەك کە ئەبینێ بەبەرچاویەوە سوکایەتی بەبەیتولمەقدیس دەکرێت و پیرۆزی لەکەدار دەکرێت، بۆیە یەکەم شتێك کە سوربوو لەسەری بریتی بوو لەرزگار کردنی بەیتولمەقدیس لەدەستی ئەو داگیرکەرانە،[3] جاهەوڵ بدەن رەحمەتی خواتان لێ بێت بەڵکو لەو کەسانەبن کەلەئەم فەتحە گەورەیەدا پشکیان دەبێت.[4] هەروەها السلمی دائەنرێت بەیەکەم کەسێك کە پەی بەپێویستی یەکخستنی جیهادی خەڵکی شام و عیراق و شارەکانی ئاسیای پچوك بردبێت، پێش سەردەمی یەکێتی ئیسلامی دژبە خاچپەرستەکان بەسەرکردایەتی بنەماڵوی زەنگی و ئەییوبیەکان و یەکێکە لەپێشڕەوانی ئەم بوارە، هەروەها السلمی موسڵمانانی بانگهێشت دەکرد بۆ پاککردنەوەی دەرون و چاکسازی کردن تیایدا، چونکە بناغەی یەکێتی ئیسلامیە بۆ لێ بڕان و سوربون لەسەر بەرەنگار بونەوەی ئەو شاڵاوە: جیهادی نەفسی خۆتان پێش جیهادی دوژمنە کانتان بخەن چونکە دەرونی خۆتان لەوان زیاتر دوژمنتانە، رێگری بکەن لەو سەرکەشیەی کەتێی کەوتوە ئینجا ئەتوانن سەربکەون بەسەر دوژمنەکانتاندا،[5] بەرای سەلەمی هێرشی خاچپەرستی بۆ سەر وڵاتی شام لەبۆشایەوە سەرچاوەی نەگرتبوو بەڵکو ئەو پەی بەلاوازی موسڵمانان بردبوو بەهۆی دەستنەگرتنیان بەئاینی پیرۆزی پەروەردگارەوە هەر بۆیە ئامۆژگاریکردن بەگەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارو پاککردنەوەی دەروونەکان بەدەربڕینی پەشیمانی لەبەردەم خوای پەروەردگارداو دەست هەڵگرتن لەتاوانەکانی پێشویان و واڵاکردنی دەرگای جیهادو تێکۆشان: (با مەبەستتان بەم جیهادەتان رازی کردنی پەروەردگارتان و بەرگری کردن لەخۆتان و براکانتان بێت هەتاوەکو پاداشتی تەواوی غەزاکەتان دەستبکەوێت،[6] ئەمەش لەبەرامبەر هێرشی خاچپەرستی و دەست

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٩٥.

[2] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

[4] هەمان سەرچاوە ل٩٧.

[5] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[6] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

گرتنی بەسەر چەند شارێکدا تەنها بەوە دەبێت کەدەستپێشخەری نەکرێتو هێرشیان بۆ نەبرێتو لەو شارانەدا بمێننەوە کە هێشتا دەستی بەسەردا نەگیراوە،[1] چونکە بەرێ کەوتن بەرەو رویان بۆ ئەو ناوچانەی کە داگیریان کردوە مەبەستپێی بەرگریکردنە لەگیانو ماڵو منداڵو پاراستنی ئەوەیەکە بەدەستمانەوە ماوە،[2] هەروەها بانگهێشتی السلمی بۆ موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی بوو بۆ یەکخستنی هێزە ئیسلامیەکان: شامیو دورگەی عەرەبیو میسری، ئامۆژگاریشی کردن کەشوێنی رێبازەکەی بکەون بۆ پاککردنەوەی دڵو دەروونو لێبوردن لەیەکترو هەستان بەجیهادو هەتاوەکو بەئامانجی خۆیان دەگەن لەبەرپەرچدانەوەی ئەو شاڵاوەدا،[3] ئەو پێی وابوو: ئەگەر دەسەتدارانی موسڵمان رقو کینەو ناکۆکیەکانیان لەبیر نەکەن ئەوە هێشتا لەسەر رێبازی، نەفامینو چاویان نەکردوە لەوپەندە جوانەی کە لەشوێنەوارە أثردا هاتووەو ئەڵێ: لەکاتی تەنگانە دا رقو کینە نامێنێت،[4] هەروەها السلمی لەچەند شوێنێکی کتێبی الجهاد دا بەردەوام دەبێت لەسەر ئامۆژگاریو هاندانو هۆشداریدان بەکاربەدەستان بەگشتی لەمەڕپێویستی جیهادبەو ووتارو ئەو وانانەی کە لەمزگەوتی دیمەشق دا دابوی، هەروەها لەمزگەوتەکانی ولاتی شامو فەلەستین لەسیو دوو بەشدا،[5] هیچ قسەو یادەوەریەك نیە لەسەر جیهاد کەباسی نەکردبێت،[6] هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کەالسلمی لەکتێبی الجهاد دا هەستاوە بە رونکردنەوەی دابەش بوونو پەرتەوازەیی لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، بەتایبەت لەولاتی شامدا، کەبوە هۆی لاوازی هێزە ئیسلامیەکانو هەلوەشانەوەیان لەگەڵ لاوازی باوەڕبوون بەفەرزی جیهاد، ئەمەش خاڵێکە داگیرکەران قۆستیانەوە ئەم کەمو کورتیەشی بە خستنە بەرباسی مەسەلەی خۆپاککردنەوەوگەڕانەوە بۆ دەست گرتن بەئاینی پیرۆزی خوا چارەسەرکردهەروەها بەچاککردنی نێوانو هەستان بەجیهادو بەرەنگار بونەوەی ئەو شاڵاوە، ئەمەش بەبێ یەکگرتنی هێزە ئیسلامیەکان بەدی نایەت، بۆیە کتێبی (الجهاد) گشتی بوو، تایبەتی نەکرد بوو بەدەسەڵاتێکی سیاسی دیاری کراو یان کۆمەڵێك لەموسڵمانانی ولاتی شام دبەپێی تێڕوانینێکی ئیسلامی بنیات نراو لەسەر بنەمایەکی تۆکمە کەلەقورئانی

---

[1] موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل٩٨.

[2] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[4] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[5] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[6] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرو کتێبەکانی سیرەو غەزاکان و تەفسیرو بەستەنەوەی بابەتەکانی بەهەڕەشەکانی خاچپەرستیەوە بۆ سەر وڵاتی شام، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئاگایی زۆرو بیرتیژی لەکۆکردنەوەی زانیاری و بەکارهێنانی لەشوێنی گونجاودا[1] هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوە تێبینی دەکەین کەبانگەوازی یەکەم بۆ جیهاد لەئەنجومەنی فەرمانڕەواکانەوە دەرنەچوو بەڵکو لەکۆڕبەندی زانایانی موسڵمان و مامۆستاو نوسەرو فەقیهەکانەوە بوو، السلمی دائەنرێت بەیەکێك کەو کەسانەی کەلەسەرەتاوەهانی خەڵکی دا بۆ جیهادو لەوکەسانەی کەبەڕەوتی بەرهەڵستکاری گشتی ئیسلامی دادەنرێن کە لەلایەن زانایانەوە پشتیوانی لێ دەکرا.[2] السلمی کتێبە کتێبەکەی لەسەرەتای بەرپابونی ئەو جەنگانەدا نوسی ئەمەش بەڵگەیەلەسەر زیرەکی و ژیری و پەی بردنی بەکێشەئالۆزەکانی وڵاتی شام، بەلام کەشێکی لەباربۆسەرخستنی بانگەوازەکەی دەستەبەر نەبوو لەو سەرەتایەدا، بەڵکو دئەو بەو کتێبەی هاوکار بوو بۆ ڕێخۆشکردن بۆ قۆناغی زەنکی و ئەیوبی، مامۆستا رەمزان حسین الحشاوش یش هەستاوە بەلێکۆڵینەوەو تاوتوێ کردنی کتێبی "الجهاد"ی السلمی و وەك نامەیەکی ماستەر پیچشکەشی کرد لەزانکۆی الفاتح الطرابلوس رۆژئاوادا ساڵی ١٩٩٢ز.[3]

● **بەشداری زانایان و دادوەران لەگۆڕەپانەکانی جیهاندا :** دیارترین نمونە لەسەر بەشداری ئەو زانانیانە لەگەڵ سەربازەکاندا لەبەرەکانی جەنگ دا بۆ دەربڕینی حاڵەتی نمونەیی بیروباوەڕی بەجیهادو بەرگری کردن لەماڵ و گیان، حاڵەتی قازی أبو محمد عبداللەی کوڕی مەنصور ناسراو بەئیبن صلیحە قازی قەڵای جبلە، کەبو بەسەرپەرشتیاری زانایانی ئەو قەڵایەدوای کۆچی دوایی مەنسوری باوکی لەساڵی ٤٩٤ك/ ١١٠٠ز، هەورەها خاوەنی ئەزمونێکی سەربازی باش بوو چونکە سەرکبازی خۆش دەویست و خۆی سەربازی هەڵدەبژارد بەم شێوە پیاوەتی و لێهاتوویی دەرکەوت،[4] بەهرەکانی ئەم ئەمیرەش لەکاتی گەمارۆدانی قەڵای جبلە لەلایەن فەرەنسیەکانەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی ٤٩٤ك/ ١١٠٠ز هەروەها بەکارهێنانی ئەوەی کەئەمڕۆ بەجەنگی دەرونی ناوزەدی دەکەن دەرکەوت، ئەمەش کاتێ بووکە ژیرانە پلانی دانا بۆ بڵاوکردنەوەی ترس لەڕیزی هێزە فەرەنسییەکانداو وای پیشاندا کە سوڵتان بروکیا روق بەرەو

---

[1] موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل٩٩.

[2] هەمان سەرچاوە ل٩٣.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٣.

[4] الكامل في التأريخ لة موقف فقهاء الشام وة.

شـام کەوتۆتـە ڕێ[1] ، بـۆ یارمەتیـدانی ئەمـەش تـرس و دڵـەڕاوکێی خـستە دڵـی سـەربازانی فەرەنسییەوەو دواتریش بووە هۆی ڕۆیشتنیان لەناوچەکە بەڵام کاتێ فەرەنسیەکان لەڕاستی ئەو فێڵە تێگەیشتن دوبارە گەڕانەوەو گەمارۆی شـارەکەیان دایـەوە، بـەڵام قـازی ئـەم فێڵـەی بەشێوەیەکی تر دووبارە کردەوەو لەڕیزی خاچپەرستەکاندا بڵاوی کـردەوە: کەمیـسرییەکان کەوتونەتە ڕێ بۆ جەنگکردن دژیان و یارمـەتی دانـی ئـەو هـەر بۆیـە دوبـارە قەڵاکـەیان بـەجێ هێشت[2]. دیارە فەرەنسیەکان زانیاری پێویستیان دەربـارەی بـارودۆخی نـاو قەڵاکـەو ژمـارەی سـەربازەکانی لەبـەر دەستدانەبوو ئـەگینا وازیـان لەگـەمارۆدانی نـەدەهێنا لـەو دووجـارەی پێشوودا، بەڵام خێرا فەرەنـسیەکان بەئـەم جەنگـە دەرونییـەو مەبەستەکانیان زانـی، بۆیـەبۆ جاری سێیەم گەڕانەوە بۆ گەمارۆدانی قەڵاکە بۆ لەمانگی شەعبانی سـاڵی ٤٩٤ك دا، بـەڵام ئـەو قازییە زانی کەفەرەنسییەکان بەشێوازە کۆنەکانیان زانیوە بۆیە پەنای برد بۆ شـێوازێکی نـوێ بۆ ڕوبەڕووبونەوەی فەرەنسیەکان ئەویش بەوەی: کەلەگەڵ گاورەکانی ناو قەڵاکەدا ڕێك کەوت لەسـەر ئـەوەی کەوەفـدێکیان بـڕوات بـۆ لای فەرەنـسیەکان بـۆ گفتوگـۆکردن سـەبارەت بەبەدەستەوەدانی قەڵاکەو ەناردنی کۆمەڵێك لەسوارەکانیان بۆ وەرگرتنی قەڵاکە، هـەروەها: سێ سەد کەس لەناودارو ئازاکانیان بنێرن، ئەوانیش بەمە ڕازیبوون وادیارە قازی ئیبن صلیحة بۆسەی بۆ دانابوون[3]: ئەوەبوو یەك لەدوای یەك بەگوریسەکەدا سەردەکەوتن، هەر کەیەکێکیان دەگەیـشتە لای ئـیبن صـلیحة دەیکوشـت، هـەتاوەکو هـەموویانی کوشـت، کاتـێ ڕۆژبوویـەوە سەرەکانی بۆ فڕێ دان[4]، سەرباری ئەمەش خاچپەرستەکان بەو چاڵ و داوەی کـەتێی کـەوتن و ئەو سەرکەوتنەی کەدژیان تۆمـارکرا وازیـان نـەهێنا، بـەڵکو بڕیاریـان دا بەهـەر نرخێك بوبێـت لەدەسـتی بـسێننەوە، ئـەوە بـوو بورجێکیـان لەتەختـە دروسـت کـردو چـەند بورجێکیـان لەبورجەکانی تێك دا، بەڵام بەهۆی ژیری و زیرەکی ئەو قازیەوە توانی دەرك بەو مەترسیە بکات کەڕوبـەڕوی بوەتـەوەو ئامـادەی خۆبەدەسـتەوەدان نـەبوو، بـەڵکو دەسـتی دایـە دانـانی نەخشەیەکی زیرەکانە، هاوشێوەی ئەو پلانە سەرکەوتوانەی کەپێشتر زیـانێکی زۆرو شکـستی توشی دوژمن کرد، ئەمجارەش هەوڵی دا دبۆ پەلکێش کردنی خاچپەرستەکان بۆ بۆسەیەکی تر کەبە شێوەیەکی تۆکمە بۆی دارشتبون، ئەوە بوو هەستابە کـونکردنی شـورای شار پێدەچێ

[1] موقف فيهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل١٢٠.

[2] الكامل في التأريخ لة موقف فيهاء الشام ل١٢٠.

[3] موقف فيهاء الشام قضاتها ل١٢٠.

[4] هەمان سەرچاوە ل١٢١.

لەدواوە بوبێت – ئەمەش وەك ئاسانکارییەك بۆ دەرچونی هەندێ لەسوپاکە،[1] کاتێ قازی ئیبن صلیحە لەگەڵ سوپاکەیدا لەدەرگاکانەوە هاتنە دەرەوە خۆی وەك شکستخواردو پیشان دا، ئەم فیلەش بەسەر دوژمنەکانیدا تێپەڕی و کەوتنە راوەدونانی بۆ ناوشوراکەلەوکاتەدا ئەو سەربازانەی کە لە کونەکانەوە هاتبونە دەرهێرشیان کردە سەر دوژمن و گەمارۆیاندان و گرتنیان بەم شێوەیە دوژمن هەلات،[2] دیارە قازی ئیبن صلیحە ئاگاداری هونەرەکانی جەنگ و هەندێ شێوازی سەربازی ئیسلامی بوە، چونکە شێوازی جەنگی دەرونی کەلەپوری سەربازی ئیسلامیدا لەسەردەمی خاچپەرستەکاندا، شتێکی نوێ نەبوو چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی خەندەق دا لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا بەکاری هێنا، کاتێ چاڵەکەی هەڵکەندو سوپای ئەحزابی تێکشکاند، بەهەمان شێوە لەجەنگی مۆتەشدا لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا، کاتێ سەرکردە خەلیدی کوڕی وەلید جەنگەکەی لە شکستەوە گۆڕی بۆ سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا، ئەمەش بەبەکارهێنانی جەنگی دەرونی لەڕێی تەپوتۆزکردن بەهۆی سوارەکانەوەو ڕۆمەکانیش واتێگەیشتن کەکۆمەکیان بۆ هاتوە بۆیە خێراهەڵاتن، پاشان سوپای ئیسلامی لەبەرەی جەنگ کشایەوە بێ ئەوەی هیچ زیانێکی توش ببێت، ئەم جەنگە دەرونیەش لەچەندین جەنگی تر دا پیادەکرد، جەنگی یەرموکیش لەساڵی ١٣ك یەکێك بوو لەوجەنگانە کاتێ هەستا بەدابەش کردنی هێزەکانی، بەشێوەیەك کەلای چەپی کرد بەڕاست و پشتەوەی کرد بەپێشەوە بەم تەکنیکە سەربازیەش سوپای زۆری ڕۆمی ترساندو توشی شکستی کردن.[3]

- **هاندانی خەڵك لەلایەن زاناو دادوەرەکانەوە بۆ جەنگ کردن لەبەرەکانی جەنگدا:** کەسایەتی دادوەر أبو الفضلی کوڕی خشاب دادوەری ناسراوی حەلەب لەم بوارەدا دەرکەوت کاتی گەمارۆی خاچپەرستەکان توندکرا لەسەر حەلەب لەساڵی ٥١٣ك/ ١١١٩ز دادوەر ئیبن الخشاب بەسەر ئەسپێکەوە هات و خەڵکی هان دەدا بۆ جەنگ کردن و ڕمێکی بەدەستەوە بوو وتارێکی کاریگەری بۆدان کە بوە هۆی بەرزکردنەوەی وره و هیمەتیان و گڕی بەردایە هەست و نەستیان و خەڵکی خستە گریان و بوە هۆی هەستانیان بۆ ڕوبەڕوبونەوەی داگیرکەران[4].

ئەوە چوو هەرچەندە حەلەبیەکان توانیان شارەکەیان ڕزگار بکەن لەهەمان ساڵدا بەڵام خاچپەرستەرکان دودڵیان نەنواند لەئەنجامدانی هێرشێکی نوێدا بۆ گێڕانەوەی حەلەب لەساڵی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٢١.

[2] الكامل في التأريخ (٨/٤٢٥).

[3] موقف فقهاء الشام وقضاتها ل١٢٢.

[4] هەمان سەرچاوە ل١٣٩.

٥١٨ك/ ١١٢٤ز ئەمەش کاتێك بوو کە هەستان بەتێکدانی گوندەکانی دەوروبەری حەلەب، هەتاوەکو یارمەتی شاری حەلەب نەدەن، فەرەنسیەکانیش چونە حەرِان و پاشان حەلەب لەلای مشهد الجف لەباکورەوە، ئیبن الخشابی دادوەریش رۆڵی هەبوو لەهاندان بۆرِووبەرِووبونەوەی ئەو هێرشە، تەنانەت رۆڵی هەبوو لەهاندانی ئەمیر ئەقسنقری برسقی ئەمیری موسڵ، ئەمەش لەکاتی باسکردنی رۆڵی ئەمیرە سەلجوقیەکان لەموسڵ و دیمەشق و شوێنەکانی تردا لەبەر پەرچدانەوەی هێرشی خاچپەرستەکانداروون دەکەینەوە بەپشتیوانی پەروەردگار.

## سێیەم: رۆڵی شاعیران لەبزاوتی بەرگریدا:

هەندێ لەشاعیران رۆڵێکی گەورەیان بینی لەهاندانی موسوڵمانان و وەسفکردنی بارودۆخی ئومەت و سروشتی هێرشی اچپەرستی کەولاتی داگیردەکردو ئابرِوی خەڵکەکەی هەڵدەماڵی، بەناوبانگترینی ئەو شاعیرانەش ئەوەیە کە هەرەوی قاضی و ئەشڵێن أبی مظفري ئەبیوەردی وتویەتی کەسەرەتاکەی:

مزجنا دماءً بالدموع السواجم ... فلم يبق منا عرضه للمراجم

وشر سلاح المرء دمع يفيضه ... اذا الحرب شبّت نارها بالصوارم

ئەو لەم پێشەکییەدا، باس لەگریانی خەڵکی دەکات بەشێوەیەك کەخوێن لەچاویان دەهاتە خوارەوە لەبەر بەردەوامی و زۆری هێندە گریان کەبواری لۆمەکردنیان نەهێشتەوە، بەلام زۆری نەخایاند هەتاوەکو دەرکی بەوە کرد کەگریان هەرچەندە زۆربێت، سودی نیە لەجەنگدا، چونکە تەنها شمشێری تیژ دەتوانێ ئاگری جەنگ خۆشبکات، لەو شیعرانەش:

فإيها بني الاسلام إن وراءكم ... وقائع يلحقن الذرا بالمناسم

أتهويمة في ظلّ أمن وغبطة ... وعيش كنّوار الخميلة ناعم

وكيف تنام العين ملء جفونها ... على هفوات أيقظت كلَّ نائم

واخوانكم بالشام يُضحي مقيلهم ... ظهور المذاكي أو بطون القشاعم

تسومهم الروم الهوان، وأنتم ... تجرون ذيل الخفض، فعل المسالم

لێرەدا شاعیر هاوار لەو کەسانە دەکات کە لەجەنگ دواکەوتون لەبرا موسڵمانەکانیان لەولاتی شام دا، بەم پارچە یەدەست دەکات بەئاراستەکردنی بانگەوازێکی گەرم بۆ موسڵمانان: ئەی رۆڵەکانی ئیسلام لەخەو بێداربن ئەو جەنگەی توشتان بووە سەربەرزتان سەر شۆردەکات پاشان سەرسامی خۆی بەرامبەر بەخۆیان و خەوەکەیان پێشان دەدات کەچۆن خەویان لێ دەکەوێت و بەخۆشی و هێمنی دەژین لەکاتێکدا کە لەتەنیشتیاندا خراپترین شت روودەدات و بەسەری براکانیان لەشام دەبارێ بەجۆرێك کاتیان نیە تیایدا بنون لەماڵەکانیاندا و هەموو کاتەکانیان لەجەنگدا

بەسەر دەبەن‌و دەجەنگێن‌و شەهیدیان دەستگیردەبێت‌و هەڵۆکانی ئاسمان ئەیانفڕێنن‌و جەستەیان دەشارێتەوە، لەوانەشە بکەونە ژێر دەستی دوژمنیان‌و سوکایەتیان پێ بکرێت، بەڵام ئێوە رابواردنتان پێوە دیارەو لەنازو نیعمەتدان، ئێوە موسڵمانن یان هاوپەیمانی دوژمنانن،

لەو شیعرانەش:

وكم من دماء قد أبيحت ومن دمى — توارى حياء حسنها بالمعاصم[1]

بحيث السيوف البيض محمرة الظبا — وسمرُ العوالي داميات اللّهاذم[2]

وبين اختلاس الطعن والضرب وقفة — تظل لها الولدان شيب القوادم

وتلك حروب من غيب عن غمارها — ليسلم يقرع بعدها سنّ نادم

سللن بأيدي المشركين قواضباً — ستغمد منهم في الطلا و الجماجم

يكاد لهن المستجنُّ بطيبة — ينادي بأعلى صوت، يا الَ هاشم

لەم دێرانەشدا وێنەی ئەو جەنگە توندەمان پێشان دەدات کە لەنێوان موسڵمانەکان‌و دوژمنە فەرەنسییەکانیاندا روویدا، ئەوە بوو خوێنی زۆرێك لەموسڵمانان رژێنراو پەلاماری ژنان لەماڵەکانیاندا درا و هیچیان دەست نەدەکەوت کە بەرگری پێ بکەن لەخۆیان جگە لەدەستیان کە لەشەرم‌و ترسدا بەرگری لەخۆی دەکرد، هەروەها ئەم جەنگانە توندتربوون‌و کوشتارتیایدا بەرادەیەك پەرەی سەند کەشمشێرو رمەکان سورو خوێناوی بوون، تەنانەت مێرد منداڵان سەریان سپی دەبو لەترسی لێدان‌و کوشتن،پاشان دەگەرێتەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسانی دواکەوتوو لەو جەنگە بەوەی کەپەشیمان دەبنەوە لەدوا کەوتنیان لەبەشداری کردن لەو جەنگانەدا، دوبارە دەگەرێتەوە بۆ باس کردنی مەترسییەکانی‌و لەپلەوپایەی دوژمنان‌و چەك‌و شمشێرە تیژە هەڵکێشراوەکانیان کەم دەکاتەوە لەکۆتایی ئەم دێرانەشدا ترسناکی ئەم جەنگانە دەخاتەروو بەجۆرێك کەپێغەمبەر (ﷺ) لەگۆری پاکیدا لەمەدینەی پیرۆز هانا بۆ عەرەب‌و موسڵمانان دێنت نەك تەنها بۆ تیرەی هاشم[3]:

أرى أمتي لا يشرعون إلى العدا — رماحهم، والدين واي الدعائم

ويجتنبون النار خوفا من الردى — ولا يحسبون العار ضربة لازم

أترضى صناديد الأعاريب بلأذى — ويغفي على ذل كماة الأعاجم؟

---

[1] نصوص من أدب عمر الحرب الصليبية عمر الساريسى ل٢٦٧.

[2] هەمان سەرچاوەل٢٦٧.

[3] هەمان سەرچاوەل٢٦٧.

فليتهم اذالـــــــم يذودوا حمية عن الدين ضنوا غيرة بالمحارم

وإن رهدوا في االأجر، اذحمى الوغى فهلا أتوه رغبة في الغنائم؟

هەروەها شاعیر ئازار دەچێژێت بەوازهێنانی هەندێ خەڵكی هۆزەكەی لەجیهادو پاڵدانەوەیان، لەگەڵ ئەمەشدا باسی واقعی لاوازیان دەكات بۆ سەرخستنی ئاین كەدوژمنان هەوڵی لاوازتركردنی دەدەن، ئەمەش بەهۆی ترس و تەماعو بێ ئاگایی لەوە نەنگیەی كەتوشیان دەبێت لەكاتی شكستدا، سەرسامی خۆشی بەرامبەر بەموسڵمانانی ئازاو بەجەرگ دەردەبڕێت لەعەرەب و عەجەم، كەچۆن بەم هەمووحاڵەتەوە روو دەكەنە بەرەكانی جەنگو پاشان هۆكارەكانی بەرگریكردن لەئاینو خاكیان بۆ فەراهەم دەبێت بەشێوازێكی لۆژیكیانەو ئازاردڵیان دەگوشێتو ناخیان دەهەژێنێتو داوای بەرگری كردن لەئاینیان لێ دەكات بەپلەی یەكەم ئەگەر ئەوەش نەیجوڵاندن بابەرگری لەماڵ خێزانو وڵاتیان بكەن، ئەمەش لاوازترین جۆری باوەڕە، كەگرنگی بەدونیاو كەلوپەلو دەستكەوتەكانی بدەن ئەگەر توانای تۆڵەسەندنەوە بۆ ئاینو جیهادكردن لەپێناویدا نەبوو! ! لەكۆتایی هۆنراوەكەشدا ئازار زۆری بۆدێنێتو ئایندەو داهاتوی خۆیانیان ئەخاتە پێش چاو كەچۆن دوچاوی سەر شۆری دەبنو منداڵو نەوەكانی داهاتوشیان ملكەچ دەبن ئەگەر رازی بن بەداگیركردنی وڵاتەكەیان لەلایەن دوژمنانەوە، پاشان هەڕەشەی نەنگی خۆبەدەستەوەدانی ژنانیان لێ دەكات ئەگەر بەو شێوەیە پاڵی لێ بدەنەوە دەسبەرداری جیهاد بن بەم شێوەیە شاعیر بەردەوام بانگەوازی دەكرد جەنگیش هەر بەردەوامبوو، هەتاوەكو دلێرانە پەلاماری دوژمنان بدەنو گورزێكی توند لەفەرەنجەكان بوەشێنن، وەك چۆن هەموو جارێك دوچاری بوون كاتێ كەهێرشیان كردبێتە سەر خاكی ئیسلام:

لئن أذعنت تلك الخياشيم للبُرى فلا عطستِ الا بأجدع راغم

دعوناكم والحرب تدعو ملحة الينا بألحاظ النسور القشاعم

تراقب فينا غـــــــارة عربية تطيل عليها الدوم غضّ الأباهم

فإن أنتم لــــم تغضبوا بعد هذه رمينا الى أعدائنا بالجرائم[1]

هەروەها شاعیرێكی تر دەربارەی هێرشی خاچپەرستەكان بۆ سەر بەیتو لمە قدیس ئەڵێ:

أحل الكفر بالإسلام ضيما يطول عليه للدين النجيب

فحق ضائع و حمى مباح وسيف قاطع ودم صبيب

وكم من مسلم أمسى سليبا ومسلمة لها حرم سليب

---

[1] الكامل في التأريخ(٨/ ٤٠٧).

وكم من مسجد جعلوه ديرا ... على محرابه نصب الصليب
دم الخنزير فيه لهم خلوق ... وتحريف المصاحف فيه طيب
أمور لو تأملهن طفل ... لطفل في عوارضة المشيب
أتسبي المسلمات بكل ثغر؟ ... وعيش المسلمين إذن يطيب
أما لله والإسلام حق؟ ... يدافع عنه شبان وشيب
فقل لذوي البصائر حيث كانوا ... أجيبوا الله، و يحكم، أجيبواس

•**شاعیر ئیبن خه یاط:** أبو عبدالله ئەحمەد کوڕی محمدی ئیبن لخیاط: ئـەم شـاعیرە هەوڵیدا هیممەتی عصب الدوله سەرکردەی سوپای دیمەشق بجوڵێنێت، بۆیـە لەهۆنراوەیـەکی درێـژدا هانیدا بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جیهادو لەسەرەتاکەیدا ئەڵێت:..................

فدتك الضواهل قبا وجردا ... وشم القبائل شيبا ومردا
وذلك لا سيافك البيض قضبا ... ودانت لأرماحك السمر ملدا

هەتا ئەوەی ئەڵێت: دەدێڕ شعره........ پاشان پـاش ئـەوەش کـە شـاعیر بـاس لـەبارودۆخی هاوەڵ گەران و توندوتیژیان دەکات و لەبەرامبەریشیاندا باسی موسڵمانەکان ددکـات و عـصب الدولـه هان دەدات بۆ جیهاد:

فحاموا عن دينكم و الحريم ... محاماة من لايرى الموت فقدا
وسدوا الشغور يطعن النحور ... فمن حق ثغر بكم أن يسدا
فقد أينعت أروس المشركين ... فلا تغفلوها قطافا و حصدا
فلا بد من حدهم أن يفل ... ولابد من ركنهم أن يهدا

هـەروەها هـەوڵی زانایـان و دادوەرو ئـەدیب و شـاعیران کاریگـەری خـۆی هـەبوو لەبـەهێزبوونی بزوتنـەوەی بـەرگوی چـەکداری کەئـەمیرەکانی سـەلجوقی سـەرکردایەتیان دەکـردو لەلاپـەڕەکانی داهاتوودا بەپشتیوانی پەروەردگار باسی لێوەدەکەین.

**چوارەم: سەرکردەکانی جیهاد لەناو سەلجوقییەکاندا پێش عیماد الدین زەنگی:**

یەکێك لەراستیە بەڵگە نەویستەکانی مێژووی خاچپەرستی ئەوەیە کەبزاوتی جیهادی ئیسلامی دژبـە خاچپەرسـتەکان یەکـەم جـار لەرۆژهەڵاتـەوە سـەری هەڵـداو بەتایبـەت لەناوچـەی جەزیرەدا،چونکە کەوتۆتە نێوان دیجلەو فوراتـەوە، ئـەم ناوچـەیەش بـەوە ناسـراوە کـەئاو هـەوای پاکەو بەپیت و بەرەکەتەو خێرو بێری‌زۆرە، شاری گەورەو شورای تۆکمـەو قـەڵای زۆری تیایـە(٣). ئەو هۆکارانەش کەوایکردوە بزوتنەوەی بەرگری لەم ناوچەیەدا سەرهەڵبدەدات ئەمانەن:

- ناوچەی جەزیرە یەکەم وڵاتی موسڵمانانە لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کە بەئاگری جەنگی خاچپەرستەکان سوتابێت کاتێ کەدەستیان گرت بەسەر ئەلرەهاداو یەکەم میرنشینی خاچپەرستیان لەساڵی ٤٩٠ك/ ١٠٩٧ز دامەزراندو دانیشتوانیش لەمەترسی بوونی خاچپەرستەکان لەوڵاتەکەیاندا گەیشتن‌و ئەمەش وای کرد لەموسڵمانان دەستپێشخەر بن بۆ هێرشکردنە سەر خاچپەرستەکان.
- ناوچەی جەزیرە هەر لەسەرەتایی ئیسلامەوە کەسایەتی خۆی سەلماند، بەهۆی دراوسێییەتی لەگەڵ سنورەکانی دەوڵەتی بیزەنتیدا، ئەمەش مەترسییەکی گەورەی لەسەر موسڵمانان دروست کرد لەسەردەمی عەباسی‌و ئەمەوییەکانداو بوو بەسەنگەری یەکەمی بەرگری سنوورەکانی ئیسلام دژ بەرۆمەکان، دوای شاڵاوی خاچپەرستیش ناوچەی جەزیرە روبەروی میرنشینی رەهای خاچپەرست بوویەوە کەگەورەترین مەترسی بوو لەسەر خەلافەتی عەباسی لەبەغدا.
- لەسەدەی پێنجەمی کۆچی‌و یازدەیەمی زاینیدا ناوچەی جەزیرە هاتنی تورکە سەلجووقییەکانی بەخۆوە بینی، لەگەڵ ئەو خۆشەویستییەی کەپێی ناسرابوون بۆ پەروەردەکردنی ئەسپ‌و سەرکێشی کردن‌و دڵگەرمیان بۆ ئیسلام بەهۆی تازە موسڵمان بوونیان ئینتمایان بۆ مەزهەبی سوونني، سەلجوقییەکان خوێنێکی تازەیان کرد بەبەری ناوچەی جەزیرەدا کەدڵگەرمییەکی بێ وێنەی هەبوو بۆ جیهادکردن لەپێناو خوادا، بەپێچەوانەی هێزە ئیسلامییەکانی تر لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کەبڵێسەی حەماسەتی ئاینی لەدەرونیدا کپ بوبویەوەو گیانی رووبەروبونەوەی تیادا لاوازبووبوو[1].
- ئەو سامانە زۆرو داهاتە فراوانەی کە لەناوچەی جەزیرەدا هەیە بەهۆی بوونی سەرچاوەکانی ئاوو یەپیتی زەوی‌و فراوانی روبەرە کشتوکاڵییەکان‌و زۆری لەوەرگەی پێویست بۆ ئەسپ‌و مەروماڵات، ئەمەش توانای سەرخستن‌و یارمەتیدانی موجاهیدەکانی پێ بەخشی کردیە سەرچاوە بۆ ئازوقەو کەرەستەی جەنگ، ئەمە لەگەڵ ئەو تۆکمەیی‌و قایمکاریە سروشتییەی شارە گەورەو قەڵاکانی جەزیرە لێی بەهرەمەندن کەبزاوتی جیهادی ئیسلامی تیایدا سەری هەڵدا وەك موسڵ‌و ئامێدی‌و ماردین‌و قەڵای کیفاو شارەکانی تر، هەروەها ئەم شارانە لەپشتیوانییەکی سروشتی کەم وێنە بەهرەمەندن کە داگیرکردنیانی زۆر سەخت کردبوو، بەم جۆرەش پارێزراوبوون لەدژە هێرشی خاچپەرستەکان، لەوانەشە بوونی میرنشینی رەهای

[1] الأمارات الأرتقية في الشام والجزيرة ل ٢٠١.

خاچپەرست لەجەزیرەداو ئەو مەترسییە گەورەی کەهەیبوو لەسەر دەسەڵاتیان وێڕای مەترسیان لەپێشڕەوی کردنی خاچپەرستەکان بەرەو باشور بۆ لەناوبردنی خیلافەتی عەباسی لەبەغدا[1] هۆکار بوبێت بۆ زیندووکردنەوەی بیرۆکەی جیهاد لەدڵی سەرکردەکانی جیهاد لەو ناوچەیەدا. لێرەشەوە سەیرنییە ئەگەر بیرۆکەی جیهادی ئیسلامی لەم ناوچەیەدا سەرهەڵبدات بەمەبەستی سەندنەوەی ناوچەی ڕەها لەدەستی خاچپەرستەکان[2].

١- **جیهادی قوام الدولە "ڕاگری دەوڵەت" کربۆقای دەسەڵاتداری موسڵ:** بیرۆکەی بەرگری ئیسلامی لەساڵی ٤١٩ك/١٠٩٧ز چووە بواری جێبەجێکردنەوە ئەمەش کاتێ بوو قوام الدولە کربۆقا دەسەڵاتداری موسڵ هەستا بەکۆکردنەوەی ڕێژەیەکی زۆر سەربازو بەمەبەستی ڕێگری کردن لەڕوخانی ئەنتاکیە لەسەر دەستی خاچپەرستەکان، بەڵام کربۆقا ڕووبەڕووی وەستاو هەستا بەگەمارۆی ڕەهای بۆ ماوەی سێ هەفتە بەم شێوەیەش هەلێکی باشی بۆ خاچپەرستەکان ڕەخساند بۆداگیرکردنی ئەنتاکیەو هەر ئەمەش ڕوویدا، بەڵام ئەگەر کربۆقا ڕاستەوخۆ بەرەو ئەنتاکیە بڕۆشتایە ئەوەیاغی سیان شاری ئەنتاکیەی ئەدا بەدەستەوەو بارودۆخی گەمارۆ دراوەکان دەگۆڕا[3]، بەڵام کربۆقا گەمارۆی لەسەر ڕەها هەڵگرت کاتێ بیستی ئەنتاکیە داگیرکراوەو لەفورات پەڕیەوە بەرەو شامو لەمەرج دابقدا مایەوە، هەروەها دقاقی کوڕی تتشی دەسەڵاتداری دیمەشقو ظهیرالدین طفتکین أتابك دقاقیش لەوێ بوون، لەگەڵ جناح الدولە حسێن فەرمانڕەوایی حمصو ئەرسەلان تاشی فەرمانڕوای شنگارو سەقمانی کوڕی ئەرتەق فەرمانڕوایی بیتزوالمقدسو چەند ئەمیرێکی تر لەوانەی کە هاو شێوەیان لەلێهاتوویی‌و ئازایەتیدا نەبوو وەك ئیبن کیثر دەڵێت[4]: هەروەها سەرجەم ئەمیرەکان چوونە ژێر فەرماندەی کربوق ئەویش بەرەو ئەنتاکیە بەڕێ کەوت لەساڵی ٤٩١ك/١٠٩٧ز کەتا ئەوکاتەش قەڵاکەی بەدەست موسڵمانانەوەبوو، ئەوەبوو توانیان لێی نزیك بنەوەو گەمارۆی لەسەر توندبکەنو ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر خاچپەرستەکان‌و بارودۆخی بەرەو خراپی بردن، چونکە خۆیان لەنێوان دوو گەمارۆی دەرەکی‌و ناوخۆییدا دەبینیەوەو ئەمەش ڕووبەڕووی قەیرانێکی توندی کردنەوە بەهۆی کەمی ئازوقەوەو ناچاری

---

[1] الجهاد ضد الصليبين في الشرق الأسلامي ل ١٣٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٣٨

[3] هەمان سەرچاوە ل ١٣٨

[4] الكامل في التأريخ (٨/٤٠٠).

کردن پەنابەرن بۆ خواردنی پاشە ڕۆو گەڵای درەخت[1]، هەروەها ناچاری کردن کەوەفدێك بنێرن بۆ لای کربۆقاو داوای پەنادانی بکەن هەتاوەکو ئەنتاکیە بەجێبهێڵن، بەڵام کربۆقا داواکەیانی ڕەتکردەوەو وتی: بەشمشێر نەبێ دەرناچن[2]. ئەمەش پاڵی بەیەکێك لەپیاوانی ئاینی گاورەوە نا هەتاوەکو چیرۆکی جەنگی پیرۆز هەڵببەستێو بووە هۆی ئەوەی کەورەی خاچپەرستەکان بەرزبکاتەوەو لەدەوری سەرکردەکانیان کۆببنەوە، ورە بدەنە بەر خۆیان بۆ هێرشبردنە سەر موسڵمانەکانو دەستە دەستە دەرچوونو بەپەری هێزەوە پەلاماری موسڵمانەکانیانداو توانیان شکستیان پێ بێننو بڵاوەیان پێ بکەن[3]. بەم جۆرە کربۆقا سەرکەوتوونەبوو لەسەرکردایەتی ئەو هاوپەیمانێتییە ئیسلامییەدا کەویستی بەهۆیەوە ڕێگری بکات لەداگیرکردنی ئەنتاکیە لەلایەن خاچپەرستەکانەوە لەساڵی ٤٩١ك/ ١٠٩٧ز.

هەروەها مێژوونوسان باس لەهۆکارەکانی شکست هێنانی کربۆقا دەکەن لەکاتێکدا کەخاچپەرستەکان گەیشتبوونە ئەوپەری لاوازیو شڵەژان لەناو ئەنتاکیەدا. لەو هۆکارانەش:

- ئەوەی کەمێژوونوسە فەرەنسییەکان باسی دەکەن کە کربۆقای فەرمانڕەوای موسڵ سێ هەفتەی لەکیسدا لەگەمارۆدانی ئەڵڕەهادا ئەمەش ڕێخۆشکەربوو بۆ خاچپەرستەکان هەتاوەکو ئەنتاکیە داگیربکەنو خۆیان ئامادەبکەن بۆ هەر هێرشێك کە لەوانەیە بکرێتە سەریان چ لەلایەن موسڵمانانی تاو قەڵاکەوە یاخود لەلایەن براکانیان لەوڵاتی شامو شوێنەکانی تردا[4].

نەبوونی هەماهەنگی لەنێوان هێزەکانی کربۆقادا کە لەعەرەبو تورکو خەڵکانی تریێك هاتبوون، پاشان ئەوەی کەرضوانی فەرمانڕەوای دیمەشق پێی هەستا لەبڵاوکردنەوەی ناکۆکی لەنێوان عەرەبوتورکدا.

- نەبوونی پلانێکی سەربازی ڕوونو ئاشکرا لای کربۆقا، ڕونترین بەڵگەش لەسەر ئەمە ڕێنەدانی کربۆقا بوو بەلێدانی یەکجارەکی خاچپەرستەکان، کاتێ کە دەستە دەستە لەئەنتاکیە دەرچوون، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەکربۆقا پێی وابوو بەکارەی تەنها پێشەکی ئەو سوپایە لەناودەبات[5].

---

[1] الكامل في التأريخ (٨/٤٠٠).

[2] الكامل في التأريخ (٨/٤٠٠).

[3] الكامل في التأريخ (٨/٤٠٠).

[4] تأريخ الحرب الصليبية (٣/٣٢٨).

[5] هەمان سەرچاوە (٢/٣٥٠).

● خراپی مامەڵەی کربۆقا لەگەڵ ئەو ئەمیرانەی کەلەگەڵیدابوون، هۆکارێکە لەهۆکارەکانی شکست هێنان و روخانی ، ئەوەبوو جۆرێك خۆبەزلزانینی تیادا بەدی دەکرا، چونکە وایدەزانی بەوشێوەیە لەگەڵیدا هەڵدەکەن ئەمەش بووە هۆی بێزاربوونیان لەهەڵسوکەوتی[1].

● بەرزبوونەوەی لایەنی مەعنەوی و ورەی خاچپەرستەکان دوای هەڵبەستنی چیرۆکی جەنگی پیرۆز، ئەمە جگە لەو کارەی کەخاچپەرستەکان پێی هەستان پێش گەیشتنی کربۆقا بۆ ئەنتاکیە کاتێ سەرکردەکانیان هەستان بەنامە ناردن بۆ دقاقی فەرمانڕوایی دیمەشق و ئاگاداریان کردەوە کەتەنها ئەو شوێنانەیان مەبەستە کەپێشتر بەدەست ئیمپراتۆریەتی بیزەنتییەوەبوو لەوڵاتی شام[2]، ئەمەش رێگرنییە لەبەردەم ئەوەدا کەبڵێین ئەو هەوڵەی کربۆقا بۆ پارێزگاری کردن لەئەنتاکیە خاڵی دەستپێك بوو بۆ زیندوکردنەوەی بیرۆکەی جیهادی ئیسلامی دژ بەخاچپەرستەکان هەروەك بەهێزی موسڵمانانی بۆ خاچپەرستیان سەلماند لەحاڵەتی یەککرتنیانداو رێگەی راستی دیاری کرد بۆ ئەو سەرکردانەی کەدوای خۆی هاتن و بەرزکردنەوەی ئاڵای جیهاد یان کردە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەتاوەکو درێژە بەوکارەی ئەو بدەن، ئەم راستیەش بەرجەستەتر دەبێت ئەگەر بزانین کەعمادالدین زەنکی خۆی لەژێر چاودێری کربۆقادا ژیا دوای مردنی باوکی[3] بەڵام کربۆقای فەرمانڕوای موسڵ مەرگ یەخەی پێ گرت لەشاری خوی ئازەربایجان لەساڵی ٤٩٥ك/ ١١٠٣ لەکاتی ئەو ناکۆکییەدا کەکەوتە نێوان سوڵتان برکیاروق و کوڕی مەلکشاو براکەی محمدی کوڕی مەلەکشادا، بەم شێوە موسڵ چۆڵ بوو لەیەکێك لەو سەرکردانەی کەناکۆکی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا نەیتوانی کارکردنی بۆ زیندووکردنەوەی بیرۆکەی جیهادی ئیسلامی دژ بەخاچپەرستان لەبیربەرێتەوە[4].

٢- **جیهادی جکرمشی فەرمانڕەوای موسڵ و سقمانی کوڕی ئەرتەق فەرمانڕەوای ماردین و دیاربەکر:** ردنی ئەتابەکی موسڵ کەربۆقا گۆمەکەی شڵەقاندو بوو بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی ناوخۆیی، چونکە کەربۆغا وەسیەتی کردبوو کەدوای خۆی سونقرجەببێت بەفەرمانڕەواو داواشی کرد لەتورکەکان کەگوێرایەڵی بکەن، بەڵام موسای تورکمانی لەقەڵای کیفا کەوتە ململانێ لەگەڵیدا، دوای ئەوەی ناودارانی موسڵ بانگهێشتیان کردو توانی

[1] الجهاد ضد الصليبين ل ١٤٠.

[2] الجهاد ضد الصليبين.

[3] الجعاد ضد الصليبين ل ١٤٠

[4] دول الأسلام للذهبي (٢/٣٥٠).

ركابەرەكەی بكوژێ وەك جێگری سوڵتان بركیاروق[1]. هەروەها شمس الدولە جكرمێش فەرمانڕوایی جزیرەی ئیبن عومەر ئەم ناكۆكیەی قۆستەوە بۆ دەست وەرداتە ناو ململانێ ناوخۆییەكان ئەوەبوو بەرەو نصبین بەرێ كەوتو دەستی بەسەردا گرت،موسی ش بەرەو موسڵ هەڵاتو پاشان لەوێ خۆی قایم كردو لەوێ جكرمش بۆ ماوەیەكی دورودرێژ گەمارۆی داو موسی ش ناچاربوو پشت ببەستیت بەسقمانی ئەرتەقی لەدیاربەكرداو پێشنیاری پێدانی قەڵای كیفای بۆ كردو دە هەزار دیناری پێدا، لەبەرامبەر یارمەتی دانیدا، سەقمانیش ئەم پێشنیارەی قبوڵكردو یارمەتی سەربازی پێشكەش كرد، جكرمشیش ناچاربوو كەگەمارۆی سەر موسڵ هەڵگرێت، كاتێ موسا دەرچوو بۆ پێشوازیكردن لەسەقمان، هەندێ لەخزمەتكارەكانی لەرێگادا كوشتیان و سوپاكەشی پەرتەوازەبوو، سەقمانیش بەپەلە گەڕایەوە بۆ قەڵای كیفاء دەستی گرت بەسەریدا لەهەمان كاتتدا جگرمش بەرەو موسڵ پێشڕەوی كردو چووە ناویەوە خەڵكەكەشی بەخۆشحاڵییەوە بەخێریان هێنا[2]. جكرمش بوو بەفەرمانڕوای میرنشینی موسڵ لەساڵی ٤٩٥ك-٥٠٠ك/ ١١٠١-١١٠٦ز داو بووە هاوپەیمانی سەقمانی كوڕی ئەرتەق ئەمیری ئەرتەقەكان لەدیاربەكردا، مەبەست لەم پەیمانیەش پێی بەرەنگاربوونەوەی پێشڕەوی خاچپەرستەكان بوو لەرۆژهەڵاتەوە بەئاراستەی ناوچەكەری جەزیرە، ئەوەبوو ئەو سەركەوتنە خێرایانەی كەخاچپەرستەكان بەدەستیان هێناو ئارەزووی دەست گرتنیان بەسەر حەڕاراندا دەگەیەنێت نێوان چوار رێبیانێك بەرەو عێراقو جەزیرەو شام، بەسوود وەرگرتن لەناكۆكی نێوان ئەمیرە موسڵمانەكان، سەرباری ئەوەی كە لەدەستگرتن بەسەر حەڕاراندا وەردەگیرێت لەبچرانی پەیوەندی لەنێوان موسڵمانان لەوڵاتی فارسو عێراقو جەزیرەو شامو بەخشینی هەلێكی تر بەخاچپەرستەكان بۆ هێرش كردنە سەر موسڵو هێوركردنەوەی رەهاو دەستگرتن بەسەر هەرێمی جەزیرەدا، ئەم هەموو هۆكارە كاریگەری تەواویان هەبوو بۆ وەلانانی ناكۆكییەكان لەنێوان جكرمشو سقمانداو كاركردن پێكەوە بۆ وەستانی پێشڕەوی خاچپەرستەكان[3].

أ- **جەنگی بەلیخ و سەركەوتنی موسڵمانەكان بەسەر خاچپەرستەكاندا "كە بەجەنگی حەرارانیش ناوزەد دەكرێت"**: هەریەك لەجكرمشو سقمان بانگهێشتی یەكتریان كرد بۆ كۆبوونەوە بۆ خۆلادان لەمەسەلەی حەڕاران و هەتاوەكو بەیەكتری رابگەیەنن كەبڕیاریان داوە

[1] تأريخ الذنكسن في الموصل وبلاد الشام ل٦٢.

[2] هەمان سەرچاوە ل٦٣

[3] المقاومة الاسلامية الغزو الصليبي ل٩٥ عما الدين خليل.

خۆیـان ببەخـشن بـەخوا، ئـەوە بـوو بـەدەم یەکـەوە هـاتن‌و لـەخاپووردا لای راس العـین کۆبوونەوەو هاوپەیمانێتتەکەیان توندوتۆڵ کرد بەدەهەزار سواری تـورك‌و کـوردو عەرەبـەوە کەوتنە رێ بۆ رووبەرووبوونەوەی زەها پێش ئـەوەی هێرشیان بکرێتـە سـەر، کاتـێ بلـدوینی دوەمیش ئەمیری رەها هەواڵی کۆبوونەوەیانی بیست هانـای بـرد بـۆ جوسلین بـۆ هیمۆنـدو داوای کۆمـەکی لێ کـردو پێشنیاری کـرد کەئاراستەی هێرشـەکە بگـۆرن بـەوەی کەهەسـتن بەهـەوڵێك بـۆ روبەروبوونـەوەی حـەڕاران، دوای ئـەوەش کەبلـدوین پاسـگایەکی بـچووکی هێشتەوە لـەرەهادا بـەرەو حـەراران کەوتـە رێ بەسـەرۆکایەتی کۆمـەڵێکی کـەم سـوارەو ئەرمەنـەکان، لـەنزیك حەرارانیـشدا هەریـەك لەجوسلینی ئـەمیری تـەل باشرو بۆ هیمۆنـدی ئـەمیری ئەنتاکییـەو تـانکردی خوشـکەزای‌و بـەتریارکی ئەنتاکییـەو سـوپایەك کەسـوارەو فەرمانـدەکانی خاچپەرسـت‌و ژمارەیـەکی زۆر لەئەرمـەن‌و پیـاوانی ئـاینی هاتنـە پـاڵی، کەژمارەیە دەگەیشتە سێ هەزار سوارو سـێ هێنـدەی ئـەم ژنارەیـە پیادە لەواقعیشدا ئـەم سوپایە ئەو هێزە لێدەرو ئامادەو تەواوە بوو کەخاچپەرستەکان لەباکوری شـامدا هـەیانبوو، جگە لەپاسگای شوراکان، کاتێ ئـەم سـوپایەش کۆبوویـەوە لەبـەردەم حەڕاراندا جکرمش‌و هاوپەیمانەکەی هێشتا بەرەو رەها دەهاتن[1].

ئەوەبوو زۆری نەمابوو خاچپەرستەکان دەست بگرن بەسـەر حەڕاندا، دوای ماوەیـەکی کـەم لەئابلۆقەدانی، بەڵام ئەو ناکۆکییـەی کەلـەنێوان بلدوین بـی بـورو بوهیمۆنـددا روی‌داو سوربوونی هەریـەکێکیان لەسـەر هـەڵکرتنی ئاڵاکـەی لەسـەر ئـەو شـارە دوای دەسـت بەسـەراگرتنی، یارمەتیدەربوو بۆ خۆراگرتنی حەڕان‌و هەلی رەخساند بۆ موسڵمانان هەتا وەکو بکەونە جموجۆڵ بۆ جـەنگ کـردن دژی خاچپەرسـتەکان پـێش لەدەسـتدانی ئـەو شـوێنەی کەبەدەسـتیانەوەبوو، روبوروبوونەوەش لەنێوان هـەردوولادا لەسـەر روبـاری بـەلیخ روویدا لـەنوێ شـەعباندا، موسـڵمانان خۆیان وەك شکستخواردو پیشاندا، خاچپەرستەکانیش نزیکـەی دوو فەرسـەخ شـوێنیان کـەوتن، پاشان هێرشیان بۆ هێنانەوەو زۆرینـەی سـوپاکەیان لـەناوبردن[2] وریێژەیـەکی زۆر موڵك‌و سـامانیان دەسـکەوت[3]، هـەروەها بوهیمۆنـدی ئـەمیری ئەنتاکییـەو تـانکردی خوشـکەزای بۆسـەیان دانـابوو هـەتاوەکو لەپـشتەوە بـدەن بەسـەر موسـڵمانەکاندا لـەکاتی گـەرم بـوونی جەنگدا، کاتـێ هاتنـە

---

[1] الحروب الصليبية وسمات (٣/٧١/٧٢) المقاومة الاسلامية للغزو الصليبي ل٩٦.

[2] المقاومة الاسلامية للغزو الصليبيل٩٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

دەرەوەو بينييان هاورێكانيان شكستيان هێناوەو سەربازگەكەيان تالان كراوە، لەشوێنەكانى خۆياندا بەشەو مانەوەو پاشان دزەيان كردو هەلاتن، موسلمانەكانيش شوێنيان كەوتنو ژمارەيەكى زۆريان لەهاورێكانيان كوشت، بەلام ئەم دوو كەسە توانييان دەربازبنو بگەرێنەوە بۆ رەها، بەلام بلدوينو جوسلين بەديل گيران پێشتريش بلدوين لەگەل كۆمەلێك لەفەرماندەكانيدا هەلاتبوون لەكاتێكدا كە ويستيان لەدەرياى بەليخ بپەرنەوە، بەلام قورو ليتە بووە رێگريانو دەرەنجام سەركردەيەكى توركمانى لەهاورێكانى سقمان پياياندا گەشتەوەو توانى بەديليان بگرێتو بەلدوينى برد بۆ سەقمانى سەركردەى[1].

ب- **ناكۆكى نێوان جكرمشو سقمان:** كاتێ هاوەلانى جكرمش بينيان هێزەكانى سەقمان دەستيان گرتووە بەسەر بەشى زۆرى دەسكەوتى خاچپەرستەكاندا وتيان بەسەركردەكەيان: ئەگەر بەو هەموو دەسكەوتەوە برۆنەوە ئێمە لاى خەلك چى بلێينو چيمان پێ دەلێن؟! بۆيە پێشنيارى فراندنى بلدوينيان لاخۆشەويست كرد، جكرميشيش هەندێك لەهاورێكانى ناردو توانيان ئەميرە خاچپەرستەكە لەسەربازگەى سەقماندا بفرێنن، كاتێ سەقمان بەمەى زانى، لەوكاتەدا لەوێ نەبوو) زۆر بەلايەوە قورسبوو، بۆيە هاورێكانى خۆيان ئامادەكرد بۆ جەنگ، بەلام ئەو پاش كەمێك گێرانەوە ووتى: نامەوێ بۆ دامركاندنەوەى تورەييم دوژمنانى موسلمانان دلخۆش بكەم[2]، پاشان بەسەركردايەتى هێزەكانى كەوتەرێو چەكو ئالاى خاچپەرستەكانى بردو جلو بەرگەكانى كردە بەر سەربازەكانىو سوارى ئەسپەكانيانى كردنو هات بۆ هەرێمى شبختان لەدياربەكردا ئەوەبوو خاچپەرستەكان بەجێيان هێشت، چونكە وايان دەزانى لەخۆييانو سەركەوتوون سقمانيش روبەرويان بوويەوەو لەناوى بردنو هەلى كوتايە سەر قەلاكانيان، بەم شێوەيە توانى دەست بگرێت بەسەر ژمارەيەك لەقەلاكانى ناوچەكەدا پاشان گەرايەوە بۆ بارەگاى مىرنشينەكەى لەدياربەكردا[3].

ج- شكستخواردنى جكرمش: جكرمش برپيارى بەردەوام بوونى لەسەر جەنگ كردندا دواى گەرانەوەى هاوپەيمانەكەى هەروەك هەستا بەپەلاماردانى قەلاكانى خاچپەرستان لەهەرێمى شبختان دا كەتاكو رۆژهەلاتى رەها درێژ دەبێتەوە، پاشان بەردەوام بوو لەپێشرەويكردن بەرەو رەها، ئەوەبوو پەلەنەكردنى خاچپەرستەكان بووە هۆى هێشتنەوەى حەران بەدەستى موسلمانەكانەوە، رەهاش بەهۆى هێواش جولانەوەى موسلمانەكانەوە بەدەست گاورەكانەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٩٧.

[2] الكامل في التأريخ (٨/٤٦٦).

[3] هەمان سەرچاوە (٨/٤٦٦) المقاومە الأسلاميە الغزو الصليبي ل٩٧.

مایەوە، چونکە بواری دا بەتانکرد هەتاوەکو ئامێرەکانی بەرگری چاك بکاتەوەو بەم شێوەش توانی یەکەم هێرش بەرپەرچ بداتەوە کەجکرمش پێی هەستا، ئەمەش بەزۆری ئەگەرێتەوە بۆ ئەو ئازایەتیو ئەمەکداریەی کەئەرمەنو خەڵکی ناوچەکە نواندیان، بەڵام ئەو فشارە زۆرەی کەتانکرد هەستی پێ کرد، ناچاری کرد کەپەنابەرێت بۆ بۆهیمۆند لەگەڵ ئەوەشدا کەبوهیمۆند رویەروی کێشەی زۆر بووبویەوە، بەڵام پێی باش بوو مەسەلەی بەرگری کردن لەرەها پێش بخات بۆیە هەستا بەیارمەتی دانی خوشکەزاکەی، بەڵام خراپی رێگاوبان بووە رێگر لەبەردەمیداو تانکردیش زۆر نائومێدبوو فەرمانی دا بەپیاوانی پاسگاکە کەبچنەشوێنەکانیانبۆ هێرش کردن لەبەرامبەریاندا ئەوەبوولەتاریکی شەودا هەڵیان کوتایە سەر تورکەکان لەکاتێکدا کە لەخەوێکی قوڵدابوون، بەگەیشتنی بۆهمۆندیش سەرکەوتنی خاچپەرستەکان بەدی هاتو جکرمشیش بەترسەوە هەڵهاتو لەپاش خۆی سەربازگەکەی بەجێ هێشت کەپڕبوو لەسەروەتو سامان بەم شێوەیەش فەرەنجەکانیش تۆڵەی شکستی حەڕانیان کردەوەو توانیان پارێزگاری لەرەهابکەن لەو دیلانەش کەکەوتبوونە دەست تانکرد کچە شازادەیەکی سەلجووقی بوو لەخانەوادەی جکرمش، جکرمشیش هێندە رێزی لەو خاتوونە گرت، کەبڕێکی زۆر پارەی دا بۆ ئازادکردنی کەدەگەشتە نزیکەی ١٥هەزار بیزنت، یان گۆرینەوەی بەخودی کۆنت بلدوین، ئەوەبوو هەواڵی ئەم پێشنیارە گەیشتە بەیتولمەقدیسو بەلدەوینی پاشاش خێرا نامەیەکی نوسی بۆ بۆ هیمۆند کەئەم هەلە لەدەست نەدات هەتاوەکو بەلدوین رزگاری ببێت، بەڵام بۆهیمۆندو تانکرد پێویستیان بەپارەبوو، هەروەها گەڕانەوەی بەلدوینیش تانکردی لەکارەکەی دورخستەوە، چونکە وەك دەسەڵاتداری رەها- دەبوایە بگەرێتەوە بۆ ئەنتاکییە، بۆیە وەڵامیان بۆ نامەکەی پاشا بلدوین بەم شێوەیەبوو: هیچ دبلۆماسیەتێکی تێدانییە کەپەلەبکەن لەپەسەندکردنی پێشنیارەکەدا، چونکە ئەگەر دوو دڵی بنوێنن رەنگە جکرمش ناچاربێت فیدیەکە زیاتربکات، لەو کاتەشدا لەگەڵ جکرمیشدا رێك کەوتبوون لەسەر رازیبوون بەو برە پارەیەو هەر بۆیە بلدوین لەزینداندا مایەوە[1].

د- ئەنجامەکانی جەنگی بلیخ یان حەڕان: جەنگی بلیخ دەرەنجامی گرنگی هەبوو لەسەر ئاستی ئیسلامیو خاچپەرستیدا کەگرنگترینیان:

[1] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبيي ل٩٩.

●پێشڕەوی خاچپەرستەکانی وەستاند بەئاراستەی ڕۆژهەڵات لەسەر حسابی موسڵمانەکان‌و بێ ئومێدی کردن لەپێشڕەوی کردن بەرەو عێراق‌و دەستگرتنیان بەسەر هەرێمی جەزیرەدا. خەونەکانی بوهیمۆندی لەناوبرد بۆ دەست گرتن بەسەر حەلەبداو کردنی ئەنتاکیە بەدەوڵەتێکی گەورەو خاچپەرستەکانی بێ ئومێدکرد بەرامبەر بە بچڕانی پەیوەندی نێوان موسڵمانەکان لەشام‌و جەزیرەو ئاسیای بچووکدا لەرێگەی دەستگرتن بەسەر حەلەبدا.

●چارەنوسی شارەی ڕەهای دیاریکرد، چونکە ئەم ئیمارەتە روبەروی چەندین ناکۆکی‌و کێشەی ناوخۆیی بویەوە کەبووە هۆی لاوازکردنی بەتایبەت لەلایەن ئەرمەکانەوە، کەهەرزوو بێزاریان دەربڕی لەدەسەڵاتی لاتینی لەبەر توندی ئەوان بەرامبەر بەکڵێسای ئەرمەنی‌و دەربەدەرکردنی پیاوانی ئەمەش وایکرد لەئەرمەنەکان کەپەیوەندی بکەن بەتورکەکانەوە ئەگەری روخانی رەها لەسەردەستی موسڵمانەکان نزیك بوویەوە[1].

●هەلی گێرانەوەی ئەو موڵکانەی بۆ موسڵمانان رەخساند کەپێشتر لەدەستییان دابووو خرابوویە سەر میرنشینی ئەنتاکییە.

●تانکرد دوای بەدیلگرتنی بلدوین بو بەفەرمانڕەوای ڕەها، بۆهیمۆندیش بوو بەبەهێزترینئەمیری خاچپەرست لەباکوردا.

●ئەم سەرکەوتنە بووە هۆی نزیك بوونەوەی زیاتری هێزە ئیسلامی‌و بیزەنتییەکان دژ بەدوژمنی هاوبەشیان ئیبن القلانسی ش مەترسی دەرەنجامەکانی روون دەکاتەوەو دەڵێت: ئەمە سەرکەوتنێکی باش بوو بۆ موسڵمانان، کە هاوشێوەی نەبوو فەرەنجەکانی لاوازکردو ژمارەیان کەم بوویەوە، مەترسیان نەماو دەرونی موسڵمانەکانی بەهێزکردو هیمەتی جوڵاندن بۆ سەرخستنی ئاین‌و جیهادکردن دژ بەبێ باوەڕان‌و خەڵکی مژدەی شکستهێنانیان دەدا بەیەکترو دڵنیابوون لەلێدان‌و هەرەسهێنانیان.

●ئەو ئەفسانەیەی بەدرۆخستەوە کەدەڵێ خاچپەرستەکان ناشکێن[2].

●ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەلکسیوس هەلی لاوازبوونی دەسەڵاتی بۆ هیمۆندی قۆستەوە پاش ئەوەی کەڕوبەڕوی ڕەخنە بوویەوە بەهۆی رزگار نەکردنی بلدوینی هاورێیەوە، وێرای پابەندبوونی بەورێککەوتننامانەی کەلەگەڵ ئیمپراتۆردا مۆری کردبوو کەدەستی دایە هاندانی ئەو ڕاپەڕینانەی کەدانیشتوانی قلیقیە پێی هەستان دژ بەفەرمانڕەوا نورمانەکانیان، هەروەها

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل ٦٥.

[2] هەمان سەرچاوە ل٦٥.

فرمانی دا بەهێزەکانی کەدەستگرن بەسەر چەند شارو پێگەیەك کەپێشتر تانکرد دەستی بەسەردا گرتبوو، گەشتیگەلی بیزەنتیش بەشداربوو لەدەستگرتن بەسەر هەندێ شاری کەنار دەریادا وەك لادقیەو طرطوس، سەرباری ئەمەش بیزەنتیەکان توانیان سود لەبنکە دەرياييەکانیان لەقبرسدا وەرگرن بۆ پێشکەش کردنی یارمەتی بەریمۆندی ضجیلی– دوژمنی سەرسەختی بۆهیمۆند–کەهەوڵی دەدا بۆ دامەزراندنی میرنشینێك بەدەوری تەرابلوسدا لەتەنیشت ئەنتاکییەوە لەباشورەوە لەکاتێکدا کەکەس لەقودسەوە نەرۆیشت بۆ یارمەتی دانی بۆهمۆند بۆ تێپەراندنی ئەو کێشەیە[1].

بەم شێوەیە دانرابوو بۆ جکرمش کەبەهۆی هاوپەیمانێتی لەگەڵ سقماندا، رۆڵێکی ترسناك بگێرێ لەمێژووی جەنگەکانی خاچپەرستیداو خۆیو هاوپەیمانەکەی یەکەمین سەرکەوتنی یەکلاکەرەوە پێشکەش جیهانی ئیسلامی بکەن، بەمەش دەروازەی والآکرد بۆ دەرکەوتنی چەندین فەرماندەو هاوپەیمانێتی ئیسلامی کەگورزی یەك لەدوای یەکیان ئاراستەی خاپەرستەکان کرد، ئەو سەرکردانەش بە مەدودی فەرمانڕەوای سەلجوقی لەموسڵ دەستی پێکردو بەصلاح الدین کۆتایی پێ هات و ئیلغازیو بلك ئەرتەقیو ئاق سنقری بەرسقیو پاشان عماالدین نورەدین ی زەنگیشی لەو نێوەندەدا لەخۆ دەگرت[2].

د- **درێژەدانی جکرمش بەجیهاد:** وێڕای هەندێ دەستپێشخەری نێگەتیف کە لەدوای سەرکەوتنی موسڵمانەکانەوە لەبەلیخدا روویدا، جکرمش هێشتا ئومێدی هەبوو سەرکەوتنی تر لەم گۆرەپانەدا تۆمار بکات، ئەمەشی دوای کەمتر لەدوو ساڵ بۆ ڕەخسا کاتێ لەکۆتایی ساڵی ٤٩٩ك–١١٠٦ ز فەرمانێکی لەسوڵتان محمدەوە پێگەشت بۆ ئەنجامدانی بەهەڵمەتێکی نوێ بۆ سەر خاچپەرستەکان، ئەویش پەیوەندی کرد بەئەمیری ناوچەکانەوە توانی هاوپەیمانێتییەك پێك بهێنێت کە رضوانی ئەمیری حەلەبو ئیلغازی ئەرتەقیو ئەمیری ماردینو ئەلب تەمرتاشی فەمانڕەوای شنگارو اصبهذساوا کە یەکێك بوو لەگەورە ئەمیرەکانی وڵاتی فارسی لەخۆ گرتبوو، بەڵام ئەوەی کەئیلغازی خستیە بەردەم ئەمیرەکانی تر، جێبەجێکردنی ئەو پلانەی یەك خست، ئەوەبوو داوای لێکردن کەهەڵمەتەکەیان دژ بەجکرمش دەست پێ بکەن بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر موسڵدا بۆ دەستخستنی ڕەزامەندی سوڵتان محەمەد کەهەندێ هەڵسوکەوتی فەرمانڕەوای موسڵی بەدڵ نەبوو وێڕای

---

[1] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١٠٠.

[2] المقاومة الأسلامية للغزو لبصليبي ل١٠٢.

ئەگەری سود وەرگرتن لەبودجەی دارایی‌و سەربازی موسڵ دژ بەخاچپەرستەکان، ئەوەبوو هاورێکانی بەوە رازیبوون‌و پێکەوە کەوتنە رێ بۆ هێرشکردنە سەر نصیبین کەیەر بەفەرمانڕەوای موسڵ بوو، بەڵام بریکارەکانی جکرمش لەو شوێنەدا سەرکەوتوو بوون لەنانەوەی دووبەرەکی لەنێوان رضوان‌و ئیلغازیدا بەپلانی گەورەکەیان لەموسڵ، رضوانیش هەلی سازدانی خوانێکی شایی قۆستەوە کە لەبەردەم شوراکانی نسیبیندا سازدراو هەستا بەفڕاندنی ئیلغازی‌و کۆتکردن‌و گرتنی، بەڵام شوێنکەوتووە تورکمانەکانی توانیان رزگاری بکەن‌و هێرشێکی کتوپڕ بکەنە سەر سەربازگەی رضوان ئەمەش رضوانی ناچارکرد بە پاشەکشەکردن‌و گەڕانەوە بۆ حەلەب، لێرەشەوە هەڵوەشانەوەی ئەم هاوپەیمانێتییە دەرکەوت پێش ئەوەی تاقە هەنگاوێك بنێت بەرەو ئامانجی سەرەکی کەکوشتاری خاچپەرستەکان بوو[1]، بەڵام هەموو ئەمانە جکرمشی ساردنەکردەوە لەهێرشکردنە سەر دوژمنە راستەقینەکانی، ئەوەبوو کە لەشکست هێنان بەهەوڵەکانی هاوپەیمانێتی ئەمیرەکان لەدژی بویەوە، ڕاستەوخۆ هێرشی کردە سەر رەها، بەڵام زۆری نەخایەند گەرایەوە بۆ موسڵ‌و لەوێش روبەرووی کێشەی نوێ بوویەوە لەگەڵ سلجووقیەکاندا، دوای ئەوەی کەسەرکەوت بەسەر ئەو هێرشەی کەسەربازەکانی رێشارد (سالرنو) پێی هەستان کە لەجیاتی بلدوینی دیلکراو فەرمانڕەوایەتی رەهای دەکرد، بەڵام زۆری نەخایەند سوڵتان قەلج ئەرسەلانی کوڕی سولەیمان سوڵتانی رۆمە سەلجوقییەکان، هەستا بەهێرشکردن بۆ سەر رەها، جێگرەکانی جکرمیش لەحەڕان هەلەکەیان قۆستەوەو نوێنەریان ناردە لای‌و بانگهێشتیان کرد بۆ ئەوەی ئەو شارەی رادەست بکەن، قەلج ئەرسەلانیش بەرەو ئەوێ بەرێی کەوت‌و چووە ناو حەڕان‌و خەڵکیش دڵخۆشبوون بەجیهاد کردن لەدژی فەرەنج[2]، لەوێش چەند رۆژێك مایەوە پاشان ناچاربوو بگەرێتەوە بۆوڵاتەکەی بەهۆی نەخۆشییەکەی توندەوە کەتوشیبوو، بەڵام کۆمەڵێك لەهاوەڵانی لەحەڕاندا بەجێهێشت بۆ پاراستنی[3]،وادیارە کەسایەتی قەلج ئەرسەلان وردەوردە هەژموونی پەیداکرد بەهۆی ئەو هێزو دەسەڵات‌و سەربەخۆییەی کەهەیبوو زیاتر لەئەمیرە موسڵمانەکانی تر لەناوچەکەدا بەهۆی ناکۆکی بەردەوام‌و شەڕو پێکدادانیان لەپێناو بەدەسهێنانی دەسکەوتی ئیقلیمی سنوردارو ئەمە جگە لەوەی کە ئەو گرفتانەی روبەرووی جکرمش بوویەوە لەموسڵ داو تێکچوونی

---

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١٠٣.

[3] الكامل في التأريخ له المقاومة الأسلامية ل١٠٤.

پەیوەندیەکانیشی لەگەڵ سەلجوقییوکاندا بەتەواوی گرنگی دانی بەگۆرەپانی جیهاد دژ بەخاچپەرستەکان لەبیر بردەوە، ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی قطب ئەرسەلان جێگرەکانی بریکارەکانی جکرمش راکێشێت لەحەڕاندا بۆیە بانگهێشتیان کردو حەرارانیان دابەدەستەوە، ئەمەش هەمان هۆکاری بانگهێشتکردنی قەلج ئەرسەلان بوو لەلایەن خەڵکی موسڵەوە هەتاوەکو حوکمڕانیان بکات، پاش کوژرانی حکرمشی حوکمڕانی پێشوییان[1].

**٣- جیهادی جکرمشی فەرمانڕەوای موسڵو سەقمانی کوڕی ئەرتەق فەرمانڕەوای ماردین و دیاربەکر:** هەر کە ئەوروپای رۆژئاوایی هەواڵی ئەو سەرکەوتنەی بیست کەهێزە خاچپەرستەکان لەوڵاتی شامو فەلەستیندا بەدەستیان هێنا، زۆرێك لەئەمیرەکانیان کەپێشتر بەشداریان نەکردبوو لەهاتن بۆ رۆژهەڵات ئارەزووی بەشداری کردنیان نواند بەپاڵنەری تەماعی کەسی دونیاییو دەسکەوتنی موڵكو سامان وێڕای پاڵنەری ئاینی کەخۆی لەدەسکەوتنی پاداشتو لێخۆشبوون دادەبینییەوە، شایانی باسە خاچپەرستەکان لەرۆژهەڵاتدا پێویستی زۆریان بەجەنگاوەرو داگیرکەری زۆر هەبوو بەمەبەستی:

- درێژەدان بەجەنگ دژی موسڵمانەکان.
- دەسپێکردنەوەی فراوانخوازی.
- پاراستنی ئەو دەسکەوتانەی کەبەدەستیان هێناوە.
- پاراستنی ئەو مافانە دژ بەهەر هەوڵێکی موسڵمانان بۆ گێرانەوەی.

کۆمەڵگەی رۆژئاوا وەڵامی ئەم دیاردەیەی دایەوو ڕابونێکی خاچپەرستی لێکەوتەوەو بووە هۆی هاتنی کۆمەڵانێکی خاچپەرستی تر بۆ رۆژهەڵاتو لەمباردیەکانیش یەکەمی ئەو کۆمەڵانەبوون، ئەوەبوو لەساڵی ٤٩٤ك/ ١١٠١ز ئیتالیایان بەجێ هێشت بەسەرکردایەتی ئەنسلم بووی سەرۆکی ئوسقۆنەکانی میلانو کۆمەڵێك لەشازادەکانیش هاورێیەتییان کرد کە لەنێوانیاندا ئەلبەرت کونت بیاندراتو جیوبرت کونت بارماو هیوکونت مونتیبلو هەبوو[2]. وادیارە ئەم کۆمەڵە لامباردیانە وێڕای زۆری بەشداربووان تیایدا لەڕووی جۆرو چۆنێتییەوە زۆر لەکۆمەڵەکانی پێش خۆی جیاوازنەبوون، بە بەڵگەی ئەوەی کەتەنها ژمارەیەکی کەم جەنگاوەری لەخۆ دەگرتو زۆرینەی بەشداربوانی لەخەڵکانی ئاسایی‌بوون کەشارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی جەنگ نەبووو هیچ رێکخستنێکیان پێوە دیارنەبوو، کاتێ گەیشتنە دەوروبەری قوستەنتینە دزیو تاڵانی زۆریان کرد ئەمەش وای کرد

---

[1] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١٠٤.

[2] تأريخ سلاجقة الروم فب اسيا ل٩٦.

لەئیمپڕاتۆری بیزەنتی کەپەلە بکات لەگواستنەوەیاندا بۆ ئاسیای بچوک ئەمەش لەمانگی جمادی یەکەم/ ئازاردا، ئەوەبوو لەنیو قومیدیەدا نیشتەجێ بوون لەچاوەڕوانی گەیشتنی کۆمەڵەکانی تردا[1]، زۆریشی نەخایەند کۆمەڵێکی تر لەفەرەنسییەکان گەیشتن بەسەرکردایەتی ستیڤن بلوا، کۆمەڵێ شازادەش پەیوەندیان پێوەکرد وەك ستیڤن کونت برجدیاو هیو کونت بردیو بلدوین کونت جراندبر بەو هیوبییرفون ئوسقوفی سواسون لەگەڵ سریەیەکی ئەڵمانی بەسەرکردایەتی کونراد ئەم کۆمەڵانەش پێکەوە لەبسفۆڕ پەڕینەوەو لەنیقیەدا لەنزیك سەربازگەی لەمباردی جێگیر بوون، ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکەش لەنێوان دوو سەد بۆ سێ سەد هەزار جەنگاوەر دەبوو، ئیمپڕاتۆری بیزەنتیش ئەلکیس کومنین ریموند کونت تولوزی هاوڕێی وەك فەرماندەی گشتی دەستنیشان کرد و کۆمەڵێك سەربازی بیزەنتی بەسەرکردایەتی تسیتاس بۆ نارد[2].

أ- **جەنگی مرسیفان:** سوپای خاچپەرست لەنیقۆمیدیەوە بەرەو دوریلیۆم بەرێکەوت بەمەبەستی گەیشتن بەزەویە پیرۆزەکان، بەو مەرجەی لەکاتی ڕۆشتنیدا ئەو ڕێگەیە بکاتەوە کەبەئاسیای بچووکدا تێپەردەبێت، بۆیە ئیمپڕاتۆر ستیڤن بلوا وەسیەتی کرد کەسوپا ئەو ڕێگەیە بگرێتە بەر کە کۆمەڵە خاچپەرستەکان پێشتر گرتویانەتە بەر کەبەدوریلیوم و قونیەدا تێپەردەبێت، بەڵام لەمبادیەکان رازی نەبوون بەرەو زەویە پیرۆزەکان بەرێ:ەوت هەتاوەکو بۆهیمۆند ئازاد نەکەن کەبەنموونەو پاڵەوان و تاکە سەرکردەی باوەڕپێکراویان دەزانی کەبتوانێ بەرەو سەرکەوتن بیانبات، بۆیە سوربوون لەسەر ئەوەی کەهەڵمەتەکە بەرەو کمبادو کییە بڕوات، ئیبن الأثیریش باسی ئەوە دەکات کەئامانجی ئەو کۆمەڵە خاچپەرستانە بریتی بوو لەرزگارکردنی بۆهیمۆند لەدیلی[3]، وێڕای نارەزابوونی هەندێ لەسەرکردەو شازادەکان، بەڵام ئەندامانی هەڵمەتەکە ڕوویان کردە زەوی داشمەندییەکان لەڕێی ئەنقەرەوە کەئەوکات لەژێر دەسەڵاتی قلج ئەرسەلاندابوو، ئەوەبوو ڕێگەیان دۆزییەوەو درێژەیان بەگەشتەکەیاندا بەرەو کنغری کەئەکەوێتە خوارووی بافلاجونیا بۆئەوەی ئەو ڕێگە سەرەکییە بگرنەبەر کەبەرەو ئەماسییەو نیکسار دەڕواتو هەتاوەکو پێشڕەوی خاچپەرستەکان یەك بخەن، قلج ئەرسەلانیش بەئەنقەست پاشەکشەی کرد لەبەردەم هێزە خاچپەرستەکاندا بەشێوەیەکی پلە بەندیو شێوازی بیابان نشینەکانی گرتە بەر بەروخاندنی ئەو شوێنانەی کەپاشەکشەی لێ دەکاتو سوتاندنی هەر شتێ کە لەوانەیە خاچپەرستەکان

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

[2] الكامل في التأريخ لە تأريخ سلاجقة الروم ل٩٧.

[3] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا ل٩٧.

سودی لێ وەرگرن بەتایبەت ئازوقەو جبەخانەکانیان، لەهەمان کاتیشدا هێزە تورکمانەکان کۆبوونەوە لەهاوپەیمانێتییەکی نوێدا بۆ روبەروبوونەوەی هەرەشەی خاچپەرستەکان ئەوەبوو کمشتکین ئەحمەد ئەلدانشمند هەستا بەنوێکردنەوەی هاوپەیمانێتییەکەی لەگەڵ فلج ئەرسەلاندا، هەروەها رضوانی فەرمانڕەوای حەلەبی هاندا بۆ ناردنی چەند جەنگاوەرێك[1].

خاچپەرستەکان گەشتنە کنغریو تورکمانەکانیان بەئەوپەری هێزیانەوە تیادا بینی بەڵام بەهۆی تۆکمەییەوە ئەو شارەیان بۆ نەگیرا ناچاربوون درێژە بەگەشتەکەیان بدەن دوای ئەوەی گوندەکانی دەوروبەریان تاڵان کرد، بەڵام وردەوردە بەهۆی کەمی ئازوقەو گەرمی کەش و هەواو رێگری تورکەکانەوە ماندوبوون و ریمۆندیش بۆ ئەوەی سوپاکە لەتیاچوونێکی مسۆگەر رزگاربکات، پێشنیاری کرد کەبەرەو باکوری رۆژهەڵات و قستمونی بەرێ کەون، لەوێشەوە بەرەو لەشارەکانی بیزەنتی لەسەر دەریای رەش، هەرچەندە رۆیشتن بەرەو قستونی هێواش و زەحمەت بوو لەبەر تەواوبوونی ئازوقەو لەناوبردنی بەروبوومی کشتوکاڵییەکان و پڕکردنەوەی بیرەکان لەلایەم تورکەکانەوە، ئەوەبوو خاچپەرستەکان رووبەڕووی هێرشێکی کتوپڕبوون لەلایەن تورکەکانەوە کەشپرزەو پەرتەوازەی کردن و هیچییان پێ نەکرا هەتاوەکو ریموند توانی کۆییان بکاتەوە کاتێ گەیشتە دەوروبەری قستمونی، لەم کاتەشدا پێویشت بوو لەسەر ریمۆند رێرەوێك بۆ خۆی بکاتەوە لەنێوان ئەو کۆمەڵە تورکیانەدا بەئاراستەی کەنار دەریا، بەڵام دیسانەوە لەمباردیەکان سووربوون لەسەر رۆیشتن بەرەو رۆژهەڵات، ئەویش لەو دەوروبەرەدا لایدا بەناچاری و لەسەر رای ئەوان[2]، پاشان سوپای خاچپەرستی روباری هالیسی بڕی و بەئاراستەی دانشمندیەکان و تاکەکانی گەشتنە شاری مرسیفان کەدەکەوێتە رێگەی نێوان روبارەکەو ئەماسییە[3] کاتێ تورکەکانیش زانیان کەهێزە خاچپەرستەکە ماندوبووە پێشڕوییان بۆ کردو ڕوبەڕووی بوونەوە، زۆری نەخایەند خاچپەرستەکان توشی شکست بوون و گۆرەپانی جەنگییان بەجێ هێشت لەژێر فشاری جەنگەکەداو ژن و قەشەکانیان بەجێ هێشت و ریمۆندیش پەنای برد بۆ تەپۆلکەیەکی بچووك و خۆی تیادا قایمکرد هەتاوەکو فەرەنسی و ئەڵمانییەکان فریای کەوتن، پاشان بەشەودا هەڵات دوای ئەوەی بێ ئومێدبوو لەسەرکەوتن و، لەپاش خۆشی سەربازگەی خاچپەرستەکان و ئەو خەڵکەی تر کەلەگەڵیاندابوون وەك دەسکەوت کەوتە دەست

---

[1] تأريخ الحروب الصليبية (٤٣/٣ ) رنسيمان.

[2] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرآى ل٩٨.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

تورکەکان[1]، دوای جەنگەکەش کرداری راوەدونان دەستی پێ کرد کەتەنها سوارەکان لێی رزگاربوون، زیانی خاچپەرستەکانیش گەشتە چوار لەسەر پێنجی سوپاکە[2]، تورکەکانیش دەستیان گرت بەسەر رێژەیەکی زۆر چەكو دیلێکی زۆریان دەسکەوت کەدواتر وەك بەندە فرۆشران.

زۆری نەخایاند ریمۆند گەشتە بافرا، ئەو بەندەرە بیزەنتییە بچووکەی کەلەسەر دەریای رەشە نزیك سینوب، لەوێشەوە کەشتیەك بەرەو بیزەنتەو پاشانیش بەرەو قوستەنتینەی برد[3]، هەروەها مێژوونووسی لاتینی ئەلبەرت ئوف ئەکس ئاماژە بەوە دەدات کەریمۆند بەرتیلێکی لەتورکەکان وەرگرتبوو هەتاوەکو سوپاکە بەرەو قەستمونی بەرێت ئەمەش دوورە، چونکە هەر کەسێ چاودێری رێڕەوی هەڵمەتەکەو ئەو رووداوانەی کەتیایدا روویاندا کردبێت هەست بەو هەموو هەوڵە ئەکات کەریمۆند گرتییە بەر بۆ بڕوا پێ هێنانی لەمباردییەکان هەتاوەکو روونەکەنە وڵاتی دانشمەندییەکان پاشان هەوڵدانی بۆ دەرهێنانی سوپاکە لەو تەنگژەیەی کەتێی کەوتبون، هەڵبژاردنی رێگەی قستونیش لەبەر ئەو هەمووە نەهامەتییەبوو کەتوشی سوپاکەی بوو، راکردنیشی لەگۆرەپانی جەنگ دەرەنجامی دڵنیابوونی لەبێ سودی درێژەدان بەجەنگ دوای ئەوەی لەمباردییەکان هەڵاتنو بەجناکە مشەخۆرەکانیش بەدوایاندا هەڵاتن[4].

ب- **جەنگی هرقلەی یەکەم:** ئەو کارەساتەی کە لەمرسیفاندا بەسەر خاچپەرستەکاندا هات ئەو ناوبانگەی سڕیەوە کەدەرەنجامی سەرکەوتنیان لەدووریلیۆمدا دەستیان کەوتبووە ئەوەش کاریگەی زیاتر کرد ئەوەبوو کەئەمە دوا کارەساتییان نەبوو، چونکە لەهەمان کاتدا کە لەمباردیەکان شاری نیقومیدییەیان بەجێ هێشت، هێزێکی فەرەنسی بەسەرکردایەتی ولیم کونت نیفریە بەپازدە هەزار سوارو پیادەوە گەشتە بەرەوەو ولیەم سووربوو لەسەر گەشتنەوە بەلەمبەردییەکاندا بەخێرایی بۆیە قوستەنتینەی بەرەو نیقومیدیە بەجێ هێشت، لەوێش زانی کەکۆمەڵانی سوپای خاچپەرستی بەرەو ئەنقەرەبەرێ کەوتونو ئەویش رووی لەم شارە ناو بەئاسانی گەشتە ناوی، بەڵام کەس نەیدەزانی کۆمەڵانی خاچپەرست بەرەو کوێ رۆیشتوون، بۆیە بەناچاری روویکردە قونیە، کاتێ گەشتە قونیە گەمارۆی داو پاسگایەکی سەلجوقی تورکیش ئەرکی بەرگری کردنی لەئەستۆ گرتو سەرجەم هەوڵەکانی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[2] هەمان سەرچاوە ل٩٨.

[3] تأريخ سلاجقة الروم فب أسيا الصغرى ل٩٩.

[4] تأريخ سلاجقة الروم فب أسيا الصغرى ل٩٩.

ولیەمی بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو شارەدا شکست پێ هێناو دەرەنجام بەناچاری بەجێی هێشت[1].

لەو ماوەیەدا سەلجوقیو هاوپەیمانەکانیان لەلەناوبردنی کۆمەڵە لەمباردییەکان بوو بوونەوە، قلج ئەرسەلانو کمشتکین ئەحمەد دانشمند بەهاتنی دوژمنی نوێیان زانیو هێشتا کاریگەری سەرکەوتنیان لەسەرمابوو بەرەو باشور رۆیشتنو پێش ولیم کەوتن بۆ هرقلە، سەربازەکانی نیفەریش لەقونیەوە بەرەو رۆژهەڵات کەوتنەڕێ، کاتێ گەشتنە شوێنێکی نزیك لەهرقلەو ماندوبوون زۆری بۆ هێنابوون، تورکەکان هێرشیان بۆ هێنانو دوای جەنگێکی کورت خایەن توشی شکست بوونو سوپای فەرەنسیش بەتەواوی لەناوچوو جگە لەئەلکونتو شەش لەشوێنکەوتوانی[2].

ج- **جەنگی هرقلەی دووەم:** لەوکاتەدا کە هەڵمەتەکەی نیفر بەئاسیایی بچووکدا دەگەڕا، دوا بەشی ئەو کۆمەڵە خاچپەرستانە گەشتە قوستەنتنیە، ئەم کۆمەڵانەش لە فەرەنسیو ئەڵمانییەکان پێك هاتبوون بەسەرکردایەتی ولیەمی نۆیەم دۆقی ئەکویتینو ولفی چوارەم دۆقی بافاریا، ژمارەی جەنگاوەرەکانیشی گەشتە شەست هەزار جەنگاوەر ئەم کۆمەڵانە دەرچوون بەرەو قوستەنینە بەئاراستەی قونتە بەرێ کەوتنو هەمان رێگەییان گرتە بەر کە بۆهیمۆند پێشتر پیایدا رۆیشت، تورکەکانیش هەمان شێوازییان گرتە بەر کەپێشتر پیادەییان کردبوو، بەسوتاندنی دەغڵو دانو لەناوبردنی ئازوقەو پڕکردنەوەی بیرەکان کاتێ تاکەکانی ئەم کۆمەڵە گەشتنە قونیە، بینیان شارەکەو وێران بووە، ئەوەبوو پاسگا سەلجووقیەکە پاش بەرەنگاربوونەوەی هەڵمەتەکەی نیفر چۆڵی کردو هەموو ئازوقەکانی ناوی لەگەڵ خۆیدابردبوو، هەروەك بێستان باخەکانی لەهەموو ئەو شتانە خاڵی کردبووو کە لەوانەبوو سودێك بەخاچپەرستەکان بگەیەنێت[3]. هەروەها خاچپەرستەکان زۆر لەقونیەدا نەمانەوەو بەجێییانهێشت بەرەو هرقلەو لەرێگەیەکەوە کە درێژیەکەی پەنجاو پێنج میل بوو، سەرنێشەی زۆرییان توش بووو برسێتیو تینوێتی زۆری بۆ هێنان، تورکەکانیش ناوبەناو دانە دانەیەکیان لێ دەکوشتن، کاتێ چونە شارەکەشەوە بینییان چۆڵکراوە[4] لەم کاتەشدا موسڵمانەکان لەدارستانەکانی دەوروبەری هرقلەدا بۆ سەریان بۆ دانانو کتوپڕ لەکاتی ئاو خواردنەوەدا دایان بەسەرییانداو شپرزەیان کردنو دوا کەسییان لەناوبردن، جگە

---

[1] تأريخ سلاجقة الروم فب أسيا الصغرى ل٩٩.

[2] هەمان سەرچاوەل٩٩، ١٠٠.

[3] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠٠.

[4] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠٠.

لەکۆمەڵێکی کەم نەبێت کەتوانییان زۆر بەزەحمەت دەربازبن کە لەنێوانیاندا ولیمی تۆیەمو ولفی چوارەم هەبوو، کە بەرەو طرسوس و لەوێشەوە بەرەو ئەنتاکییە رۆشتن[1].

د- **ئەنجامی جەنگەکانی پێشووی قلج ئەرسەلان:** هەر سێ کۆمەڵەکە کۆتاییەکی ناخۆشییان هەبوو، ئەم ئەنجامانەش لەلایەکەوە کاریگەری هەبوو لەسەر رێڕەوی بزوتنەوەی خاچپەرستی لەلایەکی تریشەوە کاریگەری لەسەر تورکەکان بەگشتی و سەلجوقییەکان بەتایبەت هەبوو گرنگترین ئەو دەرەنجامانەش ئەمانەن:

- تۆڵەسەندنەوەی سەلجوقییەکان بۆ ئەوەی کە لەدوریلیوم بەسەریاندا هات، بەجۆرێك کەچیتر لەئەنادۆڵ دەرنەکرێن، هەروەك ئەم سەرکەوتنانە گیانی بەرەنگاربوونەوەو ورەی لایان بەرزکردەوە.

- ئەو رێگەیەی کەبەئاسیای بچووکدا تێپەردەبێ بۆ وڵاتی شام بەردەوام بەنائارامی مایەوە بۆ سوپای خاچپەرست و بیزەنتیەکان سەرباری سەرکەوتنی یەکەمین کۆمەڵەی خاچپەرست لەبرینیدا، بۆیە کۆچکەرە خاچپەرستەکان لەتێپەربوون بەم رێگاو شکانییەدا دەترسان کەبەقوستەنتینەدا تێپەر دەبێت بۆ ئیسۆس، ئەگەر لەناو کۆمەڵێکی زۆردا نەبوایەن و نەشیان دەتوانی بێنە ئەم ناوچەیە بەرێگەی دەریادا نەبێت لەگەڵ ئەو خەرجییە زۆرەی کەتەنها خەڵکێکی کەم دەتوانن دەبینی بکەن، ئەم رێگە وشکانییەش بۆ ماوەی چەند ساڵێك بەداخراوی بەرووی خاچپەرستەکاندا مایەوە[2] خاچپەرستەکان بیزەنتیەکانیان بەهۆکاری ئەو نەهامەتییانە دەزانی کە دووچاریان بوو و بەرپرسیارێتی ئەو روداوانەیان ئەخستە ئەستۆی ئەوانەوە، قسەڵۆکی ئەوەش لەناویاندا بڵاوبوویەوە کەپیمۆند رێنماییەکانی ئیمپراتۆری جێبەجێکردوە کاتێ سوپاکەی لەرێڕەوی خۆی لاداوە هەتاوەکو سەربازەکان لەو بۆسە ئامادەکراوەدا گیانییان لەدەست بدەن، لاتیینەکان دەیانویست قوربانییەك بدۆزنەوە هەتاوەکو تاوان و هەڵەکانی خۆییانی بخەنە ئەستۆ، بۆ ئەم مەبەستەش کەوتنە لۆمەی بیزەنتییەکان و بەبەرپرسیاریان دەزانین لەو نەهامەتیانەی کەدووچاری بوون[3].

- زۆری نەبرد قلج ئەرسەلان سەروەری زیاتری تۆمار کرد دوای ئەو سەرکەوتنانە و تورکەکانی تری ئەنادۆڵیش بەشدارییان لەگەڵدا کرد، ووایلێهات ئەیتوانی دەسەڵاتی خۆی بۆ ناوەوەی

---

[1] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠٠.

[2] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠١.

[3] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠١.

ئەو بانە بگێڕێتەوە. پاشان لەقونیەی پایتەختیدا مایەوە کەدەکەوێتە سەر ئەو ڕێگا سەرەکییەی کەقوستەنینەی ئەبەست بەوڵاتی شامەوە[1].

- دانشمەندییەکان دەستیان دایە ئازاد سازیەکانیان لەدۆڵی فوراتداو بەبێ کۆسپو گەشتنە دەوروبەری ڕەها، هەروەها مەلەطیەیان ڕزگارکردو فەرمانڕەواکەیان لە٢٣ ذی الحجةی ٤٩٥ک١٨ی ئەیلول ١١٠٢ز. دا دەستگیر کرد.
- کۆچکردنەوەی خاچپەرستەکان بۆ وڵاتی شام بەهۆی ناکۆکی لەنێوان سەلجوقیو دانشمەندەکانو ململانێی هەردوو بنەماڵەی تورکی گەورە سەلجوقیو دانشمەندییەکان لەسەر خاوەنداریێتی ملطیەو فدیەی بۆهیمۆند، بەم شێوەیەش بەرەی تورکەکان هەڵوەشایەوە لەناوچەکەدا[2].
- کاریگەری کۆچی دوایی قلج ئەرسەلان: زەنکی کوڕی جکرمش نامەیەکی ئاراستەی قلج ئەرسەلان کرد کەبێت بەهانایەوە لەکاتێکدا گو لەملطیەدابوو، بەڵێنی بەدەستەوە دانی موسڵو دەوروبەرەکەی پێدا سوڵتان قلج ئەرسەلانیش ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ فراوانخوازی لەسەر حسابی ئەمیرە بەشەڕهاتووەکانو خێرا چوو بەدەم زەنگییەوە، کاتێ جاولیش بەهاتنی زانی لەشارەکە پاشەکشەی کرد،بەتایبەت کەجکرمش لەدیلی دا کتوپڕ کۆچی دوای کردو ئەشی ویست وەك هۆکارێك بۆ مساوەمە کردن بەکاری بێنێت، لەلایەکی تریشەوە باش لەوەگەیشتبوو کەقلج ئەرسەلانی یەکەم هێندە بەهێزە کەناتوانێ لەجەنگی دەستەو یەخەدا ڕووبەڕووی ببێتەوە بۆیە بڕیاریدا کەهاوپەیمانێتییەکی بەرهەڵستکار پێك بێنێ دژی هەتاوەکو پشتگیری هەڵوێستەکەی بکات[3]. بەڵام قلج ئەرسەلانی یەکەم توانی بەخۆشحاڵی دانیشتوانی موسڵەوە بچێتە ناویەوە، ئەویش بەڵێنی پێدان کەڕێز لەئازادییەکانیان بگرێتو چەند ڕێکخستنی ئیداری[4] تیاداکرد، سەبارەت بەجاولیش،ئەوە پاشەکشەی کرد بۆ شنگارو چەند دانوستانێکی لەگەڵ ئیلیغازی ئەرتەقیو ڕزوانی فەرمانڕەوایی حلب دا ئەنجامداو لەکۆتاییدا ڕێککەوتن لەسەر دەرکردنی قلج ئەرسەلانی یەکەم لەموصلو ڕۆیشتن بەرەو هێرشکردنە سەر ئەنتاکییەو جەنگیش دژ بەقلج ئەرسەلانی یەکەم یەشکستخواردنو خنکانی

---

[1] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١٠١.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٠١.

[3] تأريخ الزنكين فبي الموصل وبلاد الشام ل٦٨.

[4] تأريخ الزنكين فبي الموصل وبلاد الشام ل٦٨.

لەرووباری خاپووردا[1] لەساڵی ٥٠٠ك/١١٠٧زدا کۆتایی پێهات[2]. هەروەها قلج ئەرسەلانی یەکەم بەیەکێك لەو کەسایەتییە نموونەییانەیە دادەنرێت کەرۆمە سەلجوقیەکان بەرهەمیان هێناوە، رۆژهەڵاتی نزیکیش بەسەرجەم چین و توێژەکانییەوە بەکۆچی دوایی کاریگەر بوون.

- سەرکردەیەکی تری بەهێزی وەك قلج ئەرسەلان لەناو سەلجوقیە رۆمەکاندا پەیدانەبوو کەشوێنی پڕبکاتەوە رووبەڕووی فشارێکی زۆربوون لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتیەوە کەدووبارە دەستی وەردایە کاروبارە ناوخۆییەکانیان و ئەلکسیۆس کۆمنین توانی بەدڵنیاییەوە دەسەڵاتی خۆی بگێڕێتەوە بۆ سەر ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیایی بچووك و کەناری باشووری بەتەواوی کۆنترۆڵ بکات.
- کۆچی دوای قلج ئەرسەلان تەمەنی دەوڵەتی سەلجوقی مەزنی نزیکەی سەد ساڵ درێژکردەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو دابەشبوونە سنورداره لەناو دەوڵەتدا لەنێوان سوڵتان و ئەمیرەکانداو بۆ دەستگرتن بەسەر تەختی پاشاییداو زۆری جەنگە ناوخۆییەکان لەنێوانییاندا سەرباری ئەو مەترسییە دەرەکیانەی دەوری دابوون، وەك مەترسی حەشیشیەکان و خاچپەرستەکان، ئەمەش قلج ئەرسەلانی هاندا بۆ دەستێوەردان لەکاروبارەکانی رۆژهەڵات لەپێناو دەستگرتن بەسەر تەختی سوڵتانداو مەترسی بۆ یەکخستنەوەی سەرلەنوێی سەرجەم هێزە سەلجوقییەکان لەرۆژهەڵاتداو لەتواناشیدا هەبوو ئەم خەونەی بەدی بێنێت چونکە بارودۆخەی سیاسی ناوخۆیی و دەرەکی لەباربوو، بەڵام کۆچی دوایی یارمەتی دەوڵەتی سەلجووقیە مەزنەکانی داو تەمەنی درێژکردەوە.
- کۆچی دوایی قۆناغێکی زۆر گرنگ بوو لەجیابوونەوەی سەلجوقیە رۆمەکان لەسەلجوقیەکانی رۆژهەڵات چونکە ئەو مەترسییە ناوخۆیی و دەرەکییانەی کەرووبەرووی دەوڵەتی مەزنی سەلجوقییەکان بوویەوە بو بەرێگر لەبەرامبەر دەستێوەردانیان لەلقە سەلجوقییەکانی تردا بەتایبەت لەوڵاتی شام و ئاسیای بچووکدا، شایانی باسیشە کەدەوڵەتی سەلجوقییە رۆمەکان تائەو کاتەش بەناو سەر یەسەلجوقییە مەزنەکان بوو و سەربەخۆیی تەواویشی سەربخۆیی وەرنەگرت لەساڵی ٥٥٣ك/١١٥٧ز نەبێت[3].
- کۆچی دوای قلج ئەرسەلان سەلجوقییەکانی شامی بێ بەشکرد لەهێزێك کەگرنتی بوو بۆیەکخستنیان، لەبەر ئەوەی سەروەری سەلجوقییەکان لەوڵاتی شامدا یەخێرایی کەم

---

[1] رووباری خاپور: رووبارێکی گەورەبە لەنێوان راس العين و فوراتدا لەزەوی جەزیرەدا.

[2] الكامل في تأريخ (٥٠٣/٨).

[3] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١١١.

دەبوویەوە، چونکە دوو کورەکەی تتشی رضوانی ودقاق ئەو توانا سیاسییەیان نەبوو کەبتوانن ڕووبەڕووی ئەو بارودۆخە نائارامە ببنەوە کەوڵاتی شام تیایدا دەژیا لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەیەمی زاینیو سەرەتای سەردەمی شەشەمی کۆچیدا، رەنگە دیارترین نموونە بۆ هەڵوەشانەوەی دەسەڵاتی سەلجووقییەکان لەوڵاتی شامو عێراق وڵاتانی تردا دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لەو بنەماڵە فەرمانڕەوایانە بێت کەبوونی پەیوەندی لەگەڵ خانەوادەی سەلجووقیدا کۆیان دەکاتەوە، لەو خانەوادانەشەوە چەند یەکەیەکی سیاسی دەرکەوت کەناوی ئەتا بەکییەکانیان لێنراو بەخاوەنەکانیشیان ئەوترا ئەتابەك[1].

- کۆچی دوایی قلج ئەرسەلان مەترسییەکی گەورەی لەسەر سنگی ئیمپراتۆری بیزەنتی لابرد لەکاتێکی هەستیاردا، لەوکاتەدا بۆهیمۆند خۆی ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر بەلقان لەساڵی ٥٠١ك/١١٠٧ز سەرەتا لەقەڵای دوازو تۆکمەوە، ئەلکسیوکۆمنینیش قوربانیدایە سنوری باشوری رۆژهەڵاتی وڵاتەکەی لەپێناو پاراستنی دورازو بۆیە هاوپەیمانێتییەکی بەست لەگەڵ قلج ئەرسەلاندا کەبەپێی ئەو هاوپەیمانێتییە یارمەتییەکی سەربازی دەستگیر بوو، بەڵام کۆچی دوایی کتوپڕیو نەبوونی کەسایەتییەکی بەهێز بۆ جێگیرتنەوەی، هەلی بۆ رەخساند هەتاوەکو بەدڵنیاییەوە یەکلابێتەوە بۆ رووبەڕووبونەوەی هێرشی بۆهیمۆند کە لەساڵی ٥٠٢ك/١١٠٨ز[2] لەبەرامبەریدا شکستی هێنا.
- کوچی دوایی قلج ئە رسە لان بارودوخەکەی لەئاسیادا شلەقاند، ئەوەبوو گەورەترینی چوار کوڕەکەی کەناوی مەلەك شا بوو دیل کرا لەلایەن سوڵتان محەمەدوە دوای جەنگی خاپور، لەهەمان کاتدا بێوەژنەکەی دەستی گرت بەسەر ملیەو هەرێمە رۆژهەڵاتییەکاندا بەیارمەتی ئەمیر ئید بەرکەدانی نابەسەروەری طغرل ئەرسەلاندا، بچووکترین منداڵی قلج ئەرسەلان بەسەر وڵاتی رۆمەوە، سەبارەت بەدوو براکەی تریش کەناوییان مسعودو عەرەب بوو ئەوە یەکەمییان لەوڵاتی دانشمندییەکان دادەژیاو دووەمیشیان لەقونیەدا جێگیربوو[3].
- هەرەسهێنانی دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقیە رۆمەکان لەبەرژەوەندی بیزەنتییەکاندا نەبوو، چونکە ئەوانە بەردەوام بوون لەهێرش بردن بۆ سەر زەوییەکانی ئیمپراتۆری، سەرباری ئەوەش ئیمپراتۆری بیزەنتی توانی دەستبگرێت بەسەر هەندێ لەقەڵاکانی ناوچە

[1] تأريخ سلاجقة الروم في أسيا الصغرى ل١١١.

[2] هەمان سەرچاوە ل١١٢.

[3] هەمان سەرچاوە ل١١٢.

سنورییەکاندا[1]، بەڵام ئامادەنەبوو سەرکێشی بکاتو بەرەو قیلیقییە یان بەرەو وڵاتی شام بڕوات، ئەم هەڵسوکەوتەشی لەبەرژەوەندی سەلجوقییەکان بوو کەیەکلابوبونەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتە ناوخۆییەکان[2].

- جاولی سقاوە: دوای کۆچی دوایی قلج ئەرسەلانو خنکانی لەرووباری خاپوردا لەساڵی ٥٠٠ك/١١٠٧ز لەتوانای جولیدا هەبوو بچێتە ناو موصڵ، بەڵام ئەو دڕندەییەی کە لەحوکمڕانیدا هەبوو وای لێکرد کەخۆشنەویستراو بێت لەلایەن خەڵکەوە، هەروەك هیچ شتێکی لەجکرمش زیاتر نەکرد کاتێ دانپێدانانی خۆی بۆ دەسەڵاتی سوڵتان محەمەد علی ئاشکراکرد، هەرچەندە کە بەناوی ئەوەوە لەموسڵدا وتاری دەخوێندەوە[3]، ئەوەبوو سەربەخۆیی خۆی راگەیاندو هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵدا بچڕاند، ئەمەش پاڵی نابەسوڵتان محەمەدەوە یەکێك لەپیاوانی کەمەودودی کوڕی تونتکین بوو راسپێرێت هەتاوەکو جاولی لەموصڵ دەربکاتو شوێنی بگرێتەوە لەمانگی ذي القعدةی ساڵی ٥٠١ك/حوزەیرانی ١١٠٨ز[4] بەم شێوەیەش جاولی ناچاربوو کەدوبارە رابکات لەموصڵو، بەرەو جەزیرە بەرێکەوت لەوێش هەموو دوژمنانی دەوڵەتی سلجوقی لەدەوری کۆبوونەوە لەسەروی هەمووشیانەوە هۆزی بەنی مەزیدی عەرەبی، هەروەك دودڵی نەنواند لەهاوپەیمانێتی کردن لەگەڵ هێزە خاچپەرستەکانی دەوروبەردا، هەروەك بلدوینی دووەم دی بورجی ئەمیری رەهای ئازادکردو هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵدا بەست دژ بەسەلجوقییەکان[5]، مەودودیش لەنێوەندی خۆشحاڵی خەڵکدا چووە موصڵەوە لەمانگی صفری ساڵی ٥٠٢ك/ئەیلولی ١١٠٨[6].

٥- **شەرەفولدەولە لەمەودودی کوڕی تونتکین ٥٠١ك+٥٠٧ك/١١٠٨/١١١٣ز:** مەودود پلەوپایەیەکی تایبەتی هەبووە لەمێژووی جیهاددا دژ بەخاچپەرستەکان، چەند هۆکارێکیش رۆڵی هەبوو لەپێکهێنانی ئەم پلەوپایەدا کەگرنگترینییان- بێ گومان-ئەوەماوە زوەبوو کەتیایدا دەرکەوتو ئەو مۆرکە ئیسلامییە بەهێزەی کەبەکەسایەتییەوە دیاربوو دڵسۆزی بۆ ئامانجە گەورەکانی موسڵمانانو سیاسەتی دادگەرانەو لێبوردانەیو توانای سەرکردایەتی کردنی بۆ

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١١٢.

[2] هەمان سەرچاوە ل١١٢.

[3] الكامل في التأريخ لة الزنكيين في الموصل وبلاد الشامەوە ل٦٨.

[4] الكامل في التأريخ لة الزنكيين في الموصل وبلاد الشامەوە ل٦٨.

[5] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل٦٨.

[6] الباهر لإبن الأثير ل١٧.

بزاوتی جیهادو دروستکردنی جۆره هەماهەنگی بۆ یەکەم جار لەنێوان سەرجەم هێزە ئیسلامیەکان لەبەرەکانی جەنگدا ئەو کارەی کە لەهیچ سەردەمێکدا بەدی نەهاتووە جگە لەسەردەمی ئەرتەقییەکانو زەنگی دا... دوا جاریش سەرکەوتنی لەدانانی خاچپەرستەکان لەهەلۆیستی بەرگریکارداو بەدەست هێنانی چەند سەرکەوتنێك کەیەکێکییان لەبەرزاییەکانی تەبەریەدابوو لەناوجەرگەی فەلەستیندا، دور لەو گۆرەپانەی کەوالییەکانی پێشووی موسڵ راهاتبوون لەسەر رووبەرووبونەوە تیایدا لەگەڵ دوژمنەکانیدا... پاشان کوژرانی بەخێرایی پاش ئەوە لەمزگەوتی دیمەشقدا لەسەر دەستی شیعەی باتنی دوژمنە درندەکانی بزاوتی جیهادو بەرگریو ئەو دلتەنگییە گەورەی کەجەماوەری موسڵمانی گرتەوە دوای تیرۆرکردنیو ئەو وشە دڵسۆزانەی پێش شەهیدبوونی وتی هەموو ئەمە پلەو پاییەی ئیسلامییەی مەودود دوپات دەکاتەوە وەك پاڵەوانێك لەپاڵەوانی جەنگەکانی خاچپەرستیو پێشەنگێك لەپێشەنگە یەکەمەکانی جیهادو تێکۆشان[1].

أ- **هەڵمەتی یەکەمی مەودود بۆ سەر رەها:** لەساڵی ٥٠٣ك/١١٠٩زدا و پاش چەند مانگێکی کەم لەسەقامگیربوونی بارودۆخ بۆی لەموصڵ داو دوای ئەوەی کەفەرمانێکی لەلایەن سوڵتانی سەلجوقی محەمەد کوڕی مەلەکشاوە پێگەشت بۆ جوڵانەوە دژ بەخاچپەرستەکان، مەودود هەستا بەپێکهێنانی هاوپەیمانێتییەکی ئیسلامی کەئەمیری ئیلغازی ئەرتەقی ئەمیری ماردین بەسەربازی تورکمانەوەو سقمان قطبی ئەمیر ئەرمیینەو ناسراو بەشای ئەرمەنو ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی خۆبەخشی لەخۆگرتبوو[2]، ئەمەش یەکەم جاربوو کەئەو ژمارە زۆرە لەسەرکردە موسڵمانەکان کۆببنەوە بۆجەنگ کردن دژی خاچپەرستەکان، بۆیە ئەم هەڵمەتە بەدەروازەی سەردەمێکی نوێ لەخەباتو تێکۆشان دژ بەخاچپەرستەکانو خاڵێکی گرنگی وەرچەرخانو گۆڕان لەدابەشبوونو دەستە مۆییەوە بەرەو کۆبوونەوەو هێرش بردن[3] دادەنرێت هەر کەخاچپەرستەکان لەرەهادا بەکۆبوونەوەی موسڵمانەکانییان زانی راستەوخۆ بلدوین دی بورج نێردراوێکی بەرێ خست بۆ بەیتولمەقەدیسو داوای کرمەکی بەپەلەی کرد لەشا بلدوینو خۆی لەداوی یارمەتی کردن لە "تانکردی فەرمانڕەوای ئەنتاکیە" بوارد چونکە گومانی لەمەبەستەکانیو رێککەوتنی لەگەڵ موسڵمانەکاندا دژ بەرەها هەبوو، پاشا بلدوینیش لەوکاتەدا گەمارۆی شاری بەیروتی دابوو، شوێنی خۆی بەجێ نەهێشت هەتاوەکو

---

[1] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١١٢.

[2] هەمان سەرچاوە ل١١٣، تأريخ الزنكيين في الموصل ل٦٩.

[3] نورالدين محمود، حسين مؤنس ل١٢٣.

دەستی بەسەرداگرتو پاشان بەپەلە بەرەو باکور کەوتە رێو بەهاوڕێیەتی برترامی ئەمیری طرابلوس ، لەنزیك سمیساطیشدا کۆمەڵێك لەسەرکردەکانی ئەرمەن پەیوەندییان پێوەکرد لەسەروەری هەمووشیانەوە کوغ باسیل، لەکۆتایی مانگی ذی الحجة/ کۆتایی مانگی تەموزدا گەشتە ڕەهاو ئەتابەك مەودودیش دوو مانگ بوو گەمارۆی ڕەهای دابوو بەبێ ئەوەی بتوانێ کارێ بکات، کاتێ سوپای بەیتولمەقەدیسی بینی گەمارۆکەی هەلگرتو پاشەکشەی کرد بۆ حەڕان بەپێی نەخشەیەکی سەربازی تۆکمەو طغتکینی ئەتابەکی دیمەشقیش پەیوەندی پێوەکرد[1]، پاشا بلدوینیش بڕیاری ڕاوەدونانی سوپای ئیسلامیدا، بەلآم دەبوایە خاچپەرستەکانی یەکبخستایە پێش ئەوەی بەم کارە هەستێت، بۆیە تانکردی فەرمانڕوای ئەنتاکییەی بانگ کردو سەرکەوتووبوو لەئاشتکردنەوەی لەگەڵ فەرمانڕەوای ڕەهادا[2]، مەودودیش بەردەوام بوو لەپاشەکشەکردنیدا هەتاوەکو خاچپەرستەکان بۆ شوێنێکی دوور ڕاپێچ بکات کە لەبنکەکانییانەوە دووربێتو بەهەلگەڕانەوەی کتوپڕ بەرەو باکور، بەلآم کرداری ڕاوەدونانەکە لەپڕ وەستاو هاوپەیمانێتی خاچپەرستەکانهەلوەشایەوە، چونکە کۆمەڵێ هۆکار کۆبویەوە کەوای کرد خاچپەرستەکان واز لەڕاوەدونان بێننو پاشەکشە بکەن لەناوچەکە.

**لەوهۆکارانەش:**

- پاشا بەلدوین بەزەیی لەپلانەکەی مەودود ئاگادارکرایەوە، بۆیە گەمارۆی لەسەر قەلآی شناو هەلگرت کەدەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوایی حەڕانەوە، هەروەها لەبینولمەقەدیسەوە ئاگادارکرایەوە لەجموجۆلێکی فاطمییەکان دژ بەبەیروت بۆیە بڕیاریدا واز لەوهەلمەتە بێنێت[3].
- چەندپڕوپاگەندەیەك لەناو خاچپەرستەکاندا بلآوبوویەوە، دەربارەی ئەوەی کەرضوانی فەرمانڕەوای حلب خۆی ئامادەکردوە بۆ هێرشکردنە سەر ئەنتاکییە لەکاتی ئامادەنەبوونی ئەمیرەکەیدا، ئەمەش تانکردی ناچارکرد واز لەو هەلمەتە بێنێت.
- لەسەر ڕای پاشا، کەپێی وابوو هەوڵدانو بۆ پاراستنی ئەو شوێنانەی کەدەکەونە ڕۆژهەلآتی رووباری فوراتەوە بێ سودە، بلدوین داوای لەدانیشتوانەکەی کرد بگوێزنەوە بۆ بەری ڕۆژئاواو چەند پاسگایەکی سەربازی لەقەلآیی گەورەی ڕەهاو سروجیو چەند قەلآیەکی

---

[1] ابن القلا ننسي ذيل تأريخ دمشق ل٢٧١.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل٧٠.

[3] تأريخ الزنكيين فب الموصل وبلاد الشام ل٧٠.

بچووکدا هێشتەوە، لەگەڵ بەهێزکردنی توانای بەرگری کردن تیایدا، هەرچی مەددودیشە ئەوە هەستا بەهێزشکردنە سەر بەشی دواوەی ئەو خاچپەرستانەی کەسەرگەرمی پەڕینەوەبوون پاشان گەرانەوە بۆ موصڵ[1].

ب- **هەڵمەتی دووەمی مەودود دژ بەرەها:** هەڵمەتی دووەم پاش کەمتر لەدوو ساڵ دەستی پێکرد، دوای ئەو هەڵمەتی ئامادە باشییەی کەوەفدێکی حەلەب داوایان کرد پاش هاتنییان بۆ بەغداد بۆ بانگەوازکردن بۆ جیهاد دوای ئەوەی کەبینییان رضوان ڕۆچووە لەمل کەچکردن بۆ خاچپەرستەکانو ئەو شکستە یەکلەدوای یەکانەی کەروبەروی موسڵمانەکانی شام بویەوەو لەئاکامدا چەندین پێگەییان کەوتە دەستی دوژمنان، بانگەوازی ئەو وەفدەی حەلەب جەماوەری خەڵکی بەغداو زانایانی وروژاندو بەخۆپیشاندانێکی فراوانیان ئەنجامداو داوایانکرد لەبەرپرسەکانییان بەخەلیفەو سوڵتانەوە کەهەستن بەراگەیاندنی جیهادو ناردنی سوپا بۆ وەستاندنی پێشڕەوی خاچپەرستەکان، ئەوەبوو خەلیفە خێرا سوڵتانی سەلجوقی لەم رووداوە ئاگادارکردوەو داوای لێکرد گرنگی بەمەسەلەکە بداتو بەدەم بانگەوازی موسڵمانانەوە بێت، سوڵتانیش بەپەلە فەرمانیدا بەمەودودی فەرمانڕەوای موصڵ بەپێکهێنانی هاوپەیمانێتییەکی ئیسلامی نوێو سەرکردایەتیشی بسپێرێت بەشا مەسعودی کوڕی[2] ئەوەبوو لەژێر سەرکردایەتی مەودودی فەرمانڕوای خلاطو[3] و تەبریزو[4] و هەندێ ناوچەی دیاربەکرو ئیلغازیو ئەرتەقی کەئەیازی کوڕی لەجێی خۆیدا ناردبوو و هەردوو ئەمیری کوردی ئەحمەدیل فەرمانڕەوای مەراغەو[5]، ئەبولهەیجائی فەرمانڕەوای هەولێر لەگەڵ هەندێ لەشازادەکانی فارسدا بەسەرکردایەتی هەردوو شازادە ئەیلفکی کوڕانی ئالتی بوورسوقی فەرمانڕەوای هەمەدان[6].

هێزی هاوپەیمانەکان دەستیانکرد بەکردارە سەربازییەکانیان لەمانگی موحەررەمی ساڵی ٥٠٥ی کۆچیدا/ مانگی تەمووزی ساڵی ١١١١ز بەئازادکردنی چەند پێگەبەک لەدەستی خاچپەرستەکان لەرۆژهەلاتی فوراتدا پاشان بەرێکەوتن بۆ گەمارۆدانی رەها، ئەم هەڵمەتەش ترسی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٧٠.

[2] المقاومة الاسلامية لغزو الصليبي ل١١٥. لە الكامل في التأريخ وەرگیراوە.

[3] قصة أرمنية الوسطى.

[4] تبريز: لەبەناوبانگترین شارەکانی ئازەربایجانە.

[5] مەراغە: گەورەترینو بەناوبانگترین شوێنە لەئازەربایجاندا.

[6] ذيل تأريخ ديمش ل٢٧٩-٢٧٨.

خسته دڵی دانیشتوانەوە، بەڵام هیچ هەڵویستێکی تیادا نەگۆڕا، تۆکمەیی شارەکە خۆڕاگری خەڵکەکەی موسڵمانەکانی ماندووکرد بۆیە مەودود ناچار بوو لەفورات بپەڕێتەوە بۆ هێرشکردنە سەر تل باشر[1] بەم شێوەیە سوپای موسڵمانەکان رووی کردە تل باشر هەتاوەکو دوژمنەکانییان پەلکێش بکەن بر پەڕینەوە لەفوراتو لەوێ بەسەریاندا سەربکەون، بەڵام ئەمە هەڵەیەك بوو لەلایەن سەرکردە موسڵمانەکانەوە، چونکە خاچپەرستەکان توانییان لەکاتی پەڕینەوەییاندا لەفورات ڕێژەیەکی زۆر ئازوقەو چەكو کەرەستەی جەنگ بگوێزنەوە بۆ رەها ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوونی دوای لاوازبوونێك کەخەریکبوو شکستی پێ بێنێت لەبەردەم موسڵمانەکاندا ئەگەر بەردەوام بوونایە لەسەر گەمارۆکەیان[2]، زۆری نەخایەند جۆسلینی فەرمانڕەوای تل باشر کەرووبەرووی فشاری هێزە ئیسلامییەکان بوویەوە توانی بەرتیل بداتە سەرکردەی کوردی ئەحمەدیل کەزۆربەی هێزە موسڵمانەکانی لەگەڵدابوو ئەویش پاشەکشەی کرد، بەبێ ئەوەی گوێ بەناڕەزایی ئەمیرەکانی تر[3] پاشان رضوان هانای هێنا بۆ مەودودو هێزەکانی بانگهێشت کرد بۆ چون بۆ حەلەب هەتاوەکو پێکەوە لەوێ کاربکەن دژ بەخاچپەرستەکان، مەودودیش تەل باشری بەرەو حەلەب بەجێ هێشت هەر کەلەتل باشر دوورکەوتنەوە جوسلین بەسەرکردایەتی هێزێك لەسوارەکانی هاتە دەرەوەو پەلاماری دواوەی سوپاکەی داو توانی نزیکەی هەزار کەسییان لێبکوژێتو پاشان بەدەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە رضوانیش بۆ مەودود راستگۆیانە نەبوو ئەوەبوو هەر کەهێزە ئیسلامییەکان لەحەلەب نزیك بوونەوە فەرمانیدا بەداخستنی دەرگاکان بەروویداو چەندین رێو شوێنی گرتە بەر بۆ رێگرتن لەو خۆپیشاندانو فەرمانیدا بەدەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لەناودارانی شارەکەو وەك بارمتە بەکاریهێنان، مەودودیش ناچاربوو کەسوپاکەی بەرەو باشور بەرێت بۆ شیزەر دوای ئەوەی کەهێرشی کردە سەر چەند پێگەیەکی خاچپەرستەکان لەباکووردا، لەشیزەردا لەگەڵ طغتکین دا کۆبوویەوە کەپێشتر رووی کردبووە بەغداد بۆ داوای یارمەتی کردن بۆ گێڕانەوەی طرابلس، بەڵام ترسا دیمەشقی لەدەست بسێنن بۆیە بەنهێنی ئاگربەستی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا مۆرکردو سەبارەت بەتانکردیش کەلەبەرامبەر شیزردا سەنگەری گرتبوو ئەوە پاشەکشەی کرد بۆ ئەفامییەو پەنای برد بۆ پاشا بلدوین، ئەویش وەڵامی دایەوەو فەرمانیدا بەسوارەکانی لەرۆژهەڵاتی خاچپەرستدا کەپەیوەندی پێوەبکەن، ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆریان پەیوەندییان پێوەکرد، تانکردیش هەستا بەبانگکردنی شوێنکەوتوانی

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل٧٣.

[2] نهر الذهب للغزى (٨٣/٣).

[3] مرأة الزمان (٨/٣٥-٣٦) المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١١٦.

لەسەرجەم ناوچەکانی ئەنتاکییەوە، هەرچی مەودودیشە خۆی لەپشت شوراکانی شیزردا قایمکردو پێش ئەوەی خاچپەرستەکان کۆبنەوە کەژمارەییان شازدە هەزار سەربازبوو بەسەرکردایەتی پاشای بیتولمەقدیس و ئەمیرەکانی رەهاو ئەنطاکیە و طرابلوس دیارە مەودود نەیدەویست دوژمنانی راپێچی بکەن بۆ جەنگێکی یەکلاکەرەوە، بەڵام کاروباری سوپاکەی بەشێوەیەکی باش بەرێوەنەدەچوو، چونکە طغتکین ئامادەنەبوو یارمەتی بدات و هەتاوەکو بەڵێنی لەمەودود وەرگرت کەبەسوپاکەیەوە بەرەو باشور بڕوات بۆ جەنگکردن دژی خاچپەرستەکان لەفەلەستیندا سەربازی ترسناکی ئەم هەوڵە لەرووی سەربازییەوە، سەبارەت بەبرسقی کوردیش ئەوە توشی نەخۆشی بوو ویستی بەرەو ولاتەکەی بگەرێتەوە، شقمانی قطبی‌ش کتوپڕ کۆچی دوایی کرد سەربازەکانیشی بەرەو باکور بەتەرمەکەیەوە کشانەوە ئەحمەدیلیش دەستپێشخەر بوو لەپاشەکشەکردن بەسەربازەکانییەوە لەهەولێدا بۆ دەستگرتن بەسەر هەندێك لەمۆڵکەکانی سقماندا، بەم شێوە مەودود نەیتوانی هێرش بکات بەهۆی کەمبوونەوەی رۆژ لەدوای رۆژی هێزەکانی، هەروەها ئامادەنەبوو زستان لەدەرەوەی موصلدا بەسەربەرێت بۆیە بەرەو موصل گەرایەوە[1]. ئەم دەستپێشخەرییە خراپانە کەلەلایەن هەندێ ئەمیرەوە روویدا کاریگەری راستەوخۆی هەبوو لەسەر ئەگەری بەدەستهێنانی هەر سەرکەوتنێکی یەکجاری بەسەر بەخاچپەرستەکاندا، وەك ئەوەی کەجکرمش و سقمان لەجەنگی بەلیخدا بەدەستیان هێنا، ئەم ڕووداوانەش ڕادەی پەرتەوازەیی سەرکردە ئیسلامییەکان و یەکنەبوونیانی دەرخست، لەوکاتەدا کەهێزە خاچپەرستەکان لەباکورو باشوری شامدا کۆبوونەوەو جۆرە دەسەلات و سەرکردایەتییەکیان بۆ بلدوینی پاشای قودس بەخشی بەسەر سەرجەم ئەمیرە خاچپەرستەکاندا[2].

سیاسەتی رضوان لەئیمارەتی حەلەبدا هەمووی شەربوو ئەوە بوو ئاشتەوایی لەگەڵ ئیسماعیلی و خاچپەرستەکاندا کردو بوو بە بەهاوپەیمانییان دژ بەدوژمنە موسوڵمانەکانیان لەموسڵمانان، هەروەها چووە پاڵ فەرمانڕەوایی ئەنتاکییە دژ بەجاولی فەرمانڕەوای موصل لەساڵی ٥٠١دا، کاتێ شازادە مەودودی فەرمانڕەوای و موسڵیش هێرشی کردە سەر ئەنتاکیەو تل باشر رضوان ئاماندەنەبوو هاوکاری بکات و دەرگاکانی حەلەبی بەروودا داخست، بەڵکو لەگەڵ تانکەردی خاچپەرستدا هاوپەیمانێتی کرد کەفەرمانڕەوای ئەنتاکییە بو دژ بەموجاهییدەکان، دەرگاکانی شارەکەش حەفدە شەو بەداخراوی مایەوە بەروی سوپای ئیسلامدا[3]، بەلام خاچپەرستەکان ئەم

---

[1] مرآة الزمان (٨/٣٥-٣٨) المقاومة الأسلامية عماد الدين ل١١٨.

[2] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبيل١١٨.

[3] زبدة الحلب (١٥٩/٣) الجهاد والتجديد ل١١٩.

هەڵوێستانەی رضوانیان لەبەرچاو نەگرتو هەستان بەگەمارۆدانی حلب لەساڵی ٥٠٤داو گەمارۆکەشیان توندکرد، هەتا ئەوەبوو خەڵکی ئاژەڵی مردارەوەبوو و گەڵای دارییان دەخواردو رێژەیەك پارەییان قەرزکرد بەسەر رضواندا کەساڵانە بۆی دەبردن[1]، هەروەها ئیسماعیلیە باطنییة شیعەکان پلەو پایەیەکی بەرزییان هەبوو لەحەلەبدا، بەهۆی لایەنگیری رضوان بۆ راکانییان‌و یارمەتیدانیان پاش ئەوەش هەستا بەبەکارهێنانیان لەتیرۆرکردنی رکابەرە سیاسییەکانیدا[2]، هەروەها مەیلی بۆ فاتمەییەکانیش هەبوو، بۆیە وتاری بەناوی مستعلی‌و أفضلی وەزیرییەوە دەخوێندەوە ئەم وتارانەش دوو ساڵی خایاند لەحەلەبدا، هەروەك ژیانامەیەکی خراپی هەبوو، باطنییەکانی لەخۆ نزیك کردەوەو یانەی بانگەوازی لەحەلەبدا بۆ کردنەوەو ئەمەش بوە هۆی زۆربوونیان هەتاوەکو لەساڵی ٥٠٧دا لەناوچوو[3] مێژوو نوس ئەبولمەحاسن لەوەسفیدا ئەڵێ: زۆر روژدوو خراپەکاربووە لەدڵیدا بەزەیی بەرامبەر بەژێردەستەکان نەبوو، لەو کاتەشدا فەرەنجەکان بەردەوام بوون لەسەر هێرش‌و تاڵانکاری.....و رضوانیش هیچ خۆی تێ نەدەگەیاند[4] پاشان ئەلب ئەرسەلانی کوڕی شوێنی گرتەوە کەناسرابوو بەأخرس–واتە لاڵ، ئەویش هەستا بەلێدانی ئیسماعیلییەکان‌و کوشتنی أبو طاهری صائغ وسەرکردەکانی تریان.

ج- **هەڵمەتی سێیەمی مەودود دژ بەرەها:** لەگەڵ ئەوەدا کەمەودود خۆی تەنها بینییەوە لەبەرەی جیهادو تێکۆشاندا، بەڵام لەمانگی ذی القعدةی ٥٠٥ك/ئایاری ١١١٣زدا هەستا بەهێرشکردنە سەر رەها بەشێوەیەکی کتوپڕو گەمارۆی بەسەردا سەپاند، بەڵام ئەم شارە توانی خۆراگربێت لەبەرامبەریدا، بۆیە وای بەباشزانی هێزێکی سەربازی لەدەوروبەریدا بهێڵێتەوەو هێرش بکاتە سەر سروج لەمانگی محەرەمی ساڵی ٥٠٦ك/تەموزی ١١١٣زدا بەو پێیەی کەپێگەی دوومی خاچپەرستەکانن لەرۆژهەڵاتی فوراتدا بەپێی ئەم پلانە سەربازیەش مەودود هەستا بەدابەشکردن‌و بێ هێزکردنی سوپاکەی‌و دەستبەرداری وریایی خۆی بوو لەبەرامبەر خاچپەرستەکاندا، دەرەنجام جوسلینی فەرمانڕەوای تل باشر پیایدا گەشتەوەو کۆمەڵێکی زۆر لەسەربازەکانی کوشت‌و شکستی پێ هێنا، ئەویش ناچاربوو پاشەکشەبکات بۆ رەها، بەڵام جوسلین پێشی کەوت بۆ یارمەتیدانی بلدوین دی بررج لەبەرگریکردن لەشارەکەی، لەوکاتەشدا کەئەم رووداوانە روویدەدا ئەرمەنەکان هەستان بەپلانگێڕان

---

[1] الكامل في التأريخ (٥٤٤/٨).

[2] الجهاد والتجديد ل١١٩.

[3] الكامل فب التأريخ (٥٣٣/٨) سير أعلام النبلاء(٣١٥/١٩).

[4] النجوم الزاهرة(٣٠٥/٥).

لــەرەهادا دژ بەبلــدوینو پەیوەنــدییان کــرد بەمــەودودەوە هــەتاوەکو لەدەســەڵاتی خاچپەرستەکان رزگارییان بکات، ئەوەبوو رێککەوتن لەسەر ئەوەی کەیارمەتی بدەن بۆ دەستگرتن بەسەر قەڵایەکدا کەکەرتی رۆژهەڵاتی شارەکەی پێ کۆنترۆڵ دەکرێتو توانای دەستگرتنیشی بەسەر بەشەکەی تریدا مسۆگەردەبێت، بەڵام گەشتنی خێری جوسلین بووە رێگر لەبەردەم جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکەداو موسڵمانەکان بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوەو نویانتوانی ئەو شارە لەدەست خاچپەرستەکان بسێننەوە[1].

د- **هەڵمەتی مەودود دژە بەمیرنشینی بەیتولەقەدیس:** جەنگی "الصنبرة"[2] مەودود هەر بەردەوام بوو لەسەر پابەندبوونی بەبیرۆکەی جیهادەوە دژ بەخاچپەرستەکان، ئەمەش ئەو ئەرکەبوو کەسوڵتانی محەمەدی سەلجوقی پێی سپاردبوو، بەو پێیەی کەنوێنەری بوو لەجەزیرەو وڵاتی شامدا ئەوەبوو لەسەرەتای ساڵی ٥٠٧ك/ حوزەیرانی ١١١٣ی ز بەسەرکردایەتی هاوپەیمانێتییەکی ئیسلامی کەوتەڕێ بۆ کوشتاری خاچپەرستەکان لەبیت المقەدسدا وەك بەدەمەوەچونێك بۆ هانا هێنانی طغتکین ی ئەتابەگی دیمەشق بۆی دوای ئەوەی کەمیرنشینەکەی رووبەرووی هێرشی توندبوویەوە لەلایەن خاچپەرستەکانی بیت لمەقدیسەوە کەلەدۆڵی ئەلتیمەوە دزەییان کردبوو بۆ ناوچەی بیقاعو لەوێشەوە گەیشتبوونە بەعلەبەك، پاشان تمیرکی فەرمانڕەوای شەنگارو ئەیازی کوڕی ئیلغازی ئەمیری ماردینیش هاتنە ناو ئەم هاوپەیمانێتییەوە[3]، مەبەستی موسڵمانەکانیش ناوچەی فەلەستین بوو سەرکەوتووش بوون لەپەلکێشکردنی پاشا بلدوین بۆ ناوچەی دیمەشق هەتاوەکو پردی الصنبرەکەئەکەوێتە رێڕەوی سەرەوەی رووباری ئوردن، لەسیانزەی مانگی موحەرەمیشدا رووبەرووبونەوەکە دەستی پێکرد کەبەسەرکەوتنی موسڵمانەکان کۆتایی پێهاتو خاچپەرستەکان بەتەواوی تێکشکانو، پاشای بەیتولمەقەدیسیش گەرایەوە بۆ طبرية[4]، بەڵام زۆری نەخایەند رۆجەری ئەمیری ئەنتاکییەو بونزی ئەمیری طرابلوس هاتن بەهانایەوە، بەڵام ئەمیری رەها نەیتوانی بەهانایەوە بێت، چونکە میرنشینەکەی پێویستی بەپاراستنی بەردەوام هەبوو[5]. ئەوەبوو موسڵمانەکان پاش جەنگەکە لەپێشڕەویاندا بەردەوامبوون

---

[1] تأريخ النكيين في الموصل وبلاد الشام ل٧٦.

[2] الضبرة: شوێنێکە لەئوردن بەرامبەر عەقەبەی ئەفیقە، لەنێوان ئەوێو گبریە دا سێ رێگایە.

[3] الكامل في التأريخ (٨/٥٥٠).

[4] هەمان سەرچاوە (٨/٥٥٠).

[5] ذيل تأريخ دمشق ل٢٩٤-٢٩٧.

هەتاوەکو گەشتنە طبرية، بەڵام لەوێ ڕووبەڕووی هاوپەیمانێتی خاچپەرستەکان نەبوونەوە، بەتایبەت کەوەرزی زستان دەستی پێکردبوو، بۆیە پاشەکشەیانکرد بۆ دیمەشق[1] ئەوەش یەکەمجاربوو کەموصڵو دیمەشق هاوکاری یەك بکەن لەجەنگدا دژ بەخاچپەرستەکان لەمەملەکەتی بەیتولمەقەدیسدا، گرنگی ئەتابەك مەودودیش لەوەدایەکە: متمانەی گێڕایەوە بۆ موسڵمانەکانو لەبەرگریەوە گۆڕان بەرەو هێرشبردنو بیرۆکەی یەکێتی موسڵمانانیان خستە بواری جێبەجێکردنەوەو ڕەهەندێکی سیاسیو سەربازی پێداو، بەم شێوەیە ئەمیرەکانییان ئامادەی هاوکاری بەرهەمداربوون بەنییەتی پاکەوە[2].

٥- **کوژرانی مەودود:** مەودودو هاوپەیمانەکەی نێردراوێکیان نارد بۆ لای سوڵتانی سەلجوقی لەئەسفەهانداو مژدەییان پێدا بەوسەرکەوتنەی کەلەسەر دەستییان بەدی هاتووە، هەندێ لەدەستکەوتەکانیشییان نێردراوەدا نارد لەگەڵ چەند دیلێکی فەرەنجو سەرەکانیان، بەڵام دووری موسڵمانان لەوڵاتی خۆیانەوەو بڕانی کۆمەكو ئازوقەو لێیانو ساردی کەشو هەوا ناچاریکردن کەکردەوە سەربازییەکانییان بوەستێننو بگەڕێنەوە بۆ دیمەشق لەبیستو یەکی ڕەبیعی یەکەمدا بەهیوای ئەوەی دووبارە بگەڕێتەوە بۆ کوشتاری خاچپەرستەکان لەبەهاردا دوای ئەوەی کەمەودود وەڵامی نامەکەی لەسوڵتانەوە پێ بگاتو ڕێنماییەکانی لەوبارەیەوە بەدەست بگات[3] ئەوەبوو لەرۆژی هەینیدا لەمانگی ڕەبیعول ئەوەلدا چووە مزگەوتی دیمەشقەوە هەتاوەکو لەگەڵ طغتکیین دا نوێژی تییادا بکەن کاتێ لەونوێژبوونەوەو هاتنە دەرەوە بۆ حەوشی مزگەوتەکەو دەستی لە دەستی طغتکیین دابوو، باطنیەك پەلاماری داو خەنجەرێکی لێداو چوارجار بریندارى کرد، پاشان کابراییان کوشتو سەریان پەڕاندو کەس نەیدەناسیو پاشتر سوتاندیان، هەستان بەسووتاندنی، لەوکاتەشدا مەودود بەرۆژوبوو، هەڵیانگرتو بردییان بۆ ماڵی طغتکیینو زۆر هەوڵیاندا ڕۆژوەکەی بشکێنێ، بەڵام رازی نەبوو وتی : ئەمەوێ بەزمانی بەرۆژووەوە بەخزمەتی پەروەردگار بگەم/ ئەوەبوو هەر لەو ڕۆژەدا گیانی سپارد ڕەحمەتی خوای لێ بێت[4]، موسڵمانانیش زۆر کاریگەربوون بەکوشتنی پاڵەوانێك لەپاڵەوانەکانی جیهاد کەناسراوبوو بەدڵسۆزیو لێبڕانو بوێری، زۆر دڵتەنگبوون بۆ مەرگی خێرای، دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەی لەگەڵ

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٩٧.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل٧٧.

[3] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١٢٢.

[4] الكامل في التأريخ (٨/٥٥١).

هاوپەیمانەکەیدا لەناوجەرگەی وڵاتی خاچپەرستەکاندا بەدەستی هێنا، خەڵکی دیمەشقیش بێزاریو تورەیی خۆیان دەربڕیو ئەو شارە شڵەژانێکی بەخۆوە بینی کەماوەیەکی زۆربوو شتی وای بەخۆوە نەبینیبوو خەڵکەکەی بەهیچ دانەدەمرکان تەنها بەئومێدی ئەوەنەبێت کەبرینەکانی سەخت مەبێتو رزگاری بێت، بەڵام زۆری نەبرد هەواڵی شەهیدبوونیان پێگەیشت دوای چەند کاتژمێرێکی کەم، بۆیە دووبارە گەرانەوە سەرباری پێشووی خۆیانو دڵتەنگیو خەم باڵی بەسەردا کێشان[١]، پاشای فەرمانڕەوای بەیتولمەقەدیسیش نامەیەکی نوسی بۆ طغتکیین کەتیایدا هاتبوو: ئومەتێك کەسەرکردەکەی لەرۆژی جەژندا لەماڵی پەروەردگارەکەیدا بکوژرێت شیاوی ئەوەیە خوا لەناوی بەرێت[٢]!! بەڵام پاشای فەرەنجو ئەمیرە خاچپەرستەکانی تر نەیاندەزانی یان خۆیان واپیشاندەدا کەنازانن ئەوەی کەهاوکاری ئەوانو مەترسی گەورەیە بۆسەر هەر هەوڵێکی ئیسلامی بۆ کوشتارییان خودی ئەو ئومەتە نییە کەوایاندەزانی سەرکردەکەی خۆی کوشتووە، چونکە هەڵوێستی ئەم ئومەتەمان باسکرد بەرامبەر ئەو پاڵەوانە مووجاهیدە، بەڵکو ئەوە ئەو کۆمەڵە باطنییە شیعە داخ لەدڵەیە کە لەسەر مەزهەبێکی نوێ بنیات نراوە کەئارەزوویەکی زۆری وێرانکاری هەیەو پێشتر لەوڵاتی فارسدا دامەزرێنرا لەلایەن کەسێکەوە بەناوی حەسەنی کوڕی صباح کە پێشتریش باسمانکرد دەوڵەتی فاطمی شبعەی باطنی ش کۆمەکیان کرد، هەرگیز رقی ئەو حەشاشانە بەرامبەر بەگاورەکان زیاتر نەبوو لەرقییان بەرامبەر بەموسڵمانە سوننییەکان[٣] ئەوەش ئەمڕۆ دەیبینین باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەمە.

و- **ئەو دەرەنجامانەی کەلەناکامی هەڵمەتەکانی پاڵەوانی ئیسلامی مەودودەوە بەدەست هاتن:** وێڕای ئەو شکستانەی کەدووچاری هەڵمەتەکانی پاڵەوانی ئیسلام مەودودەدبوبەوە، بەڵام چەند دەرەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوە لەرێڕەوی مێژووی بزاوتی جیهادی ئیسلامیدا دژ بەخاچپەرستەکان کەئەتوانین لەم خاڵانەدا کۆیان بکەینەوە:

● **میرنشینی مەودود:** وێڕای کەمی ماوەی– بەخاڵێکی وەرچەرخان دادەنرێت لەمێژووی ململانێی ئیسلامی–خاچپەرستدا لەو قۆناغە بەراییەدا، ئەوەبوو بیرۆکەی جیهاد بووە

[١] تأريخ دمشق لابن القلانسي ل١٨٧–١٨٨.

[٢] الكامل في التأريخ (٨/٥٥١).

[٣] المقاومة الأسلامية للغزو الصليبي ل١٢٤.

حەقیقەتێکی بەرجەستەکراو[1]، سوارچاکی دڵسۆزی خۆی دۆزییەوە کە بۆ ماوەی نیوەی ئەو ماوەییەی کەتیایدا فەرمانڕەوای موصڵ بوو ئاڵاکەی هەڵگرت[2].

- ئەتوانین هەڵمەتەکانی مەودود دابنێین بەپێشەکییەك بۆ هەڵمەتەکانی عمادالدین زەنگی بە لەبەرچاو گرتنی ئەو سێ دەیەی کە لەنێوان سەردەمی هەردووکیاندابوو و بووە هۆی رووخانی میرنشینی رەهای خاچپەرست لەساڵی ١١٤٤ز/٥٣٩ك، ئەوەبوو مەودود هەڵمەتە یەکەمەکانی ئاراستەی رەهاو تِل باشر کردو کاری دەکرد بۆ ماندوکردنی خەڵکی بەشێوەیەك کەئەتوانین رێخۆشکەری وەسف بکەین بۆ هەوڵەکانی زەنکی، بەو پێیەی کەکاروانی جیهاد زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراوەو سەرکردە لەدوای سەرکردە درێژەی پێ دەدات.
- هەڵمەتەکانی مەودود لاوازی هێزە ئیسلامییەکانی وڵاتی شامو جەزیرەو نادڵسۆزی هەندێکییانی دەرخست بۆ مەسەلەی جیهاد دژ بەخاچپەرستەکان[3] سەرباری ئەو رۆڵە پێشەنگانەش کەمەودود پێی هەستا، هێشتا هەندێ کەس دەبینین کەپێی وایە عماالدین زەنکی دانەری بەردی بناغەی جیهاد بووە دژ بەخاچپەرستەکان[4]، ئەمەش مافخواردنو ناحەقییەکە بەرامبەر بەرۆڵی ئەو سەرکردە سەلجوقییە، ڕاستی مەسەلەکەش ئەوەیە: کەئەو مێژوونوسانەی کەمێژووی ئەو قۆناغەیان نوسییوەتەوە کەقۆناغی ململانێی ئیسلامیو خاچپەرستییە سەرسام بوون بەو رۆڵە گەورەو ئەو دەسکەوتە مەزنانەی کەعماالدین زەنگی بەدەستی هێناوە، وەك رووخانی یەکەم میرنشینی خاچپەرست کەلەناوچەکەدا دامەزرا لێرەشەوە واتێگەشتوون کەقۆناغەکانی پێش تر گرنگیو بایەخێکی ئەو تۆییان نەبووە، لەکاتێکدا کەرێخۆشکەری سەرەکی بووە بۆ ئەو دەسکەوتەی ساڵی ١١١٤ز/ ٥٣٩ك ئەبێ رۆڵی پڕوپاگەندە کاریو سیاسی سەرکەوتوو کاریگەری مێژوونوسی عێراقی مەزن ئیبن الآثیر یش لەیادنەکەین کەلەرێی کتێبە نایابەکەیەوە دەربارەی دامەزرێنەری خانەوادەی زەنکی وای لەمێژوونوسان کردوە کە بەجۆرێك لەجۆرەکان کاریگەرین پێی، بەشێوەیەك کەعماالدین زەنگی خستە ئەو هەلۆیستەوە لەرووی هەڵسەنگاندنی رۆڵی مێژوییەوە، دیارە هێندە بەسە بۆ مەودود کەسەرکەوتووبوو لەلێدانی بوونی خاچپەرستنی لەجەلیل دا، کەناوچەیەکە بۆ ماوەی دوو دەیە بوو چالاکی موسڵمانەکانی پێ گەشتبوو ، هەروەها

---

[1] شرف الدين مودود ل١٥٠ عبدالغبي رمضان.

[2] الحوب الصليبية بين الشرق والغرب ل١٥٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل١٥٦.

[4] هەمان سەرچاوە ل١٥٧.

ئەوەندەی بەسە کەسەرکەوت بەسەر دامەزرێنەری شانشینی بەیتولمەقەدیسدا، ئەشتوانین بگەینە دیدێکی هاوبەش بەوەی کەپێمان وابێت کەسەرکردەکانی جیهادی ئیسلامی تەواوکەری یەکترن‌و هیچ ناکۆکییەك لەنێوانییان دانییە ئەوەش کەمەودود پێی هەستا-دواتر سودی هەبوو بۆ سەرکردەی مەزن صلاح الدینی ئەیوبی، بۆیە ئەتوانین بڵێین ئەمرۆ صنیرەیەو سبەینێ حطین، سیاقی گشتی مێژووی ئەو ناوچەبەش لەسەدەی شەشی کۆچی‌و دوازدەی زاینیدا ئەمە دوپات دەکاتەوە[1]، بەهەرحاڵ لەکاتی بەراودکردنی هەوڵەکانی مەودود لەگەڵ پێشنانی خۆیدا وەك کربۆقاو جکرمش‌و جاولی سقاوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو رۆڵانە پلەپلەو هەڵکشاوە، چونکە کەربۆقا تەنها خەریکبوو بەدەمەوەچوونی ئەنتاکییەو جکرمیش کەمێك زیاتری کرد بەهۆی هاوپەیمانێتی کردنی لەگەڵ سقمانی کوڕی ئەرتەقدا بەشێوەیەك کەبووە هۆی سەرکەوتنی لەجەنگی حەڕاندا ٤٩٨ك/ ١١٠٤ز، بەڵام مەودود رۆڵی گەورەتربوو بەشێوەیەك کەتوانی شکست بەخاچپەرستەکان بێنێت لەجەنگی الصنیرەدا لەساڵی ٥٠٧ك ١١١٣ز دا، ئەمەش بۆمان ئەسەلمێنێ کە لەماوەی نۆ ساڵدا توانی دوو شکستی گەورە بەسەر خاچپەرستەکاندا بێنێت، بەڵام ئەو کۆسپەی کەهەبوو بریتی بوو لەسود وەرنەگرتن لەو دوو سەرکەوتنە بۆ راماڵینی دوژمنان لەناوچەکانییانداو سەرکەوتنی خێراو کتوپڕ بەسەریاندا بەجۆرێك کەنەتوانن قەرەبووی زیانەکانیان بکەنەوە ، بەڵام پاشماوەی دیاردەی پەرتەوازەبوونی سیاسی‌و رقەبەرایەتی نێوان سەرکردە ئیسلامییەکان رێگربوو لەبەردەم بەدیهاتنی ئەم مەسەلەیەدا[2].

٦- **نجم الدین ئیلغازی فەرمانڕەوای ماردین:** بزاوتی جیهادی ئیسلامی دژ بە خاچپەرستەکان پەیوەندییەکی بەهێزی هەبوو بەسەرکردەکانی موصڵەوە ئەوانەی کە لەژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکاندابوون، هەروەك کۆچی دوایی سوڵتان محەمەدی کوڕی مەلەکشابوو بەهۆی بانگهێشتکردنی ئەقسنقر لەموصڵەوە هەتاوەکو شحنکیەتی بەغدای بێ بسپێردرێت[3]، ئەو کارەی کەبووە هۆی ئەوەی موسڵ پێگەو گرنگی خۆی بەشێوەیەکی کاتی لەدەست بدات لەڕابەرایەتی بزاوتی جیهاددا دژ بەخاچپەرستەکان‌و گواستنەوەی ئەم ڕابەرایەتییە بۆ نجم الدین ئبلغازی فەرمانڕەوای ماردین ئیلغازیش کارەکانی بەدەست گرتن بەسەر حەلەبدا دەست پێکرد لەساڵی ٥١١ك/ ١١١٧ز لەبەرگرنگی بۆ هەر سەرکردایەتییەکی سەربازی‌و

---

[1] الحروب الصلیبیه العلاقات بین الشرق ولبغرب ل١٥٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٥٨.

[3] الوافي بلوفیات (٣١٠/٩) النجوم الزهرة (٣١٤/٥).

سیاسی کەبیەوێ ڕووبەڕووی خاچپەرستەکان ببێتەوە ئەمەش بەهۆی ئەو تایبەتمەندییە گرنگانەوە کەتیایدابوو وەك ناوەندێکی ستراتیژی گرنگ لەرووی مرۆییو سەربازیو سیاسیو ئابوورییەوە، هەروەها حەلەب دەکەوتە نێوان دوو میرنشینی خاچپەرستەوە کە ئەوانیش رەهاو ئەنتاکییەبوون، لەهەمان کاتیشدا ئەتوانێ پەیوەندی بکات بەهێزە ئیسلامییە تورکمانانەوە کە لەناوچەی جەزیرەدا بلاوبوونەوە، بۆیە دەست بەسەراگرتنی وەك کردنەوەی دەرگاوابوو بۆ سەرکردایەتی بزاوتی جیهاد هەر ئەمەش بۆ نجمالدین ئیلغازیو بلکی کوڕی بەهرامی برازایو دواتریش ئوقسنقری برسقیو عمادالدین زەنکیو نورالدین محمود روویدا[1]، سەبارەت بەووردەکارییەکانی دەستگرتنی نجم الدین ئیلغازی بەسەر حەلەبدا لەساڵی ٥١١ك/١١١٧زدا ئەوە هێندە شت تیایدارووییدا کەتەماعی خستە بەر خاچپەرستەکان هەتاوەکو دەست بگرن بەسەریدا، چونکە لاوازیو تەنگژەی ئابووری زۆری بۆ هێنابوو بەرادەیەك کەخەڵکەکەی دەستەوسان کردبوو لەبەرامبەر پێشکەشکردنی ئالف بۆ ئاژەڵەکانییان، بەلام لەبەر مەترسی دەست بەسەراگرتنی شارەکەیان لەلایەن خاچپەرستەکانەوە ناچاربوون هانابەرن بۆنجم الدین ئیلغازیو لەهەمان ساڵدا حەلەبی بەدەستەوەبدەن نجم الدین ئیلغازیش دەستی دایە بەهێزکردنی دەسەلاتی لەهەندێ شوێندا وەکو بالنسو هەندێ پیاوی حەلەبی دەستگیرکرد هەتاوەکو پارەییان لێ وەرگرێت بۆ رێککەوتن پێی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا، بۆیە خەڵکی حەلەب لەخۆیو سەربازەکانی بێزاربوون بەقسەی أبن العدیم–و ئەمەش ناچاریکرد حەلەب بەجێ بهێڵێتو بەرەو ماردین بەرێ بکەوێت دوای ئەوەی کەحسام الدین تمر تاشی لەجێی خۆیدا دانا، ئەوەبوو سەربازەکانی لەبالنسدا ئەو گرانییەیان قۆستەوە کەرووی تێکردبوونو لەهەمان ساڵدا ٥١١ك/ ١١١٧ز، ناردیان بەدوای خاچپەرستەکاندا هەتاوەکو ئەو شارەییان بدەن بەدەستەوە، ئەمەش ئیلغازی ناچارکرد بۆ گەرانەوە بەسەرکردایەتی هێزێکی تورکمان بەرەو حەلەب، کاتێ خاچپەرستەکان هەستیان بەمەترسی کرد، باشە کشەیانکردو دووبارە ئیلغازی دەستی بەسەراگرتەوەو پاشان گەرایەوە بۆ ماردین دوای ئەوەی ئاگربەستێکی لەگەڵدا مۆرکردن کەنابێ هیچ لایەکییان دەستدرێژی بکاتە سەرموڵکی ئەوی تریان[2].

[1] الأمارات الأرتقية في بلاد الشام والجزيرة ل٢٣٤–٢٣٥.

[2] زبدة الحلب (١٨٠/٣) الجهاد ضد الصليبين في الشرق الأسلامي ل١٣٥.

●هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەکە لەلایەن خاچپەرستانەوە،بەڵام خاچپەرستەکان بارودۆخەکەیان بەگونجاو زانی پاش دەرچوونی ئیلغازیو هێرشیان هێنایە سەر عزازو گەمارۆییان لەسەرتوندکرد هەتاوەکو موسڵمانەکانییان ناچارکرد کەخۆییان بەدەستەوەبدەن، خەڵکی حەلەبیش ناچاربوون نامەبنوسن بۆ خاچپەرستەکانو داوای پابەندبوونییان بەڕێککەوتنەکەوە لێ بکەن کەئیلغازی مۆری کرد لەگەڵیاندا، خەڵکی حەلەبیش لەبەرامبەردا تل هراقییان بەدەستەوە ئەدەنو ئەو بڕەپارە دیاریکراوەش کەهەزاردینارە لەبری چوار مانگ رادەست دەکەن لەبری ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای حەلەب[1].

کاتێ نجم الدین ئیلغازیش هەواڵی حەلەبی پێ گەیشت زۆر تورەبوو ، بەڵام نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ حەلەبو رزگاری بکات لەوبارودۆخەدا لەبەرکەمی سەربازەکانی بۆیە بەرەو ڕۆژهەلاتی ناوچەی جەزیرە کەوتەڕێ بەمەبەستی کۆکردنەوەی سەرباز لەهەمان کاتدا ظهیر الدین طغتکین ئاگاداری کردبووەوە لەئارەزووی بۆ ئەنجامدانی کۆبوونەوە لەگەڵیدا لەساڵی ٥١٣ك/ ١١١٨ز، ئەوەبوو لەقەڵای دوسردا بەمەبەستی دورخستنەوەی خاچپەرستەکان لەحەلەب کۆبوونەوە، بەڵام ئەم کارەییان بۆ ئەنجامنەدرا، ئەمەش وایکرد لەخاچپەرستەکان کەدەسەڵاتی خۆییان بەسەر دەروازەکانی حەلەبدا بەهێزتر بکەن دوای ئەوەی کەدەستییان گرت بەسەر بەزاغەدا بەم شێوەیە بارودۆخی حەلەب بەرەو خراپی ڕۆیشت هەتاوەکو گەشتە ڕادەی لەناوچوون بەقسەی ابن العدیم[2]، خەڵکی حەلەبیش ناچاربوون کەهانا بەرن بۆ خەلافەتی عەباسیو دەوڵەتی سەلجووقی لەبەغدا، بەڵام کەس بەهاناییانەوە نەهات بەهۆی سەرقاڵبوونی سەلجوقییەکان بەکێشە خێزانییەکانەوە لەلایەكو لاوازی خەلافەتی عەباسیش لەلایەکی ترەوە.

●ڕاگەیاندنی رەشبگیری- نفیر-دژ بەخاچپەرستەکان: نجم الدین ئیلغازی نەیتوانی رووبەرووی خاچپەرستەکان ببێتەوە، چونکە لەطغتکیین جیابوویەوەو گەرایەوە بۆ ماردین بۆ کۆکردنەوەی سەرباز وەك ڕێخۆشکەریەك بۆ گەرانەوە بۆ جیهادو ڕووبەرووبونەوەی خاچپەرستەکان لەجەنگێکی یەکلاکەرەوەدا[3]. ئەوەبوو لەماردین ئیلغازی زیاتر لەبیست هەزار تورکمانی کۆکردەوە[4]، بەمەبەستی جەنگ کردن دژ بەخاچپەرستەکان کەگەمارۆیەکی توندی حەلەبییان دابوو بەشێوەیەك کەخەریك بوو خۆراکییان لێببڕێت، هەروەها ئیلغازی

---

[1] زبدە الحلب (٣/١٨٥-١٨٦).

[2] هەمان سەرچاوە (٣/١٨٦).

[3] هەمان سەرچاوە (٣/١٨٦).

[4] هەمان سەرچاوە(٣/١٨٧-١٩٠).

نێردراوی نارد بۆ بەغدا هەتاوەکو ڕەشبگیر نەفیر ژ بەخاچپەرستەکان ڕابگەیەنێت‌و خەلیفەی عەباسی المسترشد باللە‌و سوڵتانی سەلجوقی مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی مەلەکشاهیش لەوکارەی خاچپەرستەکان دژ بەوڵاتی جەزیرە ئاگاردار بکاتەوە کەهەستاون بەدەست گرتن بەسەر قەڵایەك لەنزیك ڕەهاو عطیری فەرمانڕەواییان کوشتووە[1]، ئەوەبوو نجم الدین ئیلغازی پێشتر لەگەڵ طغتکیین دا ڕێك کەوتبوو لەساڵی ٥١٣ك/١١١٨ز لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان لەمانگی صفری ساڵی داهاتوودا ٥١٣ك/١١١٩ز لەشام ژ ئیلغازیش پێش ئەو وادە دیاریکراوە بەرەو ڕەها کەوتەڕێ‌و گەمارۆیەکی توندی بەسەردا سەپاند، ئەمەش خاچپەرستەکانی ناوی ناچارکرد کەرێککەوتنی لەگەڵدا مۆربکەن بەرامبەر بەئازادکردنی ئەو دیلە موسڵمانانەی کەلایانە ، ئەویش بەمەرازی بوو مەرجیشی بۆ دانان کەنابێ بەرێ کەون بۆ یارمەتیدانی ئەمیری ئەنتاکییە لەحاڵەتی ڕوودانی ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵیدا ئەوانیش ڕەزامەندییان پێشاندا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر لاوازی‌و ملکەچی خاچپەرستەکان لەناوچەی جەزیرەدا بۆ داخوازییەکانی ئەمیرە موسڵمانەکان[2].

- جەنگی ساحە الدم-گۆرەپانی خوێن- دوای ئەوەی کەئیلغازی دڵنیابوو لەوەی کە لەپشتەوە لێی نادرێت بەرەو وڵاتی شام کەوتەڕێ‌و ئوسامەی کوڕی مبارەکی کوڕی شبل کلابی ئەمیر طغان ئەرسەلانی فەرمانڕەوای بەدلیس‌و ئەرزنیش هاتنە ناو سوپاکەیەوەو پێکەوە بەرێکەوتن هەتاوەکو گەشتنە نزیکی الأثارب لەزەوی سەرمەدا لەرەبیعی یەکەمی ساڵی ٥١٣ك/١١١٩ز داو لەوێ چاوەڕوانی گەشتنی ظهیر الدین طغتکیینی دەکرد، خاچپەرستەکانیش بەسەرکردایەتی ڕۆجەری فەرمانڕەوای ئەنتاکیە لەتل عفریندا جێگیربووبوون‌و دەستیاندایە دروستکردنی شورایەك تیایدا، بەڵام بەخەیاڵیاندا نەدەهات کەنجم الدین ئیلغازی لەو شوێنەدا بدات بەسەریاندا، هەروەها وایاندەزانی کە (أثارب) یان (زوردنا) یان دەست دەکەوێت، تەنانەت ئەوەندە لەخۆ بایبوون بەهۆی تۆکمەیی شوێنەکەیانەوە ناردییان بۆ لای ئیلغازی‌و پێیان دەوت: خۆت ماندوومەکە بەهاتن بۆ لامان ئێمە خەریکە دەگەینە لات[3]، پاش درێژەکێشانی چاوەڕوانی ئیلغازی بەدیار هاوپەیمانەکەیەوە، وەڵامی خواستی ئەمیرەکانی دایەوە بۆ هێرشکردنە سەر خاچپەرستەکان بەشێوەیەکی غافڵگیرانە ئەوەبوو خاچپەرستەکان بەخۆییان نەزانی هەتاوەکو پەرچەمی

---

[1] الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي ل١٥٣.

[2] الامارات الارتقية في بلاد الشام والجزيرة، عماد الدين خليل ل٢٤١.

[3] زبدة الحلب (٣/١٩٠) الجهاد ضد لبصليبين ل١٥٤.

موسڵمانەکانییان بینی کە لەهەموو لایەکەوە دەوری دابوون، ئەمەش لەرۆژی هەینی شازدەی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥١٢ك/١١١٩ز دا بوو پاشان قازی حلب ابو الفضل خشاب هاتە دەرەوە وتارێکی بەپێزی دا بۆ موسڵمانەکان‌و ورەی بەرزکردنەوەو هیمەتی جوڵاندن بۆ جیهادکردن، بۆیە موسڵمانان لەهەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەر خاچپەرستەکان‌و تیر وەك گوللە بەسەریاندا دەباری‌و لەکاتێکدا کە لەهەموو لایەکەوە شمشێر خرابووە گەردنییان‌و تەنها خەڵکێکی کەمییان لێدەربازبوو ئەوانی تریشیان کوژراویان برینداربوون، لەناو کوژراوەکانیشدا رۆجەری فەرمانڕەوای ئەنتاکییە هەبوو کەدەستپێشخەری کرد لەرووبەڕووبوونەوەی موسڵماناندا پێش گەشتنی هێزەکانی بەیتوالمقەدیس‌و طرابلوس‌و شوێنەکانی تر، حەفتاو ئەوەندە سواریش لەسوارەکانی خاچپەرستەکان بەدیل گیران‌و هەوڵیاندا کەبەرامبەر بەسێ سەد هەزار دینار ئازاد بکرێن، بەڵام نجم الدین ئیلغازی بەوە قایل نەبوو، بەڵکو فەرمانی کوشتنی هەموویانیدا.

ئەم جەنگەش لای مێژوونوسە لاتینەکان‌و ئەو مێژونوسە هاوچەرخانەی کە لەوانەوە شتیان گواستۆتەوە ناسراوە بەساحة الدم — واتە گۆرەپانی خوێنە؛ لەبەر زۆری ئەو خەڵکە خاچپەرستەی کەتیایدا کوژرا لەبەرامبەر کوژرانی ژمارەیەکی کەم لەموسڵمانان[1].

● ئەو رەهەندانەی کەسەرکەوتن بەسەر خاچصەرستەکان لەجەنگی ساحەالدمدا بەدەستی هێنا: گرنگی ئەو شکستەی کە بەسەر خاچپەرستەکاندا هات تەنها لەو سەرکەوتنە سەربازیەدانەبوو کەنجم الدین ئیلغازی تۆماری کرد بەسەریاندا، بەڵکو لەوە تێپەری کرد بۆ دروست بوونی بەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو کە لەئەمیرە موسڵمانەکانی شام‌و جەزیرە پێکهاتبوو، بەڵکو لەوەش تێپەری کرد بۆ دورخستنەوەی حەلەب لەهەڕەشەی خاچپەرستەکان بەتایبەت پاش دەستگرتنی نجم الدین ئیلغازی بەسەر قەڵایەکدا لەنزیك أثارب لەهەمان ساڵدا، ئەمە جگە لەوەی کەکارەساتێکی گەورەبوو ئەنتاکییەی بێبەش کرد لەرۆجەری سەرکردەو سوپاکەی، ئەمەش وایکرد (سریان) ئاشوری‌و ئەرمەنەکان لەئەنتاکییەدا گومان لەبەسودی مانەوەیاندا لەگەڵ خاچپەرستەکاندا بکەن، هەر ئەمەشبووە پاڵنەریان بۆ خۆ رزگارکردن لەخاچپەرستە رۆژئاواییەکان لەدواتردا[2]، هەروەها أبن العدیم باسی ئەوە دەکات کەنجم الدین ئیلغازی دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە چووە خێوەتەکەی

---

[1] السرق الادسط والحروب الصليبية (٤٧٣/١) الامارات الأرتقية ل٢٤٢.

[2] الاعتبار ل٤٠،٤١، الحركة الصليبية (٤٩٣/١).

ڕۆجەرو هەتاوەکو لەوێ موسڵمانەکان دەسکەوتەکانییانی ڕادەست کەن، بەڵام ئەو هەموو دەسکەوتەکانی گێڕایەوە بۆ جەنگاوەرەکان جگە لەچەکێك نەبێ کەکردیە دیاری بۆ پاشاکانی ئیسلام هەتاوەکو خۆشەویستی جیهادی ئیسلامی لەدڵیاندا دژ بەخاچپەرستەکان زیندوو بکاتەوە[1]، هەروەها ئیلغازی توانای زنجیرەیەك سەرکەوتن لەباکوری شامدا تۆمار بکات،ئەمەش کەشێکی هێمنو ئارامی بۆ موسڵمانەکان ڕەخساندو توانیان شکستێکی تەواو بەو سوپایەبێنن کەبەسەرکردایەتی بلدوینی پاشای بەیتولمەدیس بەرێ کەوتبوو بۆ بەدەمەوە هاتنی ڕۆجەری فەرمانڕەوای ئەنتاکیە[2]نجم الدین ئیلغازیش بەمە وازی نەهێنا، بەڵکە لەئەرتاحدا لەگەڵ طغتکنی، هاوپەیمانی دا کۆبویەوەو ڕێککەوتن لەسەر هێرشکردنە سەر أثاربو زردناو توانییان لەدەستی خاچپەرستەکانی بسێننەوە، پاشان ئیلغازی بەچەند کەسێکی کەمەوە لەموسڵمانان بەرەو دانیت بەرێ کەوتو لەگەڵ بلدوینی پاشای بەیتولمەقەدیسو رووبەرتی فەرمانڕەوای زردنادا ڕوبەڕوبویەوە شەڕ لەنێوانییاندا هەڵگیرسا لەجمادی یەکەمی ساڵی ٥١٣ك/١١١٩ز داو بەسەرکەوتنی نجم الدین ئیلغازی کۆتایی پێهاتو خاچپەرستەکان شکستییان خواردو دوای ئەوەی کەنجم الدین ڕاوەدونانیان خۆیان لەقەڵای هابدا قایمکرد[3]، پاشان نجم الدین ئیلغازی گەڕایەوە بۆ حەلەبو پیاوەکانیشی لەڕێگەی گەڕانەوەدا ڕوبەوری ڕۆبەرتی فەرمانڕەوایی زردنا بوونەوە بەهاوڕێییەتی هێزێك لەخاچپەرستان،سوپاکەی ئیلغازیش پەلاماری دانو خاچپەرستەکانی ناچارکرد کەبگەڕێنەوە بۆ قەڵای هاب، لەهەمان کاتیشدا رووبەرتی الأبرص بەدیلی کەوتە بەردەستی موسڵمانەکانو ئەوانیش بردییان بۆ حەلەب بۆ لای ئیلغازی، ئەویش ناردی بۆ دیمەشق بۆ لای طغتکین لەوێ زیندانی کرا هەتاوەکو بەئازارکوشتی[4]. لەکۆتایی جمادی یەکەمی ٥١٣ك ١١١٩ز ئیلغازی حەلەبی بەرەو ماردین بەجێ هێشت بەهۆی ئەو تەنگژە دارییەوە کەپێیدا تێپەڕی، چونکە حەلەبیش هێندە لاوازبوو کەنەیدەتوانی تیایدا بمێنێتەوە[5].

●ئابڵۆقەدانی ئەنتاکییەو مۆرکردنی ئاگربەست لەگەڵ پاشای بەیتولمەقەدیسدا: وێڕای سەرقاڵبوونی نجم الدین ئیلغازی بەهەندێ کاروباری ئیدارییەوە لەماردیندا، بەڵام توانی

---

[1] زبدة الحلب (٣/١٩٠) الجهاد ضد الصليبين ل١٥٥.

[2] الجهاد ضد الصليبين ل١٥٥.

[3] زبدة الحلب (٣/١٩٠) الجهاد ضد الصليبين ل١٥٦.

[4] تأريخ الحروب الصليبية (٣/٣٤٥).

[5] الجهاد ضد الصليبين ل١٥٦.

سوپایەك لەتورکمانەکان کۆبکاتەوەو لەفوراتەوە بیانپەڕێنێتەوە بەرەو وڵاتی شام لەساڵی ٥١٤ك/ ١١٢٠ز داو لەگەڵ طغتكيين‌دا کۆبویەوەو پێکەوە بەرێ کەوتن بەرەو ئەنتاکیەو گەمارۆیان بەسەردا سەپاند، بەڵام دەسەڵاتییان بەسەریدا نەشکا، بۆیە چوونە ناو قنسرین‌و شەو رۆژێك گەمارۆیياندا، بەڵام لەوێش هیچییان پێنەکرا،لەم کاتەشدا ظهير الدين طغتكيين پێشنیاری کرد بۆ هاورێکەی کەدەست لەگەمارۆدانی هەڵگرێت‌و هەریەکەییان بگەڕێنەوە بۆوڵاتی خۆی، نجم الدينيش ئامۆژگاری هاورێکەی قبوڵکردو گەرایەوە بۆ حەلەب دوای ئەوەی کەرادەی بەهێزی خاچپەرستەکانی بۆ دەرکەوت سەربازە تورکمانەکانیشی بڵاوەیانکردو ئیلغازیش ناچاربوو ئاگربەستێك لەگەڵ پاشای بەیتولمەقەدیسدا بلدوینی دووەم مۆربکات بەمەرجێك مەعەررەو کفرطابو بادەو ضياع جبل السماق بدرێتە خاچپەرستەکان‌و ئەم ئاگربەستەش هەتاوەکو کۆتایی ساڵ بەردەوام بێت[1].

● هەڵوەشانەوەی رێککەوتنەکە: خاچپەرستەکان پابەندنەبوو بەم رێکەوتنامەیەوەو جوسلینی فەرمانڕەوای تل باشر لەهەمان ساڵدا ٥١٤ك/١١٣٠ز هەستا بەهێرشکردنە سەر ئەو ناوچانەی کەسەر بەحەلەب بوون، ئەمەش خەڵکی حەلەبی ناچارکرد کەنارەزاییەکی توند بنێرن بۆ بلدوینی دووەم پاشای بەیتولمەقەدیس‌و تیایدا ئاگاداری کردەوە لە هێرش‌و دەستدرێژییەکانی جوسلین بۆ سەر موسڵمانەکان، بەڵام ئەو بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە: کەهیچ دەسەڵاتێکم بەسەر جوسلیندا نییە[2]، چاچپەرستەکانیش بەمەوازییان نەهێنا، بەڵکو لەئەنتاکیەوە هێرشیان کردە سەر وڵاتی شیزو کۆمەڵێکیان لەموسڵمانەکان بەدیلگرت‌و چەند داخوازییەکی زۆریان خستە بەردەم ئەمیری عەرەب أبو العساكر سلطانی کوڕی منقذ ئەویش ناچاربوو لەگەڵیاندا رێك بکەوێت بەرامبەر بەوەی کەبڕێك پارەیان بداتێ[3]، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خاچپەرستەکان هەلی نەبوونی ئیلغازیان لەحەلەبدا قۆستەوەو بۆیە لەصفری ساڵی ٥١٥ك/ ١١٢١ز هێرشیان کردە سەر أثاربو هەستان بەسوتاندنی ئەوخانوو دەغڵ‌و دانەی کە تیایدابوو، بلدوینی دووەمیش هێرشی کردە سەر خودی حەلەبو گەمارۆیەکی توندی بەسەردا سەپاند کەبووە هۆی ئەوەی پەنجا کەس لەخەڵکەکەی ببنە دیل بەدەستیەوە، حەلەبیەکانیش سەرکەوتوبوون لەرزگارکردنی براکانییان‌و توانییان

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٥٢.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٥٧،١٥٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل١٥٦.

خاچپەرستەكان ناچار بەكشانەوە بۆئەنتاكییە بكەن[1]، وادیارە نجم الدین ئیلغازی ناچاربوو ماوەیەك لەلەماردیندا بمێنێنەوە، ئەمەش وایكرد كە نامە بنێرێت بۆ سولەیمانی كوڕی ئیلغازی جێگیری خۆی لەحەلەبداو فەرمانی پێ بكات كەڕێككەوتن لەگەڵ خاچپەرستەكاندا مۆربكات، بەپێی ئەم ڕێككەوتنەش خاچپەرستەكان دەستیان گرت بەسەر سرمینو لیلۆنو هەندێ لەناوچە كشتوكاڵییەكانی دەوروبەری حەلەبو أثارب[2].

- یاخیبوونی سلێمانی كوڕی ئیلغازی لەباوكی: هەرچەندە ئەو ڕێككەوتنەی سولەیمانی كوڕی ئیلغازی مۆی كرد لەبەرژەوەندی موسڵمانەكاندانەبوو، بەڵام سولەیمان هەوڵی نەدا بۆ چارەسەركردنی ئەو پشێویو شڵەژانەی كە بەسەر حەلەبدا هات، بەڵكو یاخیبوونی خۆی دژ لەباوكی سەربەخۆیی خۆی لەحەلەبدا ڕاگەیاند، ئەم هەنگاوەشی خاچپەرستانی هاندا بۆ تەنگ هەڵچنین بەحەلەبو داگیركردنی هەندێ ناوچە لەدەوروبەریدا ئەمەش لەجمادی دووەمی ساڵی ١٥١ك ١١٢١زدا، داوایان لەسولەیمانی فەرمانڕەوای كرد كەدەستبەرداری أثارب بێت بۆ بەلدوینی دووەمی پاشای بەیتولمەقەدیس، بەڵام دانیشتوانی موسڵمانی أثارب ئامادەنەبوون ملكەچی خاچپەرستەكان بن ئەمەش بلدوینی ناچاركرد هەتاوەكو پاشەكشە بكات بۆ ئەنتاكییەو لەوێشەوە بۆ بەیتولمەقەدیس[3].
- لەناوبردنی یاخیبوونەكە: نەجمالدین ئیلغازیش هەر كەهەواڵی یاخیبوونی كوڕەكەی بیست لەحەلەبدا یەكسەر كەوتەڕێ بەرەو حەلەبو هەموو ئەوانەی سزادا كەلەپشت یاخیبوونی كوڕەكەیەوەبوون، كاتێ سولەیمان ئەو سزا توندەی بینی كە بەسەر هاوكارەكانیدا سەپێنرا ترساو هەڵات بۆ دیمەشقو داوای مافی پەنابەێتی لەطغتكبنی فەرمانڕەوای كرد، ئەوە بوو هەر كەك بارودۆخ بۆ ئیلغازی یەكلابوویەوەو توانی كۆتایی بەئاژاوەكە بێنێت، بدر الدولە سولەیمانی كوڕی عبداالجباری كوڕی ئەرتەقی برازای تیادا دانا وەك جێنشینی خۆی، ئەویش ڕێككەوتنێكی یەك ساڵەی لەگەڵ خاچپەرستەكاندا مۆركرد، ئامانجی ئیلغازیش لەو ڕێككەوتنە بۆ سورد وەرگرتن بوو لەكات هەتاوەكو بگەڕێتەوە دیاربەكرو هەتاوەكو پێی دەكرێ هێز كۆبكاتەوە بۆ دووبارە هێرشكردنە سەریان، وێڕای مەترسی لەوەی كەخاچپەرستەكان هێرش بكەنە سەر حەلەبو برازاكەشی نەتوانێ بەرپەرچیان بداتەوە[4].

---

[1] زبدة الحلب (١٩٩/٢) الجهاد ضد لبصليبين ل١٥٧.

[2] زبدة الحلب (١٩٩/٩–٣٠٥) الجهاد ضد الصليبين ل١٥٧.

[3] زبدة الحلب (١٩٩/٩–٣٠٥) الجهاد ضد الصليبين ل١٥٧.

[4] الامارات الادتقية ل٦٠.

لەماردینیشدا نجم الدین ئیلغازی توانی زۆرترین خەڵکی تورکمان کۆبکاتەوەو پاشان بەرەو وڵاتی شام بیانبات لەمانگی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥١٦ك/١١٢٢ز، بەسود وەرگرتن لەو ناکۆکیەی کە لەنێوان بەلدوینی پاشای بەیتولمەقەدیس‌و یونزی فەرمانڕەوای طرابلسدا هەبوو، بەڵام نجمالدین ئیلغازی نەیتوانی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە بەدەست بێنێت بەسەر خاچپەرستەکاندا، سەرباری پەیوەندی کردنی بلکی کوڕی بهرامی کوڕی ئەرتەق‌و ظهیر الدین طغتکین پێوەی، بەڵام نەیتوانی دەسەڵات‌و هەژمونی خۆی بەسەر تەواوی ناوچەی حەلەبدا بسەپێنێت[1].

●کۆچی دوای ئیلغازی‌و کاریگەری لەسەر موسڵمانەکان: لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٥١٦ك/١١٢٢ز ئیلغازی هەستی خراپبوونی باری تەندروستی کردو گەڕایەوە بۆ میافارقین‌و لەوێش گیانی سپارد، بەو ئەندازەیەش کەکۆچی دوایی ئیلغازی کارەساتبوو بۆ موسڵمانانی وڵاتی شام‌و جەزیرە بەگشتی، بەڵام ئەم کارەساتە گەورەتربوو بۆ خەڵکی حەلەب، چونکە نجم الدین ئیلغازی ئومێدی خاچپەرستەکانی بڕیبوو بۆ دەست گرتن بەسەر حەلەبدا،گرنگی کۆچی دوای ئیلغازی تەنها بەمەوە نەوەستا، بەڵکو بووە هۆی هەڵوەشانەوەی میرنشینەکەی‌و لەنێوان منداڵەکانیدا دابەشکراو حسام الدین تمرتاش ماردین‌و سولەیمان میافارقینی بەرکەوت‌و حەلەبیش بەدەست سلێمانی کوڕی عبالجباری کوڕی ئەرتەقی برازایەوە مایەوە، بلکی کوڕی بهرامی کوڕی ئەرتەقیش قەڵای خرتبرتی بەدەستەوە مایەوەو دواتریش حەڕانی خستەسەر[2]. سەرباری ئەوەی کەحەلەب پێشتر پشتی بەو سەربازە تورکمانانە ئەبەست کەئیلغازی کۆی دەکردنەوە لەباکوری جەزیرەوە، بەڵام دواتر ئەو ڕەگەزە مرۆییەی لەدەستدا کەهەمیشە تای ترازوی موسڵمانانی بەسەر خاچپەرستەکاندا زاڵ دەکرد، ئەمەش حەلەبی کردە ئامانجی هێرشەکانی خاچپەرستان بەهۆی لاوازی‌و کەم توانایی سولەیمان کوڕی عبدالجباری کوڕی ئەرتەقی فەرمانڕەوای لەبەرامبەر هێرشەکاندا، ئەوەبوو هەلی مردنی نجم الدین یان قۆستەوەو بەسەرکردایەتی بەلدوینی دووەمی پاشای بەیتولمەقەدیس هێرشیان کردە سەر بزاعەو بالس لەسەر رووباری فورات‌و بەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو توانیان دەست بگرن بەسەر قەڵای البیرەدا، هەتاوەکو وایلیهات حەلەب لەلایەن خاچپەرستەکانەوە ئابڵوقە درابوو، ئەمەش سولەیمانی ناچارکرد

---

[1] نور الدين محمود والصليبون حسن حبشي ل٢٠.

[2] الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي ل١٦٠.

کەرێککەوتنامەیـەکیان لەگەڵـدا مۆربکـات لەسـاڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣ز کـە بـەپێی ئـەو رێککەوتننامەیە سولەیمان دستی لەقەڵای أثارب هەڵگرت بۆیان[1].

٧- **بلکی کوڕی بهرامی کوڕی ئەرتەق:** بلکی کوڕی بهرام فـەرمانڕەوای قـەڵای (خرتـبرت) پـاش ئیلغازی مامی ئاڵای جیهادی هـەڵگرتو رکابـەرێکی سەرسـەختی خاچپەرستەکان بـوو، زۆر خولیـای لـەناوبردنی خاچپەرستەکانبوو نـەك بەتـەنها لەجـەزیرەدا، بـەڵکو لەتـەواوی وڵاتـی شامدا، کارە سەرەکییەکانی هەر لەکاتی نەخۆشی نجم الدین ئلغازی مامییەوە دەست پێکرد لەرەجەبـە سـاڵی ٥١٦ك/ ١١٢٣ز بەگـەمارۆدانی رەهـا، بـەڵام نـەیتوانی داگیریبکـات دوای گەمارۆیەکی دوورودرێژ، ئەمەش ناچاریکرد هـەتاوەکو پاشەکشە بکات، خاچپەرستەکانیش لەبەر ئەم هۆیە گەشتنە ئەو بڕوایەی کەپێویستە کۆمەکی لەجوسلینی دوژمنـی سەرسـەختی موسـڵمانەکانەو کـەزۆر تـەماعکاربوو وەربگـرن.کەلەوکاتـەدا لەگـەڵ بلـدوینی پاشـای بەیتولمەقەدیسدابوو لەالبیرە، لێرەشدا ئەیانویست سود لەبڵاوبوونەوەی سەربازەکانی بلکی کوڕی بەهرامی کوڕی ئەرتق وەرگرن پاش گەڕانەوەی لەرەها، بەڵام بلکی کوڕی بهرام تـوانی بۆ سەیەك بۆ جوسلینو خاچپەرستە یەکی قوڕو لیتەوە تێربوو لەئاوی بـاران ئەمـەش بـووە هۆی ئەوەی کە ئەسپەکانیانی لەناو لیتاودا گیربکاتو لەهـەمان کاتیـشدا خـۆیو پیاوەکـانی کە لەچوار سەد سوار تێپەریان نەدەکرد تیربارانییـان کـردنو تـەنها ژمارەیـەکی کـەمییان لێ دەربـازبووو جوسلینو جـالیرانی پـورزای فـەرمانڕەوایی البـیرەش لەسـاڵی ٥١٦ك/١١٢٢زدا دەستگیرکران لە ئەنجامی ئـەم سـەرکەوتنەی بلکـی کـوڕی بهـرام هێـزو ناوبـانگی مەعنـەوی خاچپەرستەکان لەوڵاتی شامدا لەناوچوو، هەروەها ئارەزووی پـەلاماردانو لێدانیان لەلایـەن موسڵمانەکانەوە پەرەی سەند[2]. بلکی کوڕی بهرامی کـوڕی ئەرتـەقیش هەوڵیدا لەجوسلینو هـاوڕێ دیلکراوەکانییـەوە بـەڵێنی بەدەسـتەوەدانی رەهـای دەسـت کـەوێت بەرامبـەر بەئازادکردنیان، بەڵام ئەوان ئەمەیان رەتکردەوە وتیان: ئێمە وڵاتەکەمان وەکو حوشتر وایـە بۆمان، هەرکاتێ حوشترەکەمان مرد ئەبێ بگوێزینـەوە بـۆ حوشـترێکی تـر، ئـەو شوێنانەش کەبەدەست ئێمـەوەبوو ئێستا بەدەسـتی خـەڵکی ترەوەیـە[3]، پاشـان بلکـی کـوڕی بهـرام دیلەکانی برد بۆ قەڵای خرتبرتو چەند کەسێکی راسپارد بـۆ پاسـەوانی کردنیـانو لەسـاڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣ز بـەرەو قـەڵای کرکـری سـەر بەمیرنـشینی رەهـا کەوتـەرێ بـۆ دەسـت

---

[1] زبدة الحلب (٣/٣٠٦) الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي ل١٦٠.

[2] نور الدين محمود والصليبيون حسن حبسي ل٣٠.

[3] الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي ل ١٦٠.

بەسـەراگرتنی[1]، پاشـا بەلـدوینی پاشـای بەیتولمەقەدیسیش کەسەرپەرشـتی رەهـاو ئەنتاکییەشی گرتبووە ئەستۆ دەرکی بەوەکرد کەپێویستە لەسەری هەوڵبدات بۆ رزگارکردنی جوسلین لـەدیلیو رێ بگرێت لـەداگیرکردنی کرکر لەسـەر دەستی بلکی کـوڕی بهرامو بـۆ موسڵمانانی بسەلمێنێت کەهێزی خاچپەرستەکان هێشتا توانـای گـورز وەشاندنو هێرشی ماوە، بۆیە بلدوین بەسەرکردایەتی سوپاکەیەوە چووە دەرەوە هـەتاوەکو گەشتە کـەناری رۆژهەلاتی روباری سنجە کەیەکێکە لەلقەکانی فـورات بەئاراستـەی سـەربازگەی بلکی کـوڕی بهـرام کەگـەمارۆی لەسـەر کرکر هـەلگرتبوو و گـەڕا بویـەوە بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی بلـدوینی دووەمـی پاشـای بەیتولمەقـەدیس، جـەنگ لـەنێوان هـەردوو لادا لـەنۆزدەی مـانگی صـفری ٥١٧ك/١١٢٣زدا هەلگیرسـاو سـەرباری کـەمی سـوپای موسـڵمانەکان، بـەلام شکـستیات بەخاچپەرستەکان هێنا گرنگی ئەم جەنگەش تەنها لەسەرکەوتنی بلکی کوڕی بهرامدا نـەبوو، بەڵکو لەوەش تێپەری بۆ بەدیل گرتنی بلدوینی دووەم پاشای بەیتولمەقـەدیسو دەستگرتن بەسـەر قـەلای کرکردا، پاشـان بلك دیلـە نوێکـەی بـرد بـۆ قـەلای خرتـبرتو خستییە پـاڵ جوسلینو سەرکردە خاچپەرستەکانی تر[2] بـەم شـێوەیە هـەموو میرنشینە خاچپەرستەکان، رەهاو ئەنتاکییەو شانشینی بەیتولمەقەدیس چۆڵبوو لەسەرکردەکانییان، ئەمەش بووە هۆی شلەژانی باری خاچپەرستەکان لەجەزیرەو وڵاتـی شام، بـەلام هێـزە ئیسلامییەکان لـەولاتی شـام لـەو کاتـەدا نـەیانتوانی ئـەم هەلـە بقۆزنـەوەو میرنـشینەکانیان لەناوبـەرنو کۆتـایی بەمەترسیان بێنن[3].

- گەمارۆدانی حەلـەب لەلایـەن خاچپەرستـەکانەوە: سـەبارەت بـەبلکی کـوڕی بـەهرامی کـوڕی ئەرتـەق ئەوە دوای ئەوەی کەدیلەکانی کۆکردەوە لەقەلای خرتبردا هەسـتا بەرۆیـشتن بـەرەو حەڕان بۆ دەست بەسەراگرتنی لەرەبیعی یەکەمی ساڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣ز، ئەمەش بەمەبەستی بەهێزکردنی پێگەی خۆیو ئەمەشی بۆ چووە سەر، هـەروەها بلکی کـوڕی بهـرام ئـارەزووی دەسگرتنی بەسەر حەلەبیشدا هەبوو کەلـەژێر دەستی سلێمانی کـوڕی عدالجباردابوو دوای ئەوەی دەستیگرت بەسەر حەڕاندا، چونکە گرنگی حەلـەبی دەزانـی لـەرووی ستراتیژیەوە، کـەناتوانێ هـیچ ئـەنجامێکی یەکلاکـەرەوە بەدەسـت بێنێـت ئەگـەر حەلـەب نەخاتـە سـەر میرنشینەکەی، هەتاوەکو بنکەیەکی هەبێت لەوڵاتی شامدا و بەهۆیەوە بتوانێت لەروبـەرێکی

[1] زبدة الحلب (٣/ ٣٠٦) الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي (١٦٠).

[2] نور الدين محمود والصليبيون في الشرق الاسلامي ل١٦١.

[3] الجهاد ضد الصليبين في الشرق الاسلامي ل١٦٠.

فراواندا جموجوڵ بکاتو یەکلابیێتەوە بۆ کوشتاری خاچپەرستەکان[1]، هەر بۆیە بلکی کوڕی بهرام گەمارۆی خستە سەر حەلەب هەتاوەکو دانیشتوانی ناچارکرد کە لەبەرە بەیانی جمادی یەکەمی ساڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣زدا[2] بەدەستەوەی بدەن، بەڵام بلکی کوڕی بهرام نەیتوانی زیاتر بەردەوام بێت لەسەر کوشتاری خاچپەرستەکان لەشامدا، چونکە هەواڵی هەڵاتنی جوسلینی لەبەندیخانە پێ گەشت بەیارمەتی کۆمەڵی لەئەرمەنەکان لەوانەی کەبلکی کوڕی بهرام لەخرتبرتدا بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا کردبوون، بۆیە لە ڕەجەبی هەمان ساڵدا ٥١٧ك/ ١١٢٣ز بەخێرایی گەڕایەوە بۆ خرتبرت و توانی ئاسایشی بۆ بگێرێتەوەو دیلەکانی تریش بگوێزێتەوە بۆ حەڕان دوای سزادانی ئەو ئەرمەنیانەی کەلەوێبوون[3]. جوسلینی فەرمانڕەوای ڕەهاش کە لەبەندیخانە دەربازبوو توانی سوپایەك لەخاچپەرستەکانی بەیتولمەقەدیسو ئەنتاکیە پێك بێنێو بەرەو حەلەب بەڕێ بکەوێت تەنگ بەموسوڵمانەکانی ئەو شارە هەڵچنێ، بەمەش وازی نەهێنا، بەڵکو گوڕی موسڵمانەکانی لەناوچەکانی دەوروبەریدا هەڵدایەوەو گومارۆکەشی هەتاوەکو مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣ز بەردەوام بوو، بەڵام کاتێ نەیتوانی داگیری بکات ناچاری گەڕانەوە بەرەو تل باشر بوو، بەڵام دوای گەڕانەوەی جوسلین بۆ تل باشر حەلەب ڕزگاری نەبوو لەگەمارۆدان لەلایەن خاچپەرستەکانەوە، بەڵکو دووچاری گەمارۆیەکی تربوویەوە لەلایەن خاچپەرستەکانی ئەنتاکیەوە، ئەمەش بووە هۆی بچڕانی پەیوەندی لەنێوان حەلەبو ناوچە موسڵمان نشینەکانی تر لەشامدا، ئەو ناوچانەی کەئازوقەو کەلو پەلیان بۆ دەنارد[4]. لەم حاڵەشدا بلکی کوڕی بهرامی کوڕی ئەرتەق ناچار بوو پەنابەرێت بۆ ئەقشنقری برسقی، فەرمانڕەوای موصلو ظهر الدین طغتکین فەرمانڕەوای دیمەشق بۆ لابردنی ئەو ستەمە لەسەر خەڵکی حەلەب ولێدانی خاچپەرستەکان بەشێوەیەك کەبلکی کوڕی بهرام بتوانێت پاش ئەوە بگەڕێتەوە بۆ حەلەبو کاروبارەکانی ڕێك بخاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لەساڵی ٥١٧ك/ ١١٢٣ز دا هەریەك لەئەقسنقرو ظهرالدین طغتکین بەسەرکردایەتی هێزەکانییانەوە گەشتنە لایو لەفورات پەڕینەوەو لەعزاز لایاندا، بەڵام ئەو خاچپەرستەکانەی کەکۆبوبونەوە تیایدا توانیان موسڵمانەکانی تیادا وەدەرنێن بۆیە هەریەکەیان گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیو بلکی کوڕی بهرامیش لەساڵی ٥١٨ك/١١٢٤ز چووە

---

[1] تلامارت الادتقیة ل٢٦٨.

[2] الکامل في التأریخ (٨/٦٣٣،٦٣٢).

[3] الجهاد ضد الصلیبین في الشرق الاسلامي ل١٦١.

[4] الجهاد ضد الصلیبین في الشرق الاسلامي ل١٦١.

حەلەبەوەو کۆمەڵێك لە نەیارانی تیادا لەناو بردو پشێوی‌و جەردەیی تیانەهێشت‌و یەکێك لەکچەکانی رضوانی مارەکرد بۆ بتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ سلجوقییەکاندا حەلەبی کردە پایتەختی خۆی‌و بنکەیەك بۆ دەرچوون بۆ لێدانی خاچپەرستەکان، هەربەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو دیلەکانی لەحەڕانەوە بۆ گواستەوەو لەقەڵای حەلەبدا زیندانی کردن، دیارە ئەم کارەشی بۆ دڵنیابوون بوو لەهەر هەوڵێك کە بۆ رزگارکردنیان بدرێت لەکاتی دورکەوتنەوەیدا لێیان، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کاتێ تیپێکی سەربازی ئامادەکرد لەصفری ساڵی ٥١٨ك/ ١١٢٤ز بۆ جەنگ کردن دژ بەخاچپەرستەکان لەعزازدا لەگەڵیاندا نەرۆیشت نەوەکو هەندێ لەدانیشتوانی نەیاری لەحەلەبدا ناپاکی لەگەڵدا بکەن‌و دیلەکان ئازاد بکەن[1].

- کوژرانی بلکی کوڕی بهرام: مەرگ مۆڵەتی بلکی کوڕی بهرامی نەداو لەکاتێکدا کەفەرەنجەکانی گەمارۆدابوو لەلای قەڵای منیجدا مەرگ یەخەی پێگرت بەهۆی تیرێکی وێڵەوە کەبەریکەوت‌و بووە هۆی گیان لەدەستدانی، ئەوەبوو سەربازەکانی شڵەژان‌و بڵاوەییان لێکردو بەکوژرانی موسڵمانەکان پیاوێکی مەزنییان لەدەستدا کەکردەوەکانی سەلماندیان سەرکردەو فەرماندەیەکە کەهەوڵی ئەدا بۆ یەکخستنی موسڵمانەکانیدا لەشام‌و جەزیرەدا دژ بەخاچپەرستەکان، ئەشتوانین بڵێین بەکوژرانی بلکی کوڕی بهرام لەساڵی ٥١٨ك ١١٢٤ز کۆتای هات رابەرایەتیکردنی بزاوتی جیهادی ئیسلامی لەلایەن ئەرتەقیەکانەوە، هەرچەندە حسام الدین تمرتاشی کوڕی ئیلغازی توانی دوای کوژرانی بلکی کوڕی بهرام دەست بگرێت بەسەر حەلەبدا، بەڵام لەسەردەمی ئەودا حەلەب بارودۆخێکی ئارامی نەبوو، بەڵکو بارودۆخی تێکچووو موسڵمانان تیایدا لاوازبوون، چونکە گەنجێتی‌و یاریکردن فەرمانڕەوایی‌و هەوڵدانی لەبیر بردەوە، تەنها بەم تەمبەڵی‌و خەمساردیەشەوە نەوەستا لەبەرامبەر جیهادکردندا، بەڵکو میانجیگەری أبی العساکر سلطانی کوڕی منقذی فەرمانڕەوای شیزەری قبوڵکرد بۆ ئازادکردنی بلدوینی پاشای بەیتولمەقەدیس کەدیلی بلکی کوڕی بهرامبوو[2]. ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی ئارەزووی خاچپەرستەکان‌و بەرزبوونەوەی ورەیان بۆ لێدانی موسڵمانان‌و کاریگەری زۆریشی هەبوو لەبەهێزکردنی بەرگری خاچپەرستەکان بۆ زاوتی زیندووکردنەوەی بیرۆکەی جیهادی ئیسلامی کە لەقۆناغی

---

[1] زبدة الحلب (٢/٢١٦-٢١٧) الجهاد ضد الصليبين ل ١٦٤.

[2] الجهاد ضد الصليبين ل١٦٣،١٦٢.

داهاتوودا كەئەقسنقر برسقی‌و فەرمانڕەوای موصل‌و ظهیر الدین طغتكینی فەرمانڕەوای دیمەشق رابەرایەتییان دەكرد[1].

٨- **جیهادی ئەمیری موصل ئاق سنقر برسقی بۆ رزگاركردنی حەلەب:**

أ- **حەلەب بەرەنگاری خاچپەرستەكان دەبێتەوە:** حەلەب چەندین جار روبەرووی فشارو هێرشی خاچپەرستەكان بویەوە هەر لە دەستپێكردنی شالاوی خاچپەرستەكان بۆ سەر وڵاتی شام‌و جەزیرە، ترسناكترین‌و دیارترینی ئەو هێرشانەش لەساڵی ٥١٨ك بوو، دیارە ئەو داگیركەرانە گرنگی لەڕادەبەدەری ئەم شارەیان دەزانی بەتایبەت كەوەك ناوەندێكی ستراتیژی زیندوو بەكاردەهات لەبواری مرۆیی‌و سەربازی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و هێڵەكانی گواستنەوەدا چونكە ئەكەوێتە ناوەندێكی تۆكمەی نێوان دوو میرنشینی خاچپەرستەوە، كەئەوانیش: میرنشینی بەهال رۆژهەڵاتی جەزیرەی فوراتەوەو ئەنتاكییە لەرۆژئاواوە لەسەر دەریای ناوەراست ئەمەش والیدەكرد كەلەیەك كاتدا بتوانێت پەیوەندی بكات بەو هێرشە ئیسلامیە توركمانانەی لەجەزیرەو فورات‌و ئەنادۆڵ‌و باكوری شامدا بڵاوبوبونەوە ئەمەش بناغەیەكی بەهێزە بۆ بەردەوامبوونی بزاوتی جیهادو بەدیهێنانی چەند ئامانجێكی یەكلاكەرەوە دژ بەخاچپەرستەكان لەبەرامبەریشدا داگیركردنی حەلەب‌و لكاندنی بەقەوارەی خاچپەرستەوە هاتوچۆی نێوان رەهاو ئەنتاكیە مسۆگەر دەكات‌و پێكهێنانی یەكێتی سەربازی‌و سیاسی لەنێوانیاندا خێراتر دەكات كەرۆڵێكی ترسناكی دەبێ لەبەرژەوەندی داگیركەران[2]. دیارە خەڵكی حەلەبیش دەركیان بەگرنگی كۆتایی هێنان بەم بارودۆخە پڕ دڵە راوكێیەو پێویستی رادەستكرنی بەئەمیرێكی بەهێزكرد بوو بۆیە ناردیان بەدوای ئیلغازی ئەرتەقیدا كەفەرمانڕەوای دیاربەكربوو داوایان لێكرد بەرەو ئەوێ بەرێكەوێت هەتاوەكو شارەكەی رادەست بكەن، لەساڵی ٥١١ك دا ئەویش پێشڕەوی كرد بەرەو حەلەب كاروبارەكانی گرتە دەست‌و دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو ناوچەكانیدا سەپاند، بەڵام سەرقاڵ بوونی ئەم پیاوە بەكاروباری میرنشینەكەی خۆیەوە لەزۆربەی كاتەكاندا دەبووە هۆی ئامادەنەبوون‌و پشتگوێ خستنی كێشەكانی حەلەب، خاچپەرستەكانیش ئەمەیان دەقۆستەوەو هێرشەكانیان بۆ سەر حەلەب چڕ دەكردەوە، هەركە ئیلغازی ئەرتەقی لەڕەمەزانی ساڵی ٥١٦ك كۆچی دوای كرد خاچپەرستەكان هەوڵیاندا ئەم هەلە بقۆزنەوە بۆ دابەشكردنی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ١٦٣.

[2] دراسات تأريخية ل ١٢، ١٣.

میرنشینەکە لەنێوان کوڕەکانی داو دابڕینی حەلەب لەو هێزانە کە لەدیاربەکردا دەجەنگان لەپێناو بەدەسهێنانی چەند سەرکەوتنێکی خێرا لەباکوری شامدا، بەڵام دەرکەوتنی بلکی کوڕی بهرام برازای‌و رابەرایەتیکردنی بزاوتی جیهاد لەلایەن ئەوەوە دژ بەخاچپەرستەکان، بووە رێگر لەبەردەمیانداو حەلەبی لەمەترسییەکی مسۆگەر رزگار کرد، بەڵام کوژرانی بلك دوای ساڵێك لەبوونی بەفەرمانڕەوای گواستنەوەی فەرمانڕەوایەتی بۆ حسام الدین تمرتاشی ئامۆزای کەناسراوبوو بەلاوازی‌و دۆڕاوی، رێخۆشکەربوو لەبەردەم خاچپەرستەکاندا هەتاوەکو توندترین بەرامبەر بەحەلەب‌و بەئاواتی خۆیان بگەن کە خۆی لەدەست بەسەراگرتنیدا دەبینییەوە، هەروەها مێژونووس أبن العدیم باسی چۆنێتی خراپبوونی بارودۆخی حەلەب دەکات پاش وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن تمرتاشەوە، ئەڵێ : سەبارەت بەتمرتاش ئەوە کاتێ بووە پاشای حەلەب منداڵی‌و یاریکردن هەوڵدان‌و جیهادو کاروبارەکانی حوکمڕانی لەبیر بردەوە، بۆیە بارودۆخ بەرەو خراپی رۆشت‌و موسوڵمانەکان لاوازبوون[1]، هەروەها تمرتاش فەرمانڕەوایی خۆی بەئازادکردنی بلدوینی پاشای بەیتولمەقەدیس دەست پێکرد کەپێشتر لەلایەن بلکەوە بەدیل گیرابوو، ئەمەشی بەرامبەر بەپارەیەکی کەم کرد، تمرتاشیش لەزینداندا ئازادی کردو هێنای بۆ مەجلیسی خۆی‌و پێکەوە نانیان خواردو پاشان تمرتاش عەبایەکی پاشایانەی کردە سەر شانی‌و ئەسپەکەیان بۆ هێنایەوە کەپێشتر بلك لێی سەندبوو[2]، بەڵام پاش ئەوە زۆری نەخایاند تمرتاش پاشەکشەی کرد بۆ دیاربەکری وڵاتی خۆی، هەتاوەکو سیاسەتی دابڕان پەیڕەو بکات‌و تیرێك بۆ دوژمنان نەهاوێژێ، بەم شێوەیەش هەلیان بۆ ڕەخسا هەتاوەکو گەمارۆی سەر حەلەب توند تر بکەن‌و ئەو ئامانجەیان بەدی بێننکەچەندین ساڵ بوو خەویان پێوە دەبینی، بەم شێوەیە حەلەب لەساڵی ٥١٨ك گەمارۆیەکی بەخۆوە بینی کەترسناکترین گەمارۆبوو کە لەمێژووی دوورودرێژی جەنگە خاچپەرستیەکاندا رووبەڕووی بێتەوە[3].

ب- **ناپاکی نواندنی دبیسی کوڕی صدقەی مەزیدی ئەمیری حلله :** هەوڵدان بۆ رووخانی حەلەب بەناپاکییەك دەستی پێکرد کەیەکێك لەئەمیرە عەرەبەکان پێی هەستا بەناوی دبیسی کوڕی صدقەی مەزیدی ئەمیری حیللە کە ئەکەوێتە باشووری بەغداوە، ئەم پیاوە لەدەست خیلافەتی عەباسی‌و سوڵتانی سەلجوقی هەڵاتبوو بەهۆی وروژاندن‌و پیلان گێڕی بەردەوامی

---

[1] زبدة الحلب (٢/٣٠٣).

[2] الاعتبار ل ١٠٣،١٢٠،١٢١.

[3] دراسات تأريخية د. عماد الدين خليل ل١٤.

لەدژیان، ئەوە بوو بەخاچپەرستەکانی ووت: کە ئەو پشتیوان و هاوکاری لەحەلەب دا هەیەو هەرکاتێ بەسەرکردایەتی سوپایەکەوە بیبینن ولاتی ڕادەست ئەکەن، لەووشتانەش کەبەخاچپەرستەکانی وت: خەڵکەکەی شیعەن و بەهۆی مەزهەبەوە مەیلیان بۆ من هەیە، هەرکاتێ بمبینن ولاتەکەم ئەدەن بەدەستەوە، لەپێناو ئەم یارمەتییەشدا پارەیەکی زۆری پێدان[1]، هەروەها بلدوین بەڵێنی دا بەئەمیری ئەنتاکیەو ئەمیری رەها کەشتی زۆریان پێشکەش بکات لەبەرامبەر یارمەتیدانیداو وتی: من لەحەلەبدا جێگرو گوێڕایەڵی ئێوەم[2]، لەکۆتایشدا توانی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا بگاتە ڕێککەوتنێك کە بەپێی ئەم ڕێککەوتنە حەلەب بۆ ئەودەبێت، بەڵام ماڵو سامان و چەند شوێنێکی نزیك حەلەب بۆ ئەوان بێت[3]، ئەوەبوو بلدوین بەسەرکردایەتی هێزەکانییەوە پێشڕەوی کردو لە ڕووباری قویقدا لەنزیك حەلەب لایداو هەموو ناوچە کشتوکاڵییەکانی دەوروبەری تێکدا پاشان بەرەو حەلەب بەرێ کەوتو لەکۆتایی شەعبانی ٥١٨ك گەیشتە ناوی و جوسلینی ئەمیری رەهاش بەهاوڕێیەتی دبیسی کوڕی صدقە[4] پێشڕەویان کرد– دبیس وەك باو باپرانی شیعەبوو[5] بەرەو ناوچەیەکی تری دەوروبەری حەلەبو بەهەمان شێوە هەستان بەتێکدانی زەویە کشتوکاڵییەکانی، ئەو زیانانەش بەنزیکەی سەد هەزار دینار مەزەندە دەکرا، پاشان لەگەڵ بلدویندا کەوتنەڕێو چوونە ناو حەلەبەوە، لەوێش کۆمەڵێ (خیانەتکاری) تر لەگەڵیاندا کۆبویەوەو لەپێناو دڵنیابوون لەبەرژەوەندییەکانیان و دابەشکردنی دەسکەوتەکان لەحاڵەتی گیرانی حەلەبدا: لەوانە سوڵتان شای کوڕی رضوانی سلجوقی و عیسەی کوڕی سالمی کوڕی مالکی عەقیلی و یاغی سیان کوڕی عبدالجباری ئەرتەقی.....هەموویان لەهەموو لایەکەوە گەمارۆیان خستە سەر حەلەب[6] و خۆیان لەسەر مانەوەیەکی دوورودرێژو ڕاهێنان بڕیاریاندا بەجێی نەهێڵن

---

[1] الكامل في تأريخ (٦٤٣/٨).

[2] زبد تأريخ دمشق ل٢١٢.

[3] الاعتبار ل١٠٣، زبدة حلب (٢٢٢/٢–٢٢٣).

[4] دراسات تأريخية د. عماد الدين خليل ل ١٥.

[5] سير أعلام النبلاء (٦١٣/١٩).

[6] زبدة حلب (٢٢٥/٢–٢٢٦).

هەتاوەکو داگیری دەکەن، خانوشیان بۆ خۆپاراستن لەگەرماو سەرما بنیاتنا[1]، ئەمە وێڕای سێ سەد خێوەت، لەکاتێکدا کە ئەو لەحەلەبدا تەنها پێنج سەد سوار هەبوو[2].

ج- **کاری دوژمن کارانەی خاچپەرستەکان دژ بەخەڵکی حەلەب:** داگیرکەران هەستان بەهێرشی بەردەوام بۆ سەر حەلەب و درەختەکانیان بڕی و بێستان و زەوییە کشتوکاڵەکانیان تێکدا ئەمەش وەک هەوڵێك بۆ روخانی ئابووری حەلەب کەپشتی بەکشتوکاڵ دەبەست بەپلەی یەکەم، هەروەها هەستان بەتێکدانی شوێنەکان و هەڵدانەوەی گۆڕی موسڵمانەکان و بردنی کفنەکانییان و تابوتەکانیشیان بۆ نان خواردن بەکاردەهێنا، هەروەها قاچ و دەستیان بەگوریس دەبەستن و بەبەر چاو خەڵکی حەلەبەوە ڕایان دەکێشان و هاواریان دەکرد: ئەمە محەمەدی پێغەمبەرتانە (ص)!! هەروەها کۆمەڵێکیان قورئانێکیان هێناو هاواریان کرد: ئەی موسڵمانان سەیری کتێبەکەتان بکەن!! پاشان یەکێکیان کونی کردو پاشان بەدوو تاڵە دەزوو بەستی بەخوارسکی هێسترێکەوەو ئەویش پیسای پیادا دەکرد.... هەرکە ئەو دیمەنەشیان دەبینی چەپڵەیان لێدەداو لەخۆشیدا پێدەکەنین[3].

د- **بەرگری جەماوەری خەڵکی حەلەب:** خاچپەرستەکان بەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو هەر موسڵمانێکیان دەستبکەوتایە خراپیان پێدەکردو ئەمەش موسڵمانەکانی ناچارکرد بەهەمان شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، قاضی أبو الفضلی کوڕی خشابیش سەرکردایەتی بەرگری ئیسلامی دەکرد، پێشتریش لەسەر ئەم بەرگریکرنە ڕاهاتبوو لەسەرەتایی ئەوە دەیەیەداو خاوەنی جەماوەرێکی زۆر بوو لەحەلەبدا، ئەوەبوو فەرمانی دا بەئاراستەکردنی گورزی ڕاستەوخۆ بۆ ناوجەرگەی سەربازگەکانی دوژمن و بۆ ئەم کارەش کۆمەڵێ لەجەنگاوەرانی حەلەب بەنهێنی دەرچوون بۆ هێرش کردنە سەر ئەم سەربازگانە، پاش کوشتن و بەدیل گرتنی کەسانێك دەگەڕانەوە بنکەکانیان، لەهەمان کاتیشدا نێردراو لەنێوان هەردوو لادا دەهاتن و دەچوون بۆ گەشتنە رێکەوتنێك، بەڵام بێ هیچ دەرەنجامێك[4].

هـ- **پەنابردنی خەڵکی حەلەب بۆ فەرمانڕەوای دیاربەکر:** موسڵمانان لەحەلەبدا تەنگیان پێ هەڵچنراو ماندوبوون و برسێتی زۆری بۆ هێنان، بۆیە بدر الدینی ئەرتەقی و کۆمەڵێك لەگەورە بەرپرسان رێك کەوتن لەسەر ناردنی وەفدێك لەسەرکردەکانی حەلەب بۆ دیاربەکر بۆ داوای

---

[1] الكامل في التأريخ (٨/٦٤٢).

[2] زبدة حلب (٢/٢٢٤-٢٢٥). دراسات تأريخية ل١٥.

[3] دراسات تأريخية ل١٥.

[4] هەمان سەرچاوە ل ١٦، ذيل تأريخ دمشق ل ٢١٢.

یارمەتی کردن لەحسام الدین تمرتاشی فەرمانڕەوایی، ئەوەبوو سێ ئەندامەکەی وەفدەکە بەشەودا دزەیان کردو ڕۆشتن بۆ ماردین بنکەی دیاربەکر- هەتاوەکو هانا بەرن بۆ ئەمیرەکەی، بەڵکو گرنگی بەو مەینەتیو نەهامەتییەی حەلەب بدات، کاتێ گەشتنە ئەوێ حسام الدین سەرقاڵی دەستگرتن بوو بەسەر وڵاتی براکەیدا کە لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردبوو، ئەم کارەش وایکرد کەکاروباری حەلەب پشتگوێ بخاتو بەدەم داواکارییەکانی وەفدەکەوە نەچێت، ئەندامانی وەفدەکە ماوەیەك لەماردیندا مانەوەو حسام الدین یان هان دەدا کەبەدەم حەلەبەوە بچێت هەتاوەکو لەو گەمارۆیە رزگاری بکات، ئەویش بەڵێنی پێ دانو ئەمڕۆ سبەی پێکردن، بێ ئەوەی هیچ کارێك بکات، ئەوانیش ئاگاداریان کردەوە کە ئەیانەوێ خۆی بەتەنها بڕواتو حەلەبییەکان خۆیان ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە[1]، بەڵام هەوڵەکانیان لەکۆتاییدا شکستی هێناو وەفدەکە توانیان لەو چاودێریە رزگاریان بێت کەحسام الدین خستبوویە سەریان هەتاوەکو ماردین بەجێ نەهێڵن بۆ داوای یارمەتیکردن لەئەمیرێکی تر لەترسی لاوازبوونی زیاتری دەسەڵاتو لەدەستدانی شاری حەلەب، هەروەها وەفدەکە توانی پەیوەندی بەوالی سلجوقی موسڵەوە بکات کە أقسنقر برسقی بوو[2].

و- **أق سنقر برسقیو بەدەمەوە چوونی بۆ بانگەوازی خەڵکی حەلەب:** لەوکاتەدا برسقی نەخۆش بوو، لاوازیش زۆری بۆ هێنابوو، بۆیە نەیاندەهێشت کەس سەردانی بکات جگە لەپزیشکەکان، ئەم هەواڵەش لەرێی کەسانێکەوە گەیشت بە دبیس، ئەویش مژدەیدا بەسەربازەکانیو الله اکبرو الحمد لله یان دەکرد، هەندێ لەهاوەڵانی هاواریان لەخەڵکی حەلەب دەکرد: ئەو کەسەش مرد کەئومێدتان پێی بوو، حەلەبییەکانیش خەریکبوو گیانیان دەردەچوو[3]، کاتێ خەڵکی حەلەب داوای مۆڵەتیان کردو برسقی مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی پێدان، ئەوانیش چوونە لایو هانایان بۆ بردو باسی ئەو مەترسیانەیان کرد کەرووبەرووی حەلەب بووەتەوەو ئەو مەینەتیانەیان خستە روو کەخەڵکی حەلەب بەدەستییەوە دەناڵێنن، ئەویش وەڵامی دانەوەو ووتی: ئێوە ئەم نەخۆشیو بارودۆخەی من دەبینن، بەڵام من نەزرم کردوە بۆ پەروەردگار ئەگەر شیفام بدات لەم نەخۆشییە هەموو هەوڵێکم ئەخەمە گەر بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەوەی کە وڵاتەکەتان دوچاری بووەو دژ بەدوژمنەکانتان ئەجەنگێم،ئەوەبوو پێش تێپەڕبوونی سێ رۆژ بەسەر ئەو دیدارەدا یەکسەر تاکەی لەکۆڵ

---

[1] دراسات تأريخية ل١٦.

[2] زبدة حلب (٢٢٧/٢) دراسات تأريخية ل ١٧.

[3] دراسات تأريخية ل١٧.

بوویەوەو بەرەو چاکبوونەوە رۆیشتو خێوەتی لەدەرەوەی موسڵدا هەڵداو هێزەکانی بانگهێشت کرد هەتاوەکو خۆیان ئامادە بکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستانو رزگارکردنی حەلەب، لەماوەی چەند رۆژێکیشدا بەتەواوی سوپاکەی ئامادەبووو موسڵی بەجێهێشتو بەرەو الرحبة کەوتەڕێ، لەوێشەوە ناردنی بەدوای طغتکین ی ئەمیری دیمەشقو خیرخانی ئەمیری حمصو داوای کۆمەکی لێ کردن بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارەکەی، ئەوانیش سەربازەکانیان نارد بۆ پەیوەندی کردن بەسوپاکەی برسقیەوە کە لەوکاتەدا بەرەو بالس بەڕێ کەوتبوو کە لەنزیك حەلەبدایە، لەوێشەوە ناردی بۆ لای بەرپرسانی حەلەب مەرجێکی پێشوەختی بۆ دانان کەقەڵای حەلەب بدەن بەدەست جێگرەکانیەوە هەتاوەکو خۆیانی تیادا قایم بکەن، لەحاڵەتی شکست خواردنی لەبەردەم خاچپەرستەکاندا ئەوانیش مەرجەکەیان قبوڵکرد، هەرکە کاروبار کەوتە دەست جێگرەکانی برسقی دڵنیابوویەوە لەبوونی پاسەوانو پاسگایەکی باش لەحاڵەتی پاشەکشەکردندا، دەستی دایە پێشڕەوی کردن رووەو پێگەی هێزە خاچپەرستیەکان کەئابڵوقەی حەلەبیاندابوو[1]. سەرەتای هێزەکانی بورسقی لەرۆژی پێنج شەممە بیستو دووی ذی الحجەی ساڵی ٥١٨ك دا گەشتنە حەلەب، هەر کەبرسقی بەهێزە رێکخراوییەکانییەوە گەشتە بەرەوە خێرا خاچپەرستەکان چوونە پێگەی بەرگری بەهێزترو لەکێوی جوسندا لەسەر رێگای ئەنتاکییە سەنگەریان لێدا، بەم شێوە کەوتنە حاڵەتی بەرگریەوە دوای ئەوەی کە لەحاڵەتی هێرشبردندابوون، خەڵکی حەلەبیش چوونە دەرەوە بۆ خێوەتەکانیانو پێداویستییەکانیان تیادا دەسکەوتو بەشێکیشیان چوون بەدەم برسقییەوە بۆ پێشوازی لێکردنو بەدەمەوە چوونی لەکاتی گەشتنیدا ئەم پیاوەش لەمەبەستی خاچپەرستەکان لەپاشەکشە کردنو وەرگرتنی هەڵوێستی بەرگریکاری تێگەشت بۆیە پەلەی نەکرد لەهێرش کردنە سەریان پێش رێکسختنەوەی سەرلەنوێ هێزەکانی لەترسی ئەوەی کەسوپاکەی توشی شکست ببێتو حەلەبیش داگیر بکرێتو، هەروەها چاوساغەکانی نارد هەتاوەکو ئەو هێزانە بگێڕنەوە کەپێشڕەویان کردووە بۆ سەربازگەکانیان لەحەلەبداو ئەم پلانەشی بەم شێوە ڕوونکردەوەو دەیوت: کێ لەپشتەوە بمانپارێزێ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆمانو موسڵمانان لەناوبەرن؟ بەڵام خوای گەورە شەری ئەوانی دوورخستەوە بابچینە شارەکەو بەهێزی بکەینو سەیری بەرژەوەندی بکەین پاشان خۆمان کۆنەکەینەوەو دێینە دەرەوە بۆیان بەپشتیوانی خوا. بەم شێوەیە بورسقی چووە حەلەبەوەو هەستا

[1] نهر الذهب (٣/٨٦–٨٧) دراسات تأريخية ل١٨.

بەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیو بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووریو کۆمەلایەتیو، دادگەری بلاوکردەوەو بڕیاری لابردنی باجو ستەمە دارایییەکانو نەهێشتنی تالانکردنی مالو مولکی خەلکی دەکرد، دادپەروەریشی هەموو حەلەبییەکانی گرتەوە دوای ئەوەی ڕێگریکرد لەستەمو مال بردنو دەسەلاتی خۆسەپێنەکان لەماوەی گەمارۆی خاچپەرستەکاندا[1]، هەروەها برسقی بەمەشەوە نەوەستا، بەلکو هەستا بەهەولدانێکی زۆر بۆ هێنانی ئازوقەو دانەوێلە بۆ شارەکە هەتاوەکو کەمێك گرانی سوك بکاتو ئەو نەهامەتیو تەنگاویە کەم بکاتەوە کەخەلکی حەلەب بەدەستیەوە دەیاننالاند، ئەوەبوو زۆری نەبرد چالاکی کشتوکالی گەڕایەوەو ناوچەی حەلەب گەرایەوە باری ئاسایی خۆی، کشتیارەکان دەستیانکردەوە بەکارکردن لەوزەویانەدا کەلێی دەرکرابوونو چالاکی بازرگانی گەرایەوە دۆخی دارانی خۆی بەهۆی ئەو ئاسایشو هێمنییەی کەبالی بەسەر ناوچەکەدا کێشا بوو[2] بەم شێوەیە برسقی توانای ئەو گەمارۆیە تێك بشکێنێ کەخاچپەرستەکان بەسەر حەلەبدا سەپاندیانو ئەو شوێنە گرنگە رزگاربکات لەگەورەترین مەترسی کە بەدرێژای جەنگەکانی خاچپەرستی روبەرووی بوبێتەوەو لەگەل موسلدا بۆ یەکەم جار یەکیبخات لەسەرەتایی دەسپێکردنی ئەم جەنگانەوە، ئەم کارەش بواری رەخساند بۆ ئەم سەرکردەو بۆ عماد الدین زەنکی بۆ سوود وەرگرتن لەم یەکێتییە بۆ تۆمارکردنی چەندین سەرکەوتن دژ بەداگیرکەران[3]، مێژوونوسی ئینگلیزی هاوچەرخ ستیفن رنسمان دەلێ: ... ئەو میرنشینەی کەبرسقی پێکی هێنا، بوو بەناوك بۆ ئەو دەولەتە ئیسلامییە یەککرتووەی کە لەشامدا لەسەردەمی زەنکیو ئەیوبیو مەمالیکەکاندا سەری هەلدا. ئەو خاچپەرستانەش کە رژێمی پاشایەتی لەبەیتولمەقەدیسدا یەکی خستن ڕووبەڕووی چەند هێزێکی پەرتەوازە دەبوونەوە کە بەش بەش بوونیان هێندەی تر لاوازی کردبوون، کەواتە ئەو یەککرتنەوەی کە لەنێوان حەلەبو موسلدا روویدا بەسەرەتای یەکخستنی بەرەی جیهاد دادەنرێت کەلەچارەی نوسرابوو ڕۆژێك لەرۆژان هێزی خاچپەرستەکان لەشامدا لەناوبەرێت[4]. هەروەها تێبینی سوربوونی موسلمانان دەکەین لەسەر چوونە ناو قەوارەیەکی ئیسلامی سوونی بەچاوپۆشی لەسەرکردایەتییەکەی تورك بێت

---

[1] زبدة حلب (٢/٢٢٩-٢٣٠) دراسات تأريخية ل١٩.

[2] دراسات تأريخية ل١٩.

[3] هەمان سەرچاوە ل٢٠.

[4] الشرق الاوسط والحروب الصليبية (١/٤٨٥،٣٤٥-٤٨٦).

یان عەرەب یان هەر نەتەوەیەکی تر، بەڵکو گرنگ ئەوەبوو کەبەرگری لەئیسلامو موسڵمانان بکات لەژێر ئاڵای ئەهلی سووننەتدا.

ز- **کوژرانی بورسقی:** لەساڵی ٥٣٠ ك داو لەهەشتی ذی القعدةدا قسیم الدولة أقسنقر برسقی لەشاری موسڵدا بەدەست باطنییەکان لەرۆژی هەینیو لەمزگەوتدا کوژرا لەکاتێکدا کەنوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، ئەو شەوەش لەخەویدا بینیبووی کەچەند سەگێك پەلاماریان داوەو ئەویش هەندێکیانی کوشتووەو ئەوانی تریش ئازاریان پێگەیاندووە، کاتێ خەوەکەی بۆ هاورێکانی گێڕایەوە داوایان لێکرد چەند رۆژێك لەماڵ دەرنەچێت ئەویش وتی: هەرگیز جومعە بۆ هیچ شتێك وازلێناهێنم، بەڵام ئەوان رێگرییان کردو نەیانهێشت بێتە دەرەوە، هەر سووربوو لەسەر ئامادەبوونی لەنوێژی جومعەدا بۆیە قورئانەکەی هەڵگرتو یەکەم شتێك کە بەرچاوی کەوت ئایەتی: ﴿مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَراً مَقْدُوراً﴾ (الأحزاب ٣٨)، واتە: بەردەوامیش کارو فەرمانەکانی خوا بڕیار لەسەر داوە"[1].

پاشان بەپەلە هات بۆ مزگەوتو هەمیشە لەڕیزی یەکەمدا نوێژی دەکرد، ئەوەبوو زیاتر لەدەکەس پەلاماریان دا بەئەندازەی ئەو سەگانەی کەبینینیو بەچەقۆ بریندارییان کردو ئەویش سێ کەسی لەوان کوشتو خۆشی گیانی سپارد ڕەحمەتی خوای لێبێت، فەرماندەیەکی تورکی چاك بوو، ژانایانو پیاوچاکانی خۆش دەویستو لەباشترین والییەکان بوو پارێزگاری لەنوێژەکانی دەکرد لەکاتی خۆیداو بەردەوام بوو لەسەر شەو نوێژ[2].

ح- **باگنیەکان، ترسناکترین کۆسپ لەبەردەم بزاوتی جیهاتدا:** باطنیەکان دوژمنایەتی خۆیان بۆ سەرکردایەتی بزاوتی جیهاد سەلماند لەو سەردەمەوە کە خەنجەرە ژەهراویەکانییان رێگەیان بۆ خاچپەرستەکان خۆشکرد بۆ جێپێکردنەوە لەوڵاتی شامو جەزیرەدا لەسەر حسابی موسڵمانان، هەروەها مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەچۆن سەرکردەکانی جیهاد لەو سەردەمەدا لەهەندێ کاتدا لەشەهیدیدا یەکیان دەگرتەوە پێشتر شرف الدین مودود تیرۆرکراو ئێستاش أق سنقر برسقی ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس دەبێتەوە، ئەمەش دەسەلمێنێ: کەرێبازی ئیسماعیلی تراری لەو کاتەدا مەترسیدارترین کۆسپ بوو لەبەردەم بزاوتی جیهادی ئیسلامیدا دژ بەداگیرکەران بەهۆی بوونی دوژمن لەیەك کاتدا لەبەردەم

[1] تەفسیری ئاسان ل٤٢٣.

[2] الكامل في التأريخ (٨).

سەرکردايەتی سوننەدا بەجۆرێك كە ئەو نەهامەتييانەمان پێشان دەدات كەرووبەرووی ئەو سەركردانە بووتەوە[1] لەبەرگريكردنياندا لەبيروباوەڕو ئاين‌و نيشتمانی ئەم ئوممەتە. ئەگەر چی أق سنقر شەهيدبوو، بەلام كاروانی تێكۆشەران ئاوەدان‌و ئامادەيە بۆ جەنگ كردن لەپێناو خوادا، ئەوەبوو لەرەبيعی دووەمی سالی ٥١٢ك ١١٢٧ز سولتان محمود ميرنشينی موسلی سپارد بەعماد الدين زەنكی‌و بەدەركەوتنی لەسەر شانۆی رووداوەكان لاپەڕەيەكی نوێ هەلدرايەوە لەهاوكێشەكانی هێزدا لەنێوان موسلمانەكان‌و خاچپەرستەركاندا[2]، عماد الدين هەستا بەپێكهێنانی بەرەيەكی ئيسلامی يەكگرتوو دژ بەخاچپەرستەكان‌و دەستی گرت بەسەر ئەو قەلاو تەپۆلكانەی كەنزيك بوو لێوەی وەك دورگەی أبن عمرو نصيبين‌و شەنگارو ولاتی خاپوورو حەران، پاشان بيری لەدەستبەسەراگرتنی حەلەب كردەوە كەگەورەترين ناوەندبوو لەباكووری شامدا، ئەوەبوو كاتێ كەبەتێكچوونی بارودۆخی حەلەبی زانی لەگەل هەرەشەكانی هەريەك لەجوسلينی دووەمی فەرمانڕەوای رەهاو بووهيمۆندی دووەمی فەرمانڕەوای ئەنتاكيە بەپەلە گەشتە حەلەب‌و خەلكەكەشی بەخۆشحالييەوە هاتن بەدەميەوە ئەويش لەرۆژی دووشەممە ١٣ی جمادی دووەمی سالی ٥٢٢ك يونيۆی ١١٢٨زدا[3] چووە حەلەبەوەو كاروبارەكانی رێكخست‌و سەربازو فەرماندەكانی دامەزراند ئيبن ئەسيريش گرنگی ئەم ئازادكردنە باس دەكات‌و دەلێت: ئەگەر خوای گەورە بەزەيی بەرامبەر موسلمانان نەنواندايە بەهاتنی ئەم سەركردەيە ئەوە فەرەنجەكان دەستيان دەگرت بەسەر هەموويدا دەگرت[4].

**پێنجەم: گرنگترين كارەكانی عماد الدين زەنكی ئازادكردنی رەها بوو:**

عماد الدين زەنكی توانای بەشێكی زۆر لەبەرنامەكەی بەدی بێنێت‌و شوێنێكی تايبەت بۆخۆی لەمێژووی ئيسلامدا تۆماركرد، وەك سياسييەكی لێهاتوو سەربازێكی بەتواناو موسلمان‌و هۆشيار كەپەی بەو مەترسييە بردوە كە لەلايەن خاچپەرستەكانەوە رووبەرووی جيهانی ئيسلامی دەبوويەوەو بگۆڕێت توانی ئاراستەی ئەو بارودۆخە مێژووييە لەبەرژەوەندی موسلمانان، ئەمەش بەكۆكردنەوەی هێزە ئيسلامييەكان پاش لەناوبردنی هۆكارەكانی بەش بەشبوون‌و جياوازی‌و يەكخستنی شارو ميرنشينە سەربەخۆكان لەچوارچێوەی يەك دەولەتدا، كەبەتوانای خۆی توانی

---

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦١.

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الادنى في الجهاد ضد الصليبين خلال الحركة الصليبية ل ٤٨.

[3] الكامل في التأريخ (٦٦٣/٨).

[4] الكامل في التأريخ (٦٦٤/٨).

سود لەزۆرترین توانا وەربگرێت لەپێناو جێبەجێکردنی بەرنامە دولایەنەکەیدا کەبریتی بوو لەپێکهێنانی بەرەی ئیسلامیو لێدانی خاچپەرستەکان، ئەمەش بەباشی لەباسکردنی عماد الدین زەنکیدا لەکتێبە کەمدا سەبارەت بەدەوڵەتی زەنکی روون کردۆتەوە، هەروەها ئازادکردنی رەها بەیەکێك لەگرنگترین دەسکەوتەکانی عما الدین زەنکی دادەنرێت، چونکە میرنشینی رەهای خاچپەرست یەکەمین میرنشینی خاچپەرست بوو لەرۆژهەلاتدا کە لەساڵی ٤٩١ك ١٠٩٧ز بەسەرکردایەتی بلدوینی یەکەم دامەزراو بەردەوام بوو لەفەرمانڕەوایەتی کردنی ئەومیرنشینەدا هەتاوەکو ساڵی ٤٩٤ك ١١٠٠ز کاتێ بوو بەفەرمانڕەوای بەیتولمەقەدیس پاش کۆچی دوای جورفری پاشای بەیتولمەقەدیس، هەروەها رەها تایبەتمەندییەکی جیاوازی هەبوو کەبریتی بوو لەپێگەکەی کەدەکەوتە حەوزی ناوەراستی روباری فوراتەوە ئەمەش وایکرد ئەرکی بەرگریکردنی لەمیرنشینە خاچپەرستەکان لەولاتی شامدا لەئەستۆ بگرێت، ئەمەش بەهۆی نزیکییەوە لەخلافەتی عەباسیو پاشان بەهۆی وەستانی لەبەرامبەر تورکمانەکاندا کەناوچەی جەزیرە پڕبوو لێیان دوای ئەو هەلوەشانەوەی کەتوشی سلجوقییەکان هات لەولاتی شامو عێراقدا پاش کۆچی دوای مەلیك شاە ٤٨٥ك ١٠٩٢ز[1]، گرنگی رەهاش تەنها لەپێگە ستراتیژیەکەیدا بوونی لەهێڵی پێشەوەی بەگری لەمیرنشینە خاچپەرستەکاندا نەبوو، بەڵکو هەرەشەیەکی سەرەکی بوو بۆ هێڵەکانی گواستنەوەی ئیسلامی لەنێوان شامو ئاسیای بچووكو عێراقو ناوچەی جەزیرەدا[2]. هەرچەندە رەهاش نەئەکەوتە چوارچێوەی زەویە پیرۆزەکانەوە، بەلام خاچپەرستەکان بەپیرۆزترین شاریان دەزانی پاش بەیتولمەقەدیسو ئەنتاکیەو قوستەنتینە، هەروەها زۆری سامانی یارمەتی فەرمانڕەواکانی رەهای دەدا بۆ فراوانکردنی روبەری ولاتەکەیان، بۆیە میرنیشنی رەها کەدەکەوتە هەردوو کوناری دەریای فورات لەراوندانو عین سانەوە لەرۆژئاواوە درێژدەبویەوە هەتاوەکو رۆژهەلاتی بهنسیو کیسوم لەباکورەوە منبج لەباشوورەوە[3]، هەروەها بەهۆی فەرمانڕەواکانیەوە کەبەبەهێزیو ئازایەتی ناسرابوون رەها گرنگییەکی تایبەتی پەیداکردو توانی لەبەرامبەر موسڵمانەکاندا خۆراگربێت، ئەمە سەرباری ئەوەی کەرەها بەدەست دوو خاڵی لاوازەوە دەینالاند کەیەکەمیان ئەو سنورە سروشتییە بوو کە هیچ بەربەستێکی تێدانەبوو کەبیپارێزێ، دووەمیشیان نەبوونی هەماهەنگیو هاو رەگەزی بوو لەنێوان دانیشتوانەکەیدا کەتێکەڵەیەك بوون لەگاورەکانی رۆژهەلاتو "سریانو ئەرمەنو یەعاقیبەکان" و گاورە رۆژئاواییەکان ئەمە جگە لەموسڵمانەکان کەهەندێ شاریان پێك دەهێنا وەك

---

[1] سلاجقة ايران و العراق، عبدالمنعم حسين، ل:٨٤

[2] امارة الرها علية الجروي ل٣٤.

[3] الحركة الصليبية (٤٢٤/١) الجهاد ضد الصليبين ل ٢٣٠.

سـروج و الـبيره كـه لـه‌ژێر ده‌سـتى خاچپه‌رسـته‌كاندابوو[1]، هـه‌روه‌ها ئـه‌م شـاره تـه‌نها لاى خاچپه‌رسته‌كان گرنگ نه‌بوو، به‌ڵكو لاى موسڵمانه‌كانيش به‌گرنگترينى ئه‌و پێگانه داده‌نرا كه‌ده‌بێ ده‌ستى به‌سه‌ردا بگيرێت، ئـه‌وه‌تا ئـيبن الاثـير باسى له‌پێگه‌ى گرنگى ده‌كات له‌وڵاتى جه‌زيره‌دا به‌هۆى پێگه‌ى له‌نێوان موسڵ و حه‌له‌بداو وه‌ك شارى سه‌ره‌كى جـه‌زيره وه‌سفى ده‌كات و به‌قـه‌ڵاى وڵاتى ئيسلامى داده‌نێت، ئه‌مه‌ش واى له‌هێزه ئيسلامييه‌كان كـردووه له‌شـام و عێراقـدا كـه‌ئاره‌زووى ده‌ست به‌سه‌راگرتنى بكه‌ن به‌به‌رده‌وامى[2].

١- **بـارودۆخى نـاوخۆى ميرنـشينى ره‌هـا**: بـارودۆخى نـاوخۆيى ره‌هـا لـه‌باربوو بۆ عماد الـدين زه‌نكى، چونكه جوسلينى دووه‌مى فه‌رمانڕه‌واى به‌كه‌سێتييه لاوازو شـوێن ئاره‌زوو كـه‌وتوو نـه‌دارى توانايـه‌كى سياسـى و دوربينـى ناسـرابوو، ديـاره جوسـلينى دووه‌م كاريگـه‌رى ئه‌رمه‌نييـه‌كانى پێوه‌دياربوو، چونكه دايكـى لـه‌وانبوو، بۆيـه هـه‌ر له‌منالْييـه‌وه مـه‌يلى بـۆ ئه‌رمـه‌ن و گـاوره رۆژهه‌ڵاتيـه‌كانى تـرى پێـوه ديـاربوو لـه‌گاوره‌كانى رۆژهـه‌ڵات به‌باشـترى ده‌زانين، ئه‌مه‌ش خاچپه‌رسته‌كانى وروژاندو جۆرێك له‌نائارامى له‌ناو ميرنشينه‌كه‌يدا خوڵقاند، هه‌روه‌ها فه‌رمانڕه‌واى ره‌هـا بـه‌وه ناسـرابوو كه‌حـه‌زى له‌پـشوودان و خۆپاراسـتنه، ته‌نانـه‌ت له‌كاتێكدا كه عماد الدين زه‌نكى هێرشى كرده سـه‌ر ميرنـشينه‌كه‌ى وازى له‌شـاره‌كه‌ى هێنـاو له‌تل باشردا نيشته‌جێ بـوو كه‌ده‌كه‌وێتـه كـه‌نارى خۆرئـاواى فـورات، جا ئه‌گـه‌ر زانيـشمان كه‌موسـڵمانه‌كان لههـه‌موو لايه‌كـه‌وه ده‌ورى ئـه‌م ميرنـشينه‌يان دابـوو و روبـارى فـوراتيش له‌شـوێنه‌كانى تـرى خاچپه‌رسـته‌كانى جياكردبوويـه‌وه لـه‌وڵاتى شـامدا، ئـه‌وه ئـه‌توانين بيرۆكه‌يه‌كى گشتى لاى خۆمان پێك بێنين سه‌باره‌ت به‌هۆكاره‌كانى رووخانى ئـه‌م ميرنـشينه، شايه‌نى باسه ئـه‌م ميرنـشينه مه‌ترسييه‌كى گـه‌وره‌ى له‌سـه‌ر رێگـه‌كانى هـات و چۆى نێـوان موسڵ و حه‌لـه‌ب و به‌غـداو سـلجووقه ڕۆمـه‌كانى ئاسـياى بـچووك دروسـت كردبوو، هـه‌روه‌ك به‌ربه‌ستێك بوو له‌به‌رده‌م دروسـت بـوونى يـه‌كبوونى ئيسلامى دا له‌ناوچـه‌ى شـام و جـه‌زيره به‌هۆى جوڵانـه‌وه‌ى بـه‌رده‌وامى له‌به‌رژه‌وه‌نـدى نـه‌يارانى عمـاد الـدين زه‌نكـى كه‌يـه‌كێك بـوو له‌فه‌رمانده موسـڵمانه‌كانى ناوچـه‌كه[3]. بۆيـه ئـازادكردنى پێويـستييه‌كى سياسـى سـه‌ربازى و ئابوورى و ئاينى بوو[4].

---

[1] الجهاد ضد الصليبين ل٢٣١.

[2] التأريخ الباهر ل٦٦.

[3] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل١٤٩.

[4] هه‌مان سه‌رچاوه لا ١٤٩.

٢- **گرده سەربازییەکانی ئازاد سازی:** عماد الدین زەنکی ئەو بارودۆخەی قۆستەوە کەپێشتر باسمان کردو هەوڵیدا فێڵێك بەکاربێنێت کە بەکورترین رێگە ئامانجەکانی بپێکێت، ئەشیزانی کەناتوانێ مەبەستەکانی بەدی بێنێت هەتاوەکو جوسلین و هێزەکانی لەرەهادا بن تیایدا بمێنێتەوە، بۆیە بەدوای رێگە چارەیەکدا دەگەرا بۆ دۆزینەوەی هۆکارێك کەپاڵ بەرکابەرەکەیەوە بنێ بۆ دورخستنەوەی لەپایتەختی میرنشینەکەی، بۆیە بەرەو ئامەد بەرێکەوتو دوای پیشان دەدا کەئەیەوێ گەمارۆی بداتو مەبەستی تەنها ئەوێیە، لەهەمان کاتیشدا هەستا بەبڵاوکردنەوەی چاوساغو هەواڵگرەکانی لەناوچەی رەهادا هەتاوەکو یەك بە یەك ئاگاداری بکەنەوە لەجموجۆڵەکانی ئەمیرەکەی، ئەویش هەر کەبینی زەنکی سەرقاڵە بەرێکخستنی سوپاکەیەوە لەدیاریەکرداو دەستی بەتاڵ نییە بۆ هێرش هێنان بۆ سەر پێگەکانی خاچپەرستان، بەسوپاکەیەوە میرنشینەکەی بەجێ هێشت[1]، دوای ئەوەی کەرێو شوێنی خۆپارێزی گرتە بەر بەمۆرکردنی لەگەڵ فرار ئەرسەلانی فەرمانڕەوای قەڵای کینادا کەپەنای هێنا بۆ جوسلین پاش ئەوەی لەلایەن زەنکیەوە هەڕەی لێکرا[2]. پاشان بەرەو تل باشر کەوتەرێ کەدەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای فورات، هەتاکو لەوێ خۆی لەهەر بەرپرسیارێتییەك بدزێتەوەو یەکلایی بێتەوە بۆ ئارەزووەکەکانی، پاراستنی رەهاشی بەجێ هێشت بۆ دانیشتوانەکەی لەئەرمەن و سریان و نەستوری و یەعقوبییەکان، کەزۆربەیان لەوو بازرگانانەبوون کەهیچ شارەزاییەکییان نەبوو لەجەنگدا، لەهەمان کاتدا کۆمەڵێ سەربازی بەکرێگیراو ئەرکی بەرگریکردنیان لەقەڵاکە گرتبوویە ئەستۆ[3]. ئەوەبوو چاوساغو هەواڵگرەکانی عماد الدین زەنکی ئاگاداریان کردەوە لەوەی کەهەمیشە ئاواتی بۆ دەخواست ئەویش بەپەلە بەرەو رەها بەرێکەوتو بۆ خێرا گەیشتنیش پشتی بەحوشتری هەڵبژێردراو بەستبوو هەموو موسوڵمانێکی تواناشی خستە گەر بۆ جیهادکردن لەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی خواداو زۆری نەخایەند کۆمەڵانێکی زۆر لەخەڵکانی خۆبەخش لای ئامادەبوون و بەهۆیانەوە لەهەموو لایەکەوە رەهای گەمارۆداو لەسەرەتاشدا ویستی رێگەی ئاشتی بگرێتە بەر، بەڵکو بەبێ بەکارهێنانی هێز بەئامانجی خۆی بگات، بۆیە نامەیەکی ئاڕاستەی خەڵکی رەها کرد و پێشنیاری پەنادانی کردن و[4] و داوای لێکردن دەرگاکانی بۆ بکەنەوە هەتاوەکو

---

[1] الباهر ل٦٧ عما الدین زةنکی ل١٥١.

[2] عماد الدین زةنکی ل١٥١.

[3] هەمان سەرچاوە ل١٥٢.

[4] هەمان سەرچاوە ل١٥٢.

ناچارنەبێت شوراو دیوارەکانیان بڕوخێنێتو شوێنەکەیان پێ چۆڵ بکات، بەڵام ئەوان پەنادانیان ڕەتکردەوە، بۆیە زەنکی هەستا بەتوندکردنی گەمارۆی سەریان بەبەکارهێنانی ئامێرە گەورەکانی گەمارۆدان کە بۆ رووخاندنی شوراکانیان لەگەڵ خۆیدا هێنابووی پێش ئەوەی هەل بۆ خاچپەرستەکان بڕەخسێت بۆ کۆبوونەوەو پێشڕەوی کردن بۆ رزگارکردنی ئەم پێگە مەترسیدارە هەرکە جوسلینیش بەم هێرشەی زانی داوای فریاکەوتنی لەسەرجەم میرنشینە خاچپەرستەکان کرد لەشامدا، بەڵام کەس بەهانایەوە نەهات جگە لە (میلزاند) کەسەرپەرشتیاری بەیتولمەقەدیس بوو، هێزە فریاگوزارییەکەشی پاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە گەیشتە بەرەوە[1] هەروەها هەوڵێکیدا بۆ چوونە ناو شارەکەوەو ناردنی فریاگوزاری بۆ بەهێوکردنی بەرگری، بەڵام ئەم کارەی پێنەکراو لەبیستو شەشی جمادی دووەمی ٥٣٩کو پاش تێپەربوونی بیستو هەشت رۆژ بەسەر دەستپێکردنی گەمارۆکەدا هەندێ بەشی شوراکە روخا بەهۆی ئەو لێدانە توندو چڕو پڕەی کەئاراستەی کرا، ئەوەبوو هێزە موسڵمانەکانشارەکەیان ڕامالی[2] پاش دو رۆژیش قەڵاکەی خۆی دابەدەستەوەو قەشەی یەعقوبی برصوما هەستا ئەنجامدانی بەرێوشوێنی بەدەستەوەدانی رەها بۆ زەنکی[3].

٣- **سیاسەتی عماد الدین زەنکی لەرەهادا:** دوای ئەوەی کە عماد الدین زەنکی رەهای ئازادکرد پێی وابوو کەنابێت ئەو وڵاتە وێران بکرێت[4] بۆیە فەرمانی دابەسەربازەکانی کەکاری کوشتنو گرتنو تالانکردن کۆتایی پێ بێننو ئەوەی کەدەستیان بەسەراگرتووە بیگەرێننەوە ئەوانیش هەموویان گەڕانەوە جگە لەچەند شتێکی کەمو دەگمەن، پاش ئەوەش فەرمانێکی تری دەرکردو داوای پەلە کردنی کرد لەرێکخستنەوەی کاروبارەکانی رەهاداو ئاوەدانکردنەوەی ئەوەی کەرووخابوو لەماوەی گەمارۆی چەند هەفتەییداو خەڵکانێکیشی دانا کەبەشیاوی دەزانین بۆ رێکخستنی کاروبارەکانیو پاراستنو کارکردن بۆ بەرژەوەندییەکانی شارەکە، هەروەها بەڵێنی هەڵسو کەوتی باشو دادگەریشیدا بەخەڵکەکەی[5] مەبەستیشی لەم کارە راکێشانی خەڵکی ئەسڵی شارەکەبوو کەگاوری رۆژهەڵاتی بوون دژ بەخاچپەرستە

---

[1] الحركة الصليبية (٢/٦٠٦،٦٠٥) عاشور عماد الدين زنكي ل١٥٢.

[2] ذيل تأريخ دمشق ل (٢٧٩-٢٨٠) عماد الدين زنكي ل١٥٢.

[3] عماد الدين زنكي ل١٥٣.

[4] الكامل في التأريخ له تأريخ الزنكيين في الموصل ل١٥٣.

[5] ذيل تأريخ دمشق ل ٢٨٠ عماد الدين زنكي ل١٥٣.

کاسۆلیکەکان، هەستانیشی بەتێکدانی چەند کلێسایەکی کاسۆلیکیو هێشتنەوەی کلێسا ڕۆژهەڵاتییەکان ئەمە دەسەلمێنێت[1].

٤- **ئەو هۆکارانەی کەیارمەتی عمادە دینیاندا بۆ گێڕانەوەی ڕەها:** چەندین هۆکارمان هەیە کەیارمەتیدەربوون بۆ ڕزگارکردنی ڕەها لەلایەن عماد الدینوە لەوانە:

- گەشەکردنی بزاوتی جیهادی ئیسلامی هەتاوەکو سەردەمی ئەوو دروێنەی ئەزموونی موسڵمانان لەوبوارەدا، گومانیش لەوەدانییە کەئەو ئەزمونانەی پێشوو سەلماندیان کەمیرنشینی ڕەها چانسی ڕووخانی لەمیرنشینە خاچپەرستەکانی تر زیاترە لەسەر دەستی سەرکردەکانی جیهادی ئیسلامی لەوکاتەدا زیاتر بوو، دیارە هێرشو پەلامارە بەردەوامەکانی ئەتابکەکانی موسڵیش بەشێوەیەکی تایبەت لەماوەی چواردەیەدا ئەو میرنشینەی ماندوکردبوو بەجۆرێك کەوەك مەرگێکی هێواش بوو بۆی هەتاوەکو لەو ساڵەدا بەیەکجاری لەناوبرا.
- لێهاتووی عماد الدینی زەنکیش لەرووی سەربازییەوە یەکێك بوو لەو هۆکارانە ئەوەبوو دوای دڵنیابوونی خاچپەرستەکان لەهێرش نەکردنی بۆیان کتوپڕ هێشی کردە سەریانو هەلی ئامادەنەبوونی ئەمیرەکەیمانی قۆستەوە–جوسلینی دووەم–و گورزێکی کەمەو شکێنی ئاراستەکرد کە بەڕووخانی کۆتایی هات، بەم شێوەیە ئەو سەرکردە موسڵمانە مەزنە سەلماندی کە کاتێکی گونجاوی بۆ ئەو کارە سەربازیە گەورەیە هەڵبژاردووە.
- سەرباری ئەمانەش: ئەو ناکۆکییەی کە لەنێوان میرنشینی ڕەهاو ئەنتاکیەدا هەبوو کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر میرنشبنی ڕەهاو بووە هۆی ماندووکردنی لەڕووی سیاسیو سەربازییەوە[2] بەجۆرێك کەسەلماندی ئەو ناکۆکیانەی کە لەنێوان سەرکردە خاچپەرستەکاندا رووی دەدا ڕۆڵو کاریگەری هەبوو لەسەر قەوارەی سیاسیان، خۆشبەختانەش میرنشینی ڕەها باجی ئەوەیداو کەوتە دەستی ئەوانەی کەشاوی بوون لەسەرکردەکانی جیهادی ئیسلامی لەو کاتەدا.
- لەلایەکی تریشەوە نابێ بێ ئاگابین لەکەسایەتی ئەمیری ڕەها (جوسلینی دووەم) کە (لەئاستێکی باشدا نەبوو) لەرووی لێهاتنی سیاسیو سەربازییەوە وەك جوسلینی یەکەمی باوکیو مەیلی ژیانی ڕابواردنو ئارەزووبازی هەبوو بەردەوام هەوڵی بۆ چێژە کاتیەکان دەدا،

---

[1] عماد الدين زنكي ل١٥٣.

[2] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٢.

تەنانەت چەندین جار رەهای بەرەو تل باشر بەجێ دەهێشت هەتاوەکو لەوێ هەموو جۆرە خراپەکاریەك ئەنجامی بدات ئەوەبوو موسڵمانانیش بەم لایەنەیان زانیو بەباشی سودیان لێ وەرگرتو هێرشیان کردە سەر رەهاو لەکاتی ئامادەنەبوونی جوسلینی دووەم تیایداو توانیان دەستی بەسەرا بگرن[1].

- دیارە ئەو نەوە نوێیەی خاچپەرستەکان کەجێی نەوەی یەکەمی گرتەوە کە هەستا بەدامەزراندنو پاراستنی ئەو قەوارە خاچپەرستەو نەیدەتوانی پارێزگاری لەوە بکات کەنەوەی پێش خۆیان بنیاتیان نا، بەڵکو دەرکی بەگرنگی رۆڵی مێژوویی خۆی نەکرد لەپێگە زۆر هەستیارەدا کە لەهەموو لایەکەوە لەلایەن موسڵمانانەوە دەورە درابوون،بەم شێوەیە جوسلینی دووەم– بەبێ ئەوەی بزانێ بەشداری کرد لەسەرخستنی بزافی جیهادی ئیسلامی لەو کاتەدا بەسەرکردایەتی سەرکردەی مەزن عماد الدین زەنکی[2].
- بەهەرحاڵ، ئەگونجێ مێژوونوسە رۆژئاواییەکان هەوڵیان دابێ هۆکارە ناوخۆییەکانو لاوازییان لەمیرنشنی رەهادا وەك تاکە هۆکارێك نیشاندابێ بۆ رووخانی ئەو میرنیشنە ئامانجیشیان لەپشت ئەمەوە لاوازکردنی چالاکی سیاسیو سەربازی موسڵمانەکانە، بەڵام لۆژیکی مێژوو پێمان دەڵێ هۆکارە ناوخۆییو دەرەکییەکان پێکەوە رۆڵیان هەبوو لەو سەرکەوتنەی ساڵی ٥٣٩ك/١١٤٤ز دا. دیارە ناکۆکیو کوشتاری ناوخۆییو دەرەنجامەکانی هەرچەندە گرنگی بووبێت بەڵام هەرگیز بەبێ کردە سەربازیەکانی سەرکردەی بەهرەمەند عماد الدین زنکیو سەربازەکانی میرنشینی رەها نەدەڕوخا ئەو سەرکەوتنە یەدی نەدەهات[3].

٥- **هەڵوێستی زانای ئەرمەنی لەئازادکردنی رەهاو ئەوەی کە لەصقلیەدا رووی داو خەوێکی عمادەدین پاش مردنی:** هەڵوێستی زانا موسای ئەرمەنی لەئازادکردنی رەهادا: زانا بانگوێژ موسای ئەرمەنی کەمامۆستابوو لەیەکێك لەخوێندنگەکانی موسڵدا هەڵوێستێکی ستایشکراوی هەبوو لەئازادکردنی رەهادا، ئەوەبوو هەستا بەبەکارهێنانی جەنگی دەروونی لەشاڵاوەکەی عمادەدین زەنکی دا بۆ سەر رەها لەساڵی ٥٣٩ك/١١٤٥زدا وەك جەنگاوەرێك بەشداری لەگەمارۆی رەهاکرد بیرۆکەیەکی زیرەکانەی بۆ هات لەکاتی گەمارۆدانی رەها لەلایەن عمادەدین زنکییەوە، پاشا دابەزییە بازار پۆشاکی ئەرمەنی کڕی هەتاوەکو

---

[1] هەمان سەرچاوە ١٦٢.

[2] هەمان سەرچاوە ١٦٣.

[3] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٢.

خاچپەرستەکان نەیناسنەوەو گومانی لێنەکەن[1]، ئەڵێ: چوومە بازارو پۆشاکێکی ئەرمەنیم کڕیو لەبەرم کرد[2] وگەشتمە وڵاتەکەیان هەتاوەکو لێی وردبمەوەو هەواڵی بزانم، پاشان هاتم بۆ مزگەوتو چوومە ناوییەوەو منارەکەیم بینیو لەدڵی خۆمدا وتم ئەچمە سەر منارەکەو بانگ ئەدەمو چی ڕووئەدات باڕووبدات پاشان چوومە سەریو هاوارم کرد الله اکبر الله اکبرو بانگم داو بێ باوەڕەکانیش بەسەر شوراکانەوە بوون هاوار لەشارەکەدا بەرزبوویەوە کەموسڵمانەکان لەلایەکیترەوە هێرشیان هێناوەتە سەر وشار، بێ باوەڕەکانیش وازیان لەجەنگ هێناو لەسەر شوراکە دابەزینو موسڵمانەکان چوون سەر شوراکەو هێرشیان هێنایە سەر شارەکە[3].

- **پاشای دورگەی صقلیە:** پاشای دورگەی صقلیە لەفرەنجەکان بوو کاتێ ڕەها ئازادکرا پیاوچاکێم مەغریبی موسڵمانی تێدابوو پاشاش زۆر ڕێزی لێدەناو بانگی دەکردو گوێی لێدەگرتو پێش قەشەو ڕاهیبەکانی خۆیانی دەخست کاتێ ڕەها ئازادکرا ئەم پاشایە سوپایەکی لەفەرەنجەکان لەدەریایەوە بەرەو ئەفریقا بەڕێخستو توانیان هێرش بکەنو دیلیان هەبێتو چەند شوێنێك تاڵان بکەن پاشان هەواڵی ئەم دبلو دەسکەوتو تاڵانیانە گەشت بەپاشا لەکاتیەشدا دانیشتبووو ئەو زانا مەغریبیەشی لەلابوو، وەنەوزی دەداو پاشا بەخەبەری هێناو وتی: ئەی زانا ئەوە هاوەڵانی ئێمە واو وایان کردوە بەموسڵمانەکان، محەمەد لەکوێییەو بۆ سەری نەخستن؟ ئەویش پێی وت: ئەو سەرقاڵی ئازادکردنی ڕەهابوو– مەبەستی شوێنکەوتوانی پێغەمبەر د.خ– فرەنجەکانیش بەمە پێکەنین، بەڵام پاشا پێی وتن: پێ مەکەنن، سوێند بەخوا لەخۆیەوە واناڵێت پاشا بەمە زۆر دلگران بوو، ئەوەبوو پاش تێپەر بوونی کاتێکی کەم هەواڵی ئازادکردنی ڕەهایان لەلایەن موسڵمانەکانەوە پێ گەیشتو گەورەیی ئەم سەر شۆڕیەش خۆشی ئەم هەواڵەی لەبیربردنەوە،بەهۆی گرنگی ڕەها بەلای گاورەکانەوە[4].

---

[1] موقف فقهاء الشام وقضاتها في الغزو الصليبي ل٢٢.

[2] هەمان سەرچاوە لە بغية الطلب في التأريخ حلب.

[3] بغية الطلب في التأريخ حلب (٣٨٥١/٩) موقف فقهاء الشام وقضاتها من الغزو الصليبي ل١٢٢.

[4] كتاب الدوضتين في أخبار الدولتين (١٤١/١).

● **خەوێك بەشەهیدەوە دوای كوژرانی:** ئەگێڕنەوە كەپیاوچاكێك وتویەتی: شەهید عمادەدینم لەخەودا بینی باش كوژرانی لەباشترین حاڵدابوو، منیش پێم ووت: خوا چی لەگەڵداكردی؟ ئەویش ووتی: لێم خۆشبوو وتم:بەهۆی چییەوە؟ وتی: بەهۆی رزگاركردنی رەهاوە[1].

● **شكست خواردنی پلانێكی خەڵكی رەها:** زۆری نەبرد خەڵكی رەها لەساڵی دواتردا هەستان بەپلانێك بۆ لەناوبردنی موسڵمانەكان و گێڕانەوەی شارەكە بۆ ژێر دەستی خاچپەرستەكان دوای بانگهێشتكردنی جوسلین، بەڵام زەنكی هەر زوو پەی بەم هەوڵە ترسناكە بردو هەستا بەدەستگیركردنی دانەرانی و لەسێدارەدانییان، پاش ئەوەش هەستا بەلەسێدارەدانی ژمارەیەك لەئەرمەنەكان هەتاوەكو بوارییان نەبێ جارێكی تر لەپشتەوە خەنجەربدەن لەموسڵمانەكان و گرنگترین شوێنییان بەو ئاسانییە بدەن بەدەست دوژمنانەوە[2].

٦- **دەرەنجامەكانی ئازادكردنی رەها:** ئازادكردنی رەها لەلایەن عمادەدین زنكییەوە بەگرنگترین دەستكەوت دادەنرێت بۆی لەماوەی حوكمڕانیدا ئەم سەركەوتنەش دەرەنجامی گرنگی هەبوو لەجیهانی ئیسلامی و مەسیحیدا، بەكورتیش گرنگترین دەرەنجامەكانی ئەمانەن:

أ- موسڵمانان دڵنیابوون لەوەی كەبزاوی جیهادی ئیسلامی گەشتۆتە قۆناغێكی پێگەیشتووو لەقۆناغی هەرزەكاری سیاسی تێپەڕیووە، ئەمەش ماف خواردن و كەم كردنەوەی تێكۆشانی سەركردەكانی پێش زەنكی نییە وەك مەودود،ئەگەر چی ریها یەكەم میرنشینی خاچپەرست بوو كە لەسەر دەستییان روخا، بەڵام ئەمە سەرەتایەو ئەمڕۆكە رەها دەروخێ و سبەینێشە قەوارە بێگانەكانی تر، هەر ئەمەش رویداو لەئێستاش بەدواوە میلەكانی كاتژمێر ناگەڕێتەوە دواوە، بەڵكو بەو پەڕی متمانەوە هەنگاو بەرەو پێشەوە دەنێت.

ب- دوپات بوونەوەی لۆژێكی مێژوو كە ئەو جۆرە قەوارە ناشەرعیانە تاسەر نامێننەوە لەخاكی موسڵماناندا، چونكە رۆڵەكانی ئەم ناوچەیە خاوەنی شوناسێكی ئاینی یەكگرتوون و بەو بارودۆخە سیاسی و سەربازیە نامۆیە رازی نابن بەم شێوەیەش هەماهەنگی گەرایەوە بۆ باكوری عێراق و چیتر رەهاش رۆڵی جیاكەرەو قەوارەی خاچپەرستی رێگری بەربەستی لەنێوان سلجوقییەكانی ئاسیای بچووك و سەلجوقییەكانی عێراق و وڵاتی فارسدا نەبینی[3].

ج- فشار لەسەر ئەو پشتێنە خاچپەرستییە زیادبوو كە لەئەنتاكیەوە درێژدەبوویەوە لەباكورەوە بەرەو ئیلات (الرشراش) لەباشوورەوە و لەرووباری ئوردن لەخۆرهەڵاتەوە

---

[1] هەمان سەرچاوە (١/١٤١).

[2] عماد الدين زنكي ل ١٥٧.

[3] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٤–١٦٥.

هەتاوەکو کەناری شام- جگە لەعەسقەلان- چونکە صور بەمیرنشینی رابلوس و شانشینی بەیتولمەقەدیسەوە پێشتر لەساڵی ١١٢٤ز/ ٥١٨ك روخابون ، گومانیش لەوەدانییە کەرەهای سەرە رمی خاچپەرستان بۆ هەتاهەتایی روخا، ئێستاش دەستی باڵایە لەو قەوارە خاچپەرستانەدا کەماونەتەوە، بۆیە فشاری سەربازی لەسەر زیاتربوو لەلایەن هێزە ئیسلامییەکانەوە کەدەستیان گرت بەسەر پشتیەوەی شام کە لەدەشتی کەناری شامدا خۆی دەبینییەوە، وەك ئەوەی جەنگەکە لەسەر ئاستی جوگرافی بوویێت لەنێوان کەنارو پشتەوەیدا، لایەنی یەکەم-کەنار-پشتی بەکۆمەکی دەرەکی ئەورووپی دەبەست بەشێوەیەکی سەرەکی، لایەنی دووەمیش پشتی بەتوانا ناوخۆییەفراوانەکانی دەبەست کە لەگەڵ دەرکەوتنی سەرکردەکانی یەکبوونی نێوان موسڵمانانندا گرنگی زیاتری پەیداکرد.

د- روخانی رەها بەم شێوەیەبووە هۆی جوڵانی ئەو هاوپەیمانییە بەرگریکارییە ستراتیژییەی کە لەنێوان قەوارەی خاچپەرست لەرۆژهەڵاتداو رەحمی دایك لەخۆرئاوای ئەورووپایدا، چونکە رۆژئاوا رازی نەبوو ئەو درێژبوونەوە سیاسیو مێژوییەی لەرۆژهەڵاتدا هەرەس بێنێت، بەڵکو دەبێ دەستیوەربدات لەپێناو گەرانەوەی بارودۆخ بۆ دۆخی خۆیو لەباربردنی چالاکیەکانی میرنشینی موسڵ، لێرەشەوە پەیدابوونی خاچپەرستەکان لەساڵی ١١٤٧-١١٤٩ز/٥٤٢-٥٤٤ك کەبەشالاوی خاچپەرستی دووەم ناسرابوو دەرەنجامێکی راستەوخۆی رووخانی رەهابوو، ئەمەش بۆمان دەردەخات کەچۆن سەرکردەکانی جیهادی ئیسلامی دژ بەچەندین هێزی جیهانی جەنگاون، ئەو هێزانەش تەنها هێزی ناوخۆیی سنوردارنەبوون لەرووی کاریگەریو چالاکییەوە، بەڵکو بەشێکبوون لەململانێیەکی کیشوەری یاخود جیهانی بەجۆرێك کەپێگەیەکی دیاریان پێ دەبخشێت لەمێژووی موسڵمانانندا-بەگشتیو لەسەردەمی جەنگە خاچپەرستییەکاندا بەتایبەتی.

هـ- هەروەها لەو دەرەنجامە زۆرانەی کە لەم سەرکەوتنەدا بەدی هات: بەرزبوونەوەی پلەوپایەی عمادەدین زەنکی بەشێوەیەکی بەرچاو، ئەوەبوو لەسەرکردەیەکی ناوخۆییو ناوچەییەوە لەرووی چالاکیو کاریگەرییەو گۆڕا بۆ سەرکردەیەك کەناوی لەساڵنامەی لاتینیو سریانییەکاندا زۆر دەهات ئەمەش رەنگدانەوەی ئەو کاریگەرییە گەورەیەیە کەهەیبوو لەسەر رووداوەکانی رۆژهەڵاتی لاتینیدا. ، سەبارەت بەموسڵمانەکانیش ئەوە پێگەو پایەیەکی دیاری هەبوو[1]، چونکە ئازادکردنی رەها پێگەی عمادەدین زەنکی بەرامبەر بەسوڵتان

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٥.

مەسعوودی سەلجوقیو خەلیفەی عەباسی المقتفي لامر الله کەکۆمەڵێکی زۆر نازناوی پێ بەخشی کەبەوپەری لێهاتووییەوە بەدەستی هێنا،وەك ئەمیری سەر فرازو پایەی ئیسلامو گەورەی سوڵتانەکانو سەرکردەی سوپای موسڵمانەکانو پاشای ئەمیرەکانو ئەمیری عێراقییەکانو شام[1]. ئەم سەرکەوتنەش عمادەدین زنکی کرد بەبەرگریکاری یەکەم لەئاینو تێکۆشەر لەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی خوادا، لەناوەند ئیسلامییەکانیشدا چەندین باسو خواس دەربارەی کەسایەتی دەکرا کەرادەی ئەو رێزلێنانو سەرسامییە دەردەخات کەدەستی کەوت پاش بەدەست هێنانی ئەو سەرکەوتنە مەزنە، ئەم ئازادکردنەش رێخۆشکەربوو بۆ عمادەدین زەنکی هەتاوەکو درێژە بەئازادکردنی قەڵاکانی دەوروبەر بداتو دەسەڵاتی خۆی بەسەر دوژمنەکانی لەناوچەکەدا بسەپێنێت، هەروەها ئازادکردنی رەها رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەرزگارکردنی میرنشینەکەی عمادەدین زەنکی لەمەترسی بەردەوام بوونی هێرشەکانی خاچپەرستان بۆ سەری بەم شێوەیەش خەڵکەکەی دوای ترس کەوتنە باردۆخێکی ئارامەوە[2] ئەمەش لەمژدە نزیكو دونیاییەکانی مرۆڤی باوەڕدارە.

٧- **رای رۆژهەڵاتناس جۆن لامۆنت دەربارەی عمادەدین:** رۆژهەڵاتناس جۆن لامۆنت یەکێکە لەدیارترین مێژوونوسە ئەمریکییەکان نیوەی یەکەمی سەدەی رابردوودا، چەندین نوسراویشی لەبواری خاچپەرستیدا هەیە بەتایبەت لێکۆڵینەوە گشتگیرەکەی دەربارەی موڵکایەتی دەرەبەگایەتی لەشانشینی بەیتولمەقەدیسدا، لێکۆڵینەوەیەکی تریشی بەناونیشانی جەنگی خاچپەرستیو جیهاد لەچوارچێوەی کتێبی کەلەپوری ئیسلامیدا، کەنبیە فارس بڵاوی کردەوەو تیایدا لامۆنت هەوڵی داوە کەبیرۆکەی جیهاد لای موسڵمانان ئەوکاتە بەدرۆبخاتەوەو جوڵانەوەی سەرکردە ئیسلامییەکانی لەوکاتەدا بەکاریگەی پاڵنەرە ئابووریو سیاسییەکان لێك داوەتەوە وای دادەنێ کە بەهیچ شێوەیەك عمادەدین الزنکی پاڵەوانی جیهادنەبووە، چونکە عمادەدین هەرچەندە لەزووەوە ئارەزووی گێڕانەوەی رەهای بووە وەك کمال الدین بن العدیم دەڵێ: بەڵام ئەم کارەی بەڕوونی تەنها لەم دواییانەدا ئەنجام داو پاش ئەوەی ئەمیری حەڕان أبو المعالی فضل الله بن ماهان هانی دا بۆ ئەو کارەو ئاسانی دەستبەسەراگرتنی ئەو شارەی بۆ روونکردەوە[3]، پاشان لەسەر قسەکانیدا دەڕوات ئەڵێت: وادیارە کە ئەو بۆ خۆی داگیرکردنی رەهای بەدەرچوون لەسیاسەتی خۆی دەزانیو وەك

---

[1] تأريخ الزنبيك في الموصل وبلاد الشام ل١٦٥.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٥٦.

[3] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٦.

کارێکێکی لێی دەڕوانی کەدەرەنجامی هاندانی خەڵکانی تر بۆ بێت[1]، هەروەها ئەڵێ:زەنگی دەست بەسەراگرتنی حەماو حەلەبو جەنگەکانی دژی ئەرتەقییەکانی بەلاوە گرنگ تربوو لەجەنگی خاچپەرستەکان، بەڵام هەرگیز هاوپەیمانێتی لەگەڵ لاتینەکاندا پێ ناخۆش نەبوو ئەگەر بەرژەوەندی تێدابوایە[2]، ئەشتوانین ئەو رایانە بەم شێوەیە پوچەڵ بکەینەوە:

- هەستانی عمادەدین زنکی بەهێرشکردنە سەر رەها لەکاتێکی درەنگدابوو هەرچەندە ئەمە لەرۆڵێ جیهادی ئەو کەمناکاتەوە، چونکە ئەو دەیویست توانای ئەو میرنشینە خاچپەرستە بەکاربەرێت بەو ململانێو جەنگانەی کەدژ بەپێگەو ناوچەکانییان دەیکرد، پاشان هەستێت بەهێرشکردنە سەر خودی میرنشینەکە پاش ئەوەی کەتوانای بڕینی قوڵایی بەرگرییەکانیانی دەبێت، وخاڵە بەهێزو لاوازەکانیان دەزانێت، لەلایەکی تریشەوە ئاساییە کەوایببینین کەئامۆژگاری ئەمیری حەڕان بۆ زەنکی بەرووخانی رەها هیچی لەمەسەلەکە نەدەگۆری ئەگەر زەنکی ئەو بڕیارەی نەدایەو پلانی بۆ دانەنایە، زۆر قورسیشە بتوانین روخانی رەها بەو شێوەیە ببینین کەلامۆنت باسی دەکات، بەڵکو ئەوە پلانو نەخشەیەکی مێژینەی زەنکییەکان بوو، سەبارەت بەهۆی پەلەنەکردنی زەنکی لەئازادکردنیشیدا ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەئارەزووی ئەوەی نەبووە کەخێرا هێزەکانی لەروبەڕوبوونەوەیەکی پێشوەختدا بەکاربێنێت کەدەرەنجامی دیارو مسۆگەری نەبێت لەقۆناغی سەرەتای حوکمڕانیدا، بۆیە ئەتوانین ساوەختی ئازادکردنی ئەها بەوشێوەی کەسەرچاوە لاتینیو سریانیو عەرەبیەکان باسیانکردووە بەبەڵگە دابنێین لەسەر لێهاتوویی زەنکی لەڕووی سیاسییەوە، واش دەرئەکەوێت کە ئەو قسەی لامۆنت کەگوایە رووخانی رەها دووربووە لەسیاسەتی عمادەدین زەنکی گەورەترین وتەیە کەهیچ بەڵگەیەکی مێژوویی پاڵپشتی نا، کات، چونکە ئاشکرایە زەنکی لەسوپای مەودودا بووەو بەدەقی قسەی ئیبن الأثیر: لەگەڵیدا بەشداری جەنگەکانی کردووە[3]، گومانیش لەوەدانییە کەزەنکی بەباشی گرنگی رووخانی رەهای دەزانی، بەڵکو ئەو خەونە لەزووەوە لەئ هاتوچەندێشەیدا جێگیربووە، لەوانەشە ویستبێتی لەو مەسەلەیەدا سەرکەوێت کەپێشتر مەودود شکستی تێداهێنا،و رووخانیشی بەمەسەلەیەکی پێویستە دەزانی بەوپێیەی نزیکترین ئامانجی خاچپەرستە لەموسڵەوە، هەر وەك بەدیهێنانی ئەو

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ١٦٦.

[2] هەمان سەرچاوە ل ١٦٦.

[3] الباهر ل١٧ الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٧.

ئامانجـە لەوانەیـە پەیوەنـدیکردنی بـەباکوری شـا مـەوە ئاسـان تربکـات بەتایبـەت لەڕێیلەڕوانگەی تێڕوانینی یەکێتیخوازو دوربینانەی وردی زەنگیەوە[1].

- گریمانەی جون لامونت سەبارەت بـەوەی کـەزەنکی ئـەیتوانی لەگـەڵ لاتینـدا هاوپـەیمانێتی بکات لەپێناو بەرژەوەندی سیاسیدا، پاڵپشتی لێهاتوویی زەنکی دەکات لەڕووی سیاسیەوە، ئەوەبوو جارجارێك پەنای دەبرد بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتنامە لەگەڵ خاچپەرستەکاندا لـەپێناو پشوودانو نەکەوتنە ناو دوو بەرەی جەنگەوە، بـەرەی ڕۆژهـەڵات بـەو ململانێیـەی کەلەگـەڵ هێزە سیاسییەکانیدا هەیبوو، بەرەی رو لەگەڵبەرپبوونەوە لەگـەڵ خاچپەرسـتەکاندا. پاشـان ئەیویست هەردوو لادڵنیابکاتەوە بەهۆی ئەم جۆرە ڕێککەوتنانەوە، کاتێکدا لەنییەتی هـەبوو بەنهێنی پـەلاماری رەهابـدات، بۆیـە گـەمارۆدانی لەلایـەن زەنکییـەوە کـارێکی کتوپڕیـوو بۆ خەڵکەکەی[2].

- وتنی ئەوەی تاکە ئامـانجی زەنکـی رووخـانی رەهـا نـەبووە، بـەڵکو هـەوڵی بنیـات نانـەوەی دەوڵەتی خۆی داوە لەسەر حسابی دراوسێکانی چ موسڵمان بن یان خاچپەرست ئەوە دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کەسەرجەم ئـەو سـەرکردە ئیسلامییانەی کـە لەسـەردەمی جەنگـەکانی خاچپەرستیدا پەیدابوون بەدرێژایی سەدەی دوانزەو سیانزەی زاینی/ شەشـەمیو حەوتـەمی کۆچیو بەشداربوون لەجیهادکردندا مۆرکی تەماحی سیاسییان پێوەدیاربووەو هەوڵیان داوە پایەکانی دەوڵەتەکـەیان بەهێزبکـەن لەسـەر حـسابی دەوڵـەتانی دراوسـێی، بـەڵام مەبەسـت لێرەدا ئەوەیە کەتەماعی سیاسی وەك پێشتر باسم کرد، لەڕێی تەقاندنەوەی دۆزی سەرەکی ئومەتەوەکرا کە لەجیهادا ، چونکە هخۆی دەبێنیتەوەهەندێ لەو سەرکردانە ئەیانتوانی رازی بن بەژیانی ملکەچیو لاوازی لەبەرامبەر خاچپەرستەکاندا بـێ ئـەوەی ئامـادەی فراوانخـوازی بـن لەسـەر حـسابی ئـەوان لـەپێناو خـۆ لادان لەکێـشەی سیاسـیو کەوتنـەوەی جـەنگ لەنێوانییانـدا تەنانـەت ئەگـەر ناوچـەکانی ژێـر دەسەڵاتیـشیان رووبـەرووی دەسـتدرێژی ببوایەتەوە، بەڵام بەوە رازی نەبوونو رووبەروبونەوەیان هەڵبژاردو توانای خۆیان نیشاندا بۆ گۆرینی جوگرافیـای سیاسـی ناوچـەکە لـەڕێی بەئـەنجام گەیانـدنی پـڕۆژە جیهادییەکانـەوە[3] پێویستە بزانرێت کەشاراوەنییە لای لێکۆڵەرانی مێژووی پەیوەندییـە ئیـسلامییەکان لەگـەڵ هێـزە گاورەکانـدا لـەقۆناغی جەنگـەکانی خاچپەرسـتیدا کەچـۆن بەشـێك لەرۆژهەڵاتناسـان

---

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٦٧.

[3] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٨.

سوربوون لەسەر ئەوەی کەدەسکەوتەکان لەموسڵمانان داڕنن و گومان لەقۆناغە گەشەکانی مێژوویاندا بکەن، هەروەك گیانی تۆڵە سەندنەوە لەکۆمەڵگاکاندا هەیە بەرامبەر بەبیرۆکەی جیهاد کەچڵەپۆپەی ئیسلامە، بۆیە زۆر سووربوون لەسەر نکوڵی کردن و گومان لێکردنی و خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ سەرجەم ئەزمونە جیهادییەکانی پێشتری موسڵمانان هەتاوەکو لەداهاتوودا دووبارە کاری پێ نەکەن، بەم شێوە ئەتوانین دان بەوەدا بنێین- بەشێوەیەکی بابەتی و بەبێ زۆرکردن لەبڕیارداندا- کەسەردەمی جەنگەکانی خاچپەرستی گواستنەوەیەکی چۆنایەتی بوو بۆ گەشەدان بەبیرۆکەی جیهاد لەئیسلامدا، چونکە جیهادی ئەم جارە دژ بەدوژمنێکە کەلەسەر زەوی ئیسلام جێنشین بووە دوای لاوازبوونی موسڵمانەکان دەرئەنجامی ململانێ ناوخۆییەکانیان، جا ئەگەر بزانین کەشوناسی ئاینییان لەمەترسیدابووە لەبەرامبەر پڕۆژەکانی بەگاورکردندا کەدەزگای پاپا ئومێدی گەورەی پێ هەبوو، ئەوە دەرك بەوە دەکەین کەچەندە بیرۆکەی جیهاد بیرۆکەیەکی سەرەکییە لەسەردەمی جەنگە خاچپەرستییەکاندا[1]، لەراستیدا سەرچاوە رۆژئاواییەکان هەوڵی شێواندنی وێنەی ئەم تێکۆشەرە گەورەیەیان داوە لەکۆن و نوێداو لەگرنگترین ئەو کتێبە هاوچەرخانەش کتێبی الحروب المقدسة الحروب الصليبية وأثرها على العالم اليوم، خاوەنی ئەم کتێبە کارین أرمسترونغ دەربارەی عمادەدین زنکی ئەڵێت: بەهیچ شێوەیەك ئەم پیاوە پێشەنگ نەبووە، بەڵکو سەرخۆشێکی بەد رەوشت بوو کەزۆر کەم بەهۆش خۆی دەهاتەوە ، هەروەك توندوتیژو دڵرەق بوو هاوشێوەی زۆربەی پیاوانی جەنگ لەسەردەمی خۆیدا[2] بێگومان ژیاننامەی ئەم پیاوە ئەم قسانە بەدرۆ دەخاتەوەو مێژونوسەکانیش بەشەهید وەسفیان کردووە، ئەمەش خەڵاتێکی گەورەیەو نادرێ بەکەسێك کەزۆر شیاوی ئەو وەسفە گەورەیە نەبێت، هەروەها دەربارە ی ژیاننامەی ئەڵێن کەباشترین ژیاننامەی هەبووە لەناو پاشاکانداو لەهەموویان لێبڕاوتربووەو هاوڵاتییانی لەئاسایشێکی تەواودا ژیاون کەتیایدا بەهێز نەیتوانییوە دەستدرێژی بکاتە سەر لاواز[3]، هەروەك شەریعەتی بەگەورە دەگرت و سنورەکانی جێبەجێدەکرد لەدەوڵەتەکەی خۆیداو چەند دادوەرێکی راسپاردبوو بۆ ئەم مەبەستە، دیارە ئامانجی هەندێ لەرۆژهەڵاتناسان بریتی بووە لە:

---

[1] الحروب الصليبية العلاقات بين الشرق والغرب ل١٦٨.

[2] الحرب المقدسة الحملات الصليبية وأثرها عاى العالم اليوم ل ٣٤٥.

[3] كتاب الدوضتين في أخبار الدولتين (١/١٥٧).

● ناشیرین کردنی ئەوکەسانەی کەهێمای جیهادو تێکۆشان بوون هەتاوەکو نەوەکانمان بێ بەش بن لەپێشەنگێک کەورەیان بەرزبکاتەوەو هیمەتییان بجولێنێ.

● لاوازکردنی گیانی قوربانیدانو خۆبەختکردنو شەهیدیو جیهاد لەئوممەتدا هەتاوەکو بتوانن وەك رانە مەڕ پێش خۆییانیان بخەن.

● هەوڵدان بۆ دابڕاندنی ئەومەت لەمێژووی خۆی بەدرۆو شێواندن هەتاوەکو نەگەرێتەوە بۆ مێژووی دەوڵەمەندی خۆیو پەندو وانەی لێ وەرنەگرێت.

● نوسینەکانییان هەڵقولاوی گیانێکی خاچپەرستانەیو داخ لەدڵە بەرامبەر بەئەو پاڵەوانانەی کەهاوکاربوون لەشکست پێهێنانی پرۆژەی خاچپەرستیدا، بۆیە رۆژهەلاتناسان هەولیانداوە وێنەی عمادەدین زنکی بشێوێنن.

● ژیاننامەی عمادەدین زەنکیو خەڵکانی هاوکارو دڵسۆزی دەوروبەری وەك قازی شارەزوری هیچ گومانێك ناهێڵێت لەدرۆزنی ئەو رۆژهەلاتناسانە، کەهەولیانداوە راستەکان ژێر پێ بخەنو تۆمەتی ناڕەوا بۆ ئەو پیاوە مەزنە هەڵبەستن دیارە ئەزموونی تێکۆشانی شیاوی لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی قوڵە لەگەڵ بەستنەوەی ئەو پەندو وانانەی کەپێی دەگەین بەواقیعی هاوچەرخمانەوە هەتاوەکو سودی لێ وەربگرین بۆ هەوڵدانی لێبڕاوانە لەپێناو بەرەوپێشچوونو بوژانەوەی ئومەتی ئیسلامیدا.

٨- **ستایش کردنی شاعیران بۆ عمادەدین لەکاتی ئازادکردنی رەهادا :** زۆرێك لەلێکۆڵەرو نوسەران گرنگییان بەئەدەبی سەردەمی جەنگەکانی خاچپەرستی نەداوە، بەڵکو زۆرینەیان بەئەدەبی دواکەوتوو ناوزەدیان کردووە، لەمەشدا قسەی رۆژهەلاتناسەکانیان پەیڕەوکردووە کەدەیانەوێت لەلێکۆڵینەوەی مێژوو ئەدەبی ئەم جەنگانە دوربکەوینەوە لەبەر چەندین هۆ لەوانە ئارەزویان لەوەی کە لەدڕندەییو دڵڕەقی خاچپەرستەکان ئاگادارنەبین، پاشان هەتاوەکو هەست بەسەربەرزیو شانازی نەکەین کاتێ مێژووی پاڵەوانانی ئیسلام دەخوێنینەوە بەکوردو عەرەبو تورکەوە-کاتێ لەژێر ئالای ئیسلامدا سوپای ئیسلامییان بەرێوە دەبرد- کە وەك جەنگاوەرو تێکۆشەرو سەرکەوتوو گەورەتر لەنەتەوە پەرستیو نیشتمانچێتی نەفامی بیریان دەکردووەو خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو تێکۆشان لەپێناو خواو رەزامەندیدا کۆی دەکردنەوە، لەراستیدا ئەدەبی ئەم سەردەمە هێشتا پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زۆرە، پاشان پێویستی بەهەڵسەنگاندنەوەی سەرلەنوێ هەیە، لەو کاتەشدا دەبینین راکانمان بەشێوەیەکی پۆزەتیف گۆڕاوە، چونکە ئێمە زۆر شتی تیا دەبینین کەشیاوی لێکۆڵینەوەبێتو زۆر شیعری ناسك هەیە لەبواری حەماسەتو وەسفی جەنگەکانو

ستایشی پاڵەوانەکان، هەروەها زۆر شیعری غەمباریو گریان هەیە لەپیاهەڵدانیاندا[1]. ئەمەش چەپکێك شیعری جوانە کەپەیوەستە بەئازادکردنی رەهاو ستایشکردنی عمادەدین زەنکی، ئەوەتا ئیبن الأثیر وەسفی سوپای عیمادەدین دەکات لەکاتی چوونە دەرەوەیدا بۆ ئازادکردنی رەهاو ئەڵێت:

بجيش جاش بالفرسان حتى ظننت البرَ بحراً من سلاج
وألسنة من العذبات حُمر تخاطبنا بأفواه الرِياح
وأروع جيشه ليلٌ بهيم وغُرّته عمود للصباح
صفوح عند قدرته ولكن قليل الصفح مابين الصفاح
فكان ثباته للقلب قلبا وهيبتهُ جناحاً للجناح[2]

أ- قەیسەرانی ستایشی عمادەدین دەکات لەئازادکردنی رەهادا: شاعیر دەڵێ:

هو السيف لايغنيك إلاّجِلادُهُ وهل طَوَّق الأملاك إلاّ نجاده

ئەم ئازادکرنە ئاوازێکی خۆشی هەبوو لەدەروونی خەڵکیداو بەئازادکردنی رەها تێڕوانینی فەرەنجەکان بۆ هێزی موسڵمانەکان گۆڕاو عمادەدین زنکی گەراندیەوە بۆ وڵاتی ئیسلام دوای ئەوەی فەرەنجەکان نیو سەدە حکومڕانییان کرد هەروەها لەوشعرانەدا هاتووە:

وعن ثغر هذا النصر فلتأخذ الطي سناها وإن قات العيون اتقاده
سمت قبه الإسلام فخرا بطوله ولم يك يسمو الدين لولا عماده
وذاد قسيم الدولة ابن قسيمها عن الله ما لا يستطاع ذيادة
ليهن بي الإيمان أمن ترفعت رواسية عزا وأطمأن مهادة
وفتح حديث في السماع حديثه سهي إلى يوم المعاد معاده
أراح قلوبا طرن من وكناتها عليها فوافى كل صدر فؤاده
لقد كان في فتح الرها دلالة على غير ما عند العلوج اعتقاده
يرجون ميلاد ابن مريم نصرة ولم يعن عند القوم عنهم ولاده
مدينة إفك منذ خمسين حجة يفل حديد الهند عنها حداده
تفوت مدى الأبصار حتى لو أنها ترقت إليه خان طرفا سواده
وجامحة عز الملوك قيادها إلى أن ثناها من يعز قياده

[1] شعر الجهاد الشامي في مواجهة الصليبيين ل١٠.

[2] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين (١/١٣٩).

فأوسعها حر القراع مؤيد ... بصير بتمرين الألد لداده
كأن سنا لمع الأسنة حوله ... شرار ولكن في يديه زناده
فأضرمها تارين: حربا وخدعة ... فما راع إلا السيف حتما يفاده
فيما ظفرا عما البلاد صلاحه ... بمن كان قد عم البلاد فساده
فلا مطلق إلا وشد وثاقة ... ولا موثق إلا وحل صفاده
ولا منبر إلا ترنح عوده ... ولا مصحف إلا أنار مداده
فإن يشكل الإبرنز فيها حياته ... وإلا فقل للنجم كيف سهاده
وياتت سرايا القمص تقمص دونها ... كما يتترى عن حريق جراده
إلى ين يا أسرى الضلالة بعدها ... لقد ذل غاويكم وعز رشاده
وريدكم لا مانع من مظفر ... يعاند أسباب القضاء عناده
مصيب سهام الرأي لو أن عزمه ... رمى سد ذي القرنين أصمى سداده
وقل لملوك الكفر سلم بعدها ... ممالكها إن البلاد بلاده
كذا عن طريق الصبح أيتها الدجي ... فيا ظالما غال الظلام امتداده
ومن كان أملاك السموات حنده ... فأية أرض لم ترضها جياده
والله عزم ماء سيحان ورده ... وروضة قسطنطينية مستزاده
إن الصفائح يوم صافحت الرها ... عطفت عليها كل أشوس ناكب
فتح الفتوح مبشرا بتمامه ... كالفجر في صدر النهار الآيب
لله أيه وقفة بدرية ... نصرت صحابتها بأيمن صاحب
ظفر كمال الدين كنت لقاحة ... كم ناهض باحرب غير محارب
وأمدكم جيش الملائك نصرة ... بكتائب محفوفة بكتائب
جنبوا الدبور وقد تم ريح الصبا ... جند النبوة هل لها من غالب
أترى الرها الورهاء يوم تمنعت ... ظنت وجوب السور سورة لاعب
لا أين يا أسرى المهالك بعدها ... ضاق الفضاء على نجاة الهارب
شدا إلى أرض الفرنجة بعدها ... إن الدروب على الطريق اللأحب
أفغركم و الثار رهن دمائكم ... ما كان من إطراق لحظ الطالب
وإذا رأيت الليث يجمع نفسه ... دون الفريسة فهو عين الوائب
صفات مجدك لفظ جل معناه ... فلا استرد الذي أعطاكه الله

يا صارما بيمين قائمة — وفي أعالي أعادي الله حداه
أصبحت دون ملوك الأرض منفردا — بلا شبيه إذ الأملاك أشباه
فداك من حاولت مسعاك عمته — جهلا وقصر عن مسعاك مسعاه
قل للأعادي ألا موتوا به عمدا — فالله خيبكم والله أعطاه
ما زال يسمك والأيام تخدمه — فيما ابتلاه وتدني ما توخاه
حتى تعالت عن الشعري مشاعره — قدرا وجاوزت الجوزاء نعلاه
وقد روى الناس عن فتح أتيح له — مظل أفف الدنيا جناحاه
على المنابر من أنبائه، أرج — مقطوبة بفتيق المسك زياه
فتح أعاد على الإسلام بهجته — فافتر مبسمه واهتز عطفاع
يهدى بمتعصم بالله فتكته — حديثها نسخ الماضي وأنساه
إن الرها غير عمورية وكذا — من رامها ليس مغزا، كمغزاه
أخذت الكواكب عزا ما بعى أحد — من الملوك لها وقما فواتاه
حتى دلفت لها بالعزم يشحذه — رأي يبيت فويق النجم مسراه
مشمرا وبنو الإسلامفي شغل — عن بده غرس لهم أثمار عقباه
يا محيي العدل إذ قامت نوادبه — وعامر الجود لما مح معناه
يا نعمة الله يستضفي المزيد بها — للشاكرين ويستقني صفاياه
أيقاك للدين و الدنيا تحوطها — من لم يتوجك هذا التاج إلا هو
أيا ملكا ألقى على الشرك كلكلا — أناخ على أماته كاكا الثكل
جمعت إلى فتح الرها سد بابه — بجمعك بين النهب والأسر و القتل
هو الفتح أنس كل فتح حديثه — وتوج مسطور الرواية و النقل
فضضت به نقش الخواتم بعده — جزيت جزاء الصدق عن خاتم الرسل
تجردت للإسلام دون ملوكه — تبتك أسباب المذلة و الخذل
أخو الحرب عدتع القراع مفطما — يشوب بإقدام الفتى حنكة الكهل
بعماد الدين أضحت عروة الدين — معصوبا بها الفتح المبين
واستزادت بقسيم الدولة — القسيم في ادحاض كيد المارقين
ملك أسهر عينا لم يزل — همها تشديد هم الراقين
لاخلت من كحل النصر فقد — فقأت غيظا عيون الحاسدين

كل يوم مر من أيامه ... فهو عيد عائد للمسلمين
لو جرى الإنصاف في أوصافه ... كان أولاها أمير المؤمنين
ما روى الراوون بل ما سطروا ... مثل ما خطت له ايدي السنين
إذ أناخ الشرك في أكنافه ... بمئي ألف تلاها بمئين
وقعة طاحت بكلب الروم من ... قطعه التين إلى قطع الوتين
إن حمت مصر فقد قام لها ... واضح البرهان أن الصين صين
والرها لو لم تكن إلا الرها ... لكفت حسما لشك الممترين
درج الدهر عليها معصرا ... لم تدنس بمرام اللا مسين
هم قسطنطين أن يفرعها ... ومضى لم يحو منها قسط طين
ولكم من ملك حاولها ... فتحلى الحين وسما في الجبين
هي أخت النجم إلا انها ... منه كالنجم لرأي المبصرين
منيت منه بليث قائد ... بعران الذل أساد العرين
زارها يزأر في أسد وغى ... تبدل الأسد في الزأر الأتين
صولجوا البيض بضرب نثر ... الهام في ساحاتها نثر الكرين
يا لها همة ثغر أضحكت ... من بني القلف ثغور الشامتين
برنست رأس برنس ذلة ... بعدما جاست ججوايا جوسلين
وسروج مذ وعت أسراجه ... فرقت جماعها عنها عضين
تلك أقفال رماها الله من ... عزمه الماضي بخير الفاتحين
شام منه الشام برقا ودفه ... مؤمن الخوف مخيف الآمنين
كم كنيس كنست آرامها ... منه بعد الروح في ظل السفين
همة تمسي وتضحي عزمة ... ليس حصن إن تحتع بحصين
قل لقوم غرهم إمهاله ... سنذوقون شذاه بعد حين
إنه الموت الذي يدرك من ... فر منه فشجا للغافلين
وهو يحيي ممسكي عروته ... إنها حبل لمن تاب متين
من يطع يتج ومن يعص يكن ... من غداة عبرة الأخرين
أقسم الجد بأن تبقى لكي ... تملك الأرض يمينا لا يمين
وتفيض العدل في أقطارها ... منسيا مؤلم عسف الجائرين

لا تزل دارك كيف انقلت — كعبة محفوفة بالطائفين
كل يوم يتحلى جيدها — من نظيم المدح بالدر الثمين
كلما أخلص فيها دعوة — لك ألسن الخلف أمين

٩- **كردە سەربازییەکان دوای ئازادکردنی رەها:** ئازادکردنی رەها سەرەتایەك بوو روداوی تری بەدوادا هات، چونکە قورس نەبوو لەسەر عمادەدین زنکی کەبەردەوام بێت لەسەر کارەکەی بۆ ئازادکردنی پێگەکانی تری خاچپەرستان کەسەر بەمیرنیشینی رەهابوون، ئەویش هەلی لاوازبوونی بارودۆخی خاچپەرستەکانی لەناوچەکەدا قۆستەوەو[1] بەرەو سروج کەوتەرێ کەدەستبەرداری پاسگاکەی بوون و هەلاتن و عمادەدینیش دەستی گرت بەسەریدا پاشان قەلاکانی دەوروبەریشی یەك لەدوای یەك کەوتنە دەستییەوە[2]، هەتاوەکو وایلێهات بەهەر شوێنێك و قەلایەکدا تێپەری بکردایە خۆیان دەدا بەدەستەوە[3]، پاشان رووی کردە قەلای ئەلبیرەی تۆکمە کەبەسەر فوراتدا دەیروانی بەگرنگترینی ئەو قەلایانە دادەنرا کەمابوویەوە بەدەست جوسلینی دووەمەوەو لەهەمووشیان تۆکمەتربوو عمادەدین ئابلۆقەی بەسەردا سەپاندو سەرچەم کۆمەکی و گەشتنی ئازوقەی لێ قەدەغەکرد، بەلام لەم کاتەدا هەوالی کوژرانی جێنشینی خۆی لەموسلدا پێگەشت و ناچاربوو کەگەمارۆکە هەلگرێت و بەپەلە بگەرێتەوە بۆ پایەتەختی میرنشینەکەی بۆ گێرانەوەی هێمنی بۆی : بەلام خاچپەرستەکانی قەلاکە لەوە دەترسان کەدوبارە هێرش بکاتە سەریان بۆیە ناردیان بۆ لای حسام الدین تمرتاشی ئەرتەقی و ئاگاداریان کردەوە کەئارەزویان لێیە ئەم پێگەیەی خۆیانی بەدەستەوە بدەن پێش ئەوەی بکەوێتە دەست ئەو دوژمنە سەرسەختانەیان، بەم شێوەیە خاچپەرستەکانی رەها سەرجەم قەلاکانیان لەرۆژهەلاتی فوراتدا[4] لەدەستدا لەئاکامی لەدەستدانی بنکەی سەرەکیان لەپەرژەوەندی زەنکی،پێیەش تەنها چەند قەلایەك بەدەست جوسلینەوە مایەوە کەدەکەوتنە خۆرئاوای فوراتەوە وەك تل باشرو مرعش و دلوك و

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ل١٥٦.
[2] ذبل تأريخ دمشق ل٢٨٠ عماد الدين زنكي ل١٥٦.
[3] ذبل تأريخ دمشق ل٢٨٠ عماد الدين زنكي ل١٥٧.
[4] مفرج الكروب (٩٦/١) عماد الدين زنكي ل١٥٧.

سمیساط وعینتاب وعزاز[1]، هەروەها نور الدین محمود باشتر توانی- هەموویان رابماڵێت‌و یەکەمین میرنشینی خاچپەرست لەناوبەرێت[2].

١٠- **لەوشێوازانەی کەزەنکی دەیگرتە بەر بۆ رووبەرووبوونەوەی خاچپەرستەکان:** عمادەدین زەنکی لەرووبەرووبوونەوەی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا تەنها شێوازی جەنگی نیزامی نەدەگرتەبەر، چونکە ئەمە وای پێویست دەکرد کەبەبەردەوامی لەولاتی شامدا بمێنێتەوە،و هەموو هێزەکانی بەکاربێنێت بۆ کوشتاری ئەو دوژمنانە، لێرەشەوە نەیدەتوانی دەستی خاڵی ببێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی لەعێراقداو هەروەها گرنگی سودوەرگرتن لەهێرشەکان گەشتبوو، واتە پەلاماردان‌و پاشەکشەی خێرا، بەتایبەت لەو ماوەیەدا کەلەشامدا ئامادە نەبوو، چونکە ئەم جۆرە جەنگە دەرەنجامی باشی بۆ دەستەبەر دەکات: کەیەکەمیان نیگەرانکردنی خاچپەرستان‌و بوار پێ نەدانیانە بۆ رێکخستنەوەی هێزەکانیان‌و پلانداناں بۆ هێرشکردنە سەر پێگەکانی موسڵمانان لەناوچەکەدا وێرای بەخشینی توانای بەرگریکردن لەناوەندەکانیان‌و پاراستنی، دووەمیشیان: لاوازکردنی هێزە سەربازی‌و ئابوورییەکانی دوژمن، بەهۆی ئەو کوشتن‌و برین‌و وێرانکارییەی کە لەوجەنگا نەدەکەوێتەوە، سێیەم. دەرەنجامیش بریتییە: لەبچڕاندنی پەیوەندی لەنێوان ناوەندەکانی خاچپەرستی لەباکوری شامداو بوار نەدان بەکۆبونەوەو وەشاندنی گورزی یەکلاکەرەوە لەموسڵمانان[3]، هەروەها زەنکی لەم جۆرە جەنگەدا پشتی بەجەنگاوەرانی تورکمان دەبەست، وەك زەمینەسازیەکیش بۆ ئەم کارە هەستا بەپتەوکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردەکانیانداو پۆستە سەربازیە گەورەکانی پێ سپاردن‌و کاری دەکرد بۆ دانانی سەرکردەی زیرەك لەتورکمانە ئیتکین‌و لجە تورکی‌و یاروق‌و هتدو جەنگاوەرە ئازاکان بۆ ئەنجامدانی ئەوەی کەئەمڕۆ پێی دەوترێ جەنگی بەرگری‌و پارتیزانی، هەروەها حەلەبی کردە ناوەندێك بۆیان لەبەر گرنگی پێگەکەی بۆ قەڵاو شورا خاچپەرستی‌و ئیسلامییەکان، چونکە لەناوەندی ئەنتاکیەو رەهای خاچپەرستیدابوو دەسەڵاتی بەسەر هێڵەکانی گواستنەوەی لەنێوانیاندا هەبوو ، هەروەك دادەنرێ بەباشترین بنکەی سەربازی بۆ ئاراستەکردنی هێرشی خێرا دژی پێگەو جموجوڵی خاچپەرستەکان‌و، کاروانی کۆمەکی‌و ئازوقە هێنان،ئەوەبوو کۆمەڵێك لەتورکمانەکان هەستان بەچەندین هێرشی دژ بەسوپای

---

[1] عماد الدین زنکی ل١٥٧.

[2] عماد الدین زنکی ل١٥٧.

[3] عماد الدین زنکی ل١٥٧.

دوژمنان‌و سه‌ربازگه‌و کاروان‌و شوێنی کۆبوونه‌وه‌یان‌و هیچ ساڵێك له‌ساڵه‌کانی ململانێ له‌م دیارده‌یه به‌ده‌رنه‌بوو، جه‌نگی پارتیزانیش که‌تورکمانه‌کان پێی هه‌ڵده‌ستان‌و به‌هۆیه‌وه زیانی زۆریان گه‌یاند به‌پێزه‌کانی دوژمن بۆ نموونه له‌ره‌جه‌بی ساڵی ٣٥٤ك دا زه‌نکی هێزێکی سه‌ربازی ئاماده‌کرد که‌هه‌ستا به‌په‌لاماردانی عزازی خاچپه‌رست، له‌ساڵی دواتریشدا پێکدادانێك له‌نێوان سوارو جوسلیندا له‌باکوری حه‌له‌ب روویداو بوه هۆی سه‌رکه‌وتنی خاچپه‌رسته‌کان‌و کوژرانی ژماره‌یه‌ك له‌موسڵمانه‌کان، ئه‌مه‌ش سواری ناچارکرد چه‌ند هێرشێك بکاته سه‌ر ربض أثارب‌و ده‌ست به‌سه‌ر ئه‌ندازێك ماڵ‌و موڵك‌و به‌روبوومیدا بگرێت، زۆریشی نه‌خایاند پاش ساڵێکی تر له‌٥٢٦ی کۆچیدا په‌لامارێکی خاچپه‌رسته‌کانی تل باشریداو خه‌ڵك زۆری لێ کوشتن[1]،به‌م شێوه‌یه سوارو سه‌ربازه تورکمانه‌کانیش به‌رده‌وامبوون له‌هێرشکردنه سه‌ر خاچپه‌رسته‌کان هه‌رکاتێ هه‌لیان بۆ ره‌خسابێ، ئه‌وه‌بوو له‌صفری ساڵی ٥٢٧ك چه‌ند پێکدادانێك له‌نێوان هه‌ردوو لادا رویدا، که یه‌کێکیان له‌نزیك قنسرین بوو، له‌کاتی هه‌ستانی بلدوینی پاشای به‌یتولمه‌قه‌دیس به‌هه‌وڵێك بۆ هێرشکردنه سه‌ر ده‌وربه‌ری حه‌له‌ب‌و سوارو کۆمه‌ڵێك له‌سه‌ربازه‌کانی رووبه‌رووی بوونه‌وه‌و له‌ئاکامدا موسڵمانه‌کان شکستیان خواردو پاشه‌کشه‌یانکرد بۆ حه‌له‌ب، به‌ڵام سه‌رکرده ئازاکه‌یان دووباره بۆیان ده‌رچوو په‌لاماری کۆمه‌ڵێکی دان‌و رێژه‌یه‌کی زۆری کوشت‌و به‌دیل گرت‌و ئه‌وانی تریشیان هه‌ڵاتن به‌ره‌و وڵاتی خۆیان‌و ئه‌ویش گه‌رایه‌وه بۆ حه‌له‌ب‌و سه‌ری کوژراوه‌کانی پێ بوو ئه‌و رۆژه رۆژێکی مه‌زنبوو[2] زۆری نه‌برد خاچپه‌رستانی ره‌ها هه‌ستان به‌هێرشکردنه سه‌ر ناوچه‌کانی ده‌وروبه‌ری حه‌له‌ب، سواریش هاته ده‌ره‌وه بۆیان به‌هاورێیه‌تی حسان بعلبکی ئه‌میری مه‌نبه‌خ‌و کتوپڕ دای به‌سه‌ریانداو توانی ژماره‌یه‌کی زۆریان له‌ناوبه‌رێت‌و پاشماوه‌که‌شی به‌دیل گرت، پاشان گه‌رایه‌وه بۆ حه‌له‌ب بێ ئه‌وه‌ی هیچ سه‌ربازێکی بریندارببێت[3]، له‌مانگی جه‌مادی یه‌که‌می هه‌مان شاڵیشدا سوار به‌سه‌رۆکایه‌تی هێزێك له‌سواره‌کانی هه‌ستا به‌هێرشکردنه سه‌ر ته‌ل باشرو خاچپه‌رسته‌کانیش به‌رپه‌رچیان دایه‌وه، به‌ڵام توانی زاڵ بێت به‌سه‌ریانداو هه‌زار که‌سی لێ کوشتن‌و سه‌ری هه‌موویانی برده‌وه بۆ حه‌له‌ب[4]، له‌ره‌بیعی یه‌که‌می ساڵی دواتریشدا فه‌رمانده‌ی پێگه‌ی قدموسی خاچپه‌رست به‌ره‌و

---

[1] عماد الدين زنكي ل١٦٠.

[2] ذيل تأريخ دمشق ل٢٤٠-٢٤١ عماد الدين زنكي ل١٦٠.

[3] عماد الدين زنكي ل١٦٠.

[4] عماد الدين زنكي ل١٦١.

قنسرين کەوتەڕێ بەسەرۆکایەتی هێزێك لەسوارەکانی ئەنتاکیە، سوپای حەلەبیش بەسەرۆکایەتی سوار روبەڕویان بوووەو جەنگەکە بەسەرکەوتنی خاچپەرستەکان کۆتایی هاتو زەنکیش ناچاربوو رێککەوتنیان لەگەڵدا مۆربکات، بەڵام زۆری نەخایەند هێرشی کردە سەر یەکێك لەسریەکانیانو توانی زۆرینەیان بکوژێت پاشان گەرایەوە بۆ حەلەب: خەڵکیش بەم سەرکەوتنە دڵخۆش بوون دوای دڵتەنگ بوونیان بەشکستی پێشووی، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم سوارەکانی رەها هێرشیان هێنایە سەر دەوروبەری حەلەبی باکور لەکاتێکدا کەبەرەو سەربازگەیەکی خاچپەرستەکان دەچوون، بەڵام سوارو ئەمیری منبج رێیان پێ گرتنو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتنو ژمارەیەکی زۆریشی لێ بەدیلگرتن[1]. پاشان سوار لەهەمان ساڵدا هەستا بەهێرشکردنە سەر پێگە خاچپەرستەکان لەناوچەی ئەلجەزوو[2] زردناو توانی رێ بەدوژمنەکانی بگرێت لەحارمداو پاشان گەرایەوە بۆ حەلەب بەدەسکەوتو دیلێکی زۆرەوە[3] دواتر روبەڕی هێرشو پەلامارەکان بەرەبەرە فراوان دەبوون، ڕەجەبی ساڵی ٥٣٠ك یش هێرشێکی فراوانی بەخۆوە بینی لەلایەن سوارەوە کاتێ بەسەرکردایەتی سێ هەزار سواری تورکمانەوە کەوتەرێو کتوپڕ پەلاماری لازقیەو دەوربەری دا لەهێرشێکدا کەخاچپەرستەکان هیچ حسابێکیان بۆ نەکردبوو، توانی حەوت هەزار دیلیان لێ بگرێتو رێژەیەکی زۆر دەسکەوتی دەستگیربوو دەیان گوندو کێڵگەی رامالیو موسڵمانەکان دەستیان گرت بەسەر دیلو دەسکەوتێکی زۆردا، موسڵمانەکانی ناوچەکەش زۆر خۆشحاڵبوون بەم سەرکەوتنەی سوار کەکۆستێکی گەورەو کەم وێنەبوو بۆ خاچپەرستەکانی باکور[4]، لەراستیشدا ئەو کێشە ناوخۆییانەی کەئەنتاکیە بەخۆیەوە بینی دەرەنجامی ململانێ بوو لەسەر دەسەلات لەساڵەکانی ٥٢٩-٥٣٠ك داو تارادەیەکی باش رۆڵی هەبوو لەلاوازکردنی توانایی بەرگریکردنی لەبەرامبەر هێرشەکانی موسڵمانەکاندا[5]، ئەمەش پالی نابەسەرکردەکیانەوە بۆ قۆستنەوەی هەلەکەو تۆمارکردنی سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر خاچپەرستانی باکوردا، لەکۆتاییەکانی ساڵی دواتریشدا سوار هەستا بەهێرشێکی کتوپڕ دژ بەسریەیەکی گەورەی بیزەنتی کەبەرەو رۆژهەلات پێشرەوی دەکردو توانی ژمارەیەك لێ

---

[1] ذبدة حلب (٢/٢٥٢).

[2] ئەلجەزر: یەکێکە لەگوندەکانی حەلەب معجم البلدان (٢/٧١).

[3] ذبدة حلب (٢/٢٥٤) عماد الينزنكي ل ١٦١.

[4] ذبل تأريخ دمشق ٢٥٥-٢٥٦ عماد الين زنكي ل١٦١.

[5] الحروب الصليبة، العديني (١/٥١٠) عماد الينزنكي ل ١٦١.

بکوژێت‌و بریندارێکات پاشان گەڕایەوە بۆ بارەگای خۆی لەحەب[1]. هێشتا چەند مانگێك بەسەر ئەم هێرشەدا تێنەپەڕیبوو بو خاچپەرست‌و بیزەنتییەکان هەستان بەناردنی هێزێکی هاوبەش بۆداگیرکردنی قەلای أثارب لەنزیك حەلەب، دوای ئەوەی ئامانجی خۆیان بەدەست هێناو پاراستنی دیلە موسڵمانەکانیان پێ سپێردرا کە لەوشوێنەدا کۆکرابوونەوە، بەلام سوار پاش ماوەیەك بەهێزێکەوە هێرشی بۆ سەر بازگەی خاچپەرست‌و بیزەنتی هێناو توانی زۆربەی دیلەکان رزگاربکات‌و بیانهێنێتەوە بۆ حەلەب‌و شار خۆشحاڵی‌و شادیەکی زۆری بۆ گەڕایەوە بەم سەرکەوتنە مەزنە[2]. لەساڵی ٥٣٣دا سوار هێرشی هێنایە سەر چەندین پێگەی خاچپەرستی‌و هەندێ دەسکەوتی هەبوو، بەلام سوارەکانی خاچپەرستان توانیان پیایدا بگەنەوەو سەرکەون بەسەر هێزەکانیدا ئەمەش بووە هۆی بەدیل گیرانی هەزار سوارلێیان، خودی سواریش پاشەکشەی کرد بۆ حەلەب لەگەڵ ئەو سەربازانەیدا کەدەربازبوون[3]، بەم شێوە رووبەڕووبوونەوەکان بەدرێژایی چەند ساڵی داهاتوو بەردەوام بوون لەساڵی ٥٣٤-٥٣٥یشدا هەندێك ساردی روی تێکرد بەهۆی شکستهێنانی زەنکی لەهەوڵێکیدا بۆ دەستگرتن بەسەر دیمەشقداو هاوپەیمانێتی خاچپەرست‌و دیمەشقییەکان دژی، بەلام ئەم پێکدادانانە سەر لەنوێ لەساڵی ٥٣٦ك‌و ساڵەکانیتردا سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوەو، ئەوەبوو لەمانگەکانی سەرەتای ئەم ساڵەدا خاچپەرستەکان هەستان بەهێرشێکی خێرا دژ بەهەندێ پێگەی ئیسلامی لەرۆژئاوای حەلەبدا،و کاتێ بلاوبونەوە، سوار هێزێکی لەتورکمانەکان نارد بەسەرکردایەتی عەلەمەدینی کوڕی‌و پەلاماری چەند پێگەیەکی خاچپەرستانیداو توانی بگاتە شوراکانی ئەنتاکیە، پاشان بەکۆمەڵێ دەسکەوت‌و کەلەوپەلەوە گەڕایەوە، زۆری نەخایاند لجەی تورکی پەلاماری چەند ناوچەیەکی خاچپەرستانداو کۆمەڵێك کوژراو دەستکەوتی‌و دیلی هەبوو، ئەشڵێن ژمارەی کوژراوەکان حەوسەد سەربازبوو.لەرەمەزانی هەمان ساڵیشدا سوار هێرشکردە سەر سەربازگەیەکی خاچپەرستی لەنزیك پردی الحدید لەباکوری رۆژهەلاتی ئەنتاکیەدا دوای ئەوەی توانی بەهێزەکانییەوە لەزێی عاصی بپەڕێتەوە بەئاراستەی سوپای دوژمن‌و توانی زۆرینەی سەربازەکانی سەربازگەکە بکوژێت‌و ئەوانی تریشیان بەدیل بگرێت[4]. زۆری نەبرد ئەمیری ئەنتاکیە لەساڵی داهاتوودا کەوتەرێ بۆ

---

[1] عماد الدين زنكى ل١٦٢ ذبدة حلب (٢/٢٦٣).

[2] الكامل في التأريخ له عماد الدين زنكى ل١٦٢.

[3] ذبدة حلب (٢/٢٧١) عماد الدين زنكى ل١٦٢.

[4] زبدة (٢/٢٧٦)عماد الدين زنكى ل١٦٣.

هێرشکردنە سەر دۆڵی بەزاعەی نزیك حەلەبو ئەویش بەرپەرچی دایەوەو ناچاریکرد پاشەکشەبکات، پاشان جوسلین هەلەکەی قۆستەوەو هەستا بەهێرشکردنە سەر کۆبوونەوەی موسڵمانەکان لەکەناری روباری فوراتداو، توانی نۆسەد کەسیان لێ بەدیلبگرێت، دواتر هەر دوو لاپێیان باشبوو ئاگر بەستێك رابگەیەنن بۆ ئەوەی پشکی ئەمیری ئەنتاکییەی تێدابێت[1]، بەم شێوەیە کوشتار بەردەوام بوو لەنێوان ئەم میرنشینەو هێزەکانی حەلەبداو کاتێك کۆمەڵێکی زۆر لەبازرگانانی ئەنتاکییە، لەجمادی یەکەمی ساڵی ٥٣٨ك بەپاسەوانی کۆمەڵێك سوارە بەرەو هەندێ وڵاتی خاچپەرستی دراوسێ بەرێ کەوتنو پارەو کەلوپەلێکی زۆریان پێبوو، موسڵمانەکانیش کتوپڕ پەلاماریاندانو توانیان سەرجەمی ئەو هێزە لەناوبەرن کەئەرکی پاراستنیانی گرتبووە ئەستۆو کەلو پەلو شتومەکە بەنرخەکانیشیان بووە دەسکەوت بۆیان[2] لەکۆتایی مانگی ذي القعدةی هەمان ساڵیشدا کۆمەڵێك سوارەی حەلەب هێرشیان کردە سەر سوارەکانی خاچپەرستان لەکاتێکدا کە سوطا دەرچوونو هەموویانیان لەناوبردو فەرمانڕەوای باسوطایان بەدیل گرتو سواریش لەحەلەبدا زیندانی کرد[3].

بەم شێوەیە هەندێ شێوازی زەنکی دەبینین لەپێناو بەدەستهێنانی بەرنامە دولایەنەکەی واتە پێکهێنانی بەرەیەکی ئیسلامیو لێدانی خاچپەرستەکان، بەخستنەڕووی پەیوەندی عمادەدین زنکی بەهێزە ئیسلامییەکانەوە وەك میرنشینی شارو میرنشینە ناوخۆییەکان لەجزیرەو شامو هۆزە کوردیو تورکمانەکانو- رادەی لێهاتویی سیاسیو بەهێزی پلانە سەربازیەکانمان بۆ دەردەکەوێت لەڕوانگەی پەیوەندی ئاشتەواییو جەنگی لەگەڵ ئەو هێزانەی کە لەم ناوچەیەدا بڵاوبوونەتەوە، چونکە ئەو بەشێوەیەکی فەرمی لەسوڵتانی سەلجوقی مەلیکشاوە لەساڵی ٥٢٢دا بڵاوکراوەیەکی فەرمی پێگەشتبوو کەدانی دەنا بەدەسەڵاتی شەرعی عمادەدیندا لەناوچەکانی موصڵو جەزیرەو شامدا، ئەم بڵاوکراوەیەش ساڵانی دواتر دوپات بوویەوە، بەڵام ئەمە بەس نەبوو بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی لەم ماوەیەدا کەژمارەیەکی زۆر لەئەمیرەکان توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ژمارەیەکی زۆر شارو هەرێمدا بسەپێننو تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆبوون لەدەسەڵاتی سەلجوقیو سودیان وەرگرتبوو لەچەندین فاکتەری کەسیو سیاسیو جوگرافیو ئابووریو مرۆیی، کەواتە پێویستبوو زەنکی ئەو هێزوو دەسەڵاتە زۆرانە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە کە لەناوچەکەداهەبوون، بەپەیڕەکردنی شێوازی هێرش کردن، لەسەرەتاوە. سەرباری ئەو مەترسیانەی کەرووبەرووی ئەم

---

[1] عماد الدين زنكي.

[2] ذيل تأريخ دمشق ل٢٧٨ زبدة حلب (٢/٢٧٧-٢٧٨).

[3] زبدة حلب (٢/٢٧٨) عماد الدين زنكي ل١٦٣.

شێوازە دەبوویەوە کەیەکەمیان ئەگەری پێکهاتنی هاوپەیمانێتییەکی بەرگری نەیاربوو لەلایەن ئەمیرە نەیارەکانەوە لەوانەشبوو ئەم هاوپەیمانێتییە دواتر ببێتە هاوپەیمانێتەکی هێرشبەر، وەك بۆ ئەرتەقییەکان روویدا، دووەمی ئەو مەترسیانەش نەبوونی پلانێك بۆ پاشەکشەکردن لەحاڵەتی شکست خواردن یان پاشەکشەدا لەبەرامبەر ئەمیرە ناوخۆییەکاندا کەوەك بازنە دەوریان دابوو ، بەڵام زەنکی گوێی بەو مەترسیانە نەداو هەر لەسەرەتاوە هەستا بەهێرشکردنە سەر ئەمیرەکانی ناوچەکەو پاڵنەریشی بریتی بوو لەئازایەتیو تەماعی خۆیو دڵنیابوونی لەو بنکە جەماوەرییەی کەزادەی خۆشەویستیو دڵسۆزی جەماوەربوو بۆ هەڵوێستەکانی پێشووی بەرامبەر بەخاچپەرستەکان، پێش ئەوەی ببێتە فەرمانڕەوای موسڵ، هەروەها بڵاوکراوەکەی سوڵتانیش لەم بوارەدا یارمەتی دەری بوو بۆ گرتنە دەستی موسڵو جەزیرەو شامو دانپیادانانی بەئازادی زەنکی لەڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ پێکهاتە سیاسییە ناوخۆییەکانداو ڕاماڵینیانو پەنابردن بۆ هەر هۆکارێك کە بەگونجاوی بزانێت بۆ گەشتن بەو ئامانجە[1]، بەڵام لەوەگرنگتریش ئەو توانا سیاسیو سەربازییەبوو کە لەعمادەدیندا هەبوو وێڕای ئەو دووربینییەی کەهەیبوو، چونکە ئەو هەر لەسەرەتاوە ئەیزانی کە ئەگەر ڕێگای ئاشتیو نەرمو نیانی بگرێتە بەر بەرامبەر بەئەمیرەکانی ناوچەکەو قەڵاو شارو میرنشینەکان بەردەوام وەك هۆکارێکی مەترسیدار دژ بەمیرنشینەکەی دەمێنێتەوە، لەبەر نزیکیان لێیەوەو بەهۆی ستراتیژی بوونی پێگەکانی، چونکە ئەوە مەسەلەیەکی گرنگە بۆ سەپاندنی دەسەڵات،چونکە خاڵی بەرزەو بەسەرناوچەکەدا دەڕوانی لەبەر شۆڕبوونەوەی بەسەر موسڵو هێڵەکانی بەرگریشی چەند زنجیرە چیایەكو رووبارێکی بەیەکداچووو قەڵای تۆکمەبوو، ئەو سیاسەتی دابڕانەش کە ئەو ئەمیرانە گرتیانە بەر بەرامبەر بەو مەترسیە خاچپەرستیەی کەبەرەو ڕۆژهەڵات پێشڕەوی دەکردو ئەو پەرتەوازەبونەی کەدوچاری توانامرۆییو سەربازیو ئابوورییەکانی موسڵمانان بووبوە هۆی بێ دەسەڵاتی ئەم میرنشینانە لەبەرامبەر ئەم مەترسییە هێرشهێنەرەی خاچپەرستاندا. ئەمە لەکاتێکدا پێویست بوو لەسەر زەنکی کار بکات بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپانەی کەدەبوو ڕێگر لەبەردەم یەکخستنی میرنشینە جیاوازو پەرشو بڵاوەکان لەبەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوودا.

**شەشەم: کۆی ئەو ڕۆڵە سیاسیو سەربازیەی عمادەدین گێڕای لەسەر شانۆی مێژززی ئیسلامی:**

ئەتوانین بڵێین عمادەدین زنکی توانی بەشێکی زۆر لەبەرنامەکانی جێبەجێ بکاتو پلەو پایەیەکی تایبەت بۆ خۆی لەمێژووی ئیسلامدا بەدەست بێنێت وەك سیاسیو فەرماندەیەکی

---

[1] عماد الدين زنكي ل١٦٥.

لێهاتووو موسڵمانێکی هۆشیار کەپەی بەو مەترسیانە بردبوو کەدەوری جیهانی ئیسلامی دابوو لەلایەن خاچپەرستەکانەوە ئەوەبوو توانی ئەو بارودۆخە مێژووییە لەبەرژەوەندی موسڵمانان ئاراستە بکات، ئەوەش بەکۆکردنەوەی هێزە ئیسلامییەکان، دوای لەناوبردنی هۆکارەکانی بەش بەش بوونو یەکخستنی شارو میرنشینە جیابووەکان لەچوار چێوەی یەك دەوڵەتداو بەلێهاتووی خۆی توانی سود لەزۆرترین تواناکان وەربگرێت بۆ وەستاندنی هێرشی خاچپەرستی، پاشان هەستا بەهێرشێکی رێکخراو بۆ سەر بنکەکانی خاچپەرستان ئەم هۆکارانەش پاڵیان بەزەنکییەوە نا بۆ پەیرەوکردنی سیاسەتی هێرشکردن، کەهەندێ جاریش پەیوەندی ئاشتیو پەیماننامەی تێ دەکەوت کەبارودۆخەکە دەیخواست، لەهەمان کاتیشدا زەنکی کاری دەکرد بۆ پاراستنی سنوری میرنشینەکەی بەئاراستەی رۆژهەڵاتو باکوری رۆژهەڵاتدا، چونکە لەم شوێنانەدا کوردو تورکمانەکان لەم ناوچەیەدا رەگەزێکی مەترسیداربوون دژ بەمیرنشینەکەی بەتایبەت لەکاتی تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ میرنشینەکانی رۆژئاوادا، یان لەکاتی دورکەوتنەوەی لەبارەگاکەی لەموسڵدا[1]، لێرەشەوە بەروونی گرنگی ئەو رۆڵەمان بۆدەردەکەوێت کە عمادەدین زنکی گێڕای لەمێژووی ئیسلامیدا، چونکە دائەنرێت بەیەکەم سەرکردە کەهەستابێت بەکۆکردنەوەی هێزە ئیسلامییەکان بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو هەتاوەکو بەهۆیەوە روبەڕووی مەترسی خاچپەرستان ببێتەوە هەوڵەکانی پێش زەنکی نەیتوانی بیانووەستێنێت بەتایبەت ئەوەی کەلەسەردەمی مەودودی کوڕی تونتکینو ٥٠٢-٥٠٧ك و ئیلغازیو بلکی ئەرتەقی ٥١٢-٥١٨ك[2]، روویدا واشی بۆ دەچین کە ئەگەر زەنکی بیتوانیایە دیمەشق رزگاربکاتو هەوڵەکەی بۆ یەکخستنی شام بەئاکام بگەشتایەو ئەگەر لەلوتکەی سەرکەوتنەکانیدا بەسەر خاچپەرستەکاندا نەکوژرایە ئەوە ئەیتوانی ئەو بەشانەی کەمابوو لەبەرنامەکەیدا پیادەی بکاتو ئێستا لێکۆڵەر وێنەیەکی تەواوی ئەو رۆڵەی بۆ دەردەکەوت کە لەمێژووی ئیسلامیدا پێی هەستاوە. کەرۆڵێکی یەکلاکەرەوەیەو گرنگیشی کاتێ روون دەبێتەوە ئەگەر بزانین کەنور الدین محمدو پاش ئەویش صلاح الدین، هەوڵەکانیان تەنها تەواوکەری ئەو کارەبوە کەعمادەدین زنکی پێی هەستاو لەسەر هەمان رێڕەوبوو[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٦٦.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٦٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل١٦٦.

هەستا بەهێرشکردنە سەر پێگەکانی خاچپەرستان‌و چووە قوڵایی شوراکانی ئەناکییەدا، پاشان بەدەسکەوت‌و دیلی زۆرەوە گەرایەوە[1]، پاش ماوەیەکی کەمیش لجەی تورکی هێرشی کردە سەر هەندێ ناوەچەی خاچپەرست لەباکورداو هەستا بەکوشتن‌و راپێچکردن‌و بەدیل گرتنیان‌و واباس ئەکەن کەژمارەی کوژراوەکان گەشتۆتە حەسەد پیاو[2]، لەرەمەزانی هەمان ساڵیشدا سوار هێرشی کردە سەر سەربازگەیەکی خاچپەرستەکان لەنزیك پردی الحدید کەئەکەوێتە باکوری رۆژهەلاتی ئەنتاکیە، دوای ئەوەی بەهێزەکانیەوە لەرووباری العاصی پەریوە بەئاراستەی کۆبونەوەی دوژمن پێشڕەوی کردو توانی زۆرینەی ئەندامانی.

## حەوتەم: شالاوی دووەمی خاچپەرستەکان:

رووخانی میرنیشنی رەها لەلایەن موسڵمانەکانەوە کاردانەوەیەکی توندی هەبوو لەرۆژئاوای ئەوروپاییداو بووە هۆی پەلەکردن لەناردنی هەڵمەتێکی خاچپەرستی نوێدا، دوای ئەوەی کەرووخاتی ترسی خستە دەرونەکانەوە، نەك تەنها بەهۆی ئەو پلەو پایە ئاینییەی کەئەم شارە هەیبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی یەکەم میرنشینێکە کەخاچپەرستەکان لەرۆهەلاتی نزیکدا دایان مەزراندبێت، بۆیە رووخانی سەرەتای لەرزۆك بوونی ئەو بینا گەورەیەبوو کەخاچپەرستەکان بنیاتیاننا لەشالاوی خاچپەرستنی یەکەمدا لەرۆژهەلاتی نزیکدا، هەروەها ئەوروپای رۆژئاوایی پەی بەوەبرد کەئەگەر پەلە نەکات بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەوە رووخان‌و هەرەسهێنانی دورنییە[3]، بانگەوازی فریاکەوتن‌و بەدەمەوە چوونیش لەفرەنجەکانی رۆژهەلاتەوە گەشتبووە پاپا یوجبیوسی سێیەم ئەوەبوو شازنی بەیتولمەقەدیس وەفدێکی پایە بەرزی نارد بۆ لای پاپا بۆ داوای فریاکەوتن‌و هانا بۆ بردنی پاش رووخانی رەها[4]، پاپاش چەند نێردراوێکی نارد بۆ ئیمپراتۆری ئەڵمانیاو پاشای فەرەنساو هانی دان بۆ بەدەمەوەچوونی فەرەنجەکان‌و رزگارکردنییان لەمەترسی موسڵمانەکان، لەهەمان کاتیشدا یەکێك لەپیاوەئاینییە بەناوبانگەکانی لەفەرەنسادا بەناوی برنارد راسپارد بۆ بانگەوازکردن بۆ جەنگ دژ بەموسڵمانەکان لەرۆژهەتدا، ئەم قەشەیەش هەستا بەو رۆڵەی کەئۆربانی دووەم پێی هەستا ٤٩٠ك ١٠٩٥ز لەکاتی بانگەوازکردنیدا بۆ شالاوی یەکەمی فرەنجەکان[5]، ئەوەبوو ئیمپراتۆر کۆنرادی سێیەم‌و لویسی حەوتەمی پاشای فەرەنسا بەدەم

---

[1] ذبد حلب (٢/٢٧٥) عماد الدين زنكى ل ١٦٢.

[2] عماد الدين زنكى ل١٦٣ زبدة حلب (٢/٢٧٥).

[3] تأريخ زنكيين في الموصل وبلاد الشام ل١٧١.

[4] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٤.

[5] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٤.

بانگەوازەکەیەوە هاتن، هەریەکەیان بەسوپاکەیەوە ئەوروپایان بەجێ هێشت بەرەو قۆستەنتینەو لەوێشەوە لەتەنگەی بسفۆڕەوە بەرەوئاسیای بچووك پەڕینەوە[1].

١- **سەلجوقییەکان سوپای ئەڵمانی لەوناودەبەن:** سوپای ئەڵمانی چەند ڕۆژێك پێش سوپای فەرەنسی کەوتو لەوکاتەشدا گەشتبووە ناوچەی دوریلیوم لەڕۆژهەڵاتی شاری نیقیە- هەمان ئەو شوێنەی کەفەرەنجەکان لەشاڵاوی یەکەمدا تیایدا سەرکەوتن بەسەر سەلجوقییەکاندا بەسەرکردایەتی قلج ئەرسەلان پێش پەنجا ساڵ-ئەوەبوو سوپای ئەڵمانی کەوتە بەردەستی سوپای سوڵتان مەسعود ئەمیری سلجوقییە ڕۆمەکان لەئاسیادا، سوڵتان مەسعودیش بەپێی پلانێکی سەربازی زیدەکانە پاشکشەیکرد هەتاوەکو سوپای ئەڵمانی پێشڕەوی بکات بۆ ناوچەرگەی فریجیا، هەروەها سوڵتان مەسعود سوپاکەی لەسەر لوتکەی چیاکانی دەوروبەریان بڵاوکردەوە هەر کەسەربازە ئەڵمانییەکان گەشتنە روباری باتیس نزیك دوریلیوم سوپای سلجوقی پەلاماری دان، لەکاتێکدا کەماندوێتیو نینوێتی زۆری بۆ هێنابوون ئەمەش سەرکردەکەیانی توشی شڵەژان کردو ویستیان خۆیان لەدۆڵی نێوان چیاکاندا قایم بکەن، بەڵام سلجوقیەکان ئابڵوقەیان دانو تیر بارانیان کردنو سەربازە ئەڵمانییەکانیش تایبەتمەندی بەکارهێنانی تیریان لەدەستدابوو بۆ دورخستنەوەی تورکەکان ئەسپەکانیشیان ئالفیان لێ بڕابوو، لەوکاتەشدا کونرادی سێییەم بڕیاری پاشەکشەو گەڕانەوەی دا بۆ ئەو شوێنەی کەلێوەی هاتوون، بەڵام سلجوقییەکان وازیان لێ نەهێنانو پەلاماری پێشەوەو ناوەراستو پشتەوەی سوپاکەیانداو پشێویان خستە ریزەکانیانو زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن لەنێوان دیلو کوژراودا. لەڕاستیدا ئەم جەنگە کوشتارێکی ترسناك بوو کەنۆ لەسەر دەی سوپاکەی تیادا کوژراو کۆنرادی سێییەمیش دووجار بریندار بوو کەیەکێکیان لەسەریدابوو[2]، هەرچەندە کونرادی سێیەم هەوڵی کۆکردنەوەی سوپاکەیدا، بەڵام بێ سود بوو، بۆیە لەئێوارەدا جەنگەکەی بەجێ هێشتولەگەڵ پاشماوەی سوپاکەیدا هەڵاتنو بەپەلە خۆیان گەیاندە نیقیە، لەکاتێکدا کەسلجوقییەکان ئەندازەیەکی زۆر دەسکەوتیان هەبوو[3]، توانیان دەست بگرن بەسەر هەموو کەلوپەلەکانی ناو سەربازگەکەدا لەئەسپو ئازوقەو ژمارەیەکی زۆر جەنگاوەریان لێ بەدیل گرتنو دەسکەوتەکان بۆ ماوەی چەند مانگێك

[1] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٤.

[2] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٤.

[3] تأريخ سلاجقة الروم في اسيا الصغرى ل١٤٦.

لـەبازاری شـارە ئیسلامییەکاندا دەفرۆشـران[١]. بـەم شکسـتە گەورەیـەش ئـەتوانین دوپـاتی بکەینەوە کەسوپای ئەڵمانی شکستی هێنا لەبەدەستهێنانی ئـەو ئامانجـەی کـە لەپێناویدا هـاتبوو بـۆ رۆژهـەڵات، ئەمـەش کاریگـەری خراپـی هـەبوو لەسـەر شـاڵاوی دووەمـی خاچپەرستەکان[٢].

٢- **سلجوقیە رۆمەکان کۆسپ بۆ پێشڕەوی سوپای فەرەنسی دروست دەکەن:** سـوپای فەرەنسی بەسـەرکردایەتی پاشـا لویـسی حەوتـەم پـاش سـوپای ئـەڵمانی بەرێکـەوت هێـزە فەرەنسییەکانیش لەڕووی ژمارەوە یەکسان بوون لەگـەڵ سوپای فەرەنیسدا، بـەڵام ئـەمان رێکخراوتربوون، لویسی حەوتەمیش ئیلبا نۆری خێزانی لەگەڵ خۆیدا هێنـابوو[٣]، لەوکاتەشدا کەجەنگ تیایدا رووی دەدا لـەنێوان سلجوقیەکان و سوپای ئـەڵمانیادا، هێزەکانی فەرەنسا لەبـسفۆرەوە پەرینـەوە بـۆ ئاسـیای بـچووك و گەشـتنە نقیـەو پاشـای فەرەنـساش بەشکستخواردنی ئیمپراتۆری ئـەڵمانیای زانـی بۆیـە خێـرا خـۆی گەیانـدە لای بـۆ دڵنـەوایی کردن و یارمەتیدانی[٤]، سەرباری ئـەو رێوشـوێنانەش کەپاشـای فەرەنـسی گرتیـە بـەر، بـەڵام سوڵتانی سەلجوقی مەسعود لەشـاری دیکـیر منیـوم ی نزیك ئەنتاکیـە کتـوپڕ پـەلاماری داو لەسەر پـردی سـەر روبارەکـە رووبـەڕووی بویـەوەو جـەنگێکی قـورس لەنێوانیانـدا روویـداو خاچپەرستەکان توانیان رێـڕەوی بـۆ خۆیـان لەسـەر پردەکـە بکەنـەوەو مەسـعودیش پاشـە کشەی کرد بۆ ناو شوراکانی شار، پـاش ئـەوەش خاچپەرستەکان درێژەیانـدا بەپێشڕەویان مەسـعودیش ئامادەنـەبوو دابەزێتـە دەشـتەکەوە بـۆ راوەدونانیـان، بـەڵام هـۆزە تورکمانـە خێڵەکییـەکان لەناوچـە سـنوریەکاندا هاتنـە دەسـت لێیـان و تـیر بارانیـان کـردن و پـاش راوەدونانیـان دواوەی سـوپاکەیان پـەلامارداو ژمارەیـەکی زۆریـان لێ کوشـتن بەتایبـەت نـەخۆش و وێـڵ بووەکانیـان و تـەنها تاریـك بـوونی دونیـابووە هـۆی رزگـاربوونی سـوپای خاچپەرست لەتیاچوونی تەواو، چونکە لەگەڵ تاریکبوونی دونیادا تورکمانەکان پاشەکشەیان کرد[٥] سوپای فەرەنسیش نەیتوانی خۆی بگەیەنێتـە ئەنتاکیـە هـەتاوەکو زیـانێکی زۆری پـێ نەگەشـت، پـاش ئـەوەی کـەئیمپراتۆری رۆمـانی لەنەخۆشییەکەی چـاکبوویەوە درێـژەی دا

---

[١] ذیل تأریخ دمشق ل١٩٧.

[٢] تأریخ سلاجقة الروم قي اسيا الغرى ل١٤٦.

[٣] تأريخ سلاجقة الروم قي اسيا الغرى ل١٤٧.

[٤] هەمان سەرچاوە ١٤٧.

[٥] هەمان سەرچاوە ١٤٧.

بەگەشتەکەی بەرەو فەلەستین لەڕێی دەریاوە بەکەشتی بیزەنتییەکان[1] لەوێش ئیمپراتۆری ڕۆمانیو پاشای فەرەنسا لەقودس لەگەڵ پاشا بلدوینی سێیەمدا بەیەك گەیشتنو چاویان بەملیزاندی دایکی پاشاو گەورە سەرکردەکانوو پیاوانی ئاینی شانشینی بەیتولمەقەدیس کەوتو هەموان مەسەلەی ئامانجی شاڵاوەکەیان تاوتوێ کرد کە لەپێناو داگیرکردنیدا هاتوونو بڕیاریاندا ئامانجی یەکەمیان بریتی بێت لەداگیرکردنی دیمەشق[2].

٣- **هێرشی خاچپەرستان بۆ سەر دیمەشق:** سوپای فەرنجە هاوپەیمانەکان بەرەو دیمەشق کەوتنە ڕێ، لەوکاتەشدا معین الدین أنر أتابك پاشا مجید الدین أبق ی کوڕی محمدی کوڕی بوری فەرمانڕەوایەتی دەکرد، کەنزیك ترین ئەمیری موسڵمان بوو لەفرەنجەکانەوەو لەهەموویان زیاتر هاوکاری دەکردن[3] هەربۆیە پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کەببێتە قوربانی یەکەمی ئەو سوپا زەبەلاحەی فەرەنجەکان، بەڵام کاتێ بەنیەتی فەرەنجەکانو بەرێکەوتنیانی زانی بەرەو دیمەشق چەند ڕێوشوێنێکی گرتە بەر بۆبەرگری کردن لێیو ناردی بۆ لای نور الدین محمودو سیف الدین غازی داوو داوای یارمەتی لێکردن[4]، نور الدین محمودیش نەریتی وابوو باروددۆخی نێودەوڵەتیو هەرێمایەتی شیدەکردەوەو چاودێری ڕووداوەکانی دەکردو بەوردی لێدەکۆڵیەوەو پاشان پەندو وانەی بەسودی لێ هەڵدەگۆزی بۆ سودمەندبوون لێی لەدارشتنی سیاسەتەکانی لەئایندەدا، شاڵاوی خاچپەرستی دووەمیش گەورەترین ڕووداوبوو لەناوچەکەو جیهاندا لەساڵی ٥٤٣ك/ ١١٤٨ز یەکەمین ڕووداوی لەو جۆرەش بوو بۆ نورەدین مەحمود دوای گەشتنی بەدەسەڵات لەساڵی (٥٤١ز، ١١٤)ك دا تائەوکاتە سیاسەتی پێشووی پەیڕەودەکردو ئەوەبوو نور الدبن پێشبینی ئەوەی دەکرد کە حلبی میرنشینی ئامانجی یەکەم بێت لەم هەڵمەتەدا، چونکە ئەو هەڵمەتە لەئاکامی ڕووخانی میرنشینی ڕەها لەسەر دەستی عماد ابدین بەرەو ڕۆژهەڵات بەرێکەوتبووو لەساڵی ٥٣٩/١١٤٤ز، بەڵام ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو کەهەڵمەتەکە ئامانجی خۆی گۆڕیو بەرەو دیمەشق کەوتەڕێو گەمارۆیدا لەهەوڵێکدا بۆ داگیرکردنی ئەم گۆڕانکاریەش کارێکی زۆر کتوپڕو چاوەڕوان نەکراوبوو بۆ نور الدبنو چاوەڕوان نەکراوتر بوو بۆ مجیر الدین بقی فەرمانڕەوای دیمەشقو ئەتابەکەکەی معین الدین أنر کە هەڵسوڕێنەری ڕاستەقینەی

---

[1] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٥.

[2] دور نور الدين في نهضة الامة ل٩٥.

[3] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

[4] هەمان سەرچاوە ل٩٦.

کاروبارەکانی میرنشینی دیمەشق بوو، دیارە کتوپڕبوونی ئەم مەسەلەیە بۆ نور الدین هۆکارەکانی زانرابون، بەڵام سەبارەت بەدەسەڵاتدارانی دیمەشق ئەوە هۆکەی ئەوەبوو کەئەوان بەتاکە دۆستی فەرەنجەکان دادەنران لەناو موسڵمانەکانی ناوچەکەداو لەنێوانیاندا هاوکاریەکی پتەو هەبوو دژ بەعمادەدین زنکی کاتێ ویستی دەست بەسەر دیمەشقدا بگرێت، چاوەروانیش نەدەکرا لەفەرەنجەکان کەهێرش بکەنە سەر دۆستەکانیان لەدیمەشقو واز لەدوژمنی یەکەمی خۆیان بێنن لەحەلەبدا، بەڵام نور الدین محمود سودی لەم گۆرانکارییە کتوپڕە وەرگرت لەئامانجی هەڵمەتەکەدا کەسەرپێیی و گەوجانە نەبوو وەك هەندێ لەمێژونوسان دەڵێن[1]. بەڵکو پاش لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی بارودۆخی ناوچەکە هاتبوو، سەرکردەکانی هەڵمەتەکە لەکۆبوونەوە چڕوپڕەکانیاندا کەئەنجامیاندا بەبەشداری پاشای بەیتولمەقەدیسو فەرماندەکانی لەشاری عەککادا پێش هێرشکردنە سەر دیمەشق[2]، نورەدین محمودیش لەناوەڕۆکی راستەقینەی شاڵاوی پێشووی فەرەنجەکان لەشاڵاوی یەکەمو ئەوەی ئێستا تێگەشت کەهیچ پەیوەندییەکی بەگێڕانەوەی گۆری مەسحو پاراستنی رێگای حەج بۆ قودس بەدرێژایی کەناری دەریا لەباکورەوە بەرەو قوستەنتینەوەنییە، وەك سەرکردەکانی ئاینی مەسیحی ئەوانەی کەپلانیان دارشتبوو بۆ ئەم جەنگە ئەیانوت ، هەروەها ئامانجی راستەقینەیان لەم هەڵمەتەی دووەمدا دوربوو لەتۆڵەسەندنەوە بۆ رووخانی رەها بەو پێیەی هەڵمەتەکە رووی کردە دیمەشق کەهاوپەیمانی فەرەنجەکانە لەناوچەکەداو بەرەو حەلەب یان رەها نەرۆشت کە ئەو خەڵکەی تێدایە کەدەبێ تۆڵەی لێ بسەندرێ، بۆیە نورەدین محمود لەوەگەشتبوو کەئامانجی ئەم هەڵمەتە داگیرکردنی رۆژهەڵاتی ئیسلامیو دەست بەسەردا گرتنییەتی وەك چۆن پێشتر ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی پێش ئیسلام دەستی بەسەردا گرتبوو، هەروەها ئەوان لەهەوڵیاندا بۆگەیشتن بەم ئامانجە جیاوازی لەنێوان میرنشینو دەوڵەتە موسڵمانەکاندا ناکەن بۆیە هاوپەیمانو هاوکار لەگەڵ ئەوەی کەرووبەڕوویان دەبێتەوە وەك یەکن، چونکە ئەوان دەیانەوێ وڵاتی هەمووان داگیربکەنو دەسەڵات بەسەر هەمووانـدا بسەپێنن، بویە وا باشە لەدیمەشقەوە دەست پێبکەن کەبەدڵی وڵاتی شام دادەنرێتو گەورەترین میرنشینی موسڵمانە لەڕووی روبەڕووەوە دەوڵەمەندترینیانە لەداهاتدا لەرووی سەربازیشەوە لاوازترییانە پاش ئەویش بەرێ دەکەون بەرەو حەلەبو رەهاو موسڵو

---

[1] تأريخ الحروب الصليبية رنسيمان ل٥٢٣.

[2] نور الدين محمود سيرة مجاهد صادق ل٢١٢-٢١٣.

ناوچەکانی تر کەواتە ئەمە جەنگێکی گشتگیرەو چاودێر لەدورەوە پارێزراو نابێت لێی، بەڵکو پاش ماوەیەکی تریش بێت هەر نورەیدێت جا ئەگەر مەسەلەکەش وابێت ئەوە نورەدین بەوسیاسەتە دوربینەی کەپێی ناسرابوو پێویستە هەر لەسەرەتاوە بەشداربێت لەم جەنگەدا، چونکە دیمەشق بۆ ئەو وەك حەلەب وایە لەم بارودوخەشدا بەهێڵی بەرگری یەکەم دادەنرێت بۆ بەرگری کردن لەحەلەبو موسڵو ناوچەکانی تری وڵاتی ئیسلامی، بۆیە دەبینین سوپاکەی شان بە شانی سوپای سیف الدین غازی برای فەرمانڕەوایی موسڵ نزیك حمصو بەعلەبەك کۆدەکاتەوەو بۆ هەماهەنگی کردن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی دیمەشقدا بۆ ئەنجامدانی کاری هاوبەش لەپێناو ڕوبەڕوبوونەوەی داگیرکاری بیانی، ئەم کۆبوونەوەش کاریگەری سەرەکی هەبوو لەشکست هێنانی هێرشی خاچپەرستیدا بۆ سەر دیمەشق نورەدین محمودیش لەم ڕوداوە گەورەوە چەندین وانە گرنگی وەرگرت کە بۆچوونو بڕواکانی پێشوی دوپات دەکردەوەو لەو پەندو وانانەش: گرنگی ستراتیژی میرنشینی دیمەشق لەرووبەڕووبونەوەیاندا دژ بەفرەنجەکانو گرنگی دەست بەسەراگرتنی بەهەر نرخێك بێت، هەروەها حساب کردن بۆ دەستێوەردانی ئەورووپا لەملمڵانێ لەگەڵ میرنشینە فەرەنجەکاندا[1].

٤- **هەڵوێستی پیاوانی ئاینی گاور لەبەرامبەر شاڵاوی دووەمی خاچپەرستەکاندا:** سەبارەت بەهەڵوێستی پیاوانی ئاینی مەسیحی بەرامبەر بەڕێکەوتنی شاڵاوی دووەمی خاچپەرستەکان بەرەو ڕۆژهەڵات ئەوە هەر کەهەواڵی ڕووخانی میرنشینی ڕەهایان پێگەیشت لەلایەن عمادەدین زەنکییەوە لەساڵی ٥٣٩ك/ ١١٤٤ز دا ئەم هەواڵە گەشتە پایتەختەکانی ڕۆژئاوای ئەورووپاو بووە هۆی ترسو نیگەرانییەکی زۆرو خاچپەرستەکان تێگەیشتن کە ئەوە سەرەتای کۆتایی هێنانە بەمیرنشینە خاچپەرستەکانی تر لەزەوییە پیرۆزەکاندا، بۆیە پەیوەندیان کرد بەبەرپرسانی میرنشینی ئەنتاکییەوەو هاتنە سەر ئەو ڕایەی کەوەفدێك بنێرن بۆ لای پاپا یوجنیۆسی سێیەم ٥٤٠ك- ٥٤٨ك/ ١١٤٥-١١٥٣ز هەتاوەکو بانگەوازبکات بۆ شاڵاوێکی نوێی خاچپەرستی، لەئەورووپاشدا جموجوڵێکی فراوان پەیدابوو کەبەوپەری لێبڕانەوە بانگەوازی دەکرد بۆ پێویستی پەلەکردن لەم هەڵمەتەدا بۆ گەڕاندنەوەی میرنشینی ڕەها بۆ گاورەکان، پاپا یوجینوسی سێیەمیش هەستا بەبانگهێشت کردنی لویسی حەوتەمی پاشای فەرەنساو کونرادی سێیەمی ئمپڕاتۆری ئەڵمانیا هەتاوەکو ڕابەرایەتی ئەم هەڵمەتە بکەن، لویسی حەوتەمیش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی

---

[1] دور نور الدين في نهضة الامة ل١٥١.

بۆبانگهێشتەکەی پاپاو شوێنکەوتوانی بانگهێشت کرد بۆ کۆبوونەوە لەگەڵیدا بۆ قسەکردن دەربارەی ئەو ئامادەکاریانەی کەپێویستە بیگرێتە بەر، بەڵام ئەوان هیچ دڵگە رمییەکیان نیشان نەدا بۆ بەشداری کردن لەم هەڵمەتەدا شالویسی حەوتەم بڕیاریدا جێبەجێکردنی بانگهێشتەکەی پاپای دوابخات بۆ ماوەی سێ مانگو پەنای برد بۆ یەکێك لەناودارانی ئاینی مەسیحی لەشانشینەکەیدا کەقدیس برناردبوو سەرۆکی دێری کلیرفۆ کەناوبانگێکی زۆری هەبووزیاتر لەدەسەڵاتی پادشا بەپێی وتەی مێژوونوسی ئینگیلزی رانسیمان، ئەم پیاوە توانایەکی باشی هەبوو بۆ بڕوا پێهێنانو دانانی کاریگەری لەسەر خەڵك، هەرکە پادشا لویسی حەوتەمو پاپا یوجیبوس ئەو داوایەیان ئاراستەکرد، قەشە برنارد راستەوخۆ داخوازییەکەی جێبەجێکردو بەهەموو توانایەوە کاریکرد بۆ سەرخستنی ئەم هەوڵە[1].

هەروەك چۆن پاپا ئۆربانی دووەم لەکیلرمونتدا هەستا بەبانگەوازکردن بۆ شاڵاوی یەکەمی خاچپەرستی پێش پەنجا ساڵ، بەهەمان شێوە قدیس برنارد لەدەرەوەی کڵێسای فێزیلیەدا لەشوالی ٥٤٠ك/ مارسی ١١٤٦زدا وەستا بۆ بانگەوازکردن بۆ شاڵاوی دووەمی خاچپەرستیو بەرەوانبێژیو زمانپاراوی خۆی توانی بچێتە ناو ئەو دڵانەی کەتینوی شەڕو سەرکێشیبوونو ئاگری تێ بەردان، کاتێ خەڵکی گوێیان لەدەربڕینی پڕ جادوو زمانپاراوی گرت، کەوتنە هاوارکردنو داوای خاچیان دەکرد، لەم کاتەشدا قدیس برنارد پۆشاکەکانی سەرەوەی لەبەر خۆی داکەندو شێوەی خاچیان لێ دروست کرد، ئەم قەشەیەو هاوکارانی بەردەوامبون لەسەر دورینی خاچ بۆ هەموو ئەوانەی کەخۆبەخشانە بەشداریان لەم هەڵمەتەدا کرد[2]، دوای چەند رۆژێك قەشە برنارد هەستا بەنوسینی نامەیەك بۆ پاپا کەتیایدا رادەی کاریگەربوونی خەڵکی بەپیاوانی ئاینی مەسیحیو رادەی گوێڕایەڵیان بۆ پیاوە ئاینییەکان دەخست لەو کاتەدا، تیایدا ئەڵێ: فەرمانم پێکردنو بەگوێیان کردم ئەوکەسەش کەفەرمانی دەدا هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، من گوێڕایەڵیانم بەرهەمدارکردووە، هەر کەدەمم کردەوەو قسەم کرد خاچپەرستان بەرێژەیەکی زۆر رژان بەسەرمدا، شارو لادێکان چۆڵبوون لەدانیشتوانەکانیان، یەك پیاو بۆ حەوت ئافرەت دەست نەدەکەوتو لەهەموو لایەکەوە توشی ئەو بێوەژنانە دەبوویت کەهێشتا مێردەکانییان زیندوون[3] پاش ئەمە بەردەوام دڵگەرمی قەشە برنارد زیاتر دەبوو دوای ئەو سەرکەوتنەی لەفەرنسادا بەدەستی هێنا بۆیە دەستی دایە گەران بەهەرێمەکانی ئەڵمانیادا بەهیوای راکێشانی ئەڵمانەکان بۆ بەشداریکردن لەم هەڵمەتەداو

---

[1] تأريخ الحروب الصليبية رنسيمان (٢/٤٠٧-٤٠٩).

[2] دور الفهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى ل٢٥٤.

[3] دور الفهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى ل٢٥٥.

تارادەیەکی زۆر سەرکەوتوبوو لەکاریگەری دانان لەسەر کۆنرادی سێیەمی پاشای ئەڵمانیا بۆ پەیوەندیکردن بەو جەنگە پیرۆزەوەو داوای لێ کردن کەهەستن بەراڤەکردنی راگەیاندنەکەی پاپا کەناردبووی بۆ سەجەم شارەکانی ئەوروپا لەپێناو ئەوەی کەهەمووان هەستن بەئەرکەکانییان کۆ یارمەتیدانی زەوی پیرۆز لەفەلەستین‌و بانگهێشتکردن بۆئازادکردنی[1]. هەروەها رای بەشداربووان لەم هەڵمەتەدا هاتە سەر هێرشکردنە سەر دیمەشق‌و داگیرکردنی، پیاوانی ئاینی مەسیحیش شان بەشانی سەربازەکان لەگەمارۆی دیمەشقدا بەشداربوون، لەگەڵ پادشای ئەڵمانی کونرادیشدا قەشەیەکی پیر هەبوو بەناوی "إلیاس" کەپیاوێکی ریش درێژبوو خەڵکەکە متمانەیان پێی هەبوو، کاتێ دیمەشقییان گەمارۆدا ئەم قەشەیە سواری گوێدرێژەکەی بوو وخاچێکی کردە ملی‌و خاچێکیشی گرت بەدەستییەوە قەشەکانی بەخاچ کۆکردەوەو پاشاو سوارەکانی لەیەردەستیدا سوارکردو هیچ کام لەوخاچپەرستانەی کەبەشدریان لەگەمارۆکەدا کردبوو دوانەکەوتن تەنها ئەوانە نەبێت کە بۆ پاراستنی خێوەتەکان دانرابوون، ئەم قەشەیە لەبەردەم هەمووانـدا وەستابوو لەپێشیانەوە ئەیوت: مەسیح بەڵێنی پێداوم کەئەمڕۆ دیمەشق ئازاد دەکەم‌و کەس ناتوانێ رێگریم بکات، بەڵام ئەم پێشبینییەی هەڵە دەرچوو، چونکە یەکێ لەلاوە موجاهیدەکان هێرشیان کردە سەری‌و خۆی‌و گوێدرێژەکەی کوشت[2].

٥- **سەرکەوتنی دیمەشق بەسەر شاڵاوی خاچپەرستی دووەمدا:** لەڕەبیعی یەکەمی ساڵی پێنج سەدو چل‌و سێ فرەنجەکان هێرشیان هێنایە سەر دیمەشق بەدە هەزار سوارو شەست هەزار پیادەوە، موسڵمانەکانی دیمەشقیش هاتنە دەرەوە بۆ وەستان بەرامبەرییان‌و ئەوانیش سەدو سێ هەزار کەس بوون پاش روبەروبوونەوەیەك نزیکەی دوو سەدییان لێ کوژرا، پاشان لەرۆژی دووەمدا پێکدادان رویداو کۆمەڵێکی تر شەهیدبوون لەفەرەنجەکانیش ژمارەیەکی زۆر کوژران لەرۆژی پێنجەمیشدا غازی کوڕی ئەتابەك لەگەڵ نورەدینی برایدا بەبیست هەزار جەنگاوەرەوە گەشتنە حەماە، خەڵکی دیمەشقیش خەریکی پاڕانەوەو پەنابردنبوون بۆ پەروەردگارو قورئانەکەی سەردەمی پێشەوا عوسمانییان دەرهێنا بۆ گۆرەپانی مزگەوت بۆ تکاکردن‌و مزگەوت پڕبوو لەژن‌و منداڵ‌و خەڵکی سەریان رووتکردو هەژاری خۆیان بۆ پەروەردگار دەربڕی ئەویش هات بەهانایانەوە[3] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ﴾ (النمل:٦٢) واتە: ئایا کێیە جگە لەزاتی پەروەردگار کەبێت بەهاناو

---

[1] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى ل٢٥٥.

[2] هەمان سەرچاوە ل٢٥٥.

[3] شذرات الذهب (٦/٢١٩).

هاواری لێقەوماو بێ دەرەتانو بێ دالدەوە کاتێك نزا دەکاتو لێی دەپاڕێتەوە ئەوسا بەلاو ناخۆشیکان لادەباتو دەتانکاتە نیشتەجێو......... هتد[1].

یەکێك لەو هۆکارانەش کەخوای گەورە کردیە هۆ بۆ سەرخستنی خەلکی دیمەشق گەشتنی سوپای خەلکی موسلو حەلەب بوو لەکاتێ پێویستو گونجاودا، ئەوەبوو هەریەك لەسیف الدین غازیو نورەدینی برای پەیوەندییان کرد بەمعینەدین أنرەوە بۆ هەماهەنگیکردنی هاوکاری نێوانییان دژ بەفەرەنجەکان معین الدین أنریش فەرمانڕەوای دیمەشقیش حەزی نەدەکرد سیف الدینو نورەدین بچنە دیمەشقەوە، لەهەمان کاتیشدا هەرەشەی لەفەرەنجەکان دەکرد کەئەگەر هەولی پەلاماردانی دیمەشق بدەن ئەوا دیمەشق رادەستی سیف الدین یان نورەدین دەکات، هەروەها نامەی لەگەل فەرمانڕەوایانی قودسدا گۆڕییەوەو بەلێنی رادەستکردنی قەلای بیناسی پێدان ئەگەر بتوانن باوەر بەئیمپراتۆر کونرادو پاشا لویس بێنن کەپاشەکشەبکات لەدیمەشق، ئەم پەیوەندیانەش هاوکات بوو لەگەل رودانی ناکۆکی لەنێوان فەرەنجەکاندا سەبارەت بەو کەسەی کەحوکمڕانی دیمەشق بکات لەکاتی داگیرکردنیدا[2]. ئەوەبوو فەرمانڕەواکانی قودس رازی بوونو پێشنیارەکەی معین الدین أنریان پەسەندکردو ئیمپراتۆر کونرادو پاشا لویسیشیان قایل کرد بەپێویستی پاشەکشەکردن لەترسی ئەوەی کەدیمەشق رادەوستی سیف الدین غازی "پاشای رۆژهەلات[3] بکرێت. چونکە ئەگەر بکەوێتە دەستی تەماع دەکاتە قودسو هەول داگیرکردنی دەدات بەم شێوە کۆتایی بەبوونی گاورەکان دێت لەناوچەی رۆژهەلاتدا، ئەوەبوو هێزەکانی فەرەنج پاشەکشەیان کرد بۆ فەلەستینو لەوێشەوە ئیمپراتۆر کۆنراد لەرێی دەریاوە گەشتە قوستەنتینەو لەرێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ئەلمانییا، بەلام پاشا لویس چەند مانگێك دواکەوتو پاشان لەرێی دەریاوە گەشتەوە فەرەنسا[4] بەم شێوە گەورەترین شالاوی فەرەنجەکان بەشکستی تەواو کۆتایی پێ هاتو بەهۆی هاوکاری کردنی میرنشینە ئیسلامییەکان وەك حەلەبو موسل لەگەل دیمەشقو سلجوقییە رۆمەکاندا بەرامبەر بەدوژمنان، هەروەها بەهۆی بوونی ئیرادەی بەرگریو روبەروبوونەوە لەدەروونی سەرکردەکاندا بەپێچەوانەی ئەو بارودۆخەی کە لەشالاوی یەکەمی خاچپەرستەکاندا روویدا کەتوانی ئامانجەکانی خۆی بپێکێ بەداگیرکردنی زۆربەی ناوچەکانی شام بەهۆی ناکۆکی ئەم میرنشینانەو نەبوونی ئیرادەی جەنگو لاوازی گیانی بەرگری لەدەروونی فەرمانڕەواکاندا نورەدینیش سود

---

[1] تەفسیری ئاسان ل٣٨٢.

[2] تأريخ الحروب الصليبية (٢/٢٥٥).

[3] الباهر ل٨٩ دور نورالدين في نهضية الامة ل٩٦.

[4] نورالدين محمود، حسيَن مؤنس ل٩٦.

وەرگری سەرەکی بوو لەشکست هێنانی شاڵاوی فەرەنجی دووەم پاش فەرمانڕەوای دیمەشق ئەوەبوو گرنگی ئەو ڕۆڵە دەرکەوت کەخۆیو سیف الدین غازی برای پێی هەستان لەناچارکردنی فەرەنجەکاندا بۆ پاشەکشەکردن لەدیمەشق بەسەر شۆرییەوە، لێرەشەوە گرنگی هاوکاریو هەماهەنگی نێوان میرنشینە ئیسلامییەکان دەرکەوت بۆ پاراستنی لەتەماعی فەرەنجەکان، ئەمەش ئەو کارەبوو کەنورەدین محمود هەوڵی بەدیهێنانی دەدا وەك هەنگاوی یەکەم لەسەر ڕێی یەکگرتن کەئامانجی ستراتیژی بوو لەپێناو ئازادکردنی وڵات لەو داگیرکاریەی فەرەنجەکان، پاش شکستهێنانی شاڵاوی دووەمی خاچپەرستەکان نورەدین محمود پێگەو بایەخی تەواوی دیمەشقی بۆ دەرکەوت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان چ لەڕووی پێگەی جوگرافییەوە لەبەرامبەر گەورەترینو بەهێزترین میرنشینی فەرەنجەکاندا (شانشینی بیت المقدیس) یاخود لەڕووی تواناو زۆری سەرچاوە سروشتتیوو هێزی مرۆییەوە، لێرەشەوە بیرۆکەی دەسبەسەراگرتنی لەدەرونیدا چەسپیو دەستی دایە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئەو بیرۆکەیە بەپشت بەستن بەهۆکارە ئاشتیخوازانەکانو بەسود وەرگرتن لەئەزموونی باوکی لەم بوارەدا[1].

٦- **بەشداریکردنی زانایانی مەغریب لەبەرگریکردن لەدیمەشقدا:** بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی زانایان لەجەنگدا تەنها زانایانی شامی نەگرتبوبەوە، بەڵکو هەندێ ڕیوایەت ئاماژە بەبەشداری زانایانی مەغریبو ئەندەلوس دەکەن کە لەوڵاتی شامدا نیشتەجێبوون لەو جەنگانەدا،ئەوەبوو کاتێ شاری دیمەشق دووچاری پەلاماردان بوو لەساڵێ ٥٤٣ك ١١٤٧زدا ئەو زانایانە بەشداری سوپای شارەکەیان کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێرشە، لەو زانایانەش زانای مەغریبی حجة الآسلام أبو الحجاج یوسفی کوڕی دوناس فەندەلاویو مالیکی وشێخ عبدالرحمان الحلوني[2]. شێخ فەندەلاویش خواناسو دونیانەویستێکی گەورەبوو کاتێ بەرێکەوت، معین الدینی فەرمانڕەوای دیمەشق ڕوی لێ ناو سڵاوی لێکردو پێی وت: ئەی شێخ تۆ لەسەرت نییە لەگەڵماندا بێیت ئێمە لەبری تۆ دەجەنگێین، تۆ توانای شەڕکردنت نەماوە، ئەویش فەرمووی: فیرو شتۆمەو کرییەتی، ئێمەش وازناهێنین مەبەستی فەرمایشتی پەروەردگاربوو: ﴿إِنَّ اللَّـهَ اشْتَرَى مِـنَ الْمُـؤْمِنِينَ أَنْفُـسَهُمْ وَأَمْـوَالَهُمْ بِـأَنَّ لَهُـمُ الْجَنَّـةَ﴾ (التوبة: ١١١)، ئینجا چووە پێشەوەو کەوتە کوشتاری فەرەنجەکان هەتاوەکو بەشەهیدی کوژرا ڕەحمەتی خوای لێبێت[3].

---

[1] موقف فقهاء الشام وقضلتها من الغزو الصليبي، ل:١٢٥.

[2] موقف فقهاء الشام وقضلتها من الغزو الصليبي، ل:١٢٥.

[3] أخبار الروضتين (١/١٩٠).

پاش كوشتارو خۆراگرى نواندن شێخ حلحونى شەهيدكرا[1]. هەروەها شێخ فندلاوى لەخەودا بينرا دواى شەهيدبوونىو پێيان وت: لەكوێيت؟ ووتى: لەبەهەشتى عەدندا لەسەر جێ"و سيستمى رووبەڕووى يەك[2].

٧- **ئەو شيعرانەى كە لەبارەيانەوە هاتووە:**

أبو الندى حسانى كوڕى نميري كلبي لەستايشى مجيرالدينى فەرمانڕەواى دبمەشقدا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| عرج عـــلى نجد لعلك منجدي | ينسيمها وبذكر سُعدى مُسعدي |
| من قاتل الإفرنج دَينـــــا غيرة | والخيل مثل السيـــل عند المشهد |
| رد الأمان بل ندب بـــــاسل | ومن الجباد بكـــل نهد أجرد |
| ومن السيوف بكل عَضب أبيض | ومن العَجاج بكـــل نقع أسود |
| حتى لوى ألإسلام تحت لـــوائه | وغدا بجمد من شـــريعة أحمد[3] |

٨- **دەرەنجامەكانى شاڵاوى دووەمى خاچپەرستى:** كۆمەڵێك دەرەنجام لەشاڵاوى دووەمى خاچپەرستى كەوتنەوە لەوانە:

- دەژمنايەتى ئەوروپاى رۆژئاوا لەگەڵ ئيمپراتۆرى بيزەنتيدا توندتركرد، چونكە ئەو نەهامەتىو مەينەتيانەى ئيمپراتۆرى ئەڵمانى كونرادى سێيەمو پاشاى فەرەنسى لويسى حەوتەم چەشتيان بەهۆى ئەو رێگە وشكانيەوە كەبەناوچەكانى بيزەنتەدا تێپەردەبێ ئەو دوژمنايەتييە بەردەوامو ريشەدارەى سەلماند كە لەنێوان هەردولادا هەبوو، ئەمەش دوژمنايەتييەكە بەدرێژاى سەدەى دوانزەيەمى زاينى/ شەشەمى كۆچى لەپەرەسەندنابوو هەتاوەكو دەگاتە چلەپۆپە لە سەرەتاى سەدەى سيازدەى زانى/ حەوتەمى كۆچيدا.
- ئەو هەڵمەتە كاريگەرى هەبوو لەسەر سروشتى بوونى خاچپەرستى لەرۆژهەڵاتدا: تێبينى ئەوە دەكرێت كەبزوتنەوەى خاچپەرستى پەيوەست بووە بەهاوپەيمانێتييەكى بەرگرى ستراتيژى لەگەڵ ئەوروپاى رۆژئاواييدا، كەهەموو پشتيوانييەكى مادىو مەعنەوى بۆ دابينكرد لەپێناو بەرەوپێش چوونو گەشەسەندنيدا، بەڵكو بەهەموو شێوەيەك لەوناوەندە ئيسلامييە نەيارەدا دەيپاراست، ئێستاش دواى ئەو چارەنوسەى كەشاڵاوى دووەمى خاچپەرستى پێ گەشتووە بەو هەمووە هيواو ئاواتەى كەبەسەركەوتنييەوە بەسترابوو،

---

[1] دور الفهاء والعلماء المسلمين في الشرق الآدنى ل١١٧.

[2] أخبار الروضتين (١/١٩٠).

[3] أخبار الروضتين (١/١٩٣).

بەجوانی بۆمان دەردەخات کەپشت بەستنی خاچپەرستەکان ئێستاش دوای ئەو سەرەنجامەی کەشاڵاوی دووەم پێی گەشت بەو هەموو هیوایەی کە بەسەرکەوتنییەوە بەسترابوو، بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کەپشت بەستنی خاچپەرستەکان بەکۆمەکی دەرەکی ئەوروپی لەڕێی ئەو هەڵمەتە شکستخواردرەوە هیچ سودێکی نەبوو تەنانەت نەیتوانی درێژە بەداگیرکاریان بدات لەناوچە موسڵمانەکاندا بەهۆی ئەوەی کەتەماعیان بێ سنورەو بێ ئەندازە نییە بوونی خاچپەرستەکانیش بەردەوام وەك مەتۆلکەیەك وابوو کەگەشەی سروشتی بۆنەکرا بەهۆی پەیوەندی ناتەندروستی بەنیشتمانی دایکەوە لەئەوروپاداو پشت بەستنیش بەنیشتمان خاڵی لاوازی ئەو مەتۆلکەیەبوو کەچارەسەرێکی راستەقینەی نەبوو لەمیکانیزمی ململانێ خاچپەرستیو ئیسلامی[1]، ئەمەش لەم سەردەمەدا بەسەر ئیسرائیلدا جێبەجێ دەبێت.

- دەستەوسانی قەوارەی خاچپەرستی بەتوانا ناوخۆییەکانییەوە لەئەنجامدانی گۆرانکاری لەواقیعن سالّی ٥٣٩ك ١١٤٤ز تەنانەت لەگەڵ پشت بەستن بەنیشتمانی دایکیشدا هەردەستەوەسان بوو، هۆی ئەمەش لەپاڵ هەوڵەکانی خاچپەرستەکاندا بەرادەیەك بوو کەمیلەکانی کاتژمێر نەتوانن بۆ دواوەی بگەڕێنەوە، بەڵکو لێرە بەدواوە دەسکەوت لەدوای دەسکەوت دێت هەتاوەکو بەتەواوی خاچپەرستەکان لەناوچەکەو دەردەندێن بۆ راستکردنەوەی هەڵەی دابەشبوونی ئیسلامی کەرێخۆشکەربوو بۆ هاتنی خاچپەرستەکان بۆ ناوچەکە.
- دەرکەوتنی ئەستێرەی نورەدین محمود: شاڵاوی ناوبراو پشتیوانیەکی باش بوو بۆ نورەدین محمود لەحەلەبدا، چونکە سەرباری مەترسی دیمەشقییەکان لەئامانجە سیاسییەکانی، بەلام پەیوەندی باشیان لەگەڵیدا پەیداکرد کە لەپێش ئەو روداوانە باشتربوو[2]، پشتیوانیان لەدۆخی سیاسی دەکرد لەباکوری شامدا بەشێوەیەکی بەهێزتر، هەروەها دیمەشقییەکان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دانییان بەبەهێزی نفوزی سیاسی داناو داوای کۆمەکییان لێکرد دژ بەشانشینی بەیتوالمقدیسی هاوپەیمانی دوێنێیان[3].
- لاوازی دەسەلاتدارانی دیمەشق: شاڵاوی ناوبراو ئەو لاوازییەی ئاشکراکرد کەکەتابەکی دیمەشق پێی گەشتبوو، چونکە نەیتوانی روبەرووی شاڵاوی خاچپەرستی ببێتەوە بۆسەری،

---

[1] الحروب الصليبية والعلاقات بين الشرق والغرب ل١٨٤.

[2] الحروب الصليبية والعلاقات بين الشرق والغرب ل١٨٤.

[3] الحروب الصليبية والعلاقات بين الشرق والغرب ل١٨٥.

بۆیە داوای یارمەتی سەربازی دەرەکی کرد، گومانیش لەوەدا نییە کەنورەدین محمود پەی بەو لاوازییە بردبوو بەشێوەیەك کەوایلێکرد لەپێشتر زیاتر پلان دابنێت لەپێناو یەکخستنی بەرەی ئیسلامیو هێنانی دیمەشق بۆ ناو ئەوبەرەیە[١].

● تێکشکاندنی قەڵای العریمة: نورەدین محمود یەکەم هەلی قۆستەوە کەبۆی رەخسا بۆ کارکردنی هاوبەش لەگەڵ معین الدین أنردا ئەوەبوو رادیمۆندی طرابلوس پشتی بەست بەنورەدین محمود دژ بەیەکێك لەئەمیرەکانی فەرەنجەکان، کەئامادەبوون لەگەڵ شاڵاوی دووەمی خاچپەرستەکاندا لەناو سوپای فەرەنسیدا کەبرترندکونت تولوزبوو، ئەم ئەمیرە لەگەڵ سوپای فەرەنسیدا نەگەڕایەوە بۆ فەرەنسا دوای تەواوبوونی هەڵمەتەکە، بەڵکو لەرێی دەریاوە لەتەنیشت کەناری دەریاوە بەرەو باکور کەوتەرێو لەمیرنشینی طرابلوسدا دابەزیە ناو وشکانیو پەلاماری قەڵای العریمەی میرنشینی طرابلوسی داو خۆی تیادا قایمکردو ئارەزوی خۆی دەربڕی بۆ دەست گرتن بەسەر طرابلوس دا، چونکە خۆی بەشیاوتر دەزانی بۆ ئەو شوێنە لەڕایمۆندی ئەمیری طرابلوس رادیمۆندیش نەیتوانی زاڵبێت بەسەریدا بۆیە هەوڵیدا پشت بەمیرنشینە فەرەنجەکانی تر ببەستێت، بەڵام کاتێ هیچ وەڵامێکی لەوانەوە دەست نەکوت، هانای بۆ نورەدینو معین الدین هێنا کەخێرا کەوتنەرێو ئابڵوقەی قەڵاکەیانداو دەستیان گرت بەسەریداو هەموو ئەو کەسانەشیان بەدیلگرت کەتیایدابوون پاشان شوراکەیان روخاندو لەگەڵ زەویدا یەکسانیانکردو هەریەکەیان گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆی[٢]. ئەم رووداوەش بەڵگەیە لەسەر ئەو بارودۆخە خراپەی کەشکستخواردنی شاڵاوی دووەمی خاچپەرستی خستییەوەو کاریگەری خراپی لەسەر بارودۆخی میرنشینە فەرەنجەکان لەرۆژهەڵاتی ئیسلامیدا[٣].

● تێکشکانی هەیبەتی خاچپەرستەکان لەدەروونی موسڵماناندا: زۆرێك لەمێژونوسان شکستی شاڵاوی دووەمی خاچپەرستی بەخاڵی وەرچەرخان دادەنێن لەمێژووی ململانێی ئیسلامی–مەسیحیدا، چونکە سەربازی ئەوەی کەبووە مایەی نەمانی هەیبەتی خاچپەرستەکان لەشامدا ئەمەش هێزە ئیسلامییەکانی هاندا بۆ پەلاماردانی بێ پەروای میرنشینە خاچپەرستەکان، پاشان ئەمە ئەو بۆنەیەبوو کەئەستێرەیەکی تر لەئەستێرەکانی جیهادی خاچپەرستی تێدا دەرکەوت کەئەمەش نورەدین محمود زنکی بوو کەپرۆژەکەی باوکی بۆ یەکخستنی بەرەی

---

[١] الحروب الصليبية والعلاقات بين الشرق والغرب ل١٨٥.

[٢] دور نورالدين محمود في نهضة الأمة ل٩٧.

[٣] دور نورالدين محمود في نهضة الأمة ل٩٨.

ئیسلامی دژ بەخاچپەرستەکان زیندوکردەوەو ئەمەش ئەو پرۆژەیە کەصلاح الدین تەواوی دەکات و سەرکەوتوو دەبێت لەزەمینە خۆشکردن بۆ کۆتایی هێنان بەجەنگی خاچپەرستان، هەروەها نورەدین سەرکەوتوبوو لەقۆستنەوەی ئەو بارودۆخەی کەبەدوای شکستی شاڵاوی دووەمی خاچپەرستەکاندا هات بۆ یەکخستنی شام لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا لەسەر حسابی فەرمانڕەوای دیمەشق، پاشان دەستی کردەوە بەجیهادکردن دژ بەخاچپەرستەکان بەسەرکەوتوویی، ئەمەش هێزە ئیسلامییەکانی تری وەکو سەلجوقییە رۆمەکان و ئەرتەقی و تورکمانەکانی هاندا بۆ پێشڕەوی کردن بۆ روبەروبوونەوەی خاچپەرستەکان بەتایبەت لەرەهاو ئەنتاکیەدا، بەڵکو هەوڵەکانییان یەکخست هەتاوەکو نورەدین زەنکی توانی هەموو وڵاتی شام یەك بخات لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا هەر لەرەهاوە لەباکورەوە هەتاوەکو حۆران لەباشوردا دەوڵەتێکی ئیسلامی سەربەخۆ دروست بوو کەپایتەختەکەی دیمەشق بوو، ئەمەش هەنگاوی یەکەم بوو بەرەو پێکهێنانی ئەو بەرەیەی کەلەفوراتەوە درێژ دەبێتەوە بۆ نیل بۆ بەرپەرچدانەوەی راستەقینەی ئەم مەترسییە خاچپەرستیە[1].

---

[1] السقوط ل ١٣٦.

## باسی چوارەم: تێڕوانینی نورەدین بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتی فاطمیدا:

### یەکەم: ڕەگ و ریشەی شیعەی ئیسماعیلی و دەوڵەتی فاطمی:

دوای مردنی پێشەوا جعفری کوڕی محمدی صادق شیعەبوون بەدوو کۆمەڵ کەخۆیان دایە پاڵ جعفر الصادق: کۆمەڵێك پێشەوای و ئیمامەتییان ئەدایە پاڵ موسی الكاظمي کوڕی، ئەمەش دوانزە ئیمامیەکان بوون، کۆمەڵێکیش ئیمامەتی لێ دادەرنن و ئەڵێن: ئیمام دوای جەعفەر بریتییە لەئیسماعیلی کوڕی، ئەم کۆمەڵەش بەشیعەی ئیسماعیلی ناسران[1]. عبدالقاهر بغدادی دەربارەی ئیسماعیلییەکان ئەڵێت ئەمانە ئیمامەتیان بەخشی بەجەعفەرو دواتریش دایانە پاڵ ئیسماعیلی کوڕی[2] شهرستانیش ئەڵێ: ئیسماعیلییەکان لەموسەوی و دوانزەئیمامییەکان بەوە جیادەکرێتەوە کەئیمامەتیان بۆ ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر سەلماندوە کەکوڕی گەورەیەتی و پێشتر دەقی لەسەر هاتووە ئەڵێت: صادق ڕەحمەتی خوای لێبێت ژنی نەهێناوە بەسەر دایکی ئیسماعیلداو کەنیزەکیشی نەکردۆتە هاوسەری وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەدیجەکردی و عەلیش بەرامبەر بەفاطمەکردی (رضي الله عنه)[3]،کەواتە ئیسماعیلییە یەکێکە لەکۆمەڵەکانی شیعەو ئەدرێتە پاڵ ئیسماعیلی کوڕی جعفر الصادق و نازناوی زۆریان هەیە کەپێی ناسراون جگە لەنازناوی ئیسماعیلییە لەوانە باطنییەکان، ئەم ناوەشیان بۆیە لێنراوە، چونکە وتویانە هەموو ڕواڵەتێك (ظاهر) ناوەرۆکێکی (باطنیکی) هەیە، هەموو دابەزێنراوێکیش+ سروش_ تأویل و لێکدانەوەیەکی هەیە، قەرامطەو مەزدەکییەش لەوانن، ئەم دوو ناز ناوەشیان لەعێراقدا لێنراوە، لەخوراسانیشدا بە "ملحدەکان" واتە "بێ باوەڕان" ناسراون، بەلام خۆیان ئەو ناوانەیان پێ خۆش نییە، بەڵکو ئەڵێن: ئێمە ئیسماعیلین، چونکە بەمە لەشیعەکانی تر جیادەکرێینەوە[4].

هەروەها دەوڵەتی فاطمی شیعە لەساڵی ٢٩٦/٩٠٩ز لەباکوری ئەفریقادا لەسەر دەستی ئەبو عیدللەی شیعە دامەزرا دوای شکستخواردنی قەیرەوان لەبەرامبەر هێزەکانیداو هەڵاتنی زیادەی تەغلوبی بۆ میسر لەجمادی دووەمی ٢٩٦کداو[5]، بەیعەت دان بەعبدللەی مەهدیش لەقیرەوان دا

[1] الدولة الفاطمية العبيدية للصلابي ل٣٥.

[2] الفرق بين لبفرق ل٦٢.

[3] الملل والدخل (١/١٩١).

[4] هەمان سەرچاوە (١/١٩٢).

[5] موسعة المغرب العربي (٣/٦٠).

لەساڵی ٢٩٧ك/٩١٠ز فەرمانڕەوایی ئەبو عەبدللەی شیعە دوای دە ساڵ بەردەوامی کۆتایی پێهات بەپێی قسەی هەندێ لەمێژوونوسان[1].

١- **عبیداللەی مەهدی خەلیفەی یەکەمی شیعە:** عبداللە باوکی محەمەدە یەکەم خەلیفەی خەواروبجەعوبەیدیە باتنییەکانە کەئیسلامیان هەلگێڕایەوەو خەلیفایەتی ئەبو بکرو عومەریان رەتکردەوە کە بە(رفض) ناسراو بەنهێنی مەزهەبی ئیسماعیلیان بلاوکردەوەو بانگخوازیان بۆ بەرێخستو خەلکانی کێویو نەزانیان بێ هەلخەلەتاندن،[2] ذهبي باسی رەچەلەکو ئەوەی کەدەربارەی وتراوە دەکاتو ئەلێ: لێکۆلەران لەسەر ئەوەن کەرەچەلەکی نادیارو نەزانراوە، بەجۆرێك کە المُعز کەیەکێکە لەخۆیان کاتێ أبن طباطبا پرسیاری دەربارەی رەچەلەکی لێ کرد ووتی: سبەی بۆت دەردەهێنم، پاشان بۆ بسەینێ هاتو پارچە ئالتونێکی فرێ داو نیوەی شمشێرەکەی لەکێلان دەرهێناو وتی: ئەمە رەچەلەکمەو فەرمانی پێدان کەزێرتالان بکەن ووتی: ئەمە رەچەلەکمە[3] هەرچی شێخ طاهر الزاویموفتي لیبیاشە رەحمەتی خوای لێبێت ئەوە سەبارەت بەژیانی عبیداللە مەهدی دا ئەلێ: دامەزرێنەری دەولەتی عوبەیدیو یەکەم دەسەلاتدارەتیایداو بەرەچەلوك عیراقیە لەکوفە لەدایك بوە لەساڵی ٢٦٠ك داو لەشارۆچکەی سلمیە پێگەی ئیسماعیلیە باطنیەکان لەباکوری شام دا خۆی شاردەوە، لەرۆژی لەدایك بونیشیەوە تاکو ئەو رۆژەی کەلە سلمیە دانیشتەجێ بوو بەناوی سەعیدی کوڕی حسن کوڕی أحمدی کوڕی محمدی کوڕی عبد اللە کوڕی مەیمونی قەدداخ نابرابوو لەناوچەی سلیمەی بارەگای ئیسماعیلەکان عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محمەد کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق کۆچی دوایی کردو، ئیسماعیلیەکانیشی چەندین مەزاری نهێنیان بۆ بنیات ناو بڕیاری گواستنەوەی ئیمامەتیان دا لەنەوەی ئیسماعیلی کوڕی جعفر الصادق وە بۆ کوڕەکەیان بەنیکاحی رۆحی.[4] پاشان ئەلێ: ئەمەڕەچەلەك وبنەچەی عبیداللەی مەهدیە، رەچەلەکی ئەو عوبەیدیانەشە کەئەدرێنە پالی،[5] شایانی باسە عبیدالەی شیعە کاتێ چوە ئەفریقیاوە "واتە تونس": شیعە گەرێتیەکی قیزەونی بلاوکردەوەو جنێوی بەهاوەلانی پێغەمبەر (ﷺ) خێزانەکانی دەداجگەلە عەلی

---

[1] هەمان سەرچاوە (٧٠/٣).

[2] سير أعلام النبلاء (١٤١/١٥).

[3] هەمان سەرچاوە (١٤١/١٥).

[4] تأريخ الفتح العربي في ليبيا ل٢٥٣.

[5] الدولة الفاطمية العبيدية للصلابي ل٤٧.

کوڕی أبوطالبو مقدادو عەمماری کوڕی یاسرو سەلمانی فارسیو ئەبوزەڕی غەفاریو لای ئەوەی لێ دەدا کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆی هەڵگەراونەتەوە جگە لەوانەی کەناومان بردن،[1] ئەهلی سوننەتیش "سوننەکان" لەقەیرەواندا لەسەردەمی خانەوادەی عوبەیددا زۆر پەراوێز خراوو شاراوە بوون وەك ئەهلی ذیمه وابوون[2]و بەڵاو مەینەتی زۆریان بەشێوەیەکی رۆژانە بەسەر دادەهات. کاتێ کوڕانی عوبەید خۆیان ئاشکراکردو حسین الاعمی نابینای جنێو فرۆشیان دانا لەبازاڕەکاندا هەتاوەکو بەچەند شیعرێك۳کەفێریکرا بوو جنێو بدات بەجۆرێك کەکۆتایی جنێوەکان دەگاتە سەرخودی پێغەمبەر (ﷺ)[3] وەکو: نەفرەت لەئەشکەوتو ئەوەی کەتیایدا بوە هەروەها لەپۆشاك (الكساء)و ئەوەی لەبەری کردوە چەندین ووشەی تر مەبەست لەئەشکەوتیش ئەشکەوتی ثورە کەپێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکر لاخۆیان تیادا شاردەوە هەروەها جنێوی تیایە بۆ ئالو بەیت کەپۆشاك (الكساء) ئەیانگرێتەوە، هەروەك سەری گوێدرێژو ئاژەڵ بەدوکانو کۆگاکاندا هەڵدەواسراو ناوی هاوەڵانی لێ دەنوسرا، بەم شێوە تەنگیان بەئەهلی سوننەت هەڵچنیو ئەوەی قسەی بکردایە یان بجوڵایەتەوە دەکوژرا یاخود لێدانیان دەکرد[4].

٢- **لەتاوانەکانی عوبەیدیەکان لەباکوری ئەفریقیادا:** شیعە ئیسماعیلیەکان چەندین تاوانی دزێویان ئەنجام دا لەوانە.

أ- رۆچونو زیادەڕوی هەندی لەبانگخوازانیان لەعبیداللەی مەهدیدا: تەنانەت هەندێکیشیان گەیاندیانە ئاستی خواو زانینی غەیبیان دەدایەپاڵو ئەیانوت پێغەمبەری نێردراوەو پەیمانیان لەخەڵك بۆ وەرگرتو بەئارەزوی خۆیان شتیان دەدایە پاڵ هەندێکیان دەیانوت: مەهدی کوڕی پێغەمبەرە (د.خ)و بەڵگەی خوایە بەسەرخەڵکەوە بەهەندێکیشیان دەوت کەخوای بەدیهێنەرو رۆزیدەرە،[5] ئەوەی کەوتویانە خوایە ئەوە لەقسەو رەفتارو دروشمی بانگەخوازەکانیدا دەردەکەوێت، چونکە کابرا یەك هەبوو پێیان دەت أحمد البلوی النحاس: لەنوێژدا ڕوی دەکردە نشینگەیەك لەکاتێکدا کەعبیداللەی تێدا بوو دەرکەوتە رۆژئاواوە بوو، کاتێ گواستیەوە بۆ مەهدیە کە ئەکەوێتە، رۆژهەڵاتەوە کابرا ئاراستەی گۆڕی بەرەو ئەوێ

[1] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل٢٩١.

[2] ترتيب المدارك (٣١٨/٢).

[3] هەمان سەرچاوە.

[4] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل٢٩١.

[5] هەمان سەرچاوە ل ٢٩١

لەنوێژدا.[1] گوایە وەکو مەککەی پیرۆزوایە ئەم بیروباوەڕەش لای زۆرخەڵك لەو سەردەمەدا باوو بوو، ئەوەتا یەکێك لەشاعیرەکانی بنی عبید دەربارەی مەهدیە دوای گوێزانەوەی مەهدی بۆی ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ليهنك أيها الملك الهمام | قدوم للدهر ابتسام |
| لقد عظمت بأرض الغرب دار | بها الصلوات تقبل و الصيام |
| هي المهدية الحرم الموقى | كما بتهامة البلد الحرام |
| كأن مقام إبراهيم فيه | ترى قدميك إن عدم المقام |
| وإن لثم الحجيج الركن أضحى | لنا بعراص قصركم التثام |
| لك الدنيا ونسلك حيث كنتم | فكلكم لها أبدا إمام |

هەروەها لەو شیعرانەی کەدەربارەی بەخوازانینی وتراوە، پیاهەڵدانەی کە محمدی کوڕی البدیل کردویەتی کەتیایدا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| حل برقادة المسيح | حل بها آدم ونوح |
| حا بها أحمد المصطفى | حل بها الكبش والذبيح |
| حل بها الله ذو المعالي | وكل شيء سواه ريح |

ئەوەش کەئەڵێن غەیبی زانیوە، ئەوە لەباوەڕبونی هەندێکیانەوە دەرئەکەوێت کەکاتێ سوێندیان دەخوارد ئەیانوت: بەحەقی زانای غەیبو بینراو گەورەمان کەلەڕەقادەیە،[2] زانینی غەیبیش لەتایبەتمەندیەکانی پەروەردگارەو کەس غەیب نازانێ جگە لەخوا، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾(النمل:٦٥).

هەروەها سوێند خواردن بەدروستکراونابێت بەڵکو تەنها بەبەدیهێنەر دەبێت، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمێت: (هەر کەس سوێند دەخوات بابە خوا سوێند بخوات یان بێدەنگ بێت). فەرمودەی زۆریش دەربارەی نەهی کردنی لەسوێند خواردن بەباو باپیران هاتوە.[3]

ب- خۆسەپاندنو ستەم کردنو لەسێدارەدانی هەر کەسێك کەلەسەر مەزهەبی ئەوان نەبێت، ئەمە سەرباری ئەوەی کەپێشتر باسمان کرد لەسەر زمانی قازی عیاض لەتانەدان

---

[1] الكواكب الدرية في السيرة النورية ل٢٠٤ — ٢٠٥.

[2] هەمان سەرچاوە (٢٢١/١).

[3] كتاب التوحيد محمد بن عبدالوهاب ل٩٠.

لەهاوەڵان و هەڵواسینی سەری ئاژەڵ – کەبەڕای ئەوان ئاماژەیە بۆ ناوی هاوەڵان وێڕای کارە دزێوو ناڕەواکانی تریان،[1] زۆر کردنیشیان لەخەڵك بۆ چونە سەرمەزهەبیان لەڕێی ترساندنیانەوە بوو بەکوشتن، ئەوە بوو بەیەکجار بڕیاری لەسێدارەدانی چوار هەزار کەسیان جێبەجێ کرد، القابسی ئەڵێ: ئەوانەی کەلە –دارالبحردا – زیندانی عوبەیدیەکان دا مردن لەمەهدیە لەکاتی هاتنی عبدالله هەتاوەکو ئێستا چوار هەزار پیاون کەبەئازار کوژراون و کەهەموویان زاناو خواناس و پیاوچاکبوون،[2] ئەمە جگەلە وانەی کەبەبێ زیندانی دەکوژران یاخود لەشەقامەکانی قەیرەوان دا لێدان دەکران، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر ژیانی رۆژانەیان، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم مەینەتیانە لێبڕان و سوربون و دەستگرتنی خەڵکی مەغریبی عەرەبی بەقورئان و سوننەتەوە زیاتر دەکرد.

ج- قەدەغە کردنی فتوادان بەپێی مەزهەبی پێشەوا مالك: هەروەها قەدەغە بوو کەزانایان فتوا بەپێی مەزهەبی پێشەوا مالیك بدەن و ئەمەشیان بەتاوانێك دادەنا کەسزاکەی لێدان و زیندانی کردن یان کوشتن بوو هەندێ جار بەدوای ئەمەشدا روبەڕوی جۆرێك لەتۆقاندنی دەرونی دەکرایەوە بەبازاڕی قەیرەواندا ئەیانگێڕاو هاواریان ئەکرد: ئەمە سزای ئەو کەسەیە کەمەزهەبی مالك پەیڕەو دەکات، هەروەها رێیان بەفتوانەدەدا بۆ هیچ کەسێکی تر ئەگەر لەسەر مەزهەبی خۆیان نەبوایە، وەك ئەوەی کە کردیان بەزانای ناسراو هزنی: أبو عبدالله محمدی کوڕی عەباسی کوڕی وەلید کەلە ساڵی سێ سەدو بیست و نۆدا کۆچی دوایی کرد[3].

د- هەڵوەشاندنەوەی هەندێ سوننەتی متواتر "دەماو دەم" مشهور " بەناوبانگ": یاخود زیاد کردنی هەندێ دەستەواژە وەك: حی علی خیر العمل لەبانگ داو نەهێشتنی نوێژی تەراویح،[4] دوای ئەوەی کەیەك ساڵ رێیان بەکردنیدا، بەهۆی ئەمەشەوە خەڵکانێکی زۆر وازیان لەنوێژکردن لەمزگەوتداهێنا، قوربەسەر ئەوکەسەش کەدەستەواژەی حی علی خیر العملی نەوتایە، لەم بارەیەوە ئەگێڕنەوە کەعروسی بانگوێژ کۆچکردوو لە ٣١٧ك لەیەکێك لەمزگەوتەکاندا هەندێ شیعە شایەتیان دا لەسەری کە حی علی خیر العملی نەوتوە، سزاکەشی بریتی بوو لەبڕینی زمان و پیشاندانی پاش ئەوەی کەبەناو قەیرەواندا گێڕایان،

---

[1] جهود علماء المغرب ل٣١٢.

[2] مدرسة الحديث بالقيروان (٧٦/١).

[3] رياض النفوس (٥٦/٢).

[4] جهود علماء المغريب في الديفاع عقيدة أهل السنة ل٣٠٩.

پاشان کوژرا[1] بەڵام هەندێ لەزانایان لەپیلانی عوبەیدییەکان‌و مەبەستە گڵاوەکانیان گەشتن لەپشت ئەم کارەوە کەبریتییە لەچۆڵ کردنی مزگەوت لەنوێژکەران بۆ رێگریش لەم خراپە مۆڵەتیان دا بەبانگ وێژەکان کە حی علی خیر العمل زیاد بکەن چونکە واز لێهێنان‌و نەوتنی خراپەی زیاتر لێ دەکەوێتەوە لەو زانایانەش: أبو الحسن علی کوڕی محمدی کوڕی مسروری عبدی دباغ کۆچکردوو لەساڵی ٣٥٩ك[2] کەیەکێك بوو لە زانا خواناس‌و پارێزکارو خواپەرستەکان ئەم پیاوە زوو لەمەبەستی عوبەیدییەکان تێ گەشت ی بەبانگ وێژەکانی ووت: لەدڵی خۆتاندا بەپێی سوننەت بانگ بدەن کەلێبوونەوە بڵێن: حی علی خیر العمل چونکە عوبەیدییەکان ئەیانەوێ بەم شێوەیە مزگەوتەکان چۆڵ بکەن وتنی ئەو دەستەواژەیەش باشترە لەچۆڵ بوونی مزگەوتەکان.

ه- قەدەغەکردنی کۆبوونەوە: دەوڵەتی فاطمی سوور بوو لەسەر قەدەغەکردنی کۆبوونەوەکان لەترسی شۆرش‌و راپەرین دژیان هەر بۆیە گەرەنایەکیان دانا بوو لەسەرەتای شەودا لێیان دەداو هەرکەسێکیان دوای ئەوە ببینیایە ئەیاندا لەملی، هەروەها ئەو خەڵکەیان بڵاوە پێ دەکرد کەبۆ بەخاکسپاردنی زانانیان کۆدەبوونەوە.[3]

ئەم کردەوەیەش تائێستا بەردەوامە لەو ریژێمە پۆلیسیە سەرکەوتکەرانەی کەشتێکی تر نابینن جگەلەوەی کەفەرمانڕەواو ستەمکارو فیرعەونەکەیان دەبیینێ: ﴿مَا أُرِيكُمْ إِلاَّ مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلاَّ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ (غافر:٢٩).

و- لەناو بردنی هەندێ لەنوسراوەکانی ئەهلی سوننەت: نوسراوەکانی ئەهلی سوننەتیان لەناو بردو رێگریان دەکرد لەئاڵوگۆڕپێکردنیان لەلایەن خەڵکەوە وەك چۆن کتێبەکانی أبو محمدی کوڕی هاشم التجيبی یان لەساڵی ٣٤٦ك قەدەغەکرد کەحەوت بارکتێبی بەجێ هێشت لەدوای خۆی، هەمووی بەدەستی خۆی نوسیبوو، پاش گەیاندنی بەسوڵتانی عوبەیدیەکان بردی‌و خەڵکی لێ بێبەش کرد[4].

ز- رێگری کردن لەوانە وتنەوەی زانایانی سوننە مەزهەب: رێگریان لەوانەوتنەوەی زانایانی ئەهلی سوننەت دەکرد لەمزگەوتەکاندا، هەروەها بڵاوکردنەوەی زانست‌و کۆبونەوەیان لەگەڵ قوتابیاندا لێ قەدەغەکرد بوون بۆیە کتێبەکانی مەزهەبی سوننە تەنها لەماڵەکاندا دەخوێنرا

---

[1] البيان المغرب (١/١٨٢ – ١٨٣).

[2] ترتيب المرارك (٢/٥٢٥ – ٥٢٨).

[3] ريامن النفوس (٢/٢٩).

[4] هەمان سەرچاوە (٢/٤٢٣).

لەترسی عوبەیدیەکان، ئەوە بوو أبو محمدی کوڕی أبی زیدو أبو محمدی کوڕی التبانو خەڵکانی تریش، بەدزیەوە ئەهاتن بۆلای أبی بکری کوڕی اللباد شێخی سوننەکان لەقەیرەوانداو کتێبەکانیان ئەخستە ژێر جلەکانیان بەجۆرێك کەناوەڕاستی لەشیان عارەقی دەکرد لەترسی عوبەیدیەکان،[1] ئەم ڕێرەوو شێوازەش لەلایەن هەندێ دەوڵەتی چەوسێنەرەوە تائێستاش لەجیهانی ئیسلامیدا بەرامبەر بەگەلەکانیان پیادە دەکرێتو هەندێکیان ئەم مەسەلەیە بەتەواوی قەدەغە ئەکەنو هەندێکی تریشیان تەنها بواربە هەندێ مەسەلەی ئاینی دەدەن کەلەگەڵ بەرژەوەندی زلهێزەکاندا دەگونجێ.

ح- شەریعەتیان یەك خست و فەرزەکانیان هەڵگرت لەسەر ئەوانەی کەشوێن بانگەوازەکەیان دەکەوتنو دەبرانە شوێنێکی تاریکەوە عبیدالله فەروەیەکی هەڵگەڕاوەی لەبەردا بوو لەسەر دەستو قاچی دەرۆشتو دەهاتە لایانو پێی دەوتن: بەخ پاشان ئەیهێنانەوە دەرەوەو ئەم کارەی بۆ ڕاڤەئەکردنو ئەیوت: ئەوەی کەبەسەردەستو قاچمەوەی هاتمەژوورەوە ئەوە من دەمەوێ ئاگادارتان بکەمەوە کەئێوە وەك گیانداروانو هیچی ترنین، نەڕوناکیو نەنوێژو نەزەکاتو نەهیچ فەرزێك لەفەرزەکان، هەموو ئەوانەتان لەسەر لاچوە، ئەو پۆشاکەش کەبەهەڵگەڕاوی لەبەرم کردوە، ئەوە ئەمەوێ ئاگادارتان بکەمەوە کەئێوە ئاینتان هەڵگەڕاندۆتەوە، ئەوەش کەووتم بەخ، ئەوە ئەمەوێ پێتان رابگەیەنم کە هەموو شتەکان دروستەبۆتان لەزیناو مەی خواردنەوەو ... هتد[2].

ط- بەزۆر ڕۆژوو شکاندن بەخەڵك پێش بینینی مانگ: زۆر جار خەڵکیان ناچاری ڕۆژو شکاندن دەکرد پێش بینینی هیلالی مانگی شەووال،[3] بەڵکو ئەو کەسانەیان دەکوشت کەفتوای ئەوەیان دەدا کەڕۆژووشکاندن دروست نیە هەتاوەکو هیلال نەبینرێت، وەك دژ بەزانا ابن الحبلی قازی شاری بەرقە کردیان الذهبی لەباسی ژیانیدا ئەڵێ: پێشەوای شەهید دادوەری شاری برقە محمد بن الحبلی ئەمیری برقەهات بۆلایو ووتی: سبەینێ جەژنە، ووتی: باهیلال ببینین ئەگینا ڕۆژوو بەخەڵك ناشکێنمو تاوانیان بخەمە ئەستۆی خۆم، ئەویش ووتی: نامەکەی مەنسور بۆ ئەمە هاتووە ئەمەڕای عوبەیدیەکان بوو بەژمارە ڕۆژویان دەکردەوەو گوێیان بەهیلال نەدەدا ئەوە بوو هیلال نەبینرا، بەڵام ئەمیری شارەکە تەپڵی لێداو ئامادەسازی بۆ جەژن کرد، دادوەریش ووتی: ناچمو نوێژی جەژنیان بۆناکەم، ئەمیریش

---

[1] مدرسة الحديث بالقيروان (٧٦/١).

[2] رياض النفوس (٥٠٤/٢).

[3] مدرسة القيروان (٧٣/١).

فەرمانی دا بەپیاوێك وتاریان بۆ بداتو ئەویش وتارەكەی داپاشان نامەیەكی نوسی بۆ منصورو ئەویش داوای دادوەری كردو بردیان بۆلای‌و پێی وت: پەشیمان ببەرەوە لێت خۆش دەبم، بەڵام دادوەررازی نەبوو، بۆیە فەرمانی هەڵواسینیداو لەبەر خۆردا هەڵواسرا هەتاوەكو مرد، زۆر هاواری دەكرد لەتینوێتی دا بەڵام ئاویان پێ نەدەدا، پاشان لەسەر دارێك لەخاچیان دا نەفرەتی خوا لەستەمكاران بێت[1].

ي- نەهێشتی شوێنەواری خەلیفە سوننە مەزهەبەكان: دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی فاطمی لەرۆژئاوای ئیسلامیدا (باكوری ئەفریقیا) كاریان بۆ سڕینەوەی ئاسەواری ئەو خەلیفەسوننیانە دەكرد كەپێش خۆیان هاتبوون، ئەوە بوو عبیداللە فەرمانێكی دەركد بۆ سڕینەوەی ناوی ئەو فەرمانڕەوایانەی كە مزگەوتو قەڵاو شوراكانیان بەناوەو ناوی خۆی لەبری ئەوان دادەنا، هەروەها ئەم شیعە باطینیە دەستی گرت بەسەر ماڵو سامانو چەكی شوراكانداو ئەو خەڵكانەشی دەركرد كەپاسەوانی كۆشكی زیاد ئەغلەبی بوونو كردی بەجبەخانەی چەك[2].

ك- بردنە ژوورەوەی ئەسپەكانیان بۆ مزگەوت: یەكێك لەتاوانە زۆرو زەبەندەكانی عبیداللە ئەوە بوو كەئەسپی دەبردە مزگەوت، كاتێ لەخاوەن ئەسپەكانیان پرسی:بۆ ئەیانهێننە مزگەوت؟ وتیان: پاشەڕۆو میزیان پاكە، چونكە ئەسپی مەهدیە كاتێ كارگوزاری مزگەوتەكە ئەمەی رەتكردەوە لای مەهدی سكالایان كردو ئەویش كوشتی، ئیبن عذاری ئەڵێت: لەكۆتایی ژیانیدا خوای گەورە بەنەخۆشیەكی قیزەون تاقی كردەوەكە، كرمێك بوو لەكۆمیدا ناوسكی ئەخوارد ئەم دەردەشی پێوەبوو هەتاوەكو بوە هۆی مردنی،[3] موسڵمانانی هاوچەرخ كاتێ مێژوی دەوڵەتی فاطمی عوبەیدی ئەخوێننەوە تەنها ئەوەدەزانن كەلەسەر مێژووی سیاسی ئەم دەوڵەتە نوسراوە، فلان كەس رۆشتو فلان كەس شوێنی گرتەوەو ئەم دەوڵەتە دەوڵەتێك بوە زانستی خۆش ویستوەو بڵاوی كردۆتەوە، مەبەستیش بەمەبڵاوكردنەوەی كتێبی فەیلەسوفەكانە، بەڵام تەنها كەمینەیەك باسی لێدانی زانانیانی سوننەدەكەن، تەنانەت ئەو قوتابیانەی كەمێژووی ئیسلامی دەخوێنن باسی المعزلدین الله فاطمی وەك پاڵەوانێك لەپاڵەوانەكانی مێژوو ئەكەن !، ئەمەش هەموو دەرەنجامی نەبونی لێكدانەوەی بیروباوەڕ خوازانەی ئیسلامیە بۆ مێژوومان تەنانەت هەندێك لەو مێژوو نوسانەی كەمێژویان

---

[1] سیرأعلام النبلاء (١٥/٣٧٤)

[2] ریاض النفوس (٢/٢٩)

[3] أبعید التأریخ نفسه ل٣٩.

نوسیوەتەوە کاریگەر بوون بەقوتابخانە رۆژهەڵاتناسیەکان، یان بەبیری شیعەگەری، پارەیەکی زۆریشیان پێ بەخشراوە بۆ شاردنەوەی راستیەکانو ساختەکردنی مێژوو، تائەمڕۆش ململانێی ئیسلامیو باطنی بەردەوامە، چونکە بیرۆکەکان نامرن بەڵکو تەنها شێوەو روخسارەکان دەگۆڕێت، دوژمنانی ئیسلامیش هێشتا بەبەردەوامی بەنهێنیو ئاشکراو بەشەو و بەرۆژ کاردەکەن بۆ لەناو بردنی ئەم بیروباوەڕە راستە کەئومەت لەپێشەوای ئازیزو هاوەڵە جوامێرو ئەهلو بەیتی پاکو بێگەردیەوە وەرگرتوە(رضي الله عنه).

٣- **شێوازەکانی روبەڕوبونەوەی مەغریبیەکان لەگەڵ دەوڵەتی فاگمی عوبەیدیدا:** زانایانی سوننە لەمەغریب دا شێوازی جۆراوجۆریان گرتەبەر بۆ روبەروبونەوەی شیعەگەری، وەك بەگری سلبیو بەگری جەدەلیو بەگریو روبەروبونەوەی چەکداری، چەند جۆرێکی تری بەرگریش هەبوو لەرێگەی بڵاوکردنەوەو هۆنینەوەی شیعرو ... هتد.

أ- **بەرگری سلبی:** یەکەم شێوازێك کەزانایانی سوننە لەبەرامبەر رەوتی شیعەگەری داگرتیانە بەربریتی بوو: لەهۆکاری سلبی مەبەستیشمان پێی: بەشدارینەکردنی بەکۆمەڵە لەهەر شتێکدا کەپەیوەندی بەشیعە گەریەوە هەیە، یان بەدەسەڵاتی باڵا دەستەوە، ئەمەش لەمانگرتنی دادوەرەکانی دەوڵەتو فەرمانبەرانیدا خۆی دەبینیەوە، هەروەها نەدانی باج بەدەوڵەت،[1] لەڕواڵەتەکانی ئەم جۆرە بەرگریەش ئامادەنەبوون لەنوێژی هەینی دا کەبۆنەیەك بوو بۆ نەفرەت کردن لەهاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر مینبەر: بەهۆی ئەمەشەوە ماوەیەکی زۆر نوێژی هەینی لەقەیرەواندا نەکرا،[2] هەندێکیش تەنها دوعایان لێ دەکردن وەك عبدالصمد الواعظ،[3] هەورەها وەك أبو الاسحاق السبائي زاهید کاتێ نوشتەیەکی ئەکرد دوای خوێندنی فاتیحەو سورەتی ئیخلاصو مەعوزەتین ئەیوت: لەبەر رقم لەعبیداللە و تەوەکانیو خۆشەویستیم بۆ پێغەمبەرەکەتو هاوەڵانو ئالوبەیتەکەی شیفای هەرکەسێ بدەکە روقیەی شەرعیم بۆ کردوە،[4] هەروەها لەڕواڵەتەکانی بەرگری سلبی دەنگ وەرگرتن بوو لەهەرکەسێك کەلەسوڵتانەوە نزیك بوایە یاخود بەرگری لەبونی بکردایە یان پاشاوی بۆ بهێنایەتەوە، ئەمەش لەبەر فەرمایشتی پەروەردگار ﴿لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْأَخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ (المجادلة:٢٢) واتە:

---

[1] مقدمة حسين مؤنس على رياض النفوس ل١٧.

[2] البيان المغرب (١/٢٧٧).

[3] معالم الايمان (٣/٢٣٧).

[4] معالم الايمان (٣/٧١).

کەسێکت دەست ناکەوێت باوەڕبێنن بەخواو بەڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کەدژایەتی خواو پێغەمبەرەمەیان کردبێت، ئەگەر چی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن. تەفسیری ئاسات ل٥٤٥.

ئەوەتا خەلەف کوڕی أبی القاسم ی براذعی :کۆچکردوو لە ٤٠٠ك[1] هەموو زانایانی قەیرەووان دژی وەستان لەبەربونی پەیوەندی لەگەڵ پاشاکانی عوبەیدییداو وەرگرتنی دیاریەکانیان‌و دانانی کتێب لەسەر ڕەچەڵەکیان، تورەیی‌و بێزاریشیان دژی پەرەی سەندکاتێ ستایشکردنی عوبەیدیەکانیان بینی کەبەخەتی دەستی ئەو نوسرابوو نموونەی بەشیعرێکی حطئە هێنابویەوە کەدەڵێ[2]:

لأولئك قوم إن بنوا أحسنوا البنا وإن عاهدوا أوفوا وإن عقدوا شدوا

بەهۆی هەمووئەمانەوە زانایانی قەیرەوان دفتوای وەلانانی کتێبەکانی‌و نەخوێندنەوەیان دا، لەبەرامبەریشدا ئەو ناچار بوو کۆچ بکات بۆ صقلیەو لەوێش پێشوازیەکی باشی لێکرا لەلایەن ئەمیرەکەیەوە[3].

ب- **بەرگری جەدەلی:** بەرگری جەدەلی بەهێزترین‌و فراوانترین جۆری بەرگری بوو کەزانایانی سوننەی مەغریب پێی هەستان دژ بەشیعەی لادەر، کۆمەڵێکی زۆر زاناش درەوشانەوە لەئاسمانی ئەم مشتومڕو گفتوگۆو روبەڕووبوونەوە بیروباوەڕیەداو توانیان ببنە زمانی گۆیاو بەرگریکاری سوننەکان لەئاین، لەو کەسانەش کەدرەوشانەوە لەبواری مشتومڕو جەدەلدا شێخ عبالله ی کوڕی التبان کۆچکردوو (٣٧١ك)[4]، ئەم زانایە ناوبانگی دەرکردو بەهۆی مشتومڕی لەگەڵ عوبەیدەکاندا بەرادەیەك کەخەڵکی لەشوێنە دورەکانەوە دەهاتنە لای بەهۆی زانیاری‌و شارەزایی لەبواری بەرگریکردن لەمەزهەبی ئەهلی سوننەتدا، هەروەها ئەم پێشەوایەوێرای لێهاتووی لەمشتومڕو جەدەلدا پیاوێکی ئازاو چاونەترسش بووو سڵی لەمەرگ نەدەکردەوە، مالکی‌و دباغ دەگێڕنەوە کەعبدالله ی ناسراو بەفێڵباز[5]، فەرمانڕەوای قەیرەوان بەدوای زانایاندا دەگەڕا، ئەوانیش لەماڵی ابن أبی زیدی قەیرەوانیدا کۆبوونەوەو ابن التبان یش پێی وتن: من ئەڕۆم بۆ لای گیانم ئەبەخشم لەپێناوتاندا، چونکە ئەگەر شتێك

---

[1] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل ٣٢٤.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٢٤.

[3] هەمان سەرچاوە ل٣٢٤.

[4] ترتيب المدارك (٢/٥١٧-٥٢٤) شجرة النور الزنكية (١/٩٥-٩٦).

[5] یەکێکە لەکاربەدەستانی عوبەیدەکان.

بەسەر ئێوەدابێت ئیسلام توشی لاوازییەکی گەورەدەبێت[1]، پاشان چوو بۆ لای و خۆی و کۆمەڵەکەی لەمەجلیسی مشتو مڕدا دەمکوت کرد ، پاش شکست هێنانیشیان هێشتا شەرمیان نەدەکردو داوایان لێکرد بچێتە سەر مەزهەبەکەیان، بەڵام ئەو رازی نەبوو وتی:چۆن زانایەك شەست ساڵی تەمەنی بێتو حەڵاڵو حەرامی خوابزانێتو وەڵامی حەفتاو دوو کۆمەڵ بداتەوە شتی وای پێ دەوترێت؟! ئەگەر بمکەن بەدوو کەرتەوە واز لەمەزهەبی خۆم ناهێنم[2]، دوای ئەوە بەجێی هێشتن و ئەوانیش بێ ئومێدبوون لێی چەند پیاوێکی دەوڵەتی فاطمیان ناردو شمشێریان لێ بەرزکردەوە هەتاوەکو ئەو خەڵکانەی کەدەیبینین بترسن، بەڵام لەژێر ئەو فشارەشدا بەردەوام بوو لەرێنمونی دەکردنی خەڵك و ئامۆژگاری پێشکەش دەکردن و بەبێ ترس ئەیوت: دامەزراوبن، لەنێوان ئێوەو خوادا تەنها ئیسلام هەیە، ئەگەر لێی دوربکەونەوە تیائەچن[3]. هەروەها لەوەدەترسا کەخەڵکی لەلایەن عوبەیدەییەکانەوە سەریان لێ بشێوێنرێتو ئەیوت: سوێند بەخوا لەگوناهکردنیان ناترسم، چونکە پەروەردگاریان بەخشندەیە، بەڵام تەنها لەوە دەترسم گومانیان لەبێ باوەری عوبەیدییەکاندا هەبێتو بچنە دۆزەخەوە[4].هەروەها لەو کەسانەی کەناسرابوون بەداکۆکی کردن لەئیسلامو بەلگەی روون و بەهێزیان دەخستەروو بانگخوازانی دەوڵەتی فاطمیان دەمکوت دەکرد أبو عوسمان سعیدی کوڕی حداد کۆچیکردوو لە٣٠٢ك زمان حاڵی ئەهلی سوننەتو ئیبن حەنبەلی مەغریب، سەلەمی دەربارەی دەڵێ: زانایەکی چاکو زمان پاراو خواپەرستو تاقانەی سەردەمی خۆی بوو لەگفتوگۆو وەڵامدانەوەی فاطمیەکاندا[5]. الخشني دەربارەی ئەڵێت: وەڵامی بیدعە چییەکانی دایەوە ئەوانەی کەپێچەوانەی سوننەت بوون و لەم بوارەشدا رۆڵێکی دیارو ئاسەواری باشی هەبوو نوێنەرێکی باشی موسڵمانان بوو بەرادەیەك کەخەڵکی قەیرەوان بەأحمدی کوڕی حەنبەلیان دەچواند[6] ، المالکی دەربارەی ئەڵێت: چەندین دانیشتنی هەبوو لەگەڵ بێ باوەڕاندا ئەبوو عبیدەالله ی شیعە وأبی العباس و برای و عبیدالله، تیایدا بێ باوەڕی و پاشگەزبوونەوەیانی لەئاین و پەك خستنی سیفەتەکانی

---

[1] معالم الایمان (١١٣/٣).

[2] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل٣٢٧.

[3] هەمان سەرچاوە ل٣٢٤.

[4] معالم الایمان (٩١/٣).

[5] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل٣٢٨.

[6] طبقات الخشني ل١٩٩ معالم الأيمان (٢٠٩/٢).

پەروەردگاری لەلایەن ئەوانەوە روونکردەوە[1]، هەروەها دەوڵەتی فاطمی لەمەغریدا هەوڵیدا کەخەڵکی ناچاربکات بۆ پەیرەکردنی مەوهەبیان هەندێ جار لەرێگەی گفتوگۆو بەڵگەهێنانەوەو هەندێ جاریش لەرێگەی هەرەشەی کوشتنەوە، ئەمەش خەڵکی ترساندو پەنایان برد بۆ ئەبی سەعیدو پرسیاریان لێکرد دەربارەی "تقیە"[2]، بەڵام ئەو پێی رازینەبوو ووتی: من لەنەوەد ساڵ تێپەرییوم، پێویستم بەژیان نەماوەو پێویستە مشتومڕو مجادەلە بکەم لەسەر ئاین هەتاوەکو لای خوای گەورە پاساوم هەبێت، ئەوەبوو راستی کردو بەم کارە هەستاو پاش خوای گەورە پشتیان بەو دەبەست لەروبەروبوونەوەی شیعەدا[3].

لەگرنگترین ئەو بابەتانەش کەمشتومڕی لەسەرکرا.

• **پێشخستنی عەلی بەسەر ئەبوبەکر** (ﷺ): یەکەمین گفتوگۆ وەك خاوەنی "المعالم" دەڵێ: دەربارەی چاکتربوونی ئەبوبەکرو عەلی بووە، ئەوەبوو دوای کۆبوونەوەی نێوان إبن الحدادو أبی عبدالله شیعەدا، ئەبوو عبداللەی پرسیاری کرد لەأبن الحداد ووتی: ئێوە خەڵکانی تر فەزڵ ئەدەن بەسەر (أصحاب الكساء)؟! مەبەستی (أصحاب الكساء) محمد (ﷺ) عەلیو فاطمةو حسنو حسین (ﷺ)و مەبەستی لەخەڵکانی تر ئەبووبەکر (ﷺ)بوو أبو عثمانیش ووتی: باشە کامیان بەباشتر بزانین؟ پێنج کەس کەجبریل شەشەمیانە یاخود دوو کەش کەخوای گەورە سێیەمیانە[4]؟! ئەوسا کابرای شیعە دەمکوت بوو.

• **بەپێشەواو ئیمام زانینی عەلی** (ﷺ): لەم گفتوگۆیەدا ئەبوو عبداللەی شیعە ویستی بیسەلمێنێت کە "موالاة" لەفەرمودەی " من كنت مولاه فهذا علي مولاه[5]"دا، مەبەست پێی بەندایەتییە، بۆیە ووتی: بۆچی خەڵکی نابنە بەندە بۆ ئێمە؟ أبن الحدادیش ووتی: ئەوە ویلایەتو سەرپەرشتی بەندایەتی نییە، بەڵکو سەرپەرشتیو گەورەیی ئایینە بەڵگەشی بەئایەتی: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ٧٩ وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ٨٠﴾، واتە: بۆ هیچ ئادەمیزادێكو كەسێك نەگونجاوە كەخوا كتێبی ئاسمانیو فەرمانڕەوایيو

---

[1] رياض النفوس (٢/٧٥).

[2] معالم الايمان (٢/٢٩٨) جهود علماء المغرب ل ٣٢٩.

[3] سن التدمذي، تحفة الأموذي ژمارە ٣٧٩٧ فەرمودەیەکی باشو مامۆیە (حسن غريب).

[4] سن التدمذي، تحفة الأموذي ژمارە ٣٧٩٧ فەرمودەیەکی باشو مامۆیە (حسن غريب).

[5] جهود علماء المغرب في الدفاع عن عقيدة أهل السنة ل٣٣١.

پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیبێت لەوەودوا بەخەڵکی بڵێت: وەرن ببنە عەبدو بەندەی من لەجیاتی ئەوەی بەندەو عەبدی خوابن، بەڵکو (بەخەڵکیان ووتوە) هەوڵ بدەن بۆ خوا بژین‌و لێبڕبن‌و بۆ رەزامەندی پەروەردگار هەوڵ بدەن، بەوەش دەبنە خواناس‌و رەبانی کەبەرنامەی خوای فێری خەڵکی بکەن‌و خۆشتان بەردەوام هەوڵ بدەن فێری ببن (هیچ پێغەمبەرێك فرمانی ئەوەی نەداوە کەفریشتەکان‌و پێغەمبەران بکەن بەپەروەردگار (هەرگیز کاری لەو جۆرە لەوان ناوەشێتەوە) ئایا ئاراستە فرمانی بێ باوەڕی‌و کوتا پێ بدات دوای ئەوەی کەئێوە موسڵمانن‌و ملکەچی پەروەردگار؟! (تەفسیری ئاسان ل٦٠). چونکە شتێك کەخوای گەورە بۆ پێغەمبەری بڕیار نەدابێت بۆ خەڵکی ئاسایشی بڕیار نادات، عەلیش (ﷺ) پێغەمبەر نەبوە، بەڵکو وەزیرو هاوکاری پێغەمبەربووە (ﷺ)[1]، ئەمە چەند ئاماژەیەکی خێرابوو بەشێکی کەمیشە لەکۆمەڵە مشتومڕو گفتوگۆیەك کە لەنێوان هەردولا روویدا.

ج- **روبەروبوونەوەی چەکداری:** زانایانی مەغریب تەنها بەبەرگری سلبی‌و جەدەلی وازیاننەهێنا، بەڵکو هەندێکیان چەکیان هەڵگرت‌و چوونە دەرەوە بۆ جەنگ کردن دژ بەفاطمییەکان، ئەوەتا جبلەی کوڕی حمود الصدفي ریباگی بەجێهێشت‌و چووە قەیوەوان، کاتێ دەربارەی ئەوە قسەی لەگەڵ کراو ووتی: ئێمە پاسەوانی دوژمنێکمان دەکرد لەنێوان ئێمەو ئەودا دەریا هەبوو ئێستا ئەم دوژمنە هاتۆتە ناومان‌و ئەمە ناخۆشترە پاشان ووتی: جیهادکردنی ئەمانە باشترە لەجیهادکردنی خەڵکی هاوەڵپەیداکەر[2]، بەڵگەشی بۆ ئەمە ئایەتی"التوبە ١٢٣." واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بجەنگن دژی ئەو بێ باوەڕانەی کەلێتان نزیك دەبنەوەو بەدەوروبەرتاندان. تەفسیری ئاسان ل٢٠٧.

هەروەها لەو زانایانەش أبو قاسم حسنی کوڕی مفرج کۆکردوو لە ٣٠٩ ك کە لەو یەکەمین کەسانەبوو کە دژ بەدەسەڵاتی شیعە راپەڕی‌و بەشەهیدی مرد، عبیداللەی مەهدی کوشتی، لەگەڵ پیاوێکی تردا لەخاج دژا بەناوی أبو عبداللەی سدری کەپیاوچاکێك بوو پەیمانیدابوو کەجیهاد بکات دژ بەمەهدی خەڵکیشی بۆ ئەو کارە هاندەدا هەواڵی ئەمەش بەعبدالله گەیشت‌و فەرمانی کوشتنی دا[3] هەروەها کۆمەڵێ زانایان هەنگاوێکی گەورەتریان ناوو فتوای پێویستی جیهادیان دژ بەدەوڵەتی فاطمی عوبەیدیان راگەیاند، ئەمەش دوای کۆبوونەوەو راوێژکردن بوو لەنێوان زانایانی سوننەدا

---

[1] تقیة: واتە ئەوەی کەمرۆڤ شتێك پێشان بدات‌و لەدڵەوە باوەڕی پێی نەبێت، ئەمەش یەکێکە لەبنەماکانی شیعە. وەرگێڕ.

[2] معام الأیمان (١٨٥/٢) جهود علماء المغرب ٣٣٧.

[3] ریاض النفدس (١٦٩/٢-١٧٢).

پاشان هاوپەیمانێتییەکان راگەیاند لەگەڵ ئەهلی قیبلەدا دژ بەفاطمییە کان کەحوکمی بێ باوەریان بەسەردا سەپاندن بەهۆی بیروبۆچوونە نارەواکانییانەوە زانا شێخ أبوبکری کوڕی عبدالرحمانی خولانی ئەڵێ: شێخ أبو اسحاقی سبائی رەحمەتی خوای لێبێت لەگەڵ زانایانی ئەفریقیەو ئەبوو یەزیددا کەوتەرێ بۆ جەنگ کردن دژ بەفاطمي‌یەکان، ئەبو اسحاقیش ئاماژەی بۆ سەربازانی ئەبوو یەزیددەکردو ئەیوت ئەوانە ئەهلی قیبلەن. ئاماژەشی بەسەربازانی فاطمی دەکردو ئەیوت ئەوانە ئەهلی قیبلەنین، پێویستە لەسەرمان لەگەڵ ئەم ئەهلی قیبلانەدا برۆینە دەرەوە بۆ کوشتاری ئەوانەی کەئەهلی قیبلەنین، جا ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتین ئەوە گوێرایەڵی ئەبێ بەزیدناکەین، چونکە خەواریجەو. خوای گەورى پێشەوایەکی داد پەروەری بەسەردا زاڵ دەکاتو لەئێمەی دوردەخاتەوەو لەدەستی رزگارمان دەکات، ئەو زاناو خواپەرستانەش کە لەگەڵیدا چوون بریتی‌بوون لە. أبو العرب ابن تحيم وابو عبدالملك مروان نصروانو أبو أسخاق السبائی أبو الفضل وأبو سليمانو ربيع بن القطان[1] و خەڵکانێکی زۆری تریش[2]،ئەوەبوو لەکاتی دیاریکراویدا زانایان چوونە دەرەوەو ناودارانی خەڵکیشیان بەدواوەبوو وێڕای جەماوەرێکی زۆر، هیچ زاناو پیاو چاکێك دوانەکەوت جگە لەپیروپەککەوتەکان نەبێت ربيع القطانیش لەپێشەوەی ریزەکانەوە بوو بەسواری ئەسپەکەیەوە زرێپۆشو کەرەستەی جەنگی لەخۆی ئاڵاندبوو ئەیوت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەهێشتمیەوە هەتاوەکو گەشتم بەکۆمەڵێك باوەڕدار کە بۆ جیهادی دوژمنانی تۆو پێغەمبەرەکەت کۆبوونەتەوە[3]. زانایانیش لەو روبەروبوونەوەدا رۆڵێکی باشییان بینی وێنەیەکی راستەقینەیان بۆ جیهادکردن لەپێناو خوادا پێشانداو، زیاتر لەهەشتا زانایان لێ شەهیدبوو، لەوانە ربيع القطانو ممیسیو خەڵکانێکی تر، سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێناو خەریك بوو دەستبگرن بەسەر مەهدیەدا ئەگەر فێڵیان لێ نەکرایەو ئەبو یزید رووی راستەقینەی خۆی هەڵنەماڵیایەو دژایەتی خۆی بۆ ئەهلی سوننەت دەرنەخستایە بەفەرمانکردن بەسەربازەکانی هەتاوەکو پشتی خەڵکی قەیرەوان بەردەن، ئەوەبوو بەسەربازەکانی ووت: ئەگەر روبەروویان بوونەوە ئەوا پشتی خەڵکی قەیرەوان بەردەن هەتاوەکو دوژمنەکانییان زاڵ بن بەسەریانداو بەدەستی ئەوان بکوژرێن نەك ئێمەو رزگارمان بێت لەدەستییان[4] ئامانجیشی بەم کارە بۆگەنو ناشیرینە بریتی بوو لەرزگاربوونی لێیان، چونکە ئەگەر زانایانو سەرۆك هۆزەکانی قەیرەوان بکوژێت ئەوە بەئاسانی بەسەر

[1] الدولة الفاطمية العبيدية للصلابي ل٧٨.

[2] الدولة الفاطمية العبيدية للصلابي ل٧٨.

[3] معالم الأيمان (٣/٣٧-٤٢).

[4] الجيان المغرب (١/٢١٨).

شوێنێکەوتوانیاندا زاڵ دەبێتو ئارەزووی خۆی بۆ هەر شتێك کەبیەوێت بانگهێشتیان دەکات[1]، بەلام بەخراپترین شێوە شکستی خوارد، چونکە ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی چوونە ریزی دوژمنو تەنها سەربازێکی کەمی بەدەوردا مایەوەو بەخراپترین شێوە کوشتییان، کوشتنیشی لە٣٠ی مجرمی ساڵی ٣٣٦ك بوو[2]، ئەم روبەروبوونەوەش دواتر کاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندی نێوان شیعەو سوننە لەسەر گۆرەپانی مەغریب، چونکە بەرگری بەردەوام بوو هەتاوەکو پاش دەرچوونی فاطمییەکانیش لەمەغریب ئەوەبوو ئەگەران بەشوێن ناوەندەکانی شیعەداو لەهەرکوێ بەدییان بکردایەن ئەیانکوشتنو ماڵیان بەتالان ئەبردن، أبن العذاری له البیان المغربدا باس دەکات کەخەڵکێك لەشاری قەیرەواندا هەبوون خۆیان لەژێر پەردەی شیعەدا حەشاردابوو خراپترین خەڵکبوون، خەڵکی شارەکەش بەگشتی هێرشیان کردە سەریانو خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتنو ماڵو موڵکییان تالان کردن[3]، قازی عیاضیش وەسفی ئەم روداوە ئەکاتو ئەڵێ: دەستپێکی ئەمە لەرۆژی هەینی ناوەراستی محرم دابوو، خەڵکیی شیعەکانییان کوشتو سوتاندنیانو ماڵو موڵکییان تالانکردنو خانووەکانییان روخاندنو ژنو منالەکانییان کوشتنو بەقاچ رایاندەکێشان، ئەمەش هێزێك بوو خوا زاڵی کرد بەسەریاندا، ئەم مەسەلەیەش لەقەیرەوانەوە گوێزرایەوە بۆ مەهدییەو شوێنەکانی ترو بەئاگر سوتاندنیانو کەسیان لێ نەهێشتن لەئەفریقیادا جگە لەوانەی کەدیارنەمان[4]. ئەم جۆرە بەرگرییەش توندترین جۆری بەرگری بوو کەبەهۆیەوە خوای گەورە زەوی مەغریبیان پاك کردەوە لەمەزهەبی شیعەی باگنی داهێنراو.

د- **بەرگری لەرێی نوسینو دانانی کتێبەوە:** بەرگری لەرێی نوسینەوە لەهۆکارە بەسودو کاریگەرەکانی بەرەنگاربوونەوەی شیعەبوو، کەرۆڵێکی باشی هەبوو لەنیگەرانکردنو بێزارکردنیانو راگەیاندنی جەنگ لەلایەن ئەوانەوە دژ بەهەر کەسێك کەبەوکارە هەڵدەستێت، هەروەها کاریگەری هەبوو لەسەر رونکردنەوەی راستی بۆ خەڵكو چەسپاندنی بنەماکانی سوننەت ئەم نوستنو دانراوانەش ئەکران بەدوو بەشەوە:

- ئەو نوسراوانەی کەباسیان لەمەسەلەکانی عەقیدەو بیروباوەر دەکرد بەگشتی بەپێی رێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، لەو مەسەلانەش کەباسی دەکرد مەسەلەی "إمامە" لای ئەهلی سوننەتو فەزلی ئەبووبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی (رضي الله عنهم)، و رەوایەتی خەلیفایەتی ئەو

---

[1] هەمان سەرچاوە (١/٢٦٨).

[2] جهود علماء المغرب في الدفاع عن غقيدة أهل السنة ل ٣٤٤.

[3] البیان المغرب (١/٢٦٨).

[4] ترتیب المدارك (٢/٦٢٥).

سیانە بەپێچەوانەی رای شیعەو رازی بوون لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ جیاوازی لەنێوانیانداو بەدادگەرو چاك زانینی سەرجەمیان بەپێچەوانەی شیعە کەبەبێباوەڕو گوناهباریان دەزانن جگە لەچەند کەسێکی کەم، ئەم جۆرە نوسینە کاریگەری باشی هەبوو لەسەر بەرچاورونکردنەوەی خەڵکی بەرامبەر بەئاینەکەیانو بڵاوکردنەوەی مەزهەبی راست بەجۆرێك کەوایان لێهات هەرکەسێك پێچەوانەی ئەم بیروباوەڕانە بیری بکردایەتەوە بەپێچەوانەی ئیسلامو دەرچوو لەریزی موسڵمانیان دەزانیو ئەوەی کەبەرامبەر بێ باوەر پێویستبوو بۆ ئەویش بەپێویستیان دەزانی وەك دژایەتی کردنو کوشتنو دەنگ لێ وەرگرتنو جۆرەکانی تری مامەڵە، بەڵکو بەهۆی ئەمەوە بگەڕێتەوەو پەشیمان ببێتەوە[1].

- جۆری دووەم: ئەو نوسینانەی کەبەتایبەت بۆ وەڵامدانەوەی شیعەو بیروباوەڕە نارەواکانیان دەنوسرا، ئەم جۆرە نوسینەش وەك پێشتر باسمانکرد دەرەنجامی چەند بارودۆخێکی تایبەت بوو کەپێویستی دەکرد لەسەر ئەهلی سوننەت وەڵامییان بدەنەوەو، گومانەکانییان پوچ بکەنەوە، لەم جۆرە نوسینانەش هەردوو کتێبی "الامامە" باس دەکەین کەدانراوی محمد بن سحنونبوون،و باشترین کتێبن لەم بوارەدا نوسرابن، عیسەی کوڕی مسکین ئەڵێ: لەم بوارەدا شتی وەك ئەو دوو کتێبە نەنوسراوە[2]، هەروەها کتێبی "الامامە" ی پێشەوا ابراهیمی کوڕی عبدالله زبیری، هەروەها کتێبی "الرد علی الرافضة" ی هەمان نوسەر. ئەم دوو کتێبە هۆکاری لێدانو گیرانو ئازاردانی بوو لەلایەن دەوڵەتی فاطمی عوبەیدیەوە، چونکە ئەم جۆرە نوسینە کاریگەری خۆی هەبوو لەبەرگریدا[3].

٥- **بەرگری شاعیرانی سوننە مەزهەب:** لەپاڵ نوسیندا هۆکارێکی تر هەبوو کەبریتی بوو لەهۆنینەوەی شیعر دژ بەعوبەیدییەکانو بەخراپ باسکردنیان لەم بوارەشدا زۆر شاعیر دەرکەوتن لەوانە: أبو قاسم فزاری کەوەسفی خۆیانو هەڵسو کەوتیانی دەکردو ئەیوت:

| | |
|---|---|
| عبدوا ملوكهم وظنوا أنهم | نالوا بهم سبب النجاة عموما |
| وتمكن الشيطان من خطواتهم | فأراهم عوج الضلال قويما |
| رغبوا عن الصديق و الفاروق في | أحكامهم لا سلموا تسليما |
| واستبدلوا بهما ابن الأسود نابحا | وأبا قدارة واللعين تميما |

---

[1] جهود علماء المغرب في الدفاع عن غقيدة أهل السنة ل٣٤٩.

[2] جهود علماء المغرب في الدفاع عن غقيدة أهل السنة ل٣٤٩.

[3] جهود علماء المغرب في الدفاع عن غقيدة أهل السنة ل٣٤٩.

تبعوا كلاب جهنم وتأخروا عمن أصارهم الإله نجوما

أمن اليهود؟ أم النصاري؟ أم هم دهرية جعلوا الحديث قديما

أم هم من الصابئين أم من عصبة عبدوا النجوم و أكثروا التنجيما

أم هم زنادقة معطلة رأوا أن لا عذاب ولا تنبعيما

أم عصبة صنوية قد عظموا النورين عن ظلماتهم تعظيما

سبحان من أبى العباد بكفرهم وبثركهم حقبا وكان رحيما

يا رب فالعنهم و لقهم بأبي يزيد من العذاب أليما

عجيب لفتنة أعمت وعمت يقوم بها دعي أو كفور

تزلزلت المدائن و البوادي لها وتلونت منها الدهور

وضاقت كل أرض ذات عرض ولم تغن المعاقل والقصور

فنجى القيروان وساكنيها إله دافع عنها قدير

أحاط بأهلها علما و خبرا وميز ما اكتنه الصدور

وجللهم بعافية وأمن وأسبل فوقها ستر ستير

وأثبت جلة العلماء فيها بحار لا تعد ولا بحور

ومنها سادة العلماء قدما إذا عدوا وليس لها نظير

وفيها القوم عباد خيارا فقد طاب الأوائل و الأخير

هم افتكوا سبايا كل أرض وفادوا ما استبد به المغير

كفيناهم عظائمها جميعا فزالت عنهم تلك الشرور

وسكنا قلوبا خافقات أمات عروقها ضر ضرير

وآوينا و آسينا وكنا لهم أهلا و أكثرهم شطير

فبات طعامنا لهم طعاما هناك ودورنا للقوم دور

وكان لنا ثواب الله ذخرا وقام بشكرنا منهم شكور

ولولا القيروان و ساكنوها لغاب طعامهم و المخ رير

وليس لنا كما لهم حصون ولا جبل أعاليه وعور

ولا سور أحاط بنا ولكن لنا من حفظ رب العرش سور

ولا نأري إلى بحر وإنا إذا قضى القضا تنحى البحور

ولكنا إلى القرآن نأوي وفي إيماننا البيض الذكور

عقائق كالبوارق مرهفات — بها تحمي الحرائم و الثغور

وسمر في أعاليهن شهب — بها ظمأ مواردها النحور

وإنا بعد من خوف وأمن — نحب إذا تشعبت الأمور

رسول الله و الصديق حيا — به ترجى السعادة و الحبور

وبعدهما نحب القوم طرا — وما اختلفوا فربهم غفور

ألا بابي و خاصتي وأمي — محمد البشير لنا النذير

سأهدي ما حييت له ثناء — مع الركيان ينجد أو يغور

٤- **المعز لدين اللةى فاطمىو چوونه بۆ میسر:** بەوردی چاودێری کاروبارەکانی فەرمانڕەواو ئەمیرەکانی میسری دەکردو دڵی لێی دەدا بۆ دەستگرتن بەسەر میسردا، بەمردنی کافوری ئەخشیدیش ساڵی ٣٥٥ك دا بارودۆخی وڵای میسر تێکچوو، معزلدینیش ئەم هەلەی قۆستەوەو، بۆسە بڕیاری داو پلانی داناو دەستی دایە لێدانی بیرو بنیاتنانی کۆشك لەنێوان قەیرەوان‌و سنوری میسردا بۆ ئەم مەبەستەش سوپایەکی زۆری کۆکردەوەو پارەو سامانێکی زۆری پێکەوە ناو جەوهەر الصقلی بەسەرکردایەتی هێزەکانی دانا کە لەسەد هەزار زیاتر بوون، سوپای عوبەیدیەکان کەوتە ڕێ بۆ گواستنەوەی مەزهەبی باطنی بۆ میسر هەتاوەکو ڕزگاریان ببێت لەو قەیران‌و شۆڕش‌و ململانێ توندانەی کەزانایانی سوننە مەزهەب رابەرایەتیان دەکرد بەدرێژایی پێنج دەیەی یەك لەدوای یەك لەباکوری ئەفریقادا، بۆ ڕەتکردنەوەی باطنی‌و لەپێناوی ڕاگەیاندنی بیرو باوەڕەکانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتدا، معزالدینیش سودی وەرگرت لەلاوازی حوکمی ئەخشیدی کەسەر بەدەوڵەتی عەباسی بووو توانی تیری ژەهراوی خۆی بهاوێژێت، بۆیە سوپاکەی لەسەر خواستی هاوکارانی خستەڕێ بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی عەباسی، لەمانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ٣٨٥ك دا سوپاکەی توانی بەسەرکردایەتی جەوهەر الصقلی بەئاسانی میسر بخاتە سەر موڵکی فاطمیەکان، جەوهەر الصقلی ش ئەو کەسەیە کەئەزهەری بنیات ناوە لەساڵی ٣٦١ك هەتاوەکو لانکەیەك بێت بۆ پێگەیاندنی بانگخوازانی مەزهەبی ئیسماعیلی، هەر کە میسر کەوتە ژێر دەستی معز الدین فاطمی بەسوپاو خێزان‌و ماڵ‌و موڵك‌و خەڵکای دەورو بەریەوە باکوری ئەفریقای بەرەو میسر بەجێهێشت هەتاوەکو خۆی فەرمانڕەوایەتی بگرێتە ئەستۆو کاروباری باکوری ئەفریقاشی سپارد بەئەمیری صنهاجی بلكین بن زیری پاشان طرابلس‌و سرت‌و برقەشی لکاند بەمیسرەوە محەمەدی کوڕی هانی ئەندەلوسی شاعیریشی لەگەڵدا بوو کە ڕۆچوو ببوو لەستایش کردنی معزداو ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| فكأنما أنت النبي محمد | وكأنها أنصارك الأنصار |
| ماشئتُ أنت لا ماشاءت الأقدار | فاحكم فأنت الواحد القهار |
| هذا الذي تجدي شفاعته غداً | حقاً وتخمد أن تراه النار |

هەروەها دەربارەی موعز دەڵێ:

| | |
|---|---|
| النوار أنت وكل نورٍ ظلمة | والفوق أنت وكل فوق دون بيت شعير |

هەروەها سەرەتای گەشتی معزالدین بۆ میسر لەساڵی ٣٦٢ك دا بوو ئیبن هانییش لەبرقەدا کوژرا لەڕەجەبی ساڵی ٣٦٢ك لەتەمەنی چل‌و دوو ساڵیدا تەرمەکەشی وەکو سەگ فرێ درابوو لەکەنار دەریای برقەداو معزالدینیش زۆری بەداخ بوو بۆ کوژرانی‌و وتی: ئەم پیاوە ئومێدمان وابوو شانازی پێوە بکەین لەبەرامبەر شاعیرانی رۆژهەڵاتدا بەڵام بۆمان نەکرا[1]، ئەوەبوو معز الدین بەردەوام بوو لەگەشتەکەیدا هەتاوەکو گەیشتە سنوری‌میسرو چووە شاری ئەسکەندەریە لە٢٣ی شەعبانی ساڵی ٣٦٢ك چەند وەفدێکی زۆر لەناودارو سەرکردەو دادوەرەکانی پێشوازیان لێکرد، هەروەها دەسەڵاتی معزالدین لەسبتەوە لەرۆژئاواوە درێژدەبووەوە هەتاوەکو مەککە لەرۆژهەڵاتەوە هەروەها دانیشتوانی کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسیش بەفەرمانی ئەو جوڵانەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ‌و نیو لەمیسردا مایەوەوو لەحەوتی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٣٦٥ك لەقاهیرە کۆچی دوایی کردو دەسەڵاتی لەئەفریقادا سی‌و دوو ساڵی خایاند[2].

الذهبی دەڵێ: لەم کاتەدا شیعەگەری بەرەوی پێدراو لوتبەرزی گرتی لەمیسرو شام حیجازو لەرۆژئاوادا بەهۆی دەوڵەتی عوبەیدیەوەو لەعێراق‌و جەزیرەو وڵاتی عەجەم‌و بوەیهیەکاندا، هەروەها خەلیفە موطیع پلەو پایەکەی کەمی هەبوو لای بوەیهیەکان جەستەشی لاواز بوو بەهۆی ئیفلیج‌و لاڵ بوونیەوە بەم هۆیەشەوە لەسەر کار لایان برد الطائع للەی کوڕیان لەشوێنیدا داناو وتاریش بەناوی ئەوەوە بوو لەگەڵ چەند شتێکی تردا بەم شێوەیە شانشینی معز گەورەترو بەدەسەڵات تر بوو[3].

٥- **ئەمانی دەوڵەتی فاگمی لەباکوری ئەفریقادا:** هەندێ لەزانایانی مالیکی توانیان بگەنە دیوانی فەرمانڕەوایی لەدەوڵەتی صنهاجەدا کەسەر بەدەوڵەتی فاطمی بوو لەمیسرداو کاریگەرییان هەبوو لەسەر هەندێ لەوەزیرو ئەمیرەکانی کەرۆڵی باشیان هەبوو

---

[1] الفتح العربي في ليبيا، ل: ٣٦٣.

[2] الفتح العربي في ليبيا، ل: ٣٦٣.

[3] سير أعلام النبلاء (١٥/١١٣، ١١٤)

لەکەمکردنەوەی فشاری دەوڵەت لەسەر زانایانی ئەهلی سوننەتو زانا ئەبو الحسن الزجال توانی کار بکاتە سەر ئەمیر معزالدین بادیس صنهاجی بەپەروەردەکردنی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەت ئەم پەروەردەکردنەش کاتێ هاتە بەرهەم معز یفەرمانڕەوایەتی ئەفریقای گرتە دەست لەذی الحجەی ساڵی ٤٠٦ك دا. کاری زانا ئەبو الحسن یش بەنهێنی بوو بێ ئەوەی هیچ یەکێك لەشیعەکان پێی بزانێ، ئەم زانایەش پیاو چاکو خاوەن ڕەوشتو ئاینو بیروباوەڕ دروست بوو زۆر ڕقی لەمەزهەبی شیعەی باطنی بوو توانی ڕێنمایی ڕستو دروست لەدەرونو هزری معزی کوڕی بادیسدا بچێنێ کەدواتر لەسەر دەستی ئەو مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی لەباکوڕی ئەفریقادا لەناو براو، ذهبیش وەسفی معز کوڕی بادیسی کردووەو بەوەی کەپاشایەکی خاوەن سام ئازاو هیمەت بەرز ، زانست دۆستو بەخشندە بووە، شاعیران ستایشیان کردووەو مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفە لەئەفریقادا پەرەی سەندو ئەویش خەڵکی وڵاتەکەی پابەند کرد بەمەزهەبی مالیکیەوە بۆ نەهێشتنی ناکۆکی، وازی لەگوێڕایەڵی کردنی عوبەیدیەکان هێناو وتاری بەناوی القائم بأمر الله عەباسیەوە دەدا، مستنسریش نێردراوی ناردە لایو هەڕەشەی لێکرد بەڵام ئەو گوێی پێنەدا[1]، هەروەها وەڵامی ئەو وتارەی فاطمی دایەوە کە لەمیسردا هەڕەشەی لێکردبوو وتبوی: بۆچی شوێن پێی باوو باپیرانت هەڵناگریت لەگوێڕایەڵیو مل کەچ کردندا بۆمان، معزالدین بادیسیش وەڵامی دایەوەو وتی: باوکی تۆو باپیرانی من پاشای مەغریب بوون پێش ئەوەی هاوشێوەکانی تۆ ببنە خاوەنی، حەقی ئەوانە ببنە خزمەتکاری ئێمە[2]، هەروەها کتێبەکانی مێژوو بۆمان روون دەکەنەوە کەمعز بن بادیس بەشێوەیەکی پلە بەندی دوژمنایەتی شیعەو دەسەڵاتدارانی میسری کردووە ئەمەش لەساڵی ٤٣٥ك دەرکەوت کاتێ بنکەی سوپاو دیوانو دەوڵەتی فراوان کردو، هەستا بەئەنجامدانی چەند هەڵمەتێك بۆ پاککردنەوەی لەبیرو باوەڕە( باطني)ەکانو ڕێی نەدەدا جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بدرێت،و فەرمانی دا بەسەربازەکانیو خەڵکی بەگشتی کەهەستن بەکوشتنی هەر کەسێك کە جنێو بدات بە ئەبو بەکریو عومەر( خوا لێیان رازی بێت)، بەم شێوەیە خەڵکی دەستیان دایە لەناوبردنی پاشماوەی عوبەیدیەکان لەباکوڕی ئەفریقادا هەتاوەکو باکوڕی ئەفریقیا لەبیرو بۆچونە خراپو نامۆکانیان پاك بکاتەوە، زانایانیش ستایشی ئەم کارەیان کرد کەمعز بن بادیس

[1] هەمان سەرچاوە، (١٨/١٤٠).

[2] تأريخ الفتح العربي في ليبيا، لطاهر الزاوي، ل: ٣٨٩

سەرپەرشتی دەکردو شاعیرەکان شیعریان لەستایشیدا دەوت‌و قاسمی کوڕی مەروان دەربارەی ئەم رووداوانە دەڵێت:

وسوف يقتلون بكل أرضٍ          كما قتلوا بأرض القيروان

شاعیرێکی تریش دەڵێت:

يامعزالدين عش في رفعة          وسرور وأغتباط وجذل
أت أرضيت النبي المصطفى          وعتيقاً في الملاعين السفل
وجعلت القتل فيهم سنة          بأقاصي الأرض في كل الدول[1]

هەروەها معزی کوڕی بادیس بەردەوام بوو لەنزیکبوونەوە لەخەڵك‌و زانایان‌و مامۆستایانی ئەهلی سوننەت‌و بەردەوام بوو لەپلانەکەیدا بۆدابڕانی تەواو لەعوبەیدیەکان لەمیسردا، بۆیە مەزهەبی مالیکی کردە مەزهەبی سەرەکی لەدەوڵەتەکەیداو پەیوەندی کرد بەخیلافەتی عەباسیەوەو ئالاکەی گۆڕی بۆ ئالای عەبباسیەکان‌و دروشمەکانیانی بەرزکردەوەو ئالای (فاطمي)یەکانی سوتاند، هەروەها فەرمانی دا بەهەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکردن بەدینارو درهەمی عوبەیدیەکان کەناوی خۆیانی پێوە بوو خەڵکی ١٤٥ ساڵ بوو مامەڵەیان پێوە دەکردو فەرمانی دا بەلێدانی سکەو دراوێکی نوێ کە لەدیوێکی نووسی: لاالـه الا اللـه محمد رسول اللـهو لەدیوەکەی تریشی نوسی(وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) (آل عمران: ٨٥) هەروەها معزی کوڕی بادیس سەرجەم ئەو مەزهەبانەی لەناو برد کە دژ بەمەزهەبی سوننە بوون وەك صفریەکان‌و نکاریەکان‌و موعتەزیلەکان‌و ئیباضیەکان، لەساڵی ٤٤٣ك یشدا برقە هەمووی چووە پاڵ معزی کوڕی بادیس کاتێ جبارەی کوڕی مختار گوێڕایەڵی خۆی پیشاندا بۆی‌و یەکەم کەسێکیش کە سەرکردایەتی شاڵاوی پاکسازی دژی شیعەی ئیسماعیلی لەطرابلسدا کردو رووبەرووی داب‌و نەریتە ناڕەواکانیان‌و بانگەوازە گومڕاکەیان وەستا زانانی علاّمە عەلی کوڕی محمەد المنتصر بوو کە بەباوکی حسن ناسراو بوو لەساڵی ٤٣٣ك کۆچی دوایی کرد[2].

٦- **هەوڵەکانی سلجوقیەکان بۆ پاراستنی عێراق لەشیعە گەری باطني:** دەوڵەتی فاطمی هەوڵی دەست بەسەراگرتنی عێراق‌و رۆژهەلاتی دەدا بۆیە هەستا بەناردنی بانگخواز بۆی، ئەوەو بوو خەلیفە فاطمیەکان هەوڵەکانیان درێژە پێدا بۆ بلاوکردنەوەی بانگەواەکەیان بەسود وەرگرتن لەو پشێویەی کە عێراقی گرتەوە، بۆ ئەمەش خەلیفەی فاطمی الظاهر لإعزالدين اللـه

---

[1] هەمان سەرچاوە، ٢٨٩.

[2] تأريخ الفتح العربي في ليبيا، لطاهر الزاوي، ل: ٢٨٩.

بانگخوازانی خۆی نارد بۆ بەغدا لەساڵی ٤٣٥ك دا، خەڵکێکی زۆر بەدەم بانگەوازەکەیانەوە هاتو چالاکی بانگخوازانیان لەولاتانی رۆژهەلاتی ئیسلامیدا پەرەی سەند لەسەردەمی المستنصر باللەی فاطمیدا پاشان داوای لەبانگخوازانی کرد کەکۆچ بکەن بۆ ولاتی فارسو خۆراسانو ئەو بەری دەریا، لەبەناوبانگترین بانگخوازو فەیلەسوفەکانی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلیش المؤید في الدین هبة اللەی شیرازی بوو کەجار جار بە مؤید دەناسرا، ئەم بانگخوازە سەرکەوتوو بوو لەکاریگەری دانان لەسەر بەساسیری کە یەکێك بوو لەسەرکردە سەربازیەکانی دەوڵەتی عەباسیو ئەم سەرکردەیەش توانی خەلیفە قائم بأمر الله لەسەر کار لابداتو دەستبگرێت بەسەر بەغداداو وتاری بەناوی فاطمیەکانەوە دەداو دەوڵەتی عەباسی لەبەغدا دابڕیو خەلیفەی وەدەرنا بۆ ئەنبار و لەحەدیثە زیندانی کرد لای مهارشی کوڕی مجلی عقیلی کە فەرمانڕەوای حدیثە بوو ئەویش کەیەکێك بو لەناودارانی بنی عقیل خۆی هەستا بەخزمەتکردنی، لەسەردەمی مستنصریشدا چل هەینی وتار بەناوی فاطمیەکانەوە دەخوێندرایەوە[1]. هەروەها بساسیری هەوڵی دا ئەو رێککەوتنە هەڵوەشێنێتەوە کە لەگەڵ قریشی کوڕی بەدراندا مۆری کردبو سورش بوو لەسەر کۆچپێکردنی خەلیفەی عەباسی بۆ میسر بەلام قوڕەیش دژی ئەم هەوڵە وەستاو داوای لە ئەمیر محی الدینی کوڕی مهارشی عقیلی ئامۆزای کرد (فەرمانڕەوایی حدیثە) کەخەلیفە بپارێزیو ژیانی مسۆگەر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا بساسیری رێی نەدا خەلیفە القائم بأمر الله بڕوات بۆ حدیثە هەتاوەکو دانپێدانانێکی پێ نووسی کە مافی فەرمانڕەوایەتیو خیلافەت لەنەوەکانی عەباس دەستێنێتەوە هەتاوەکو نەوەی فاطمة زهراء مابێت[2]، هەروەها بساسیری بەمەش وازی نەهێنا بەڵکو دەستی گرت بەسەر جلو بەرگو مێزەری خەلیفەدا[3]. و ناردی بۆ خەلیفە مستنسر باللە فاطمی، هەروەها بساسیری پێشتر دەستی دابوویە بەکارهێنانی کۆمەڵێ خەڵکی سادەو چەکی پێدابوون لەگەڵ کۆمەڵی خەڵکی بێکاردا تەماعی خستە بەریان بۆ تالانکردنی کۆشکی خەلیفایەتیو خەڵکی کەرخ(کە شیعە بوون)ماڵەکانی خەڵکانی سوننە مەزهەبیان لەباب البصرە تالان کردو ماڵی قاضی القضاة گەورەی دادوەران (الدمغانی)ش تالان کراو حی علی خیر العمل یان گێڕایەوە بۆ بانگو لەهەموو مزگەوتەکاندا بەو شێوەیە بانگ دەدرا لەجومعەو نوێژەکانی جەماعەتدا، هەروەها وتار بەناوی خەلیفەی فاطمیەوەدەخوێنرایەوەو زۆربەی تۆمارگەو

---

[1] تأريخ الفتح العربي، ل:٣٩٠، ٣٩١.

[2] الدولة السلاجقة للصّلّابي، ل:٥٤.

[3] أخبار الدول المنقطعة (٣/٤٣٠).

کتێبه بەسودەکان لەناو بران‌و دراویان بەناوی فاطمیەکانەوە لەئاڵتون‌و زیو لێداو، کۆشکی خەلیفە گەمارۆ دراو سەرۆکەکان أبو القاسم ی کوڕی مسلمه دەست گیر کرا.

بساسیریش سەرزەنشتی توندی کردو پاشان لێدانێکی زۆریان کردو سوکایەتی زۆریان پێکردو پاشان خەڵکی ماڵی خیلافەتیان تاڵان کردو ڕێژەیەکی لەژمارە نەهاتوی گەوهەرو شتی بەنرخ ئاوریشم‌و کەل‌و پەل‌و جل‌و بەرگیان تیادا برد هەروەها لەڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ٤٥٠ك بساسیری قوماشی سپی کردە بەرو وتار بێژو بانگوێژەکان‌و خۆی‌و هاوڵەکانیشی هەمان پوشاکیان پۆشی‌و پەرچەمی مستنصری‌و ڕمی میسریشی بەسەرەوە بوو، پاشان وتاری بەناوی مستنصری فەرمانڕەوای میسرەوە خوێندەوە، شیعەکانیش لەوپەڕی خۆشحاڵیدا بوون بەوەی کە حی علی خیر العمل یان لەسەرانسەری عێاقدا دەبیست، هەورەها بساسیری تۆڵەیەکی توندی لەخەڵکی بەغدا کردەوەو هەرکەسێ نەیاری بووایە دەیخستە دەریاوەو رزقو ڕۆزی‌و بەخشینی فراوانیشی دەدا بەدۆست‌و هەوادارانی، ڕۆژی دوو شەممە بەرواری ٢٨ی ذی الحجه وەزیر أبو القاسمی کوڕی مسلمەیان هێنا کەنازناوی سەرۆکی وەزیرانی لێنرا بوو جبەیەکی خوری‌و قاپوتێکی لەباری سوری لەبەردا بوو ملوانکەیەکی چەرمی بەگەردنەوە بوو، سواری وشترێکیان کردو[1] بەشارا گێڕایان‌و لەدواشیەوە کەسێك هەبوو بەپارچە چەرمێك لێیدەدا کاتێ لەکەرخ پەڕییەوە هەندێ شتی پیسیان کرد بەسەریداو تفیان تێکردو جنێوو نەفرەتیان ئاراستە کرد، ئەمەش نەریتی هەمیشەییانە کاتێك خەڵکانی نەیاریان بەردەست دەکەوێت لەهەموو کات‌و ساتێکدا، پاشان بەرامبەر بەکۆشکی خەلیفایەتی وەستاندیان‌و ئەمیش ئایەتی: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (آل عمران ٢٦) واتە ئەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار، بڵێ خوایە تۆ خاوەن هەموو شتێکیت، دەسەڵات دەبەخشیت بەهەر کەسێك بتەوێت‌و دەسەڵات وەردەگریتەوە لەهەر کەسێك بتەوێت، هەر کەس بتەوێت باڵا دەستی دەکەیت‌و، هەر کەسێکیش بتەوێت زەلیل‌و بێدەسەڵات‌و ژێردەستی دەکەیت هەرچی خێر هەیە هەر بەدەست تۆیە ، بێگومان تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێکدا. (تەفسیری ئاسان ل: ٥٣).

پاشان پێستی گامێشیان لەبەر کرد بەشاخەکانیەوەو دوو قولاپیان نا لەچەناگەی‌و بەتەختەیەکەوە بەرزیان کردەوەو تا ئێوارە خۆی رادەتەکاند هەتاوەکو گیانی لەدەستدا ڕەحمەتی

---

[1] البدایە والنهایە، (١٥/ ٧٥٩).

خوای‌لێبێت، دوا قسەشی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەخۆشی ژیاندمی‌و بەشەهیدی مراندمی[1]، لەتایبەتمەندیەکانی کەسایەتی شیعەی باطنی کە بەدرێژایی مێژوو سەلمێنراوە پەیڕەو کردنی شێوازی سەرکزی‌و هەژاری‌و نەرم‌و نیانی لەکاتی لاوازیدا بەڵام هەرکە هەستیان بەدەسەڵاتداری کرد ئەوە خراپترین جۆری ستەم‌و تاڵان‌و لێدان‌و تۆڵە سەندنەوە بەکاردەهێنن، لەو کاتەشدا طغرل بەگی سوڵتانی سەلجۆقی کە بوەیهیەکانی راماڵی لەدەرەوەی عێراق بوو بەسوپایەکەوە دژی یاخی بووەکان دەجەنگاو دەسەڵاتی دەوڵەتەکەی دەسەپاند، کاتێ لەو کارە بوویەوە بەسوپاکەیەوە گەڕایەوە بۆ بەغداو خەلیفەی عەباسی گەڕاندەوە بۆ خیلافەت دوای رزگار کردنی لەدیلی‌و توانیشی بساسیری راوەدوو بنێت‌و بیکوژێت، پاشان عێراق دووبارە گەڕایەوە بۆ خیلافەتی عەباسی سوننی‌و ئەم رووداوە مێژووییانەشم لەکتێبەکەمدا (الدولة السلاجقة والمشروع الإسلامي لمقاومة التغلغل الباطني والغزو الصليبي)دا باس کردووە، سلجوقیەکان لەو مەترسیانە دەگەیشتن کە رووبەروویان دەبێتەوە لەپشت بانگەوازی فاطمیەوە لەوڵاتەکانی خیلافەتی عەباسیدا، بۆیە سیاسەتێکی دانایانەیان بەکار هێنا پاش ئەوەی جڵەوی دەسەڵاتیان لەبەغدادا گرتە دەست کەخۆی لەدژایەتیکردنی بانگەوازی فاطمی‌و بانگخوازانیاندا[2] دەبینیەوە بەتوندی‌و لێبڕانەوە، ئەوە بوو بەدوای بانگخوازانیاندا دەگەڕان بەتایبەت ئەوانەیان کە لە وڵاتی فارسدا ئەو بانگەوازەیان بڵاو کردەوە هەروەها هەستیان بەدوور خستنەوەی فەرمانبەرە شیعەکانی سەر بەمەزهەبی ئیسماعیلی لەدیوانەکانی حکومەت‌و پیشە ئاینییەکان‌و سوننەکانیان لەشوێنی ئەواندا دادەمەزراند[3].

**٧- خوێندنگە یاسایەکان‌و رۆڵیان لەراپوونی سوننی‌و بەرپەرچدانەوەی هزری شیعەدا:**

بیرکردنەوەی جددی لەدامەزراندنی ئەم خوێندنگە یاسایانە بۆ رووبەڕوبوونەوەی هەڵکشانی شیعەی ئیمامی ئیسماعلی پاش چوونە سەر تەختی سوڵتان ئەلب ئەرسەلانی سەلجوقی لەساڵی ٤٥٥ك دا بوو، ئەم سوڵتانە پیاوێکی بەتواناو دڵگەرمی سوننی دانا کە حەسەنی کوڕی عەلی ئیسحاقی طوسی بوو کەنازناوی نظام الملک‌ی لێنرابوو ئەم وەزیرە پێی وابوو تەنها رووبەڕووی سیاسی بەس نییە لەبەرامبەر شیعەی ئیمامی ئیسماعیلیدا ئەم کارە بەتەنها سەرکەوتوو نابێت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ئەگەر شان بەشانی ئەم بەرگریە بەرگری هزرو بیریش هەنگاو نەنێت، چونکە شیعەی ئیمامی بن یان ئیسماعیلی لەم کاتەدا چالاکانە کاریان دەکرد بۆ مەزهەبەکەیان بەشێوازی فیکری جۆراو جۆر ئەم چاکییە فیکریەش تەنها

---

[1] الدولة السلاجقة للصَّلاّبي، ل:٨٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٦٨.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٦٨.

بەچالاكی سوننی هاوشێوە سەركەوتوو دەبێت كە بەبەڵگەوە رووبەڕووی دەبێتەوە[1]، ئەوەبوو دەوڵەتی فاطمی هەڵدەستا بەئامادەكردنی بانگخواز لەرێی زانكۆی ئەزهەرەوە كە كردبوویانە دەزگایەكی فێركاری تایبەتمەند بۆ بڵاوكردنەوەی مەزهەبەكەیان لەساڵی ٣٧٨ك دا[2]. ئەمە سەرباری بەرنامە فێركاریەكان كە بەشێوەیەكی تایبەت ئامادەكرا لەپایتەختی دەوڵەتی فاطمی دا بۆ ئامادەكردنی بانگخوازان‌و رۆشنبیركردنیان بەرۆشنبیرییەكی مەزهەبی فراوان پێش ناردنیان بۆ وڵاتە ئیسلامیەكان بۆ بڵاوكردنەوەی مەزهەبی ئیسماعیلی، ئەمەش كاریگەری هەبوو لەبرەو دان بەم مەزهەبە لەهەندێ لەناوچەكانی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دەرئەنجامی ئەم هەوڵە رێكخراوو بەردەوامانە بۆ بڵاوكردنەوەی ئەم بانگەوازە[3]، لەبەر هەموو ئەمانە نظام الملك بیری لەبەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی شیعە كردەوە بەهەمان ئەو شێوازەی كە پێی بڵاو دەبێتەوە. ئەمەش مانای وایە كەئەو پێی وابوو دەبێ لەپاڵ بەرگری سیاسیدا بەرگری فیكریش هەبێت[4]، ئوممەت لەسەر قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر (د.خ)و بیرو باوەڕێ ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت كە لەسروشەوە –وحي–وەرگیراوە پەروەردە بكرێت، لێرەشەوە بیری لەكردنەوەی خوێندنگەی یاسایی كردەوە كە لەمێژووشدا دراوەتە پاڵی، چونكە ئەو لێبڕا بۆ دامەزراندنی‌و دانانی نەخشەو پلان بۆی‌و ماڵی زۆری بۆ وەقف كردو مامۆستای باش‌و لێهاتووی بۆ دانا بۆ یەكارێكی سروشتی بوو كەبەناوی ئەوەوە بێت لەناو سەلجوقیەكاندا[5]، خوای گەورەش نظام الملك كۆمەك كرد بەشێوەیەك كە هاوشێوەی كەمە لەمێژووی سیاسی‌و زانستی‌و ئاینیدا، ئەوە بوو خوێندنگەكانی ماوەیەكی دوورو درێژ بەردەوام بوون بەتایبەت خوێندنگەی بەغدا كەنزیكەی چوار سەدە بەردەوام بوو، دوایەمین كەسێكیش كەناسیبێتمان لەوانەی كەتیایدا خوێندوویانە فەیروز ئابادی‌خاوەنی قاموسی (المحیط)ە كەلەساڵی ٨١٧ك كۆچی دوایی كردووە، چونكە ئەم خوێندنگانە لەكۆتایی سەدەی نۆی كۆچیدا كۆتاییان پێهات[6]، بۆ ماوەیەكی زۆر پەیامی خۆی گەیاند لەدەرچاندنی زانایان لەسەر مەزهەبی سوننی شافعی بەتایبەت لەبوارەكانی قەزاو حسبە(چاودێری‌و

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٩١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٩١.

[3] التأریخ السیاسی والفكری، ل: ١٧٩.

[4] التأریخ السیاسی والفكری، ل: ١٧٩.

[5] التأریخ السیاسی والفكری، ل: ١٧٩.

[6] نظام الملك، ل: ٤٠١.

فتوادان)دا کەگرنگترین وەزیفە بوون لەو سەردەمەدا، پاشان ئەوانە بەجیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوونەوەو سنوری دەوڵەتی فاطمی باطنی یان لەمیسردا بەزاندو گەیشتنە باکوری ئەفریقاو پشتیوانی کۆمەکی ئامادەیی سوننەیان کرد لەوناوچەیەدا، لەم خوێندگانەش نەوەیەك دەرچوو کەزۆربەی ئەو ئامانجانەی بەدیهێنا کە نظام الملك داینابوو و زۆربەی دەرچوانیان کۆچیان دەکرد بۆ ناوچەکانی تر هەتاکو هەستن بەوتنەوەی فیقهی شافعیو فەرموودەی پیرۆزو بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت لەو شارانەدا کەبۆی چوون یاخود ئەنجوومەنی قەزاوو فتوای تیادا بگرنە ئەستۆ ، یان هەندێ ئەرکی کارگێڕی گرنگیان پێبسپێردرێت لەدیوانەکانی دەوڵەتدا، السبکی لە ئەبی ئیسحاقی شیرازیەوە دەگێڕێتەوە کەیەکەم مامۆستای خوێندنگەی نیزامی بەغدا بووە دەڵێت: لەچوونمدا بۆ خۆراسان بەهەر گووندو شارێك گەشتبم ئەوە دادوەرەکەی یان موفتیەکەی یاخود وتار بێژەکەی قوتابی یان هاوڕێم بووە[1]، ئەم خوێندنگانەش رۆڵیان هەبووە لەگێڕانەوەی رۆڵی رێبازی سوننە بەشێوەیەکی بەهێز بۆ ناو ژیانی ئوممەت، هەروەها کاریگەری دیاری هەبوو لەسەر تەسککردنەوەی رۆڵی شیعە بەتایبەت کاتێ بڵاوکراوەکانیان دژ بەمەزهەبی شیعە دەرکەوتو پێشەوا غەزالیش لەپێشەوەی ئەو بیریارانەدا بوو کەجەنگێکی بێپەروایان دژ بەشیعە راگەیاند[2]. ئەم خوێندنگا یاسایانەش بەکەلەپوورو زانایانو پیاوانیەوە رێخۆشکەر بوون بۆ نورەدین زەنکیو ئەیوبیەکان هەتاوەکو بەو ئامانجانە بگەن کەئەو خوێدنگایانە لەپێناویدا دانران کەبریتی بوو لەکارکردن بۆ باڵادەست بوونی ئیسلامی راستو دروست لەو شوێنانەی کەشیعە تیایدا لایەنگری هەبوو لەو کاتەدا وەك میسرو شام[3].

لەو مەترسییە گەورانەش کە ئەمرۆ رووبەرووی ئوممەت دەبێتەوە ئەو پرۆژە باطنیە نوێیەیە کەچالاکانە لەهەموو جیهاندا کاردەکاتو قورئانو سوننەت بیروباوەڕی ئومەتو مێژوو پیاوە مەزنەکانی کردۆتە ئامانج، جا ئایا ئێمە پەند لەو وانانە وەردەگرینو کار بەسوننەتو یاسا خواییەکان دەکەین لەبانگەواز کردنماندا بۆ ئاینی راستو دروست کەمحەمەد (ﷺ) لای خواوە هێناویەتی، هەتاوەکو فەرمانڕەواکانمان هاوشێوەی ئەلب ئەرسەلانیان تیادا هەڵکەوێ لەئازایەتیداو لەوەزیرەکانیشماندا وەك نظام الملك پەیدا ببێت لەهیمەتو لێبڕانداو لەناو زانایانیشماندا هاوشێوەی جوینیو غەزالیو بەغەویو گەیلانیو زانا پایەبەرزەکانی مەغریب هەڵکەوێ

---

[1] طبقات الشافعية(٣/٨٩).

[2] الدولة السلاجقة والمشروع الأسلامي لمقاومة التغلغل الباطني والغزو الصليبي، ل:٢٠٣.

[3] هەمان سەرچاوە،ل: ٣٠٤.

لەداكۆكیكردنیاندا لەقورئان و سوننەت و هاوەڵان و مەسەلەكانی هزری ئیسلامی راستەقینەو هەروەها دەبێ هۆكارە نوێكان بخەینە گەڕ بۆ بڵاوكردنەوەی بیرو باوەڕە ڕاست و دروستەكانی ئیسلام و مێژوی باوەڕپێكراوو هزری ڕەنگینی لەڕێی كەناڵە ئاسمانیەكان و ئینتەرنێت و چاپخانەو گۆڤارو ڕۆژنامەو كتێب و كۆڕو كۆبوونەوەو كۆنگرەو پرۆگرام و قوتابخانەو زانكۆكان و هۆكارەكانی بانگەوازكردن بەهەموو جۆرەكانیەوە، مەبەستیشمان لەمەدا رەزامەندی پەروەردگاو رۆژی دوایی و هاوڕێیەتی پێغەمبەران و پیاو چاكان و ڕاستگۆیان و شەهیدان بێت.

٨- **هەوڵەكانی پێشەوا غەزالی بۆ تێكشاندنی شیعەی باطنی:** یەكێك لەبەرهەمەكانی خوێندنگە نیزامیەكان ئەوە بوو كە ڕێخۆشكەر بوون بۆ باڵادەست بووونی مەزهەبی سوننی، ئەم مەسەلەیەش بەو ئاسانیە بەدەست نەهات بەڵكو دەرئەنجامی چەندین هەوڵی بێوچان و قوربانیدانی زۆرو یەكخستنی تواناكان بوو، لەدیارترین دەرئەنجامەكانیشی كەمبونەوەی هەژمونی بیری شیعە بوو بەتایبەت دوای ئەوەی چەندین نووسراوی دژ بەشیعە لەم خوێندگانەوە دەرچوون، پێشەوا غەزالیش لەپێشەوەی ئەو بیریارانەدایە كەجەنگێكی توونديان دژ بەشیعەی باطنی بەرپا كردو وەك خۆی دەڵێت: چەند كتێبێكی لەو بارەیەوە داناوە لەوانە: فضائح الباطنية، كە لەلایەن خەلیفە مستظهرەوە داوای نووسینی لێكرابوو لە٤٨٧ك دا[1]، بەڵام ئەوەی كەجێی سەرسوڕمانە ئازایەتی غەزالی بوو لەهەڵمەتەكەیدا دژ بەئیسماعیلی باطنیەكان، ئەمە لەكاتێكدا بوو كەبانگخوازانیان لەوڵاتی فارسدا بڵاوبوونەوەو مەترسیان پەرەی سەند تا ئەو رادەیەی كەهەستان بەدروستكردنی قەڵاو شوراو هەڕەشەیان لەئاسایش و ئارامی خەڵك دەكردو هەستان بەتیرۆركردنی خەڵك بەشێوەیەكی بەرفراوان، ئەم تیرۆركردنەش زۆرێك لەسیاسی و بیریارەكانی گرتەوەو لەسەرو هەموشیانەوە خودی نظام الملك، غەزالیش هەستا بەم هەڵمەتە لەسەر خواستی دەسەڵات لەگەڵ ئارەزووی غەزالی زانای سوننی مەزهەب بۆ بەرگریكردن لەئیسلامی ڕاستەقینە[2]، ئەمەش شتێكی جوانە كاتێك هەوڵەكانی دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ زانایاندا یەكدەگرێتەوە لەبەدیهێنانی ئامانجەكانی ئیسلامدا لەڕێی چەند دەزگایەكی بەسوودەوە بۆ كۆمەڵگەو دەوڵەت، وەك ئەوەی كەخوێندنگە یاساییەكان پێی هەستان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هزرو هەژمونی شیعەی باطنی، ئەوە بوو دەوڵەتی فاطمی بەهۆی فەلسەفەو بیروباوەڕی باطنیەوە خۆی بەهێز

---

[1] الدولة السلاجقة للصّلابي، ل:٣٨٠.

[2] رجال الفكر والدعوة(٣٠٤/١) الغزالي للقرضاوي، ل: ٥٧.

دەکردو لەبەرگی ئاینی سیاسیدا خۆی دەردەخست، بەم پێیەش مەترسی لەفەلسەفە زیاتر بوو بۆ ئیسلام وەك مامۆستا نەدەوی دەڵێت: چونکە فەلسەفە لەکۆشکێکی بەرزدا دەژیاو دوور بوو لەخەڵكو جەماوەر[1]، بەڵام (باطني)یەکان دزەیان دەکردە کۆمەڵگەو ژەهری خۆیان پیادا دەپژاند،و پاداشتی ماددی گەورەی بۆ تەرخانکرا بوو، لەجیهانی ئیسلامیشدا لەکۆتایی سەدەی پێنجەمدا کەسێك نەبوو وەك غەزالی شیاو بێت بۆ وەڵامدانەوە دۆزینەوەی نهێنیەکانو هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی کە بیرۆکەکانیانی لەسەر بنیات دەنێن، نوسینەکانی غەزالیش کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبوو لەبواری وەڵامدانەوەی باطنیەکانداو توانی بەهۆی هزری بەهێزو ئەو ناوبانگەی کەبەدەستی هێنابوو زانستە شەرعیو عەقڵیەکان لەفەلسەفەو لۆژیكو بیروباوەڕ بخاتە گەڕ بۆ هەڵتەکاندنی رەگو ریشەی مەزهەبی باطنیو ئەو وتە بەناوبانگەی دەربارە وتن کەوەك پەندی لێهاتووەو دەڵێت: بەرواڵەت رەفز دەکەنو لەناوەڕۆکیشدا کوفری تەواو، مەبەستی لەرەفز رەفزکردنی خیلافەتی ئەبو بەکرو عومەرە(رضي الله عنه) ئەوان لەژێر پەردەی شیعەدا خۆیان حەشارداوەو شیعەش نین، بەڵکو ئەوە دەمامکێکە لەپشتیەوە پلانەکانیان دەشارنەوە بۆ لێدانی ئیسلام، لەو کارە باشانەش کە بۆ غەزالی دەژمێردرێت:بەردەوامبوونی لەسەر رەخنەگرتن لەم کۆمەڵەو پەردە لادان لەسەر بیروبۆچوونە پێچەوانەو دژەکانیانو کردەوەو نیەتە خراپەکانیان، لەکاتێکدا لەو سەردەمەدا وانراو بوو کە لەوانەیە ئەوە رەخنەگرتنە ببێتە هۆی کوشتنی، بەتایبەت کە بەچاوی خۆی کوژرانی پیاوی گەورەی دەوڵەت نظام الملك ی بینیبوو، هەروەها شیعەی باطنی هەڕەشەیان لەهەر تاکێك دەکرد کەبە مەترسییان بزانیایە بۆ سەر خۆیان چ لەپیاوانی دەسەڵاتدار بوایە یاخود لەمامۆستایانی ئاینی ئەمەشیان بەکوشتنو ژەهر دەرخواردان پیادە دەکرد یان بەچەندین شێوازیتر کە بەباشی شارەزای بوو بوونو بەوردی پیادەیان دەکرد، ئەمەش ئەگەر بەڵگە بێ لەسەر شتێك ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئازایەتی غەزالی بۆ وتنی راستی و رووبەڕووبوونەوەی ناڕەوایی، بەهەر نرخێك بێت چونکە هیچ شتێکی تووش نابێت کە خوا لەسەری نەنوسیبێت[2]. ئەمەش وانەو بیر خستنەوەیەکە بۆ زانایانی هاوچەرخ کە راستگۆ بن لەگەڵ پەروەردگاردا لەرووبەڕووبوونەوەی باطنیە نوێکاندا، چونکە من هەندێ بەناو زانام دیوە کە لێیان دەترسنو لەخەمی کوشتن یان تیرۆرکردن یان تۆمەتی تائیفیان هەیە،

---

[1] الجهاد من الهجرة الى الدعوة والدولة، ل: ١٤٧.

[2] الأمام الغزالي بين مارحيه وناقديه، ل: ٦٢.

هەندێکیشیان کەوتوونەتە ژێر دەرزی بێهۆشکردنی باطنیو چەند روپامایییەك کە هیچ قورساییەکی نییەلەترازووی شەرعدا، یاخود چەند حسابێکی دونیایی کورت خایەن، بۆیە دەست بەرداریان بوون هەتاوەکو یاری بەبیروباوەرو پیرۆزییەکانی ئوممەتەوە بکەنو هەندێ لەزانایانی ئومەتیش رۆڵیان هەبووە لەبێ هۆشکردنی جەماوەرێکی بەرفراوان لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانن ئەوانە چەندە مەترسییان هەیە بۆ بیروباوەڕو رەوشتی ئوممەت، ئایا ئەو زانایانە لەو رۆژەدا ناترسن کەدڵو چاوەکان تیایدا دەلەرزنو خوای گەورە پرسیار لەراستگۆییان دەکات دەربارەی راستگۆیان.

### دووەم: هەڵمەتە سەربازییەکانی نورەدین بۆ سەر میسر:

وەزیری فاطمی ئیبن السلاری سوننی مەزهەب هەستا بەهەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن بەنوورەدینەوە لەپێناو ئەنجامدانی چەند هێرشێکی سەربازی هاوبەش لەسەر بنەمای پێشرەویکردنی نورەدین لەباکورەوەو کەشتیگەلی فاطمیش هەستێت بەهێرشکردنە سەر شارە کەناریيەکانی خاچپەرستان، ئەوە بوو ئوسامەی کوڕی منقذ بووە ناوبژیوان لەنێوان هەردوو لاداو ئیبن السلاریش پێشنیاری بۆ کرد کەپارەو دیارییەکان بەرێت بۆ سوڵتانی حەلەبو هەستێ بەهێرشکردنە سەر طبریە، لەهەمانکاتیشدا کەشتیگەلی فاطمی هەڵدەستێت بەهێرشکردنە سەر غەززە، لەحاڵەتی رازیبوونی نورەدین بەمە ئیبن منقذ پارەی پێشکەش دەکات بۆ یارمەتیدانی، ئەگەر رازیش نەبوو ئەوە لەسەر ئەمەی دواییە کە بەو پارەیە کۆمەڵە سوارێك بخاتە ڕێ بۆ جەنگ کردن دژی خاچپەرستان لەنزیك عەسقەلان، بەڵام ئەو کاتێ گەیشتە بُصریو چاوی بەنورەدین کەوت رادەی سەرقاڵبوونی بەدیمەشقەوە بۆ روونکردەوە کە بەربەستێکی تۆکمەیەو رێگرە لەهاوکاری هاوبەش لەگەڵ فاطمیەکاندا، چونکە لەو کاتەدا هێشتا دەستی بەسەردا نەگرتبوو[1].

تێبینی ئەوەش دەکرێت کە ئیبن السلار بەردەوام بوو لە ململانێیدا لەگەڵ خاچپەرستەکاندا بۆیە لەساڵی ٥٤٦ك/١١٥١ز کەشتیگەلێکی ئامادەکرد کەپارەیەکی زۆری تیادا سەرفکردبوو و هێرشی پێکردە سەر شارە کەناریەکانی خاچپەرستەکانو بەئامانجی خۆی گەیشت، ذەهبیش باسی ئیبن سەلار دەکاتو دەڵێت: پاڵەوانێکی ئازا بوو، دەستپێشخەرو سامدارو شافیعیو سوننی بوو، لەسەر ئاینی عوبەیدیەکان نەبوو، لەگەڵ السِّلفی دا ئاهەنگی گێڕاو خوێندنگەیەکی بۆ کردەوە بەڵام ستەمو ناحەقی تیا بوو[2]، هەروەها ئەو هەوڵانەی پێشوو لەسەردەمی وەزارەتی الطلائع ئیبن روزەیك

---

[1] فن الصراع الأسلامي الصليبي، ل: ٨٣.

[2] اتعاظ الحنفاء (٣/٣٠٣).

دووباره بوویەوە کە پەیوەندی بەنوورەدین محموودەوە کرد لەڕێگەی ئوسامەی کوڕی منفذەوە بەڵام نورەدین پەلەی نەکردو پێی وابوو کە هێشتا بارودۆخ لەبار نییە، هەروەها لەنێوان ئوسامی کوڕی منفذو پاشای سالح ئەبو الغارات طلائع ی کوڕی روزەیك شەڕە شیعر هەبووە لەو شیعرانەش کە طلائع کوڕی رزيك وتی:

فقولوا لنورالدين لا فُل حدُّه　　ولا حكمت فيه الليالي الغواشم

تجهز الى أرض العدوِّ ولا تهن　　وتُظهر فتوراً إن مضت منك حارم[1]

هەروەها لەو شیعرانەش ئەم شیعرەی کە بۆ ئوسامەی کوڕی منفذی نووسی:

ياسيِّداً سيموا بهمَّته　　الى لرُّتب العليه

فينال منها حين يحرم　　غيرة أوفى مزيه

أتت الصديق وإن بعدت　　وصاحب الشيم الرضية

ننبيك أن جيوشنا　　فعلت فعال الجاهلية

سارت إلى الأعداء من　　أبطالها مئتا سرية

فتغير هذي بكرة　　وتعاود الأخرى عسية

فالوين منها للفرنج　　فقد لقوا جهد البلية

جاءت رؤوسهم تلوح　　على رؤوس السهمرية

وقلائع قد قسمت　　بين الجنود على السوية

وخلائق كثرت من　　الأسرى تقاد إلى المنية

فانهض فقد أنبيت مجد　　الدين بالحال الجلية

وألمم بنور الدين وأعلمه　　بهاتيك القضية

فهو الذي ما زال يخلص　　منه أفعالا ونية

ويبيد جمع الكفر بالبيض　　الرقاق المشرفية

فعساه ينهض نهضة　　يفني بها تلك البقية

إما لنصرة دينه　　أو ملكه أو للحمية

قل لابن منفذ الذي　　قد حاز في الفضل الكمالا

فلذلك قد أضحى الأنام　　على مكارمه عيالا

كم قد بعثنا نحوك　　الأشعار مسسرعة عجالا

---

[1] سير أعلام النبلاء (٣٨٣/٣٠).

وصددت عنها حين رامت — من محاسنك الوصالا
هلا بذلت لنا مقالا — حين لم تبذل فعالا
مع أننا نوليك صبرا — في المودة واحتمالا
ونبئك الأخبار إن — أصحت قصارا أو طوالا
سارت سراياك لقصد — الشام تعتسف الرمالا
تزجي إلى الأعداد — جرد الخيل أتباعا توالي
فلو أن نور الدين — يجعل فعالنا فيهم مثالا
ويسير الأجناد جهرا — كي ينازلهم نزالا
ووفى لنا ولأهل دولته — بما قد كان قالا
لرأيت للإفرنج طرا — في معاقلها اعتقالا
وتجهزوا للسير نحو — الغرب أو قصدوا الشمالا
وإذا أبى إلا اطراحا — للنصيحة و اعتزالا
عدنا بتسليم الأمور — لحكم خالقنا تعالى
يا أشرف اوزاراء أخلاقا — وأكرمهم فعالا
نبهت عبدا طالما — نبهته قدرا وحالا
وعتبته فأفلته — فخرا ومجدا لن ينالا
لكن ذاك العتب يشغل — في جوانحه اشتعالا
واشدد يديك بود — نور الدين والق به الرجالا
فهو المحامي عن بلاد — الشام جماعا أن تذالا
ومبيد أملاك الفرنج — وجمعهم حالا فحالا
ملك يتيع الدهر — والدنيا بدولته اختيالا
جمع الخلال الصالحات — فلم يدع منها جلالا
فإذا بدا للناظرين — رأت عيونهم الكمالا
فبقيتما للمسلمين — حميّ وللدنيا جمالا

هەروەها نورەدین نەچووە هاوپەیمانی سەربازییەوە لەگەڵ طلائع کوڕی روزەیکدا بەڵکو گرنگی دەدا بەپەیوەندیە دبلۆماسیەکان، ئەوەبوو باڵوێزێـک لەلایەن نورەدینەوە لەساڵی ٥٥٢ك/ ١١٥٧ز گەیشتو ئەم کارەش لەساڵی داهاتوودا دووبارە بوویەوە واتە ساڵی ٥٥٣ك/ ١١٥٨ز، وەڵامی

دەوڵەتی فاطمیش ئەوەبوو کە ئەو باڵوێزەی نورەدین گێڕدراوەتەوە بۆ وڵاتەکەی بەچەندین دیاریو چەکەوەکە بەسێ هەزار دینار مەزەندە دەکرێت پارەو سامانێکیش کە بەحەفتا هەزار مەزەندە دەکرا لەپێناو کۆمەکی کردنی ململانێی نورەدین دژ بە خاچپەرستەکان[1]، هەروەها نورەدین باڵوێزێکی تری لەساڵی ٥٥٤ك/ ١١٥٩ز ناردو لەلایەکی تریشەوە دەوڵەتی فاطمی هاوسۆزی خۆی بۆ دەربڕیو عاضد لەساڵی ٥٥٥ك/١١٦٠ز هێمای خۆی بۆ نارد لێکدانەوەی لۆژیکیانەش بۆ ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە(فاطمي)یەکان دوای ئەوەی عەسقەلانیان لەدەست دا لەساڵی ٥٤٨ك/١١٥٣ز بەتەواوی لەمەترسی خاچپەرستانو پێویستی سود وەرگرتن لەهێزی دەوڵەتی نورەدینو قورسایی سیاسیو سەربازی تێگەیشتن[2].

١- **پاڵنەرەکانی ئازادکردنی میسر لای نورەدین:** ئازادکردنی میسر گەورەترین دەستکەوتی نورەدین بوو رەحمەتی خوای لێبێت، ئەوە بوو توای دەوڵەتی فاطمی عوبەیدی بڕوخێنێت کە بۆ ماوەی دوو سەدە بەردەوام بوو لەسەر گەندەڵی سیاسیو تێکدانی بیرو باوەڕ لەسەرجەم ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا، چونکە ئەوان بوون یارمەتی خاچپەرستەکانیان دا بۆ داگیر کردنی وڵاتی شام ئەمەش لەرێی هاوپەیمانێتیو هاوکاری کردنی نێونیانەوە، هەروەها ئەوان بوون کە مەزهەبی باطنییان بڵاوکردەوە لەجیهانی ئیسلامیدا، کاتێکیش پشێوی دەسەڵاتی گرتەوە لەمیسرداو وەزیرەکان دەستیان بەسەر کاروبارەکاندا گرتو خەلیفەکان پەراوێزخران، تەماعیان کردە میسرو جار لەدوای جار هێرشیان بۆ دەهێنان بۆیە نورەدین محمود هەڵمەتە سەربازییەکانی یەکلاکردەوە بۆ رزگارکردنی میسر لێیانو، لەپێناو گێرانەوەی زەوی کینانە بۆ رێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، یەکخستنەوەی گوتاری موسوڵمانان[3]، دەشتوانین دیارترین ئەو پاڵنەرانەی کە بوونە هۆی هێرشکردن بۆسەر میسر لەمانەدا کورت بکەینەوە:

**پاڵنەری یەکەم :** ئەو حاڵەتی پشێوییەی کە میسری گرتەوە لەکۆتا رۆژەکانیدا، ئەوە بوو دەوڵەت بەدەست زۆر رواڵەتی گەندەڵیو لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەوە دەیناڵاند، هەتا ئەو رادەیەی کە کوژرانی خەلیفەو وەزیر کارێکی ئاسایی بوو، لەململانێی نێوان وەزیرەکاندا، یاخود وەزیرو خەلیفەدا، ئەوەبوو خەلیفە ظاهر لەسەر دەستی وەزیرەکەی کوژراو وەزیرەکان زاڵ بوون بەسەر خەلیفەکانی دوای ئەوداو بەئارەزووی خۆیان کەسیان هەڵدەبژارد ، هەروەها وەزیرەکانیش

---

[1] فن الصراع الأسلامي الصليبي، ل: ٨٤.

[2] فن الصراع الأسلامي الصليبي، ل: ٨٤.

[3] الجهاد والتجديد، ل:١٩٥.

یەکتریان دەکوشت ئەوەبوو لەیەك ساڵدا سێ کەس بوونە وەزیر: عادلی کوڕی روزیك‌و شاورو ضوغام، بەم شێوەیە دەوڵەت لاواز بووو پشێوی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشاو لەکۆتایی ئەم ململانێیەشدا شاوربەدەستی ضوغام دەرکراو هانای برد بۆ نورەدین محمود کەبارودۆخەکەی بەلەبار زانی بۆ یەکخستنی شام‌و میسر.

**پاڵنەری دووەم:** تەماعی خاچپەرستەکان پاڵی بەسەرکردەی موجاهید نورەدینەوە نا بۆ بیرکردنەوەی جیدی بۆ هێنانی میسر بۆ ناو بەرەی ئیسلامی، هەروەها ئەو بەڵێنەی کە لەخەلیفەی عەباسییەوە سەبارەت بەئازادی کارکردنی لەشام‌و میسردا وەریگرت زیاتر هانی دا بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم کارە[1].

**پاڵنەری سێیەم:** لەبەهێزترینی ئەو هۆکارانەی کە بوونە هۆی لەناو بردنی خەلافەتی فاطمی عوبەیدی، هۆکاری بیروباوەڕ بوو، چونکەئەم دەوڵەتە بیروباوەڕی باطنی هەبوو مەزهەبیشی ئیسماعیلی بوو، یەکێتی موسوڵمانانی نەهێشت‌و بەردەووام هاوکاری دوژمنانیانی دەکرد[2]. بۆیە پێویست بوو یەکێتیەکی بەهێز لەبیروباوەڕدا پێك بهێنرێت کە خەلافەتی عەباسی‌و زەوی کینانەو وڵاتی شام لەخۆ بگرێت[3].

لەم بارودۆخەدا کە نورەدینی شەهید بەهیوای هێرشکردنە سەر میسربوو وەزیری فاطمی شاوری کوڕی مجیر السعدی گەشتە دیمەشق لەساڵی ٥٥٩ك دا داوای پەنادانیکرد لەبەرامبەر ئەو کەسەی کە پلەو پایەی بەزۆر لێزەوت کردبوو هەروەها شاور بەڵێنی بەنورەدین دا کە یەك لەسەر سێی داهاتی میسری پێبدات دوای پێدانی موچەی بەسەربازەکانی بەرامبەر بەیارمەتیدانیدا دژ بە ضرغام ، بەمەرجێك ببێتە جێنشینی نورەدین لەمیسردا، هەروەها ئەسەدەدین شێرکۆش لەمیسردا بەسوپاکەیەوە بمێنێتەوەو لەگەڵ شاوردا کاروباری وڵات بەڕێوە بەرێت بەفەرمانی نورەدین[4]، بەلام نورەدین دوو دڵ بوو ئایا کەسێك بۆ ئەم کارەڕەوانە بکات یان نا هەتاوەکو نوێژی ئیستیخارەی کرد، سەرباری ئەو مەترسییانەش کەرووبەڕووی دەبوویەوە هەر لەبەر بوونی خاچپەرستان لەکەنارەکانی شام‌و بەیتولمەقدیسدا هەتاوەکو گومان کردن لەدڵسۆزی شاور السعدیدا[5]، پاشان

---

[1] الجهاد والتجدید، ل:١٩٦.

[2] الجهاد والتجدید، ل:١٩٧.

[3] مصر والشام في عهد الأيوبين والمماليك، ل: ١٣.

[4] الكامل في التأريخ لە الجهاد والتجديدەوە وەرگیراوە، ل: ١٩٨.

[5] الكامل في التأريخ لە الجهاد والتجديدەوە وەرگیراوە، ل: ١٩٨.

نورەدین چەند هەڵەتێکی یەک لەدوا یەکی بەرێخستو ئاراستەی میسری کرد لەساڵی ٥٥٩ك هەتاوەکو ٥٦٤ك بەسەرکردایەتی ئەسەدەدین شێرکۆ[١].

٢- **شاڵاوی یەکەمی نورەدین ٥٥٩ك:** نورەدین مەحمود بڕیاریدا کە هەڵمەتێکی سەربازی ئاراستەی میسر بکات بەسەرکردایەتی ئەسەدەدین شێرکۆ بۆ بەدیهێنانی دوو ئامانجی سەرەکی:

● ئاگادار بوون لەباروذۆخی ناوخۆیی میسر لەنزیکەوە وەك رێخۆشکەریەك بۆ دەست بەسەراگرتنی، بەتایبەت کەشاور بەڵێنی پێداوە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ پۆستەکەی ئەوە هەموو خەرجییەکانی هەڵمەتەکە لەئەستۆ دەگرێت سەرباری ئەستۆ گرتنی مانەوەی ئەسەدەدین شێرکۆو سەربازەکانی لەمیسردا.

● گەڕاندنەوەی شاور وەزیری لەسەرکارلابراوی فاطمیەکان بۆ پۆستەکەی، ئەوە بوو ضرغام بەو ئامادەکارییانەی زانی کە لەدیمەشق دا دەکرێت بۆ ئامادەکردنی هەڵمەتێك بۆ یارمەتیدانی شاور، بۆیە خۆی ئامادەکردو هاناشی برد بۆ عەموری یەکەم لەهەوڵێکیدا بۆ چوونە ناو گەمەی هاوسەنگ کردنی هێزەکانو، رێککەوتنێکی لەگەڵدا مۆر کرد، بۆ یارمەتیدانی دژ بەنورەدین محمود لەبەرامبەریشدا بەڵێنی پێدا کەسەرانەی ساڵانە بدات بەو شێوەیەی کە پاشا دیاری دەکات هەروەها ڕازی بوو بەوەی کەمیسر ببێتە پاشکۆی خاچپەرستەکانو خەلیفەی فاطمی العاضدیشی ناچارکرد کە ئەو رێککەوتنە مۆر بکات[٢]، ئاسایش بوو کەعەموری یەکەم ئەم پێشنیارە قبوڵ بکات چونکە هەلێکی زێڕینی پێدەبەخشێت بۆ چوونە ناو میسرەوە ئەمەش ئەو ئاواتەیە کە زیاتر لەنیو سەدە خاچپەرستەکان هەوڵیان بۆ دەدا، بۆیە خێرا هەڵمەتێکی سەربازی بەرێخست بۆ هێرشکردنە سەر میسرو ئەسەدەدین شێرکۆش بەسەرۆکایەتی شاڵاوی یەکەم بەرەو میسر بەرێکەوت لەجەمادی دووەمی ٥٥٩ك / نیسانی ١١٦٤ز بەهاوڕێیەتی صلاحەدین یوسفی کوڕی ئەیوبی برزای کەتەمەنی لەبیستو حەوت ساڵ زیاتر بوو رێگەی دیاریکراوی گرتبووە بەر بۆ هەڵمەتەکە کەبەناو ئەو زەویانەدا تێدەپەڕی کەخاچپەرستەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو[٣]، بۆئەوەی دڵنیاشیان بکاتەوە لەهەڵمەتەکەیو گیانی سەربازەکانیشی پارێزراو بێت نورەالدین محمود کاری لەسەر دوو میحوەر دەکرد:

---

[١] الجهاد والتجديد، ل: ١٩٨.

[٢] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٢٨.

[٣] النوادر السلطانية والحاسن اليوسفية، ل: ٧٦.

**یەکەم:** لەگەڵ هەڵمەتتەکەیدا بەسوپاکەیەوە رۆیشت هەتاوەکو لەدیمەشق تێپەڕین بۆ رێگرتن لەڕووبەڕووبوونەوەیان.

**دووەم:** هەستا بەهێرشکردنە سەر کەنارەکانی باکوری شانشینی بیت المقدیسی هاوسێی دیمەشق، لەپێناو راکێشانی سەرنجی خاچپەرستەکان بەرەو میسر[1].

ئەوە بوو ئەسەدەدین شێرکۆ بەسەرکردایەتی سوپا زۆرەکەیەوە بەناو بیاباندا بەرێکەوت بەهاورێیەتی شاور و لەکرك پەڕییەوە بەشەوبەکو پاشان ئەیلەدا تێپەڕیو دواتریش سوەیسو لەوێشەوە بۆ قاهیرە هێندەش خێرا دەڕۆشت کە توانی لەبەرزەخی سوەیس بپەڕێتەوە پێش ئەوەی خاچپەرستەکان خۆیان ئامادە بکەن بۆ دەستیۆەردان، ئەوە بوو ضوغام هێزێکی سەربازی رەوانە کرد بەسەرۆکایەتی برایەکی خۆی کە ناوی ناصر الدین بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەیو لەئاکامی ئەم رووبەڕبوونەوەیەدا کە لەبلبیسدا روویدا ئەسەدەدین شێرکۆ سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو ناصرالدینیش بەشکستخواردوویی گەڕایەوە بۆ قاهیرە، ئەسەدەالدین شێرکۆش ڕاوەدووی ناو لەکۆتایی جەمادی کۆتایدا گەشتنە پایتەختی میسرو لەویش ضوغام بەهەموو هێزەکانیەوە هاتەدەر بۆی چونکە دەیزانی ئەم جەنگەجەنگی کۆتاییەتیو ئەم رووبەڕبوونەوەیەش لەژێر شوراکانی قاهیرەدا روویداو جەنگەکەش توندو تیژی بەخۆوە بینیو بەسەرکەوتنی ئەسەدەدین کۆتایی هات دوای ئەوەی سوپاو خەڵکیو خەلیفە پشتی ضوغامیان بەردا، لەکاتی هەڵهاتنیشدا لەنزیك ئەو شوێنەی کە بەمەزاری خاتوو نفیسە ناسراوە لەمانگی رەجەبی ٥٥٩ك/ حوزەیرانی ١١٦٤ز کوژرا لەگەڵ ناصر الدینی برایدا، پاشان ئەسەدەدین شێرکۆ بەسەرکەوتویی چووە قاهیرەوە و شاوری گێڕایەوە بۆ پۆستەکەی لەوەزارەتدا، پاشان لەدەرەوەی قاهیرەدا سەربازگەیەکی دروستکرد[2]. دوای ئەوەی کەشاور گەڕانەوەی بۆ پۆستی وەزارەت مسۆگەر کرد گەڕایەوە سەر سروشتی کۆنی خۆی کە بەفرتو فێڵ ناسرا بوو هەتاوەکو بچێتە ململانێیەکی نوێوە لەگەڵ ئەسەدەدین شێرکۆدا، ئەوە بوو لەگەڵ خەڵکیدا خراپ مامەڵەی دەکردو بەڵێنەکانی بۆ نورەدین لەبیر خۆی بردەوەو خێرا نیشانەکانی ناپاکی لێدەرکەوتو رێککەوتنەکەی لەگەڵدا هەڵوەشاندەوە، داوای کرد لەشێرکۆ کە میسر چۆڵ بکاتو خێرا بەهێزەکانیەوە بچێتەوە بۆ شام، بەڵام شێرکۆ ئەم داوایەی رەتکردەوەو وەڵامی هەڵوێستە ناجێگیرەکەی دایەوەو دەستی گرت بەسەر بلبیسداو حوکمڕانی ناوچەی رۆژهەڵاتی میسری لەئەستۆ گرت[3]، شاوریش ناچار بوو پەنا

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٢٩.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٢٩.

[3] الباهر ل ١٣١–١٣٣ تأريخ الزنكيين في الموصل، ل ٣٣٠.

بەرێت بۆ پاشا عەمووری یەکەم کە لەئامادەسازیدا بوو بۆ هێرشکردنە سەر میسرو ئەم پێشنیارانەی خستە بەردەمی :

- بۆ هەر قۆناغێك لەقۆناغەکانی گەشتەکەی لەبەیتوالمەقدیسەوە بۆ رووباری نیل کەبیستو حەوت قۆناغە بڕی هەزار دیناری پێدەدات.
- دیاریەك دەبەخشێت بەهەر کەسێك کەهاوڕێیەتی بکات لەسوارەکان ئسبتاریە کەبڕبڕەی پشتی سوپای شانشینی بیت المقدس یان پێکدەهێنا، وەك هەوڵێك بۆ هاندانی سوارەکانی بۆ بەشداربوون لەهەڵمەتەکەدا.
- پارەی ئالفی ئەسپەکانیان لەئەستۆ دەگرێت بەرامبەر بەیارمەتیدانی بۆ وەدەرنانی ئەسەدەالدین لەمیسردا[1]، بەم شێوە شاور چووە ناو گەمەی سیاسی نێوان دوژمنە گەورەکانەوەو هەوڵی دەدا بۆ بەرژەوەندی خۆی بیانوروژێنێت، گومانیش لەوەدا نییە کە عەمووری یەکەم لەو کاتەدا چاودێری پێشهاتەکانی هەڵوێستی سیاسی سەربازی دەکرد لەمیسردا، کاتێ بەجموجۆڵەکانی ئەسەدەدین شێرکۆی زانی مەترسییەکانی زیاتر بوون، کەبانگهێشتەکەی شاوریشی بەدەست گەیشت خۆشحاڵی خۆی دەربڕی ئەم هەلەی لەکیس خۆی نەدا بۆ چوونە ناو میسر هەرچەندە هاوپەیمانەکەی گۆڕاوە، چونکە ئەمە بۆ ئەو گرنگییەکی نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کەئەو بچێتە میسرەوە[2].

٣- **شاڵاوی دووەمی عەمموری بۆ سەر میسر:** شاڵاوی یەکەمی عەموری شکستی هێنا بۆ سەر میسرو ناچار بوو پاشە کشە بکاتو بگەڕێتەوە بۆ بەیتولمەقدیس ئەمەش لەساڵی ٥٥٨ك/١١٦٣زدا بوو هەر کە بۆ جاری دووەمی هەلی بۆ رەخسا بۆ چوونە ناو میسر پاش بانگهێشتکردنی لەلایەن شاورەوە، خێرا کۆبوونەوەیەکی گرێدا لەبەیتولمەقدیسدا بەئامادە بوونی بارۆنەکانی میرنشینەکە، تیایدا بڕیاریدا بەدەم بانگهێشتەکەی شاورەوە بچن دوای ئەوەی کەڕوونی کردەوە بۆ کۆبوونەوەکە کە لەتوانایدا هەیە هەڵمەتێك بەرێبخات بۆ داگیر کردنی میسر بەبێ ئەوەی بەرگرییەکانی شانشینەکەی لاواز ببێت، بەتایبەت کە لەو کاتەدا لەئەورووپاوە ژمارەیەك حاجی گەشتبون بۆ سەردانی بەیتولمەقدیس کە دەتوانرا سودیان لێوەربگیرێت بۆ لایەنی سەربازیو بەهیوا بوو کە بتوانێ میسر داگیر بکات بۆ خاچپەرستەکانو بڕیاریشیدا کە بوهیموندی سێیەم ئەمیری ئەنطاکیە بەڕێوەبردنی

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل، ل: ٣٣٠.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل، ل: ٣٣٠.

کاروبارەکانی شانشینەکەی لەئەستۆ بگرێت لەکاتی ئامادەنەبوونیدا[1]. دواتر پاشای بەیتولمەقدیس خێرا بەرەو میسر بەرێکەوت بەسەرکردایەتی هێزەکانیەوە بۆ جاری دووەم لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٥٥٩ك/ ئابی ١١٦٤ز و لەگەڵ گەیشتنیدا بۆ فاقوس[2] پەیوەندی کرد بەشاورەوەو رێککەوتن لەسەر گەمارۆدانی ئەسەدەدین شێرکۆ لەبلبیسدا ئەم قەڵایەش سێ مانگ لەبەرامبەر ئابلۆقەکەدا خۆی گرت لەو ماوەیەشدا شێرکۆ بەباشی بەرگری لەسەنگەرەکانی کرد[3] بەڵام کتوپڕ عەمموری یەکەم بڕیاری دا کە بچێتە دانوستانەوە لەگەڵ ئەسەدەدین دا بۆ ئەوەی هەردوو لا میسر بەجێ بهێڵین، بەڵام ئایا چی لەئاسۆی سیاسیدا روویدا هەتاوەکو هەڵسێت بەم هەنگاوە؟ لێرەدا ژیریو بلیمەتی نورەدین لەرووی سەربازی سەرکردایەتیەوە دەردەکەوێت، چونکە عەموری یەکەم هەواڵی ناخۆشی پێگەیشت لەشامەوە کە ئەویش فشاری هێنانی نورەدین محمود بوو بۆ سەر موڵکەکانی، بۆیە پێی باش بوو بگەڕێتەوە بۆ بەرگری کردن لێی، لەهەمان کاتیشدا تێگەیشت کەهەڵمەتەکەی شکستخواردووە چونکە ئەسەدەدین باش خۆی قایم کردبوو لەبلبیسدا، لەهەمان کاتدا هەڵویستی ئەسەدەدین شێرکۆش زۆر زەحمەت بوو، چونکە خەریك بوو ئازووقەی لێدەبڕا سەربازی زۆری هەێزە خاچپەرستیو فاطمیة هاوبەشەکان لەڕووی ژمارەوەو لەبەرژەوەندی نەبوونی باری سەربازی بۆیە رازی بوو بەدانوستان لەپێناو بەجێهێشتنی میسردا[4]، ئەوە بوو هەردوو لا رێککەوتن لەسەر بەجێهێشتنی میسر لەمانگی ذي الحجە/ تشرینی یەکەمدا، بەم شێوەیە سوپای ئیسلامیو خاچپەرست بەتەنیشت یەکەوە بەنیمچە دورگەی سینادا رۆیشتن دوای ئەوەی شاوریان بەجێهێشت هەتاوەکو دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت شێرکۆش دوایەمین کەس بوو کە ئەم وڵاتەی بەجێهێشت بۆ گەیشتنەوە بە سوپاکەیدا[5]، شاوریش براوەی راستەقینەی ئەم ململانێ بوو کە لەبەرژەوەندی کۆتایی هات، ئەوەبوو بەیەکجاری لەسوپای ئیسلامی شامو خاچپەرستی رزگاری بوو، پاش رزگار بوونیشی لەضوغام بۆماوەی دوو ساڵ خۆی تاکە دەسەڵاتدار بوو لەوڵاتدا[6]. ئەسەدەدین شێرکۆش پاش گەڕانەوەی

---

[1] الكامل في التأريخ لە تأريخ الزنكيين في الموصلە وە وەرگیراوە: ل: ٣٣١.

[2] فاقوس: شارێکە لەقوڵایی میسری رۆژهەڵاتداو دوا شاری میسرە لەلای شامەوە(٤/٢٣٢).

[3] تأريخ الزنكيين ى الموصل، ل: ٣٣١.

[4] تأريخ الزنكيين ى الموصل، ل: ٣٣١.

[5] تأريخ الزنكيين ى الموصل، ل: ٣٣١.

[6] تأريخ الزنكيين ى الموصل، ل: ٣٣٢.

لەمیسر خۆی خستە ژێر دەستی نورەدین محمودو میسر بویەوە بەخولگەی بیرکردنەوەو قسەکردنی مەجلیسەکانیو وازی هێنا لەڕاگۆڕینەوە لەگەڵ هاوەڵانی میسریدا کەبەردەوامی هەواڵی ئەوییان پێدەگەیاند، لەو ماوەیەشدا نورەدین محمود بەئەرکێك ناردی بۆ بەغدا ، ئەویش هەلی ئامادەبوونی لەپایتەختی خەلافەتدا قۆستەوە بۆ هەڵنانی خەلیفە مستنجد بالله بەگێرانەوەی بارودۆخی میسرو ئەوەی کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، خەلیفەش کاریگەر بوو بەمەی کەبیستیو هانیدا بۆ گەڕانەوە بۆ میسر[1]. هەرچەندە هەڵمەتەکەی ئەسەدەدین شێرکۆ ئامانجەکانی بەدینەهێنا لەمیسردا، بەڵام ئەنجامی کۆتایی ئەوەبوو کە موڵکەکانی نورەدین محمودلەشامدا بەهێزتر بوو و پلەو پایەی زیاتر بوو لەجیهانی ئیسلامیداو، بوو بەیەکێك لەهێزە گەورەکانی ناوچەکە، لەبەرامبەریشدا موڵکی خاچپەرستەکان پاشەکشەی کرد بەرەو کەناری دەریاو تووشی نائومێدی بوون[2]. هەرچۆنێك بوو شێرکۆو عەمموری یەکەم خاکی میسریان بەجێهێشتو هەریەکەیان لەبارودۆخی نالەباری سیاسیو باری خراپی ئابوری وڵاتەکەیان ئاگادار بوون، ئەمە وێڕایی ئەو سامانو سەرچاوە مرۆییە گەورەیەی کە پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ هەرکەسێك کەدەستی بەسەردا بگرێت، هەروەها شاور هەلی دەرچوونیانی لەمیسر قۆستەوەو گەڕایەوە سەر خوو نەریتی پێشووی کە لەکوشتنو ستەمکردنو بردنی ماڵی خەڵکدا خۆی دەبینیەوە، بەجۆرێك کە هیچ شتێکی بۆ خەلیفەی فاطمی عاضد نەهێشتبووەوەو بەتەواوی تەنگی پێهەڵچنی نامەیەکی نووسی بۆ بۆ نورەدین محمود هەتاوەکو بەهانایەوە بێتو رزگاری بکات لەدەستی[3].

٤- **شاڵاوی دووەمی نورەدین:** نورەدین محمود هێزی پێویستی ئامادەکردو بەرێی خست بۆ میسر لەساڵی ٥٦٢ك/ کانوونی دووەمی ١١٦٧زدا بەسەرکردایەتی ئەسەدەدین شێرکۆو بەهاوڕێیەتی صلاح الدینی برازایو کۆمەڵێ ئەمیریشی لەگەڵیدا نارد[4]، ژمارەی ئەم هێزانەش گەشتە دوو هەزار سوار[5] نورەدینیش هەتاوەکو قەراغی شار لەگەڵیدا ڕۆیشت.لەترسی ڕێگە پێگرتنی لەلایەن خاچپەرستەکانەوە[6]، پاشان سەربازانی هەڵمەتەکە بەرێگەیەکی

---

[1] تأريخ الزنكين في الموصل، ل: ٣٣٢.

[2] تأريخ الزنكين في الموصل، ل: ٣٣٢.

[3] النجوم الزاهرة (٣٤٨/٥).

[4] تأريخ الزنكين في الموصل، ل: ٣٤٣.

[5] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين(١٣/٣).

[6] الكامل في التأريخ الزنكيين في الموصل، ٣٤٣.

پڕمەترسیدا ڕۆیشتن، چونکە ئەو خاچپەرستانەی کە لەسەر ڕێگاکانیان بوونو لەکرکو شوبکدا جێگیر بووبوون، لەوانەبوو بەسەریاندا بدەنو دەستیان لێبوەشێنن، لەکاتێکدا ئەوان دوور بوون لەناوچەکانیانەوە، هەروەها بیابانشینەکان بەدوایانەوە بوونو هەواڵیان دەگواستەوە بۆ خاچپەرستەکان، بۆیە پێویست بوو لەسەریان کە جارجارێك ڕێگای هاتووچۆیان بگۆڕن بۆخۆشاردنەوە، هەروەك سروشتیش پێشڕەوی دوادەخستن ئەوە بوو گەردەلوولێکی لماوی توند بەڕوویاندا هەڵی کردو کۆمەڵە پیاوێکی لێکوشتنو وێڕای لەناوبردنی بڕێك ئازووقە، سەرباری هەموو ئەمانەش درێژەیان دا بەگەشتەکەیان بەرەو میسر، بەڵام دواکەوتنیان بواری ڕەخساند بۆ شاور کەهانا بەرێت بۆ عەمووری یەکەم، چونکە لەخوێندنەوەی ڕووداوەکانەوە گەشتبووە ئەو بڕوایەی کە ئەگەر ئەمجارە ئەسەدەدین شێرکۆ بێتە میسر، ئەوە تیایدا دەمێنێتەوەو بەئاسانی بەجێی ناهێڵێت، بۆیە دوودڵی نەنواند لەپەیوەندیکردن بەپاشای بەیتولمەقدیسو دانوستاندن لەگەڵیداو، ڕوونکردنەوەی ئەو مەترسی یەی کەنورەدین مەحمود دەیبێت بۆ شانشینی بەیتولمەدیس ئەگەر بێتو دەست بەسەر میسردا بگرێت، عەمووری یەکەمیش خۆشحاڵی خۆی بۆ بانگهێشتەکە دەربڕی چونکە چاوی بڕیبوە سامانی میسرو بەهیوای دەست بەسەراگرتنیو دورخستنەوەی سوپای نورەدین مەحموود بوو لێی، هەتاوەکو نەتوانێ چواردەوری شانشینەکەی بدات کەکەوتۆتە ناوەڕاستی موڵکەکانی نورەدین مەحمودەوە[1]. پێش ئەوەی ئامادەکارییەکان تەواو بن هەواڵ گەیشت کە ئەسەدەدین شێرکۆ خەریکە بیابانی سینا دەبڕێت، ئەمەش عەموری یەکەمی ناچار کرد کە ئەو ژمارە سەربازەی کە بۆی کۆبووەتەوە بیاننێرێت بۆ ڕێگرتن لەپێشڕەوی ئەسەدەدین ، بەڵام ئەم ڕێوشوێنە لەکاتی خۆیدا دوا کەوتبوو،هەرچەندە سوپای ئەسەدەدین ڕووبەڕووی گەردەلولێکی لماوی بوویەوەو بووە هۆی لاواز کردنی پێشڕەویو خەریك بوو سەربازەکانی لەناو بەرێت، بەڵام دواجار توانی خۆی بگەیەنێتە بەرزەخی سوێس لەمانگی ڕەبیعی دووەم/ سەرەتای مانگی شوباتدا، هەروەها ئەسەدەدین شێرکۆ زانی کە سوپای خاچپەرستەکان کەوتووەتە پێشڕەوی بەرەو میسر، بۆیە هەستا بەبڕینی بیابان بەئاراستەی باشوری ڕۆژئاوا هەتاوەکو خۆی لەڕووبەڕووبوونەوەیەکی پێشوەخت لابدات لەگەڵ خاچپەرستەکاندا، هەتا گەیشتە ڕووباری

[1] المفروج الكروب (١٤٩/١) تأريخ الزنكين في الموصل، ٣٤٣.

نیل لەنزیك ئیطفیح لەدووری چل میل لەباشوری قاهیرەوە[1]، پاشان پەڕیەوە بۆ کەناری ڕۆژئاوا کردیە ڕێرەوی خۆی هەتاوەکو گەشتە جیزەو لەوێ لەبەرامبەر فسطاطدا سەنگەری لێداو بۆ ماوەی پەنجاو ئەوەندە ڕۆژ حوکمڕانی ناوچەی ڕۆژ ئاوای کرد[2].

أ- **شالاّوی عەموری سێیەم بۆ سەر میسرو دانوستانی خاچپەرستی فاطمي یەکان:** عەمووری یەکەم لەبەیتولمەقدیس دەرچوو لەمانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٦٢ك/ کانوونی دووەم ١١٦٧زداو بەرەو میسر بەڕێکەوت لەشالاّوی سێیەمیدا بۆ سەر میسر، ئەوەبوو ڕێگەی ئاسایی نێوان غەزەو عەریشی بڕی پاشان لەبیانەوە تێپەڕی بۆ بلبیس‌وشاوریش تووشی بەهۆی گەشتنی کتوپڕو هەماهەنگی نەکردنی لەگەڵیدا تووشی دڵەڕاوکێ بوو، وادیارە هێشتا بەگەشتنی شێرکۆی بۆ ئیطفیح نەزانیبوو، دڵنیاش نەبوو هەتاوەکو چاوساغەکانی نارد بۆ بیابان بۆ زانینی ڕاستی بارودۆخەکە، لەم کاتەشدا چووە دەرەوە بۆ پێشوازی کردن لەپاشای خاچپەرستەکان‌و چاوی پێکەوت، عەموری یەکەمیش لەسەربازگەکەیدا میوانداری کرد لەکەنار ڕووباری نیلدا لەدووری میلێکەوە لەشوراکانی قاهیرەو[3]، گفتوگۆی لەگەڵ شاوردا دەست پێکرد و شاوریش بەڵێنی دا کە چوار سەد هەزار دیناری پێبدات لەبەرامبەر دەرکردنی ئەسەدەدین شێرکۆ لەمیسر، بەمەرجێك نیوەی ئەم ڕێژەیە یەکسەر بدرێت‌و نیوەکەی تریشی دوایی بدرێت، بەمەرجیشی گرت کە عەمووری یەکەم سوێند بخوات لەسەری[4]، بۆ پشتگیری کردنی ئەم ڕێککەوتنەو پێدانی سیفەتی فەرمی عەموری یەکەم هەریەك لەهیوی گەورەی قیساریەو جفری پێشڕەوی سوارەکانی داویەی نارد بۆ لای خەلیفەی فاطمی بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی فەرمی لەسەری، دوو نێرردراوەکەش زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکراو لەکۆشکی فاطمیدا و ڕێککەوتننامەکە پەسەند کرا[5]، مەسەلەیەکی ئاسایش بوو کە خاچپەرستەکان پێشوازی لەم ڕێککەوتنە بکەن چونکە دەیانکاتە پارێزەری میسرو خیلافەتی فاطمی‌و ئەسەدەدین شێرکۆش دوور دەخاتەوە وەك ڕکابەری یەکەمیان بۆ دەستگرتن بەسەر ئەم وڵاتەدا[6].

---

[1] الكامل في التأريخ له الزنكيين في الموصل، ٣٤٣.

[2] الكامل في التأريخ له الزنكيين في الموصل، ٣٤٣.

[3] وليم الصورى (٨٩٦/٣).

[4] هەمان سەرچاوە (٨٩٩/٣) تأريخ الزنكيين في الموصل، ل: ٣٤٤.

[5] تأريخ الزنكيين، ل: ٣٤٤.

[6] تأريخ الزنكيين، ل: ٣٤٤.

ب- **جەنگی ئەلبابەین:** ئەوەبوو ئەسەدەدینو سەربازەکانی نورەدین بەرەو صَعید بەرێکەوتبوونگەشتنە شوێنێك کە بەئەلبابەین ناسرا بوو، سوپای میسریەکانو فەرەنجییەکانش بەدوایاندا رۆیشتن هەتاوەکو لەبیستو پێنجی جەمادی یەکەمدا پێیاندا گەشتنەوە، ئەوەبوو چەند سیخوڕێکی ناردبووە ناویان کاتێ هاتنەوە هەواڵیان پێدا کەژمارەو کەرەستەیان زۆرەو لێبراویشن لەبەدواداچونیدا ئەویش بڕیاری رووبەڕووبوونەوەوەو کوشتاری دان، بەڵام لەوە دەترسا کە دەرونی سەربازەکانی لاواز بێتو نەتوانن دان بەخۆیاندا بگرن لەم شوێنە مەترسیدارەدا کە ئەگەری پەککەوتنیان لەسەلامەتییان زیاترە لەبەر کەمی ژمارەو دوورییان لەوڵاتەکانیانەوە بۆیە ڕاوێژی پێکردن، ئەوانیش هەموویان ڕایان وابوو کەلەنیل بپەڕێتەوە بۆ کەناری ڕۆژهەڵاتو بگەڕێتەوە بۆ شامو پێیان وابوو: ئەگەر شکستمان خوارد (کە گومانی تیادا نییە) بۆکوێ بچینو پەنا بۆ کوێ بەرین؟ لەکاتێکدا کەسەربازو خەڵكو جوتیار هەمووی دژمانەو ئاوات بۆ لەناوبردنمان دەخوازن. دیارە هەقی خۆشیان بوو بەتایبەت، ئەوان دوو هەزار سوار بوون دوور لەوڵاتی خۆیانو بەرامبەر بەدەیان هەزار جەنگاوەر لەحاڵێکدا هەموو خەڵکی وڵاتەکە دوژمنیان بوو، کاتێ ئەمەیان وت کەسێك لەسەربازانی نورەدین بەناوی شەرەفەدین بوزغوشەوە هەستا (کەناسرا بوو بەئازایەتی) وتی: ئەوەی لەکوژرانو برینداریو بەدیل گرتن دەترسێت با خزمەتی پاشا نەکات، بەڵکو ببێتە جوتیار یان لەگەڵ خێزانەکەیدا لەماڵەوە دانیشێت، سوێند بەخوا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لای پاشای دادپەروەر بەبێ سەرکەوتنو رووبەڕوبوونەوەیەك کە ببێتە پاساو بۆتان ئەوە هەموو دەستکەوتەکانتان لێدەستێنێتەوە کە تا ئەمڕۆ دەستتان کەوتووەو پێتان دەڵێت: ئایا پارەو سامانی موسوڵمانان دەبەنو لەدوژمنەکانیان هەڵدێنو شوێنێکی وەکو میسر دەدەن بەدەست بێباوەڕەوە؟ ئەسەدەدینیش وتی: ئەمە ڕای منەو کاریشی پێدەکەم ئەوەبوو صلاح الدین یوسفی کوڕی ئەیوبیش هاوڕا بوو لەگەڵیاندا، پاشان لایەنگرانی ئەم ڕایە زۆر بوونو لەسەر ڕووبەڕبوونەوە کۆبوونەوە ، ئەمەش سامو شکۆی نورەدین دەردەخات لەدڵی فەرماندەو سەربازەکانیدا، ئەوەبوو ئەسەدەدین لەشوێنی خۆیدا مایەوەو بەئامادەباشییەوە هەتاوەکو میسریو فەرەنجەکان گەشتنە لای (لێرەشدا ژیری ئەسەدەدین شێرکۆو ئەزموونی سەربازی دەرکەوت کاتێ قورسایی خستە ناوەڕاست هەتاوەکو خۆی پێزۆر بکات وتی بەوانەی کە لەگەڵیدا بوون: فەرەنجو میسریەکان وا دەزانن من لەناوەڕاستدام بۆیە هێرشو هێزی خۆیان ئاڕاستەی ئەوێ دەکەن، جا ئەگەر هێرشیان بۆ هێنان ئەوەە باوەڕیان پێمەکەنو خۆتان

بەکوشت نەدەن لەدەستیان هەڵبێن ئەگەر وازیان لێهێنان ئەوە شوێنیان کەون پاشان هەستا بەهەڵبژاردنی کۆمەڵێکی بەهێزو ئازا لێیان کە ئاشنای ئارامگری و ئازایەتیان بوو، لەلای راستەوە وەستاندنی کاتێ هەردوو لا رووبەڕوو بوونەوە فرەنجەکان ئەوەیان کرد کە ئەسەدەدین وتی هێرشیان کردە سەر ناوەندی سوپاکەوچونکە وایان دەزانی ئەسەدەدینی تیادایە، ئەوانەش کە لەوێ بوون شەڕێکی سوکیان کرد لەگەڵیاند پاشان لەبن دەستیان هەڵاتن و ئەوانیش شوێنیان کەوتن، پاشان ئەسەدەدین و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون هێرشیان کردە سەر ئەو سەربازانەیان کە مابونەوە لەفرەنجەکان و شکستیان پێهێنان و شمشێری نایە ملیان و زۆربەیان کوشت برینداد کرد پاشماوەشیان هەڵاتن، کاتێ فرەنجەکان ئەوانەی کەشوێن موسوڵمانەکان کەوتبوون گەڕانەوە بینیان شوێنی جەنگەکە چۆڵ بووە لەهاوەڵەکانیان یەکسەر هەڵاتن ئەمەش سەیرترین رووداوێکە کە لەمێژوودا نووسرا بێت کەدوو هەزار سوار سەربازەکانی میسرو فرەنجەکانی کەنار دەریا شکست پێبهێنن[1].

ج- **گەمارۆی ئەسکەندەریە:** پاشان ئەسەدەدین بەرەو سەربازگەی ئەسکەندەریە بەرێکەوت، هەرچی لەو لادێ و دەشتەدا بوو لەماڵ و موڵك دەستیان بەسەردا گرت، دواتر گەشتە ئەسکەندەریەو بەبێ جەنگ دەستی بەسەردا گرت، دانیشتوانەکەی رادەستیان کردو ئەویش صلاح الدینی برازای تێدا دانا، پاشان گەڕایەوە صعیدو دەستی بەسەردا گرت و پارەو سامانەکەی بردو تیایدا مایەوە هەتاوەکو مانگی رەمەزانی گرت، میسری و فرەنجەکانیش گەڕانەوە قاهیرە خۆیان کۆکردەوەو خەڵکێکیان لەشوێنی ئەوانەدا دانا کە لێیان کوژرا بوون، پاش زۆربوونیان بەرەو ئەسکەندەریە بەڕێکەوتن، کە صلاح الدینی تێدا بوو لەگەڵ کۆمەڵە سەربازێکدا، خەڵکەکەشی لەترسی فرەنجەکان هاوکاریان دەکردن، ئەوەبوو گەمارۆیان لەسەر توند بوو خۆراك کەم بووەیەوە، بەڵام دانیان بەخۆیاندا گرت، پاشان ئەسەدەدینیش لەصعیدەوە بەرەو لایان بەڕێکەوت، شاوریش هەندێ لەو تورکمانانەی تێکدا بوو کە لەگەڵیدا بوون، نێردراوی میسری و فرەنجەکانیش دەهاتنە لای و داوای ئاشتەواییان لێدەکرد[2].

د- **دانوستانەکانی نورەدین و خاچپەرستەکان سەبارەت بەبەجێهێشتنی میسر:** دوای دانوستانێك لەنێوان هەردوولادا ئاشتەواییەکیان مۆر کرد لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە:

---

[1] الباهر، ل: ١٣٢-١٣٣ كتاب الروضتين (١٣/٣).

[2] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين(١٤/٣).

- هەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر ئەسکەندەریە.

- ئاڵوگۆکردنی دیلەکان

- ئازادکردنی سەربازەکانی نورەدین لەئەسکەندەریەدا.

- شێرکۆ سەربازەکانی میسر بەجێبهێڵن.

- رێ پێنەگرتنیان لەرێگەدا لەلایەن هێزە خاچپەرستانەکانەوە.

ئەگەر خوێندنەوەیەکی خێرا بکەین بۆ رەوتـی رووداوەکان، بـەو شـێوەیەی کـە لەسـەر زەوی روویدا، ئەو پێشنیارە ئاڵوگۆڕ کراوانەی کە بۆ گرێدانی ئاشتەواییەکە خرانە روو ئەو رووداوانەی کـە پاش رێککەوتنەکە روویاندا دەتوانین ئەم تێبینیانە رەچاو بکەین: ئەوە بـوو هـەردوو لا نـورەدین‌و خاچپەرست‌و فاطمی یەکان رێککەوتن لەسەر :

- دەرچوونی هێزەکانی نورەدین‌و خاچپەرستەکان لەمیسر

- ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکان.

- شاور بەڵێن دەدات کە هاوڵاتیانی خۆی لەئەسکەندەریەدا سزا نەدات هـەروەها لەشـوێنەکانی تردا.

بەرامبەر بـەو یارمەتییەی کەپێـشکەشی ئەسـەدەدین شـێرکۆیان کـردووە[1]. هەرچـۆنێك بێـت، عەموری یەکـەم لـەمانگی شـەوال/ ئابدا چـووە نـاو ئەسکەندەریەوە لەهـەمان کاتـدا صـلاح الـدین بەکاروانێکی سەربازی چڕو پڕەوە شارەکەی بەجێهێشت هەرچەندە خەڵکەکـەی زۆر دڵتـەنگ بـوون بەدەرچوونی لەو شارە، هەردوو سەرکردەش بەیـەك گەیـشتن‌و هـەردوو لا سەرسـام بـون بەیـەکتر، تەنانــەت پاشــای بەتولمەقـدیس هەسـتا بەکۆمــەکی کردنـی ســەلاحەدین بەچــەند بەلــەمێك بـۆ گواستنەوەی برینداره‌کان بۆ وڵاتی شام[2]، بـەڵام کێـشەی دانیـشتوانی شـارەکە کۆتـایی پێنــەهات، چونکە هەر کەشوێنکەوتوانی شاور چوونە ناو شارەکەوە یەکسەر دەسـتیان دایـە دەسـتگیرکردنی هەر کەسێك کە گومانی هاوکاری کردنی سەلاحەدینی لێکرابێت، سەلاحەدینیش نـاڕەزایی خـۆی بـۆ عـەموری یەکـەم دەربڕی‌و ئـەویش ئامۆژگـاری شـاوری کـرد کـە دەسـتگیرکراوەکان ئـازاد بکـات[3]. ئەمەش جاری دووەم بوو کەشاور ناپاکی تیادا نواند، ئەمەش وانەیەکی توند بـوو بـۆ سـەلاحەدین،

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل، ل: ٣٥٠.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل، ل: ٣٥١.

[3] تأريخ الفاطمين، ل: ٤٩٤.

بۆیە ڕێی نەدا بەدووبارەبوونەوەی بەدەستی خۆی تۆڵەی لەشاور کردەوە کاتێك کەهێزەکانی شام گەڕانەوە بۆ میسر لەساڵی ٥٦٤ك– ١١٦٨ز[١].

ﻫ- **دەسەڵاتی خاچپەرستەکان بەسەر میسرەوە:** هەریەك لەئەسەدەدین شێرکۆو سەڵاحەدین میسریان بەجێهێشت لەمانگی ذي القعدة/ مانگی ئەیلولدا، بەڵام عەموری یەکەم چەند هەفتەیەك دواکەوت چونکە بەقاهیرەدا تێپەڕی هەتاوەکو دەسەڵاتی خاچپەرستەکان بەسەر دەوڵەتی فاطمیو شاوردا بسەپێنێت کەدیارترین رواڵەتەکانی بریتیبوون لە:

- دانی سەرانەیەکی ساڵانە کە ئەندازەکەی سەد هەزار دینارە بەخاچپەرستەکان.
- هێشتنەوەی هێزێك لەسوارەکانیان بۆ پاراستنی دەرگاکانی قاهیرە، بۆ ڕێگرتن لەنورەدین مەحمود ئەگەر دووبارە هەوڵی هێرشکردنی دا.
- دانانی نوێنەرێك لەبری پاشای خاچپەرست لەقاهیرەدا کە بەشدار بێت لەکاروبارەکانی دەسەڵاتدا[٢].

دیارە بیرۆکەی خاوەنداریێتی میسر هێشتا لەهزری سیاسی عەموری یەکەمدا بەچالاکی مابوویەوە، نەیدەتوانی دەست بەرداری ببێت، بۆ دەوێست پاش ڕێکخستنی کاروبارەکانی لەوڵاتی شامدا بگەڕێتەوە، ئەمەش دەرئەنجامی چاوتێ بڕینی بۆ سامانی میسرو لەپێناو پاراستنی قەوارەکەی لەوڵاتی شامدا، پاشان گەڕایەوە بۆ فەلەستین[٣]. بەم ڕێو شوێنانەش دەسەڵاتی بەسەر میسردا چەسپاو دەرئەنجامی ئەمەش ململانێی نێوان نورەدینو عەموری یەکەم بەردەوامی بەخۆی بینی[٤].

و- **شاڵاوی سێیەمی نورەدین بۆ سەر میسر لەساڵی ٥٦٤ك:** هۆی ئەم هەڵمەتەش ئەوە بوو کە فرەنجەکان پێگەیەکیان بۆ خۆیان لەقاهیرەدا داناو دەستیان گرت بەسەر دەروازەکانیداو بەشێوەیەکی ستەمکارانە حوکمی موسوڵمانەکانیان دەکرد، کاتێ بینیان کەکەس نییە ڕووبەڕوویان بوەستێت ناردیان بەدوای عەموری یەکەمی پاشایان لەقودسداو داوایان لێکرد کەبێت بۆ دەست بەسەراگرتنی میسرو باسی ئاسانی ئەم کارەیان بۆ کرد ، بەڵام ئەو دوو دڵی نواند چونکە لەدەرئەنجامی خراپی ئەم کارە دەترسا پاشان لەگەڵ سوارەکانیدا بەنابەدڵیەوە کەوتە ڕێ هەتاوەکو گەشتنە بلبیس لەسەرەتای صەفرداو دەستیان دایە

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل: ٤٩٥.

[٢] هەمان سەرچاوە، ل: ٤٩٥.

[٣] النجوم الزاهرة(٥/٣٤٩).

[٤] تأريخ الفاطمين، ل: ٤٩٥.

کوشتن‌و دیل کردن‌و تالانکردنی، پاشان بەرەو فسطاط ڕۆیشتن‌و شاوریش فەرمانی سوتاندنی داو داوای کرد لەخەڵکەکەی بگوازنەوە بۆ قاهیرەو کەل‌و پەلەکانیان بێنن نەوەکو فرەنجەکان بیگرن‌و تالانی بکەن، ئەوانیش شارەکەیان چۆڵ کردو ئاگریان تێبەرداو بۆ ماوەی پەنجاو چوار ڕۆژ ئاگر دەیسوتاند، پاشان فرەنجەکان قاهیرەیان گەمارۆ داو تەنگیان پێهەڵچنی، شاوریش سەرپەرشتی سەربازەکانی دەرکرد تیایدا، کاتێ زۆری بۆ هات‌و نەیتوانی ڕووبەڕوویان ببێتەوە پەنای برد بۆ فێلێک‌و نامەیەکی نارد بۆ عەموری پاشایان‌و بەڵێنی دا هەزار دیناری میسری پێبدات‌و هەندێکیشی وەك پێشەکی بۆ بنێرێت، ئەوەبوو سەد هەزار دیناری بۆ ناردو داوای لێکردن کە ناوچەکە جێبهێڵن هەتاوەکو پارەیان بۆ کۆدەکاتەوە، ئەوانیش بە جێیان هێشت بۆ ناوچەیەکی نزیك‌و ئەویش دەستی دایە کۆکردنەوەی پارە بۆیان بەڵام تەنها پێنج هەزار دیناری پێ کۆکرایەوە چونکە میسریەکان خانوو سوتاو ماڵ بڕاو بوون[1].

ز- **عاضد پەنا بۆ نورەدین محمود دەبات:** عاضدی فەرمانڕەوای میسر دوای کەوتنەوەی ئاگرەکە لەمیسردا نێردراوێکی نارد بۆلای نورەدین‌و هانای بۆ برد باسی لاوازی موسوڵمانەکانی بۆ کرد لەبەرامبەر فرەنجەکاندا لەنامەکەشدا قژی ژنانی ناردبوو تیایدا نووسیبوو: ئەمە قژی ژنانی کۆشکی منە داوای فریاکەوتن دەکەن لەتۆ هەتاوەکو لەدەست فرەنجەکان ڕزگاریان بکەیت[2]، چەند پێشنیارێکیشی بۆ خستەڕوو بەرامبەر بەڕزگارکردنی وڵاتەکەی لەدەست خاچپەرستەکان لەوانە:

- پێدانی یەك لەسەر سێی وڵاتی میسر.
- پێدانی زەوی بەفەرماندەکانی.
- ڕێکەدان بەمانەوەی شێرکۆ لەمیسردا[3].

ح- **ئەسەدەدین شێرکۆ بەرەو میسر بەڕێکەوت دەچێتە قاهیرەوە:** یاسای هەل: نورەدین دەستی دایە ئامادەکردنی سوپا بەشێوەیەکی باش‌و دووسەد هەزار دیناریشی دا بەسەرکردەی هەڵمەتەکە ئەمە جگە لەپۆشاك‌و ولاغ‌و کەرەستەی جەنگ، سەرپشکیشی کرد لەسەربازو گەنجینەدا هەتاوەکو چی پێویستە بیبات، ئەسەدەدینیش دوو هەزار سەربازی سوارەو شەش هەزار سواریشی لەتورکمانەکان کۆکردەوەو لەگەڵ نورەدیندا پێکەوە هەتاوەکو

---

[1] کتاب الروضتین، لەجیهاد والتجدیدە وە، ل: ٣٠٣.

[2] کامل في التأريخ لە الجهاد والتجدیدەوە، ل: ٣٠٣.

[3] تأریخ الفاطمین، محمد سهیل طقوس، ل: ٤٠٥.

دەروازەی دیمەشق رۆیشتن، پاشان کەوتنە رێ بەرەو رأس الماء[1]، هەر سوارێکیش لەلایەن نورەدینەوە بیست دیناری پێدراو وەك یارمەتیەك بەدەر لەمووچە، کۆمەڵێکی تر ئەمیریشی خستە تەك شێرکۆدا نارد کە سەلاحەدینی ئەیوبی یەکێکیان بوو، ئەسەدەدینیش بەلێبڕاوانەوە بەرێ کەوت کاتێ لەمیسر نزیك بووەوە، فرەنجەکان دەستی بەتاڵ و سەر شۆڕی و نائومێدیەوەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان، نورەدینیش بەبیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بووو فەرمانی دا بەلێدانی تەپڵی سەرکەوتن لەوڵاتدا، کاتێ ئەسەدەدین گەشتە قاهیرە لەگەڵ عاضددا کۆبووەوە ئەویش دیاری خۆی پێشکەش کردو خەڵکی میسر بەهاتنی دڵخۆش بوون و خەڵاتێکی زۆر پێشکەش بەسەربازەکانی کرا[2].

ط- **کوژرانی شاور:** شاور ئەوەی لەناخیدا بوو ئاشکرای نەدەکردو دەستی دەکرد بەئەسەدەدین لەپێدانی ئەو پارەیەی کە بەڵێنی پێدابوو لەگەڵ مووچەی سەربازەکانیدا، دەیویست دووبارە ناپاکی بنوێنێت، بۆیە بڕیاری دا خوانێك بۆ ئەسەدەدین و ئەمیرەکانی رێك بخات و لەو کاتەشدا بیانکوژێت، بەڵام کاملی کوڕی ئەم کارەی رەتکردەوەو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بتەوێت ئەو کارە بکەیت ئەسەدەدین ئاگادار دەکەمەوە باوکیشی وتی: سوێند بەخوا ئەگەر وانەکەین ئەوە هەموومان دەکوژرێین. ئەویش وتی: راست دەکەی. ئەگەر بکوژرێین بەموسوڵمانی و وڵاتەکەشمان بەدەست موسوڵمانانەوە بێت باشترە لەوەی بکوژرێین و وڵاتیشمان بەدەست فرەنجەکانەوە بێت، ئەو کاتە هەر ئەوەندە خۆشە کە فرەنجەکان ببیستن کە شێرکۆ گیراوە ئیتر یەکسەر دێنەوە، ئەگەر عاضدیش پەنا بۆ نورەدین بەرێت ئەو کات نایەت بەهانامانەوە، بەم شێوەیە شاور وازی لەپلانەکەی هێنا[3].

لەکۆتایشدا سەلاحەدین و چەند ئەمیرێك رێککەوتن لەسەر خۆ رزگار کردن لەدەست ئەم ناپاکی فێڵبازە بۆیە دەستگیریان کرد، کاتێ عاضد ئەمەی بیست ناردی بۆلای شێرکۆ بۆ داوای سەری ئەسەدەدینش فەرمانی کوشتنی داو کوشتیان و سەرەکەیان لەحەڤدەی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٦٤ك دا نارد بۆ عاضد[4].

---

[1] الجهاد والتجدید، ل:٢٠٣ رأس الماء لەناوچەی حۆران.

[2] كتاب الروضتین في أخبار الدولتین(٣/٥٥).

[3] هەمان سەرچاوە، (٣/٥٦).

[4] الجهاد والتجدید،ل: ٢٠٣.

**ي- ئەسەدەدین وەزارەتەکەی عاضد لەئەستۆ دەگرێت:**

ئەسەدەدین چووە قاهیرەوەو روویکردە کۆشکی عاچد ئەویش پۆستی وەزارەتی پێسپاردو نازناوی پاشای سەرکەوتوو( الملك المنصور)ی (أمیر الجیوش)ی فەرماندەی سوپای لێنا، شێرکۆش خەڵکانی باوەڕ پێکراوی کردە بەرپرسی شوێنەکانو سەربازەکانی بەوڵاتدا دابەش کرد، شاعیرانیش ستایشی ئەسەدەدین شێرکۆیان کردووە بەهۆی ئەم کارو سەرکەوتنانەیەوەو العماد دەڵێ:

| | |
|---|---|
| بلغت بالجد مالا یبلغ البشر | ونلت ماعجزت نیله القُدَر |
| أصجت بالعدل والإقدام منفرداً | فقل لنا: أعليٌّ أنت ام عمرُ |
| إ فخر فانّ ملوك الأرض أذهلهم | ماقد فعلت فكلُّ فیك مفتكِرُ |
| سهرت إذ رقدوا بل هُجْتَ اذ سكنوا | وصُلت اذجبنوا، بل طُلت[1] اذ قصروا |

**ك- كۆچی دوایی ئەسەدەدین:** وەزارەتی شێرکۆ زۆری نەخایاند، چونکە لەبیستو دووی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٦٤ك کۆچی دوایی کردو فەرمانڕەوایەکەی دوو مانگو پێنج رۆژ بوو رەحمەتی فراوانی پەروەردگاری لێبێت، سەلاحەدینی برازاشی بووە جێنشینی لەوەزارەتەکەیدا[2]، ئەسەدەدینیش یەکێك بوو لەفەرماندە گەورەکانی نورەدین، پاشای دادپەروەریش بۆ ئەو هەنگاوە گەورە هێشتبوویەوە کەزەمینەسازی بۆ دەکرد، کەئەویش لکاندنی میسر بوو بەوڵاتی شامەوە، ئەسەدەدین بەرەحمەت بێت زۆر بەخشندە بوو لەگەل سەربازەکانیداو، زۆر یەکلاکەرەوەو یاسا چەسپێن بوو لەناویانداو سامو شکۆی لای سەربازەکانی هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا خۆشیان دەویستو لەگەڵیدا شاڵاوی گەورەیان ئەنجامداو رووبەڕووی مەترسی زۆر بوونەوە[3]، کەسودی باشی هەبوو بۆ ئیسلامو موسوڵمانانو رۆڵی هەبوو لەبەهێزکردنی پرۆژەی رووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری خاچپەرستی کەنورەدین محمودو دواتریش سەلاحەدین رابەڕایەتیان دەکرد، هەروەها شێرکۆ ئازاو لێهاتوو بەجەرگ بوو، بەهێز بوو لەخوا پەرستیداو توندو تیژ بوو لەبەرامبەر بێباوەڕانو پەرستیشی زۆرو پاكو دیندار بوو، خێرو بێری زۆری دەکردو خەڵکی زاناو ئایین پەروەری خۆشدەویست، زۆر لەخۆ بردوو بەسۆز بوو بۆ خزمەکانی بەڵام زۆر دەستی بۆ شل نەدەکردن، پارەو

---

[1] کتاب الروضتین، ل: ٢٠٣-٢٠٤.

[2] الجهاد والتجدید، ل: ٢٠٤.

[3] الجهاد والتجدید، ل: ٢٠٤.

سامان و ئەسپ و مەڕو ماڵات و وشترێکی زۆری بەجێهێشت و وێڕای پێنج سەد کۆیلە، کەئەوانیش ئەسەدیەکان بوون کەڕۆڵیان هەبوو لەبنیاتنانی دەوڵەتی ئەیوبیدا[1].

**سێیەم: وەزارەتی سەلاحەدین لەمیسرو ئەو کارانەی کە بەئەنجامی گەیاند:**

سەلاحەدین پێشتر لێهاتوویی خۆی لەکاتی هاوڕێیەتی مامیدا پیشاندابوو، لەکاتی هەڵمەتەکانی شێرکۆدا بۆ سەر میسر، بۆیە پاش کۆچی دوایی مامی وەزارەتەکەی گرتە دەست، لەتەمەنی سی و یەك ساڵیدا عاضد هەڵیبژارد، چونکە کەمتەمەنترین ئەمیر بوو ئەویش ئومێدی ئەوەی پێی هەبوو کەزیاتر گوێڕایەڵی بێت بەلام (الملك الناصر) (پاشای سەرکەوتوو) وەك عاضد ناوی لێنابوو فاطمیەکانی هیوا بڕ کردو، دەستی دایە ڕاکێشانی دڵی خەڵك بەلای خۆیداو ئەو پارانەی بەسەردا دابەش کردن کەمامی کۆی کردبوویەوە، خەڵکیش مەیلیان بۆی هەبوو و خۆشیان دەویست و توانای بەتەواوی دەست بەسەر سوپادا بگرێت[2]، ئەو کارانەش کە سەلاحەدین بەئەنجامی گەیاند گەورەو گرنگ بوون و توانی ناوەندەکانی هێز لەناو بەرێت.

١- **پیلانی ئەمینداری خیلافەت:** روداو گەلێکی زۆرباش وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لەلایەن سەلاحەدینەوە روویدا، بەتایبەت کەمیسر بەقۆناغێکی ترسناکدا تێدەپەڕی، چونکە دەوڵەتی فاطمی هێشتا مابوو سوپاو پیاوە گەورەکانی دەوڵەت پاڵپشتی بوون، هەڕەشەی خاچپەرستانیش هێشتا لەنزیك دەروازەکانی رۆژهەڵاتی میسرەوە خۆی مەلاس دابوو، بۆیە پێویست بوو لەسەر سەلاحەدین کە لێهاتوویی خۆی لەدەسەلاتدا بسەلمێنێت هە تاوەکو دەسەلات بۆی یەکلا ببێتەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو پێشهاتە سیاسیانەی کەدێنە پێش، زۆری نەخایاند توانایەکی فراوانی پیشاندا لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵاتداو سوریش بوو لەسەر دەستگرتن بەسەر هەموو دەسەلاتەکاندا بەوانەشەوە کەتایبەتن بەخەلیفەوە هەروەها چەند ڕێو شوێنێکی گرتەبەر کەدەسەلاتی تەواوی بۆ مسۆگەر دەکرد لەوانە:

*ڕاکێشانی دڵی خەڵکی میسر بەو پارەو سامانەی کە پێی بەخشین و خۆشەویستی خستە دڵیانەوە.

*سەربازو خزمەتکارەکانی ئەسەدەدین شێرکۆی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو بەتەواوی دەستی گرت بەسەر سوپادا دوای ئەوەی کە بەباشی مامەڵەی لەگەڵدا کردن.

---

[1] الموسوعة الشاملة (ج٢٤/٧٣).

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٠٥.

*پێگەی خۆی بەهێز کرد بەهۆی ئەو یارمەتیە سەربازیانەی کە لەنورەدین محموودەوە پێی دەگەیشت، لەگەڵ یەکێك لەیارمەتیە سەربازییەکانیشدا شمس الدین توران شای کوڕی ئەیوبی برای گەیشت[1]، ئەو ڕێوشوێنانەش کەسەلاحەدین گرتیە بەر بووە هۆی بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەسەر داهاتەکانی وڵاتداو، لایەنگیری عاضدی کەم کردەوەو پێگەی ئیمامەتی لاوازکردو بوە مایەی بێزاری گەورەی طواشیەکان کە ئەمینداری خەلافەتو سەربازی سوپای سودانو خەڵکی وڵاتی نۆبە(سودان) بوو، ئەم پیاوە تێگەیشت کە ئەم ڕێبازەی کەسەلاحەدین گرتوویەتیە بەر ئەگەر بەردەوام بێت، دەبێتە هۆی لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی لەئێستا یان داهاتوو وادیارە ئەمیش چاوی بڕیبووە جێنشینی شاور، کاتێ نەیتوانی لەپیلانو نەخشەکەیدا سەرکەوتوو بێت دەستی دایە پیلان گێڕان بۆ لەناوبردنی سەلاحەدینو هەوڵی پەیوەندیکردنی دا بەعەموری یەکەمی پاشای بیت المقدسەوە بۆ هاندانی بۆ هێرشکردنە سەر میسر، بەو هیوایەی لەکاتی دەرچوونی سەلاحەدیندا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمیش هەستێت بە دەستگیرکردنی پاشماوەی سوپاکەی لەقاهیرەداو پۆستی وەزارەت بگرێتە ئەستۆو وڵات لەگەڵ خاچپەرستەکاندا دابەش بکات، بەڵام سەلاحەدین بەم پلانەی زانی کاتێ یەکێك لەهاوکارانی گومانی کرد لەشێوەی ئەو دوو خوففەی کە نێردراوی ئەمینداری خیلافەت ئەینێرێ بۆ عەموری یەکەم، بۆیە دووخوففەکەی بردو دەزووەکانی دەرهێناو نامەیەکی تیادا دۆزییەوە، بەم شێوەیە ئەمینداری خیلافەت دەستگیرکراو ئەم هەلەشی قۆستەوە بۆ لەناوبردنی، بەڵام هەوڵی لەقبوونی پێگەی لەمیسردا خاچپەرستەکانی هاندا بۆ هەوڵدانی دووبارە بۆ هێرشکردنە سەر میسر[2]، سەلاحەدینیش هەستا بەدوورخستنەوەی هەموو خزمەتکارە سودانیەکان لەکۆشکو بەهاالدین قراقوشی کرد بەبەرپرسی ناو کۆشك، ئەویش بەبێ فەرمانی ئەو هیچ کارێکی گەورە یان بچوکی نەدەکرد[3].

٢- **جەنگی سودان:** کاتێ الطواشی[4] ئەمینداری خیلافەتو خزمەتگوزاری حەبەشی کوژراو خزمەتکارەکانی تر دوورخرانەوە توورە بوونو نزیکەی پەنجا هەزار کەسیان کۆکردەوەو

---

[1] تأريخ الفاطميين، ل: ٥٠٩ البداية والنهاية(٤٣٣/١٦).

[2] كامل في التأريخ له تأريخ الفاطميين، ل: ٥١٠.

[3] البداية والنهاية(٤٣٤/١٦).

[4] الطواشي: کۆی طاشیە ئەو خزمەتگوزارانە بوون کە لەکۆشکی سوڵتاندا کاریان دەکردو دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو.

لەگەڵ سوپای سەلاحەدیندا لەنێوان دوو کۆشکەکەدا ڕووبەڕووبوونەوەو خەڵکێکی زۆر لەهەردوو لا کوژران، عاضدیش لەکۆشکەکەیەوە سەیری جەنگەکەی دەکردو سوپای شامیش لەکۆشکەکەوە بەرد باران کراو لێشیەوە تیریان بۆ دەهات، وتیان: ئەوە بەفەرمانی عاضد بووە، وتیشیان بەفەرمانی ئەو نەبووە، پاشان شمس الدولە نورانشای برای سەلاحەدین کەئامادەی جەنگەکە بووو نورەدین ناردبووی بۆ یارمەتیدانی سەلاحەدین فەرمانی سوتاندنی ئەو شوێنەی دا کە عاضد لێیەوە دەیڕوانی، پاشان دەرگاکەی کرایەوەو هاواریان کرد: ئەمیری باوەڕداران فەرمانتان پێدەکات کە ئەو سودانیانە لەولاتەکەتان وەدەرنێن، بەم شێوەیە شامیەکان بەهێز بوون‌و سودانیەکان ترسان‌و سەلاحەدینیش سەربازەکانی نارد بۆ گەڕەکەکەیان کە بەمەنصورالباب زویلە ناسراو بوو ماڵ‌و منداڵیانی تیادا بوو خانووەکانی سوتاندن‌و ئەوانیش هەڵاتن‌و لەکاتی ڕاوەدونانیاندا خەڵکێکی زۆری لێکوشتن، پاشان داوای پەنادانیان کردو سەلاحەدینیش داواکەیانی قبوڵ کردو ناردنی بۆ ناوچەی جیزە، پاشان شمس الدولە تورانشاو سەلاحەدینی برای چوون بۆیان‌و خەڵکێکی زۆری لێکوشتن‌و تەنها خەڵکێکی کەمیان لێمایەوە: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾(النمل٥٢)[1] وادیارە عاضدی فەرمانڕەوای میسر لەوکاتەدا ئاگادار بوو لەپیلانی ئەمینداری خیلافەت، چونکە ناگونجێ ئەوە لەکۆشکی دا ڕووبدات بەبێ زانیاری ئەو، هاویشتنی بەردو تیریش بۆ سوپای سەلاحەدین لەکۆشکی عاضدەوە ئەمە دووپات دەکاتەوە، تەنانەت عاضد بۆخۆشی چاودێری جەنگەکەکەی دەکرد[2]. پەی بردن بەم پیلانە لەئەستۆی دیوانی ئینشائو قازی الفاضل دا بوو کە ئەندازیاری سەرەکی لەناوبردنی فاطمیەکان‌و چەسپاندنی مەزهەبی سوننە بوو لەمیسردا کە دواتر بەدرێژی باسی دەکەین لەکاتی قسەکردنماندا سەبارەت بەدەوڵەتی ئەیوبی بەپشتیوانی پەروەردگار.

قازی الفاضل چاودێری دیوانی ئینشائو ئەو کەسانەی دەکرد کەلێی دەرچوون، سیخوڕەکانیش بەهەموو لایەکدا بڵاو بووبوونەوە، لەکۆشکەکان‌و ناو سەربازەکان‌و سەر سنورو وێستگەکانی پۆستەو پەیوەندی کردنی نێوان میسرو فرەنجدا، ئەم سیخوڕانەش پەیوەندی ڕاستەو خۆیان بەقازی فاضلەوە هەبوو بەهۆی نێردراوەکانیەوە ڕاپۆرتی خۆیان پێشکەش دەکردو بەکۆتری نامەبەرەوە بۆیان نارد[3].

---

[1] البداية والنهاية(١٦/٤٣٥).

[2] الطريق الى القدس، ل: ٩١.

[3] القاضى الفاضل عبدالرحيم البيسانى العسقلانى، ل: ١٣٠، ١٣١.

٣- **لەناوبردنی ئەرمەنەکان:** سەرکەوتنی سەلاحەدین تەنها بەلەناوبردنی هێزەکانی سودان کۆتایی نەهات بەڵکو لەناوبردنی هێزی ئەرمەنیشی بەدوادا هات، ئەمانیش هێزی دووەم بوون دوای سودان لەڕووی بەهێزیو ژمارەوە، ئەوەبوو خانوویەکی ئەرمەنەکانی لەنێوان هەردوو کۆشکدا سوتاند بەژمارەیەك سەربازی ئەرمەنەوە کەزۆرینەیان تیر هاوێژ بوونو موچەیان لای دەوڵەت هەبوو، ئەوانیش پێشتر هەوڵیان دابوو کۆسپ دروست بکەن بۆ پێشڕەوی هێزەکانی سەلاحەدین لەکاتی جەنگیدا دژی بەسودان، بەتیر هاویشتن بۆیان بۆیە بەسزای خۆیان گەیەندان ئەوانەش کەمانەوە لێیان لەلایەن سەلاحەدینەوە دوورخرانەوە بۆ صعید[1]، بەلەناو بردنی هێزی سودانو ئەرمەنیش سەلاحەدین توانی دەوڵەتی فاطمی تارادەیەکی باش لاواز بکات، بەجۆرێك کە ئاشکرا بوو لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمیش زۆری نەماوە[2].

٤- **گرنگی دانی سەلاحەدین بەبەهێزکردنی سوپاکەی:** هەر کە سەلاحەدین وەزارەتی گرتە دەست دەستی کرد بەئامادەکردنی سوپای ئەیوبی هەتاوەکو ببێتە ناوکێك بۆ سوپایەکی میسری نوێ کە بتوانێ بەرگری لەدەسەڵاتیانو وڵاتی میسر بکات لەبەرامبەر هەڕەشەی فرەنجەکاندا، تێکچوونی سوپای فاطمیو لەبەریەك هەڵوەشانەوەشی لا شاراوە نەبوو، چونکە لەسێ گەشتەکەیدا بۆ میسر لەنێوان ساڵەکانی (٥٥٩ك-٥٦٤ك/ ١١٦٣ز-١١٦٨ز)دا ئەو سوپایەی تاقیکردبووەیەوەو بەباشی شارەزای بوو لەڕووی سەرچاوە مرۆییو ماددیو جەنگەکانەوە هەروەها لەڕووی رێکخستنی تیپەکانی کە لەسەر بنەمای رەگەز دانرابوون وەك سودانو ئەرمەنو میسریەکانو دەیلەمو تورکەکانو عەرەبەکان، هەروەها بەوردی بارودۆخی هەموو تیپێك لەم تیپانەی دەزانی[3]، پێشتریش قازی الفاضل لەبەڕێوەبردنی ئەم هێزانەدا کاری کردبوو کە لەسەردەمی روزیکی کوڕی صاڵحداو لەهەندێ کاری سەربازیدا. هاوکارییبوو لەشاڵاوی دووەمی فرەنجەکانی شام بۆ سەر میسر وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، هەورەها فەرماندەی تیپە جیاجیاکانی ئەم هێزانەی بینی لەکاتێکدا کەملململانێدابون لەسەر دەسەڵات ئەو کارەی کەهێزەکانی ماندوو کردو میسری بەڕادەیەکی زۆر لاواز کرد بەجۆرێك کە نەیدەتوانی بەرگری لەسەربەخۆیی خۆی یاخود مانەوەی بکات، هەروەها قازی الفاضل زۆرێك لەهێزەمیسریەکانی دەناسی لەڕێی کارکردنیەوە لەگەڵیاندا لەدیوانی سوپاودیوانی ئینشادا کەمامەڵەی لەگەڵ دیوانی سوپا دەکردو سەرپەرشتی سیخوڕو نێردراوەکانی دەکرد،

---

[1] القاضی الفاضل عبدالرحیم البیسانی العسقلانی، ل: ١٣٠، ١٣١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٣٣.

[3] القاضی الفاضل عبدالرحیم البیسانی العسقلانی، ل: ١٣٦.

بۆیە چاك ئەم هێزانەی دەناسیو بەئاگا بوو لەهەموو تیپەکانیو مەبەستی سەرکردەکانیان، هیچ زانیاریەکیشی لەم زانیاریانە لەسەلاحەدین نەشاردبووەوە بەڵکو هەمووی بەکارهێنابوو بۆ رێکخستنی سوپای ئەیوبیو بەڕێوەبردنی، بەدرێژایی کارکردنیشی لەگەڵ سەلاحەدیندا سەرپەرشتی سەربازەکانی دەکرد، چاودێری ئامادەسازیو رێکخستنیو سەرچاوە داراییەکانی دەکرد، لەمیسرەوە بۆ شام هاوڕێیەتی دەکرد هەتاوەکو لەتەنشت سەلاحەدیندا بجەنگێنو لەشامیشەوە بۆ میسر هەتاوەکو ئامادەباشو ساز بێت بۆ هەڵمەتەکانی داهاتوو دژ بەفرەنجەکان، هەروەها سەلاحەدین لەسەرەتای دەست بەکار بوونیەوە لەوەزارەتدا سوپایەکی گەورەی پێکهێنا کە بەتێپەڕبوونی کات لەڕووی ژمارەو کەرەستەوە روو لەزیاد بوون بووو فراوان بوونی کارە سەربازیەکانیشی دژ بەفرەنجەکان یارمەتیدەری بوو لەم بوارەدا، پاسەوانی تایبەتیش لەمیسردا بڕبڕەی پشتی ئەم سوپایە بوون، پاشان ئەو سوپا جەماوەرییەی کە لەئەمیری کەرتو ناوچەکانو سەربازەکانیان پێك دەهاتن، بەتایبەت لەشامو جزیرەدا دوای ساڵی ٥٧٠ك/١١٧٤ز هەروەها بیابان نشینەکانیش[١]، ئەمەش بەشێوەیەکی تەواو لەباسی دەوڵەتی ئەیوبیو سەلاحەدیندا دەبێت بەپشتیوانی پەروەردگار روون دەکردێتەوە.

**چوارەم: بەرەنگاربوونەوەی شالاوی خاچپەرستی بیزەنتی هاوبەش و گەمارۆی دومیاط ٥٦٥ك:**

فرەنجەکان درکیان بەترسناکی بارودۆخیان کردبوو پاش ئازادکردنی میسرو وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لەلایەن سەلاحەدینەوە، بۆیە پاشای قودس عەموری یەکەم و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی رێککەوتن لەسەر هێشکردن بۆ سەر میسر بەکەشتیگەلەکانیانەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەو هاوپەیمانیەتیەش گەمارۆی دومیاطیان دا[٢] سەلاحەدینیش هێزەکانی بەسەرکردایەتی شەهاب الدین محمود خاڵیو تقی الدین عومەر ی برازای ناردو، نوێنەرێکیشی نارد بۆ لای نورەدینو ئەو مەترسیانەی بۆ باس کرد کەرووبەڕوویان دەبێتەوەو وتی: ئەگەر فریای دومیاط نەکەوم فرەنجەکان دەستی بەسەردا دەگرن، ئەگەر بەرەو ئەویش بەرێبکەوم میسریەکان دەست دەکەن بەخراپەو لە گوێڕایەڵیم دەردەچنو بەشوێنمدا دێنو فرەنجەکانیش لەپێشمەوەنو بەهەردوولا لەناومان دەبەن[٣].

ئەوەبوو نورەدینیش هەستا بەو ڕۆڵەی کەلێی چاوەڕوان دەکراو بڕیارێکی دروستی داو هێزێکی بەرێخست بۆ لای، خۆشی بەرێکەوت بەرەو فرەنجەکانی وڵاتی شامو دەستی کرد بەهێرشکردنە

---

[١] القاضی الفاضل، ل: ١٢٧.

[٢] الجهاد والتجدید، ل: ٢٠٧.

[٣] الجهاد والتجدید، ل: ٢٠٧.

سەر قەڵاو پێگەکانیان‌و سریەکانی توانیان بگەنە ئاستێك کەپێشتر پێینەگەیشتبوون لەپێناو سوك کردنی فشار لەسەر میسر، ئەمەش بەهێزکردن‌و پشتیوانیەکی باش بوو بۆ سەلاحەدین هەتاوەکو بتوانێت باشتر میسر کۆنترۆڵ بکات‌و یەکلاش بێتەوە بۆ هاوکاری کردن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی ستراتیژی گەورە کەخۆی لەرزگارکردنی کەنارەکانی وڵاتی شامدا دەبینیەوە لەدەستی داگیر کەری فرەنجی[1]، ئەوەبوو پاسگای دومیاط رۆڵێکی پاڵەوانانەی گێڕا لەپارێزگاریکردن لەو شارەو زنجیرێکی زەبەلاحیان فرێدایە دەریاکەوە بووە رێگر لەبەردەم گەشتنی کەشتیە یۆنانیەکانداو موسوڵمانە بەرگریکارەکانیش زیانێکی زۆریان گەیاند بەکەشتیگەلی بیزەنتی یۆنانی‌و بارانێکی زۆریش سەربازگەی خاچپەرستەکانی کردە زۆنگاو بۆیە خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوەو بەجێهێشتنی دومیاط دوای گەمارۆدانێك کە پەنجا رۆژی خایاند، کاتێ کەشتیگەلی بیزەنتی لەدەریاوە کەوتە رێ، گەردەلولێکی توند هەڵی کردو دەریاوانەکانیان کە خەریك بوو لەبرسا دەمردن نەیانتوانی کەشتیەکانیان کۆنترۆڵ بکەن‌و زۆربەیان نوقمی ئاوو بوون‌و خوای گەورەش سەرکەوتنێکی مەزنی کردە خەڵاتی موسوڵمانان[2].

١- **هۆکارەکانی شکستی هەڵمەتەکە بۆ سەر دومیاگ:** هۆی تێکشاندنی شالاوی خاچپەرستەکان بۆ سەر دومیاط دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار کە پەیوەندی بەموسوڵمانەکان‌و خاچپەرستەکان‌و بیزەنتیەکانەوە هەیە بەتایبەت بەهەردوو لایەنی خاچپەرستی‌و بیزەنتی پێکەوە:

أ- **سەبارەت بەلایەنی ئیسلامی دەتوانین ئەم هۆکارانە دەست نیشان بکەین:**

- خۆڕاگری خەڵکی دومیاگ لەبەرامبەر داگیرکەراندا.
- پەلەکردن لەکۆمەکی کردنی شارەکە کە بەئازووقەو چەك لەلایەن سەلاحەدینەوە کەبووە هۆی بەرزکردنەوەی ورەی دانیشتوانی گەمارۆدراوی شارەکە .
- هاوکاری راستگۆیانە لەنێوان هێزە ئیسلامیەکان لەوڵاتی شام‌و میسردا بەئامانجی بەرپەرچدانەوەی داگیرکەران.
- توانای جەنگی هێزە ئیسلامیەکان‌و باشی پلان‌و رێکخستنی وردیان[3].
- هەڵوێستی هاوکاری‌و پشتگیرانەی نورەدین محمود، ئەوەبوو چەند کومەکیەکی یەك لەدوای یەکی نارد. پاشان نورەدین ئامادەنەبوونی فرەنجەکانی لەوڵاتەکەیاندا قۆستەوەو

---

[1] دور نورالدين محمود في نهضة الأمة، ل: ١٦٠.

[2] الجهاد والتجديد، ل: ٢٠٨.

[3] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٧٩.

بەسوپایەکی زۆرەوە پەلاماری دانو چووە وڵاتیانەوەو ماڵو سامانێکی زۆری بردنو پیاوانێکی زۆری لێکوشتنو ژنو منداڵێکی زۆری لێ گرتن، کاتێ فرەنجەکان بەمەیان زانی ناچاربوون دومیاط بەجێبهێڵنو بگەڕێنەوە بۆ شام[1].

- سود وەرگرتنی باشی موسوڵمانەکان لەو هەلانەی کەبۆیان رەخسا، ئەوەبوو هەلی برسیبوونی بیزەنتیەکانیان قۆستەوەو هێرشێکی توندیان کردە سەریان کە کاریگەری باشی هەبوو، هەروەها سودیان لەهەڵکردنی بای باش وەرگرت بۆ ئاگر تێبەردانی کەشتیگەلی بێزەنتی بەهۆی سوتێنەرێکەوە[2]، لەهەموو ئەمانەش گرنگتر پشتیوانیو پارێزگاریو لەگەڵابوونی پەروەردگارو دابەزاندنی سەرکەوتنی بوو بۆ بەندە تێکۆشەرەکانی.

**ب- سەبارەت بەلایەنی خاچپەرستی:**

- پاشا عەموری یەکەم سێ رۆژ هێرشی خۆی بۆ سەر شارەکە دوا خست هەتاوەکو کەشتیگەلی بێزەنتی بگاتە جێ، ئەمەش هەلێکی باشی بۆ موسوڵمانەکان رەخساند بۆ تۆکمەکردنی شارەکەو ناردنی جەنگاوەرو کەرەستەی زیاتر بۆی[3].
- خۆلادانی هێزە خاچپەرستەکان لەکۆمەکی پێشکەشکردن بەسوپای بیزەنتی کاتێ رووبەڕووی هێرش بوویەوە لەلایەن موسوڵمانەکانەوەو بینینی هەڵوێستی بینەر[4].

**ج- سەبارەت بەلایەنی بیزەنتیش دەتوانین ئەم هۆکارانە دەستنیشان بکەین:**

- بەکار نەهێنانی کەشتیگەلی بیزەنتی بەشێوەیەکی سەربازی لەلایەن فەرماندە کونتوستیفانۆسەوەو دەرکەوتنی وەك سەرکردەیەکی وشکانی نەك دەریایی.
- رۆڵی کەشتیگەلی بیزەنتی کورت بوبویەوە لەگواستنەوەی هێزەکان بۆ کەناری دومیاط.
- سەرکردەی بیزەنتی تێڕوانینێکی سەربازی دروستی نەبوو، کاتێ کەشتیە بیزەنتیەکانی بەتەنیشت یەکەوە هێشتەوە لەنیلدا، ئەمەش کاری هێزە ئیسلامیەکانی ئاسان کرد بۆ ئاگر تێبەردانی چەند دانەیەکیان.
- هێواشی سەرکردەی بیزەنتی لەجێبەجێکردنی ئەو بنەما سەربازیانەی کەئاسایشی کەشتیەکانی مسۆگەر دەکات کاتێ رێی دا بەدەریاوانەکانی لەدەرەوەی کەشتیەکانیاندا بمێننەوە لەکاتی بەڕێوەچوونی کردە سەربازییەکاندا.

---

[1] البداية والنهاية(١٦/٤٤٠).

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨٠، معالم الأمبراطورية البيزنطية محمود سعيد عمران، ٣٣٠.

[3] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨٠.

[4] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨٠.

• بڵاوبونەوەی برسێتی لەنێوان هێزە بیزەنتیەکاندا.

**د- چەند هۆکارێکی هاوبەش کە پەیوەستن بەخاچپەرستو بیزەنتیەکانەوە، لەوانە:**

١- خراپ هەڵبژاردنی کاتی دەرچوونی هەڵمەتەکەو جێبەجێکردنی گەمارۆکە لەوەرزی زستاندا، کەبووە هۆی ئەوەی سوپای هاوپەیمانان رووبەڕووی لافاو ببێتەوەو ئەمەش بووە هۆی نوقوم بوونی سەربازگەکەیانو بەهۆی ئەو گەردەلولەی کە بووە هۆی دوورخستنەوەی کەشتیەکانیان لەکەنارەکە.

٢- خراپ هەڵبژاردنی ئەو شوێنەی کە سەربازە هاوپەیمانەکان کردیانە سەربازگە، کەئەویش ئەو ناوچەیە یە کە بەدرێژایی کەنار دەریا درێژدەبێتەوە، نزیکەی میلێك دەبوو چونکە جێگەی ئەو هەموو سەربازە نەدەبوویەوە کە بەپەنجا هەزار کەس مەزەندە دەکراو هەموو لەم شوێنە تەسکەدا کۆکرانەوەو ئازادی جوڵەو بڵاوبوونەوەی پێویستیان لەدەست دا بۆ چوونە ناو جەنگێکی سەرکەوتووەوە.

٣- خراپ هەڵبژاردنی شوێنەکە وای کرد کە هێزە هاوپەیمانەکان ببنە ئامانجی هێرشو پەلاماری موسوڵمانەکان.

٤- نەبوونی سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو، نەبوونی هەماهەنگی لەنێوان هەردوو سەرکردەی خاچپەرستو بیزەنتیدا، ئەمەش بووە هۆی شکست هێنانی کردە سەربازییەکان بۆ سەر ئەو شارەو بڵاو بوونەوەی پڕوپاگەندە لەناو سەربازگەکانیانداو تۆمەتبارکردنی یەکتر بەوەی کە هۆکاری شکست هێنانی هەڵمەتەکەیە[1].

٢- **دەرئەنجامەکانی هەڵمەتەکە بۆ سەر دومیاط:** دوای شکست هێنانی هەڵمەتە هاوبەشەکە بۆ سەر دومیاط ئەم رووداوە بووە خاڵی وەرچەرخانی گرنگ لەمێژووی رۆژهەڵاتی نزیکدا، چونکە ئەگەر ئەم هاوپەیمانێتیە خاچپەرستیە سەرکەوتوو بوایە لەبەدیهێنانی ئەنجامەکانیدا ئەوە لەوانە بوو ببێتە رێگر لەبەردەم یەکگرتنی شامو میسردا کەمەترسییەکی راستەوخۆ بوو بۆ سەر خاچپەرستەکان لەشامدا، هەروەها لەمپەرێك دەبوو لەبەردەم هەوڵی موسوڵمانەکاندا بۆ بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستەکانو وەدەرنانیان لەناوچەکە.

• شکستهێنانی شاڵاوی گاورەکان خاڵی وەرچەرخان بوو لەدیاریکردنی ئایندەی سەڵاحەدینداو، وەك کەسێکی بەتواناو، میسرو دەوڵەتی فاطمی دڵنیا کردەوە لەوەی کە سەڵاحەدین توانای پاراستنی ئەو وڵاتەی هەیە لەبەرامبەر هێرشەکانی دوژمندا، ئەمە وێڕای

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨١.

پارێزگاریکردن لەپێگەکەی لەبەرامبەر پیلانی ناحەزاندا، بەم شێوەیەش توانی ببێتە جێی سەرسامی هەموان.

- موسوڵمانەکانی کردە هێزێك کە هەر.
- هەڕەشەی راستەوخۆ لەمیرنشیەنە خاچپەرستەکان دەکەن بەشێوەیەك کەرۆژ لەدوای رۆژ خاچپەرستەکان هەستیان بەتەنگ پێهەڵچنینی زیاتر دەکرد دوای ئەوەی کە پێشتر تەنها مەترسی نورەدینیان لەسەر بوو لەباکورەوە، بەڵام ئێستا دەبێ هێزەکانیان لەنێوان باکورو باشوردا دابەش بکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی نورەدین مەحمودو سەلاحەدین لەیەك کاتدا[1].
- ئەگەر وەرگرتنی پۆستە وەزارەت لەلایەن سەلاحەدینەوە سەرەتای کۆتایی هێنان بێت بەدەوڵەتی فاطمی ئەوە شکستخواردنی گاورەکان لەدومیاط، هەنگاوێکی تر بوو بۆ لەناو بردنی ئەم دەوڵەتە چونکە خەلیفە عاضد هەوڵی رزگاربوونی دەدا لەدەسەڵاتی سەلاحەدین، بەڵام ئەو شکستەی کەدوچاری هەڵمەتەکە بوو، عاضدی بێهیوا کردو بواری یەکلاکردنەوەی دەسەڵاتیشی بەسەلاحەدین بەخشی لەمیسردا، ئەمە جگە بەئاکامگەیاندنی هەوڵەکانی بۆ لاوازکردنی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی، بەم شێوەیە دەوڵەتی فاطمی دوا هیوای لەدەست دا بۆ رزگار بوون لەدەست سەلاحەدین‌و سەلاحەدینیش بووە گەورەی میسر بەبێ رکابەر[2].

٣- **گەیشتنی نجم الدین ئەیوب بۆ میسر:** سەلاحەدین داوای لەنورەدین کرد کە باوکی بنێرێت بۆ لای‌و نورەدینش رەزامەندی خۆی لەسەر ئەم داوایە نیشان داو داوای لەنەجمەدین ئەیوب کرد کە خۆی ئامادە بکات بۆ بەرێکەوتن بەرەو میسرو نامەیەکیشی پێدا نارد بۆ سەلاحەدین کە تیایدا فەرمانی پێدەکرد کە پەلە بکات لەهەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی فاطمی لەمیسرداو خوێندنەوەی وتار بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە[3]، لەگەڵ کاروانی نەجمەدین ئەیوبیشدا ژمارەیەکی زۆر بازرگان‌و خاوەن بەرژەوەندی بەرێکەوتن، نورەدین محمودیش مەترسی هەبوو لەوەی کەفرەنجەکان رێ بەکاروانەکە بگرن بۆیە بەسوپاکەیەوە بەرەو کرك بەرێکەوت‌و گەمارۆی دا هەتاوەکو لەتێپەڕبوونی کاروانەکەو لەو ناوچەیە دڵنیا بوو پاشان بەجێی هێشت‌و گەڕایەوە بۆ دیمەشق[4]، دواتر نەجمەدین ئەیوبی باوکی سەلاحەدین گەیشتە قاهرەو لەبیست‌و چواری رەجەبی ساڵی ٥٦٥ك دا عاضدیش خاوەنی کۆشك چووە دەرەوە

---

[1] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨١.

[2] تأريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام، ل: ٣٨٢.

[3] دور نورالدين محمود في نهضة الأمة، ل: ١١٥.

[4] دور نورالدين محمود في نهضة الأمة، ل: ١١٦.

بۆ پێشوازی لێکردنیو ڕێزێکی زۆری لێنا، هەمان ڕووداوی پێغەمبەر یوسف(ﷺ) لەگەڵ باوکیدا یەعقوب(ﷺ) بۆ سەلاحەدینو باوکی دووبارە بوویەوە. کاتێ هاتە لایو بینی کوڕەکەی دەسەلاتداری میسرەو وتی: ﴿ادْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَاء اللّهُ آمِنِينَ﴾ (یوسف ٩٩) هەروەها باسی ئەوە دەکەن(الملك الناصر) سەلاحەدینو عاضد چوونە دەرەوە بۆ پێشوازیکردن لەباوکیو لەگەڵیدا کۆبوونەوە هەندێ لەئامادەبوان ئایەتی: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَا أَبَتِ هَـذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بَي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاء بِكُم مِّنَ الْبَدْوِ مِن بَعْدِ أَن نَّزغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَاء إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (یوسف ١٠٠)، کاتێ سەلاحەدین لەگەڵ باوکیدا کۆبووەوە ڕێزێکی زۆری لێنا وەك نەریتی خۆیو هەموو کاروبارەکانی دایە دەست، بەلام باوکی بەمە ڕازی نەبوو وتی: کوڕی شیرینم خوای گەورە بۆیە تۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەم کارە چونکە شیاوی خۆتە لەبەر ئەوە نابێ ئەو کارە بگۆڕی[1]. سەلاحەدینیش گەنجینەکانی دایە دەستو لەناوچەی لۆلۆە کە بەسەر کەنداوی قاهرەدا دەڕوانێ نیشتە جێکرد[2]. دەربارەی ئەم ڕووداوە سەلاحەدین کۆبوونەوەی لەگەڵ باوکیدا عمارە الیمانی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| من شاكر والله أعظم شاكر | ما كان نعمى بني أيوب |
| طلب الهدى نصرا فقال وقد أتوا | حسبي فأنتم غاية المطلوب |
| جلبوا إلى دمياط عند حصارها | عز القوي وذلة المغلوب |
| وحلوا عن الإسلام فيها كربة | لو لم يجلوهاأتت بكروب |
| فالناس في أعمال مصر كلها | وعتقاؤهم من نازح و غريب |
| إن لم تظن الناس قشرا فارغا | وهم اللباب فأنت غير لبيب |
| صحت به مصر وكانت قبله | تشكو سقاما لم يعن بطبيب |
| عجبا لمعجزة أتت في عصره | والدهر ولاد لكل عجيب |
| رد الإله به قضية يوسف | نسقا على ضرب من التقريب |
| جاءته إخوته ووالده إلى | مصصر على التدريج و الترتيب |

دەگێڕنەوە کاتێ سەلاحەدین لەگەڵ باوکیدا کۆبوویەوە لەخانوی وەزارەتداو پێکەوە لەسەر ڕاخەرێك دانیشتن، نەجمەدین باسی ئەوەی کرد کەسەلاحەدین لەو شەوەدا لەدایك بووەو کە ئەو

---

[1] مفرج الكروب(١/١٨٦).

[2] مفرج الكروب(١/١٨٦).

تیایدا لەقەڵای تکریت دەرکراوەو وتی: رەشبینی دایگرتمو بەد بین بووم بەرامبەر بەوەی کە بەسەرمدا هات، نوسەرێکی گاورم لەگەڵدا بوو وتی: گەورەم تۆ چووزانی کێ دەڵێ ئەم منداڵە پاشایەکی گەورەو بەناوبانگو پایەداریلێدەرناچێت، دەڵێ قسەی ئەم پیاوە سۆزی بۆ سەلاحەدین جوڵاندم، ئامادەبوانیش هەموو سەرسام بوون بەم رووداوە رەحمەتی خوا لەهەموویان[1]. هەروەها نەجمەدین ئەیوب لەساڵی ٥٦٨ك دا کۆچی دوایی کرد، دوای ئەوەی لەکاتی سوار بوونیدا ئەسپەکەی سەرکەشی نواندو نەجمەدین کەوتە خوارەوە لەباب النصر لەرۆژی دوو شەممە هەژدەیەمی ذي الحجەو بردیانەوە بۆماڵی خۆیو هەشت رۆژ ژیاو پاشان لەرۆژی سێ شەممە بیستو حەوتەمی ذي الحجەدا کۆچی دوایی کرد، نەجمەدین پیاوێکی بەخشندەو بەسۆزو میهرەبانو لێبوردە بوو، بەردەرگای ماڵەکەشی پڕبوو لەوەفدی جۆراو جۆر، هەروەها نەجمەدین گەورە بوو لەدەرونی خەڵکیدا لەرووی ئاینو چاکەو هەڵسو کەوتو سیاسەتی باشەوە، هەر کەسێکیش لەخەڵکانی زانستخوازو دینداری سەردانی بکردایە میوانداری باشی دەکردو پارەی پێدەبەخشی، هەرکەسێکی دینداریشی بناسیایە سەردانی دەکرد[2]، لەو کاتەشدا سەلاحەدین لەولاتی کرکو شەوبەك دا بوو بۆ جەنگ دژی داگیر کەرانو نەجمەدینیش لەپاڵ گۆڕی ئەسەدەدینی برایدا نێژرا لە الدار السلطانية پاشان پێکەوە گوێزرانەوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆزو دورودو سڵاو لەسەر ئەو پێغەمبەرەی کەجێنشینە تیایدا، گۆڕەکەشیان لەتربة الوزير جمال الدين-ی ئەسفەهانیدایە کەوەزیری موصڵ بووە[3]. عمارەی یەمانیش شیوەنی بۆ دەکاتو دەڵێ:

صفو الحياة وإن طال المدى كدر — وحادث الموت لايبقي ولا يذر
وما يزال لسان الدهر ينذرنا — لو أثرت عندنا الآيات والندر
فلا تقل غرت الدنيا مطامعنا — فما مع الموت لا غش وكدر
كأس إذا ما الردى حياة بها — لم ينج من شكرها أنثى ولا ذكر
كم شامخ العز لاقى الذل من يدها — ما أضعف القدر إن ألوى به القدر
في كل جيل وعصر من وقائعها — شعوا يقطر منها الناب والظفر
أودى علي وعثمان بمخبها — ولم يفتها أبو بكر ولاعمر
ومن أراد التأسي في مصيبته — بفقوری برسول الله معتبر

---

[1] مفرج الكروب(١/١٨٦).
[2] عيون الروضتين(٢/٢٥٢).
[3] هەمان سەرچاوە، (٢/٢٤٩).

هەروەها نەجمەدین چەند کوڕێکی لەدوای خۆی بەجێهێشت لەوانە سەلاحەدین یوسف الناصر، سەیفالدین أبابکر العادل، شمس الدوله توران شاو شاهنشاهو سیف الاسلام طغتکینو تاج الملوك بوری، لەکچانیش ست الشامو رەبیعە خاتوون[1].

## پێنجەم: هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی فاطمی عوبەیدی:

ئەم هەنگاوە یەکێکە لەمەزنترین ئەو کارانەی کە سەلاحەدین پێی هەستا، ئەوە بوو نورەدین سوربوو لەسەر کۆتایی هێنان بەخیلافەتی فاطمی هەر بۆیە نامەیەکی نووسی بۆ سەلاحەدینی جێنشینیو فەرمانی پێدا کەوتار بەناوی خەلیفەی عەباسی المستضیءوەبخوێنێتەوەو سەلاحەدینیش پۆزشی هێنایەوە چونکە دەترسا خەڵکی میسر دژی بوەستنەوە بەهۆی مەیلیان بەلای فاطمیەکاندا، هەروەها لەبەر ئامادەنەبوونی بەباشی بۆ ئەم کارە، بەڵام نورەدین نامەیەکی بۆ ناردەوە: پابەندی کرد بەو مەسەلەیەوە بەشێوەیەك کە بواری بۆ دواخستنی ئەو کارە نەهێشتەوە، خەلیفەی عەباسیش پێشتر نامەیەکی ناردبوو بۆ نورەدینو گلەیی لێدەکرد بەهۆی دواکەوتنی خوێندنەوەی وتار بەناوی ئەوەوە لەمیسردا. ئەوەبوو الملك العادل(نورەدین) نەجمەدین ئەیوبی بانگ کردو نامەیەکی پێدا نارد کە تیایدا هاتبوو: ئەمە فەرمانێکەو دەبێ جێبەجێی بکرێت، هەتاوەکو ئەم کارە باشو پلەو پایە پاکەمان دەست بکەوێت پێش مردن بەتایبەت. کەپێشەوای سەردەم (المستنجد) بەتەواوی چاوەڕێیەتیو گرنگترین ئاواتە بەلایەوە[2]، بەڵام سەلاحەدین دوو دڵ بوو لەرووخاندنی ئەو خیلافەتە دەترسا ، چونکە میراتی عوبەیدیەکان لەمیسردا تەمەنی لەدوو سەد ساڵ زیاترە، نورەدینیش ئازادکردنی میسری بەنیعمەتێك دەزانی لەنیعمەتەکانی پەروەردگار لەپێناو یەکخستنی وڵات لەسەر رێبازی ئەهلی سوننەتو نەهێشتنی بیدعەی شیعەگەری[3]، هەروەها بەباشیش لەبارودۆخی سەلاحەدین تێدەگەشتو بەناوی ئەمیر (ئەسفەهلارەوە) بانگی دەکرد، ئەگەر بیشیویستایە ئەوە لەمیسردا لەسەر کار لای دەبردو وڵاتێکی تری پێدەسپارد، ئەمەش ئەو قسەیە بوو کەنەجمەدین بۆ سەلاحەدینی درکاند لەمیسردا: ئەگەر بیویستایە لەسەر کار لاتبەرێت نامەیەکی دەنارد هەتاوەکو بچیتەوە بۆ لایو وڵاتەکەی دەدایە دەست کەسێکی تر[4]، لەو بەڵگانەش کەرێزگرتنی نورەدین لەسەلاحەدین دەسەلمێنێ ئەوەبوو لەوتارەکەیدا هاتووە بۆ ئیبن ئەبی عصرون کاتێ دادوەری میسری پێسپاردو تیایدا دەڵێ: تۆو کوڕەکەت دێن هەتاوەکو بتان نێرم بۆ

---

[1] عیون الروضتین (٢/٢٥٩).

[2] کتاب الروضتین لە الجهاد والتجدیدەوە، ل:٢٠٢.

[3] الجهاد والتجدید، ل: ٢١٥.

[4] کتاب الروضتین لە الجهاد والتجدیدەوە، ل:٢١٥.

میسر، ئەمەش بەڕەزامەندی هاوڕێکەم سەلاحەدینو ڕێککەوتن لەگەڵیدا، خوای گەورە سەرکەوتووی بکات من زۆر سوپاسی دەکەم، خوا پاداشتی بداتەوەو بیهێڵێتەوە،چونکە مانەوەی پیاو چاکو ساڵحەکان مایەی چاکبوونی هەموانە[1]، کەواتە حەقیقەتی پەیوەندی نێوان ئەم دوو سەرکردەیە ڕێزگرتنی دولایەنەو نرخاندنی هەوڵی یەکترەو دواتریش باس لەپەیوەندی نێوانیان دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار هەروەها وەلامی ئەو نوسەرانە دەدەینەوە کەڕیوایەتەکانی ئیبن أبی طيّو شیعەیان وەرگرتووە کە سور بووە لەسەر شێواندنو ناشرینکردنی پەیوەندی نێوانیانو تانەدان لەژیاننامەیان تا ئەو شوێنەی کەبۆی کرابێت.

١- **پلەبەندی لەهەڵوەشاندنەوەی وتاردان بەناوی خەلیفەی فاطمي یەوە:** سەلاحەدین سودی وەرگرت لە قازی فاضل ئەو پیاوە گەورەو کەم وێنەیە، ئەوەبوو یارمەتی دا بۆ دانانی پلانێکی تۆکمەو ورد لەپێناو لەناوبردنی دەوڵەتی فاطميو مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلیو سەلاحەدینیش بەو پەڕی وردەکاریەوە هەستا بەجێبەجێکردنی، پاش ئەوەی کە سەلاحەدین میسریەکانی سازدا بۆ کودەتا کردنو نینۆکی دەزگای فاطمی کرد، پاش لەسەر کار لابردنی دادوەرە شیعەکانو هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنەکانی بانگەوازو لەناو بردنی سەرچاوەکانی مەزهەبی شیعە، ئەوەبوو لەساڵی ٥٦٥ك/ ١١٦٩زدا (حی علی خیر العمل) محمد علی خیر البشري لەبانگدا لابرد، مەقریزیش باسی ئەوە دەکات کە ئەمە یەکەم تەنگی بوو بەسەر دەوڵەتدا داهات[2]. پاش ئەوە لەڕۆژی هەینیدا دەی ذي الحجە ٥٦٥ك/ ١١٦٩-١١٧٠ز دا فەرمانی دا کەناوی خەلیفەکای ڕاشدین ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانو عەلی ببرێت، لەوتاردا پاشان باسی عاضد بکرێت بەجۆرێك کەگومان لای شیعەکان دروست بکات، ئەوە بوو وتار بێژ دەیوت: خوایە گیان عاجد باش بکە بۆ ئاینەکەت[3]. هەروەها دادوەری لەقاهیرەدا سپارد بەزانا عیسای هەکاری سوننیو ئەویشدادوەری شافیعی مەزهەبی لەهەموو شوێنێکی وڵاتدا داناو قوتابخانەی دامەزراند بۆ خوێندنی مەزهەبە سوننیەکان، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە تەنگی بەعاضد هەڵچنی بوو دەرماڵەکانی دەبڕیو بێبەشی دەکرد لەپارەو ئەسپو خزمەتکارو ڕێورەسمی خەلیفایەتی قەدەغە کرد کەخۆی لەئاهەنگە فەرمیەکانی جەژنەکانو....هتد دا دەبینیەوە، خەلیفەی لەکۆشکەکەیدا بەند کردبوو نەیدەهێشت لەکۆشکەکەی بێتە دەرەوە تەنها بۆ چەند بۆنەیەکی کەم نەبێت لەوانە دەرچوونی بۆ پێشوازیکردنی نەجمەدین ئەیوبی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٥.

[2] المقیزی (الإتعاظ) (٣/٣١٧)، القاضی الفاضل ١٣٧.

[3] المقیزی (الإتعاظ) (٣/٣١٧)، القاضی الفاضل ١٣٧.

باوکی سەلاحەدین بەم شێوەیە عاضد لەکۆشکەکەیدا کەناری گرتو بوو بە نێچیری خەمو نەخۆشی[1] لەم کاتەدا سەلاحەدین تێگەیشت کە بارودۆخەکە لەبارە بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی فاطمی کە لەحاڵەتی ئاوابووندا بوو بۆ ئەم مەبەستەش ئەنجومەنێکی گەورەی پێکهێناو فەرماندەکانی سوپاو زانایانی سوننەو صۆفیەکانی کۆکردەوەو داوای راوێژو ئامۆژگاری لێکردن هەموو ئامادەبوانیش رێککەوتن لەسەر هەڵگرتنی ئەو هەنگاوە یەکلاکەرەوەیە لەژیانی ئەو وڵاتەدا[2]. لەسەرەتای ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١-١١٧٢ز دا سەلاحەدین وتاری بەناوی فاطمیەکانەوە نەهێشتو ئەم کارەشی بەپلەبەندی کرد لەجومعەی یەکەمی موحەرەمی ٥٦٧ك-١١٧١-١١٧٢زدا ناوی عاضدی لەوتاردا لابردو لەهەفتەی دووەمیشدا بەناوی مستضیء بأمر الله باوکی الحسنی کوڕی المستنجده بالله وتاری خوێندەوە بەم شێوەیە ئەو جۆرە وتارە کۆتایی پێهاتو هەتا ئەمڕۆش لەمیسردا وتاری فاطمی دووبارە نەبووەتەوە[3].

تیبینی ئەوەش دەکرێت کەوتار بەناوی عەباسیەکانەوە یەکەمجار لەئەسکەندەریەدا پێش قاهرەدا چونکە ئەوێ هەر لەسەر مەزهەبی سوننی مابوویەوە بەدرێژایی سەردەمی فاطمیەکان[4]، ئەمەو عاضد لەدەیەمی محرمی ساڵی ٥٦٧ك ١١٧١- ١١٧٢زدا[5] کۆچی دوایی کردو دەڵێن سەلاحەدین کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی عاضدی فاتمی بیست دوای چەند رۆژێك پەشیمان بوو لەوەدا کە پەلەی کردووە لەلابردنی ناوی لەوتارداو وتی: ئەگەر بمزانیایە لەم کاتەدا دەمرێت ئازارمان نەدەدا بەهەڵگرتنی ناوی لەوتاردا، قازی الفاضلیش پێکەنیو وتی: ئەگە بیزانیایە ناوی لانابەن نەدەمرد[6]. ئەوەبوو ئامادەبوان زەردەخەنەیەکیان یۆ ئەم سوعبەتەی نێوان وەزیر سەلاحەدینو نوسەرو راوێژکارەکەی کرد. کە دوا پەڕەی لاپەڕەکانی مێژووی دەوڵەتی فاطمی عوبەیدی تیایدا پێچرایەوە[7].

٢- **کۆچی دوای العاضد لەساڵی ٥٦٧ك:** ئیبن کثیر دەڵێ: عاضد لەزمانەوانیدا واتە: قاطع واتە بڕەر دەوڵەتیان لەودا بردایەوە، ناوی عبداللەیەو باوکی محمەدی کوڕی یوسف الحافظ ی

---

[1] الخطط المقریزی لە صلاح الدین الأیوبي قلعەجي یەوە، ل: ١٦١.

[2] صلاح الدین الأیوبي، قدری قلعجي، ل: ١٦٢.

[3] صلاح الدین الأیوبي، قدری قلعجي، ل: ١٦٢.

[4] القاضی الفاضل، ل: ١٣٧.

[5] تأریخ مصر الإسلامیة زمن سلاطین بنی أیوب، ل: ٥٩.

[6] القاضی الفاضل، ل: ١٣٩.

[7] القاضی الفاضل، ل: ١٣٩.

کوڕی محمەدی کوڕی مستنصر کوڕی الظاهری کوڕی الحاکم کوڕی العزیزی کوڕی المعزی کوڕی مەنصوری قائمی کوڕی المهدی یەکەمین پاشای فاطمیەکانەو لەدایکبوونی العاضد لەساڵی چلو شەش دا بوو بیستو یەك ساڵ ژیا، ژیاننامەی زۆر خراپ بوو شیعەیەکی پیس بوو ئەگەر بۆی بکرایە هەرچی سوننە هەیە دەیکوشت[1].

٣- **خۆشحاڵی موسوڵمانان بەنەمانی دەوڵەتی فاطمی:** کاتێ هەواڵ بەشا نورەدین گەیشت وەفدێکی نارد بۆ لای خەلیفەی عەباسیو ئاگاداری کردەوە وەفدەکە بەهاوڕێیەتی ئیبن أبی عصرون بوو، ئەوە بوو بەغداد رازێنرایەوەو دەرگاکانی داخرانو موسوڵمانەکان زۆر دڵخۆش بوون، پێشتر وتار بەناوی عەباسیەکانەوە لەمیسردا هەڵگیرابوو لەساڵی ٣٥٩ك لەسەردەمی خەلافەتی المطیع ی عەباسیدا کاتێ فاگمیەکان دەستیان بەسەر میسردا گرت لەسەردەمی المعزی فاطمیدا بنیاتنەری قاهیرەو هەتاوەکو ئەم کاتەی ئێستا کەدەیکردە ٢٠٨ ساڵ[2] شاعیرەکانیش لەگەڵ ئەم رووداوە گەورەیەدا ئاوێتە بوونو کاریگەری زۆری لەسەریان هەبوو ئەوەبوو عیمادی ئەصفەهانی دەڵێ:

توفي العاضد الدعي فما ... يفتح ذو بدعة بمصر فما
وعصر فرعونها انقضى وغدا ... يوسفها في الأمور محتكما
قد طفئت جمرة الغواة وقد ... داخ من الشرك كل ما اضطرما
وصار شمل الصلاح ملتئما ... بها وعقد السداد منتظما
لما غدا مشعرا شعار بني ... العباس حقا والباطل اكتتما
وبات داعي التوحيد منتظرا ... ومن دعاة الأشراك منتقما
وظل أهل الضلال في ظلل ... داحية من غيابة وعمى
وارتبك الجاهلون في ظلم ... لما أضاءت منابر العلما
وعاد بالمستضيء ممتهدا ... بناء حق قد كان منهدما
واعتلت الدولة التي اضطهدت ... وانتصر الدين بعدها اهتضما
واهتز عطف الإسلام من جذل ... وافتر ثغر الإيمن وابتسما
واستبشرت أوجه الهدى فرحا ... فلقرع الكفر سنة ندما
عاد حريم الأعداء منتهك ... الحمى وفيء الطغاة مقتسما

---

[1] البداية والنهاية، (١٦/٤٥١).

[2] هەمان سەرچاوە، (١٦/٤٥٠).

قصور أهل القصور أخربها عامر بيت من الكمال سما

أزعج بعد السكون ساكنها ومات ذلاً وأنه رَغما[1]

لەراستیدا نورەدین محمود نەهێشتنی دەوڵەتی فاطمی بەئامانجێکی ستراتیژی دەزانی بۆ لەناوبردنی قەوارەی خاچپەرستیو دەسەلاتی باطنی لەولاتی شامدا بۆیە سور بوو لەسەر گەڕاندنەوەی میسر بۆ دەسەلاتی ئیسلامی راستەقینە ئەوە بوو هەستا بەدانانی نەخشەی پێویستو سوپایەکی باشی ئامادەکردو چەند ئەمیرێکی لێهاتووی بۆ دیاری کرد خوای گەورەش خواستی لەسەر دەستی سەربازی دڵسۆزو فەرماندەی دەست پاك سەلاحەدین بەدەستهێنا کەهەستا بەجێبەجێکردنی سیاسەتی دانایانەی نورەدین جێی خۆشیەتی ئومەتی ئیسلامیو سەرکردەکانی دڵخۆش بن بەم مژدە گەورەیە کە بریتی بوو لەنەهێشتنی دەوڵەتی شیعەی باطنی.

٤- **ئەو پەندو وانانەی کە لە لەناوچوونی فاطمیەکان لەمیسردا وەردەگیردرێت:** ماوەی حوکمڕانی فاطمیەکان دووسەدوو هەشتا ساڵو شتێك بوو، بەڵام خێرا چوونە مێژووەوە وەك ئەوەی هەرگیز تیایدا نەژیابن، یەکەم پاشاشیان المهدی، خەڵکی سلمیەبووکە ئاسنگەرێکی بەرەچەڵەك جولەکە بوو هاتە وڵاتی مەغریبەوەو ناوی عبیداللەی لەخۆی ناو لافی ئەوەی لێدا کە خانەدانەو لەبنەماڵەی عەلیو فاطمیە (رضي الله عنه) وتی کە ئەو مەهدیە، ئەم باسەش لەلایەن چەندین زانای پایەبەرزەوە گێڕدراوەتەوە وەکو قازی ئەبو بەکری باقلانیو شێخ حامد ئیسفرایینیو چەند گەورە زانایەکی ترەوە.... مەبەست ئەوەیە کە ئەم لافلێدەرە درۆزنە ئەو درۆیەی بۆ چووە سەر کە لەو وڵاتانەدا کردیو کۆمەڵێ خەڵکی خواپەرستی نەزانیش پشتیوانیان لێکردو بەم شێوەیە دەوڵەتو دەسەلاتی گرتە دەستو شارێکی دروست کرد ناوی نا مەهدیە بەناوی خۆیەوە، پاشان بووە پاشایەکی گوێ بۆ گیراو کە بەئاشکرا خەلافەتی ئەبو بەکرو عومەر رەت دەکاتەوەو لەناخیشدا بێ باوەڕی تەواوی دەشاردەوە، پاش خۆشی قائیمی کوڕیو دواتریش ئەلمەنصور پاشان المعز، کە یەکەم کەسێکیان بوو کەبێتە میسرەوە قاهیرەی بۆ بنیات نرا، پاش ئەویش العزیزو الحاکمو الظاهرو المستنصرو المستعلیو الآمر و الحافظ والظافرو پاشان الفائزو دواتریش العاضد کەدواهەمینیان بوو، کۆی گشتیان چواردە پاشاو ماوەکەشیان دوو سەدو نەوەدو ئەوەندە ساڵ بوو، هەروەها فاطمیەکان دەوڵەمەندترینو پارەدارترین خەلیفەو ستەمکارترینو دڵڕەقترینیان بوون، هەروەك پیسترینو ناپاکترین پاشا بوون، بیدعەو کاری خراپە لەدەوڵەتیاندا سەری هەڵداو

---

[1] کتاب الروضتین(٢/١٩٥).

خراپەکاران زۆر بوون پیاو چاكو زانایانو خواناسانیان ناودا کەم بویەوە ، هەروەها لەخاكی شامیشدا نوصەیریو دورزیو حەشیشی بڵاو بوویەوەو خاچپەرستەکانیش بەتەواوی دەستیان گرت بەسەر کەنارەکانی شامدا تەنانەت قودسی پیرۆزو نابلسو عجلونو غەورو وڵاتی غەززەو عەسقەلانو کركو شوبەكو طبریە بانیاسو صور عشلیث و صیداو بەیروتو عەککاو صفدو طرابلوسو ئەنطاکیەو ئەو شوێنانەی کەسەر بەم ناوچانە بوون هەتاوەکو وڵاتی ئایاس[1] و سیس[2]یان داگیرکردو دەستیان گرت بەسەر وڵاتی ئامەدو رەهاو رأس العینو چەندین ناوچەی تر، خەڵکێکی زۆریشیان کوشت کەتەنها خوای گەورە خۆی ژمارەیان دەزانێ وێڕای بردنی سەدان ژنو منداڵی موسوڵمانان کە لەژمارەو باس نایەتو زۆری نەمابوو دەست بەسەر دیمەشقیشدا بگرن، بەڵام خوای گەورە پاراستی، کاتێ سەردەمی ئەوان بەسەر چوو دەسەڵاتیان نەما هەموو ئەم ناوچانە گەڕایەوە بۆ موسوڵمانانو بێباوەڕانیش بەسەر شۆڕی گەڕانەوەو تەنها سەرشۆڕی ماندوێتیان بۆ مایەوە[3].

**شەشەم: لەباربردنی کودەتایەك بۆ گێڕانەوەی دەوڵەتی فاطمی:**

دەوڵەتو کۆمەڵگەی ئەو کاتەی میسر لەقۆناغی گۆڕانکاری گەورەدا بوو، گۆڕانکارییەك کە خەلافەتو سیستمو دەزگاو پیاوانی فەرمانڕەوا بۆ ماوەی دوو سەدە کاریگەریان هەبوو لەسەر هەموو بوارەکانی کۆمەڵگە بۆ حوکمێکی نوێو دەوڵەتێکی نوێ کە سیستمو دەزگاو پیاوی ئاینی تایبەت بەخۆیەوە دەستی داوەتە گۆڕانکارییەکی پلەبەندی، ئەوەبوو سەلاحەدین هەوڵی ڕاکێشانی دڵی جەماوەری دەدا بۆ لای خۆیو تارادەیەکی باش سەرکەوتوو بوو، بەڵام هەندێ لەبیریارانی دەوڵەتی فاطمیو پیاوانیو چەند دەستەو تاقمێك کە ئیمتیازاتو دەسەڵاتیان لەدەستدا بوو لەسەر لایەنگیری خۆیان مانەوە بۆ فاطمەکان بۆ ئەو دەستکەوتو بیرو بۆچوونانەی کە فاطمیەکان نوێنەرایەتیا دەکرد[4] بۆیە ئەو هێزانە کە لەچەند سەربازو ئەمیرو نوسەرو فەرمانبەری دیوانو خێزانی وەزیرەکانی پێشوو وەك خانەوادەی روزەیكو شاور پێکهاتبوون هەستان بەپیلان دانا بۆ لەناوبردنی حوکمی سەلاحەیدنو گێڕانەوەی دەوڵەتی فاطمی[5]، عمادەدین ئەسفەهانیش باسیان دەکاتو دەڵێ: کۆمەڵێك لەبانکخوازانی ئەو دەوڵەتە توندڕەوو دەمارگیرە کۆبوونەوەو بەنهێنی

---

[1] ایاس: شارێکە لەوڵاتی ئەرمەندا لەکەناری دەریا.

[2] سیس: پایتەختی وڵاتی ئەرمەنە، صبح الأعشى (١٣٤/٤).

[3] البداية والنهاية(٤٥٧/١٦).

[4] صلاح الدين القائد وعصره د. مصطفى الحياري، ل: ١٦٨.

[5] كتاب الروضتين في الأخبار الدولتين(٢٨٢/٢).

سەردانی یەکتریان کرد بەنهێنی بەهیوای گەیشتن بەئاواتێك كە بووە مایەی مەرگیان ئەوە بوو خەلیفەو وەزیریان دیاریکردو راو راوێژی خۆیان تەواو رکدو بەشەودا خویان ڕێکخست، هەوڵی خۆیان بۆ یەکخست[1] وادیارە پلانەکەیان زۆر وردو تۆکمە بوو، خەلیفەو وەزیریان دەست نیشانکردو چەند جارێك نامەیان بۆ فرەنجەکان نووسیو لەیەکێیاندا داوایان لێکردن هێرش بکەنە سەر میسر لەکاتێکدا کە سەلاحەدین لەکرك بوو هەروەها ئەوانە لەدەوری عمارەی الیمنی زاناو ئەدیبی سوننی مەزهەب کە لایەنگیری فاطمەکان بوو کۆبوونەوە. هەستان بەنامە گۆڕینەوە لەگەڵ فرەنجەکاندا، پیلان گێران وایان دەزانی کەنهێنی بوونی تەواوی کارەکانیان بەرەو سەرکەوتنیان دەبات، بەلام نەیانزانی کە قازی الفاضل لەڕێگەی دیوانی ئینشاء وە خەریکی چاودێریکردنیانە بەوردی هەتاوەکو کاتی ئاشکراکردنی پیلانەکەیان دێت، سەرچاوەکانیش دەربارەی ئاشکرا کردنی پیلانەکەیان دوو چیرۆکی جیاواز باس دەکەن لەهەندێ وردەکاریدا، یەکەمیان ئەوەیە کە یەکێك لەنوسەرانی دیوان بەناوی عبد الصمدی کاتب، کەملکەچی تەواوی بۆ قازی الفاضل دەنداند، بەلام رۆژێکیان قازی بینیو ئاوڕی لێنەدایەوە قازیش وتی: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەمیش نەیاری سەلاحەدینە، پاشان ئیبن نەجای واعیظی بانگ کردو ئەم مەسەلەیەی بۆ باسکردو داوای لێکرد کە بەدواداچوونی بۆ بکات، ئەویش دوای بەدوادا چوون گەشتە ڕاستی مەسەلەکە، پاشان قازی الفاضل ناردی بۆ لای سەلاحەدینو پێی وت: کاتژمێر ئەوەندە لای ئامادە دەبیتو ئەو باسەی بۆ دەکەیت، ئەویش لای سەلاحەدین ئامادە بوو لەمزگەوتداو باسی مەسەلەکەی بۆ کرد، پاشان سەلاحەدین بانگی کردنو داوای روونکردنەوەی لێکردن، ئەوانیش دانیان بەپیلانەکەیاندا نا، ئەویش دەستگیری کردنو فەرمانی لەخاچدانی بۆ دەرکردن[2]، ریوایەتی دووەمیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەپیلان گێران زەینەدینی کوڕی نەجای واعظ یان بەشدار کردووە لەپلانەکەیانداو ئەویش سەرەتا وا خۆی پیشان دا کە لەگەڵیادایە بەلام دواتر پیلانەکەی ئاشکرا کرد بۆ سەلاحەدینو داوای لێکرد موڵکەکانی ئیبن کامل ی پێببەخشێ، سەلاحەدینیش رازی بوو داوای لێکرد تێکەلاویان بکات بۆ زانینی مەبەستەکەیان، ئەمیش هەموو گۆڕانکارییەکانی پێراگەیاندو پاشان نێردراوێکی فرەنجەکان بەدیارییەکەوە هات بۆ لای سەلاحەدینو نامەیەکی ئاشکراو نامەیەکی نهێنی پێبوو بۆ پلانگێرەکان، بەم شێوەیە سەلاحەدین ئاگادار بوویەوە[3]، هەروەها قازی فلضل بۆ خۆی ئامارەی بەوردەکارییەکانی ئەم پلانە داوە کە لەنامەکەیەکدا ئاراستەی نورەدینی کرد لەبری سەلاحەدین،

---

[1] كتاب الروضتين في الأخبار الدولتين(٢/٢٨٢).

[2] القاضي الفاضل، ل: ١٤٦.

[3] القاضي الفاضل، ل: ١٤٦، مفرج الكروب، (١/٢٤٥،٢٤٤).

ئەم نامەیەش بەڵگەیە لەسەر ئاگاداری وردی لەم پلانە، بەڵکو بەشداریکردنی لەپوچەڵکردنەوەیدا، لەوانەشە ئەو ئەو کەسەی دانابێت کە لەوردەکاریەکانی پیلانەکە ئاگارداری کردەوە، وەك لەنامەکەدا ئاماژە بەسیخوڕەکانی دیوانی ئینشائی میسری دەکات لەفرەنجەکان و خەڵکانی تر کە پەیوەندیان بەدیوانەوە هەیە[1]، هەروەها لەو نامەیەدا قازی الفاضل بەدەستی خۆی نووسی بۆ نورەدین بەناوی سەلاحەدینەوە دوای ئەو لێکۆڵینەوانەی کە سەلاحەدین ئەنجامی دا، بەشێوەیەکی تایبەت و گشتگیر قسە لەسەرەتاکانی پیلانەکەو بەرەوپێشچوونەکانی و چۆنێتی ئاشکرا کردن و لەخاچدانی پیلان گێڕەکان لەبەردەم ماڵەکانیاندا دەکات[2].

١- سەلاحەدین بەردەوام پاش لەناوبردنی خیلافەتی فاطمیش هێشتا (سەربازانی میسر)و خەڵکی ناو کۆشکی فاطمی بەدوژمنی دەوڵەت و بوونی خۆی دەزانی و چاوەڕوان بوو کە هەستن بەکارێك لەدژی بۆیە هەمیشە خۆی لێدەپاراستن و چاودێری بەسەریانەوە دانابوو بەبەردەوامی ئاگادار بوو لێیان، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام و بەنهێنی هەموو هۆکارێکیان دەگرتە بەر بۆ تۆڵە کردنەوە لێی.

٢- ئەوان هەر لەڕاگەیاندنی وتاری عەباسیەکانەوە هەتاوەکو دەستگیرکردنیان، لەهەموو کات و سات و ساڵ و ڕۆژێکدا لەپیلانگێڕی و کۆبوونەوەدا بوون و نێردراویان دەنارده لای خاچپەرستەکان بۆ هاوکاری کردنیان لەپێناو بەدیهێنانی مەبەستەکانیاندا، ئەو کارەش کەزۆر بەلایانەوە خۆش بوو پشتیان پێدەبەست ئەو نامە گۆڕینەوە بەردەوامە بوو لەگەڵ فرەنجەکاندا هەیانبوو، کەتیایدا تەماعیان دەخستە بەریان و هاتن و پێشڕەوییان لا شیرین دەکردن[3]. بەڵام فرەنجەکان لەسەرەتادا وەڵامیان نەدانەوە لەترسی سەلاحەدین بەڵام لەهەمان کاتدا بێئومێدیان نەدەکردن لەیارمەتیدانیان لەکاتی پێویستدا.

٣- کار گەیشتە ئەوەی نامەیان نووسی بۆ پاشای خاچپەرستەکان لەو کاتەدا کە سەلاحەدین هەستا بەشاڵاوی دووەمی بۆ سەر وڵاتی کرك وشوبەك بەژمارەیەکی زۆری هێزەکانیەوە، داوایان لێکرد کە هەستێ بەو ڕۆڵەی کە لەسەری ڕێککەوتوون و لەنامەکەیاندا نووسیبویان: کە ئەو دوورەو هەلەکە لەبارەو ئەگەر عەموری بەهێزەکانیەوە بەرەو صورو أیلە پێشڕەوی بکات ئەوە ڕێ لەسەلاحەدین دەگرێ و بواری گەڕانەوەی نامێنێت و لەو کاتەشدا قاهیرە ڕاپەڕین دەکات " خەڵکی ناو کۆشك و سەرجەم سەربازانی فاطمیەکان لەمیسردا" و کۆمەڵە

---

[1] القاضي الفاضل، ل: ١٤٦،

[2] صلاح ادين القائد وعصره، ل:١٦٩.

[3] كتاب الروضتين(٢/٢٧٨).

سودانیەکان‌و ئەرمەنیەکان‌و ئیسماعیلەکان خانەوادەی سەلاحەدین‌و هاوکاران‌و پیاوەکانی لەپایتەخدا لەناو دەبات[1].

بەلام هۆشیاری سەلاحەدین‌و ئەو تەکنیك‌و ئۆپەراسیۆنانەی کەپێی هەستا عەموری شپرزەکرد لەو کاتەدا کە هەوڵی دەدا جموجووڵی سەلاحەدین چاودێری بکات لەنەقەبدا لەباشوری ئوردن، هەروەها چالاکی خۆی لەلای ئاوەکانی الکرمل لەکێوەکانی خەلیلدا راگرت لەترسی ئەوەی کە سەلاحەدین هەلی جموجولی هەلەی پاشا بقۆزێتەوە، رووبکاتە ناوچەکانی رۆژئاوای ئوردون‌و دەریای مردوو.

٤- نائومێد نەبوونی پلانگێڕان: کاتێ جرج (جورج یان جور جیوس) نووسەری نامەی بۆ پاشا مەعموری گەیشتە قاهیرە بۆگەیاندنی نامەیەك بۆ سەلاخەدین. (وادیارە نامە گۆڕینەوە بەردەوام بووە، خێرا پەیوەندیان پێوەکردوو) نامەیەکیان پێدانارد بۆ پاشا عەموری: کەسەربازەکان پەرتەوازەن‌و لەناوچە جیاجیاکاندا بلاو بوونەتەوەو کاتی وەرزی دروێنەیەو تەنها هەندێکیان لەقاهیرەدا ماونەتەوە، ئەگەر کەشتیگەلێك بنێرێ بۆ هەندێ ناوچە، ئەوە فلانە کەس دەنێرێ بۆ رووبەرووبوونەوەت‌و سەلاحەدین بەتەنها دەمێنێتەوە لەشارداو ئێمەش بەو کارە هەلدەستین کە پێشتر لەشۆڕشدا باسمان کرد[2]، ئەمەش بەلگەیەکی ترە لەسەر هەولدانیان بۆ سود وەرگرتن لەبارودۆخی لەبار، لەبەرئەوەی کە کۆکردنەوەی بەرو بووم لە کێلگەکانەوە لەو کاتەدا کەئەمیری ناوچەکان‌و سەربازەکانیان تیادا روودەکەنە ناوچەکانیان بۆ وەرگرتنی پشکەکانیان‌و دابەشکردنی، ئەمەش حالەتێکی ئاسایی‌و زانراوە لەمێژووی ناوچەکە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا[3].

٥- پاشا عەموری هەرکاتێ بیویستایە بارودۆخی میسر بزانێ یان پەیوەندی بکات بەپلانگێڕانەوە بۆ گفتو گۆکردن لەگەلیاندا، جورجی نێردەی دەنارد بۆ لای سەلاحەدین: بەروالەت بۆ ئێمەو بەنهێنی بۆ لای ئەوان بوو، ئەو پیاوەتیەی دەخستە بەردەممان کە هەرگیز دەرونمان پەسەندی نەدەکردو لەگەل ئەوانیشدا ئەو شتە ناڕەوایەی گرێدەدا کە دەمانزانی، خەلکی ناو کۆشك‌و میسریەکانیش (سەربازەکان) لەکاتی ئەم کۆمەکیانەدا نێردراویان هەبوو کەهاتووچۆی دەکردو نامەی دەبرد بۆ فرەنجەکان[4].

---

[1] کتاب الروضتین (٢/٢٧٨).

[2] کتاب الروضتین (٢/٢٧٨).

[3] صلاح ادین القائد وعصره، ل:١٧٠.

[4] کتاب الروضتین (٢/٢٨٧).

٦- سیاسەتی سەلاحەدین لەم ماوەیەدا وابوو کە ئەگەر هاوکارانی گومانیان لەیەکێك لەو کۆمەلانەدا بکردایەو دەستگیریان بکردنایەو هیچ بەلگەیەکیان لەسەریان دەست نەکەوتایە، ئازادی دەکردن بەلام لێخۆش بوون چاو قایم ترو نەرمی نواندن توند تری دەکردن[1].

٧- پیلان گێران لەهەمان کاتدا پەیوەندیان کرد بە(شیخ الجبل)ی سنان[2]، سەرکردەی ئیسماعیلیە نزاریەکان لەولاتی شامداو داوای یارمەتیان لێکرد بەبیانوی ئەوەی: کە یەك بانگەوازیان هەیەو جیاوازی نێوانیان نابێتە بایسی ئەوەی کەپشتیوانی لەیەکتر نەکەن[3]. بۆیە داوایان لێکرد کەهەستێت بەتیرۆرکردنی پاشا وەك نەریتی خۆیان، یان هەستێت بەپیلان گێران دژ بەپاشا، نێردراوی نێوانیشیان خالی ئیبن قرجلە بوو[4] کەیەکێك بوو لەپیاوانی پێشووی دەولەتی فاطمی، وا دیارە هەردووکیان لای (صاحب الجبل) بوون لەکاتی ئاشکرا بوونی پلانەکەدا بۆیە پەنایان برد بۆ خاچپەرستەکان[5].

٨- ئاشکراش نییە کە پیلانگێرەکان پەیوەندیان کردبێت بەپاشای صقلیەوە بۆ ناردنی کەشتیگەلێك بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان لەرێگەی پاشای خاچپەرستەکانەوە، بەلام کەشتیگەلەکە پاش شکستهێنانی پیلانەکە گەیشتە ئەسکەندەریەو پێکهاتبوو لە٣٠٠کەشتیو ژمارەیەکی زۆر سوارو پیادەی لەخۆ دەگرتو وتوشی زیانێکی زۆر بوو چونکە پاشا عەموری لەوشکانیدا پێشرەوی نەکرد وەك لەسەری رێککەوتبوون بەهۆی لەناوبردنی توندی پیلانگێرانەوە[6].

٩- لەدوایەمین جاری هاتنی جۆرج دا بەنامەیەکەوە بۆ دیوانی سەلاحەدین، نامەیەك گەیشتە دیوان کە تیایدا هاتبوو" لەو خەلکە خاچپەرستانەی کەجێی گومان نین بیستومانە کە ئەمە نێردراوی فێلو تەلەکەیە نەك دۆستایەتی" پیاوەکانی سەلاحەدینیش رێو شوێنی پێویستیان گرتە بەر بۆ چاودێریکردنی بەبێ ئەوەی بزانێت،و هیچ گومانێکیان لەلا نەدرکاند، ئەویش هەستا بەپەیوەندیکردن بەخەلکی ناو کۆشکی فاطمیو پیلانگێرانو فەرماندەکانی سوپای فاطمیو کۆمەلێك لەگاورو جولەکەکان، لێرەدا پیاوانی سەلاحەدین توانیان چاودێرێك

---

[1] هەمان سەرچاوە،(٢/٢٨٧).

[2] هەمان سەرچاوە،(٢/٢٨٧).

[3] هەمان سەرچاوە،(٢/٢٨٧).

[4] هەمان سەرچاوە،(٢/٢٨٧).

[5] هەمان سەرچاوە،(٢/٢٨٧).

[6] صلاح ادين القائد وعصره، ل:١٧٢.

بخەنە ناویانەوە(کەسێکمان دزە پێکردە ناویان[1] ودەستی دایە گواستنەوەی هەواڵەکانیان بۆمان)[2].

١٠- بەم شێوەیە پڕوپاگەندە دەربارەی پلانەکە لەناو خەڵکیدا بڵاو بوویەوەو پیاوانی دەوڵەتی سەلاحەدینیش لەئاشکرا بوونی مەسەلەکە و هەڵاتنی سەرانی ئاژاوەکە دەترسان، بۆیە بڕیاری دەستگیرکردنیان داو یەکە یەکە هێنانیانە روو: ئەویش داوای رونکردنەوەی لێکردن‌و ئەوانیش دانیان بەو پلانەدا ناو پاساویشیان ئەوەبوو کەنان بڕاو کراون[3].

١١- لەلیکۆڵینەوەو دانپیادانانەکانەوە دەردەکەوێت کە ئەوان خەلیفەو وەزیریان دەستنیشان کردووەو ناکۆکیشیان لەسەر خەلیفەو وەزیر کەوتۆتە نێوان (خانەوادەی روزەیك‌و شاور).

١٢- سەلاحەدین داوای فتوای زانایانی کرد دەربارەیان، ئەوانیش فتوای کوشتنیان دان، کاتێ سەلاحەدین دوودڵی نواند لەجێبەجێکردنی ئەو فتوایەدا خەڵکی ڕاوێژپێکراو فتوادەر داوای پەلەکردنیان کرد لەجێبەجێکردنی حوکمەکەدا،ئەویش بڕیاری کوشتن‌و لەخاچدانی بۆ دەرکردن‌و بەدەرگای کۆشك‌و دارخورماکانی بەرامبەریەوە هەڵواسران[4]. ئەو کەسە بەناوبانگانەش کە لەسێدارە دران بریتیبوون لە: عمارەی کوڕی عەلی یەمەنی شاعیرو عەبدولصەمەدی کاتب‌و قازی عویرس‌و داعی الدعات ئیبن عبدالقوی، قازی فاضلیش بەشێوەیەکی راستگۆیانە ویستی تکا بۆ عەمارە بکات لای سەلاحەدین سەربارى ئەو دوژمنایەتیە کۆنەی کە لەنێوانیاندا هەبوو بەڵام عەمارە وای زانی ئەمە فێڵە بۆیە ئەو کارەی رەتکردەوەو لەگەڵ ئەوانی تردا لەخاچ درا[5].

١٣- سەبارەت بەخەڵکی ناو کۆشکیش ئەوە هەر لەسەرەتاوە دەستگیر کران‌و پاشان گوێزرانەوە بۆ شوێنی جیا جیاو کۆشکەکەشی دایە دەستی العادلی برای، چونکە سەلاحەدین پێی وابوو: کە ئەوان هەرچەندە تیایدا بن هەر ناکۆکی لەسەر بەردەوام دەبێت چونکە بابەتێکە تەماعی لێنابڕێت[6].

---

[1] صلاح ادين القائد وعصره، له كتاب الروضتين ل:١٧٢.

[2] صلاح ادين القائد وعصره، له كتاب الروضتين ل:١٧٢.

[3] صلاح ادين القائد وعصره، له كتاب الروضتين ل:١٧٢.

[4] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين (٢/٢٨٩).

[5] صلاح ادين القائد وعصره، ل:١٧٣.

[6] كتاب الروضتين(٢/٢٩٠).

١٤- تائیفەی ئیسماعیلی لەوڵاتی میسر دەربەدەر کران و دورخرانەوە، ئەو خەڵکەی تریش کە مابویەوە ئەوە لەقاهیرەدا راگەیەنرا: کەدەبێ هەموو سەربازەکان و خەڵکی ناو کۆشك و سودانیەکان کۆچ بکەن بۆ ئەوپەڕی وڵاتی صعید[1].

١٥- لێکۆڵینەوەو پشکنینەکانیش لەم رووەوە سەلماندی کە بانگخوازێك لەئەسکەندەریەدا هەیە کە زۆرینەی خەڵکەکە سوننە بوون بەناوی قدید القفاص)و بانگەوازەکەشی لەوڵاتی شام و میسر بڵاوبوەیەوەو خەڵکی خاوەن پیشەش لەسەربازگەی ئەسکەندەریەدا بەشێك لەداهاتی خۆیانی پێدەدەن و ژنانیش پارەیەکی زۆری بۆ دەبەن[2]. هەروەها نوسراوو پارچەی زۆری لایە کە بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی ئاشکرا[3]، بەم شێوەیە سەلاحەدین بەپشتیوانی پەروەردگارو پاشان بەئارامگری و سەرکردایەتی بەهێزی توانی ئەم ئاژاوەیە لەناو بەرێت کە لەدەرەنجامدا پاڵی پێوە نا بۆ گەشتن برِیارێکی یەکلاکەرەوە سەبارەت بەپاشماوەکانی دەوڵەتی فاطمی و گەورە پیاوان و دەستەو دایەرەو سەربازو سودانیەکان[4].

عەمارەی کوڕی عەلی یەمەنی شاعیر: الذهبی دەربارەی دەڵێت: ئەبو محمەد، عەمارەی کوڕی عەلی کوڕی زەیدانی حکمی مذحجی یەمەنی شافیعی فرضی، شاعیر، خاوەنی دیوانی بەناوبانگ لەساڵێ پێنج سەدو پازدەدا لەدایك بووە لەزبید ماوەیەك خوێندویێتی و لەساڵی چل و نۆدا حەجی کردووەو ئەمیری مەککەش، قاسمی کوڕی فلیتە ناردی بۆ لای فائز لەمیسردا ئەمیش بەشیعر ستایشی کرد، بیروباوەڕیشی روون و دروست بوو دەربارەی ئەبو بەکرو عومەر ئەوەتا عمارە ئەگێڕێتەوە کە صاڵحی کوڕی روزەیك دانوستانی لەگەڵدا کردو وتی: بیروباوەڕت چۆنە سەبارەت بە ئەبو بەکرو عومەر؟ وتی پێم وایە ئەگەر ئەوان نەبونایە ئەوە ئیسلام بۆ ئێمەو ئێوە نەدەماو وا ئەبینم کە خۆشەویستیان پێویستە، ئەویش پێکەنی، چونکە پیاوێکی ژیرو تێگەیشتو بوو، قسەی زانایانی سوننەی بیستبوو الذهبی دەڵێ: ئەمە لێبوردەییە کە لەکەسێکی لە باشەوە وێڕای شیعە بوونی[5].

هەروەها ئیبن واصل سەبارەت بەهۆکاری هۆگری عەمارەی یەمەنی بۆ فاطمیەکان دەڵێ: عەمارەی کوڕی عەلی یەمەنی زۆر دەمارگیر بوو بۆیان چونکە لەیەمەنەوە هاتە لایان و ئەوانیش

---

[1] صلاح ادين القائد وعصره، ل:١٧٣.

[2] كتاب الروضتين(٢/٢٩٠).

[3] كتاب الروضتين(٢/٢٩٠).

[4] صلاح ادين القائد وعصره، ل:١٧٣.

[5] سير أعلام النبلاء (٢٠/٥٩٥،٥٩٤).

چاك بوون لەگەڵیداو دەسەڵاتیان پێدا، ئەویش ئەوەی لەبەرچاو بوو، مرۆڤیش وەك تراوە (بەندەی چاكەیە) هەروەها ئەم پیاوە لەسەر مەزهەبی ئەوان نەبوو بەڵكو سوننیو شافیعی بووە، كاتێ فاطمیەكان لەناو چوون بەجوانترین شیعر شیوەنی بۆ كردنو بەزمانی داكۆكی لێدەكردن چونكە بەدەست پێی نەكرا، كاتێ كۆمەڵێ خەڵكیش دەستیان دایە جموجۆڵ بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆیان پەیوەندی پێوەكردن وەك سوپاسگوزاریەك بۆ چاكەكانیان بەرامبەری‌و هەر ئەمەش بووە هۆكار بۆ لەسێدارەدانی[1]. وەك باسمان كرد، هەروەها عەمارە باسی جیاوازی خۆی دەكات لێیان لەڕووی مەزهەبەوە لەهۆنراوەیەكدا كە تیایدا دەڵێت:

أفاعيلهم في الجود افعال سنَّةٍ وانْ خالفوني في اعتقاد التشيع[2]

ذهبیش دەربارەی ئەم دێڕە شیعرە دەڵێ ت: خۆزگە تەنها شیعە بوایە، یان ئەبو بەكر و عومەری بەدڵ نەبوایە، چونكە دەڵێن: ئەو هەڵگەڕاوەتەوەو بێ باوەڕ بووە[3]، چونكە عەمارە لەشیوەنی عاضدو فاطمیەكاندا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| أسفي على زمن الإمام العاضد | أسف العقيم على فراق الواحد |
| جالست من وزرائه وصحبت من | أمرائه أهل الثناء الخالد |
| لهفي على حجرات قصرك إذ خلت | يا ابن النبي من ازدحام الوافد |
| وعلى انفرادك من عساكرك الذي | كانوا كأمواج الخضم الراكد |
| قلدت المؤتمن الخلافة أمرهم | فكبا وقصر عن صلاح الفاسد |
| فعسى الليالي أن ترد إليكم | ما عودتكم من جميل عوائد |
| يا عاذلي في هوى أبناء فاطمة | لك الملامة إن قصرا في عذلي |
| بالله زر ساحة القصرين وابك معي | عليهما لا على صفين و الجمل |
| وقل لأهلهما والله ما التحمت | فيكم قروحي ولا جرحي بمندمل |
| ماذا ترى كانت الإفرنج فاعلة | في نسل آل أمير المؤمنين علي |

من لێرەدا سەرسامم لەعەمارەی یەمەنی كە چۆن فاطمیەكان ئەلاوێنێتەوەو سۆزی خۆی بۆ بیدعەو جەژنو كۆشكەكانیان دەردەبڕێتو رووبەڕووی دەوڵەتی سوننی نوێ لەمیسردا دەوەستێتو بەرگری لەفاطمیەكانو درۆكانیان دەكات كە دەڵێن ئیمە لەوەچەی پیرۆزی

[1] مفرج الكروب(١/٢١٢).

[2] سير أعلام النبلاء (٢٠/٥٩٦).

[3] سير أعلام النبلاء (٢٠/٥٩٦).

پێغەمبەرین، ئایا کەلوپەلی دونیای لەناوچوو ئەم کارە دەکات بەبیرو باوەڕە دروستەکان بەو شێوەیەی کە بەعەمارەی یەمەنی کرد یاخود ئایا دیاریو بەخشینو پلەو پایە والەمرۆڤ دەکات کەدەستبەرداری بیروباوەڕی راستو دروستی بێتو فرمێسک بۆ پاشماوەی دەوڵەتی فاطمی شیعە برێژێت؟ بچێتە ناو پڕۆژەیەکی پیلانگێڕی دژ بەپڕۆژەی ئیسلامی بەرگریکار دژ بەخاچپەرستان لەوڵاتی ئیسلامیدا؟ بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە.

**- گەمارۆی ئەسکەندەریە:**

خەڵکی ئەسکەندەریە هاوکار بون لەسەرکەوتنی پڕۆژەی سوننی لەمیسرداو بەرگرییان کرد لەسەلاحەدین کاتێك کەگەمارۆ دراو بەئازایەتی و پیاوەتیەکی کەم وێنەوە بەرگریان لەشارەکە کرد، موسوڵمانانی میسریش بەشێوەیەکی گشتیو خەڵکی ئەسکەندەریەش بەتایبەتی هەمیشەو بەردەوام لەسەنگەری بەرگری کردندا بوون لەکێشەکانی ئوممەت لەکۆنو نوێدا هێندەش توانای هزریو مادديو پێنوسی بەهێزو سروشتی پاکیان هەیە لەپێشەوەی ئەو کەسانەدا بن کە بەرپەرچی پڕۆژەی شیعەی باطنیو پڕۆژەی ئەمریکی رۆژئاوایی بدەنەوە هەر لەکۆنیشەوە میسریەکان بەرەنگاری دەسەڵاتی شیعەی باگنیو شاڵاوەکانی خاچپەرستی بوونەتەوەو هاوکاری برا سوننەکانیان کردووە لەرووی هزریو بیرو باوەڕی سیاسیو سەربازیو ئابوریو راگەیاندنەوە هەتاوەکو توانرا پڕۆژەی شیعەی باطنی لەناو ببرێت بۆیە دەبینین نوسەرانی شیعە زۆر رق لەدڵن بەرامبەر بەمیسرو دەربارەی خەڵکەکەش دەڵێن: خەڵکی میسر نەفرەتیان لێکراوە لەسەر زمانی داود (سڵاوی خوای لێبێت) خوای گەورە کردوونی بەمەیمونو بەبەراز[1] کاتێ خوای گەورەش لەبنی ئیسرائیل تورە بوولەمیسردا نیشتەجێی کردنو هەر کەلێشیان رازی بوو لەمیسر دووری خستنەوە[2]. هەروەها دەڵێن: میسر خراپترین وڵاتە، زیندانی ئەو کەسانەی بەنی ئیسرائیلە کە خوای گەورە لێیان رەنجا بوو[3]، هەروەها وتویانە: دورکەوتنەوە لەمیسر تیایدا نەمێننەوە چونکە توشی بەد رەوشتی دەبن[4]، چەند ریوایەتێکی تریشیان هەیە سەبارەت بەخراپ باسکردنی میسرو قسەوتن بەخەڵکەکەیو خۆپاراستن لێیانو ئەم ریوایەتانەشیان داوەتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) و محمەد باقرو عەلی الباقر، ئەمە رای شیعەیە سەبارەت بەمیسر لەو سەردەمە ئیسلامییە پرشنگدارانەدا، ئەنجوومەنی شیعەش لێکدانەوەی بۆ ئەم دەقانە ئەوەیە کە لەو کاتەدا میسر

---

[1] بحار الأنوار (٦٠/٢٠٨) تفسير القمي ل: ٥٩٦.

[2] تفسير العياشي (١/٣٠٤) البرهان(١/٤٥٦).

[3] تفسير العياشي (١/٣٠٥) البرهان(١/٤٥٧).

[4] بحار الأنوار (٦٠/٢١١) اصول الشيعة (٢/٩٠٠).

خراپترین وڵات بووە، چونکە خەڵکەکەی خراپترینو بێ باوەڕترین خەڵك بوون[1]، وادیارە ئەم دەقانە ڕەنگدانەوەی ڕقو کینەی شیعەیە دژ بەمیسرو خەڵکەکەی کە دەرئەنجامی ڕووخانی دەوڵەتی ئیسماعیلی برایانە لەسەر دەستی سەلاحەدین، کەهەستا بەپاککردنەوەی زەوی کینانە لەپیسیو بۆگەنیان، جائایا ئەم وتە تاریکانە دژ بەمیسرو خەڵکە خۆشەویستەکەی لەکوێو وەسیەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەکوێ کە داوای چاکەکردن دەکات لەگەڵ خەڵکی میسردا[2]؟! ئەمەش ئەو کارانەیە (خوێنەری بەڕێز) کەخەڵکی ئەسکەندەریە پێی هەستان بۆ بەرگریکردن لەئیسلامو دەوڵەتە سوننیە نوێیەکەی لەمیسردا، ئەوەبوو ئەسکەندەریە ڕووبەڕووی دابەزاندنی هێز بووەوە لەلایەن صقلیەوە وە لەرۆژەکانی کۆتایی ساڵی ٥٦٩ك کۆتایی تەمموزی ساڵی ١١٧٤ز دا کەشتیگەلی نورماندیش لەدوو سەد کەشتی پێکدەهاتو[3] دەشڵێن سەدو هەشتا کەشتی کە پەنجا هەزار پیاوی تیادا بوو لەنێوانیاندا سێ هەزار سەرباز وەك جێبەجێکردنی ئەو پیلانە فراوانەی کە خەڵکانی لایەنگری فاطمیەکان لەگەڵ هەردو پاشای بەتولموقەدیسو صقلیەدا لەسەری ڕێککەوتبوون بەمەبەستی زیندوو کردنەوەی خەلافەتی فاطمی[4]. لەمیسرداو گێڕانەوەی بانگەوازی شیعە بۆ دۆخی جارانی خۆی، هەروەها شاڵاوی نۆرماندی لە١٦ی ذي الحجەدا گەیشتەبەردەم ئەسکەندەریە دوای ئەوەی لەلایەکەوە پیلانەکە ئاشکرا بووەو پیلان گێڕەکانی ناوخۆ لەناو بران لەلایەکیتریشەوە پاش کۆچی دوایی عەمووری یەکەم پاشای بەیتولموقەدیس. ئەوەبوو نۆرمان دەستی دایە هێرش کردنە سەر ئەسکەندەریە توانیان چەند کەشتیەکی میسری نوقوم بکەن کە لەو کەنارەدا لەنگەری گرتبوو[5]. سوپای ئەیوبیو خەڵکی ئەسکەندەریەش بەرگریەکی ئازایانەیان نواندو زرێپۆشەکانی دوژمنیان سوتاند کەلەنزیك شوراکەدا جێگیر کرا بوون لەو کاتەشدا سەلاحەدین ئامادە نەبوو لەئەسکەندەریەداو کاتێ گەیشتەوە ناوی: ماندوێتیو برینی جەنگاوەرەکانی سارێژ بوو هەریەکەیان وای دەزانی سەلاحەدینی لەگەڵدایە، جەنگی ئەو کەسەی دەکرد کەدەیەوێت خەڵکی جەنگی ببینن[6]. ئەمەش خاچپەرستەکانی ناچارکرد کە خۆیان بەدەستەوە بدەنو زۆرینەیان یان دیل کران. بەم شێوەیە سەلاحەدینو خەڵکی ئەسکەندەریە گورزێکی کوشندەیان

---

[1] مسلم(٢/٢٩٧٠).

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل: ٣٨٢.

[3] تأريخ القبائل العربية في عصر الدولتين الأيوبية والمملوكية، ل: ٨٠.

[4] تأريخ القبائل العربية في عصر الدولتين الأيوبية والمملوكية، ل: ٨١.

[5] الكامل في التأريخ له الجيش الأيوبي ەوە ، ل: ٣٨٣.

[6] الكامل في التأريخ له الجيش الأيوبي ەوە ، ل: ٣٨٣.

وەشان لەخاوەنانی بیرۆکەی داگیر کاری، بەشیوەیەك کەجارێکی تر بیر لەو کارە نەکەنەوە لەسەردەمی سەلاحەدیندا هەرچەندە بەتەواوی وازیان لەم بیرۆکەیە نەهێنا،و پاش سەلاحەدین بەچارەکە سەدەیەك دەستیان کردەوە بەهێرشکردن[1].

- پیلانی کنز الدولە:

لەو پیلانانەی کەرووبەرووی سەلاحەدین بوویەوە لەمیسردا ئەو پیلانانە بوو، لەئەسوانو قوصدا روویدا لەساڵی ٥٧٠ك دا، ئەوەبوە کنز الدولە کەکاربەدەستی ئەسوان عەرەب بوو سودانیەکانی کۆکردەوەو رووی کردە قاهیرە بەمەبەستی گەڕاندنەوەی دەوڵەتی فاطمی، بۆ ئەم مەبەستەش پارەیەکی زۆری سەرف کردو کۆمەڵێك هەواداریشی لێ کۆبووەوە دە کەسیان لەئەمیرەکانی سەلاحەدین کوشتو لەگوندی (طود)یش پیاوێك هاتە دەرەوە کە بەقیاس شادی ناسرا بوو ناوچەی قوص ی گرتە دەستو ماڵو موڵکی تالان کردن، سەلاحەدینیش الملك العادلی برای بەسوپایەکی زۆرەوە ئامادەکردو.... ئەویش کەوتە رێو شادی لەناو بردو کۆمەڵەکەی بڵاوە پێکرد پاشان ڕووبەڕووی کنز الدولە بوویەوە لەناوچەی طود دا. و جەنگ لەنێوانیاندا روویداو دوای کوژرانی کنز الدولە زۆرینەی سەربازەکانی هەڵاتنو مەلیك عادلیش لە١٨ی سەفەردا گەیشتەوە قاهیرە[2]، بەم شێوەیە سەلاحەدین توانی کۆتایی بەئاژاوە بێنێتو ئەو خەڵکە پەرتەوازەو پیلانگێڕە لەناو بەرێتو کۆتایی بەپیلانگێڕیو ئاژاوەچێتی بێنێتو بەتەواوی وتەی شاعیری بەسەردا دەچەسپێت کەدەڵێت:

| | |
|---|---|
| على قدر أهل العزم تأتي العزام | وتأتي على قدر الكرام المكارم |
| وتعظم في عين الصغير صغارها | وتصغر في عين العظيم العظائم[3] |

**حەوتەم: ئەو هۆکارانەی کەسەلاحەدین گرتیە بەر بۆ لەناوبردنی مەزهەبو سڕینەوەی ئاسەواری فاطمي یەکان:**

ئاسان نییە مەزهەبێك بەتەواوی بنەبڕ بکرێت، تەنها بە گۆڕینی سیستمی سیاسی لەوڵاتێك بەڵکو گۆڕانکاری پێویستی بەچەندین ساڵو گرتنەبەری رێو شوێن هەیە کە تەنها[4] لەهێزو زبروزەنگدا خۆی نابینێتەوە، بۆیە تێبینی دەکرێت کەسەلاحەدین چەندین هۆکارو ئامرازی گرتووەتە بەر لەپێناو کۆتایهێنان بەبانگەوازی فاطمی لەمیسردا، هەندێ لەم شێوازانەش توندو

---

[1] الكامل في التأريخ له الجيش الأيوبي ەوە ، ل: ٣٨٣.

[2] سيرة صلاح الدين لابن شداد ٤٧-٤٨ الكامل في التأريخ، صلاح الدين علون، ل: ٣٨.

[3] صلاح الدين عبدالله علون، ل: ٣٨.

[4] تأريخ الأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٥٦.

تیژو یەکلاکەرەوە بوون‌و هەندێکیشیان شێوازی فێڵ‌و پلەبەندی پێوە دیار بوو هەندێکیشیان هێزی سەربازیان تیادا بەکار هێنراو ئەوانیش تریشیان رێگەی بانگەوازو فێرکردن‌و پێسەلماندن‌و راکێشان لەرێگەی دەزگا کۆمەڵایەتی‌و ئاینی‌و خێرخوازیەکان‌و ئەو وەقفانەی کە تەرخان دەکرێ بۆ دابین کردنی خەرجی بۆی گرتبوویە بەر[1] ئەمەش هەندێکن لەو ئامرازانە:

١- **زەلیلکردنی خەلیفەی فاطمی العاضد**: سەلاحەدین هەستا بەزەلیلکردنی کەسایەتی خەلیفەی عاضد لەپێناو لاوازکردنی بیرۆکەی (ولایەت)دا کە هەموو تیۆرو بیروباوەڕەکانی ئیسماعیلیەکانی لەسەر بنیات دەنرێت‌و دەسەڵاتدارە فاطمیەکانیش لێیەوە پیرۆزی خۆیان وەردەگرن، ئەوەبوو خەلیفەی فاطمی ناچارکرد کە بەپێی خۆی بچێت بۆ پێشوازی کردن لەنجمەدین ئەیوبی باوکی لەکاتی گەشتنی بۆ میسر، سەرباری ئەو نەریت‌و رسومەی کە فاطمیەکان سور بوون لەسەری کە خۆی لەگەورەیی خەلیفەی فاطمی‌و دەرخستنی بۆ خەڵك هەتاوەکو بەهۆی زۆر دەرکەوتنی لەناو خەڵکدا پلەو پایەی دانەبەزێت‌و بۆ ئەوەی جۆرە پیرۆزیەکی بەبەردا بکرێت، تەنانەت ئەبو شامە باسی ئەوە دەکات کە عاضد هەتاوەکو باب الفتوح بەدەم نەجمەدینەوە چوو کە هەرگیز شتی وایان لێنەدیبوو، بۆیە بەسەیرترین رۆژ لەلایەن خەڵکەوە لەقەڵەم دەدرا[2]، بەڵکو عاضد ناچار بوو کە پێچەوانەی داب‌و نەریت‌و بنەماو رێورەسمەکانی دەوڵەت بجوڵێتەوەو نازناوەکانی وزراء السیوف والملك الأفضل لێناو لەکۆشکەوە دیاری‌و شتی بەنرخی بۆ هێنا[3]. پاشان سەلاحەدین بەردەوام بوو لەسەر سوکایەتی کردن بەخەلیفە بەکەمکردنەوەی پێگەی روحی لەنێوان لایەنگرو پشتیوانانی دەوڵەتەکەیدا لەم بوارەشدا دەستی گرت بەسەر کەل‌و پەل‌و موڵکی تایبەت‌و ئەسپەکانیدا بەبیانوی پێویستی زۆری پێی بۆ جیهادکردن، تەنانەت خەلیفە لەکۆتایدا دەستبەرداری ئەسپەتایبەتەکەی خۆی بوو کەتەنها ئەوەی هەبوو بەڵام سەلاحەدین پۆزشی هێنایەوە بەوەی کەپێویستی پێی نیە، شاراوەش نییە کەئەم سوکایەتیپێکردنە بەردەوامو ئەنقەستە بۆ دورخستنەوەو دابڕینی خەڵك‌و دەرنەکەوتنی لەبۆنەکاندا بوو هەتاوەکو میسرییەکان لەبیری بکەن[4].

---

[1] تأریخ الأسلامیة زمن سلاطین بني أیوب، ل: ٥٦.

[2] کتاب الروضتین له تأریخ میصر الأسلامیة، ل: ٦٥.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٥٧.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٥٧.

٢- **دابەزاندن و کەمکردنەوەی پلەو پایەی کۆشکی خەلیفەی فاطمی:** سەلاحەدین کاری دەکرد بۆ کەمکردنەوەی پلەو پایەی کۆشکی خیلافەتی فاطمی، بەوەی کە ئەمیرە کوردەکانی دەوڵەتی تیادا جێنشین کرد ئەم کارەشی بۆ دوپاتکردنەوەی روخانی دەوڵەتی فاطمی بوو چونکە دەەوڵەتی فاطمی بەدرێژایی سەدەکانی گەشەسەندنی ناسراو بوو بە(دەوڵەتی قەیسەری)[1] لەبەر ئەوەی کە خەلیفەکانیان لەکۆشکەکانی قاهیرەدا نیشتە جێدەبوون، ئەوە بوو لەساڵی ٥٦٦ك/ ١١٧٠زدا سەلاحەدین دەستی گرت بەسەر کۆشکەکانی فاطمیەکانداو دایە دەستی قەرەقوشی خزمەتکاری پاشان سەربازو خزمەکانی تیادا نیشتەجێ کردو باوکی کردە کۆشکی لۆلۆەوەی سەرکەنداوی قاهیرە پاشان الملك العادل برای تیادا نیشتە جێ بوو لەکاتی جێنشین دانانی لەلایەن سەلاحەدینەوە[2].

٣- **نەهێشتنی وتاری فاطمی لەئەزهەرداو هەڵوەشاندنەوەی وتنەوەی هزری فاطمی تیایدا:**

زۆری نەخایاند سەلاحەدین گورزێکی کوشندەی ئاراستەی بانگەوازی فاطمی کرد لەمیسردا ئەویش لەساڵی ٥٦٧ك/١١٧٠زدا بوو کاتێ هەستا بەنەهێشتنی وتاری فاطمی لەئەزهەردا کە فاطمیەکان کردبوویانە زانکۆیەك بۆ بڵاوکردنەوەی زانستەکانی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلی[3]. ئەمەش دوای ئەوە هات کە پۆستی قەزا (دادوەری) سپارد بەسەدرەدین عبدالملكی کوڕی درباس،و کاری بەمەزهەبی ئەو کرد کە تیایدا رێگە بەدوو وتار بۆ جومعە لەیەك شارداو نادرێت، وەك لەمەزهەبی پێشەوا شافعیدا هەیە، بۆیە وتاری مزگەوتی ئەزهەری نەهێشتو وتاری مزگەوتی حاکمی هێشتەوە چونکە فراوانتر بوو، ئەوە بوو بۆ ماوەی سەد ساڵ لەو بەروارەوە مزگەوتی ئەزهەر نوێژی هەینی تیادا نەکرا، هەتاوەکو دووبارە لەسەردەمی پاشا ظاهر بیبرسدا گێڕدرایەوە[4]، هەروها سەلاحەدین ئەم هەنگاوە بوێرانەی پشتگیری کرد بەنەهێشتنی ئەو دروشمو سروتە ئاینیانەی کە فاطمیەکان هێنایانە میسر بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانیان بەردەوام بوون لەبانگو سەلاواتدانی شیعانە، پاشان بانگی گەڕاندەوە سەر مەزهەبی سوننەو بەو شێوەیە بەردەوام بوو[5]، هەروەها سەلاحەدین ئەوەی قەدەغەکرد کە بانگوێژەکان کردبوویانە نەریتو سڵاویان دەنارد بۆ خەلیفەی فاطمی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٥٧.

[2] تأريخ مصرالأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٦٠،٦١.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٩٣.

[4] الخطط للمقريزى (٥٣/٤).

[5] الخطط للمقريزى (٥٣/٤) تأريخ مصرالأسلامية، ل:٩٣.

لەبانگدا[1]، هەروەها وتاری هەینی لەمزگەوتی حاکمدا بەشێوەی سوننیانە دەدرا کە تیایدا دوعا بۆ هاوەڵان‌و شوێنکەوتوانیان دەکرا (ر.خ) هەروەها بۆ خێزانەکانی پێغەمبەرو عەباس‌و هەمزەی مامی، خۆشی لەسەر دەستوری عەباسیەکان جلی رەشی لەبەردەکرد[2]، گومانیش لەوەدا کەنەهێشتنی وتاری شیعانە لەمزگەوتی ئەزهەرو پەکخستنی خوێندنی مەزهەبی شیعە لەئەزهەردا کە لەسەردەمی فاطمیدا گەورەترین ناوەند بووە بۆ بانگەوازی ئیسمکاعیلی لەمیسرو جیهانداو[3]، پاشان گۆڕینی ئەزهەر بۆ زانکۆیەکی سوننی‌و خوێندن‌و زانستەکانی سوننەت تیایداو بەردەوام بوونی تا ئەمرۆو کۆچکردنی زانایانی سوننە بۆ خوێندنی وانەوتنەوە تیایدا بووە هۆی بڵاوبوونەوەی زانستەکانی سوننەت لەمیسرو زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا[4].

٤- **لەناوبردن سوتاندنی کتێبەکانی شیعەی ئیسماعیلی:** سەلاحەدین هەستا بەلەناوبردنی گەنجینەکانی کۆشکی فاطمي‌و هەندێکیشی بەدیاری نارد بۆ نورەدین زەنکی‌و بڕێکیشی بۆ خەلیفەی عەباسی‌و پاشماوەکەشی دانا بۆ فرۆشتن بەشێوەیەك کە ئەم فرۆشتنە دە ساڵی خایاند[5]، پاشان بەدەست ڕێبوارانی هاتوو ڕۆشتوەوە گوێزرایەوە بۆ وڵاتانی تر[6]، هەروەها دەستی گرت بەسەر کتێبەکانی بانگەوازی ئیسماعیلیدا کە لەکتێبخانەی کۆشکی فاطمي‌ەکاندا هەبوو، هەستا بەسوتاندن‌و فڕێدانی لەکێوی مقطم دا، پاشان کتێبە نامەزهەبیەکانی تری بەخشییەوە بەسەر گەورە زانایان‌و لایەنگرانی دەوڵەتەکەیدا وەکو عمادی ئەسفهانی‌و قاضی وفاضل‌و أبی شامەی ئەسفەهانی، ئەمەش دوپاتی دەکاتەوە کەمەبەستی سەلاحەدین تەنها سوتاندنی کتێبەکانی بانگەوازی شیعە بووە[7]، ئاشکراشە کەکتێبەکانی بانگەوازی ئیسماعیلی لەگرنگترین ئەو هۆکارانە بوون کە بانگخوازە فاطمیەکان بەکاریان دەهێنا بۆ برەودان بەبانگەوازەکەیان، دەسەڵاتدارانی ئەیوبیش بەجۆرێك ئەو

---

[1] تأريخ مصرالأسلامية، ل: ٩٣.

[2] تأريخ مصرالأسلامية، ل: ٩٣.

[3] تأريخ مصرالأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٩٧.

[4] تأريخ مصرالأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٩٧.

[5] كتاب الروضتين(٢/٢١٠) تأريخ ميصر الأسلامية، ل: ٦١.

[6] تأريخ ميصر الأسلامية، ل: ٦١.

[7] هەمان سەرچاوە، ل: ٦٣.

کتێبانەیان سوتاند کە لەو سەرچاوەکانی بانگەوازی ئیسماعیلی تەنها ئەو کتێبانە مانەوە کە لایەنگرانی فاطمیەکان لەیەمەن‌و هندا پاراستبویان پاش روخانی دەوڵەتەکەیان لەمیسردا[1].

٥- **هەڵوەشاندنەوەی سەرجەم جەژنە مەزهەبیەکانیان:** کاریگەری‌و مەترسی جەژن‌و ماتەمینی‌و حوسەینیە مەزهەبیەکانی شیعە لەبرەو دان بەمەزهەب‌و چەسپاندنی بیرو باوەڕی شیعە لەدەرونی میسرییەکاندا لەسەلاحەدین شاراوە نەبوو بۆیە هەستا بەهەڵوەشاندنەوەی جەژنە مەزهەبیەکانیان‌و ئەمەش بووە هۆی نەمانیان لەمیسردا، بەلێزانینی سیاسی‌و لەڕوانگەیەکی بیرو باوەڕیانەوە لەسەربنەمای قەلاچۆکردنیبیدعەکانی شیعە توانی ئەو جەژنە مەزهەبیانە قەدەغەبکات کە پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتن، بۆ تەواو کردنی ئەم هەنگاوەش ئەیوبیەکان هەستان بەدانانی جەژن‌و بۆنە ئایینیەکانی سوننە لەمیسردا بەو شێوەیەی کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە[2].

٦- **هەڵوەشاندنەوەی باج‌و مامەڵەکردن بەدراوی فاطمي یەکان:** هاوکات لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی باج‌و رسومی فاطمیدا مامەڵەکردن بەدراوەکەشیان هەڵوەشێنرایەوە، بەتایبەت کەمۆرکی بیروباوەڕی فاطمیپێوەبوو کەپشتوانی دەکرد لەمافیان لەخەلیفایەتیدا" لا اله الا الله، محمد رسول الله، علي ولي الله" هەروەها ناوی خەلیفەی فاطمیەکانی لەسەربوو لەگەڵ دەستەواژەکانی بیرو باوەڕی فاطمیدا، سەرباری ئەمەشمهەندێ لەو دراوانە بۆیادەکان بوون‌و لەجەژن‌و بۆنە مەزهەبیەکاندا دەدرا بەلایەنگرانیان بۆ راکێشانیان بەلای بیرو باوەڕی دەوڵەتدا[3].

٧- **پاراستنی ئەندامانی خانەوادەی فاطمی:** سوڵتان سەلاحەدین پارێزگاری لەخانەوادەو مناڵەکانی عاضد کردوو لەدەرەوەی کۆشک‌و لەشوێنێکی تایبەتدا دانان‌و پێداویستی بۆ دابین کردن‌و سپاردنی بەقەرەقووشی خزمەتگوزاری‌و ژن‌و پیاویانی لەیەك جیاکردەوە هەتاوەکو زوو کۆتاییان پێبێت[4]، دیارە سیاسەت وایدەخواست نەریتی پاشاش وابوو کەخانەوادەی فاطمی لەلایەن ئەیوبیەکانەوەبخرێنە بازنەوە، نەوەکو خەڵکێك لەلایەنگرانییان پەیدا ببێت کەلایەنگرو هەوادارانیان لەدەوریان کۆبکاتەوە بۆگەڕاندنەوەی دەسەڵاتیان[5].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٦٣.

[2] تأريخ الشعوب الأسلامية، ل: ٦٣، ٦٤، ٦٥.

[3] هەمان سەرچاوە، ل:٦٦.

[4] كتاب الروضتين(٢/٢١٠).

[5] تأريخ الشعوب الأسلامية، ل: ٦٦.

٨- **لاوازكردنی پایتەختی فاطمی:** دوای ئەوەی كە ئەیوبیەكان ناوەندی حكومڕانیان لەمیسردا گواستەوە بۆ قلعه الجبل، كەكارێكی سەربازی دووربیانە بوو مەبەست پێی بەهێزكردنی میسر بوو لەبەرامبەر هێرشەكانی فرەنجەكاندا، ئەم هەلەیان قۆستەوە بۆ لاوازكردنی شاری قاهیرەی پایتەختی فاطمیەكان كەبەدرێژایی ماوەی حوكمڕانیان وەك شارێكی پاشایی تایبەت بەخەلیفەو پیاوانی دەوڵەتو سەربازو بەرپرسی دیوانەكان مایەوە ، لەهەمان كاتیشدا قەڵاو شورایەكی سەربازیش بوو بە جۆرێك كە زۆرینەی خەڵكی میسر نیشتەجێی فسطاط[1] بوون، مەقریزیش بەم شێوەیە لەسەرلاوازكردنی پایتەختی فاطمیەكان دەدوێتو دەڵێت: قاهرە بوو بەشاری نیشتەجێ بوون دوای ئەوەی كە قەلایەك بوو پەنای بۆ دەبراو كۆشكی رووليكراوی خەليفە بوو، بەم شێوەیە پاش سەروەری لاوازكراو پاش رێز لێنان سوكایەتی پێكرا، ئەمەش نەریتی پاشاكانە، هەمیشە شوێنەواری پێش خۆیان دەسڕنەوەو ناوی دوژمنەكانیان كوێر دەكەنەوەو یادیان دەسڕنەوە[2]. بەلام ئەم كارەی سەلاحەدین لەپێناو خواو سەرخستنی پێغەمبەرەكەیدا بووە(ﷺ).

٩- **زیندوكردنەوەی مەسەلەی ساختەبوونی گێڕانەوەی رەچەڵەكی فاطمی بۆ خانەوادەی پێغەمبەر(ﷺ):** لەگەڵ لەناو بردنی كەلەپوری فاطمی لەلایەن ئەیوبیەكانەوە هەستان بەزیندو كردنەوەی مەسەلەی ساختەكردنی گێڕانەوەی رەچەڵەكی فاطمی بۆ خانەوادەی پێغەمبەر(ﷺ)، روونكردنەوەی ئەوەی كە فاطمیەكان لەبنەچەیەكی جولەكە یان ئاگرپەرستەوە سەرچاوە دەگرن، بەم شێوەیەش بەردەوام بوون لەهەڵتەكاندنی ئەو پاڵپشتە شەرعیە (ساختەكراوە)ی خیلافەتدا، هەروەك زانایانی باوەڕ پێكراویش بەسوپاسەوە هەوڵی زۆریان بۆ پەردە هەڵماڵین لەسەر رەچەڵەكیان، لەو زانایانەش ئیبن خەلەكانو ئیبن أبی شامەو ئیبن واصلو هتد، ئەمانیش ناوی (ئەوەی عوبەید)یان لێناون وەك ئاماژەیەك بۆ عوبەیداللەی كوڕشی مەیمونی كوڕی القّداحی ئاگرپەرست، تەنانەت ئەبو شامە ئاگادارمان دەكاتەوە كە كتێبێكی سەربەخۆی داناوە تیایدا ساختەبوونی رەچەڵەكی فاطمیەكان دەسەلمێنێت[3]، هەروەها ئەبو شامە لەكتێبی الدوختین چەند لاپەڕەیەكی دوورو درێژی

---

[1] العمارة العربية في مصرالأسلامية، ل: ٣٢٤– ٣٢٦.

[2] تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٧٦.

[3] كتاب الروضتين له تأريخ ميصر الأسلامية وه، ل: ٧٠.

تەرخانكردووە بۆ روونكردنەوەی ساختەبوونی گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەكیان بۆ خانەوادەی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)[1].

١٠- **بەردەوام بوون لەسەر راوەدوونانی پاشماوەكانی شیعە لەشام و یەمەندا:** بەم شێوەیە ئەهلی سوننەت بەڕابەرایەتی نورەدین مەحمود دەوڵەتی فاطمیان لەناو برد بەكەلەپورو پاشماوەكانیشیەوە، ئەوەبوو پاش راوەدوونانی شوێنكەوتوانیان لەمیسردا شیعەگەری كەمبوویەوە بەرەو خۆشاردنەوەو بەنهێنی بوون رۆیشت، ئەمانی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلیش لەمیسردا هاوكاتبوو لەگەڵ جێگیر كردنی سوپای نورەدین لەساڵی ٥٦٤ك/ ١١٦٨ز دا هەروەها ئەیوبییەكان بەفەرمانی سەلاحەدین بەردەوامبوون لەناوبردنی بانگەوازی ئیسماعیلی لەمیسرو یەمەن‌و شامدا درێژەیان دا بەو هەوڵانەی كە غەزنەوی‌و سەلجوقی‌و زەنكیەكانی دەستیان پێكرد بۆ رووبەرووبونەوەی بانگەوازی شیعەگەری‌و بڵاوكردردنەوەی بانگەوازی سوننی لەئێران‌و شامدا، هەروەها شیعەگەری وردەوردە لەمیسردا بەرەو لاوازی دەچوو هەتاوەكو بەتەواوی خەڵكەكەی هاتنە سەرمەزهەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت[2].

بێگومان ئەو رێ‌و شوێنانەی كە سەرانی ئەهلی سوننەت وەك نورەدین‌و سەلاحەدین گرتیانە بەر بۆ بەرەنگاربوونەوەی ھەژمونی شیعە رافزی زیندوكردنەوەی مەزهەبی سوننەت بەرهەمی باشی هەبوو، توانی مەزهەبی شیعەی رافزی ببنبڕ بكات بەشێوەیەكی تەواو، ئەمەش تێگەیشتنی قوڵ‌و وردی ئەوان دەسەلمێنێ لەكاتێكدا كە ئوممەت زۆر پێویستی بەو كارە هەبوو ئەو وانە مەزهەبیانەش كەلێوەی فێر بین ئەوەیە كە: ریشەكێشكردنی بیدعە لەكۆمەڵگە ئیسلامیەكاندا پێویستی بە تێڕوانینێكی گشتگیرو پرۆژەیەكی تێروتەسەل هەیە بۆ زیندوكردنەوەی ئیسلامی دروست‌و بەرەنگار بوونەوەی بیری باطنی‌و پەروەردەكردنی ئوممەت لەسەر سەندنەوەی مافەكانی‌و بەرەنگاربوونەوەی داگیركەرە خاچپەرستەكان، هەروەها سەلاحەدین‌و ئەییوبییەكان سودمەند بوون لەئەزموونی نورەدین لەبواری زیندووكردنەوەی سوننەو بەرەنگاربوونەوەی شیعەگەری و ئامادەكردنی ئوممەت بۆ بەرگریكردن‌و سەندنەوەی مافەكانی لەدوژمنان، بۆیە سەلاحەدین لەبۆشاییەوە دەستی پێنەكرد بەڵكو سودی لەو هۆكارانە وەرگرت كە نورەدین دەیگرتە بەر وەك دامەزراندنی خوێندنگەی سوننی‌و یانەی فەرمودە قەزاوەت كردن بەپێی مەزهەبی سوننی‌و هاندانی سۆفیگەری سوننی‌و دانانی وەقف بۆ دەزگاكانی كۆمەڵگەی مەدەنی‌و

---

[1] كتاب الروضتين (٢/٢١٤ بۆ ٢٢٣).

[2] تأريخ ميصر الأسلامية، ل: ٧٦.

سەرپەرشتی کردنی راستەوخۆی خوێندنگەکانو بەکارهێنانی حسبە( چاودێری)و بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەت، وردەکارییەکانی ئەم باسەش بەپشتیوانی پەروەدگار لەباسی دەوڵەتی ئەیوبیدا درێژە پێدەدەین، هەروەها لێکۆڵەر محمد حمدان خالد القیسی هەستاوە بەپێشکەشکردنی نامەیەکی ماستەر لەزانکۆی یەرموکی ئوردونندا سەبارەت بەکاریگەری هەوڵە پەروەردەیەکانی سەلاحەدین لەگۆڕینی واقیعی کۆمەڵگەی میسریدا کە دەکرێت لەو بوارەدا سودی لێوەربگیرێت، بەیەکخستنی ناوچەکە لەساڵی ٥٦٩ك /١١٧٤زدا لەمیرنشینی نورەدیندا، ئەم میرنشینە ناوچەکانی سودانو حجازو یەمەنو میسری گرتەوەو رۆژهەلاتی ئیسلامی کرد بەیەك دەوڵەت کە فەرمانی لەیەك سەرکردەوە وەردەگرت، کە بەتامەزرۆییەوە بۆ ئەو ئامانجە ستراتیژیەی دەڕوانی کە لەسەرەتای حوکمڕانییەوە هەوڵی بەدیهێنانی دەدا کە بریتی بوو لەئازادکردنی وڵاتی شام لەفرەنجە داگیر کەرەکان[1] ئەم ئامانجەش بەرەو بەدیهاتن دەڕۆشت بۆیە فەرمانی دا بەدروستکردنی مینبەرێکی گەورە بۆ مزگەوتی ئەقسا هەتاوەکو لەگەڵ خۆیدا بیبات کاتێك کە بەرێدکەوێت بۆ ئازادکردنی قودس[2]، نامەیەکیشی نووسی بۆ سەلاحەدینو فەرمانی پێکرد بەسەرکردایەتی سوپای میسرەوە کەبکەوێتە رێ هەتاوەکو لەقەلای کەرکی فرەنجییەکاندا پێی بگات[3]، سەلاحەدینیش بەو شێوەیەی کە نورەدین وتیو ئابلوقەی قەلای شوبکی (لەباشوری کەرك)داو کاتێ نورەدینیش بەمەی زانی لەدیمەشقەوە بەرەو باشور کەوتە رێ هەتاوەکو بگات بەسەلاحەدین، بەلام پێش گەیشتنی بەسەلاحەدین نامەیەکی لێوە بەدەست گەیشت کە باسی لەتێکچوونی بارودۆخی میسر دەکردو مەترسی خۆی پیشاندەدا لەدەستگرتنی نەیارانی بەسەر کاروبارەکانیدا، کە پێویست دەکات بگەڕێتەوە بۆی بۆ سەقامگیرکردنی بارودۆخ تیایداو ساڵی داهاتوو دەگەڕێتەوە بۆ جیهاد کردن لەگەڵ نورەدیندا[4]. دیارە نورەدین زۆر گرنگی دەدا بەهەڵکەندنی بێباوەڕانو دەرکردنیان لەوڵاتی شام کاتێ هەندێ گەنجینەی کۆشکی فاطمیەکانی پێگەیشت لەگەڵ پیشەسازیە دەگمەنەکانی زێڕو مرواری، وتی: سوێند بەخوا پێویستمان بەم پارەیە نیەو هیچ پێویستیەکی پێ پڕناکەینەوە، ئەو دەزانێ کەئێمە ئەگەر پێویستمان بەزێڕ بوایە لەمیسرداڕێزمان تیادا سەرف نەدەکرد، بەلام ئەو دەزانێت کەسەنگەرەکانی شام پێویستی بەپارەو

---

[1] دور نورالدين في النهضة الأمة، ل: ١١٨.

[2] هكذا ظهر جيل صلاح الدين له دور نورالدين في النهضة الأمة، ل: ١١٨.

[3] دور نورالدين في النهضة الأمة، ل: ١١٨.

[4] الباهر ل ١٥٨ دور نورالدين في النهضة الأمة، ل: ١١٨.

پیاوو کۆمەکی هەیە بۆ هەڵکەندنی بێ باوەڕان لەوڵاتی شام[1]. واتە ئەو مەبەستی لەپارەو پیاوو تەنها ریشەکێشکردنی بێباوەڕانە لەکەنارەکانی ئەو وڵاتە[2]. بڕیارە سەلاحەدین لەگەڵ نورەدیندا هاوڕابوون لەئامانجە ستراتیژیەیکاندا بەلام لەتێکچوونی بارودۆخی میسر دەترسا، بۆیە بەپلەی یەکەم خەمی ڕێکخستنی کاروباری میسری بوو پاشان خەمی مەسەلەی شامی دەخوارد، بۆیە ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ میسر، وادیارە نورەدینیش بیری لەوە دەکردەوە کە بەسوپاکەیەوە بچێتە میسرو گەمارۆی خاچپەرستەکان بدات، سەلاحەدینیش هەستی بەمە کردبوو بۆیە خزمەکانی خۆی کە لەناویاندا نەجمەدینی باوکیشی شهاب الدینی حارمی مامی[3] هەبوو کۆکردەوە لەگەڵ چەند فەرماندەیەکی سوپاداو راوێژی پێکردن دەربارەی نیەتی نورەدین بۆ هاتنە ناو میسرەوە لەسەر کارلابردنی سەلاحەدین تیایدا، ئەوە بوو یەکێك لەبرازاکانی پێشنیاری کرد کەخۆی ئامادە بکات بۆ کوشتاری نورەدین ئەگەر بەرەو میسر هات، هەندێ لەئامادەبوانیش هاوڕابوون لەگەڵیدا، خێرا نجمەدینی باوکی سەرزەنشتی ئەوانەی کردو وتی: من باوکتمو ئەمەش شهاب الدینی خاڵتەو ئێمە لەهەموو ئەمانەی کەلێرەن زیاتر تۆمان خۆش دەوێ ، سوێند بەخوا ئەگەر منو خاڵت نورەدین ببینین ناتوانین هیچ کارێ بکەین جگە لە ماچکردنی زەوی لەبەر پێی داو ئەگەر فەرمانمان پێبکات بدەین لەگەردنت ئەوە ئەو کارە دەکەین جا ئەگەر ئێمە وابین، دەبێ خەڵکی تر چۆن بێت؟ هەموو ئەم ئەمیرانەش کەلای تۆن ئەگەر نورەدین ببینن ناتوانن بەسەر ئەسپەکانیانەوە خۆیان بگرن، ئەم وڵاتەش موڵکی ئەەو، ئێمە جێگیرو خزمەتگوزاری ئەوین، جا ئەگەر بیەوێ لەسەر کار لات بەرێت گوێڕایەڵی دەبین، رای باشیش ئەوەیە کەنامەیەك بنوسی لەگەڵ نێردەیەکدا بینێری‌و تیایدا بڵێت: بیستومە کە تۆ دەتەوێت بکەویتە ڕێ بۆ دەست گرتن بەسەر ئەم وڵاتەدا، نازانم کەی پێویست بەوە دەکات، دەتوانی بەرێزت نێردراوێك بنێریت‌و دەسرێك بخاتە ملمەوەو بمهێنێت بۆ لات، چونکە هیچ کەسێك نییە لێرە ڕێگری ئەوە بکات[4]. پاشان بەئامادەبوونی وت: هەستن بڕۆن، ئێمە خزمەتگوزاری نورەدینین، هەرچی دەیەوێ با بیکات، ئەوە بوو لەسەر ئەم رایە کۆتاییان بەدانیشتنەکە هێناو زۆربەیان ئەم هەواڵەیان بۆ نورەدین نووسی[5]، کاتێ نەجمەدین بەتەنهایی لەگەڵ سەلاحەدینی کوڕیدا مایەوەو پێی وت: تۆ نەزان‌و کەم زانیاریت، ئەو خەڵکە زۆرە

---

[1] كتاب الروضتين له الجيهاد والتجيدەوه، ل: ٢١٣.

[2] الجيهاد والتجيد، ل: ٢١٣.

[3] دور نورالدين في النهضة الأمة، ل: ١١٨.

[4] كتاب الروضتين (٢/٢٢٨).

[5] كتاب الروضتين (٢/٢٢٨).

کۆدەکەیتەوەو رازی دڵی خۆتیان بۆ باس دەکەیت، ئەگەر نورەدین ئەم هەواڵە ببیستێ کە تۆ دەتەوێ ئەم وڵاتەی لێ قەدەغە بکەیت، ئەوە خۆی یەکلایی دەکاتەوە و بۆت رووەدەکاتە ئێرە، ئەگەر رووش بکاتە ئێرە ئەو خەڵکەی کە لێرەدا کۆتکردنەوە یەکێکیان نابینی پشتیوانیت لێبکات‌و رادەستی نورەدین دەکەن، بەڵام ئیستاو دوای ئەم مەجلیسە هەموویان نامەی بۆ دەنوسن‌و باسی قسەکەی منی بۆ دەکەن تۆش دەبێ ئەو کارە بکەیت‌و نامەیەك بەم جۆرە بنوسی: بۆچی خۆت زەحمەت دەدەی؟ تەنها خزمەتکارێك بنێرەو گوریسێك بخاتە ملمەوە دێم، ئەگەر ئەمە ببیستێت ئیتر نایەت‌و بەکاری ترەوە سەرقاڵ دەبێت[1].

وەك دەردەکەوێت نەجمەدین ئەیوب حۆشەویستی‌و گوێڕایەڵییەکی زۆری هەبووە بۆ نورەدین زەنکی ئەوەبوو سەلاحەدینیش بەگوێی رایەکەی باوکی کرد، کاتێ نورەدین (رەحمەتی خوایی لێبێت) مەسەلەکەی بەم شێوەیە بینی دەست بەرداری نیەتەکەی بوو مەسەلەکەش بەو شێوەیە دەرچوو کەنەجمەدین دەیوت[2]، لەسەرەتای ساڵی ٥٦٨ك/١١٧٣ز پاش گەڕانەوەی نورەدین لەئازەربەیجان‌و ئەرمینیا بڵاوکراوەیەکی بەدەست گەیشت لەخەلیفەی موصل‌و جەزیرەو ئەربیل‌و خلاط‌و شام‌و وڵاتی قلج ئەرسەلان‌و میسرەوە لەمانگی شەوالی هەمان ساڵیشدا سەلاحەدین بەسوپاکەیەوە بەرەو الکرك کەوتە ڕێ‌و ئابلۆقەی بەسەردا سەپاندو نورەدینیشی ئاگادار کردەوە سەبارەت بەهاتنە دەرەوەی بۆ جێبەجکردنی رێککەوتەکەی ساڵی پێشو ئەوەبوو نورەدینیش لەلای خۆیەوە دیمەشقی بەجێهێشت‌و بەرەو سەلاحەدین کەوتە رێ کاتێ گەیشتە الرقیم لەناوەڕاستی ئوردندا نامەیەکی لەسەلاحەدینەوە پێگەیشت کە تیایدا ئاگاداری کردەوە کەباوکی لەمیسر نەخۆشەو دەترسێت بمرێت‌و میسریەکانیش ئەو هەلە بقۆزنەوەو دەست بگرن بەسەر وڵاتداو خۆیان تیایدا قایم بکەن بۆیە ناچارە بگەڕێتەوە بۆ میسر[3]. کاتێ نورەدین بەمەی زانی وتی: پاراستنی میسر گرنگترە لامان لەشوێنەکانی تر[4]. پشان زۆری نەخایاند مەترسیەکانی سەلاحەدین هاتە دی‌و شۆڕشێکی گەورە دژی بەرپا بوو بەسەرکردایەتی جەوهەری ئەمینداری خەلافەت پاش ئەوەش پیلانێکی گەورە بەرپا بوو کە عەمارەی یەمەنی‌و لایەنگرانی تری مەزهەبی شیعە تیایدابەشدار بوون کە پێشتر ئاماژەمان پێداو لەساڵی ٥٦٨ك نورەدین چەند هێرشێکی کردە سەر خاچپەرستەکان عیمادی ئەسفەهانیش لەگەڵ الملك العادلدا بوو نورەدین پێی وت: چۆن وەسفی

---

[1] کتاب الروضتین (٢/٢٢٩).

[2] هەمان سەرچاوە(٢/٢٢٨).

[3] هەمان سەرچاوە(٢/٢٢٨).

[4] هەمان سەرچاوە(٢/٢٢٨).

ئەمە دەکەی کە روویدا؟ ئەویش بەهۆنراوەیەك ستایشی کردو ئەم هۆنراوەیەش دەربارەی بەرگریکردنی نورەدین بوو لەحۆران و تیایدا دەڵێ:

عقدت بنصرك راية الإمان ... وبَدَت بعصرك آية الإحسان
ياغالب الغلب الملوك وصائد ... الصيد اللّيوث وفارس الفرسان
يا سالب التيجان من أربابها ... حزت الفخار على دوي التيجان
محمود المحمود ما بين الورى ... في كل إقليم بكل لسان
يا واحدا في الفضل غير مشارك ... أقسمت مالك في البسيطة ثان
أحلى أمانيك الجهاد وإنه ... لك مؤذن أبدا بكل أمان
كم بكر فتح ولدته طباط من ... حرب لقمع المشركين عوان
كم وقعة لك بالفرنج حديثها ... قد سار في الآفاق و البلدان
قمصت قومصهم رداء من ردي ... وقرنت رأس برنسهم بسنان
وملكت رق ملوكهم وتركتهم ... بالذل في الأقياد والأسجان
وجعلت في أعناقهم أغلالهم ... وسحبتهم هونا على الأذقان
إذ في السوابغ تحطم السمر القنا ... والبيض تخضب بالنجيع القاني
وعلى غناء المشرقية في الطلي ... والهام رقص عوالي المران
وكأن بين النقع لمع حديدها ... نار تألق من خلال دخان
في مأزق ورد الوريد مكفل ... فيه بري الصارم الطمان
عطى العجاج به نجوم سمائه ... لتنوب عنها أنجم الخرصان
أو م كفاهم ذاك حتى عاودوا ... طرق الضلال ومركب الطغيان
وجلوت نور الدين ظلمة كفرم ... لما أتيت بواضح الرهان
وهزمتهم بالرأي قبل لقاتهم ... والرأي قبل شجاعة الشجعان
أصبحت للإسلام ركنا ثابتا ... والكفر منك مضعضع الأركان
قوضت الناس الضلال بعزمك ... الماضي وشدت مباني الأيمان
قل أين مثلك في الملوك مجاهد ... لله في سر وفي إعلان
لم تلقهم ثقة بقوة شوكة ... لكن وثقت بنصرة الرحمن
ما زال عزمك مستقلا بالذي ... لا يستقل بثقله الثقلان
وبلغت بالتأييد أقصى مبلغ ... ما كان في وسع ولا إمكان

دانت لك الدنيا فقاصيها إذا حققته لنفاذ أمرك داني

فمن العراق إلى الشام إلى ذرا مصر إلى قوص إلى أسوان

لم تله من باقي البلاد وإنما ألهاك فرض الغزو عن همدان

للروم والإفرنج منك مصائب بالترك و الأكراد و العربان

أذعنت لله المهيمن إذ عنت لك أوجه الأملاك بالإدعان

أنت الذي دون الملوك وجدته ملان من عرف ومن عرفان

في بأس عمرو في يسالة حيدر في نطق قسي في تقى سلمان

سر لو أن الوحي ينزل أنزلت في شأنها سور من القرآن

فاسلم طويل العمر ممتد المدى صافي الحياة مخلد السلطان

١١- دەست گرتن بەسەر مەغریبی نزیکداو لکاندنی بەمیرنشینی ئەیوبیەوە: سەلاحەدین کاری دەکرد لەپێناو بەهێزکردنی ئەو دەستکەوتانەی کە لەمیسردا بەدەستی هێنا، هەتاوەکو کتو پڕ لەدەستی نەدات، هەوڵەکانیشی بەلکاندنی مەغریبی نزیک بەمیسرەوە کۆتایی پێهات، ئەوەبوو باکوری ئەفریقا لەسەردەمی یەکەمین فتوحاتی ئیسلامیەوە لکابوو بەمیسرەوە، بۆیە سروشتی بوو کەسەلاحەدین چاو ببڕێتە وڵاتەکانی لەلایەکەوە بۆ سود وەرگرتن لەو سامانانەی کە تیایدایە، ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە بەهۆی ئەو پێگە بەهێزەی کە هەیانبوو بۆ پاراستنی سنوری رۆژئاوای میسر، ئەوەبوو لەساڵی ٥٦٨ك دا/ ١١٧٣زدا سەلاحەدین هێزێکی سەربازی نارد بۆ مەغریبی نزیك بەسەرکردایەتی شرف الدین قەراقوش، خزمەتکاری مظفر تقی لدین عمری کوڕی شاهنشاهی کوڕی ئەیوب، ئەویش چووە طرابلوس و برقەو هەندێ ناوچەی مەغریبی نزیك وەك قابس بەڵام نەگەیشتە مهدیەو صفاقس و قفصەو تونس[1].

١٢- لکاندنی یەمەن بەمیسرەوە: لکاندنی یەمەن بەمیسرەوە لەچوارچێوەی ئەو نەخشەیەی نورەدین دابوو کە مەبەست پێی یەکخستنی بەرەی ئیسلامی بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێرشی خاچپەرستی[2]، ئەم سیاسەتی لکاندنی یەمەن بەمیسرەوە لەلایەن سەلاحەدینەوە بووە هۆی:

[1] تأريخ الأيوبيين في المصر وبلاد الشام، ل: ٤٦.

[2] تأريخ اليمن الأسلامي د. محمد عبدة السرودي ل: (٢١١).

أ- تەنگ هەڵچنین بەلایەنگرانی فاطمیەکان بەتایبەت کەوالی یەمەن عبدالنبی کوڕی مەهدی شیعەیەکی سەر بەخەلیفەی فاطمی بوو لەمیسردا.

ب- بەهۆیەوە سەلاحەدین توانی پاراستنی سنورەکانی باشوری میسر مسۆگەر بکات: لەبەر ئەوەی کە لکاندنی یەمەن کە بەدەروازەی دەریای سور دادەنرێت لەباشورەوە، دەسەلاتی سەربازیو بازرگانی بەسەر هەرێمەکانی باشوردا مسۆگەر دەکاتو ئەگەری نزیکبوونەوەی نێوان خاچپەرستان کە بەهیوای دەستگرتنن بەسەر دەریای سورو حەبەشیەکاندا کە ئاینی گاوریان هەبوو دووردەخاتەوە هەروەها بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر پلاری خاچپەرستەکان لەکەناری دەریای ناوەڕاست لەباکورو حەبەشیەکان لەکەنارەکانی دەریای سور لەباشورەوە.

١٣- یەمەن لەو کاتەدا بەقۆناغی نائارامیدا تێپەڕی دەکردو ململانێی سیاسیو ئاینیو مەزهەبی زۆری بۆ هێنابوو، بەتایبەت لەنێوان زبیدو سەنعا، هەروەها درۆزنێکیش پەیدا بوو کە لافی ئەوەی لێدەدا کەمەهدی چاوەڕوانکراوە کەئەویش عبد النبی کوڕی مهدی بوو توانی دەست بگرێت بەسەر یەمەنداو وتاری بەناوی خۆیەوە دەخوێندەوەو دوای ئەوەی وتار خوێندنەوەی بۆ عەباسیەکان نەهێشتو خۆی ناونا (ئیمام)و لەسەر گۆڕی باوکی گومەزێکی گەورەی دروست کردو فەرمانی کرد بەخەڵکی یەمەن کەحەجی بۆ بکەنو رێگریکردن لەچون بۆ حەج بۆ مەککە.

١٤- سەلاحەدین ویستی سنورێك بۆ ئەم سەرکێشانە دابنێت کەهەڕەشە لەیەکێتی موسڵمانان دەکات بەتاتیبەت کەخەڵکی یەمەن داوای بەدەمەوە چونیان لێکرد[1] هەرچۆنێك بێت ئەو: سەلاحەدین سریەیەکی بەرێخست بەسەرکردایەتی شمس الدولە توران شای برای گەورەی کە چووە مەککەو پاش ئەنجامدانی عومرە بەرەو زبید بەرێکەوتو دەستی بەسەردا گرت پاشان بەرەو عەدەن بەرێکەوتو دەستی بەسەراگرتو رێگری لەتالانکردنی کرد لەلایەن سوپاکەیەوەو وتی: ئێمە نەهاتووین بۆ وێرانکردنی ئەم ولاتە بەڵکو بۆ ئاوەدانکردنەوەی هاتووین، پاشان بەرەو قەلاو شوراکانی تر بەرێکەوتو هەموو یەمەنی بەتەواوی ئازاد کردو وتاری بەناوی خەلیفەی عەباسیەوە خوێندەوە[2]، عبدالنبی لافلێدەری ئیمامەتی کوشتو یەمەنی لێ رزگار کردو گەڕاندیەوە دۆخی جارانی[3]، پاشان شمس الدولەش نامەیەکی بۆ پاشا ناصر صلاح الدین نووسیو هەواڵی سەرکەوتنی پێداو بەفەزلی خوای زانی، سەلاحەدینیش

---

[1] تأريخ الأيوبيين في المصر وبلاد الشام، ل: ٤٦.

[2] الطريق الى بيت المقديس، ل: ٩٦.

[3] الطريق الى بيت المقديس، ل: ٩٦.

ئەو هەواڵەی نووسی بۆ نورەدین، ئەویش نامەی نارد بۆ خەلیفەی عەباسیو مژدەی ئازادکردنی یەمەنو خوێندنەوەی وتار بۆ خەلیفەی پێدا[1].

١٥- ئازادکردنی وڵاتی نەوبە(سودان): نەوبە لەو کاتەدا شانشینێکی گاور بوو پایتەختەکەشی شاری دنقلە بوو کە دەکەوێتە سەرەوەی نیلو پەیوەندی پتەوی لەگەڵ میسردا هەبوو لەکاتی فتوحاتی ئیسلامیەوە کاتێ دەوڵەتی ئەیوبیش لەمیسردا دروست بوو، سەلاحەدین ویستی وڵاتی نەوبە ئازاد بکات لەپێناو پاراستنی میسر لەوەی لەباشورەوە دەستدرێژی بکرێتە سەر، بۆیە توران شای برای نارد لەمانگی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٦٨ك/ کانوونی دووەمی ١١٧٣زدا نارد بۆ وڵاتی نەوبەن ئەوەبوو ئیبریمی رزگار کردو دەستکەوتو دیلی زۆری هەبوو پاشان گەڕایەوە بۆ قوص، ئیسلام چووە چەند شوێنێکیەوە کە پێشتر ئەسپی موسوڵمانەکان پێی نەنابووە ناویەوەو ئیبراهیمی کوردی کرد بە والی تیایدا[2]، ئەم ئازادکردنەش هۆکارێك بوو بۆ نەهێشتنی ئەو بەربەستانەی کەڕێگر بوون لەبڵاوبوونەوەی ئیسلام لەو ناوچەیەدا[3].

**هەشتەم: راستی ساردی نێوان سەلاحەدینو نورەدین:**

مێژوونوسان باسی پەیوەندی نێوان سەلاحەدینو نورەدینیان کردوە، ئیبن ئەثیرو ئەبو شامە لەئیبن طی یەوە هۆکارەکانی ئەو ساردیە باس دەکەن کە کەوتۆتە نێوان نورەدینو سەلاحەدینەوە لەساڵی ٥٦٧ك دا کاتێ رێککەوتن لەسەر گەمارۆدانی الکرکو پاشان سەلاحەدین پاشەکشەی کرد پێش گەشتنی نورەدین[4]، لەئیبن الأثیر و ئیبن أبی طي یشەوە کۆمەلێك مێژوونوس ئەم باسەیان گێڕاوەتەوە[5]، کۆمەڵێ نوسەری هاوچەرخیش ئەم باسەیان گوێزاوەتەوە بەبێ بژارکردنو زیادەڕۆییان کردووە لەلێکدانەوەو لێکۆڵینەوە لەهۆکارەکانی ساردی نێوانیانو دەرئەنجامەکانیداو پەیوەندی نێوان سەلاحەدینو نورەدینیان بەشێوەیەکی دوژمنکارانە لێکداوەتەوە، لەو قسانەش کە کردوویانە گوایە هەریەك لەسەلاحەدینو نورەدین لەیەکتر ترساونو سەلاحەدین هەوڵی داوە بۆ رزگار بوون لەدەسەڵاتی نورەدینو دەیویست ناوچەی الکرك وەك بەربەستێك لەنێوانیاندا

---

[1] الطریق الی بیت المقدیس، ل: ٩٦.

[2] تأریخ الأیوبیین في المصر وبلاد الشام، ل: ٤٦.

[3] جیهاد الأیوبیین والمعالیك ضد الصلیبیین والمغول د. فرستال ٥٢.

[4] الباهر(١٥٨، ١٥٩) کتاب الروضتین(٢/٢٢٧).

[5] نورالدین زنکي في الأدب العربي، ل١١٦.

بمێنێتەوە، نورەدینیش خۆی بەهەڵە زانیوە لەناردنی ئەسەدەدین‌و سەلاحەدین بۆ میسرو وەسفکردنی نورەدین بەدوژمنی سەرسەختی سەلاحەدین‌و چەندین شتی تر[1].

**ئەم بۆچونە نارەوایانەش تەنها لای ئیبن طيء وئیبن اثیر باسکراوە:**

هەرچی ئیبن أبي طي ئەوە هەوڵی داوە بەو درۆزنی‌و فێڵبازیەی کەپێناسراوە تانە بدات لەپەیوەندی نێوان ئەم دوو پیاوە،و ئەو تۆمەتبارە بەو شتە نەشیاوانەی کەدەیداتە پاڵ نورەدین، چونکە نورەدین شیعەی حەلەبی ملکەچککردووەو دروشمەکانی هەڵوەشاندنەوەو سوننەی بەهێز کرد، باوکی ئیبن طي ش لەسەرانی شیعە بوو لەلایەن نورەدینەوە دورخرایەوە لەحەلەب، بۆیە دەبینین ئیبن ئەبی طي زۆر هێرش دەکاتە سەر نورەدین‌و هەوڵ دەدات پەیوەندی نێوان ئەم دوو پیاوە مەزنە بەدرۆ بۆگەنەکانی بشێوێنێ[2].

سەبارەت بەئیبن الأثیریش: ئەوە گومان هەیە لەو شتانەی کەدەربارەی سەلاحەدین نوسیویەتی‌و زۆر جار بەدوای پاساوێکدا دەگەڕێ بۆ رەخنەگرتن‌و شکاندنی سەلاحەدین بەتایبەت لەکاتی بەراورد کردنی نێوان ئەووو نورەدیندا[3]، ئەم مێژوونووسەی ماڵی زەنکی لەهەردوو کتێبەکەیدا (الكامل في التأريخ والباهر في تأريخ الدولـة الأتابكيـة) ئەو رایانەی لەکتێبەکەیدا باس کردووە کە کۆمەڵێ مێژوونووس لێیەوە دەگێڕنەوەو پوختەی ئەم رایەش ئەوە دەگەیەنێ کەسەلاحەدین بەئەمەك نەبووە بۆ نورەدینی مامۆستای، بەڵکو هەر لەسەقامگیر بوونی دەسەلاتیەوە لەمیسردا هەوڵی جیابوونەوەو سەربەخۆیی دەدا لێی تەنانەت هەوڵی کێبڕکێ کردنی دەسەلاتی سیاسی داوە لەولاتی شامدا، هەموو ئەم رایانە[4]، ئیبن الأثیر دوای کۆچی دوایی کردنی سەلاحەدین‌و ناچاربوونی بۆ دەرچوون بۆ ولاتی شام بەسەرکردایەتی سوپاکەیەوەو هێنانی موڵکەکانی نورەدینی مامۆستایی بۆ ناو موڵکەکانی خۆی لەناو میسردا، چونکە دەرچوونی سەلاحەدین بەسوپاکەیەوە بۆ شام‌و لەپێناو گێڕانەوەی گەرانەوەی بەرەی ئیسلامی یەکگرتوو بوو کە عیماد الدین زەنکی‌و نورەدینی کوڕی خۆیان ماندوو کرد لەپێناو پێکهێنانیداو دوای کۆچی دوایی نورەدین خەریك بوو هەڵدەوەشایەوەو، باروذۆخ دەگەڕایەوە بۆ دۆخی لاوازی‌و پەرتەوازەیی پێشوو، دوای دابەش بوونی ماڵی زەنکیش بۆ حزبی دیمەشق‌و حزبی حەلەب‌و کوڕە منداڵەکەی

---

[1] نورالدين محمود في الأدب العربي في عصر الحروب الصليبية، ل: ١١٧.

[2] كتاب الروضتين (٢/١١٨،١١٧).

[3] دراسة في تأريخ الأيوبين والمماليك، ل: ٦٣.

[4] تأريخ مصر الأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٢٢.

بەناوی سالح ئیسماعیل نەیتوانی دووبارە شانشینەکەی باوکی یەکبخاتەوە[1]، ئەوەبوو سەلاحەدین نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەی عەباسیو بۆ کوڕەکەی نورەدینو ئاگاداری دەکردەوە کە دەرچوونی بۆ شام بۆ یەکخستنی موسوڵمانانە دژ بەفرەنجەکان[2].

واش پێدەچێت دەبرێت کە ئەم رایانەی ئیبن ئەثیر دەیانڵێتەوەوو مێژوو نووسەکان لێییەوە دەیگێڕنەوە سەبارەت بەوەفادارنەبوونی سەلاحەدین بۆ خانەوادەی زەنکیو ئەو ڕیوایەتانەی کە لەو بارەیەوە هاتوون مێژوو نووسەکان خۆیان دایانڕشت بێت بۆ لێکدانەوەی ئەو ڕێبازەی کە سەلاحەدین پاش وەفاتی نورەدین گرتیە بەر، هەروەها هۆگری ئیبن ئەثیر بۆ خانەوادەی زەنکی هۆکارێکی تر بوو، پاشان هاوسۆز نەبوونی لەگەڵ سەلاحەدیندا بەهۆی ئەوەی کە سەلاحەدین ئەو بنەماڵەو موڵکەکانی لەناو برد، هەروەك مێژوونووسان تێبینی ئەوەیان کردووە ئیبن ئەثیر لەهەردوو تأریخەکەیدا الکامل والباهر زۆردابەزیوەتە سەر سەلاحەدینو بەدوای هەڵەو کەمو کورتییەکانیدا گەڕاوە[3]، لەراستیشدا سەلاحەدین باشترین سەرباز بووە بۆ گوێڕایەڵی نورەدینی سەرکردەیو ئەمەش چەند بەڵگەیەکە لەسەر ئەوە:

١- عیمادی ئەسفەهانی دەڵێت: سەلاحەدین لەفەرمانی نورەدین دەرنەدەچوو و کاری بەباشیو بەهێزیەوە بۆ دەکردو دەگەڕایەوە بۆ راو بیرو بۆچوونەکانی[4].

٢- ئەبو شامە: ئەمیش هەستا بەپوچەڵکردنەوەی تۆمەتەکانی ئیبن أثیر سەبارەت بەدەرچوونی لەگوێڕایەڵی نورەدین، بەپێی رای ئەبوو شامە نورەدین رەخنەی لەسەلاحەدین نەگرتووە بەهۆی زیادەرەوی کردنی لەبەخشینو خەرجکردنی پارەدا بەبێ پرسو راوێژکردن بەنورەدین[5]. ئەم رایەشی بەبەڵگە نامەیەك دووپات دەکاتەوە کەخۆی بینیویەی بەخەتی نورەدین نوسراوەو تیایدا نورەدین بۆ قازی أبی عصرون کە قازی نورەدین لەشامداو سەلاحەدین لەمیسردا بوو باسی سەرسامی تەواوی خۆی دەکات بەسەلاحەدینو هەستانی بەسەرخستنی مەزهەبی سوننی لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمیو مەزهەبی شیعە لەمیسرداو داواشی لەئەبی عصرون کردووە کە پشتگیری سەلاحەدین بکات لەم کارە مەزنەدا[6].

---

[1] تأريخ مصر الأسلامية زمن سلاطين بني أيوب، ل: ٢٢.

[2] مرآة الزمان (٨/٣٢٨، ٣٢٧) تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٢.

[3] التعريف بامؤرضتين في عهد المغول والتركمان، ل: ٣٨-٤٩.

[4] كتاب الروضتينله تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٣.

[5] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٣.

[6] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٣.

٣- لەراستیدا هەموو ئەوهەنگاوە یەکلاکەرەوانەی کە سەلاحەدین گرتیە بەر بۆ روخاندنی دەوڵەتی فاطمی لەمیسرداو لەناوبردنی بانگەوازی ئیسماعیلی تیایدا، بەفەرمانی راستەوخۆی نورەدین بوو جێبەجێکردنیشی پاش گەیشتنی نەجمەدین ئەیوب باوکی سەلاحەدین لەلایەن نورەدینەوە بۆ میسر هەتاوەکو بۆ خۆی سەرپەرشتی ئەو کارە بکاتو یارمەتی سەلاحەدین بدات بۆ لەناوبردنی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلی[1].

٤- بەڵگەیەکیش کە بەتەواوی شوێنکەوتەیی سەلاحەدین بۆ نورەدینو خۆبەجێنشین زانینی لەمیسردا دەسەلمێنێ ئەوەیە کەوتار بەناوی ئەوەوە دەخوێندرایەوە لەهەموو ناوچەکانی دەوڵەتی فاطمیدا لەکاتێکدا کەسەلاحەدین وەزیری عاضدی خەلیفەی فاطمی بوو[2]، پاشان وتار بێژەکانی میسر نزایان بۆ نورەدین دەکرد پاش خەلیفە، ئەمە سەرباری لێدانی دراو بەناوی المستضیء بأمر الله والملك العادل نورەدینو هەڵکۆڵینی ناوی هەریەکەیان لەسەر دیوێکی ئەو دراوە[3].

٥- هاتنی ئیبن قەیسەرانی وەزیری نورەدین بۆ میسر لەساڵی ٥٦٨ك- ٥٦٩ك بۆ پێداچوونەوەی حساباتی وڵاتو بینینی بارودۆخو دیاریکردنی ئەو برە پارە ساڵانەی کە سەلاحەدین دەیدا بەنورەدین ، مەسەلەیەکی سروشتی بووو پاشکۆیەتی میسری بۆ نورەدین دووپاتدەکردەوە[4].

٦- خەلافەتی عەباسیش ئەمەی دەزانی، بۆیە جیاوازی لەنێوان پلەو پایەیو نازناوەکانی خەلیفەدا هەبوو بۆ هەرلایەكو خەڵاتو دیاریەکانی سەلاحەدینی کەمتر دانابوو لەنورەدین ئەوەبوو دوو شمشێری کردە خەڵاتی نورەدین وەك ئاماژەیەك بۆ بەرپرسیارێتی لەهەردوو وڵاتی میسرو شام، نورەدینیش لەلایەن خۆیەوە خەڵاتی نارد بۆ سەلاحەدینو خێزانەکەیو ئەمیرەکانی لەمیسردا[5] بۆ دووپاتکردنەوەی شوێنکەوتەییان بۆی.

---

[1] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٤.

[2] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٤.

[3] السلوك، المقريزى(١/٤٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٤.

[4] تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٣.

[5] مفرج الكروب (١/٢١٩) تأريخ مصر الأسلامية، ل:٢٥.

٧- سەلاحەدین ڕێزو شکۆی پاشای دەپاراستو خۆی نەدەبردە ریزی نورەدینی گەورەیەوە، ئەوەبوو نێردراوەکانی نورەدین هەواڵیان نارد بۆی: کەسەلاحەدین دیاریو پۆشاکەکانی ئەو لەبەر دەکاتو ئەو بڕە پارەیەی ساڵانە کە لەسەری ڕێککەوتوون بەبەردەوامی دەینێرێت[١].

٨- ئەگەر هەموو ئەو ڕێو شوێنانەی کە سەلاحەدین گرتیە بەر بۆ ڕوخاندنی خیلافەتی فاطمی وتار خوێندنەوە بەناوی عەباسیەکانەوەو لەناوبردنی بانگەوازی ئیسماعیلی لەمیسردا بەڕێنمایی ڕاستەوخۆی نورەدینو دوای ناردنی نەجمەدینی باوکی سەلاحەدین بوبێت ئەوە دەست بەسەراگرتنی یەمەنو لکاندنی بەمیسرەوە بەهەمان شێوە بەمۆڵەتی نورەدین بوو لەپێناو لەناوبردنی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلیو هێنانی یەمەن بۆ بەرەی بەرەنگار بوونەوە بەجۆرێك نورەدین ئەم مژدەیەی نارد بۆ خەلیفەی عەباسی، هەروەها لکاندنی مەغریب بەمیسرەوە هێرشکردنە سەر وڵاتی نەوبە(سودان)یش بەهەمان شێوە، وێڕای مژدەدان بەخەلیفە بەبۆنەی نزیکبوونەوەی ئازادکردنی قودسو قوستەنتینە[٢]، ئەوەبوو نورەدین نامەیەکی بۆ خەلیفەی عەباسی نووسی کە تیایدا هاتبوو: قوستەنتینیەو قودسیش بەرەو ئازادبوون دەڕۆنو خوای گەورەش بەمیهرەبانی خۆی لێکردنەوەی بەرووبووم دەکاتە خەڵاتی ئەهلی ئیسلامو خزمەتگوزارتان سەرکەوتوو دەکات بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پێشەواکەی، لەو شتە باشانەش کە لەم ڕۆژە پرشنگدارەدا روویاندا، ئەو دەسکەوتە گەورەیە بوو کە بۆ موسوڵمانەکان بەدیهاتو ئازادکردنی وڵاتی نەوبەی لێکەوتەوەو گەیشتن بەچەند شوێنێك کە پێشتر ئەسپی موسوڵمانەکان پێی تێ نەناوە هەروەها سەربازەکان دەستیان گرت بەسەر برقەو قەڵاکانیدا هەتاوەکو سنوری مەغریب[٣].

٩- هەر لەجێگیر بوونی سەلاحەدینەوە لەمیسردا هەتاوەکو کۆچی دوایی نورەدین، بەردەوام بوو لەناردنی شتە بەنرخەکانی کۆشکی فاطمی بۆ نورەدین وەك هێمایەك بۆ شوێنکەوتەیی، هەروەها بەردەوام بوو لەسەر ئاگادارکردنەوەی نورەدین لەهەموو گەورەو بچوکێك کەلەمیسردا روویدەدا، بۆنموونە نامەیەك بەدیدەکەیت کەتیایدا باسی ڕاپەڕینی پاشماوەکانی فاطمیەکان دەکات لەناویشیاندا عەمارەی یەمەنی باس دەکات[٤]. هیچ شتێکش هێندەی هاوکاری ستراتیژیان لەکوشتاری خاچپەرستەکاندا بەڵگە نییە لەسەر بوونی هاوکاری

---

[١] السلوك، المقريزي(١/٤٧) تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٦.

[٢] مفرج الكروب (١/٢٣٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل:٢٧.

[٣] مفرج الكروب (١/٢٣٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل:٢٧.

[٤] مفرج الكروب (١/٢٣٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل:٢٧.

لەنێوانیاندا، ئەوەتا ئەبو شامە باس لەوە دەکاتو دەڵێ: لەساڵی ٥٦٨ك/١١٧٢زدا هەردوو سوڵتان نورەدین لەشامو سەلاحەدین لەمیسر سەرپەرشتی جیهادی خاچپەرستەکانیان دەکرد، هەروەها عیماد ئەم رووداوە (بەجیهادی دووسوڵتانەکە دژ بەفرەنجەکان وەسف دەکات)[1] ئەمەش لەو نامەیەی سەلاحەدیندا بۆ خەلیفەی عەباسی دووپات کراوەتەوە کەتیایدا دەڵێت: لەگەڵ نورەدیندا رێککەوتین لەسەر گرتنی هەردوو لای داگیر کەران لەمیسرو شامەوە، بەندە(سەلاحەدین) بەسەربازەکانمەوە لەوشکانیو دەریاوەو نورەدینیش لەلای دەشتو سەختایی شامەوە[2].

١٠- ئەوەبوو سەلاحەدین پاشکۆیەتی خۆی دەربڕی بۆ خانەوادەی نورەدین تەنانەت دوای کۆچی دوایشی لەساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٣زدا، بەجۆرێك کە سەلاحەدین بەناوی الصالح ئیسماعیلی کوڕیەوە وتاری دەخوێندەوەو دراویشی بەناویەوە لێداو[3]، پرسەنامەشی نارد بۆ سەرەخۆشی بۆ کۆچی دوایی نورەدین[4]، بەم پێیەشدەتوانین بڵێین کە هەتاوەکو کۆچی دوایی نورەدینیش میسرو شام یەکیان گرتبوو بەسەرکردایەتی نورەدین[5]، سەلاحەدینیش تەنها کار بەدەستێکی ئەو بوو لەمیسردان عمادەدینی ئەسفەهانیش ئەمەمان بۆ دووپاتدەکاتەوە لەکاتێکدا کەستایشی نورەدین دەکاتو دەڵێت:

بملك مصر أهنيء مالـــك الأمم     فثق وأبشر بنصر الله عن أمم

فملك مصر وملك الشام قد نُظِما     في عقد عز من الأسلام منتظم[6]

لەهەموو حاڵەتەکانیشدا پەیوەندی سەلاحەدین لەگەڵ نورەدیندا نەگەیشتووەتە رادەی دوژمنایەتی، هیچ پاساوێکیش نییە بۆ لێکدانەوەی جیاوازی بیرو را وەك ساردیو پشتکردنەیەك، وەك ژمارەیەك لەمێژوونووسو نوسەران دوپاتی دەکەنەوە، هەمووی مەسەلەکەش ئەوەیە نورەدین چاوی بڕیبووە میسر وەك سەرچاوەی داهاتەکان هەتاوەکو خەرجی دابین بکات دژ بەخاچپەرستەکان لەشامدا، چونکە سەرچاوەیەکی وزەی مرۆیی خەباتگێڕە، سەلاحەدینیش لەنورەدین زیاتر ئاگادار بوو لەوەی کە لەمیسردا دەگوزەراو ئەو مەترسیانەی کەئامادەباشی

---

[1] مفرج الكروب (١/٢٣٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل:٢٧.

[2] كتاب الروضتين له تأريخ الشعوب الأسلامية، ل:٢٧.

[3] السلوك، المقريزى(١/٥٥) تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٨.

[4] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٧.

[5] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٨.

[6] كتاب الروضتين له تأريخ مصر الأسلامية، ل: ٢٧.

لایەنگرانی فاطمی‌ەکان بۆ چوونە پاڵ فرەنجەکان دروستی دەکرد، بۆیە گرنگی دەدا بەبنیاتنانی سوپایەکی بەهێز بەجۆرێك کە بتوانێت دەسەلات بەسەر میسردا بگرێت‌و پێی وابوو چەسپاندنی قەوارەی دەوڵەتی نوێ لەمیسردا لەپێشترە هەتاوەکو گرنگی دان بەمەسەلەکانی شام[1]. ئەمەش هاوڕایە لەگەڵ ئەوەی کەنورەدین ووتی بەو نێردراوەی کە سەلاحەدین ناردی بۆ پۆزش هێنانەوە لەگەمارۆدانی الکرك، پاراستنی میسر لامان گرنگترە لەشوێنەکانی تر[2]. سەلاحەدین لەسەر هەمان رێڕەوی نورەدین بەردەوام بوو لەسەرخستن‌و چەسپاندنی پرۆژەی سوننی، سەرکردایەتیش لەئیسلامدا قۆرخ نییە بۆ خێزانی ئەیوبی یان زەنکی یان هەر خانەوادەیەکی تر هەرچەندە پلەو پایەی بەرزبێت بەڵکو ئەمە بۆ هەرکەسێکە کەکارو کردەوەکانی پاش پشتیوانی خوا پێشەنگی پێبدات‌و خۆشەویستی‌و رێزو پشتیوانی‌و هاوکاری خەڵك پێشی بخات، بۆ نموونە ئەبوو بەکر ر.خ ئوممەت پێشی خست پاش پێغەمبەرەکەی‌و بەیعەتی پێدا هەروەها عومەر درێژەی دا بەو کاروانەو عوسمان‌و عەلیش ر.خ بەدوایاندا هاتن، خزمەتکردنی ئایین‌و موسوڵمانانیش لەپێش هەموو شتێکەوە بوو لەهزری سەلاحەدیندا.

**نۆیەم: وەفاتکردنی نورەدین:**

عمادی ئەصفەهانی دەڵێ: نورەدین رەحمەتی خوای لێبێت فەرمانی دا بە پاککردنەوەی(خەتەنەکردنی) پاشا صالح ئیسماعیلی کوڕی لەرۆژی جەژنی رەمەزانداو ئاهەنگمان گێڕا بۆ ئەم بۆنەیەو بازاڕەکانی دیمەشق بۆماوەی چەند رۆژێکداخران، منیش هۆنراوەیەکم بۆ دەربڕینی خۆشی بۆ جەژن‌و پاکبوونەوە نووسی کەتیایدا هاتووە:

عیدان: فطر و طهر فتح قریب ونصر

کلاهما لك فیه حقاً هناء وأجر

وفیها بالتهاني رسمٌ لنا مستمر

طهارة طاب منها أصلُ وفرعُ وذکر[3]

دەڵێ: لەرۆژی جەژندا کەرۆژی یەکشەممە بوو وەك نەریتی خۆی نورەدین بەپشتیوانی پەروەردگار سواری ئەسپەکەی بوو لەناو ئاپۆرەی سەربازەکانیداو قەدەریش پێی دەوت: ئەمە دوایەمین جەژنتە پاشان لەگۆرەپانی الأخضری سەرودا وەستا بۆئەوەی لەگەردنی بدرێ،

[1] نورالدین زنکي في الأدب العربي في الحروب الصلیبیة، ل١١٩.

[2] زبدة حلب (٢/٣٣٩) نورالدین زنکي في الأدب العربي في الحروب الصلیبیة، ل١١٩.

[3] کتاب الروضتین(٢/٣٠٨).

پێشتریش خێوەتەکەی لەگۆرەپانی أخضردا هەڵدا بوو فەرمانی دانانی مینبەری دابوو، وتاربێژ قازی شمس الدين کوڕی فرّاشی قازی سوپاس وتاری بۆ خوێندنەوەو دوای نوێژو یادکردنەوەی پەروەردگار گەڕایەوە قەڵاو سیمایەکی جوان‌و نورانی هەبوو مێزەرەکەشی وەکو تورکەکان‌و خاوەن مولکەکان بەسەر شان‌و باڵی دا بەردا بوویەوە، پاشان لەسەر خوانی ئامادە بووین‌و بەتەواوی ڕێزێکمان بۆ بەست کە بەدەر بوو لەکەم‌و کورتی[1].. لەرۆژی دووشەممەشدا لەکاتێکدا کە گەورەکان لەگەڵیدا دەرۆیشتن‌و تێکەیشتوان گفتو گۆیان لەگەڵدا دەکردو همام الدين مودودیشیان تێدا بوو کە لەکەسایەتیە گەورەکانی ئەو سەردەمە بوو لەسەرەتای دەوڵەتی نورەدیندا والی حەلەب بوو زۆر بەئەزموون‌و دنیا دیدە بوو... قسەیەکی بەنورەدین وت کە پەندی تیادا بوو بۆ هەر کەسێك کە لەو رۆژگارەدا لەخۆی بایی بووبێت: ئایا ساڵێکی تر دەمێنین هەتاوەکو لێرەدا کۆ ببینەوە؟ نورەدینیش وتی: ئایا مانگێکی تر دەمێنین؟ ساڵ دوورە، ئەوەبوو ئەو قسەیەیان هاتە دی و نورەدین نەگەیشتە مانگێك‌و هەممامیش ساڵی پڕنەکردەوە پاشان نورەدین دەستی کرد بەیاریکردن بەتۆپ لەگەڵ هاوکارانیدا، پاشان ئەمیرێکی تر ڕێی پێگرت بەناوی یەرەنقوش‌و پێی وت: باش[2] ئەمەش بووە هۆی بێزاری‌و تورەبوونی بەپێچەوانەی سروشتی خۆی کە لێبوردەو میهرەبان بوو بۆیە لێی تووڕە بوو سەرزەنشتی کردو پەلکێشی کرد بۆ ناو قەڵاکەو دابەزی‌و ماوەیەك لەبەر چاوو ون بوو، هەفتەیەك لەماڵەوەدا مایەوەو سەرقاڵی میوانەکانی‌و سەرگەرمی نەخۆشیەکەی بوو، خەڵکیش لەئاهەنگی خۆیاندا ڕۆچوو بوون، یەکێك ماڵی دەبەخشی‌و یەکێکیش گیانی دەکرد بەقوربانی، ئەم خۆشیانەش بەناخۆشی کۆتایی هات‌و پاش ئەویش دەسەڵات بۆ کەس دانەمەزرا تەنها الملك الصالح نەبێت[3] دەڵێ: پاشان نەخۆشی زۆری بۆ هێناو پزیشکەکانیش ئامۆژگاری بڕینیان کرد بەڵام ئەو رازی نەبوو، کەسێکی سامدار بوو بۆیە دووبارەیان نەکردەوە لەگەڵیدا، بەم شێوەیە لەرۆژی چوار شەممە یازدەی شەوالدا گەڕایەوە بۆ خزمەت پەروەردگار، بەراستی یەکێك بوو لەبەندە چاك‌و ساڵحەکانی پەروەردگار[4]، هەروەها کۆچکردنیشی بەهۆی تەنگە نەفەسیەکەیەوە بوو، کە بەپزیشکەکان چارەسەر نەکراو[5] لەرۆژی چوار شەممە یازدەی شەوالی ساڵی ٥٦٩ك کۆچی دوایی کردو لەقەڵای دیمەشق بەخاك سپێردرا پاشان گوێزرایەوە بۆ نزیك ئەو

---

[1] كتاب الروضتين(٢/٣٠٨).

[2] كتاب الروضتين(٢/٣٠٨).

[3] كتاب الروضتين(٢/٣٠٩).

[4] كتاب الروضتين(٢/٣١٠).

[5] هەمان سەرچاوە(٢/٣١٣).

خوێندنگەیەی کە بۆ هاوەڵانی ئەبو حەنیفە بنیاتی نابوو لەتەنیشت الخواصین لەشەقامی ڕۆژئاوا[1].

ڕەحمەتی خوا لەگیانی پاکی بێت چەند سور بوو لەسەر شەهیدیو دەیوت: زۆر هەوڵی شەهید بوونم داوەو پێی نەگەشتووم، الذهبی دەڵێت: ئەوەبوو لەسەر جێگا بەپلەی شەهیدی گەشتو خەڵکیش دەیانوت: نورەدینی شەهید[2]، شاعیرانیش بەچەندین هۆنراوەی جوان شیوەنیان بۆ دەکرد کە جوانترینیان ئەم شیعرەی عیمادی ئەسفەهانییە کەدەیوت:

الدين في ظلم لغيبة نورة — والدهر في غمم لفقد أميره

فليندب الإسلام حامي أخطاره — والشام حافظ ملكة وصغوره

ما أعظم المقدار في أخطاره — إذ كان هذا الخطب في مقدوره

ما أكثر المتأسفين لفقد من — قرت نواظرهم بفقد نظيره

ما أغوص الإنسان في نسيانه — أو ما كفاه الموت في تذكيره

من للمساجد والمدارس بانيا — لله طوعل عن خلوص ضميره

من ينصر الإسلام في غزواته — فلقد أصيب بركنه و ظهيره

من للفرنج ومن لأسر ملوكها — من للهدى يبغي فكاك أسيره

من للخطوب مذللا لجماحها — من للزمان مسهلا لوعوره

من كاشف للمعاضلات رأيه — من مشرق في الداجيات بنوره

من للكريم ومن لنعش عثاره — من لليتيم ومن لجبر كسيره

من للبلاد ومنم لنصر جيوشها — من للجهاد ومن لحفظ أموره

من للفتوح محاولا أبكارها — برواحه غزوه وبكوره

من للعلا وعهودها من للندى — ووفوده من للحجا ووفوره

ما كنت أحسب نوردين محمد — يخبز وليل الشرك في ديجوره

أعزز علي بأن أراه مغيبا — عن محفل متشرق بحضوره

لهفي على تلك الأنامل إنها — مذ غيبت غاض الندى ببحورة

ولقد أتى من كنت تجري رسمه — فضع العلامة منك في منشوره

لقد أتى من كنت تكشف كربه — فارفع ظلامته بنصر عشيره

ولقد أتى من كنت تؤمن سربه — وقع له بالأمن من محذورة

---

[1] هەمان سەرچاوە(٣١٣/٢).

[2] سير اعلام النبلاء (٥٣٧/٢٠).

ولقد أتى من كنت تؤثر قربه   فادم له التقريب في تقريره
والجيش قد ركب الغداة لعرضه   فاركب ليبصره أوان عبوره
أنت الذي أحييت شرع محمد   وقضيت بعد وفاته بنشوره
كم قد أمرت بحفر خندق معقل   حتى سكنت اللحد في محفورن
كم قيصر للروم رمت بقسيره   إرواء بيض الهد من تاموره
أوتيت فتح حصونه وملكت   عقر بلاد وسبيت أهل قصوره
أزهدت في دار الفناء وأهلها   ورغبت في الخلد المقيم وحوره
أوما وعدت القدس أنك منجز   ميعاده في فتحه وظهوره
فمتى تجير القدسي من دنس العدى   وتقدس الرحمن في تطهيره
يا حاملين سريره مهلا فمن   عجب نهوضكم بحمل ثبيره
يا عابرين بنعضع أنشقتم   من صالح الأعمال نشر عبيره
نزلت ملائكة السماء لدفنه   مستجمعين على شفير حضيره
ومن الجفاء لع مقامي بعده   هلا وفيت وسرت عند مسيره
حياك معتل الثبا بنسيمه   وسقاك منهل الحيا بدروره
ولبست رضوان المهمين ساحبا   أذيال سندس خزه وحريره
وسكنت عليين في فردوسه   حلف المسرة ظافرا بأجوره

دوای کۆچی دوایی نورەدین ئالای جیهادی لەلایەن سەلاحەدینی ئەیوبی قوتابی زیرەك‌و سەربازی دڵسۆزی-یەوە بەرزکرایەوە کەجیهادی خۆی لەسەر ئەوە بنیاتنا کەنورەدین دایمەزراند بوو لەجیهادکردنی بێ باوەڕان‌و توانی ئەم کارە بەجوانترین شێوە ئەنجام بدات.

# بەشی دووەم: دروووست بوونی دەوڵەتی ئەیوبی

## باسی یەکەم: خانەوادەی سەلاحەدین و پەروەردەبوونی

### یەکەم: ڕەچەڵەکی سەلاحەدین:

سەلاحەدین لەخێزانێکی کوردی، خانەدان و پایەدارە، ئەم خێزانەش سەر بەهۆزێکی کوردە، یەکێکە لەناودارترین هۆزەکانی کورد لەڕووی ڕەچەڵەکەوە، ئەم هۆزەش بە ڕەوادی[1] ناسراون، لەشارۆچکەی دوینی سەر سنوری ئازەربایجان لەنزیك شاری تفلیسی ئەرمەنیەوە هاتوون و ئەیوبیەکان دەدرێنە پاڵ ئەیوبی کوڕی شادی و ئیبن أثیر بەخانەدانترین هۆزیان دەزانێ چونکە هەرگیز کۆیلایەتیان[2] بەخۆیانەوە نەدیوە، هەروەها نەجمەدین ئەیوبی باوکی سەلاحەدین و ئەسەدەدین شێرکۆی مامی کاتێ لەعێراقەوە هاتن بۆ وڵاتی شوانکارە نەبوون بەڵکو زۆر بەئاگاو شارەزا بوون لەکاروبارە سیاسی و ئیداریەکاندا، هەرچەندە هەندێ لەئەیوبیەکان هەوڵیانداوە نکوڵی لەکوردبوونی خۆیان بکەن و خۆیان بەعەرەب و ئەمەوی لەقەڵەم بدەن[3]، بەڵام ڕەچەڵەکیان هەرچیەك بێت ئەوە دەرکەوتنیان لەسەر شانۆی ڕووداوەکان لەڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لەسەدەی شەشەمی کۆچی / دوازدەی زاینییەوە بوو کاتێ شادی باپیرە گەورەیان هەندێ پۆستی کارگێڕی لەقەڵای تکریتدا پێسپێردرا کە لەو کاتەدا موڵکی بەهرۆزی خزمەتگوزاری کە یەکێك بووە لەئەمیرەکانی سوڵتانی سلجوقی محمەدی کوڕی ملکشاه[4]، تکریتیش کەدەکەوێتە بەری ڕاستی ڕووباری دیجلە لەباکوری سامەڕا دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم ئە ڕێگایانەدا هەبوو کە بەعێراق و وڵاتی شامدا تێپەڕ دەبوون، زۆرینەی دانیشتوانیشی کورد بوون، شادی بن لەگەڵ دوو کوڕەکەیدا نەجمەدین ئەیوب و ئەسەدەدین شێرکۆدا گواستیەوە بۆی و پلە بە پلە بەپۆستە ئیداریەکاندا سەرکەوت هەتاوەکو پۆستی شحنە(پۆلیسی) گرتە دەست و کاتێ کۆچی دوایی کرد نەجمەدین ئەیوب بووە جێنشینی[5]، سەیر لەوەدایە کە هەندێ مێژوو نووس فێڵ لەلێکۆڵینەوەکانیاندا دەکەن

---

[1] التأريخ الباهر للدولة الأتابكية، ل: ١١٩.

[2] التأريخ الباهر للدولة الأتابكية، ل: ١١٩

[3] الخطط، المقريزي (٣/٤٠٤).

[4] تأريخ بيت المقدس د. محمد الحافظ النقرل، ل: ١٣٢.

[5] تأريخ بيت المقدس د. محمد الحافظ النقرل، ل: ١٣٢.

هەتاوەکو بنەماڵەی سەلاحەدین لەزنجیرەی باوباپیرانەوە ببەستنەوە بە(مُصر) وە کەدەچێتە سەر عەدنان، لەڕێی ئەم لێکۆڵینەوانەشەوە کە لەگەڵ لێکۆڵینەوەی زانستیو ڕاستیشدا ناگونجێ هەوڵ دەدەن هەموو کەسایەتیەکی مەزنی ناعەرەب پشتاو پشت ببەنەوە سەر رەچەڵەکی عەرەب، وەك ئەوەی هەرچی پیاوەتیو چاکە هەیە کورتبوویێتەوە لەعەرەبداو تایبەت بێت بەوان، یان وەك ئەوەی موسوڵمانی غەیرە عەرەب (بەپێی تێڕوانینی ئەوان) توانای بنیاتنانی هیچ سەروەریو شارستانیەتێکیان نەبێتو شیاوی ناوداری نەبن[1]، یان نەتوانن ئاینەکەیان بەشمشێرو زمان سەر بخەن، بەڵام ئەگەر سەرنجی مێژوو بدەینو بەدوادا چوون بۆ کەسایەتیە مەزنەکانی مێژووی ئیسلام بکەین، دەبینین نەتەوەکانی تر ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەشارستانی ئیسلامیدا لەوێنەی محمەد فاتحو نورەدینو عمادەدین لە تورکو نظام الملك لەفارسوبنەماڵەی ئەیوبی لەکوردو یوسفی کوڕی تاشفین لەبەربەر، دیارە خوای گەورە ڕێزی لەعەرەب ناوە بەبڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامو هەرکەسێك دڵسۆزی ئاینەکەی بێت خوای گەورە ڕێزداری دەکاتو ئێمەدژ بەدەمارگیری کوێرانەو رەگەزپەرستی بۆگەنین، چونکە ئیسلام لەسەر بنەمای: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات ١٠). دامەزراوە ئەمەش نەگۆرە[2]: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ ( الحجرات : ١٣).

هەروەها نەجمەدین هەستاوە بەخزمەتکردنی سوڵتانی سەلجوقی محمەدی کوڕی مەلکشاه و ئەویش دەستپاکیو ژیریو جوامێری تیادا بەدیکردو قەڵای تکریتی پێسپاردو نەجمەدینیش بەباشترین شێوە بەڕێوەی بردو بەتەواوی کۆنترۆڵی کردو خەڵکی خراپەکارو چەتەی تیادا نەهێشتو ئەمەش بووە هۆی ئاوەدان بوونەوەو باش بوونی باری گوزەران تیایدا[3]، هەروەها ئەبو شامە باسی ئەوە دەکات کە ئەسەدەدین شێرکۆ لەپێشەوەی ئەمیرەکاندا بووە لای سەلجوقیەکانو ناوچەیەکی بەرفراوانیان بۆ تەرخانکردبوو لەتکریتو دەوروبەریدا کەنرخەکەی ساڵانە بە نۆسەد دینار مەزندەدەکرا[4]، ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر بوو بۆ ئەو کاتە[5].

**دووەم: لەدایکبوونی سەلاحەدین:**

سەلاحەدین لەساڵی ٥٣٢ك/ ١١٧٣زدا لەقەڵای تکریت لەدایك بووە کە شارۆچکەیەکی کۆنە لەنزیك بەغداو، لەباکوریەوە قەڵایەکی هەیە کە بەسەر دیجلەدا دەڕوانێت، کە پاشاکانی فارس

[1] تأريخ بيت المقدس د. محمد الحافظ النقرل، ل: ١٣٢.

[2] تأريخ بيت المقدس د. محمد الحافظ النقرل، ل: ١٨.

[3] كتاب الروضتين(٢/٢٥٢).

[4] كتاب الروضتين(٢/٢٥٧).

[5] تأريخ بيت المقدس د. محمد الحافظ النقرل، ل: ١٣٣.

لەكۆنەوە لەسەر بەردێكی گەورە بنباتیان نابوو، كردبوویانە جبەخانەی چەكو شوێنێك بۆ چاودێریكردنی دووژمن پاشان موسوڵمانەكان لەساڵی شازدەی كۆچیدا لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتابدا ر.خ ئازادیان كرد[1]. سەیرو سەمەرەكانی قەدەریش ئەوەبوو كە رۆژی لەدایك بوونی سەلاحەدین هاوكات بوو لەگەڵ ئەو رۆژەدا كە مجاهد الدین بەهرۆزی والی لەبەغدا فەرمانی كرد بەنجمەدین ئەیوبو شێركۆی برای كە قەلای تكریت جێبهێلن بەهۆی كوژرانی یەكێك لەسەركردەكانی قەلا لەلایەن شێركۆی مامی سەلاحەدینەوە بەهۆی ئافرەتێكەوە كە ئەو سەركردەیە ویستبووی ئابڕوی لەكەدار بكات، شێركۆش تۆڵەی بۆ شەرەفو پیاوەتی كردەوە كاتێ كە ئافرەتەكە هانای بۆ هێنا، بەهرۆزیش دوو دڵ بوو نەیدەزانی ئایا لای خۆی بیانهێلێتەوە یاخود فەرمانیان پێبكات بۆ بەجێهێشتنی قەلاكە؟ چونكە ئەگەر بیهێشتنایەتەوە لەتۆڵەی سەركردەكان دەترسا كە تووشی شتێكیان بكەن، بۆیە هیچ چارێكی تری نەبوو جگە لەوەی فەرمانیان پێبكات ناوچەكە جێبهێلن، ئەوەبوو هاتە لایانو خەمی خۆی بۆ دەربڕینو داوای لێكردن كە شەو ناوچەكە بەجێبهێلن، ئەوانیش بەجێیان هێشت بەروە موسڵ بەخێزانەكانیانەوە بەرێكەوتن سەلاحەدینیش كەمنداڵێكی تازە لەدایكبوو بوو بەكۆڵی نەجمەدین ئەیوبی باوكیەوە بوو هەروەك خاوەنی وفيات الأغيان باسی ئەوە دەكات: كە ئەیوب رەش بین بووە بە لەدایك بوونی سەلاحدینو ویستویەتی بیكوژێت لەكاتێكدا كە لەدەرەوەی شاردا دەگریا بەلام یەكێك لەشوێنكەوتوانی ئاگاداری كردەوە لەم كارەو پێی وت: گەورەم ئاگام لێیە چەند تووشی رەشبینی بوویت بەهۆی ئەم منداڵەوە نازانم ئەو تاوانی چییە؟ كەی شیاوی ئەوەیە لەكاتێكدا هیچ دەسەلاتێكی نییە ئەمەی بەسەر تۆدا هاتووە قەزاو قەدەری پەروەردگارە پاشان تۆ چووزانی ئەم منداڵە پاشایەكی ناودارو شكۆمەندی لێدەرناچێت، وازی لێبێنە چونكە بێ تاوانەو نازانێ تۆ لەچ خەمو گرفتێكدایت[2]، ئەم وشانەش كاریگەریان كردە سەر دەرونی ئەیوبو خێرا بەخۆیدا چووەیەوەو گەڕایەوە سەر رێبازە دروستەكەی ئیسلام[3].

**سێیەم: پەروەردەی سەلاحەدین:**

هەردوو برا نەجمەدین ئەیوبو شێركۆ لەبەغداوە كۆچیان كرد بۆ موسڵو چوونە لای عیمادەدین زەنكی كە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ كردنو دیاریو بەخششێكی زۆری پێدان ئەم پێشوازیو بەخشینەش وەك پاداشتێك وابوو بۆ هەڵوێستی دڵسۆزانەیان كاتێ هەستان

---

[1] معجم البلدان(٢/٤٩١).

[2] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين، صلاح الدين علوان ، ل: ٢٠.

[3] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين، صلاح الدين علوان ، ل: ٢١.

بەرزگارکردنی لەکوشتن یان بەدیل گیران ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە عیمادەدین زەنکی فەرمانڕەوای موسڵ لەنزیك تکریت لەسەردەمی والی بەغدادا رووبەڕووی سەلجوقیەکان بوویەوەو سوپاکەی لەبەرامبەر سوڵتانی سەلجوقیدا تێکشکاو لەکاتی پاشەکشەو گەڕانەوەیدا بۆ موسڵ بەتکریتدا تێپەڕی و گیانی خۆی و سوپاکەی کەوتە دەست نەجمەدین ئەیوبی والی تکریت کەدەیواتوانیی بیانکوژێت یان رزگاریان بکات نەجمەدین ئەیوبیش چاکەی هەڵبژاردو لەگەڵ شێرکۆی برایدا هەستان بەیارمەتیدانی عیمادەدین و رێگەی رزگاربوونیان بۆ ئاسانکردو هەتاوەکو گەیشتەوە موسڵ، ئەم مامەڵە جوان و هەڵوێستە مەردانەش کاریگەری باش و دەرئەنجامی چاکی هەبوو لەبنیاتنانی موڵکی ئەیوب و بەرپاکردنی سەروەری ئیسلام لەسەردەستی سەلاحەدین[1] کاتێ ئەم دوو پیاوە گەیشتنە موسڵ عیمادەدین بەگەرمی پێشوازی لێکردن و پاداشتی چاکەی دانەوە وەك باسمان کرد ئەوەبوو زەوی پێدان هەتاوەکو بەسەربەرزی بژین[2]، لەخزمەت عیمادەدینیشدا بنەماڵەی ئەیوبی گەشەی کردو نەجمەدین و شێرکۆی برای بوون بەیەکێك لەباشترین سەرکردەکانی، ماوەیەك پاش ئەوە عیمادەدین کوژراو نورەدین کاروباری گرتە دەست ئەویش بەیارمەتی ئەیوبیەکان توانی دیمەشق بێنێتە ناو دەوڵەتەکەیەوەو لەدیمەشقدا سەلاحەدین زانستە ئیسلامیەکان فێربوو لەگەڵ فێربوونی هونەرەکانی سوار چاکی و راوو تیر هاوێژی و پێداویستیەکانی تری پاڵەوانێتی[3]، کاتێ نورەدین محمود زەنکی هەستا بەئازادکردنی بەعلەبەك لەساڵی ٥٣٤ك دا نەجمەدین ئەیوبی کرد بەوالی تیایدا بەڵام موجیرەدینی فەرمانڕەوای دیمەشق هەستا بەگەمارۆدانی نەجمەدین لەبەعلەبەکداو نەجمەدینیش نامەی بۆ نورەدین مەحمودو سەیفەدین غازی ناردو داوای لێکردن کەبێن بەهانایەوە بەڵام ئەوان سەرگەرمی کاری تربوون بۆیە دوای گەمارۆیەکی دورودرێژ هەردوو لا سوڵحیان کردو نەجمەدین ئەیوب چووە دیمەشقەوەو بوو بەیەکێك لەئەمیرە گەورەکانی[4]، بەم شێوەیە سەلاحەدین تەمەنی سەرەتای منداڵی لەبەعلەبەکدا بردە سەر لەساڵی ٥٣٤/ ١١٤٠زداو ناوە ناوە دەستدرێژی خاچپەرستەکانی دەبینی بۆ سەر وڵاتانی ئیسلام، کاتێ خاچپەرستەکانیش هێرشیان کردە سەر دەشتی بیقاعی تەنیشت بەعلەبەك لەساڵی ٥٤٦ك نەجمەدین و ئەسەدەدین شێرکۆ بەپەرچیان دانەوەو پاش شکست پێهێنانیان ژمارەیەك دیلیان لێگرتن[5]، لەهەمان ساڵیشدا

---

[1] صلاح الدين علوان ، ل: ٢١ موسوعة الشاملة (ج ١٤٢/٢٤).

[2] صلاح الدين علوان ، ل: ٢١.

[3] موسوعة تأريخ الأسلامي، الشلبي(ج١٨٧/٥).

[4] النجوم الزاهرة(٥/٦) مفرج الكروب(٨/١).

[5] كتاب الروضتين(٤٨/١).

سەلاحەدین پەیوەندی کرد بەسوپای ئەسەدەدین مامیەوەو ئەویش هاوڕێی نورەدین بوو کەسەرکردایەتی زەنکیەکانی گرتە ئەستۆ دوای کوژرانی باوکی، واش دیار بوو کە نورەدین پەی بەتوانا سەربازیو کارگێڕییەکانی سەلاحەدین برد بوو، ئەوەتا ئەبو شامە باسی ئەوە دەکات کەسەلاحەدین چووەتە لای نورەدینو ئەویش ماچی کردووەو بەخششی بۆ بڕیوەتەوە[1]. هەروەها پشتی پێ دەبەستو لەخۆی نزیکی دەکردەوەو تایبەتمەندی پێدەدا، بەردەوامیش سەلاحەدینی پێش دەخست بەجۆرێك دەیوت دەیەوێ پلەی بالاتری پێبدات[2]، هەروەك نورەدین رایدەسپارد هەتاوەکو بچێتە لای مامیو راوێژی پێبکات لەهەندێ مەسەلەدا کەپەیوەندی بەدەوڵەتو باجو گرنتیەکانەوە هەبوو، چونکە نورەدین گرنگی دەدا بەڕاوێژی گەورە سەرکردەکانی[3]، ئەم ئەرکەی سەلاحەدینیش لەئێستادا بە(نهێنی پارێز) یان ئەفسەری تایبەتیَ نورەدین ناودەبرێت[4]. سەبارەت بەچۆنێتی وەرگرتنی پۆستەکان لەلایەن سەلاحەدینەوە ئیبن الفرات بۆمان روونەدەکاتەوەو دەڵێ: سەلاحەدین لەژێر چاودێری باوکیدا گەورە بوو، کاتێك الملك العادل نورەدین دەسەلاتی گرتە دەست لەدیمەشقدا نەجمەدین ئەیوب یوسفی کوڕی خستە خزمەتیو ئامارەکانی خۆشبەختی بەسەلاحەدینەوە بەدی دەکراو لەنورەدینیشەوە سەلاحەدین رێگەی خێرو چاکە فێر بوو لەچاکەکاریو بیرکردنەوە لەجیهاد هەتاوەکو گەشتە ئاستێك کە لەگەڵ مامیدا (ئەسەدەدین شێرکۆ) کەوتە رێ بۆ میسر لەوێش ئەسەدەدین خۆی کاربەدەستی یەکەم بوو سەلاحەدینی برازاشی راستەوخۆ بەگرنگیو ژیریو سیاسەتێکی جوان کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد[5]. لەسەردەمی والی بوونی باوکیدا لەبەعلەبەکدا سەلاحەدین زانستە ئیسلامیەکانی خوێندو خۆی لەسەر هونەرەکانی جەنگو تۆپو هونەرەکانی تری چینە فەرمانڕەواکان راهێنا وێڕای لێهاتوویی لەیاری جوکاندا کە یاریەکی وەرزشی رۆژهەلاتیەو یاریزانەکان بەسەرپشتی ئەسپەوە دەیکەنو ئەمەشی لەباوکیەوە وەرگرت ئەمانە وێڕای گرنگی دانی بەزانستە شەرعییەکان[6]. لەمەوە بەپشت بەستن بەوەی کە باسکراوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو قۆناغەی سەلاحەدین تیایدا ژیا لەشامدا پێش ئەوەی پۆستێکی سەربازی گرنگ لەئەستۆ بگرێت چاودێری پێشهاتە سیاسیو سەربازیەکانی

---

[1] كتاب الروضتين(٤٨/١) الفكر السوقي الأيوبي، ل: ٨٢.

[2] النوادر السلطانية، ل: ٦ الفكر السوقي الأيوبي، ل: ٨٢.

[3] الكواكب الدرية في السيرة النورية، ل: ٤٣.

[4] الفكر السوقي الأيوبي، ل: ٨٣.

[5] الفكر السوقي الأيوبي، ل: ٨٣.

[6] الفكر السوقي الأيوبي، ل: ٨٣.

سەر گۆڕەپانی ئیسلامی دەکرد کەگرنگترینیان ململانێی دژ بەخاچپەرستەکانو پشت بەستنی نورەدین بەباوکیو شێرکۆی مامی بوو، بۆیە پێویست بوو کە ئەم ڕووداوانە کاری تێبکەن هەرچەندە بەشداری تێدا نەکردبوو، هەروەها پێویست بوو هەستی ئامادەسازی بۆ داهاتوو لای خۆی گەشە پێ بدات هەتاوەکو ئامادەبێت بۆ پۆستە باڵاکانی دەوڵەت[1]. دەشتوانین بڵێین کە سەلاحەدین نەشو نمای کرد لەباوەشی خێزانەکەیداو لەنەجمەدین ئەیوبی باوکیەوە لێهاتوویی سیاسیو لەشێرکۆی مامیەوە ئازایەتی وەرگرت، بەم پێیە لێزانینی سیاسیو گیانی سەربازی بوونە تایبەتمەندیو لەسەریان پەروەردە بوو، هەروەها فێری زانستەکانی سەردەمی خۆی بوو قورئانی لەبەرکردو شەریعەتی خوێندەوەو لەفەرموودە شارەزا بوو لەسەردەستی گەورە زانایانی ناوچەی شامو جەزیرەدا فێری زانستەکان بوو وەك شێخ قطب الدين نيسابوری[2]، پاشان سەلاحەدین کاریگەر بوو بەسوڵتان نورەدین کەنموونەیەکی جوانی دڵسۆزیو هەستکردن بەبەرپرسیارێتی ئاینی بوو لێیەوە سەلاحەدین فێری دڵسۆزیو فیداکاریو چۆنێتی رازو نیازکردن بوو لەگەڵ پەروەردگاردا لەنوێژە تایبەتیەکانیدا لەمیحرابەکاندا بۆ وەرگرتنی وزەو هێز بۆ جیهادو تێکۆشان، هەروەها لەوێشەوە سەرکردایەتی پرۆژەی ئیسلامی وەرگرتو بووە میراتگریو فێر بووکەچۆن ڕووبەڕووی گەشەو بڵاوبوونەوەی شیعەو داگیرکاری خاچپەرستی ببێتەوە ئەمەشم لەکتێبەکەمدا سەبارەت بەدەوڵەتی زەنکیو ژیاننامەی نوەردین مەحمودی شەهید ڕوونکردووەتەوە.

سەلاحەدین بەم شێوەیە بەرێگەی سەربەرزیدا سەرکەوتو لەسەر سوارچاکی پەروەردەبوو و خۆی راهێنا لەسەر جەنگو جیهادو مومارەسەی سیاسەتو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کردو وەك شاعیر دەڵێت:

وينشأ ناشيء الفتيان فينا          على ماكان قد عوّده أبوه

لەو ماوەیەشدا کەسەلاحەدین لەدیمەشقدا بەسەری برد لەپاش دەست بەسەراگرتنی لەلایەن نورەدینی کوڕی عمادەدەین زەنکیەوە کەسایەتی کەم وێنەی سەلاحەدین دەرکەوتو بووە مایەی رێزو خۆشەویستیو پێزانینی هەمووان بەڵکو پێگەو پلەو پایەی هاوتابوو لەگەڵ پلەوپایەی فرەمانڕەوای دیمەشقدا، لەناوکۆمەڵگەشدا وەك لاوێکی هێمنو بەڕەوشتو ئاین پەروەرو دڵگەرم بۆ ئیسلام دەردەکەووت ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەوشت بەرزییەی کە لە نورەدینەوە وەریگرتبوو کەپلەو پایەیەکی تایبەتی هەبوو لای، یەکێك لەو پۆستانەش کە لەدیمەشق لەسەردەمی نورەدیندا

---

[1] الفكر السوفي الأيوبي، ل: ٨٣.

[2] القدس تأريخ وحضارة عبلة المهدي، ل: ١٨٢.

پێسپێردرابوو سەرۆکی پۆلیس بوو کە بەجوانترین شێوە پێی هەستاو تونی دیمەشق لەدزەکان پاك بکاتەوەو خراپەکاران دووربخاتەوەو هێمنیو ئاسایش بۆ ولاتی شام بگێڕێتەوە، خەڵکی دڵنیابوون لەگیانومالّیانو لەسایەی ژیانێکی ئارامووو خۆشیدا ژیانیان بەسەربرد، حەسانی کوڕی نمەیری ناسراو (بەعرقلە) دیمەشقی خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی بەوەرگرتنی پۆستی سەرۆکی پۆلیس لەلایەن سەلاحەدینەوەو دەڵێ:

| | |
|---|---|
| رويدكم يالصوص الشام | فاني لكم ناصح في المقال |
| أتاكم سمي النبي الكريم | يوسف رب الحجا والجمال |
| فذالك يقطع أيدي النساء | وهذا يقطع أيدي الرجال[1] |

سەبارەت بەو ماوەیەی کەسەلاحەدین لەمیسردا بەسەری برد ئەوە بەگەورەترین ئەو رۆژانە دادەنرێتکەپاڵەوانێتیو لێهاتوویی سەربازی کەم وێنەی سەلاحەدینی تیادەردەکەوێت، ئەوەبوو لەگەل شێرکۆی مامیدا بەشدار بوو لەهەرسێ هەڵمەتەکەیدا بۆ سەر میسرو یەکێك بوو لە پیاوە مەزنەکانیو، پاڵەوانێتیو لێهاتوویەکی کەم وێنەی نواند لەهونەرەکانی جەنگو کوشتاریدا، پاشان بەزیرەکیو پلانی وردی توانی لەگەڵ ئەسەدەدینی مامیدا میسر بلکێنێ بەدەوڵەتی نورەدینەوە دوای رزگارکردنی گەلی مەزنی میسر لەچنگی دەوڵەتی فاطمی شیعە، لەمەی لەپێشەوە باسکرا ئەگەینە ئەوەی کە سەلاحەدین لەسەرەتای ساڵەکانی تەمەنی منداڵیو لەدەیەی دووەمو سێیەمی لاوێتیدا لەسەر رەوشتی بەرز پەروەردە بوو و لەهاوڕێیەتی ئەمیرو سەرکردەکانەوە فێری نەریتە رەسەنەکانو لێهاتوویی سەربازیو ئازایەتیو بوێری بوو ئەمەش وای لێکرد کەشیاوی[2] ئەوە بێت کە ببێتە کەسێکی نموونەییو مەزن کەتوانی دونیا بهەژێنێتو بەشدار بوو لەدروستکردنی سەردەمێکی گرنگ لەمێژووی شکۆداری ئیسلامسدا.

## چوارەم: کەی دەوڵەتی ئەیوبی دامەزرا؟

مێژوونووسان جیاوازیان هەیە سەبارەت بە سەرتای دەستپێکردنی دەوڵەتی ئەیوبیو هەندێك پێیان وایە لەوەرگرتنی پۆستی وەزارەت لەلایەن سەلاحەدینەوە بۆ خەلیفەی فاطمی العاضد الدین الله ساڵی ٥٦٤ك /١١٦٩زدا دەست پێدەکات[3]، هەندێکی تریش دەیگێڕێتەوە بۆ ساتەوەختی وتارخوێندنەوە بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە لەمیسردا، کەپاش ئەوە عاضد کۆچی دوای کردوو

---

[1] صلاح الدين، عبداله علوان، ل: ٢٢.

[2] صلاح الدين، علوان، ل: ٢٣.

[3] سلاطين في المشرق العربي د. عصام شبارو الأيوبين، ل: ١٣٩.

خەلافـەتی فـاطمیش رووخـا لەسـاڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١، راسـتـە دەسـەڵاتی سـەلاحەدین لـەوەرگرتنی پۆستی وەزارەتەوە دەستی پێکرد پاشان بەهەنگاوی لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی بـەهێزتری کـرد، بەڵام لەڕووی شەرعیەوە ئەو هێشتا سەر بەدەسەڵاتی نورەدین مەحمود بوو کەزۆری نـەبرد کۆچی دوایی کـرد لەسـاڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٤ز، لەبـەر ئەمـە سـاڵی کۆچیی دوایکردنـی نورەدین بـەرای ئێمـە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبیە کەخەلیفەی عەباسی المستضیء بالله دانی پیادا نا لە ساڵی ٥٧٠ك/ ١١٧٥زدا[1].

---

[1] سلاطين في المشرق العربي د. عصام شبارو الأيوبين، ل: ١٤٠.

## باسی دووەم: ڕەوشت بەرزی سەلاحەدین

کەسایەتی سەلاحەدین هەڵگری ڕێژەیەکی زۆر لەڕەوشتی جوان بوو کەیارمەتی دەری بوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە مەزنەکانی، لەگرنگترین ئەو ڕەوشتانەش ئازایەتیو بەخشندەییو ئەمەکداریو لێبوردەییو دادگەریو پیاوەتیو جوامێریو پەناگرتنی بەهێزی بەخواو خۆشەویستی جیهادو ئارامگریو خواویستیو سوور بوونی لەسەر زانستخوازیو خاکی بوون..هتد. ئەمەش دیارترین ئەو ڕەوشتانەوبەهێزترین ئەو سیفەتانەن:

**یەکەم: پارێزکاریو پەرستشی خوای گەورە:**

دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَـكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ (الأعراف: ٩٦)، واتە: خوا ئەگەر خەڵکی شارەکان بەراستی باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، ئەووا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕوبەرەکەتی ئاسمانو زەوییان لەسەر دەکردنەوە بەڵام ئەوان کەپەیامو پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆزانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کەدەیانکرد و گرتمانو لەناومان بردن (تەفسیری ئاسان،ل: ١٦٣).

دیارە ترسی خواو بەدیهێنانی بەندایەتی تەواو بۆی مرۆڤ دەپارێزێت لەپیلانو تەڵەکەی دوژمنان خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ (آل عمران: ١٢٠)، واتە: جائەگەر خۆگر بنو پارێزگار بن لەپیلانو تەڵەکەی ئەوان هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت چونکە بەراستی خوا دەوری پیلانیانی داوەو ئاگایە بە هەمووو کارو کردەوەو نەخشەکانیان.(تەفسیری ئاسان: ٦٥).

گومانیش لەوەدا نییە کە پارێزگاریو پەرستشی پەروەدگارو ترسان لێیو گومانی باش بردن پێیو پشت پێبەستنی یەکەم شتێکە کە دەبێ موسوڵمان پێی بناسرێتو باشترین شتێکیشە کە خۆی پێی برازێنێتەوە چونکە ئەوە موسوڵمان دەکات بەشێرێکی هەڵمەتبەر کە هەرگیز نابەزێو پاڵەوانێکی دەست پێشخەر کە لەمەرگ ناترسێتو ئازایەکی هێرش بەر کەدوژمن بەهیچ نازانێت، ئەم تایبەتمەندی باوەڕو پەرستشەش لەسەلاحەدیندا بەدی هاتبوو[1]. ئەمەش رای قازی بەهادینی ناسراو بە ئیبن شەداد کە هاوچەرخی سەلاحەدین بووەو هاوڕێیەتی کردووەو ئاگاداری ژیانی بووەو بۆمان باس دەکاتو دەنوسێت:

**بیروباوەڕی:** سەلاحەدین ڕەحمەتی خوای لێبێت بیروباوەڕی بەهێز بوو، زۆر یادی پەروەردگاری دەکرد، بیرو باوەڕی لەسەر بەڵگەو پشکنینو گەڕان لەگەڵ شێخو گەورە زانایاندا

---

[1] صلاح الدين الأيوبي بطل حطين محرّر القدس، علوان، ل: ١٣٩.

بنیات نرابوو، بەم شێوەیەش توانی بیروباوەڕی لەتەشبیهو چواندن بپارێزێتو دوور بێت لەلادانی (تعطیل) دارنینی سیفەتەکان لەپەروەردگارو ڕێڕەوی پەیڕەو دەکرد بەپێی یاسای تێڕوانینی دروست کەپەسەند بوو لای گەورە زانایان هەروەها شێخی پێشەوا قطب الدین نەیسابوری ڕەحمەتی خوای لێبێت بیرو باوەڕێکی بۆ کۆکردبوویەوە کەهەموو شتە پێویستەکانی ئەو بوارەی لەخۆ گرتبوو، ئەویش هێندە گرنگ بوو بەلایەوە کە بەمندالانی دەوتەوە هەتاوەکو لەمندالیەوە لەهزریاندا بچەسپێ، بۆ خۆشم بینیومە کە ئەوان بە لەبەر بۆیان دەوتەوە.

١- **نوێژ:** سەلاحەدین ڕەحمەتی خوای لێبێت زۆر پابەندی نوێژی بەکۆمەڵ بوو تەنانەت ڕۆژێك باسی ئەوەی کرد کە چەندین ساڵە نوێژی بەکۆمەڵی نەفەوتاندووە، هەرکاتێکیش نەخۆش بوایە ئەوە ئیمامێکی بانگ دەکردو زۆری لەخۆی دەرکردنوێژەکەی بەکۆمەڵ دەکرد، هەروەها لەسەر سوننەتو راتبەکانیش بەردەوام بوو، شەوانیش چەند ڕکاتێکی هەبوو ئەگەر خەبەری ببوایەتەوە ئەگەرنا پێش نوێژی بەیانی دەیکردن، هەرگیز نوێژیشی نەفەوتاندووە مەگەر هۆشی لەدەست دابێت وەك ئەو سێ ڕۆژەی هۆشی لەخۆی چووبوو لەکاتی نەخۆشیدا، بۆخۆشم بینیوومە لەنەخۆشی مەرگیدا نوێژی دەکرد کەتیایدا هەر بەپێوە مرد، هەرکاتێکیش کاتێ نوێژ بهاتایەو ئەو لەڕۆیشتندا بوایە دادەبەزیو نوێژی دەکرد[1].

٢- **زەکات:** سەبارەت بەزەکاتیش ئەوە سەلاحەدین (رضي الله عنه) هەرچی لەسەر پێویست بوو بەخشیویەتیو خێرو بەخشینی تریش هەموو ماڵو موڵکی گرتەوەو لەو هەموو ماڵو موڵکەی کە هەیبوو لەزێرو زیو تەنها چلو حەوت درهەمی ناصریو یەك پاچە ئالتونی صوری بەجێهێشت بەبێ ئەوەی هیچ موڵكو ماڵو خانوو بێستانو گوندو کێڵگەو هیچ جۆرە موڵکێکی تر بەجێ بهێڵێت، ڕەحمەتی خوای لێبێت.

٣- **ڕۆژوی ڕەمەزان:** چەند ڕۆژێك ڕۆژوو قەرزار بوو، بەهۆی چەند نەخۆشیەك کە لەڕەمەزانەکاندا تووشی بوو بوو قازی فاضلیش ئەو ڕۆژانەی بۆ بژاردبوو، لەو ساڵەشدا کە کۆچی دوایی کرد هەستا بەگرتنەوەی ئەو ڕۆژانەو زیاتر لەمانگێك بەڕۆژو بوو لەبری ئەو ڕۆژانەی کە لەدوو ڕەمەزاندا لەکیسی چوو بوو، بەهۆی نەخۆشیو سەرقاڵ بوون بەجیهادو تێکۆشانەوە، وادیار بوو ڕۆژوو زۆر لەگەڵ سروشتیدا نەدەگونجا بەڵام خوای گەورە یارمەتی داو قەرزەکانی گرتەوە[2]، ئەوەبوو ئەو بەڕۆژوو دەبوو منیش بۆم دەبژارد چونکە قازی لەوێ بوو دەیوت:

---

[1] سيرة السلطان الناصر صلاح الأيوبي ئيبن شداد، ل: ٥٨.

[2] هەمان سەرچاوە ل٩٥.

(نازانم چی رووده‌دات) وادیار بوو که‌خوای په‌روه‌دگار ده‌یوست پاك ببێته‌وه بۆیه به‌رده‌وام به‌رۆژوو بۆ هه‌تاوه‌کو کۆچی دوای کرد[1].

٤- **سه‌باره‌ت به‌حه‌ج:** ئه‌وه به‌نیازی ئه‌نجامدانی بوو به‌تایبه‌ت له‌و ساڵه‌دا که کۆچی دوایی کرد، خۆی بۆ ئاماده‌کردو فه‌رمانی دا به‌خۆسازدان‌و ته‌نها ئه‌وه مابوو به‌رێبکه‌ون، به‌ڵام به‌هۆی سه‌رقاڵی‌و که‌می کاته‌وه ئه‌و کاره‌ی بۆ نه‌کرا بۆیه دوای خست بۆ ساڵی داهاتوو به‌ڵام قه‌ده‌ری خوای گه‌وره بواری نه‌دا ئه‌مه‌ش لای هه‌موو خه‌ڵکی ئه‌و کاته ئاشکرا بوو[2].

٥- **گوێگرتنی له‌قورئانی پیرۆز:** سه‌لاحه‌دین ره‌حمه‌تی خوای لێبێت زۆر حه‌زی له‌گوێگرتن بوو له‌قورئانی پیرۆز، به‌راده‌یه‌ك که ئیمامی نوێژی هه‌ڵده‌بژاردو به‌مه‌رجی دانابوو که شاره‌زا بێت له‌زانسته‌کانی قورئان‌و به‌باشی له‌به‌ری بێت هه‌روه‌ها له‌کاتێکدا که به‌شه‌ودا له‌بورجه‌که‌یدا ده‌مایه‌وه که‌سێکی راده‌سپارد هه‌تاوه‌کو قورئانی بۆ بخوێنێته‌وه[3]، له‌جزم‌و دوان‌و سیانیش تێده‌په‌ری، هه‌روه‌ك له‌مه‌جیلیشی گشتی خۆشیدا ئه‌م کاره‌ی ده‌کرد، جارێکیان به‌لای مناڵێکدا تێپه‌ڕی که له‌به‌رده‌ستی باوکیدا قوئانی ده‌خوێند، ئه‌ویش هه‌ستا به‌نزیك کردنه‌وه‌ی له‌خۆی‌و به‌خشینی به‌شه بێستانێك به‌خۆی‌و باوکی، هه‌روه‌ها سه‌لاحه‌دین (رضي الله عنه)دڵنه‌رم‌و هه‌ست ناسك‌و فرمێسك رێژ بوو، کاتێ قورئانی ده‌بیست دڵی داده‌مه‌زراوو فرمێسك به‌چاویدا ده‌هات[4].

٦- **گوێگرتنی له‌فه‌رموده‌ی پیرۆز:** سه‌لاحه‌دین ره‌حمه‌تی خوای لێبێت زۆر ئاره‌زووی بیستنی فه‌رمووده‌ی هه‌بوو، هه‌رکاتێ ببیبیستایه شێخێك گێرانه‌وه‌ی باشه‌و فه‌رموده‌ی زۆری بیستووه، ئه‌وه ئه‌گه‌ر بهاتایه بۆ مه‌جلیسی سه‌لاحه‌دین ده‌یهێناو خۆی‌و خزمه‌تگوزارو منداڵه‌کانی‌و ده‌ست‌و پێوه‌نده‌کانی گوێبیستی ده‌بوون‌و فه‌رمانی ده‌کرد به‌خه‌ڵکی لای دابنیشن وه‌ك رێزلێنانێك بۆی، ئه‌گه‌ر ئه‌و شێخه‌ش له‌و که‌سانه بوایه نه‌ده‌چوونه کۆشکی سوڵتان‌و خۆی له‌سوڵتان به‌دوور ده‌گرت ئه‌وه سه‌لاحه‌دین خۆی سه‌ردانی ده‌کردو گوێبیستی ده‌بوو، ئه‌وه‌بوو سه‌ردانی حافظی ئه‌سفه‌هانی کرد له‌ئه‌سکه‌نده‌ریه‌داو چه‌ندین فه‌رمووده‌ی لێوه‌گێڕاوه‌ته‌وه، هه‌روه‌ها سه‌لاحه‌دین (ره‌حمه‌تی خوای لێبێت) حه‌زی ده‌کرد خۆی فه‌رموده بخوێنێته‌وه هه‌میشه له‌کاتی ته‌نهاییدا بانگی ده‌کردو چه‌ند کتێبێکی فه‌رمووده‌ی

---

[1] هه‌مان سه‌رچاوه ل٩٥.

[2] سيرة الناصر صلاح الدين لابن شداد ل٩٥.

[3] سيرة الناصر صلاح الدين لابن شداد ل٩٥.

[4] هه‌مان سه‌رچاوه ل٦٠.

دەهێناو بۆی دەخوێندمەوە ئەگەر فەرموودەیەکی بخوێندایەو ئامۆژگاری تیابوایە دڵی نەرم دەبوو فرمێسک بەچاویدا دەهاتە خوارەوە[1].

٧- **بەگەورەگرتنی دروشم و سروتە ئاینیەکان:** هەروەها سەلاحەدین رەحمەتی خوای لێبێت زۆر بەگەورەییەوە دەیڕوانیە دروشمە ئایینیەکان، باوەڕی بەزیندووبوونەوەی مرۆڤەکان و بڵاوکردنەوەیان و پاداشت دانەوەی چاکەکاران بەبەهەشت و خراپەکار بەدۆزەخ بەهێز بوو، باوەڕی بەتەواوی ئەوشتانە هەبوو کە لەشەریعەتدا هاتوون و رقی لەفەیلەسوف و (معطلة) ئەوانەی کە خوای گەورە لەسیفەتەکانی دادەڕنن، ودەهریەکان – سروشت پەرستەکان – و دوژمنانی شەریعەت بوو، فەرمایشی کرد بەمەلیك الظاهری کوڕی کەهەستێت بەکوشتنی گەنجێك بەناوی سهروەردی کەدەوترا دژ بەشەریعەتەو دروشمە ئایینیەکانی رەتدەکردەوە، پێشتر کوڕەکەی دەستگیری کردبوو کاتێ ئەوشتانەی لێبیستبوو سوڵتانیشی لێ ئاگاداركردبووە ئەویش فەرمانی هەڵواسینی دا بۆ چەند رۆژێك و پاشان کوشتی.

٨- **گومانی باشی بەپەروەردگار:** ئیبن شەداد دەڵێ: سەلاحەدین بەرەحمەت بێت گومانی باش بوو بەرامبەر بەخواو زۆر پشتی پێ دەبەست و هەمیشە دەگەڕایەوە بۆ لای، شوێنەواری ئەمەشی بەباشی پێوەدیار بوو خۆم ئەم رووداوەم لێبینی: کاتێ فەرەنجەکان لەنزیك –بیت نوبە– کەشوێنێکی نزیکی قودسە لایاندابوو سوڵتانیش لەقودسدابوو چاو ساغی دەنارد بۆ ئاگاداربوون لەدوژمن[2]، ئەوەبوو هەواڵی ئەوە هات کەدوژمنان سورن لەسەر گەمارۆدان و داگیرکردنی قودس و کوشتارکردن تیایدا، ئەمەش موسڵمانەکانی ترساندئەویش فەماندەکانی کۆکردەوەو ئەم مەترسیەی لەگەڵدا تاوتوێ کردن و راوێژی پێکردن دەربارەی مانەوە لەقودسدا ئەوانیش روپاییان دەکردو ئاشکراو نهێنی وەك یەکنەبوو زۆریەیان سوربوون لەسەر ئەوەی کەهیچ بەرژەوەندیەك لەمانەوەی خودی سەلاحەدین لەقودسدا نییە، چونکە ئەوە ئیسلام توشی مەترسی دەکات و وتیان: ئێمە تیایدا دەمێنینەوەو تۆ بەکۆمەڵێ سەربازەوە بڕۆرە دەرەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن وەك ئەوەی لەعەکادا کردیان، هەروەها سەلاحەدین و سەربازەکانی سەرقاڵی رێگریکردن لەئازوقەو تەنگ پێ هەڵچنینی دوژمنانبن، ئەوانیش هەڵدەستن بەپاراستنی شارەکەو بەرگری لێکردنی ئەوەبوو ئەنجوومەنی شورایان لەسەر ئەمە رێکەوت، بەڵام سەلاحەدین سوربوو لەسەر ئەوەی کەخۆی لەشاردا

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٦١.

[2] سيرة السلطان الناصر صلاح الدين ل٦١.

بمێنێتەوە، چونکە دەیزانی ئەگەر خۆی تیایدا نەمێنێتـەوە کـەس تیایدا نامێنێتـەوە، کاتـێ فەرماندەکان چوونەوە بۆ ماڵەکانیان هەواڵیان نارد بۆی کـە ئـەوان نامێننـەوە ئەگـەر الملك العـادلی بـرای یـان یـەکێك لـەکوڕەکانی نەمێنێتـەوە هـەتاوەکو خـۆی سەرپەرشتیان بکـات و فەرمان لەخۆیەوە وەرگرن ئەویش تێگەیشت کەئەمە ئاماژەیە بۆ ئامادەنەبوونیان بۆ مانـەوە لەقودسدا، بۆیە دڵـی تـەنگو بـیری پەرتـەوازەبوو ئـەو شـەوە لەخزمەتیـدا مامـەوەو وەرزی زستانبوو دووبە دوو ماینـەوە شـوێنەکانمان دابـەش دەکـردو پێداویستیمان بۆ دادەنـا بـەم کارەوە خەریك بـووین هـەتاوەکو بـەزەیم پیایدا هاتـەوەو لەتێکچوونی دەترسام– وادیـارە صـەلاحەدین فـشاری خـوێنی بـەرزبووە–منـیش تکـام لێکـرد هەتاوەکوپشوویدات، بـەڵکو ماوەیەك بخەوێت، ئەویش وتی: لەوانەیە تـۆ خـەوت بێـت؟ پاشـان هەسـتاو منـیش هـەر کـە هەستامو گەشتمە ماڵەوە یەکسەر بانگی بەیانی فەرموو، چوم بۆ لای بۆ نوێژکردن، چـونکە زۆربەی کات نوێژی بەیانیم لەگەڵداکرد، کاتـێ چـومە لای بینـیم ئاوبەچـاویدا دێتـە خـوارەوە فەرمووی: بەهیچ شێوەیەك خەوم بـۆ نـەهات، منـیش وتم: ئـەزانم ووتـی چـۆن؟ وتم، چـونکە منیش نەخەوتوومو کاتی خەونەمابوو پاشان نوێژمانکردو دەستمان کردەوە بەکاری خۆمـان و پێم وت: روداوێکم بەسەرهاتووە کەوائەزانم وتی چیە؟ وتم: پشت بەستن بەخواو گەڕانەوە بۆ لای و پەنابردن بۆی بۆ هەڵگرتنی ئەم گرفتـە لەسـەرمان ئـەویش وتـی: بـۆ ئـەوە دەبـێ چـی بکەین؟ وتم:ئەمڕۆ جومعەیە گەورەمان خۆی بشوات و نوێژی هەینی لەقودسدا بکات لەشوێنی بڵندبوونـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ)، پاشـان گـەورەمان شـتێك بکـات بـەخێر لەسـەر دەسـتی کەسێك کەمتمانەی پێی هەیەو دواتر دوورکات نوێـژ لـەنێوان بـانگو قامەتـدا بکـات و تیایـدا نزایەکی زۆر بکات، چونکە فەرمودەیەکی صحیحی دەربارە هاتووەپاشان ئەڵێت:حوایە گیان هۆکـارە مرۆڤکردەکـانی سـەر زەوی بەبنبەسـت گەشـتوون و تـەنها پـشت بەسـتن بـەتۆوە دەسگرتن بەبەرنامەکەت و پەناهێنان بۆ تۆ ماوەتۆمان بەسـەو پـشت و پـەنامان هـەر تۆیـت. ئەگـەر ئەمانـە بڵێیـت ئـەوە خـوای گـەورە لـەوە بەخـشندەترە کـە بـێ ئومێـدت بکـات، سەلاحەدینیش هەموو ئەوانەی کردو منیش وەك نـەریتی خـۆم لەتەنیشتییەوە نوێژم کـرد/ ئـەویش دوو رکاتەکـەی لـەنێوان بـانگو قامەتـدا کـردو پاشـان بینـیم کڕنوشـی بـردو فرمێسکەکانی بەڕیشی دا دەتکایە سەر بەرماڵەکەی، بەڵام نەمـدەزانی چـی دەوت، ئـەوەبوو پـێش تێپـەڕ بونی ئـەو رۆژە نامەیـەك لـەعزەدین جـوردیکی فـەرمانڕەوای الیـزك–وە هـات و ئاگاداری ئەکردینەوە کەفەرەنجەکان شڵەژاون و ئەمڕۆ هـەموو سـەربازەکانیان بـەرەو بیابـان بەڕێکەوتوون و تا نیوەڕۆ لەوێ بوون پاشان گەڕاونەتەوە بـۆ خێوەتـەکانیان، لەبەرەبـەیانی

شەممەشدا نامەیەکی تر هات کە ئەوەی دوپات کردەوە، پاشان لەکاتی نیوەڕۆدا سیخوڕێك هاتو هەواڵی دا کەناکۆکی کەوتۆتە نێوانیانو فرەنسیسیەکانیان[1]، پێیان وایە کەدەبێ گەمارۆی قودس بدەن، ئەنکتارەکانیش[2] پێیان وابوو کەنابێ ئاینی گاور تووشی مەترسی بکرێتو هەڵیان بدەنە ئەو چیایە بەو بێ ئاوییە، چونکە سوڵتان هەموو کانییەکانی دەوروبەری قودسی تێکدابوو، پاشان چوونەوە بۆ راوێژکردن، چونکە نەریتیان وابوو راوێژیان دەکردبۆ جەنگ بەسەرپشتی ئەسپەکانیانەوە ئەوەبوو دە کەسیان بۆ ئەوکارە دەستنیشان کردو کردیانە دادوەرو هەرچیان بوتایە لەقسەیان دەرنەئەچوون، ئەوە بوو سەرلەبەیانی دوو شەممە مژدەدەر هاتو ئاگاداری کردنەوە کەڕۆشتوونو ناوچەکەیان بەرەو رەملە بەجێهێشتووە، من ئەمەم بینی وەك بەڵگەیەك بۆ پشت بەستنو گەڕانەوەی بۆ پەروەردگار[3].

**دووەم: دادگەری:**

﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (النحل:٩٠)، واتە: (بەراستی خوا فەرمان دەدات بەداد پەروەریو چاکەکاریو یارمەتیدانو....هتد) (تەفسیری ئاسان، ل:٣٧٧). دیارە فەرمانکردنی پەروەردگاریش بەکارێك پێویست فەرزبوونی ئەو کارە دەگەیەنێت وەك دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ (النساء:١٣٥)، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە راگری دادوەری بنو شایەتی بۆ خوابدەن، پاشایەتیەکەشیان بۆ خۆتانو دایكو باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسێك لەوانە دەوڵەمەند بێت یان هەژار خوا بەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێت لەئێوە، نەکەن شوێن ئارەزوی نەفس بکەونو لەدادپەروەری لابدەن (زمان بگوڕن)و شایەتی ناحەقی بدەن، یان پشت هەڵبکەن، ئەوە چاك بزانن خوا ئاگادارە بەکاروکردەوەتان(تەفسیری ئاسان، ل:١٠٠).

سیفەتی دادگەریش لەدیارترین سیفەتەکانی سەلاحەدین بوو، باوەڕیشی وابوو کەدادگەری یەکێکە لەیاساکانی پەروەگار لەبونەوەرداو بەرهەمێکیشە لەبەرهەمەکانی باوەڕ ئەمەشی لەنورەدینی مامۆستای گەورەیەوە فێربوو بوو کەبنەمای دادگەری نوێکردەوەو سەلاحەدینی لەسەر

---

[1] واتە خاچپەرستە لاتینیەە فەرەنسیەکان کە بەزۆری هەڵمەتی یەکەمو دووەمی خاچپەرستەکان لەوان پێکهاتبوو.

[2] مەبەست بەئەنکتار پاشا ریشارد شێر دڵی پاشای انکلترایە.

[3] سيرة السلطان صلاح الدين، ابن شداد ل٦٤.

پەروەردەکرد، سەلاحەدین دادپەروەرو پشتیوانی چەوساوەکان بوو لەبەرامبەر دەستەلاتداراندا و هەموو رۆژێکی دووشەممەو پێنج شەممە لەمەجلیسێکی گشتیدا بۆ ئەو مەبەستە دادەنیشت و زانایان و دادوەران لەگەڵیدا ئامادەدەبوون و دەرگایان بۆ خاوەن کێشەکان والا دەکرد هەتاوەکو هەموو کەسێك بگاتە لای بەگەورەو بچووك و پیرەژن و پیرە پیاوەوە ئەمەشی لەشارداو لەکاتی گەشت و گەڕانیشدا دەکرد، هەمیشەش ئامادەبوو بۆ ئەو چیرۆکانەی کەدەخرانە پێش چاوی و پەردەی لەسەر نامەقیەکان هەڵدەدایەوە، هەموو رۆژێ چیرۆکەکانی کۆدەکردەوەو دەرگای دادگەری والادەکردو هەرگیز کەسێکی رەت نەکردۆتەوە کەبۆ یەکلاکردنەوەی کێشەیەك هاتبێت، پاشان لەگەڵ نوسەرەکەیدا ماوەیەك دادەنیشت بەشەودا بێت یان رۆژوو لەکێشەکانی بەو شێوەیەی کەپەروەردگار دەیخستە دڵیەوە، بەردەوام یادی پەروەردگاریشی فەرامۆش نەدەکردو بەخوێندنی قورئانەوە خەریك دەبوو، زۆر دڵنەرم و میهرەبان بوو بەرامبەر بەژێردەستەکانی و پشتیوانی ئاین بوو، هەرکەسێکیش هانای بۆ ببردایە گوێبیستی دەبوو و گرفتەکەی بۆ چارەسەردەکرد، ئەوەبوو پیاوێکی خەڵکی دیمەشق بەناوی زەهیرەوە سکالای تقی الدینی برازای سەلاحەدینی لاکرد، ئەویش ناردی بەشوێنیدا هەتاوەکو بیهێنن بۆ مەجلیسی دادوەری، کاتی هێنایان و دوو شایەتی ناسراوو قسە وەرگیراو شایەتیان لەسەردا، قاضی أبا القاسمی (قاضی حماه) راسپارد بۆ دادگاییکردنی، پاش ئامادەبوونی شایەتەکان و شایەتی دانیان پاش ئەوەی بریکار دروستی بریکاریەکەی سەلماندو نەیارەکەشی رەتیدەکردەوە[1]، قاضی ابن شداد وتی: کاتێ بریکاریەکە جێگیر بوو فەرمانمکرد بەأبا القاسم کەهەردوولا یەکسان بکات ئەویش کردی(بەرامبەرەکەشی خزمی سوڵتان بوو) پاشان دادگاییەکە بەڕێوەچووو سوێند خواردن رووبەڕوی تقی الدین کرایەوەو مەجلیسەکە بەو شێوەی کۆتایی هات بەهۆی هاتنی شەوەوە، تقی الدینیش یەکێك بوو لەخۆشەویسترین کەسەکانی بەلایەوە، بەڵام هەق و راستی لەپێش هەموو شتێکەوە بوو لەلای[2]. ئەوەش کەدادگەری دەسەلمێنێت ئەوەیە کەئەو بەرامبەر بەڕکابەرەکەی دەوەستا لەدادگادا بێ ئەوەی پێی نەنگی و شورەیی بێت، چونکە هەق بەلای ئەوەوە لەهەموو شتێك لەپێشتربوو، جارێکیان بازرگانێك بەناوی (عمر خلاطی) داوایەکی لەسەر سەلاحەدین تۆمارکرد کەهەستاوە بەبردنی کویلەیەکی بەناوی (سنقر)و هەموو موڵك و ماڵی ئەم کویلەیەی بەناڕەوا بردووە، کاتێك ئەم بازرگانە سکالانامەکەی پێشکەش بەقاضی ابن شداد کرد، سەلاحەدین

---

[1] سيرة السلطان الناصر لابن شداد ، ل: ٦٦.

[2] سيرة السلطان الناصر لابن شداد ، ل: ٦٦.

لێبوردەییەکی گەورەی نواندو بەسنگێکی فراوانەوە لەبەرامبەریەوە وەستاو هەریەکە بەڵگەو شایەتەکانی خۆیانیان هێنا هەتاوەکو لەکۆتاییدا بۆ درۆزنیو ناهەقی داواکەی کابرا بۆ دادوەر روونبویەوە لەگەڵ ئەمەشدا سەلاحەدین رازی نەبوو خاوەن داواکە بەدەستی بەتاڵەوە بچێتەوە، بەڵکو فەرمانیدا کەپۆشاکێکو برێك پارەی بدەنێ هەتاوەکو بەخشندەیی خۆی بسەلمێنێت لەکاتێکدا کەتوانای تۆڵەکردنەوەی هەبوو[1] هەروەها لەنیشانەکانی دادگەری هەستانی بەچاودێری کردنی بەرژەوەندیەکانی خەڵکو نەهێشتنی هەندێ باج وەك بارسوکیەك بۆ خەڵکو لابردنی ستەم لەسەر شانیان، ابن جبیریش لەباسی چاکەکانی سەلاحەدیندا باسی لابردنی زۆرێك لەو باجو خەرجیانە دەکات کەبەسەر خەڵکیدا سەپێنرابوون، لەکڕینو فرۆشتنەکانیاندا، تەنانەت باج بۆ خواردنەوەی ئاوی نیل دانرابوو، بەلام سەلاحەدین هەموو ئەوانەی نەهێشت[2] ، هەروەها باجێك هەبوو کەرێژەکەی حەوت دینارو نیو بوو بەسەر حاجیەکاندا سەپێنرابوو لەکاتی چونیاندا بۆ حیجاز بۆ ئاوەدان کردنەوەی مەککەو مەدینەو یارمەتیدانی خەڵکی تیایانداو فاتمیەکانیش زیادەڕەویان دەکرد لەکۆکردنەوەی ئەم باجاونەداو سزای توندی ئەو کەسەیان دەدا کەئامادە نەبوایە بیدات، بەلام سەلاحەدین ئەمەشی نەهێشتو لەبری ئەوە هاوکارییەکی مادی دانا کەیەکسان بوو بەوەی کە لەحاجیەکان وەردەگیراو ساڵانە دەدرا بەخەڵکی حیجاز بەم شێوەیەش حاجییەکانی رزگارکرد لەچنگی باج وەرگرەکان، بەتایبەت کەرێژەیەکی زۆریان هەژاربوونو نەیاندەتوانی ئەو پارەیە بدەن کەلێیان داوا دەکرد، بەم شێوەیە خوای گەورە لەسەر دەستی ئەم سوڵتانە دادگەرە موسڵمانانی لەبەلایەکی گەورە رزگارکرد[3] ، لەراستیدا دادگەری بەهێزترینو پیرۆزترین پارێزە بۆ موڵكو دەوڵەت چونکە گوێڕایەڵیو خۆشەویستی مسۆگەر دەکاتو چاکسازی بۆ کارەکانو نەشونماکردن بۆ سامانەکان دەگێڕێتەوەو هاوڵاتیان دەبوژێنێتەوە بۆیە خوای گەورە مرۆڤەکانی بانگهێشت کردووە بۆ بەدیهێنانی و هانیداون بۆ پاراستنی[4].

**سێیەم: ئازایەتی:**

ئازایەتی یەکێکە لەپێویستترین سیفەتەکانی پاشاو پێویستە ببێتە بەشێك لەسروشتی، هەتاوەکو بتوانێت بەسامو شکۆ بێتو دوژمن بێ هیوا بکات لەچاوبڕینە خاکو وڵاتیو بتوانێت بەهۆیەوە وڵات بپارێزێتو پارێزگاری لەهاوڵاتیانی بکات، سەلاحەدین بەرەحمەت بێت یەکێك بوو

---

[1] سيرة السلطان الناصر لابن شداد ، ل: ٦٦، صلاح الدين، علوان ، ل: ١٤٣.

[2] رحلة ابن جبير لە ، صلاح الدين وە، علوان ، ل: ١٤٣.

[3] هەمان سەرچاوە ، صلاح الدين وە، علوان ، ل: ١٤٤.

[4] النهج المسلوك فی سياسة الملوك، ل: ١٠٣.

لەمرۆڤ هەرە ئازاكانو، دەرونی بەهێزو دڵی دامەزراوو توندو تۆڵو چاو نەترس بوو، جارێکیان بینیم بەرامبەر بەکۆمەڵێکی زۆر لەفرەنجەکان وەستابوو کەبەردەوام هێزیان بۆ دەهات، بەڵام ئەم بەردەوامو ئارامگرو بەهێزبوو، هەروەك دوای نوێژی عەسر حەفتاو ئەوەندە کەشتیان گەشتە عەککا، بەڵام ئەم ورەی بەرنەدا، ئەوەبوو فەرمانی بەکۆمەڵێك دەکردو خۆشی لەگەڵ کۆمەڵێکی کەمدا دەمایەوە بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو سوپاوگەورەیان ، ئیبن شداد دەڵێت: پرسیارم کرد لەبالیانی کوڕی بارزان کەیەکێك بوو لەگەورە پاشاکانی کەنار دەریا سەلاحەدینیش رەحمەتی خوای لێبێت لای دانیشتبوو، لەرۆژی مۆرکردنی ئاشتەواییدا دەربارەی ژمارەیان، وەرگێڕەکەش بەدەمی ئەوەوە وتی دەڵێت: منو فەرمانڕەوای صیدا(کەئەویش یەکێك بوو لەپاشاو کەسە زیرەکەکانی) بەروەو سەربازەکانمان دەرۆیشتین لەصوردا، کاتێ نزیکیان بووینەوە، گرەومان لەسەر کردن من وتم شەس سەد هەزارن ئەو وتی پێنج سەد هەزارن یان بەپێچەوانەوە وتم: چەندیان لێکوژراوە؟ وتی بەکوشتن نزیکەی سەد هەزار، بەڵام بەخنکانو مردن نازانم، لەو کۆمەڵەیەش تەنها کەمینەیەکیان گەڕایەوە، هەروەها سەلاحەدین رۆژی جارێك یان دووجار بەدەوری دوژمندا دەسوڕایەوە ئەگەر لێیانەوە نزیك بووایە، کاتێ جەنگیش گەرم دەبوو سەلاحەدین بەناو ریزەکاندا دەگەڕاو کوڕێکی لەگەڵدا بوو و قەڵغانێکیشی بەدەستەوەبوو سەربازەکانی دەبڕی لەڕاستەوە بۆ چەپو هێرشبەرەکانی رێکدەخستو فەرمانی پێشڕەویو وەستانی لەو شوێنەدا پێدەکردن کەبەباشی دەزانی، هەروەها نزیك دەبووەوە لەدوژمنو دەچووە تەنیشتیانەوە[1]، ئیبن شداد دەڵێت: بەشێك فەرموودەی بۆ خوێنرایەوە لەنێوان هەردوو ریزەکەدا ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کەمن پێم وت: فەرموودە لەهەموو شوێنێکی پیرۆزدا بیستراوە، بەڵام بیسترابێت کە لەنێوان هەردوو ریزەکەدا گوێبیستی بن، جا ئەگەر گەورەمان حەز دەکات ئەوەی لێوە باس بکرێت ئەوە باشە، ئەویش مۆڵەتی داو بەشێکیان هێناو کەسێکیان هێنا کەشارەزابوو خوێندیەوە بۆمانو ئێمەش بەسواری وڵاخەکانمانەوە بوین لەنێوان هەردوو ریزەکەدا ماوەیەك دەرۆشتینو ماوەیەك دەوەستاین. هەرگیزیش نەمبینیوە سەلاحەدین دوژمن بەزۆر بزانێت یان بەگەورە بۆیان بڕوانێت، بەڵکو بەردەوام بیری دەکردەوەو لەپلاندانانەدا بوو هەموو بەشەکانی دەهێنایە یادی خۆیو هەر بەشەی بەپێی پێویست رێکدەخست بەبێ تووڕەییو هەڵچوون، ئەوە بوو لە (المصاف الأكبر) لەعەککا موسڵمانەکان تێکشکان، تەنانەت دڵو ناوەندی سوپاکەش

[1] النهج المسلوك فی سياسة الملوك، ل: ١٠٣.

هەڵهات و قەڵغان و ئاڵاکەشیان کەوت[1]، بەڵام سەلاحەدین (ﷺ) خۆڕاگری نواندو بەچەند کەسێکی کەمەوە رویکردە خەڵکەکەو کۆی کردنەوەو بەری لێگرتن و شەرمەزاری کردن هەتاوەکو بگەڕێنەوە بەردەوام ئەم کارەی کرد هەتاوەکو سوپای موسڵمانەکان سەرکەوتن لەو رۆژەداو نزیکەی حەوت هەزار پیادەو سواریان لێکوژرا[2]، بەڵام سەلاحەدین هەر خۆڕاگر بوو، هەرتاوەکو لاوازی موسوڵمانەکانی بۆ دەرکەوت ئینجا بڕیاری سوڵحی دا هەرچەندە لاوازی و کوشتاری زۆر بەدوژمنانەوە دیار بوو بەڵام ئەوان چاوەڕوانی کۆمەکی بوون و ئێمە چاوەڕوانی نەبووین. بۆیە بەرژەوەندی لەرێککەوتندا بوو، ئەمەش کاتێك دەرکەوت کە قەزاوقەدەر هەگبەی خۆی بۆ ئاشکرا کردین[3].

**چوارەم: بەخشندەیی:**

بەخشندەیی کرۆکی رەوشتی جوان و چڵەپۆپەی پیاوەتیە، هەموو جوانی و باشیەك لەوەسفیدا وتراوە[4]، لەئەنەسەوە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) باشترین کەس و بەخشندەترین و ئازاترین کەس بوو[5]، لەجابریشەوە (ﷺ) دەڵێت: هەرگیز شتێکیان لەپێغەمبەر داوا نەکردووەو بڵێ نەء[6] شافعیش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| وإن كثرت عيوبك في البرا | وسرّك أن يكون لها غطاء |
| تستر بالسخاء فكل عيب | يغطية كما قيل السخاء[7] |

بەخشندەیی سوڵتان سەلاحەدین لەوە دیارتر بوو کە بنوسرێت و بەناوبانگتر بوو لەباسکردن بەڵام ئێمە بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەی پێ دەدەین ئەوە بوو لەگەڵ ئەو هەموو موڵکەدا کە هەیبوو کاتێ مرد لەگەنجینەکانیدا تەنها چل و حەوت درهەمی ناصری زیو هەبوو لەگەڵ یەك پارچە زێڕی صوریدا[8] هەروەها سەلاحەدین بەناوبانگ بوو بە بەخشندەیی و ئەوەی لەکۆشکەکانیدا هەبوو لەگەوهەرو پارە دابەشی کرد بەسەر ئەمیرو هاوڕێکانیدا هیچی بۆ خۆی نەهێشتەوە هەروەها

---

[1] ئاڵای تایبەتی سوڵتان سەلاحەدین زەردبوو لەناوەڕاستیشدا هەڵۆیەکی سور هەبوو.

[2] ئاڵای تایبەتی سوڵتان سەلاحەدین زەردبوو لەناوەڕاستیشدا هەڵۆیەکی سور هەبوو.

[3] سيرة الناصر صلاح الدين، إبن شداد، ل: ٧٤.

[4] الأخلاق بين الطبع والتطبيع، ل: ١٥٧.

[5] البخاری ژمارە ٣٠٤٠.

[6] البخاری ژمارە ٦٠٣٤.

[7] الأفلاق بين الطبع و التطبيع ص١٥٩.

[8] سيرة الناصر صلاح الدين لابن شداد ص٧٠.

دیاریشی دەنارد بۆ هەرێمەکان ئەوەبوو کاتێ ئامەدی ئازاد کرد قرأ أرسلان داوای لێکرد ئەویش پێی بەخشی[1] هەروەها لەکاتی تەنگانەشدا وەك کاتی فراوانی هەر بەردەوام بوو لەبەخشیندا جارێکیان باسی لەبەخشندەیی خۆی دەکردو دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو دنیا ببەخشرێت بەکەسێکی هەولدەرو ئاواتە خواز ئەوە بە زۆری نازانم بۆی ئەگەر هەموو گەنجینەکانمی بۆ بەتاڵ کەم هێشتا شیاوی ئەو ئارەقی نێوچەوانەی نییە کە بۆی رشتووم[2].

هێندەش بەخشندە بوو ئەگەر بیزانیایە لەگەنجینەکانیدا پارە هەیە ئەوە پشووی نەدەدا ئەو پارەیەی دەبەخشی، ئەگەر پارەیەکیشی بدایە بەکەسێك پاشان بوێرایە ئەو ئەندازەیە بەشی ناکات دوو هێندەی پێ دەدا[3] هەر پیاوێکی بەتەمەنیشی ببینیایە بەزەیی پێدا دەهاتەوەو پارەی پێ دەداو چاکەی لەگەلدا دەکرد، هەر هەتیوێکیشیان بهێنایەتە لای ئەوە رەحمەتی بۆ دایكو باوکی دەناردو دلنەوایی دەکردو یارمەتی دەدا، ئەگەر سەرپەرشتیارێکی گەورەشی هەبووایە پارەکەی بەو دەدا ئەگینا هەر ئەوەندەی پێ دەدا کە پێویستی بوایەو ئەوی تریشی دەدا بەو کەسەی کە پەروەردەکردنی لەئەستۆ گرت بوو. عیمادی ئەصفەهانیش باسی بەخشندەیی دەکاو دەلێ: ئارەزووی بەخشینی ئەو دیاریو باجانەی هەبوو کە دەهێنران، زۆرجار پێش گەشتنی پارە دەیبەخشیو حەوالەی دەکرد بۆیان هەرکەسێکیش بهاتایە بۆ پارە دەستی بەرەوویەوە نەدەنا بەلکو بەنەرمی وەلامی دەدایەوەو داوای چاوەڕوانی لێ دەکردو دەیوت: ئێستا هیچمان لا نییە[4]، لەوەش زیاتری دەدا بەداواکار کە دەیویست، زەردەخەنەشی بۆ دەکرد وەك ئەوەی کە هیچی پێ نەدابێ[5] ژمارەی ئەو ئەسپانەش کە بەخشی بەئامادەبووان لەگەلیدا بۆ جیهاد لەماوەی سێ سالدا لەوکاتەوەی کە فرەنجەکان دابەزینە عەککا لەرەجەبی سالی ٥٨٥ك یەوە هەتاوەکو رۆژی مۆرکردنی رێککەوتن لەشەعبانی سالی ٥٨٨ك دا بەدوانزە هەزار ئەسپو ماین مەزەندە دەکرێن. إبن شدادیش سەبارەت بەمە دەلێ: هەر کەسێ بەخششەکانی ببینێ ئەم ژمارەیە بەکەم دەزانێ ئەمە سەربارى ئەوپارەیەی کە وەك نرخی ئەسپە پێکراوەکانی جەنگ دەیدا بەخاوەنەکانیانو هەرگیز سواری ئەسپێکیش نەدەبوو کە بەخشرابێ یان بەلێنی بەخشینی درابێو پێ بەخشراوە

---

[1] سیرة الناصر صلاح الدین لابن شداد ص٧٠.

[2] تأریخ الأیوبیین في مصر، محمد سهیل طقوش ص٢٢١.

[3] تأریخ الأیوبیین في مصر و بلاد الشام ص٢٢١.

[4] الفتح القیسي في الفتح القدسي ص٦٢٩.

[5] سیرة السلطان الناصر ل: ٤٩ ابن شداد.

چاوەڕوانی بێ[1] کاتێ کۆچی دوایی کرد هێندە پارەی نەبوو کەزەکاتی لێ بکەوێت چونکە لەخێرکردندا هەمووی بەکارهێنابوو[2] قازی إبن شداد ئەڵێ: ڕۆژێکیان گوێم لێ بوو لەباسی خۆیدا دەیوت: ئەکرێ لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەبن کە وەك چۆن لەخاك دەڕوانن ئاواش لەسامان بڕوانن[3].

**پێنجەم: گرنگیدانی بەجیهاد:**

سەلاحەدین (ﷺ) هەمیشە دەست بەکاربوو بۆ جیهاد گرنگی زۆری پێدەدا ئەگەر کەسێکیش سوێند بخواتو بڵێت پاش دەرچوونی بۆ جیهاد هیچ دینارو درهەمێکی لەشتێکی تر جگە لەجیهادو ڕێکخستنی سوپادا سەرف نەکردووە ئەوە ڕاست دەکاتو سوێندەکەی ناکەوێ، لەڕاستیدا خۆشەویستیو حەزی جیهاد بەتەواوی دڵی پڕ کردبوو بەجۆرێك کە بە بەردەوامی باسی لێوە دەکردو خەریکی کەرەستەکانی بوو و گرنگی بەپیاوەکانی دەداو حەزیشی لەهاوڕێیەتی ئەو کەسانە بوو کە باسیان دەکردو خەڵکیان بۆ هان دەدا، ئەوە بوو لەخۆشەویستی جیهادو تێکۆشان لەپێناو خواداماڵو منداڵو وڵاتو خاكو زێدی خۆی بەجێهێشت[4] و ڕازی بوو بەنیشتەجێبوون لەژێر خێوەتێکدا کە ڕەشەبا ڕاستو چەپی پێدەکردو شەوێکیان لەعەککادا خێوەتەکەی کەوت بەسەریدا بەهۆی ڕەشەبایەکی توندەوە ئەگەر داری ناوەڕاستی خێوەتەکە نەبوایە گیانی لەدەست دەدا، هەموو ئەمانەش تامەزرۆییو خۆڕاگری زیاتر دەکرد، ئەگەر کەسێکیش بیویستایە لێیەوە نزیك ببێتەوە ئەوە بەباسی جیهاد دەستی پێدەکرد، چەند کتێبێکیشی لەبارەی جیهادەوە بۆ نوسرا، ئیبن شەداد دەڵێ: من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە کتێبێکم بۆ کۆکردەوە، لەبارەی جیهادەوەو باسی ڕەوشتەکانی جیهادو هەموو ئەو ئایەتو فەرموودانە کردبوو کە لەبارەیەوە هاتوونو لێکدانەوەم بۆ نەزانراوەکانیان کردبوو، سەلاحەدینیش زۆر دەیخوێندەوەو گرنگی پێدەدا هەتاوەکو الملك الأفضلی کوڕی لێی وەرگرتو وتی ئەوە دەگێڕمەوە کە لێیەوە بیستوومە: لەمانگی ذي القعدەی ساڵی ٥٨٤ ك دا دەستی گرت بەسەر کوکبداو فەرمایشتی کرد بەسوپاو، سەربازەکانی میسریش گەڕانەوە بۆ میسرو لەپێشەوەیاندا الملك العادل هەبوو ئەویش لەگەڵیدا ڕۆشت هەتاوەکو خوا حافیزی لێ بکاتو نوێژی جەژن لەقودسدا بکاتو ئێمەش لەخزمەتیدا دەڕۆشتین، کاتێ نوێژی جەژنی لەقودسدا کرد بەخەیاڵیدا هات کە لەگەڵیدا بچێت بۆ عەسقەلان لەوێ خواحافیزیان لێ

---

[1] تأريخ الايوبيين في مصر و بلاد الشام ل٢٢٢.

[2] تأريخ الايوبيين في مصر و بلاد الشام ل٢٢٢.

[3] سيرة السلطان الناصر صلاح الدين ل٧١.

[4] سيرة السلطان الناصر صلاح الدين ل٧٦.

بکـاتو لەکـەنار دەریـاوە بگەڕێنـەوەو سـەردانی ناوچـە کەنارییـەکانی بکـات هـەتاوەکو عـەککاو کاروبارەکـانی ڕێـك بخـات، بـەڵام هـاوەڵانی رایـان وابـوو کـە ئـەو کـارە نـەکات، چـونکە ئەگـەر سـەربازەکان بـڕۆن ژمارەیـەکی کـەمیان لێ دەمێنێتـەوەو فەرەنجـەکانیش لەصـوردان ئەمـەش مەترسییەکی گەورەیـەی تیایە بـەڵام ئـەو گـوێی نـەگرتو لەگـەڵ سـەربازەکانو براکەیـدا ڕۆشـتو لەعەسقەلاندا خواحافیزی لێ کردن، ئێمەش لەخزمەتیدا بەکەناردەریادا بەرێکـەوتین بـەرەو عـەککا، ئەوکاتانەش زستانێکی سەخت بوو دەریاش شەپۆلی توندی دەدا وەك کێو بەرز دەبویـەوە، منـیش یەکەم جارم بوو کە دەریا ببینم، بۆیە زۆر ترسامو ئەگـەر کەسـێك پێـی بوتایـەم یـەك میـل بڕۆیتـە دەریاوە هەموو دنیات پێ دەدەم نەمدەکردو گاڵتەم بەڕای ئەو کەسەی دەهات کەدەچێتە دەریاوە بۆ دەستکەوتنی دینار یان درهەمێكو، رای ئەو کەسەم پێ پەسەند بوو کە شایەتی کەسـێك قبـوڵ ناکات کە دەریاوان بێت، هەموو ئەمانەم بەخەیاڵدا هات لەترسی گەورەسی ئـەو شـەپۆلانەی دەریـا کـەبینیم لەکاتێکیـشدا کـە لـەم خەیاڵانـەدا بـووم سـەلاحەدین رەحمـەتی خـوای لێ بێـت ئـاوڕی لێ دامەوەو وتی: شتێکت بۆ باس نەکەم؟ وتم: بەڵێ، وتی: بەخەیاڵمـدا هـاتووە کـە هـەر کـاتێ خـوای گەورە ناوچەکانی تری کەناری لەسەردەسـتمان ئـازاد کـردن، وڵات بـەش بکـەمو وەسـیەت بکـەمو بەجێی بهێڵمو بچمە دەریاوەو بگەمە دورگەکانیانو راوەدویان بنێم هـەتاوەکو یـان کەسـێك لەسـەر زەویدا نەهێڵم بەبێ باوەڕی، یان دەمرم، ئەم قسەیەش زۆر کاری لێکردم چونکە پێچەوانەی ئـەوە بوو کە بەخەیاڵی مندا هات، منیش پێم وت: لەسەر زەویدا لەگەورەمان ئازاتر نییەو لەوێش مکـورتر نییە بۆ سەرخستنی ئاینی خوا، وتی: چۆن؟ وتم: ئازایەتییەکە لەبەرئـەوەی گـەورەمان لـەم دەریـا ترسناکە ناترسـێو سەرخـستنی ئـاینیش لەبەرئـەوە کـە گـەورەمان رازی نـابێ بـێ بـاوەڕان تـەنها لەناوچەیەکدا نەمێنن بەڵکو دەیەوێ لەتەواوی سـەرزەویدا نـەمێنن، وتم: بـەڵێ ئەمـە تـەنها نیـەتو ئاواتێکی جوانە، چونکە گەورەمان قەڵاو پەناگەی ئیسلامەو نابێ خۆی بخاتە مەترسییەوە، ئەویش وتی: من رای تۆم ئەوێ باشترین مەرگ کامەیە؟ منیش وتم: مەرگە لەپێناو خوادا، وتی: دوا ئـاواتی منیش ئەوەیە کە لەپێناو خـوادا بمـرم[1]. هـەروەها لەنامەکـەی قاضـي الفاضـل بـۆ سـەلاحەدین کـە بەمەبەسـتی جیهـادو دەرکردنـی دوژمـن لـەخاکی موسـوڵمانانـدا رووی لەشـام نـابوو، بـەڵام چـەند مەسەلەیەك بوونە رێگر لەبەردەم سەلاحەدیندا بۆ دەستپێشخەری کردن بۆ جیهاد بۆیە سوڵتان زۆر خەمی پێ خوارد، قاضي الفاضلیش نامەیەکی نوسی بۆ سوککردنی باری خـەمی کەتیایـدا هـاتبوو: سەبارەت بەنیگەرانی گەورەمان بۆ ئەوکاتانەی کەویستی لـەجیهاددا بەسـەری بـەرێتو کۆسپەکان

---

[1] سیرى السلطان الناصر صلاح الدين ل ٧٩.

ڕێیان پێ نەدا، ئەوە گەورەمان نیەتی خۆی بۆ نوسراوە، ئایا خوا ئاگادار نییە لەمەبەستی بەندەکەی؟ هەروەها خوای گەورە بەندەکانی لەسەر کردەوەیەك سزا نادات کە لەتوانایاندا نەبێت بەڵکو لێپرسینەوە بەپێی نییەتو توانایە، بۆیە بەو پێیەی کە گەورەمان هۆکارەکانی جیهادی گرتۆتەبەرو ڕێگای بۆ پاککردۆتەوە ئەوە لە طاعەتدایە هەتاوەکو لەوێ بێتو لەو پێناوەدا ماندوبێت حەجیش بۆیە گەورەیە چونکە دورەو ماندوبوونی زۆری دەوێ تا پێی دەگەیت، ئەگەر خوای گەورەش بەچەند ڕۆژێکی کەم هەموو شوێنەکانی بۆ موسوڵمانان ئازاد بکردایەو کێشەی نێوان موسوڵمانانو دوژمنانی ئیسلامی یەکلا بکردایەتەوە، ئەوە جیهادو ماندووبوونی نەدەویستو مانەوە لەسەنگەرو چاوەڕوانیدا خێری نەدەماو کۆتایی پێ دەهات[1].

**شەشەم: لێبوردەیی:**

لێبوردەیی بەڵگەی ڕەوشت جوانییەو ناونیشانی هیممەت بەرزییەو یەکێکە لەپیرۆزترینی ڕەوشتەکانو شیاوترینیانە بۆ خەڵکی ژیرو هۆشمەندەکان، لەبەرئەو ئارامیو دڵنیاییو خۆشیو چێژو ئەستۆ پاکیو ئاسودەیی دەروونو سوپاسگوزاریو خۆبەرزگرتن لەتۆڵەسەندنەوەی کەتیایدایە، بۆیە کەسێك ناتوانێت جوامێر بێت هەتاوەکو ئەم ڕەوشتە لەخۆیدا بەرجەستە نەکات[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ (الاعراف ١٩٩)، واتە کاری ئاسان لەخەڵکی تر داوا بکەو چاوپۆشی لەهەڵەو کەمو کورتییەکانیان بکەو فەرمان بدە بەچاکەو کردەوەیەك کەپەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕەو پشت بکە لەنەفامو تێ نەگەشتووان)[3].

صفوح عن الاجرام كأنه      من العفو لم يعرف الناس مجرماً

وليس يبالي أن يكون به الأذى      اذا ما الأذى لم يغشى بالكره مسلما[4]

لەراستیدا سوڵتان سەلاحەدین زۆر میهرەبانو لێبودە بوو و زۆرجار لەتاوانباران خۆش دەبوو ڕەوشت بەرزو ئارامگر بوو لەسەر ناخۆشییەکان، زۆر چاوپۆشی لەهەڵەی هاوڕێکانی دەکردو قسەی ناخۆشی بەرامبەر خۆی دەبیست لەهاوەڵەکانیەوە بەڵام نەپێی دەوتنو نەروشی لەگەڵیاندا دەگۆڕا، ڕۆژێکیان دانیشتبوو یەکێك لەئامادەبووان پێڵاوەکەی فڕێداو کەوتە بەردەم سەلاحەدین بەڵام ئەو ڕووی وەرچەرخاند وەك ئەوەی خۆی لێ بێ ئاگا بکات[5]، هەروەها قاضي شهاب الدين

---

[1] بيت المقدس و المسجد الاقصى، محمد سراب ل١١٣.

[2] الاخلاق بين الطبع و التطبيع ل١٣٨.

[3] تەفسیری ئاسان ل١٣٨.

[4] تەفسیری ئاسان ل١٤٠.

[5] الموسوعة الشاملة (٤٤٩/٣٤).

ئەڵێ: ڕۆژێکیان هێسترەکەم لەدەستم هەڵات و منیش بەسەریەوە بووم و بەلای سوڵتاندا تێپەڕی و قاچی ئازار پێگەیاند بەڵام ئەو هەر دەم بەخەندە بوو، هەروەها دوکیسی ئاڵتونی میسری لەگەنجینەکەیدا دزرا بوون و لەشوێنیاندا دوکیس پارە دانرابوو ئەویش کاردانەوەی بەرامبەر بەوکەسانەی کە ئەمەیان کردبوو تەنها دوورخستنەوەیان بوو[1] قاضی ابن شداد ئەڵێ: لەخزمەتیدابووم لەمرج عیوندا پێش هاتنە دەرەوەی فرنجەکان بۆ عەککا، نەریتی سەلاحەدینیش وابوو کە لەکاتی سواریدا سوار دەبوو پاشان دادەبەزی و نانی لەگەڵ خەڵکیدا دەخوارد، پاشان دەچووە خێوەتە تایبەتەکەی خۆی و ماوەیەك دەنوست پاشان هەڵدەستا و نوێژی دەکردو لەگەڵ مندا پێکەوە دادەنیشتین و کەمێك فەرمودەو فیقهمان دەخوێندو کتێبێکی کورتی (سليم الرازي) بۆ خوێندمەوە[2]، کە هەر چوار بەشەکەی فیقهی لە خۆگرتبوو، ڕۆژێکیان وەك نەریتی هەمیشەیی دابەزی و خواردن خرایە بەر دەستی و پاشان ویستی هەڵسێت لەو کاتەدا پێیان وت: کاتی نوێژ نزیکە، ئەویش دوبارە دانیشتەوەو وتی: نوێژ دەکەین و دەخەوین پاشان دانیشت بەبێزاریەوە قسەی دەکردو ئەو شوێنەش چۆڵ کرابوو، جگە لەو خەڵکانەی کە پێویست بوون، ئەوە بوو پیاوێك هات کە زۆر بەڕێز بوو لای و پێشنیاری بۆ کرد کە چیرۆکی چەند موجاهیدێکی بۆ بگێڕێتەوە ئەویش وتی: من ئێستا بێزارم، کەمێك دوای بخە، بەڵام کابرا ئەوەی نەکردو چیرۆکەکەی لەدەم و چاوی پیرۆزی نزیك کردەوەو کردیەوە بۆئەوەی بیخوێنێتەوە، ئەویش لەسەر ئەو ناوە ڕاوەستا کە لەسەرەوەی بەرگەکەیدا نوسرا بوو و ناسیەوەو وتی: پیاوێکی شیاوە، کابراش وتی: قوربان بۆی ئیمزا دەکەی؟ وتی: ئێستا پێنوس ئامادە نییە لەو کاتەشدا بەناو دەرگای خێوەتەکەدا دانیشتبوو بەجۆرێك کەس نەیدەتوانی بچێتە ناویەوەو پێنوسەکەش لەسەرەوەی خێوەتەکەدا بوو، پاشان کابرا وتی: ئەوە پێنوسەکەیە لەسەرەوەی خێوەتەکەدایە ! ئەمەش مانای ئەوەیە فەرمان دەکات بەسوڵتان کەپێنوسەکە بێنێت، سەلاحەدینیش ئاوڕی دایەوەو پێنوسەکەی بینی و وتی: بەخوا ڕاست دەکات پاشان لەسەر دەستی چەپی و دەستی ڕاستی درێژ کردو هێنای و ئیمزای بۆ کرد، منیش وتم: خوای گەورە بەپێغەمبەری فەرمووە (ﷺ) (وانك لعلى خلق عظيم)وادە زانم گەورەشمان لەگەڵ سەروەردا لەم ڕەوشتەدا بەشدارە، ئەویش وتی: هیچمان نەکردووە، کارەکەیمان بۆ جێبەجێکردو پاداشتمان دەستکەوت. ئایا کێ ئەتوانێ شتی وا بەدەسەڵاتدارەکەی بڵێ؟ دیارە ئەمە لوتکەی چاکەکاری و میهرەبانییەو خوای گەورەش چاکەی چاکەکاران ون ناکات[3].

---

[1] الموسوعة الشامة فۆ التأريخ الحروب الصليبي (٢٤/٤٤٩).

[2] سيرة الناصر صلاح الدين ل٨٥.

[3] سيرة الناصر صلاح الدين ل٨٦.

هەروەها صلاح الدین (ﷺ) لەو کەسانەوە کە هانایان بۆ دەهێناو سکاڵایان لادەکرد توندترین ناخۆشترین شتی دەبیستو بەروویەکی خۆشەوە وەری دەگرت وەك ئەم رووداوە کە دەگمەن شتی وا نوسراوە: کە ئەویش ئەوە بوو کە یەکێك لەپاشاکانی فرەنج لە یافاوە بەرێکەوتبوو بەڵام سوپا جێیان هێشتبوو بۆیە پاشەکشەی کردو گەڕایەوە بۆ النطرون کەشوێنێکە لەیافاوە دوو قۆناغ بۆ کەسی خێراو سێ قۆناغ بۆ کەسی ئاسایی دوورە، پاشان سوپای بەرێ خست بەرەو قیساریە بەرێکەوت بەڵکو یارمەتی‌و کۆمەکیان لێوە وەرگرێتو بەئامانجی خۆی بگات، ئەوە بوو فرەنجەکانی یافا بەمەیان زانی ئەوانیش بریتی بوون لەپاشا ریتشارد شێردڵو هاوەڵەکانی ئەویش هەستا بەپرچەك کردن‌و رێکخستنی زۆرینەی ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون بۆ قیساریە بۆ پاراستنی ئەو هێزەی کە بۆ کۆمەکی بەرێکەوتبوو ئەوە بوو رێتشارد شێردڵ بەچەند کەسێکی کەمەوە مایەوە چونکە دەیزانی سەلاحەدین دوورە لێیانەوە، کاتێ سەلاحەدین گەشتە قیساریەو بینی هاوکاری‌و کۆمەکیان بۆ هاتووەو زانی کە ناتوانێ بەئامانجی خۆی بگات لەسەرەتای شەودا هەتاوەکو کۆتایی بەڕێوەبوو و سەر لەبەیانی گەشتە یافاو ریتشارد شێر دڵیش بەسێ سەد پیادەو حەڤدە سوارەوە لەوێ لەدەرەوەی شاردا خێوەتێکی هەڵدابوو، سەربازەکانیش شوێنی کەوتن‌و ئەویش سواری ئەسپەکەی بوو دیارە ئەو نەفرەت لێکراوە زۆر ئازاو لێهاتوو شارەزا بوو لەجەنگداو لەبەردەم موسوڵمانەکاندا خۆڕاگری نواندو نەیهێشت بچنە شارەکەوە، پاشان سوپای موسوڵمانان ئامادە بوو بۆ جەنگو سوڵتانیش داوای لێکرد کە فرسەت بگرن‌و لەکاتی گونجاودا هێرش بکەن، بەڵام هەندێ لەئەمیرە کوردەکان بەزبری و توندی وەڵامیان دایەوە ئەویش جڵەوی ئەسپەکەی گرتو وەك ئەوەی تورە بووبێت وا دیار بوو ئەیزانی لەو رۆژەدا کارێکیان لەدەست نایەت، بۆیە فەرمانیدا خێوەتەکەی کۆبکەنەوەو جێی هێشتن‌و گەڕایەوە، بۆیە خەڵکەکەش دەستیان لەکوشتار هەڵگرت، ئەوە بوو سوڵتان هەر لەرۆشتندا بوو هەتاوەکو گەشتە یازور کەشوێنێکی دڵگیرە لەوێ خێوەتەکەیان بۆ هەڵداو دابەزی‌و سەربازەکانیش لایانداو خێوەتیان هەڵدا، زۆربەی ئەمیرەکانیش لەترساندا ئەلەرزین‌و وایان دەزانی کە زۆریان لێ توورە بووە، ئەڵێ: ئەوەندە دەترسام ئەم دەوێرا بچمە لای هەتاوەکو خۆی بانگی کردم، ئەڵێ: بینیم لەدیمەشقەوە میوەی زۆری بۆ هاتووە و وتی: ئەمیرەکان بانگ بکەن با شتێك بخۆن، ئەڵێ: ئینجا هاتمەوە سەر خۆم‌و دڵخۆش بووم‌و ئەمیرەکانم بانگ کرد، ئەوانیش بەترسەوە هاتن، کاتێك رووخۆشی‌و کرانەوەیان بینی بەروویاندا دڵنیابوون‌و خۆشی رووی تێکردن، پاشان بەنیەتی بەجێ هێشتنی ناوچەکەوە لای هەستان وەك ئەوەی هیچ

شتێك رووی نەدابێت[1] لێبوردەییشی (رەحمەتی خوای لێ بێت) تەنها بەرامبەر بەشوێنکەوتووان‌و ژێر دەستەو سەربازەکانی نەبوو بەڵکو لەوەش تێپەڕی کرد بۆ دوژمنەکانی ئەوانەی کە لەجەنگدا بوون لەگەڵیداو کوشتاریان دەکرد[2]، وەك دواتر باسی دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار.

### حەوتەم: دەستگرتنی بە هۆکارەکانی پیاوەتیەوە:

پیاوەتی کۆی رەوشتە جوانەکان‌و نەریتە پەسەندەکان‌و نیشانەی مەردایەتییە، ئەم رەوشتە هۆکارە بۆ رێزداربوونی خاوەنەکەی‌و گەورە بوونی لەچاوی بەرامبەرەکاندا، راستی پیاوەتیش بەهێزی دەروونی‌و دەسپێکی کردەوە جوانەکانە ، کەستایشکردنی بەدوادا دێت بەپێی عەقڵ‌و شەرع‌و نەریت[3]. ابن القیم دەفەرموێت: کرۆکی پیاوەتی بریتییە لەخۆ دوورگرتن لەقسەو کردەوەو رەوشتی نزم‌و پیشاندانیەتی بۆ دۆست‌و دوژمن، پیاوەتی سامانیش: لەباش سەرفکردن‌و دانانی لەشوێنە باشەکاندا بەپێی شەرع‌و عەقڵ‌و نەریت، پیاوەتی لەچاکەشدا بریتییە لەخێراکردن‌و ئاسانکاری‌و رێزلێنان‌و بەنهێنی کردن‌و باسنەکردنی دوای ئەنجامدانی، پیاوەتی وازهێنانی لەخراپەش بریتییە لە: وازهێنانی لەناکۆکی‌و گلەیی‌و داواکاری‌و چەندو چون کردن[4]. شاعیر دەڵێت:

إني لتطر بني الخلال كريمة　　　طرب العريب بأوبه و تلاق

وتهزني ذكرى المروءة و الندى　　　بين الشمائل هزّه المشتاق[5]

سەلاحەدینیش (رضي الله عنه) پیاوەتی زۆر بوو، روخۆش‌و بەئابڕوو بوو، پێشوازی گەرم بوو بۆ میوانەکانی نەیدەهێشت میوانی بڕوات هەتاوەکو نمەکی نەکات، هەر داوایەکیشی هەبوایە بۆی جێبەجێ دەکردو رێزی لەمیوان دەگرت با بێ باوەڕیش بوایە، قاضی ابن شداد ئەڵێ: جارێکیان بینیم فەرمانڕەوای صیدا هات بۆ لای بۆ ناصرە، ئەویش رێزی زۆری گرت‌و نانی لەگەڵ خواردو باسی ئیسلامی بۆ کردو چەند نموونەیەکی لەئاکارە جوانەکانی بۆ خستەڕوو و هانیدا بۆ موسوڵمان بوون. هەروەها رێزی دەنا لەو شێخ‌و زاناو پیاوچاك‌و ناودارانە کە دەهاتنە لای‌و خەڵاتی دەکردن، داواشی لێدەکردین هەر زانایەکی ناودار بەلای خێوەتگەکەیدا تێپەڕی بیهێننە لای‌و هەتاوەکو لەچاکی‌و بەخشندەیی‌و بەهرەمەند ببێت‌و بەشێوەیەکی جوان خزمەتی بکات، ئەوە بوو لەساڵی ٥٨٤ك دا پیاوێکی زانا سەردانی کردین کە زانست‌و تەصەوفی تیادا کۆبووبوویەوەو کەسێکی بەتواناو

---

[1] سيرة الناصر صلاح الدين ل٨٨.

[2] صلاح الدين الايوبي، علوان ١٤٩.

[3] التعريفات للجرجاني ل١١١.

[4] تهذيب و رارج السالكين (٣/٦٩٧ — ٦٩٩).

[5] ديوان المروءة، أحمد بركات، الاخلاق بين الطبع و التطبع ل١٩٦.

سەرقاڵی زانستو زانیاری بوو، پاش حەج کردن هاتبوو بۆ قودس کاتێك جێ دەستی سوڵتانی تیایدا نینیبوو بڕیاریدا بوو کە بێت بۆ سەردانی، ئەوە بوو بەچەندە سەربازێکەوە گەشتە لامانو هەستم پێ نەکرد هەتاوەکو هاتە ناو خێوەتەکەمەوە پاشان بەخێرهاتنم کردو پرسیارم لێکرد دەربارەی هۆکاری سەردانەکەی، ئەویش ئاگاداری کردمەوە کە دەیەوێت سوڵتان سەلاحەدین ببینێت لەبەر ئەو کارە جوانو شوێنەوارە باشانەی کە لێوەی بیستووە، منیش ئەو شەوە سوڵتانم لەهاتنی ئەو پیاوە ئاگادارکردەوە، ئەویش داوای کردو فەرمودەیەکی بۆ باس کردو سوپاسی کرد لەسەر ئەو کارانەی کە بۆ ئیسلامی کردووەو هانیدا بۆ چاکەکردن، پاشان بەجێمان هێشتو شەو لای من مایەوەو لەخێوەتەکەمدا کاتێ نوێژی بەیانیمان کرد خوا حافیزی لێ کردم بەڵام من پێم جوان نەبوو کە وابڕوات بەبێ ئەوەی سوڵتان خواحافیزی لێ بکات بەڵام ئەو گوێی پێ نەداو وتی: کاری خۆمم کردو هیچ مەبەستێکیشم نەبوو جگە لەبینینو سەردانی ئینجا ڕۆشت پاش چەند شەوێك سوڵتان هەواڵی پرسیو منیش بۆم باس کرد، بەڵام گلەیی لێکردم کە چۆن ئاگادارم نەکردۆتەوە لەڕۆشتنیو وتی: چۆن پیاوێکی ئاوا دێتە لامانو دەڕوات بەبێ ئەوەی چاکەیەکی لەگەڵدا بکەین؟ بەو کارە زۆر نیگەران بوو، منیش ناچار بووم نامەیەك بنوسم بۆ محي الدينى قاضي دیمەشقو رام سپارد کەپرسیارم دەربارەی ئەو کابرایە بۆ بکاتو پارچە نوسراوێکی بگەیەنێتە دەست کە تیایدا باسی نارازی بوونی سوڵتانم کردبوو لەوەی کە بەبێ ئاگاداری ئەو ڕۆیشتبوو و، داوام لێکرد بگەڕێتەوە هاوڕێیەتییەکیش هەبوو لەنێوانماندا کە ئەوەی دەخواست، ئەوە بوو زۆری نەبرد گەڕایەوەو منیش سوڵتانم ئاگادارکردەوەو ئەویش وتی: لەگەڵ خۆتدا بیهێنە بۆ لام، منیش لەگەڵیدا ڕۆشتم سوڵتانیش بەگەرمی پێشوازی لێکردو زۆر خۆشحاڵ بوو بەسەردانەکەیو چەند ڕۆژێك لەلای خۆی هێشتیەوەو پۆشاکێکی باشی پێداو وڵاخێکی باشی بۆ دابین کردو جلوبەرگیشی پێدا بۆ خێزانو دراوسێو شوێنکەوتووانیو بڕێ پارەش بۆ خەرجی خۆی، زاناکەش بەنزایەکی زۆرو سوپاسگوزاریەوە بەجێی هێشت[1]. ابن شداد ئەڵێ: جارێکیان دیلێکی فرەنجیان هێنایە بەردەستیو زۆر دەترسا، وەرگێڕەکەش پێی وت: لەچی دەترسی، وتی: پێش ئەوەی ئەم دەموچاوە ببینم زۆر دەترسام بەڵام دوای بینینو ئامادەبوونم لەبەر دەستیدا دڵنیابووم کە من خێر دەبینم، سەلاحەدینیش بەزەیی پێدا هاتەوەو چاکەی لەگەڵدا کردو ئازادی کرد[2]، جارێکیان لەخزمەتیدا بووم بەسواری لەبەرامبەر فرەنجەکاندا ئەوەبوو هێزێکی پێشەوەی

---

[1] سيرة الناصر صلاح الدين ل٩١.

[2] سيرة الناصر صلاح الدين ل٩١.

سوپا گەشتە بەرەوەو ژنێکیان لەگەڵدا بوو زۆر دەکروزایەوەو دەگریاو ملوانکەیەکی لەملدا بوو پێشڕەوی سوپاکەش وتی: ئەمە لەناو فرەنجەکانەوە هاتووە داوای بینینی تۆی کرد، ئێمەش هێنامان بۆلات، سوڵتانیش فەرمانیکرد بەوەرگێڕەکەی کە پرسیاری لێ بکات ئەویش وتی: دزە موسوڵمانەکان دوێنێ شەو هاتونەتە خێوەتەکەم و کچەکەمیان بردووە، دوێنێ شەویش هەتاوەکو بەیانی من هاوارم کردووەو پێیان وتم: پاشاکەیان میهرەبانەو ئەتنێرین بۆ لای داوای کچەکەتی لێ بکەو بەم شێوەیە هاتم، منیش کچەکەم لەتۆ دەوێت؟ سەلاحەدینیش بەزەیی پێدا هاتەوەو فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارەوە، فەرمانیدا بەکەسێك کە بچێتە سەربازگەو کەهەواڵی ئەو کچە بچوکە بپرسێتو بڵێت: هەرکەس کڕیویەتی پارەکەی دەدەینەوەو بۆمان بێنێتەوە، زۆری پێ نەچوو سوارەکە گەڕایەوەو کچەکەی بەسەرشانەوە بوو، هەر کە ئافرەتەکەی بینی خۆی دا بەزەویداو دەمو چاوی دەهێنا بەزەویداو خەڵکیش بۆی گریانو پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمانو نەمان دەزانی چی دەوت، پاشان کچەکەی پێ درایەوەو بەڕێ کرا هەتاوەکو گەشتەوە ناو فرەنجەکان[1].

هەروەها کاتێك ئەلبرەنس ئەرناط فەرمانڕەوای کەرك لەگەڵ پاشای فەرەنجەکان لەکەناردا هاتنەلای لەپاش بەدیلگیرانیان لەجەنگی حطیندا لەساڵی ٥٨٣ك ئەم رووداوەش لەشوێنی خۆیدا بە درێژی باسی دەکەین (بەپشتیوانی خوا) هێنانیشیان لەسەر داوای سەلاحەدین بوو، ئەم ئەرناطەش بێ باوەڕێکی ستەمگارو بەهێز بوو، لەکاتی ئاگر بەستی نێوان ئەوو موسوڵمانەکاندا کاروانێك بەناوچەکەیدا تێپەڕ بوو بوو ئەویش هەستا بوو بەپەلاماردانیو بردنی کەلوپەلەکانیانو ئازاردانی کاروانچییەکانو زیندانی کردنیان لەزیندانی تەسكو تەنگەلاندا، ئەوانیش ئاگر بەستو رێکەوتنەکەیان بیرخستەوە بەڵام ئەو وتی: بڵێن بەموحەمەدەکەتان رزگارتان بکات، کاتێ بەسەلاحەدین بەمەی زانی، نەزری کرد کە هەر کاتێ خوا سەری خست بەسەریدا بیکوژێت. کاتێ سەرکەوت بەسەریداو بەدیلی هێنایانە بەر دەستی زۆر سور بوو لەسەر کوشتنی (وەك وەفایەك بۆ نەزرەکەی) ئەوە بوو لەگەڵ پاشادا هێنایانو پاشا داوای ئاوی کردو ئاویان بۆ هێناو خواردیەوە پاشان ئاوەکەی دا بە ئەرناط و سوڵتانیش بەوەرگێڕەکەی وت: بڵێ بەپاشا: تۆ ئاوت پێداوە، چونکە من ئاوو خواردنی پێ نادەم، چونکە پیاوەتی ئەوە دەخوازێ کە ئازاری کەسێك نەدەم کە نمەکی کردووم، پاشان بەدەستی خۆی دای لەگەردنیو نەزرەکەی بردەسەرو دەستی کرد بەسەر عەککاداو هەموو دیلەکانی ئازاد کرد کە نزیکەی چوار هەزار دیل بوونو هێندە پارەی پێدان کە

---

[1] سیرة الناصر صلاح الدین ل٩٣.

پێی بگەنەوە ناو خێزانەکانیان[1]. ئەم رووداوەش کە ابن شداد دەیگێڕێتەوە بەڵگەیە لەسەر لێبوردەیی فراوان‌و پیاوەتی کەم وێنەی، ئیبن شداد ئەڵێ: کاتێ پاشای ئینگلیزی ریتشارد شێردڵ نەخۆش کەوت (کەسەر سەختترین‌و دوژمنی سەلاحەدین بوو) سەلاحەدین میوەو بەفری بۆ ناردو ئەمەش بووە مایەی سەرسوڕمانی خاچپەرستەکان[2] لەراستیدا سەلاحەدین رەوشت بەرزو قسەخۆش بوو، شارەزای رەچەڵەک‌و مێژووی عەرەب‌و داب‌و نەریت‌و خورەوشتیان بوو، هەروەک شارەزای دونیاو سەرگوزەشتەو سەیرو سەمەرەکانی بوو بەجۆرێك کەگوێگری سودێکی لێ وەردەگرت کە لەخەڵکانی تری وەرنەدەگرت، هەروەها زۆر رەوشتبەرز بوو و پرسیاری لەهەر یەکێکیان دەکرد دەربارەی نەخۆشی‌و چاکبونەوەو خواردن‌و خواردنەوەو گۆڕانکارییەکانی ژیانی، هەروەك مەجلیسی پاك بوو و کەس بەخراپە لەمەجلیسیدا باس نەدەکراو رازیش نەدەبوو قسەی خراپ‌و ناڕەوای لەلادا بکرێت‌و زمان خاوێن بوو، ئیبن شداد ئەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە حەزی لەجنێو بێت، پێنوسی پاك بووەو هەرگیز بەپێنوسەکەی ئازاری هیچ موسوڵمانێکی نەداوە[3]، چاودێری‌و وەفاشی باش بوو، هەر هەتیوێکیان بهێنایە بۆ لای رەحمەتی بۆ دایك‌و باوکی دەناردو دڵی دەدایەوەو بژێوی باشی بۆ دابین دەکرد، ئەگەر کەسێکی گەورەو سەرپەرشتی هەبوایە، رادەستی ئەوی دەکرد، ئەگینا ئەندازەی پێویستی پێ دەداو پاشماوەکەشی دەدا بەو کەسەی کە سەرپەرشتی دەکرد، هەر پیروبەساڵاچوویەکیشی ببینیایە چاکەی لەگەڵدا دەکردو پارەی پێ دەدا، لەسەر ئەم خورەوشتەش بەردەوام بوو هەتاوەکو ئەو کاتەی کەخوای گەورە گەڕاندیەوە بۆ لای خۆی[4].

### هەشتەم: ئارامگری‌و دان بەخۆداگرتن:

ئارامگری گەورەی رەوشتەکان‌و هاوڕێی رێگاو رێبازی گەشتنە بەپێشەوایەتی‌و سەرکەوتن، رەوشتە جوانەکانیش پەیوەستن بەئارامگرییەوەو ئارامگری بناغەی رەوشتی بەرزو کاری خێرو چاکەخوازیە لەبنەرەتیشدا وشەی ئارامگری‌و سەبر لە خۆگرتنەوەوە هاتووە، ئارامگری واتە گرتنەوەی دەروون لەبێزاری‌و زمان لەسکاڵاو ئەندامەکان لەسنگ کوتان‌و یەخەدابڕین، ئارامگری راستەقینەش بریتییە لەرەوشتێکی جوانی دەروون کە لەگەڵیدا مرۆڤ واز لەئەنجامدانی کردەوە نادروست‌و ناباشەکان دێنێت‌و یەکێکە لەو هێزانەی دەروون کەچاکێتی‌و دامەزراوی دەروونی لەسەر

---

[1] سيرة الناصر صلاح الدين ل٩٣.

[2] صلاح الدين الايوبي، علوان ل١٥١.

[3] سير الناصر صلاح الدين ل٩٣.

[4] سير الناصر صلاح الدين ل٩٣، ٩٤.

وەستاوە[1]. وتراویشە: ئارامگری بریتییە لەوەی لەبەرامبەر بەلاو نەهامەتیدا بەئەدەبەوە مامەڵە بکەیت[2]، خوای گەورەش باسی ئارامگری لەنەوەدو ئەوەندە شوێنی قورئاندا کردوە ئەمەش پێویست بوونی دەسەلمێنێت، زۆرترین پلەوپایەو چاکەشی بۆ (صبر) بڕیار داوەو کردویەتی بە بەرهەمی، چەند شتێکیشی بڕیار داوە بۆ ئارامگران کە بۆ خەڵکی تری بڕیار نەداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُولَـئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾ (البقرة ١٥٧)، واتە: ئا ئەوانە چەندەها ستایشو رەحمەتو میهرەبانی هەر بەسەر ئەواندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریاهەوەو ئەوانە ئەو کەسانەن رێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە[3].

لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە ئەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کێ لەهەموو کەس زیاتر تاقی دەکرێتەوە؟ فەرموی پێغەمبەران پاشان باشترین کەس دوای ئەوانو هەروەها، هەموو بەندەیەك بەپێی بیروباوەڕی تاقی دەکرێتەوە جا ئەگەر باوەڕی بەهێز بێت ئەوە تاقی کردنەوەی سەختتر دەبێت، ئەگەر باوەڕیشی لاواز بێت تاقی کردنەوەی لاواز دەبێت، هێندەش مرۆڤ توشی بەلاو تاقیکردنەوە دەبێت هەتاوەکو هیچ گوناهێکی لەسەر نامێنێت[4]. شاعیر دەڵێت:

أصبر قليلاً و كن بالله معتصماً      ولا تعجلن، فإن العجز بالعمل

الصبر مثل اسمه في كل نائبة      لكن عواقبه أحلى من العسل[5]

سەلاحەدینیش رەحمەتی خوای لێ بێت ئارامگر بوو لەسەر تاڵی ژیان لەگەڵ ئەوەشدا کەتوانای خۆش ژیانی هەبوو، هەروەها نموونەیەکی جوانی ئارامگریو خۆراگری بوو لەگۆڕەپانەکانی جیهادو لەکاتی نەهامەتیو کۆستەکاندا، قاضی ابن شداد ئەڵێ: بینیم لەسەوزاییەکانی عەککادا، زۆر نەخۆش بوو بەهۆی ئەو دومەڵانەوە کە لەورگیەوە هەتاوەکو ئەژنۆی دەری کرد بوو بەجۆرێك کە نەیدەتوانی دابنیشێت بەڵکو شانی دائەداو لەسەر لائەکەوت لەخێوەتەکەیداو نەیدەهێشت خواردن لەبەردەستیدا دابنێن لەبەرئەوەی کەنەدەیتوانی دابنیشێتو فەرمانی دەکرد خواردنەکەی بدرێ بەخەڵکی تر، لەگەڵ ئەوەشدا لەخێوەتی جەنگدا بەرامبەر بەدوژمن دەمایەوەو سوپای دابەش کردبوو بەسەر چەپو راستو ناوەڕاستو دڵدا وەك ئامادە باشی بۆ جەنگ، لەگەڵ هەموو ئەمەشدا بەیانی زوو هەتاوەکو نوێژی نیوەڕۆ بەسواری ئەسپەوە بەسەر سوپاکەیدا دەگەڕاو لەعەسریشەوە

---

[1] الاخلاق بين الطبع و التطبع ل١٩٧.

[2] الاخلاق بين الطبع و التطبع ل١٩٧.

[3] تەفسیری ئاسان ٢٤.

[4] صحيح الجامع الألباني (٩٩٢/١) السلسلة الصحيحة رقم ١٤٣.

[5] الاخلاق بين الطبع و التطبع ل١٩٧.

بۆ مەغریب بەهەمان شێوەی ئارامگر بوو لەسەر ئەو ئازارە زۆرەی کە بەهۆی ئەو دومەڵانەوە دەیچەشت و منیش سەرسام بووم پێی، ئەویش دەیوت: کاتێ سواری ئەسپ دەبم ئازاریان نامێنێ هەتاوەکو دادەبەزم، ئەمەش چاودێرییەکی خواییە، ئەوە بوو کاتێ نەخۆش کەوت ئێمە لەخەڕووبە بووین و لەتل الحجل دواکەوت بەهۆی نەخۆشییەوەو فرەنجیەکانیش بەمەیان زانی، بۆیە پەلاماریاندان بەئومێدی وەشاندنی گورزێکی کاریگەر لێیان. بەهۆی نەخۆشییەکی سەلاحەدینەوە، ئەوە بوو لەقۆناغی یەکەمدا چوونە دەرەوە بۆ لای ئەو بیرانەی کە لای تەپۆلکەکەدان سەلاحەدینیش رەحمەتی خوای لێ بێت فەرمانیدا بەکۆکردنە وەی کۆچ و بارەکانیان و رۆشتن بەرەو ناصرە، لەوکاتەشدا عمادەدینی فەرمانڕەوای شەنگاریش نەخۆش بوو، بۆیە مۆڵەتی پێدا کە لەگەڵ کۆچ و بارەکەدا بێت و خۆشی لەوێ مایەوە، پاشان دوژمن لەرۆژی دووەمدا بەشوێنماندا هات، ئەویش ئەو ئازارەوە کەپێوەی بوو سواری ئەسپەکەی بوو سەربازەکانی رێکخست بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمن و لای راستی سپارد بەالملك العادل و لای چەپی سپارد بە تقی الدین عمر، الملك الظاهری کوڕیشی لەناوەندا لەگەڵ الملك الأفضلدا دانا، خۆشی چووە دوای هەموویانەوە، هەر کە لەتەپۆلکەکە دابەزی دیلێکی فرەنجیان هێنایە بەر دەستی، ئەویش فەرمانی کوشتنیداو لەبەردەمیدا دایان لەگەردنی، پاش ئەوەی پێشیاری موسوڵمان بوونیان بۆ کردو ئەویش رەتی کردەوە، هەرچەندە دوژمن بەدوای بەشی سەرەوەی رووبارەکەدا دەگەڕا ئەویش پشتی لێ دەگرتن هەتاوەکو لەخێوەتەکانیان دایانبڕێت ئەوە بوو ماوەیەك دەرۆشت و ماوەیەکیش دادەبەزی بۆ پشوودان دەستەسرێکی دابوو بەسەریدا لەبەر کاریگەری تیشکی خۆر لەسەری بەڵام نەیهێشت خێوەتی بۆ هەڵبدرێ بۆ ئەوەی دوژمن بەلاوازی نەزانێ بەو شێوە مایەوە هەتاوەکو دوژمن چووە بەشی سەرەوەی رووبارەکە ئەویش چووە نزیکیان و لەتەپۆلکەیەکدا نیشتەجێ بوو کەدەیڕوانی بەسەریاندا هەتاوەکو شەو هات، پاشان فەرمانیدا بەسەربازەکانی کەبگەڕێتەوە شوێنەکانیان و بەشمشێرەکانیانەوە ئامادەبن خۆشی لەگەڵ ئێمەدا کشایەوە بۆ لوتکەی چیاکەو لەوێ خێوەتێکمان بۆ هەڵدا ئەوشەوەش من و پزیشك چارەسەرمان دەکردو سەرقاڵی کردبووین، ئەویش ماوەیەك دەخەوت و ماوەیەك هەڵدەستا کاتێ سەیری دوژمنم کرد بینیم لەرۆژئاوای رووبارەکەوە بەرەو خێوەتەکانیان بەرێکەوتوون لەو رۆژەشدا موسوڵمانەکان تەنگیان پێ هەڵچنی بوو کوڕەکانی الملك الظاهر و الملك الأفضل و الملك الظافر و ئەوانی تریش کە ئامادە بوون ناردە بەرەی جەنگو جگە لەمن و ئاڵا هەڵگرو چەند منداڵێك کەسی لەدەوری خۆی نەهێشت کەسێك لەدوورەوە سەیری بکردایە وای دەزانی خەڵکێکی زۆری لەدەوروبەردایە لەبەر ئەو هەموو ئاڵایانەی کە هەڵیان گرتبوو، بەڵام تەنها یەك کەسی تیابوو کە بەتەنها بەرامبەر جەماوەرێکی زۆر دەوەستا، ئەوە بوو دوژمن

بەردەوام دەهاتەپێش‌و بە بەردەوامیش لێیـان دەکوژراو هەرکەسێکیان لێ بکوژرایـە دەیانناشـت‌و هەرکەسێکیان لێ بریندار بووایە هەڵیان دەگرت هەتاوەکو نەزانرێ چەندیان لێ کـوژراو یـان بریـندار بووە، بەم شێوەیە بەڕێوەبوون‌و ئێمەش ئەمانبینین هـەتاوەکو زۆریـان بـۆ هێنـان‌و دابەزینـە نزیـك پردەکە، هەر کـە فرەنجەکانیش دابەزینـە سـەر زەوی موسـوڵمانەکان بـێ ئومێـد دەبـوون لـەوەی بتوانن بەئاکامێك بگەن، چونکە لەحاڵەتی دابەزیندا بەباشی خۆیان دەپاراست بۆیە لەشوێنی خۆیدا مایەوەو سەربازەکانیش بەسوار ئەسپەکانیانەوە بوون لەنزیك دوژمن هەتاوەکو کۆتایی رۆژ، پاشان فەرمانی پێکردن کە بمێننەوە وەك شەوی پێشترو ئێمە چوینەوە بۆ ماڵـەوە وەك شـەوی پێشوو و هەتاوەکو بەرەبەیان هەر لەتەنگ پێ هەڵچنینی دوژمندا بووین هەتاوەکو دوژمن شـوێنەکەی بـەجێ هێشت‌و ئـەویش بێزار بـوو لەجـەنگ‌و کوشـتار، پاشـان لەخێوەتەکـەی نزیـك بونـەوەو لەوێشەوە خەڵکانێك هاتنە دەرەوە کە رزگاریان کرد هـەتاوەکو گەشـتنەوە خێوەتـەکانیان، جـا سـەیری ئـەم ئارامگری‌و خۆراگریە بکە، ئەم پیاوەی چەندە بەرزکردۆتەوە[1]، قاضی ابـن شـداد ئـەڵێ: جارێکیـان بینیم هەواڵی کۆچی دوایی کـوڕێکی هـەرزەکاری بـەناوی ئیسماعیلەوە دەخوێنـدەوە، ئـەوە بـوو لەسەر ناوەکە وەستاو بەکەسی نەوت هەتاوەکو لەکەسانی ترمان بیست، هیچ ئاسەوارێکیشی پێوە دەرنەکەوت جگـە لـەوەی کـاتێ کاغەزەکـەی خوێنـدەوە فرمێسك بەچاویدا هـات[2]. شەوێکیشیان گەمارۆی صفدی دابوو ئەیوت: ناخەوین هەتاوەکو ئەمشەو پێنج مەنجەنیق دانەمـەزرێنین[3] بـۆ هـەر مەنجەنیقێکیش کۆمەڵێکی دانا کە سەرپەرشتی دانانیان دەکرد، ئێمە بەدرێـژایی شـەو لەخزمەتیدا بـووین لەخۆشـترین ژیـان‌و بەچـێژترین کاتـدا، بـەردەوامیش نێردراوەکـان هـەواڵی دانـانی مەنجەنیقەکانیان پێ دەگەیاند هەتاوەکو کاتێ رۆژ بویـەوە هـەموو مەنجەنیقـەکان دانرابـوون، ئـەو شەوانەش درێژترین‌و ساردترین شەو بـوون بـارانێکی زۆریـشی تیادا بـاری، ئـەوەبوو لـەو شـەوەدا هەواڵی کۆچی دوایی تقی الدین عمری برازای پـێ گەیـشت لەکاتێکدا بەرامبـەر فرەنجەکان وەسـتا بووین‌و هەموو شەوێ رەشەبا خێوەتەکانی هەڵدەکەندین‌و خەڵکی بـەدەرەوە دەمانـەوە هـەتاوەکو بەیانی لە الرملەدا[4] و دوژمنیش لەیازوردابوو، لەنێوانیشماندا ماوەیـەکی کـەم هـەبوو، ئـەویش الملك العادل‌و علم الدین سلیمان کوڕی جندر سابق الدینی کوڕی الدایـەو عزالـدین المقدمی هێنـاو خـەڵکی لەخێوەتەکـەی دورخـستنەوەو پاشـان نامەیـەکی دەرهێنـاو گریـانێکی زۆری کـردو ئێمەشـی

---

[1] سیرة السلطان الناصر صلاح الدین ل٨٣.

[2] سیرة السلطان الناصر صلاح الدین ل٨٣.

[3] ئامێرێك ە لەتەختە دروست دەکرێت دوولای هەیەو لەنێوانیاندا تیرێکی درێژ هەیە.

[4] سیرة السلطان الناصر صلاح الدین ل٨٤.

خستەگریان بەبێ ئەوەی بزانین هۆی چیە پاشان بەگریانەوە وتی: تقی الدین کۆچی دوایی کرد[1] و پاشان گریانی زیاتر بوو خەڵکەکەش گریان، منیش بەخۆمدا چوومەوەو وتم: داوای لێخۆشبوون دەکەین خوای گەورە لەم حاڵەتە سەیر بکەن بزانن ئێوە لەکوێن و لەچیدان و واز لەشتی تر بێنن[2]، ئەویش وتی: بەڵێ لێمان خۆشبە خوایەو چەند جارێك دووبارەی کردەوە پاشان وتی: با کەس بەمە نەزانێت، پاشان داوای کەمێك گوڵاوی کردو چاوەکانی پێ شت و دواتر خواردنیان هێناو خەڵکی کۆبونەوە بۆی و کەس بەمەی نەزانی هەتاوەکو دوژمن گەڕایەوە بۆ یافاو ئێمەش گەڕاینەوە بۆ النطرون، کەشوێنی سەرەکیمان بوو.

**نۆیەم: ئەمەکداری:**

وەفاداری لەسیفەتە بەرزو رەوشتە گەورەکانەو خوای گەورەش فەرمانی کردووە بە بەندەکانی کەپابەند بن پێوەی و ستایشی ئەوانەی کردووە کە ئەنجامی دەدەن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا......﴾(المائدة)، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەئەمەك و بەوەفا بن بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەکانتان)[3]. هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾(الانسان ٧)، واتە: ئەو بەختەوەرانە یەكێك لەسیفەتیان ئەوەیە: وەفا بە نەزر دەکەن یاخود بەڵێنێکیان داوەو وەفادارن)[4] شاعیریش دەڵێت:

إذا قلت في شيء نعم فاتمه — فان نعم دين على الحر واجب

والا فقل لا تسترح ولا تُرح بها — لئلا يقول الناس انك كاذب[5]

سەڵاحەدینیش نمونە بوو لەبواری وەفاکردن بەپەیماندا و هەرکاتێ سوڵحی بکردایە پابەند دەبوو پێوەی ئەگەر بەڵێنیشی بدایە ئەیبردە سەر، ابن واصل لەبەتریارکی قودسەوە دەیگێڕێتەوە کاتێ ئەو شارەی بەجێهێشت دوای دەست بەسەراگرتنی لەلایەن سەڵاحەدینەوە، پارەیەکی زۆر زۆری پێ بوو و سەڵاحەدینیش رێگری لێ نەکرد کاتێ وتیان ئەو پارانەی لێ وەرگرە هەتاوەکو بۆ بەهێزکردنی موسوڵمانان بەکاری بێنێت وتی: ستەمی لێ ناکەم و پەیمان ناشکێنم، بۆیە تەنها ئەوەندەی لێ وەرگرت کە لە کەسە ئاساییەکانی تری وەردەگرت کە بریتی بوو لەدە دینار، پاشان لەگەڵ بەتریارك و هاوڕێکاندا هێزێکی نارد بۆ پاراستنیان و گەیاندیان بەشاری صور کە بوو بووە

---

[1] سيرة السلطان الناصر صلاح الدين ل٨٤.

[2] سيرة السلطان الناصر صلاح الدين ل٨٤.

[3] تەفسیری ئاسان ل١٠٦.

[4] تەفسیری ئاسان ل٥٧٩.

[5] الهج المسلوك في سياسة الملوك ل١١٧.

پێگـەی فرەنجـەکان‌و شـوێنی کۆبوونـەوەیان دوای تێکشکانیان لـەحطینـداو وەرگرتنـەوەی ئـەو شوێنانەی کە دەستیان بەسەردا گرتبوو لەشامدا[1].

**دەیەم: خاکی بوون:**

سیفەتێکە لەسیفەتەکانی (عبادالرحمن) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ (الشعراء ٦٣) واتـە: بەنـدەکانی خـوای میهرەبـان ئـەو کەسـانەن کـە زۆر بـەهێمنی‌و سـەلاری بەسـەریدا دەڕۆن... هتـد[2] خـاکی بـوونیش نیشانەی خۆشەویستی خوایە بۆ بەندە وەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (المائدة ٥٤)، واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوەوەی هـەر کـەس لـەئێوە لـەئاین‌و بەرنامەکـەی وەرگەڕێت پاشگەزبێتەوە ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەکات) ئەو لەئایندەدا خوا کەسـانێك دەهێنێتـە کایەوە (ئەوەندە رێك‌وپێك‌و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێـن ئـەوانیش ئـەویان خۆشـدوێت هـەروەها ملکـەو فەرمانبـەرداری بەسـۆزن بـۆ ئیمانـداران‌و سـەر بڵنـد شکست نـەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا لـەپێناو رێبـازی خـواداو بـۆ بەدەسـت هێنـانی رەزامەنـدی ئـەو هەوڵ دەدەن‌و تێ دەکۆشن لەلۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن، ئەمە فەزڵ‌و رێزی تایبـەتی خوایـە کـە دەیبەخشێت بە هەر کـەس کـە بیـەوێت کـە فـراوانگیرو زانایـە[3]. إبـن کـثیر ئـەڵێت: ئەمـە سـیفەتی باوەڕدارە تەواوەکانە کە یەکێکیان خاکی بێت بەرامبەر براو گەورەکـەی‌و شـکۆمەند بێـت بەرامبـەر بـەدوژمنانی[4]، سـوڵتان سـەلاحەدینی ئـەیوبیش سـیفەتی خـاکی بـوون تێـدا بـوو نزیـك بـووە لەخەڵکەکـەوەو هەڵـەو کـەم‌و کورتییـەکانی قبـوڵ دەکـردن‌و دڵـی راگیر دەکـردن خـۆی لەکـەس بەگەورەتر نەدەزانی‌و ئارامگر بوو لەسەر ئەو شتانەی کە پێی خۆش نەبوو زۆر چاو پۆشـی دەکـرد لەهەڵەو کەم‌وکورتی هاوەڵەکانی شتی وای دەبیست کەپێی خۆش نەبوو لەکەسێکەوە بەڵام نەپێی دەوت‌و نەدەشگۆڕا لەگەڵیدا لەکاتی گێڕانەوەی چیرۆکدا بۆی جل‌و بەرگ‌و راخەرەکەی دەبوو بەژێر پێوەو هیچ کاری تێ نەدەکرد. إبن شداد بای ئەو دەکات کە جارێکیان هێشترەکەی هەڵاتووەو پێی

[1] مفرج الكروب (٣/٣١١) حطيت بين أخبار مؤرخيها وشعر معاصريها ل٤٦.

[2] تەفسیری ئاسان لا٣٦٥.

[3] تەفسیری ئاسان ل:١١٧.

[4] تفسير إبن كثير (٢/٧٣).

ماو بەقاچی سەلاحەدینداو بەلام ئەو هەردەمی بەخەندەوە بووە[1]، هەروەها سەلاحەدین پێشەوایەکی باش بوو بۆ شوێنکەوتووانی خۆی دەستی دەدایەو کارو پاشان داوای دەکرد لەخەڵکی تر چاوی لێ بکەن ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنی دروستی چونکە ئەو دەیزانی کەپلەی بەرز لەهەر کۆمەڵگەیەکدا بۆ ئەو کەسانەیە کە کار دەکەن، کاریش بناغەی هەڵسەڵگاندنی تاکو کۆمەڵگاکانەو میحوەری هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە بەهۆی ئەمەشەوە خەڵکی بەگشتی خۆشیان دەویستو دڵسۆز بوون لەخزمەتکردنو هاوسۆزبوون لەگەڵیدا ئەم خۆشەویستییەش نهێنی سەرکەوتنو بەهێزی بوو چونکە ئەو شتانەی کە خەڵکی تر بە زۆرو تۆقاندن دەستی دەکەوت ئەو بەخۆشەویستیو هاوسۆزیو رەوشتی جوان دەستی کەوت[2] هاوەڵانیشی چاویان لێ دەکردو پێشبڕکێیان دەکرد لەچاکەداو وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ﴾ (الحجر ٤٧)، واتە: لەکاتێکدا هەرچی کینەو بوغزە لەدڵو دەروونیاندا دەرمانکێشاوە...هتد[3].

ئەوە بوو کاتێ سەلاحەدین بڕیاری بنیاتنانی شورای قودسیداو چوار دەوری هەڵکەند خۆی ئەوکارەی گرتەئەستۆو بەسەر شانی خۆی بەردی ئەگواستەوەو خەڵکیو زانایانو دەوڵەمەندەکانو خزمەتەکانیو خەڵکانی هەژاریش چاویان لێکرد ئەمەش خۆشەویستی خستبووە دڵی خەڵکەوە، لەساڵی ٥٨٧ك – ١١٩١ز معزالدین قەیسەر شاه محمد کوڕی بلج ئەرسەلان فەرمانڕەوای وڵاتی رۆم هات بۆ لای سوڵتان سەلاحەدینو ئەویش رێزی لێناو کچی العادلی برای لێ مارە کرد، کاتێ سەلاحەدین سوار بوو بۆ خواحافیزی لێ کردنی معزالدین بەپیادە دەڕۆشت سەلاحەدینیش دابەزی، کاتێ سوڵتان سەرکەوت معزالدین یارمەتیداو سواری کرد، علاء الدین کوڕی عزالدینی فەرمانڕوای موسڵیش لەوکاتەدا لەگەڵ سەلاحەدیندا بوو و هەستا بەرێککردنی جلەکانی، بۆیە هەندێ لەئامادەبووان سەرسامی خۆیان نیشانداو بەچپە بەیەکتریان دەوت: باکت نییە ئەی کوڕی ئەیوب هەر چۆنێك بمریت، پاشایەکی سەلجوقیو کوڕی ئەتابەك زەنکی سوارت دەکەن[4]، ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی لایەنی رەوشتی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی.

هەروەها سەلاحەدین ناسراو بوو بەکۆمەڵێك سیفەتی جوانو ئاکاری بەرز وەك ورە بەرزیو ئیدارەی بەهێزو توانای چارەسەرکردنی کێشەکانو پلان دانانو ئاراستەکردنو رێکخستنو

---

[1] النوادر السلطانیة ل٦٣.

[2] تأریخ الأیوبیین في مصر و بلاد الشام ل٢٢٥.

[3] تەفسیری ئاسان ل٣٦٤.

[4] الکامل فی التأریخ لە تأریخ الایوبیین ل٣٣٥.

چاودێری‌و چەندین سیفەتی تر، بەهۆی ئەو سیفەتە خواویستانەش کە پەروەردگار تیایدا داینابوو توانی شام‌و موصل‌و مصرو شوێنەکانی تر لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا یەکبخات‌و سەرکەوتنی گەورە بەسەر خاچپەرستەکاندا لەحطین تۆمار بکات‌و بیت المقدس بگێڕێتەوە بۆ موسوڵمانان، ئەوە بوو هەوڵە بێ وچانەکانی ئەنجامی باشیان هەبوو لەسەر ئاستی تاکەکەس‌و کۆمەڵگەو دەوڵەت‌و پڕۆژە بەرگریکارییەکەی بووە مەشخەڵێك بۆ ئەوانەی کەکاریان بۆ گێڕانەوەی سەروەری ئیسلام دەکرد، هەروەها سەلاحەدین رۆژێکیان باسی نهێنی‌و سەرچاوەی هێزی خۆی کرد لەکاتێکدا کەقسەی لەگەڵ الملك الظاهر غازیدا دەکرد، دوای مۆرکردنی ئاشتەوایی لەگەڵ ریتشارد شێردڵدا پێش ئەوەی بچێت بۆ حەلەب وەسیەتی بۆ کردو وتی: وەسیەتت بۆ دەکەم بەترسان لەپەروەدگار، چونکە ئەوە سەری هەموو چاکەیەکە، فەرمانت پێ دەکەم بەوەی کە پەروەردگار فەرمانی پێکردووین، چونکە ئەوە هۆکاری رزگاریتە، هەروەها ئاگادارت دەکەمەوە لەخوێن‌و دەستخستنە ناویەوە چونکە خوێن ناخەوێ! هەروەها وەسیەتت بۆ دەکەم بەپاراستنی دڵی ژێر دەستەکانت‌و سەرنجدانی کاروبارەکانیان، چونکە تۆ ئەمینی من‌و خوای گەورەی بەسەریانەوە هەروەها وەسیەتی راگرتنی دڵی ئەمیرو کاربەدەست‌و گەورە پیاوانت بۆ دەکەم، چونکە ئەم پلەوپایەی کە من پێی گەشتوم بەمودارات و دڵڕاگرتنی خەڵك بووە، هەرگیز رق لەکەس هەڵمەگرە، چونکە مەرگ کەس ناهێڵێتەوە ئاگاشت لەوەش بێت کە لەنێوان تۆو خەڵکیدا هەیە، چونکە خوا لێت خۆش نابێت تا ئەوان لێت رازی نەبن بەڵام ئەوەی کە لەنێوان تۆو خوادایە ئەوە بەپەشیمانبونەوەو گەڕانەوە لێت خۆش دەبێت چونکە پەروەردگار بەخشندەیە[1].

---

[1] النوادر السلطانية و المحاسن اليوسفية ل: ٣٥٢، ٣٥٣.

## باسی سێیەم: بیروباوەڕی دەوڵەتی ئەیوبی

گەڕانەوە بۆ شوناسی ئوممەتی ئیسلامیو بیروباوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەدیارترین ئاماژەکانی نویێ بوونەوە بوو لەسەردەمی زەنکیو ئەیوبییدا ئەوە بوو لادان درێژەی کێشا بوو بیدعەش بڵاوبوبوویەوەو دەوڵەتێکی ستەمکاری وەك دەوڵەتی فاطمي عوبەیدیش لەمیسردا پارێزگاری لێ دەکرد بۆیە گەڕانەوە بۆ کارکردن بەقورئانو سوننەت لەگەورەترین دەستکەوتەکانی هەردوو دەوڵەتی نورەدینو سەلاحەدین بوو، ئەوە بوو توانرا دادگەری بەرپا بکرێتو بیدعە لەناوببرێتو دەوڵەت رەنگ رێژکرا بەرەنگێکی ئیسلامی پاكو بێگەرد، سەلاحەدینیش بەردەوام بوو لەسەر رێبازی نورەدین زەنکی لەجێبەجێکردنی شەرع لەسەرجەم کاروبارەکانی دەوڵەتداو جێبەجێکردنی دادگەریو لەناوبردنی ستەمکاریو خۆی سەرپەرشتی هەڵگرتنی ستەمی دەکردو پشتی بە دادوەرانو زانایان دەبەست دیارە سەلاحەدین کەسێکی باوەڕدارو خواپەرستو لەخوا ترسو پارێزکار بوو متمانەی بەخوای گەورە زۆر بوو هەمیشە پەنای بۆ دەبردو بیروباوەڕی دروست بوو یادی خوای گەورەشی زۆر دەکرد دەوڵەتەکەشی بەبیروباوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت گۆش دەکرد کە پێغەمبەر (ﷺ) روونی کردبویەوەو خەلیفەکانی راشدین لەسەری دەرۆشتنو ئەیوبییەکانیش پاش سەلاحەدین لەسەری بەردەوام بوون هەروەك سەلاحەدین دروشمە ئاینییەکانی زۆر بەگەورە رادەگرتو رقی لە فەیلەسوفو موعطلەکانو دوژمنانی شەریعەت بوو. ئەگەر بیبیستایە کەسێك بێ باوەڕو دژ بەدینە لەولاتەکەیدا فەرمانی کوشتنی دەدا، ئەوە بوو رووبەڕووی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی وەستاو توانی ئەو پلانە جێبەجێ بکات کە نورەدین زەنکی دایناوبوو بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی عوبەیدیو کاری دەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی بیروباوەڕە ناڕەواکان لەمیسرداو گێڕانەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی دروست بۆی لەرێی ستراتیژێکی روونەوە، دەوڵەتی ئەیوبیش سودی وەرگرت لەهەوڵە زانستیو هۆکارە بانگخوازییەکانی دەوڵەتەکانی سلجوقیو زەنکیو غەزنەوی چونکە دەوڵەتی ئەیوبی دوای چەند دەوڵەتێکی سوننی هات کە رۆڵیان هەبوو لەبڵاوکردنەوەی قورئانو سوننەت لەناو ئوممەتی ئیسلامیدا، سەلاحەدینیش گرنگی دەدا بەپاراستنی بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامی بەپێی مەزهەبی ئەهلی سوننەت پەیڕەوی رێبازی ئەشعەری بوو و سوربوو لەسەر بەرەنگاربوونەوەی هەر لادانێك لێیو لەناوبردنی رواڵەتەکانی، زۆرینەی ئەیوبییەکانیش شارەزا بوون لەبنەماکانی ئەم بیروباوەڕە[1]، ئیبن شەدداد دەربارەی سەلاحەدین ئەڵێ: سەلاحەدین بەرەحمەت بێ بیروباوەڕی باش بوو، زۆر یادی

---

[1] التأريخ السياسي و الفكري ل٢٤٦.

پەروەردگاری دەکردو بیروباوەڕی لەبەڵگەوە وەرگرتبوو لەڕێی لێکۆڵینەوەو پشکنین لەگەڵ زاناو شێخە گەورەکانەوە، بەم شێوەیە بیروباوەڕی پارێزراو بوو لە تەشبیه و لێکچوواندنی پەروەردگارو داڕنینی لەسیفەتەکانی (تعطیل)... شێخ قطب الدین نیسابوریش بیروباوەڕێکی بۆ کۆکردبویەوە کە هەموو ئەو شتانەی لەخۆگرتبوو کە پێویست بوون لەم بوارەدا، سەلاحەدینیش هێندە مکوڕ بوو لەسەری منداڵە بچوکەکانی فێردەکرد هەتاوەکو لەمنداڵیەوە لەمێشکیاندا بچەسپێ، بۆ خۆشم بینیومن لەبەردەستیدا ئەیانخوێندەوە[1]، دەوڵەتی ئەیوبیش هەوڵی زۆری دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت لەمیسرداو سەلاحەدینیش سور بوو لەسەرئەوەی کەبیروباوەڕی ئەهلی سوننەت باڵادەست بێت لەو دەزگا هزریانەدا کە بنیاتی نابوون لەمیسردا[2].

## یەکەم: گرنگیدانی ئەیوبییەکان بەدامەزراندنی خوێندنگە سونیەکان:

ئەم قۆناغە لەساڵی ٥٧٣ك/١١٧٦ز وە دەستی پێکرد دوای ئەوەی کە سەلاحەدین توانی زۆربەی ناوچەکانی شام کۆنترۆڵ بکاتو پاشان بگەڕێتەوە بۆ میسر بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی، لەم ساڵەدا فەرمانیدا بەبنیاتنانی دوو خوێندنگە: یەکەمیان بۆ شافیعیەکان بوو لای گۆڕی پێشەوایانیو بەخوێندنگەی سەلاحیە ناسراو بوو، دووەمیشیان بۆ حەنەفیەکان. دوا بەدوای ئەمانەش دروستکردنی خوێندنگە بۆ سوننیەکان بەردەوام بوو لەچەند شوێنێکی جیاجیای قاهیرەو شوێنەکانی تری وڵاتدا، لەلایەن ئەمیرە ئەیوبییەکانو هاوکارانیانەوە دیارە ناتوانین باس لە هەموو ئەو خوێندنگایانە بکەین لەبەر زۆری، چونکە دامەزراندنی خوێندنگە بووە نەریتێکی پەیڕەوکراو لەلایەن بەرپرسانی دەوڵەت بەژنو پیاوەوە لەم ماوەیەدا[3]، بۆیە تەنها باس لە خوێندنگە بەناوبانگەکان دەکەین... کە ڕۆڵیان هەبووە لەپرۆژەی گۆڕینی مەزنی ژینگەی میسر لەمەزهەبی شیعەوە بۆ مەزهەبی سوننی[4].

### ١- خوێندنگەی صەلاحی:

بنیاتنانی ئەم خوێندنگەیە لەساڵی ٥٧٣ك/١١٧٦ز دەستی پێکرد لای گۆڕی پێشەوا شافعی ئەم خوێندنگەیەش وەقف بوو بۆ شافعیەکانو سیوطی وەسقی دەکاتو دەڵێ: تاجی خوێندنگاکان بوو، پاشان باسی دەکاتو دەڵێ: وانەوتنەوە تیایدا سپێردرا بە نجم الدین الخبوشانیو ئیبن جبیریش سەردانی ئەم خوێندنگەیەی کرد لەکۆتایی ذی الحجەی ساڵی ٥٧٨ز/١١٨٣ز دا لەوکاتەشدا

---

[1] النورادر السلطانية و المجاسن اليوسفية ل٧.

[2] التأريخ السياسي و الفكري ل٢٤٦.

[3] هەمان سەرچاوە ٢٣٣.

[4] هەمان سەرچاوە ٢٣٣.

کار بۆ فراوانکردنی دەکراو ئیبن جبیریش باسی ئەوە دەکات کە هاوشێوەی ئەم خوێندنگەیە بنیات نەنراوە لەم وڵاتەدا و هاوشێوەی نییە لەفراوانی رووبەڕوو خۆشی بیناکەیدا، کەسێك کە بەناویدا بگەڕێت وادەزانێ کەشارێکی سەربەخۆیەو تێچونی لەژمارە نایەت، شێخ حەبوشانیش بۆ خۆی سەرپەرشتی دەکردو سوڵتانی ئەم شوێنانەش (سەلاحەدین) رێی پێدابوو بۆ ئەم مەبەستەو ئەیوت: ئەوەندەی تر جوانو رازاوەی کە پێویستە لەسەرمان کەپشتیوانی لێ بکەین، هەروەها إبن جبیر باسی ئەوە دەکات کە ئارەزووی دیداری خبوشانی هەبووە چونکە بەناوبانگ بووە لەئەندەلوسدا[1].

رەنگە ئەم ئاماژەیەی ئیبن جبیریش ئەوە دوپات دەکاتەوە کە سەلاحەدین خوێندنگاکانی لەخەڵکانی خاوەن زانستو چاکەو خواناسی هەڵبژاردووە لەوانەی کە ناوبانگیان لەجیهانی ئیسلامیدا دەرکردبوو، هەتاوەکو بتوانن ئەو ئامانجانە بەدی بێنن کە هەوڵی بۆ دەداو هۆکارێك بن بۆ ڕاکێشانی زانستخوازان لەهەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییەوە[2].

**٢- خوێندنگەی المشهد الحسيني – مەزاری حوسەینی:**

هەروەها سەلاحەدین لەقاهیرەدا لەتەنیشت ئەو مەزارەی کە (بەناحەق) دەدرێتەپاڵ حسێن خوێندنگەیەکی بنیاتناو ماڵێکی زۆری بۆ وەقف کرد[3]. هەورەها مەقریزی لەکاتی باسکردنی مەشهەدی حوسەینیدا ئەڵێ: کاتێ کەسوڵتان ناصر بوویە دەسەلاتدار ئەڵقەی وانەوتنەوەو فیقهی تیاداناو سپاردی بەزانا: البهاء دمشقي ئەویش لەمیحرابەکەدا ئەنەنیشت کە گۆڕەکە لەدواوەیەتی، کاتێ معين الدين حسنی کوڕی شێخ الشيوخ بووە وەزیری (الملك الكامل) لەوەقفەکانی پارەی کۆکردەوە ژورێکی بۆ وانەوتنەوە دروستکرد کە تا ئێستاش ماوەو لەگەڵ چەند خانویەکدا بۆ زانا عەلەویەکان[4]، جا ئەگەر ئامانجی گشتی سەلاحەدین لەدانانی خوێندنگە سونیەکان لەمیسردا بریتی بوبێت لەجێگیرکردنی مەزهەبی سوننەو لەناوبردنی مەزهەبی شیعە ئەوە بنیاتنانی ئەم خوێندنگەیە لەناومەزاری حوسەینیدا ماناکایەکی تایبەتی هەیە، چونکە یەکێك بوو لەو دوایەمین ئەو پێگانەی کە شیعەکان پەنایان بۆ دەبرد لەمیسردا لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کە فاطمیەکان توانیان دڵیان راکێشن بەلای خۆیاندا لەخەڵکی سادەی سوننە، بۆیە گرنگە کەخوێندنگەیەك هەبێت لەم شوێنەدا بۆ فێرکردنی ئاینی راستو بەرەنگاربوونەوەی ئەو بیدعانەی کە فاطمیەکان بڵاویان کردبویەوە[5].

---

[1] رحلة ابن جبير ل٢١.

[2] التأريخ السياسي الفكري للمذهب السني ٢٣٤

[3] الوفيات لابن خلطان (٢٠٦/٦).

[4] المواعظ و الاعتبار (٤٢٧/١ – ٤٢٨).

[5] التأريخ السياسي الفكري ل٢٣٥.

### ٣- خوێندنگەی فاضلية:

لەو خوێندنگە گرنگانەش کە لەم سەردەمەدا دامەزرێنران خوێندنگەی فاضلی بوو کە القاضي الفاضـل لەسـاڵی ٥٨٠ك/١١٨٤ز دا بنیاتینـاو وەقفـی کـرد بـۆ شـافیعیو مالیکییـەکانو یـەکێك لەهۆڵەکانی بۆ خوێندنی قورئانو فێربوونی زانستی خوێندنەوەکان (علم القراءات) لەسەردەستی پێشەوا القاسم أبی محمدی شاطبي (خاوەنی شاطبية کۆچکردوو لە ٥٩٦ك/١٣٩٤ز) تەرخان کردبوو و کۆمـەڵێکی زۆر کتێبـی بـۆ وەقـف کردبـوو کـە ئـەڵێن سـەد هـەزار کتێـب بـووە، لەتەنیشتیشیدا کتێبێکی بۆ فێرکردنی هەتیو وەقف کردبوو، المقريزيش باسی ئەم خوێندنگەیە دەکاتو دەڵێ: ئەم خوێندنگەیـە یـەکێك بـووە لەگـەورەترینو پیرۆزتـرین خوێندنگـەکانی قـاهیرە[1]، هـەروەها السلطان العادلی برای سەلاحەدینیش خوێندنگەیەکی بۆ مالیکییەکان بنیـات نـاو صفی الـدين عبـدالله کـوڕی شـاکری وەزیریـشی کۆچـکردوو لـە (٦٣٠ك/١٢٣٣ز)دا هـەمان شـتی کـردو خوێندنگەیـەکی بـۆ مالیکییەکان لەشوێنی نیشتەجێ بوونی وەزیری فاطمي يعقوبی کوڕی کلسدا بنیاتنا، ابـن شـاکریش زانایەکی شارەزا بوو لەمەزهەبی پێشەوا مالیکدا[2].

### ٤- یانەی فەرموودەی الکاملیە:

پاشـا (الملـك الکاملی کـوڕی عـادل زۆر تامـەزرۆی بیـستنی فـەرمودە بـوو سـوننەتو خـەڵکی سوننەتخوازیشی زۆر خۆش دەویستو ئارەزووی بڵاوکردنـەوەی هـەبوو، بۆیـە لـەقاهیرەدا هەستا بەدانانی یەکەم خوێندنگە بۆ خوێندنی فەرمودە کـە بەخوێندنگـەی لەکاملیـە ناسـراو بـوو ئەمـەش لەسـاڵی ٦٢٢ك/ ١٢٢٥زدا[3]، ئـەم خوێندنگەشـی وەقـف کـرد بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە سـەرقاڵبوون بەفەرموودەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پاش ئەوانیش زانایەکی شافیعی، الحافظ عمری کوڕی حسن ئەندەلوسی کرد بەشێخیو سەرپەرشتی خوێندنگەکەی پێ سپارد ئەم زانایـەش بـە (ئـیبن دوحیـە) ناسراو بوو ئەمەش لەساڵی ٦٣٣ك/١٢٣٥ز دا، ئەم زانایە زۆر بەئاگا بوو لەفـەرمودەو گرنگـی زۆری پێدەداو پەروەرشیاری الملك الکاملیش بوو[4].

### ٥- خوێندنگەی الصالحیە:

سەبارەت بەو خوێندنگەیەش کە صالح نجم الـدينی کـوڕی ئـەیوب بنیـاتی نـا ئـەوە لەشـوێنی کۆشـکی ڕۆژهـەڵاتی فـاطمیـەکانـدا بـوو، لەسـاڵی ٦٣٩ك/١٢٤١ز دا دایمەزرانـدو بیرۆکەکـەی

---

[1] المواعظ و الاعتبار (٢/٣٦٦).

[2] هەمان سەرچاوە (٢/٣٦٥، ٣٧١).

[3] هەمان سەرچاوە (٢/٣٧٥).

[4] التأريخ السياسي و الفكري للمذهب السني ل٢٣٦.

لەخوێندنگەی موستەنصریەوە وەرگرتبوو و وەقفی کرد بۆ هەر چوار مەزهەبەکەو چەند وانەیەکی بۆ ئەم مەزهەبانە تیایدا رێکخست لەساڵی ٦٤١ك/١٢٤٣ز داو مەقریزی دەربارەی ئەڵێ: ئەو یەکەم کەسێکە لەوڵاتی میسردا کەوانەی چوار مەزهەبی لەشوێنێکدا دانابێت[1]، گرنگی ئەم خوێندنگەیەش لەوەدایە کە هەلی رەخساند بۆ حەنبەلیەکان هەتاوەکو هەوڵەکانیان ڕۆڵی هەبێت لەبزوتنەوەی بوژاندنەوەی مەزهەبی سوننە لەمیسردا، چونکە ئەوان هەتاوەکو مێژووی دامەزراندنی ئەم خوێندنگەیە تاکە کۆمەڵێك بوون لەنێوان کۆمەڵە سونیەکاندا کە ئەیوبیەکان لەسەرەتادا گرنگیان بەدامەزراندنی خوێندنگە نەدابێت بۆیان. رەنگە ئەمەش بەهۆی کەمیانەوە بووبێت، السیوطیش ئەمە دوپات دەکاتەوەو لەباسی زاناکانانیان لەمیسردا ئەڵێ: ئەوان زۆر کەمن لەمیسرداو من هەواڵی بونیانە بیستووە هەتاوەکو سەدەی حەوتەمو دواتر، نهێنی ئەمەش روون دەکاتەوەو ئەڵێ: مەزهەبی ئەحمەد (ﷺ)لەدەرەوەی عێراقدا دەرنەکەوت هەتاوەکو سەدەی چوارەم ئەو سەدەیەی کە عوبەیدیەکان دەسەلاتی میسریان گرتەدەستو پێشەواو زانایان سێ مەزهەبەکەی تریان لەناوبرد بەکوشتنو دورخستنەوەو ئاوارەکردنیانو مەزهەبی شیعەیان بلاوکردەوە، کاتێ دەولەتەکەیان روخا زاناکان لەمەزهەبەکانی ترەوە گەڕانەوە بۆی[2]، هەولی ئەیوبیەکانیش بۆ بنیات نانی خوێندنگە لەقاهیرەدا کورت نەبوبیەوە بەڵکو شارەکانی تریشی گرتبوویەوە، ئەوە بوو لەفەییومدا تقی الدین عمر دوو خوێندنگەی دامەزراند: کەیەکێکیان شافعیو ئەوی تریشیان مالیکی بوو[3]، سەلاحەدینیش خوێندنگەیەکی بۆ شافعیەکان لەئەسکەندەریەدا دامەزراند لەساڵی ٥٧٧ك/١١٨١زدا[4]، دیارە ئەو وەقفە زۆرانەی کە تەرخان کرابوون لەگەڵ باشکردنی باری گوزەرانی مامۆستاو قوتابیەکاندا یەکێك بوو لەو هۆکارە گرنگانەی کە رۆڵی هەبوو لەکێشکردنی زانایانو زانستخوازان بۆ میسر، یەکێك لەنەریتە پەیڕەوکراوەکانیش ئەوە بوو کە لەکاتی دامەزراندنی هەر خوێندنگەیەکدا هێندە وەقفیان بۆ دادەنا کەگرنتی بەردەوامی ژیانی زانستی تیادا مسۆگەر بکات، ئیبن جبیر ئەڵێ: لەشانازیەکانی ئەم وڵاتە (ئەسکەندەریە)و ئەو سەروەریانەی کە بۆ سوڵتانەکەی دەگەڕێتەوە: دامەزراندنی خوێندنگەو میوانخانەکان بوو تیایدا[5] بۆ خەڵکی زانستخوازو خواپەرست کە لەوڵاتە دوورەکانەوە ئەهاتنو هەریەکەیان خانویەکی دەست دەکەوت کە تیایدا بژیو

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٣٦.

[2] حن المحاضرة (١/٤٨٠).

[3] المواعظ و الاعتبار (٢/٣٦٥).

[4] الحافظ السلف: محمود زیتون ل١٤٠.

[5] التأریخ السیاسي الفکري ل٢٣٧.

مامۆستایەك کە ئەو هونەرەی فێر دەکرد کە دەیویست، پاشان سوڵتان گرنگی زیاتریدا بەو خەڵکە میوانەو فەرمانیدا کە گەرماویان بۆ دابین بکرێت بۆ خۆشتنیان تیایداو نەخۆشخانەشی بۆ تەرخان کردن بۆ چارەسەری نەخۆشەکانیانو پزیشکیشی دانا بۆ بەسەرکردنەوەیان[1]، هەروەها ئیبن جبیر ئاماژە بەزۆری مزگەوتەکانی ئەسکەندەریەدا دەدات کە لەتاقە شوێنێکدا چوار تا پێنج مزگەوت هەبووە، زۆرجار مزگەوتەکان تێکەڵ بوون واتە حوجرەو خوێندنگەیان تیایدا بووەو پێشەوای خۆیان هەبووەو لای سوڵتان هەژمار کراونو موچەیان هەبووە، بۆنموونە هەیانبووە پێنج دیناری میسری لەمانگێکدا هەبووەو هەشبووە لەوە زیاتر یان کەمتری هەبووە، ئەمەش یەکێکە لەچاکەکانی سوڵتان[2]، ئەم وێنە جوانەش کە ئیبن جبیر پیشانی داوە بۆ کاوروهەوڵەکانی سەلاحەدین لەئەسکەندەریەدا ئاماژەیە بەمەزنی هەوڵەکانی لەم بوارەدا لەناوچەکانی تردا، چونکە ئەسکەندەریە بە بەردەوامی پێگەی ئەهلی سوننە بووە لەسەردەمی فاطمیەکاندا، لەکۆتاییەکانی ئەو سەردەمەشدا دوو خوێندنەگەی سوننی تیابوو کە یەکێکیان مالکی بوو: کە ئەویش خوێندنگەی حافظ ی کوڕی عەوفی زوهەری بوو، ئەوەی تریشیان شافعی بوو: کە ئەویش خوێندنگەی حافظی سەلەفی بوو، ئەم دوو خوێندنگەیەش توانیان کەرۆڵێکی بەرچاو بگێڕن بۆ پارێزگاری کردن لەکەلەپوری سوننی لەمیسری فاطمیدا، تەنانەت القاضی الفاضل ئەم راستییەی لەیەکێك لەو نامانەدا باسکردووە کە سەلاحەدین بۆ نورەدینی نارد دوای دۆزینەوەی بانگخوازێکی فاطمیی لەئەسکەندەرییەداو ئەڵێ: یەکێك لەو هەواڵە خۆشانەی کە پێویستە گەورەمان بیزانێ ئەوەیە کە هەموو خەڵکی ئەسکەندەرییە لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەتن[3]، جا ئەگەر وەقفەکانیسەلاحەدین لەئەسکەندەرییەدا کەسوننی بوونی خۆیی پاراست بوو بەم چروپڕیە بێت ئەوە لەناوچەکانی تردا کەبانگەوازی فاطمیەکان تیادا برەوی هەبووە زیاترو زۆرتر بووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو موچەیە بوو کەسەلاحەدین بۆ خەبوشانی لەخوێندنگەی الصلاحیەدا بڕیبویەوەو بڕی چل دیناری مانگانە پێ دەدا لەبری وانەوتنەوەو دە دیناریش بۆ سەرپەرشتی کردنی وەقفەکانی خوێندنگەو شەست رەتڵ نان لەهەر رۆژێکداو دوو کاروان ئاوی نیل[4] پاشان ئیبن جوبەیریش زیاتر وێنەکەمان بۆ روون دەکاتەوە کاتێ کە بەردەوام بوو لەسەر بەدواداچوونی هەوڵەکانی سەلاحەدین لەقاهیرەدا هەتاوەکو زانیاری بخاتە بەردەست خوازایارانیو ئەڵێ: سەیر لەوەدایە القرافە هەموو مزگەوتی بنیاتنراو

---

[1] رحلة ابن جبير ل١٥.

[2] هەمان سەرچاوە ١٦، ١٧.

[3] كتاب الرضتين لة التأريخ السياس و الفكري ل٢٣٨.

[4] حسن المحاضرة (٢/٥٧).

دیمەنی ئاوەدانە، غەریبو زاناو پیاوچاکو هەژاران روویان لێ دەناو یارمەتیو هاوکاری هەمووشیان لەلایەن سوڵتانەوە دابین دەکرا هەروەها ئەو خوێندنگانەش کە لەمیسرو قاهیرەدا بوون بەهەمان شێوە مانگانە یارمەتی دەدرانو ئەو هاوکاریەش کە بۆ هەموو ئەو شوێنانە دابین دەکرا پتر بوو لە دوو هەزار دیناری میسری لەمانگێکدا[1]، لەمەشەوە دەردەکەوێت کە سەلاحەدین لەکاتێکدا کە بەردەوام بوو لەسەر کاروانی ژیاندنەوەی مەزهەبی سوننی لەمیسردا تەنها بەبنیاتنانی خوێندنگە وازی نەهێناوە، بەڵکو سور بووە لەسەرئەوەی کە زانایانی سوننەی بۆ بێنێت لەهەموو گۆشەو کەنارێکی جیهانی ئیسلامیەوە هەتاوەکو بەهەوڵەکانیان بەشداری بکەن لەم بوژاندنەوە هزریەدا، پاش ئەوەی کە فاتمیەکان هەموو هەوڵەکانیان تەرخان کرد بۆ لەناوبردنی زانایانی سوننە لەمیسردا پێشتریش ئەو رتەیەی سیوطمان هێنا کەباسی ئەوەی دەکرد چۆن هەستان بە لەناوبردنی زانایانی سێ مەزهەبی سوننی بەکوشتنو دورخستنەوەو ئاوارەکردنیان، هەتاوەکو ئەوکاتەی کەدەولەتەکەیان رووخاو زانای سوننەی سەرجەم مەزهەبەکان سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆی، لەڕاستیدا هەوڵەکانی سەلاحەدین گەورەترین هاندەر بوو بۆ ئەم شاڵاوی کۆچانە کەزانا سوننیەکان کردیان بۆ میسر، هەروەك چۆن سەلاحەدین گرنگی دەدا بەهێنانی زانایانی بەهەمان شێوە گرنگیشی بەهێنانی سۆفیەکان دەداو یەکەم خانەقای لەمیسردا بۆ دروستکردنو کردیە یانەی ئەو سۆفیە هەژارانەی کە لەوڵاتی جۆراوجۆرەکانەوە دەهاتنو وەقفی زۆری بۆ دابین کردنو شێخێکیشی دانا بۆ سەرپەرشتیکردنو بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان کە بەشێخ الشیوخ ناسرا بوو، مەقریزی باسی ئەوە دەکات کەدانیشتووە سۆفیەکانی ئەو خانەقایە ناسراو بوون بەزانایىو خواناسىو ژمارەشیان دەگەشتە سێ سەد کەس، سوڵتانیش نانو گۆشتو حەلوای بەشێوەیەکی رۆژانە بۆ دەناردن لەگەڵ چل درهەمدا کەپارەی پۆشاکێك بوو و لەتەنیشتشیانەوە گەرماوێکی بۆ دروستکرد بوون، هەرکەسێکیشیان ویستبێتی سەفەر بکات پارەی پێویستی بۆ دابین کراوە ئەم گرنگیدانە زۆرەش بەکاروباری سۆفیەکان (بەڕای من) مەبەستێکی تایبەتی هەبوو و پەیوەندی بەبزاتی زیندوکردنەوەی مەزهەبی سوننییەوە هەبوو، چونکە سەرباری ئەوەی کە سۆفیگەری میانەڕەوانە ئاڕاستەیەکی رێزلێگیراو بوو لەلایەن دەسەلاتدارانو جەماوەرەوە لەم سەردەمەدا، بەلام گرنگی پێدانی بەم شێوەیە لەمیسردا بەتایبەت کارێکی ئامانجدار بوو و مەبەست پێی بەدی هێنانی ئامانجێکی دیاریکراو بوو، رەنگە نهێنی ئەمەش ئەوە بێت کە سەرجەم ئەو هۆکارانەی کە فاطمیەکان لەمیسردا گرتیانەبەر نەیتوانی سەرکەوتوو بێت لەبانگەوازکردن بۆ مەزهەبەکەیانو

[1] رحلة ابن جبیر ل٢٢.

دزەپێکردنی بۆ ناو بیروباوەڕی میسرییەکان بەڵام بەئاسانی کاری کردە لایەنی سۆزداریان، ڕواڵەتەکانی خەمباریو گریان بۆ حسێنو ئاهەنگ گێڕان بۆ لەدایکبوونی ئەندامانی ئالو بەیتو گرنگیدانی فاطمیەکان بەم ئاهەنگانە کاریگەری خۆی هەبوو لەهەستو سۆزی میسرییەکانداو تا ئەمڕۆش شوێنەواری ماوە لەناویاندا، ئەگەرچی سەلاحەدین هەوڵی ڕاکێشانی زانایانی سوننەیدا لەهەموو شوێنێکەوە بۆ میسر هەتاوەکو بەهۆی زانستەکانیانەوە بەشدار بن لەبزوتنەوەی بوژاندنەوەی مەزهەبی سوننیدا، ئەوە لایەنێکی تریش هەبوو کە پێویست بوو کار بۆ تێرکردنو گۆڕینی بکرێت لەو ئاراستەوە کەفاطمیەکان پێیاندا بوو بەئاراستەیەکی تردا، ئەم لایەنە گرنگەش بریتییە لەلایەنی سۆزداری لەخەڵکدا کەفاطمیەکان بەئاسانی دەستیان بەسەردا گرتبوو، هەروەها سۆفیەکان لەو توێژە دەگمەنانە بوون کەتوانای تێرکردنی ئەو لایەنەیان هەبوو لەو ڕۆژگارەدا بەهۆی ڕەوشتی جوانو دنیا نەویستیو توانای بزواندنی لایەنی سۆزداری خەڵکەوە لەڕێی مەجلیسەکانی وەزعو ئامۆژگارییەوە سەرنجی خەڵکی بۆ خۆیانو سروتەکانیان ڕابکێشن، مەقریزی دەگێڕێتەوە دەڵێت: خەڵکی لەمیسرەوە دەهاتن بۆ قاهیرە هەتاوەکو سۆفیەکانی خانەقا کە بە (سعيد السعداء) واتە خۆشبەختی خۆشبەختان ناسرابوون ببینن لەکاتێکدا کە بەرەو مزگەوتی گەورەی الحاکم دەچوون بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی هەتاوەکو خێروبەرەکەتیان توش ببێ بەهۆیەوە[1]، هەروەها سەلاحەدینو جێنشینەکانی بەهۆی هەوڵەکانیانەوە توانیان میسر لەو دابڕانە فیکرییە دەربێنن کەتێی کەوتبوو پەیوەندی پتەوی بەناوەندەکانی ڕۆشنبیری سوننی لەجیهانی ئیسلامیدا گرێ بدەنەوە وەك بەغدادو دیمەشقو قورطبە دوای ئەوەی کە فاطمیەکان هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئەم ناوەندەدا بچڕاندو بەرهەمهێنانی میسر لەبواری فیکری سوننەدا بۆ ماوەی زیاتر لەدوو سەدەو نیو دواکەوت[2].

**دووەم: هەوڵی ئەیوبییەکان لەشامو جەزیرەدا:**

ئەم گرنگیدانە زۆرە کە لەمیسردا بەبزاوتی زیندوکردنەوەی مەزهەبی سوننی دەدرا، مانای ئەوە نییە کە ئەیوبیەکان ئەو ناوچانەی تریان پشتگوێ خستووە کە بارودۆخیان هاوشێوەی بارودۆخی میسر نەبووە، بەڵکو وەك دەبینین کەمتەرخەمیان نەکردووە لەبڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری سوننی لەهەموو ناوچەکاندا، لەمەشدا هەمووان لەهەوڵی بەردەوامدا بوون هەر لەسوڵتانو ئەمیرەکان بەژنو پیاوەوە هەتاوەکو هاوکارو وەزیرو فەرماندەو زاناو نوسەران. زۆرینەی ئەوانە

---

[1] المواعظ و الاعتبار (٢/٤١٥، ٤١٦).

[2] سيرة القاهرة، التأريخ السياس و الفكري ل٢٤٠.

سور بوون لەسەر بنیاتنانی خوێندنگەو دامەزراندنی لەوڵاتی شامو جەزیرەدا: ئەوەتا سەلاحەدین لەشاری قودسدا خوێندنگەیەکی دامەزراند بۆ شافیعیەکانو لەدیمەشقیش خوێندنگەیەکی تری بۆ مالیکیەکان بنیاتنا، خانوەکەی خۆشی لەمیسردا کردە خانەقایەك بۆ سۆفییەکان پاش گواستنەوەی بۆ وڵاتی شام، تقی الدین عمریش خوێندنگەیەکی لەشاری رەها دامەزراند، عەزیز عوسمانی کوڕی سەلاحەدینیش خوێندنگەیەکی تەواو کرد کە الملك الأفضلی برای دەستی بەدروستکردنی کرد بوو لەدیمەشقداو بەخوێندنگەی عەزیزیە دەناسرا، معظم عیسای کوڕی العادلیش خوێندنگەیەکی بۆ حەنەفیەکان بنیاتنا کە بە معظمیة ناسرا بوو[1]، سەیفولئیسلامی برای صلاح الدینیش خوێندنگەیەکی وەقف کرد بۆ حەنبەلیەکان لەدیمەشقدا[2]، الأشرف کوڕی العادلیش یانەی فەرموودەی الأشرفیتی لەو شارەدا بنیاتنا[3] هەروەها القاضی الفاضلیش یانەی فەرموودەی الفاضلیەی نزیك مزگەوتی ئەمەوی بنیاتنا[4]، ست الشام (خوشکی صلاح الدین)یش خوێندنگەیەکی بۆ شافعیەکان لەدیمەشقدا دامەزراند[5]، رەبیعە خاتونی خوشکیشی هەمان کاری کردو خوێندنگەکەشی وەقف کرد بۆ حەنبەلیەکان لەدیمەشقدا[6]، ئەمە وێڕای چەندین خوێندنگەی تر کە زۆرو بڵاوبوون، تەنانەت عزەدینی کوڕی شەدداد لەو خوێندنگانە تەنها لەشاری دیمەشقدا نەوەدو دوو خوێندنگەی بژاردووە، کە لەنێوان چوار مەزهەبەکەی سوننەدا دابەش بوو بوون، ئەمە جگە لەشوێنەکانی تر کە بۆ فێرکردنو وانە وتنەوە بەکار دەهێنران وەك مزگەوتە ئەمەوییەکان[7] و هەروەها ابن جبیر وێنەی ژیانی زانستی لەشاری دیمەشقدا بەتایبەت لەناو مزگەوتەکانیدا دەگێڕێتەوە، لەکاتێکدا کە لەساڵی ٥٨٠ك/١١٨٤ز دا سەردانی ئەم شارەی کردبوو، بۆیە دەربارەی مزگەوتی ئەمەوی دەڵێ: ئەڵقەی تیابوو بۆ وانە وتنەوە بە قوتابیان، یارمەتی باشیش هەبوو بۆ مامۆستاکانی، مالیکیەکانیش گۆشەیەکیان هەبوو بۆ وانە وتنەوە لەلای رۆژئاوای مزگەوتەکەوە، کە قوتابیە مەغریبییەکانی تیادا کۆدەبوونەوە کە یارمەتییەکی دیاریکراویان هەبوو، شوێنەکانی ئەم

---

[1] الدارس في التأريخ المدارس (٥٧٩/١).

[2] التأريخ السياس و الفكري للمذهب السني ل٢٤١.

[3] الدراس في التأريخ المدارس (٥٧٩/١).

[4] التأريخ السياس و الفكري ل٢٤١.

[5] هەمان سەرچاوە ل ٢٤١ لە مرآة الزمانەوە.

[6] هەمان سەرچاوە ل ٢٤١ لە مرآة الزمانەوە.

[7] هەمان سەرچاوە ل ٢٤١ لە مرآة الزمانەوە.

مزگەوتە ڕێزگرە لەغەریبو زانستخوازان فراوانو زۆر بوون[1] دەربارەی گۆڕەپانەکانی مزگەوتیش ئەڵێ: بەشێك لەگۆڕەپانەکانی چەند بێستانو زەویەکی وەقف کراو بوو، تەنانەت ئەوقاف خەریك بوو هەموو شارەکەی دەگرتەوەو مزگەوتو خوێندنگەو خانەقایەکیش کە تازە بنیات بنرایە سوڵتان وەقفی بۆ دابین دەکرد... هەروەها ژنە خاتونو شکۆدارەکانیش هەڵدەستان بەبنیاتنانی مزگەوتو سەنگەرو خوێندنگەو پارەی زۆریان بۆ خەرج دەکردو بڕێکیان لەسامانی خۆیان بۆ وەقف دەکرد، هەندێ لەئەمیرەکانیش ئەم کارانەیان دەکردو پێشبڕکێیان بۆ ئەم کارە خێرو پیرۆزانە دەکرد[2]، هەروەها حەلەبیش پشکی باشی لەم هەوڵانەدا بەرکەوتبوو، قاضي بهاء الدینی کوڕی شدادیش ئەرکی وانەوتنەوەی تیادا گرتبووە ئەستۆ کە الظاهر سەرپەرشتی ئەوقافی هەموو حەلەبی پێ سپارد بوو[3] هەروەها ابن شداد خوێندنگەی صاحبیەی شافیعی دروستکردو لەتەنیشتیشەوە خانەیەکی بۆ فەرمودە دامەزراند، کە بووە ناوەندێك بۆ کۆبوونەوەی هۆگرانی فەرمودەو نیشتەجێ بونیان تیایدا، لەم ناوەندەدا فەرمودە دەخوێندراو دەنوسرایەوە ئەمەش بەردەوام بوو هەتاوەکو هاتنی تەتارەکان، گوندێکیشی لەگوندەکانی حەلەب بۆ ئەم ناوەندە وەقف کردبوو لەنزیك ئەمیشەوە خانوویەکی بنیاتنا بۆ سۆفیەکان[4]، بەدرێژایی سەردەمی ئەیوبییەکانیش حەلەب وەك قەڵای زانست وابوو، کەزانستخوازان لەهەموو شوێنەکانەوە روویان لێ دەنا، ئەمەش پاش فەزڵی خوا دەرەنجامی ئەو هەوڵە زانستییە بوو کە ئیبن شداد پێی هەستاو گرنگی دەدا بە ڕێکخستنی کاروبارەکانیو زانایانی کۆکردەوە تیایدا کە بووە هۆی ئاوەدان بوونەوەی ئەو هەموو خوێندنگەیەو هاتنی زانایان بۆی لەوڵاتە جۆراوجۆرەکانەوە، دەرەنجام سەرقاڵبوون بەزانستو سود لێ وەرگرتنی پەرەی سەند، ابن خلکانیش باسی ئەوە دەکات کە پەیوەندی کردووە بەو خوێندنگەیەی کە ئیبن شداد دایمەزراندووە لەگەڵ براکەیدا، ابن شدادیش بۆ خۆی وانەی تیادا دەوتەوەو چوار زانای بەڕێزی تر بابەتەکانیان دووبارە دەکردەوە، هەروەها ئیبن خەلەکان ئاماژە بەوە دەدات کە زانایان لەحەلەبداو لەسەردەمی ئیبن شەددادا ڕێزێکی زۆریان هەبووەو بەباشی خزمەت کراون، بەتایبەت ئەو کۆمەڵەی کە لەخوێندنگەکەیدا بوون ئەوە بوو ئامادەی دانبشتنەکانی سوڵتان دەبوونو لەسەرخوانی ئەو ڕۆژویان دەشکاند، قاضیش لەدوای نوێژی جومعە وانەیەکی فەرمودەی هەبوو کە

---

[1] رحلة ابن جبير ل٢٢٠.

[2] رحلة ابن جبير ل٢٢٣.

[3] أعلام النبلاء بتأريخ حلب الشهباء (٤/٣٥٥ – ٣٥٦).

[4] التأريخ السيس و الفكري للمذهب السني ل٢٤٣.

نوێژکەرەکان گوێبیستی دەبوون[1]، ابن واصلیش باسی ئەوە دەکات کە لەکۆتایی سالّی ٦٢٧ك/ ١٢٣٠ز دا بەرەو حەلەب بەرێکەوتووە هەتاوەکو فیقه و ئوصولو ڕێزمانو زمانی تیادا بلێتەوەو شاد بێت بەدیداری ئیبن شەداد کە لەخوێندنگەی صاحبیەدا بوو[2].

## سێیەم: ڕەگەزەکانی ڕۆشنبیری سوننی لەسەردەمی ئەیوبیدا:

گرنگیدانی سەلاحەدینی ئەیوبیو سولتانەکانی دوای ئەوە بەسەرخستنو چەسپاندنی مەزهەبی ئەهلی سوننەت لەو ولاتانەدا کە فەرمانڕەوای بوون گرنگی دانێکی هەمەلایەنەو چڕوپڕ بوو بەتایبەت لەشارەکانی قاهیرەو ئەسکەندەریەو دیمەشقو حەلەبو... هتد. گرنگترین ڕەگەزو پێکهاتەکانی ڕۆشنبیری سوننیش کە لەو کاتەدا جێی بایەخی ئەیوبییەکان بوو بریتی بوون لە:

### ١- قورئانی پیرۆز:

ئەیوبییەکان گرنگیان دەدا بەوتنەوەی قورئانی پیرۆز بەمندالانو لەبەرکردنیان ئەوەتا ئیبن جوبەیر باس دەکاتو دەلێت: صلاح الدین فەرمانیدا بەئاوەدانکردنەوەی چەند شوێنێك لەمیسرداو مامۆستایانی بۆ وەتنەوەی قورئانی پیرۆز دیاری کرد هەتاوەکو مندالّی هەژارانو هەتیوان فێری قورئان بکەنو یارمەتی باشیان بۆ دابین کرابوو[3]، هەروەها قاضی بهاء الدینی کوڕی شەداد وێنمونەیەك لەگرنگیدانی زۆری سەلاحەدینمان بەقورئانی پیرۆز نیشان دەداتو باسی ئەوە دەکات کە ڕۆژێکیان بەلای منالێکی بچوکدا تێپەڕیووە کە سەرقالّی قورئان خوێندن بوو، ئەویش سەرسام بووە بەخوێندنەوەکەی، بۆیە لەخۆی نزیکی کردەوەو لەخواردەمەنی تایبەتی خۆی بەشیداو بەشە کێلگەیەکی بۆ خۆیو باوکی وەقف کرد هەروەها مەرجی دانا بوو بۆ مامۆستای ئەو خوێندنگەیە دەبێ شارەزا بێت لەزانستەکانی قورئانو بەباشی لەبەری بێت[4]، پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە القاضی الفاضل لەتەنیشت خوێندنگەکەیەوە لەقاهیرەدا چەند نوسەرێکی دانابوو کە وەقفی کردبوون بۆ پڕۆژەی وتنەوەی قورئان بەهەتیوان، هەروەك یەکێك لەهۆلەکانی ئەم خوێندنگەیەی تایبەت کردبوو بۆ وتنەوەی قورئانو زانستەکانی، کاتێ ئیبن جبیریش سەردانی مزگەوتی ئەمەوی کرد بینی کە ئێوارەو بەیانی قورئانی تیادا دەخوێنرێتو قورئان خوێنەکانیش یارمەتی دەدرێنو نزیکەی پێنج سەد کەس بەو یارمەتییانە دەژین، لەدوای لێبونەوەشیان لەخوێندنەوەی قورئانی بەیانی لەبەرامبەر هەر مامۆستایەکدا منداڵێك دادەنیشێو فێری قورئانی دەکات، مندالەکانیش

---

[1] وفيات الأعيان (٦/٨٧ – ٨٩).

[2] مفرج الكروب (٤/٣١١ – ٣١٢).

[3] رحلة ابن جبير ل٢٥.

[4] سيرة صلاح الدين (٩)، التأريخ السياسي والفكري (٢٤٣).

یارمەتییەكی دیاریكراویان هەبوو كەپێیان دەدرا جگە لەوانەیان كەدەوڵەمەند بوون، چونكە ئەوان باوكیان ڕێیان پێ نەدەدان بۆ وەرگرتنی[1]، هەروەها ئیبن جبیر شوێنێكی تری بینی لەدیمەشقدا كە مندالآن تیایدا فێری قورئان دەبوونو وەقفێكی باشی بۆ دانرا بوو و مامۆستایانیش ئەوەندەیان لێ دەبرد كە بەشی منداڵەكانو پۆشاكو خەرجیان بكات[2]. زانستی خوێندنەوەكانی قورئانیش (علم القراءات) لە(دار الحدیث الاشرفیة)دا لە دیمەشق[3] و خوێندنگەی قاهریە لەحەلەبدا دەخوێنران[4].

## ٢- فەرمودەی پیرۆز:

ئەیوبییەكان گرنگی باشیان دەدا بەفەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەم گرنگیەش بۆ پڕكردنەوەی دوو پێویستی سەرەكی بوو كەڕووبەڕووی كۆمەڵگەی ئیسلامی بووبوویەوە لەمیسرو شامدا، یەكێكیان گشتی بوو ئەوی تریشیان تایبەت بەهەندێ ژینگەوە، گشتییەكە ئەوەبوو كەموسوڵمانەكان دەستەویەخە بوون لەگەڵ دوژمنێكدا كە هەمیشە لەمەلآسدا بوو بۆیانو سوكایەتی بەپیرۆزییەكانیان دەكرد، هاندانی موسوڵمانەكانیش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان پێویستی بەگرنگیدانێكی زۆر هەبوو بەفەرمودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەتایبەت ئەوانەی كە پەیوەندییان بەم بوارەوە هەیە، بۆیە تێبینی دەكرا كە سەلاحەدین گرنگی زۆری بەفەرمودەی پێغەمبەر دەداو گوێبیستی دەبوو و دوبارەی دەكردەوەو هەوڵی گوێبیست بوونی دەداو هانی نوسینی دەدا لەوبارەیەوە، عیمادی ئەسفەهانیش باسی ئەوە دەكات كە لەگەڵیدا چەند جارێك سەردانی حافظی سلفی كردووە لە سەردانەكەیدا بۆ ئەسكەندەریە لەساڵی ٥٧٣ك/ ١١٧٦ز داو گوێبیستی فەرمودە بوەلێیەوە[5]. هەروەها سوڵتان سەلاحەدین خۆیو كوڕەكانی گوێبیستی كتێبی موطأی پێشەوا مالیك بوون. لەزانایەكی ئەسكەندرییەوە بەناوی إبن عەوف الزوهەری لەساڵی ٥٧٧ك/ ١١٨١ز دا[6] هەروەها بهاء الدینی كوڕی شداد وەسفی سەلاحەدین دەكاتو دەڵێت: زۆر تامەزۆری بیستنی فەرمودە بوو، دەچوو بۆ لای ئەو زانایانەی كە خۆیان دوور دەگرت لەهاتنە ناو مەجلیسی دەسەلآتدارانەوە هەتاوەكو لایان گوێبیستی فەرمودە بێت هەروەها إبن شدار درێژە بەقسەكانی دەداو دەڵێ: سەلاحەدین حەزی لێ بوو خۆی فەرموودە بخوێنێتەوە كاتێكیش تەنها بووایە منی

---

[1] رحلة ابن حبیر ٢٢٠.

[2] هەمان سەرچاوە ٢٢٠، التأریخ السیاسي و الفكري ٢٤٣.

[3] حسن المحاضرة (٢/٥٠٦).

[4] أعلام النبلاء (٤/٣٥٥ – ٣٥٦) التأریخ السیاسي و الفكري (٢٤٤).

[5] كتاب الروضتین لە التأریخ السیاسي و الفكریەوە (٢٤٥).

[6] طبقات الشافعیة (٤/٢٢٦).

بانگ دەکردو چەند کتێبێکی فەرموودەی دەهێناو دەیخوێندەوە[1] ئەگەر کەسێکیش بیویسایە لێی نزیك ببێتەوە هانی دەدا بۆ جیهادو هەندێ باسی لەو بارەوە بۆ دەکرد إبن شداد چەند کتێبێکی لەسەر جیهاد بۆ نوسی بوو منیش خۆم کتێبێکی گشتگیرم بۆ نووسی بوو کە تیایدا رەوشتەکانی جیهادو ئەو ئایەتانەی کە باسی دەکەن ئەو فەرموودانەی کە لەگەورەیی دەدوێن کۆکرابوویەوە، ئەویش رەحمەتی خوای لێ بێت زۆر دەیخوێندەوە هەتاوەکو الأفضلی کوڕی لێی سەند[2]، گرنگیدانیش بەفەرموودە تەنها تایبەت نەبوو بەسەلاحەدین بەڵکو زۆرێك لەئەمیرە ئەیوبییەکان هەوڵی بیستن و گێڕانەوەی فەرموودەیان دەدا لەوانە تقی الدین عومەر کەگوێبیستی فەردووده دەبوو لەلای السلفی لە ئەسکەندەرییە[3]، هەروەها الملك الكامل کەرێبازی نورەدینی گرتەبەرو یەکەمین خانەی فەرموودەی لەمیسردا دامەزراندو السیوطیش وەسفی دەکات بەوەی کە سوننەت و هەلگرانی زۆر بەگەورە زانیوەو خۆشی لە السلفییەوە گوێبیستی فەرموودە بووەو مۆڵەتیشی پێداوە[4] هەروەها کوڕەزای إبن الجوزی وەسفی دەکات بەوەی کە قسەی بەپێزی دەربارەی صحیحی مسلم هەبوو[(5)] سەبارەت بە الأشرفی کوڕی العادل ئەوە ئەویش لە(دار الحديث الأشرفية) دا کەخۆی دایمەزراند لەدیمەشقدا گوێبیستی صحیحی بخاری بوو[5] ئەم هەوڵانەش کە ئەیوبییەکان پێی هەستان وەلامدانەوەی پێداویستییەکی گشتی بوو کەپەیوەست بوو بەداخوازییەکانی جیهادەوە لەپێناو خواداو هاندانی موسوڵمانان بۆی و بەرزکردنەوەی توانای موسوڵمانەکان لەرێی پەروەردەو رۆشنبیرکردنیانەوە بەرەگەزێکی گرنگی رۆشنبیری و سوننی، سەبارەت بەپێداویستییە تایبەتەکە کەپێویستی بەگرنگیدانی زیاتر هەبوو بەفەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوە پەیوەندی بەو ژینگانەوە هەبوو کە کلتوری شیعە تیادا باو بوو لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا، چونکە شیعەکان تەنها ئەو فەرمودانە بەصحیح دەزانن کە ئالوبەیت هەستاوە بەگێڕانەوەیان ئەوەش کە ئەیدەنە پاڵ ئالوبەیت بەدەر نییە لەدرۆو هەڵبەستن وەك ریوایەتەکانی زرارە و جابر ئەلجەعفی و خەڵکانی درۆزنی تر، هەروەها تانەدەدەن لەفەرمودەکانی ترو ئەمەش دەکەنە هۆکارێك بۆ تانەدان

---

[1] سيرة صلاح الدين (١٠) التأريخ السيس و الفكري (٢٤٥).

[2] التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٥).

[3] المواعظ و الاعتبار (٢/٢٦٥).

[4] حسن المحاضرة (٢/٣٣ – ٣٤) التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٥).

[(5)] التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٥).

[5] التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٥).

لەراویەکانیان (گێڕەرەوەی فەرمودەکان)[1] لێرەشەوە گرنگیدان بەفەرمودەی پیرۆز لەمیسردا بۆ زیندووکردنەوەی ئەم لایەنە بوو لەناو رۆشنبیری سوننیدا[2].

### ٣- رەگو ریشەی بیروباوەڕی سوننی:

ئەیوبییەکان گرنگیان دەدا بەپاراستنی بنەماکانی بیروباوەڕ بەپێی مەزهەبی پێشەوا ئەشعەری، چونکە ئەشعەری رەحمەتی خوای لێ بێت لەو زانایانە بوو کە ئالای زانستیان هەڵکرد لەهەموو بوارو لایەنە زانستییەکانداو دادەنرێ بەیەکێك لەو زانایانەی کە چەندین زانستو زانیاریو هونەریان پێکەوە کۆکردۆتەوە[3]، ذهبي دەربارەی ئەڵێ: عەللامەو پێشەوا زانایانی بیروباوەڕ ئەبو الحسن... سەرسوڕهێنەر بوو لەزیرەکیو زوو تێگەیشتندا کاتێ بەباشی شارەزای (موعتەزیلە) بوو بێ بەری بوو لێیانو خۆشی لەراکانیان نەدەهات، جارێکیان چووە سەر مینبەرو تەوبەی کرد لەڕاکانی موعتەزیلەو پاشان بەرەبەرە وەڵامی دەدانەوەو کەموکورتییەکانی ئاشکرا دەکردن[4] هەروەها الذهبي باسی دەکاتو دەڵێت: أبی الحسن زیرەکیەکی کەم وێنەی هەبوو لەزانستدا رۆچوو بوو شتی باشو نوسراوی زۆری هەیە کە شارەتی فراوانی زانستی بۆ دەدەن[5] هەروەها ئەڵێ: چوار کتێبی أبی الحسنم بینیوە دەربارەی أصول تیایدا باسی بنەماکانی مەزهەبی سەلەف دەکات دەربارەی سیفەتەکانی پەروەردگارو تیایدا دەڵێ: ئەو سیفەتانە چۆن هاتوون دەبێ هەرواش وەربگیرێت پاشان ئەڵێ: ئەوە رای منەو باوەڕم بەو شێوەیەو نابێ لێکدانەوەو تەئویلی بۆبکرێت[6].

قاضی عیاضیش دەربارەی ئەڵێ: چەند نوسراوێکی بۆ ئەهلی سوننەت نوسیوەو بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر راستی سەلماندنی ئەو سیفەتانەی پەروەردگار کە بیدعەچیەکان رەتیان کردۆتەوە وەك بینینو ئەزەلی بوونی قسەی پەروەردگارو دەسەڵاتیو مەسەلەکانی بیستن کە دەربارەی صیراطو میزانو شەفاعەتو حەوز و سزای ناوگۆڕ کە موعتەزیلەکان رەتی دەکەنەوە. ئەمە وێڕای چەندین بۆ چوونی تری ئەهلی سوننەتو فەرمووده، ئەوە بوو بەڵگەی روونو ئاشکرای لەسەر هێنایەوە لەقورئانو سوننەتو بەڵگە ئەقڵیەکانو گومان بیدعەچیو شیعەکانی وەڵام دایەوەو هەموو ئەمانەشی لەو نوسراوو کتێبە باشانەدا نوسی کە خوای گەورە کردیە جێی سودو

---

[1] التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٦).

[2] التأريخ السياسي و الفكري (٢٤٦).

[3] شعبة العقيدة لابي الحسن الاشعري و المنتسبين اليه ل٢١.

[4] سير أعلام النبلاء (١٥/٨٦).

[5] سير أعلام النبلاء (١٥/٨٧).

[6] سير أعلام النبلاء (١٥/٨٦).

کەڵك بۆ ئوممەت[1]، ئیبن عەساکریش کتێبێکی نوسیوە بۆ بەرگریکردن لێی‌و زۆر ستایشی کردووەو بەنوێکەرەوەو (مجدد)ی داناوەو ئەو ریوایەتانەی باسکردووە کەدەربارەی هۆزو بنەماڵەکەی هاتوون[2]، هەروەها السبکی ش لەطبقات الشافعیەدا هەمان کاری کردووە لەیەکێك لەو قسانەشدا کەدەربارەی دەیکات دەڵێ: شێخ‌و پێشەنگمان بۆ لای خوا شێخ ئەبو الحسن ئەشعەری بەسری شێخی رێبازی پەیرەوانی سوننەت‌و جەماعەت‌و پێشەوای زانایانی بیروباوەڕو سەرخەری سونەتی سەروەری پێغەمبەران‌و بەرگریکار لەئاین‌و تێکۆشەر لەپێناو پاراستنی بیروباوەڕی موسوڵمانان بەشێوەیەکی کەکاریگەری بەردەوام بێت هەتاوەکو ئەو رۆژەی کە خەڵکی لەبەردەم پەروەردگاردا دەوەستن، پێشەوایەکی زاناو خواناس‌و چاکەکار بوو، شەرعی پاراست لەقسەی هەڵبەستراوو هەستا بەسەرخستنی ئیسلام بەشێوەیەکی باش، ئەمە لەگەڵ چەندین زانای تر کە ستایشی خۆی‌و کارەکانیان دەکرد.[3].

أ- **ئەو قۆناغانەی کە پیایدا تێپەڕیوە:** أبو الحسنی ئەشعەری لەرووی بیروباوەڕەوە تەمەنی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم:** زۆرینەی سەرچاوەکان یەکدەنگن لەسەرئەوەی کە ئەشعەری لەقۆناغی یەکەمی ژیانیدا لەژێر سایەی موعتەزیلەدا ژیاوەو پەیرەوی لێکردوون‌و لەو ماوەیەشدا هاوڕێی شێخەکەی بووە کە لەهەمان کاتدا باوەپیارەی بووە بەناوی (الجبائی) هەتاوەکو تەمەنی چل ساڵی[4].

**قۆناغی دووەم:** دوای دەرچوونی لەموعتەزیلەو جیابوونەوەی لێیان رێبازی عبداللەی کوڕی سەعیدی کوڕی کیلابی بەسری[5] گرتەبەرو دەستی دایە وەڵامدانەوەی موعتەزیلە بەپشت بەستن بەو یاساو مەسەلانەی کە عبداللەی کوڕی کلاب باسی دەکردن[6]. ئیبن تیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت ئەڵێت: ئەبولحەسەنی ئەشعەری کاتێك وازی لەموعتەزیلە هێنا رێبازی أبی محمدی کوڕی کلابی گرتەبەرو[7] کتێبی (اللمع في الرد علی أهل الذیغ و البدع) نوێنەرایەتی ئەم قۆناغەی دەکات[1] ئیبن

---

[1] ترتیب المدارك (٥/٢٤).

[2] موقف ابن تیمیة من الاشاعرة (١/٣٣٩).

[3] موقف ابن تیمیة من الاشاعرة (١/٣٤٠).

[4] شعبة العقیدة بین أبي الحسن و المنتسبین الیه ل٣٩.

[5] سیر أعلام النبلاء (١١/١٧٤).

[6] شعبة العقیدة بین أبي الحسن المنتسبین الیه ل٤٢.

[7] الفتاوی (٥/٥٥٦) (٣/١٠٣).

کلابیش وەڵامی موعتەزیلەو جوهەمیـەی دەدایـەوە بەشـێوەیەك كـە نزیـك بـوو لەمەزهـەبی ئـەهلی سوننەتو فەرمودە بەڵام كاتێك دەمەقاڵەو وەڵامدانەوەیان بۆ یەكتر پەرەی سەندو كلابیش بەرێگە قیاسـیەكان رووبەڕوویان دەبویـەوە چـەند بنەمایـەكی بـۆ سـەلماندن كەئـەوان خۆیـان دایاننـاوە، لێرەشەوە بیدعە دزەی كردە ناو رێبازەكەیەوە[2]، هەروەها ئیبن كلابـیش مەزهـەبێكی نـوێی داهێنـا بوو كە لەهەندێ شتیدا هاوڕا بوو لەگەڵ مەزهەبی سەلەفـو پێشینانداو لەهەندێكی تریدا هـاوڕا بـوو لەگەڵ موعتەزیلەو جوهەمیەدا[3].

لەبارەی ئەمەشەوە ئیبن تیمیە رەحمەتی خوا لێ بێت ئەفەرموێت: خەڵكی پـێش أبـی محمدی كوڕی كلاب دوو جۆر بـوون: پـەیڕەوانی سـوننەتو جەماعـەت سیفەتو كردەوەكـانی پـەروەردگار دەسەلمێنن بەڵام جوهـەمیو موعتەزیلـەكان ئـەم دوو مەسـەلەیە رەت دەكەنـەوە، قـسەكەی ئـیبن كلابیش ئەم سیفەتانەی بۆ پەروەردگار دەسەلمێنێ، بەڵام ئـەوە رەت دەكاتـەو كـە ئـەو كردەوانـە لەپەروەردگاردا هەبن كە دەیـەوێو بڕیـاری داوە[4] ئـەبوالعباس قلانـسیو أبـو الحـسنی ئەشعەریش[5] هاوڕان لەگەڵیدا، ئەم بنەمایەش كە ئیبن كیلاب دایهێنا پاڵینا بەپێشەوا ئەحمەدی كـوڕی حەنبـەلو پێشەوایانی تری سەلەفەوە كە خەڵكیان لێ ئاگاداربكەنەوە[6]، ئەم رێبازەش كە ئیبن كیلابی بەصری دایهێنا كەس پێش ئەو پـەی پـێ نـەبردبوو، ئەشـعەریش هـاوڕا بـوو لەگەڵیـداو بـەهۆی ئەمەشـەوە وەڵامی جوهەمیو موعتەزیلەی دایەوە[7].

**قۆناغی سێیەم:** ئەشعەری ماوەیەك لەسەر رێبازی ئیبن كیلاب وەڵامی موعتەزیلەی دەدایەوە، بەڵام خوای گەورە بەرچاوی رۆشن كردەوەو راستی نیشاندا ئـەویش بەگەڕاندنـەوەی بەتـەواوی بـۆ سەر رێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو پەیڕەوكردنی رێبازیانو شـوێنكەوتنی رێگـەیان، ئەمـەش ئەوە بوو كە ئەشعەری دەیویست لەسەری بێت لەكاتێكدا كە بەخزمەت پـەروەردگار دەگات، بۆیـە بێبـەریبوونی خـۆی لـەرێبازو مەزهەبـەكانی تـر پیـشانداو دەسـتی دایـە بانگـەوازكردن بـۆ رێبـازی

---

[1] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري و المنتسبين اليه ل ٤٢.

[2] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري و المنتسبين اليه ل ٤٢.

[3] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري و المنتسبين اليه ل ٤٤.

[4] الفتاوى (١٣/١٣١ – ١٥٤).

[5] موافقة صريح المعقول لصحيح المنقول (٢/٤ – ٥) على هاشم منهاج السنة.

[6] مجموع الفتاوى (١٣/٣٦٨).

[7] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري ل٤٥.

سەلەفو بووە شوێنکەوتەی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕەزای خوای لێ بێت، ئەم قۆناغەش لەبەر گرنگی لەبواری بیروباوەڕدا ئێمە بە سێ بەڵگە بۆمان سەلماندووە[1]:

**یەکەم: وتەی زانایان:** زۆرێك لەپێشەواو زانایان شایەتی گەڕانەوەی تەواو ئەشعەریان داوە بۆ سەر مەزهەبی سەلەفی ساڵح، بێگومان ئەم پێشەوایانەش ئەم شایەتیەیان نەداوە هەتاوەکو باش لەژیانی ورد نەبوبنەوەو نەیانزانیبێت چۆن بووەو لەسەرچی گیرساوەتەوە، لەو زانایانەش[2]:

- شێخی ئیسلام: ئیبن تیمیە[3]
- ئیبن القیم[4]
- حافظی ذهبي[5]
- حافظ ئیبن کثیر، ئەڵێ: سێ حاڵەتیان بۆ شێخ أبی الحسن ئەشعەری باسکردووە:

**یەکەمیان:** موعتەزیلە بوونی کە بێگومان لێی پاشگەزبوویەوە.

**دووەمیان:** سەلماندنی حەوت سیفەتە عەقڵیەکان بۆ پەروەردگار: کە ئەوانیش ژیانو زانینو تواناو ویستو بیستنو بینینو قسەکردنن، لەگەڵ لێکدانەوەی سیفەتە خەبەریەکان وەك ڕوومەتو هەردوو دەستو قاچو پێو هاوشێوەکانی.

**سێیەمیان:** بڕیاردانی هەموو سیفەتەکان بەبێ چۆنێتیو چواندن بەپێی ڕێبازی سەلەف ئەمەش ئەو ڕێبازەیە کە لەکتێبی الإبانەدا گرتویەتییە بەر کە دواجار نوسی[6].

- شێخ نوعمان الالوسی[7]
- شێخ أبو المعالی محمود الالوسی[8]
- عەللامەو زانای گەورە محب الدین الخطیب: کە لەباسکردنی ئەو قۆناغانەدا کە ئەشعەری پیایدا تێپەڕیوەو گەڕانەوەی بەتەواوی بۆ مەزهەبی سەلەف دەڵێ: أبو حسنی ئەشعەری

---

[1] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري ل٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل٤٧

[3] الفتاوی (٥٣/٦).

[4] إجتماع الجيوش الاسلامية ل١١٢.

[5] سير أعلام النبلاء (٨٦/١٥).

[6] إتحاف السادة المتقين، المرتضى الزبيدي ل٤٨.

[7] جلاء العينين ل٢١٣.

[8] غلبة الاماني في الرد على النبهاني (٤٨/٢).

کوڕی ئیسماعیل لەگەورە زانایانی بواری بیروباوەڕە لەئیسلامدا، یەکەمجار موعتەزیلە بوو و پاشان بووە قوتابی الجبائی ، پاشان خوای گەورە بەرچاو روونی پێ بەخشی کاتێ لەنیوەی تەمەنو سەرەتای پێگەشتنیدا بوو پاشگەزبونەوەی خۆی راگەیاند لەگوڕایی موعتەزیلە، پاشان لەم قۆناغەدا چالاکانە دەستیدایە نوسینو موناقەشەو وتنەوەی وانە بۆ رەتدانەوەی موعتەزیلە، بەپەیرەوکردنی رێگەیەکی مام ناوەند لەنێوان رێگای جەدەلو تەئویلو رێگەی سەلەفدا، پاشان رێگاکەی پاڵفتەکردو دڵسۆزانە گەڕایەوە بۆ رێگای سەلەف لەسەلماندنی هەر شتێك کە بەدەق سەلماوە لەمەسەلە غەیبییەکان کە خوای گەورە باوەڕ پێهێنانی بەدڵسۆزیەوە پێویست کردووە، لەسەر ئەم رێبازەش دوا کتێبەکانی نوسیوە لەوانەش کتێبی (الإبانة) ئەو زانایانەش کە باسی ژیاننامەیان کردووە ئەمە بەدوا کتێبی دادەنێن، ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە ویستویەتی لەسەری بێت کاتێك بەخزمەت پەروەردگار دەگات، هەر شتێکی تر کەپێچەوانەی ئەمە بێت لەو شتانەی کە دەردرێنەپاڵی، یان ئەشعەریەکان چوبێتنەسەری، ئەوە ئەشعەری لێی پاشگەزبوەتەوە بۆ ئەوەی کە لەکتێبی الابانەدا هاتووە[1].

**حاڵەتی دووەم: دیداری لەگەڵ حافظ زەکەریای ساجی**

دوای وازهێنانی لەموعتەزیلەو دەستهەلگرتنی‌لەرێبازی ئیبن کیلاب رووی کردە پێشەوایانی (ئەهلی حدیث) کە ناسراون بەدروستی بیروباوەڕو خاوێنی رێبازیان هەتاوەکو لێیانەوە رای سەلەفو (ئەهلی حدیث) وەرگرێت لەو پێشەوایانەش زانای فەرمودە لەبەسرەدا زەکەریای ساجی[2] ئیبن تیمیە دەربارەی ئەشعەری دەڵێ: بنەماکانی فەرمودەی لەزەکەریای ساجییەوە وەرگرت لەبەسرەدا پاشان کاتێ هاتە بەغدا چەند شتێکی تر لەحەنبەلیەکانەوە فێربوو، ئەمەش لەکۆتایی تەمەنیدا بوو، وەك خۆیو هاوەڵانی لەکتێبەکانیاندا باسی دەکەن[3]، لەشوێنێکی تریشدا الذهبي لەباسی ژیانی الساجیدا دەڵێت: أبو الحسنی ئەشعەری ئوصولی لەئەوەوە وتەی ئەهلی حەدیسو سەلەفی وەرگرتووە[4] لەشوێنێکی تریشدا دەربارەی الساجي ئەڵێت: ئەبولحەسەنی ئەشعەری لەوەوە وتەی سەلەفی وەرگرتووە دەربارەی سیفەتەکانی پەروەردگارو لەنوسراوو کتێبەکانیدا

---

[1] بڕوانە: المنتقى الذهبي بتلیدوانی محب الدين الخطيب ذمارة ٣ ل ٤١.

[2] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الاشعري و المنتسبين اليه ل٤٩.

[3] الفتاوى (٣/٢٨٨).

[4] تذكرة الحافظ الذهبي (٢/٧٠٩).

پشتی پێ بەستووە[1]، ئیبن القیم[2]و ئیبن کثیریش[3] ئەم بەیەکگەشتنەوەی ئەشعەریو ساجیان سەلماندووەو بەخاڵی وەرچەرخانیان داناوە لەژیانی ئەشعەریدا[4] ئەمە وێڕای زانای تر[5].

### حاڵەتی سێیەم: کتێبی الإبانةو ساغبوونەوەی دانانی لەلایەن ئەشعەریەوە:

دواین کتێب کە ئەشعەری دایناوە کتێبی الإبانەیە، لەم کتێبەشدا باسی ئەوە دەکات کە ئەو شوێنکەوتوە پێشەوا ئەحمەدەو پابەندە بەبیروباوەڕی سەلەفی ساڵحەوەو شوێن پێشەوایانی فەرمودە دەکەوێت، پاش ئەمەش باسی بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح دەکات لەکاروبارەکانی ئاینـدا، کۆمەڵێکی زۆریش لەزانایان ئەم کتێبەیان داوەتە پاڵ ئەشعەری لەزانایانی پێشینو ئەم دواییانەش[6] نزیکترین زاناش لەسەردەمی ئەشعەریەوە ئیبن ئەلنەدیمە کۆچکردوو لە ٣٨٥ك ئەم زانایە لەکتێبی الفهرست باسی ژیانی ئەشعەری دەکاتو ناوی کۆمەڵێ لەکتێبەکانی دەهێنێ لەوانە کتێبی (التبين في أصـول الـدين) دوای ئەویش ئیبن عەساکر هاتو بەرگری لەئەشعەری کردو باسی کۆمەڵێك لەکتێبەکانی کرد لەوانەش کتێبی الإبانەو زۆر شتیشی لەکتێبی (التبيين) باس کرد بۆ ستایشکردنی بیروباوەڕی راستو دروستی، ئیبن عەساکر دەربارەی ئەشعەری ئەڵێت: کتێبەکانی لای ئەهلی عیلم ناسراوو بەناوبانگە بە بەهێزیو لێکۆڵینەوەی دروست، لای لێکۆڵەرەوان وەسف کراوە، هەرکەسێکیش کتێبی الابانەی بخوێنێتەوە پلەوپایەی ئەم زانایەی بۆ دەردەکەوێت لەرووی زانستو باوەڕەوە[7]. پاش ئەویش ئیبن درباس کۆچکردوو ٦٥٩ك هاتو کتێبێکی دانا بۆ بەرگریکردن لەئەشعەریو کتێبی الإبانەشی دایەپاڵو وتی: پاشان.... بزانن برایان خوای گەورە هەموو لایەکمان سەرکەوتوو بکات بۆ ئاینی راستو دروستی خۆیو رێنمونیمان بکات بۆ رێگەی راست کە کتێبی (الإبانة عن أصول الديانة) کەپێشەوا أبوالحسن علی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەری دایناوە ئەو بیروباوەڕەیە کە دواجار ئەشعەری پەیڕەوی کردووە پاش گەڕانەوەی لەناو موعتەزیلە بەفەزڵو منەتی پەروەردگارەوە، هەر قسەیەکی تر بدرێتەپاڵی کەجیاواز بێت لەوەی لەم کتێبەدا هاتووە ئەوە لێی پاشگەزبووەتەوەو بێبەریبوونی خۆی بۆ خوا دەربڕیوە هەروەها پەیڕەوی

---

[1] سير أعلام النبلاء (١٩٨/٤).

[2] شعبة العقيدة بين أبي الحسن و المنتسبين اليه ل٥٠.

[3] إجتماع الجيوس الاسلامية ل٩٧.

[4] البداية و النهاية (١٣١/١١).

[5] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الاشعري ل٥٠.

[6] شێخ حماد ئەنصاری نامەیەکی نوسیوەو تیایدا گەڕانەوەی ئەشعەری بۆ مەزهەبی سەلەف سەلماندووە.

[7] تبيين كذب المفترى ل٢٨.

لەهاوەڵان و شوێنکەوتووان و پێشەوایانی فەرمووده و رای پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کردووه (رضي الله عنه)، ئایا دوای ئەمە رەوایە بڵێین: پاشگەزبوەتەوە؟ باشە لەچی پاشگەزبێتەوە لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەر کە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و پێشەوایانی فەرمووده لەسەری بوون؟ لەکاتێکدا دەیزانی کە ئەوە مەزهەبی ئەوانە و خۆی لێیانەوە گێڕاویەتیەوە، ئەمە سوێند بۆ خوا شیاو نییە بدرێتە پاڵ خەڵکانی سادە ئیتر چۆن دەدرێتە پاڵ پێشەوایەکی وەك ئەو دوای ئەوەی باسی ئەو کتێبەیمان کرد کە کۆمەڵێ لەپێشەوا ناودارەکانی ئیسلام و زانایانی فەرمووده دەیدەنە پاڵی و ستایشی دەکەن لەسەر ئەو بیروڕایانەی کە بێبەری دەکات لەو بیدعانەی کە دراونەتە پاڵی[1]، پاشان ناوی کۆمەڵێ لەو زاناو پێشەوایانەی هێناوە کە ئەم کتێبەیان داوەتە پاڵ ئەشعەری، لەوانە: پێشەوا أبو علی حسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی فاسی کۆچکردوو له٤٤٦ك.

- حافظ أبو عثمانی صابونی کۆچکردوو له٤٤٩ك.
- حافظ ئەبو بەکری بەیهەقی کۆچکردوو له٤٥٨ك.
- زانای پێشەوا ئەبولفەتح نصر ئەلمەقدسی کۆچکردوو له٤٩٠ك.
- زانا ئەبولمەعالی مجلی خاوەنی کتێبی الذخائر لەفیقهدا کۆچکردوو له٥٥٠ك[2].

هەروەها زانای زۆری هەن کەکتێبی الإبانة ئەدەنەپاڵ ئەشعەری جگە لەوانەی ئیبن درباس باسی کردون وەك:

- پێشەوا ئیبن تەیمیه کۆچکردوو له٧٢٨ك.
- حافظی الذهبي کۆچکردوو له٧٤٨ك کەئەڵێت: کتێبی الإبانة بەناوبانگترین نوسراوی أبی الحسن، حافظ ابن عساکر ئەمەی ئاشکراکردو پێشەوا محي الدینی نەوەویش بەخەتی خۆی لەبەریگرتۆتەوە[3].
- پێشەوا ئیبن القیم کۆچکردوو له٧٥١ك[4].
- حافظ ئیبن کثیر کۆچکردوو له٧٧٤ك.
- عەللامە ئیبن فەرخونی مالیکی کۆچکردوو له٧٩٩ك[5]، هەروەها کۆمەکی تری زۆر هەن کەلەهەژمار نایەن و هەمووشیان ئەم کتێبەیان داوەتە پاڵ ئەشعەری بە دوایەمین کتێبیان

---

[1] رسالة الذب عن أبي الحسن الاشعري لابن درباس ل١٠٧ لێکۆڵینەوەی د.علی ناصر الفقهي.

[2] شعبة العقيدة بين أبي الخسن الأشعري والمنتسبين إلية ل٥٢.

[3] مختصر العلو ل٢٣٩.

[4] إجتماع الجيوش الإسلامية ل١١٣ك.

[5] الديباع المذهب ل١٩٥.

داناوە[1]. هەروەها مێژوونوسان کۆمەڵێ هۆکاریان باس کردووە بۆ گەڕانەوەی أبی الحسن بۆ مەزهەبی ئەهلی سوننەت و وازهێنان لەموعتەزیلە کە گرنگترینیان بەزەیی و میهرەبانی و ڕێنمایی پەروەردگارە بۆی.

ب- **نهێنی گەورەیی ئەشعەری لەمێژوودا:** دوای ئەم گۆڕانکاریە مەزنە ئەبو لحەسەنی ئەشعەری هەستا بەبانگەوازکردن بۆ بیروباوەری ئەهلی سونەت و بەرگری لێ کردنی بەدڵگەرمی و باوەڕەوە و وەڵامدانەوەی موعتەزیلە و شوێنکەوتنیان لەمەجلیس و ناوەندەکانیاندا بۆ بڕواهێنانیان بەوەی کەخۆی دواجار باوەری پێهێناوە لەبیروباوەری ئەهلی سوننەت و مەزهەبی سەلەف، چالاکیشی لەم بوارەدا لەسەردەمی پێشووی زیاتر بوو، هەروەها خۆی سەردانی موعتەزیلەی دەکردو موناقەشەی دەکردن، بۆیە لەو بارەیەوە پێیان وت: چۆن تێکەڵی خەڵکی بیدعەچی ئەکەیت و ئەچیتە لایان لەکاتێکدا کەدەبێ لێیان دووربیت؟ ئەویش فەرمووی: ئەوان خەڵکی دەسەڵاتداران و والی و قازییان تێدایە و لەبەر ئەوە دانابەزن و نایەنە خوارەوە هەتاوەکو لەگەڵیاندا بدوێم، جائەگەر ئەوان نەیەنە خوارەوە بۆ لای من و منیش نەچم بۆ لای ئەوان، ئەی چۆن هەق دەردەکەوێت و بزانن کەئەهلی سوننەت پشتیوانیان هەیە کەبەبەڵگەی بەهێز راکانیان دەسەلمێنن[2]. ئەم هەوڵە مەزن و تێکۆشانە بێوچانانەش بوو سەرخستنی مەزهەبی ئەهلی سوننەت شیاوی ستایش و نرخاندنە، دیارە ئاستی ئەقڵی و ژیری ئەبولحەسەنی ئەشعەری بەرزتربووە لەئاستی هاوتەمەن و هاوڕێکانی و خاوەنی داهێنان و شاگاری گەورەبووە لەبواری ئەقڵ و ژیریدا، وەڵامی بەڵگەکانی موعتەزیلە و بیروباوەڕەکانیانی بەئاسانی دەدایەوە و بەوپەڕی متمانە و تواناوە پوچەڵی دەکردەوە. وەك چۆن مامۆستایەکی شارەزا وەڵامی گومانی قوتابیەکی خۆی دەداتەوە و گرفتەکانیان چارەسەر دەکات، هەروەها پێشەوا ئەشعەری پێشەوایەکی تێکۆشەرو موجتەهیدبوو لەزانستی کەلامدا و یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی، هەموو زانایانی تریش کەدوای ئەو هاتوون بەزیرەکی و تێڕوانینە وردو وتە بەهێزەکانی کاریگەربوون[3].

ج- **ئەبولحەسەنی ئەشعەری بیروباوەڕی خۆیمان بۆ ڕاڤەدەکات:** ئەڵێت: ئەو قسەیەی کەئێمە دەیڵێین و ئەو بیروباوەڕەی کەئێمە ئایینداری لەسەر دەکەین بریتییە لەپابەندبوون بەپەڕاوە مەزنەکەی پەروەردگارو سوننەتی پێغەمبەرو ئەوەی کەهاوەڵان و شوێنکەوتوان و پێشەوایانی

---

[1] شعبة العقيدة بين أبي الحسن الأشعري ل٥٢.

[2] تيبن الكذب المفتري ل١١٦.

[3] رجال الفكر والدعوة في الإسلام (١٤٣/١-١٤٤).

فەرمووده فەرمویانە، ئێمە پابەندین بەوەوەو بەوەی کە ئەبو عبدالله أحمدی کوڕی حەبنەل فەرمویەتی خوای گەورە پایە بەرزی بکاتو پاداشتی بەخێری بداتەوە، ناڕازین بەوەی کەنەیارانی وتویانە، چونکە ئەو ئەو سەرکردە تەواوەیە کەخوای گەورە بەهۆیەوە هەقی رونکردەوەو گومڕایی هەلگرتو رێبازی خۆی پێ رونکردەوەو بیدعە چییەکانی دەم کوت کردو گومانەکانی رەواندەوە، دەسا رەحمەتی خوای لێبێت چەند پێشەوایەکی پێشڕەو هاورێیەکی مەزنو گەورەبوو[1]. هەروەها خزمەتەکانی ئەشعەری تەنها خۆی لەپشتیوانی کردن لەبیروباوەری ئەهلی سوننەتو سەلەفدا نەبینیەوە، چونکە حەنبەلی و زانایانی فەرمووده بەو کارە هەستابوونو کەمتەرخەم نەبوون تیایدا، بەڵکو بلیمەتی لەوەدایە کەهەستا بەهێنانەوەی بەلگەو پاساوی ئەقلیو لۆژیکی بۆ ئەم بیروباوەڕانەو یەکە یەکە روبەروی بیروباوەری موعتەزیلەو فەلسەفەچییەکان دەبوویەوە ، هەموو ئەمانەشی بەزمانێك ئەنجام دا کەئەوان لێی تێ دەگەیشتن شێوازێ کەئاشنابون پێی بەم پێیەش توانی بیسەلمێنێت کەئەم ئاینو بیروباوەرە راستو دروستەی لەلایەن ئەقلو لۆژیکەوە پاڵپشتی دەکرێنو ئەقلی دروست پیشتیوانی ئاینی راستەو هیچ ململانێو دژایەتییەکیان لەنێواندا نییە[2] سەرچاوەکانی بیروباوەڕ لای ئەبولحەسەنی ئەشعەری: ئەشعەری باوەری وابوو کەسەرچاوەی بیروباوەرو ئەو مەسەلانەی کەپەیوەست بەباوەڕو شتە نادیارەکانەوە—میتافیزیك—بریتییە لەقورئانو سوننەتو ئەوەی کەپێغەمبەران هێناویانە نەك تەنها ئەقڵو ژیریو قیاسو میتافیزیکی یۆنانی، بەلام بێ دەنگبوونی بەباش نەدەزانی بەرامبەر ئەو مەسەلانەی بەتێپەربوونی کات پەیدابوون، بەهۆی تێکەڵ بوونی نەتەوەو ئاینو فەلیەفە بێگانەکان لەگەڵ ئومەتی ئیسلامیدا، کە لەئاکامیدا چەندین دەستەو گروپ دروست بوون، بەڵکو پێی وابوو بێ دەنگ بوون بەرامبەر بەو مەسەلانە زیان بەئیسلام دەگەیەنێتو سامو شکۆی سوننەت ناهێڵێو واپێشان دەدرێت کەسوننەت لەرووی ئەقلیو زانستییەوە لاوازەو، زانایانی ئاینیش دەستەوسانن لەبەرامبەر ئەم ڕەوتانەو روبەروبوونەوەی هێرشەکانیاندا، هەروەها خەڵکی گومڕاش ئەمە دەقۆزنەوەو دزە دەکەنە ناو ئەهلی سوننەتو بیروباوەری راستو گومانەکانیان لەناویاندا بلاودەکەنەوەو گەنجە رۆشنبیرەکانیان رادەکێشن بەلای خۆیاندا، هەروەها ئەشعەری باوەری وابوو کەسەرچاوەی بیروباوەر بریتییە لەسروشو

[1] هەمان سەرچاوە ل٥.

[2] رجال الفكر والدعوة في الإسلام (١/١٤٧).

(وحي)پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، رێگای فێربوونیشی بریتییە لەقورئان‌و سوننەت‌و ئەوەی کە لەهاوەڵانەوە هاتووە ﷺ، ئەمەش جیاوازی‌و خاڵی ناکۆکی نێوان ئەوو موعتەزیلەیە، چونکە ئەو لەم بوارەدا پێچەوانەی موعتەزیلەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وابوو کەبەرگریکردن لەبیروباوەری دروست‌و چاندنی لەدڵی ئەوەی نوێدا پێویستی بەقسەکردنە بەزمانی سەردەم‌و بەکارهێنانی زاراوە زانستییەکان‌و روبەروبوونەوەی ئەیاران بەو شێوازە ئەقڵی‌و لۆژیک یەی کەئەوان پەیرەوی ئەکەن، ئەمەشی تەنها بەدروست نەیدەزانی، بەڵکو بەباشترین جیهادو گەورەترین کاری دەزانی لەو سەردەمەدا، ، ئەمەش خاڵی جیاکەرەوە بوو لەنێوان ئەوو هەندێ لەحەنبەلیەکان‌و زانایانی فەرموودەدا، کەدانەبەزینیان بۆ ئەم ئاستە بەگوناه دەزانی‌و پێی تەنگاو دەبوون[1].

د- **هەندێ لەنوسراوەکانی ئەبولحەسەنی ئەشعەری:** کاری ئەبولحەسەنی ئەشعەری تەنها موناقەشەو مشتومڕ نەبوو، بەڵکو لەپاش خۆی کتێبخانەیەکی بەجێ هێشت کەهەمووی نوسراو دانراوی خۆی بوو و لەبوارەکانی بەرگری کردن لەسوننەت‌و راڤەکردنی بیروباوەری دروست دەدوان، هەروەها راڤەی قورئانیشی کردوەو کەمترین شتێکیش کە لەسەر ئەو تەفسیرەی وترابێت ئەوەیە کەسی بەرگ بووەوهەندێ لەنوسەرانیش ئەڵێن نوسراوەکانی ئەگاتە نزیکەی سی سەد کتێب[2] و زۆربەشیان لەوەڵامی موعتەزیلەدایەو هەندێکیشی وەڵامە بۆ مەزهەبەکانی تر لەو کتێبانەش کتێبی (الفصول) کەوەڵامە بۆ فەیلەسوف‌و سروشتپەرست‌و بورهەمی‌و جولەکەو گاورو ئاگر پەرستەکان، ئەم کتێبە زۆر گەورەیەو دوانزە بەش لەخۆ دەگرێت، ئیبن خەلەکانیش باسی کتێبەکانی (اللمع)و "ایضاح البرهان" و "التبيين عن أصول الدين"و "الشرح والتفصيل في الرد على الإفك والتضليل" دەکات جگە لەزانستە ئەقڵی‌و بیروباوەرییەکانیش چەند نوسراوێکی هەیە لەزانستە شەرعییەکاندا وەکو "كتاب القياس"و "كتاب الاجتبهاد"و "خبر الواحد"و کتێبێك دەربارەی وەڵامدانەوەی ئیبن راوەندی لەرەتکردنەوەی "تواتر" دا، هەروەها لەکتێبی "العمد"دا باس لەو کتێب‌و نوسراوانەی دەکات کەتاساڵی ٣٢٠ك تەواوی کردون‌و واتە چوار ساڵ پێش وەفاتکردنی، کەشەست‌و هەشت کتێبن، زۆربەشیان لەدەبەرگو زیاتردا خۆیان دەبیننەوە، لەکۆتایی تەمەنیشیدا چەند کتێبێکی زۆری نوسی، هەروەها کتێبی "مقالات الاسلاميين"یشی

---

[1] رجال الفكر والدعوة (١٤٨/١).

[2] تبيين كذب المفتري ل١٣٦.

ئەیسەلمێنێ کەئەو تەنها زانای بیروباوەڕ نەووە، بەڵکو مێژونوسێکی دەستپاکی زانستی بیروباوەربووەو ڕۆژهەڵاتناسەکانیش دانیان ناوە بەوردیو پاکیو ڕاستگۆیی لەهێنانی زانیاریدا[1]. کتێبەکانی کۆمەڵو ئاینەکانیش بەڵگەن لەسەر پاکیو وردی لەگێڕانەوەو وەرگرتنی زانیارییەکاندا[2].

هـ- **تێکۆشانی لەبواری پەرستشدا:** ئەبولحەسەنی ئەشعەری تەنها پیاوی ئەقڵو زانستو لێکۆڵینەوە نەبوو، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا کەگەشتبووە پلەی پێشوایەتیو ئیجتیهاد لەئەقڵو زانستدا، لەهەمان کاتدا کۆششی زۆری لەپەرستشەکاندا دەکردو خۆی بەڕەوشتە جوانەکان ڕازاندبویەوە ئەمەش یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی زانا پێشینەکان، کە سەرقاڵبوونیان بەزانستەوە نەبووەتە ڕێگر لەکۆشش کردنیان لەپەرستشەکانداو بەدەمەوەبوونی بەردەوامیان بۆی، بەڵکو وانەوتنەوەو خوێندنو پەرستشیان پێکەوە کۆکردبویەوە لەگەڵ ئەمەشدا خوا ویستو دونیا نەویستبوون ئەحمەد کوڕی عەلی فقیە ئەڵێ: چەند ساڵێك لەبەسرەدا خزمەتی ئەبولحەسەنی ئەشعەریم کردو لەبەغداشدا لەگەڵی ژیاوم هەتاوەکو کۆچی دوای کرد ڕەحمەتی خوای لێبێت کەسم نەبینیووە لەو لەخواترس تربێت، هیچ شێخێکیشم نەبینیبوو، هێندەی ئەو بەشەرم بێت لەمەسەلە دونیابییەکانیداو لەویش چالاکترم نەبینیووە لەهەوڵدانیدا بۆ کارکردن بۆ ڕۆژی دوای[3]. هەروەها لەو باسەشەوە أبو الحسن السّروي بۆ دەکات باس دەمات دەربارەی پەرستشو خواپەرستی بەشەودا بۆمان دەردەکەوێت کەچەندە مکوڕو بەهێزبووە لەبەندایەتیدا[4]، ئیبن خەلەکانیش ئەڵێ: لەبەروبوومی زەویەکی وەقف کراوی دەخوارد کەبلالی کوڕی أبی بردەی کوڕی أبو موسی وەقفی کردبوو بۆ منداڵەکانیو خەرجی ڕۆژانەشی حەڤدە درهەم بوو، ئەمەش بەپێی ووتەی الخطیب[5].

و- **ئەو بیروباوەڕەی کەأبی الحسنی ئەشعەری لەسەری بوو هەتاوەکو کۆچی دوای کرد:** ئەبو لحەسەنی ئەشعەری ئەڵێ: ئەمە گێڕانەوەی کۆی ئەو بیروباوەرەیە کەئەهلی سوننەتو فەرموودە لەسەری بوون:

---

[1] رجال الفكر والدعوة (١/١٥٠).

[2] رجال الفكر والدعوة (١/١٥٠).

[3] تبيين الكذب المفتري ل١٤١.

[4] رجال الفكر والدعوة (١/١٥٠).

[5] وفيات الأعيان (٤١٢/١).

١- دانئنان بەبوونی خواو فریشەتەکانو پێغەمبەرانو ناسینی محمد وەك بەندەو پێغەمبەری خوا.

٢- بەهەشت راستەو ئاگری دۆزەخیش راستەو رۆژی دوایی بێ هیچ گومانێك بەرێوەیەو خوای گەورەو ئەوانە زیندوو دەکاتەوە کە لەگۆردان.

٣- خوای گەورە لەسەر عەرشی خۆیەتی وەك ئەفەرموێ ﴿الرحمن على العرش استوى﴾ (طه:٥).

٤- خوای گەورە دوچاوی هەیە بەبێ چۆنێتی وەك ئەفەرموێ ﴿تجري بأعيننا﴾ (القمر: ١٤).

٥- هەروەها دو دەستی هەیە بەبێ چۆنێتی وەك ئەفەرموێ ﴿خلقت بيدي﴾ (ص:٧٥).

٦- هەروەها خوای گەورە روومەتی هەیە وەك ئەفەرموێت ﴿ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام﴾ (الرحمن: ٢٧).

٧- بەناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار ناوتریێ بەشێك نییە لەخوا وەك موعتەزیلەوخەواریج تویانە.

٨- دانیان بەوەدا ناوە کەخوای گەورە زانایە وەکو ئەفەرمووێت ﴿أنزله بعلمه﴾ (النساء:١٦٦)، هەروەها ئەفەرموێ ﴿وما تحمل من أنثى ولا تضع إلا بعلمه﴾ (فاطر:١١).

٩- هەروەها بیستنو بینینیان بۆ پەروەردگار بڕیارداوەو وەك موعتەزیلە رەتیان نەکردۆتەوە.

١٠- هێزیان بۆ خوا بڕیار داوە وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أو لم يَرَوا أن الله الذي خلقهم هو أشَدُّ منهم قوة﴾ (فصلت:١٥).

١١- وتویانە: هیچ خێرو شەڕێك لەسەر زەویدا بەبێ ویستی خوارو نادات.

١٢- هەموو شتەکان بەویستی خوا ڕوو دەدەن، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿وما تشاءون إلا أن يشاء الله﴾ (التكوير: ٢٩)، هەروەك موسڵمانانیش دەڵێت: هەرشتێ خوا بیەوێ دەبێ ئەوەی نەیەوێ نابێت.

١٣- وتویانە: هیچ کەسێك ناتوانی شتێك بکات پێش ئەوەوادەیەی کە بۆی دانراوە یان شتێك بکات کەخوای گەورە بۆی نەینوسیبێت.

١٤- بڕیاریان داوە کەهیچ بەدیهێنەرێك نییە جگە لەپەروەردگارو خراپەی مرۆڤەکانو کارەکانیان خوا بەدی دێنێتو ، هەروەها مرۆڤەکان ناتوانن هیچ بەدی بێنن.

١٥- ئەڵێن قورئان قسەو فرمایشتی خوایەو بەدیهێنراو نییە.

١٦- هەر کەس بڵێ وشەکانی بەدیهێنراون یان لەسەر یان بووەستێ ئەوە بیدعە چییە بەلایانەوەو ناوترێ وشەکانی قورئان بەدیهێنراون یان نا.

١٧- ئەڵێن: خوای گەورە لەقیامەتدا بەچاوی سەردەبینرێت وەك چۆن مانگ لەشەوی چواردەیەمییدا دەبینرێتو باوەردان ئەیبینن و بێ باوەران نایبینن، چونکە لەنێوان ئەوانو

خوادا بەربەستو پەردە هەیە خوای گەورە ئەفەرمویَت ﴿كَلاَّ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ﴾ (المطففين) هەروەك موسی سلاّوی خوای لیَبیَت داوای بینینی لەپەروەردگارکرد لەدونیادا خوای گەورەش خۆی پیشانی کێوە کەداو تواندیەوەو تێی گەیاند کە لەدونیادا خوا نابینێت، بەڵکو لەرۆژی دواییدا ئەبێت.

١٨- هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە بەهۆی گوناهەوە وەك زیناو دزیو هاوشێوەکانییەوە لەتاوانە گەورەکان بەبێباوەر نازانن، بەڵکو بەلایانەوە باوەڕدارن هەرچەندە گوناهی گەورەشیان ئەنجام دابێت.

١٩- باوەڕ بەلایانەوە بریتییە لەباوەرهێنان بەخواو فریشتەکانو پێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانییەکانو بەقەدەر بەخێرو شەریەوە چاكو خراپییەوە،هەروەها ئەو شتەی کە بۆ ئەوان نەبووە هەرگیز بۆیان نەدەبوو ئەوەش کە بۆیان بووە هەرگیز لەوان تێپەرنەدەبوو.

٢٠- ئیسلام بریتییە لەوەی کەشایەنی بدەی کەهیچ خوایەك نییە جگە لە اللهو محمدیش نێردراوی خوایە بەو شێوەی کە لەفەرموودەکەدا هاتووەو ئیسلامیش بەلایانەوە جیاوازە لەئیمان.

٢١- دان بەوەدا دەنێن کەخوای گەورە دڵەکان دەگۆرێ.

٢٢- دان بەشەفاعەتی پێغەمبەردا دەنێن کەبۆ ئەو خەڵکانەیە کەخاوەنی گوناهە گەورەکانن لەئومەتەکەیدا، هەروەها دان بەسزای ناو گۆڕ دادەنێنو حەوز صراطو زیندوبوونەوەی دوای مردن بەراست دەزانن.

٢٣- لێپرسنەوەی پەروەردگار بۆ بەندەکانیو وەستانیان لەبەردەم پەروەردگاردا هەقو راستە.

٢٤- دان بەوەدا دەنێن کەباوەڕ قسەو کردەوەیە زیادو کەم دەکاتو ناڵێن بەدیهێنراوە یان نا.

٢٥- ئەڵێن: ناوەکانی خوا بەشێکن لەخوای گەورە.

٢٦- بریاری چوونە ناو دۆزەخ بۆ کەسێك نادەن کەگوناهی گەورەی ئەنجام داوەو بریاری چوونە بەهەشتیش بۆ کەسێك نادەن کەیەکتا پەرست بێت، هەتاوەکو خوای گەوەی بەویستی خۆی بریاریان لەبارەوە دەداتو ئەڵێن: کاریان دەسپێرین پەروەردگار ئەگەر بیەوێ سزایان دەداتو ئەگەر بیشیەوێ لێیان خۆش دەبێت، هەروەها باوەریان بەوە هەیە کەخوای گەورە خەڵکانێکی یەکتاپەرست لەدۆزەخ دەردێنێت بەو شێوەی کە لەریواتەکاندا لەپێغەمبەرەوە د.خ هاتووە.

٢٧- دژ بەجەدەلو مشتومرن لەئایینداو جیاوازین لەقەدەرداو لەگەڵ باوەرهێنانو ملکەچ کردندانبۆ ریوایەتە راستەکانو ئەو شوێنەوارانەی کەکەسانی متمانە پێکراو گێڕاویانەتەوە

بەشێوەیەکی پشتاوپشت هەتا دەگاتە پێغەمبەری خوا، ناشڵێن چۆن‌و بۆچی، چونکە ئەوە بیدعەیە.

٢٨- ئەڵێن: خوای گەورە فەرمانی بەخراپە نەکردوە، بەڵکونەهی لێ کردووەو رازیش نەبووە بەشەر هەرچەندەرێ بەرەدانی دەدات.

٢٩- رێزو مافی ئەوانە دەزانن‌و دەپارێزن کەخوای گەورە بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی هەڵبژاردون چاکەکانیان لێ وەردەگرن‌و بێدەنگ دەبن لەوەی لەنێوانیاندا روویداوە بەگەورەو بچووکیانەوە.

٣٠- هەروەها ئەبوبەکر پاشان عومەر پاشان عەلی ﷺ پێش ئوممەت دەخەن لەچاکەو فەزڵدا.

٣١- دان بەوەدا دەنێن کەئەوان خەلیفەی راشیدو رێنونی کراون‌و لەهەموو خەڵك باشترن پاش پێغەمبەر ﷺ.

٣٢- باوەڕیان بەو فەرموودانە هەیە کە لەپێغەمبەرەوە هاتوون ﷺ: خوای گەورە دائەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیاو ئەڵێت: ئایا کەسێك هەیە داوای لێخۆش بکات؟ وەك لەفەرموودەکەدا لەپێغەمبەرەوە هاتووە ﷺ.

٣٣- دەست دەگرن بەقورئان‌و سوننەتەوە.

٣٤- شوێن سەلەفو پێشەوایانی پێشووی ئیسلام ئەکەون وشتێك داناهێنن کەخوا رێی پێ نەدابێت.

٣٥- دان بەوەدا دەنێن کەخوای گەورە لەقیامەتدا دیێت وەك ئەفەرموێت: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ (الفجر ٢٢).

٣٦- هەروەها باوەریان هەیە کەخوای گەورە لەبەندەکانی نزیك دەبێتەوە بەهەر شێوەیەك کەبیەوێت

٣٧- باوەریان بەنوێژکردن هەیە لەپشت هەموو ئیمامێکەوە خواناس بێت یان گوناهبار.

٣٨- باوەریان بەمەسح کردن یەسەر خوفدا هەیە وەك سونەتێك لەسەفەرو کاتی نیشتەجێ بووندا.

٣٩- جیهادکردنی هاوەڵگەران بەپێویست دەزانن هەر لەو کاتەوە کەپێغەمبەر ﷺ نێردراوە هەتاوەکو دوایەمین کۆمەڵ کەروبەرووی دەججال دەبنەوەو دوای ئەوانیش.

٤٠- رایانوایە کەدروستە دوعا بۆ پێشەواو دەسەڵاتدارانی موسڵمانان بکرێت‌و نابێت چەك یان شمشێر یان لەرودا بەرزبکرێتەوە هەروەك نابێت لەکاتی ئاماژاوەی نێوان موسڵماناندا بجەنگێن.

٤١- باوەریان بەهاتنەدەرەوەی دەجالو کوشتنی بەدەستی عیسای کوڕی مەریەم هەیە.

٤٢- باوەریان بەنەکیرو مونکەرو شەوڕەوییو بڵندبونەوەو خەوبینین هەیە.

٤٣- هەروەها نزاکردن بۆ مردووی موسڵمانانو خێرکردن بۆیان پێیان دەگات.

٤٤- باوەریان بەوە هەیە کە لەدونیادا ساحیرو جادوگەر هەیە ساحیرو جادو گەریش بێ باوەرەوە وەك خوای گەورە ئەفەرموێت، هەروەها سیحر هەیەو دەبێت لەدونیادا.

٤٥- باوەریان بەنوێژکردن هەیە لەسەر هەر کەسێك کەبەموسڵمانی بمرێت چاك بێت یان خراپو میراتیشیان لێ دەبرێت.

٤٦- باوەریان بەوە هەیە کەبەهەشتو دۆزەخ دروستکراون.

٤٧- وە هەر کەسێك بمرێت ئەوە بەئەجەلو لەوادەی مەرگی خۆیدا دەمرێت، هەر کەسێکیش بکوژرێت ئەوە بەئەجەلی خۆی دەروات.

٤٨- رزقو رۆزی لەخواوەیەو دەیدات بەبەندەکانی حەڵاڵ بێت یان حەرام.

٤٩- هەروەها شەیتان وەسوەسەو دڵە خورپە بۆ مرۆڤ دروست دەکات دەیخاتە گومانو هەڵەوە.

٥٠- پیاو چاکانیش لەوانەیە خوای گەورە نیشانەو کاریان لەسەر دەست بەدی بێنێتو کارو بارێکیان پێ بسپێرێت.

٥١- هەروەها سوننەت قورئان ناسڕێتەوە، چونکە قورئان لەخواوەیە.

٥٢- مناڵانیش ئەگەر مردن کاروباریان بەدەست خوایە ئەگەر بیەوێ سزایان دەدات یان بەویستی خۆی لەگەڵیاندا دەجوڵێتەوە.

٥٣- خوای گەورە زانایە بەوەی کەبەندەکانی دەیکەنو نوسیویەتی کەئەوە دەبێتو کاروبارەکان هەموو بەدەستی پەروەردگارن.

٥٤- هەروەها باوەڕیان بەئارامگرتن هەیە لەسەر بڕیارەکانی پەروەردگارو دەست گرتن بەوەوە کەفەرمانی پێ کردەوەو وازهێنان لەوەی کەقەدەغەی کردەوەو کارکردن بەدڵسۆزیو ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان، هەروەها پەرستش لەگەڵ پیاوچاکاندا بەدینداری دەزانن لەگەڵ ئامۆژگاری کردنی کۆمەڵێ موسڵمانانو دورکەوتنەوە لەتاوانە گەورەکانی وەك زیناو شایەتی درۆو دەمارگیریو خۆبەلزانینو خۆ هەڵکێشانو بەسوك سەیرکردنی خەڵكو لەخۆباییی بوون بەنارەوا دەزانن.

٥٥- هەروەها باوەڕیان بەپێویستی دورکەوتنەوە هەیە لەهەرکەسێك کەبانگەواز بکات بۆ بیدعە.

٥٦- هەروەها سەرقاڵبوون بەخوێندنەوەی قورئانو نوسینەوەی شوێنەواری پیاوچاکانو خوێندنو لێکۆڵینەوەی شەرع لەگەڵ خاکی بوونو رەوشتبەرزیو چاکەکاریو ئازارنەدانی

خەڵکیو وازهێنان لەغەیبەتو قسەهێنانو ئاژاوە نانەوەو وردبوونەوە لەخواردنو خواردنەوە بەپێویست دەزانن.

٥٧- ئەمە کۆی ئەو شتانەیە کەفەرمانی پێ دەکەنو باوەریان پێی هەیە، ئێمەش لەگەڵ هەموو ئەم شتانەداین کەوتویانە پشتو پەناشمان هەر پەروەردگارەو سەرەنجامیشمان هەر بۆ لای ئەوە[1]. ئەمە بیروباوەری پێشەوا ئەشعەرییە کەدواجار لەسەری جێگیربووو بۆ خۆی ئاشکرای کردووەو یەکێکیشە لەو شوێنە وارانەی کەپاش کۆچی دوای کردنی بەجێی هێشتو رۆڵێ هەبوو لەهۆشیارکردنەوەی نەوەی ئوممەتو پەروەردە کردنی لەسەر بنەماکانی ئەهای سوننەتو جەماعەت لەسەردەمی خوێندنگە نیزامییەکانی سەلجوقیەکاندا یان لەسەردەمی زەنکیو ئەیوبیو مەمالیكو عوسمانییەکاندا هەتاوەکو ئەمرۆ وەك دادگەری زانستیش (ئینصافی علمي) دەڵێین مەزهەبی ئەشعەری بەو شێوە نەمایەوە کەلەکاتی کۆچی دوای کردنی ئەشعەری دا لەسەری بوو بەجۆرێك کەجیاوازی لەچەندین مەسەلەدا تێ کەوت، لەبەناوبانگترین ئەوزانایانەش کەئیجتهادیان کردو جیاوازبوون لەگەڵ ئەشعەریدا لەچەند مەسەلەیەکدا، ئەبوبەکری باقلانیو ئیبن فورکو عبدالقاهری بەغدادیو بەیهەقیو قشەیریو جوەینیو غەزالیو هتد ئەمانە بەپلەی جیا جیا جیاوازیان لەگەڵیدا هەبووە، د. عبدالرحمن بن صالح المحمودیش هەستاوە بەبەدواداچوونی ئەم گۆرانکاریە بەوردەکاریەوە لەکتێبە بەنرخەکەیدا "موقف ابن تیمیة من الأشاعرة".

**کۆچی دوایی:** کۆچی کردنی پێشەوا ئەشعەری (رەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵی ٣٢٤ك دا بوو و لەبەغداش نێژرا، لەپرۆژەی الزوایا[2] لەکاتی بەخاکسپاردنی تەرمەکەشیدا هاواریان کرد: ئەمرۆ پشتیوانی سوننەت کۆچی دوایی کرد[3] ئەمە ئەو بیروباوەرە سوننییە بوو کەدەوڵەتی ئەیوبی لەسەری دەرۆیشت، هەروەها زانایانی سوننە هەستان بەپوچەڵکردنەوەی بیرۆکەی دەق (النص)[4] کەشیعەکان باوەریان پێی هەبووەو مەزهەبی خۆیانیان لەمەسەلەی ئیمامەتدا لەسەر بنیات نابوو پوچەڵی ئەم بیرۆکەشیان بەهەڵبژاردنی ئەبوبەکرو بەیعەت دانی موسڵمانان پێی لەرۆژی السقیفەدا

---

[1] اعتقاد أهل السنة أصحاب الحديث سرع حملة ماحكاه عنهم أبو موسى الأشعريء وقررقفى مقالاته. د.محمد عبدالرحمن الخميس ل١ هەتاوەکو ١٧١ دکتۆریش هەستاوە بەراڤەکردنی ئەم بنەمایانە.

[2] وفيات الأعيان (٤١٢/١).

[3] رجال الفكر والدعوة (١/١٥١).

[4] تێۆری دەق "النص": مەبەست پێی بوونی دەق لەپێغەمبەرەوە سەبارەت بەدەستنیشان کردنی ئیمامەکان گوایە دەق هاتووەو هەموو پێشەواکانی شیعەی دیاری کردووەو جگە لەوان کەس بۆی نییە ببێتە پێشەوا. وەرگێڕ.

سەلماند[1] لەهەمان کاتیشدا بانگخوازانی سوننە ڕەوابوونی دەسەڵاتی خەلیفە عباسی یە سونەکانیان دووپات دەکردەوە بۆ فەرمانڕەوایی کردنی هەموو وڵاتانی موسڵمان لەگەڵ ڕوون کردنەوەی ناڕەواییەکانی هزری شیعەی اسماعیلیو ئەو چەواشە کارییانەی کەتێیدایە، وێڕای ئاشکراکردنی ناڕاستی فاطمی بوونو سەر بەعەلی کوڕی ئەبی طالب بوونی ڕەچەڵەکیان.
ئەیوبییەکانیش سودیان لەسلجوقیو زەنکییەکانەوەو وەرگرت لەشێوازەکانی بڵاوکردنەوەی بیروباوەری سوننی ئیسلامی لەمیسرو سەرجەم ناوچەکانی دەوڵەتی ئەیوبیدا، بیروباوەری سوننی ئیسلامیو هۆکارەکانی بڵاوکردنەوە لەلایەکەوەو فیقهی شافعیش لەلایەکی ترەوە ئەودوو باڵەی بانگەواز سوننی بوو کەئەیوبییەکان بڵاویان کردەوە دوای ئەوەی دەوڵەتی شیعەی ئسماعیلیان لەناوبرد[2].

**لێکۆڵینەوە فیقهیەکان:** ئەیوبییەکان گرنگییەکی زۆریان بەم لقەی ڕۆشنبیری سوننی دەدا، ئەمەش لەڕێی ئەوخوێندنگە زۆرانەوە کەبنیاتیاننناو کردیان بەوەقف بۆ زانایانی مەزهەبێکی دیاریکراو یان وەقفی هاوبەش لەنێوان مەزهەبەکاندا، وەك ئەوەی لەخوێندنگەی الفاضلیةدا هەبوو کەوەقفو تایبەت کرابوو بۆ مەزهەبی شافیعیو مالکی، هەروەها خوێندگەی ظاهر یە حەلەب کەوەقف کرابوو بۆ شافعیو حەنەفیەکانو خوێندنگەی صالحیەش لەقاهیرە کە الصالح نجم الدین ئەیوب تەرخانی کرد بەچوار مەزهەبە فیقهیەکەی سوننە، بەڵام گرنگی دانی ئەیوبییەکان بەمەزهەبی شافعی زیاتربوو بەو پێیەی مەزهەبی فەرمی دەوڵەت بوو قەزاو دادوەریش لەسەر ئەو دەکراو سەرجەم ئەیوبییەکانیش پەیڕەویان لێ دەکردو کەسیان لەونەریتە بەدەرنەبوون جگە لە الملك المعظم عیسى ی کوڕی العادل کەحەنەفی مەزهەب بوو کوڕەکانیشی شوێنی کەوتن ئەمە سەرباری ئەوەی کەهەموو ئەوانەی کەپۆستە سەرەکیەکانی دەوڵەتی سەلاحەدینیان لەئەستۆ گرتبوو شافیعی مەزهەب بوون، ئەم کەسایەتیانەش وەك : القاضي الفاضل والعماد الآصفهاني ءبهاء الدين ی کوڕی شەداد، ئەمەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کەپێشتر ئاماژەیان پێدا کەنورەدینی حەنەفی مەزهەب زۆربەی پیاوەکانی شافعی مەزهەب بوونو زۆربەشیان دەرچووی خوێندنگە نیزامییەکان بوون، وەك قاضي كمال الدينی شارەزوریو ئیبن أبی عصرون[3] و خەڵکانی تر. ئەمانە ڕەگەزە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیری سوننە بوون کەدەزگا هزرییەکانی گرتبوویەوە لەسەردەمی ئەیوبییەکانداو هەروەها ئەیوبییەکان بایەخیان بەبڵاوکردنەوەو چەسپاندنی دەدا بەتایبەت

---

[1] تأريخ مصر زمن سلاگين بنى أيوب ل١٥٠.

[2] هەمان سەرچاوە ل١٣٦، ١٦٣.

[3] التأريخ اليساسي والفكري ل٢٤٤.

لەمیسردا، دەرەنجامی ئەوبارودۆخە مێژووییەی کەپیایدا تێپەربوو وەك ناوەندو پێگەی سەرەکی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلی، ئەوەبوو رەگەزەکانی رۆشنبیری سوننی قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەرو لێکۆڵینەوە فیقهیە سوننیەکان بنەماکانی بیروباوەری تیادا کۆبووبویەوە، پاشان لەمانە تێپەری کرد بۆ هەرشتێك کەخزمەت بەو رۆشنبیرییە بکات لەئەدەبو زانستەکانی زمان، بەڵام لێکۆڵینەوە ئەقڵیە فەلسەفییەکان پشکیان تیایدانەبوو، بەڵکو ئەو خەڵکانەی کەبەدوای ئەم جۆرە رۆشنبیرییەدا دەگەڕان بەشەرمەوە بەدوایدا دەگەڕان، بەهۆی خراپ سەیرکردنی سەرقاڵبوون بەم زانستانەوە لەناوەندو زانستیەکانی سوننەدا، هەروەك ئەوانەی کەسەرقاڵ بوون بەو زانستانەوە لەناوکۆمەڵدا پەسەندکراو نەبوون و لەناوەندە زانستیەکانی سوننەشدا رەتدەکرانەوە[1] نمونەش لەم بوارەدا زۆرە لەوانە ئەوەی کەسەلاحەدین رقی لەفەیلەسوف و موعطلیەو دەهریەکان بوو[2]، واپێدەچێت دژایەتی کردنی زانستە فەلسەفیەکان لەوژینگەدا دوو هۆکاری هەبووبێت:

**یەکەم:** ئەم هەڵوێستە کاردانەوەیەك بوو دژبە مەزهەبی شیعەکەبەشێوەیەکی بەرچاو پشتی بەفەلسەفە دەبەست لەپێکهێنانی بیروباوەڕەکانیو بانگەواز کردن بۆی، لێرەشەوە زانایانی سوننە دژی وەستان، چونکە باوەڕیان وابوو کە مەزهەبی سوننە رونو ئاشکرایەو خەڵك بەئاسانی لێی تێ دەگەن بێ ئەوەی پێویست بەپەنا بردن بۆ فەلسەفەو لۆژیك بکات وەك ئیبن صەلاح لەفتواکەیدا بۆی چوە[3].

**دووەم:** فەلسەفە رەونەقی خۆی لەدەست دابوو و پلەو پایەی جارانی نەمابوو بەتایبەت دوای ئەوەی کەپێشەوا غەزالی رەخنەکانی خۆی ئاراستە کرد لەکتێبی: تهافت الفلاسفة دا، هێشتا کاریگەری غەزالیش وزەوتینی خۆی لەدەست نەدابوو لەکۆمەڵگە سوننیەکان لەوسەردەمانی پاش کۆچی دوایی خۆیدا[4].

## چوارەم: زیندوکردنەوەی دەوڵەتی خەلافەتی عەباسی لەلایەن ئەیوبیەکانەوە:

دەوڵەتی ئەیوبی لەکۆتایی سەدەی شەشەمی کۆچیو سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیدا توانی دەسەڵاتی سیاسی خەلافەتی عەبباسی زیندوو بکاتەوە لەزۆرینەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، ئەوە بوو پاش لەناوبردنی خیلافەتی فاتمی لەمیسردا، لەلایەن ئەیوبیەکانەوە لەساڵی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٢٤٨.

[2] سيرة صلاح الدين ل١٠.

[3] الحياة العلمية في مصرء الشام ل٦.

[4] التأريخ السياسي و الفكرى للمذهب السني ل٣٥١.

٥٧٦ك/ ١١٧١ز دا توانجیان لەساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٣ز وڵاتی یەمەن ئازاد بکەن کەبەبەهێزترین‌و کۆنترین پێگەی بانگەوازی فاتمی دادەنراو توانیان ئەو بانگخوازە فاتمیە تیایدا لەناوبەرن کەبەعبدالنبی کوڕی مەهدی ناسرابوو، وتاریشیان بەناوی عەباسیەکانەوە خوێندەوە لەسەرمینبەرەکانی یەمەن‌و لەیەمەنیشەوە دەسەڵاتی خۆیان بڵاو کردەوە بەرەو دوو حەرەمە پیرۆزەکەی مەککەو مەدینەوە لەوێش توانیان وتار بەناوی خەلیفەی بەغداوە بخوێننەوە[1]. بەم پێیەش دەسەڵاتی رۆحی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بۆ خەلافەتی عەباسی گێڕایەوە چونکە پارێزەری هەردوو حەرەمە پیرۆزەکەیە دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر خەلافەتی فاتمی ئەم کارەی لەئەستۆ گرتبوو[2] هەندێ ئاماژەش هەن کەمێژوو نووسە میسری‌و یەمەنی شامیەکانی سەردەمی هاوچەرخەکانی ئازادکردنی یەمەن لەلایەن ئەیوبیەکانەوە[3] روونی دەکاتەوە کەئەم ئازادکردنە هەنگاوێکی ئایدۆلۆژی بووبۆلەناوبردنی بانگەوازی فاتمی، سەرەتا سەلجوقیەمان‌و دواتریش زەنکییەکان هەوڵیان بۆداو ئەیوەبیەکانیش جێبەجێیان کردو هەرگیزیش هەنگاوێك نەبوو بۆ جیاکردنەوەی ئەیوبییەکان لەنورەدین زەنکی[4]، لەکاتی ئازادکردنی یەمەنیشدا لەلایەن ئەیوبییەکانەوە سوربوون لەسەر هێنانی کتێبەکانی بانگەوازی سوننی لەگەڵ سوپاکانیاندا بۆ یەمەن‌و کارکردن بۆ بڵاوکردنەوەی لەوڵاتی یەمەندا، ئەمەش بۆ لەناوبردنی کتێبەکانی بانگەوازی شیعە لەوێدا، وەك کتێبەکانی موعتەزیلەو زەیدی‌و فاطمیەکان کەهێنرابوو بۆ وڵاتی یەمەن لەوڵاتی دەیلەمەوە لەسەردەمی پێشەوا زەیدییەکانی یەمەن‌و لەسەردەمی دەسەڵاتی فاطمیدا لەوڵاتی یەمەن[5]، لەلایەکی تریشەوە ئەوروپییەکان هەوڵیان دەدا بۆ لکاندنی مەغریبی ئیسلامی بەمیسرەوە دەرهێنانی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی موەحیدین بۆ بەرژەوەندی عەباسیەکان، هەروەها سەلاحەدین سوربوو لەسەر رێزگرتنی خەلیفەکانی عەباسی‌و ئەم رێبازەشی درێژە پێدانی رێبازی نورەدین بوو کەکوڕەزاکەی ابن الجوزی وەسفی دەکات بەوەی کە : گوێڕایەڵی خەلیفەی بەدینداری دەزانی[6]. ئەم رێزگرتنەشی هەڵقوڵاوی باوەڕبوونی بوو بەپێویستی گوێڕایەڵی کردنی خەلیفەکانی عەباسی، ئەمەش بەروونی لەیەکێك لەنامەکانی القاضي الفاضل دا بۆ خەلیفە ناصر دەردەکەوێت

---

[1] رحلة ابن جبير ل ٧٣ تأريخ مصر الاسلامية زمن بني أيوب ل١٨٣.

[2] النفوذ الفاطمي في جزيرة العرب، جمال سرور ل١٨٣.

[3] تأريخ مصر زمن بني أيوب ل١٨٣.

[4] تأريخ مصر زمن بني أيوب ل١٨٣.

[5] تأريخ مصر زمن بني أيوب ل١٨٣.

[6] مراة الزمان (٢١٣/٨) التأريخ السياسي والفكري ل٢٥١.

دوای دەستگرتنی سەلاحەدین بەسەر حەلەب دا کەتیایدا هاتبوو: ئەم سێ مەبەستە: جیهادوتێ کۆشان لەپێناو خواو نەهێشتنی ستەمکردن لەبەندەکانی خواو، گوێرایەڵیکردنی خەلیفە بریتین لەمەبەستەکانی خزمەتگوزار ئەگەر ئەو وڵاتەی بۆ ئازادکراو، دەسکەوتێکی دونیاییە ئەگەر ببیەخشێ، خوای گەورەش دەزانێ کەئەو بۆ ژیانێکی خۆشترنە ئەجەنگاو مەبەستی تەنها ئەو کارانەیە کەبەپێویستی دەزانین[1].

کاتێکیش خەلیفە الناصرلدین الله گلەییەکی ئاراستەی سەلاحەدین کرد سەبارەت بەوەی کەچۆن نازناوی الملك الناصری لەخۆناوە لەکاتێکدا کەئەوە نازناوی ئەمیری باوەڕداران‌و خەلیفەیە، ئەویش دکەسێکی ناردە لای‌و پۆزشی بۆ هێنایەوە بەوەی کەئەو کارەی لەسەردەمی خەلیفە المستضیئ دا بووە‌و ئێستاش ئەگەر خەلیفە نازناوێکی تری بۆ دیاری بکات ئەوە لاری نیەو وازلەنازناوی پێشووی دێنێت، بەم شێوەیە زۆر بەئەدەب بوو بەرامبەر بەخەلیفە[2] و ئەیوبیەکانی تریش هەمان ڕێبازیان بەرامبەر بەخەلیفەکان پەیڕەو دەکرد[3].

**پێنجەم: پاراستنی ڕێگای حەج‌و دوو حەرەمە پیرۆزەکە لەلایەن سوڵتانەکانی ئەیوبییەوە:**

سلجوقیەکانی ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لەگەڕاندنەوەی دەسەڵاتی عەباسیەکان بۆ حیجازو دەرهێنانی شوێنە پیرۆزەکان لەژێر ڕکێفی دەوڵەتی فاتمی شیعە، لەسەردەمی نورەدین یشدا هەوڵی زۆریدا بۆ چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی مەککەو مەدینەو سەربازانی نارد بۆ پاراستنی مەدینەی پیرۆزو شوراو حەساری مەدینەی تەواو کردو بیرێکی بۆ لێداو بڕێکی باش پارەی دانا بۆ ئەمیرە عەرەبەکان بۆ پاراستنی ڕێگای نێوان حیجازو دیمەشق‌و هەروەها پارەشی بڕیەوە بۆ ئەمیری مەککە، سورای مەدینەشی تەواوکردو کارێزێکی بۆ لێدا.بۆیە پاش خەلیفەی عەباسی ناوی ئەویش لەوتاری هەینی دا دەبراو دوعای خێری بۆ دەکرا[4]، زانیاریەکی زۆرگرنگیش هەیە کەبایەخێکی زۆری هەیە بۆ لێکۆڵەری مێژووی بنەماڵەی ئەییوبی، بریتییە لەوەی کە وەرگرتنی پۆستی ئەمیری حاجیەکانی شام لەلایەن دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیەوە لەسەردەمی نورەدین دا گرنگترین هۆکار بوو بۆبەهێز بوونی ئەم بنەماڵە خاوەن خولیایە، ئەمەش لە ساڵی ٥٥١ك / ٥٥٦ز لەسەردەمی نورەدین دا دەستی پێ کردو پاش ئەویش أسدالدین شێرکۆی برای ئەم پۆستەی لەئەستۆگرت کەباسی ئەوە دەکات کاتێ چوەتەلای نورەدین زەنکی وەك ئەمیری حاجیەکان لەدیمەشقەوە

---

[1] كتاب الروضتين (٤٨/٢) التأريخ السياسي والفكري ل٢٥١.

[2] حسن المحاضرة (٢٠/٢) طبقات الشافعية (٤ ٣٤١).

[3] حسن المحاضرة (٢٠/٢) طبقات الشافعية (٤ ٣٤١).

[4] الذهب المسبوك له تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٣.

ناردویتی[1]. هەروەها شێرکۆ لەژیانیدا پارەیەکی زۆری بەخشیوە لەپێناو بەرپاکردنی دروشمو سروتە دینیو خێرخوازیەکان لەدوو حەرەمە پیرۆزەکەدا بەهاوکاری وەزیر جمال الدینی وەزیری فەرمانڕەوای موسڵ، هەروەها وەسیەتی کرد بۆ هاوڕێکەی کەلەتەنیشت مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەمەدینە دابینێژن[2].

پاشاکانی ئەیوبیش مکوربوون لەسەر بەدیهێنانی ئەم ئاواتو وەسیەتە، بۆیە هەستان بەگواستنەوەی روفاتی نەجمەدین ئەیوبو شێرکۆی برای دوای بەخاکسپاردنیان لەمیسرداو سەرلەنوێ لەمەدینەدا بەخاکیان سپاردن بەپێی وەسیەتی خۆیان[3]، هەروەها دەسەلاتو هەژمونی حیجاز لەسەردەستی سوڵتانو پاشاکانی دەوڵەتی ئەیوبی بەردەوام بوو، ئەم دەسەلاتەش خۆی لەگەڕانەوەی خوێندنی وتار بەناوی خەلیفەی عەباسی لەکەعبەدا لەلایەن ئەمیری مەککەو سوڵتانی ئەیوبی فەرمانڕەوای میسرو پاشای یەمەنەوە کەبەهەمان شێوە ئەیوبی بوو، ئەمەش سەرباری ئەنجامدانی ڕێورەشمەکانی خەلیفە لەرێورەسمەکانی هەریەك لەئەمیرەکانی مەککەو مەدینە بەهاوڕێیەتی ئەمیری حاجیەکانی عێراق، هەروەك مەراسیمی لەسەر کارلابردنی ئەمیری مەدینەو مەککە یان جێگرەکانیان لەتەنیشت مزگەوتی پێغەمبەردا د.خ دەخوێنرایەوە[4]. هەروەها ناردنی پۆشاکی کەعبە هەمووساڵێك بەدروشمی عەباسییەکانەوەبوو، کەبریتی بوو لەقوماشێکی رەش کە بەسوور نەخشێنرابوو ناوی خەلیفەو چەند دەستەواژەیەکی لەبەرزەوەندی ئەو تیابوو[5]، هەروەها خەلیفەی عەباسییەکان ئاوەدانکردنەوەی کەعبەو مزگەوتی پێغەمبەریان د.خ گرتبووە ئەستۆو مافی بەرزکردنەوەی ئاڵاش لەعەرەفەدا پارێزراوبوو بۆ خەلیفەی عەباسی[6]، بۆ دووپاتکردنەوەی سەرپەرشتیاری خەلیفەی عەباسی بۆ حەرەمی مەککە ئەمیری حاجیەکانی عێراق خۆی ساڵانە مەراسیمی پۆشتەکردنەوەی کەعبەی ئەنجام دەدا[7]، هەروەها جبەی خەلیفەش رەش بوو وەك هێمایەك بۆ عەباسییەکان لەبەغداشەوە دەنێردرا بۆ حەرەمی مەککە- کەعبە- هەتاوەکو ئەمیر

---

[1] تأريخ مصر الاسلامية زمن سلاطين بنى أيوب ل ٢٠٤.

[2] مرآة الزمان (٨/٣٥٠) تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٤.

[3] مرآة الزمان (٨/٣٥٠) تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٤.

[4] مرآة الزمان (٨/٣٥٠) تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٤.

[5] تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٥.

[6] النجوم الذاهرة (٦/١٠٥) تأريخ مصر الآسلامية ل٢٠٥.

[7] تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٦.

لەبەری بکات لەکاتی وتاری هەینیدا، وەك هەموو ئەو وتاربێژانەی کەسەر بەدەوڵەتی عەباسی بوون بەپێی قسەی ئیبن جبیر[1].

١- **سەلاحەدینی ئەیوبی حزمەتگوزاری هەردوو حەرەمی پیرۆز:** سەلاحەدینی ئەیوبی لەنورەدین زەنکی مامۆستایەوە پۆستی سوڵتانی بۆ مایەوە لەگەڵ ئەو پەیامەدا کەنورەدین هەیبوو خۆی لەیەکخستنی بەرەی ئیسلامی دا دەبینیەوە. دژ بەداگیرکەران لەرێگەی زیندوکردنەوەی خەلافەتی عەباسیو سەرخستنی بانگەوازی سوننیەوە. هەروەها رێکخستنو مسۆگەرکردنی رێگەی حەجیشی لەمامۆستاکەیەوە بۆ مایەوەو فەرمانیدا بەهەڵوەشاندنەوەی ئەو باجەی کەلەجدە لەکەناری دەریای سوردا لەحاجیان وەردەگیرا، لەبری ئەوەش سالانە هەشتا هەزار ئەردەب گەنمی بۆ ئەناردن بەدەریادا. هاوشێوەی ئەوەش بۆ خەڵکی مارستان ئەنێردرا لەمەککە ئەمە جگە لەوەی چەند وەقفێکی بۆ حاجییەکانو هەردوو شوێنە پیرۆزەکە دانابوو[2]، بۆ کڕینی پێداویستیو ئازوقە بۆیان لەکاتی حەجدا[3]. هەروەها چەند ناوچەیەکی تەرخان کرد لەصعیدی میسرو یەمەندا بۆ ئەمیری مەککە[4]، بەهەمان شێوە لەصعیدی میسردا ناوچەیەکی بۆ ئەمیری مەدینە- مجازو مناڵەکانی دابین کردبوو کەلەسەرچاوە ئەیوبییەکاندا باسنەکراوە، هەرچەندە بەڵگە نامەکانی دادگای شەرعی دووپاتی ئەکەنەوە لەچەند تۆمارگەیەکدا کەهەتاوەکو ئەمڕۆ پارێزراون لەتۆماری"مصلحة الشهر العقاري"[5]. هەروەها سەلاحەدین هەموو ئەوانەی هەڵگرت بەلابردنی باجەکان کەچەند باجێکی ناشەرعی بوو لەبازرگانەکان کۆدەکرانەوە بۆ ئاسانکردنی رێگای حەجو رێخۆشکەری بۆی دوای ئەوەی کەحاجییەکان نەیاندەزانی فەرزی حەج بەجێ بێنن[6] هەموو ئەو خزمەتە گەورانەی کەسەلاحەدین پێشکەشی کرد بەحاجیانی ماڵی خوا وای کرد کەببێتە پارێزەری هەردوو حەرەمە پیرۆزەکەو یەکێك لەسەرکردە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی[7]. ئاشکراشە کەجیهانی ئیسلامی کاریگەربوو بەهەوڵەکانی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٠٦.

[2] مرآة الزمان(٣٣٨/٨) تأريخ مصر الاسلامية ل٢٠٧.

[3] تأريخ مصر الأسلامية ل٢٠٧ رحلة ان جبير ل٣٠-٣١.

[4] هەمان سەرچاوە ل٢٠٧.

[5] هەمان سەرچاوە ل٢٠٨.

[6] هەمان سەرچاوە ل٢٠٨.

[7] هەمان سەرچاوە ل٢٠٩.

سەلاحەدین بۆیە کاتێ کەدوعای بۆدەکرا لەسەر مینبەرەکانی مەککەو مەدینە دوای خەلیفەی عەباسی هەموو زمانەکان ئامینیان بۆ دەکردو لەهەموو شوێنێکەوە، ئەگەر خوای گەورەش رۆژێ بەندەیەکی خۆش بوێت، خۆشەویستی دەخاتە دڵی خەڵکەوەو ئەوەش مافی سەلاحەدین بوو بەسەریانەوە لەبەر ئەو گرنگییە زۆرەی کەپێی دەدانو هەڵگرتنی ئەو باجە زۆرانە لەسەریان[1]. هەروەها ئیبن جبیر دوای باسکردنی نزاکردنی وتار بێژ بۆ سەلاحەدین ئەڵێ: سەلاحەدین خاوەن کاری بەناوبانگو پلەو پایەی بەرزە، هەرکاتێ نزای بۆ بکرایە دەنگی ئامین لەهەردوو حەرەمەکەوە بەرزدەبویەوە دڵی دڵسۆزو نیەتی راستگۆیانەش کە پڕ لەملکەچیو خشوع بوون پیشتگیری ئەم زمانەیان دەکرد ئەمەش بەهۆی ئەو ستایشە جوانەوە بوو کەخوا بەم سوڵتانە دادپەروەرەی بەخشیبوو لەگەڵ ئەو خۆشەویستیەی کە لەدڵێ خەڵکیدا بۆی دانابوو، دیارە بەندەکانی خواش شایەتەکانی خوان لەسەر زەویدا[2].

ئیبن جبیر ئەڵێ: بیستمان کەنامەی سەلاحەدین گەیشتوە بەئەمیر مکثر، گرنگترین شتیش تیایدا بریتی بوو لەئاراستەکردنی حاجیانو جەخت کردنەوە لەسەر بەدەمەوە بوونو خۆشگوزەرانییانو هەڵگرتنی ئازارو دەستدرێژی لەسەریانو خزمەتگوزارو شوێنکەوتوانیش بۆ ئەمە ئاگادار بکرێنەوە، هەروەها ووتی: ئێمەو ئێوە بەبەرەکەتی ئەو حاجیانە دەژین،سەیری ئەو پلە بالاو مەبەستە پیرۆزە بکە چەند گەورەیەو بشزانە فەزڵی خوای گەورە لەزیادبووندایە بۆ هەر کەسێك کەچاك بێت لەگەڵ بەندەکانیدا، چاودێری پەروەردگار پەیوەستە بەو کەسانەی کەخەمو خولیایان خزمەتی بەندەکانیەتی، خوای گەورەش پاداشتی چاکەکاران مسۆگەر دەکات[3]. لەراستیدا سەڵاحەدین کەمتەرخەمی نەنواند لەزامنکردنی رێگەی حەجو ئاسانکردنی بۆ حاجیانی ماڵی خواو بەردەوام بوو لەسەر نامەنووسین بۆ ئەمیری مەککەو داوای چاودێریکردنو هاوکاری کردنی حاجیان لەکاتی گەشتنیان بۆ حەرەمی مەککە[4]، هەروەك پێش ئەویش ئەمیری بەرقەنامەی بۆ نوسیو وەسیەتی بۆکرد کەئاگای لەحاجیانی مەغریبو ئەندەلوس بێت لەکاتێکدا کەبەمیرنیشینەکەیدا تێ پەڕدەبن[5]، هەروەها بایەخی بەگۆرینەوەی نێردراوو وەفدی دۆستانە

---

[1] رحلة ابن جبیر ل٧٣ تأریخ مصر الأسلامیة ل٢١٠.

[2] هەمان سەرچاوە ل٨٠ تأریخ مصر الاسلامیة ل٢١٠.

[3] رحلة ابن جبیر ل٧٤.

[4] تأریخ مصر الأسلامیة ل٢١٠.

[5] تأریخ مصر الأسلامیة ل٢١٠.

دەدا لەگەڵ ئەمیری مەدینەی پیرۆزداو ڕێزی لەنێردراوەکانی دەگرت و شانازی بەدیاریەکانیانەوە دەکرد. چونکە لەلایەن ئەمیری مەدینەی پێغەمبەر ﷺ ەوە هاتووە[1].

**٢- پاراستنی ڕێگای وشکانی حاجیانی مەغریبو میسرو ئەندەلوس لەلایەن سەلاحەدینەوە:**

خاچپەرستەکان دەرکیان بەمەترسی فەریزەی حەج کرد وەك پایەیەکی سەرەکی لەپایەکانی ئیسلام کەیەکێتی ڕۆحی بۆموسڵمانان بەدی دێنێتو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیو هزریەکان لەنێوانیاندا توندوتۆڵ دەکات ئەم پەیوەندیانەش هەستی خۆشەویستیو ئینتیمایان بۆ یەك ئوممەتو کیانی کۆمەڵایەتییەتیان بەهێز دەکات بۆیە دەستیان دایە هێرش کردنە سەر کاروانەکانی حەجو بازرگانی میسر کەبەبیابانی سیناو ڕێگای بەناوبانگی حاجیاندا تێپەردەبوو، پاش دەست بەسەراگرتنیان، تالآنیان دەکردن[2] ئەمەش بووە هۆی پەککخستنی ڕێگای وشکانی ئەو حاجیانەی کەلەمیسرو مەغریبو ئەندەلوسەوە دەهاتنو ناچاریان دەکردن هەتاوەکو ڕێگایەکی دور بگرنە بەر کەلەئەسکەندەریەوە دەست پێ دەکات هەتاوەکو فنسطاطو پاشان بەشاری قوص ی صعیدی میسردا تێپەر دەبێو پاشان بیابانی عیزابیان دەبڕیو هەتاوەکو دەگەشتنە مینای عیزاب لەکەنار دەریای سور لەوێشەوە سواری کەشتی بچووك دەبوون کە بە "الجلاب" ناسرابوو هەتاوەکو مینای جددە، ئەم کەشتەش زۆر دورو درێژو گران بوو و حاجیەکان بەدەستییەوە دەیان ناڵاند[3]، بڕینی ڕێگای وشکانی حەجیش لەلایەن خاچپەرستەکانەوە دوای داگیرکردنی قەڵای الکرك بوو، ئەمەش وای کرد کەگێڕانەوەی قەڵای الکرك یەکێك بێت لەئامانجەکانی نورەدین زەنکیو[4]، پاش ئەویش سەلاحەدینی ئەیوبی کاتێ جێنشینی بوو لەمیسردا پێش ئەوەی میرنشینەکەی بۆ یەکلا ببێتەوە، بۆیە نورەدین دەستی کرد بەگەمارۆدانی الکرك واتە لەیەك کاتدا لەشامو میسرەوە گەمارۆی دابووو خەریك بوو بیگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی کاتێ سەلاحەدین بووە سوڵتانی میرنشینەکەو دەسەڵاتی بۆ یەکلا بویەوە الکرکی کردە ئامانجی یەکەمو هێرشی خۆی بۆ سەر فرەنجەکان درێژەپێدا هەتاوەکو دەست بگرێت بەسەر ڕێگای کاروانو بازرگانی نێوان میسرو شام کەبەسینادا تێپەردەبوو و ڕێگای وشکانی حەجی میسر مسۆگەر بکاتەوە دوای داخرانی گومانیش لەوەدا نییە کەشاڵاوی دەریای ئەرناط بۆ سەر دەریای

---

[1] صبح الأعشى (٥٩/١-٦١)تأريخ مصر ل٢١٠.

[2] مرأة الزمان (٤٥١/٨بۆ ٤١٦).

[3] رحلة ابن جبير ل٣٨-٥٣.

[4] الباهر ل١٥٨ تأريخ مصر الأسلامية ل٢١٢.

سورو هەوڵدانی بۆ گەشتن بە زەوییەکانی حیجازو فڕاندنی جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەزانیاری تەواوی هەبووە دەربارەی گرنگی حەجکردنی موسڵمانانو رۆشتنیان بۆ زیارەتی مەدینەی پیرۆزو مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، بەلام سەرکردەی گەشتیگەلی میسری "لۆلۆ" کەمتەرخەمی نەنواند لەبەدیل گرتنی فرەنجەکانو هێنانیان بۆ قاهیرەو بەشێوازێکی پڕ سوکایەتی وەك ئیبن جبیر بۆمان باس دەکات پاشان لۆلۆ هەندێ لەو دینەی نارد بۆ مەدینەی پیرۆزو لەوێ سەربڕدران[1]، کەواتە سەیرنییە کەنازناوەکانی "خزمەتگوزاری دوو حەرەمە پیرۆزەکە"و "رزگارکەری بەیتولمەقەدیس لەدەست هاوەڵگەران" بەخشراوە بەسەلاحەدین[2]. ئەوەی کەعیمادی ئەسفەهانی مێژوو نوسی سەلاحەدین ئەیلێت کەزامنکردنی رێگەی حەج بۆ مەککە گرنگترین پاڵنەری سەلاحەدین بوو بۆ ئازادکردنی بەیتولمەقەدیسو سەندنەوەی لەدەستی خاچپەرستەکان ئەمەش باشترین بەلگەیە لەسەر ئەو بایەخە زۆرەی کەجسهانی ئیسلامی دەیدا بەزامنکردنی رێگەی حاجیە موسڵمانەکان بۆ مەککەو سوربوونی ئەیوبیەکان لەسەر بەئەنجام گەیاندنی ئەو کارە[3].

٣- **سەرپەرشتی کردنی راستەوخۆی وەزری حەج لەلایەن پاشاکانی ئەیوبییەوە:** پاشاکانی ئەیوبی بەردەوام بوون لەسەر پاراستنی رێگەی حەجو زامنکردنیو پاراستنی لیوای حەجی عێراقی کەنوێنەرایەتی دەسەڵاتی رۆحی خەلیفەی دەکرد لەجیهانی ئیسلامیدا، ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەیوبییەکانی یەمەندا بوو هەتاوەکو سەلاحەدین لەژیاندابوو، پاش کۆچی دوایی سەلاحەدینیش سوڵتانی میسر لەهەردوو حەرەمەکەدا وتاری دەدا[4]. ئەوەبوو لەساڵی ٥٨٣ك ١١٨٦زدا سیف الاسلام طشتكين ی پاشای یەمەن گەشتە کەعبە هەتاوەکو رێگری لەبانگی شیعانە بە "حي على خير العمل" بکاتو رێ لەو کۆیلانە بگرێت کەسەر بەئەمیری مەککەنو حاجیان ئەبەن، هەروەها بۆ داواکردنی کلیلی کەعبە لەئەمیری مەککە، هەتاوەکو خۆی ببێتە پارێزەری کەعبە بەشێوەیەکی فیعلی ئەمەش دوای ئەوە هاتبوو کەئەمیری مەککە هەوڵی داخستنی دەرگای کەعبەو سپاردنی کلیلەکانی بەخزمەتگوزارانی لەبنی شیبەدا بوو کەپێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەی کردوە کەبەدەستیانەوە ئەمێنێتەوە تارۆژی قیامەت هەتاوەکو طشتكين ناچار بکات بەگەرانەوە بۆ ئەوەی داوای کلیلی کەعبە بکات،

---

[1] مفرج الكروب (٢/١٢٧-١٣٢).

[2] النوادر السلطانية له تأريخ مصر الأسلامية ل٢١٣.

[3] الفتح، العماد الأسفهاني ل١٩١، تأريخ مصر الأسلامية ل٢١٣.

[4] رحلة ابن حبير ل٨٠.

ئەوەبوو طشتکین هەڕەشەی ئەوەی کرد کەبەزۆر دەبیات بۆیە ئەمیری مەککە ملکەچ بوو کلیلەکانی رادەستی طشتکین کرد، ئەویش هەستا بەگێڕانەوەی بۆ بنی شیبە[1]، ئەوەی کەبایەخدانی ئەیوبییەکان بەوەرزی حەج دووپات ئەکاتەوە ئەویە کەنوێنەرانی نوسەرانی سەلاحەدین باسی ئەکەن کەچەند ڕێوڕەسمێکی تایبەتی داناوە بۆ پێشوازی کردن لەکاروانی حەجی شام، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کەلەدیمەشقدا نیشتەجێ بوو، ئەوەبوو سەلاحەدین جلو بەرگی سەربازی دەپۆشیو لەفیستیفاڵێکی گشتیدا بەشەقامەکانی دیمەشقدا دەگەڕا[2]. ئەگەر چی مێژوونوسان تێبینیی ئەوەیان کردووە کەهیچ یەکێك لەسوڵتانە ئەیوبییەکانی میسر حەجی نەکردووە بەهۆی سەرقاڵبوونی بەردەوامیان بەتێکۆشانو جیهاد دژ بەخاچپەرستەکان، بەڵام لەئەیوبییەکانی یەمەن الملك المعظم شمس الدولة تورانشاه برای سەلاحەدینو رزگارکەری یەمەنو یەکەمین پادشا تیایدا[3] حەجی ئەنجام داوە، پاشان الملك المسعود ناسراو بەباقسیس کوڕی الملك الكاملی سوڵتانی میسر[4]، حەجی کردووە، لەئەیوبییەکانی شامیش الملك المعظم عیسی کوڕی العادل أبی بکر فەرمانڕەوای دیمەشقو الملك الناصر داودی کوڕی المعظم عیسی فەرمانڕەوای الكرك حەجیان کردووە[5].
ئەیوبییەکانی لەسەردەمی سەلاحەدینەوە شەرەفی پاراستنی فەریزەی حەجو سەرپەرشتی کردنی هەردوو حەرەمی پیرۆزو پشتیوانیکردنی هەژموونی سیاسی ئەمیری لیوای حەجی عێراقی بەسەر وڵاتی حیجازدا لەئەستۆ گرتووە، هەروەها سوڵتانی ئەیوبی بوو بەپارێزەری بانگەوازی عەباسیو کاری کرد بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازیان لەسەرجەم وڵاتانی ئیسلامیدا چ لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی فاطمیدا یاخود دەسەڵاتی دەوڵەتی موحیدەین لەمەغریبدا، لەسەروو ئەوەشەوە لەو ناوچانەی شام کەهێشتا لەدەست خاچپەرستەکان نەسەندرابوویەوە، گومانیش لەوەدانییە کەهەستانی یەکلاکەرەوەی سوڵتانە ئەیوبییەکان بەلەئەستۆگرتنی ئەرکی بانگەوازی عەباسیو پاراستنی خەلیفەی عەباسیو پابەندکردنی پاشاکانی دەوروبەر بەگوێڕایەڵیکردن شوێنکەوتنی، پاڵپشتێکی شەرعی بوو بۆ دەسەڵاتی

---

[1] مرآة الزمان(٣٣٨/٨) تأريخ مصر الاسلامية ٢١٣.

[2] النوادر السلطانية له تأريخ مصر الأسلامية ل ٢٢٦.

[3] الذهب المسبوك ل٧٠-٧٣، تأريخ مصر ل ٢٢٧.

[4] تأريخ مصر ل ٢٢٧.

[5] الذهب المسبوك ل٧٦-٧٩.

ئەیوبییەکان‌و سەرکردایەتی سیاسی لەجیهانی ئیسلامیدا پێ بەخشین[1]، شایەنی باسە یەکەمین سوڵتانی سوننی کەهەستا بەپاراستنی فەریزەی حەج پێش نورەدین زەنکی‌و شاگردە ئەیوبییەکانی، بریتی بوو لەسوڵتان مەحمودی غوزنەوی یەکەمین سوڵتانی سوننی‌و کۆنترینیان لەمێژووی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا[2]، پاشان سەلجوقیەکان بوونە میراتگری دواتر سوڵتان مەلیکشای سەلجوقی کەیەکەم کەسێك بوو هۆکارەکانی پاراستنی ئەم فەریزەی بۆ سوڵتانەکانی دوای خۆی دیاریکرد ئەوەبوو حەوزی ئاوی نا لەسەر رێگای حیجاز بنیاتناو باج‌و سەرانەکانی پێشوازی حەجی هەڵگرت‌و لەبری ئەوە پارەی بڕیەوە بۆ ئەمیرەکان کەپێش ئەوە لەهەر حاجییەك حەوت دیناری ئاڵتونیان وەردەگرت، هەروەها بەخشیشی زۆری دابەدانیشتوانی دەوروبەری کەعبەو عەرەبە بیابان نشینەکان[3].

**شەشەم: روبەروبوونەوەی شیعەگەری لەلایەن ئەیوبییەکانەوە لەمیسرو شام‌و یەمەندا:**

ئاسان نییە مەزهەبێك لەمەزهەبەکان بەگۆڕینی سیستمێکی سیاسی لەوڵاتێکدا ڕیشە کێش بکرێت، بەڵکو ئەوە پێویستی بەگۆڕانکاری چەند ساڵەو گرتنەبەری رێوشوێنی جۆراوجۆر هەیە نەك هێزی زۆر، وەك تێبینیش دەکرێت سەلاحەدین چەند شێوازێکی گرتەبەر بۆ لەناوبردنی بانگەوازی فاطمی لەمیسردا هەندێ لەو شێوازانە توندوتیژی‌و یەکلا کردنەوەی راستەوخۆی پێوە دیاربوو، لەهەندێکی تریشیدا شێوازی فێڵ‌و پلەبەندی گرتەبەرو هێزی سەربازیشی لەهەندەکەی تریدا بەکارهێنا لەهەمان کاتدا لەهەندێ شێوازی تریشدا رێگەی بانگەوازو فێرکردن‌و پێ سەلماندنی گرتەبەر لەگەڵ ڕاکێشانیان لەرێی دامەزراوە کۆمەڵایەتی‌و ئاینییە خێرخوازییەکان‌و ئەومالّ‌و موڵکەی کەبۆی وەقف دەکرێت[4]القاضي الفاضليش رۆڵی دیاری هەبوو لەدانانی ئەم ستراتیژیەدا، باسی ئەم شێوازانەشم لەباسی رووخانی دەوڵەتی فاطمیدا کردووە کەیەکێك لەگرنگترین هۆکارەکانی: لاوازکردنی خەلیفە عاضدی فاطمی‌و دامەزراندنی پلەو پایەو شکۆی کۆشکی دەوڵەتی فاطمی‌و نەهێشتنی نوێژی هەینیان لەمزگەوتی ئەزهەرداو هەڵوەشاندنەوەی خوێندنی مەزهەبی فاطمی‌و سوتاندنی سەرچاوەو کتێبەکانی شیعەی ئیسماعیلی‌و نەهێشتنی هەموو جەژنە مەزهەبییەکان‌و سڕینەوەی باج‌و مامەڵەنەکردن بەدراوی فاطمی‌و بوارنەدان بەدەرکەوتنی ئەندامانی خێزانی فاطمی‌و لاوازکردنی پایتەختی دەوڵەتی فاطمی‌و زیندو کردنەوەی باسی

---

[1] تأريخ مصر الأسلامية ٢٣٢.

[2] تأريخ مصر الاسلامية ل٢٣٢.

[3] تأريخ مصر الاسلامية ل٢٣٢.

[4] تأريخ مصر الاسلامية ل١٨١.

ساختەکراوی رەچەڵەکی فاطمیو راست نەبوونی ئەوەی کەوەچەی پێغەمبەرن ﷺو بەردەوامبوون لەراوەدونانی پاشماوەی شیعەگەری لەشامو یەمەندا[1] وادیارە شیعەو لایەنگرانی فاطمیەکان لەمیسردا هەڵهاتبوون بۆ صعیدی میسرو لەدەروبەری یەکێك لەئەمیرە دڵگەرمەکانی دەوڵەتی فاطمیدا کۆبونەوە کەنازناوی کنز الدولەتی لێنرابوو، بەڵام سەلاحەدین الملك العادل ی برای بەهێزێکەوە ناردو توانی لەناویان بەرێت[2]، ئەوەبوو دەوڵەتی ئەیوبی بەتوندی روبەرووی ئەو هەوڵانە دەبویەوە کەدەدران بۆ گەڕانەوەی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی بۆ میسرو بەردەوامیش بوون لەسەرخشتنی بیروباوەڕی سوننەو لەناوبردنی کەلەپوری شیعەی ئیسماعیلیو راوەدونانیو لایەنگرانیان لەقاهیرەو صعیددا بەڕادەیەك کەس نەیدەوێرا خۆی ئاشکرا بکاتو دواجار ئەم مەزهەبە لەمیسردا لەناوچوو[3]. پاشان لەشامو یەمەنیشدا بەردەوامبوون لەڕاوەدونانی شوینکەوتواندا هەتاوەکو توانیان لەیەمەنو شامیشدا ئەم بانگەوازە لەناوبەرنو ئەو هەنگاوانەیان بەکۆتاگەیاندن کەخەزنەویو سەلجوقیو زەنکییەکان دەستییاندایە بۆ روبەروبونەوەی بانگەوازی شیعەی ئیسماعیلیو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی سوننی لەئێرانو شامدا[4]. لێرەشەوە ئیسماعیلییەکان تێگەیشتن کە ئەو کارەساتەی کەبەروخانی دەوڵەتی فاطمی توشیان بوو هەرگیز کارەساتی وایان لەسەردەستی سوڵتانە غوزنەویو سەلجوقییەکان توش نەبووبوو، چونکە دەوڵەتی فاطمی گەورەترین دەوڵەتی شیعە مەزهەب بوو کەلەمێژوودا دروستبووبێتو توانیبێتی دەستبگرێت بەسەر خەلافەتداو خەریك بوو هەموو جیهانی ئیسلامی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە کاتێك کەلەبەغدا وتاریان بەناوەوە دەخوێنرایەوە لەساڵی ٤٥٠ك/١٠٥٨زدا[5]. لێرەشەوە سەیر نییە ئەگەر شیعە ئیسماعیلیەکان وەك روخێنەری دەوڵەتەکەیان بۆ سەلاحەدین بڕوانن[6] بۆیە قەڵەمە شیعەکان بەدرێژای مێژوو ماندو بێزارنەبوون لەشێواندنی ژیاننامەی الناصر سەلاحەدین. بەم شێوەیە شیعەگەری رۆژبەرۆژ لەمیسردا لاوازدەبوو هەتاوەکو خەریکبوو بەتەواوی لەوڵاتدا نەمێنێتو میسر بووە پەیڕەوکاری مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەت.

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٥٣بۆ ٧٧.

[2] تأريخ مصر الاسلامية ل٧٥.

[3] تأريخ مصر الاسلامية ل٧٧.

[4] تأريخ مصر الاسلامية ل٧٨.

[5] تأريخ مصر الاسلامية ل٧٥.

[6] تأريخ مصر الاسلامية ل٧٧.

**حەوتەم: لەو هۆکارانەی کەیارمەتی ئەیوبییەکانی دا بۆ زیندوکردنەوەی مەزهەبی سوننە :**

ئەو هۆکارەی کەیارمەتی دەری ئەیوبییەکان بوو بۆ زیندوکردنەوەی مەزهەبی سوننە بریتیبوو لەریشەدارنەبوونی مەزهەبی شیعە لەمیسرداو وەرگرتنی دوو هەڵوێست بەرامبەری لەلایەن میسرییەکانەوە، یەکەمیان هەڵوێستی سەرسامبوون بەهەڵگرانی ئەم مەزهەبە دەرەنجامی ئەو هەوڵانەی کەدابویان بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەیان، کەتیایدا شێوازی ئاهەنگو بانگهێشتو سفرەو خوان دەڕازێندرایەوەو بەخشینی دیاریو بەخشینی زۆرو زیادرەوىو خۆشگوزەرانییان دەگرتەبەر کە هەموو بوارەکانی ژیانیانی دەگرتەوە لەگەڵ ئەو شێوە شکۆمەندو دەوڵەمەندانەی کەپێی دەناسرانو هەمیشە سوربوون لەسەر دەرکەوتن لەسەری[1]. هەڵوێستی دووەمییان: ئەوانەی کەبانگەوازەکەیان پەسەندکردبووو چوو بوونە ریزیانەوەو زۆربەی ئەوانەش بۆ پارە یان دەسەڵاتو پۆست یان لەترسی لێدانو سزادان پەیوەندیان پێوەکردبوون، هەردوو گروپەکەش مەزهەبەکەیان وەك بیروباوەر وەرنەگرتبوو، هەروەها فاطمیەکان شێوازی مژدەدانو ترساندنیان گرتبووەبەر لەبانگەوازیاندا بۆ مەزهەبەکەیان ئەوەبوو یەعقوبی کوڕی کلس کاتێ بووە وەزیر بۆ العزیز لەماڵەکی خۆیدا زانایانی کۆکردەوەو ئازوقەی بۆ هەموویان بڕیەوە[2]، هەروەها فاطمیەکان دوای جێگیربوونیان لەمیسردا– هەموو فەرمانبەرەکانیان ناچارکرد کەشوێن مەزهەبەکەیان بکەون، لێرەشەوە پاراستنی پۆستو بەرزبوونەوەو وەرگرتنی پۆستە باڵاکان پێویستی بەوە هەبوو کەئەو کەسە خۆی وەك شیعە پیشانبدات، ئەمەش پێمان دەڵێ کەئارەزوی وەرگرتنی پۆستەکانی دەوڵەت هۆکارێك بوو بۆ دەست هەڵگرتن لەمەزهەبی سوننەو پابەندبوون بەمەزهەبی شیعەوە[3] ئەو هەڵوێستە تۆقێنەرانەش کەئەیانگرتەبەر بۆ سەپاندنی مەزهەبەکەیان زۆربوون: لەساڵی ۳۸۱ك ۹۹۱ز دا پیاوێك پاش لێدان بەشاردا گێڕدرا لەسەر ئەوەی کەکتێبی موطأی پێشەوا مالیکی لابوو[4]، هەروەها سوننە لەسەردەمی الحاکم بأمر الله دا چەوسێنرانەوەو ناچارکران کەجنێو بەهاوەڵان لەسەر دیواری ماڵەکانیان بنوسنو ئەوانیش بەناچاری ئەو کارەیان کرد[5]، لەئاکامی ئەم شاڵاوی چەوساندنەوەشدا لەسەردەمی الحاکم دا خەڵکی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ چوونە ناو مەزهەبی شیعەوە لەترساندا، بۆ ئەم کارەش گەورەی دادوەران دانیشت بوو... ئەوانیش لەسەرجەم

---

[1] تأريخ التربية الاسلامية ل٤١٢-٤١٣.

[2] المواعظ والأعتبار (٣٤١/٢) التأريخ الساسي والفكري ل٢٥٤.

[3] تأريخ الدولة الفاطمية المغرب ومصرو سورية وبلاد العرب ل٢١٨.

[4] المواعظ والأعتبار (٣٤١/٢) التأريخ الساسي والفكري ل٢٥٤.

[5] هەمان سەرچاوە ل٢٥٤.

شوێنەکانەوە دەهاتن‌و قەرەباڵغییەکی گەورە دروست بوو،،، بوەهۆی مردنی چەندین ژن‌و پیاو[1]، لەسەردەمی الظاهریشدا هێشتا مەزهەبی مالیکی بەهێزبوو، بۆیە خەلیفە ناچاربوو زاناکانیان لەو وڵاتە وەدەرنێن لەساڵی ٤١٦/ ١٠٢٥ز داو فەرمانیدا بەبانگخوازانیان کەکتێبی "دعائم الاسلام"ی بنەماکانی بیروباوەری ئیسماعیلی‌و کتێبەکانی تریان پێ لەبەربکەن‌و دیاری‌و خەڵاتیشی دانا بۆ هەر کەسێك کە لەبەری بکات[2]، لەمەشەوە دەرئەکەوێت کە ئەم مەزهەبە لەسەر پایەی جێگیر بنیات نەنرابوو لەمیسردا، بۆیە کاتێ سەلاحەدین هاتووو خوێندنگە سونییەکانی دامەزراندو دەزگای قەزای سپارد بەشافعییەکان‌و بەدوای ئەوەشدا خەلافەتی روخاند راستەوخۆ شافعی وەالکییەکان لایەنگرانی خۆیان پەیداکردو مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی بەتەواوی لەمیسردا توایەوە[3]. سوپاس‌و ستایش بۆ خوا تائێستاش شیعە هەوڵی ئەوە دەدەن کەجێ پێیەك بۆ خۆیان بکەنەوە، بەڵام خۆشەویستی میسریەکان بۆ ئاینە شکۆدارەکەیان‌و دامەزراویان بەدرێژای دامەزراو چەندین سەدە لەسەر نەگۆڕەکانی بەڵگەی بیروباوەڕی دروستی سوننی‌و تێگەشتنی دروست بۆ قورئان‌و خۆشەویستی ڕاستگۆیانە بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتنی ڕێنماییەکانی خەلافەتی راشدین وایکردووە کەهەوڵەکانی شیعە بێئاکام بێت، دیارە خوێندنگە سونییەکان پشتیوانی ئومەت بوون بۆ دەستگرتن بەقورئان‌و سوونەت‌و ئاگارکردنەوەیان لەبیدعەو داهێنان‌و لەرێی ئەو ئایەتانەی قورئانەوە کەفەرمان بەگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی د.خ دەکەن[4] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ (النور،٥٤)، واتە: پێیان بڵێ فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەربن ﷺ خۆ ئەگەر پشتیان هەڵگرد ئەوە ئەو تەنها گەیاندنی پەیامی خوای لەسەر شانە ئێوەش سەرپێچی‌و یاخی بوونەکەتان لەسەر شان دەکەوێت، خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بن‌و گوێڕایەڵ‌و ملکەچی بن بەراستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن، دڵنیاش بن کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر د.خ تەنها گەیاندنی روون‌و ئاشکرایە (تەفسیری ئاسان ل٣٥٧.)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿لاَ تَجْعَلُوا دُعَاء الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاء بَعْضِكُم بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور ٦٣). ئەوەی کەیارمەتیدەری ئەیوبییەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان لەمیسردا: میسر بووە ناوچەی

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٥٤.

[2] هەمان سەچاوە (٢/٣٤١-٣٤٢).

[3] سەرچاوەی پێشوو (٢/٣٤٣) التأريخ السياسي ل٢٥٥.

[4] تخذير المسلمين في الابتداع والبدع في الدين ل٢٥.

ڕاکێشان‌و چالاکی زانایانی سوونە بەجیاوازی مەزهەبەکانییەوە، بەم پێیەش ڕۆڵێکی جوانیان گێڕا لەگێڕانـەوەی میـسر بـۆ باوەشـی سـوننە ئەمـەش لـەڕێی وانەوتنـەوە لەوخوێندنگانـەدا کەدامەزرێنرابوون یان لەرێگەی ئامۆژگاری یان نوسین‌و دانانی کتێبەوە، ئـەم هەوڵانـەش بـەردەوام بوو لەراوەدونانی پاشماوەکانی شیعەی ئیسماعیلی لەمیسردا، زۆرینەی ئەو زانایانەش کەبەشداری ئەیوبییەکانیان کرد لەهەوڵەکانیاندا لەئاستێکی باشی بەرپرسیارێتی دا بوون لـەرووی رەوشت‌و زانست‌و ئایندارییەوە، هـەروەك زۆرینەشیان بەشداریان لـەژیانی سیاسی کۆمەڵایەتیدا هـەبوو، وە القاضي الفاضـل و عیمـادی ئەصفەهانی‌و بەهائـەدین کـوڕی شـەردادو شرف الـدين کـوڕی ئـەبی عەسرون والعز کوڕی عبدالسلام، تەنانەت هەندێکیان بەشداری کاریگەریان هەبوو لەگۆڕەپانی کاتی جـەنگ‌و جیهـاددا وەك زانـا عیـسای هـەکاری‌و زۆرینەشـیان بـوێرێکی باشـیان دەنوانـد لەروبەروبوونـەوەی دەسـەڵاتداران‌و ئامۆژگـاری کردنیانـدا، نموونەیـەکی جـوان بـوو بـۆ خـەڵکی بەگشتی، لێرەشەوە کاریگەریان لەسەر خەڵکی بەباشی دیار بوو[1]، هـەروەك زۆرێـك لەئەیوبییـەکان زانـابوون‌و ڕۆڵیـان هـەبوو لەسەرخستنی مەزهـەبی سـوننیدا کـە دواتـر بەپـشتیوانی پـەروەردگار بەدرێژی باسی لێوە دەکەین.

**هەشتەم: ڕێنماییە پەروەردەییەکان لەبۆچوونەکانی سەلاحەدیندا**

لـەو ڕێنماییـە پـەروەردەییانـەی لەبۆچـوونەکانی سـەلاحەدیندا وەك سـەرکردەیەکی سیاسـی‌و سەرۆکێکی ئیسلامی:

١- **بە پەرستش زانینی گوێڕایەڵی سەرکردە:** دەربارەی گوێڕایـەڵی کردنـی بـۆ خـەلیفە عەباسـی ئەڵێ: ئێمە گوێڕایەڵی پێشەوا بە خواپەرستی دەزانین‌و ئەوە بەلامانەوە پایەیەکە لەپایەکانی ئیسلام، هەروەها ئەڵێ: بەهۆی ئەمەوە فەزڵی خـوا بەسـەرمانەوە دەرکـەوت بەسەرخستنی دەوڵەت‌و لەناوبردنی نەیارو ناحەزانی[2].

٢- **پاککردنـەوەی مینبـەرەکانی بانگـەواز لەسـەرانی بیدعـە:** دەربـارەی پاککردنـەوەی مینبەرەکان لەبانگخوازە شیعەکان دەڵـێ: توانیمـان مینبـەرەکان لەپـیسی بانگخوازەکانیان پاك بکەینەوەو ئەو کارەشمان لەپێناو دونیادا نەکردووە، چونکە بێ مانایە کارێك بـۆ دونیا ئەنجام بدەیت کە پاداشتی لەرۆژی دواییدا بێت، بەڵام باسکردنی نیعمەتی خواش پێویستە[3].

---

[1] االتأريخ السياسي و الفكري ل ٢٥٥، ٢٥٦.

[2] مصفار الحقائق ٦٢ — ٦٥ أثر جهود صلاح الدين التربوية في التغير واقع المجتمع المصري ل٨٢.

[3] لأثر جهود صلاح الدين التربوية ل٨٣.

٣- **نەهێکردن لەدەمارگیری بۆ مەزهەب:** لەنامەیەکدا بۆ العادلی برای کەجێنشینی بوو لەمیسردا لەکاتێکدا کە هەندێ کاری تێکدەرانە لەهەندێ کەسەوە روویدا بوو ئەڵێ: کارگەشتە ئەوەی کە لەوڵاتی میسردا کۆمەڵێك لەزانایان بەکۆمەکی‌و پشتیوانی کۆمەڵێ شمشێربەدەست دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی خراپەو کاریان بۆ زیندووکردنەوەی دەمارگیری دەکرد بەجۆرێك کە دوژمنانیان دڵخۆش دەکردو باسێکیان زیندوو دەکردەوە کە دەمارگیرییەکی نەفامانەیەو خوای گەورە رزگاری کردبوین لێی، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ (آل عمران ١٠٣)، فەرمایشتی پەروەردگاریش بەڵگەیە بۆ کەسێك کە گوێڕایەڵ‌و ملکەچ بێت. ئەم دەمارگیرییە بۆ مەزهەب بەردەوام بوو لەپڕ کردنی دڵەکان لەرق‌و کینەو بارگاوی کردنی دژ بەیەك، خوای گەورەش نەهی لەکێ بەرکێ‌و موجادەلە کردنی خەڵکی دەمارگیر کردووەو ئیتر دەبێ موجادەلەکردنی هاوبیروباوەڕ چۆن بێ؟ دیارە رەوا نییە مەگەر بەشێوەیەکی جوان بێت، ئێمەش دەزانین کە ئەم کارە بەرژوەندییەك بەدی ناهێنێت‌و نیەتێکی باشی لەپشتەوە نییەو ئەو ئەدەبەش باشە بۆ خەلەف (پاشینان) کە سەلەف‌و پێشینان نواندویانە جا بایەکێك لەئێمە کاتێك شتێك دەنوسێ بۆ خوا بزانێ دەربارەی چی نوسیوەو بۆ کێی نوسیوە[1].

٤- **هاندانی بۆ دادگەری‌و چاکەکردن لەگەڵ ژێردەستەکاندا:** هەروەها سەلاحەدین سور بوو لەسەر هاندان‌و ئاڕاستەکردنی والییەکانی‌و دەیوت: بادادگەربن ئەوانەی کە بەندەکانی خوا وەك سپاردەو ئەمانەتێك خراوەتە ژێر دەستیان، با لەپلەی دادگەریشەوە بەرەو چاکەکردن هەنگاوبنێن، هەکاتێ کار بە کەسێك سپێردرا با پاك بێت‌و ئارەزوو لەدەروونیدا جێ نەکاتەوەو شەیتانیش نەتوانی نشینگەیەك لای پێك بێنێ‌و ئەگەر قورساییەکیشیان کەوتە سەرشان بەقورسی نەزانن[2]. هەروەها دەڵێت لەم سەردەمەدا وەرگرتنی بەرتیل بڵاوبووەتەوە کە ئەمەر گوێنەدانە بەفەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) کە نەهی لەوەرگرتنی دەکات‌و وەك وەرگرتنی سوو وایە کە نەفرەت لەو کەسە کراوە کە دەیدات‌و ئەوەش کە دەیخوات[3].

---

[1] کتاب الرضتین (١٧٨/٢).

[2] صبح الاعشی للقلشندي (١٤٤/٣ — ١٤٨)

[3] سەرەچاوەی پێشوو (١٤٤/٣ — ١٤٨) أثر جهود صلاح الدين ل٨٤.

٥- **گرنگیدان بەمەسەلەی قەزاو دادوەری:** لەم بارەیەشەوە دەڵێت: سەبارەت بەقازیو دادوەرەکان کە پایەن بۆ شەریعەتو بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانی سەربازیو بۆ پاراستنی زانستەکانیو گەنجینەیەکی لەبن نەهاتوون، ئەوە پێویستە پشت بە لەیەکێك زیاتریان نەبەسترێتو بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکانیش خاوەن دەسەڵاتەکانیان بەکاربهێنرێت، مەسەلەی دەسەڵاتیش نابێ بدرێتە دەست کەسێك کە داوای دەکات بەڵکو دەبێ بە کەسێ بدرێ کە پشت گوێی پێ نادات هەڵپەی بۆ ناکات[1]. لەراستیدا سەلاحەدین سوور بوو لەسەر گەڕانەوە بۆ بنەماکانی قورئانو سوننەتو ئەم بنەمایانەشی لەرێی هەوڵەکانیەوە بۆ بنبڕکردنی بیدعەو سەرپێچیە شەرعییەکانو هەستانی بەپاراستنی پرۆگرامە شەرعییەکانو کارکردن بۆ دەست پێوەگرتنو بڵاوکردنەوەی بنەمای هەلی یەکسانی زانستیو بەستنەوەی ئوممەت بەواقیعی خۆیەوە لەرێی بیروباوەڕە ڕاستو دروستەکەیەوە، بەم شێوەیە کە وتە کار بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنە مەزنو نایابەکانی: هەر لەئازاد کردنی بیت المقدسەوە هەتاوەکو فتوحاتو ئازادسازییەکانی تر.

[1] سەرەچاوەی پێشوو (٣/١٤٤ – ١٤٨) أثر جهود صلاح الدين ل٨٤.

## باسی چوارم: پلەوپایەی زانایان و شەرعزانان لای سەلاحەدینی ئەیوبی

سەلاحەدین لەوە تێگەیشتبوو کە یەکێك لەهۆکارەکانی بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەسەر خاچپەرستی داگیرکەرو هەڵکشانی شیعەگەریدا بریتییە لەبوونی سەرکردەی خوا ویست، چونکە ئەم سەرکردایەتییە دەتوانێ ئوممەت بەرەو ئامانجە دیاریکراوەکانی بەرێت پاش کۆمەکیو پشتیوانی پەروەردگار، هەروەك بڕوای تەواوی هەبوو بەوەی کە دەبێ زانایانی خوا ویست لەسەرەوەی ئەو سەرکردایەتییەدا بن، چونکە ئەوان دڵو چاوی ئەو سەرکردایەتییە خواویستەن، هەروەها سەلاحەدین دەیزانی کە ئازادکردنی وڵاتانو یەکخشتنیان تەنها کارێکی سەربازی یان سیاسی نیە، بەڵکو زۆر لەوە زیاترە چونکە دەبوایە بەرەنگاری مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی ببێتەوەکە مەترسیەکی ناوخۆیی بوو هەرەشەی لەبیرو باوەڕی ئوممەتی ئیسلامیو خاوێنی ئاینو ململانێی شارستانی لەگەڵ رۆژئاوای ئەوروپی گاوردا دەکردو، بەبێ ریشە دارکردنو ساغ کردنەوەی بیرو باوەڕی (تأصیل)ی ئوممەتی ئیسلامی سەرکەوتنەکانیان تەنها چەند کارێکی لاوەکی دەبێتو ئەگەری هەڵکشانو داکشانو گۆڕانی بەردەوامی هەبێت وەك هەمیشە روو دەدات، ئەمەش بەسەرکەوتنێکی دەرەکیو ئازادکردنی قەڵایەك ناکرێت بەڵکو بەبنیاتنانی ئوممەتێکی جەنگاوەر کەبزانێت چۆن بیروباوەڕی خۆیو کەسایەتی شارستانی بپارێزێت لەپەرتەوازەبونو فەوتان، بەم پێیەش هەموو رەگەزێکی سەربازیو دەسکەوتێکی سیاسی ئەبێتە دەسکەوتێکی بنیاتنەرانەکە هێزو رەسەنایەتیو تۆکمەیی کۆمەڵگەی جەنگاوەر زیاد دەکات، نەك تەنها شت کەڵەکە کردنێکی رێژەیی کەبەرگەی لێدانێكو دوان دەگرێتو لەسێیەمو چوارەمدا هەرەس دێنێت، لەگەڵ هەرەسهێنانیشیدا هەوڵی چەندین ساڵی دوورودرێژ بەهەدەر دەچێت[1] دیارە چالاکی زانستی لەسەردەمی سەلاحەدینداو گرنگیدانی بەزانایان درێژەپێدانێکی سروشتی سەردەمی نورەدین زەنکی بوو و هەرگیز چالاکی زانستیش لەوکاتەدا تەرەفێکی فیکریو دەرهاویشەیەکی کلاسیکی دەزگاکانی دەوڵەت نەبوو بەڵکو لێبڕانێکی ئامانجدار بوو لەپێناو چەسپاندنو ریشەدارکردنی بیرو باوەڕداو ئەیوبیەکانیش گرنگیان دەدابە زانایانو بەشداربوون لەچەسپاندنو برەو پێدانی مەزهەبی سوننەدا، ئەوە بوو سەلاحەدین بیرو باوەڕی خۆی بە بەڵگەوەردەگرت لەرێی پشکنینو لێکۆڵینەوە لەگەڵ زانا گەورەکاندا، بۆ تێگەیشتن لەهەرشتێك کەپێویستی بەتێگەیشتن هەیە، بەجۆرێك کە ئەگەر قسەیەکیان لەبەردەمی دابکردایە قسەی باشی دەربارە دەکرد بائەو دەستەواژەیە

---

[1] عصر الدولة الذنكية للصلابي، ل ٢٤٩ نورالدين محمود الرجل والتجربة ل٢٤٩.

لەزانایانیشەوە نەهاتبێت[1]، هەروەها سوربوو لەسەرئەوەی کەلەگەڵ چەند زانایەکی نزیکی خۆیدا کۆببێتەوەو هەندێ فەرمودەو فیقهی بۆ بخوێنێتەوە، یان لەمەجلیسی قەزادا ئامادەبێت[2]، چەندجارێکیش باسی ئەوەمان کرد کەئارەزووی بیستنی فەرمودەی پیرۆزی هەبوەو سەردانی گەورە زانایانی فەرمودەی کردوە بۆ وەرگرتنی فەرمودە لێیانەوە، هەورەها سوربونی لەسەر ئەوەی کەکورەکانی لەسەر رێز گرتنی زانستو زانایان پەروەردە بن، بۆیە دەیبردن بۆ مەجلیسەکانی عیلمو ئەوانیش لەسەرخۆشەویستی زانستو رێزگرتن لەزانایان پەروەردەبوون[3].

هەروەها سەلاحەدین رێزی لەزانایانی سەردەمی زەنگی دەگرتو هاوکاری ئەکردن، ئەمیرو وەزیرەکانی دەوڵەتەکەشی هەموو لەزاناگەورەکان بوون، بەناوبانگترینیشیان القاضي الفاضل نوسەرو راوێژکارو وەزیری کەناوی عبدالرحيمی کوری عەلی بوو، سەلاحەدین لەبارەیەوە ئەڵێ: ولاتانمان بەشمشێرەکەم رزگارنەکردوە بەڵکو بەرای القاضي الفاضل، ئەم پیاوە لەپاڵ لێهاتوویی سیاسیدا زۆر پارێزکارو لەخواترسیش بوو، رۆژوو نوێژو قورئان خوێندنی زۆربوو، خاکیو خۆبەکەم زان بوو، چاکە کار بوو لەگەڵ هەژاراندا و زۆر سەردانی نەخۆشی دەکرد[4]. ئەمەش ژیاننامەی گرنگترین زانایانو رۆڵی سیاسیو زانستیو جیهادیو پەروەردەییانە لەسەردەمی سەلاحەدیندا:

**یەکەم: القاضي الفاضل:**

پێشەواو زانای رەوانبێژ القاضي الفاضل، زیندو کەرەوەی ئاینو دەستەراستی دەوڵەتو گەورەی رەوانبێژان ئەبو علی عبدالرحيمی کوری حەسەنی عەسقەلانی، بەرپرسی دیوانی ئینشاء لەسەردەمی سەلاحەدین داو لەپیریدا لەأبي طاهر السلفي وأبي محمد العثماني وأبي القاسم ی کوری عساکر، أبی طاهر کوری عثمان و عثمانی کوری فرج العبدری یەوە فەرمودەی بیستووە[5] جوانئوسیو بەهێزی دارشتنی پێ سپێردراو لەو بوارەدا دەستێکی باڵاو ئەزمونێکی باشی هەبوو، داهێنەر بوو لەدەربرینی ماناو داهێنانی ووشەی جواندا،[6] ئەم هونەرەی لەیوسفی کوری الخلالی بەرپرسی دیوانی ئینشائی سەردەمی العاضدە وە وەرگرت، پاشان ماوەیەك لەبەرەکانی جەنگدا

---

[1] سيرة صلاح الدين، ابن شداد ل٢٥٦.

[2] سيرة صلاح الدين ل١٣،٢٨.

[3] التأريخ السياسي والفكري ل٢٥٦.

[4] هكذا ظهر جيل صلاح الدين ل٢٦٢.

[5] سير أعلام النبلاء (٢١/ ٣٣٩).

[6] سير أعلام النبلاء (٢١/ ٣٣٩).

خزمەتی کردو دواتریش کوڕی الصالح بن روزيك داوای کردو لەدیوانی ئینشادا کاریٚ پێ سپارد[1]، عیمادی ئەسفەهانی ئەڵێ: ژیانی بەخۆشی بەسەربرد، هیچ کارێکی چاکی نەهێشتەوە کەنەیکردبێت، یان بەڵێنێکی بەهەشتی نەهێشتەوە هەوڵی بۆ نەدابێت، هەر پەیمانێکی چاکەشی زانیبێت مۆری کردوە، چاکەکانی لەگەردنەکاندایەو خێرەکانی بێشومارن، بەتایبەت ئەو وەقفانەی کەبۆ ئازادکردنی دیلو یارمەتی دانی شافعیو مالیکیەکان لەخوێندنداو فێرکردنی هەتیوان تەرخانی کردبوو، دادوەری مافەکانو گەیەنەری راستیەکان بوو، سوڵتان بەگوێی دەکردو رای وەردەگرتو شارو هەرێمەکانی بەهۆی راکانی ئەوە ئازاد دەکرد، منیش یەکێك بووم لەچاکەکانیو قەرزاری بەخششەکانیم، نوسینەکانی کەتیبەی سەرکەوتنو گەوهەرەکانی رۆژگار بوون، لێهاتویی لای هەمووان ئاشکرا بوو، دەستەواژەکانیشی جادویی بونو رەوانبێژیشی تەواوکەری دەوڵەتو فەزڵدەری سەردەمی سەلاحەدین بوو بەسەرسەردەمەکانی تردا، شێوازی پێشینانی سڕیەوە بەو شێوازە نوێیانەی کەدایهێنا، هەرگیز نەمبینیوە دوعایەك دوبارە بنوسێتەوە لەنامەکانیدا یان وشەیەك لەقسەدا دووبارە بکاتەوە[2]، هەروەها لەکتێبی الخريدة دا دەربارەی ئەڵێ: پێش ئەوەی باس لەناودارانی میسر بکەم باس لەئەو کەسەدەکەم کەباسی هەموو پیاوچاکانی سەردەم وەك دڵۆپێك وایە لەدەریای ئەو دا، کەئەویش القاضي الفاضله هەتاوەکو ئەوەی کەئەڵێ: ئەو وەکو شەریعەتەکەی محمد وایە کەشەریعەتەکانی تری سڕیوەتەوە، بیرۆکەی دادەهێناو پاشای کۆنترۆڵکردبوو بەبیروڕاکانیوە بوبوە هەوێنی دەسەڵاتی، لەرۆژێکدا هێندەشتی دەنوسی کەئەگەر بۆ هەموو نوسەرەکان دابنرایە ئەوە باشترین نوسین بوو، قسی کوڕی ساعدەی لەرەوانبێژی دا و قەیس لەژێریدا پێی نەدەگەشتو خاتەمو عەمریش هاوتای نەبون لەبەخشندەییو ئازایەتیدا[3]. منەت لەکردەوەیداو درۆلەقسەیدا نەبوو، وەفادارو خاوەن پیاوەتیو پاکیو جوامێری بوو لەو ئەولیایانەش بوو کەکەرامەتیان هەبوو لەنوێژی سوننەت بێزار نەدەبوو و لەپەیوەندیو سەردانیش داماندوونەدەبوو[4]، حافظي منذري دەربارەی ئەڵێ: سوڵتان بەتەواوی مەیلی بۆی هەبوو، زۆر پێشی دەخست، چاکەی زۆر بوو شوێنەواری جوانی پاش خۆی بەجێ هێشت[5] هەروەها الموفق عبداللطيف ئەڵێ: القاضي الفاضل زۆر هۆگری نوسینو کتێب بوو، دیندارو پاکو پارێزکاربوو بەردەوام بوو

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢١/٣٣٩).

[2] سير أعلام النبلاء (٢١/ ٣٤٠).

[3] هەمان سەرچاوە (٢١/٣٤٢).

[4] هەمان سەرچاوە (٢١/٣٤٢).

[5] هەمان سەرچاوە (٢١/٣٤٢).

لەسەرویردەکانی شەوو رۆژوو قورئان خوێندن، ئەسەدەدین هێنای‌و سەرسام بوو پێی پاشان سەلاحەدین هێشتیەوە لای خۆی، ئەم پیاوە رابواردنی کەم‌و چاکەی زۆر بوو، بەردەوام بوو لەسەر شەونوێژو سەرقاڵ دەبوو بەتەفسیرو ئەدەبەوە، کەم گرنگی بە "نحو"ی عەرەبی دەدا بەڵام سەلیقەی بەهێز بوو، دەربڕینی کەم وێنە بوو، لای ابن سناء الملك بیست‌و دوو بەرگ نوسین‌و لای ابن القطان بیست بەرگی هەبوو،جل‌و بەرگ‌و خواردن‌و ژن هێنانی کەم بوو، پۆشاکی سپی دەپۆشی‌و لەگەڵ خۆیدا خزمەتگوزارێکی سەردەخست‌و نەیدەهێشت کەسی تری لەگەڵدابێت لەبەخاك سپاردنی تەرم‌و سەردانی نەخۆشدا زۆر ئامادە دەبوو چاکەی ناسراو بوو بەنهێنی‌و ئاشکرا جەستەی لاوازو شێوەی ناسك‌و کەمێك پشتی چەماوەبوو کەبەهۆی جبەکەیەوە دادەپۆشرا، چاکەی لەگەڵ زانایاندا دەکردو بەخشیشی پێ دەدان‌و هەرگیز تۆڵەی لەدوژمنانی نەدەکردەوە مەگەر بەچاکە کردن یان لێ خۆش بون لێیان، داهاتیشی لەساڵێکدا نزیکەی پەنجا هەزار دینار بوو جگە لەئەو شوێنە بازرگانیانەی کەلەهیندو مەغریب داهەیبوو[1] بەشێوەیەکی کتوپڕ کۆچی دوایی کرد، زۆر پێویستی بەمەرگ بوو چونکە بەرەو کاتێکی نەهات ئەڕۆشتن ئەمەش بەڵگەیە لەسەرچاودێریی خوای گەورە بۆی[2]، ئەبوو شامە دەربارەی ئەڵێت: خاوەنی رای دروست‌و ئەقڵێکی پێگەیشتوو بوو، سوڵتان زۆر رێزی لێ دەناو ڕاوێژی پێ دەکردو رای وەردەگرت‌و بەگوێشی دەکردو ئازاد کردنی شارەکانیش بەهۆی پەیڕەوی کردنی راجوانەکانی حئەوەوە بوو، نوسینەکانیشی کەتیبەی سەرکەوتن بوون[3]. هەروەها القاضي الفاضل لەزۆر کاردا بەشداری کردوە چەند پۆستێکیشی گرتۆتە ئەستۆ لەوانە:

١- **سەرۆکایەتی دیوانی ئینشا:** کاتێ سەلاحەدین وەزیری دەوڵەتی فاتمی بوو لەمیسردا، وەك سوڵتان حسابی بۆدەکراو نازناوی سوڵتانیشی لێ نرابوو، قاضي الفاضل یش سەرۆکی دیوانی ئینشاء بوو وەك وەزیری سوڵتان وابوو[4]، القاضي فاضل وەك سەرۆکی دیوانی ئینشاء مایەوە لەکاتێکدا کەنازناوی جێگری سەرۆکی دیوانی ئینشای هەبوو ئەمەش وەك رێزلێنانێك بۆ شیخ الموفق أبی الحجاج ی کوڕی الخلال ی مامۆستاو سەرپەرشتی، هەرگیز ابن الخلال یش هەستی بەوە نەکردبوو کە ئەوشوێنی گرتۆتەوە، لەحاڵێکدا کەلەوانەیە ابن الخلال پێشی خۆش بوبێت چونکە رێزی القاضي الفاضلي دەگرت‌و هۆگری بوو خولیای ئەوەی بوو

---

[1] سیر أعلام النبلاء (٢١/٣٤٣).

[2] سیر أعلام النبلاء (٢١/٣٤٣).

[3] کتاب الروضتین (٢/٢٤١).

[4] القاضي الفاضل عبدالرحیم البیانی ل١٢٤.

کەبەردەوام بێت لەسەرئەو شێوازو رادەربڕینە کەهیبوو، دیارە ئەم قوتابیەشی نائومێدی نەکردو لەدواساڵەکانی تەمەنیدا وەك کوڕێکی گوێڕایەڵ مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرد[1].

سەرۆکایەتی دیوانی ئینشائیش گەورەترین ئاواتی القاضي الفاضل بوو لەناو پۆستەکاندا، ئەوە بوو دوای ململانێیەك کەبیستو یەك ساڵی خایاندوتیایدا توشی جۆرەها مەینەتی بوو گەشتە ئەو پۆستەی کەهەندی لەنوسەرە میسریەکان لەهەوڵی ئەوەدابوون کەلێ ی زەوت بکەن دوای وەرگرتنی، ئەو پۆستەش نازناوی شێخی زۆر بەرێز یان گەورەی بەرێزو نوسەری کاغەزی پیرۆزو بەرپرسی دیوانی ئینشائی لێ نرا[2]. بەلاّم نازناوی القاضي الفاضلی زیاتر بۆ بەکاردەهێنرا ناوی خۆشی کە عبدالرحيم البيساني العسقلاني بوو زیاتر پـێ ی دەناسرا کەئاماژە بەزێدو شوێنی لەدایك بونی دەکرد بەتایبەت لەو نوسینانەوە کە لێیەوە هاتوە، خۆشی هەرچەندە ئەو نازناوەی بەشێوەیەکی فەرمیو بەرواڵەت پەسەند بوو، بەلاّم ئەو ئەوململانێیەی گرتە ئەستۆکەلە زێدو شوێنی لەدایك بوونی یەوە وەرگیرابوو، هەروەها القاضي الفاضل دیوانی ئینشائی لەمیسردا گرتە دەست، سەرباری بونی چەندین نوسەر کەلەڕوی تەمەنەوەلەو گەورەتر بوون بەلاّم ئەو لەسەرەتای چونە دیوانی ئینشاوە وەك قوتابیەك چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردنو لەسەردەستی هەندێکیان خۆی راهێناوەك قاضي ئيبن أثيری کوڕی بیان، پاشان دەستی دایە کارکردن لەگەڵیانداو بازی دابەسەریاندا ئەوانیش هەر لەشوێنی خۆیاندا بوون ئەمەش مەترسی لای هەندێکیان دروست کرد، ئاشکراشە کەکەسایەتی کارای القاضي الفاضلو توانای خۆگونجاندنو زیرەکی کەم وێنەو ئەزموونی بەهێزی لەبواری خانی هێزو لاوازی سەرکردەکاندا لەو هۆکارانەبوون کەبوونە هۆی بەرزبوونەوەی بەوشێوە خێرایە، شێوازی هونەریشی چەند بوارو ئاسۆیەکی لەبەردەم دا والآکرد ئەمەش بەڵگەیەلەسەر گرنگی ئەدەب لەسیاسەتداو گرنگیدانی پیاوانی دەوڵەت لەو سەردەمەدا بەئەدەبو ئەدیبانو هاوکاری کردنی خاوەن بەهرەکانیان[3]، هەر کەالقاضي الفاضلیش لەگەل سەلاحەدین دا سەرۆکایەتی دیوانی ئینشائی گرتە ئەستۆ دەستی دایە کارکردن بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی فاتمی ئەمەش هەوڵدانو خۆ ئامادەکردن بەشێوەیەکی

---

[1] القاضي الفاضل ل ١٢٥.

[2] القاضي الفاضل ل ١٢٥.

[3] القاضي الفاضل ل ١٣٥.

قۆناغ بەندی بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی فاتمیو یەکەم هەنگاویش کەبەم ئاراستەدا گرتیەبەر بریتی بوو لەئامادەکردنی سوپایەکی ئەیوبی کەپلانی کودەتای پێجێ بەجێ بکات[1].

٢- **القاضي الفاضل، سوپای سەلاحەدین:** لەسەرەتای دەست بەکاربونیەوە وەك وەزیر سەلاحەدین دەستی دایە ئامادەکردنی سوپای ئەیوبی هەتاوەکو ببێتە ناوکێك جبۆ سوپای نوێی میسر کەئەرکی پاراستنی میسر لەهێرشی خاچپەرستان لەئەستۆبگرێت، تێکچونی بارودۆخی سوپای فاتمیشی لا شاراوەنەبوو چونکە لەهەرسێ گەشتە کەیدا بۆ میسر ئەم سوپایەی تاقیکردبویەوە لەنێوان ساڵەکانی (٥٥٩ – ٥٦٤ك دا) دا بەباشی شارەزای سەرچاوە مرۆیی و دارایی و سەربازییەکانی بوو و لەڕووی ڕێکخستن و تیپەکانیەوە کەلەسەربنەمای رەگەز دانرابوو وەکو سوودان و ئەرمەن و میسرییەکان و دەیلەم و تورکەکان و عەرەبەکان و بارودۆخی هەموو تیپێك لەم تیپانەش زانیاری هەبوو[2] القاضي الفاضل یش لەسەردەمی روزەیکی کوڕی صالحدا لەبەڕیوەبردنی ئەم هێزانەدا کاری کرد بوو، لەگەڵیشیدا لەهەندێ ڕووبەڕوبوونەوەی سەربازیشدا لەکاتی هەڵمەتی دووەمی فرەنجەشامیەکاندا بۆ سەر میسر بەشداری کردبوو، و فەرماندەی سەرجەم تیپەکانی بینیبوو لەکاتێکدا کەململانێیان بوو لەسەر دەسەڵات ئەمەش ئەو هێزانەی لاواز کردو میسریشی بەتەواوی ماندوکرد بەڕادەیەك کەتوانای بەرگری کردن لەسەر بەخۆیی خۆی لەدەست دا، هەروەها القاضي الفاضل زۆرشتی دەربارەی هێزەکانی میسر دەزانی لەڕێی کارکردنی لەگەڵیان لەدیوانی سوپاو دیوانی ئینشادا کەلەگەڵ دیوانی سوپادا مامەڵەی دەکرد، چاودێریی وەفدو نێردراوو چاوساغ و سیخوڕەکانی دەکرد، بۆیە بەباشی شارەزا بوو لەم هێزانە، خاڵەلاوازەکانی دەزانین و شارەزایی دەربارەی هەموو تیپ و سەرکردەکانی هەبوو، لەگەیاندنی ئەم زانیارییانەشدا بەسەلاحەدین کەمتەرخەمی نەدەکرد، بەڵکورێنمایی دەکرد بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی سوپای ئەیوبی و بەدرێژایی ئەو ماوەی کەلەگەڵ سەلاحەدین دا بوو سەرپەرشتی سوپاکەی دەکردو چاودێری ئامادەکردن و ڕێکخستن و سەرچاوەداراییەکانی ئەکرد. هەروەها هاورێیەتی سوپای دەکرد لەمیسرەوە بۆ شام هەتاوەکو شان بەشانی سەلاحەدین بجەنگێن و لەشامیشەوە بۆ میسر هەتاوەکو خۆی سازو ئامادەی بکات بۆ هێرشی تر بۆ سەرفرەنجەکان[3]. لەگەڵ ئەوەشدا کە القاضي الفاضل سەرۆکی دیوانی ئینشاو و وەزیری

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٣٦

[2] هەمان سەرچاوە ل١٣٦

[3] هەمان سەرچاوە ل١٢٧.

دەوڵەت بوو لای سەلاحەدین بەڵام بەئاگابوو لە هەموو گەورەو بچوکێك لەسوپادا، بەحوکمی ئەو پەیوەندیەی کەدیوانی ئینشا لەگەڵ دیوانی سوپادا هەیبوو، هەروەها بەشداری ئەکرد لەدانانی پلانە سەربازیەکانداو سەرپەشتی کۆمەکی کردنو پرچەك کردنی سوپاو کەشتیگەلی دەکردو بەبەردەوامیش بەم ئەرکانە هەڵدەستا بەدرێژایی ماوەی کارکردنی لەگەڵ سەلاحەدین دا[1].

٣- **القاضي الفاضلو لەناوبردنی فاطمیە نەیارەکان:** القاضي الفاضل بنەماکانی جموجوڵە سیاسیەکانی لەسەرەتایی سەردەمی سەلاحەدین دا لەئەزمونی پێشتریەوە وەرگرتبوو لەکۆشکی فاتمیو ناو سوپاو کارکردنی لەگەڵ وەزیرو بەرێوەبەرەکاندا، دەرکی بەوەش کرد بوو کەئەم دەزگایانەو ئەو کەسایەتیانەی کەتیایاندا کاردەکەن لانکەیەبۆ ئەو پیلانانەی کەکۆتایی نایەنو پشتیوانی ئەو فێڵانەشن کەدوایی نایەن، دیارە قاضي لەگەڵ هەموویاندا مامەڵەی کردووەو، دڵنیابوو لەوەی کەدوو دڵی نانوێنن لەپەنابردن بۆ فەرەنجەکان سەرباری ئەو هەمووە نەهامەتیەی کەبەسەرئەوانو گەلی میسردا تێ پەڕی لەپێناو پاراستنی دەسەڵاتیاندا، بەتایبەت ئەگەر دەسەڵاتی سەلاحەدین یان ئەیوبیەکان بە مەترسی بزانن بۆ سەرخۆیان لێرەشەوە لەوکاتەوەی کەسەلاحەدین دەسەڵاتی پێ دا دەستی دایە دانانی سیخورو هەواڵگرەکانی لەناو ئەو دەزگاو کۆمەڵەو کەسانە دا کەئەیناسینو لەشەڕیان ئەترسا، ئەم دەزگاو کۆمەڵانەش دەستیان کرد بەجموجۆڵو پلان دانان بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی سەلاحەدین، ئەمینداری خەلافەتیش بوە سەرکردەی ئەم گروپانەو دەستی دایە جموجۆڵو چالاکی، ئاشکرا کردنی پیلانەکانیش لەئەرکەکانی دیوانی ئینشاو خودی قاضي فاضل بوو کەبەبەردەوامی چاودێری نوسەرانی دیوانی ئینشای دەکرد بەتایبەت ئەوانەیان کەئازاد کرابوون، هەوڵەکانی قاضي فاضیلیش رۆڵی هەبوو لەئاشکراکردنی پیلانی ئەمینداریو خیلافەتو توانرا لەناوببرێتو سەلاحەدینیش هێزی ئەرمەنەکانی لەناوبردو مەترسی نەهێشتن، کە بەدووەم هێز دادەنرا دوای سودانیەکان لەرووی هێزو ژمارەوە ئەوە بوو خانویەکی ئەرمەنییەکانی لەنێوان هەردوو کۆشکدا بەکۆمەڵێ سەربازی ئەرمەنەوە سوتاند، کەزۆربەیان تیرهاوێژ بوونو موچەی حکومەتیان هەبوو، چونکە ئەوانە هەوڵی ئەوەیان دابوو کە کۆسپ بۆ جموجۆڵی هێزەکانی سەلاحەدین دروست بکەن لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سودانیەکانداو هەستا بوون بەتیربارانکردنیان بۆیە بەسزای خۆیان

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٢٩.

گەیشتن، هەرچیشیان لێ مایەوە دوورخرانەوە بۆ صعید[1]. پاشان توانرا سامی دەوڵەتی فاطمي نەهێڵرێ لەماوەی پێنج مانگی یەکەمی دەسەلاتی سەلاحەدیندا، پاش دوو ساڵیش توانرا سیستمی کارگێڕی میسری بگۆڕێت بۆ سیستمی ئەیوبی سوننی نوێ، القاضی الفاضلیش رۆڵی هەبوو لەم گۆڕانکارییەدا کەرێخۆشکەر بوو بۆ دەستگرتنی تەواوی سەلاحەدین بەسەر میسردا[2].

### گێڕانەوەی رێکخستنی ئیداری لە میسردا:

القاضی الفاضل دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی نەخشەی لەناوبردنی رژێمی حوکمی فاطمي بە لەناوبردنی پیاوانی دەوڵەتو بەرپرسی دیوانەکانو نوسەرانی لایەنگری فاطمیەکان، بەحوکمی کارکردنیشی لەدیوانەکاندا ئاگادار بوو لەپیاوانی دەوڵەتو بەرپرسی دیوانو نوسەرانیو ئینتیمای سیاسیو مەزهەبیان، ئەوە بوو هاوڕێیەتی هەندێکیانو کێ بەرکێی هەندێکی تریانی کرد هەتاوەکو هەلی بۆ رەخسا بۆ لەناوبردنیانو شەویش ئەو هەلەی قۆستەوەو توانی ژمارەیەکی زۆر نوسەری شیعەی ئیسماعیلیو گاورو جولەکە لەناوبەرێت لەترسی ئەوەی کە لەگەڵ پاشماوەی فاطمیەکاندا هەستن بەپیلانگێڕانو پەیوەندی بکەن بەفرەنجەکانەوە، بەناوی ئەو دیوانانەوە کە کاری تیادا دەکەن، ئاماژەشی بەمەترسی ئەو نوسەرانە لەزیاتر لەنامەیەکی فەرمیدا بۆ خەلیفەی عەباسیو بۆ نورەدین دەدا، لەیەکێك لەنامەکانیشیدا کە لەبری سەلاحەدین ناردی بۆ خەلیفە المستضيء (٥٧٠/١١٧٤ — ١١٧٥ز)دا وەسفی بارودۆخی میسر لەژێر سایەی فاطمیەکان دەکاتو ئەڵێ: کۆشکەکانیان حەوشی پڕ سێبەرو هەوای فێنكو دیمەنی جوانی تیایە کە دڵڕفێنو هەست هەژێنەو پێنوسی نوسەرانیشیان وەك کاریگەری هەیە، ئەم گومانەشی لەجێی خۆیدا بوو و دواتر بەدی هات، کاتێ هەستان بە داڕشتنی پیلانێك بۆ لەناوبردنی دەسەلاتی سەلاحەدین، هەروەك چۆن ئەو نوسەرو ئیداریانەی لەکارخست کەگومانی لێیان هەبوو ئەوە بەهەمان شێوە ئەوانەی هێشتەوە کە بێگومان بوو لێیان چونکە پێویستی بەئیدارەو زانیاریو شارەزاییو هاوکاریان هەبوو لەجێبەجێکردنی نەخشەی کودەتاکەدا، لەپێشەوەی ئەوانەشدا الخطیر بن مماتی سەرۆکی دیوانی سوپاو یەکێك لەدۆستەکانی القاضی الفاضل، ئیبن مماتی خزمەتی دیوانی سوپای لەسەرەدەمی شاوردا کرد بوو و لەسەر دەستی ئەسەدەدین شێرکۆش چووە ناو مەزهەبی سوننەوە، بە بەردەوامی نزیك بوو لەقاضی الفاضلەوە هەتاوەکو ساڵی ٥٧٨ك کۆچی دوایی کرد، دوای خۆشی

---

[1] القاضی الفاضل (١٣٣ — ١٣٠).

[2] القاضی الفاضل (١٣٤).

ئەسعەدی کوڕێ مماتی کوڕی دیاری کرا بۆ سەرپەرشتیکردنی دیوان، ئەسعەدیش وەك باوکی دڵسۆز بوو بۆ القاضی الفاضل کەپشتی دەبەست بە بەڕێوەبردن و دڵسۆزی لەکاتی ئامادە نەبوونی لەمیسردا، هەروەها القاضی الفاضل الأثیر بن بیانی هێشتەوە کە بەرپرسی دیوانی النظر بوو بەهەمان شێوە سوننە مەزهەب بوو ئەم ئیبن بەیانەش لە القاضی الفاضل بەتەمەنتر بوو و کاتێ القاضی الفاضل یش هاتە دیوانی ئینشاوە ئەم پیاوە کاری تێدا دەکرد، کاتێ لەئەسکەندەریەشەوە گەڕایەوە بۆ قاهیرە داکۆکی لێکرد، القاضی الفاضل یش بەردەوام بوو لەکارکردن و پشت بەستن بەئیبن بەیان تەنانەت لەکاتی بەساڵاچوون و لەکارکەوتنیشدا موچەی بۆ بڕیەوەو بژێوی بۆ دابین کرد[1]، هەروەها ئەبوالحەسەنی مەخزومی هێشتەوە کە بەهەمان شێوە سوننە بوو وەك چاودێری دیوانی ئەنجومەن و مەجلیس و خۆشی سەرۆکایەتی دیوانی ئینشاو سەرپەرشتیاری گشتی وەك وەزیر گرتەدەست پاشان قاضی دەستی دایە ئاراستەکردنی دیوانەکان بەهاوکاری کردنیان بۆ خزمەتکردنی ئامانجەکانی سەلاحەدین و دەوڵەتەکەی[2] و پڕۆژە ئیسلامییە گەورەکەی.

٤- **القاضی الفاضل و زیندووکردنەوەی مەزهەبی سوننی لەمیسردا:** ئەسکەندەریە ناوەندی سەرەکی زیندووکردنەوەی مەزەبی سوننە بوو لەمیسردا، ئەمەش لەسەر دەستی چەند زانایەك روویدا کە لەمەغریبەوە هاتبوون وەك ئەبی بەکری الطرطوشی لەرۆژهەڵاتیشەوە وەك السلفی ئەم زانایانەی چەندین خوێندنگەیان تیادا دامەزراند کەکاریگەری زۆری هەبوو لەسەر زیندووکردنەوەی مەزهەبی سوننی، جیهادکردن دژ بەفەرەنجەکان ئەمەش هۆکاری پاڵپشتی کردنی ئەسەدەدین و سەلاحەدینمان لەلایەن خەڵکی ئەسکەندەریەوە بۆ روون دەکاتەوە سەبارەت بەقاهیرەش ئەوە وەك ئەسکەندەرییە، خوێندنگەو زانای سوننەی تیا نەبوو بەڵام ئەم بارودۆخە بەدەرکەوتنی سەلاحەدین لەسەر شانۆی سیاسی گۆڕا لەگەڵ ئەوەدا کە نورەدین و ئەسەدەدین سودیان لەهەندێ خەڵکی سوننە وەرگرت پێش وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لەلایەن سەلاحەدینەوە بۆ دەستخستنی پشتیوانیەکی جەماوەری بۆ جموجۆڵەکانیان لەناو میسردا بەڵام ئەم خەڵکە کەمە بەتەنها بەس نەبوو پێویستی بەشۆڕشێکی رۆشنبیری دەکرد کە بەهۆیەوە میسر بگێڕدرێتەوە بۆ مەزهەبی سوننی بەشێوەیەکی پلەبەندی، سەلاحەدینیش چاکسازیەکانی لەمیسردا بەدامەزراندنی چەند خوێندنگایەك دەستی پێکرد کە هەر چوار مەزهەبەکەی تیادا دەخوێندرا، یەکەمیانی بۆ

[1] النظم المالية في مصر زمن الأيوبيين (٩٣ — ٨٠).

[2] القاضي الفاضل ١٣٥.

مەزهەبی شافیعی بنیاتنا لەجێی زیندانی مەعونەدا، ئەو زیندانەی کەژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی میسری لەخۆ گرتبوو (٥٦٦)ك (١١٧٠ – ١١٧١)ز دا، ئەمەش یەکەم خوێندنگابو لەمیسردا. هەروەها لەسالی ٥٦٦ ك ١١٧٠ز خوێندنگایەکی بۆ مالکیەکان دامەزراند لەنزیك مزگەوتی عەمری کوڕی عاص کە بە القمحیە ناسرابوو، تقی الدین عمری کوڕی شاهنشاه ئەیوبی برازای سەلاحەدینیش خوێندنگایەکی بۆ شافیعیەکان دامەزراندن‌و چەند شوێنێکی بۆ وەقف کرد[1]. ئەم خوێندنگانە سەرەتای بنیات نانەوەی مەزهەبی سوننە بوو، دواتر خەڵکێکی زۆر تیایدا بەشداری کرد کەلەئەیوبیەکان‌و ئەمیریەکانیان لەسەردەمی سەلاحەدیندا لەمیسر، هەروەها القاضي الفاضل بەخوێندنگایەك بەشداری کرد کەیەکێك بوو لەو دەوڵەمەندترین ئەو خوێندنگایانەو بەشی زۆری کتێبەکانی گەنجینەی فاتمیەکانی تیادا دانا هەرچەندە بیرۆکەی بنیات نانی ئەم خوێندنگا سوننیانە لەشامەوە وەرگیرابوو لاسایی کردنەوەی نورەدین مەحمود بوو کەهەستابوو بەبنیاتنانی چەند خوێندنگایەك لەشامدا کەلەروی پرۆگرام‌و بابەتەوە نزیك بوون لەخوێندنگای نیزامی لەبەغداد بەڵام سەرپەرشتی کردن‌و پاڵپشتی دارایی‌و هەڵبژاردنی مامۆستایان تیایدا لەدەسەڵاتی القاضي الفاضل دا بوو، یەکێك لەچاکسازیە ئیداریەکانیشی لەسەردەمی وەزارەتی سەلاحەدیندا بوو، ئەویش بریتی بوو لەجیاکردنەوەی دیوانی (الأحباس) فاتمی کەسەرپەرشتی بەڕێوەبردنی دەزگا ئاینیەکان‌و کۆمەکی‌و هاوکاری کردنی لەرێی دیوانی (الأموال) دارایی یەوەو کردنی بەدیوانێکی سەربەخۆ کە راستەوخۆ وەزیر سەرپەرشتی دەکرد واتە سەلاحەدین ، پێش لەناو بردنی فاتمیەکان‌و دواتریش لەژێر سەرپەرشتی خۆیدا بوو پاش لەناوبردنیان، لێرەشەوە بوو بە بەرپرسی یەکەم لەبەڕێوەبردنی ئەم دەزگا گرنگانەو هەڵبژاردنی مامۆستاو قورئان خوێن‌و فەرمودەو ئیمام‌و وتاربێژ تیایاندا[2]، هەموو ئەمانە لەو هۆکارانەبوون کە بەهۆیانەوە گۆڕانکاری دەکرا، ئاشکراشە کە سەلاحەدین پشتی بە لێزانین‌و لێهاتوویی القاضي الفاضل ئەبەست لەهەڵبژاردنی ئەو کەسانە لەمیسردا، کاتێکیش کەچوە شام بارودۆخەکە بەوشێوەیە مایەوە، ئەوە بوو لەبواری پەروەردەیی‌و ئاینی دا ڕاوێژی پێ دەکرد، پاش ئەوەش کەسەلاحەدین میسریەکانی سازکرد بۆ کودەتا کردن‌و نینۆك کردنی دەوڵەتی فاتمی وەك باسمان کرد، دەستی دایە خۆئامادەکردن بۆ لەناوبردنی یەکجاری

---

[1] الخطط (٢/٣٦٤).

[2] القاضي الفاضل ل١٣٦.

ڕێوڕەسمەکانی خەلافەتی فاتمی ئەوە بوو لەساڵی ٥٦٥ك/ ١١٦٩ز دا حی علی خیر العمل محمدو علی خیر البشری مەقریزیش ئەوە بەیەکەم نەنگی دائەنێت کەتوشی دەوڵەت بوو[1].

- پاشان لەڕۆژی هەینی دەی ذی الحجةی ساڵی ٥٦٥ك/ ١١٦٩- ١١٧٠ز دا فەرمانی دا کەناوی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی لەوتاری هەینی دا بهێنرێت.
- پاش ئەوەش فەرمانی دا کە العاضد بەجۆرێك باس بکرێت کەگومان دروست بکات لای شیعەکان، ئەوەبوو وتاربێژ ئەیوت: خوایە گیان عاضد چاك بکەیت بۆ ئاینەکەت[2].
- زانا عیسای هەکاری کە کوردێکی نزیك بوو لە سەلاحەدینەوە دانا بەقاضي قاهیرە، ئەم کارەشی سەرەتایەك بوو بۆ گۆڕینی وەلا سۆزی خەڵکی قاهیرە کەزۆرینەیان لەئیسماعیلیەکان بوون[3].
- هەروەها قاضيیە شیعەکانی میسری لەسەرکار لابردو دواتریش دەستی گرت بەسەر موڵكو ماڵی عاضدو کۆشکەکانی داو ڕادەستی الطواشي بهاءالدين قراقوشی ئەسەدی کرد، ئەویش کاروبارەکانی گرتە دەستو چاودێری هەموو جموجوڵێکی دەکرد، تەنانەت خەلیفە عاضد وەك بەندکراوی لێهاتبوو لەکۆشکەکەیدا[4].
- لەسەرەتایی ساڵی ٥٦٧ك، ١١٧١ - ١١٧٢ز دا سەلاحەدین وتاری بەناو خەلیفەکانی فاتمیەوە هەڵوەشاندەوە بەشێوەیەکی پلە بەندی، لەهەفتەی یەکەم دا لەمحرمی ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١ - ١١٧٢ز دا ناوی عاضدی لەوتاردا نەهێشت، لەوتاری دووەمیشدا بەناوی خەلیفە المستضيئ بأمرالله أبي محمد الحسنی کوڕی المستخجد بالله وە وتار خوێنرایەوە وتاری فاتمی کۆتایی پێهات[5]، العاضدیش لەدەی محرم ی ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١ - ١١٧٢ز دا[6] کۆچی دوایی کرد، ئەم عاشورایەش جیاوازبوو لەو عاشورایانەی کەمیسریەکان لەگەورەبەرپرسانی دەوڵەتی فاتمیەوە بینیبویان، کەهەڵدەستان بەچەند بیدعەیەك لەوانە وتاری دڵتەزێنو شێوەن گێران بۆ ئالوبەیتی علی ﷺ بەشێوەیەك کەڕقو کینەی زۆری لەدەرونیاندا دەوروژاند بەهۆی ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوو درۆئاشکرایانەوە، پاشان جنێودان

---

[1] اتعاظ الحنفاء (٣/٣١٧).

[2] اتعاظ الحنفاء (٣/٣١٧).

[3] اتعاظ الحنفاء (٣/٣١٧).

[4] القاضي الفاضل ل١٣٧.

[5] اتعاظ الحنفاء (٣/٣٢٥ - ٣٢٦).

[6] القاضي الفاضل ل١٣٧.

بەهاوەڵانو خەلیفەکانی راشدینو ئەمەویەکان، پاشان ئەچونەوە بۆ ماڵ بۆ خواردنی قەرەخەرمانو چەند خواردنێکی تر کە بو بۆ نەریتێك بۆنەوەکانی دوای خۆیانو لەسەردەمی ئێستادا بەعاشورا ناسراوە، دواتر لەبەیانی رۆژی داهاتوودا ساڵێکی نوێ لەژیانیاندا دەستی پێدەکردو چاویان بەدوای خەلیفەدا دەگێڕا ئەویش خۆی ئەشاردەوە لەکۆشکەکەیدا لەرۆژی عاشوراداو لەچێشتینگاشدا قاضي القضاة "دادوەری گەورە"و شایەتحاڵەکان بەجلوبەرگی تایبەتەوە سواری ئەسپەکانیان دەبونو ئەرۆشتن بۆ مەزاری حسێنو دائەنیشتنو خوێنەرانی کۆشكو وتاربێژەکانیشیان لەگەڵدابوو، پاشان وەزیر دەهاتو دەچووە پێشەوەی مەجلیسو لەم لاو ئەولاشیەوە قاضیو بانگخوازی هەبوون، پاشان قورئان خوێنەکان ماوە ماوە قورئانیان دەخوێندو خەڵککەش هەموو بەخشوعەوە دەوەستان هەرکە لەخوێندنەوەکە دەبوونەوە شاعیرەکان هەڵدەستان، کە لەشاعیرانی دەرەوەی کۆشك بوون، چەند پارچە شعرێکییان دەخوێندەوە کە بەتایبەت بۆ ئەم بۆنەیە ئامادەکرابوو، شیعرەکانیشیان شیوەن بوو بۆ ئالو بەیت، جائەگەر وەزیر شیعەبوایە زۆر رۆدەچوون ئەگەر سوننەش بوایە زوو لێ دەبوونەوە بەم شێوەیە بۆ ماوەی سێ کاتژمێر دەمانەوە، دوای لێ بوونەوە لەقورئان خوێندنو هۆنینەوەی شعر، نێردراوەکانی خەلیفە ئەهاتنو بانگیان دەکردنو یەکەمین کەس کەدەرۆیشت وەزیربوو بەدەستەسرێکی بچووکەوە ئەچووەوە بۆ ماڵ، بەڵام قاضی القضاةو بانگخوازو هاورێکانیان ئەرۆشتن بۆ دەرگای زێری کۆشكو لەوێ دیمەنێکیان ئەبینی کەجیاوازبوو لەوەی کەپێشتر بینیبوویان، قاڵی یەگرانبەهاکان پێچرابوونەوە هەتاوەکو چەند حەسیرێکی سادە شوێنیان بگرێتەوە، بەرپرسی ئەو دەرگایەش دانیشتبوو چاوەڕێی دەکردن، ئەوانیش دائەنیشتن، خەڵکی ناوداری وڵاتیش لەزانایانو سەربازان لەدەوروبەرو تەنیشتیانەوەبوون، پاشان دووبارە قورئان خوێنەکان قورئانییان دەخوێندو پاشان شیعر دەخوێندرایەوەو ئامادەبووان دەستییان دەکرد بەگریان دواتر خوانی خەمگینی رادەخراو، هەزار قاپ نیسکێنەو ترشیاتو پەنیرو ماشتو هەنگوینو کولێرەی جواو جۆر دادەنرا...
کاتی نیوەرۆش بەرپرسی دەرگاو بەرپرسی خوانەکە دەوەستانو فەرموویان لەخەڵك دەکرد بۆ نان خواردن، یەکەم کەسێکیش کەدەهاتە ژورەوە قاضی پاشان بانگخواربوو دەرگاوانەکەش لەنزیکیاندا دەدەنیشت لەبری وەزیرو هەرکەسێك بیویستایە ئەهاتە ژوورەوە دوای نان خواردنیش هەمووان لەهۆڵەکە دەردەچوونو، خەڵکانێکیش بەگریانو هاوارەوە

بەقاهیرەدا دەگەران و بازرگانەکانیش هەتاوەکو عەسر دووانەکانییان دادەخست پاشان ئەیانکردەوە[1]. پاش ئەم بیدعانەش ژیان دەگەرایەوە بۆ دۆخی ئاسایی خۆی، القاضی الفاضل یش بەشداری لەم ئاهەنگانەدا دەکرد بەحوکمی کارەکەی و نزیکی لەدەزگای فاطمیەوە، بەڵام ئەم عاشورایە جیاواز بوو لەعاشوراکانی تر کەمیسرییەکان لەسەری راهاتبوون، چونکە قاضی القضاة و بانگخوازی تیادانەبوو، بەهۆی لەسەر کار لابرانیابوو، هەروەها شیعرخوێندنەوەو شیوەنکردن لەگەڕەکەکانی قاهیرەدانەما، چونکە ئەم ئاهەنگە بەجۆرێکی تربوو، کەئەویش ئاهەنگێرانبوو بەبۆنەی نەهێشتنی ئەو رسی و رەسمانەوە کەمیسرییەکان بۆ ماوەی دووسەد ساڵ ئەنجامیان ئەدا، هەروەها ئاهەنگی لەناوبردنی دانەرانی ئەو ئاهەنگو مەراسیمانەو هێماو ئاماژەکانی بوو، سەلاحەدینیش وەك وەزیر نەچوو بۆ ئەو شوێنەی کەناوی مەزاری حسینی لێ نراوە، بەڵکو چوو بۆ مزگەوتی عەمری کوڕی عاص بۆ نوێژکردن لەکەڵ کۆمەڵێك لەخەڵکی شام و میسردا دوای نوێژیش لەتەنیشت القاضی الفاضل وە دانیشت بۆ تاوتوێکردنی ئەو کارانەی کە لەهەفتەی پێشودا کودوویانە کەتیایدا خەلافەتی فاطمی هەڵوەشێنرایەوەو بانگەوازی تیادا بۆ خەلیفەی عەباسی کرا، لەوکاتەدا سەربازێك بەپەلە هاتە لایان و شتێکی پێوتن و چووە دەرەوە، سەلاحەدین و القاضی الفاضل یش بەشێوەیەك سەیری یەکییان کرد کەدڵخۆشی و خۆشحاڵی پێوەدیاربوو، پاشان سەلاحەدین دەم و چاوی گۆڕاو ووتی: ئەگەر بمانزانیایە لەم رۆژەدا دەمرێت— مەبەستی خەلیفە عاضدیوو— ناومان لەوتاری هەینیدا لانەدەبرد، القاضی الفاضل یش پێکەنی و ووتی: قوربان ئەگەر بیزانییایە ناوی لەوتاردا لانابەن نەدەمرد[2]، ئامادەبوانیش بزەیەك گرتنی بۆ ئەم سوعبەتەی نێوان وەزیر سەلاحەدین و قاضي الفاضل ی نوسەرو راوێژکاری کەدوا لاپەڕەی مێژووی دەوڵەتی فاطمی تیادا پێچرایەوە، ئەوەبوو العاضد کەدوا خەلیفەبوو لەم رۆژەدا مرد کەرۆژی عاشورای ساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١ز بوو واتە رۆژی یادکردنەوەی کوژرانی حسین کوڕی علی رضي الله عنه[3].

٥- **القاضي الفاضل و لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی:** مێژوونوسی میسری مەقریزی ئاماژە بەرۆڵی القاضي الفاضل دەکات لەو کودەتایەدا کەبەسەر دەوڵەتی فاطمیدا کراو، ئەڵێ: سەلاحەدین پشتی دەبەست بە القاضي الفاضل بر لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی و ئەم

---

[1] الخطط (١/٤٣١–٤٣٢–٤٩٠).

[2] أخبار الدولتين له القاضي الفاضل وة ل١٣٩.

[3] القاضي الفاضل ل١٣٩.

کارەشی بۆکرا، بۆیە کردی بەراوێژکارو وەزیری خۆی[1]. وشەی (پشتی بەست) ئاماژەیە بەرۆڵی القاضي الفاضل لەجێبەجێکردنی پلانی لەناوبردنی دەولەتی فاطمیدا، هەروەها هەڵبژاردنی القاضي الفاضلء دەستنیشان کردنی وەك وەزیر دەربڕی نرخاندنو پێزانینی سەلاحەدینە بۆ رۆڵی القاضي الفاضل لەو پلانە ترسناکەدا، هەروەها لەدامەزراندنی بنەماکانی دەوڵەتی ئەیوبیدا کەپێش ئەم پلانەبووو ئەم دەسنیشانکردنەش ئاماژەیەکی روونە بەدانانی سەلاحەدین بەرۆڵی القاضي الفاضل لە لەناوبردنی فاطمییەکانو گرنگی بۆ پلانەکانی سەلاحەدین لەداهاتوودا، سەلاحەدینیش بەرهەمی هەڵبژاردنەی القاضي الفاضلیوەك وەزیری خۆی هەتاوەکو مردنی چنیەوە، بێ گومان کارەکانی القاضي الفاضل لەئیدارەی میسریدا لەسەردەمی ئەسەدەدین شێرکۆداو نوسینەکانی لەسەردەمی سەلاحەدیندا ئاماژەیەکە بۆ رۆڵی گرنگی لەپاڵپشتی کردنی سوننەکان لەمیسردا، لەرێی نەخشەیەکی سوننیانەشەوە هەوڵی دەدا بۆ لەناوبردنی هۆکارەکانی بەش بوونی لەجیهانی ئیسلامی لەپێناو پاراستنی میسر لەهەرەشەی فرەنجەکانو ئازادکردنی فەلەستین، ئەم هەلەشی لەگەڵ سەلاحەدیندا بۆ رەخساو بەخێرایی جێبەجێی کرد، چونکە ئەو سەلاحەدینی بەسەرکردەیەکی بەتوانا دەبینی کەتوانای رزگارکردنی میسری هەیە لەمەترسی فرەنجەکانو ئەشتوانێ شتی زۆر پێشکەش بەئومەتەکەی بکات، بۆیە هەموو توانا فراوانەکانی خستە بەردەم سەلاحەدین لەزانیاریو ئەزمونو ئیدارەو ئەدەبو شیعر، بەیارمەتیو هاوکاری ئەویش جۆرێك لەسەقامگیری ناوخۆیی بۆ میسر دەستەبەرکرد دوای ئەو هەمووە نەهامەتیو مەینەتییەی کەتووشی گەلەکەی بوو سەلاحەدینیش دەرکی بەوەکرد کە القاضي الفاضل مرۆڤێکی گەورەیە لەرووی عەقڵو زانستو پلەوپایەوەو ئەتوانێ بیگەیەنێتە ئامانجەکانی لەمیسردا بەهۆی توانا فراوانەکانییەوە، بەم شێوەیە ئەم دوو پیاوە دەستیان نایە ناو دەستی یەکتر بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی گەورە کەهەریەکەیان لەبواری خۆیدا کاری بۆ جێبەجێکردنی دەکرد[2]. بەڕاستی القاضي الفاضل سیاسەتمەدارو پیاوێکی گەورەی دەوڵەت بوو کەواقیعەتی سیاسیو زیرەکیو نەرمی نواندنی لەگەڵ ئامانجێکی گەورەی وا کەخۆی بۆتەرخان کردبوو کۆکردبوویەوەو ماوەیەکی دوورودرێژ دانی بەخۆیدا گرت بۆ بەدیهێنانیو بڕوای وابوو کەرێگەی ئیسلام بریتییە لەرێبازی ئەهلی سوننەتوەهەر

---

[1] الخطط (٢/٢٦٦).

[2] القاضي الفاضل ل١٤١.

ڕێگەیەکی تر بەرەو ناکۆکیو لاوازکردنی بیروباوەڕو تواناکانمان ئەبات هەمیشەش خاکی فەلەستینیش هەمیشە لەیاد بوو، بۆیە کاتێ هەلێکی بۆ ڕەخسا بۆ گێڕانەوەیو دڵنیابوو لەڕاستگۆیی سەلاحەدین لەجیهادکردن لەپێناویدا، ئیرادەو لێبڕانی بەهێزبوو ئەگەر چی هەڵبژاردنی گەیاندیە پلەیەکی باڵاو پلەی وەزیری پێ درا لەدەوڵەتی سەلاحەدینداو بووە کەسی دووەم بەمەش گەشتە ئەو ئاستەی کەهەموو کەسێکی سیاسی بەئاواتییەوەیەتی لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیو سەرکەوتن لەدۆزەکەیدا، بەبەشداری کردنی بۆ پلان دانانو کارکردندا ئەمەش شایەتی بەهرەی زۆرو زیرەکی کەم وێنەی بۆدەدا[1].

هەروەها القاضي الفاضل وتەبێژی ڕەسمی سەلاحەدین بوو لەدەرەوەی ناوەوەری وڵاتدا، بەپێی قسەی ئیبن کثیریش لەماڵو منداڵی خۆشەویستربوو بەلایەوە[2]، سوڵتانیش هەمیشە ئاماژەی بەچاکەو لێهاتووی دەکردو[3]. ئەیوت: وامەزانن من ئەم وڵاتەم بەشمشێرەکانی ئێوە کردۆتە موڵکی خۆم، بەڵکو بەپێنوسی الفاضل بوو[4] هەروەها القاضي الفاضل پلەو پایەکی بەرزی هەبوو لەدەوڵەتداو دەستی ڕاستی سەلاحەدین بووە، چونکە وەزیرو ڕاوێژکاری بوو هیچ فەرمانێکی بەبێ ڕاوێژو تەکبیری ئەو نەدەکرد[5]، هەروەها ئەم زانا خوا ویستە چەند وانەیەکی گرنگمان فێردەکات لەوانە: دانەبڕان لەکاروباری خەڵکو کاری کۆمەڵایەتیو حکومیو سوربوون لەسەر دەسخستنی ئەزموونو گرنگی دەرکەوتنو تایبەتمەندی لەئەنجامدانی کارەکانداو دەستگرتن بەڕێبازی ئەهلی سوننەتو هاوکاری کردن لەگەڵ براکانیدا لەبواری بیروباوەری دروستو خستنەگەری وزەو تواناکان بۆ خزمەتی پڕۆژەی سوننی، هەروەها نموونەی سەرکردەی سوننیو پلانی عەمەلی پێشکەش بەسەلاحەدین کردو کەمتەرخەمی نەکرد لەدەربڕینی ڕاو ڕاوێژو ئەزموون بۆی، هەروەك ژیانی ئەم پیاوە خوێندنگەیەکە بۆ تێگەیشتن لەمەبەستەکانی شەریعەتو تێگەیشن لەبەرژەوەندیو زیانەکان (مصالحو مفاسد) و بنیاتنانی دەوڵەتو لەناوچوونی، هەروەها لەو بیریارو موفتیە گەورەی دەوڵەتی سەلاحەدینەوە فێری گرنگی مامەڵەکردنی دادگەرانە دەبین لەگەڵ خەڵکی سادەی شیعەدا لەگەڵ ویستنی خێرو خۆشی بۆیانو خوێن نەڕشتنیانو سوربوون لەسەر

---

[1] القاضی الفاضل ل١٥٧.

[2] القاضی الفاضل ل١٥٩.

[3] البداية والنهاية له دور الفقهاء والعلماء ل ١٣٢.

[4] النجوم الزاهرة (١٥٧/٦).

[5] الخطط (٣٦٦/٢) دور الفقهاء والعاماء ل١٣٢.

فێرکردنیان‌و چونکە بەکارهێنانی هێز بەرامبەر بە پیلانگێڕان‌و گروپە چەکدارە یاخییەکان‌و ئەو کەسانە دەبێت کەجگە لەهێز هیچ شتێکی تر سەدی نییە لەگەڵیاندا.

٦- **القاضي الفاضل‌و جیهادو تێکۆشان:** القاضي الفاضل هاوڕێیەتی سەلاحەدینی کرد لەهەموو غەزاکانیدا لەوڵاتی شام، پاشان لەمیسردا مایەوە بۆ سەرپەرشتنی کردنی ئیداری دارایی‌و کاری دەکرد بۆ پڕ چەککردنی سوپاو ئامادەکردنی گەشتی گەل، پاش ئەوەش گەڕایەوە بۆ وڵاتی شام‌و لەلای سەلاحەدین مایەوە هەتاوەکو دوا نەخۆشی‌و کۆچی دوای لەگەڵ قاضی ئیبن شەداد لەساڵی ٥٨٩ك/ ١١٩٣ز[1] هەروەها چەند هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی القاضي الفاضل هەبوون کەپلەو پایەو گرنگییان لەدەوڵەتی سەلاحەدیندا دوپات دەکردەوە، ئەوەبوو کاتێ سوڵتان سەلاحەدین لەمرج الصفر دا بوو لەوڵاتی شام لەساڵی ٥٧١ك/ ١١٧٦زدا خاچپەرستەکان داوای ئاگربەستیان لێکرد ئەویش بەناچاری رازی بوو، چونکە ئەو ساڵە لەشامدا نەهاتی بوو پاشان سوپاکەی بەهاوڕێیەتی القاضي الفاضل نارد بۆ میسر هەتاوەکو ئەندامانی سوپاکەی پشویەك بدەن‌و ترسیشی هەبوو لەوەی کە لەمیسردا باری ئەمنی تێك بچێت لەو ماوەیەدا کە ئەو لەوێ نییە، بۆیە ناردنی ئەم سوپایەی لەگەڵ القاضي الفاضل دا ئەوپەری لێزانین‌و ئامادە سازی بوو هەتاوەکو پارێزگاری لەئاسایشی ناوچەکە بکات[2]. لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە القاضي الفاضل هاوڕێی سوڵتان بوو لەجیهادو تێکۆشاندا، ئەوەش کەئەمە دووپات ئەکاتەوە ئەو نامەیەیە کەناردی بۆ سوڵتان سەلاحەدین‌و تیایدا پۆزشی بۆ دەهێنایەوە کەناتوانێ لەجیهادکردندا دژ بەخاچپەرستەکان لەعلی حارم لەساڵی ٥٧٣ك/١١٧٧زدا بەشداربێت، چونکە ئەیەوێ بەشداری حەج بکات/ ئیبن واصل ئەڵێ : القاضي الفاضل لەمیسردا مایەوە بەنییەتی حەجکردن لەساڵی داهاتوداو نامەیەکی گەشت بەدەستی سوڵتان کەتیایدا هاتبوو: سەبارەت بەنیگەرانی گەورەمان لەوکاتانەی کەبەتاڵە تیایدا لەوفەریزەیەی کە لەپێناویدا لەماڵ دەرچووەو پەیدابوونی بەربەستی بێ کۆتا ئەوە گەورەمان نییەتی خۆی بۆ حساب دەکرێت، چونکە خوای گەورە زاناو بەئاگایە لەبەندەکانی‌و پرسیار لەبکەر ناکات دەربارەی تەواوی کارەکەی، ئەگەر لەتواناو دەسەڵاتیدا نەبێت، بەڵکو پرسیار دەربارەی نییەتی دەکات یان لێپرسینەوەی بەپێی توانای خاوەنەکەیەتی بەسەر ئەوکردەوەدا جائەگەر گەورەمان هۆکارەکانی جیهاد بگرێتەبەر

---

[1] وفيات الأعيان (٧/٢٠٣-٢٠٢).

[2] الكامل في التأريخ (٧٩/١٠).

ئامادە سازی بۆ بکات ئەوە لەتەعەتو پەرستشی خوادادایەو پاداشتیش بەپێی ماندووبوونە، حەجیش بۆیە بەگەورە زانراوە لەبەر ئەو هەوڵو ماندوبوونەی کەبۆی دەدرێت، جا ئەگەر گەورەمان لەچەند رۆژێکدا هەموو شوێنەکانی ئازاد بکردایەو مەسەلەی نێوان هاوەڵگەرانو موسڵمانانی یەکلابکردایەتەوە ئەوە جیهاد پێویستی نەدەماو چاوەڕوانیو مانەوە لەسەنگەرەکاندا هیچ پاداشتێکی نەدەبوو[1].

٧- **القاضي الفاضل وەك ئەدیبێك:** القاضي الفاضل لەسەردەمی خۆیدا وەك ئەدیبیش ناسرابوو، قوتابخانەیەکی پەخشانیش بەناوی القاضي الفاضل وە ناسرابوو کەتوانی یادی لەنێوان ئەدیبانی زیندوو راگرێتو وەك ئیدارەیەکی بەتواناش ئیدارەکەی خستبوویە ریزی وەزیرە هەڵکەوتووەکانو وەك مرۆڤێکیش ژیانی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی ئەو گەلانەی کەمامەڵەی لەگەڵدا دەکردن بۆ جیهاد کردن لەپێناو رزگارکردنی ئەو ناوچە ئیسلامیانەی کەگەلانی رۆژئاوایی بەزۆر داگیریان کردبوو لەراستیدا توانای بەباشی چەند رۆڵێك ببینێت، تەنانەت مێوونوسان بەنمونەی مرۆڤی نموونەییان زانیوە لەسەردەمی خۆیداو زۆر کەس سەرسامن لەشێوازی نوسینی القاضي الفاضل هەرچەندە تێگەیشتنی بەلایانەوە ئاسان نییە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر رۆشنبیریەکی فراوانو شارەزایەکی ورد لەئەدەبو فەرموودەو فیقهو زانستەکانی ترو تێگەیشتنی قوڵی بۆ قورئان،چونکە القاضي الفاضل گەورەترین کتێبخانەی هەبووە لەسەردەمی خۆیدا، کەمێژوونوسان بەباڵایدا هەڵدەدەنو ستایشی ناوەرۆکی دەکەن، هەروەها باسی ئەوە دەکەن کەسەد هەزار کتێبی تیابووە، جا ئەگەر ئەمە وابێت ئیتر چۆن دارشتنی بەلاواز وەسف دەکرێت، هەروەها ئەم پیاوە تەنها ئیداریو سیاسی نەبووە، بەڵکو مامۆستایەکی گەورەش بوو لەمامۆستاکانی سەردەمی خۆی، ماوەی خانەنشینی خۆشی بەوانەوتنەوەو رۆشنبیرکردنی نەوەکان بەسەر دەبرد، شێوازی دەربڕینی القاضي یش شێوازی سێیەمی دەربڕینە کەتایبەتە بەزمانی عەرەبییەوە لەپاڵ دوو شێوازە باوەکەی تردا کەئەوانیش شیعرو پەخشانی مرسل- رەهان، دیارە دەربڕینی ئەدەبی عەرەبی سێ نموونەی هەیە: یەکەمو کۆنترینیان ئەو نموونە شیعریەیە کە سەرەتاکەی ئەگەرێتەوە بۆ شیعری نەفامی (جاهلی)و تائەمرۆش درێژ دەبێتەوە، شێوازی دووەمیان شێوازی پەخشانی رەها (النثر المرسل) کەبریتییە لەو شێوازەی کەکتێبەکانی مێژوو فەلسەفەو فقە و ئوسوڵو تەفسیرو زانستەکانی تری پێ نوسراوە کەئەقڵی عەرەبیو ئیسلامی دایهێنابون، شێوازی

---

[1] مفرج الكروب (٢/٦٨) القاضي الفاضل ل٣٤٩.

سێیەمیش بریتییە لەشێوازی پەخشانی هونەری لەم بوارەشدا ئەدەبی مەقاماتو ئەدەبی نامەکان (الرسائل) کەئەگەرێتەوە بۆ سەرەتای گۆڕانی ئەدەبی پەخشان کە لەعبدالحمید الکاتبدا خۆی دەبینێتەوە ئەم شێوازەش لەسەردەمی القاضي الفاضلو هاوڕێکانداو خەڵکی سەردەمیدا باوبوو، شێوازی پەسەند کراوبوو نەك هەر لەلایەنی رەوانبێژیەوە، بەڵکو لەلایەنی کاریگەریشیەوە، ئەو نامانەش کە القاضي الفاضل و هاوڕێکانی نوسیان چەند رونکردنەوەو بەیانێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو چەند مەقامێك بوون کەمانای جۆراو جۆریان لەخۆدەگرت[1]، ئەوەی کەهیچ گومانێك لەسەر ئەم نامەو نوسینانە ناهێڵێت لەڕووی شێوازو دەربڕینی زمانەوانییەوە ئەو ئاماژانەیە کەکراوە بۆ ئەدەبو دانانیو پەندو وتەی بەنرخو فەرمودەی پیرۆزو تێکهەڵکێش کردنی قورئانی پیرۆز،سەرباری ئەو وێنانەی کەبەکاریان دێنێ بۆ دەرچوون لەگەڵ رووداوەکاندا[2].

٨- **بانگەوازکردنی بۆ پاراستنی یەکێتی دوای کۆچی دوایی سەلاحەدین:** القاضي الفاضل توانی پارێزگاری لەکەسایەتی مەعنەوی خۆی بکات پاش کۆچی دوایی سەلاحەدین، هەرچەندە هەڵپەی نەدەکردو دڵگەرم نەبوو بۆ دەستێوەردان لەکاروبارەکانی دەوڵەتدا، بەڵکو دابڕانی لەسیاسەتو گۆشەگیریو تەرخان کردنی ساڵەکانی داهاتوو تەمەنی بۆ خوێندنگەی الفاضلیة ی هەڵبژارد بێ گومان وازهێنانیشی لەسیاسەت لەم ماوەیەدا بۆچەند هۆکارێك ئەگەڕێتەوە لەوانە: بەکۆچی دوایی سەلاحەدین ئەو پیاوەی لەدەست چوو کەهەموو هیواو ئاواتەکانی پێوە بەستبوو لەسەردەمیدا گەشتە پلەو پایەیەکی باڵا کەخەڵکی تر خەویشی پێوە نەدەبینی هەروەك بەشێکی زۆری ژیانی تەرخان کرد بۆ ئامۆژگاریو رێنمونی کردنی بەوپەڕی دڵسۆزیو خۆشەویستیەوە بەڕادەیەك کەنەیدەتوانی لەژیانیدا لێی دابڕێت ئیتر ئەبێ دوای مەرگو لەدەستدانی سەلاحەدینو نائومێدبوونی لەژیان چۆن بتوانێت؟ وەك لەهەندێ نامەشیدا ئاماژەی پێ دەدات ئاواتی شادبوونە بەدیداری سەلاحەدین لەرۆژیی دواییدا لەم بارەیەوە ئەڵێ: پەیمانمان نەداوە بەدوونیا لەسەر ئەوەی کەهەتاهەتایە تیایدا بژین یان مەرگ سەردانمان نەکات هەرچەندە دواش بکەوێت، خۆشەویستان بەجێمان دێڵن ئەگەر بیریشیان بکەوین ئەوە رۆژگارو زەمانە ئەو قۆناغانەن کە دەمانگەیەنن پێیانو هەناسەکانیش هەنگاوەکانمانن کە نزیکمان دەکەنەوە لێیان ئێمە هەموو رۆژێك بەرەو رووبان

---

[1] القاضي الفاضل ل٣٤٩، ٣٥٠.

[2] القاضي الفاضل ل٣٥٠.

هەنگاو دەنێین ئیتر چۆن دڵتەنگیمان کەم نابێتەوە لەحاڵێکدا کەرۆژانە ئەو ماوەی نێوانمان کەم دەبێتەوە[1]، کاتێ هاورێکانی دەبینی یادی دەکردەوەو ئەگەر خەڵکی بەدەوری خۆیدا ببینیایە وێنەی ئەوی دەهاتە پێش چاو، لەیەکێك لەنامەکانیشیدا بۆ عماد الدین ئەڵێ: رۆژە خۆشەکانیش وادەیەکی هەبوو کەکۆبوونەوە بوو لەگەڵ سەلاحەدیندا ، شەوی بینینی شەوی قەدربوو کاتێ ئەو دەژیاو ژیان خۆشبوو، کاتێ مردیش مردن خۆش بوو، جائەگەر کەسێك دوو شتی دژ بەیەکی بەهۆیەوە خۆش بێتو دوو قۆناغیش خۆش بکات لەکاتێکدا کەژیان هەر بەیەکیانەوە خۆشە ئەوە دڵەکان ناهەقیان نییە ئەگەر خورپەیان پیابێتو چاوەکانیش هەقیانە فرمێسك ببارێنن[2]، هەروەك دوای کۆچی دوای سەلاحەدین القاضي الفاضل وەکو بزوێنەری سیاسی نەمایەوە، چونکە دەوڵەت دابەش بووو ئەو کارەش کەپێی هەڵدەستا لەسەردەمی سەلاحەدیندا دابەش بوو بەسەر چەند کەسێکدا، کەلەنێوانیاندا کەسانێك هەبوون کەئەو لێیان رازی نەبوو، وەك صفي الدين کوڕی شوکر وەزیری الملك العادل ضياء الدين وەزیری الملك الأفضل کەهەر لەسەرەتا هەوڵی دا هەتاوەکو لەهاوڕێیانیو لەباوكو راوێژکارانی دور بخاتەوە، هەروەها القاضي الفاضليش لەوەتێگەیشت کەکۆچی دوای سەلاحەدین کۆتایی رێگەیە بۆ ئەو لەهەندێ لەنامە برایانەکانیدا " الرسائل الأخوانية" هەستو نەستی خۆی دەربڕی کەلەیەکێکیاندا دەڵێ: من بێزاربووم لەژیان، چونکە دوای ئەوەی وەك چاو خزمەتم دەکردو وەك پوشم لێهاتو تەمەنیش ناخۆشی زۆربوو، بەلام لەهەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کەلەکۆتایی پشتیوانی دا بوو لەکاتێکدا کەهێزو توانامان بەرەو لاوازی دەچوو[3].

ئەشتوانین بڵێین بەکۆچی دوای سەلاحەدین خەونێکی گەورەی القاضي الفاضل لەبارچوو، کەبەشێکی زۆری تەمەنیو ژیانی بۆ تەرخان کردبوو، ئەوەش بەدابەشکردنی ئەو وڵاتەی کەماوەیەکی زۆر هەوڵی یەکخستنیو بەهێزکردنی دا لەنێوان کورەکانی سەلاحەدیندا کەکەوتنە کێبڕکێ کردن لەسەریو خۆپەرستانە لەسەری دەجەنگانو دوژمنی خۆ مەلاس داوی سەرسنوریان لەبیرکردبوو، ئەوەبوو قاضي الفاضليش بانگهێشتی دەکردن بۆ هاوپەیمانێتیو هەوڵی لێك نزیککردنەوەیانی دەداو هیچ بۆنەیەکی نەهێشتەوە کەتیایدا پێویستی یەکخستی ریزەکانیان بیرنەخاتەوە، بۆیە هەستا بەنوسینی نامەیەکی سەرەخۆشی کەتیایدا هاتبوو: وادەرئەکەوێ ئەگەر

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٣٤٤.

[2] الكتاب الروضتين لە القاضي الفاضل ل٣٤٦.

[3] القاضي الفاضل ل٣٤٦.

ئێوە ڕێك بكەون ئەوە تەنها كەسايەتی بەڕێزی ئەوتان لەدەست داوە، بەڵام ئەگەر وانەكەن ئەوە نەهامەتییەكانی داهاتوو لەكۆچی دوای باوكتان گەورەتر دەبن و ئەوەش گەورەترین نەهامەتییە[1].

هەروەها القاضي الفاضل هەستا بەبینینی ڕۆڵی ناوبژیوان بۆ سوڵحكردن لەنێوان العزيز عثمان كوڕی صلاح الدینی پاشای میسرو الأفضل ی كوڕی صلاح الدین پاشای شام[2]. هەروەك كاری دەكرد بۆ یارمەتیدانی العادل أبی بكری برای صلاح الدین بەتەمەنترین خزمی سەلاحەدین و بەئەزموونترینیان هەتاوەكو هەڵوێستی سەربەرزانەو خۆڕاگرانە بنوێنێ دژ بەهەڕەشەی خاچپەرستەكان ئەوەبوو لەنامەیەكدا لەساڵی ٥٣٩ك/١١٩٦ز دا بۆی نووسی: ئەوەی كەپێشهاتووە لەگەشتنی دوژمنی نەفرەت لێكراو بۆ نزیك بەیروت مەترسییەكە بۆ وڵات كەئافرەتی شیردەر لەهۆش خۆی دەبان و تەنگانەیەكە كەهزرەكان توشی تەنگانە ئەكا، ئیسلامی ئەمڕۆ پێییەكی جێگیری هەیە ئەگەر بخلیسكێ و هەموو شتێكتان لەدەست دەچێ و ئەگەر جێگیریشبێ ئەوە سەركەوتن مسۆگەرەو ئەو پێیەش پێی العادلیە یەو هیمەتیش هیمەتی پێشینەیی شمشێربازانە، جا بۆ خواو لەبەر خوا دامەزراوبن و شوێن بەدوژمنتان لێژبكەن و لەبەر خوا شەو نخونی بكێشن، چونكە ئەم شەو شەوی خەو نییە، گوێ بەقسەی ئەم و ئەو مەدەن و باسی هەڵەی ئەم و ئەو كێ هاتووەو كێ نەهاتووە مەكەن، بەڵكو بزانن كەئێوە هەموو ئیسلامن و بێ باوەڕانیش بەهەموویانەوە هاتوون، هەریەك لەئێوە سێبەری خوان جائەگەر خۆ ڕاگربن ئەو سێبەری خوا هەرگیز ناسڕێتەوە ئارامبگرن، چونكە خوا پشتیوانی ئارامگرانە، ئەمە تەنها پەڵە هەورێكەو تێپەر دەبێ و شەوێكەو ڕۆژی بەسەردادێ و بازرگانییەكەو قازانج دەكات[3]، بەڵام پاش ئەوە بینی چەند شارێكی تر كەوتە دەست فرەنجەكانەوە بۆیە هەناسەی هەڵ دەكێشا بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو یەكێتییەی كەسەلاحەدین بنیاتی نا، ئەمەش القاضي الفاضلی گۆشەگیرتركردو ئەو نەخۆشیانەش كەكەڵەكەبووبوون بەسەریەوە هۆكارێك بوو بۆ دورخستنەوەی لەبارودۆخی سیاسی، چونكە جەستەی لاوازو پڕ نەخۆشی بوو، ئەمەش وایدەكرد كەلەهەندێ غەزادا دوابكەوێت لەسەردەمی سەلاحەدیندا، لەنامەكانیشدا ئاماژەی زۆر هەن بۆ نەخۆشی و لاوازی كەپاش وەفاتی سەلاحەدین زیاتربوون[4]، لەنامەیەكیشدا بۆ عیمادی ئەسفەهانی هاورێی ئەڵێ: گەورەمان ئەزانێ كەسی بچووك حاڵی چۆنە ئەگەر گەورەكەی لەدەست بدات، هەروەها لاوازو كەم توانا ئەگەر بانگبكرێت بۆ

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[3] الكتاب الروضتين لە القاضي الفاضل ل٣٤٦.

[4] القاضي الفاضل ل٣٤٦.

تێکۆشان ئەڵێی دنیام نەناسیوە هەتاوەکو ئەم ڕۆژانە، هەرگیز ناڵێی من بووم بێ دەسەڵاتیم بۆ کاتێ مەرگ دانابوو، من چاوەڕێم دەکرد لەشەودا بەخەوتوویی بمرم یان لەجێگاشدا بەسەرسامییەوە[1]. هەروەها لەنامەیەکی تردا وەسفی باری جەستەی خۆی بۆ دەکات و ئەڵێ: ئەم نامەیەم لەکاتێکدا نووسی کەقاچم تووشی چەند لوویەك بووەو لەپێ کەوتوومو زەردوو ڕەش هەڵگەراوم، هیچ شوێنێکم باش نییە جگە لەنەخۆشیەکەمو کاتێ بەتەنیام هاوار یەسەر شەیتاندا دەکەم[2]. هەروەها لەنامەیەکی تردا بۆی ئەڵێ: سەبارەت بەباری جەستەم ئەوە هەر مەپرسە جومگەکانم بێ هێزو دانەکانم لەق و لۆق بوون و لوی قاچەکانیشم ئاگری بەرداوەتە گیانم، شتێکیشم بۆ زیادبووە کەوەك کەم بوونەوە وایە ئەویش ئەو گۆچانەیەکە سێبەری هاتۆتە پاڵ سێبەرم[3].

هەروەها وەسفی ئازارەکانی دەکات لەکۆتایی ژیاندا بۆ عماد الدین و ئەڵێ: هەڵسوکەوتی هەرزەکارانیش ئاگرێکی هەڵگیرساوە، پێم وایە ئارامگرتن لەسەر نەخۆشییەکە زۆر خۆشترە لەمامەڵەکردن لەگەڵ ئەواندا، بۆیە برسیم ئەبێت و داوای خواردن ناکەم تینوم ئەبێت داوای ئاو ناکەم، دەستم ڕائەخەمو ئەڵێم بەسەریدا بڕۆن و قاچم درێژ ئەکەمو ئەڵێم رایکێشن[4].

٩- **کۆچی دوای القاضي الفاضل:** دوای ئەم هەمووە ئازارە جەستەیی و مەعنەویانە لەشەشەمی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٦٩ك/ ١١٩٩زدا کۆچی دوای کرد، عمادی ئەسفەهانی دەربارەی ڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەڵێت: نەهامەتی گەورەو بەڵای مەزن و کۆستی پیاو چاکان لەم ساڵەدابوو ئەویش بەکۆچی دوای القاضي الفاضل بۆ زێدی مانەوەی هەتاهەتایی لەماڵەکەیدا لەقاهرە[5]، هەروەها باسی ئەوە دەکات کەشەوێ پێش مردنی لەخوێندنگاکەیدا کاری کردووەو لەگەڵ زانا ئیبن سلامدا دانیشتووەو باسی چەند شتێکییان کردووە، ئەوشەوەش لەشەوەکانی تر ڕووخۆشترو گەشتربوو، باس و قسەکانیان خۆش بوو دانیشتنەکەیان درێژەی کێشاو پاشان بەلەش ساغی و زمان پاراوییەوە بەرەو ماڵەکەی بەڕێ کەوت و بەخزمەتگوزارەکەی ووت: گەرماوەکەم بۆ ئامادەبکەو پاش خەوتنیشم دامپۆشە ئەوەبوو لەبەرە بەیاندا هاتە لای بۆ ئاگادارکردنەوەی، بەڵام ئەو دەنگی خزمەتگوزارەکەی نەبیستوو ئەویش نەیدەزانی کەمەرگ لەقسەی خستووەو شتنی لەکەوسەر بێ پێویستی کردووە

---

[1] القاضي الفاضل ل٣٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[3] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[4] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[5] الكتاب الروضتين له القاضي الفاضل ل٣٤٧.

لەشتنی دونیا کاتێ باوکی هاتە لای بینی بێ دەنگو رووە، زانی کەوادەی مەرگی هاتووە بۆیە ئەو رۆژە تا ئێوارە بەدەنگێکی نزم دەینالاند، دەیزانی کە ئەو فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێکردووە پاشان بەدڵخۆشییەوە کۆچی دوایی کرد[1]. عماد الدینی ئەسفەهانیش بەم جۆرە باسی کۆچی دوای دەکات: بەشەهیدبوونو سەربەرزی کۆچی دوای کردو خوای گەورەش وەسییەتەکەی بەدی هێناو لەوەشدا چاوی لەسەروەری هەموان کرد، لەبەر ئەوەی کەهیچ کارێکی چاك نەمابوو کەلەژیاندا ئەنجامی نەداتو مژدەی بەهەشت نەما کاری بۆ نەکاتو هەموان قەرزاری چاکەکانی بوون، وەقفەکانیشی بۆ کاری خێر لەژمارە نەدەهاتن بەتایبەتی ئەو وەقفانەی کە بۆ رزگارکردنی دیلی موسڵمانانو یارمەتیدانی زانستخوازانی شافعیو مالیکی مەزهەب لەخوێندنگەکەیدا دابینی کردبوو، هەروەها هاوکاری هەتیوان بوو بەو خێروبێرەی کەرۆژانە بەسەریدا دەرژاندن، بەم شێوەیە ژیانی دووەمی لەرۆژی دوایدا بۆخۆی مسۆگەرکردو، سوڵتانیش رەحمەتی خوای لێبێت مەبەستی سەلاحەدینە یەکێك بوو لەشاکارەکانی ئەوو پایەو کۆڵەکەی دەوڵەتەی کە ئازادکردنی هەرێمەکانیش دەرەنجامی راکانی ئەوبوون[2].

### دووەم: الحافظ السِّلفي:

الحافظ أبو طاهیر أحمدی کوڕی محمدی کوڕی أحمدی محمدی سیلەفی ئەسفەهانی[3] یەکێك لەو زانایانەی رۆژهەڵات کەکۆچیان کرد بۆ میسرو لەئەسکەندەریەدا نیشتەجێبوونو خوای گەورە خەڵکێکی زۆری لێ سوودمەندکرد لەبڵاوکردنەوەی مەزهەبی سوننەدا.

١- **هاتنی بۆ ئەسکەندەریە:** سیلەفی لەساڵی ٥١١ك هاتە ئەسکەندەریەو لەو کاتەشدا تەمەنی سیو شەش ساڵ بوو، ئەزموونی باشی هەبوو و توانی زانستی زۆر دەست خۆی بخات، لەبواری پێگەیشتووی هزرو پسپۆڕی لەبواری زانستی فەرموودەدا گەشتە ئاستی زانا پسپۆرەکان، چونکە ئەو وڵاتی زۆر گەڕابوو توانیبووی بەخزمەت زانای زۆر بگاتو زانا گەورەکانی بواری فەرموودەی بینیبوو لەبەر دەستیاندا شارەزاییەکی باشی لەزانستی (الروایة) گێڕانەوەی فەرموودەو بنەماکانی فەرموودەو زانستەکانیدا پەیدا بکات، لەکتێبەکانیشیاندا شتی جوانو بەسوودی هەڵدەبژاردو بەخەتی خۆشی چەند بەشێکی زۆری

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٣٤٧.

[2] هەمان سەرچاوە ل٣٤٨.

[3] وفیات الأعیان (٢٢٥/١) الحافظ أبو طاهیر السلفي ل١٦.

نوسیەوە[1]. هەروەها شارەزایو ئەزموونێکی باشی هەبوو لەنوسینو دانانی کتێبدا، چونکە پێشتر فەرهەنگێکی بۆ شێخەکانی لەئەسفەهان دانابوو فەرهەنگێکی تریشی بۆ شێخەکانی لەبەغدادا نوسیبوو[2]، هەروەها شارەزاییەکی باسی وتنەوەی فەرمودەو فێرکردنی هەبوو، چونکە ئەو کارەی پێشتر لەئەسفەهاندا کردبوو لەساڵی ٤٩٢ک،..... هەروەها لەکاتی نیشتەجێ بوونیدا لەدیمەشق سەرقاڵی وانە وتنەوەبوو لەساڵی ٥٠٩ بۆ ٥١١ک دا بێگومان رۆشنبیری سیلەفی لەکاتی هاتنیدا تەنها لەبواری فەرموودەدا کورت نەبوبویەوە،بەڵکو زاناو فەقیە بوو لەمەزهەبی ئیمامی شافعیداو فیقهی لەخوێندنگەی نیزامی بەغداد خوێندبوو لەسەر دەستی ئەلکیا ئەلهەرراسیو فخر الاسلام ئەلشاشیو یوسف کوڕی عەلی زنجانی، هەروەها سیلفی بەباشی زانستی خوێندنەوەکانی قورانی (قراءات)ی دەزانیو شارەزابوو لەپیتو شێوازەکانیو لەسەردەستی زانایانی بەناوبانگ ئەو زامستەی خوێندبوو[3]. الذهبی ئەڵێ: لەخەتی الحافظ عبدالغني المقدسی یەوە (خطوط المشاریخ) سیلەفیم لەزانستی قراءات دا نقلێ کردووە بەپێی خوێندنەوەی عاصم[4] لەسەردەستی أبی سعد المطرز خوێندویتی، رێوایەتی حمزەشی[5] الکساء ئیشی بۆ علی محمدی کوڕی نصر القصارو ریوایەتی قانونیشی لەنصری کوڕی محمدی شیرازییەوە وەرگرتووە[6] و رێوایەتی قونیلیش[7] لەعبداللەی کوڕی أحمد الخرقیو لای هەندێ زانای تریش لەساڵێ ٤٩١دا خوێندویتی، جگە شارەزایی سیلفی لەفەرموودەو فقهو زانستی خوێندنەوەکانی قورئان پێش نیشتەجێ بوونی لەئەسکەندەریەدا، شارەزاش بوو لەئەدەبو زمانی عەرەبی، ئەمانەشی کاتێ خوێندبوو کەلەبەغدابوو لەسەر دەستی زانای زمانەوانی بەناوبانگ زەکەریای کوڕی یحیی ی کوڕی عەلی تەبریزی شێخ ی ئەدەب لەخوێندنگەی نظامییەدا، هەروەها شاعیرێك بوو شعری دەنووسیو چێژی لێدەبردوو حەزی لەبیستنی دەکردو مەجلیسو دانیشتنەکانی کەبۆ فێرخوازانی فەرموودەسازی دەدا بەچەند درێژە شیعرێك کۆتایی پێدەهێنا کە دانایيو ئامۆژگاری

---

[1] سیر أعلام النبلاء له الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٦.

[2] أبو طاهير السلفي ل٩٦.

[3] أبو طاهير السلفي ل٩٧.

[4] ئەبوبەکری کوری عاصم کوری أبی النجود لەساڵی ١٢٧ ك وفیات الاعیان (٢/٢٢٤).

[5] حمزەی کوری حەبیبی کوری عمارە ناسراو بە زیات.

[6] عیسی ی کوری وردان زەرقی کەنازناوی قانونی لێ نرابوو قورئان خوێنی مەدینە.

[7] قونیلی عەبدوو لرەحمانی کوری خالیدی مەککی، بەرپرسی پۆلیس بوو لەمەککەدا.

لەخۆگرتبوو[1]، سیلەفی ئەسکەندەریەو خەڵکەکەی خۆشدەویست، چونکە ئەوان ڕێزیان لێگرتبوو ئەویش بەشوێنێکی گونجاوی زانی بۆ نیشتەجێبوون، چونکە ئەیتوانی لەهەمان کاتدا سودبەخشو سومەندیش بێت بۆیە بەشێوەیەکی کاتی دەستبەرداری بیرۆکەی چوون بۆ ئەندەلوس بووو ئەسکەنەریەی کردە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی ئەم بڕیارەشی بۆ چەن هۆکارێك ئەگەرایەوە سەرباری ڕێزو خۆشەویستی خەڵکی ئەسکەنەریە بۆی، لەو هۆکارانەش:

- هەڵکەوتەی جوگرافی ئەسکەندەریە کەئەکەوێتە ناوەندی وڵاتی جیهانی ئیسلامی بەتایبەت نێوان حیجاز لەڕۆژهەڵاتەوەو مەغریبو ئەندەلوس لەڕۆژئاواوە ئەمەش کردبووی بەناوەندی بەیەکگەیشتنی ئەو حاجیە ئەندەلوسیو مەغریبیانەی کەتیایدا پشوویان دەدا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەکاتی چوونیان بۆ سەفەری حەجو گەڕانەوەیان لێی، ئەویش سودی لەوکاتانەدا وەردەگرتو لەگ'ڵ زاناو ئەدیبو شارەزایاندا کۆدەبوویەوەو زلنستو ئەدیبو ڕۆشنبیرییان ئاڵوگۆر دەکرد هەر دوولا سودیان لەیەکتری وەردەگرت.
- ئەسکەندەریە لەسەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچیدا ناوەندی بەیەکگەیشتنی زۆرێك لەزانایانی شام بوو کەوڵاتەکانیان بوببوە گۆرەپانی جەنگە خاچپەرستەکانو هەندێ لەشارەکانیشیلن کەوتە دەستی خاچپەرستەکان وەك قودسو ڕەملەو زۆرێك لەشارە کەناریەکانی فەلەستین[2]، ئەمەش ئەو زانایانەی ناچارکرد بۆ چۆڵکردنو بەجێهێشتنی.
- ئاوارەبوونی ژمارەیەکی زۆر لەزانایانی موسڵمانی صلقلیە بەرەو ئەسکەندەریە دەای ئەوەی کەنۆرمان دورگەکەیانی داگیرکرد لەنیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچیداو ئاوارەبوونی ژمارەیەکی تریش لەزانایانی ئەندەلوس لەئاکامی ئەو قەیرانە سیاسییە یەك لەدوای یەکانەی کەهەندێ لەشارەکانی ئەندەلوس دووچاری بوو، ئەمەش وای کرد لەزۆرینەی زانایان کەکۆچ بکەنو داوای پەنابەرێتیو پاراستن بکەن وەکو زانای مالیکی بەناوبانگو ئەبوبەکر طةرطوشیو چەند وانایەکی تر.
- خەڵکی ئەسکەندەریە بەهرەمەندبوون لەئازادی بیرو باوەڕی ئاینی– بەبەراورد لەگەڵ قاهیرەدا هەرچەندە بەشێوەیەکی فەرمی بەژێر دەستەی مەزهەبی فاطمی دانران، بەڵام سوننی بوونو پەیرەویان لەمەزهەبی پێشەوا مالیك ئەکرد، ئەم ئازادییە ڕێژەیەش وایکرد لەو کەسانەی کەدەهاتنە میسر کە رووبکەنە ئەسکەندەریە لەبری قاهیرە بۆ نیشتەجێ بوون

---

[1] الحافظ أبو طاهير السلفي ل٩٩.

[2] الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٠٠.

تیایـدا هـەتاوەکو دووربـن لەفـشارەکانی دەوڵـەتی فـاطمی شـیعە کەپێـچەوانەیە لەگـەڵ بیروبـاوەری سـونیدا، ئـەم هۆکارانـەو چـەندین هۆکـاریتریش وایکـرد لـە الحـافظ سـیلەفی کەلەئەسـکەندەریەدا نیـشتەجێ بێـت، بـەڵام بەرەبـەرە تیایـدا سـەقامگیربوو، لەکۆتایـشدا لەکاتێکدا کەتەمەنی بەرەو شەست ساڵ دەرۆیشت هاوسەرگیری لەگەڵ– ست الاهـل–داکـرد کەخەڵکی ئەسکەندەریەبوو، بەم شێوەیە باری شانی قـورس بـوو، پاشـان بەتـەواوەتی وازی لەکۆچبەریهێنا دوای ئـەوە کـەوالی ئەسـکەندەریە ئـیبن سـەلار خوێندنگـەی عادلیـەی بـۆ بنیاتناو سەرپەرشتی کردنی پێسپاردو ئـەویش بەخۆشحاڵیەوە تیایـدا نیـشتەجێ بـوو ئـەو شارەی جێنەهێشت هەتاوەکو کۆچی دوای کرد[1].

٢- **چالاکی زانستیو خوێندنگەکەی:** بەگەشتنی الحافظ سیلەفی بەئەسکەندەریە خێـرا دەسـتی دایە وتنەوەی فەرموودە لەساڵی ٥١١دا، شێخ أبو عبداللەی رازی ناسراو بەئیبن خطاب زانای فەرموودە لەئەسکەندەرییەدا لەساڵی ٥٢٥ك داکۆچی دوای کـرد، سـیلەفی شـوێنی گرتـەوەو بووە تاکە شێخو زانای فەرموودەی لەئەسکەندەرییەدا بەبێ رکابەر، پاشـان رۆژ لـەدوای رۆژ ناوبـانگو ناسـراوی زیـاتر دەبـوو، حاجییـەکانی ئەندەلوسـیش لەهـەموو شـوێنێکدا بـاسو هەواڵیان دەگەیاندە ئەو شوێنەی کەبۆی دەچوون، ئەمەش وای کرد کەقوتابیانی فـەرموودە لەمیسرو دەرەوەیدا رووی لێ بنـێنو کـۆچو باریـان بپێـچنەوە بـۆلایو لەهـەموو شـوێنێکەوە رووبکەنە ئەسکەندەریە هاتاوەکو بەزانای گەورە فەرموودە بگەن، بەم شێوەیەش وتنـەوەی فەرموودەو گێڕانەوەی لەئەسکەندەریەدا گەشەیکردو شوێنی شیاوی خۆی گرت لەم بـوارەی خوێندنـدا، ئـەڵێن: ئەسـکەندەریە سـەر بەمیـسربوو، خوێنـدنو وتنـەوەی فـەرموودە تیایـدا لاوازبوو هەتاوەکو سیلەفی تیایدا نیشتەجێ بوو پاشان خەڵکی روویان تێکرد بۆ فـەرموودەو زانستی خوێندنەوەکان[2].

٣- **خوێندنگـەی عادلیـە (السیلیفیە):** سـیلەفی مـاوەی چـارەکە سـەدەیەك ناوبـەناو وانـەی دەوتەوە ماوەیەك لەمزگەوتداو ماوەیەك لەماڵی خۆیـدا هـەتاوەکو أبـو الحسن کـوڕی سـەلار ناسراو بەالملك العادل بووە والی ئەسکەندەریە، ئەم والیەش زۆر رێـزی لێنـاو خوێندنگەیـەکی بۆ بنیاتنا بەناوی العادلیە ئەمەش ئاماژەیە بەناوی "العادل"ی دامەزرێنەری، پاشـان بـەناوی سیلەفیە ناوی دەرکرد وەك ئاماژەیـەك بـۆ سـیلەفی مامۆسـتا تیایـدا[3]، دکتـۆر جمالـە الـدین

---

[1] الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٠١.

[2] الاعلان بالتوبيج لمن ذمّ التأريخ ل٢٩٤.

[3] الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٠٤.

شیال یش لەکتێبی (أعلام الاسکندریة) دا باسی ئەوە دەکات کەلەساڵی ٥٤٤ك بنیات نراوە[١]، هەروەها دکتۆر حسین عبدالحمید صالح یش هەمان رای هەیە[٢]، سەرچاوە مێژوییەکانیش ئاماژە بەوەدەکەن کەئیبن سەلار سونییەکی بەرەچەڵەك کوردبووە[٣]، پابەندبوونی خۆی بەبیروباوەڕی ئەهلی سونەو جەماعەتەوە کاتێ ئاشکراکردووە کەبوەتە بەرپرسی سەربازگەی ئەسکەندەرییە، پاشان هەستا بەنامە ناردن بۆ نورەدین محمودی فەرمانڕەوای حەلەب بۆ هاوکاریکردن دژ بەدەسەڵاتی فاطمیەکان بەم جۆرەش پەیوەندی خۆشەویستیو دۆستایەتی نێوانیان پتەوبوو، نورەدین کۆمەکی دارایی دەکرد، چونکە ئیبن سەلاریش وەك ئەو سوونەبوو، هەروەها لەبەر ئەوەی نورەدین بەهیوای ئازادکردنی میسربوو[٤] . لەوانەشە نورەدین ڕێنمایی ئیبن سەلاری کردبێت لەنامەکانی نێوانیاندا کەهەمان ئەزموونی سوریا جێبەجێ بکات بۆ لەناوبردنی مەزهەبی فاطمی لەڕێگەی کردنەوەی خوێندنگەوە ئیبن سەلاریش هەستا بەکردنەوەی ئەم خوێندنگەیەو وانە وتنەوەو سەرپەرشتی کردنی سپارد بەزانای گەورەی فەرمووده حافظ ی سیلەفی سوننە مەزهەبی[٥]. سرەشتیش بوو ئەم شتانە هەمووی لەسەردەمی فەرمانڕەوای ئیبن سەلار لەم شارەدا ڕوویدات پێش ئەوەی دەست بگیرێت بەسەر وەزارەتدا لە ١٥ی شەعبانی ساڵی ٥٤٤ ك، خەلیفەی فاطمی الضافر هەستی بەمەترسی ئیبن سەلارو خوێندنگە سونییەکەیو کۆبوونەوەی خەڵکی سوننە لەدەوری کردبووو دەستی دایە پلان گێران لەدژیو وەزارەتیشی سپارد بەنجم الدینی کوڕی مصالی وەزیری شیعە کەبەرەگەز مەغریبی بوو، ئەمەش ئیبن سەلاری تورەکرد، بۆیە هەستا بەکۆکردنەوەی لایەنگرانی لەخەڵکی سوننەی ئەسکەندەریەو لەگەڵیاندا بەرەو قاهیرە بەڕێکەوتو توانی بچێتە ناو قاهیرە دوای ئەوەی بەسەر ئیبن مصالدا! سەرکەوت لەناوچەی الجزیرەدا لە١٤ی رەمەزانی ٥٤٤ك[٦]، لەوانەیە زیادە ڕەویمان نەکردبێت ئەگەر بڵێین هۆی سەرەکی ململانێی نێوان ئیبن سەلارو مصال بریتییە لەململانێی نێوان بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت کەنورەدین محمود پشتگیری دەکردو ئەهلی شیعە کە خەلیفەی فاطمی نوێنەرایەتی

---

[١] أعلام الاسكندرية ل١٣٧.

[٢] الحافظ أبو طاهير ل١٠٥.

[٣] وفيات الأعيان (٧٦/٢).

[٤] تأريخ الدولة الفاطمية في مصر ل١٨٣.

[٥] الحركة الفكرية في مصر ل١٥٨.

[٦] الكامل لابن أثير له الحافظ السيلفي ل١٠٦.

دەکرد[1]، لەراستیدا دروست کردنی ئەم خوێندنگەیە بووە مایەی خۆشحاڵی خەڵکی ئەسکەندەریەو بەدیارییەکی گەورەی ئیبن سەلاری فەرمانڕەوایان زانی کەپێویستە سوپاسی بکەن لەسەری، بۆیە شاعیرانیان دەستیان دایە ستایش کردنو پیاهەڵدانو دەربڕینی خۆشیو شادی خۆیان بۆی[2]. ئەوە بوو حافظ سیلەفی سەرپەرشتی ئەم خوێندنگەیەی گرتە ئەستۆو کردی بەناوەندی تیشکدانەوە بۆ گەڕانەوەی خەڵکی میسر بۆ بیروباوەری ئەهلی سوننەتو مونتەدایەك بۆ خەڵکانی خاوەن هێزو ڕۆشنبیریو ناوەندێك بۆبەیەکگەیشتنی زانایانی فەرمودەو قوتابیانو پیاوانی فیقه و خوێندنەوەکانو ئەدیبانو شاعیرانو پیاوانی مێژوو گێڕەرەوەی چیرۆكو سەرگوزشتەکان، بەم شێوەیەش هۆگرانی زۆربوونو کاریگەری بۆ سەر خەڵکی بەرەی سەندو خەڵکانێکی زۆر سودمەندبوون لەو چاوپێکەوتنو کۆڕو وتارانەی کەتیایدا پێشکەش دەکران، کاریگەریشی زیاتر بەخەڵکی ئەسکەندەریەوە دەرئەکەوت ئەمەش لەدوو شوێندا رەنگی دایەوە:

**یەکەمیان:** ئەو ڕۆژەی کەلەگەڵ ئیبن سەلاری والیاندا دەرچوون بۆ دەسگرتن بەسەر وەزارەتدا لەقاهیرەو. دووەمیشیان: ئەو ڕۆژەبوو کەلەگەڵ سەلاحەدیندا دژ بەوەزیری فاطمی شارو خاچپەرستە هاوکارەکانی جەنگاو وێڕای گەمارۆی سێ مانگی پشتیان بەرنەدا، بەڵکو شان بەشانی دەجەنگانو بەسەرو ماڵیانەوە پشتیوانی بوون هەتاوەکو شاور گەمارۆکەی هەڵگرت[3] سەلاحەدینیش ئەم چاکەیەی لەبەر چاوبوو بۆ خەڵکی ئەسکەندەرییەو کاتێ دەوڵەتی فاطمی لەناوبردو دەوڵەتی ئەیوبی دروستکرد گرنگییەکی تایبەتی دا بەخەڵکی ئەسکەندەریە، ئەمەش بەهۆی پێگەی ستراتیژی ئەم شارە بۆ بەرگریکردن لەمیسر وێڕای ئەو ڕێزە تایبەتەی کەخەڵکی ئەسکەندەریە هەیانبوو لەلای بەهۆی هەڵوێستی پاڵەوانانەیان بەرامبەر گەمارۆی شار لەساڵی ٥٦٣ك دا کاتێ هەموو توانایەکیان خستە خزمەتو بەسەرو ماڵەوە بەرگریان لێکرد، بۆیە سەیر نییە کەسەلاحەدین لەسەرەتای وەرگرتنی پۆستی سوڵتانەوە فەرماندەدات بەچاککردنەوەی شورای ئەسکەندەریەو بەهێزکردنی بورجو قەلاکانیو هێنانی چەند دامەزراوەیەك بۆی، نەك هەر ئەمە، بەڵکو لەساڵی ٥٧٣ك دا خۆی سەردانی ئەسکەندەریەی کرد هەتاوەکو لەنزیکەوە بەسەری بکاتەوەو بنکەکانی ڕێکبخاتو فەرمانی نۆژەنکردنەوەی بورجو شوراو حەسارەکەی دەربکات[4]، لەم

---

[1] تأريخ الدولة الفاطمية ل١٨٤.

[2] الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٠٦.

[3] الحافظ أبو طاهير السلفي ل١٠٧.

[4] مفرج الكروب (٥٦/١).

سەردانەشدا سەلاحەدین کەشتیگەلی جەنگی بەسەرکردەوەو ئەو فەرامۆشکاری‌و خراپ بوونەی بینی کەدووچاری بووبوو فەرمانی نوێکردنەوەو بنیاتنانی کەشتی نوێی دەرکردو بودجەیەکی تایبەتی بۆ دیاریکردو دیوانێکی سەربەخۆشی بۆ دانا لەگەڵ دانانی فەرماندەیەك بۆی بەناوی "فەرماندەی کەشتیگەل"[1]، هەروەها ئەسکەندەریە بەردەوام جێی بایەخی سەلاحەدین بوو هەتاوەکو جارێکی تر بواری سەردانی بۆ رەخسا لەساڵی ٥٧٧ك دا، لەم سەردانەشدا لەنزیکەوە چاکسازی‌و دامەزراوەکانی بەسەرکردەوەو فەرمانی دا کەپەلە بکرێت لەخزمەتکردن‌و جێبەجێکردنی پرۆژەکاندا، عیمادی ئەصفەهانی لەم سەردانەدا ئەڵێ: سوڵتان لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٥٧٧دا هەستا بەسەردانی ئەسکەندەریە لەرێی البحیرەوەو لە السواری لایداو سەردانی ئەو شوراو حەسارو باڵەخانانەی کرد کەفەرمانی کردبوو بەدروستکردنی‌و داوای بایەخ پێدانی زیاترو تەواوکردنی کرد[2]، لەم سەردانەشدا ئەسکەندەریە گرنگیەکی باشی پێدرا لەلایەن سەلاحەدینەوەو دامەزراندنی دامودەزگای ئاوەدانی زۆری بەخۆوە بینی‌و خوێندنگەیەکی گەورەی دامەزراند بۆ قوتابیە بێگانەکان هەتاوەکو تیایدا ئەدەب‌و سەرجەم زانستەکان بخوێنرێت‌و خانویەکیشی بۆ بنیاتنان کەگەرماو نەخۆشخانەشی تیابوو بێ بەرامبەر تیایدا چارەسەر دەکران‌و چەند پزیشکێکی بۆ تەرخان کرابوو[3]، پاشان بنیاتنانی خوێندنگە لەسەردەمی سەلاحەدیندا گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی بەپێی ئەو سیاسەتە گشتیەی کەگرنگی زۆری بەبنیاتنانی خوێندنگە دەدا وەکو هۆکارێکی قیکری بۆ لەناوبردنی فکری فاطمی شیعە، ئەوەبوو چەندین خوێندنگە لەماوەیەکی کەمدا بنیات نران ئەمەش بووە جێی سەرنجی ئەو مێژوونوسانەی کەسەردانی ئەسکەندەریەیان دەکردو چەندین شتیان لەسەر نووسی لەم بارەیەوەشەوە ئیبن خزیمە کە لەساڵی ٥٦١ك-١١٦٤زدا سەردانی کردو تیایدا نیشتەجێ بوو و لە وەسفیدا ئەڵێ: سەدو هەشتا خوێندنگەی بۆ فێرخوازان تیادابوو[4]، سەلاحەدینیش لەم سەردانەیدا فەرمانی دا بەبنیاتنانی مزگەوتی گەورەو گواستنەوەی وتاربێژی، دوای ئەوەی لەسەردەمی فاطمیەکاندا لەمزگەوتی العطارین دەکرا کەگەورەترین مزگەوت بوو لەم شارەدا[5]، پاش ئەوەش کۆمەڵێکی زۆر مزگەوت بنیات نراو ژمارەی مزگەوتەکانیش لەم ماوەیەدا گەشتە ژمارەیەکی زۆرو سەنجی ئەو مێژوو نوسانەی راکیشا کەسەردانی ئەو شارەیان

---

[1] الحافظ أبو طاهر السلفي ل٦٠.

[2] كتاب الروزتين له الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٦١.

[3] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٦١.

[4] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٦٢.

[5] تأريخ المساجد الآثرية ل٦٧، حسن عبدالوهاب.

کردو بەچەندین شێوە مەزەندەیان کردووە کەهەندێکیان زیادە ڕەوی زۆری تیایە[1]. ئیبن جبیریش کە لەساڵی ٥٧٨ك دا واتە لەسەردەمی سەلاحەدیندا- سەردانی ئەم شارەی کرد وەسفی زۆری مزگەوتەکان دەکاتو دەڵێت: لەهەموو شارەکان مزگەوتی زۆرتربوو مەزەندەکردنی خەڵکیش بۆیان جیاوازەو زۆروکەمی هەیە، ئەوانەی کەزۆریان وتووە بەدوانزە هەزار مزگەوت ئەیخەمڵێنن، ئەوانی تریش هەندێکیان بەهەشت هەزارو هەشە کەمتر ئەڵێ بەگشتی ژمارەیان زۆر بووەو لەیەك شوێن چوار تا پێنج مزگەوت هەبووە، لەوانەشە بەدەم یەکەوە بووبن‌و بۆ هەمووشیان ئیمام لەلایەن سوڵتانەوە دیاری کرابوو[2]، گرنگی دانی ئەیوبییەکانیش بەئاوەدانکردنەوەی ئەسکەندەریە بەردەوام بوو پاش سەلاحەدین‌و هەمان سیاسەت پەیڕەوکرا هەتاوەکو کۆتایی سەدەی شەشەمی کۆچی[3].

٤- **تایبەتمەندی کەسێتی أبی الطاهری سەلەفی:**

أ- **لێبڕانی لەژیاندا**: الحافظ السِّلفي هەموو ژیانی بۆ وانە وتنەوەو خوێندنەوەو نوسین‌و وتاردان تەرخان کردبوو بێ ئەوەی بێزاری رووی تێبکات، سەراپای ژیانیشی لێبڕان‌و تێکۆشان بووە وەك الحافظ عبدالقادری الرهاوی قوتابی باسی دەکاتو ئەڵێ: پێم گەشتووە کەلەم ماوەی مانەوەیدا لەئەسکەندەریە نەچووە بۆ بێستان یان سەیران بۆ تاقە جارێکیش، بەڵکو بەردەوام لەخوێندنگەکەیدا بوو، هەر کاتێ سەردانیشمان بکردایە ئەمان بینی سەرقاڵی خوێندنەوەی شتێکە..... تەنانەت منارەی ئەسکەندەریەشی لەتاقێکەوە بینیبوو کە لەماڵەکەیدابوو[4] ئیبن عیمادیش وەسفی دەکات ئەڵێ: سیلەفی بۆ ماوەی شەستو ئەوەندە ساڵ لەئەسکەندەریەدا نیشتەجێبوو و تیایدا سەرقاڵی زانستو خوێندنەوەو دەسخستنی کتێب بوو[5].

ب- **ڕێزنانی لەمەجلیسی خۆی:** سیلەفی پیاوێکی لێبوردەو خاکی بوو، باوەشی بۆ خەڵك والابوو، هاودەمی خەڵك بوو ئەوانیش هۆگری ئەوبوون، ئارامگربوو لەسەر ووشکی غەریبان لەگەڵیدا ئەو کەسانەی خۆش دەویست کەسەردانیان دەکردو بەهەموو هەستو نەستیەوە ڕووی تێ دەکردن‌و کەم تەرخەم نەبوولە سود پێگەیاندن‌و دڵسۆزی‌و ڕووخۆشی لەگەڵیاندا، خەلیل ئەلصەفدی لەوەسفیدا ئەڵێ: ئەگەر هەڵەیەکی بەرامبەر کەسێك بکردایە وازی

---

[1] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٦٢.

[2] رحلة بن جبير ل٤٣.

[3] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٦٣.

[4] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١١٤.

[5] شذرات الذهب (٤/٢٥٥).

لێنــەدەهێنا هــەتاوەکو ڕازی دەکـردو دڵـی دەهێنایـەوە جێـی خـۆی بـۆ ئـەوەی کەسـی لێ دانەبڕێت، بەڵام هەرگیز ڕێی بەگاڵتەو گەپ یان قسەکردن یان سەرقاڵکردنی بەرامبەر نەدەدا لەکاتی وانە وتنەوەدا جا ئەو کەسە هەر پلەو پایەیەکی هەبوایە، هەر کە لەباس‌و بابەتەکەی دەبوەیەوە بواری دەدا بەئامادەبووان هەتاوەکوپرسیارو سەرنجەکانیان بخەنە ڕوو، الحافظ الذهبی ئەگێڕێتەوە کەسوڵتان سەلاحەدین براکەی ڕۆژێك هاتۆتە لای بـۆ بیـستنی فـەرمودەو بەهێواشی قسەیان لەگەڵ کردووە، وەزیرەکەشیان سیلەفی نـارەزایی خـۆی پێشاندا ووتـی: ئەوە چییە؟ ئێمە فەرموودەی پێغەمبەر د.خ دەخوێنینـەوەو ئێـوەش قسە دەکـەن؟ ئینجا ئەوانیش بێدەنگ بوون[1].

ج- **خۆشەویـستی بـۆ خوێندنـەوەو کۆکردنـەوەی کتێب:** سـیلەفی ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت خوێندنەوەی زۆربوو، خاوەن زانیاریەکی بـاش بـوو، لێبڕاوبـوو لەبەدواداچوونی زانستداو زۆر بـەدوای مەسـەلە ئاڵۆزەکانـدا دەچـوو، ئیـشکالاتەکانی ڕوون دەکـردەوە، دوای وانەوتنــەوە بەخوێندنەوەو نوسین‌و لێدوان‌و لێکۆڵینەوە لەسەر کتێبی خەڵکانی تر خەریك دەبوو، حـافظ عبـدالقادر ڕەهـاوی دەربـارەی ئـەڵێ: هـەرکاتێ سـەردانمان بکردایـە ئـەمانبینی خـەریکی خوێندنەوەی شتێکە.... هـەروەها زۆر تامـەزرۆی کتێـب بـوو سـوربوو لەسـەر کۆکۆدنـەوەو خاوەنداریێتی،بەرادەیەك کەکۆمـەڵێکی زۆر کتێبـی جۆراوجـۆری کـۆکردەوە کەتەمـەن بـواری خوێندنەوەی نەداو کاتێ کۆچی دوایشی کرد زۆربـەی کـەڕووی هـەڵهێنابوو پێکـەوە لکابوو، دەرەنجامی شێداری کەش‌و هەوای ئەسکەندەریە ئەمەش بووە هۆی خراپبوونی زۆربەی.

٥- **پەیوەنـدی لەگـەڵ ڕۆشـنبیراندا:** ئەڵقـەکانی خوێنـدن لەمزگـەوت‌و خوێندنگـەدا خـاڵی بەیەکگەیـشتن‌و پەیوەنـدی نێـوان سـیلەفی‌و چین‌و توێـژە ڕۆشـنبیرەکان بـوو، لـەڕێی ئـەم ئەڵقانەشەوە توانی کەپەیوەندی فراوانی لەگەڵ زانایان‌و فێرخوازانی فەموودەو پیاوانی هزرو ئەدەب وەك نوسەران‌و ئەدیبان‌و شاعیران‌و گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەتدا هـەبێت وەك والی‌و قاضـی‌و هتـد هـەروەها لەگـەڵ خـاوەن پیـشە جـۆراو جۆرەکانـدا وەك پزیـشکان‌و ئەنـدازیارەکان‌و بازرگانـان‌و خـاوەن پەڕاوێزگـەو ئیمـامی مزگـەوت‌و وتاربێـژو نوسـەرو بانگوێژاندا، هەروەها لەگەڵ زۆرینەی حاجیـانی مـەغریب‌و ئەنـدەلوس کـە لەئەسـکەندەریەدا تێپەر دەبوون لەگەشتەکەیاندا بەرەو حەج، سەبارەت بەپەیوەنـدی بەشاعیرانەوە ئـەوە زۆر بـاش‌و تایبـەتی بـوو خۆشەویـستی‌و هاوسـۆزی بـاڵی بەسـەردا کێشابوو، ئـەوەبوو حـەزی

---

[1] الحافظ أبو الطاهر ل١١٨.

لەتێکەڵاوی‌و گوێ بۆ گرتنیان بوو دڵی پێیان دەکرایەوەو زۆرجار شیعریان بۆ دەخوێندەوە، چونکە ئەویش وەك ئەوان شاعیربوو، شیعری دەوت‌و چێژی لێ دەبردو رەخنەشی لێ دەگرت، حافظ ذهبي وەسفی دەکات‌و ئەڵێ: حەزی لەشیعر بوو شیعری دەنوسی‌و خەڵاتی ئەکەسەشی دەکرد کە ستایشی شیعری بکردایە[1].

٦- **پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا:** پەیوەندی لەگەڵ زۆر خۆش بوو، چونکە خاوەنی پلەو پایەیەکی بەرزبوو لایان، زۆر جار دەهاتنە لای هەتاوەکو بەرەکەتیان دەست بکەوێت بەهۆی پارێزگاری‌و پیاو چاکییەوە، تەنانەت زیاردەرەویان لەرێزو حورمەتگرتنیدا دەکردو بەکەسێکی بەرەکەتیان دەزانی[2]. لەو شتە خۆشانەش کە حافظ ذهبي ئەیگێرێتەوە لەم بوارەدا ئەوەیە کەخەڵکی ئەسکەندەریە پەنایان بۆ دەهێنا لەکاتێکدا کەژنێك منداڵبوونی دوابکەوتایە هەتاوەکو هەندێ نزایان لەکاغەزێکدا بۆبنێرێت، ئەویش بۆی دەنوسین‌و رێگری نەدەکردو دەقی نوسینەکەشی ئەمەبوو "خوایە گیان ئەوانە گومانی باشیان بەمن بردووەو دەسا تۆش بێ ئومێدیان مەکە لێم"[3].

٧- **پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی فاطمیدا:** سیلەفی زۆر خۆی لادەدا لەپێکدادان لەگەڵ دەوڵەتی فاطمیدا هەتاوەکو ئازاری نەدەن وەك چۆن زانایانی تری ئەسکەندەریەیان ئازاردا یان رێگری گێڕانەوەو وتنەوەی فەرموودەی لێ بکەن وەك لەگەڵ زانایانی فەرمودە أبی اسحاق الحبال المصری‌دا کردیان[4]. بۆیە خۆی دەبوارد لەرەخنە لێگرتن‌و دژایەتی کردنیان هەتاوەکو نەیان وروژێنێ ئەوانیش لێی دورکەوتنەوەو وازیان لێ هێنا، تەنانەت هەندێکیان ئامادەی وانەکانی دەبوون‌و گوێیان دەگرت، هەروەها لەو هۆکارانەی کەیارمەتی سیلەفی دا بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ئەوەبوو کەدەوڵەتی فاطمی لەو کاتەدا لەماوەی نێوان ساڵی ٥١١م-٥٦٧م بەرەبەرە ئەستێرەی بەرەو ئاوابوون دەرۆیشت‌و خۆی‌و خەلیفەکانیش لاوازو بێ ئیرادەو ئیدارەبوون‌و وەزیرە بەشەڕ هاتووەکان لەسەر کورسی حوکم هەموو کاروبارەکانیان لەئەستۆ گرتبوو، ئەم وەزیرانەش هێندە بەتەنگ پەیڕەوکردنی مەزهەبی فاطمی‌و پاراستنیەوە نەبوون‌و زیاتر گرنگیان بەمانەوەی خۆیان دەدا لەدەسەڵاتدا،تەنانەت چەند

---

[1] سیر أعلام النبلاء له الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٢٨.

[2] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٠.

[3] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٠.

[4] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٢.

وەزیرێکیان سوننەبوون[1] سەرجەم ئەم وەزیرانەش بەجیاوازی مەزهەبەکانیانەوە کەم تازۆر مەزهەبی فاطمیان بەلاوە گرنگ نەبوو[2]، پەیوەندیشی بەوالیە سوننانەی ئەسکەندەریەوە کەنەبوونبەشیعە خۆش و باش بوو، چونکە خۆشیان دەویستو ڕێزیان لێ دەناو پلەو پایەیان دەپاراستو لەوانەکانیدا ئامادە ئەبوونو زانستیان لێوەردەگرت، بۆ نموونە والی قسطە ئامری دۆستایەتیو نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ سیلەفیدا هەبوو لە معجم السفردا لەبارەیەوە دەڵێ: ئەم قسطە ناوە یەکێك بوو لەو ئەمیرە ژیرانەی کەحەزیان لەدادگەریو خوێندنەوەی کتێب بوو بەتایبەت مێژوو ژیان نامەی پێشینانو لەنێوان منو ئەودا دۆستایەتیو نامە گۆڕینەوە هەبوو[3]، سەبارەت بەجێگیری والی ئەسکەندەریە ئەبوو رەضا عبدالله ی کوڕی فضلی کوڕی دّلیلی الحضرمي ئەوە لەباسی ژیانیدا ئەڵێ: ..... هەمیشە دەهاتە لام و پرسی پێدەکردم لەو مەسەلانەدا کەگومانی تیادا هەبوو، کتێبی "البخاري ئیبن بطالي " لاخوێندم بۆ فێربوون نەك گێڕانەوە، هەرچی بەئیبن سەلاری والی ئەسکەندەریەشە ئەوە زۆر ڕێزی لێدەناو پلەو پایەیەکی شیاوی بۆ بڕیار دەداو خوێندنگەی العادلیەی بۆ بنیاتناو وانە وتنەوەو سەرپەرشتی کردنی پێسپاردو وەقفی باشیشی بۆ دیاری کرد بۆ دابین کردنی خەرجی بۆی، ئەمانەش نموونەی پەیوەندیەکانی حافظ سیلەفی بوو لەگەڵ پیاوە فەرمییەکانی دەوڵەتی فاطمیدا کەبەگشتی پەیوەندییەکی باش بووەو ڕێزو پێزانینی پێوە دیارە، هەرچەندە ئەو سەردانی هیچ یەکێکیانی نەکردووە لەماڵەوە یان شوێنی کاریدا[4].

٨- **پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتی ئەیوبیدا:** حافظ سیلەفی زۆر دڵخۆشبوو بەلەناوچوونی دەوڵەتی فاطمی شیعەو دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی سوننی، کەلەیەکەم ساتەکانی دەست بەکاربوونیانەوە کاریان دەکرد بۆ پەرەوکردنی بیروباوەری ئەهلی سوننەتو نەهێشتنی هەموو ڕواڵەتەکانی بیروباوەری فاطمیو ترساندنی هەر کەسێك کە ئەیەوێ مەزهەبی فاطمی بگێڕێتەوە یان بانگەوازی بۆ بکات، لەگەڵ ئەمەشدا حافظ سیلەفی لەدەرگای هیچ سوڵتانو ئەمیرێکی ئەیوبییەکانی نەدا بۆ پیرۆزبایی یان سوپاسکردن، وەك چۆن لەگەڵ فاطمیەکانیشدا ئەم کارەی نەکرد، ئەم هەڵوێستەی سیلەفیش زۆر گەورەی کرد لای ئەیوبییەکانو ئەوان دەهاتنە لایو لەوانەکانیدا ئامادە ئەبوونو گوێبیستی قسەکانی ئەبوون

---

[1] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٣.

[2] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٥.

[3] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٦.

[4] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٣٦.

بەئەوپەڕی ڕێزو پێزانینەوە، بۆ نموونە سەلاحەدین بەو سامو شکۆو پلەو پایەیەوە کەهەیبوو وەك فەرمانڕەوای میسر لە قاهیرەوە چوو بۆ ئەسکەندەریەو بەهاوڕێیەتی کورەکانی الأفضل علیو العزیز عثمانو العادلە برایو عماد ئەسفەهانی سکرتێریو گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەی بۆ سەردانو بیستنی فەرموودە لەلای[1]. قاضي ئیبن شەداد لەوەسفی ئەو سەردانەدا لەباسی خوڕەوشتی سەلاحەدینو حەزکردنی لەبیستنی فەرموودە ئەڵێ: سوڵتان زۆر تامەزرۆی بیستنی فەرموودە بوو، هەر کاتێ: ناوی شێخێکی ببیستایە کەگێڕانەوەی بەهێزو فەرموودەی زۆری بیستووە، ئەوە ئەگەر ئەو زانایە بهاتایە بۆ لای ئەیهێناو گوێبیستی دەبوو، ئەگەر ئەو زانایەش ئامادە نەبووایە سەردانی سوڵتان بکات خۆی دەچووە خزمەتیو گوێبیستی دەبوو..... ئەوەبوو چەند جارێك سەردانی حافظ سیلەفی کرد لەئەسکەندەریەو فەرموودەی زۆری لێگێڕایەوە[2]، هەروەها أبو شامەی خاوەنی کتێبی الروضتین لەئەسفەهانییەوە بەوردی باسی ئەو سەردانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو ئەڵێ: سوڵتان لەڕۆژی چوار شەممەی بیستو دووی شەعباندا لەقاهیرە دەرچوو هەردوو کورەکەی الأفضل علیو الغزیز عثمانی لەگەڵ خۆیدا برد... پاشان گەشتینە ئەسکەندەریە لەگەڵ سوڵتاندا چوبنە لای شیخ حافظ أبو الطاهر أحمدی کوڕی محمدی سیلفیو ماوەیەك لای ماینەوە لەدەمو چاوییەوە نوری باوەڕمان بەدی دەکردو سێ ڕۆژ لای بووین: پێنج شەممەو هەینیو شەممە کەچوارەمی مانگی ڕەمەزان بوو ئەو هەلەمان باش قۆستەوەو ئەو سێ ڕۆژەش خۆشترین ڕۆژەکانی تەمەنمان بوو[3]، یەکێك لەو شتە خۆشانەش کە لەو سەردانەدا ڕووی دا ئەوەبوو الملك العادل لەو سێ ڕۆژەدا لەتەنیشت سوڵتانی برایەوە دادەنیشتو جارێکیان خۆی لارکردەوەو چپاندی بەگوێیدا، کاتێ حافظ سیلەفی ئەمەی بینی سەرزەنشتی کردنو نارەزایی دەربڕیو ئینجا ئەوانیش بێدەنگ بوون[4].

٩- **سیلەفی شاعیرو پەیوەندی بەشاعیرانەوە:** حافظ سیلەفی شاعیربوو شیعری دەوتو چێژی لێ دەبردو بەوپەڕی شارەزاییەوە ڕەخنەی لێ دەگرتو حەزی لەگوێگرتن بوو لەشاعیرانو بەخشیشی دەدا بەو شاعیرانەی کەشیعرەکانیان بەهێزبوو[5]، هەروەها حەزی

[1] السلوك للمقريزي له الحفاظ أبو الطاهر ل١٣٧.

[2] النور السلطانية ل٧ الحافظ أبو الطاهر ل١٣٨.

[3] الحافظ أبو الطاهر ل١٣٨.

[4] الحافظ أبو الطاهر ل١٣٩.

[5] الحافظ أبو الطاهر ل١٣٨.

لەلەبەرکردنی شیعرو گێڕانەوەو هێنانەوەی بوو لەدانیشتنەکانیداو دووبارەی ئەکردەوە بۆ گوێبیستانی بەتایبەت شیعری ئەو شاعیرانەی کە ئەڵێ:

قالوا نفوس الدار سكنها وأنتم عندي نفوس النفوس

هەروەها شاعیر دەڵێ:

نحن نخشي الإله في كل كرب ثم ننساء عند طشف الكروب

كيف نرجو استجابة لدعاء قد سددنا طريقة بالذنون

پاشان شاعیر دەبارەی پیری دەڵێ:

حل المشيب بعارضي ومفارقي بئس القرن أراه غير مفارقي

رحل الشباب فقلت: قف لي ساعة حتى أودع. قال: إنك لاحقي

پاشان شاعیر دەبارەی دەروونبەرزی دەڵێ:

منزلي منزل الكرام و نفسي نفس حر ترى المذلة كفرا

وإذا ما قنعت بالقوت دهري فلما أزور زيدا و عمرا

پاشان سەرسام بوو بەوتەی أبی ئیسحاقی شیعرازی دەرباری هاوڕێی بەوەفا:

سألت الناس عن خل وفي فقالوا ما إلى هذا سبيل

تمسَك إن ظفرت بودّحرّ فأن الحرّ في الدنيا قليل[1]

هەندێ کتێبیش چەند سەر گوزشتەیەکی سیلەفی بۆ باس کردووین کەلەگەڵ هەندێ شاعیردا روویداوە، لەوانە ئەم سەرگوزشتەیە باس دەکەین، چونکە کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر جولاندنی هەستو سۆزو خۆشەویستی بۆ خزمو خوێشەکانی لەئەسفەهانی زێدی خۆیدا..... ئەبو ئەحمەد عبداللەی کوڕی محمدی تجیبی ئەندەلوسی ناسراو بەئیبن مەلیح ئەڵێ: ئەبولحە جاجی کوڕی الشیخ ئەم دێڕە شیعرانەی بۆ أبو الطاهری سیلەفی وت:

أيا من حل نور عيني ويا من حاز كل علا وزين

أنا مذ صرت عبدك زدت فخرا وزال بملكك نقصي و شيني

أتيتكم لأقرأ أو لأروي فعدت لمنزلي صفر اليدين

قريح القلب لم أظفر بشيء كأني لم أكن أهلا لذين

يروح الناس عنك بكل خير وأرجع لابسا خفي حنين

وما ذنبي سوى أني غريب وقومي حيل بينهم وبيني

---

[1] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٧٣.

أبو محمدی کوڕی ملیح ئەڵێت: أبو الحجاج پێی وتن: کاتێك أبو گاهر ئەم دێڕانەی گوێ لێبوو گەشتە ئەوەی کە دەڵێم:

وما ذنبي سوى أني غريب وقومي حيل بينهم وبيني

دەستی کرد بەگریانو هاواری کرد: خزمەکانم لێم دابڕان ئەمەش سۆزبوو بۆ ئەسفەهانی زێدیو ئەو خزمو کەسانەی کە لێیان دابڕابوو پاشان لەهۆش خۆی چوو، ئەمەش وای کرد لەقوتابیەکانی کەسەرزەنشتی من بکەنو بڵێن: ئەمە چی بوو ئەمرۆ کردت؟ پاشان شێخ برایەوە بۆ ماڵی خۆیو تا چوار رۆژ نەهاتە دەرەوە[1].

هەروەها بۆ خۆشی شیعری دەهۆنیەوەو لەو شیعرانەی کەئەیوت:

إن علم الحديث علم رجال تركوا الابتداع للاتباع

فإذا جن ليلهم كتبوه وإذا أصبحوا غدوا للسماع

هەروەها شانازی بەزانستیو فەرمودەیەوە دەکرد کە خوای گەورە فێری کردبوو ئەیوت:

إذا ذكرت بحار العلم يوما فقول المصطفى لا غير بحري

هو البحر المحيط وما عداه فأنهار صغار منه تجري

لەم هۆنراوەیەشدا وەڵامی (معطلة و محسمة) ئەداتەوە، پاشتر ناودارانی مەزهەبی شافیعی یەك لەدوای یەك باس دەکات هەتاوەکو دەگاتە ئەوەی کە دەڵێ:

وأعلم بأن أعزهم وأجلهم شيخ الأنام سجية وفعالا

من لم يخف في اللع لومة لائم وبما رآه من الآذى بالا

ذاك ابن حنبل الامام المقتدى من فاق بين العالمين خطالاً

١٠- **کۆچی دوایی:** سەرلەبەیانی رۆژی هەینی- ئەشڵێن شەوی هەینی- پێنجی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٧٦ك خۆری ژیانی سیلەفی ئاوابووو ئەستێرەی لەئاسمانی ئەسکەندەریەدا بۆ هەتاهەتایە لەدرەوشانەوە کەوت، بەم شێوەیەش کۆتایی بەژیانێکی پڕ تێکۆشان هات کەنزیکەی سەدەیەکی خایاندو خاوەنەکەی لەخزمەت زانستو وانە وتنەوەو خوێندنەوەو نوسینو فێربوونو سود گەیاندندا بەسەری بردو بۆ رۆژێك دەست بەرداری ئەم کارانە نەبووو هیچ رێگرێك نەیتوانی ببێتە بەربەست لەبەر دەمیدا، بەڵکو بەردەوامو تا دوا ئێوارەی ژیانی سەرقاڵی سود گەیاندنبوو[2]، أبو طاهری کوڕی عوضی هاورێی کەزانای مەزهەبی مالیکی بوو

---

[1] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل١٧٣.

[2] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٢٥٤.

لەئەسکەندەریەدا پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی لەمزگەوتی عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصدا نوێژی لەسەرکردو لەگۆرستانی (وعلة)دا نێژرا کەئیبن خەلەکان باسی دەکاتو ئەڵێ: گۆرستانێکە لەناو حەسارەکەدا لای الباب الأخضر[1]، کۆمەڵێ پیاو چاکی تێدا نێژراوە وەك طرطوشیو هتد...[2].

یەکێك لەو مێژوونوسە بەناوبانگانەش کەسەردانی گۆرەکەی کردووە أبو شامەی خاوەنی کتێبی الروضتین في أخبار الدولتین، ئەمەشی لەڕووداوەکانی ساڵی ٥٧٦ك باس کردووە و ئەڵێ: لەم ساڵەدا حافظ سیلەفی کۆچی دوایی کردو سەردانی گۆرەکەشیم لەناو الباب الأخضردا کرد[3].

لەڕاستیدا الحافظ أبو الطاهر سیلەفی لەزانا گەورەکانی ئوممەتەو بەبونیشی لەو شارەدا ئەسکەندەرییە ناوبانگێکی جیهانی دەرکرد لەبواری فەرموودەو زانستی خوێندنەوەکاندا بەدرێژایی سەدەی شەشەمی کۆچی، بۆیە پێویستە لەسەر خەڵکی ئەسکەندەریە کەشانازی بەم زانا پایە بەرزەوە بکەنو پاداشتی بدەنەوەو بەناساندنی بەنەوەکانی داهاتووو زیندو ڕاگرتنی ناوی بەناونانی خوێندنگەیەك یان پەیمانگایەکی ئەو شارە بەناویەوەو بڵاوکردنەوەی ئەو شوێنەوارو کەلەپورەی کە بەجێی هێشت[4].

**سێیەم: ئەبوو الطاهری کوڕی عەوفی ئەسکەندەرانی:**

شێخی پێشەواو پێشەنگی موسڵمانان زانای مالیکیەکان ئیسماعیلی کوڕی مەکی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عیسای کوڕی عەوفی کوڕی یەعقوبی کوڕی محمدی کوڕی عیسای کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی حمیدی کوڕی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، قورەیشی زوهەری عەوفی ئەسکەندەری مالیکی لەوەچەی عەبدولرەحمانی کوڕی عوف ﷺ[5]، لەساڵی ٤٨٥ لەدایکبووە لەسەردەستی مامۆستا ئەبوبەکری طرطوشی خوێندویەتی پێشی هاوەڵانی کەوتووە لەزیرەکیو لێهاتوویدا الموطأی أبي عبدالله ی رازی و طرطوشیەوە گێڕاوەتەوەو پێشەوای سەردەمی خۆیو زانایەکی کەم وێنەی بواری فیقه بووەو، فتوا لەسەر ئەو وەستاوەو زۆر خوناسو دونیاویستو خاوەن پەرستش بووە[6]، هەروەها زۆر خاکیو دەرون پاك بووەو[1]. کۆتایی دەوڵەتی فاطمی شیعەو

---

[1] یەکێکە دەروازەکانی ئەسکەندەریە لەکۆندا، دەکەوتە لای ڕۆژئاواوە.

[2] وفیات الأعیان (١/٢٢١).

[3] کتاب الروضتین لە الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٢٥٥.

[4] الحافظ أبو الطاهر السلفي ل٢٥٥.

[5] سیر أعلام النبلاء (٢١/١٢٢).

[6] هەمان سەرچاوە (٢١/١٢٣).

دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی بەچاوی خۆی دیوەو سەلاحەدینیش چووتە خزمەتی بۆ ئەسکەندەریە لەساڵی ٥٧٧ك داو لەم سەردانەشدا سەلاحەدین زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئامادەبوون لەگەڵ کورەکانی خۆیو گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەیدا لەوانەکانی ئەبوطاهرداو هەموویان پێکەوە گوێبیستی "موطأ"ی مالك بوون لەخزمەتیدا، عیمادی ئەسفەهانیش ئەم هەواڵەمان بۆ دەگێڕێتەوە، چونکە ئەو بۆ خۆی هاورێیەتی سەلاحەدینی کردو تیایدا، ئەڵێ پاش مانگی رەمەزان سوڵتان بەرەو ئەسکەندەریە بەرێ کەوت لەساڵی ٥٧٧ك دا لەرێی البحیرەوەو لای السواری خێوەتی هەڵداو ئەو حەسارو شورایەی بینی کەنۆژەنی کردبوویەوەو ئەو بینایانەی کەبەردی بناغەی دانابوون‌و فەرمانی کرد بەپەلەکردن لێیان‌و تەواوکردنیان، سوڵتان ووتی سود لەئامادەبوونی شێخ أبو طاهری کوڕی عەوف، ئەوەبوو چوینە خزمەتیو مرطأی ئیمام مالکی بۆی گێڕانەوەو ئێمەش گوێبیستی بوین ئەم کتێبەشی بەرێوایەتو گێڕانەوەی طرطوشی بۆ باس کردین لەدەیەی کۆتایی شەوالی[٢].
هەمووشمان پێمان وابوو کەسەلاحەدین خێرێکی باشی دەسکەتووە بەبونە قوتابی ئیبن عەوف‌و گوێگرتن لێی، بەم بۆنەیەشەوە قاضي عبدالرەحیمی عەلی بیسانی نامەیەکی جوانی ئاراستەی سەلاحەدین کرد‌و تیایدا پیرۆزبایی لێکرد بەبۆنەی ئەم گوێبیستبونەوەو تیایدا بەراوردی کردبوو لەنێوان ئەم گەشتەی سەلاحەدین‌و دوو کورەکەی بۆ بیستنی الموطأ لای ئیبن عەوف‌و گەشتەکەی هارون الرشید لەگەڵ دوو کورەکەیدا بۆ بیستنی هەمان کتێب لای ئیمام مالیکی دانەری الموطأ،ئەمەش دەقی نامەکەیە:خوای گەورە دەوڵەتی الملك الناصر پایەدار بکات، سەلاحی دونیاو دین‌و سوڵتانی ئیسلام‌و موسڵمانان‌و زیندوو کەرەوەی دەوڵەتی ئەمیری باوەرداران، خۆشبەختی بۆ گەشتە زانستییەکەیو خوای پاداشتی بداتەوە وگەنجینەی خێری بەسەردا بڕژێو دەرفەتیش بەخەڵکی بدات بۆ سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتە گەورە، چونکە ئەوە نیعمەتێکە بواری باشی دەوێ بۆ سوپاسگوزای دەربڕین لەسەری، هەروەها نورو رووناکی خۆی بخاتە دڵیەوەو هەردوو گەشتەکەشی بۆ خواو لەبەر خوا لێی وەرگرێو ئەو دوو رۆژەی بەچاکەو تێکۆشان بۆ بنوسیو نێوچەوانی گەش‌و درەوشاوە بکات. سوپاس بۆ ئەو خوایەش کەدوو رۆژی پێ بەخشیوە: رۆژێك کەحیبر لەقەڵەمەکەی دەرژێتو رۆژێکیش کەخوێنی بێ باوەڕان لەژێر ئاڵایدا دەرژێ.

لەیەکەمیاندا بەدوای فەرموودەی پێغەمبەردا دەگەرێو شوێنەوارێکی دیارو بەرچاو جێ دەهێڵێو لەدووەمیشدا هەوڵ دەدات بۆ سەرخستنی شەریعەتی پڕ هیدایەتی پەروەردگار بەسەر

---

[١] الدیباج المذهب، ابن فرحون ل٩٥.

[٢] كتاب الروضتین (٢/٢٤).

گومڕاییداو خەڵکانیش هیممەتی زانایانیان بزواندووە لەگەشتیاندا بۆ گواستنەوەو بیستنی فەرموودەو بەدواداچوونی باوەڕپێکراو دەستە بژێر کراوەکانیو چەندین کتێبیان داناوە کەمەبەستیان پێی بەرزکردنەوەی هیمەتەکانو ئاگادارکردنەوەیان بووە، لەگەڵ بەرزراگرتنی خاوەنەکانیو دەستخۆشی لێکردنیان، لەم بارەشەوە وتویانە: فڵانە کەس چووە بۆ گوێبیست بوونی مسندی فڵانو زەید چووە بۆ لای عەمر سەرباری دوری ماوەی نێوانیان،خاوەنی ئەم گەشتەش خۆی بۆ زانست تەرخان کردووەو تەمەنی بۆ سەرف کردووەو هێزی خۆی بۆ گوشیوە هیمەتی بەهیچ شتێك لاواز نابێت، ئەگەر ئەمە بۆ خەڵکی تر وابێت ئەی ئەبێ بۆ پاشەیەك چۆن بێت کەبیرو هۆشی داگیرکردووەو کاروباری ئاینی پەروەردگاری بۆ بڕاوەتەوەو، لەکەمترین کاتێکدا گەشت دەکات بۆ پاشماوەی خێرو بۆ زانستو دەست لەپێویسترین کاری هەڵدەگرێتو چەند ڕۆڵێکی پێ دەبەخشێ لەکاتێکدا کەبەچرکەو سات لەگەڵ غەزاکەراندایەو خەمیان دەخوات، نەشم بیستووە فریشتەی سەر شانی ڕاست گەشتی بۆ دەسخستنی زانست بۆ هیچ پاشایەك تۆمار کردبێت جگە لەهارونە ڕەشید ڕەحمەتی خوای لێبێت، هەرچەندە ئەو سەردانی پێغەمبەری (ﷺ) لەگەڵ خواستێکدا کۆکردەوەو لەگەڵ دوو کورەکەیدا چوونە خزمەت مالیك- ڕەحمەتی خوای لێبێت- بۆ بیستنی موطأ- کەڕەشیدیو ناصریەکان-سەلاحەدین کۆدەنگ بوون لەسەر گوێبیستبوونو سەفەرکردن بۆ وەرگرتنی ئەوەی کە هارونە ڕەشیدیش داوای کردبوو لە مالیك- ڕەحمەتی خوای لێبێت- کەمەجلیسێکی تایبەت بۆ خۆیو ئەمینو مەئمونی کوڕی تەرخان بکاتو بۆ بیستنی موطأ ئەویش لەوەڵامدا پێی ووت: ئەمە سوننەتی ئامۆزاکەتە واتە پێغەمبەر (ﷺ)- خەڵکی تر پۆشیویانەو تۆش ئەتەوێ بڵاوی بکەیتەوە، ئەمەش دووەم گەشتە لەزەمانەداو یەکەم گەشتە لەرووی باوەڕەوەو خوای گەورە بەپێنوسی فریشتەی نوسەری چاکە دەینوسێ وتیایدا گەورەمان شوێنی هارون ئەلڕەشید ئەگرێتەوەو عەلیو عوسمانیشی جێی ئەمینو مئمون دەگرنەوە[1] نوسخەی ئەسلی واتە ئەو نوسخەی کەمالیك بۆ هارونە ڕەشیدی خوێندۆتەوە لەگەنجینەی کتێبی میسریدابوو، جائەگەر ئەوە لەگەنجینەکەدا هەبێت ئەوە بەرەکەتێکی گەورەو تایبەتمەندیەکی مەزنو گەنجینەیەکی کۆنو بەنرخە ئەگەرنا بابەدوای نوسخەیەکی تردا بگەڕێن کەبەخەتی موسای کوڕی جەعفەر نوسراوەو مأمون سەرپەرشتی کردووە، ئەم دوانە هەر دوکیان پیرۆزنو فەڵی زانستیان پێوە دیارەو خوای گەورە گەورەمان لەو فەزڵە بێ بەش ناکات، خوای گەورەش سوڵتانی بۆ ئەم کارە ڕێنوێنی کردو تەندروستی باشی پێداو لەجەنگو خوێن بەدوری گرتو دڵی لەهەموو

---

[1] مەبەستی دوو کورەکەی سەلاحەدینە: الأفضل عةلیء العزیز عثمان.

خەمێك دارِنیو رێگەی خێری پیشان داو ئەم خێروبەرەكەتەی دەسكەوت، ئومێد دەكەین تەندروست باشیو دڵگوشادی بەردەوامبێو خوێنی لێ بەدوربێو بەچوونی بۆ شام خوێن رشتن كۆتایی پێ بێتو ئاشتی بەرقەراربێتو سەركەوتن بەدەست بێنێتو، بەرەكەت بخاتە رێگەو گەشتیەوە ئینشاڵڵا[1]. لەم كاتەشەوە ئیبن عەوف پلەپایەیەكی باشی لای سەلاحەدین دەسكەوتو رێزو حورمەتی زۆری لێ دەناو ئەگەر گرفیتێكی ئاینی یان سیاسی دەوڵەتی توش ببوایە دەینارد بەدوایداو راوێژی پێ كردو راو فتوای وەرگرتو ئیبن فرحونیش ئەمەمان بۆ دوپات دەكاتەوەو ئەڵێ: سوڵتان سەلاحەدینی كوڕی ئەیوب رێزی ئیبن عەوفی دەگرتو ئاڵوگۆڕی نامەیان پێكەوە دەكردو فتوای لێ وەردەگرت[2]، هەروەها الصفدی لەكتێبەكەیدا "نكت الهمیان" باس لە یەكێك لەو نامانە دەكات لەكاتی باسكردنیدا لەژیانی قاضي شرف الدین عبداللهی كوڕی أبی عصرون، لەسەر دورستی مانەوەی لەو پۆستی دادوەریدا دروست بوو دوای ئەوەی كەتوشی نابینایی بوو، ئیبن أبی عصرونیش خۆی سوربوو لەسەر ئەوەی كە لەو پۆستەدا بمێنێتەوە بۆیە نامیلكەیەكی نوسیو تیایدا پشتگیری ئەوەی كرد كە قاضي نابینابێت ئەمەش رایەكە كەمینەیەك لەزانایان ئەسەرینیو زۆرینە رەتی دەكەنەوە، وادیارە سەلاحەدینیش سوربووە لەسەر ئەوەی ئیبن أبی عصرون رازی بكاتو هەستی بریندار نەكات لەبەر بەساڵاچوونی بۆیە ناردی بۆ لای ئیبن عەوفو داوای فتوای لێكرد لەو بارەیەوە الصفدی ئەڵێت: سوڵتان سەلاحەدین بەخەتی خۆی بۆ قاضي لفاضل ی نوسی: قاضي ئەڵێ: دادوەری نابینا دروستە، لەگەڵ شێخ أبو الطاهر ئیبن عوف دا كۆببەرەوە دەربارەی ئەو فەرموودانەی كەلەبارەی دادوەری نابیناوە هاتوون پرسیاری لێ بكە[3]. دیارە سەلاحەدینبە بەدەم راكانی ئیبن عەوفەوە دەهات، ئەوەبوو پەلەی كرد لەجێبەجێكردنی خواستەكەی كاتێ داوای گێڕانەوەی باجی "الصادر"ی كرد كەباجێكە لەسەر بازرگانە فەرەنجەكان دانرابوو لەئەسكەندەریەداو داهاتەكەی بەسەر زانایانی ئەو شارەدا دابەش دەكرا[4]. هەروەها سەرچاوەكان باسی ئەوەدەكەن كەچالاكی ئیبن عەوف تەنها لەوانەوتنەوەدا كورت نەبوبویەوە، بەڵكو هاوشێوەی ئەو چالاكی لەبواری نوسیندا هەبوو ئەوەتا سیوطی ئەڵێ: چەندین كتێبی هەیە[5]، هەروەها شێخ

---

[1] كتاب الروضتين (٢/٢٤-٢٥).

[2] إعلام الاسكندرية ل١١٩.

[3] الوفيات (٢/٢٥٦) نكتب الهيمان ل١٨٥.

[4] إعلام الاسكندرية ل١٢٠.

[5] إعلام الاسكندرية ل١٢٠.

ئەبو طاهر کتێبی" تذکرة التذکرة في أصول الدین" و چەندین کتێبی تری هەبوو[1]. لەساڵی ٥٨١ك ئیبن عەوف کۆچی دوای کردو لەئەسکەندەریەدا بەخاکسپێردرا لەتەمەنی نەوەدو شەشە ساڵیدا[2].

ئەوەی کە ئەبو طاهری سیلەفی وابو الطاهری کوڕی عەوف پێی هەستان لەدەستخستنی زانستو بڵاوکردنەوەی لەنێوان خەڵکیداو کارکردن بۆ زیندوکردنەوەی مەزهەبی سوننە گەورەترین جۆری جیهادە، چونکە سەرقاڵبوون بەدەسخستنی زانستو فێرکردنی خەڵکی گەورەترین جۆری جیهادە بۆ کەسێك کەنیەتی ساغ بێتو هیچ کردەوەیەکی پێ ناگات، چونکە دەبێتە هۆی زیندوکردنەوەی زانستو ئاینو ڕێنیشاندانی خەڵکانی نەزانو بانگەوازکردن بۆ خێرو نەهی کردن لەشەڕو دەسخستنی خێرێکی زۆر کە مرۆڤەکان ئاتاجن پێی[3].

زانستیش پەرستشێکە بەسەرقاڵ بوون پێوەی مرۆڤ لەخوای گەورە نزیك دەبێتەوە زۆرینەی پێشەوایانیش فەزلیان داوە بەسەر زۆر پەرستشی گەورەو سەرەکیدا ئەمەش لەکاتێکدا بوو کەزانست برەوی هەبوو، جائەبێ لەئەمڕۆدا پلەوپایەی چۆن بێت کەکەم بوەتەوەو خەریکە بەرەو نەمان دەچێت دیارە زانست میراتی پێغەمبەرە (ﷺ) و هەرکەس ڕێ"ەیەك بگرێتە بەر بەمەبەستی دەسخستنی زانست خوای گەورە ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکاتو سوودی پێ دەکەیەنێتو ئەم سودەشی لێوە بڵاو دەکاتەوە بۆ خەڵکانی تر، ئاشکراشە کە زانست یەکێکە لەو کردەوانەی کەدوای مەرگیش بەهانای مرۆڤەوە دێت کاتێك کەلاپەرەی کردەوەکانی دەپێچرێتەوە، بەڵکو ئەهلی عیلم بەردەوام چاکەیان زیاد دەکات هەتاوەکو بەهۆی زانستەکەیانەوە خەڵکی ڕێنمایی وەرگرنو شوێن قسەکانیان بکەون، بۆیە جێی خۆیەتی مرۆڤی ژیر کاتە بەنرخەکانی بۆ سەرف بکاتو تەمەنی لەپێناودا دابنێتو خۆی ئامادە بکات بۆ ڕۆژی هەژاریو پێویستی[4].

**چوارەم: عەبدوڵای کوڕی ئەبی عەسرون:**

شێخو پێشەواو زانای لێهاتوو، قورئان خوێنی تاقانەو شێخی شافعیەکانو گەورەی دادوەران (قاضي القضاة) شەرەفەدین زانای خەڵکی شام ئەبو سەعد عەبدوڵڵای کوڕی محمدی کوڕی هیبەتوڵڵای کوڕی المطهری کوڕی عەلی کوڕی ئەبی عەسرونی کوڕی ئەبی سەری تەمیمی بەرەچەڵەك حەدیثیو موسڵیو شافعی[5]، ئەم زانایە لەسەردەمی نورەدیندا بووەتە قازی

---

[1] إعلام الاسكندرية ل١٢١.

[2] سیر أعلام النبلاء (١٢٢/٢١) السنة النبوية في القرن السادس ل ٦٧٧.

[3] الأسباب والأعمال التي يضاعف بها الثواب.

[4] هەمان سەرچاوە ل٧٤.

[5] سیر أعلام النبلاء (١٢/٢١).

سنجار(شەنگار) ونصیبین‌و حەڕاڕان‌و شارەکانی تری دیاربەکرو لەوێ وەکو گەورە سەرۆکی دادوەران (القاضي القضاة) وابوو چەند قازیەکی وەك بریکار دامەزراندبوو لەشارەکانداو خۆی سەرپەرشتی دەکردن[1]، لەساڵی ٤٩٢ك یان ٤٩٣ك دا لەموسڵ لەدایکبووەو لەسەردەستی کۆمەڵە زانایەك خوێندوێتی‌و دواتر گواستویەتییەوە بۆ حەلەب لەساڵی (٥٤٥ك-١١٥٠ز)دا پاشان هات بۆ دیمەشق لەو کاتەدا کەنورەدین هاتە ناویەوەو لەمزگەتی حەلەبدا دەستی دایە خوێندن‌و تیایدا نیشتەجێبوو، چەند کتێبێکی لەبارەی فیقهو مەزهەبەکانەوە نووسی‌و کۆمەڵێکی زۆر قوتابی لەبەر دەستی زانست‌و زانیاریان وەرگرت، چونکە زانایەکی گەورەبوو بەزاناترین کەسی سەردەمی خۆی‌و پێشەوای زانایانی مەزهەبی شافیعی دانراوە، کاروکردەوەشی هاوشێوەی زانست‌و زانیاری بووە، بۆیە نورەدین هێنایە پێشەوەو کردیە سەرپەرشتیاری بنیاتنانی قوتابخانەکان لەحەلەب‌و حمص‌و بەعلەبەك‌و چەند شوێنێکی تردا، زۆریشی نەخایەند کردیە (لقاضي)و دادوەری دیاربەکرو دەسەڵاتی زۆری پێ بەخشی[2]، ساڵی ٥٥٦ك-١١٧٠زیشدا وەك نوێنەری خۆی ناردی بۆ لای خەلیفە ئەلموستەچیئ بۆ بەغدا[3].

١- **عەبدڵڵای کوڕی ئەبی عەسرون‌و سەلاحەدینی ئەیوبی:** سەلاحەدین بەباشی عەبدڵڵای کوڕی ئەبی عەسرونی دەناسی، ئەم ناسینەشی لەسەردەمی زەنکیەوە بوو، چونکە هەردووکیان لەژێر چاودێری‌و لەخزمەت نورەدیندا پەروەردەبوون بەتایبەت سەلاحەدین‌و، هەردووکیان لەپیاوە بەتواناکانی زەنکی بوون کەیەکێکیان لەبواری دادوەری‌و فتواو زانست‌و خوێندندا کاری دەکردو ئەوی تریشیان سەرقاڵی کارە سەربازیەکان بووو گرنگی زۆری پێ دەدا، رەوتی رووداوەکانیش لەسەردەمی نورەدین محمود زەنکییەوە دەیسەلمێنن کەپەیوەندی نێوان ئەم دوو پیاوە پڕبووە لەخۆشەویستی‌و دۆستایەتی‌و رێزی دوو لایەنەو هەریەکەیان بەباشی ئەوی تری دەناسی‌و هەوڵەکانی دەنرخاند، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو نامەیەبوو کەسەلاحەدین لەمیسرەوە ناردی بۆ ئەبی عەسرون بۆ شام، دیارە هەڵبژاردنیشی لەلایەن سەلاحەدینەوەو تایبەتکردنی بەم نامە بەڵگەیە لەسەر فەزڵدانی بەسەر خەڵکانی ترداو داننانە بەرۆڵ‌و کاریگەری لەسەر رووداوەکان، هەر بۆیە نامەکەی جۆرە گلەییەکی لەخۆگرتبوو ئومێدەواربوو کەهەوڵی جدی بدات بۆ هەرەسپێهێنانی ئەو رێککەوتنە غەدر

---

[1] عصر الدولة الزنكية للصلابي ل٢٤١.

[2] عصر الدولة الزنكية، ل٢٤٢، وفيات الأعيان، ل٢٤٢.

[3] مراة الزمان (٢٨٣/٨)، عصر الدولة الزنكية، ل: ٢٤٣.

ئامێزە، عبداللەی کوڕی ئەبی عەسرونیش ئەو ڕێککەوتنەی پێ باش نەبوو ڕەزامەندی لەسەر پێشان نەدابوو، بەڵکو زۆر نیگەران بوو بۆ ئەو لاوازیەی کەموسڵمانەکانی گرتبوویەوە، تەنانەت پێی خۆشبوو سەلاحەدین لەمیسرەوە بێتو پێکەوە کاربکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێککەوتنەو کاربکەن بۆ دەرپەڕاندنی دوژمنی خاچپەرستی خۆسەپێنو داگیرکەری خاکی ئیسلامی لەشامدا[1]، وادیارە ئیبن ئەبی عەسرون وای بەباش دەزانی کەپاش کۆچی دوای نورەدین سەلاحەدین لەمیسرەوە روبکاتە شام بۆ کۆتایی هێنان بەناکۆکی ئەمیرەکان لەپاش نورەدین، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ئەو ئامادەنەبوو ئەم ڕێککەوتننامەیە ئیمزا- واژوو بکات وەك سەرجەم ئەمیرو دادوەرەکانی تری شامو هەروەك یەکێك بوو لەکەسایەتییە گەورەکانی شامو دژ بەو ئەمیرانەش وەستا کەداوای بەردەوامبونییان دەکرد لەسەر دژایەتی سەلاحەدینو ڕێگرتن لەهاتنی بۆ شام ئەمەش وای کرد لەسەلاحەدین کەپۆستی قازیو دادوەری میسری پێ بسپێردرێت[2]، لەگەڵ ئەمەشدا عبداللەی کوڕی ئەبی عەسرون لەگەڵ الملك الصالح ئیسماعیلی کوڕی نورەدین مەحمود زەنکی دا لەدیمەشقەوە چوو بۆ حەلەب پێش گەشتنی سەلاحەدین بۆ دیمەشق، بەڵام لەوێ زۆر نەمایەوەو دوبارە گەڕایەوە بۆ دیمەشقو لەوکاتەشدا سەلاحەدین لەوێ بوو لەساڵی ٥٧٢ك ئەمەش لەکاتی سەرەمەرگی قازی کەمالەدینی شارەزووری قازی شام لەسەردەمی سەلاحەدیندا بوو، ئەوەبوو ئەبی عەسرون بەشداری کرد لەشتنو کفنکردنیداو لەبەخاکسپاردنیدا بەشداربوو[3].

٢- **دانانی ئیبن ئەبی عەسرون بەقازیو دادوەر:** کاتێ کەمالەدینی شارەزووری هەستی بەنزیکبوونەوەی وادەی مەرگی کرد، پۆستی قەزاو دادوەری سپیارد بەئەبی الفضائل قاسمی کوڕی یەحیای کوڕی عەبدڵلای برازای کەنازناوی ضیاءالدینی هەبوو، سەلاحەدینیش ناچاربوو کەرازی بێت، چونکە ضیاءالدین شیاوبوو بۆ دادوەریو دادوەریش یەکێکە لەو پۆستە گرنگانەی کەبە پشتاوپشت ناگوێزرێتەوە[4]، هەروەها کەمالەدینی شارەزوری ڕۆڵی هەبوو لەڕێخۆشکردن بۆ پشوازی کردن لەسەلاحەدین، چونکە پێی وابوو کە لەئەمیرەکانی تر بەتواناترو لێهاتووترە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان، ئەم کارەشی لەو کارە گرنگانەیە کە بۆ کمالەدینی شارەزوری هەژمار دەکرێت، چونکە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانی خستە

---

[1] المدارس العصرونية في بلاد الشام/ د. صادق أحمد، ل٢٩.

[2] السلوك للمقريزى، لە المدارس العصرونية ل٢٩.

[3] مفرج الكروب (٢/٥٠) المدارس العصرونية ل٢٩.

[4] المدارس العصرونيه فى بلاد الشام ل٣١.

پێش هەموو شتێکی ترو فەزڵی سەلاحەدینی دا بەسەر سەرجەم ئەمیرەکانی تر لەشامدا، کەهەستان بەمۆرکردنی ئاشتەوای لەگەڵ دوژمنی خاچپەرستیدا[1] ئەمەش لەکاتی خۆیدا بەدرێژی باس دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار. بەڵام ئارەزووی سەلاحەدین بۆ دامەزراندنی کوڕی أبی عەسرون لەپۆستی قەزاو دادوەردا لەبەر ئەم هۆیانەبوو:

أ- بەهێزی کەسایەتی زانستیو ئەدەبی عبداللەی کوڕی أبی عەسرونو پلەوپایەی وەك شێخی مەزهەبی شافعی لەسەردەمی خۆیدا، بەشایەتی زۆرینەی ئەو خەڵکانەی کەلەو سەردەمەدا ژیاون[2].

ب- ئەو رێزو خۆشەویستییەی کەسەلاحەدین بۆ شوێنکەوتوانی مەزهەبی شافعی هەیبوو، کەهەندێ جار دەگەیشتە رادەی دەمارگیری، چونکە ئەو دەیویست دەوڵەت لەسەر مەزهەبی شافعی یەکبخات.

ج- لەئامێزگرتنی ئیبن أبی عسرون لەلایەن سەلاحەدینەوە لەکاتێکدا کەهات بۆ لای بۆ دیمەشقو لەوەش زیاتر سپاردنی پۆستی قەزای میسر بە کوڕی ئەبی عەسرون لەساڵی ٥٧٠ك وەك مەقریزی باسی دەکات، هەروەها ناردنی نامەیەك بۆی کەهانی دەدا بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی دیمەشق لەگەڵ خاچپەرستەکاندا لەهەمانساڵدا[3]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسەلاحەدین ەرێزو خۆشەویستی زۆری هەبوە بۆیو دەیەوێ ببێتە دادوەری، بەڵکو ئەم نامەیە رێخۆشکەربوو بۆ هەڵبژاردنی لەئایندەدا.

د- هەروەها پەیوەندی سەلاحەدینو کوڕی ئەبی عەسرون زۆر پتەو توندوتۆڵ بوونو کوڕی ئەبی عەسرون خۆی سەرپەرشتی هاوسەرگیری سەلاحەدینی لەگەڵ خاتوو عسمەت دینی کچی ئەمیر معینەدین ئەنرو هاوسەری سوڵتان نورەدین- پێش کۆچی دوای کردنی — کەلەقەڵای دیمەشق دا نیشتەجێبوو لەساڵی ٥٧٢ك[4].

ە- بونی کەسایەتی پایەبەرزلە دەوڵەتی سەلاحەدین دا کەپێیان باش بوو پۆستی — قاضي القضاة — گەورەی دادوەران لەشامدا بسپێردرێت بەعەبدوڵڵای کوڕی ئەبی عەسرون، لەو کەسایەتیانەش القاضي الفاضل کەپەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵیدا هەبوو، کوڕی ئەبی عەسرونیش زۆرجار لەنامەکانیدا بەمجیرەدین قاچی الفاچل ناوی دەبرد وەك ئاماژەیەك

---

[1] المدراس العصرونيه فى بلاد الشام ل٣٥.

[2] مفرج الكروب (٢/٥٠) المدراس العصرونية ل٣٤.

[3] كتاب الروضتين (١/٢٣١)، المدراس العصرونية، ل٣٥

[4] هەمان سەرچاوە (١/٢٣١)، هەمان سەرچاوە ل٣٥.

بەڕێزو پلەو پایەی[1]، هەروەها زانا عیسای هەکاریش یەكێك بوو لەوكەسایەتیو ئەمیرانەی سەلاحەدین كەلەسەردەستی عبدالله كوڕی ئەبی عەسرون زانستی وەرگرتو حەزی دەكرد ڕۆژێك مامۆستاكەی لەپۆستی گەورەی دادوەرانی شام دا ببینێت[2]، بێ گومان ئەم دوو كەسایەتیەش كاریگەریەكی زۆریان هەبوو لەڕاكێشانی سەلاحەدین بەلای عبداللەی كوڕی ئەبی عەسرون داو سپاردنی قەزاو دادوەری پێی، دیارە خەڵكیش جیاوازن لەئارەزوو بۆ چونەكانیاندا[3].

و- پلانی عەبدوڵلای كوڕی ئەبی عەسرونو هاوكارانی كەدەستیان دایە بڵاوكردنەوەی ئەوەی كەضیائەدین لەسەركار لادەبرێتو لەوانەیە توشی ناخۆشی ببێت، ئەمەش تەنگاویەكی بۆ ئەم پیاوە دروست كردو ناچاری كرد كە بێوەیو سەلامەتی هەڵبژێرێو دەست لەكار كێشانەوەی خۆی پێشكەش بكاتو دەست لەكاركێشانەوەكەشی زۆر بەخێرایيو بێ دودڵی پەسەندكرا[4]. ئەمەش ئەوەمان بۆڕون دەكاتەوە كەسەلاحەدین ئارەزووی بەلای عەبدوڵلای كوڕی ئەبی عەسرون دا بوو لەهەمان كاتیشدا نەیدەویست تەنگ بە ضیائەدین هەڵچنێ یان لەسەر كارلاییبات[5]، هەرچۆنێك بێت كۆی ئەم هۆكارانەپێكەوە ڕێخۆشكەربوون بۆ ئەوەی شەرەفەدینی كوڕی ئەبی عەسروت پۆستی گەورەی دادوەران لەئەستۆبگرێت لەهەموو ناوچەكانی شام دا كەلەژێر ركێفی سەلاحەدینی ئەیوبیدا بوون لەساڵی ٥٧٣ك دا[6]، مەرجی سەلاحەدینیش بۆ ئەم دامەزراندنەئەوە بوو كەمحی الدین أبو المعالی محمدی كوری زەكیەدینو ئەوحەد داوود بریكاری كەمالەدین لەدادوەریو قەزادا وەك دوو دادوەر دادوەری بكەنو لەبری سەلاحەدین هێنانو دەركردنی حوكمەكان بڕیار بدەنو دامەزراندنیشیان بەئیمزای خودی سوڵتان دەبێت[7].

٣- **بەرهەمی زانستی كوڕی ئەبی عەسرون:** كوڕی ئەبی عەسرون كەسایەتیەكی تایبەتمەندو خاوەنی سیفەتی دەگمەن بوو، وەك خاوەنی (النجوم الزاهرە) وەسفی دەكات بەوەی كە:

---

[1] هەمان سەرچاوە (١/٢٣١)، هەمان سەرچاوە ل٣٥.

[2] وفيات الأعيان (٣/١٦٣)، المدارس العصرونية، ل:٣٦.

[3] المدارس العصرونية، ل:٣٦.

[4] المدارس العصرونية، ل:٣٦.

[5] مفرج الكروب (٢/٥٠) المدراس العصرونية ل٣٧.

[6] سنا البرق الشامي، ل: ١١٣، المدارس العصرونية، ل:٣٨.

[7] سنا البرق الشامي، ل: ١١٣، المدارس العصرونية، ل:٣٨.

پێشەوایەکی پیاو چاكو كتێب دانەربوو، السبكی ش خاوەنی کتێبی "طبقات الشافعية"وەسفی دەکاتو ئەڵێت: نیشتەجێی دیمەشقو گەورەی دادوەرانو زاناو پێشەوایان بوە[1]. موەفەقەدین قودامەی مەقدیسیش دەربارەی دەڵێ: پێشەوای زانایانی شافیعی مەزهەب بوو لەسەردەمی خۆیدا، ئیبن سەلاحیش باسی دەکاتو ئەڵێ: زانا ترین وتێگەشتوترین خەڵکی سەردەمی خۆی بووو سەرچاوەی فتواو حوكمەشەرعیەکان بوو[2]، عیمادی ئەسفەهانیش لەوەسفی دا ئەڵێ: حوججە تولئیسلام موفتی عێراقو شام شێخی زانستو کەڵە زانا، کەبەفتواکانی ئاینی بەهێزکردو لەسەردەمی ئێمەش دا لەوشارەزاترنیە لەمەزهەبی شافعی داو فەزڵو چاکەی هەموو شوێنەکانی گرتبویەوەو چەند دانراوو کتێبێکی بەپێزی لەسەرمەزهەبی شافعی هەبوو[3]، لەوکتێبانەش کەکوڕی ئەبی عەسرون نوسی "صفوة المذهب في نهاية المطلب" کە حەوت بەرگە،و "الإنتصار" کە چواربەرگەو "المرشد" کە دوو بەرگەو "الذريعة في معرفة الشريعة" یەك بەرگەو "التيسير" دەربارەی جیاوازی کەچواربەرگەو "مآخذ النظر"و "مختصر الفرائض"و "الارشاد المغرب في نصرة المذهب" کەتەواوی نەکردو کارێك ڕوی کردە حەلەب[4].

هەروەها چەندین نوسراوی تری هەیە لەوانە (التنبيه في معرفة الأحكام)و (فوائد المذهب) لەدوو بەرگدا و (الموافق و المخالف) و (الفوائد المنذري) لەدوو بەرگدا. هەروەها بەشێکیشی لەسەر دروست دادوەری کردنی نابینا نوسیوە . بەغدادیش لە (هداية العارفين) دا چەند فتواو زنجیرە فەرمودەیەکی باسکردووە.

٤- **بەرهەمی ئەدەبی شەرەفەدینی کوڕی ئەبی عەسرون:** شەرەفەدین لەزانستەکانی فیقهو ئوصولو جیاوازیو فتوادانو قەزادا بەناوبانگ بوو، هەروەها لەبواری ئەدەبیشدا ناوبانگی هەبوو، چونکە ئەو شاعیرو ئەدیب بوو و عیمادی ئەسفەهانیو خەڵکی تریش چەندین کۆپلە شیعریان هێناوە کە ڕەنگدانەوەی هەستی فراوانو ئەندێشەی بەپێزو دەوڵەمەندو دەروونێکی بەئەزموونە[5]، لەو شیعرانەش:

کل جمع الى شقاق بصير  أي صفوما شابه تكدبر

---

[1] النجوم الزاهرة (١٠٩/٦)، المدارس العصرونية ل: ١٢٢.

[2] طبقات الشافعية (١٣٢/٧)، المدارس العصرونية ل: ١٢٢.

[3] المدارس العصرونية، ل: ١٢٢.

[4] حذيرة القصر، شعراء الشام (٢/ ٣٥١)، المدارس العصرونية، ل: ١٢٢.

[5] هەمانە سەرچاوە، ل:١٢٤.

أنت في اللهو و الآماني مقيم      والمنايا في كل وقت تسير

و الذي غره بلوغ الآماني      بسراب و خلب مغرور

ويك يانفسي أخلصي إن ربي      بالذي أخفت الصدر بصير[1]

هەروەها لەشیعرەکانی:

أمستخبري عن حنيني اليه      و عن زفراني و فرط إشتياقي

لك الخير إن بقلبي اليك      ظما لا يروبه الا التلاقي.

هەروەها وتویەتی:

يا سائلي كيف حالي بعد فرقته      وحاشاك مما بقلبي من تنائيكا

قد أقسم الدمع لا يجفو الجفون أسى      و النوم لازارها حتى ألاقيكا[2]

ئەمە کەسایەتی تایبەتمەندی کوڕی ئەبی عەسرونە کەتێرو تەواوەو کاریگەری خۆی هەبووە لەبواری فەزاو فەتواو سیاسەتو کارگێڕیو دبلۆماسیو باڵیۆزیداو، بەرێژەیەکی باش بەهرەمەند بووە لەزانستو ئەدەب، ئەمەش وای کرد بەرزترین پۆستی دەوڵەت وەربگرێت کە گەورەی دادوەرانو باڵیۆزو شێخو مەرجەعی گەورەی مەزهەبی شافیعی بوو لەسەردەمی خۆیدا[3].

٥- **ڕۆشتنی بۆ مزگێنیدان بەخەلافەتی عەباسی:** لەو ئەرکە پیرۆزانەی کە قاضی شەرەفەدینی کوڕی ئەبو عەسرون پێی هەستا مزگێنیدان بوو بە خیلافەتی عەباسی لەساڵی ٥٦٧ك — ١١٧١ز دا، دەربارەی نەهێشتنیو تاردان بەناوی خەلیفەی عاضدی فاطمیەوەو خوێندنەوەی بەناوی خەلیفە موستەضیئی عەباسیەوە، لەگەڵیشیدا چەندین دانەی تری نوسیبوو و بەهەر شارێکدا تێپەڕبووایە بۆی دەخوێندنەوەو ئەم مزگێنییە گەورەیەی پێدەدان، هەتاوەکو گەیشتە بەغداو خەڵکی بەغداش ڕێزی زۆریان لێناو هەواڵەکەشیان بەرز نرخاندو دینارو پارەیان بەسەردا باراندو خەڵاتو دیاریشیان نارد بۆ نورەدینو سەلاحەدین[4]، بەم شێوەیە قاضی شەرەفەدینی کوڕی ئەبی عەسرون بەردەوام بوو لەبەشداریکردن لەژیانی سیاسیدا بەزانستو راکانیو وەك باڵیۆزی سەلاحەدین بۆ خیلافەتی عەباسی لەبەغدا هەتاوەکو ڕوودانی جەنگی حطین لەساڵی (٥٨٣ك/ ١١٨٧ز)، مێژوونووسیانیش بەشداریان

---

[1] المدارس العصرونية، ل:١٢٤.

[2] المدارس العصرونية، ل:١٢٦، النجوم الذهرة (٦/١١٠).

[3] المدارس العصرونية، ل:١٢٨.

[4] السلوك (١/٦٤، ٦٥)

لەگەڵ سەلاحەدیندا لەم جەنگە مەزنەدا دوپات کردۆتەوە کەتیایدا خوای گەورە زۆربەی شارەکانی کەناری شامو بەیتولمەقەدەسی لەسەر دەست رزگارکردن[1].

٦- **عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی عەسرون تووشی نابینایی دەبێت:** ئەرەفەدینی کوڕی عەسرون وەك قاضی مایەوەو حوکمی بەپێی شەرەع دەکرد هەتاوەکو ساڵی ٥٧٧ك، لەو کاتەشدا تووشی نابینایی بوو و چاوی لەدەستدا، خەڵکیش کەوتنە قسەکردن لەسەر نەشیاوی بۆ دادوەریو تانەیان لەبڕیارەکانی دەدا[2]. لێرەشدا سەلاحەدین زۆر تەنگاو دەبوو و رووبەڕووی گرفتێکی شەرعی بووەوە، چونکە ئەوە نەیدەویست هەستی ئەو هاورێیەی بریندار بکات کەچاوی لەدەستداوەوە لەپۆستەکەی لاییبات و لەهەمان کاتیشدا رووبەرووی وتەو رەخنەی زانیانیش دەبوویەوە کەگومانیان دەکرد لەشیاوێتی کوڕی ئەبی عەصصرون بۆ قەزاو داوای لەسەرکار لادانیان لێدەکرد، کوڕی ئەبی عەسرونیش خۆی رووبەڕووی ئەم کێشەیە بوویەوەو کتێبێکی نوسی دەربارەی دروستی دادوەریکردنی نابینا لەمەشدا پێچەوانەی زۆرینەی زانایان بوو، بەڵگەی کوڕی ئەبی عەسرونیش بۆ ئەم مەسەلە رایەك بوو کە لە "جمع الجوامع"ی رەویانیدا هاتووەو شەرەفەدینی کوڕی ئەبی عەسرونیش هەڵیبژارد لەبەر رۆشنایی ئەوە بەشێکی نوسی دەربارەی دروستی دادوەری نابیناو خۆشی دادوەری مایەوە کاتێ توشی نابینا بوو، بەڵگەی زۆرینەی زانایانیش سەبارەت بەنادروستی دادوەریکردنی نابینا ئەوەبوو کە ئەو رکابەرەکان و شایەتەکان ناناسێو ئیتر چۆن دەتوانێ دادوەری بکات لەرووداوەکاندا، بەڵگەی ئەو کەسانەش کە بەدروستیان دەزانی ئەوە بوو کە شوعەیب پێغەمبەر نابینا بووەو ئەگەر دروست بوبێت نابینا پێغەمبەرو نێردراوی پەروەردگار بووبێت ئەوە دادوەریکردنی نابینا لەپێشترو رەواترە، چونکە پێغەمبەر لەدادوەر بەرێزترو گەورەترە چونکە خوای گەورە فەرزڵی پێغەمبەری داوە بەسەر خەڵکانی تردا، هەروەها وتراویشە: نابینایی شوعەیب نە سەلمێنراوە ئەگەر واش بوبێت ئەو شوێنکەوتووانی ئەوەندە کەمبوون پێویستی بەدادوەریکردن نەبووە لەنێوانیاندا، گریمان پێویستیان بەدادوەریکردن بوبێت ئەوە سروش (وەحی) دابەزیوەو دادوەری کردووە، بەڵام سروش بۆ دادوەرو قاضی دانابەزرێت[3] لەبەرامبەر ئەم گرفتەشدا کە قاضی شەرەفەدینی کوڕی ئەبی عەسرون بەتەنها بەرامبەر بە هەموو زانایان وەستا لەشامدا سەلاحەدین سەرسام بوو و نەیدەزای چی بکات؟ بۆیە ناردی

---

[1] دور الفقهاء و العلماء في الشرق الادنى، ل: ١٣٥.

[2] وفيات الأعيان (٣/٥٤)، المدرس العصرونية، ل:٣٩.

[3] كفرج الكوب (٢/٥١)، نكت الهميان، ل:٦٠.

بۆ لای القاضی الفاضل کە ئەو کاتە لەمیسردا بوو و داوای کۆمەکی لێکرد لەم مەسەلەیەدا بەوەی کە پەیوەندی بە شێخ ئەبی طاهری کوڕی عەوفی ئەسکەندەرییەوە بکاتو پرسیاری لێبکات دەربارەی ئەو فەرمودانەی کەسەبارەت بەدادوەری نابیناوە هاتوون[1]، بەڵکو لای ئەو چارەیەکی بۆ ئەم گرفتو گرێ کوێرەیە دەست بکەوێت، ئەوە بوو زۆری نەخایاند وەڵامی قاضی الفاضل گەیشتەوە دەستی سەلاحەدینو تیایدا هاتبوو: مەسەلەکە لە دوو شت بەدەر نییە، خوای گەورەش باشترین دانەیان بۆ گەورەمان دیاری بکات، هێشتنەوەی مەسەلەکە بەدەستی باوکەوە بەجۆرێك کەڕاو راوێژو فتواو بەرەکەتی بمێنێتو کوڕەکەشی ببێتە جێنشینیو بەمەرج بگیرێت لەگەڵیدا کە لەهەڵەکردندا سزا دەدرێ، یاخود مەسەلەکە بسپێردرێت بەپێشەوا قطب الدین چونکە ئەو پاشماوەی زانایانو پێشەنگیانەو نابێ کەسێ پێشی بخرێت کە لەچینێکی باڵاتر نەبێت لەزانستدا[2].

بەم وەڵامەش سەلاحەدین دەروی لێکرایەوەو چارەسەری دۆزیەوەو سەرەفەدینی بە بەرپرسی یەکەمی دەزگای قەزا هێشتەوەو مەسەلەی دادوەریشی سپارد بە محي الدین أبی حامد محمدی کوڕی شەرەفەدین بەمەرجێك کە باوکی دادوەری راستەقینەو سەرەکی بێتو ئەویش خۆی وا پیشان بدات کە جێگری باوکیەتی، بەجۆرێك کە خەڵکی نەزانن باوکی لابراوە، بەم شێوەیەش شەرەفەدین وەك گەورەی دادوەران لەشامدا مایەوەو کوڕەکەشی بووە جێگری، ئەمەشی بەهۆی داکۆکیکردن لەخۆییو چونە ناو قوڵایی شەرعەوەو دۆزینەوەی بەڵگە بۆ دروستی دادوەری نابینا، پاشان بەهاوکاری سەلاحەدینو پشتگیری قاضی الفاضل بۆی[3].

٧- **کۆچی دوایی کوڕی ئەبی عەسرون:** قاضی کوڕی ئەبی عەسرون لەیازدەی رەمەزانی ساڵی ٥٨٥ك دا کۆچی دوایی کرد[4]، کاتێ ئەم هەواڵەش گەشت بە القاضي الفاضل لەمیسردا نامەیەکی سەرەخۆشی نوسی کەتیایدا هاتبوو: نامەی زاتی پیرۆزتان گەیشت، خوای گەورە سەرکەوتووی بکاتو خەڵکانی پێ دڵخۆش بکاتو رێگای خێری بۆ ئاسان بکاتو کارو کردەوەشی بۆ خۆی ساغ بکاتەوە، لەنامەکەشدا هەواڵێك هەیە کە کەمبوونەوەی ئیسلامو درز تێکەوتنی خەڵکە، بەڵکو لەدرزیش تێپەڕ دەکات بۆ رووخان، ئەمەش ئەو قەزاو بڕیارەی خوایە سەبارەت بەمردنی پێشەوا شەرەفەدینی کوڕی ئەبی عەسرون خوا لێی خۆش بێتو

---

[1] وفيات الأعيان (٣/٥٤)، المدرس العصرونية، ل:٤١.

[2] مفرج الكروب (٢/٧، ٦٨)، المدرس العصرونية، ل:٤١.

[3] المدارس العصرونية، ل:٤١.

[4] سير أعلام النبلاء (٢١، ١٢٩).

ئەو کەموکورتیو زیانەی کە بەهۆی کۆچی دواییەوە توشی سەر زەوی هاتو موسوڵمانانی نیگەرانو نەیارانیانی خۆشحاڵ کرد، چونکە بەراستی ئەو هێمای زانستو پاشماوەی پیاوچاکانی پێشین بوو، زانستی لەم شامدا بڵاوکردەوەو هەرکەسێ فێر بوو بێت لەوەوە بووەو فەزڵی ئەوی تیایە، خوای گەورە ئاوی رەحمەتی بەسەر گۆڕەکەیدا ببارێنێ، دیارە کەسێك خاوەنی ئەو هەموو کتێوبە بەسودە بێت یاخود محی الدین کوڕی بێت نامرێتو چونکە شوێنەوارو زانستی زیندوو بەردەوامەو منیش زۆر غەمگینم کە ئامادەی بەخاکسپاردنی نەبووم، خوای گەورەش دەزانێ کە چەندە دڵتەنگم بە لەدەستدانیو چۆڵ بوونی دونیا لەبەرەکەتیو لەدەستدانی نزاو پاڕانەوەکانی، سوپاس بۆ خوا کە نەمرد هەتاوەکو چەند منداڵێکی باشو بەڕێزو چەندین زانستخوازی زانای پێ گەیاند کە خوێندنگەکان ئاوەدان دەکەنەوە، هەروەها چەندین قوتابخانەو مزگەوتی دروستکردو شەوو رۆژی بە رکوعو کڕنوش بەسەر دەبرد، بەراستی ئەو زیندووە بەکارە جوانەکانیەوەو ئێمەین کە بەهۆی لەدەستدانی ئەوەوە مردووین[1].

## پێنجەم: زانا عیسای هەکاری:

زانا ضیائەدین باوکی محمد کوڕی عیسای کوڕی محمدی کوڕی عیسای هەکاری، یەکێکە لەئەمیرەکانی دەوڵەتی سەلاحەدینو پشتی پێ بەستووە لەراوڕاوێژدا وانەی فیقهی لەخوێندنگەی الزجاجیە لەحەلەبدا دەوتەوەو، پەیوەندی کرد بەئەمیر ئەسەدەدین شێرکۆی مامی سەلاحەدینەوەو بوو بەپێشنوێژیو پێنج فەرزەی بۆ دەکرد، کاتێ ئەسەدەدین بەرێ کەوت بۆ وڵاتی میسرو وەزارەتی گرتە دەست عیسای لەگەڵدا بوو، سەلاحەدینیش راوێژی پێدەکردو رای وەردەگرتو پەیڕەوی دەکردو رێزو نازی زۆری هەبوو لایو گەیەنەری داخوازییەکانی خەڵك بوو بەسەلاحەدین[2].

## پشتیوانی کردنی بۆ سەلاحەدین لەوەزارەتەکەیدا:

کاتێ سەلاحەدین وەزارەتی خەلیفە عاضدی گرتە دەست هەندێ لەئەمیرەکانی نەوەی نورەدین نارازی بوون چونکە چاویان بڕیبووە ئەو پۆستەو ئامادە نەبوون گوێڕایەڵی سەلاحەدین بنو کاری لەگەڵدا بکەن[3]، تەنانەت خەریك بوو ئاژاوەیەك لەنێوان هێزەکانی نورەدیندا لەمیسر روویدات ئەگەر رۆڵی عیسای هەکاری نەبوایە کە کورد بووە، ئەوە بوو بێ وچان هەوڵی لەگەڵ ئەو ئەمیرانەدا دەدا هەتاوەکو توانی لەدەوری سەلاحەدین کۆیان بکاتەوە بەجۆرەها شێواز هەر لەمژدە

---

[1] المدارس العصرونية، ل:١٩٢.

[2] وفيات الأعيان (٤٩٧/٣)، طبقات الشافعية (٢٥٥/٧).

[3] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٢٣.

دانـەوە هـەتاوەکو هەڕەشـەو ترسـاندن، لـەم کـارەش بـەردەوام بـوو هـەتاوەکو دەوڵـەت یـاروقی دامەزراندو ئەمیش بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ شام بۆ خزمەتی نورەدین بەمـەرجێك سـەر بەسـەلاحەدین بێـت[1]، بـەم شـێوەیە ئـەو ڕۆڵـە مەزنـە دەردەکـەوێت کـە زانـا عیـسای هـەکاری پێـی هەسـتا بـۆ پـشتیوانیکردنی سـەلاحەدین لەوەزارەتەکـەیدا، بـەهۆی بـەهێزی کەسـایەتیو زیرەکیشەوە تـوانی دەسـەڵاتی سـەلاحەدین بـچەسپێنێت لەسـەرەتای وەرگرتنـی وەزارەتـداو بـواری بـۆ بڕەخـسێت هـەتاوەکو خـۆی یـەکلایی بکاتـەوە بـۆ مەسـەلەی گـەورەکانی تـر مەبەسـتیـشمان تێکۆشـانە دژ بەخاچپەرستەکان[2].

## چاککردنەوەی نێوانی سەلاحەدین و نورەدین:

لەمەشدا شێخ عیسای هـەکاری ڕۆڵـی سـەرەکی هـەبوو تـوانی نێـوانی سـەلاحەدینو نـورەدین خۆش بکات، بەوەی کە سەلاحەدین پۆزش بێنێتەوە لەوەی کەنەیتوانی بەرەو قـەڵای الکرك بـەرێ بکەوێت بۆ یارمەتیدانی نورەدینو نورەدینیش ئەم پۆزشەی پەسەندکردو نامەیەکی بۆ سـەلاحەدین نوسی کە ئەوەی دەگەیاند: پاراستنی میسر لەشتی تر بەلامانەوە گرنگترە[3]، هـەروەها سـەلاحەدین لەزۆر کاروبـاردا پـشتی بەشێخ عیسای هـەکاری دەبەست هـەتاوەکو وای لـێ هـات بـووە یـەکێك لەئەمیرە گەورەکانی سەلاحەدین، هەروەها سەلاحەدین ڕێزی دەنا لەڕاو و بۆچوونو زانیارییەکانیو لەزۆربەی مەسەلەکانی فەرمانڕەواییدا پرسی پێدەکردو لەڕای دەرنەدەچوو[4].

## هاوکاریکردنی بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ خەڵکی موسڵدا:

بەدوای یەکدا هـاتنی ڕووداوو هەڵوێـستەکان گرنگـی ئـەم زانایـەیان دوپـاتکردەوە لەدەوڵـەتی سەلاحەدیندا، ئەمەش کـاتێ دەرکـەوت کـە سـەلاحەدین ویـستی موسـڵ گـەمارۆ بداتو لەدەسـتی ئەتابەك عیزەدین مەسعودی بیسێنێتەوەو بیگەڕێنێتەوە باوەشی بەرەی ئیسلامیو هاوکـاریکردنی مـسۆگەر بکـات دژ بەخاچپەرسـتان لەجـەنگی یەکلاکـەرەوەی لەگەڵیانـدا، بـەڵام دوای چـەند ڕووبەڕووبوونەوەیـەك لەنێوانیانـدا خەلیفـەی عەباسـی هاتـە نـاو کێـشەکەوەو گـەورەی شـێخەکان صدرالدینی نارد هەتاوەکو هەردوولا ڕێکبخـات[5]، سـەدرەدینیش نـاردی بـۆ لای سـەلاحەدینو داوای لێکرد چەند کەسێکی باوەڕپێکراوی خۆی بنێرێت بۆ دانوستانکردن لەنێوان هەردوولادا، سـوڵتانیش

---

[1] الباهر، ل:١٤٢.

[2] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٢٤.

[3] دور العلماء اصلاح المجتمع زمن الحروب الصليبية، ل:٦٢.

[4] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٢٤.

[5] كتاب الروضتين، له دور الفقهاء و العلماء وه، ل:١٢٦.

داوای لەقاضی فاضل‌و شێخ عیسا کرد کە ئامادەی ئەو دانوستانە بن، ئەوانیش ئامادەبوون‌و بەم شێوەیەش گفتوگۆ دەستی پێکردو گەشتنە ڕێککەوتن‌و سەلاحەدینیش ناوچەکەی بەجێ هێشت‌و بەم شێوەیەش خوێن لەنێوان موسوڵماناندا نەڕژا[1].

### دانوستان لەگەڵ وەزیری خلاطدا:

لەساڵی (٥٨١ك – ١١٨٥ز)دا زانا عیسای هەکاری هەستا بەئەنجامدانی ئەرکێکی دبلۆماسی تر، کاتێ سەلاحەدین ناردی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ وەزیری خەلاطدا وەك بریکاری خۆی، چونکە پاش ئەوەی کە شا ئەرمەن سکمانی فەرمانڕەوای خەلاط کۆچی دوایی کرد سەیفەدین بەکتمەر شوێنی گرتەوە، پاڵەوان ئەتابەك شەمسەدین محمدی کوڕی ئیلدکزی فەرمانڕەوای عەجەمیش بەرێکەوت بۆ ئەوەی خەللاطی لەدەست بسێنێت، هەروەها وەزیری خەلاطیش چاوی تێ بڕیبوو کەناوی مجدالدینی کوڕی موەفەقی کوڕی ڕەشیق بوو داوای لەسەلاحەدین کرد کەسنورێك بۆ ئەو تەماعکاریانە دابنێت، سوڵتانیش زانا عیسای هەکاری ناردو ئەرکێکی دبلۆماسی پێ سپارد هەتاوەکو زەمینەسازی بکات بۆ ئەنجامدانی دانوستان لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا، ئەوە بوو وەزیری خەلاط قسەی لەگەڵ عیسای هەکاریدا کردو داوای لێکرد سوڵتان پەلە بکات لەهاتنیدا پێش ئەوەی پاڵەوان بگاتە بەرەوە، لەوکاتەشدا سەلاحەدین موسڵی بەجێ هێشتبوو بەرەو خەلاط بەرێکەوتبوو، کاتێ پاڵەوانیش بەم گۆڕانکاری‌و ڕوداوانەی زانی‌و دڵنیابوو لەپشتگیری عیسای هەکاری بۆ وەزیری خەلاط ترساو داوای سوڵحی کرد لەگەڵ وەزیری خەلاطدا و پاش مۆرکردنی سوڵحیش گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی، ئەم کارەش بەحیکمەت‌و دانایی زانا هیسای هەکاری بوو کە لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بوو و توانای هەردوولا لەسەر مێزی گفتوگۆ کۆ بکاتەوەو دۆستایەتی‌و هاوسۆزی نێوانیان بگێڕێتەوە[2].

### پیاوی ئەرکە تایبەتەکان:

لەساڵی (٥٨٢ك – ١١٨٦ز)دا سوڵتان هەستا بەئەنجامدانی چەند گۆڕانکارییەك لەمیسرو شامدا بەتایبەت لەجێنشین‌و بریکارەکانی خۆیدا ئەمەش بەمەبەستی دڵنیابوونی لەئایندەی وڵات دوای کۆچی دوایی خۆی‌و دروست نەبوونی ناکۆکی لەنێوان جێنشینەکانیدا کە کوڕانی خۆی بوون. ئەمە سەرباری ڕاهێنانیان لەسەر سیاسەتی حوکمڕانی لەژیانی خۆیداو پاراستنی وڵات لەدابەش بوون، بەتایبەت کە لەسەروو بەندی خۆ ئامادەکردندا بوو بۆ جەنگێکی یەکلاکەرەوە دژبەخاچپەرستەکان،

---

[1] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٢٧.

[2] مفرج الكروب (٢/١٦٨، ١٦٩).

کاتێ هەواڵیی پێگەیشت کە تقی الدین عمری برازای‌و جێنشینی لەمیسردا لەگەڵ الملك الافضلی کوڕیدا چەند هەڵسوکەوتێکی ئەنجامداوە لەکاتی نەخۆشکەوتنی سەلاحەدیندا لەحەڕان کە بەڵگەیە لەسەر ئارەزووی تاکڕەوی‌و خۆسەپاندن بەسەر میسردا، هەستا بەناردنی زانا عیسای هەکاری بۆ میسر کەپیاوێکی پایەبەرز بوو بەلایەوەو سوپاش گوێڕایەڵیان دەکرد ، فەرمانی پێکرد کە تقی الدین عمر لەمیسرە وەدەرنێ‌و خۆی لەشوێنیدا بمێنێتەوە[1] زانا عیسا هەکاریش هەستا بەجێبەجێکردنی داواکەی‌و بەرەو میسر بەرێکەوت‌و داخوازییەکەی سەلاحەدینی جێبەجێ کردو تیایدا مایەوە هەتاوەکو العادلی برای سەلاحەدین بەهاوڕێیەتی العزیز عثمانی کوڕی سەلاحەدین گەشتە میسر، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو متمانە زۆرەی کە سەلاحەدین بەزانا عیسای هەکاری هەیبوو و دڵنیابوونی لێی بەتایبەت کە دەیزانی هەکاری کاریگەری زۆری هەیە لەسەر سوپا لەمیسردا[2].

## ئازایەتی لەجەنگەکانی خاچپەرستیدا:

دوای ئەوەی کە بارودۆخی وڵات سەقامگیر بوو سەلاحەدین دەستیدایە جیهادکردن لەبەرەی شامدا بە بەشداری کۆمەڵێکی زۆر زانای خۆبەخش، لەپێش هەموشیانەوە زانای عیسای هەکاری کە بەشێوەیەکی کردەیی بەشداری دەکرد لە تێکۆشان دژ بەخاچپەرستانداو شمشێری هەڵدەگرت‌و لەپێناو خوادا دەجەنگا، پۆشاکی سەربازی لەبەر دەکردو مێزەرەی مەلاشی بەسەرەوە بوو و هەردوو پۆشاکەکەی پێکەوە کۆ دەکردەوە[3]. سەرچاوە ئیسلامییەکانیش ئەم بەشدارییەیان بۆ ئەم زانایە تۆمار کردووە، ئەوە بوو لەکاتێکدا سەلاحەدین چوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان لەساڵی ٥٧٣ك – ١١٧٧زدا لەعەسقەلاندا هەستا بەپەلاماردانی‌و خەڵکێکی زۆری لێ کوشت‌و زۆرێکیشی لێ بەدیل گرت‌و دەوروبەری شارەکەشی سوتاند، پاشان بەردەوام بوو بەرەو رەملەو لەوێش دەرکەوت‌و دیلی زۆری هەبوو بەڵام کاتێ سوپاکە سەرقاڵی کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان بوون‌و بەگوندەکاندا بڵاوبوونەوە سەلاحەدینیش لەگەڵ چەند جەنگاوەرێکی کەمدا مایەوە، خاچپەرستەکان کتوپڕ هێرشیان هێناو موسوڵمانەکانیان شپرزە کرد پاش رووبەڕووبوونەوەیەك ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان کوژرانو بەدیل گیرا، زانا ضیائەدین عیسای هەکاری‌و ظهیرەدینی براشی لەو کەسانەدا بوون کە بەدیل گران، ئیبن کثیریش باسی ئەوە دەکات کە عیسای هەکاری

---

[1] دور الفقهاء و العلماء المسلمین، ل:١٢٨

[2] دور الفقهاء و العلماء المسلمین، ل:١٢٩.

[3] وفیات الأعیان (٣/٤٩٨)

لەو رۆژەدا کوشتارێکی باشی کردووە[1]، بەڵگەشمان لەسەر مەزنی پلەپایەی ئەم زانایە لای سەلاحەدین ئەوەیە کە مێژوونوسان باسیان کردووە کە سەلاحەدین دوای دوو ساڵ بەبڕی شەست هەزار دینار ئازادی کرد[2]، هەروەها مێژوونوسان باسی ئەوە دەکەن کە سەلاحەدین تەنها پارەی بۆ ئازادکردنی ئەم زانایە نەداوە بەڵکو کۆمەڵێکی زۆریشی لەداویەکان[3] ئازادکرد، لەوانەیان کە بەدیلی گرتبوون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەورەیی ئەم زانایە لای سەلاحەدینی ئەیوبی[4] ئەمەو زانای پایە بەرز عیسای هەکاری لەساڵی ٥٨٥ك دا کۆچی دوایی کرد[5].

**شەشەم: زەینەدین عەلی کوڕی نەجا:**

لەو هەڵوێستە جوانانە کە کۆمەڵێ لەزانایان پێی هەستان‌و شیاوی ئاماژە پێدانە، ئەو دڵسۆزی‌و خەمخۆرییە بوو کە لەساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٤ز دا نواندنیان لەپێناو سەلامەتی‌و ئاسایشی وڵاتداو سوربونیان لەسەر پارێزگاری لێکردنی لەهەڵوەشانەوەو پارچە پارچە بوون، هەتاوەکو دوژمنانی ئیسلام چاوی تێ نەبڕن، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کەکۆمەڵێ شیعە لەمیسردا هەستان بەپیلانێك بۆ گێڕانەوەی دەوڵەتی فاطمی دوای ئەوەی کە لەسەردەستی سەلاحەدین روخێنرا لەساڵی ٥٦٧ك/ ١١٧١ز، پیلانەکەشیان بەو شێوە بوو کە بانگهێشتی گاورەکانی صقلیەو وڵاتی شام بکەن بۆ بەدەمەوە چونیان بۆ میسر بەرامبەر بە بەخشینی برێك پارەو چەند ناوچەیەك پێیان، لەپیلانەکەشیاندا هاتبوو کە لەو کاتەدا خاچپەرستەکان دێن‌و سەلاحەدینیش دەچێتە دەرەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەیان پیلانگێڕان لەناوەوەی میسردا شۆڕش بەرپا دەکەن‌و بەم پێیەش سوڵتان ئەکەوێتە نێوەندی دوو ئاگرەوە، ئاگری راپەڕین لەناو خۆرداو ئاگری خاچپەرستەکان لەدەرەوەدا، ئەمەش دەبێتە هۆی پەرتەوازەکردنی هێزەکانی‌و شسکت خواردنی لەبەرامبەر خاچپەرستەکاندا، لەدەرەوەو لەناوەوەشدا یاخیبووان دەست دەگرن بەسەر دەسەڵاتدا، سەرکردەی ئەم پیلانگێڕانەش لەشیعەکاندا زاناو شاعیر عمارەی کوڕی ئەبی لحەسەتی یەمەنی[6] و عەبدولسەمەدی کاتب‌و قاضی هیبەتوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا ئەلعوەیرس‌و چەندین سەربازی میسری‌و

---

[1] مفرج الكروب (٢/٥٩، ٦٠).

[2] كتاب الروضتين، لە دور الفقهاء و العلماء، ل:١٢٥.

[3] كۆمەڵە جەنگاوەرێكی ئاینی گاور بوون كە بەرەگەز فەرەنسی بوون.

[4] دور الفقهاء و العلماء المسلمين، ل:١٢٥.

[5] وفيات الأعيان (٣/٤٩٧).

[6] وفيات الأعيان (٣/٤٣١، ٤٣٦)

پیاوانی سودان‌و کارمەندانی ناو کۆشك‌و کۆمەڵێك لەئەمیروسەربازانی سەلاحەدین[1] بوون، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم پیلانە خیانەتێکی ئاشکرایە لەلایەن کۆمەڵێ شیعەوە لەوانەی کە پشتیان دەبەست بەخاچپەرستەکان بۆ کوشتاری موسوڵمانەکان لەپێناو دەسکەوتنی چەند بەرژەوەندییەکی کەسی‌و تایبەت‌و، روخاندنی دەوڵەتی سونتی ئیسلامی سەلاحەدین کە تێدەکۆشا دژ بەدوژمنانی ئاین، تەنانەت ئەم خیانەتە گەشتە ئاستێك کە پارە ببەخشن بەخاچپەرستەکان بۆ هاتن بۆ میسرو داگیرکردنی[2].

ویستی پەروەردگاریش وابوو کە سەرەداوەکانی ئەم پیلانە لەسەر دەستی یەکێك لەپیاوانی ئاینی‌و زانایانی دڵسۆزو رۆشنبیرو عەمخۆرو بەرژەوەندیخوازی ئوممەتی ئیسلامی کە ئەویش زەینەدین عەلی بوو ئاشکرا ببێت، ئیبن ئەسیر ئەڵێ: میهرەبانی پەروەردگار لەوەدا بوو کە کۆمەڵە میسریەکە زەینەدین عەلی کوڕی نەجای واعیظ و قاضی ناسراو بە ئیبن نەجیەیان بردە ریزی خۆیانەوە[3]و خەلیفەو وەزیر بانگخوازو قاضیان لەناو خۆیاندا دیاریکرد[4]، کاتێ قاضی ئیبن نەجایان بردە ریزی خۆیانەوەو ئەویش کاتێ هەستی بەمەترسی پیلانەکەیان کرد، هەستا بەئاگادارکردنەوەی سەلاحەدین لەهەموو وردەکارییەکانی پیلانەکە، ئەویش داوای لێکرد کە هاوکاریان بکات‌و لەهەموو گۆڕانکارییەکان ئاگاداری بکاتەوە، ئەویش بەگوێی کردو بەوردی مەبەست‌و کارەکانیان دەگەیاندە سەلاحەدین[5]. لەبەر رۆشنایی ئەم زانیارییانەشدا سەلاحەدین توانی لەوردەکارییەکانی پیلانەکە ئاگاداربێتەوەو هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا نێردراوێکی پاشای فرەنج لەناوچەی کەنار دەریای ناوەڕاستدا گەشتە لای سەلاحەدین‌و دیاری‌و نامەیەکی پێ بوو کە بەرواڵەت بۆ سەلاحەدین بوو و لەناوەرۆکدا بۆ ئەوان بوو، دیارە نامەگۆڕینەوە لەنێوان گاورەکان‌و ئەو کۆمەڵەدا هەبوو، سەلاحەدینیش بەمەی زانی‌و، یەکێك لەو گاورانەی کە متمانەی پێی هەبوو راسپارد هەتاوەکو لەگەڵ نێردراوەکەیاندا بڕوات‌و لەمەسەلەکە دڵنیا بێت ئەویش رۆشت‌و راستی مەسەلەکەی لەنێردراوەکەوە بۆ هێنا، لەم کاتەشدا سەلاحەدین لەو هەواڵەی ئیبن نەجا دڵنیابوو و فریای مەسەلەکە کەوت پێش روودانی و فەرمانی دەستگیرکردنی ئەو پلانگێڕانەی دەرکردو لەناوی

---

[1] مفرج الكروب (١/٢٣٤ — ٢٤٤).

[2] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٣٠

[3] وفيات الأعيان (٢/٥٣٠)

[4] السلوك (١/٧٤، ٧٥)، دور الفقهاء و العلماء، ل:١٣٠.

[5] مفرج الكروب (١/٢٤٤، ٢٤٥).

بردن بەم شێوەیەش کۆتایی بەئاژاوەکە هات[1]، پاش ئەمەش سوڵتان زەینەدینی کوڕی نەجای لەخۆی نزیککردەوەو خەڵاتو پارەی باشی پێ بەخشیو پێداویستییەکانی بەتەواوی جێبەجێ کرد، هەروەها راوراوێژی پێ دەکردو سەرسام بوو بەراکانیو[2]و، نازناوی عەمری کوڕی عاصی لێ نابوو و راکانی جێبەجێ دەکرد چونکە ژیرو لێزان بوو، زۆرێك لەپیاوانی دەوڵەتو خەڵکانی سوننە لەمیسردا بەگوێیان دەکردو لەرای دەرنە دەچوون، هەروەك پاشان ئەلعەزیزی کوڕی سەلاحەدین پێی وت: هەر شتێکت بە بەرژەوەندی زانی بۆم بنوسە، چونکە من تەنها بەرای تۆ کار دەکەم[3].
هەروەها ئیبن جەوزی باسی ئەوە دەکات کە ئیبن نەجا چالاك بووە لەئامۆژگاریکردنی خەڵكو گێڕانەوەی فەرمودەدا، سەلاحەدینو کوڕەکانیشی لەمەجلیسیدا ئامادە دەبوونو گوێیستی وانەکانی ئەبوونو پلەوپایەو رێزێکی زۆری هەبوو لەناو خەڵکدا[4] کاتێك سەلاحەدینیش کەوتەڕێ بۆ رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان لەوڵاتی شامدا زەینەدینی کوڕی نەجا رووداوەکانی بۆ تۆمار دەکرد[5]، لەو شتانەش کە نوسیبوی ئەوە بوو کاتێ قەڵای حمصی ئازاد کرد لەساڵی ٥٧٠ك — ١١٧٤ز دا نامەیەکی بۆ نوسی کەتیایدا بەشێوەیەکی دوورو درێژ وەسفی قەڵاکەی بۆ دەکرد[6]، کاتێ سەلاحەدینیش بڕیاری مانەوەو جێگیربوونیدا لەشامدا کوڕی نەجا لەساڵی ٥٨٠ك — ١١٨٤ز دا نامەیەکی بۆ نوسیو باسی جوانیو خێرو بێرو نیلو مزگەوتەکانی بۆ دەکرد، پاشان بەڵگەی لەسەر گەورەییو فەزڵی میسر بە چەند ئایەتو گێڕانەوەو ئاسەوارێك هێنایەوە، سەلاحەدینیش بەنامەیەك وەڵامی دایەوە (کە کچەزای ئیبن جەوزیو ئەبو شامە هێناویانە)تیایدا باسی ئەوە دەکات کە نیشتەجێ بوون لەشامدا باشترەو ئاوو هەوای خۆشترەو خوای گەورەش لەقورئاندا سوێندی پێ خواردووە، هەروەها گلەیی ئەوەی لێدەکرد کە چۆن بیری دیمەشقی زێدی خۆی ناکاتەوەو داوای لێکرد کە بگوێزێتەوە بۆ دیمەشقو لەکۆتایەکەشیدا هاتبوو: زەینەدین باسی خراپەکانی شام دەکاتو منیش ئومێد دەکەم بگەڕێتەوە بۆ هەقو لەگەڵ هاوڕێکانیدا بگەڕێتەوە بۆی بەپشتیوانی خوا[7] هەرچۆنێك بێت ئیبن نەجا بەردەوام بوو لەسەر کارکردن لەگەڵ سەلاحەدیندا هەتاوەکو

---

[1] الكامل في التأريخ، لە: دور الفقهاء و العلماء، ل:١٣١.

[2] كتاب الروضتين (١/٢١٩/٢٢٤).

[3] دور الفقهاء و العلماء، ل:١٣١.

[4] مرأة الزمان، لە: هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ل:٢٨٢

[5] كتاب الروضتين، لە: هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ل:٢٨٤.

[6] هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ل:٢٨٤

[7] كتاب الروضتين، لە: هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ل: ٢٨٤

لەئازادکردنی بەیتولمەقدیس بەشدار بوو و پێکەوە چوونە ناویەوەو یەکەم مەجلیسی وەعزو ئامۆژگاری لەمزگەوتی ئەقصادا گرێدا[1] کە دواتر باسی لێوە دەکەین بەپشتیوانی خوا، دواجاریش ئەبولحەسەن عەلی کوڕی نەجای حەنبەلی ناسراو بەزەینەدین لەساڵی ٥٩٩دا کۆچی دوایی کرد رەحمەتی خوای لێ بێت[2].

## حەوتەم: عیمادی ئەسفەهانی:

قاضیو پێشەوا، زاناو موفتی، بەرپرسی دیوانی ئینشاو وەزیر عمادەدین، باوکی عەبدوڵلا محمدی کوڕی حامدی کوڕی محمدی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەلی کوڕی محمودی کوڕی هیبەی ئەصفەهانی نوسەر، کە بەئیبن أخي العزیز ناسرا بوو، هاتە بەغداو لەخوێندنگەی نامیەدا نیشتەجێ بوو، لەبواری فیقهدا لێهاتووبووەو لەسەر دەستی ئەبی منصور سعیدی کوڕی رەزاز خوێندویەتیو زمانی عەرەبیو جیاوازی بەباشی زانیوەولەزانستی (الترسل)دا دەستێکی باڵای هەبوو چەندین کتێبی نوسیوەو ناوبانگی دەرکردووە، پەیوەندی بەئیبن هبیرەوە کردووەو پاشان چووەتە دیمەشق لەساڵی ٥٦٢ك و پەیوەندی کردووە بەدەوڵەتەوەو لەدیوانی ئینشادا خزمەتی کردووە لەسەردەمی نورەدینداو بەفاریسیش شتی دەنوسی، نورەدینیش وەك نێردراوی خۆی ناردی بۆ لای المستنجد، و وانەوتنەوەی –عیمادیەدا– ئامێری پێ سپارد لەساڵی ٥٦٧دا، پاشان لەدیوانی ئەشرافدا دایمەزراند، کاتێ نورەدین کۆچی دوایی کرد پشتگوێ خراو ئەویش رووی کردە موسوڵو لەوێ نەخۆش کەوت، پاشان گەڕایەوە بۆ حەلەب لەکاتێکدا کە سەڵاحەدین گەمارۆیدابوو لەساڵی ٥٧٠ك دا، لەوێ دەستیدایە پیاهەڵدانی سەڵاحەدینو لەلای مایەوەو نامەی بۆ نارد ئەویش نزیکی کردەوە لەخۆیو، کاتێ القاضي الفاضل لەمیسر دەردەچوو عیمادەین شوێنی دەگرتەوە[3]، بەم شێوەیە عماد بووە بریکاری قاضی الفاضل لە هەموو کاروبارەکانیداو پلەوپایەی جارانی دەسکەوتەوەو بوو بەنوسەری تایبەتی سەڵاحەدینو[4]، ئەویش هەموو کاروبارەکانی پێ دەنوسیو متمانەی پێ بەخشیو بوو بە یەکێك لە کەسە نزیکەکانی کە پارەی دابەشدەکردو کاروبارەکانی بەڕێوە دەبردو بەبێ گەڕانەوەو بۆ سوڵتان ئیمزاو مۆری هەر شتێکی دەکرد کە پێی باش بوایەو پێداویستی ئەو خەڵکانەی جێبەجێ دەکرد کە روویان لێ دەناو هاوشانی وەزیرو ناودارانی دەوڵەت بوو هەرچەندە نەگەشتە ئاستی القاضي الفاضل لای سەڵاحەدین، دوای ئەمەش عماد لە القاضي

---

[1] هكذا ظهر جيل صلاح الدين، ل:٢٨٤.

[2] وفيات الأعيان (٢/٥٣٠)

[3] العماد القاضي، د. حسين عاصي، ل:٢١.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١، ٢٢.

الفاضل زیاتر لای سەڵاحەدین دەمایەوەو القاضی الفاضل زۆرجار ئامادە نەدەبوو لای سوڵتان چونکە بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکان سەردانی دیمەشقو قاهیرەی دەکردو.... هەروەها لەسەردەمی سەلاحەدیندا نامەو بڵاوکراوەو مزگێنی نامەی دەردەکردو ئەچووە مەجلیسی راوێژکردنەوە[١].

کاتێ سەڵاحەدینیش کۆچی دوایی کرد لەساڵی ٥٨٩دا عماد رۆڵی ئەماو ناوبانگی کوژایەوەو کاروبارەکانی بەرەو خراپی چوون چونکە کوڕەکانی سەڵاحەدین وەك باوکیان مامەڵەیان لەگەڵدا نەدەکردو هەستان بەدوورخستنەوەی لەپۆستەکەی، دەربارەی ئەمەش عماد لەپێشەکی البرق الشامیدا ئەڵێ: کاتێ پەروەردگاری میهرەبان سەڵاحەدینی بردەوە بۆ بەهەشتەکەی خۆی کوڕەکانی موڵكو دەوڵەتەکەیان بەشکردو منیش وتم: رێگەی ئەو دەگرنو درێژە بەکارەکانی دەدەنو رێزم دەگرنو دڵخۆشم دەکەن، بەڵام گومانەکەم لەجێی خۆیدا نەبوو و یارمەتیو بەخششیان لێ گرتمەوەو سەرچاوەیان وشك کردمو پرۆژەکانیان شێواندم[٢]. پاش کۆچی دوایی سەڵاحەدینیش ئەو مێژوونوسانەی کەباسی ژیانی عمادیان کردووە بەهیچ شێوەیەك باسیان نەهێناوە، یاقوت دەڵێت: لەماڵی خۆیدا مایەوەو دەستیدایە نوسین[٣]، هەروەها ئیبن خەلەکان دەڵێت: لەماڵەوەدا مایەوە خەریکی کارونوسینی کتێب بوو.

بەڵام وادیارە عمار پاش ماوەیەك گەڕاوەتەوە بۆ وانەوتنەوەو نوسین، ئەمەش لەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە القاضی الفاضل بۆ عمادی نارد لەمیسرەوە لە ٥٩٥ك دا و تیایدا سکاڵای تەنهایی خۆی دەکاتو توانای وانە وتنەوەو نوسینی عماد بەنیعمەتو بەخششێك دائەنێت کە شیاوی سوپاسگوزارییەو، ئەڵێ: خوا دەزانێ من لە چ تەنهاییەکدامو ئۆقرەم لێبڕاوە لەم سەردەمە ناخۆشەدا، و چاوەڕێی (البرق الشامی)م کە بباریێ بەسەرمداو سەرقاڵ بوونی گەورەشمان بەوانە وتنەوەو نوسینی پڕ رەوانبێژییەوە نیعمەتو بەهرەیە کە شیاوی ئەوەیە کە زانایان سوپاسگوزاری بن، بەرامبەر بەو چێژو خۆشییەی کە لێی دەبەن[٤]. لەو شیعرانەش کە دەیوت:

و للناس بالملك الناصر الصلاح    صلاح و نصر كبير

هو الشمس و افلاكه في البلاد    و مطلعة شرجُهُ و السرير

اذا ماسطا أو حبا واحتبى    فما الليث؟ من حاتم؟ ما ثبير؟[٥]

---

[١] سنا البرق الشامي، ل:٥٢، العماد الاصفهاني للعاصي، ل:٢٤.

[٢] إرشاد الأديب (٧/٨٥)

[٣] وفيات الأعيان (٥/١٥٢)

[٤] كتاب الروضتين، له: العماد الأصفهاني، ل:٢٦

[٥] سير اعلام النبلاء (٢١/٢٤٩)

هەروەها لەکاروانێکدا بوو دەربارەی القاضی الفاضل ئەیوت:

أما الغبار فانه      مما أثارته السنابك

فالجو منه مظلم      لكن تباشير السنابك

يا دهر لي عبدالرحيم      فلست أخشى مَسَّ نابك[1]

پاشان عماد لەرۆژی دووشەممە لەسەرەتایی مانگی رەمەزانی ساڵی ٥٩٧ك/ى حەزەیرانی ساڵی ١١٢١دا کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی سۆفیەکاندا لەدەرەوەی باب النصر بەخك سپێردرا[2].

**هەشتەم: ئەلخەبوشانی:**

زانای پایەبەرزو دونیا نەویست، نجم الدين أبو البركات محمدی کوڕی موفەقی کوڕی سەعیدی خەبوشانی شافیعی سۆفی، لەسەر دەستی محمدی کوڕی یەحیا خوێندویتی‌و زیرەکی‌و لێهاتوویی پێوە دیار بووە[3]، کتێبی (المحيط)ی خۆی لەبەربووە کە شازدە بەرگ بووەو بەڕەچەڵەك خەڵکی نیسا بووەو ژیانی سادەو زبری هەبووەو زۆر توندوتۆڵ بووە لەئایینداو پێش ئەوەی بێتە میسرەوە دەیوت: ئەچم بۆ میسرو دەسەڵاتی عوبەیدی یەهودی ناهێڵم، ئەوە بوو لەقاهیرەدا نیشتەجێ بوو و دەستیدایە رەخنەگرتن لەخەڵکی کۆشكو قسە پێ وتنیان، ئەوانیش سەرسام بوو بوون لەگەڵیداو نەیاندەزانی چی بکەن‌و، پارەو بەخششێکی زۆریان بۆ نارد کە دەڵێن: چوار هەزار دینار بووە، ئەویش بەو نێردراوەی وت کە بۆی هێنا بوو: لەناوچیت ئەم بیدعەیە چییە؟ پاشان داوای لێکرد بەخێرایی بڕوات‌و ئاڵتونەکەی بۆ فڕێداو پاش لێدان‌و داگرتنی لەسەر پلیکانەکان[4]. کاتێ هاتە میسرەوە لەساڵی ٥٦٥ك دا لەمزگەوتێکدا نیشتەجێ بوو، لەوکاتەشدا خەلیفەی فاتمی العاضرلدين الله خەوێکی بینی، لەخەوەکەشیدا دوپشکێك لەمزگەوتێکی ئەو شارەوە هاتە دەرەوە پێوەیداو ئەویش بەترسەوە راچڵەکاو کەسێکی بانگ کرد کەشارەزا بوو لەلێکدانەوەی خەودا خەوەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش وتی: ئەمیری باوەڕداران لەلایەن پیاوێکەوە زیانی پێ دەگات کە لەو مزگەوتەدا نیشتەجێ بووە، پاشان خەلیفە فەرمانیدا بەهێنانی ئەو کەسەی کە لەو مزگەوتەدایە، ئەوانیش چوون‌و سۆفیەکیان هێناو عاضدیش لێی پرسی لەکوێوە هاتووەو کەی هاتووە تەمیسرو بۆچی هاتووە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە، عاضدیش هیچ شتێکی وای تیایدا بەدی نەکرد کەجێی گومان بێت بەڵکو هەژاری‌و راستگۆیی بۆ دەرکەوت، بۆیە بڕێك پارەی پێداو پێی وت: ئەی شێخ دوعامان بۆ

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢١/٣٥٠)

[2] العماد الأصفهاني، ل:٢٧

[3] سير أعلام النبلاء (٢١/٢٠٤)

[4] طبقات السبكي (٧/١٥)، سير أعلام النبلاء (٢١/٢٠٥)

بکە، پاشان ئازادی کردو ئەویش هاتەوە بۆ مزگەوتو تیایدا مایەوە هەتا ئەو کاتەی کە شێرکۆ هات لەدیمەشقەوەو سوڵتان سەلاحەدین بووە وەزیری عاضدو دەستیدایە رووخاندنی دەوڵەتی فاطمیو، داوای فتوای لەزانایانی میسر کرد، خەبوشانیش لەهەموویان توندتر بوو بەرامبەریانو خراپەکانی باسکردنو بەبێ باوەڕی دادەنانو زۆر لەسەریان دەدوا[1]، هەروەها ئەم زانایە فرمان بەچاکەو نەهی لەخراپە دەکرد، ئەوە بوو جارێکیان بەردەرکی جێنشینی میسر مظفرالدین عومەر هاتەلایو وتی: تقی الدین سڵاوت لێدەکات، خەبوشانیش وتی: بڵێ شقی الدین واتە یاخی لەدین سڵاوی خوای لێ نەبێت، کابراش وتی: ئەو پۆزش دەهێنێتەوەو دەڵێ: شوێنی نییە بۆ فرۆشتنی ئاوی گەنمەشامی، خەبوشانیش وتی: درۆ ئەکات، وتی: ئەگەر شوێنێك ئەزانێت پێمان بڵێ، وتی: وەرە پێشەوە، کاتێ هاتە پێشەوە قژی گرتو بەزللە هات بەسەریداو ئەیوت: من ئاوی گەنمەشامی نافرۆشم، تا بزانم لەکوێ هەیە، پاشان لەدەستی رزگاریان کرد[2]، بەدرێژایی تەمەنیشی پارەی لەپاشایەك یان پارەی وەقفی وەرنەگرتووەو لەو جلانەشدا کفن کرا کە لەبەریدا بوو[3]، ئەمەو خەبوشانی لەمانگی ژی القعدەی ساڵی ٥٨٧ك دا کۆچی دوایی کرد[4].

ئەمە ژیاننامەی هەندێ لەزانایانی سەردەمی سەلاحەدین بوو، کە پلەو پایەیان زۆر بەرزو شکۆدار بوو لای سەلاحەدینو مەجلیسی پڕ بوو لەپیاوچاكو زانایان، عیمادیش لەم بارەیەوە ئەڵێ: پێی باش بوو فەرمودە بەسەنەدەوە باس بکرێتو، زانایانیش لەزانستی شەرعی بەسود بدوێن، بەهۆی زۆر گفتوگۆکردنو دانیشتنیشەوە لەگەڵ زانایانو دادوەرانا لەوان شارەزاتر بوو لەحوکمو بەڵگەی شەرعیو هۆکارەکانی رەزامەندی پەروەردگار[5].

ئیبن شەدداد لێیەوە ئەگێڕێتەوە: کە هەر کاتێ بیبیستایە زانایەك هەیە ریوایەتی باشەو فەرمودەی زۆری بیستووە، ئەوە ئەگەر زاناکە بهاتایە بۆ لای داوای هێنانی دەکردو گوێبیستی فەرمودە دەبوو لێوەی ئەگەر زاناکەش ئامادە نەبوایە بێتە لای سوڵتان بەپێی خۆی دەچوو بۆ لایو کوڕەکانو دەوروبەریشی بەشدار دەکرد لەگەڵ خۆیدا[6]، پەیوەندیشی لەگەڵ پێشەوە قطب الدینی نەیسابوریدا پەیوەندییەکی بەهێز بوو، چونکە بەردەوام لەگفتوگۆو مشتومڕدا بوو لەگەڵ

---

[1] الموسوعة اساملة في تأريخ الحروب الصليبية (٤٢٧/٢٥، ٤٢٨)

[2] سير أعلام النبلاء (٢٠٧/٢١)

[3] سير أعلام النبلاء (٢٠٧/٢١)

[4] سير أعلام النبلاء (٢٠٧/٢١)

[5] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٣٨.

[6] النوادر السلطانية، ل:٧، دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٣٨.

زانایاندا لەو مەسەلانەدا کە پێویستی بەتێگەیشتن هەبوو تیایاندا[1]، بەکورتی: زانایانو شەرعناسان پلەو پایەو گرنگیەکی تایبەتیان هەبوو لای سەلاحەدینو سۆزو چاودێریو رێزی مادیو مەعنەوی لێ دەگرتنو راکانیان نرخێنراو و بەهەند وەرگیراو بوو بەلایەوەو پرس راوێژیانی بەپێویست دەزانی لەهەموو مەسەلە شەرعییەکاندا کە پەیوەست بوو بەهەموو بوارەکانی فەرمانڕەواییەوە، بەم پێیەش زانایان دەسەلاتی رۆحیان بەسەر بیروهزری خەڵکیدا پەیدا کردو کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر گەلو حکومەت، بەڵگەش لەسەر ئەمەش ئەوەیە کە دەوڵەت جڵەوی بەرگریو جەنگی دابوویە دەست زانایانی هاوشێوەی عیسای هەکاری کە لە هەردوو بواری ئاینیو سەربازیدا شارەزار لێهاتوو بوو لەسەردەمی سەلاحەدیندا[2].

[1] دور الفقهاء و العلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٣٨.

[2] هەمان سەرچاوە، ل:١٣٩.

## باسی پێنجەم: چاکسازی ئابوری و بوارەکانی خەرجی

دەوڵەت لەسەردەمی سەلاحەدیندا لەقۆناغی دەوڵەمەندیو خۆشگوزەرانیدا بوو، بەوپێیەی داهاتی زۆر بوو و سەرچاوەکانی رۆزیشی جۆراوجۆر بوو، ئەتوانین داهاتەکانیش بەم شێوەیە دیاری بکەین:

- دەستی گرت بەسەر گەنجینە زۆرەکانی فاتمیەکاندا دوای دەست گرتنی بەسەر میسردا.
- داهاتی سەرانە کە لەخەڵکانی ناموسوڵمانەوە بۆی دەهات.
- داهاتی فیدیە کە لەدیلەکانەوە بۆی دەهات.
- داهاتی دەستکەوتو غەنیمەتەکان کە لەکاتی جەنگدا دەستی دەکەوت.
- داهاتی خەراج کە لەو زەویانە وەردەگیرا کە بە سولحو ئاشتەوایی دەستی بەسەردا گیرابوو،... وێڕای چەندین داهاتی رەواو سەرچاوەی سامانی تر، بێ گومان سەلاحەدین لەو سوڵتانانە نەبوو کە پارەو ماڵیان لەشتی لابەلاییو نارەوادا سەرف دەکرد، بەڵکو لەپێناو خواو بنیاتنانی قەڵاو حەسارو ئاوەدانکردنەوەو ئەو بوارانەدا کە سودی گشتیان هەیە خەرجی دەکرد[1].

### یەکەم: گرنگیدانی بەکشتوکاڵو بازرگانی:

بۆئەوەی سەلاحەدین وڵاتەکەی بپارێزێت لەهەژرایو قاتو قڕی کە دەرەنجامی جەنگو رووبەڕووبوونەوەکان دروست دەبێت، گرنگی باشی دەدا بەکشتوکاڵو هۆکارەکانی ئاودێری، هەتاوەکو زەوی باشترین بەروبومی هەبێتو، هەموو جۆرە پێداویستییەك بەرهەم بێنێت، ئەمەو میسرو شام هاوکاری یەکتریان دەکرد لەئاڵوگۆڕکردنی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانو بەهێزکردنی بەرژەوەندە ئابورییەکانو دابینکردنی سامانو کۆمەکی پێویست بۆ سوپا، هەروەها هەردوو هەرێمەکە هاوهەڵوێست بوون بەرامبەر بەدەستدرێژی فەرەنجەکانو، دابینکردنی ئازوقەو خۆراکی پێویست بۆ سوپای ئیسلامو، ئەوە بوو میسر لەسەردەمیدا بووە ئەڵقەی پێکەوە بەستنی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، چەند شارێکی ئەوروپیش بەهۆی ئەم بازرگانییەوە بوژانەوە وەك شارەکانی (بندقیەو پیزا) ئیتاڵی، دواتریش خەڵکی بوندوقیە رازی بوون بەدامەزراندنی بازاڕێکی بازرگانی لەئەسکەندەرییەدا بەناوی (بازاڕی ئەیك) سەلاحەدینیش گرنگییەکی زۆری دەدا بەبازاڕە بازرگانییەکان هەتاوەکو ئابوری ببوژێتەوەو بەرهەم زیاد بکات، بەم شێوەیە بازاڕەکان لەمیسرو شامدا زۆربوونو ئەویش بایەخی دەدا بەچاکسازیو فراوانکردنی، ئیبن جبیری گەڕۆك —رحالە—

[1] صلاح الدين الأيوبي، عبدالله علوان، ل:١٢٥.

بەچەند بازاڕێك لەو بازاڕانەدا تێپەڕی کردووە لەسەردەمی سەلاحەدیندا لەساڵی ٥٧٨ك داو سەرسامی خۆی تۆمار کردووە بەرامبەر بەو سیستمەی کە تیایدا پەیڕەو دەکراو لەلێدوانیدا سەبارەت بەشاری حەلەب ئەڵێ: ئەم شارە زۆر گەورەیەو بەرێکی دروستکراوەو دیمەنی دڵگیرو بازاڕەکانی فراوانو پێکەوە بەستراون بەشێوەیەکی لاکێشەیی لەپیشەیەکەوە ئەچینە ناو پیشەیەکی ترەوەو هەموو پیشە گەورەکانی بەم جۆرە تیایە، هەمووشی بەتەختە سەری گیراوەو دانیشتوانی لەسێبەری چڕو پڕدا دەژین، هەموو بازاڕێکی مرۆڤ سەرسام دەکاتو چاو روون دەکاتەوە و زۆربەی دوکانەکانیشی بەجوانی لەتەختە دروستکراوە[١]، ناصر خوسرەو لەکتێبی (سەفەرنامە)دا وەسفی شاری طرابلوسی شام لەسەردەمی سەلاحەدیندا دەکاتو ئەڵێت: وڵاتێکی جوانە، بەکێڵگەو بێستانیو قامیشی شەکری زۆرو درەختی نارنجو مۆزو لیمۆ دەورەدراوەو وێڕای شوێنی رستنو چنین کە چوار یان پێنج یان شەش چینەو بازاڕو شۆستەکانی جوانو پاکن، تەنانەت وا دەزانی هەموو بازاڕێك کۆشکێکی رازاوەیە، لەناوەڕاستی شاریشدا مزگەوتێکی گەورە هەیە، کە بە نەخشی جوانو تۆکمە رازێنراوەتەوەو لەگۆڕەپانەکەشیدا گومەزەیەکی گەورە هەیە کە لەژێریدا حەوزێك هەبوو لەخواروو ئاوهاوێژێکی تیابوو کە لەمسی زەرد دروست کربوو، هەروەها لەبازاڕیشد شوێنێکی ئاو خواردن هەبوو کەپێنج بەلوعەی ئاوی لێ بەسترابوو بۆ ئەوەی خەڵکی ئاوی لێ بەرن[٢].

## دووەم: گرنگیدان بە پیشەسازی:

سەلاحەدین گرنگی دەدا بەدروستکردنی چەكو رستنو چنینو قوماشو پۆشاکی حەریری دەزوو ئاڵتونیو زینی ئەسپو دروستکردنی شوشە، هەروەها لەسەردەمیدا پیشەسازی قاصو قاچاغو کەشتیو بەلەم دروستکردنو چەندین شتی پێویستی تر بڵاوبووبوویەوەن کە بەرهەمی زیادە دەکردو ئابوری وڵات بەهێزتر دەکرد[٣] هەروەها پیشەوەران لەسەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیدا لەهەمووکەس وەفادارتربوون بۆدابونەریتە کۆنو بۆماوەییەکانیان، ئەوە بوو کرێکارو پیشەوەران لەسەر هەمان شێوازو رێڕەوی سەردەمانی پێش خۆیان بەردەوام بوون، هەروەها پیشەوەران چەند سەندیکاو رێکخراوێکیان هەبوو کە مافەکانیان بۆ دەپاراستنو سەرپەرشتی کارو ئەرکەکانیان دەکرد بەجۆرێك کە سیستمو یاسای تایبەتی هەبوو کە هەمووان رێزیان لێ دەگرتو دەوڵەتیش

---

[١] صلاح الدين الأيوبي، ل:١٧٦.

[٢] صلاح الدين الأيوبي ل١٧٧

[٣] الفنون الاسلامية في العصر الأيوبي (٥٤/١)

پشتیوانی لێدەکرد[1]. یەکێك لەنەریتەکانی سەندیکاو ڕێکخراوەکانی پیشەوەرانیش، بریتی بوو لەپاراستنی نهێنی پیشەکان‌و نەدرکاندنی بۆ کەسانی ترو پاراستنی بۆ خاوەن کارو بنەماڵەکانیان، ڕەنگە ئەمەش هۆکاری تایبەتمەند بوون هەندێ خێزان بێت بەپیشەیەکی دیاریکراوو گواستنەوەی بەشێوەیەکی پشتاوپشت لەناویاندا. بەناوبانگترین ناوەندە پیشەسازییەکانیش لەسەردەمی ئەیوبیدا ئەمانەن:

١- **شاری قاهیرە:** مەبەست لەدروستکردنی شاری قاهیرە، بوونی بەپایتەختی دەوڵەت‌و ماڵێکی گەورە بۆ هەموو میسرییەکان نەبوو، بەڵکو مەبەست لەدروستکردنی ئەوە بوو کە ببێتە شوێنێکی تایبەت بۆ خەلیفەو سەربازو دەست‌و پێوەندەکەی دوور لەشاری فسطاط، بەڵام قاهیرە دوای یەك سەدە بووە قەرەباڵغترین ناوەندی ئاوەدان‌و ژیانی کۆمەڵگەیەکی بەهەموو چین‌و توێژو پێداویستییەکانییەوە لەخۆگرت‌و چەندین پیشەو پیشەسازی تیادا دەرکەوت‌و لەسەردەمی ئەیوبیدا بوو بەبازاڕێکی گەورە[2]. ئاشکراشە کە بازاڕەکانی قاهیرە لەسەردەمی سەلاحەدیندا گەشەکردنێکی باشی بەخۆوە بینی‌و چەندین گۆڕانکاری ئابوری‌و کۆمەلایەتی‌و مەزنی بەخۆوە بینی کە بووە هۆی زیادبوونی خواست لەسەر بەرهەمەکانی بازاڕ بەشێوەیەکی گشتی. دیارە ئەم گەشەکردنەش بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین گۆڕانکاری کەبازاڕەکانی ئەو شارە بەخۆیەوە بینی لەگرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەش

آها عليها ليال ما تركن لنا — إلا الأسى وعدلات من الحلم

عسى الرياح إذا سارت مبلغة — توفي فقد غدر الأحباب بالذمم

دەرکەوتنی پسپۆڕێتی بوو لەبازاڕەکانداو، دانانی بازاڕی تایبەت بۆ هەر کەلوپەلێك ئەمەش ڕێو شوێنێکی ڕێکخەرانە بوو کە لەسەردەمی سەلاحەدیندا بۆ یەکەم جار دەستی پێکرد، هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت کە زۆرینەی ئەو بازاڕە سەرەکییانەی کە لەسەردەمی ئەیوبیدا دەرکەوتن تایبەت بوون بەفرۆشتنی کەلوپەلێکی دیاریکراو، ئەمەش دیاردەیەکە پێش سەردەمی ئەیوبی نەبوو، لەو بازاڕانەش بازاڕی تایبەت هەبوو بەفرۆشتنی جل‌وبەرگی دووراوو ڕاخەرو پۆشاك، هەروەها بازاڕی (جەمەلۆنی گەورەش) لەسەردەمی سەلاحەدیندا بنیاتنراو تایبەت بوو بەفرۆشتنی قوماشی ئاوریشم‌و، بازاڕێکیش تایبەت بوو بەفرۆشتنی کەل‌وپەلی بووك‌و خشڵ‌و زێڕ، بازاڕی (بين القصرين)یش تایبەت بوو بەشمشێرو ڕاوو قەڵغان‌و ڕم‌و تیر، لەگەڵ پێداویستییەکانی

---

[1] همان سەرچاوە (١/٥٥)

[2] هەمان سەرچاوە (١/٥٥)

سەربازییەکانی تری وەك چەكو کەرەستەکانی تر، ئەمە جگە لەچەند بازاڕێك کەتیایدا جلوبەرگی سەربازانو پۆشاکی سوڵتانو ئەمیرو وەزیرو دادوەرەکانی هەبوو و تایبەت بوو بەخەڵکانی دەسەڵاتدار، هەروەها هەندێ بازاڕو پیشەسازی لەفسطاطەوە گوێزرانەوە بۆ قاهیرە، ئەمەش دیاردەیەکی سروشتی بوو هەتاوەکو ڕێ بدرێت بەنیشتەجێ بوونی خەڵکی بەگشتی لەقاهیرەدا ئەمەش هەلێکە بۆ بازرگانو پیشەوەرەکان هەتاوەکو بێنە قاهیرەو چالاکی خۆیان لەنزیك پیاوانی دەوڵەتەوە ئەنجام بدەن، دوای ڕزگاربوونی دەوڵەت لەو دەزگا پیشەسازییەی کە لەبەرویبوومدا هەبوو لەسەردەمی باطمیداو بووە هۆی ڕۆشتنی ژمارەیەك لەو پیشەوەرانە بۆ بازاڕە جۆراوجۆرەکان بەمەبەستی کارکردن تیایدا، ئەمەش پارمەتیدەر بوو بۆ زیادبوونی چالاکی پیشەسازیو گەشەکردنی لەقاهیرەدا، کە ئەمەش لەلای خۆیەوە ڕۆڵی هەبوو لەگەشەسەندنی بازرگانی لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا[1].

٢- **شاری فسطاط:** ئەتوانین بڵێین ئەو ئاگرەی کە شاور هەڵی گیرساند خەریك بوو بەتەواوی فسطاط لەناوبەرێت، ئەگەر بنەماڵەی ئەیوبی فریای نەکەوتنایە، ئەوە بوو لەوکاتەوەی کە ئەسەدەدین شێرکۆ وەزارەتی وەرگرت، سوربوونی خۆی نیشاندا لەسەر سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەوشارە، پاشان سەلاحەدینی برازای درێژەی بەم کارەداو گرنگییەکی زۆری بە فسطاط داو هەستا بەچاکسازیکردن لەمزگەوتو دەزگا سەرەکییەکانیداو چەندین خوێندنگەی تیادا بنیاتناو لەکۆتایشدا بەهۆی شوراو حەسارێکەوە لەگەڵ قاهیرەدا تێکەڵی کردو بەم شێوەیەش پاراستنی هەردووکیانی پێکەوە مسۆگەر کردو بەهۆی ئەم گرنگی پێدانەشەوە: ئاوەدانی وردە وردە گەڕایەوە بۆ شارو هەلی بنیاتنانەوەی فسطاط لەسەردەمی سەلاحەدینەوەو لەباربوو چەندین بیناو بازاڕو کارگە دروستکران[2] کارگەکانیش فسطاطیش بە (مسابك) ناوزەند کرانو، ئەوترا (مسابك النحاس) کارگەی تواندنەوەی مسو (مسابك الفولاذ) کارگەری تواندنەوەی پۆڵاو بەوشێوەیە، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەو کارگانە کە لەفسطاط دا بوون، خامی کانزایی تواوە لەقاڵبدراوی بەرهەم دەهێنا کە پێویست بوو بۆ پیشەسازی کانزاکان لەمیسردا بۆ دروستکردنی چەكو ئامێری جەنگی سەرباری ئامێرەکانی ناوماڵو توحفەو (نەختینە) جۆراوجۆرەکان[3].

---

[1] عمران القاهرة و خططها في عهد صلاح الدين، ل: ٢٢٧ — ٣٣٣.

[2] عمران القاهرة و خططها في عهد صلاح ادين، ل:٢٤٩ — ٢٥٢.

[3] الفنون الاسلامية في العصر الأيوبي (١٤٣/٢)

٣- **تنيس**[1]: تنيس بەگرنگترين ناوەندی پيشەسازی رستن‌و چنين دادەنرێ لەسەردەمی ئەسوبيدا، ئەوە بوو زۆرينەی مێژوونوس‌و گەشتيارەكان رۆچون لەپيشەسازی چنيندا، ئەم جۆرە قاميشەش لەدەرەوەی تنيسدا دەچێنرا[2]، شايانی باسە ئاوەدانی شاری تنيس بەهۆی چالاكی پيشەسازی‌و بازرگانی خەڵكەكەيەوە بوو، هەتاوەكو پاشا الكامل محمدی كوڕی ئەيوب لە ساڵی (٦٢٤ك/ ١٢٢٦ز) شوراو خانوەكانی روخاند[3].

٤- **لەو شارانەش كە لەوكاتەدا بەناوبانگ بوون وەك ناوەندی پيشەسازی لەسەردەمی ئەيوبيدا:** شاری دمياط و ئەخميم‌و ئەسكەندەرييەو دورگەی الروضة و شاری ديمەشق‌و حەلەب‌و[4] چەند شارێكی تر.

**سێيەم: نەهێشتنی باج و رازی بوون بەداهاتە شەرعييەكان:**

سەير نييە كە دوای كۆچی دوايی سەلاحەدين لەخەزێنەكەيدا تەنها ٤٦ درهەمی زيو و يەك دينار زێڕ مابێت، چونكە داهاتی وڵاتەكەی زۆر زۆر بوو و خەرجييە سەربازييەكانيشی زۆر دەبوون، هەرچەندە ئەو ناوچانەش زۆر بوايەن كە دەكەوتنە دەستيەوە هێندە داهات‌و خەرجييەكانی زۆرتر دەبوون، هەميشەش كاری بەم بنەمايانە دەكرد:

١- هەڵوەشاندنەوەی باج‌و (ضريبة) نادروستەكان لەهەموو ئەو وڵاتانەدا كە ئازاد كراو بوون.

٢- رازی بوون بەداهاتە شەرعييەكان وەك زەكات‌و سەرانەو خەراج‌و دەستكەوت‌و دەيەكی بازرگانی، داهاتی ميسريش سەرچاوەی يەكەمی بوو، چونكە ميسری بەشانشينی خۆی دەزانی، بۆيە ئەو باجانەی تيادا هەڵوەشاندەوە كە لەسەر مەغريبييەكان دانرا بوو بۆ حەج‌و باجی لەسەر بازرگانەكانی يەمەن لابردو وێڕای هەڵگرتنی ئەو باجانەی كە هاوشێوەی ئەمە بوون لەديمەشقدا لەكاتی ئازادی كردنيدا هەروەها لەحەلەب‌و سنجار (شەنگار)و رقەشدا هەمان كاری كرد، سياسەتی دارايشی لەو بڵاوكراوەيەدا دەردەكەوێت كە دەری كرد لەكاتی هەڵگرتنی باج لەسەر رقە كەتيايدا هاتووە: خراپترين ئەمير ئەو كەسەيە كە كيسەی پڕ كات‌و خەڵكی هەژار بكات، و دورترين كەسيشيان لەراستييەوە ئەو كەسەيە كە بەناهەق پارە لەخەڵك وەرگرێت‌و ئەو كارەش بەرەوا بزانێت، هەر كەسێكيش لەبەرخاتری خوا دەستبەرداری شتێك بێت بۆی قەرەبوو دەكاتەوەو هەركەسێكيش قەرز بدات بەخوا

---

[1] يەكێكە لەشارە جوانەكان، دورگەيەكی نزيك دەريايە لەميسردا لەنێوان ئەلفەرماو دومياطدا.

[2] الفنون الاسلامية في العصر الايوبي (١٤٥/٢١)

[3] هەمان سەرچاوە (١٤٦/٢)

[4] هەمان سەرچاوە (١٤٦/٢ بۆ ١٤٨)

وەریدەگرێتەوە، کاتێ دقەشمان ئازادکرد بینیمان چەوری دەخورێتو ستەم دەکرێت، ئێمەش فەرمانمانداو پێویستیمان کرد لەسەر خۆمانو سەرجەم والییەکان کە ئەم باجانە هەلگرو.... فەرمانمان دا ئەو دەرگایانە دابخرێنو هەلبوەشێنرێنەوەو لەدیوانەکاندا نەهێلرێنو هەموو دەولەمەندو هەژارانی لێ ببەخشرێن[1] بەشێوەیەکی هەمیشەیی.

بەم شێوەیە ئەو باجانە هەلگیرا کە خاچپەرستەکان لە الصلت و البقاء و جبل عوف و السواد و جۆلاندا وەریان دەگرت. فرەنجەکانیش نیوەی بەروبومیان لێ دەسەندن، هەروەها سەلاحەدین فەرزی زەکاتی زیندووکردەوە (کە فاطمیەکان هەلّیان وەشاندبویەوە) وەك ئاماژەیەك بۆ گەڕانەوەی مەزهەبی ئەهلی سوننەو خستییە بری باجو سەرانە ناڕەواکانیانو گرنگی دەدا بەکۆکردنەوەیو دیوانێکی بۆ تەرخان کردبوو کە (سەرپەرشتیاری زەکان) سەروکاری دەکردو موچەیەکی کەمی هەبوو[2]، هەروەها زەکات لەزێڕو زیوو بازرگانیو مەڕو مالاتو کشتوکالّ وەردەگیرا، بەلام ماددە خۆراکیەکانی وەك کونجیو تۆوی کەتانو زەیتونو سەوزە زەکاتیان لەسەر نەبوو[3]، باجی خەراجیش بەپێی سیستمو لەکاتێکی دیاریکراودا وەردەگیرا، کاتێ کەپێویست بوو سالی هەتاوی بگۆڕدرێت بە سالی کۆچی لەسالی ٥٦٧ك دا چونکە کاتێ کۆکردنەوە پێش کاتی بەروبووم دەکەوت سەلاحەدین دەسبەرداری ئەوە بوو، بەلام شوێنەکانی تری وەك شامو جەزیرە ئەوە خەراج بەپێی رووبەری زەوی بەفەددان وەردەگیراو گەنمو جۆ دوو ئەردەبو نیو بوو بۆ یەك فەددان بوو، سودمەندەکان باجەکانیان کۆدەکردەوە ئەیانبرد بۆ دیوانی سولتان، هەروەها پاقلەو نۆکیش بەهەمان شێوە بوو، هەندێ بەروبومی تریش باجی لەسەر بوو وەك ترێو بەروبوومی درەخت، کە لەنێوان دینارێکەوە تا پێنج دیناردا بوو بۆ هەر فەددانێك، لەسالی سێیەمیشدا لەسێ دینار زیاتر نەبوو، خەلکی غەیرە دینو ئەهلی کیتابیش سەرانەیان دەدا بەلام ژنانو مندالانو پیاوە ئاینییەکانیان لەسەریان نەبوو، هەروەها پێشی دەوترا باجی (الجوالي) کۆی جالیەو بەپێی کەسەکان دەگۆڕا، لەدینارێکەوە بۆ (٥ و ٤ ) دینارو جگە لەدوو درهەمو نیو کە دەبێ هەمووان سالانە بیدەن، لەبەرئەوەش کە تەختەو کانزاکان پێویست بوون بۆ دروستکردنی چەك، ئەوە سەلاحەدین نەیدەهێشت کەس دەستی بەسەردا بگرێتو لەلایەن دەولەتەوە قۆرخ کرابوو، چونکە

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهد و الملك الزاهد، ل:٣٨٨.

[2] صلاح الدين الفارس المجاهد و الملك الزاهد، ل:٣٨٨.

[3] صلاح الدين الفارس المجاهد و الملك الزاهد، ل:٣٨٨.

لەحاڵەتی شەڕدا بوو لەگەڵ فرەنجەکانداو هەرکەسێکیش قاچاغی پێوە بکردایە سزایەکی توندی دەدا[1].

زۆربەی داهاتەکانی دەوڵەتیش لەجەنگ و قەڵاو حەسارو مزگەوتو قوتابخانەکانەو سەنگەرەکاندا خەرج دەکرا سەرباری موچەی فەرمانبەرانو دروستکردنی فرۆشگا لەکوچەو ڕێگاکاندا[2]....هتد.

**چوارەم: نەخۆشخانەکان لەسەردەمی سەلاحەدیندا:**

لەسەردەمی سەلاحەدیندا خوێندنگەی تایبەت نەبوو بۆ خوێندنی پزیشکی بەڵکو ئەم پسپۆڕیە لەنەخۆشخانەکاندا دەوترایەوە، پاشان قوتابی پاش وەرگرتنی بابەتەکە سەردانی نەخۆشەکانی دەکردو بەسەری دەکردنەوە بۆ زانینی باری تەندروستی نەخۆشەکان چارەسەرکردنیان[3]، هەروەها سەلاحەدین هەستا بەبنیاتنانی چەند نەخۆشخانەیەك لەسەردەمی خۆیدا لەوانە:

- **نەخۆشخانەی ناصری لەقاهیرەدا:** سەلاحەدین هەستا بەبنیاتنانی نەخۆشخانەی ناصری لەقاهیرەداو، یەکێك لەکۆشکەکانی هەڵبژاردو کردی بە نەخۆشخانەیەکی گەورە، ئەو کۆشکەش زۆر هێمنو دور بوو لەدەنگەدەنگو قەرەباڵغی[4]. دکتۆر ئەحمەد عیسیٰ ئەڵێ: نەخۆشخانەی ناصری یان صلاحی یان نەخۆشخانەی سەلاحەدین: کاتێ سەلاحەدین دەستی گرت بەسەر میسردا لەساڵی ٥٦٧ك – ١١٧١ز دا و کۆشکی فاطمییەکانی کەوتەژێر دەستی، لەکۆشکەکەدا هۆڵێك هەبوو کە العزیز بالله لەساڵی ٣٨٤م/ ٩٩٤ز دا بنیاتی نابوو، سەلاحەدینیش کردی بە نەخۆشخانەو بووە نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ لەناو کۆشکدا[5] ، القاضي الفاضل یش دەربارەی گۆڕانکارییەکانی ساڵی ٥٧٧ك/ ١١٨١ز ئەڵێ: سوڵتان سەلاحەدین یوسفی کوڕی ئەیوب فەرمانیدا بەکردنەوەی نەخۆشخانەیەك بۆ نەخۆشو خەڵکی لاوازو کەم دەرامەتو بۆ ئەم مەبەستەش شوێنێك لەناو کۆشکدا دیاریکراو فەرمانێکی دیوانی بۆ دەرکراو دووسەد دیناری بۆ تەرخان کراو بەرووبومی ناوچەی فەییومی پێ دەدراو پزیشكو جەڕاحو کارگوزارو کارمەندی بۆ دیاریکراو خەڵکیش سودی باشیان لێ

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهد و الملك الزاهد، ل:٣٨٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل:٣٨٩

[3] تأريخ الأيوبيين في مصر و بلاد الشام، ل:٢١٤.

[4] المستشفيات الأسلامية، عبدالله، عبدالرزاق، ل:٢٣.

[5] تأريخ البيمارستانات في الأسلام، ل:٧٦ – ٧٧.

وەرگرتو تیایدا بەسۆزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا[1]، هەروەها ئەم نەخۆشخانەیە کەلوپەلی باشی بۆ دابین کرابوو کە لەکۆشکە جوانەکانەوە هێنرا بوو و هەموو پێداویستییەکانی چارەسەرکردنو حەوانەوەی تێدا بوو[2]، ئیبن جبیری گەڕۆکیش وەسفی ئەم نەخۆشخانەیە دەکات کەسەلاحەدین لەقاهیرەدا بنیاتی نابوو و ئەڵێ: یەکێك لەسەروەرییەکانی ئەم سوڵتانە ئەو نەخۆشخانەیە بوو کە لەقاهیرەدا هەبوو، کە لەیەکێك لەکۆشکە جوانەکانیدا بوو لەرووی فراوانیو رازاوەییەوە، تەرخانی کرد بوو بۆ ئەم کارە باشە لەبەر رەزامەندی پەروەدگار، سەرپەرشتیارێکی شارەزاشی تیادا دامەزراندو خەزێنەی دەرمانی دایەدەستو دەسەڵاتی بەکارهێنانی دەرمانو دروستکردنی بە هەموو جۆرەکانیەوە پێ بەخشی، هەروەها لەکۆشکدا قەرەوێڵەو جێگەیان بۆ نەخۆشەکان دیاری کردبوو کە بەیانیو ئێوارە تیایدا دەمانەوەو خواردنو خواردنەوەی گونجاویان بۆ دابین دەکرا، بەرامبەر ئەم شوێنەش شوێنێك تایبەت کرابوو بەئافرەتانو سەرپەرشتیشیان بۆ دابین کرابوو، لەتەنیشت ئەو دوو شوێنەشەوە شوێنێکی فراوان دابین کرابوو کە کورسی تێدا بوو بەپەنجەرەی ئاسن دەوری گیرابوو بۆ شێتەکان، ئەوانیش رۆژانە کەسێك بە دەمیانەوە بوو و پێداویستی بۆ جێبەجێ دەکردن، سوڵتانیش هەموو ئەم شوێنانەی بەسەر دەکردەوەو جەختی دەکردەوە لەسەر خزمەتکردنو گرنگی پێدانیان[3]. عەلی موبارەك پاشا ئەڵێت: کاتێ سوڵتان سەلاحەدین یوسفی کوڕی ئەیوب بووە کاروباری گرتە دەستو کۆشکەکانی بەسەر ئەمیرەکانیدا دابەش کرد بۆ نیشتەجێ بوون تیایدا، کۆشکێکی تەرخان کرد بۆ نەخۆشخانەو ئەم نەخۆشخانەیەش ناسراو بوو بە (العتیق) دەرگاکەی کەوتبووە بەرامبەر گەڕەکی ملوخیەوە کە لەکۆندا گەڕەکی (قائد القواد)و ئێستاش ئەو خانوەیە کە بە (دار الغمری) ناسراوە لەگەڵ خانوەکانی دەوروبەریدا، وەك لەحجج الاملاکدا هاتووە کە لەکۆتایی گەڕەکەکەدایە لەلای دەرگا بچوکەکەیەوە کە دەکەوێتە لای کۆشکی (الشوق)و لێیەوە دەچیتە ناو نەخۆشخانەی عەتیق[4]. هەروەها سەبارەت بەو پزیشکانەی کە لەنەخۆشخانەی ناسریدا کاریان دەکرد، ئەوە بەناوبانگترینیان ئەمانە بوون: رضی الدین الرجبی، ابراهیمی کوڕی الرئیس میمونو،

---

[1] المستشفيات الأسلامية، ل:٢٣٦.

[2] المستشفيات الأسلامية، ل:٢٣٦.

[3] المستشفيات الأسلامية، ل:٢٣٧.

[4] المستشفيات الأسلامية، ل:٢٣٧.

کوڕی ئەبی ئەصبیعەو، شێخ السدیدی کوڕی أبی البیانو، قاضی نفیس الدینی کوڕی الزبیر[1].

•**نەخۆشخانەی ئەسکەندەرییە:** لەلایەن سەلاحەدینەوە بنیاتنرا کاتێك لەساڵی ٥٧٧ك دا چووە ناویەوە، و دەستی کرد بەخوێندنی الموطأ لەسەردەستی شێخ ابو الطاهری کوڕی أبی عوف و تیایدا خانویەکی دروستکرد بۆ مەغریبییەکانو قوتابخانەیەکیشی وەقف کرد بۆ توران شای برای[2].

•**نەخۆشخانەی سەلاحی لەقودسدا:** ئەم نەخۆشخانەشی پاش رزگارکردنی قودس[3] بنیات نا لەساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧ز دا، (الموسوعە الفلسطینیة) فەرهەنگی فەلەستینی دەربارەی بیمارستانی سەلاحی لەقودسدا ئەڵێ: یەکێکە لەشاکارەکانی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی[4]. سەلاحەدینیش پزیشکی شارەزای بۆ دابین کرد و وەقفی زۆریشی بۆ تەرخان کردبوو، ئەم نەخۆشخانەیەش یەکێك بوو لەبەناوبانگترین نەخۆشخانەکان لەو سەردەمەداو زانستی پزیشکی تیادا دەخوێنراو بەشێوەی پراکتیکیش تیایدا پیادە دەکرا[5].

•**نەخۆشخانەی عەککا:** لەساڵی ٥٨٣ك داو دوای ئازادکردنی بەیتولموقدیس لەلایەن سوڵتان سەلاحەدینەوە، لەرێگەی گەڕانەوەیدا بۆ دیمەشق سوڵتان لەعەککا لایداو چووە قەڵاکەیەوە بەهادین قەراقوشی راسپارد بۆ نۆژەنکردنەوەو نوێکردنەوەی جوانیەکانیو خانووی (ئەلئەسبتاریە)ی کرد بە دوو بەشەوەو وەقفی کرد بۆ هەژارانو زانایانو، خانوی (ئوسقوفی) کرد بەنەخۆشخانەو وەقفی باشی بۆ تەرخانکردو سەرپەرشتی سپارد بە قاضی جمال الدینی کوڕی أبی النحیبو بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ دیمەشق[6].

بەچاوپۆشی کردن لەفراوانی نەخۆشخانەکان کە لەوانەیە هەندێکیان جیاوازبوو بن لەوانی تریان لەرووی رووبەری باخچەو نەخشەسازیو ژمارەی نافورەکانەوە، بەڵام نەخۆشخانەکان بەشێوەیەکی گشتی نەخشەیەکی سەرەکیان هەبوو کەپێکهاتبوو لە:

أ- چەند بەشێکی تایبەت بەپیاو و بەشی تریش کە تایبەت بوو بەژنو لەیەك جیابوون.

---

[1] المستشفیات الأسلامیة، ل:٢٣٨.

[2] المستشفیات الأسلامیة، ل:٢٣٩.

[3] هەمان سەرچاوە، ل:٢٥٠

[4] هەمان سەرچاوە، ل:٢٥١

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥٣.

[6] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥٥.

ب- قاوشی نەخۆشخانەکان بەپێی پسپۆڕی، هۆڵی تایبەت هەبوو بۆ ئەو نەخۆشانەی کە تووشی تابوبوون‌و هۆڵی تریش بۆ نەخۆشیە ئەقڵی‌و دەروونی‌و نەخۆشییەکانی چاوو... هتد[1].

ج- قاوشی سەربەخۆ بۆ ئەو نەخۆشانەی بەرەو چاکبونەوە دەچوون هەتاوەکو چاك دەبونەوە.

د- قاوشی پزیشکان بۆ پشکنینی ئەو نەخۆشانەی کە نەخەوێنرابون.

● چەند ژوورێك بۆ پزیشك‌و کارمەندو کارگێڕەکان.

● هۆڵێکی وانەوتنەوە کەتیایدا پزیشکە گەورەکان وانەکانیان دەوتەوەو لەگەڵ قوتابیەکانیاندا کۆدەبونەوە.

● کتێبخانەیەك.

● چێشتخانەیەك بۆ لێنانی خواردەمەنی پاك‌و تەندروست، چونکە خواردن یەکێك بوو لەرێگاکانی چارەسەر، هەروەها دەرمانی چارەسەریشی تیایدا دروست دەکرا.

● دەرمانخانەیەك بۆ ئامادەکردنی دەرمان.

● چەند گەنجینەیەك.

● هۆڵێك بۆ شۆردنی مردوو.

● مزگەوتێکی بچوك بۆ نوێژ کردن.

● ئەمە سەرباری گۆڕەپان‌و باخچە کەچەندین درەخت‌و میوەو خواردەمەنی لەخۆگرتبوو، زۆرینەی ئەو نەخۆشخانانەش خانوی تیا بوو بۆ کارمەندکانی[2].

**پێنجەم: خانەقای سۆفیەکان:**

وشەی خانەقا وشەیەکی فارسیە لەبنەڕەتدا بەمانای سفرەو خوان یان شوێنی نان خواردن دێت، پاشان بەو شوێنانە دەوترا کە پاشاو ئەمیرەکان بنیاتیان دەنا بۆ لەخۆگرتنی خەڵکی رێبوارو نەناسراو و بێگانە بۆ دابینکردنی بژێوی بۆیان‌و هۆشیارکردنەوەیان، هەرچەندە پێنج فەرزەی نوێژ لەشوێنێکی دیاریکراوی ئەم خانەقایانەدا ئەنجام دەدرا، بەلام نوێژی هەینی تیادا نەدەکرا[3]، خانەقاش کەماڵی سۆفیەکان بوو لەقوتابخانە دەچوو، چونکە بەراستی قوتابخانەی ئەو کەسانە بوو کە خۆیان بەکلاکردبویەوە بۆ ژیانی دنیانەویستی، چ ئەو کەسانە خەڵکی سادە بن یاخود خاوەن پیشەکان کە کاریان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی بنەمای فەرمانکردن بەچاکەو قەدەغەکردنی

---

[1] تنظيم صناعة الطب خلال عصور الحضارة العربية الاسلامية، ل:٥٢٢.

[2] تنظيم صناعة الطب خلال عصور الحضارة العربية الاسلامية، ل:٥٢٢.

[3] خانقاوات الصوفية في مصر في العصرين الايوبي و المملوكي (٢٢/١).

خراپە لەبازاڕەکاندا، ئەم جۆرە خانەقایەش لەرووی ئەرك‌و شێوەوە لەقوتابخانە دەچوو[1]، بەکورتی خانەقاکان لەئیسلامدا چەند خانویەك بوون بۆ زانست‌و خواپەرستی‌و رۆڵی ئاینی‌و کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری گرنگیان دەگێڕا لەژیانی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لەسەرەتایی دامەزراندیەوە، سەرەتاوە پەیمانگەیەك بوون بۆ مەزهەبە فیقهییەکان‌و فەرمودەو دواتریش ناوەندێکی تیشکدانەوەی رۆشنبیری بوو بەهۆی ئەو هەمووە کتێبەی کە لەکتێبخانەکانیاندا هەبوون لەبوارە جۆربەجۆرەکانی زانست‌و زانیاریدا[2].

هەروەك وەزیفەی ناو خانەقاکان جۆراوجۆرو زۆربوو، کەپۆستی شێخ‌و پێشەواو سەرپەرشتیاری وەقفەکان یەکەمیان بوو، چەند کارێکی تری وەك مامۆستای مەزهەب‌و جەڕاح‌و نوسەرو خەزنەداری کتێب‌و شایەت‌و بانگوێژو سەرپەرشتیاری گەرماوو چێشتلێنەرو چێت‌ولێنەرو خزمەتگوزارو دەرگاوان‌و ئاودێرو داهێنەرو پیشەکانی تر. ئەم ئەرکە زۆرانەش ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر شتێك ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەو ئەرك‌و پۆستە جۆراوجۆرانەی کە لەم خانەقایانەدا هەبووەو، هەر یەکێکیشیان بەپێی هەوڵ‌و ماندوبوونی کرێی دەدرایە بەجۆرێك کەبگونجایە لەگەڵ دەوڵەمەندی‌و پلەوپایەی کۆمەلایەتیدا، ئەمە جگە لەو کەل‌و پەل‌و ئازوقەی کە وەریان دەگرت وەك سەوزەو گۆشت‌و برنج‌و ماست‌و هەنگوین‌و شیرینی‌و هتد هەروەها جل‌وبەرگ‌و سابون‌و ئەو کەل‌وپەلە زۆرەی کەوەریان دەگرت[3]. سەلاحەدینیش هەمان رێبازی تورەدینی مامۆستای پەیڕەو دەکردو گرنگی بەم دەزگایانەو ئەو کەسانە دەدا کە هاتوچۆی خانەقایان دەکرد، چاکەی لەگەڵ دەکردن‌و لەزۆر کاروباردا راوێژی پێدەکردن‌و رێزی لەزانایانیان دەناو گوێی بۆ ئامۆژگارییەکانیان دەگرت، ئەوانیش پشتیوانی بوون لەجەنگەکانیدا دژی بەخاچپەرستەکان[4]، چونکە سەلاحەدین لای باوکی پەروەردە بوو بوو کە چاکەکارو رەوشت بەرز بوو و چاکەی زۆری هەبوو بۆ هەژاران‌و سۆفیەکان‌و لەدانیشتنەکانیاندا بەشداری دەکرد[5]. ئیبن کەثیر ئەڵێ: ئازاو بەجەرگ بوو، نوێژی زۆری دەکردو خانەقایەکیشی لەدیمەشق‌و یەکێکی تریش لەمیسردا هەبوو[6]، ئیبن خەلەکانیش لەبەعلەیەکدا خانەقایەکی سۆفیەکانی بینیوە کە پێی دەوترا النجمیە و دراوەتە پاڵ باوکی

---

[1] هەمان سەرچاوە (١/٢٢).

[2] خانقوات الصوفية في مصر (١/٢٣)

[3] هەمان سەرچاوە (١/٢٣، ٢٤)

[4] صلاح الدين و الصليبيون، أحمد الشامي، ل:٨١.

[5] له البطولة و الفداء عند الصفونيةوه، ل:١٠٣

[6] البداية و النهاية، له البطولة و الفداء وه، ل:١٠٣.

سەلاحەدین‌و، ستایشی دەکات بەوەی کە زۆر پیاوچاك بووە، بەلام کەسایەتی یەکەم لەرووی کاریگەریەوە لەسەر کەسایەتی‌و رەوشتی سەلاحەدین نورەدین مەحمودی گەورەو مامۆستای بووە، کە لێیەوە فێری چاکەکاری خۆشویستنی خواناسان‌و تێکۆشان‌و جیهاد بوو، و هەمان رێبازی ئەوی گرتەبەرو پێش ئەوەی هەستێت بەرزگارکردنی ولات لەچنگی خاچپەرستەکان بۆ ماوەی دوانزە سال لەسالی ٥٧٠ك — ٥٨٢ك کاری کرد بۆ یەکخستنەوەی موسولمانان‌و ئامادەسازی مادی‌و رۆحی، و چەندین خانەقاو فێرگەی دامەزراندو کردنی بەناوەندی سەربازی‌و پەروەردەیی، الصفوری ئەلێ: لەهەموو ئەمانەدا لەنورەدین کاری زیاتری کردو ئەمەشی بەشیعر هێناوەو ئەلێ:

أحيا الذي قدسن نورالدينً وزادما أمكن من تحسين[1]

سەلاحەدینیش دادەنرێت بەیەکەمین کەسێك کە ئەم شوێنانەی هێنایە میسرەوە. فەلقەشەندی ئەلێ: خانەقاو تەکیەکان پێش دەولەتی ئەیوبی لەمیسردا نەبوون‌و یەکەم کەس کە دایهێنا سەلاحەدینی ئەیوبی بوو[2]، سیوطی و مەقریزی‌و زانایانی تریش هاوڕان لەوەدا کە: سەلاجەدین یەکەمین کەس بوو کە خانەقای دامەزراند بۆ سۆفییەکان لەمیسرداو شوێنی زۆری بۆ وەقف کردو، خەلکانی ناو خانەقا ناسراو بوون بەزانست‌و خواناسی‌و زانایانی پایەبەرز سەرپەرشتیان دەکرد، لەو پیاوانەی کە خەلکی چاوەڕێی بەرەکەتی دەکردن لەپال ئەو وەزارەت‌و ئەمیری‌و بەڕێوەبردنی کاروباری دەولەت‌و سەرکردایەتی کردنی سوپایەکەی هەیانبوو[3]، ئەم مەسەلانەش بوونە جێی سەرنجی ئیبن جوبەیری ئەندەلوسی گەڕۆك لەگەشتەکەیدا بەرەو رۆژهەلات، بۆیە ئەلێ: لەچاکەکانی ئەم ولاتە (میسر) و ئەو سەروەریانەی کە بۆ سولتانەکەی دەگەڕێتەوە: ئەو قوتابخانەو خانەقایانە بوو کە تەرخان کرا بوو بۆ خەلکی خواناس‌و پەرستشگار..... ئەو سولتانەش کە ئەم سوننەتە باشانەی داهێنا سەلاحەدین بوو، سەلاحەدینی سەرکەوتوو، خوای گەورە چاکی‌و سەرکەوتنی بەردەوام بکات[4].

هەروەها سەلاحەدین رەحمەتی خوای لێ بێت لەهەموو ئەو شوێنانەدا کەچووبووە ناویان قوتابخانەی زانستە شەرعییەکان‌و خانەقای لەتەنیشت یەکەوە بنیات نابوو، ئەوە بوو لەکاتی ئازادکردنی قودسدا لەسالی ٥٨٣ك فەرمانی کرد بەموسولمانان کەپارێزگاری لەکلێسای قیامە بکەن‌و لەنزیکیەوە قوتابخانەیەکی بۆ زانایانی شافیعی مەزهەب‌و تەکیەیەکی بۆ پیاوچاکە

[1] وفيات الأعيان (٢٥٧/١)

[2] صبح الأعشى (٤/٧/٣)

[3] الخطط (٤١٥/٢)، البطولة و الفداء ، ل:١٠٤.

[4] رحلة ئيبن جبير، ل:٤٦، البطولة و الفداء، ل:١٠٥.

سۆفیەکان بنیات ناو چەند شوێنێکی بۆ وەقف کردو بەم شێوەیەش چاکەی لەگەڵ هەردوولادا کرد[١] لەکاتی ئازادکردنی عەککاشدا، نیوەی خانەی (ئسبتاریە)ی کردە وەقف بۆ سۆفیەکان‌و نیوەکەی تریشی وەقف کرد بۆ زانایان[٢]، ئەمەش سەیر نییە بۆ سەلاحەدین، بەتایبەت ئەگەر بزانیت کە هەردوولا (سۆفی‌و زاناکان) هاوڕێی بوون لەهەموو جەنگ‌و فتوحاتەکانیدا، مێژوونوسانیش ئەم بەشدارییەیان بۆ تۆمار کردوین، بەتایبەت لەکاتی ئازادکردنی بەیتولمەقدیسدا، ئیبن خەلەکانی ئەڵێ: ئەم ئازادکردنەوەی زۆر مەزن بوو، خەڵکانێك لەزانایان‌و خەڵکانێکی زۆری دونیا نەویست‌و زاهید لەگەڵیدا ئامادەبوون[٣] ئیبن الوردیش لەتأریخەکەیدا پاڵپشتی ئەمە دەکات‌و ئەڵێ: لەئازادکردنی قودسدا خەڵکانێکی زۆر لەزاهیدو دونیانەویستان‌و زانایانی میسرو شام ئامادە بوون، بەجۆرێك کە کەسیان لێ دوانەکەوتبوو[٤]، سەلاحەدینیش زانایانی سۆفی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ وەرگرتنی راو راوێژ پێکردنیان، ئەمە جگە لەوەی کە ئامادەبوانیان پاڵنەرێکی بەهێزە بۆکوشتاری ئازایانە[٥]. کەسایەتی سەلاحەدینیش کەسایەتییەکی خۆشەویست بوو لای سۆفیەکان، چونکە رێبازی دونیانەویستی هەڵبژاردبوو و هیچ ماڵێکی نەبوو کە زەکاتی بکەوێت‌و پاش خۆشی چل‌وحەوت درهەمی ناصری‌و یەك پارچە ئاڵتونی جێهێشت‌و نە موڵك‌و نەخانوو نەبێستان‌و هیچ جۆرە سامانێکی جێ نەهێشت‌و، لەدونیادا بەخێوەتێك رازی بوو کە رەشەبا بەچەپ‌و راستدا دەیبردو دەیهێنا[٦]. هەروەها سەلاحەدین ئاڵتون‌و قوڕی بەلاوە یەکسان بوو، ئیبن شەدداد ئەڵێ: لەکاتی قسەکردنیدا لەسەلاحەدینم بیست وتی: ئەکرێت لەخەڵکدا کەسانێك هەبن کە وەکو خۆڵ سەیری زێر بکەن، دیارە مەبەستی لێرەدا خۆیەتی[٧]، ریوایەتی زۆر هاتووە کە دونیا نەویستی‌و سادەیی سەلاحەدینمان بۆ دوپات دەکەنەوە لەخواردن‌و پۆشاکیدا لەکاتێکدا کەپارەی زۆری دەبەخشی بەزانایانی سۆفی‌و چەند گوندێکی بەداهات‌و موڵکەکانیەوە وەقف دەکرد بۆ خانەقاو خەڵکانی هەژار[٨]، هەروەها سەلاحەدین دیوەخانی بنیات دەنا لەشوێنە دوورە دەستەکاندا کە

---

[١] الفتح النفسي و الفتح القدسي، ل:١٤٥.

[٢] وفيات الأعيان (١٧٩/٧)

[٣] تتمة المختصر في أخبار الشر (١٤٧/٢)

[٤] البطولة و الفداء عند الصوفية، ل:١٠٦

[٥] النوادر السلطانية، ل:٦، ١٦.

[٦] البطولة و الفداء، ل:١٠٧.

[٧] تأريخ الأيوبيين، ل:٢١٥.

[٨] البطولة و الفداء، ل:١٠٨

دووربوون لەئاوەدانییەوەو لەسەر رێگای شارەکان بۆ خزمەتکردنی خەڵکی رێبوارو گەشتیار، ئیبن جبیریش ئەو دیوەخانەی بینیبوو کە سەلاحەدین لەرێگەی نێوان دیمەشق‌و حمصدا بنیاتی نابوو، و ناسراو بوو بە (دیوەخانی سوڵتان) هەروەها ئەمیر بەهادین قەرەقوشیش (دیوەخانی السبیل)ی تیادا بنیات نابوو[1]. هەروەك سەلاحەدین گرنگیدەدا بەراکێشانی زانایان‌و سۆفیەکان‌و یەکەم خانەقای بۆ بنیات نان لەمیسرداو کردیە شوێنی ئەو سۆفیە هەژارانەی کە لەوڵاتە دوورەکانەوە هاتبوون‌و وەقفی زۆری بۆ دابین کردبوون‌و شێخێکی کردبووە سەرپەرشتیان کە بە (شێخی گەورە) ناسرا بوو، مەقریزیش باسی ئەوە دەکات کە: دانیشتوانی سۆفی ئەم خانەقایە ناسرابوون بەزانست‌و خواناسی‌و ژمارەشیان دەگەشتە سێ سەد کەس، و سوڵتانیش رۆژانە نان‌و شیرینی بۆ دابین دەکردن‌و ساڵانەش چل درهەمی بۆ پۆشاك کرین پێدەدان‌و گەرماوێکیشی لەتەنیشت خانەقاکەوە بۆ بنیات دەنان‌و هەرکەسێکیشیان بیویستایە سەفەر بکات ئەوەندە پارەی دەدایە کە پێی بگەشتایەتە جێی مەبەستی[2] ئەم گرنگی دانەشی بەکاروباری سۆفیەکان چەند ئامانجێکی لەپشتەوە بوو کە هەندێکیان پەیوەست بوو بەبزاوتی بوژاندنەوەی مەزهەبی سوننییەوە، چونکە سەربارى ئەوەی کە سۆفیگەری ئاراستەیەکی میانەڕەوانەی رێز لێگیراو بوو لەلایەن فەرمانڕەواو جەماوەرەوە بەگشتی لەو سەردەمەدا، بەڵام گرنگی پێدانی بەم شێوەیە بەتایبەت لەمیسردا کارێکی ئامانجدار بوو و مەبەست پێی گەیشتن بوو بەئامانجێکی دیاریکراو، لەوانەشە نهێنی ئەمە ئەوە بێت کە فاتمیەکان لەهەموو شێوازەکانیاندا دەستەوسان بوون لەبانگەوازکردن بۆ مەزهەبەکەیانداو نەیاندەتوانی دزەی پێ بکەنە ناو بیروباوەڕی میسرییەکان‌و بەڵام بەئاسانی کاریان دەکردە لایەنی سۆزداریان، رواڵەتەکانی خەمباری‌و گریان‌و شیوەنکردن بۆ حسەین (رضي الله عنه)و ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی لەدایکبوونی ئەندامانی ئالوبەیتەوەو زیندوراگرتنی لەلایەن فاطمیەکانەوە، هەموو ئەمانە کاریگەری خۆیان هەبوو لەسەر هەست‌و سۆزی میسرییەکان‌و تا ئەمڕۆش ئاسەواری بەدی دەکرێت، دیارە ئەگەر سەلاحەدیی هەوڵیدابێت زانایانی سوننە لەهەموو شوێنێکەوە کێش بکات هەتاوەکو بەزانست‌و هزریان بەشدار بن لەبوژاندنەوەی مەزهەبی سوننەدا، ئەوە لایەنێکی تریش هەیە کە پێویستە تێر بکرێت‌و لەو ئاراستەوە کەفاتمیەکان پێیان داوە بگۆڕدرێت بەئاراستەیەکی تردا، بێگومان ئەم لایەنەش لایەنی سۆزداریە، کەفاتمیەکان بەئاسانی دەستیان بەسەردا گرتبوو[3]، سۆفیگەری سوننی‌و شوێنکەوتوانیشی یەکێك بوون لەگرنگترین ئەو چین‌و

---

[1] المواعظ و الاعتبار (٢/٤١٥/ ٤١٦).

[2] التأريخ السياسى و الفكرى، ل:٢٤٠.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٠

تویژانەی کە دەیانتوانی ئەم کارە ئەنجام بدەن‌و ئەو لایەنە تێر بکەن بەهۆی رەوشتی جوان‌و هێمانەو دنیا نەویستی‌و توانای دواندنی خەڵك لەرێی مەجلیسی زیکرو ئامۆژگاری‌و هتدەوە[1].

سەلاحەدین‌و نورەدینیش توانیان سود لەو ژمارە زۆرەی سوفیە سوننەکان وەربگرن بۆبوژاندنەوەی مەزهەبی سوننی‌و بەرپەرچدانەوەی شیعەگەری‌و شالاوی خاچپەرستی.

**شەشەم: چاکسازی کۆمەلایەتی:**

ژیانی کۆمەلایەتی لەسەردەمی سەلاحەدیندا مۆرکی جددی بوون‌و رووبەرووبوونەوەی فرەنج‌و لەناوبردنی دوژمنی لەخۆگرتبوو.... زۆر دوور بوو لەژیانی خۆهەلکێشان‌و خۆشگوزەرانی درۆزنانەو، زیادەرەوی بێ مانا، سەلاحەدینیش رەحمەتی خوای لێ بێت پێشەنگ بوو بۆ سەربازو ژێر دەستەکانی لەجل‌وبەرگی سادەو خواردەمەنی ئاسایی‌و مامەلەی خاکیدا، عیمادی ئەصفەهانی لە وەسفی جل‌وبەرگ‌و هەلس‌وکەوتیدا ئەلێ: تەنها شتێکی لەبەردەکرد کە لەبەرکردنی حەلاڵ بوایە وەك کەتان‌و لۆکەو خوری، هەرکەسێکیش تێکەلاوی بکردایە هەستی نەدەکرد تێکەلاوی سولتان ئەکات لەبەر خاکی بوونی[2] هەروەها سەلاحەدین وەرزشکار بوو حەزی لەسوارچاکی‌و یاری تۆپێن بوو و خەلکی بۆهان دەدا، خۆشی دوای نوێژی نیوەرۆ سوار دەبوو بۆ سەیرکردنی یاری تۆپ‌و گۆچان پیاوانی دەوروبەریشی لەگەلیدا دەرۆشتن، هەر کە دەگەشتە گۆرەپانەکە دائەبەزی بۆ سەیرکردنی یاریەکەو یاریزانەکانیش هەتاوەکو نوێژی عەسر لەیاریەکەیاندا بەردەوام دەبوون، لەگەل خەلکانی دەوروبەریدا بەشداری ئەم یاریەی دەکرد، راوکردنیش یەکێك بوو لەخولیاو ئارەزووەکانی خەلکی ئەو کاتەو، بەتاك تاکو بەکۆمەل دەچوون بۆ راوکردنی بالندەو ماسی‌و مراوی‌و کەرویشك‌و سەگیشیان لەراوەکەیاندا بەکاردەهێنا، ئەمەش ئەگەر بەلگە بێت لەسەر شتێك ئەوە بەلگەیە لەسەر ئامادەی تەواو بۆ جەنگ‌و رووبەرووبوونەوە بەوپەڕی هێزو تواناوە. لەو چاکسازییە گەورانەش کە سەلاحەدین لەکۆمەلگەی موسولماندا ئەنجامیدا، نەهێشتنی دیاردەی بەد رەوشتی‌و رابواردنی نارەوا بوو کە لەسەردەمی فاطمیەکاندا باو بوو، بەتایبەت لەوەرزو بۆنەو جەژنەکانیاندا وەك جەژنی نەورۆز، ئەگەر بشمانەوێ رادەی ئەو بەدرەوشتییە بزانین کە لەکۆمەلگەی میسریدا بلاوبوبویەوە ئەوە دەبێ گوێبگرین بۆ ئەو قسانەی کە مەقریزی لە (الخطط)کەیدا ئەیکات‌و ئەلێ: خراپەکاری باوبوو لەجەژنی نەورۆزدا، خەلکێکی زۆری لەگەل دابوو، خۆیان بەسەر خەلکیدا فەرز دەکردو لەرێورەسمێکدا کە لەمالی گەورەکاندا رێك دەخراو رازی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٠.

[2] صلاح الدين الأيوبي، عبدالله ناصح، ل:١٧٨.

دەبوون بەدیاری سادەو ژنی خراپەکار کۆدەبوونەوە لەژێر کۆشکی لۆلۆدا بەجۆرێك کە خەلیفە ئەیبینی‌و دەنگ بەرز دەکرایەوەو مەی دەخورایەوە لەرێگاوبانەکانداو خەڵکی شەرە ئاوو مەیان دەکردو ئەگەر مرۆڤێکی باش لەماڵی خۆی دەربچوایە پیایدا ئەپژێنراو جل‌وبەرگی پیس دەکراو سوکایەتیان پێدەکرد، جا یادەبوو خۆی رزگاو بکردایە یاخود سوکایەتیان پێدەکرد[1] بەڵام سەلاحەدین ئەم دیاردە خراپانەی هەڵوەشاندەوەو ژیانێکی پاك‌و بێگەردی بۆ دەستەبەرکردن‌و رەوشت‌و نەریتە جوانەکانی ئیسلامی بۆ گێرانەوە، لەو دیاردە خراپانەش کە کۆتایی پێ هێنا بۆنە داهێنراوەکانی وەك رۆژی عاشورا بوو کەرۆژی ماتەمینی بوو لای فاطمیەکان‌و لەم رۆژەدا گریان‌و شیوەن دەگێردراو دەست لەئیش‌و کارەکان هەڵدەگیراو بازارەکان دادەخران‌و خەڵکیش پەرێشان‌و غەمگین بوون وەك ئەوەی هەریەکێکیان خۆشەویستترین کەسی لەدەستدا بێت، سەلاحەدینیش توانی هەموو ئەم دابونەریتە نارەوایانە نەهێڵێت[2]. سەبارەت بە بەخشندەیی‌و دابەشکردنی بەخشش‌و یارمەتی بەسەر خەڵکدا، ئەوە ئەتوانیت بەئارەزووی خۆت باسی بکەیت، ئەوە بوو یارمەتی‌و بەخشینی وەك کەسێك بوو کە لەنەبوونی نەترسێت، چونکە تێڕوانینی بۆ سامان وەك تێڕوانینی بۆ خۆڵ وابوو، پێشتریش ئامارەمان پێدا کە کاتێ کۆچی دوایی کرد هیچ موڵك‌و خانوو و بێستان‌و گوندو کێڵگەیەکی بەجێ نەهێشت‌و خەزێنەکەشی تەنها چل‌و حەوت درهەمی ناصری زیوو یەك پارچە زێڕی تێدا بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە پارەیەکی زۆری بەسەر پڕۆژە چاکسازییەکان‌و ئامادەکردنی کەرەستەی جەنگی‌و خەڵکانی هەژارو شایستەدا دابەش دەکرد... هەتاوەکو هاوکاری‌و بەدەمەوە چوونی کۆمەڵگە بەدی بێت‌و دەوڵەتیش بەهێزو تاکەکانیش ژیانێکی نموونەییان بۆ دەستەبەر ببێت، ئەمەش ئەو کارە بوو کە ئەم سوڵتانە دادپەروەرو سەرکردە پاڵەوانەکاری بۆ کرد، لەو کارە مەزنانەش کە یادی سەلاحەدینیان بەرز راگرتووە: نەهێشتنی ئەو هەموو باجە بوو کە باری شانی تاکەکانی کۆمەڵگەی قورس کردبوو و ئارامی لەخەڵك بڕیبوو، وەك ئەو باجانەی کە ئەمیری مەککە لەسەر حاجیەکان دایناوبوو، ئەوە بوو فەرمانڕەوای مەککە فەرمانیدا بوو کە حاجییەکان پێشەکی لەشاری جدە باجەکانیان بدەن، ئەمەش ستەمی تیابوو بۆ حاجیەکان، بەڵام سەلاحەدین ئەم سیستمەی هەڵوەشاندەوەو ئەمەی بۆ فەرمانڕەوای مەککە قەرەبوو کردەوەو هەموو ساڵێ هەشت هەزار ئەردەب گەنمی بۆ دەناردو بەمەرجێ کە بەسەر خەڵکی هەردوو حەرەمی پیرۆزی مەککەو مەدینەدا دابەش بکرێت، بەم شێوەیە سەلاحەدین ئەم

[1] صلاح الدين الأيوبي، علوان، ل: ١٧٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل:١٨٠.

باجەکی لەسەر خەڵکی هەڵگرتو بەو قەرەبوەش کەدەیدا سودی گەیاند بەدانیشتوانی هەردوو حەرەمی پیرۆز[1]، ئەوەش کە بەڵگەیە لەسەر کار بەجێیو سوربوونی لەسەر سەلامەتی کۆمەڵگەو یەکێتی ئوممەتو ئاگادارکردنەوەی لەستەمکردن، ئەوەیە کە لەوەسیەتەکەیدا هاتووە بۆ الملك الظاهری کوڕی کە ویلایەتی حەلەبی پێ سپارد بوو، لەم وەسیەتەشدا وەك قاضی ئیبن شەدداد ئەیگێڕێتەوە ئەڵێ: وەسیەتت بۆ دەکەم بە لەخواترسان چونکە ئەوە بناغەی هەموو چاکەیەکەو فەرمانیشت پێدەکەم بەوەی کە خوا فەرمانی پێکردووی چونکە ئەوە هۆکاری رزگاربونتە، ئاگاداریشت ئەکەمەوە لەخوێنو دەستخستە خوێنی خەڵکیەوە چونکە خوێن گوێی لێ ناخەوێنرێ، هەروەها وەسیەتت بۆ دەکەم بەراگرتنی دڵی خەڵکیو سەیرکردنی کاروبارەکانیان چونکە تۆ ئەمینداری منو خوایت بەسەریانەوە، هەروەها وەسیەتی راگرتنی دڵی ئەمیرو پیاوانی دەوڵەتو بەرپرسانت بۆ دەکەم، چونکە تۆ تەنها بەخۆشرِوییو دڵراگیرکردنی خەڵکی دەگەیتە ئەو پلەوپایە، رقت لەکەس نەبێت چونکە مردن کەس ناهێڵێتەوە، ئاگات لەنێوانی خۆتو خەڵکیش بێت چونکە بەهۆی رەزامەندی ئەوانەوە خوا لێت خۆش دەبێت، ئەوەی لەنێوان تۆو پەروەردگاریشدایە ئەوە لێی خۆش دەبێ چونکە پەروەردگار بەخشندەو میهرەبانە[2].

ئەمە گرنگترین ئەو چاکسازیە کۆمەڵایەتیو راستکردنەوە رەوشتیانە بوو کە سەڵاحەدین پێی هەستا؛ هەتاوەکو کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەردەمی ئەودا شانازی بەجوانترین ئاکارو باشترین نەریتو شیاوترین رەوشتەوە بکات.

### حەوتەم: چاکسازی لەبواری بیناسازیدا:

لەم بوارەشدا بایەخێکی باشیدا بە شوراو حەساری قاهیرە، کاتێ کە زۆربەی روخابوو و بووبوو بە رێگەیەك کە کەسی نەدەگێڕایەوە، ئەویش هەستا بەنۆژەنکردنەوەو سەرپەرشتیکردنی بۆ ئەم کارەش بەهائەدین قەراقوشی هەڵبژارد، پێوانەی ئەم شورایەش لەسەرەتاوە تاکۆتایی بەدەوری ئەو شارانەدا درێژە دەبویەوە کەشاری قاهیرەیان پێك دەهێنا لەسەردەمی ئەودا، کەئەویش شاری فسطاط بوو کە عەمری کوڕی عاص دروستی کردبوو، لەگەڵ شاری العسکر کەصالحی کوڕی عەلی عەباسی بنیاتیناو، شاری قاهیرەش کە جەوهەر الصقلی دروستی کرد، ئامانجیش لەبنیاتنانی ئەم حەسارە پاراستنی وڵات بوو لەپیلانی ناحەزان، لەپاڵ ئەم حەسارەشدا قەڵای (الجبل)ی بنیاتنا هەتاوەکو قاهیرە پارێزراوتر بێت لەدوژمنان، بەڵام نەیتوانی هەموو ئەم کارانە تەواو بکات بەهۆی

---

[1] صلاح الدين، علوان، ل:١٨١.

[2] صلاح الدين، علوان، ل:١٨١.

سەرقاڵبوون بەجەنگە جۆراوجۆرەکانەوە لەسەرجەم بەرەکاندا، ئەم قەڵایەش یەکێکەلەشوێنەوارە تۆکمەکان لەمێژووی میسرداو چەند جارێك دەستی گۆڕانکاری پێ گەشتووە لەچەند سەردەمێکی مێژوودا، هەروەها لەو قەڵایانەی کە سەلاحەدین بنیاتینا: قەڵای سینا کە لەنیوە دورگەی سینادا لەدوری ٥٧ کیلۆمەترەوە لەباکوری رۆژهەڵاتی شاری سویسەوە بنیاتینا، هەروەك لەباشوری ئەم قەڵایەشەوە دوو مزگەوتی‌لەتەنیشت یەکەوە بنیاتنا، لەگەڵ حەوزێکی ئاو بۆ تێرئاوکردنی خەڵکانی تینوو، لەسەر یەکێك لە دوو دەرگاکە حەوزەکەش نوسراوە: بسم الله الرحمن الرحيم، سڵاوو درودی خوا لەسەر محمدی گەورەمان، خوای گەورە موڵکی گەورەمان الناصر صلاّی دین‌و دنیا بپارێزێت، پاشای ئیسلام‌و موسوڵمانان‌و جێنشینی ئەمیری باوەڕداران، ئەم تەنکیە لەلایەن پاشا علی کوڕی ناصر العادل المظفر وە نۆژەن کراوەتەوەو لەساڵی ٥٩٠ك لێ بوەتەوە[1] هەروەها م. نعوم شقير لەکتێبی (تأريخ سيناء و العرب)دا ئەڵێ: کە ئەو بەلای ئەم قەڵای مزگەوتانەدا تێپەڕیوەو بینیویەتی قەڵا کە دەرگایەکی گەورەی هەیە لەلای باکوری رۆژئاواوەو لەسەر چوارچێوەکەشیەوە بەردێکی مێژوویی عەرەبی چوارگۆشە هەبووە کە بەچەند پیتێکی دیار ناوی سەلاحەدینی لەسەر هەڵکۆڵرا بوو: بسم الله الرحمن الرحيم خلد الله ملك مولانا الملك الناصر صلاح الدين، سلطان الاسلام والمسلمين، يوسف العادل الناصر في جمادي الاخرة سنة ٥٨٣ك[2] گرنگیدانی سەلاحەدین بەدامەزراندنی قایمکاریە سەربازییەکان هەموو شتێك نەبوو، بەڵکو گرنگیشی دەدا بەئاوەدانکردنەوەی دورگەی الروضة و الجيزة و بنیاتنانی دەزگای پێوانەکان‌و هەڵکەندنی جۆگەو بنیاتنانی نەخۆشخانەو خوێندنگەو خانەقاو شاری جیزەو الروضة یەکێك بوون لەگرنگترین شوێنەکان لەسەردەمی سەلاحەدیندا، ئیبن جبیر لەگەشتەکەیدا ئەڵێ: هەموو رۆژێکی یەکشەممە لەالجیزەدا بازاڕێکی گەورە دادەنراوە لەنێوان جیزەو میسریشدا دورگەیەك هەبوو کە خانوی جوانی تیادا بوو لەگەڵ چەند شوێنێکدا کە بۆ رابواردن‌و گەشت دانرابوون، هەروەها لەنێوان ئەوی‌و میسردا کەنداوێك هەبوو لەنیلداو مزگەوتێکی گەورەی تیابوو کە نوێژی هەینی تیادا دەکرا، دەزگای پێوانەش کە کەم‌و زیادبوونی نیلی دەپێوا لەتەنیشت ئەم مزگەوتەوە بوو، بەردو روخام چەندین هونەری جوانکاری لەخۆدەگرت[3]، هەروەها سەلاحەدین ئاودێری بنیاتناو کەشتیگەلی نۆژەنکردەوەو دیوانێکی تایبەتی بۆ کەشتیگەل داناو ناوی نا (دیوانی کەشتیگەل)و دایە دەست العادل برای،

---

[1] صلاح الدين الأيوبي، ل: ١٦٨.

[2] صلاح الدين الأيوبي، ل: ١٦٩.

[3] صلاح الدين الأيوبي، ل: ١٧٠.

هەروەها ئەسکەندەریەو دومیاط لەگرنگترین بەندەرە دەریاییەکان بوون لەوڵاتی میسرداو فسطاط و القوص گەورەترین بەندەرەکانی نیلی ئەوکاتە بوون، هەروەها ئەو کەشتیانەی تیایدا دروست دەکرا کە لەبەرەکانی جەنگدا دەمانەوە، یاخود دەچوون بۆ هێرش کردن لەدەریادا بۆ بەرزکردنەوەیوشەی الله و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام، هەروەها سەلاحەدین بەگرنگیەوە سەیری ئەسکەندەرییەی دەکرد وەك ناوچەیەکی ستراتیژی بۆبەرەنگاربوونەوەی پرۆژەی خاچپەرستی، هەر بۆیە فەرمانی نۆژەنکردنەوەی شوراو بورجەکەیداو نەخۆشخانەی تیادا دروستکردو گرنگیدا بەپردو جۆگە تیایدا هەتاوەکو باری گوزەرانی کشتیارانی تیایدا باش بکات[1].

چەند هۆکارێکیش رۆڵی هەبوو لەو گەشەکردنە ئاوەدانیەدا کە سەردەمی سەلاحەدین بەخۆیەوە بینی، لەوانەش: هۆکاری ئاینیو جوگرافیو سیاسیو کارگێڕیو ئابوریو سەربازیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری، دکتۆر عەدنان محمد فایز الحارثیش هەستاوە بەراڤەکردنو روونکردنەوەی ئەم هۆکارانە لەکتێبە بەنرخەکەیدا بەناونیشانی (عمران القاهرة و خططها في عهد صلاح الدين الأيوبي)[2] هەروەها دکتۆر عزالدین فراج لە (مميزات العمارة في الطراز الأيوبي)دا ئەڵێ: گرنگترین رووخسارە بیناسازییەکان لەسەردەمی ئەیوبیدا ئەو قایمکارییانە بوو کە لەشێوەی ئەو بورجو دەروازانەدا خۆی دەبینییەوە کە بۆ قەڵاو شوراکانی میسر کرابوو، ئەو دەرگایانەش کە سەلاحەدین دروستی کردبوو لەجۆری (منكسر) شکاو بوون کە (الباشوره)یان پێ دەوتراو لەو داهێنانە بیناسازییانە بوو کە تۆکمەیی زیاتریان بەشوراکان بەخشیبوو رێگای چوونەژوورەوەش بۆی راستەوخۆی دیوارەکەی نەدەبڕی وەك جۆرە ئاساییەکانی تر، بەڵکو دوژمن ناچار بوو کە دەرگاکە لەنێوان دوو بورجەوە ببڕێت کە دەروازەیەکی تیابوو لێرەوە تیر دەهاوێژرا بەبێ بوونی قەڵغان هەروەها رەگەزێکی بیناسازی تر هەبوو کە سەلاحەدین بەکاری هێنا لەقایمکارییەکاندا، کەئەویش شوێنێکی بەردینی دیارو دەرچوو بوو لەدیواری حەسارەکەو بە (السقاطة) ناو دەبرا چەند بۆشاییەکی بەرزی تیابوو کە لێیەوە سەربازەکان تیرەکانیان دەهاویشت بۆ دوژمن لەپێشو ئەم لاو ئەولاوە، هەروەها مامۆستا کریزویلیش سەلماندوویەتي کە ئەم رەگەزە بیناسازییە رۆژهەڵاتییە، هەروەك سەلماندی کە بەکارهێنانی شێوازی هەیوانی بەیەکدا چوو لەخوێندنگەکاندا لەمیسردا پەیدابووەو هەرلەوێش پەرەی سەندووە، ئەو بیرۆکەیە لەدەرەوە نەهێنراوە، هەروەها زەخرەفەو

---

[1] صلاح الين، علوان، ص: ١٧٠

[2] عمران القاهرة و خططها في عهد صلاح الدين، ل: ٤٠ — ٦٩.

نەخشی گەچین لەم سەردەمەدا گەشەی کردوو کارکرکردنیش بە بەرد برەوی هەبوو و نوسینی نوسخیش دەرکەوت و لەگەڵ نوسینی کوفیدا پێکەوە کاریان پێدەکرا[1].

**هەشتەم: چاکسازی ئیداری:**

درەکەوتنی دەوڵەتی ئەیوبی کاریگەری زۆری هەبوو لەهێنانەکایەی بەرەپێشچوونی ئیداری گرنگدا، کە پێچەوانەی جیهازی ئیداری فاطمي بوو، قەلقەشەندی باسی ئەوە دەکات کە دەوڵەتی ئەیوبی کاتێك بووە میراتگری حوکمی فاطمي لەزۆر شتدا جیاواز بوو لێی وەك ریزبەندیو رێکخستنەکانی ناو میرنشینەکە، هەر بۆیە رووخساری میرنشینەکەی گۆڕی[2]، چونکە هاتنی ئەیوبییەکان لەرۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامییەوە رۆحێکی نوێی هێنا لەبواری ئیداریو کارگێڕیدا کەسەرچاوەکەی سیستمی سلجوقیو زەنکیو عەباسییەکان بوو، شێوازی ئەو گۆڕانکارییەش کە بەسەر ئەم ئیدارەدا داهێنایان جۆراوجۆر بوو، گرنگترینیان داهێنانی پۆستی ئیداری نوێ بوو وەك پۆستی جێگری سوڵتان[3]، کەڕەنگدانەوەی پێویستی چوونی سوڵتان بوو بۆ غەزا دەرەنجامی جەنگەکانی خاچپەرستی، بۆیە پێویست بوو کەسێك ببێتە جێنشینی سوڵتان لەکاتی ئامادەنەبونیدا[4]، هەروەها سەلاحەدین دەوڵەتەکەی دابەش کرد بەچەند هەرێمێکی ئیدارییەوە کە هەر یەکەیان توانای تایبەتو مۆرکی جیای هەبوو، وەك میسرو شامو باکوری عێراقو نەوبەو مەغریبو یەمەنو حیجازو زۆرینەی ساڵەکانی فەرمانڕەواییشی لەبەرەکانی جەنگدا بەسەر بردو سیاسەتی پلان دانانو جێبەجێکردنو سەرپەرشتی کردنو ئاراستەکردنی سیاسەتی باڵای دەوڵەتی مومارەسە دەکرد، بەڵام ئازادی جێبەجێکردنی لەمەسەلە ناوخۆییەکاندا هێشتبویەوە بۆ والییەکان لەخۆئامادەکردنو بەرگریکردندا، بەپێی بارودۆخو توانای هەر هەرێمێك، ئەمەش لەئەمڕۆدا بە (لامەرکەزیەت) ناو دەبرێت، لەراستیدا سەلاحەدین هەموو دەسەڵاتەکانی لەدەستی خۆیدا قۆرغ کردبوو، هەرچەندە ئەو دەسەڵاتداری سەرەکی دەوڵەت بوو، بەڵکو ئەو دەیزانی کە دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی وادەکات کە هەر دەسەڵاتێك ببێتە چاودێر بەسەر دەسەڵاتەکەی ترەوەو ببێتە هاوشانی لەبەرکارهێنانی دەسەڵاتەکانیدا، هەروەك دابەشکردنی کار لەنێوان چەند کەسێکی لێهاتوو و کارامەدا چەند تایبەتمەندییەك بەدەست دێنێت وەك باش ئەنجامدانی کاروخێرا بەئەنجام

---

[1] فضل المسلمين على الحضارة الأوروبيرة، ل:٢٢٨.

[2] صبح الأعشى (٤/٥٠)، عمران القاهرة و خططها، ل:٢٢٤.

[3] عمران القاهرة و خططها، ل:٢٢٤

[4] الحركة الفكرية في مصر، عبداللطيف حمزة، ل:٤٨

گەیاندنی[1]، قاهیرەش ناوەندی حکومەتەکەی بوو و جێگرو وەزیرەکانی تیایدا نیشتەجێ بوون‌و لەقاهیرەوە فەرمانی دەردەکرد بۆ هەرێمەکان‌و وڵاتی شامیش ناوەندی جەنگ‌و جیهادی بوو دژ بەخاچپەرستەکان[2].

پۆستە گرنگەکانی دەوڵەتیشی سپارد بەکوڕو خزم‌و کەسە دڵسۆزەکانی، ئەمەش بۆ پاراستنی سستم‌و ڕێبازی فەرمانڕەوایی‌و سەرکردایەتی‌و، بۆ هەڵبژاردنیان پشتی بە عەقڵ‌و ژیری دەبەست، تەنانەت الملك الظاهر غازی لەئەمیریی حەلەب لابردو سپاردی بە العادلی برای کاتێ بەرژەوەندی دەوڵەت ئەوەی دەخواست، ئەگەر میرنشینێکی ئیسلامیشی بخستایەتە سەر دەوڵەتەکەی فەرمانڕەواکەی دەهێشتەوە ئەگەر ڕازی بوایەن سەر بەدەسەڵاتی ئەو بن‌و، سیاسەتەکانی جێبەجێ بکەن‌و کار بۆ ئامانجە گشتییە ئیسلامییەکان بکەن، هەر کەسێکیش ڕازی نەبوایە دەستبەرداری دەبوو بۆ هەر کوێیەك دەڕوا باڕوا، شێوازی ئاشتیانەشی دەگرتەبەر بۆ لێك تێگەیشتن لەگەڵیاندا، ئەگەر والییەکیش لەدەسەڵاتی دەرچوایە، چاوپۆشی لەهەڵەکانی دەکردو بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێدەکردو زۆر ڕێزی لێ دەنا، وەك لەگەڵ تقی الدین عمردا کاتێ ویستی لەگوێڕایەڵی دەربچێت‌و بەرەو مەغریب بڕوات بەهۆی لەسەر کارلابردنی لەمیسردا، هەروەها چاودێری بەرژەوەندی گشتی دەکرد لە دامەزراندن‌و لەسەر کارلابردنی کاربەدەستاندا، سەرباری لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی سیاسی‌و سەربازی دەوڵەت، سیاسەتیشی ناسراو بوو بەدادگەری‌و خاکی بوون‌و هەستی کەسی بریندار نەدەکردو خۆی لەکەس بەگەورەتر نەدەزانی‌و خۆسەپێن‌و توندوتیژ نەبوو[3].

**بەهائەدین قەراقوش:** یەکێکە لەپیاوانی ئیدارەی ئەیوبی، ئەم پیاوە کۆیلەیەکی ڕۆمی بوو، لەیەکێك لەگوندەکانی ئاسیای ناوەند هەڵاتبوو و چەند شوێنی کردبوو هەتاوەکو گەیشتبویە وڵاتی شام پاشان بوو بەخزمەتکاری ئەسەدەدین شێرکۆو ئەویش ئازایەتی‌و پیاوەتی تیادا بەدی دەکردو بەم هۆیەشەوە نزیکی کردەوە لەخۆی‌و دەستی کرد بەراهێنانی لەسەر سوارچاکی‌و گەشەدان بە بەهرەسەربازییەکانی، پاشان لەدیمەشقدا بە بەهائەدینی کوڕی عەبدوڵای ئەسەدی ناوی دەرکرد، وەسفکردنیشی بەنازناوی ئەسەدی لەئەسەدەدین شێرکۆو هاتبوو کە هەستا بەکڕین‌و پەروەردەو فێرکردن‌و هۆکارێکیش بوو بۆ موسوڵمان بوونی، زۆری نەبرد بەهائەدین بەپلەکانی سوپادا سەرکەوت هەتاوەکو پلەی فەرماندەو ئەمیر، سەرکردەی ئەم سوپایەش سەرکردەی پاڵەوان

---

[1] تأريخ الأيوبيين: ل:٢١١.

[2] تأريخ الأيوبيين: ل:٢١١.

[3] تأريخ الأيوبيين: ل:٢١١.

ئەسەدەدەین شێرکۆ بوو، کە لەکۆتایی دەوڵەتی فاطمیدا هاتە میسرەوە، پاشان لەسەر دەستی سەلاحەدینی ئەیوبی دەوڵەتی فاطمی لەناو براو دەوڵەتی ئەیوبی لەجێیدا دامەزرێنرا، مانای قەراقوشیش لەزمانی تورکیدا واتە هەڵۆ ئەو باڵندە رەشە ناسراوەی کە بەهۆی ئازایەتییەوە ناوەکەی لەمرۆڤ دەنرێت یان مرۆڤی پێ دەچوێنرێت، وشەکەش لەدوو بەش پێکهاتووە: (قەرە) مانای (رەش)و (قوش) مانای بازیان هەڵۆ[1]. ئیبن خەلەکانیش کەمێك لەژیانی ئەدوێ و ئەڵێ: ئەڵێن خزمەتکاری ئەسەدەدینی شێرکۆی مامی سەلاحەدین بووەو ئەو ئازادی کردووە، کاتێکیش سەلاحەدین لەوڵاتی میسردا دەسەلاتی بۆ یەکلابوویەوە دەسەلاتی کۆشکی پێ سپاردو کاروبارەکانی دایەدەستو پشتی پێ بەست بۆ بەڕێوەبردنی ئیشوکارەکانی تیایدا، چونکە پیاوێکی رووخۆشو هیممەت بەرزبوو[2]، ئیبن کەسیریش لە (البداية و النهاية)دا باسی ژیانی کردووەو ئەڵێ: ئەمیر بەهائەدین قەراقوش زانایەکی گەورە بوو، خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی سەربازیو ئیداری[3]. ژیانی ئەمیر بەهائەدین قەراقوشیش پڕ بوو لەدەستکەوتی گەورەو پاڵەوانێتیو دڵسۆزی بۆ ئیسلامو موسوڵمانان لەکاتی هاوڕێیەتیکردنی سەرکردە سەلاحەدینی ئەیوبیدا هەروەها پاش کۆچی دوایی کردنی، ئەمەش وایلێکرد کە ببێتە جێی پیلانی دوژمنانی داخ لەدڵو خەڵکانی ئیرەیی بەر[4]، لەو کارانەش کە پێی سپێردراو بەباشترین شێوە ئەنجامیدا:

- **پاراستنی کۆشکی فاطمی:** ئەوە بوو سەلاحەدین ئەرکی پاراستنی کۆشکی فاطمی پێ سپارد هەتاوەکو هیچ کەرەستەیەکی نەگات بەدەست دوژمنانی ئەهلی سوننەت، ئەمیر قەراقوشیش بەباشترین شێوە هەستا بەم کارەو شەونخونی دەکێشا لەپێناو پاراستنی کۆشکی فاطمیدا، بەڵام پیلانگێڕان بێ سود هەوڵیان دەدا کە پارەی پێویستیان دەست بکەوێت بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەر بوو بۆ شکست پێهێنانی ئەم پیلانە[5]. کە پیلانی ئەمینداری خیلافەت بوو و پێشتر ئاماژەمان پێدا، کۆشکی دەوڵەتی فاطمیش شتی گرانبەهای وای تێدا بوو کە کەس نەیبینیبوو، وەك پۆشاکی گرانبەهاو ملوانکەی بەنرخو گەوهەری دەگمەن لەیاقوتو بازنەی زێڕو قاپو قاچاخی زیوو ملوانکەی دوڕ، ئەمیر قەراقوشیش هەستا بە پاراستنی ئەم

---

[1] حكم قراقوش، ل:١٤.

[2] وفيات الأعيان، لە: حكم قراقوشەوە، ل:١٥.

[3] البداية و النهاية، لە: حكم قراقوشەوە، ل:١٥.

[4] حكم قراقوش، ل:١٥.

[5] الفاشوش في أحكام قراقوش لإبن مماتي، عبداللطيف حمزة، ل:٣٤.

گەنجینەیە بەباشترین شێوە هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە سەلاحەدینی سەرخستو دەسەلاتی چەسپاند لەزەویدا[1].

●**بنیاتنانی قەلای (الجبل)**: کاتێك سەلاحەدین لەشام گەڕایەوەو ئەو دەستکەوتانەی بینی کە ئەمیر بەهائەدین بەدەستی هێناون لەوکاتەدا کە ئەو لێرە نەبووەو تیایدا کارامەییو شارەزاییەکی ئەندازیاری زۆری نواندووە، فەرمانی پێکرد کە قەلایەکی بۆ بنیات بنێت بۆپاراستنی میسروو سەرپشکی کرد لەدیاریکردنی شوێنو قەبارەیدا ئەویش شوێنێکی بەرزی بۆ هەلبژارد کەچیای المقطم بوو و کە بەسەر قاهیرەدا دەیڕوانی هەتاوەکو ببێتە شوێنێك بۆ قەلاکە، ئەوە بوو لەسالی(٥٧٢ك)دا دەستی کرد بەدروستکردنی، بنیاتنانی ئەم قەلایەش بەشێك بوو لەکۆمەلە قایمکاریو ڕێوشوێنێکی سەربازی کە ئەیوبییەکان گرتیانەبەر بۆ زامنکردنی پاراستنی شارەکانی میسر وەك فسطاطو قاهیرە، هەربۆیە لەدەرەوە قەلاکە زۆر تۆکمە بوو و بورجو دەرگای تۆکمەی تیادا بوو، لەناوەوەشدا چەند بینایەکی سولتانی بەرزی تیادا بوو کە جێی سەرنجو سەرسوڕمانی هەموو ئەو کەسانە بوو کە سەردانیان وەسفیان کردووە لەمێژوونوسو گەڕۆکەکان، بینای قەلاکەش لەسەر تەپۆلکەیەکی بەردین دروستکرابوو ئەمەش تۆکمەیو بەهێزی زیاتری پێ بەخشیبوو[2]، ئیبن جبیر لەگەشتەکەیدا ئەلێ: هەروەها بینای قەلاکەمان بینی کە حەسارو شورایەك بوو لکابوو بەقاهیرەوە، قەلایەکی تۆکمە کەسولتان ئەیویست بیکاتە شوێنی نیشتەجێبوونیو شوراکەی درێژ بکاتەوە هەتاوەکو هەردوو شاری میسرو قاهیرە پێکەوە بلکێنێ، ئەوکەسانەش کە لەبنیاتنانی ئەم قەلایەدا بەکارگیرابوونو کارەکانیان گرتبووە ئەستۆ وەك بەرد شکاندنو هەلکۆلینیو لێدانی خەندەق لە دەوری شوراکە کە بەپاچو قولنگ هەلدەکۆلراو یەکێك بوو لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی کە هەتاوەکو ئێستا شوێنەواری ماوە، دیلەکانی ڕۆمیش کە ژمارەیەکی زۆر بوونو جگە لەوان کەس نەیدەتوانی ئەم کارە بکات[3].

●**بیری یوسف**: ئەمیر بەهائەدین قەراقوش لەناو قەلاکەدا بیرێکی سەرسوڕهێنەری هەلکەند پاش هەلکۆلینێکی زۆر قول، ئەم بیرەش هەتاوەکو ئەمڕۆ بەبیری (یوسف) ناسراوە، ئەم ناوەشی بۆ یوسف سەلاحەدین دەگەڕێتەوە[4]، مامۆستا عەلی باشا موبارك ئەلێ: ئەو بیرەی

---

[1] حكم قراقوش، ل:١٩.

[2] حكم قراقوش، ل:١٩.

[3] رحلة ابن جبير، ل:٢٢.

[4] حكم قراقوش، ل:٥٢.

کە ناسراوە بە (الحلزون)و لەناو قەڵادا هەیە لەسەردەمی سەلاحەدیندا هەڵکەندراوەو بەمەبەستی دابین کردنی ئاو بۆ ناو قەڵاکە هەڵکەنراوە ئەگەر توشی گەمارۆو ئابلۆقەدان هات لەلایەن دوژمنەوە[1].

• **حەساری قاهیرەو قەڵاو میسر:** ئەمیر بەهائەدین دوای بنیاتنانی قەڵاکە لەساڵی (٥٦٧ك)دا هەستا بەدرێژکردنەوەی حەساری قاهیرەی فاطمی باکور بەرەو رۆژئاوا هەتاوەکو بگات بە بەندەری المقسی لەسەر رووباری نیل، شوێنی ئێستاشی مزگەوتی (الفتح الجدید)ی گۆرەپانی (رەمسیس)ەکە هەمان ئەو شوێنەیە مزگەوتی أولاد عنانی تیابوو پێش گواستنەوەی، هەروەها هەستا بەدرێژکردنەوەی حەسارەکە هەتاوەکو گەیاندنی بەشورای فاطمی باکوری کۆن کەئەکەوتە رۆژهەڵاتی گەرەکی (الدرب الأحمر)، هەروەك هەستا بەدرێژکردنەوەیشورایەکی تری سێیەم لەباشوری قەڵاکەوە هەتاوەکو گەیاندنی بەدەرگای القرافەی شاری فسطاط بەرووبەرێك کە دەگاتە نزیکەی پێنج کیلۆمەترونیو[2]، ئەم حەسارەش کە بەهائەدین قەراقوش بنیاتی نا سێیەم شورا بوو کە دەوری قاهیرەی دابوو لەسەردەمی ئەودا، یەکەم دانەشیان: فەرماندەی رۆمی جەوهەر الصقلی بنیاتی نابوو، دووەمیش: وەزیر بەدرەدین جەمالی فەرماندەی سوپای بنیات نابوو، ئەم دوو حەسارەش لەخشت دروستکرابوون، سەبارەت بە سێیەم دانەش: ئەوە ئەمیر قەراقوش لەبەرد دروستی کرد بوو[3]. ئەم شورایەش دەوری هەر چوار شارەکەی دابوو کە لەسەردەمی ئەودا شاری قاهیرەیان پێك هێنابوو کە ئەوانیش: شاری فسطاط کە عەمری کوڕی عاص بنیاتی نا، شاری العسکر کە صالحی کوڕی عەلی عەباسی پێکەوەی نا، شاری قاهیرە کە لەلایەن جەوهەر الصقلییەوە دروستکرا لەگەڵ شاری میسردا، شورای مەزنی قاهیرەش یەکێکە لەگەورەترین ئەو دامەزراوە سەربازیانەی کە لەسەردەمی ئەودا بنیات نراو سەرپەرشتیاری ئەم کارو پرۆژەیەش ئەمیر بەهادین قەراقوش بوو کە لێهاتوویی‌و ئەزمونێکی فراوان‌و هیممەتێکی بەرزی نواند لەبنیاتنانی دام‌و دەزگا سەربازییەکاندا بەجۆرێك کە سەلاحەدین پێویستی بە بنیاتنانی هەر دەزگایەکی سەربازی هەبووایە پشتی بە ئەمیر بەهائەدین دەبەست[4].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:٢٣، الخطط التوفیقیة (٦٩/١).

[2] حکم قرقوش، ل:٢٦.

[3] الفاشوش في أحکام قراقوش، ل:٤٠.

[4] حکم قراقوش، ل:٢٧.

•**باڵەخانەکانی جیزەو قەڵای المقسی:** لەو بیناو دەزگا سەربازییانەی کە ئەمیر بەهائەدین قەراقوش بنیاتی نا: باڵەخانەکانی جیزە کە لەژێر پردی موسڵەوە بوو لەنێوان هەرەمەکان‌و نیلدا بەئاڕاستەی شاری میسر[1]، باسی ئەوەش دەکەن کە هەرەمە بچوك‌و پەرش‌وبڵاوەکانی جیزەی روخاندووەو بەردەکەی بردووە بۆ بنیاتنانی بیناکان[2] هەروەها قەڵای المقسی کە بورجێکی گەورە بوو ئەمیر بەهائەدین بنیاتی نا لەجێی (قنطرة الخلفاء) باڵەخانەی خەلیفەکان لەتەنیشت مزگەوتی گەورە لەکۆتایی شورای قاهیرەدا لەلای دەرگای البحردا، شوێنەکەشی لەئەمڕۆدا ئەو جێیەیە کە هەردوو باڵەخانەی (الأوقاف)و (راتب باشا)ی تیادایە کە دەکەونە تەنیشت مزگەوتی أولاد عنان لەلای دەریای رۆژهەڵاتی گۆڕەپانی باب الحدید[3].

•**دانانی بەفەرمانڕەوای عەککاو نۆژەنکردنەوەی شوراکەی:** لەمانگی موحەڕەمی ساڵی (٥٨٥ك)دا سەلاحەدین بەرەو عەککا کەوتەڕێ‌و ماوەیەك تیایدا مایەوەو هەستا بەرێکخستنی کاروبارەکانی‌و ئەمیر بەهائەدین قەراقوشی تیادا داناو هەستا بەرێکخستنی کاروبارەکانی‌و فەرمانیدا بەئاوەدانکردنەوەو نۆژەنکردنەوەی شوراکەی[4]، دواتریش بەپشتیوانی پەروەردگار قسە لەسەر عەککاو ئەو رووداوانە ئەکەین کەتیایدا روویدا.

•**ئەسڵی پەندی حوکمی قەراقوش:** قەراقوش یەکێك بوو لە بەهێزترین‌و باشترین سەرکردەکان، جارێکیان بەدیل گیراو بە دە هەزار دینار ئازادکراو سەلاحەدینیش بەئازادکردنی زۆر دڵخۆش بوو... وا دیارە سیاسەتی لەقاهیرەدا یەکلاکەرەوەو دانایانە بووە بۆ لەناوبردنی فاطمییەکان‌و تەنگ پێ هەڵچنینی پاشماوەکانیان، بۆیە هیچ بوارێکیان بۆ نەمایەوە جگە لەوەی کەهەستن بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی‌و ناوزڕاندنی بۆ ئەم مەبەستەش کتێبێکیان دەربارەی داناوە بەناوی (الفاشوش في أحكام قراقوش) کەخەڵکانی هاوچەرخیش گێلانە دوبارەی دەکەنەوە[5]، ئیبن خەلەکان ئەڵێ خەڵکی چەند حوکمێك ئەدەنەپاڵ ئەمیر بەهادین قەراقوش کە زۆر سەیرن گوایە کاتی جێنشینیدا لەمیسر لەبری سەلاحەدین پێی هەستاوە، تەنانەت الأسعدی کوڕی مماتی لەکتێبەکەیدا بەناوی (الفاشوش في أحكام قراقوش) چەند شتێك باس دەکات کە دوورە رەوشتی وا لەوەوە روویدابێت‌و

---

[1] حكم قراقوش، ل:٢٧.

[2] شذرات الذهب (٣٣١/٤، ٣٣٢)، حكم قراقوش، ل:٢٨.

[3] النجوم (٣٩/٤)، حكم قراقوش، ل:٢٨.

[4] حكم قراقوش، ل:٢٩

[5] هەمان سەرچاوە، ل:٤١.

پێدەچێت هەڵبەستراو بێت، چونکە سەلاحەدین لەبارودۆخی میرنشینەکەیدا پشتی بەو دەبەستو، ئەگەر متمانەی بەزانیاریو لێهاتوویی نەبوایە کاری پێ نەدەسپارد[1]. لەراستیدا کتێبی (الفاشوش في أحكام قراقوش)ی ئەسعەدی کوڕی مماتی سەرچاوەی ئەو پەندەیە کە لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبووەتەوە هەر لەکاتی دەرچونیەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ، ئەم کتێبەش کتێبێکی قەبارە بچوکە چەندین چیرۆکو شتی سەمەرەو گاڵتەئامێزی تیایەو بەزمانی خەڵك (عامی) نوسراوەتەوەو باسی ئەمیر بەهائەدین دەکات بەپێچەوانەی رواڵەتی راستەقینەی خۆیو، وەك کە سایەتییەکی کۆمیدی هاوشێوەی کەسایەتی جحا کەلەپوری میللیدا پیشانی دەدا دیارە ویستویەتی ئەمیر بەهائەدین قەراقوش لەکەدار بکات[2]، ئیبن خەلەکانیش پێی وایە کە کتێبی (الفاشوش) هەمووی هەڵبەستراوە چونکە ئەسعەدی کوڕی مماتی نزیك بووە بەڵکو شێك بووە لەدەسەڵاتی ئەیوبی ئیتر چۆن گاڵتە دەکات بەو رژێمە کەخۆی بەشێکە لێی یان لەکەداری دەکات[3].

لەڕاستیشدا پاڵنەری نوسینی ئەم کتێبە کە ئەمیر بەهائەدینو سەلاحەدینو تێکڕای دەوڵەتی ئەیوبی لەکەدار دەکات، لەپشتیەوە شالاوێکی پروپاگەندەو سیاسی هەبووە کە مەبەست پێی لەکەدارکردنی سوڵتان سەلاحەدینو دەوڵەتی ئەیوبی بووە لەچڵەپۆپەی سەرکەوتنەکانیداو مەبەست لەبڵاوکردنەوەشی، ناشرینکردنی ئەم دەوڵەتە بووە کە رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمیو تێکشکاندنی خاچپەرستە داگیرکەرەکاندا، ئەشتوانین بەو پەڕی دڵنیاییەوە بڵێین کە نوسینی ئەم کتێبە بەشێوازی نامەی ئامۆژگاری بۆ سوڵتان سەلاحەدینو بەزمانی خەڵکی (عامی) بەڵگەیە لەسەر زیرەکی نوسەرەکەیو ناپاکی مەبەستی، دیارە توانیویەتی بەم ئامانجەشی بگات، بەڵگەش لەسەر ئەمە زوو بڵاوبوونەوەی ناوەرۆکی ئەم کتێبە پڕ درۆیەو وتنەوەی لەسەر زاری خەڵکیو دوبارەکردنەوەی وەك ئەوەی کە چەند راستییەکی حاشاهەڵنەگربێت، تەنانەت سیوطی پێی کاریگەر بووەو گێڕاویەتییەوە بۆ قوتابییەکانی (وەك لەدەستنوسی باریس)دا دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەدا کە سیوطی پێی وابووە کە ئەمیر بەهائەدین پیاوچاك بووەو زیاتر کاری خێری ئەنجام داوە[4] لەراستیدا ئامانجی کتێبی (الفاشوش في أحكام قراقوش) نەهێشتنی متمانەیە بە ئەمیر بەهائەدین کە یەکێك بووە لەفەرماندەو یاریدەدەرە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:٤١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل:٤١.

[3] هەمان سەرچاوە، ل:٤٧.

[4] قراقوش ونوادرة، ل:٦٩، حكم قراقوش، ل:٥٣.

دیارەکانی سەلاحەدین کە لەتەنگانەدا پشتی پێ بەستون، هەروەها بۆ هەڵنانی خەڵکە دژ بە دەوڵەتی ئەیوبی سوننی کەبەهاتنی کۆتایی هێنا بەدەسەڵاتی فاطمي شیعە لەمیسردا، ئەم کتێبەش ئامرازێکە لەئامرازەکانی پڕوپاگەندەی سیاسی دژ بەپڕۆژەی سوننی.

## باسی شەشەم: سیستمی سەربازییەکان لەسەردەمی سەلاحەدیندا

سەلاحەدین دەستی دایە قایمکردنی شارەکانو بنیاتنانی قەلاو ڕێکخستنی سوپا وەك خۆئامادەکردنێك بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمن، هەروەها بایەخی دەدا بەهێزی دەریایی چونکە دەیزانی بەهێزیی فرەنجەکان لەدەریادایەو لاوازیان لەوشکانیدایە، هەروەك پێویستە کەشتیگەلێکی سەربازی پێکەوە بنرێت بۆ ڕێگرتن لەو کاروانە دەریاییانەی کە فرەنجەکان دەیاننارد بۆ پاڵپشتکردنی میرنشینە خاچپەرستەکان لەکەنارەکانی شامداو هێنانی چەكو جەنگاوەرو ئازوقە بۆیان لەکاتی توندوبوونی فشاری وشکانی لەسەریان، سەرباری ئەمەش سەلاحەدین بۆی دەرکەوت کە بونیادی دەوڵەت لەمیسردا لاوازەو پێویستی بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کاروبارە ئیداریو شەرعییەکان هەیە پێش ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ فرەنجەکاندا، هەروەها سەلاحەدین پەی بەمەترسی بوونی پەیوەندی بازرگانیو هاتوچۆ لەنێوان دەریای سوورو ناوەڕاست بۆد بوو و دەرکی بە جیاوازی بەرژەوەندی بازرگانەکانی شارەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیشی لەگەڵ خولیای ئەمیرەکانی میرنشینە لاتینییەکاندا لەناوەڕاستو ڕۆژئاواو باکوری ئەورووپادا کردبوو، بۆیە هەستا بەمۆرکردنی ڕێککەوتنێکی بازرگانی لەگەڵیاندا بەرامبەر بەجیابوونەوەو دابڕانیان لەئەمیرەکانی میرنشینەکان، مەسەلەی دووەمیش ئەوە بوو کە سەلاحەدین دەرکی بەوە کردبوو کە فرەنجەکان هەوڵی دەدەن کە دەسەڵاتیان لە کەناری شامو فەلەستینەوە درێژ بکەنەوە بۆ دەریای سوورو ئەگەری هەڕەشەکردن لەکاروانە بازرگانییەکان لەپشتەوەو هەڕەشەکردن لەکاروانی حاجیانی موسوڵمان هەبوو، بۆیە فەرمانیدا بەناردنی سوپا بۆ یەمەن بۆ پاراستنی هێڵەکانی بازرگانی دەریاییو ڕێگرتن لەکاری چەتەگەریو دەستدرێژی کردنە سەر کاروانی حاجییەکان[1].

### یەکەم: گەشەکردنی دەرەبەگایەتی سەربازی لەسەردەمی سەلاحەدیندا:

دەرەبەگایەتی (بەخشینی زەوی) لەبەرامبەر خزمەتی سەربازیدا پێشکەش دەکرا لەسەردەمی ئەیوبییەکاندا بەڵام ئەم بەخشینە بەشێوەی پشتاوپشت نەبوو، هەروەك بەخشینی زەوی لەلایەن سوڵتان ئەیوبییەوە مانای ئەوە نەبوو کە موڵکایەتی زەویە کشتوکاڵییەکان دەبەخشرێت بەوکەسە، هەروەها بەهرەمەندبوونی ئەو کەسەشی نەدەگەیاند لەبەروبومە کشتوکاڵییەکان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، بەڵکو پێدانی ئەو زەویە تەنها مافی ئەوەی دەدا بە کەسی پێدراو کە کۆمەڵێ باجی دیاریکراو بۆ خۆیو سەربازەکانی کۆبکاتەوە بەرامبەر بەچەند ئەرکێکی مەدەنیو سەربازی

---

[1] صلاح الدين الأيوبي، سقوط القدس و تحريرها، ل:٩٤، ٩٥.

کەپێویست بوو کەپێوەی پابەند بێت ، صلاح الدینیش دەستی کرد بەدابەشکردنی زەویەکانی میسر بەشێوەی چەند کەرتێكو هەندێکی بەخشی بە ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆیو هەندێکی تریشی بەسەر فەرماندەو ئەمیرەکانی سوپاکەیدا دابەش کرد، ئەوە بوو ئەسکەندەرییەو دومیاط و بحیرەی تەرخان کرد بۆ باوکیو قوص و أسوان و عینابیشی بڕیەوە بۆ شمس الدین تورانشای برای، مەقریزی ئەمە پشتڕاست دەکاتەوەو لە الخططدا دەڵێ: هەر لەسەردەمی سەلاحەدینەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ زەوییەکانی میسر بەخشراوە بەسوڵتانو ئەمیرو سەربازەکانی[1]، دابەشکردنی زەوییەکانیش وەك بەخشینی سەربازی لەسەردەمی سەلاحەدیندا تەنها لەمیسردا قورخ نەبوو بوو، بەڵکو هەموو ئەو وڵاتانەی گرتەوە کە سەلاحەدین توانی بیهێنێتە ناو پڕۆژەی یەکێتی ئیسلامیەوەو، چەند ڕێگایەکیشی گرتەبەر بۆ دابەشکردنی ئەو زەویانە بەسەر سەربازو ئەمیرەکاندا، کە هەندێکیان بەمەبەستی جێ پێ قایم کردنی خۆی بوو لەو وڵاتانەدا کە لەژێر ڕکێفی دابوون، وەك ئەوەی کە ڕوویدا کاتێك دەستی گرت بەسەر حمصو حماه دا لەساڵی (٥٧٠ك/١١٧٤ز)، کاتێ بەشێکی دیاریکرد بۆ ناصرالدین محمدی کوڕێ ئەسەدەدینی ئامۆزایو بەشی دووەمیش بۆشهابەدین حازمی برای[2]، هەروەها سەلاحەدین دابەشکردنی زەوی وەك هۆکارێك بەکاردەهێنا بۆ بەدی هێنانی یەکێتی ئیسلامی، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو بانگەوازەیە کە ئاراستەی کرد لەکاتی دابەزینیدا لە (البیرة) کاتێ نامەی نوسی بۆ پاشاکانی دەوروبەرو وتی: هەرکەس خۆی بەدەستەوە بدات وڵاتی پارێزراو دەبێت بەمەرجێك ببێتە سەربازی سوڵتان یان شوێنکەوتوو و پشتیوانی بێت بۆ تێکۆشان دژ بە بێ باوەڕان[3] ئەم کارەشی لەگەڵ عمادەدین زەنکیو عیزەدین مەسعودی فەرمانڕەوای موسڵو لەگەڵ فەرمانڕەوای عینتابیشدا کرد کە هەستا بەنامەناردن بۆ سوڵتانو گوێڕایەڵی خۆی بۆ دوپات کردەوە، کاتێ سوڵتانیش چووە وڵاتەکەیەوە بەدەست خۆیەوە هێشتیەوە ئەمەش لەساڵی (٥٧٩ك/١١٨٣ز)[4] هەروەها سەلاحەدین زەوی دەبەخشی بەپیاوەکانی وەك پاداشتێك بەرامبەر ئەو کارانەی کە دەیانکرد، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوە بوو کە سەلاحەدین لەگەڵ ئەمیری قەڵای کیفادا کردی کاتێ ئامەدی کردە موڵکی بەرامبەر بەو خزمەتانەی کە پێشکەشی کرد بەسەلاحەدین[5]، دواتر ئەوەی کە لەگەڵ سەیفەدین ئەلمەشطوبدا کردی کاتێ

---

[1] الخطط المقریزی (١/٩٧).

[2] صلاح الدین و الصلیبیون، عبدالله الغمدي، ل:١٠٢

[3] مفرج الکووب (٢/١٣٩)

[4] هەمان سەرچاوە (٢/١٣٩)

[5] النجوم الزاهرة (٦/٩٤).

خاچپەرستەکان ئازادیان کرد لەدیلی، سەلاحەدینیش بەگەرمی پێشوازی لێکردو نابلس‌و دەوروبەری پێ بەخشی لەساڵی (٥٨٨ک/١١٩٢ز)[١] هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت کە سەلاحەدین لەدابەشکردنی زەویدا لایەنی ئەمنی دەوڵەتەکەی رەچاوکردووە، ئەوە بوو چەند جارێك زەوی بڕیەوە بۆ هۆزە عەرەبیەکان کە بەزۆری ناپاکیان لەگەڵدا دەکردو بەروبومەکانیان دەبرد بۆ خاچپەرستەکان، بۆنموونە چەند زەوییەکی جیاجیای بەخشی بە هەردوو هۆزی جذام و ثعلبة، ئەمەش بۆ پاراستنی ئاسایش‌و هاندانی عەرەبەکان بۆ جیهادکردن لەگەڵیدا دژ بەخاچپەرستەکان[٢].

هەروەها لەتایبەتمەندییەکانی دەرەبەگایەتی ئەیوبی یان مولکێتی زەوی ئەوە بوو کە رێی دەدا بەخاوەن زەوی یان پێ بەخشراو کە لەموڵك‌و زەویەکەوە بگوازێتەوە بۆ یەکێکی تر، بەڵام ئەم گواستنەوەیە لەرێگەی پشتاوپشت‌و میراتەوە نەبوو، بەمیراتبردنی موڵك‌و زەویش لەسەردەمی سەلاحەدیندا تەنها سێ جار رووی داوە[٣]، بەرامبەر بەو داهاتانەی کە لە ئەو موڵکەوە بەدەست دەهاتن، کەسی خاوەن موڵك‌و پێ بەخشراو (دەرەبەگ) چەند شتێکی لەسەر پێویست دەبوو کە دەبوایە جێبەجێی بکردایە، ئەوانیش چەند ئەرکێکی سەربازی بوون لەگەڵ چەند ئەرکێکی ناسەربازیدا[٤] وەك جێبەجێکردنی مەرسوم‌و بڕیارەکانی سوڵتان‌و چەسپاندنی ئاسایش لەو موڵکەدا کە بۆی بڕاوەتەوە[٥]، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو موڵك‌و زەویەش چەند ئەرکێکی مەدەنی لەسەر پێویست بوو، کەگرنگترینیان پەیوەندیان بەئاودێری‌و کشتوکاڵ کردن لەو موڵك‌و زەویەداو هەندێ خزمەتگوزاری تایبەت بەسوڵتان[٦]، هەندێ جاریش ئەو موڵکە زەوی چاکنەکراوی تیادا بوو دەرەنجامی لێدانی کەناڵ‌و پرد، لەسەر خاوەنەکانیشیان پێویست بوو هەموو هەوڵێك بخەنەگەڕ بۆ چاککردنی ئەو زەویانە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە دەبوو خاوەن موڵك هەستێ بەدروستکردنی پردو نۆژەنکردنەوەو پاراستنی، کە چەند بەنداوێکی کشتوکاڵی بچوك بوون‌و گرنگی خۆیان هەبوو لەئاودێری ئەو موڵك‌و زەویانەدا، سەبارەت بەپردە سوڵتانییەکانیش کەچەند بەنداوێکی کشتوکاڵی گەورە بوون‌و بۆ بەرژەوەندی هەرێمەکان دروستکرابوون، ئەوە خاوەن موڵك بەرپرسیار نەبوو لێیان لەلایەنی تیۆرییەوە بەڵکو لەلایەنی پراکتیکییەوە لێیان بەرپرسیار بوو، ئەوە بوو خاوەن

---

[١] مفرج الکروب (٢/٣٨١)، صلاح الدین و الصلیبیون، ل:١٠٢.

[٢] النظم المالیة في مصر زمن الأیوبیین، ل:٢٩

[٣] صلاح الدین و الثلیبیون، ل:١٠٣.

[٤] صلاح الدین و الثلیبیون، ل:١٠٣.

[٥] صلاح الدین و الثلیبیون، ل:١٠٤.

[٦] صلاح الدین و الثلیبیون، ل:١٠٥.

موڵكەكان یارمەتی سوڵتانیان دەدا لەبنیاتنانی ئەم جۆرە پردانەدا ئەمەش بەناردنی پیاوو مانگاو ئامێروشتی تر بۆی، هەروەها خاوەن موڵك بەشداری دەكرد لەهەڵكەندن و جۆماڵكردنی كەناڵ و جۆگەكاندا[1]. سەلاحەدینیش پەنای برد بۆ هەمان ئەو شێوازەی كە زەنكییەكانی پێش خۆی پەیڕەویان دەكرد لەپێدانی موچە بەسوپا، ئەوە بوو زەوی و موڵكی دەدا بەئەمیرەكانی لەبری ئەو موچەیەی كە دەبوو بیدات بەسەربازەكان. بەم پێیەش سەلاحەدین تەنها بانگهێشتی ئەوكەسەی دەكرد كە موڵكەكەی پێ دابوو بۆ تێكۆشان دژ بەخاچپەرستەكان، ئەویش سوپاكەی خۆی بەئازوقەو كەرەستەوە بەڕێ دەكرد بۆ لای سوڵتان[2]. لەبەرئەوەی كەسەلاحەدین سەرچاوەی سەرەكی ئەوبەخشین و بڕینەوانەبوو، ئەیتوانی لەهەركاتێكدا كەبیەوێت هەڵی بوەشێنێتەوە بەتایبەت كاتێك كەپێی بەخشراو كەمتەرخەمی بنواندایە لەئەنجامدانی كارەكانیدا، یاخود هەڵسوكەتێكی بنواندایە كەكاریگەری لەسەر ئەركە سەربازییەكانی هەبوایە، وەك ئەوەی كە لەساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ز)دا روویدا كاتێك نانی كۆمەڵێك لەكوردەكانی بڕی چونكە هۆكاری شكستی سوپای ئیسلامی بوون لەجەنگی الرملەدا لەناوچەی (تل الصافیة) بەرامبەر سوپای خاچپەرستەكان كە ئەرناط سەركردایەتی دەكرد[3]، لەراستیدا سستمی بڕینەوەی زەوی سەربازی گرنگییەكی زۆری هەبوو بۆ سوپای سەلاحەدین[4]، هەروەك سستمی (موڵكایەتی زەوی سەربازی) بەهۆی ئەركەكانیەوە خاوەن موڵكی سزا دەدا هەركاتێك كەمتەرخەمی لەو ئەركانەدا بنواندایە ئەمەش گرنتی دڵسۆزی و خۆراگری سەربازەكانی دەكرد لەكاتی جەنگ و رووبەڕووبوونەوەدا، ئەمە سەرباری ئەو كارە سەربازیانەی كە دژ بەدوژمن ئەنجامیان دەدا، ئیبن واصل و ئیبن كثیر لەرووداوەكانی ساڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ز)دا، كەعیزەدین فەرەخشاه كە بەعلەبەكی پێ بەخشرابوو لەوكاتەدا، هەستا بەهێرشكردنە سەر صفدو بەسەلامەتی گەڕایەوە دوای ئەوەی ژمارەیەكی زۆری لەسەربازەكانیان كوشت و دەستكەوتی زۆرو باشی هەبوو[5]، لەگەڵ ئەمەشدا سستمی بەخشینی زەوی سەربازی یەكێك بوو لەداهاتە سەرەكییەكانی دەوڵەتی ئەیوبی بوو چونكە سەرچاوەیەكی سەرەكی و هەمیشە ئامادەبوو بۆ دابەشكردنی بەسەر سوپای سوڵتان و سوپای ئەمیری ناوچەو موڵكدارەكاندا، ئەمە

---

[1] الخطط (١/١٠١)، المنظم المالية، ل:٣٤.

[2] النجوم الزاهرة (٦/٢٩)، صلاح الدين و الصليبيون، ل:١٠٦.

[3] السلوك (١/٦٤، ٦٥)، صلاح الدين و الصليبيون، ل:١٠٧.

[4] صلاح الدين، ل:١٠٧.

[5] مفرج الكروب، لة: صلاح الدين و الصليبيون، ل:١٠٧.

سەربارى ئەو خەرجييە سەربازيە گرنگانەى كە سوپا لەكاتى جەنگدا هەيبوو[1]، بەم پێيە ئەتوانين بڵێين كە سەلاحەدين بەهۆى جێبەجێ كردنى سستمى موڵكايەتى سەربازى لەدەوڵەتەكەيدا ئەركى پێدانى چەكو ئازوقەو كەرەستە جەنگى بەسوپا لەكۆڵ خۆى كردەوە[2].

**دووەم: ديوانى سوپاى سەلاحى:**

ئەم ديوانە بەرپرس بوو لەكاروبارە تايبەتەكانى سوپاو، يەكێك لەشارەزايانى سوپا سەرپەرشتى دەكرد بەمەرجێك كەسێكى موسوڵمانو خاوەن پلەوپايەيەكى باش بێت[3] ئەم ديوانەش وەك وەزارەتى بەرگرى ئێستا وابوو، ئەو كەسەش كە سەرپەرشتى دەكرد بەرپرس بوو لەزانينى بارودۆخى سەربازەكانو تۆماركردنى مەسەلە تايبەتەكان بەئامادەبوون يان ئامادەنەبوون ياخود بارى تەندروستىو مردنيان[4]. هەروەها دەركردنى ئامار بەشێوەيەكى دەورى دەربارەى ژمارەى سوپاو ئەو بڕە پارەى كەتەرخان كراوە بۆيان يەكێكى تر بوو لەدەسەڵاتەكانى ديوانى سوپا، لەو كارانەش كە تايبتبوون بەديوانى سوپا ئەوەى كە ئيبن خەلەكان لەژيانى الملك الظاهر غياث الدينى كوڕى صلاح الدين باسى دەكات كەرۆژێكيان بۆ كاروبارى سەربازەكان دانيشتووەو ديوانى سوپاى لەبەردەستدابووە، هەر كە سەربازێك بهاتايەتە لاى ناوى لێ دەپرسى هەتاوەكو لەليستێكدا تۆمارى بكەن[5]، فەرمانبەرەكانى ديوانى سوپاش هەڵدەستان بەتۆماركردنى ناوى خاوەن موڵكو زەوييەكان (بەگەكان) بەهەموو چينو توێژەكانيانەوە. لەگەڵ ژمارەى ئەو سەربازانەى كە سەر بەئەوان بوون لەناوچەكانياندا لەبەرامبەر هەر موڵكێكيشەوە هێمايەكى نهێنى هەبوو ئەمەش وەك خۆپاراستنو نهێنيكارييەك كەفەرمانبەرانى ديوان پەيڕەويان دەكردو، باسى بڕى بەروبومو داهاتيان نەدەكرد مەگەر بەپێى بڕيارى تايبەتى سوڵتان[6]. واديارە ديوانى سوپا پارەى بۆ ئەو قايمكارييانە خەرج دەكرد كەسەلاحەدين لەميسردا بايەخى پێ دەدا لەترسى هێرشى خاچپەرستەكان لەكاتێكدا كەخۆى لەولاتى شامدا نيشتەجێ بوو، باشترين بەڵگەش لەسەر ئەو قايمقارييانە خەرجكردنى پارەيەكى زۆر بوو بۆ بنياتنانى شوراى ئەيوبى لەقاهيرەداو، بنياتنانى

---

[1] النظم المالية في مصر، ل:٤٠.

[2] صلاح الدين و الصليبيون، ل:١١٠.

[3] الجيش الأيوبي و في عهد صلاح الدين، ل:١٢٠.

[4] هەمان سەرچاوە، ل:١٢٠.

[5] وفيات الأعيان (٦/٤، ٧)

[6] النظم المالية، ل:٢٦، صلاح الدين و الصليبيون، ل:١١٠.

قەڵای الجبل لەگۆشەیەکی کێوی المقطمدا[1]، هەروەها قایمکردنو بەهێزکردنی شاری دومیاط کەقریزی ئەڵێ هەزار دیناری تێچووە[2]، گرنگترین فەرمانبەری دیوانی سوپاش بریتی بوو لەچاودێر (ناظر) کە بەرپرسی یەکەم بوو لە هەموو ئەوشتانەی کە لەدیواندا رووی دەدا، پاش ئەویش سەرپەرشتیاری (متولی الدیوان) دیوان دەهات کە ئەرکی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی رێنماییەکانی چاودێری لەئەستۆدا بوو، پاشان (المستوفی) ژمێریار کە ئەرکی داواکردنی لیستی موچە بوو لەفەرمانبەران لەکاتی خۆیدا، ئەمەو جگە لەچەند فەرمانبەرێکی تر[3].

**سێیەم: جلوبەرگی سەربازان:**

دەوڵەتی ئەیوبی کە زاڵ بوو بەسەر دەوڵەتی فاطمیداو بووە میراتگری، لەزۆرکاروباری فەرمانڕەواییدا جیاواز بوو لێیو زۆر روخساری دەوڵەتی پێشووی گۆڕیو زیاتر لەدەوڵەتی ئەتابەکی عمادەدین زەنکی لەموسڵو الملك العادل، نورەدین مەحمودی کوڕی لەشامدا دەچوو. چونکە ئەوان (کلێتە) یان کڵاوی زەردیان دەکردە سەریان[4] بەبێ مێزەرەو قژیان بەردەدایەوە لەژێریەوە، هەموو ئەمیرو پاشاکان ئەمەیان دەکرد[5]، بەشێوەیەکی گشتیش ئەتوانین بڵێین جلو بەرگی سەربازان لەدەوڵەتی ئەیوبیدا هاوشێوەو درێژە پێدەری جلوبەرگی سەربازانی دەوڵەتی زەنکی بوو.

**چوارەم: ئازوقە:**

نەریتی سوپا وابوو کە هەمیشە ئازوقەیان لەدواوەی سوپاکەدا دەدەنا، واتە لە (الساقة)دا کە (الثقل)یشیان پێ دەوت، بەڵام لەهەڵمەتو هێرشێکدا ئازوقەکەیان لەناوەڕاستی سوپاکەدا دانا واتە لەنزیك دڵی سوپاوە، رەنگە ئەمەشیان لەترسی ئەوە کردبێت کە نەوەکو دوژمن دەستی بەسەردا بگرێت، ئەوەبوو لەناوەڕاستی جومادی یەکەمی ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨زدا سوڵتان کەوتە خۆئامادەکردن بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمنو لەپێشدا لای راستی خستەڕیو دڵیشی لەناوەڕاستدا دامەزراندو لای چەپیشی خستە کۆتایی، لەپێشی پێشەوەشدا مظفرالدینی کوڕی زەینەدینی داناو ئازوقەشی خستە ناوەڕاستی سوپاکەوە[6]، دیارە سەربازەکان هەندێ کەلوپەلی تایبەتی خۆیان

---

[1] النظم المالية، ل:٢٦، صلاح الدين و الصليبيون، ل:١١٠.

[2] الخطط (٢١٥/١)، صلاح الدين و الصليبيون، ل:١١٠.

[3] الجيش الايوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٢.

[4] الجيش اليوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٢

[5] الجيش اليوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٢

[6] مفرج الكروب (٢٥٦/٢)، الجيش الايوبي، ل:١٢٧

لەکۆڵەپشتدا هەڵگرتبوو کە لەپێستو چەرم دروستکرابوو، لەکاتی پێشڕەوی کردنیشدا سەربازەکان دادەبەزینە بازاڕو شتو مەکی پێویستیان دەکڕی کە لەنانو پەنیرو پیازو گۆشتی وشککراوو هەندێ دانەوێڵەو پاقلەمەنیو بەروبومو خورما تێپەڕی نەدەکرد[1]، کاتێ ئامادەبوون بۆ هێرشکردنە سەر ڕەملە کە بەشکستی سەلاحەدین کۆتایی هات لەساڵی ٥٧٣ك/ ١١٧٧ز عیمادی کاتب بەشێوازی سەجع ئامێزی خۆی باس دەکات کەپێی ناسرابوو و ئەڵێ: هاوار کرا لەناو سەربازەکاندا: شتومەکی دە ڕۆژی تر بکڕن، ئەوانیش نامەیەکیان نوسی بۆ بازاڕی سوپا بۆ شت کڕین لێی ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك[2]، هەروەها لەو جەنگانەدا کە پاش جەنگی حطین ڕوویانداو لەکاتی هێرشکردنی سوپای ئەیوبی بۆ کەناری دەریا لەناوچەی میرنشینی طرابلوسی خاچپەرستدا لەساڵی ٥٨٤/١١٨٨ لەناو سەربازەکاندا هاوار کرا: ئێمە دەچینە کەنار دەریاوەو لەوێش ئازوقە کەمەو دوژمنیش لەهەموو لایەکەوەیە، ئازوقەی مانگێك هەڵگرن[3]، کاتێ خەڵکی عەککا تەنگیان پێ هەڵچنراو ڕووبەڕووی گەمارۆیەکی توندودوورودرێژ بوونەوە، ئەمیر بەهائەدین قەرەقوش لەناو شارەوە نامەیەکی نارد بۆ سوڵتانو سکاڵای کەمی ئازوقەی لەلادەکرد، سوڵتانیش کەشتیەکی گەورە ئازوقەی بۆ بەرێ خست، بۆ ئەوەش بەسەلامەتی بگاتە بەرەوە هەندێ گاوری خەڵکی بەیروتی کەموسوڵمان بوو بوون خستە پێشەوەی کەشتییەکە، هەتاوەکو بتوانن گفتوگۆ بکەن لەگەڵ دوژمنانداو بەجلوبەرگو زمانیان بیانخەڵەتێنن، بۆ زیاتر بەهەڵەدا بردنیشیان فەرمانی پێدان کە خاچ بەسەر کەشتیەکەوە بەرز بکەنەوەو، بەرازیشیان لەناو کەشتییەکەدا ڕاگیر کرد و بەرەو عەککا بەڕێکەوتن، لەڕێگەشدا خاچپەرستەکان ڕێیان پێگرت، بەڵام ئەمان توانیان بیانخەڵەتێننو وا خۆیان پیشان بدەن کە خاچپەرستنو هاتونەتە بەندەرە گەمارۆدراوەکەو[4] چوار سەد غەرارە گەنمو بڕێکی زۆر پەنیرو پیازو مەڕو چەند پێویستییەکی تریان پێبوو[5]، چەند جارێکیش ناردنی ئازوقە بۆ عەککا دووبارەبوویەوە لەبەر درێژی ماوەی ئابلۆقەکە، کۆمەکیەکانیش لەمیسرەوە دەهاتن، کە سامانێکی زۆری تیایە، ئەمە جگە لەوەی کە لەبەیروتەوە بۆیان دەنێردرا[6]، هەروەها موسوڵمانەکان هەموو ڕێگەو هۆکارێکیان دەگرتەبەر بۆ ڕێگرتن

---

[1] الجيش اليوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٧.

[2] سنا البرق (١/٢٥٣)

[3] الجيش اليوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٧.

[4] الفتح القسي، ص:٤١٧، الجيش الايوبي، ل:١٢٨

[5] مفرج الكروب (٢/٣٣٠)

[6] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٨.

لەداگیرکردنی عەککا بەڵام دواتر شکستیان خواردو عەککاش گیرا، بەزەحمەت گەشتنی ئازوقەش گرنگترین هۆکاری داگیرکرانی بوو، هەروەك چەند شارێکیش کە بەدەستی خاپەرستەکانەوە بوو لەبەر هەمان هۆکار کەوتە دەستی سوپای ئەیوبی[1]، تێبینی ئەوەش دەکرێت ئەوەش دەکەین کە سوپای ئەیوبی لەجەنگەکاندا پەنای دەبرد بۆ ڕێگرتن لەگەشتنی کۆمەکیەکان لەپێناو برسی کردن‌و لاوازبوون‌و خۆبەدەستەوە دانی دوژمندا، وەك ئەوەی کە هەستا بەلەناوبردنی کشتوکاڵ‌و رەزو مێوی خاچپەرستەکان‌و بڕینی درەختەکانیان لەناوچەی کرکدا لەهەوڵێکدا بۆ لاوازکردنی رینودی شاتیونی فەرمانڕەوای کرك[2]، هەروەها هەستا بەدوورینەوەی بەروبوومی دوژمن هەتاوەکو دانەوێڵەکەیان وشك بوو[3].

**پێنجەم: خۆئامادەکردنی سەربازی:**

ئامادەسازی واتە کۆی ئەو کارانەی کە سەرکردە پێی هەڵدەستێ لەبواری کۆکردنەوەی سوپا لەگۆڕەپانی جەنگداو، پێشڕەوی پێکردنی بۆ بەرەکانی جەنگ یان هەماهەنگ کردنی هێزەکانی بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی دوژمن‌و سەرکەوتن بەسەریدا[4]. چەمکی ئامادەسازیش لەکۆن‌و نوێدا لەمە تێپەڕ نەبووە، ئەوەی کە گۆڕاوە شێوازەکانی ئامادەسازی‌و جۆری سوپاو ئەو کەرەستەو ئامێرانەیە کە بەکاری دێنێت. سەبارەت بەو سستمەش کەسوپای ئەیوبی لەسەری دەڕۆیشت ئەوە سستمی (تخمیس) پێنتج بەشی بوو[5].

١- **سستمی ( تخمیس ) پێنج بەش:** پێمان وایە کە سەلاحەدین داهێنەری ئەم سیستمە نەبووە، بەڵکو پێش ئەویش ئەم سستمە هەبووە، بۆیە ئەو جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبووە لەگەڵ ئەو سەرکردە بەناوبانگانەی کە ئەم شێوازەیان جێبەجێ کردووە[6]، ڕێکخستنی سوپای ئەیوبیش لەسەر شێوەی چەند کەتیبەیەك بوو کە لەریزبەندی ئەندامە سەرەکییەکانی لەشی مرۆڤ یاخود لەخاچ دەچوو، کە قەد لەناوەڕاستیدایەو وەك دڵی سوپاکە وایە، سەریش لەپێشەوەیە وەك پێشەنگی سوپاو بەشی پێشەوە، هەدوو دەستیش لەتەنیشتەوەیە وەك لای چەپ‌و راست، پاشان هەردوو قاچ پێکەوە لەدواوەن وەك کۆتایی‌و دواوەی سوپا، بەم

[1] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٩.

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٢٩.

[3] كتاب الروضتين، له الجيش الأيوبي، ل:١٢٩.

[4] الجغرافية العسكرية، طه الهاشمي، ل:٨٣.

[5] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٤٣.

[6] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:

شێوەیە دەبینین کە لەپێنج بەشدا سوپاکە ڕێکراوە لێرەشەوە بە (تخمیس)و پێنج بەشە ناوزەد کرا[1].

شوێنی سوڵتانیش هەمیشە لەدڵو ناوچەرگەی سوپادا بوو و ئاڵاکانیشی بەدەوردا بوو هەتاوەکو هەموو ئەمیرەکان ببینن بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێنماییانەی کە لێیەوە دەردەچێ، هەروەها بۆ پاراستنو بەهێزکردنو سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی لەکاتی شڵەژاندا، هەندێ جاریش سوڵتان ئەهاتە پێشەوە بۆ هانداو بەرزکردنەوەی ورەی سوپاو ترس خستنەدڵی دوژمن، سەلاحەدینیش فەرماندەو سەرکردە دیاردە ناسراوەکانی لەپێشەوەی لای چەپو ڕاستەوە دادەناو لەپێشی پێشەوەشدا سوارچاكو رمبازو شمشێربازو کەسە چوستو چالاکەکانی دادەنا لەجموجۆڵو ڕووبەڕووبوونەوەدا[2].

٢- **ئەڵقەی تایبەتو سوڵتانیەکان:** ئەڵقەی سوڵتانی لەکۆمەڵە سەربازێك پێکهاتبوو، کە بەدەوری سەلاحەدیندا بوون، وەك پاسەوانی تایبەت، ئەم ئەڵقەیەش ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەجەنگەکانداو لەئازارکردنی کەنار دەریاو قەڵا تۆکمەکانی خاچپەرستەکاندا، هەروەها ئیبن ئەثیر ئاماژە بەئازادکردنی قەڵای سەختو تۆکمەی برزییە ئەکات، کە چۆن سەلاحەدین سوپاکەی دابەش کرد بۆ سێ بەش هەتاوەکو بەنۆرە (سەرە) بجەنگێن، کاتێ نۆرەی هێزە تایبەتەکەی سەلاحەدین هات، جەنگێکی توندیان ئەنجامدا سەرباری ئەو گەرما زۆرەی کەتیایدا دەجەنگان[3]، هەروەها ئەم ئەڵقە تایبەتە ڕۆڵی سەرپەرشتیاری هەبوو لەگەمارۆی عەککاداو لەگەڵ سەلاحەدیندا دەیگواستەوە لەنێوان تل الخروبە و شفعمر و تل کیسانو، ناوچەکانی دەوروبەری عەککادا، ئەم ئەڵقەیەش تاکە ئەڵقەیەك بوو کە لەگەڵ سەلاحەدیندا مایەوە دوای گەڕانەوەی سەربازەکان بۆ ناوچەکانی خۆیان بۆ پشودان بەهۆی هاتنی وەرزی زستانەوە لەساڵی ٥٨٨ك/ ١١٩٢ز میسرییەکانیش زۆرینەی سەربازانی ئەم ئەڵقەیەیان پێك دەهێنا[4]، ئەوەشی کە گرنگی ئەم ئەڵقەیەی دوپات دەکردەوە ئەوە بوو کە بەتەنها لەناوچەرگەو ناوەڕاستی سوپای ئەیوبیدا بوو بەپێی قسەی ئیبن شەدداد کە خۆی لەناو ئەڵقەکەدا بووە[5]، جارێکیان سوڵتان بەرەو دوژمن ڕۆشتو تەنها ئەم ئەڵقەیەی لەگەڵدا بوو[1]،

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:١٤٤

[2] مفرج الكروب (٢/٢٩٥)، الجيش الأيوبي، ل:١٤٦

[3] الكامل في التأريخ، لە الجيش الأيوبيەوە ، ل:١٤٨

[4] الجيش الأيوبي، ل:١٤٩

[5] الجيش الأيوبي، ل:١٤٩

پیاوانی ئەم بازنەیەش ئەو تیپەیان پێك دەهێنا كە بە (تیپی سەلاحی یان ناسری) ناسراو بوو[2]، چونكە لەو كاتەدا هەر كۆمەڵە جەنگاوەرێك لەژێر سەركردایەتی فەرماندەیەكدا بجەنگایەن بەناویەوە ناو دەنرا، چونكە خزمەتگوزارو خەڵكانی دەوروبەری خۆی بوون بۆنموونە بەسەربازانی نورەدین مەحمود نوریەیان دەوتو بەپیاوانی ئەسەدەدین شێركۆش ئەسەدیەو هەروەك ئەبو شامە دەگێڕێتەوە كە لەناو پاشماوەو شتە بەجێماوەكانی ئەسەدەدین لەمیسردا لەساڵی ٥٦٤ك/ ١١٦٨ز دا: كۆمەڵە گەنجێك هەبوون، كە ژمارەیان پێنج سەد كۆیلە بوو، پێیان دەوترا ئەسەدیە[3]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە سوپای ئەییوبی سیستمی مەمالیكی تێدا بووەو سوپای میسری لەسەردەمی مەمالیكدا لەپاشماوەی سوپای ئەیوبی پێكهاتبوو كە زۆربەی لەمەمالیكە توركەكانو پاشماوەی كوردەكان پێكهاتبوو، بەپیاوانی سوڵتانیش كە مەمالیك بوون دەوترا بازنە[4]. ئەیوبییەكانیش ڕێبازی سلجوقییەكانو ئەتابەكەكانیان پەیڕەو دەكرد (عمادالدین زنكی پاشان نورەدینی كوڕی) لەپشت بەستن بەمەمالیكە توركەكانو بەكارهێنانیان بەشێوەیەكی بەرفراوان لەسوپادا، سەباری ئەوەی كە ئەیوبییەكان یان دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی ئەتابەكیو مەمالیكی كەس نەبوونو هیچ كەسێك لەبنەماڵەی ئەیوب كۆیلایەتی بەخۆوە نەبینیوە[5].

٣- **پۆلبەندی كردنی سوپا بە پێی چەكی هەر پۆلێك:** سوپای سەلاحی لەسەر بنەمای دابەشكردنی سوپا بۆ چەند كۆمەڵەو گروپێك دروست بوو بوو. ئەم گروپانەش وەك كەتیبە وابوون، لەسەرووی هەر دوو سەد سوواریان سەدو حەفتا سوارێك ئەمیرێكی موقەددەم هەبوو[6]، هەروەها وتراوە ئەو هێرشە ئەوەندە جۆر سوپا تیایدا بەشدار بوو[7]، هەر جۆرە جەنگاوەرێكیش تایبەتمەندی خۆی هەبوو كەپێی جیادەكرایەوە لەجۆرەكانی تر، ئەم جیاكردنەوەش بەجۆری چەكو كەرەستەو ئەو ئەركانەدا دەردەكەوێت كە لەئەستۆیدابوو، سوپاش ناتوانێت سەركەوتووانە لەكردە سەربازییەكاندا جموجۆڵ بكات ئەگەر

---

[1] الجيش الأيوبي، ل:١٤٩

[2] كتاب الروضتين، لە : الجيش الأيوبيەوە، ل:١٤٩.

[3] النجوم الزاهره (١٢٤/٦)، الجيش الأيوبي، ل:١٤٩.

[4] الجيش الأيوبي، ل:١٥٠

[5] هەمان سەرچاوە، ل:١٥١.

[6] هەمان سەرچاوە، ل:١٥١.

[7] هەمان سەرچاوە، ل:١٥١.

بەهەماهەنگیو تەبایی کارنەکاتو هەر بەشەو یارمەتی بەشەکەی تر نەدات لەکاتی پێکداداندا بەشێوەیەکی گشتیش دوو جۆری سەرەکی هەبوون لەناو سوپای ئەیوبیدا ئەمە جگە لە جۆرە لاوەکییەکان کە ئەوانیش:

أ- **جۆری سوارەکان:** کە شادەماری سوپایەو ئەرکی سەرەکیشی کوشتارو کۆکردنەوەی زانیاریو بەدواداچوون بوو، لەبەر ئەو خێراییەی کە ئەم دوو کردەیە پێویستیانە بۆ هێرشکردنو دۆزینەوەو راوەدونانی دوژمنو رێگریکردن لەگەڕانەوەی بۆ بردنی ئازوقەو کەرەستەی جەنگ، بۆ ئەم پۆستەش خەڵکی شارەزاو خاوەن ئەزمونو فریاگوزاریان هەڵدەبژارد، لەکاتی هەواڵگریشدا خۆیان لادەدا لەرووبەڕووبوونەوەی دوژمن چونکە ئامانجیان دۆزینەوەی رادەو قەبارەی هێزی دوژمنو، پەیبردن بەخاڵە لاوازەکانی بوو، هەروەها ئەم سوارانە هەڵدەستان بە بەدەمەوە چوونی ئەو شوێنانەی کە رووبەڕووی هێرشو مەترسی کتوپڕ دەبوونەوە، بەڵام ئەم سوارانە دەخرانە دوای پیادەکانەوەو لەدواوەی ریزبەندیدا بوون، وەك طرطوسی باس دەکاتو دەڵێ: با ئەسپ سوارە پاڵەوانەکان لەپشت پیادەکانەوە چاوەڕێی هێرش بکەن[1]، هەر کە کاتی هێرش هات پێکەوە لەگەڵ پیادەکاندا هێرشیان دەکرد، ئەو تایبەتمەندییانەش کە پێویست بوو لەسواری راستەقینەدا هەبێت، ئەوە بەتاقیکردنەوەی لەش لەرووی هێزی جەستەییو شارەزایی لەهونەری رووبەڕووبوونەوەی دوژمندا وەك زۆرانبازیو شارەزایی بەکارهێنانی رمو هونەری نیشانە شکاندندا دیاریدەکرا[2]، سوارەکانیش شمشێرو خەنجەری درێژیان پێ بوو و کڵاوو قەڵغانو پۆشاکی پارێزەریان لەبەردابوو، ئەسپەکانیشیان کورتانو زینی بەسەرەوە بوو[3].

ب- **جۆری پیادەڕەو:** زۆرینەی زۆری هێزەکانی سوپای پێکدەهێناو هەڵدەستا بە بەئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانی جەنگو گرتنە ئەستۆی دەرەنجامو قورساییەکانی، ئەو چەکانەش کە جەنگاوەری پیادەڕەو هەڵی دەگرت لەجۆری چەکی سوك بوون، چونکە ئەمان پیادەڕەو بوون، شمشێرو کەوانو رمی کورتیان بەکاردەهێناو هەڵدەستان بەوەدەرنانی سەربازانی دوژمن لەسەنگەرەکانیانو لەناوبردنیان[4]، گرنگترین شتێکیش کە بەپیادەرەوەکان دەسپێردرا بریتی بوو بێت لە: پاراستنی سوپا لەکاتی پێشڕەوی کردندا بۆ رێگرتن لەهێرش

---

[1] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٥٤.

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٥٥.

[3] الحياة العسكرية عند العرب، إحسان هندي، ل:١٦٦.

[4] دروس في المعلومات الجغرافية، طه الهاشمي، ل:١٨.

بۆ هێنان و هەڵکوتانە سەری لەلایەن دوژمنەوەو پاراستنی ئەو کاروانانەی کە ئازوقەو کەرەستەی جەنگیان هەڵگرتبوو لەکاتی هاتوچۆکردندا[1]. لەریزبەندی سوپاشدا پیادەڕەوان هەمیشە لەڕیزەکانی پێشەوەدا بوون و لەدواشیانەوە سوارەو پاڵەوانەکان دەهاتن[2].

ج- **جۆرە یارمەتیدەرەکانی تر**: ئەمانەش بەهۆی ئەو چەك و کەرەستە سەربازییانەوە دەناسران کە بەکاریان دەهێنا، هەروەها ئەو ئەرکانەی کە ئەنجامیان دەدا، وەك مەنجەنیقکارو زرێپۆشکارو نەوتهێنەرو هەواڵگرو ئازوقەهێنەرو کۆمەککارو... هتد[3].

سەلاحەدینیش پێش بەڕێکەوتن بۆ گۆڕەپانی جەنگ هەڵدەستا بەوەستاندن و ریزکردنی سوپاو دیاریکردنی شوێنی هەر جۆرەو پڕکردنەوەی کەلێنەکان و دڵنیابوون لە بەسودی ئەو چەکانەی کە جەنگاوەر هەڵی دەگرت ئەوەبوو پێش ئەوەی بکەونە ڕێ بۆ حطین سوڵتان لەڕۆژی (عەرض)و نمایشدا وەستا بوو و سەربازەکانی ریزدەکردو بۆ هەموو بۆسەیەکیش شوێنێکی هەڵدەبژارد، هەروەها بۆ هەر ئەمیرێکیش شوێنێکی لەچەپ یان لەراستەوە دەستنیشان دەکرد کە نابێ بەجێی بهێڵێت، هیچ کۆمەڵێکیشی وەلا نەدەناو کەسی لێ دورنەدەخستنەوە، هەروەها ئاڵای گەورەشی دەردەهێنا کە بەجالیشیە ناسرابوو[4]، لە هەموو شوێنێکیشدا تیرهاوێژە لێهاتووەکانی هەڵدەبژاردو وەسیەتی بۆ هەر کۆمەڵێك دەکرد بەوەی کە ئاگایان لەکۆمەڵەکانی تر بێت و دەیوت: ئەگەر چوینە خاکی دوژمنەوە ئەمە شێوازی سەربازو داهات و سەرچاوەکانیانە و شوێنی بەشەکانی سوپاو پێشڕەوی پاڵەوانەکانمانە، کەسێکیش دیاریکرابوو لەسوپادا ئەرکی بانگەوازو هاندانی سەربازەکانی بۆ جەنگ پێ سپێردرابوو لەپێناو بەرزکردنەوەی ورەیان، شوێنیشی لەنزیك سەلاحەدینەوە بوو و هەر فەرمانێك لەسەلاحەدینەوە دەربچوایە ئەو بەدەنگی بەرز دەیگەیاندە تێکرای سوپاکەو بەم کەسەش دەوترا چاوەش[5] و هاواری لەخەڵك دەکرد کە ئامادە بن و پێویستە فلانە ئەمیر بەسەربازەکانیەوە بچێت بۆ کۆمەکی فیسار ئەمیر چونکە دوژمن زۆری بۆ هێناوە، یاخود هەڵدەستا بەگەرمکردن و تاودانی سەربازەکان بەهۆی دروشمی تایبەت و وروژێنەرەوە لەوێنەی (بژی سەربازانی ئیسلام و جەنگاوەرانی یەکتاپەرستی)[6].

---

[1] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٥٥.

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٥٥.

[3] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٥٦.

[4] هەمان سەرچاوە، ل:١٥٦.

[5] چاوەش: یان شاویش: وشەیەکی تورکییە.

[6] مفرج الكروب (٢/٢٩٥، ٣٢٦) الجيش الأيوبي، ل:١٥٧.

**شەشەم: خۆبەخشەکان لەسوپای ئەیوبیدا:**

سەرباری جەنگاوەرە سوارەو پیادە سەربازییەکان کە لەدیوانی سوپای ئەیوبیدا تۆمار کرابوونو سەربازەکانی مولکداری (بەگەکان) کە سەر بەدەولەتی ئەیوبی بوونو ئەو ئەمیرانەی تر کە هاتبونە ژێر رکێفی دەولەتی ئەیوبییەوەو ئەوانەش کە پالپشتی سوپای ئەیوبییان دەکرد بە جەنگاوەر لەکاتی پێویستیداو وێرای سەربازە تایبەتەکانی سولتان، کۆمەلێك خۆبەخش هەبوون کە خۆیان خستبووە خزمەتی سوپا وەك ئەنجامدانی ئەرکی جیهادو تێکۆشان لەپێناو خواداو لەپێناو رزگارکردی زەوی موسولمانان لەداگیرکاری خاچپەرستان، لەراستیشدا سەردەمی بوژانەوەو هۆشیاری ئیسلامی بەدەرکەوتنی سەرکردەی موجاهید عمادەدین زەنکی دەستی پێکرد کە دامەزرێنەری دەولەتی زەنکی بوو هەروەها لەسەردەمی نورەدین محمودی شەهید کورپیدا. ئەم پەیمانەش لەسەردەمی سەلاحەیندا گەشتە چلەپۆپەو سەلاحەدین توانی رۆژانی سەرەتای جیهادو تێکۆشانی موسولمانان لەسەرەتای ئیسلامدا بێنێتەوە یاد، بۆیە سەیر نەبوو ئەگەر چەندین خەلکی خۆبەخش لەریزی سوپای سەلاحەدیندا ببینین، بەتایبەت لەجەنگی حطین و رزگارکردنی بیت المقدسو جەنگەکانی دوای ئەو ئەمەش بووە جێی سەرنجی مێژوونوسان ئیبن کثیر باس دەکات کە سولتان کاتێ بڕیاریدا بیت المقدس ئازاد بکات، زانایانو پیاوچاکان وەك خۆبەخش پەیوەندیان پێوە کرد[1].

خۆبەخشەکانیش لەهەموو چینو توێژە کۆمەلایەتییەکان بوون، گوندنشینو هۆزەکانو شارنشینان، لەهەژارانو دەولەمەندان، بەتایبەت زانایانو سۆفیەکان[2]، دەلێ: نورەدین مەحمود فەرمانیدا کە بانگەواز بکرێت: بەناوجەنگاوەرو موجاهیدو تازە پێگەیشتووە خۆبەخشەکاندا لەلاوانی شارو خەلکی نەناسراوو غەریب بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ رووبەڕووبوونەوەی فەرەنجە بێ باوەڕو هاوەلگەرەکان[3]، وشەی تازەپێگەیشتوویان تازە هاتوو بۆ خۆبەخشەکان بەکار دەهات، پاشان ئەم وشەیەو ونبوو وشەی خۆبەخش جێی گرتەوە، هەردوو وشەکەش ئاماژە بەوە دەکان کە ئەوانە سەربازی فەرمی دەولەت نەبوون، بەلکو خۆبەخش بوون[4]. وتاربێژەکانیش لەمزگەوتەکاندا خەلکیان هان دەدا بۆ خۆبەخشکاری لەریزی سوپاو ئیسلامدا، هەر کە وتاربێژەکانیش لەمینبەرەکانیان دادەبەزین نوێژخوێنەکان چەندین دروشمو هوتافیان دەکێشاو لەهەموو لایەکەوە

---

[1] البدايةو النهاية، لة الجيش الأيوبيەوە، ل:١٥٨.

[2] الجيش الأيوبي، ل:١٦٠

[3] ذيل تأريخ دمشق، ل:٣٤٠، الجيش الأيوبي ل:١٦٠.

[4] سنا البرق الشامي (٣٣٦/١) الجيش الأيوبي، ل:١٦١.

یەك یەكو دەستە دەهاتن بۆ سەربازگەی سوپای ئیسلامی، هەندێ جاریش سەلاحەدین کاری کوشتنی دیلەکانی ئەسپارد بەخۆبەخشەکان بەتایبەت دیلە هەلگەڕاوەکان یان تیرهاوێژەرە خاچپەرستەکان، وەك لە بیت الاحزاندا لەساڵی ٥٧٥ك/١١٧٩ز روویدا[1]. پاش سەرکەوتنیشی لەحطیندا سەلاحەدین داوای کرد لەخۆبەخشە سۆفیەکان، کە هەر یەکێکیان دیلێکی سەر بە هەردوو تیپی خاچپەرستی داویەو ئسبتاریە بکوژێت[2] تەنانەت خۆبەخشەکان ئەرکێکی مەزنیان ئەنجامدا لەجەنگی حطینداو رۆڵیان هەبوو لەتۆمارکردنی سەرکەوتنێکی خێرا بەسەر دوژمندا، کاتێ هەڵمەتیان بردو ئاگریان بەردایە ئەو پوشە وشکەی کە لەدەوری خاچپەرستەکاندا بوو و ئاگر کڵپەی سەندو تەنگی بەخاچپەرستەکان هەڵچنیو هەلکردنی باش هۆکارێك بوو بۆ بردنی ئاگرو دوکەڵ بەرەو روویان[3] و دوچاری برسێتیو گەرماو دوکەڵ بوونەوە، سەرباری گەرمای جەنگەکە وەك ئیبن ئەثیر ئەڵێ[4].

**حەوتەم: ئەو تیمانەی کە پاشکۆی سوپا بوون:**

١- **تیمی ئەندازەیی:** هەمیشە تیمێکی ئەندازەیی لەگەڵ سوپادا بوو، ئەمە جگە لەتیمی پزیشکی، تیمی ئەندازەیی هەڵدەستا بەچەند ئەرکێك کە تایبەت بوون بەئەندازیاری سەربازی کە جەنگ پێویستییەتی، بەتایبەت جەنگی شوراو خەندەقەکان، وەك دامەزراندنی ئامێرە سەربازییە گەورەکان وەك مەنجەنیقو زرێپۆشو کەوانی گەورە وەك زیارو چەرخو کەوانە چەند لاکانو نەوت پرژێنەکان، هەروەها بنیاتنانی سەربازگەو هەڵکەندنی بیرودیاریکردنی شوێنی سەپاندنی ئابلۆقە لەسەر شورای ئەو شارانەی کە ئەویسترا ئازاد بکرێت، جگە لە دروستکردنی پردو هەڵتەکاندنیو پرکردنەوەی خەندەقو گۆڕینی رێڕەوی رووبارەکانو چەندین کاری تر کە دەکەوتنە چوارچێوەی ئەرکەکانی ئەم تیپەوە، لەکاتی گەمارۆی (بیت المقدس)یشدا سەلاحەدینو سوپاکەی بۆ ماوەی پێنج رۆژ بەدەوریدا دەسوڕانەوە، لەکۆتاییشدا شارەزایانی بواری ئەندازیاری شوراو حەسار توانیان شوێنێکی گونداو بدۆزنەوە لەبەشی باکوری شوراکەوە، بەئاراستەی دەرگای عەموداو کڵێسای صەهیوندا، سەلاحەدینیش فەرمانیدا کە ئامێرەکانی ئابلۆقەدان لەو شوێنەدا دامەزرێنن[5]،

---

[1] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٦١.

[2] كتاب الروضتين، له الجيش الأيوبيەوە، ل:١٦٢.

[3] الكامل في التأريخ، له: الجيش الأيوبي، ل:١٦٢.

[4] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٦٣.

[5] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٦١.

لەساڵی ٥٨١ك/١١٨٥ز دا و لەکاتی گەمارۆدانی موسڵدا کەسوپای سەلاحەدین دەستەوسان بوو لەتۆمارکردنی هیچ پێشڕەوی‌و سەرکەوتنێکی راستەوخۆ تیایدا، وێڕای دووبارەکردنەوەی هەوڵەکان بەهۆی تۆکمەی شوراکانیەوە، ئەوە بوو هەندێ لەپیاوانی پێشنیاریان کرد کە ئاراستەی رووباری دیجلە بگۆڕێت هەتاوەکو تینویان ببێت‌و گەرمای رۆژو گەرمای ئاگرو دوکەڵ‌و گەرمای کوشتار زۆریان بۆ بێنێت، ئەم رایەش خرایە بەردەم زانای بەناوبانگ فەخرەدینی کوڕی دهانی بەغدادی کەئەندازیاری سەردەمی خۆی بوو،... ئەویش وتی: ئەمە دەکرێت‌و مەحاڵ نییە[1]، لەنامەیەکیشدا کە سەلاحەدین بۆ خەلیفەی عەباسی ناردو القاضي الفاضلی راوێژکاری بەناوبانگی نوسی هاتووە: ئەندازیارانی خاوەن ئەزمون دەڵێن ئاسانە ئاراستەی رووباری دیجلە بگۆڕین بەجۆرێك کە بەموسڵدا نەڕوات‌و رێڕەوی دوور بێت لێیەوە، لەم کاتەشدا خەڵکەکەی ناچار دەبن کە بەبێ جەنگ‌و کوشتار بیدەن بەدەستەوە، هیچ زیانێك روو نادات‌و کەس ناکوژرێت‌و کەسیش بێ ئاوی زیانی پێ ناگەیەنێ[2]، بەڵام سەلاحەدین ئەم پرۆژەیەی جێبەجێ نەکرد، لەبەر گرانی‌و زۆری تێچوون‌و کەمی کات‌و بایەخدانی بەپرۆژەی گرنگتر[3].

٢- **تیمی پزیشکی:** هاوڕێیەتیکردنی تیمی پزیشکی بۆ سوپا لەبەرەکانی جەنگدا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش‌و بریندارەکان کارێکی زۆر پێویست بوو، پزیشکەکان‌و هاوکارەکانیان وەك نەخۆشخانەیەکی گەڕۆك وابوون‌و هەموو پێداویستییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو وەك دەرمان‌و ئامێرو گوێزەرەوە (نقالە) بۆ گواستنەوەی نەخۆش‌و بریندار، ئەم کەرەستانەش بەپشتی وڵاخێکەوە هەڵدەگیران‌و عیادە گەڕۆکەکەش لەناو خێوەتدا دائەنراو ئەو کەسانەی تیابوو کە پێویستیان بەچارەسەر هەبوو، دیارە سەردەمی سەلاحەدین سەردەمی بوژانەوەی بواری پزیشکی بوو ئەمەش بەهۆی زۆری داخوازی لەسەری‌و تەرخانکردنی پارە بۆی لەلایەن سەلاحەدین‌و ئەمیرەکانیەوە بەشێوەیەکی بەخشندانە، لەراستیشدا سەلاحەدین لەسەرەتای دەست بەکاربونیەوە گرنگی بەکاروباری پزیشکی دەدا، هەروەها گرنگی بەو پزیشکانەش دەدا کە خزمەتی دەوڵەتی فاطمي و وڵاتی نوری ئەتابەکیان لەشامدا دەکرد[4]، لەو پزیشکانەش کە بەشدار بوو لەو هەڵمەتانەدا کە

---

[1] کتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبي، ل:١٦٣.

[2] مفرج الكروب (٢/١٦٧)، الجيش الأيوبي، ل:١٦٣

[3] الجيش الأيوبي، ل:١٦٣.

[4] الجيش الأيوبي، ل:١٦٤.

سوپای سەلاحەدین پێی هەڵدەستا، ئەبو زەکەریا ئەمینی دەوڵەت یەحیای کوڕی ئیسماعیل ئەندەلوسی کە یەکێك بوو لەقوتابییەکانی موهەزەبەدینی حەکیم. کەبەردەوام هاوڕێی سوپای سەلاحەدین بوو لەجەنگدا، پاشان وەك زۆربەی پزیشکەکانی سەردەمی خۆی لەدیمەشق نیشتەجێ بوو، دیارە هۆی نیشتەجێبوونیش لەم شارەدا بوونی نەخۆشخانەی گەورەی نورەدین بوو تیایدا، هۆی دەستنیشانکردنی دیمەشقیش بەهۆی نزیکیەوە بوو لەبەرەکانی جەنگەوەو ئاسان گەشتنی بریندارو نەخۆشەکانی بۆی، ئەمەو ئەبو زەکەریا لەکۆتایی تەمەنیدا پەکی کەوت و سەلاحەدینیش موچەی بۆ بڕیەوە ئەم موچەیەش هەتاوەکو کۆچی دوایی بەردەوام بوو[1]، هەروەها لەگەڵ چەند پزیشکێکی تردا ئەم کارەی کرد وەك ئیبن دهانی بەغدادیو أبي الفضل سلێمانی میسری[2]. لەبەناوبانگترین پزیشکەکانیش صلاح الدین موفق الدين أبو نصر أسعدی ناسراو بە ئیبن مطرانی دیمەشقی کە ناسراو بووە بەوەی لەجەنگەکانی سوڵتاندا بەشداری کردووەو لەنەخۆشخانەی نوری لەدیمەشقدا کاری دەکرد، چەندین نوسراوی لەبواری پزیشکیدا هەیە لەوانە: المقالة الناصرية في حفظ الأمور الصحيه[3] و چەند بەرهەمێکی تر، عمادەدین کاتب دەربارەی ئەم پزیشکە ئەڵێ: لێهاتوو و روخۆش و دڵسۆز بوو و جێی ڕێزی زۆری سەلاحەدین بوو و پلەو پایەیەکی گەورەی هەبوو لەلای و خاوەن زانیاریو زیرەکیو پێشبینی بوو[4]. ئەمەو سوڵتانیش پزیشکی تایبەتی خۆی هەبوو کە لەهێرش و جەنگەکاندا هاوڕێیەتی دەکرد، چونکە سوڵتان هەندێ ئازارو تێکچوونی باری دەروونی لەگەڵدا بووەو جارجاریش دومەڵ بەپشتییەوە دەرهاتووە تەنانەت هەندێ لەهاوڕێیانی گلەیی ئەوەیان لێدەکرد کە گرنگی بەتەندروستی خۆی ناداتو بەپێی پێویست پشوو نادات، ئەویش وەڵامی دەداتەوەو دەیوت کاتێك سواری ئەسپ دەبم بۆ جیهاد ئازارم نامێنێ هەتاوەکو دادەبەزم[5]. دیارە ئەم پزیشکە تایبەتەش بەتەنها چارەسەری سوڵتانی نەدەکرد، بەڵکو چارەسەری گەورە فەرماندەو ئەمیرەکانی سوپاشی دەکرد، ئەوە بوو کاتێ زەینەدین یوسفی فەرمانڕەوای هەولێر بەهۆی تاوە گیانی لەدەستدا لەساڵی ٥٨٦ك/١١٩٠ز

---

[1] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدينن ل:١٦٥

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدينن ل:١٦٥

[3] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدينن ل:١٦٥

[4] الفتح القسي، ل:٥٧٦ الجيش الأيوبي، ل:١٦٥.

[5] الجيش الأيوبي، ل:١٦٦.

لەكاتی گەمارۆدانی عەككادا، پزیشكی سەلاحەدین چوو بۆ چارەسەر كردنی[1] هەندێ جاریش سوڵتان خودی خۆی سەرپەرشتی چارەسەركردنی بریندارەكانی دەكرد، وەك لەپاش شكستهێنانی موسوڵمانەكان لەجەنگی ئەرسوفدا  روویدا لەشەعبانی ٥٨٧ك/١١٩١زدا كاتێ دانیشتو داوای هێنانی بریندارەكانی كردو خۆی تیماری برینەكانی دەكردن[2].

٣- **تیمی مۆسیقای سەربازی:** كاتێك كە چاوەش بانگەوازی بۆ كۆبوونەوەی سەربازەكان دەكرد، ئاڵا هەڵدەكراو كوسەكان پێكدا دەكێشران[3] ئەمەش وەك مۆسیقای سەربازی یان مارشی سەردەمی ئێستا وابوو، بۆ وروژاندنو جولاندنی ورەی سەربازەكان بەكاردەهێنرا[4]. رووداوەكانی مێژووی ئەیوبیش دەیسەلمێنن كە مۆسیقا رۆڵێكی گەورەی بینیوە لەسوپادا تەنانەت شوێنێكی تایبەتی بۆ دیاری كرابوو كە بە تەپڵخانە ناسراو بوو[5]، واتە شوێنی تەپڵ، مەقریزیش سەبارەی بەمە باسی ئەوە دەكات كە دوای جێگیربوونی سەلاحەدین لەمیسرداو كۆتایی هێنان بەدەسەلاتی فاطمییەكان كاروباری تەپڵخانە رێكخرا، لەقەلقەشەندیش ئەمەمان بۆ مانا دەكاتو دەڵێت: تەپڵخانە واتە یانەی تەپڵ، كە تەپڵو ئامێرەكانی تری تێدا بوو، ئەم ئامێرانەش لەكاتی جەنگدا چەند جارێك لەكاتەكانی تریشدا رۆژی سێ جار لێدەدران[6]، ئەو كەسەش كە تەپڵ لێدەدا پێی دەوترا (دبندار) بە (زورنا) لێدەریش دەوترا (منفر) ئەو كەسەش كە دەفرە مسەكانی بەیەكدا دەكێشا پێی دەوترا (كوسی)[7]، نەریتیشیان وابوو كە (كوسەكان) لەكاتی هاتنی كەسایەتییەكی سەربازی گرنگدا لێ بدەن، لەگەڵ لێدانیشیدا ئاڵا هەڵدەكراو زورنا لێدەدرا، چەند لێدانێكی تایبەتیش هەبوو بۆ ئەو كاتانەی كە پێویست بوو نەوەستن لەجەنگدا، یا لەكاتی شكستیشدا بوایە، لەم كاتەشدا كوسەكان بە بەردەوامی لێدەدران بێ پشوو[8] هەروەها چەند لێدانێك هەبوون كە تایبەت بوون بەسەركەوتن، ئەوە بوو كاتێ هەواڵ گەیشت لەشەوالی ٥٨٧ك/ ١١٩١زدا كە كەشتیگەلی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:١٦٦

[2] مفرج الكروب (٣٦٨/٢) الجيش الأيوبي، ل:١٦٦

[3] كوسات: چەند دەفرێك لەشێوەی قەڵغانێكی بچوكدا پێكدادەكێشرێن بەپێی ئاوازێكی تایبەت.

[4] النوادر، ل:١٤٩، الجيش الأيوبي، ل:١٦٦

[5] الجيش الأيوبي، ل:١٦٧

[6] الجيش الأيوبي، ل:١٦٧

[7] صبح الأعشى (١٣/٤)

[8] الجيش الأيوبي، ل:١٦٧.

ئیسلامی توانیویەتی دەست بگرێت بەسەر کەشتی فەرەنجەکاندا کەزیاتر لەپێنج سەد خاچپەرستی تێدا بوو: موسوڵمانەکان زۆر دڵخۆش بوونو تەپڵی سەرکەوتن لێدەدراو زۆڕنای مزگێنی ژەنرا[1].

٤- **هەڵگرانی ئاڵاکانی سوپا:** لەناو سوپادا کۆمەڵێك هەبوون کە ئەرکیان هەڵگرتنی ئاڵای سوپاو پاراستنی بوو، ئاڵاکەش وەك نیشانەیەك وابوو کە کۆمەڵێکی لەکۆمەڵێکی ترو دەوڵەتێکی لەدەوڵەتێکی تر جیادەکردەوەو هەر دەوڵەتێکی ئیسلامیو نائیسلامیش ئاڵای تایبەتی خۆی هەبوو کە رەنگێکی دیاریکراوی هەبوو[2]. رەنگی ئاڵای سەلاحەدینیش زەرد بوو لەناوەڕاستیدا وێنەی هەڵۆیەك هەبوو وەك رەمزی هێزو متمانە بوون بەسەرکەوتن[3]، لەنێوان ئاڵاکانیشدا ئاڵایەك هەبوو کە لەئاوریشمی زەردی نەخشێنراو بەزێڕ پێکهاتبوو و نازناو و ناوی سوڵتانی لەسەر بوو پێی دەوترا: العصابە، هەروەها ئاڵایەکی مەزنی تریش هەبوو کە لەسەرەوەیدا چەند تاڵە مویەك هەبوو پێی دەوترا: جالیش، وێڕای چەند ئاڵایەکی زەردی بچوك کە بە سەناجق ناسراو بوون[4] ئاڵای گەورەش هەمیشە لەگەڵ کەژاوەی سوڵتاندابوو[5]، عیمادیش باسی ئاڵای سەلاحی دەکات لەکاتی ئازادکردنی صیدا لەلایەن سوپای ئەیوبییەوە لەساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧زداو ئەڵێ: نێردراوی فەرمانڕەواکەی کلیلەکانی هێناو تاریکییەکانی بەڕووناکی خۆی رەواندەوەو ئاڵای زەرد بەدەستی سپییەوە دەردەکەوت بەسەر شورایەکەوە[6]، ئەمەو ئاڵای سەلاحەدین لەچەندین هۆنروەی شاعیرانی ئەو سەردەمەدا باسکراوە بەتایبەت لەو بۆنانەدا کە سوپای ئەیوبی سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر خاچپەرستەکانداو ئاڵای ئەیوبی تیایدا بەرزکراوەتەوە، ئەوە بوو کاتێ موسوڵمانەکان سەرکەوتن بەسەریاندا لە بیت الأحزاندا لەساڵی ٥٧٥ك/ ١١٧٩ز کۆمەڵێ لەشاعیرانی پیرۆزباییان لێکرد بەبۆنەی ئەم ئازادسازییەوە، لەو شاعیرانەش بەهائەدین ئەبولحەسەنی ساعانی خۆراسانی کە لەهۆنراوەیەکیدا ئەڵێ:

وما رفعت أعلامك الصفر ساعة      الى عذت أكبادها السود ترجف

---

[1] مفرج الكروب (٢/٣٧٣، ٣٧٤)

[2] الجيش الأيوبي، ل:١٦٨.

[3] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٦٠.

[4] صبح الأعشى (٤/٨)، الجيش الأيوبي، ل:١٦٨

[5] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، ل:١٨٦.

[6] الفتح القسى، ل:١٠٣، الجيش الأيوبي، ل:١٦٩.

كبا من أعاليه صليب و بيعة　　　وساد بةدين حنيف و مصحف

أتسكن أوطان النبيين عصبة　　　تمين لدى إيمانها حين تحلف

نصحتكم و النصح في الدين واجب　　　ذروا بيت يعقوب فقد جاء يوسف[1]

هەروەها (العلم الشاتاني) کەستایشی سەلاحەدین دەکات بەقەسیدەیەکی رائی کە لەسەرەتاکەیدا هاتووە:

أرى النصر مقرونا برايتك الصفرا　　　فسر و املك الدنيا فأنت بها أحرى[2]

دیارە ئاڵاکەش هێمای سەروەرییە، هەر بۆیە لەشوێنەکاندا هەڵدەکرا وەك: قەڵاو کەشتیو دەزگا سەربازییە سەرەکییەکان، کاتێ لایەکیش شکستی دەخوارد یەکەم شتێك کە سەرکەوتوو دەیکرد بریتی بوو لەهێنانە خوارەوەی ئاڵای شکست خواردوو و هەڵکردنی ئاڵای خۆی لەشوێنیدا، وەك ئەوەی کە موسوڵمانەکان لەو قەڵایانەدا کردیان کە ئازادیان کرد لەدەستی خاچپەرستەکان[3]، سەبارەت بەئاڵای خاچپەرستەکانیش کە ئیبن شەدداد وەسفی دەکات کاتێ بەسەر عەرەبانەیەکەوە بینیویەتیو ئەڵێ: ئاڵای دوژمن لەعەرەبانەیەکدا بەرزکرابویەوەو بەهێستر رایان دەکێشا، ئاڵاکەیان زۆر بەرز بوو وەك منارە وابوو و رەنگی سپی مەیلەو سور بوو[4] لەسەر شێوەی خاچ بوو وسەربازەکانیان پارێزگاریان لێدەکرد، واتە ئاڵای خاچپەرستەکان وەك ئاڵای رێکخراوی خاچی سوری نێو دەوڵەتی وابووە[5].

## هەشتەم: پۆستەو هەواڵگرییەکان:

١- **رێکخستنی کاروباری پۆستە**: رێکخستنی کاروباری پۆستەش لەرێی دیوانێکی تایبەتەوە دەکرا، کە بەدیوانی پۆستە ناوزەند دەکراو لەژێر چاودێری چەند فەرمانبەرێکدا بوو کە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم دەزگایەیان پێ سپێردرابوو[6]، دەزگای پۆستەو هەواڵگیری ئەیوبیش ناسراو بوو بەوەی هەمیشە لەپێش دەزگاکانی خاچپەرستەکانەوە بوو، بۆ نموونە لەجەنگی الرملەدا کە لەساڵی ٥٧٣ك/١١٧٧زدا لەباشوری فەلەستین روویداو

---

[1] مفرج الكروب (٢/٨٣، ٨٤)، الجيش الأيوبي، ل:١٦٩.

[2] وفيات الأعيان (٧/٢١١)، الجيش الأيوبي، :١٧٠.

[3] الجيش الأيوبي، ل:١٧٠.

[4] هەمان سەرچاوە، ل:١٧٠، مفرج الكروب (٢/٣٤٣).

[5] الجيش الأيوبي، ل:١٧٠.

[6] هەمان سەرچاوە، ل:١٧١.

بەشکستخواردنی سوپای سەلاحەدین کۆتایی پێهات، سەلماندی کە سەلاحەدین پۆستەیەکی چالاکی هەیە، کە بەهۆی جولانەوەی خێرایەوە توانی ئەو پروپاگەندانە کۆتایی پێبێنێت کە لەمیسردا بلاوبووبوونەوەو باسیان لەکوژرانی سەلاحەدین دەکرا، ئەم جولانەوە دەستو بردە توانی ئەو کەسانە بێ هیوا بکات کە ملیان درێژکردبوو بۆ لەناوبردنی دەسەلاتی سەلاحەدین لەمیسردا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە سەلاحەدین نێردراوەکانی لەسەر سنوری میسرەوە بەسواری حوشترەوە نارد بۆ قاهیرە هەتاوەکو دوپاتی بکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە خەیالی یاخیبوونیان هەبوو کەسەلاحەدین زیندووە، کۆتری نامەبەریش مزگێنی گەڕانەوەی بۆ قاهیرە هێنا[1]، لەسالی ٥٧٨ك/١١٨٢ز یشدلو کاتێ سەلاحەدین لەمیسردا بوو، هەستا بەهێرشکردنە سەر کرکو بۆماوەی دە رۆژ گەمارۆی بەسەردا سەپاند، بەلام کاتێك کەمی ئازوقەی سوپاکەی بینی فەرمانی بەجێهێشتنی ناوچەکەو گەڕانەوە بۆ میسری دەکرد، مێژونوسی ئەیوبی محمد کوڕی تقی الدین عمر کە لەگەل کەژاوەی سولتاندا بوو ئەلێ: کاتێ ئێمە کەوتینە ڕێ چەند هەوالگرێك هاتن مژدەی سەرکەوتنی عیزەدین فەروخشای ماميا پێدا لەغەزای دەبوریەدا[2]، هەروەها سەلاحەدینیش هێندە وردبینو خێرابوون کە هەوالەکانیان کاتـژمێر دوای کاتـژمێر هەتاوەکو بەرەبەیان دەگەیاند[3]، بەتایبەت لەکاتی گەمارۆدانی عەککادا، لەناو هەوالگرەکانیشیدا چەند گاورێك هەبوون کە سولتان لەچەندین بۆنەدا تاقی کردبونەوە، گرنگی ئەوانەش لەوەدا بوو کە زمانی دوژمنیان دەزانیو گومانیشیان لێ نەدەکرا کە پیاوی سەلاحەدین بن، بەهۆی روالەتو شێوەی دەرەکیان، بۆیە بەردەوام ئەو هەوالانەی دوژمنیان دەگەیاندە سوپای ئەیوبی کەئاسان نەبوون لەرێی هەوالگرە موسولمانەکانەوە دەستیان بکەوێت، ئەوە بوو شەوێك سەلاحەدینیان لەنیازی دوژمن ئاگادرکرەوە کە ئەیانەوێت بەشەودا[4] بدەن بەسەر سوپاکەیدا، هەروەها ئاگاداریان کردەوە لەو مەنجەنیقە گەورەیەی کە خاچپەرستان هەزارو پێنج سەد دیناریان تێدا سەرف کردبوو و ئامادەکرابوو بۆ هێرش کردنە سەر عەککا[5]، ئەمە جگە لەئاگادارکردنەوەی سەلاحەدین سەبارەت بەشالاوی ئەلمانی، هەروەها پۆستە لەکاتی گەمارۆدانی عەککادا هەموو رێگایەکی گرتەبەر

---

[1] كتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبي يەوە، ل:١٧٥.

[2] الجيش الأيوبي، ل:١٧٥.

[3] الجيش الأيوبي، ل:١٧٥.

[4] الجيش الأيوبي، ل:١٧٦.

[5] الجيش الأيوبي، ل:١٧٦.

بۆ پەیوەندی کردن بەسەربازە گەمارۆدراوەکانەوە، بۆ زانینی بارودۆخی ناهەمواریان و ناردنی پارەی پێویست بۆیان، ئەوەبوو بەهۆی کۆتری نامەبەرو مەلەوانەکانەوە پەیوەندی پێوە دەکردن رەنگە بەناوبانگترین چیرۆکی پاڵەوانانەش لەپۆستەی ئەیوبیدا چیرۆکی عەوام —مەلەوان—عیسا بێت، ئەم پیاوە هەمیشە راهاتبوو لەسەر چوونە ناو عەککا، سەرباری ئەو گەمارۆیەی کە بەسەریدا سەپێنرا بوو، لەگەڵ خۆشیدا رێنماییەکانی سوڵتانی بەنامەیەکەوە لەگەڵ برێك پارەدا بەناو قەدی خۆیەوە دەبەست، کاتێ گەشتە عەککا کۆترێکیان هەڵدەدا هەتاوەکو سوڵتان ئاگاداربێتەوە لەگەیشتنیان بەسەلامەتی بۆ ئەو شارە، ئەوە بوو شەوێك دابەزیە ناو دەریاو سێ کیسی بەست بەخۆیەوە کە هەزار دینارو چەند نامەیەکی تیابوو بۆ سەربازەکان، بەڵام نەیتوانی بگاتو لەکەناری عەککادا خنکا[1]. ئەوانیش زانیان توشی شتێك بووە چونکە کۆترەکەی هەڵنەفڕاند، ئەوە بوو دوای چەند رۆژێك تەرمەکەیان دۆزیەوەو چەند پارچەیەك زێرو پاشماوەی نامەکانی پێوە بەسترابوو، ئیبن شەددادیش لەسەر ئەمە دەدوێیو ئەڵێ: کەسێك نەبینراوە سپاردەی لەژیانیو دوای مردنیشیدا وەك ئەم پیاوە گەیاندبێت.

٢- **یەزەك (تیمی هەواڵگری)**: وشەی یەزەك فارسییە واتە (پێشڕەوی سوپا) یەزەکیش: ئەو کۆمەڵە هەولگرەیە کە ئەنێردرێن بۆ بەرەی دوژمن پێش ئەوەی سوپا بەڕێ بکەوێت بۆی، ئەو کارەش کە جەنگاوەرانی یەزەك پێی هەڵدەستان بەشێك بوو لەرژێمی هەواڵگریو گەیاندنی زانیارییە سەربازییەکان بەسەرکردایەتی سوپا بەوپەڕی خێراییەوە، کەواتە ئەتوانین بڵێین: یەزەك بریتییە لەچالاکی رۆژانەی پۆستە کەکۆمەڵێ کەسی پسپۆڕو هەڵبژێردراو پێی هەڵدەستانو دەڕۆیشتن هەتاوەکو لەنزیکەوە ئاگادار بن لەوەی کە دوژمن پێی هەڵدەستا یان دەیویست ئەنجامی بدات، ئەندامانی یەزەکیش لەنێوان خەڵکانی خاوەن شارەزاییو فریاگوزاردا هەڵدەبژێردران بۆ هەستان بەم ئەرکە، ئەمانەش خۆیان لادەدا لەرووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا لەکاتی بەئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانیاندا، چونکە مەبەست لەکاری ئەوان بریتی بوو لە: زانینی هێزی دوژمنو دۆزینەوەی خاڵی لاواز تیایدا، هەر بۆیە ئەوان پۆشاکی پارێزەریان لەبەر نەدەکردو کەلوپەلی سەربازیشیان هەڵنەدەگرت هەتاوەکو جموجۆڵیان پەك نەخاتو ئەسپی هێمنو خێراو بەهێزیان هەڵدەبژارد کە بەئاسانی

[1] الجيش الأيوبي، ل:١٧٦.

سەرکەش نەدەبوو[1]. لەراستیشدا مێژوونوسە هاوچەرخەکان بەتایبەت ئیبن شەددادو عیمادی ئەسفەهانی باسی چەندین ئەرکیان کردووە کە یەزەك پێی هەستاوەو ناردنی هەواڵیش یەکێك بووە لەو کارانە[2]. بەڵگەش لەسەر گرنگیدانی سەلاحەدین بەیەزەك ئەوەیە کە چەند کەسایەتییەکی سەرکردەی دانا بۆ سەرپەرشتیکردنی وەك الملك العادلی برای سوڵتانو[3] الملك الأفضل کوڕیو گەورەو ئەمیرەکانی وەك بەدرەدین دڵدرم یاروقیو عیزەدینی کوڕی مقدم و عیزەدین جۆردیكو علم الدین سلیمانی کوڕی جندەرو چەندانی تر، ئەو ئەمیرانەش بەنۆرە سەرپەرشتی یەزەکیان دەکرد، لەو ئەرکانەش کە بەیەزەك سپێردرا بوو بەسەرکردنەوەو زانینی هەواڵی شارەکان بوو بەتایبەت بیت المقدس کاتێ خاچپەرستەکان دووبارە هەڕەشەی داگیرکردنیان دەکرد پاش ئازادکردنی لەساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧زدا، ئەوە بوو سەلاحەدین راستەوخۆ الملك العادلی بەسەرکردایەتی یەزەك نارد بۆ ئاگاداربوون لەتوانای بەرگری ئەو شارە، العادلیش بۆ ئەم مەبەستە لەرەمەزانی ٥٨٧ك/١١٩١زدا کەوتەڕێ[4]، هەروەها ئەمیر عیزەدەین جوردیكو جەمالەدین فەرەجو خەڵکێکی تری نارد هەتاوەکو بڕۆن لەنزیك یافاوە وەك هەواڵگر بۆ زانینی ژمارەی سوارەو پیادەڕەوەکان تیایداو ئاگادارکردنەوەی سەلاحەدین لێی[5]، ئەوانیش رۆشتن، ئەوەبوو رێککەوت یەزەكو هەواڵگرەکان بۆ سەیەکیان دانا، وەك لەرێگەی یافادا روویدا، ئەم ئەرکەش سپێردرا بە بەدرەدین دلدرم، ئەویش بەدەوری رێگەدا بۆسەیەکی بەچەند هەواڵگرێکی باش دانا، کاتێك کۆمەڵێك سوارەی دوژمن بەلایاندا تێپەڕی بەکاروانێکی هەڵگری ئازوقەوە رووبەڕووی بوونەوە[6] پاش رووبەڕووبوونەوەیەك لەنێوانیاندا، هەواڵگرەکان سەرکەوتنو دوژمنیش سی کەسی لێ کوژراو کۆمەڵێکیش بەدیلگیران[7]. بەم شێوەیە یەزەك چەند جارێك لەگەڵ خاچپەرستەکاندا رووبەڕووبوونەوە، لەیەکێك لەرووبەڕووبوونەوەکاندا زۆری نەمابوو پاشا ریتشارد شێردڵ دەستگیر بکەن دوای ئەوەی کە بریندایان کرد بەڵام سەربازێکی خاچپەرست

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:١٧٨.

[2] الكامل في التأريخ، لة: الجيش الأيوبييةوة، ل:١٧٨.

[3] النوادر، ل:١٩٢، الجيش الأيوبي، ل:١٧٨.

[4] الجيش الأيوبي، ل:١٧٩.

[5] كتاب الرضتين، له الجيش الأيوبييەوە، ل:١٧٩.

[6] الجيش الأيوبي، ل:١٧٩.

[7] النوادر، ل:٢١٢.

بووه رێگرو خۆی فیدا کرد بۆی ئەو موسوڵمانەی کە برینداری کردبوو، بەجلو بەرگی جوانیەوە خەریك کردو موسوڵمانەکەش بەوەوە خەریك بوو و بەدیلی گرتو پاشا توانی دەرباز ببێتو خۆی بشارێتەوە، لەم هەڵمەتەشدا کۆمەڵێك لەسوارەکانی کوژرانو ژمارەیەکی تریش بەدیل گیران، پاشان بەترسو لەرزەوە هەڵاتن[1]، هەروەها یەزەك هەستان لەپاراستنی سوپای ئەیوبی لەهێرشی کتوپڕی خاچپەرستەکان، وەك لە ئەنطاکییەدا روویدا[2]، ئەم هەموو ئەرکە جۆراوجۆرەی کە بەیەزەك سپێردرا بوو، بەڵگەیە لەسەر ئەو رۆڵو پێگە گرنگەی کە یەزەك لەناو سوپای ئەیوبیدا هەیبوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو رێکخستنە سەربازییە ئازاترینو کارامەترین سەربازانی سوپای ئەیوبی لەخۆگرتووەو قەبارەی یەزەکیش پەیوەست بوو بەو کارەوە کە ئەنجامی دەدا، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر سوارەی لەخۆدەگرت، کەهەندێ جار ژمارەیان دەگەشتە هەزار سوار، وەك ئەو یەزەکانەی کە سەلاحەدین لەعەککادا دایمەزراند بوون، کاتێ بڕیاریدا خۆیو سوپاکەی بچنە خروبەوە[3]، بەم شێوەیە ئەبینین کە یەزەك بەپێی گەشەکردنی ئەرکەکانی گەشەی کردووە لەگەرمەی ئەو رووبەڕووبوونەوە خوێناویە بەردەوامانەدا کە لەگەڵ داگیرکەراندا رووی دەداو، لەتیمێکی تایبەت بەکۆکردنەوەی هەواڵی دوژمنەوە واتە وەك بەشێك لەکاری پۆستەو سیخوڕی بووە رێکخستنێکی سەربازی چالاكو خاوەن ئامانج کەبەرگری لەبنکەکانی سوپاو شارە ئیسلامییەکان دەکاتو هێرشی کتوپڕ دەکاتە سەر سەبازگەکانی دوژمنو هەڵدەستێت بەدانانی بۆسە بۆیان[4].

٣- **کۆتری نامەبەر:** بەکار هێنانی کۆتری نامەبەر یان ئەوەی کە بەکۆتری هۆشیار ناسرا بوو لەبەر توانای سەرسوڕهێنەری بۆ گەڕانەوە بۆ هێلانەکەی وێڕای دورکەوتنەوەی زۆری لێی. یەکێك بوو لەهۆکارەکانی پەیوەندی پۆستەیی لەسەردەمی ئەیوبیدا[5].

القاضی الفاضلیش چەند وەسفێکی جوانی ئەم باڵندەی کردووەو ئەڵێ: (ئەم باڵندەیە فریشتەی پاشاکانە) ئامارەی بەدابەزینی دەکات بۆ سەر پاشا لەئاسمانەوە وەك دابەزینی فریشتە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) لەئاسمانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ئەمانەتەی کە تیایدایەو هەرگیز

[1] الفتح القسی، ل:٥٥٢.

[2] النوادر، ل:٩٣، الجیش الأیوبي، ل:١٧٩.

[3] الجیش الأیوبي، ل:١٨٠.

[4] الجیش الأیوبي، ل:١٨٠.

[5] الجیش الأیوبي، ل:١٨٠.

چاوەڕێت ناپاکی لێ ناکرێت[1]. ئەم جۆرە کۆترە سەرباری ئەوەی کەهێلانەی خۆی دەدۆزێتەوە، ناسراوە بەوەی کە زۆر خێرایە لەفڕیندا[2]، لەوانەیە بگیرایەو دەیان ساڵ دور بکەوتایەتەوە لەهێلانەکەی بەڵام هێشتا هۆشو یادکەوتنەوەو مەیلی بۆ زێدی وەك خۆی دەمایەوە هەتاوەکو هەلێکی بۆ بڕەخسێتو بفڕێتەوە بۆی[3]، هەر بۆیە نرخی ئەم کۆترانە زۆر بەرز بوو و گەشتە حەوت سەد دیناروهەندێ جاریش هەزار دینار، نرخی یەك هێلکەی[4] ئەم جۆرە کۆترە گرنگەش بەبیست دینار بوو[5]، کۆتری پۆستەش چەند وێستگەیەکی هەبوو کە هێلانەکانی تێدا بوو و خەڵکانێکی پاسەوانی بۆ تەرخان کرا بوو کە زۆر لێهاتوو و شارەزا بوون لەبایەخ پێدان‌و دانپێدان‌و پشوودانی‌و هەڵفڕاندن‌و پێشوازی لێ کردنیدا، بەڵام نەریتیان وابوو کاتێ کۆترەکە نامەکەی دەهێنا پاسەوانەکە لێی وەرنەدەگرت بەڵکو ئەیبرد هەتاوەکو سوڵتان یان خەلیفە بۆ خۆی لێی وەردەگرت، نەوەکو لەنامەکەدا نهێنییەك هەبێت کەوا پێویست بکات کەس پێی نەزانێت، تەنانەت ئەگەر کاتیش گونجاو نەبوایە وەك ئەوەی کە سوڵتان نانی بخواردایە یان خەوتبوایە ئەوە دەستی لەخواردن هەڵدەگرتو لەخەو هەڵیان دەستاند، هەتاوەکو کارێکی گرنگ لەکیس خۆیو ژێر دەستەکانی نەداتو بۆ ئەوەی خودی خۆی نامەکە هەڵبچڕێت[6]، یان دەبوایە سەرکردەی پاسەوانەکان ئەو ئەرکەی ئەنجام بدایە[7].

نورەدین مەحمودیش هەر لەگرتنە دەستی دەسەڵاتەوە لەحەلەبو شامدا وەك عیمادەدین زەنکی باوکی کۆتری بەکاردەهێنا، بەڵام ئەوەی کە لەساڵی ٥٦٧ك دا کردی، ئەوە بوو کە هەستا بەڕێکخستنی کاروبارەکانی کۆتر بەشێوەیەکی نوێو جەختی دەکردەوە لەسەر گرنگیو بایەخ پێدانی، کەواتە چۆنێتی چاودێریکردنی کۆترو ڕێکخستنی شوێنی نیشتنەوەی لەهەموو ناوچەکانی دەوڵەتی نورەدین‌و دەوڵەتی ئەیوبی میراتگریداو دیاریکردنی بورجی نیشتنەوەو ڕێو شوێنی نوسینی نامەو چۆنێتی لکاندنی نامەکە بەکۆترەکەوەو پێشوازی کردن لێیو کردنەوەو خوێندنەوەی نامەکە، هەموو ئەم کارانەش پێش سوڵتان سەلاحەدین هەبوون، ئەوەی کە

---

[1] کتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبي، ل:١٨٠.

[2] الجيش الأيوبي، ل:١٨١.

[3] دائرة المعارف (١٦٨/٧)، الجيش الأيوبي، ل:١٨١.

[4] صبح الأعشى (٣٩٠/١٤)

[5] صبح الأعشى (٣٩٠/١٤)

[6] حسن المحاضرة (١٦٦/٢)، الجيش الأيوبي، ل:١٨١.

[7] الجيش الأيوبي، ل:١٨١.

سەلاحەدین کردی تەنها بریتی بوو لەبەستنەوەی میسر بەشامەوە لەڕێی پۆستەی ئاسمانییەوە، هەتاوەکو تۆڕێکی نیشتنەوە (فرۆکەخانە) دروست بو لەمیسرو شامدا کە لەدورترین ناوچەی باشوری میسرەوە لەئەسوانەوە بۆ قاهیرەو سوەیس و بۆ بەلبیس و لەوێشەوە بۆ شام و هەروەها لەبەلبیسەوە بۆ صالحیەو قطیا[1]. لەقطیاشەوە بۆ واردە کە لەسەر ڕێگای غەززە دایە پاشان بۆ غەززە، واتە بلبیس کەئەکەوێتە ڕۆژهەلاتی قاهیرەوە ناوەندی نیشتنەوەکان بوو لەمیسردا، غەززەش بەهەمان شێوە بوو لەباشوری فەلەستیندا لەکەناری دەریا چونکە هێلێك لێیەوە دەستی پێدەکرد بۆ ئەلخەلیل و ئەللدو قاقون[2]، پاشان جنین و لەوێشەوە بۆ صفدو بیسان و ئێرید طفس و لەوێشەوە بۆ ضمین و[3] پاشان بۆ دیمەشق، لەهەر یەکێك لەم شارانەشەوە بۆ شارەکانی دەوروبەری، هەروەها لەبیسانەوە بۆ أذرعات و[4] و لەدیمەشقیشەوە کۆترەکە ئازاد دەکرا بۆ بەعلبەك و لەوێشەوە بۆ قارە[5]. لەقارەشەوە بۆ حمص و لەوێشەوە بۆ حەماە و پاشا مەعەررەو حەلەب و بیرە، بەم شێوە سەرجەم شارەکانی شامی دەگرتەوە[6]. بێگومان ئەم هەموو وێستگەیە ژمارەیەکی زۆر کۆتری لەخۆ گرتبوو، لەکاتێکی تریشدا ژمارەی ئەو کۆترانەی کە لەبورجی قاهیرەدا هەبوون بەدوو هەزار کۆتر مەزەندە دەکران[7]. پیشەی پەروەردەکردنی کۆتریش بوو بەپیشەیەکی بەسودو پڕ قازانج، لەبەر ئەو خواستە زۆرەی کە لەسەری بوو بەتایبەت لەکاتی گەمارۆدانی عەککا لەلایەن خاچپەرستەکانەوە، عیمادەدینی کاتب ئەلێ: وامان لێهاتبوو بەبالای خاوەن کۆتردا هەلبدەین و ستایشی بکەین و داوای زۆرتری لێ بکەین و بەشەوو بەرۆژدا داوای لێ بکەین هەتاوەکو بەهۆی زۆری نێردراوەکانەوە کۆتر لەلایان کەم بویەوە[8]، سوپای ئەیوبیش سودی لەدەزگای پۆستەی نورەدین وەرگرت و سەلاحەدین و یاریدەدەرەکانیشی لەکاتی تەنگانەدا بەکاریان دەهێنا، ئەوە بوو کۆتری پۆستەبەر مزگێنی ڕزگاربوونی سولتانی لەجەنگی ڕەملەدا لەفەلەستینەوە گەیاندە میسر، عیماد ئەلێت: بەم بالندەدا مزگێنیمان ناردو بەهۆی نامەکانی ئەم

---

[1] قطایا: گوندێکە لەسەر ڕێگەی میسر لەناوەڕاستی الرمل لەنزیك ئەلفەرما.

[2] قاقون: قەلایەکە لەنزیك ڕەملە لەفەلەستیندا لەدوری نیو ڕۆژەوە لەقیساریە.

[3] الضمین: گوندێکی سەر بەدیمەشقە لەسەرەتای حۆراندایە.

[4] أزرعات: شارۆچکەیەکە لەدەوروبەری شامدا لەتەنیشت عەمماندا.

[5] قارە: گوندێکی گەورەیە لەسەر ڕێگەو یەکەم گوندی حمصە.

[6] صبح الأعشی (٤٩٣/١٤)

[7] الأریخ المدن الاسلامیة (٢٣٣/١)، الحیاة العسکریة، ل:٢١٧.

[8] الفتح القسی، ل:٣٦٠.

باڵندەوە کۆتاییمان بەپڕوپاگەندەی دوژمنان هێناو ترسمان گۆڕی بەدڵنیاییو ئارامی[1]. هەروەها سوپای ئەیوبی کۆتری ئەو شوێنانەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کەدەیویست پەیوەندییان پێوە بکات، یان کاتێ دەیویست داوای یارمەتییان لێ بکات، وەك ئەوەی لەساڵی ٥٧٤ك/١١٧٨ز دا کاتێ کە خاچپەرستەکان کۆبوونەوەو بەرەو دیمەشق بەرێکەوتن لەگەڵ پاشاکەیانداو هێرشیان کردە سەر گوندەکانی دەوروبەریو کوشتارو تاڵانی ئەنجامداو خەڵکانێکیشیان بەدیل گرت، سەلاحەدینیش عیزەدین فەرەخشای برازای نارد بەکۆمەڵێ سەربازەوە بۆیانو فەرمانی پێکرد کە هەر کە لێیان نزیك بوویەوە بەباڵندەیەکدا هەواڵی بۆ بنێرێت، فرخ شاش بەسوپاکەیەوە شوێنیان کەوت ئەوەش کە بەهێزی ڕێکخستنی پۆستە دەگەیەنێ لەم سەردەمەدا، هاتنو پەیوەندی بەردەوامی کۆترەکان بەسەلاحەدینەوە بوو لەکاتی مانەوەی درێژخایەنیدا لەبەرەکانی جەنگدا لەعەککا. لەو ڕووداوانەش کە ئیبن شەدداد ئەیگێڕێتەوە لەرەمەزانی ساڵی ٥٨٧ك/ ١١٩٠ز دا سەلاحەدین کۆترێکی نارد لەحەلەبەوە بۆ حەماو لەحەماشەوە بۆ عەککا کە لەژێر باڵیدا نامەیەك هەبوو کە تیایدا جێگرەکانی الملك الظاهری فەرمانڕەوای حەلەب رایان دەگەیاند کە هێزەکانی دوژمن لەسەربازانی میرنشینی خاچپەرستی ئەنطاکیە لەحەلەبدا هەستاون بەهێرشکردنە سەر چەند گوندێکی سەر بەحەلەبو سودیان لەلاوازی هێزەکانیان وەرگرتبوو بەبۆنەی چوونی سەربازەکانیانەوە بەسەرکردایەتی الملك الظاهر بۆ عەککا، بەڵام ئەو هێزانەی کە لەحەلەبدا مابوونەوە توانیان بۆسەیان بۆ دابنێنو تێکیان بشکێنن، بەجۆرێك کە بەخۆیان نەزانی هەتاوەکو شمشێریان نایە گەردنیانو حەفتاو پێنج کەسیان لێ کوشتنو خەڵکێکی زۆریان لێ بەدیل گرتن[2]، هەروەها موسوڵمانەکان چەندین شێوازیان داهێنابوو بۆ پاراستنی نهێنییەکانیان، هەتاوەکو دوژمن پەی پێ نەبات، بەتایبەت لەکاتی گەمارۆدانی عەککادا، تەنانەت رەمزو هێمای تایبەتیان بەکاردەهێنا کە بەشفرە ناسرابوو باسی چەند شتێك بوو کە پێشتر لەسەری ڕێککەوتبوون، ئەوەتا عمار باس ئەکات کەپیاوانی پۆستە باڵندەو کتێبیان هەڵدەگرتو بەباڵندەو کتێبیشەوە دەگەڕانەوەو نامەیان بۆ دەناردینو نامەمان بۆ دەناردنو بەکۆتردا بەشێوەی شفرە کەپێشتر لەسەر ماناکەی ڕێککەوتبووین.

٤- **کەمینو بۆسەکان:** چالاکترین ماوە کەبۆسەی تێدا دانرابێت لەمێژووی ئیسلامیدا بریتییە لەسەردەمی جەنگە خاچپەرستەکان بەتایبەت لەسەردەمی سەلاحەدیندا بەهۆی نزیکی شوێنو پێگەکانیان لەیەکەوەو بەردەوامبوونی لەنێوان هێزەکانی ئیسلامو ئەو سەنگەرو

---

[1] سنا برق الشامي (١/٢٦٠).

[2] الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين ل١٨٧

سەربازە خاچپەرستانەی کە لەکەناری دەریا لەوڵاتی شامدا بنیاتنرا بوون، بۆسەش واتە ناردنی سریەیەك سەربازی سوارە بەئاراستەی دوژمن‌و لێدانی کتوپڕو دەست لێوەشاندنی بەشێوەیەك کەنەگاتە رادەی جەنگی فراوان، واتە ئەم کردەیە بەنهێنی دەستی پێکرد، بۆیە پێویست بوو کۆمەڵێك تایبەتمەندی لەو کەسانەدا هەبێت کەهەڵدەبژێردرێن هەتاوەکو بتوانن وەك پێویست بەو ئەرکە هەستن[1]، وادیارە سەلاحەدینیش دوای ساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩ز پێی وابوو کەباشتر وایە شێوازی بۆسە بگرنە بەرو، دەست وەشاندنی خێراو پاشەکشە پەیڕەو بکەن کەدواتر بەشەڕی پارتیزانی ناسرا، هەتاوەکو بواری پشودان بەدوژمن نەدرێت‌و هێزەکانی لەدەوروبەری عەککادا کۆنەکاتەوە، بەم پێیەش دەبوایە سوپای ئەیوبی لەلایەکەوە بەرگری لەعەککا بکات‌و لەلایەکی تریشەوە گەمارۆ بەسەر خاچپەرستەکاندا بسەپێنێت کەعەککایان ئابڵۆقە دابوو و لێرەو لەوێش بۆسە بنێتەوە بۆ تەنگاوکردنی سوپای خاچپەرستەکان[2].

دیارە ئەو بارودۆخەی کەسوپای ئەیوبی لەو کاتەدا پیادا تێپەڕدەبوو لەگەڵ شیاوی زەوی شام (بەتایبەت زەوی فەلەستین) لەبەر بوونی دارودرەختی چڕو پڕ چیا تیایدا کە بۆسەدانەرەکان پەنایان بۆ دەبرد، ئەنجامدانی ئەم جۆرە کردە سەربازیە سنوردارەی بەسەردا سەپاندبوون، کەمەبەست پێی تەنگ پێهەڵچنینی دوژمن‌و تێکدانی پشووی بوو، ئەم شێوازەش لەو جۆرە جەنگە دەچێت کە بەجەنگی مەغاویر ناسراوە[3].

**نۆیەم: بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی جەنگ‌و ئاشتی‌و دیلەکان:**

١- **ئەنجوومەنی جەنگی سوپای سەلاحەدین:** سروشتی بوو کە سەلاحەدین چەند یاریدەدەرێکی هەبێت کەهاوکاری بن بۆئاراستە کردنی سیاسەتی جەنگ‌و دانانی پلانە سەربازییەکان‌و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات، ئەو کەسانەش ئەنجومەنێکیان پێکدەهێنا کە لەدەزگای (ئەرکانی سوپای) ئێستا دەرچوو، کە لەسەلاحەدین سەرکردایەتی دەکردو براکانی ئەندامی بوون بەتایبەت الملك العادل‌و کوڕە گەورەکانی بەتایبەت الملك الأفضل علی والملك الظاهر غازی‌و برازاکانی وەك تقی الدین عومەرو شەهابەدین محمود حارمی خاڵۆزای‌و ئەمیرە گەورەکان‌و فەرماندە خاوەن پیشەو نوێکان‌و القاضی الفاضل‌ی راوێژکاری داناو قاضی سەربازی بەهائەدین کوڕی شەدادی مێژوو نووس‌و بەهائەدین قراقوش‌و سەیفەدینی کوڕی

---

[1] الجیش الأیوبی فی عهد صلاح الدین، ل: ١٨٩.

[2] الجیش الأیوبی فی عهد صلاح الدین، ل: ١٩١.

[3] الجیش الأیوبی، ل: ١٩٣.

مەشطوبی هەکاریو چەندین فەرماندەی تر وەك أبو الهجاء ی هذیانیو علم الدین سلەیمانی کوڕی جندرو ئەمیری کەشتیگەلی میسر حسام الدین لؤلؤ و فەرمانڕەوا بەناوبانگەکانی شارو قەڵاکانی وەك مظفرالدین کەوکەبەریو شەمس الدین کوڕە المقدمو عیزەدین جۆردیكو زانا ضیاءالدین عیسای هەکاری،هەریەك لەوانەش مافی دەربڕینی خۆی بەئەوپەڕی ئازادیو راشکاوییەوە هەبوو، چونکە مەبەستی سەرەکیان خزمەتی دەوڵەتی سەڵاحەدینو سوپاکەی بوو[1]، ئەم ئەنجومەنەش هەرکاتێ سەڵاحەدین بەپێویستی بزانیایە کۆدەبویەوە[2]، لەم کتێبەشدا تێبینی ئەوە دەکەین کەسەڵاحەدین راوێژی بەهاوەڵانی کردوە لەهەموو بۆنەو روداوە ترسناکەکانداو راکانی جێبەجێکردوون هەندێ جار بەدڵوهەندێ جاریش بەنا بەدڵی، ئەمەش لەپێناو پاراستی بەرژەوەندی موسڵمانانو بوژاندنەو وەك رێزگرتنو بەهەندوەرگرتنی راو بیربۆچونەکانیان[3].

٢- **ئەخشەوشێوازەکانی جەنگ:** ئامانجی سەرەکی سوپای ئەیوبی لەجەنگدا بریتی بوو لەدەرپەڕاندنی ئەو داگیرکەرە خاچپەرستانەی لەکەناری شامدا جێگیربوو بوون، کە لەباکورەوە لەئەنطاکیەوە بەرەو عەسقەلان لەباشورەوە درێژبوویەوە، هەروەها لەهەندێ بەشی ناوخۆی وەك بەیتولمەقدیسو کەرك رەهاو طبریەو ...تد[4]، ئامانجی ستراتیژی لەجەنگکردنی ئەیوبییەکان بریتی بوو لەگێڕانەوەی ئەو زەوییانەی کەخاچپەرستەکان داگیریان کردبوو لەکۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچیو یازدەیەمی زاینیدا، لەپێناو گەیشتن بەم ئامانجەش سوپای ئیسلامی هەموو رێگەو شێوازێکی گرتەبەر چ لەرێگەی رووبەڕوو بوونەوەی راستەوخۆوە لەگەڵ دوژمندا، یان لەرێی لاوازکردنی لەرووی ئابووریو مەعنەوییەوەو گەمارۆدانی ناوچە سەرەکییەکاندا بەتایبەت لەسەردەمی سەڵاحەدیندا، هەموو تەکتیکێکیان گرتەبەر بۆ لێدانی خاچپەرستەکان[5]، هەروەها پلانە سەربازییەکان لەسەردەمی ئەیوبیدا تەنها لەلایەن سەڵاحەدینەوە دادەڕێژران، بەڵکو ئەنجومەنی راوێژکاریش هاوکاری دەکرد، هەرچەندە سەرکردایەتی سەربازی سوپا بەدەست سەڵاحەدینەوە بوو، جاریش سەرکەوتن مسۆگەر بوو ئەگەر سەرکردە پەیوەندی بەردەوامی

---

[1] الجیش الأیوبی، ل: ١٩٧.

[2] الجیش الأیوبی، ل: ٢٠٣.

[3] الجیش الأیوبی، ل: ٢٠٥.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٦.

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٦.

ماوەیەکی دیاریکراو شەڕی دەکرد، پاشان پشوویان دەداو بەشی دووەم بەشەڕ دەهات‌و بەم شێوەیە، مەبەستیشی لەپەیڕەوکردنی ئەم شێوازەدا، ماندووکردنی خاچپەرستەکان‌و بوارنەدان بەپشوودانیان بوو، بەڵام ئەم شێوازەش لەبەرامبەر! تۆکمەیی شوراکانی صوردا بێ ئاگا بوو، ئەمە سەرباری باری تۆبۆگرافی شارەکە[1].

ه- **پلانی ناکۆکی خستنە ریزەکانی خاچپەرستان:** سەلاحەدین پلانی جیاوازی نانەوەی لە نێوان ریزەکانی خاچپەرستاندا پەیڕەوکردو هەوڵی دەدا هەندێ لەسەرکردەکانیان رابکێشێت بەلای خۆیدا، لەهەوڵێکدا بۆلاوازکردنیان، ئیبن شەداد باس دەکات کەسوڵتان جارێکیان لەمانگی شەوالی ٥٧٨ك/ ١١٩١زدا دانیشت‌و داوای فەرمانڕوایی صەیدای کردو ئەویش دوای گەیشتنی نامەیەك پێی لەگەڵ کۆمەڵێکدا هات‌و نوێژیان لەگەڵدا کرد، مێژوونوسی ناوبراویش ئامادەبوو، سوڵتانیش رێزی نا لەمیوانە خاچپەرستەکانی‌و گفتوگۆی لەگەڵداکردن‌و لەسەرخوانی خۆی میوانداری کردن، کاتێ خواردن لابراو سوڵتان بەتەنیا لەگەڵیاندا مایەوەو لەگەڵ مەرکیز مونتفراتی فەرمانڕەوای صوردا رێکەوت، کۆمەڵێك لەفرەنجەکانیش هاتنە پاڵی کەفەرمانڕەوای صەیدایان تێدابوو، مەرجیسەلاحەدینیش ئەوەبوو بۆ مەرکیز کەدوژمنایەتی خۆی بۆ فرەنجەکان ئاشکرا بکات، کەپێشتر لێیان جیابووبوویەوە، هۆی ئەمەش ترسی زۆری بوو لێیان لەگەڵ بوونی کێشە لەگەڵیاندا بەهۆی هاوسەرگیریەوە، سوڵتانیش رەزامەندی نیشاندا لەسەر مەرجەکانی ئەو بەمەبەستی تێکدانی نێوانیان، وەك ئیبن شەداد دەڵێت[2].

و- **پتەوکردنیپەیوەندی ئابوری‌و بازرگانی لەگەڵ شارەکانی ئیتاڵیادا:** لەو رێوشوێنە ژیرانەی کەسەلاحەدین گرتیە بەر بۆ لاوازکردنی دوژمن لەرووی ئابوریەوە، هەستانی بوو بەپتەوکردنی پەیوەندی بازرگانی ئابووری لەگەڵ دەوڵەتە بچوکەکانی شارەکانی ئیتاڵیادا، وەك (بیزاو جەنەواو بوندوقیە)، ئەوەبوو لەو کاتەوە کەدەسەڵاتی میسری گرتەدەست هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ بۆ هێنانی بازرگانی ئەو شارانە بۆ میسرو، چەند رێکەوتنێکی لەگەڵ ئەم دەوڵەتە بچوکانەدا سازدا بەمەبەستی ئاڵوگۆڕکردنی باڵیۆز لەنێوانیاندا، ئەم رێکەوتننامانەش لەدوو روەوە بەسود بوون:

---

[1] الجيش الأيوبي، ل: ٢١٠.

[2] الجيش الأيوبي، ل: ٢١١، الفتح القيسي، ل: ٥٦٠.

١- زیادکردنی داهاتەکانی دەوڵەتەکەی بەهۆی چالاکی بازرگانییەوە، لەپێناو دەستگەشتنی بەپێویستییەکانی لەئاسنو تەختەو شەمع.

٢- لاوازکردنی بازرگانی خاچپەرستەکان: ئەگەر زانیمان کەسەلاحەدین هەژمونی بەسەر دەریای سوردا هەبووە، گومانیش لەوەدانییە کەبازرگانی بووە هۆی سەر لەنوێ گرنگیدانەوەی بەبنیاتنانەوەی کەشتیگەلی ئەیوبی ئیسلامی[1]، ئەوەتا لەوتارێکدا کەسەلاحەدین ئاراستەی خەلیفەی عەباسی کردووە لەساڵی ٥٧١ك/ ١١٧٥زدا هاتووە: لەو هێزانەش بوندوقییو بەیشەنیو جەنەواییەکان هەموو ئەمانە ماوەیەك دەبن بەدوژمنو سەرسەختانە دەجەنگێن، ماوەیەکیش دەبنە باڵیۆزو پشت بەئیسلام دەبەستن لەسامان کۆکردنەوەدا، ئێستاش هەموو ئامێرێکی چەكو کوشتار دەهێننە وڵاتی ئێمەوەو لەئێمە نزیك دەبنەوە بەکارەچاکەکانیان، منیش بڕیارم داوە لەگەڵیاندا بەردەوام بمو ئاشتیو دۆستایەتیان بەرمە سەر زیاتر لەوەی کەحەزی پێدەکەن[2]. ئەم پەیوەندیانە نێوان میسرو شارە ئیتالیەکانیش شتێکی نوێ نەبووە، بەڵکو درێژەپێدانی ئەو حاڵەتە بوو کە لەسەردەمی فاتمییەکاندا هەبوو[3]، بەڵام سەلاحەدین توانی بیپارێزێتو گەشەی پێبدات.

ز- **وێرانکردنی شارەکان:** لەباسی سەربازییەکانی سەلاحەدیندا هەمیشە باسی ئەوە دەکرێت کە لەساڵەکانی کۆتای ململانێتی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا کەرِیتشارد شێردڵ سەرکردایەتی دەکردن، دەستی داوەتە تێکدانی شاری عەسقەلان کەکلیلی باشوری بەتولمەقدیسو رێگەی ئەو کاروانان بوو کەبەرەو میسر دەڕۆشتن، موسڵمانەکانیش بەهۆی خۆشی ئەم شارەوە نازناوی بوکی شامیان لێنابوو[4]، سوڵتانیش کاتێ پەنای بۆئەم کارە برد کەسوپاکەی نەیتوانی بەرگری لێبکات[5] و لەوە دەترسا کەخاچپەرستەکان دەستی بەسەردابگرن، لەحاڵەتی ئاوەدانیدا وەك لەعەککادا رویدا بەم شێوەیەش رێگەی میسری لێببڕن[6]. دیارە سەلاحەدین پێی باش بوو هێزی بەرگری سوپاکەی هەلگرێت بۆ پاراستنی بەیتولمەقدیس، ئەوەبوو راوێژی بی الملك العادلی برایو گەورە ئەمیرەکانی کرد لەم بارەیەوە ئەوانیش

---

[1] الجیش الأیوبی، ل: ٢١١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٢.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٢.

[4] الفتح القیسی، ل: ٥٥٠، الجیش الأیوبی، ل: ٢١٢.

[5] الجیش الأیوبی، ل: ٢١٢.

[6] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٣.

راکەیان لاپەسەند بوو، علم الدین سلێمانی کوڕی جندریش کەیەکێك بوو لەگەورە راوێژکارەکان دەڵێت: ئەوەیافایاو دوژمن هاتۆتە ناویەوە، کە شارێکە دەکەوێتە نێوان عەسقەلان و قودسەوەو ئێمەش ناتوانین هەردوو شارەکە پێکەوە بپارێزین، جا لەشوراو شوێنە بەرزەکانیەو دەست پێبکەن بەم شێوەیە بڕیاری تێکدانی عەسقەلان درا[1]، لەراستیشدا ئەم شارە تاکە شارێك نەبوو کەرووبەڕووی ئەم چارەنوسە بویەوە، بەڵکو قەڵای رەملەش بەهەمان شێوە روخێنراو[2] قەڵای نظرونیش کەموڵکی داوییەکان بوو[3] هەمان چارەنووسی هەبوو[4]. ئەمە سەرباری بەشێك لەشورای یافاو غەززەو ئەللدو داروم کەدەکەونە بەشی هەرە باشوری کەناری شام هەمان شتیش بەسەر شورای سرمینیەی داهات، ئەوە بوو دوای ئەوەی کە الملك الظاهر غازی ئازادی کرد لەجەمادی کۆتایی ساڵی ٥٨٤ك/ ١١٨٨زدا خەڵکەکەی هێنایە دەرەوەو لەگەڵ زەویدا یەکسانی کردو رووخاندیو ئاسەواری نەهێشت[5]، هەروەها قەڵای یازوری تێکدا لەکەنارەکانی رەملەدا لەدەوروبەری فەلەستینو شارۆچکەی"بیت جبرین" یشی لەگەڵدا رووخاند پێش ئەوەی لەگەڵ ریتشارددا سوڵح بکات[6].

ح- **مسۆگەرکرنی هاتوچۆی رێگەی نێوان میسرو شام:** هەروەها یەکێك لەپلانە ستراتیژییەکانی سەلاحەدین بریتی بوو لەمسۆگەر کردنی هاتووچۆ لەسەر رێگای نێوان میسرو شام کەدووری نێوانیان نزیکەی سی رۆژ بوو[7]، هەروەها سەلاحەدین قەڵاو خانووبەرەی بنیاتناو پاسەوانی بەدرێژای رێگای نێوان میسرو شام داناو توانی ئاسایشو هێمنی بگێڕێتەوە بۆ سینا، سەلاحەدینو سەرکردەکانیشی واراهاتبوون کەرێگەی نێوان میسرو شام بگرنە بەر لەهاتوچۆیاندا[8].

ط- **پتەوکردنی شارو سەنگەرەکان:** هەروەها گرنگی دەدات بەتۆکمەکردنی هەردوو شاری میسرو قاهیرەو سەنگەرەکانی ئەو وڵاتەو دەروازەکانی کەگرنگترینیان لەسەردەمی

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٣.

[2] وفيات الأعيان(٧/١٧٥).

[3] الفتح القيسي، ل: ٢٤٧، الجيش الأيوبي، ل: ٢٢١.

[4] الجيش الأيوبي، ل: ٢٢١. الجيش الأيوبي، ل: ٢٢١.

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٤.

[6] الجيش الأيوبي، ل: ٢٢٢.

[7] كتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبي، ل: ٢٢١.

[8] الجيش الأيوبي، ل: ٢١٤.

سەلاحەدیندا بریتی بوو لە: ئەسکەندەریەو دمیاطو رەشیدو عیذابو تیس، هەروەها سەلاحەدینیش لەرادەی ئەو مەترسیە گەیشت کەرووبەڕوی میسر دەبێتەوە لەباکورەوە لەلایەن خاچپەرستەکانەوە. ئەو رووداوەش کە لەدمیاطدا روویدا کاتێ عەموری لەوشکانیو دەریاوە گەمارۆیدا لەسالی ٥٦٥/١١٦٩زدا وایکرد سەلاحەدین کەگرنگیەکی زۆر بدات بەئەم بەرەیەی جەنگو زۆر سور بوو لەسەر تۆکمەکردنی، هەروەها گرنگیشی دەدا بەتۆکمەکردنی کەنارەکانی دەریای سور، گرنگترین ئەو قایمکاریانەش کە لەناو میسردا پێی هەستا لەشاری قاهیرەدا بوو، ئەوە بوو دەستی کرد بەبنیاتنانی شورای قاهیرە، چونکە زۆربەی رووخابوو و وەك رێگەیەکی تەختی لێهاتبوو کە کەسی نەدەگێڕایەوە، ئەمەو فەرامۆشی خزمەتگوزاری کرد بەوالی تیایدا[1].

٣- **وەرزی جەنگ:** ئامادەکارییەکان بۆ جەنگ بەکۆتایی هاتنی وەرزی زستانو بەرزبوونەوەی پلەی گەرماو هاتنی بەهار دەستی پێ دەکرد، ئەو جەنگانەش کە لەزستاندا روویدەدا تەنها چەند پێکدادانێکی کەمو سنوردار بوو و دانانی بۆ سەو ناردنی تیمی هەوالگری بوو بۆزانینی بارودۆخی دوژمن، ئەگەر سەیری کاتی شەڕەکانیش بکەین دەبینین کەدەکەوتە هەشت تا نۆ مانگی پاش سەرماو بەهاتنی زستان کۆتای پێ دەهات[2]، ئەگەر چاودێری جموجۆلی رۆژانەی سەلاحەدین بکەین کەعیمادی کاتبو ئیبن شەددادو مێژوونوسە هاوچەرخو داهاتووەکان یاداشتیان کردووە، دەبینین کوشتارو گەشتی سوپای دەوروبەر بۆ بەرەی جەنگ لەوەرزی زستاندا رادەوەستا، بەلام هەر کەئەم وەرزە ساردو خلیسکە کۆتایی دەهات بەتایبەت لەولاتی شامدا چالاکی دەگەڕایەوە بۆسوپاو سەر لەنوێ خۆیان ئامادە دەکرد بۆ رووبەڕووبوونەوە دەگەشتنە گۆڕەپانی جەنگ[3] دوای ئەوەی کەوەرزی جەنگیش کۆتای دەهات سەربازەکان دەگەڕانەوە بۆ ولاتەکانیان عیماد دەلێت:دوای ئەوەی کەپایز پشتی هەلکردو زستانی سەخت هێرشی هێناو سەرچیاکان بە بەفر سپی بوون قوڕو چلپاو پەیدا بوو ئەمیرەکان داوایان کرد لەسەلاحەدین کەمۆلەتیان بدات بۆ گەڕانەوە بۆ ولاتەکانیان بۆ پشوودانو حەوانەوە پاشان فەرمانڕەوای شەنگارو دواتریش فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبن عومەرو دوای ئەویش کوڕی فەرمانڕەوای موسڵ گەڕانەوە بۆ ناوچەکانیان[4] ئیبن شەداد لەم

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٦.

[2] الجيش الأيوبي، ل: ٢١٨.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٩.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٠، مفرج الكروب (٢/٢٤٦)

بارەیەوە لەژێر ناونیشانی: گەڕانەوەی سەربازەکان لەتێکۆشان: کاتێ زستان هێرشی هێناو دەریا کەوتە شەپۆلدان دوژمن دڵنیا دەبوو لەوەی کەهێرشی بۆ ناکرێت گەمارۆی لەسەر لادەبرێت لەبەر زۆری وچڕو پڕی باران سوڵتانیش ڕێی دەدا بەسەربازە موسڵمانەکان کەبگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان هەتاکو پشوویەك بدەنو خزمەتی ئەسپەکانیان بکەنو هەتاوەکو کاتی کارکردن[1] چەند جارێکیش هاتنی سوپا بۆبەدەمەوە هاتنی سوپای ناوەندی سەلاحەدین دووبارەبوویەوە پاش کۆتای هاتنی وەرزی زستان پاشان دەگەڕایەنەوە بۆ وڵاتەکانیان بەهاتنی ئەم وەرزە[2]. لەناو ڕۆژەکانی جەنگیشدا سەلاحەدین هیوای بەڕۆژی هەینی هەبوو لەبەر پیرۆزیو گەورەیی ئەم ڕۆژە لای موسڵمانان، ئەمەش مانای ئەوە نییە کەسەلاحەدین لەڕۆژەکانی تردا دەستەبەری جەنگو ڕووبەڕووبوونەوە بووە، چاوەڕێی ڕۆژی هەینی کردووە، بەڵام هەمیشە گەشبین بووە بەدەرەنجامی جەنگەکە ئەگەر لە ڕۆژی هەینیدا بووایە، ئەوەبوو لەجەنگی حطیندا سەربازەکانی لەڕۆژی هەیندا بەرێدەکرد لەمانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٨٣داو بۆ بەرەکەت وەرگرتن لەنزای وتاربێژان لەسەر مینبەر، کەئەگەری گیرابوونی زیاترە[3]، هەروەها سوپای سەلاحەدین لەڕۆژی هەینیدا چووە عەککاوە[4]، ئازادکردنی قەڵاکانی کەناری باکوری وڵاتی شامیش لەهەمان کاتدا بوو، کەکەوتبوونە دەوروبەری میرنشینی خاچپەرستی ئەنطاکیە، هەموو ئەمانە لەڕۆژی هەینیدا روویدا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گیرابوونی نزای وتاربێژە موسڵمانەکانو سوڵتانیش دڵخۆش دبوو، چونکە خۆشحاڵ بوو بەوەی کەفتوحاتەکانی لەو ڕۆژەدا بوو کەپاداشت تیایدا چەند قاتە[5]، بەڵکو ئەنجومەنی جەنگی سەلاحەدین واپلانی دادەڕشت کەجەنگو رووبەڕوونەکان بکەوێتە ڕۆژی هەینیەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەئەم ڕۆژە کاریگەری هەبووە لەسەر دەرونی جەنگاوەرەکانو قارەمانانە رووبەڕووی دوژمن دەبوونەوە[6]، ئێمەش پێمان وایە سەرکەوتنو شکست پەیوەندی بەڕۆژێکی دیاریکراوەوە نییەو کاریگەری ڕۆژی هەینیش لەسەر سوپای

[1] کتاب الروضتین، لە: الجیش الأیوبی، ل: ٢٢٠.
[2] الجیش الأیوبی، ل: ٢٢١.
[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢١.
[4] وفیات الأعیان(١٧٥/٧)
[5] الفتح القیسی، ل: ٢٤٧، الجیش الأیوبی، ل: ٢٢١.
[6] الجیش الأیوبی، ل: ٢٢١.

سەلاحەدین کاریگەریەکی دەروونی بوو، سەرکەوتنەکانیش لەرۆژەکانی تریشدا روویدەداو تەنها لەم رۆژەدا قۆرخ نەبوو بوو چەند شکستێکیش لەم رۆژەدا بەسەر سوپاکەیدا هاتبوو[1].

٤- **مامەڵە کردن لەگەڵ دیلەکاندا:** سەلاحەدین حەزی لەخوێن رشتن‌و تۆڵە سەندنەوە لەدیلە خاچپەرستەکان نەبوو هەرچەندە ئەوان بۆ داگیرکردنی وڵاتی موسڵمانان هاتبون، لەمن بارەیەشەوە لێیەوە دەگێڕنەوە کەرێگری لەوە کردووە کوڕەکانی دیلی خاچپەرستەکان بکوژن، هەتاوەکو ئارەزووی خوێن رشتن تیایاندا گەشە نەکات، چونکە رەنگە ئەگەر کوشتنی دیلیان بکردایە بەنەریت، لەتەمەنێکی کەمدا، ئەوا لەسەر ئەو کارە رادێن بەبێ جیاوازی لەنێوان موسڵمان‌و کافردا[2]، بەڵکو سەلاحەدین الملك الظاهری کوڕی لەتەمەنی بیست ساڵیدا ئاگادارکردەوە لەمەترسی خوێن ڕشتن‌و ئەمەشی لەدوا وەسیەتیدا بۆ نووسی لەنەخۆشی سەرەمەرگیدا[3].

بەشێوەیەکی گشتیش دەبینین مامەڵەیان جیاوازبووەو هەندێ جار کاری زۆرە ملێیان پێکراوەو جار جاریش لەدیمەشقدا بەندکراون، یاخود دەخرانە روو بۆ فرۆشتن یان دەکوژران، رەنگە راستیش بێت ئەگەر بڵێین: سەلاحەدین جیاواز نەبووە لەسەرکردەکانی پێش خۆی وەك نورەدین مەحمود لەمامەڵەکردنیدا ەگەڵ دیلەکاندا، کە لەشێوازی حوکمڕانیدا پەیڕەوەی لێدەکردو ئەویش لەهەندێ بۆنەدا دیلەکانی دەکوشت وەك لەساڵی ١١٥٢/٥٥٢ز کاتێك دیلەکانیان بۆ هێناو، فەرمانیدا بەدان لەگەردنیان، زور جاریش نورەدین مەحمود زیندانی دەکردن، بەتایبەت سەرکردە گەورەکان وەك وئەرناط "رینۆدی شایتون"ی فەرمانڕەوای ئەنطاکیەو پاشای کرك کەپازدە ساڵ زیندانی کرد، پاشان ئەمیر کمشتکینی کەیەکێك بوو لەئەمیرەکانی نورەدین ئازای کرد وەك تۆڵەسەندنەوەیەك لەسەلاحەدین، مەبەستیش لەهێشتنەوەی دیلەکان بەزیندویەتی(بەتایبەت ئەمەریکیەکان) بریتی بوو لەسود وەرگرتن لێیان لەکرداری ئاڵوگۆڕ پێکردنیاندا لەگەڵ دیلە موسڵمانەکاندا، چ بەئاڵوگۆڕکردن بێت یان بەفیدیەدان، بەتایبەت دیلە مەغریبیەکان، چونکە غەریب بوون لەشامداو، کەس‌و ناسراویان نەبووتیایدا، ئیبن جبیریاسی ئەوە دەکات کەفەزڵی خوای گەورە بۆ دیلە سەغریبیەکان لەشامدا لەوەدابوو کەدەستەلاتدارو دەوڵەمەندەکان برێك پارەیان تایبەت دەکرد بۆ ئازادکردنی دیلەکانی مەغریب[4]، سەلاحەدینیش سووربوو لەسەر شوێن پێهەڵگرتنی نورەدین، تەنانەت هەستا بە ئازادکردنی دیلە هەزارەکانی خاچپەرستان بەبێ بەرامبەر، وەك

---

[1] الجيش الأيوبي، ل: ٢٢٢.

[2] كتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبي، ل: ٢٢٤

[3] النوادر، ل:٢٣٨، الجيش الأيوبي، ل:٢٢٤.

[4] رحلة ابن جبير، ل: ٢٣٨، الجيش الأيوبي، ل:٢٢٥.

لەئازادکردنی بەیتولمەقدیسدا روویدا، ئەمە سەرباری هەستانی بەئازادکردنی دیلەموسڵمانەکان، دیارە ئەمەشی لەسەر پێویست بوو وەك بەرپرس لەژیانی سەربازەکان، هەروەها بەئازادکردنی دیلەکان هێزێکی نوێی بەندکراوی ئازادو زیادەکرد، ئەمەش کارێکی خێ رو چاکەیە، هەندێ لەئەمیرەکانیشی بەهەمان شێوە دەجوڵاندەوە لەمظفر الدین کوکەبەری فەرمانڕەوایی هەولێرەوە دەگێڕنەوە کەئەوەی سەلاحەدین بووە، کەساڵانە دووجار تێردراوی بەپارەی زۆرەوە دەنارد بۆ ناوچەی کەناری وڵاتی شام بۆ ئازادکردنی دیلی موسڵمانەکان لەدەستی خاچپەرستەکان[1]. تەنانەت کچەزای ئیبن جوزی دەڵێت: پارەو سامانێی میرنشینەکەی هەموو لەخێرو چاکەدا سەرف دەکرد، ئەم مێژوو نووسەش ژمارەی دیلەموسڵمانەکان ئەوانەی کەئەم ئەمیرە ئازادیکردن بەنزیکەی شەست هەزادیل دەخەملاند. بەژنو پیاوەوە[2]. لەورووداوەنەش کەباش جوڵانەوەو مامەڵەکردنی لەگەڵ دیلەکاندا دەیسەلمێنن، ئەوەی کە لەساڵی ٥٨٧ك/ ١١٩١ز روویدا کاتێ چلو پێنج کەسی گاوریان لەبەیروتەوە هێنایە لاو لەنێوانیاندا پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو هەبوو، کەددانی لەدەم نەمابوو، کاتێ هێنایانە لای سەلاحەدین داوای کرد لەوەرگێڕەکە کەپرسیاری لێبکات دەربارەی ئەو هۆکارانەی کەوایلێکردووە بەرەو رۆژهەڵات بێت لەو تەمەنەداو چەند پرسیارێکی تریشی لێکرد، خاچپەرستە پیرەکەش وەڵامی پرسیارەکانی سوڵتانی دایەوە سوڵتانیش بەزەیی پیایدا هاتەوەو پارەی پێداو پاش ئازادکردنی بەسواری وڵاخێکەوە ناردیەوە بۆ سەربازگەی دوژمن[3]. لەهەمان کاتیشدا سەلاحەدین بەتوندی تۆڵەی لەهەندێ دیل دەکردەوە، چونکە تاوانی زۆرو خراپیان ئەنجامدابوو کەشیاوی لێخۆشبوون نەبوو، بەڵکوو سوکایەتیشی پێدەکردن پێش کوشتنیان[4]، ئەمەش لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار، بەڵام سەلاحەدین بەگشتی پێی باش بوو دیل بەزیندویەتی بهێڵرێتەوە هەتاوەکو بۆ کارکردن سودی لێوەربگرێت، ئەوەبوو کاتێ دەستی دایە دروستکردنی شورای قاهیرە (قەڵای سەلاحەدین) ئەودیلانەی بەکاردەهێنا بۆ کارە قورسەکان وەك هێنانی بەردو هەڵکۆڵینی تاشە بەردی گەورەو لێدانی خەندەقی دەوروبەری شوراکە، ئەم چاڵو خەندەقەش بەپاچ هەڵدەکەنراو لەبەرد پێکهاتبوو و زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، بۆیە کەس بەکەڵکی ئەو کارە نەدەهات جگە لەدیلە رۆمیەکان وەك ئیبن جبیر دەڵێت[5]: هەروەها

---

[1] الجیش الأیوبی، ل:٢٢٦.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٦.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٧.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٧.

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٣٧.

مێژوونوسێکی دواتری میسر دەڵێت: قەراقوش لەبنیاتنانی ئەو قەڵاو شورایەدا پەنجا هەزار دیلی خاچپەرستی بەکارهێنا[1].

٥- **ڕێکەوتننامەکانی نێوان سەلاحەدین و خاچپەرستان:** یەکەم ڕێکەوتنی نێوان سەلاحەدین و خاچپەرستەکان لەسەرەتای ساڵی ٥٧١/ هاوینی ١١٧٥ز دا بوو، واتە لەسەرەتای جێگیربوونی سەلاحەدین لەوڵاتی شامدا، گومانیش لەوەدا نییە کەفشاری بارودۆخی سیاسی و ئابووری و سەربازیو هتد پاڵی پێوەنا بۆ مۆرکردنی ئاگر بەست لەگەڵ خاچپەرستەکاندا، ئەمە وێڕای پێویستی بەکاتی زیاتر بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێی لەگەڵ کۆمەڵە ئیسلامیە رکابەرەکانیدا، بۆ ڕێگرتن لەوەی کەپەیوەندی بەخاچپەرستەکانەوە بکەن لەسەر حسابی سەلاحەدین بەتایبەت ئەتابەکەکانی موسڵو حەلەب[2]، تێکڕای ئەم هۆکارانە پاڵیان بەسوڵتانەوە نا بۆراگرتنی جەنگو ئاگر بەست مۆرکردن، کاتێ ئاگربەستەکەش چووە بواری جێبەجێکردنەوە، سوڵتان داوای کرد لەسەربازە میسریەکان کەبگەڕێنەوە بۆ میسر، لەبەر پێویست نەمانی پێیانو خراپی باری ئابووری لەشامدا (وەك وتمان) ئەمە جگە پێویستی میسر بەسەربازەکانی میسر بۆ رۆشتنەوە بۆمیسر[3]. لەراستیشدا سەلاحەدین ئەم ئاگربەستەو ڕێکەوتنەکانی تری مۆردەکردو چاوەڕێی هەڵوەشاندنەوەی لێ دەکردنو ئەو ئەگەرەی لەبەر چاوبوو، هەربۆیە مەرج و خاڵی وای دادەنا کەدوژمنی ببەستایەتەوەو ڕێگری ئەو کارەی لێ بکردایە، وەك روی دا، هەروەك هەرگیز چەکی فڕێ نەدەداو لەدوژمن دڵنیانەدەبوو بەڵکو هەمیشە سوپاکەی لەحاڵەتی ئامادە باشیدا بوو، بەردەوام چاودێری دەکردن لەترسی ئەوەی کەناپاکی بنوێنن، هەروەها سەلاحەدین راوێژی بەئەنجومەنی جەنگ دەکرد کاتێ بیویستایە لەگەڵ دوژمن دا لەسەر راگرتنی شەڕ ڕێ بکەوێت[4].

**دەیەم: چەکەکانی سوپای ئەییوبی:**

بەردەوامبونی حاڵەتی جەنگ لەگەڵ داگیرکەراندا کەناوچەکە پیایدا تێ دەپەڕی، بەتایبەت لەوڵاتی شام دا، بوە هۆی پەیدابونی پیشەسازی سەربازی چالاك بەتایبەت کەئەم ناوچەیە دەوڵەمەندبوو بەمادە خامە سەرەتاییەکانی ئەم بوارە، ئەمە لەگەڵ بونی کۆمەڵێك پیشەسازکاری لێهاتوو و کارامە، چونکە وڵاتی شام بەبونی تەختە تیایدا ناسراوە بەهۆی دارستانە چڕو

---

[1] الخطط التوفيقية، على مبارك، ل: ٧٠.

[2] كتاب الروضتين، له: الجيش الأيوبى، ل: ٢٣٨.

[3] سناالبرق(١٩٥/١)، الجيش الايوبى، ل: ٢٣٩.

[4] الجيش الايوبى، ل: ٢٣٩.

پڕەکانیەوە، بەتایبەت درەختی سنەوبەرو سندیان‌و هەرمێ‌و داربەڕووزان‌و هتد، بەڵام ئەم ناوچەیە بەوە ناسرابوو کەئاسنی کەمی تێدایە، بەرپرسەکانیش بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەم‌و کورتیە هەستان بەهاوردەکردنی ئاسن لەئیتالیاو ولاتی ترەوە، کەتەنها لەموسڵ‌و هەندێ ناوچەی شام دا هەبوو، واش پێدەچێ کەئاسن بەبەردەوامی لەسەردەمی جەنگەکانی خاچپەرستیدا دەرهێنرابێت، چ لەلایەن موسڵمانانەوە یاخود لەلایەن ئەو خاچپەرستانەوە کەئەم ناوچەیان داگیرکردبوو، ئەمە سەرباری دەوڵەمەندی ناوچەی موسڵ بەئاسن‌و قیرو نەوتی سپی پێویست بۆ ئاگر وەشێنەکان[1]، موسڵیش ماوە ناماوە بەرهەمی زەوی‌و دەستی پیشەسازکارەکانی دەبەخشی بەسەلاحەدین‌و چەند بارێك نەوتی سپی‌و قەڵغان‌و رم‌و لەهەر جۆرێك باشترین‌و توکمەترین بابەتیان بۆ دەنارد[2]، سەبارەت بەمیسریشەوە دەوڵەمەندبوو بەچەندین جۆر تەختەکە بەکاردەهات بۆ دروستکردنی کەشتی[3]، جۆرەکانی چەکیش ئەمانەبوون:

١- **چەکی تاکەکەسی:** ا-شمشێر. ب-خنجەر. ج-رم. د-تەورداس. هـ-ستون. و-کەوان. ز-بەردهاوێژ[4].

٢- **چەکە قورسەکان:** ا-نەوت‌و ئاگرهاوێژەکان. ب-ئامێرەکۆمەڵیەکان وەکو مەنجەنیق‌و زرێپۆش‌و پاشکۆکانی.

٣- **چەکەکانی جەستە:** ئەو کەلوپەلانە بوون کەجەستەیان دەپاراست وەك پۆشاکی پارێزەر لەئاگرو بەرگ‌و کەل‌و پەلی ئەسپ[5] و سێگۆشەکان، کەئامێرێکی بچوك بوو لەئاسن یان تەختە دروست دەکران‌و گۆشەیان هەبوو لەشێوەی دڕکدا وەك سێگۆشەیەکی گۆشە تیژ[6] وابوو.

**یازدەیەم: هێزی دەریایی ئەیوبیەکان:**

ستراتیژیەتی سەلاحەدین دوای گواستنەوەی لەشامەوە بۆ میسر گۆڕا کاتێ بینی میسر چەند خاڵێکی لاوازی تێدایە، ئەوەبوو دەستی دایە تۆکمەکردنی شارو قەڵاکانی‌و رێکخستنی سوپاکەی بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی چاوەڕوانکراو، هەروەها سەلاحەدین بایەخی دەدا بەبنیاتنانی هێزی دەریایی، چونکە دەیزانی بەهێزی فرەنجەکان لەدەریادایەو خاڵی لاوازیشیان لەوشکانیدایە،

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٤.

[2] الفتح القسی، ل: ٣٥٠.

[3] الجیش الایوبی، ل: ٢٦٤.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٦-٢٩٠.

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٢٣.

[6] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٢٤.

بۆیە پێویست بوو هێزێکی دەریای بنیاتبنرێت بۆ ڕێگری لە کاروانە دەریایەکانی فەرەنجەکان کەهاوکارو پشتیوانی میرنشینە خاچپەرستەکان بوو لەکەناری شامداو، کۆمەکیان دەکردن بەئازوقەو چەكو پێدانی سەرباز هەرکاتێ لەوشکانییەوە فشاریان بۆ بهێنرایە لێرەشەوە پێویستە ئاگامان لەدوو مەسەلەبێت کەسەلاحەدین ئەنجامیدا، جگە لەبنیاتنانی کەشتیگەلی سەربازیو تۆکمەکردنی شوراو قەلاکان، کەئەوانیش: یەکەمیان: ترسناکی پەیوەندی هێڵەکانی بازرگانیو هاتوچۆ لەنێوان هەردوو دەریای ناوەڕاستو سوردا، دووەمیشیان: جیاوازی بەرژەوەندی بازرگانی شارە ئەوروپیەکانی کەنار دەریای سپی ناوەڕاست لەخولیاو ئارەزووی ئەمیرەکانی میرنشینە لاتینیەکانی ناوەڕاستو رۆژهەلاتو رۆژئاوای ئەوروپا، بۆیە پەلەی کرد لەمۆرکردنی چەند گرێبەستێکی بازرگانی لەگەڵیاندا بەرامبەر بەنەهێشتنی پەیوەندیان لەگەڵ کەناری شامو فەلەستیندا بەرەو دەریای سووروئەگەری هەڕەشە کردن لەکاروانە بازرگانیەکان لەپشتەوە هەتاوەکو پاراستنی کاروانی حاجیانی موسلمان بۆ حیجاز مسۆگەر بکات، بۆیە فەرمانی دا بەناردنی سوپاکەی بۆ یەمەن بۆ مسۆگەرکردنو پاراستنی هێڵەکانی بازرگانی دەریایو ڕێگرتن لەکاری چەتەگەریو دەست درێژی کردنە سەر کاروانی حاجییان[1].

١- **چالاکی هێزی دەریای ئەیوبی:** لێکۆڵەر دەتوانێت تێبینی سێ قۆناغ بکات کەدەریاوانی ئەیوبی پیایدا تێپەڕبووە:

أ- **قۆناغی بەرایی:** دەتوانین ناوی قۆناغی ئامادەکاریو دانانی بناغە بۆ بنیاتنانی کەشتیگەلی ئەیوبی لەمیسردا لەم قۆناغە بنێین، بۆ ئەم مەبەستەش سەلاحەدین کۆمەڵێك چاکسازی ئەنجامدا، ئەوە بوو کەشتیگەلی سەر لەنوێ ڕێکخستەوەو دیوانێکی تایبەتی بۆ دانا بەسەرپەرشتی براکەیو دەسەلاتی بردنی هەموو پێداویستەكو چەکدارکردنی هەموو ئەو پیاوانەی کەپێویستیەتی پێبەخشی، بەم شێوەیە ئەم دەوڵەتە نوێیە کەشتیگەلێکی پێکەوەنا کەتوانی بەکۆمەکی هێزە وشکانییەکان بەرگری لە سەنگەرەکانی میسر بکات لەساڵی ٥٦٥ك/ ١١٦٧ز دا- ١١٦٩زدا، هەروەها ئەم کەشتیگەلە لەبەردەوام لەگەشەکردندا بوو، هەر کەساڵی ٥٧٥ك/ ١١٧٩ز یش هات ژمارەیان بەرزبوویەوەو گەشتە نزیکەی شەست کەشتی جەنگو بیست بەلەمی ڕاو، ئەوەبوو کەشتیە جەنگییەکان بەرەو کەنارەکانی ولاتی

---

[1] صلاح الدين الأيوبي وليد نويهض، ل: ٩٤، ٩٥.

ڕۆمو بەرێکەوتن تەنگیان بەکەنارەکانی وڵاتی فەرەنجەکان هەڵچنیو هەزار کەسیان لێبەدیل گرتنو کۆمەڵێکیشیان لەسەرانیان کوشت[1].

ب- **قۆناغی بەهێزی کەشتیگەلی ئەیوبی لەمیسردا:** ئەم قۆناغەش لەساڵی ٥٧٥ك/١١٨٠ ز دەست پێدەکاتو لەساڵی ٥٧٩ك/١١٨٣ز کۆتایی دێت واتە نزیکەی چوار ساڵی خایاندووە، لەم ماوەیەشدا کەشتیگەلی ئەیوبی توانی هەستێت بەکۆمەڵێك هێرش دژ بەکەشتیگەلی دەریایی خاچپەرستەکانو بەرپەرچدانەوەی کارە دوژمنکاریەکانی دوژمن دوای بەهێزبوونو زیادبوونی کەرەستەی ئەم کەشتیگەلەو چڕکردنەوەی هیمەتو هەوڵە جیهادییەکان تیایدا[2]، یەکەم کردەی سەربازیش کەکەشتیگەلی ئەیوبی پێی هەستا بریتی بوو لەپێکدادانی لەگەڵ دوژمندا لەجەنگێکی دەریایدا لەساڵی ٥٧٥ك/ ١١٨٠ز دا وسەرکەوتن بەسەریداو توانی دەست بەسەر کەشتیەك دابگرێت کەهەزار کەسی تێدا بوو، هاوکات لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە دەریاییەشدا سوپای ئەیوبی لەوشکانیدا سەرکەوتنێکی لەجەنگی بێت الأحزاندا تۆمارکردو بەم شێوە سەرکەوتن باڵی بەسەر سوپادا کێشاو دەریاو وشکانی پێکەوە گرتەوە[3]، سەلاحەدینیش بەردەوام بوو لەسەر سەرکەوتنەکانیو خاچپەرستەکان نەیاندەتوانی رووبەرووی ببنەوەو تەنها بەسەرکەوتنو تێکدانی بیت الأحزانو پەلاماردانی صورو صیداو بەیروت وازینەهێنا بەڵکو فەرمانیدا بەکەشتیگەل کەدووبارە لەسەنگەرەکانی میسر دەرچنو هێرش بکەنە سەر عەککا (قوستەنتینیەی شام) بەپێی قسەی القاضی الفاضلو لێرەشدا توانییان دەست بەسەر چەندین کەشتیدا بگرنو هەموویان تێکشکامد، ئەم سەرکەوتنانەش لەمێژووی ئیسلامدا هاوشێوەی نەبووە چ لەحاڵەتی بەهێزی ئیسلامدا یان لەحاڵەتی لاوازی کوفردا[4].

دیارە سەرکەوتنی گەورەو خاوەن دەنگدانەوە بریتیی بوو لەو سەرکەوتنەی کەکەشتیگەلی سەلاحەدین لەدەریای سوردا تۆماریکرد، ئەوەبوو لەشەعبانی ساڵی ٥٧٨ك/ ١١٨٢ز ئەمیری ناسراوی خاچپەرست (ئەرناط رینودی شایتون) سەرقاڵبوونی سەلاحەدینی بەگەمارۆدانی موسڵەوە قۆستەوەو پرۆژەیەکی گەورەو ترسناکی دانا کەمەبەستی لێی بەدەست هێنانی چەند ئامانجێك بوو، لەوانە:

---

[1] الجيش الايوبي، ل: ٣٥٢.

[2] كتاب الروضتين، له: الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٣.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٥٣.

[4] الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٤.

•**دەستگرتن بەسەر دەریای سوردا:** دوای دەست بەسەراگرتنی ئەیلە لەکەنداوی عەقەبەو عیذاب[1] لەکەناری باشووری میسردا کەبەسەر ئەو دەریایەدا دەڕوانێت، هەروەها داگیرکردنی جددەورابغ لەکەناری دورگەی عەرەبیو دواتریش داگیرکردنی عەدەن، بەم شێوەیەش ئاوی ئەم دەریایە دەکەوێتە ژێر رەحمەتی خاچپەرستانو دەست دەگرن بەسەر ئەو رێگایەیدا کەدەروازەی بازرگانییە، پاشان دەگەنە ئاوەکانی زەریای هیندی.

•**هەوڵدانی بچڕاندنی پەیوەندی لەنێوان هەردوو حەرەمی پیرۆزدا:** دوو دڵەکەی جیهانی ئیسلامیو ناوچەو بەشەکانی تری ئەم جیهانە چ لەرووی پەیوەندی دەریایەوە بێت یان وشکانییەوە، ئەم هەوڵەش مەبەست پێی بزواندنی هەستی سەرجەم موسڵمانانو بڵاوکردنەوەی شەپۆلێکی ترسو تۆقاندن بوو لەنێوانیاندا، تەنانەت خاچپەرستەکان سوربوون لەسەر چوونە ناو مەدینەی پیرۆزی پێغەمبەر دەرهێنانی روفاتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگۆڕەکەیدا[2].

•**قایلکردنی میرنیشینی حەبەشەی گاور بۆبەشداریکردن لەجەنگە خاچپەرستەکاندا:** ئەوە بوو ئەرناط خۆی ئامادەکرد بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکەی لەهەموو لایەکەوە، فەرمانیدا بەبڕینی دارو باخی ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەستەڵاتیدانو بڕینی دار خورمای ناوچەی عەریش، بەتەختەی ئەم درەختانەش چوارچێوەی کەشتی دروستکردو لەئاوەکانی دەریای مردوو (بحر الميت)دا تاقیکردەوە[3]، هەروەها خاچپەرستەکانی عەسقەلانی راسپارد بۆ دروستکردنی کەشتی تر، هەتاوەکو کەشتیگەلێکی پێکهێنا کە لەپێنج کەشتی جەنگی گەورەو ژمارەیەکی زۆر کەشتی مامناوەندو بچوک کەپیاوەکانی هەستان بەگواستنەوەی پارچەکانی بەجیا بۆکەناری کەنداوی عەقەبە لەسەر پشتی حوشتری بەکرێگیراو کەموڵکی بیابانشینەکانی ناوچەکە بوو دوای هەڵخەڵەتاندنیان بەپارە[4].

پاشان ئەرناط سوپایەکی وشکانی هێناو بەرەو تەبوك بەرێخستن بۆ ڕێگرتن لەگەشتنی هەر کۆمەکییەکی سەربازی کەفەرمانڕەوای ئەیلە لەمیسرو شامی داوا بکات، هەروەها ئەرناط رێگەی دەریای گرتەبەرو بەرەو ئەیلە کەوتەرێ کەدوای بەرگرییەکی کەم دەستی بەسەراگرت، بەڵامهێزەکانی نەیانتوانی دوورگەی قەلعە یان فرعون داگیربکەنو لەبەرئەوەی خەڵکەکەی

---

[1] عیذاب: شارۆچکەو سەر بازگەیەکی میسرە لەسەر دەریای سور (قەلزەم)، شوێنی وەستانی کەشتیە.

[2] ئیبن جبیر، ل: ٣٤، الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٧.

[3] الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٧.

[4] الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٧، رحلة إبن جبير/ ل:٣٤.

نەيانهێشت دەستيان بگاتە ئاوو(رووبەرى تەنگاوىو ناخۆشييەكى زۆربوونەوە)[1] وەك ابن الأثير دەڵێت، لەهەمان كاتدا كەشتيەكانى تر كەوتنەڕێ بۆ هێرشكردنە سەر كەنارى ئەفريقياو پەلامارى هەر شوێنو شتێكيان دەدا كەپيايدا تێپەڕينايە هەتاوەكو گەشتنە عيزابو توانيان دەست بگرن بەسەر چەند كەشتيەكى بازرگانيدا كەپڕ بوو لەكەلوپەلو لەيەمەنو شوێنەكانى ترەوە هاتبوو وەك هيندو عەدەن، لەراستيشدا موسڵمانەكان ترسان كاتێك بينيان كەشتى خاچپەرستەكان لەدەرياى سوردا دێنو دەچن، چونكە هەرگيز فەرەنجەكانيان لەم دەريايەدا نەبينيوە، نەوەك بازرگانو نەوەك جەنگاوەر[2]. هەروەها خاچپەرستەكان رووداوى ناخۆشيان بەسەر خەڵكدا هێناو نزيكەى شازدە كەشتياى موسڵمانەكانيان سوتاندو دەستيشيان بەسەر كەشتييەكەدا گرت كەكۆمەڵێ حاجى موسڵمانى هەلگرتبوو، رێژەيەكى زۆريش خواردەمەنيان سوتاند كە بۆ ئازوقەى مەككەو مەدينە دانرابوو، ئەمە وێڕاى ئەو كوشتنو بەديل گرتنو لێدانى كە لەوشكانىو دەريادا ئەنجاميانداد[3]، لەعيزابيشەوە خاچپەرستەكان بەرەو كەنارى رۆژهەلاتى دەرياى سور(حيجاز) رۆيشتنو ئاگريان بەردايە ئەو كەشتيانە كە لە(حوراء و ينبع)دا وەستابوون كەدوو بەندەرى شارى مەدينەى پيرۆز بوون، پاشان بەرەو باشور پێشڕەويان كرد هەتاوەكو گەشتنە (رابغ) كەيەكێكە لەبەندەرەكانى مەككەو كەشتيەكيان نوقم كرد كەحاجييەكان پێشوازيان لێدەكردو بەرو جددە دەڕۆشت[4]. ئەم هەواڵانە لەنامەيەكدا بەسەلاحەدين گەشت كەپارێزەر ى قەلاى ئەيلە بۆسەلاحەدينى نارد بوو كاتێ كە لەموسڵدا بوو، سوڵتانيش نامەيەكى نارد بۆ الملك العادلى براو جێگرى لەميسرداو، هانيدا بۆ گرتنە بەرى رێوشوێنى پێويست بۆ وەلامدانەوەى دەستدرێژيكاران بەشێوەيەكى خێرا، واديارە الملك العادل پێش گەشتنى ئەو نامەيەش خۆى بۆئەم كارە ئامادەكردبوو[5]، بۆيە فەرمانيدا بە فەرماندەى كەشتيگەل حسام الدين لۆلۆ بۆخۆ ئامادەكردن بۆ كردەيەكى سەربازىو كەشتيگەلێكى نوژەنكردەوە لەشارى ميسرو ئەسكەندەريەدا پاشان پارچە پارچەى كردو بەسەر پشتى چەند وشترێكەوەو گواستيەوە بۆ كەنارى كەنداوى سويسو بەشەكانى كەشتييەكە بەهاوڕێيەتى چەند جەنگاوەرێكى مەغريبى، كەهەستا بەبەستنى بەشەكان، هەروەها حسام الدين لۆلۆ هەستان بەدابەشكردنى كەشتيگەلەكە بەدوو بەشەوە، كۆمەڵى يەكەم

[1] الخطط(٢/٨٦)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٨.

[2] تاريخ إبن خلدون (٥/٦٥٥)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٨.

[3] مفرج الكروب (٢/١٢٧)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٨.

[4] الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٨.

[5] الجيش الأيوبي، ل: ٣٥٩.

بەرەوقەڵای ئەیلە بەرێکەوتو دەستی گرت بەسەرجەم کەشتیەکانی دوژمنداو هەستا بەکوشتنی زۆربەی ئەوانەی کەتیایدا بوون، بەڵام کۆمەڵێکی زۆریان توانیان دەربازبن‌و لەدۆڵ‌و گردۆڵکەکانی ناوچەکەدا خۆیان بشارنەوە، حسام الدین یش پیاوەکانی بۆ ناردن‌و پاش دۆزینەوەیان وەك هەڵۆ دایان بەسەریاندا[1]،کۆمەڵی دووەمیش بەرەو عیذاب بەرێخست، بەڵام کەسیان تیادا نەبینی بۆیە هەستان بەپشکنینی ناوچەکەو بینیان لەکەناری حوراءدا وەستاون، ئەوەبوو لەکەشتیەکانیان دابەزین دەستیان کرد بەکوشتارو راوەدونانی هەڵاتووەکانیان‌و توانیان دەستگیریان بکەن‌و، ژمارەی دیلەکانیان گەشتە (١٧٠) کەس‌وتوانیان دیلە موسڵمانەکان ئازاد بکەن، پاشان دەستیانگرت بەسەر کەشتیەکانیاندا بەکەلوپەلەکانیانەوە[2]، دواتر حسام الدین بەکەشتیگەلە سەرکەوتووەکەیەوە گەڕایەوە بۆ میسر بەدیلەکانیەوە کەزنجیرکرابوە پێیان، گەڕانەوەشیان بۆ ئەسکەندەریە لە ١ی ذی الحجه ٥٧٨ك/ ١١٨٣زدا رۆژێکی مەزن بوو کەئیبن جبیری گەڕۆك تیایدا گەشتە ئەو شارەو تیایدا کۆمەڵێ خەڵکی زۆری بینی کەهاتبوون بۆبینینی دیلە رۆمیەکان بەسوار حوشترەوە هات بوون‌و تەپڵ‌و زوڕنایان لێدەدا[3].

هەروەها الملك العادل فەرمانیدا بەدان لەگەردنیان هەتاوەکو کەسی تر دووبارە رێگای ئەو دەریایە نەزانێت‌و رووی تێنەکات[4]، ئەوەبوو سۆفی‌و زاناو خەڵکانی پیاو چاك هەستان بەکوشتنیان[5] هەروەك لەنامەکەی قاضی الفاضلدا بۆ دیوانی خەلیفە لەبەغداد هاتووە: کوشتنی ئەو بێ باوەڕانە پاشگەزبوونەوەی لێنەبوو، هێشتنەوەشیان لەشەرعدا بوار پێدراو نەبوو، هەروەك هێشتنەوەی هیچ یەکێکیشیان بەرژەوەندی تێدا نەبوو... بۆیە دەبوایە بیکوژرێن هەتاوەکو هاوشێوەکانیان پەندوەربگرن، ئەم مەراسیمەش هێندە مەزن بوو هاوشێوەی نەبوو[6]. وارێکەوت ئەو وەرزە وەرزی حەج بووو موسڵمانەکان هەندێ دیلیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ مینا بۆ کوشتنیان[7]، سەرکەوتنی کەشتیگەلی سەلاحەدینیش لەبەرپەچدانەوەی هێرشی خاچپەرستیدا ئەزمونێکی تاڵ بوو بۆ هێرشبەران‌و رۆڵی بەرچاوی هەبوو لەبەهێزکردنی ناوبانگی سەلاحەدین‌و

---

[1] الجیش الأیوبی، ل: ٣٥٩.

[2] الجیش الأیوبی، ل: ٣٥٨.

[3] کتاب الروضتین، لە: الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

[4] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

[5] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

[6] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

[7] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

چـتەوكردنی پێگـەی لـەنێوان موسـڵماناندا، هـەروەها ناوبـانگی حـسام الـدین لۆلـۆی فەرمانـدەی کەشتیگەلی بەهێزکرد[1]، هەرچی رێکخەری هەڵمـەتی خاچپەرستەکانیشە واتـە ئـەمیر ئـەرناط ئـەوە تـوانی لـەدیلی هـەڵبێتو بگەڕێتـەوە بۆشـورای کـرك وەك گـورگ زمـانی بەبرینەکانیـدا دەهێنـا[2]، هـەتاوەکو درێـژەی بـدات بـەپلانو پـرۆژە دوژمنکارییـەکانی دژ بەموسـڵمانان، بـەڵام سـەڵاحەدین رایگەیاند کـە لـەو هەوڵـەی خـۆش نابێـت کـە بـۆ لەکـەدارکردنی شـکۆو پـیرۆزی هـەردوو حـەرەمی پیرۆزداویەتی، وخۆی تەرخانکردو بۆتۆڵە سەندنەوە لێی[3]، هەر بۆیە ئەم سـەرکردە خاچپەرستەو هاوشـێوەکانی نـەیانتوانی ئـەو ئەزموونـە دووبـارە بکەنـەوە لـەدەریای سـوردا کـەوەك دەریایـەکی ئیسلامی مایەوە، دوا چالاکیش کەهێزی دەریاوانی سەڵاحەدین پێی هەستا لـەم ماوەیـەدا بریتیبـوو لەدەرچوونی لەسەرەتای سـاڵی ٥٧٩ك/ ١١٨٣زدا بـۆ قوڵاییـەکانی دەریـای ناوەڕاست بـۆ گـەڕان بـەدوای کەشـتییەکانی خاچپەرسـتەکانداو توانیـان کەشـتیەك بدۆزنـەوە کـە(٣٧٥) چـەکداری بەچەکەکانیەوە تیابوو[4]، پارەو چەکی هـەڵگرتبوو بـەرەو کـەناری داگیرکـراوی شـام بەرێکـەوتبوو، موسڵمانەکانیش رووبەڕویان بونەوەو هەردوولا خۆڕاگریان نواند، پاشان موسـڵمانەکان سـەرکەوتنو سەرجەم ئەندامانی ناو کەشتییەکەیان دەسـتگیرکرد بـەخۆیانو دەسـتکەوتەکانەوە گەڕانـەوە بـۆ میسر[5].

١- قۆناغی پاش حطین هەتاوەکو سوڵحی رەملە ٥٨٣ك– ٥٨٨ك: سوپای سەڵاحەدین بـەردەوام بوو لەسـەرکەوتنەکانیدا پـاش سـەرکەوتنی یەکلاکـەرەوەی حطـین لەبـەرە جۆراوجۆرەکـانی شەڕدا، چ لەئازادکردنی سەربازگەو قەڵاو شوراکانی شامدا بێـت یـان لـە فەلەسـتینو غـەوری روبـاری ئوردونـدا، بـەڵام چـالاکی کەشـتیگەلەکە لـەخوار ئاسـتی پێویسـتەوە بـوو، رۆڵـی سـنووردارتبوو لەسـوککردنی ئـەو جەنگانـەی کـەخرابووە ئەسـتۆی سـوپای وشـکانی بـۆ ئازادکردنی شارە کەنارییەکان. ئەم بارودۆخەش دەرەنجامی لاوازی هێزی دەریـایی ئـەیوبی نـەبوو بـەو ئەنـدازەی کەپەیوەنـدی بـەهێزی دەریـایی خاچپەرسـتەکانەوە هــەبوو، سەڵاحەدینیش ئاگای لەم جیاوازییـە بـووو نەیدەویست کەشتیگەلەکەی بەشداری جددیو راستەقینە بکات، چونکە دەترسا لەوەی کەدوژمن هەسـتێت بەهێرشـکردنە سـەرکەنارەکانی

---

[1] الفتح القیسی، ل: ٣٤١، الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٠.

[2] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦١.

[3] مرآة الزمان(٣٨٩/٨)، مفرج الكروب (١٨٥/٢).

[4] مضمار الحقائق، ل: ٥٠، الجیش الأیوبی، ل: ٣٦١.

[5] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦١.

میسر، ئەگەر بێتو هەموو هێزە دەریاییەکان لەکەنارەکانی شامدا قۆرخ بکات، بۆیە دەبینین کەهێزی وشکانی تەنها قەڵاو شوراکانی ناوخۆی وڵاتی ئازاد نەکرد، بەڵکو هەستا بەئازادکردنی شارەکانی کەنار دەریاش وەك عەککاو بەیروتو عەسقەلانو لاذیقیەو ....هتد.

بەڵام ئەمە رێگر نەبوو لەوەی کەکەشتیگەلەکەی هەستێ بەهەندێ ئەرك بۆ هاوکاریکردنی سوپاکەی، ئەوەبوو لەصوردا سەلاحەدین هیچ چارەیەکی نەما جگە لەوەی کە لەسێ لاوە بجەنگێن، بەرەی شارە گەمەرۆدراوەکە بەشورا تۆکمەکەیەوەو بەرەی باکورو بەرەی باشوری دەوروبەری شار، ئەوەبوو خاچپەرستەکان لەکەشتیەکانیانەوە کە لەبەندەرەکەدا وەستابوون تیر بارانیان کردنو ژمارەیەکی زۆریان لەموسڵمانەکان کوشتو برینداز کردو نەیانهێشت لەشارەکە نزیك ببنەوە[1]، بۆیە سەلاحەدین ناچاربوو بنێرێت بەدوای ئەو کەشتیە میسریانەی کە لەئاوەکانی عەککادا وەستابوون پاش نۆژەنکردنەوەیان، کەشتیەکانیش لەکاتی پێویستدا گەشتنو موسڵمانەکانیش توانیان لەشورای شارەکەوە نزیك ببنەوەو لەزەویو دەریاوە هێرشیان بۆ هێناو تەنگیان پێ هەڵچنیو وا چاوەڕوان دەکرا کەئەم شارە خۆی بەدەستەوە بدات. لەبەر رۆشنایی ئەم راستیانەشدا ئەو کارەی کەبەم کەشتیگەلە سپێردرا گرنگیەکی تایبەتی پەیداکرد، چونکە پێویست بوو لەسەری کەگەمارۆی بەندەرەکە بداتو لەهەمان کاتیشدا رێگربێت لەهاتنی کۆمەکی دەریایی بۆ خاچپەرستەکان بۆ صورو لەم هەلومەرجەشدا پاسگاکە نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی بگرێت[2]. بەڵام موسڵمانەکان کەمتەرخەمیان نواند لەئەرکەکانیاندا کەبریتیبوو لەپاسەوانی کردن بۆ رێگرتن لەنزیك بونەوەی کەشتی کەشتیگەلی خاچپەرستەکان بۆ صور، چونکە لەکاتێکدا کەپێنج کەشتی ئەیوبی پاسەوان بوون بۆ رێگرتن لەدەرچونو چونە ناوەوەی صور لەلایەن خاچپەرستانەوە وایان دەزانی کەباروذۆخەکەیان کۆنترۆڵ کردوە بۆیە پاسەوانەکان دڵنیا بوونو کاتی پارشێو خەوتن، پیاوانی هێزی دەریایی خاچپەرستیش ئەم هەلەیان قۆستەوە بۆ لێدانیان: ئەوەی کەویستیان کوشتیانو ئەوانی تریشیان بەکەشتیەکانەوە بەدیل گرتو بردنیان بۆ بەندەری صور، سەربازەکانی سەلاحەدینیش لەوشکانییەوە سەیریان دەکردن، فەرماندەی کەشتیگەلی ئیسلامیش عبد السلام المغربی بوو کەابن الأثیر بەئازاو زیرەك وەسفی دەکات لەکارو ئەرکەکەیدا[3] و بەدرانی فارسیشی لەگەڵدابوو[4]، هەندێ لەپیاوانی کەشتیگەلیش لەکەشتیەکاندا

---

[1] الكامل فی التأریخ، لە: الجیش الأیوبیەوە، ل: ٣١.

[2] تأریخ البحریة السلامیة، ل: ٣٦٣.

[3] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٣.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٦٣.

بـەدیل گـیران توانیـان خۆیـان فڕێبدەنـە دەریـاوەو هەنـدێکیان بەمەلـەکردن ڕزگاریـان بـوو، هەندێکیشیان خنکان، پێنج کەشتیەکەی تریش بەفـەرمانی سـوڵتان بـەرەو بـەیروت بەڕێکـەوتن (چونکە سودێکی ئەوتۆیان لێنـەدەبینرا لەبـەر کـەمیان) بـەڵام کەشـتیە خاچپەرسـتەکان شـوێنیان کـەوتن، ناچـار دەریـاوانو جـەنگاوەرە موسـڵمانەکان خۆیـان فڕێدایـە وشـکانیو کەشـتیەکانیان بەجێهێشت، بـەڵام سـەلاحەدین نەیهێـشت ئـەم کەشـتیانە بکەوێتـە دەسـتی خاچپەرسـتەکانەوەو فەرمانیدا بەکۆمەڵێك لەپیاوانی کەبگەنـە لایـانو کونیـان تێبکـەن، پاشـان گەڕانـەوە بۆ شـەڕکردن لەوشـکانیدا دژ بەشـاری صـور[1]، وەك چـاوەڕیش دەکـرا: سـوڵتان زۆر دڵتـەنگ بـوو بـەهۆی ئـەم نسکۆیەوەو بێبـاوەڕانیش زۆر دڵخۆشـبوون بـەو گـورەزە[2]، بـەم شـێوەیەش کەشتیگەلی ئـەیوبی شکـستی هێنـا لەبەشـداری کـردن لەجـەنگی یـەکێك لەشـارەکانی کـەنار دەریـادا کەبەدەسـتی خاچپەرستەکانەوە بوو، ئەم کردەیەش تاکە کردەیـەك بـوو کەئـەم کەشتیگەلە پێـی هەسـتا لـەم بوارەداو لەئازادکردنی شارەکانی تردا دووبـارەی نـەکردەوە، بـەڵام تێبینـی ئـەوە دەکرێـت کەئـەم کەشتیگەلە دووبارە گەڕایەوە بۆ چالاکی لەڕۆژگاری گەمارۆدانی درێژخایەنی عەککا لەلایەن سوپای خاچپەرستەکانەوە، بۆ سەرخستنی ئەم شارەو هێنانی کەرەستەو ئازوقەو جەنگاوەری پێویست[3].

٢- **گرنگترین چاکسازیە دەریاییەکانی سەلاحەدین:** سـەلاحەدین هەسـتا بەکۆمـەڵێك چاکسازی دەریای لەپێناو زیندووکردنەوەی هێزی دەریای لەمیسردا لەو چاکسازیانەش:

أ- کردنـی دارسـتانەکانی میـسر بـەموڵکی دەوڵـەت بەتایبـەت دارسـتانەکانی (بهنـساو سـفطو أشمونینو ئەسیوطو ئەخمیمو قوص)، نرخی یەك درەختیش سـەد دینـار بـوو بـەپێی وتـەی مەقریزی[4]. بەپێی ئەم بڕیارەش نەیهێـشت کـەس دەسـت بەسـەر دارو درەختـدا بگرێـت، بـۆ سود وەرگرتن لەدارو تەختەکەی، ، ئـەم بنەمایـەش تاکۆتـایی دەوڵـەتی ئـەیوبی لەمیـسردا کاری پێدەکرا، سەرباری ئەو فەرامۆشکاریەش کەرووبەڕووی کەشتیگەلی ئەیوبی بویەوە، لەم بارەیەشـەوە عثمـان ابـراهیم نابلـسی کـە لەسـەردەمی دەوڵـەتی ئەیوبیـدا ژیـاوە دەڵێـت: دارستانەکان حوکمی کانزاکانیان هـەبوو و مـوڵکی بـەیتولمالی موسـڵمانان بـوو، کـەس هـیچ پشكو بەشێکی تیادانەبوو[5]، ئەم بڕیارەش هەموو بابەتە سەرەکیەکانی دەگرتەوە کەدەوڵەت

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٦٣.

[2] الفتح القیسی، ل: ١٦١.

[3] الجیش الأیوبی، ل: ٣٦٣.

[4] الخطط (١٩٣/٢)

[5] الجیش الأیوبی، ل: ٣٣٢.

لەدەرەوە دەیهێنا، بەتایبەت ئاسنو تەختە کەزۆر گرنگن بۆ پیشەسازی کەشتی، وەك باسیش دەکرێت دەوڵەتی ئەیوبی پەیوەندیو رێکەوتنامەی بازرگانی هەبووە لەگەڵ کۆمارەکانی شارەکانی ئیتاڵیادا، بەپێی ئەو رێکەوتنەش پێداویستی خۆی لەم دوو مادەیە دەست دەکەوێ[1]، ئەوەش کەدەیسەلمێنێ ئەم بڕیارە ئەو کەرەستانەی گرتۆتەوە ئەوەیە کەمێژوونوس نابلسی میسری ناوبراو باسی دەکات کەئاسنو تەختەو رەصاصو بابەتەکانی تر کەدەهێنران بۆ وڵاتی میسر لەرێگەی دەریاوە دیوان بەقازانجێکی کەم دەیفرۆشتەوە، ئەمەش بۆ دروستکردنی کەشتیو باڵە خانەو جبەخانەی چەك[2]، هەروەها لەئەسکەنەریەدا دیوانێك هەبوو کە بەکۆگای سوڵتانی ناودەبرا، کاری کڕینی شتو مەکە هاوردەکراوەکان بوو کەدەوڵەت پێویستی پێیان بوو بۆ مەبەستی سەربازی، بەتایبەت دروستکردنی کەشتی، سەرپەرشتیارانی ئەم کۆگایەش ئەم کەلوپەلانەیان بەپارەی ئەو پێنج یەکە دەکڕی کە لەبازرگانەکان دەسەندرا وەك باج، سەلاحەدینیش لەبنیاتنانی کەشتیگەلەکەیدا، جگە لەوانەی کەباسمان کرد سودی وەردەگرت لەتەختەی سنەوبەرو درەختی مازو کە لەدارستانەکانی لوبناندا هەبوو، هەروەها لەکانزای ئاسنیش کە لەچیاکانی لوبنان دەردەهێنرا[3]. ئەگەر ئەمەش راستبێت، ئەوە کاتێ روویداوە کە ئەم ناوچانە گەڕانەوە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان، واتە دوای ساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٣ك.

ب- سەلاحەدین دیوانێکی تایبەت کرد بەکەشتیگەل کە بەدیوان کەشتیگەل ناسرابوو خەراجی فەییومو رۆژهەڵاتو رۆژئاوای بۆ تەرخانکرد کەبەری رۆژهەڵات ناوچەکانی بهتینو ئەمیریەو مینای ئەگرتەوەو بەری رۆژئاواش ناوچەکانی سفطو نهیاو وەسیمو بەساتینی دەرەوەی قاهیرەی دەگرتەوە، جگە لەبەروبوومی نەطرون کە لەو کاتەدا دەگەشتە هەشت هەزار دینار لەساڵێکدا، ئەمە جگە لەو ماڵەی کە وەك زەکات وەری دەگرت، کەدەگەشتە زیاتر لەپەنجا هەزار دینار، لەگەڵ کرێی کەشتیە دەوڵە تیەکاندا[4].

ج- گرنگیدانی سەلاحەدین بەبەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی پیاوانی هێزی دەریایی ئەوانەی کە لەدروستکردنی کەشتیو پێداویستیەکانیدا کاریان دەکرد بۆ باشکردنی بژێویو هاندانی خەڵکی بۆ پەیوەندی کردن بەریزەکانی هێزی دەریاییو کارکردن لەکەشتیگەلدا، بڕیار درا

---

[1] الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٣.

[2] الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٣.

[3] أحسن التقاسيم، لە: الجيش الأيوبيەوە، ل: ٣٣٣.

[4] الخطط (١٩٣/٢)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٤.

کەدیناری کەشتیگەل سیٚ لەچواری دینار بێت دوای ئەوەی کەپێنج لەسەر هەشتی دینارێك بوو، واتە بەزیادکردنی لە ١٧,٥٪ی نرخی دیناری پێشوو[1].

د- دامەزراندنی کەسایەتی گرنگی سەربازی بەفەرماندەی کەشتیگەل هەرچەندە سەرچاوەکان ئاماژە بەناوی ئەو کەسانە ناکەن کە لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەریایی ئەیوبیەکاندا کاریان کردووە لەساڵەکانی سەرەتای مێژووی دەوڵەتی ئەیوبیدا، جگە لەناوی فەرماندەی بەناوبانگ حسام الدین لۆلۆ کە لەرووداوی بەرپەچدانەوەی ئەرناطدا ناوبانگی پەیداکرد، کە پێشتر باسمانکرد، هەروەها ناوی فەرماندەی کەشتیەکانیش وەك: یەعقوبی حەلەبیو جمال الدین محمد کوڕی ئەرککزو بەدرانی فارسیو محمد کوڕی ئیسحاقو عبد السلام المغربی وچەندانی تر، دیارە دامەزراندنی الملك العادلی براشی بەبەرپرسی گشتی دەزگای دەریاوانی لەم ساڵانەی دواییدا، بەڵگەیەکی روونە لەسەرگرنگیدانی سەلاحەدین بەمەسەلەی کەشتیگەل، کاتیٚ الملك العادلیش ئەم کارەی گرتە دەست، صفی الدین عبدالله کوڕی عەلی کوڕی شکر[2] بەیاریدەدەری خۆی دەستنیشانکرد بۆ سەرپەرشتی کردنی بەڕێوەبردنی کەشتیگەل، سەلاحەدینیش دەسەڵاتی فراوانی بەخشی بەفەرمانڕەوای کەشتیگەل بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی تایبەت بوون بەدەریاوانی، دوای ئەوەی کەسەلاحەدین ئامادەکاری کەشتگەلی تەواوکردو لەساڵی ٥٧٢ك/١١٧٦ نامەیەکی نوسی بۆ هەموو وڵاتەکانو دەیوت قسە قسەی فەمانڕەوای کەشتیگەلە، دەبێت رێگری نەکرێت لەهەرکەسێك کەپیاوەکانی بیبەنو هەرشتێك کەپێویستییەتی یان پێی هەبێت، فەرمانیشیدا بەفەرمانڕەوای کەشتیگەل کەدەریا جێنەهێڵێت[3].

ە- سەلاحەدین بایەخی زۆری دەدا بەقایمکردنی سەربازگەکانی میسرو بڕیاریدا کەهەستێت بەچەند کارێکی فراوان لەچەند کاتێکی جیاوازدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی بورجو شوراکانیو هەڵکەندنی خەندەقو بەدەوریدا، بۆ ئەم کارەش بڕێکی زۆر پارەی بۆ تەرخانکردو چەند پیاوێکی لێهاتوو کارامەی دانا بۆ جێبەجێکردنی وەك بەهائەدین قەراقوش، کەئەرکی نوێکردنەوەو بنیاتنانی چەندین بینای سەربازی پێسپێردرا[4] هەروەها سەلاحەدین چەند جارێك پڕۆژەکانی تۆکمەکاریو بنیاتنانی بەردەوامی سەنگەرەکانی بەسەرکردەوە لەکەناری

---

[1] الخطط (١٩٤/٢)، الجيش الأيوبى، ل: ٣٣٤.

[2] الجيش الأيوبى، ل: ٣٣٥.

[3] كتاب الروضتين، لە: الجيش الأيوبى، ل:٣٣٥.

[4] وفيات الأعيان (٩١/٤)، الجيش الأيوبى، ل:٣٣٥.

دەریای ناوەڕستدا بەتایبەت ئیسکەندەریەو میاطو تنیس، ئەوەبوو پاش گەڕانەوەی لەگەشتی یەکەمی لەوڵاتی شام لەشەعبانی ٥٧٢ک/١١٧٦زدا هەردوو کوڕەکەی الملك الأفضل علیو الملك العزیز عثمان لەگەڵ عیمادی کاتبو مێژوونوسی ناسراو چوونو بەدمیاط تێپەڕینو سەنگەرو سەربازگەکانیان بەسەرکردەوە[1] لەساڵی ٥٧٧ک/ ١١٨١ک سەلاحەدین جەنگاوەری لەودوو بورجەدا دانا کەدەکەونە ئەم لاو ئەو لای شارەوە لەلای دەریاوەو فەرمانیدا بەبەستنەوەی کەشتیەکان بەزنجیرێکەوە هەتاوەکو سەربازە بەرگریکارەکان خۆیانی پێوە ببەستنەوە، ئەگەر دوژمن توانی لەنێوان دوو بورجەکەوە بێتە ناوەوە، هەروەها لەهەمان ساڵدا فەرمانیدا بەنۆژەنکردنەوەی شورای دمیاطو گرتنی کونو کەلەبەرەکانی، دواتریش سەلاحەدین فەرمانیدا بەهەڵکەندنی خەندەقی دمیاطو دروستکردنی پردێک لای زنجیرەی بورجەکە[2]، پاشان دمیاطی بەجێهێشت بەرەو سەربازگەی ئیسکەندەریە بەرێکەوت (وەك مێژوونوس دەڵێت) ئەو شورا بازنەییەمان بینی کەسوڵتان دایهێنا، لەگەڵ ئەو کارو شوێنەوارە جوانانەی کەجێیهێشتن، پاشان ناوچەکەی جێنەهێشت هەتاوەکو فەرمانی تەواوکردنی سەربازگەکەو نۆژەنکردنەوەی کەشتیگەلەکەیدا[3] ئەمەش دووەم سەردانو بەسەرکردنەوەی سەلاحەدین بوو کەپێی هەستا بۆئیسکەندەریەو سەردانی سێیەمو کۆتایشی بۆ ئیسکەندەریە لەساڵی ٥٧٧ک/ ١١٨١ زدا بوو بۆ بینینی ئەو شورایانەی کەنوێی کردبوونەوەو ئەو باڵەخانەی کەبناغەی بۆ دانانو فەرمانیدا بەتەواوکردنو بایەخ پێدانیان[4]، لەو قایمکاریانەش کەسەلاحەدین لەئیسکەندەریەدا ئەنجامیدا لەم سەردانەیدا فەرماندانی بوو بەفخرالدین قراجا بەشکاندنی چوارسەد ستونی رۆمانی کە لەدەوری سنوری السواریدا بوونو فڕێدانی بۆ کەنار دەریا بۆ رێگرتن لەگەشتنی کەشتیەکانی دوژمن بەشوێنی وەستانو بۆ لاوازکردنی ئەو شەپۆلانەی دەریا کەبەر شورای ئەسکەندەریە دەکەوتن[5].

و- هاندانی خەڵك لەلایەن سەلاحەدینەوە بۆپەیوەندی کردن بەریزەکانی هێزی دەریاوانیەوە: بۆ راکێشانی خەڵکانی کارامە لەدەرەوە، ئەم هەوڵانەشی سەرکەوتوبوون بەهۆی ئەو پارەو پاداشتانەی کەدیوانی دەریاوانی دابینیدەکرد یان بەهۆی زیندوکردنەوەی رۆحی جیهاد

---

[1] الجیش الأیوبی، ل:٣٣٦.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣٩.

[3] الجیش الأیوبی، ل:٣٣٩.

[4] کتاب الروضتین، لە: الجیش الأیوبیەوە، ل:٣٣٧.

[5] الجیش الأیوبی، ل:٣٣٧.

لەدەرونی موسڵمانەکانداو هاندانیان بۆ کاری خۆبەخشانەو کارکردن لەگەڵ کەشتیگەلدا، هەتاوەکو وایلێهات کە بەخزمەتگوزاریەکانی کەشتیگەلیان ئەوت تێکۆشان لەپێناو خوداو غەزاکەرانی دوژمنانی خواو خەڵکی دوعاو نزاکانیان بەبەرەکەت دەزانین[1]، سەلاحەدینیش بۆ خۆی نمونەیەکی بەهێزی جیهادو تێکۆشان بوو، ئەوەتا ئیبن شەدداى مێژونوسی کەزۆر رووداوی ناو دەریای بینیوە، باسی ئەوە دەکات کەرۆژێکیان سەلاحەدین ئاوڕی بۆ داوەتەوە لەکۆتایی گفتوگۆیەکدا کەلەنێوانیاندا روی داوە پێیوتوە: بیر لەوە دەکەمەوە کەهەر کاتێ خوای گەورە کەنارەکانی بۆ ئازاد کردین وڵات دابەش بکەمو وەسیەت بکەمو پاش ماڵئاوایی سواری کەشتی ببمو بچمە دورگەکانیانەوەو شوێنیان بکەوم هەتاوەکو کەسێك نەهێڵم لەسەرزەویدا کەبێ باوەڕبێت بەخودا یاخود بمرم[2].

٣- **رۆڵی مەغریبییەکان لەکەشتیگەلی سەلاحەدیندا:** مەغریبییەکان لەهەموو کەس زیاتر بەدەم بانگەوازی سەلاحەدینەوە هاتن بۆ کارکردن لەبواری دەریاوانیداو کەشتیگەلی میسریش زیاتر پشتی بەوان دەبەست، بەجۆرێك کەئەم مەسەلەیە لەدەست ئەواندا قۆرخ بوو بوو وەك مەقریزی ئەڵێ. لەبەر شارەزایی باشیان لە کاروبارەکانی دەریاوانیدا[3]. زانراویشە کەناوبانگی مەغریبیەکان لەرۆژهەلاتدا دەنگی دابویەوە لەبواری جیهادی دەریاییدا لەبەر لێهاتووییان لەکەشتیرانیو هونەرەکانی جەنگی دەریایدا بۆیە هەر لەکۆنەوە بەسوارەکانی دەریا ناسرابوونو فاتمیو مەمالیکو عەسمانیەکانیش لەبەڕێوەبردنی کەشتیگەلەکانیاندا پشتیان پێدەبەستن، ئەوەتا ئیبن جبیری گەرۆك باسی ئەوە دەکات کەئەو هەڵمەتە دەریاییانەی کەحسام الدین لؤلؤ دژ بەخاچپەرستەکان لەدەریای سوورو لەسەردەمی سەلاحەدیندا ئەنجامیدا ژمارەیەکی زۆر دەریاوانە کارامەکانی مەغریبی تێدابوو[4]، رەنگە گەورەترین بەڵگەش دەربارەی تایبەتمەند بوونی مەغریبیەکان لەبواری کەشتیگەلی دەریایدا لەسەردەمی سەللاحەدیندا ئەوەیەکەسەرچاوەکان دەیگێڕنەوە کەسەلاحەدین عبدالرحمنی کوڕی منقذی باڵیۆزی نارد بۆ لای پاشای مەغریب یەعقوبی مەنسوری موەحیدیو داوای یارمەتی دەریایی لێکرد بۆ جەنگکردن دژ بەسەربازگەو مۆڵگە خاچپەرستەکان لەشامدا. سەرباری ئەوەش کەوتراوە کەگوایە مەنسور داواکەی سەلاحەدینی رەتکردۆتەوە، چونکە لەنامەیەکدا نازناوی

---

[1] الخطط (١٩٤/٢)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٨.

[2] النوادر، ل: ٢٢، الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٨.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢، هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣٨.

[4] الخطط (١٨٩/٢)، الجيش الأيوبي، ل: ٣٣٨.

ئەمیری باوەڕدارانی لێنەناوە واتە دانی بەخەلافەتی دەوڵەتی موحیددین دانەناوە، ئەوەتا مێژوونوسی مەغریبی السلاوی ناصری پێیوایە کەمەنسور دووسەدو هەشتا کەشتی جەنگی ناردووە بۆ ڕێگرتن لە مانەوەی کەشتیەکانی خاچپەرستان لەکەنارەکانی شامدا[1]. سەبارەت بەبەشداری مەغریبیەکانیش لەجیهاددا دژ بەخاچپەرستەکان لەمیسر یان شامدا لەهەردوو بواری وشکانیو دەریادا، بابەتێکی چڕوپڕ هەیە لەکتێبەکانی ژیاننامەو گەشتەکاندا کەوەسفی کاروپاڵەوانیەتیەکانیان دەکاتو ناوی ئەو کەسانەیان باس دەکات کەشەهید بوونو لەفەلەستین بەخاك سپێردراون، کەرەنگە ئاماژەکردن بەگەڕۆکی ئەندەلوسی ئیبن جبیر بەس بێت کەسەردانی میسروشامی کردووە، چونکە ئەم گەڕۆکە مەغریبیە زانیاری بەنرخی پێداوین دەربارەی چالاکی موجاهیدە مەغریبیەکان لەجەنگی خاچپەرستیدا، بۆ نموونە ئاماژە بەو باجە زیادەیە دەکات کە خاچپەرستەکان لەشامدا بەجیابەسەر بازرگانە مەغریبەکاندا سەپاندیان بێ ئەوەی بازرگانە موسڵمانەکانی تر بگرێتەوە، هۆی ئەمەش ئەوەبوو کەکۆمەڵێك لەپیاوەکارامەکانی مەغریب شان بەشانی سوڵتان نورەدین مەحمود دژ بەخاچپەرستەکان جەنگانو توانیان دەست بگرن بەسەر یەکێك لەقەڵاکانی خاچپەرستەکاندا دوای ئەوەی کەئازایەتیەکی کەم وێنەیان پیشاندا کەشیاوی باسکردن بوو، فرەنجەکانیش بەوە تۆڵەیان لێکردنەوە کەباجێکی زیادەی یەك دیناری بخەنەسەر هەر بازرگانێکیان کە بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا تێپەڕ دەبوون لەشامدا ئەمەش وەك سزایەك بۆئەو هەڵوێستە بوێرانەیان، هەروەها ئیبن جبیر ئاماژە بەوە دەکات کە پاشا موسڵمانەکان خەڵکانی دەوڵەمەندو ئافرەتە خانەدانو خاتونەکان لەڕۆژهەڵاتدا هەستاون بەفیدیەدان بۆ ئازادکردنی دیلە مەغریبیەکان لەبەردوریان لەوڵاتیانەوە، ئەمە سەرباری ئەو پارە زۆرەی کەوەقف کرابوو بۆ ئەو خەڵکە مەغریبیە کە لەشامدا نیشتەجێبوو بوون[2]. ڕۆڵی مەغریبیەکانیش لەم بوارەدا مایەی شانازییە، چونکە هەمیشە پشتیوانی براکانیان بوون لەڕۆژهەڵاتداو لەهەموو بارودۆخێکدا ڕۆڵیان هەبووە لەبوارە زانستیەکانو بەرەکانی جەنگداو ئەزموونو شارەزاییە جەنگیەکانیان پێشکەش بەبرا ڕۆژهەڵاتیەکانیانو کردوە لەسەردەمی زەنکیو ئەیوبیداو توانا سەربازیەکانیان خستۆتە خزمەتیانەوە، لەپێناو بەرپەچدانەوەی کەشتیگەلەی خاچپەرستەکان، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کەگەلانی موسڵمان هەمیشە پێکەوە

---

[1] الأستقصا لأخبار دول المغرب الأقصى (١٩٣/٢)، بحث فی تأریخ الحضارة، ل: ٨٩.

[2] بحوث فی تأریخ الحضارة الأسلامیة، ل: ٨٥.

کارلێکیان هەیەو لەژێر ئاڵای تێکۆشانی ئیسلامیدا کۆدەبنەوە کاتێك ئوممەت ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە، لەو پەندو وانە گەورانەش کەوەردەگیرێت ئەوەیە کەموسڵمانان بەهۆی بیرو باوەڕو ئاینەکەیانەوە هەمیشە سەرکەوتوون بەسەر بانگەشە نشتیمانیو نەتەوەییە بەرتەسکەکاندا ئەوەتا نورەدینی تورکیو سەلاح الدینی کوردیو یوسفی کوڕی تاشفینی بەربەریو خەلیفەی عەباسی عەرەبی هەموویان لەیەك بەرەدا بوون لەژێر ئاڵای ئەهلی سوننەتو جەماعەتدا. دیارە پاراستنی شوێنە پیرۆزەکانیش لەدەستدرێژی خاچپەرستەکان گرنگترین شتێکە کەئەیوبییەکان لەماوەی حوکمڕانیاندا پێی هەستان[1]، دەشتوانین بڵێین کەسەلاحەدین توانی سوپای وشکانیو کەشتیگەلێکی دەریای پێك بێنێت کەچەکدار بوو بەهەموو پێداویستەکانی جەنگ لەچەكو ئازووقەو جبەخانە، ئەمەش بەهۆی ئەو سیاسەتە حەکیمانەوە بوو کە بۆ ڕێکخستنی سوپاکەی پەیڕەوی دەکرد، کە لەسەر بنەمای زیندووکردنەوەی گیانی جیهادی ئیسلامی لەدەرونیاندا دامەزرابوو، لەگەڵ پەیڕەویکردنی سیستمی (-دەرەبەگایتی-، موڵکایەتی سەربازی زەوی) لەوڵاتەکەیدا کە بەهۆیەوە توانی بەرەی ئیسلامی یەکبخات وەك ڕێخۆشکەریەك بۆ دەستپێکردنەوەی پرۆژەی جیهادی ئیسلامی بۆ پاکتاوکردنی خاچپەرستان لەوڵاتی شامداو پاش ئەوە هیچ گرفتو بەربەستێك نەما کەرێگربێت لەبەردەم سەلاحەدیندا بۆ یەکلابونەوە بۆ جیهادی خاچپەرستانو گێڕانەوەی بەیتولمەقدیس[2]. جگە لەیەکخستنەوەی بەرەی ناوخۆ، ئەمەشمان لەبەشی داهاتوودا بۆ ڕووندەبێتەوە بەپشتیوانی پەروەردگار.

[1] بلاد الحجاز منذ بداية عهد الشراف، ل: ٤٤.

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل:١٥٣.

## باسی حەوتەم: هەوڵەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی

کۆچی دوایی نورەدین رووداوێکی کتوپڕو چاوەڕواننەکراو بوو، ئەوەبوو لەکاتێکدا کەدیمەشق ئاهەنگی دەگێڕا بەهۆی خەتەنەکردنی کوڕەکەیەوە لەجەژنی رەمەزانی ٥٦٩ك دا، وڵاتانی موسڵمان بەیەکجاری پاش دوو هەفتە ماڵئاوایی لێکرد، هەر کە هەواڵەکە بڵاوبویەوە هەموو تەماعەکان دەرکەوتن نەك تەنها لەبنەماڵەی نورەدینو خزمەکانیدا، بەڵکو لەناو فەرماندەو ئەمیرە سەربازیەکانیشدا، تەنانەت لەفرەنجەکانیشدا، هەتاوەکو بەو پەڕی تواناوە سود لەنەمانی ئەو پیاوە وەربگرن کەچارەنوسی ناوچەکەی بەدەستەوە بوو و بەوپەڕی هێزو شکۆو دووربینیەوە لەبەرامبەر فەرەنجەکاندا وەستاو دەوڵەتێکی بەرفراوانی جێهێشت کە لەبەرقەو یەمەنەوە بۆ شام و جزیرەو موسڵ درێژ دەبویەوە، ئەگەر چاودێری رەوتی رووداوەکانیش بکەین پاش کۆچی دوایی نورەدین دەبینین کەملململانێی نێوان هێزەکان دەستی پێکردووە هەموو کۆمەڵەکان بەپێی هێزی خۆیان جوڵاونەتەوە[1].

- **بنەماڵەی زەنگی لەموسڵ[2]:** نوێنەرو جێنشینی نورەدینی تیایدا کەبرازای خۆی بوو بەناوی سیف الدین غازی، سوپاکەی کۆکردەوە بۆ یارمەتیدانی لەجەنگی فرەنجەکاندا، ئەوەبوو بەرەو نصیبین بەرێکەوتو دەستی بەسەردا گرتو پاشان رووی لەخابور کردو دەستی بەسەرا گرت، پاشان بەرەو حەڕاران رۆشتو چەند رۆژێك گەمارۆیدا، پاشان توانی دەستی بەسەردا بگرێت دوای ئەوەی (قایماز حەڕانی) فەرمانڕەوای خۆی بەدەستەوەدا کەکۆیلەی نورەدین بوو، پاشان رەهای ئابلوقەداو لەالخصی خزمەتگوزاری نورەدینی سەندەوە، پاشان هێزی نارد بۆ الرقە لەسەر رووباری فورات، لەوێشەوە بۆ سروج، بەم شێوەیە شارەکانی جەزیرە کەوتنە ژێر دەستیەوە جگە لەقەڵای (جعبر)، ئەویش سەر لەنوێ باجی گێڕایەوەو لەبواری رابواردنو خواردنەوەدا شل گیری نواند[2].
- ئەمیرەکانیش لەدیمەشق پابەندبوون بەالملك الصالحی منداڵەوە کەکاتێ سەلاحەدین جێی هێشت تەمەنی ١١ ساڵ بوو بڕیاریاندا یەکبگرنو ئەمیر ئیبن المقدمیان کردە سەرکردەی کۆمەڵەکەیانو ئەتابەکیەی منداڵەکەیان پێدا، واتە سەرپەرشتی پەروەردەکردنی[3].

---

[1] صلاح الدين الفارس والمجاهد والملك الزاهد، ل: ١٤٥.

[2] صلاح الدين الفارس والمجاهد والملك الزاهد، ل: ١٤٦، كتاب الروضتين(٢/٣٢٧).

[3] صلاح الدين الفارس والمجاهد والملك الزاهد، ل: ١٤٦.

● ئەمیر شمس الدین ئیبن الدایەش لەگەڵ دوو براکەیدا فەرمانڕەوایی حەلەبیان گرتبوە دەست بۆیە لەنێوان زەنکیەکانی ڕۆژهەڵاتو کۆمەڵەی دیمەشقدا بڕ درابوو، هەچەندە هاوڕێیو دۆستی سەلاحەدین بوو[1].

● سەبارەت بەفرەنجەکانیش ئەوە خێرا هەلەکەیان قۆستەوەو هێرشیان کردە سەر قەڵای بانیاس لەدەروازەی باشوری جۆلاندا لەکۆتایی شەووالی ساڵی ٥٦٩ك/ ئایاری ١١٧٤زداو، هاوسەرەکەی نورەدینیش بەئازایەتیەکی کەم وێنەوە (بەپێی وتەی ولیام صوری) ناردی بۆلایانو داوای هەڵگرتنی گەمارۆی کرد بەرامبەر ئاگربەستی کاتیو پێدانی بڕێکی زۆر پارە، پاشاش ئەمەی رەتکردەوەو، بۆماوەی دوو هەفتە گەمارۆی بانیاسیدا، کەئامێرەکانی تیادا تێك شکاندو لەکۆتایدا رازی بوو بەپارەکە بەرامبەر بەئازادکردنی سوارە بەدیلگیراوەکانی خاچپەرستەکان ئەوە بوو پاش ئەوەی مردو بەغدەویەی چوارەم کەتوشی گەڕی بوو بوو بوە جێنشینی[2]، ئەمە گێڕانەوەی فرەنجەکانە، هەرچی سەرچاوە عەرەبیەکانیشە باس لەوە دەکەن کەئیبن المقدم وەك ئەتابەك چووەدەر بۆیانو لەگەڵیاندا ئاگربەستی مۆرکرد بەمەرجێك کەبڕێکی زۆر پارەیان پێبدات، دیلە فەرەنجەکان ئازاد بکەن، واش دیارە کەهاوسەری نورەدین کەکچی ئەتابەك ئەنرە، لایەنگرێکی زۆری هەبووە لەدیمەشقداو وەك دایکی پاشا، بۆیە نامەکە بەناوی ئەوەوە بوو، ئەتابەك ابن المقدمیش فەرماندەی سوپاو بەڕێوەبەری کاروبارەکانی دەوڵەت بووە، بۆیە لەگەڵ فرەنجەکاندا ڕێکەوت لەسەر ئاگربەستو نەهێشتنی هۆکارەکانی جەنگو ئاژاوە[3].

● سەبارەت بەسەلاحەدینیش لەمیسردا، ئەوە هەواڵەکەی لەڕێی فەرەنجەکانەوە پێگەیشت، بۆیە باوەڕی نەکردو نامەیەکی نوسی بۆنورەدین ووتی: هەواڵێك لەلایەن دوژمنی نەفرەتلێکراو هاتووە دەربارەی گەورەمان نورەدین خوای گەورە بیپارێزێت لەناخۆشی، بەهۆی سەلامەتییەوە دڵەکانمان ڕۆشن بکاتەوە، کەگوایە نەخۆشی زۆری بۆ هێناوە ئەمەش دڵتەنگی کردوین.. جا ئەگەر ئەم هەواڵە ناخۆشە (خوانەکردە) ڕوی داوە... ئەوە موڵکی پاشاکانە هەمیشە بۆ منداڵەکانیان بووە، جا لەبەر خوا لەبەر خوا لەبەر خوا دڵو دەستەکانتان بپارێزن لەناکۆکی هەتاوەکو دوژمن بەئامانجی خۆی نەگات، ناکۆك مەبن هەتاوەکو شکست نەهێنن، چونکە دوژمنان لەهەموو لایەکەوە دەوریان داون، ئێمەش

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٦.

[2] ولیام الصوری (٢٠/٩٧٣)، صلاح الدین الفارس والمجاهد والملك الزاهد، ل: ١٤٦.

[3] کتاب الروضتین، لە : صلاح الدین وە، ١٤٦.

پشتیوانی ئەم بنەماڵەین‌و سەرشۆڕیان ناکەین، وەسییەتیشی پێشتر بۆ ئێمە ئەوەبوو کە ئەو کوڕەی کەکاری پێسپاردبوو سعد الدین کمشتکینیش لەبەر دەستیدا بوو، جا ئەگەر ئەو وەسیەتە دەرکەوتووەو پەسەند کراوە ئەوە باشە ئەگینا ئێمە دەستمان لەناودەستی ئەو کوڕەیدایە دژ بەهەر کەسێکیشێن کەدوژمنایەتی بکات، هەتاوەکو ئەگەینە ئەو مەبەستەی کەهەیبووە[1] ئەوەبوو نامەیەکی لەئەمیرەکانی دیمەشقیشەوە بەدەست گەیشتەوە کە الملك الصالح ئیمزای کردبوو و دەیوت: خوای گەورە تەمەنی گەورەمان الملك الناصر درێژبکات‌و خوای گەورە پاداشتمان بداتەوە لەباوکماندا (سەرکردەی دادپەروەر) پاشان هەموو ئەمیرە ئامادەبووەکان لەسەر بەیعەتی تەواو پەیمانی یەکلاکەرەوە کۆبوونەوەو هیچ شتێك نییە لێرە نهێنیی بێت‌و سەرقاڵمان بکات جگە لەفرەنجەکان خوا سەرشۆڕیان بکات، الملك العادلی گەورەشمان تەنها پشتی بەسەلاحەدین دەبەست‌و ئومێدی پێی هەبوو بۆئەمڕۆو سبەینێی خۆی‌و کوڕەکانی[2]...ئایا جگە لەگەورەی بەڕێزمان ناصری سەرکەوتوو سەرخەرێکی ترمان هەیە[3].

ئەمیرەکانی دیمەشقیش لەلایەکەوە دەیانویست دڵنیای بکەنەوە هەتاوەکو دوربێت‌و لەلایەکی تریشەوە هەتاوەکو سەرقاڵ بێت بەکوشتاری فرەنجەکانەوە، چونکە نورەدین ئەو ئەرکەی پێ سپاردبوو ئەوانیش شارەزای هێزی بوون‌و لەدەستێوەردانی دەترسان، ئەوەبوو سەلاحەدین سێ ڕۆژ دانیشت بۆ پرسەو نامەیەکی سەرەخۆشی نوسی بۆ الملك الصالح کە لەکۆتایدا هاتبوو: سەبارەت بەدوژمنیش( خوا سەر شۆڕی بکات) ئەو خزمەتکارت بەدوایەوەیەتی بەشەو ڕۆژ هەتاوەکو لەشوێنی خۆیدا هەراسانی دەکات، ئەمەش بچوکترین فەرزی ئەو ماڵە پیرۆزەیە، ئەم نامەیەش ڕۆژی چوارەمی ذی القعدة نێردراوە کەوتاری بەناوی بەرێزتانەوە تیادا خوێندراوەتەوە... ئەمرۆی خزمەتگوزاریشتان لەدوێنێ دەچێت لەخزمەتکردنداو توانیویەتی ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکات ووشەی ئیسلام یەك بخات‌و خوای گەورە الملك الصالح مان بۆ بهێڵێتەوەو بەهۆی ئەوەوەو لەسەر دەستی چاکسازی ئەنجام بدات‌و خزمەتگوزاریشتان سەرکەوتووبکات بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی لەبەهێزکردنی دەسەڵات‌و زۆرکردنی موڵکیدا[4]، پاش ئەوەش لەنامەیکی تردا هاتبوو: خزمەتگوزارتان بەردەوامە لەسەرپەرشتی کردنی کاروبارەکان‌و جێ بەجێ کردنی

---

[1] صلاح الدين الفارس والمجاهد، ل: ١٤٧.

[2] كتاب الروضتين(٢/٧/٥٨٧).

[3] هەمان سەرچاوە (٢/٥٨٦)، صلاح الدين الفارس والمجاهد، ل: ١٤٧.

[4] صلاح الدين المجاهدوالملك الزاهد، ل: ١٤٨.

فرمانەکان‌و ئامادەکردنی سوپادا، وەهەمیشە ئامادە باشە بۆ ئەوەی فەرمانی پێ بکرێت‌و جێ بەجێی بکات یان کاری پێ بسپێردرێ‌و پێی هەستێت یاخود روبەڕوی دوژمن ببێتەوەو گورزیان لێ بوەشێنێت، هەتاوەکو لەو رۆژەدا کەخوای گەورە پەردە لەسەر کارەکان هەڵدەماڵێت بەئەرکی خۆی بەرامبەر بەدەوڵەت هەستابێت[1]. هەروەها دراوی بەناوی الملك الصالح وە لێداو بڕێکی بۆ ناردو وتاریشی بەناوی ئەوەوە دەخوێندەوە[2].

● چاودێریکردنی روداوەکانی شام‌و عێراق لەلایەن سەلاحەدینەوە: سەلاحەدین بەردەوام چاودێری رووداوەکانی دەکرد لەشام‌و عێراقداو کاتێکیش هەواڵی بیست لەمیسردا بوو، ماوەیەك ناڕەزایی نامەی دەنوسی‌و ماوەیەکیش وەك ئامۆژگاری کەرو رێنیشاندەر.

● کاتێ بیستی کەسیف الدین غازی بەشێکی لەمیرنشینەکەی مامی بڕیوە، نامەیەکی گلەی ئامێزی نوسی بۆ الملك الصالح چونکە ئاگاداری نەکردبویەوە هەتاوەکو لەخزمەتیدا بێت‌و سیف الدین لەو کارەی پەشیمان بکاتەوە[3].

● کاتێ هەواڵی هێرشکردنی فەرەنجەکان بۆ سەربایناس ئەو ئاگربەستەی بیست کە ابن المقدم بەپارەیەکی زۆر لێی کڕیبوون، ناڕەزایی دەربڕی بەرامبەر بەو رێکەتنامەیەو نامەی نوسی بۆکۆمەڵێك لەناوداران‌و وەك ابن المقدم و قاضي ئیبن ابی عصرون لەدیمەشقداو ئەیوت: کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی خوالێخۆشبووم بیست بەمەبەستی جیهاد کردن پاککردنەوەی وڵات لەبێ باوەڕان لەمیسر دەرچووم‌و، هەواڵی ئەو ئاگربەستەم پێ گەیشت کەرێخۆشکەربوو بۆلاواز بوونی ئیسلام... شێخی گەورەشمان یەکەم کەسێك بووکەزمانی تەرخان کرد بۆرەتکردنەوەی ئەم کارە چونکە بەزمانی ئەو شمشێرەکان دەخرێنە کێلان‌و مافەکان ساغ دەبنەوە[4]. لێرەشەوە سەلاحەدین رادەی لاوازی ئەمیرەکانی دیمەشقی بۆدەرکەوت.

● کاتێ ناکۆکی نێوان ئەمیرەکانی دیمەشق‌و ئیبن الدایەی بیست لەحەلەبدا سەرکردە شادبەخت_ فەرماندەی قەڵای حەلەب_ توانی لەگەڵ ابن المقدم پیلان بگێڕێت و، الملك الصالح یش گوێزرایەوە بۆ حەلەب‌و پیلانێکیان ریکخست‌و بەهۆیەوە ئیبن الدایەو دوو براکەیان بەناهەق دەستگیرکرد. پاش ئەوەی بەڵێنییان پێ دا کەبیکەنە ئەتەبەکی دەوڵەت دواتر خستیانە زیندانەوەوە،پاش لێدانیان بەدەست‌و قاچ، دواجاریش ابن مقدم تورە بوو و

---

[1] کتاب الدوضتین،لە: صلاح الدین المجاهد، ل: ١٤٨.

[2] الباهر، ل: ١٦٢، ١٦٣، صلاالدین المجاهد: ل: ١٤٨.

[3] الکامل فی التأریخ (١١/٤٠٥، ٤٠٦).

[4] کتاب الروضتین (٢/٥٨٩)صلاح الدین الماجد، ل: ١٤٩.

لەدیمەشقەوە نامەیەکی بۆ سەلاحەدین نوسی‌و بانگهێشتی کرد بۆ دەستێوەردان، سەلاحەدینیش سێ مانگو نیو لەمیسردا مایەوەو چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد لە ١٥ی شەوالەوە هەتاوەکو سەرەتای سەفەری ساڵی ٥٧١ك،و لە نامە ناردن ماندونەدەبوو، لەم کاتەشدا سەرقاڵ بوو بەدوو مەسەلەوە: بزوتنەوەو جموجۆڵی کنز الدولە لەناوخۆداو هێرشی نۆرماندنی صەقەلیەی بۆ سەر ئسکەندەریە، کەدوو مەترسی گەورە بوون، کاتێ کەلێ بویەوە تێگەیشت کەابن الدایە دوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەمیرەکانی شام بەپێی بەرژەوەندی‌و ململانێ خۆپەرستانەکانیان رەفتار دەکەن‌و بەهیچ شێوەیەك رەچاوی حەزو ویستەکانی نورەدینیان نەکردووە: سەلاحەدینیش باوەڕی وابوو کەکوڕی نورەدین پاش باوکی مجدالدین ئیبن الدایە شوێنی دەگرێتەوە پاشان براکانی لەحەلەبدا کەهاوڕێ‌وهاوپەیمانی بوون[1] ودڵنیا بوو لێیان، بەڵام گرتن‌و لێدانییان بەناهەق وای لێکردکەبڵێ: من لەپێشترم بەرەچاوکردنی بەڵێن‌و هەوڵدانی باش، چونکە ئەگەر دەسەڵاتی ئەوانە بەردەوام بێت ئەو یەکێتی‌و کۆ دەنگیە نامێنێت‌ومیسر لەشام جیادەبێتەوەو بێ باوەڕان تەماع دەکەنە وڵاتی ئیسلام بۆیە نامەیەکی نارد بۆ ابن المقدم_کەفەرمانڕەوای دیمەشق بوو_و ناڕەزایی دەربڕی بەرامبەر بەجیابوونەوەو پەرتەوازە بونیان‌و کەچۆن توانیویانە بەرامبەر بەئەندامان‌و سەرانی دەوڵەت بوەستن، چونکە ئەو کاروباری دەوڵەت‌و ئەوانەی لامەبەستەو بەزیانیشیان نیگەرانە، ابن المقدم یش نامەیەکی بۆ نوسییەوەو داوای لێ کرد کاری بەسەر ئەو مەسەلەوە نەبێت‌و بیری لێنەکاتەوەو ئەیوت: شیاوی تۆ نیە بوترێت تەماعت کردۆتە ماڵی ئەو کەسەی کەگەورەی کردیت‌و دایمەزراندیت‌و لەمیسردا جێگری کردیت بەڵکو واباشە تۆ سەرقاڵی چاکەو کاری باشی خۆت بیت[2]. لێرەدا سەلاحەدین سەرسام مابویەوە لەنێوان بەدەمەوە چونی بنەماڵەی نورەدین‌و ئەمەکداری بۆیان‌و لەنێوان تۆمەتبارکردنیدا بەوەی کەتەماعی تێکرددون، وادیارە زۆربەی ئەو نامانەش کە لەناودارو زاناو ریش سپیانی شامەوە پێی دەگەشت مەسەلەکەی یەکلاکردەوەو بڕیاریدا دەستوەر بداتە مەسەلەکە، ئەگەر ئەم کارەشی نەکردایە لەحاڵێکدا کەخەڵکی دوای نورەدین ئومێدیان بەو هەبوو، ئەوە ئەمڕۆ سەلاحەدین باسی نەبووو یەکێك لەو ئەمیرانەی کەزۆر سادە باس دەکرا[3]. سەلاحەدین لەکۆتایی سەردەمی نورەدیندا تەنها سەرکردەیەکی دیارنەبوو لەنێوان ئەمیرەکانیدا بەڵکوبوو بەدەزگایەکی سەربازی سەر بەئەوو

---

[1] کتاب الروضتين (٥٨٩/٢)، صلاح الدين المجاهد، ل: ١٤٩.

[2] سنا البرق (١٦٨/١)، صلاح الدين، ل:١٤٩.

[3] صلاح الدين المجاهد والملك الزاهد،ل:١٥٠.

خێزانێکی هاوکار بوو لەگەڵ فەرماندەکانمدا، کە لەسەرەتادا ئەسەدەدین شێرکۆو نجم الدین ئەیوب‌و پاشان صلاح الدین‌و شهاب الدین‌و الحامی خاڵی پاشان براکانی، کەتیایاندا توران شاو طغتکین ئەبوبکر_ العادل_ وبوری‌و هەندێ لەبراکانی سەلاحەدین‌و ئامۆزاکەی‌و لەگەڵ هەندێ لەکوڕانی صلاح الدین: الأفضل علی و الظاهر غازی و العزیز عثمان، کەواتە سێ نەوەی سەرکردە بوون کەخۆیان خستبوویە خزمەت نوورەدین‌و ئاڵایان هەڵگرت، نورەدینیش خۆی هەندێکیانی پێکەوە کۆکردەوە هەتاوەکو بەهۆی خزمایەتیەوە یەکتر بناسن، دیارەنورەدین دڵنیا بوو لەسەلاحەدین‌و هاوکاری کردنیان لەگەڵیداو زاڵبوونی بەسەریاندا وەك دەستەیەك لەمیسردا، هەروەك دڵنیا بوون لەوەی کەسەلاحەدین بەباشی کارەکان ئەنجامدەدات[1].

بەهێزی سەلاحەدینیش تەنها لەمەدا نەبوو، بەڵکو لەدەوڵەمەندی میسردا بوو لەرووی ئابوری‌و مرۆییشەوە، ئەوزەویەش کەلەژێر دەستی ئەودا بوو فراوانترو گەورەتربوو لەرووی روبەرو دەوڵەمەندیەوە لەمیرنشینەکەی نورەدین لەشام‌و جەزیرەدا، چونکە میرنشینی سەلاحەدین لەبەرقەوە بۆ نەوبە( سودان)و لەوێشەوەبۆ یەمەن‌و درێژ دەبویەوە، بەم شێوەیە بارودۆخی سەلاحەدین وەك بارودۆخی فەرماندەکانی نورەدین نەبوو، بەڵکو لەوان دەوڵەمەندترو پایەدارتر بوو، سێ کورەکەی الدایەش تەنها یەکێکیان دەرکەوت‌و ئەو هەلەی کە بۆ سەلاحەدین رەخسا بۆئەو نەرەخسا کەمیسر وەك کۆمەڵگەو تاقیگەیەك وابوو کەتواناکانی بنەماڵەی ئەیوبی تیادەرکەوت‌و سەلاحەدینیش باش ئەمەی دەزانی، وەك چۆن ئەمیرەکانی تریش دەیانزانی[2].

کاتێ ئەمیرەکانی دیمەشقیش کۆبونەوە لەسەر دژایەتیکردنی سەلاحەدین ئیسماعیلی خەزنەداری پارەو حسین ئەلجراحی‌و شەهابەدین عەجمی‌و طواشی حوسامەدین رەیحان‌و لەسەروی هەموشیانەوە ابن المقدم بەئامادەبونی قاضی کمال الدین شارەزوری، قاضی ووتی: ئێوە ئەزانن کەسەلاحەدینی فەرمانڕەوای میسر لەخزمەتگوزارو پیاوانی نورەدینەو بەرژەوەندی لەوەدایە کەراوێژی پێ بکەین لەم کارەدا کەئەیکەین‌و واباشە لەم مەسەلەدا جیای نەکەینەوە هەتاوەکو لەگوێڕایەڵیمان دەرنەچێت‌و ئەوە نەکات بەبەڵگە لەدژمان، چونکە ئەو لەئێمە بەهێزترە بەوپێیەی هەموو میسری لەژێر دەستدایە.... بەم شێوەیە لێرە دەرماندەپەڕێنێت‌و خۆی خزمەتی الملك الصالح دەکات...ئەم وتەیەی قاضی ش لەگەڵ مەرامەکانیاندا نەدەگونجاو ئەترسان لەوەی

---

[1] صلاح الدین المجاهد والملك الزاهد،ل:١٥١.

[2] صلاح الدین المجاهد والملك الزاهد،ل:١٥١.

سەلاحەدین بێتە ناوچەکەو ئەوان دەربەرێنێت[١]...چونکە دەیانزانی ئەگەر بێتە ئەو ولاتەوە دەریان ئەنێت[٢]، ئەوەبوو سەلاحەدین لەئەرکەکانی بویەوە لەمیسردا دوای ئەوەی کەزۆر بێزاروتوڕە بوو لەوەی کە لەشامدا رووی دەدا، بەتایبەت ئەوەی کە لەحەلەبدا روویدا لەجیابوونەوەی سوننە_ شیعەو ناپاکی نواندنیان بەرامبەر بەئیبن الدایەی هاورێی،هەربۆیە نامەیەکی نوسی بۆ ابن المقدمو ئەمیرەکانن بۆ دیمەشقو تیایدا نوسیبوی: ئەگەر نورەدین بیزانیایە کەیەکێکتان ئەتوانێت کەببێتە جێنشینی منو وەك من متمانەی پێ هەبوایە ئەوە میسری دەدایە دەست کەگەورەترین میرنشینو ویلایەتیەتی، ئەگەر مردنیش زوو یەخەی پێنەگرتایە پەروەردەکردنی منالەکانی بەکەسێکی تر نەدەسپارد جگە لەمن، بەلام ئێستا ئەبینم ئێوە بەتەنها بڕیار لەسەر گەورەمو کورەکەی دەدەن، منیش دێم بۆخزمەت کوڕەکەیو پاداشتی چاکەکانی باوکی دەدەمەوە بەخزمەتێك کەئاسەواری دیاربێتو ئێوەش لەسەر کارەخراپەکانتان سزادەدەم کەوازتان لەبەرگریکردن لەولات هێناوە[٣]. بەم شێوەیە سەلاحەدین خۆی بەبەپرس دەزانی لەدەولەتی الملك الصالحو باش پاراستنی[٤]، هەروەها نامەی بۆ ئەمیرەکانی حەلەب نوسییو ئاگاداری کردنەوە لەهاتنی بۆ شام، ئەوانیش بێ شەرمانە وەلامیان دایەوە[٥]. وادیارە ئەوان دەیانزانی کەئەو میسر بەجێدێلێت، هەربۆیە نامەیەکیان نوسی بۆفەرمانڕەوای موسلو داوایان لێکرد کەبێت بۆدەستگرتن بەسەر دیمەشقدا پێش سەلاحەدین، ئەویش ئەم مەسەلەیەی بەپلان زانیو نەهات بەدەم بانگەوازەکەیانەوە خەلکی دیمەشقیش داوایان لەابن المقدم کرد (کەگەڕابوویەوە بۆ لایان) بانگهێشتی سەلاحەدین بکات هەتاوەکو کمشتکین کەدەستی بەسەر حەلەبدا گرتبوو دەست بەسەر دیمەشقدا نەگرێت، ئەوە بوو نامەیەکی زۆری پێگەیشت کەداوایان لێدەکرد بێت بۆ شام بۆیە ئەویش بڕیاری رۆیشتنی دا[٦].

**یەکەم: دەستگرتن بەسەر دیمەشقدا:**

دوای ئەوەی بارودۆخی میسر سەقامگیر بووو هێمنی بەخۆوە بینی، سەلاحەدین خۆی ئامادەکرد بۆ پێشڕەوی کردن بەرەو ولاتی شام دوای پێنج مانگ لەکۆچی دوای نورەدین، ئەوەبوو لەمانگی سەفەری سالی ٥٧٦ك/ ئەیلولی ١١٧٤ی زاینیدا بەسەرۆکایەتی حەوت سەد سەرباز

---

[١] كتاب الروضتين (٥٨٩/٢)، صلاح الدين المجاهد، ل: ١٥١.

[٢] صلاح الدين الفارس المجاهد، ل:١٥١.

[٣] الكامل فى التأريخ، لە: صلاح الدين الفارس المجاهد، وە، ل: ١٥٢.

[٤] صلاح الدين الفارس المجاهد، ل: ١٥٢.

[٥] صلاح الدين الفارس المجاهد، ل: ١٥٢.

[٦] هەمان سەرچاوە،ل :١٥٢.

بەرێکەوت بەهاوڕێیەتی سەیفەدین طغتکینو تقی الدین عمرو عزالدین فروخ شا، بەڕێوەبردنی کاروباری میسریشی سپارد بەالملك العادلی برای بۆ پارێزگاری کردنی زیاتریشی کۆمەڵێ سەربازی بەدەروازەو سەنگەرەکانیدا بڵاوکردەوە[1]، ئەوە بوو زۆر بەهێواشی رێی دەکردو ئەو رێگەیەی بەسێ مانگ بڕی لەیەکەمی سەفەرەوە بۆ کۆتایی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٧١ك لەسەر رێگە لەبلیس داوەستاو قەڵای ئەیلەی(العقبە)ی بەسەرکردووە، ئایا لەم ماوەیەدا بیری لەوە دەکردەوە کەئەمیرەکانو زەنکییەکان لەبارەیەوە بڵاویدەکەنەوەو تۆمەتباری دەکەن بەبێ وەفاییو تەماعبازی؟ یاخود پلانی دادەنا بەدەم رێوە بۆ راکێشانی ئەمیرەکانی نورەدین بەبێ جەنگو ململانێ؟ یاخود رادەی جەماوەری بونی خۆی تاقیدەکردەوە بەم هێزە کەمەوە، کە بەسوپایەکی کەمەوە دێتە شامو سوپاکەشی لەمیسردایە؟ یاخود بەربەرەکانی ئەوانەی دەکرد کەئەیانویست لەسەر کار لایبەن یەکلایەنە دەست بگرن بەسەر میراتی نیورەدینو کوڕەکانیدا؟ یاخود هێمنانە پلانی دادەنا بۆچونە ناو وڵاتەوە بەئاشتی بەپشت بەستن بەو خوشەویستیو هۆگریە جەماوەریەی کەهەیبوو[2]ئەمانە چەند بیرۆکەیەك بوون کەدەکرێت بەخەیاڵیدا هاتبێت،لەوانەیە خراپترینیان ئەوەبێت کەدوژمنان گومانی خراپی پێدەبەنو برەو بەو گومانە دەدەنو تۆمەتی تەماعبازی ئەدەنە پاڵ، ئەوە بوو نامەیەکی لەدیوانی ئینشائی الفاضلی دا نوسیو تیایدا دەڵێت: وەفاو ئەمەك دوای مەرگ دەبێت، خۆشەویستیش شوێنەواری لەکاتی بوونی دوژمنی زۆردا دەردەکەوێت، بەشێوەیەکی گشتی من لەدۆڵێکدامو ئەوانەی گومانی خراپم پێدەبەم لەدۆڵێکی تردا، هێندەش نییەتمان باشە کەکەس نەتوانێت لەکاری چاکە دورمان بخاتەوە، بەکەسێکیش کەمەبەستی چاکە بێت ناوترێت خراپت کردووە، هەروەك بەو کەسەش ناوترێت کەچەکی فرێداوە کەتۆ کەست بریندارکردووە، مەبەستی ئێمەش تەنها بەرژەوەندییەکە کەدەبێت پێشی بخەین، نەك ئاژاوەیەك کەتۆڵەی پێ بکەینەوە، ئەگەر چارەسەرێکی تریشمان هەڵبژاردایە جگە لەمە ئەوە هیچمان نەکردووەو ئەرکی خۆمان جێبەجێ نەکردووە، بۆیە ئەم کارەمان دەبێت بەباشترین شێوە لێکبدرێتەوەو گومانی باشمان پێببرێت[3]، هەروەها سەلاحەدین نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە مستضیء وهۆی پێشڕەوی کردنی بەرەو شام بۆ رونکردەوەو ئامانجیش لەم نامەیە پێدانی راوەیەتی بوو بەم کارەی کەپێی هەستاوە، دوپاتکردنەوەی وەلائی بۆ خەلیفەی عەباسی[4]:

---

[1] تأريخ الأيوبين فى المصر، ل: ٥٦.

[2] صلاح الدين الفارس المجاهد، ل: ١٥٣.

[3] سنا البرق الشامى، لة: صلاح الدين الملك المجاهد، ل: ١٥٦.

[4] دور المدن الفلسطينية فى مقاومة الغزو الصليبى، ل: ٥٣.

١- **وتاری سەلاحەدین کەئاڕاستەی خەلیفەی عەباسی کردبوو:** سولتان سەلاحەدین وتاریبێژ شمس الدینی کوڕی وەزیر أبی المضاء نارد بۆ دیوانی العزیز بەنامەیەکەوە کەالقاضی الفاضل نوسراوێکی دوورو درێژو جوانو بەهێزی تیانوسیبوو، کەتیایدا ئاماژەی بەچاکەو کارەکانی سولتان دابوو لەجیهادکردن دژ بەفرەنجەکان لەژیانی نورەدیندا، پاشان لەئازادکردنی میسرو یەمەنو چەند ناوچەیەکی زۆر لەدەوروبەری مەغریبداو وتاداران بەناوی عەباسیەکانەوە، کە لەسەرەتاکەیدا بەنێردراوەکەی ئەوت: ئەگەر بڕیاری باوەڕکردن بدەین ئەوە بەیەکگەیشتنو دیدار پێویست دەبێتو دڵسۆزیش پێویستی بەهەوڵو نزا دەبێت، با ئاماژە بەو رووانە بکەین کەتازە رویان داوەو هیچیان هەڵبەستراو نین وشتانێك تیایاندا وتراوە کەلەوە زیاتر روویداوە، ئەمەش دڵخۆشکەرەو بەئاشکرا بارودۆخەکەمان بۆ روندەکاتەوە، چونکە خوای گەورە بەنهێنی ناپەرسترێت:

ومن الغرائب أن تسير غرائب  في الأرض لم يعلم بها المأمول

كالعيس أقتل مايكون لها الصّدى  والماء فوق ظهورها محمول

جا ئەگەر ئێمە بەدەستی خۆمان ئاگرمان گرتبێتو خەڵکی سودی لەروناکییەکەی بردبێتو ئاومان بەمشت هەڵگۆزیبێتو خەڵکی خواردبێتیەوە، و گەردنمان دابێتە بەر تیرو خەڵکیش سەیری کردبێت، ئەوە پێویستە ئێمەش کەرەستەی خۆمان وەربگرینەوەو گوێڕایەڵیمان بکرێتو پشکی خۆمان هەبێت لەناو دڵەکاندا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کەئێمە چاوەڕێی ئەوە بووین لەلایەن خاوەن نیعمەتەوە داوای دەستێوەردانو خزمەتکردنمان لێبکرێت، وەك چۆن دەستپێشخەر بووین ئاواش مافمان پێبدرێت، یەکەم کاریشمان ئەوەبوو کە ئێمە لەشامدا بوین دژ بەبێ باوەڕان تێدەکوشاینو ناوچەکانمان ئازاد دەکرد،... بەسەربازەکانمانەوە پێشڕەویمان دەکرد، ئێمەو باوكو ماممان، جا چ شارێك ئازادکراوە یان چ پێگەیەك گیراوە یان چ سەرکەوتنێك تۆمارکراوە کەئێمەی تێدا نەبووبین، پێموانیە کەس لەکارەکانی ئێمە بێ ئاگابوبێتو دوژمنیشمان نکۆڵی نییە کەکاروبار بەدەست ئێمەوە بێتو پێشڕەوی هەموان بکەینو سەربازەکان رێکبخەین، ئەوەش کەئێمە کردمان ئێستا شوێنەواری لەشامدا دەردەکەوێت، با خەڵکی تریش باسی لێبکات لەمیسریشدا بەردەوام هەواڵی خراپ بەڕێوەبردنو زاڵبوونی بچوکەکان بەسەر گەورەکانداو لاوازبوونی ئیسلام تیایداو سەرنەخستنی لەلایەن کەسەوە دەگەشت، فەرەنجەکانیش ئەبێت بەپارەی زۆر رووبەڕویان ببێتەوە، کەبڕەکەی زۆر ترسناکە سوننەکانیش ئەگەر چی یەکدەنگن، بەلام چەوساوەن، حوکمەکانی شەرعیش ئەگەر چی ناویان هەیە، بەلام کاریان پێناکرێتو بیدعەش تیایدا ئاشکراو باڵا دەستە، ئەو گومڕاییانەش کەتیادایەو ئاشکرا داوای دورکەوتنەوە لەئیسلام دەکرێت، ئەو

مەزهەباش تێکەڵی خوێنو گۆشتی خەڵك بووەو ئەو پەیکەرانەی کەوەك چەند خوایەك وان جگە لەخوا دەپەرسترێنو پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگار ئێمەش ورەمان خستە بەر خۆمان بۆ ئازادکردنی شوێنەکانو گێڕانەوەی هەڵاتوەکان لەئیسلام، دەرخستنەوەی شتە شاردراوەکانی ئیسلام، بۆیە بەسوپایەکی مەزنەوە بۆی کەوتینە ڕێو پارەو سامانێکی زۆرمان پێکەوە نا کەزۆر ماندوی کردینو لەگیرفانی خۆمانو بەئارەقی نێوچەوانو نرخی ئەو دیلە فرنجانەی کەکەوتبونە دەستمان پەیدامانکردبوو، بەڵام چەند شتێك هاتنە پێشەوە کەبونە ڕێگر، پاشان چەند نێردراوێك هاتنە لای میسریەکانو داوای بەدەمەوە چونی فرەنجەکانیان کردو هەموو شتێکیش وادەی دیاریکراوی خۆی هەیەو هەموو هیوایەکیش دەروازەیەکی هەیە، بڕیاری پەروەردگاریش وابوو کەئێمە بەباشترین شێوە بیگرینە دەستو بەشێوەیەکی بەهێزو تۆکمە فەرمانڕوایی بکەین، ئەوەبوو فەرەنجەکان ناپاکیان نواند لەگەڵ میسریەکانو ئاگربەستیان شکاندو مەبەستیان بوو ئیسلام ریشە کێش بکەن، میسریەکانیش لەکاتەدا نامەیان بۆ نوسین بەهەمان شێوە خەڵکی شامیش نامەیان بۆ نوسین، کەئەگەر بەدەم کێشەکەوە نەچین ئەوا لەدەست دەردەچێت، و ئەگەر رووبەڕووی دوژمنی ئەمڕۆ نەوەستین ئەوە لەدەست دەردەچێتو سبەی فریای ناکەوین، ئێمەش بەئەمیرە بەناوبانگەکانەوە کەوتینە ڕێ بۆ ئەو وڵاتەی کەدوو شت بونە ڕێخۆشکەر بۆمان: یەکەمیان ئەوەی کەدەیانزانی ئێمە مەزهەبی راست سەردەخەینو دووەمیشیان ئازادکردنیانو هەڵگرتنی باج لەسەریان، ئەوەبوو خوای گەورە سەرکەوتنی خۆی ناردوو دوژمن نومێد بڕاو دەستی لەو وڵاتە هەڵگرتدوای ئەوەی کەخاكو ئاوو وڵاتو هەرێمەکانی لەژێر دەست بوو و خاچی بەسەریاندا هەڵواسیبوو و، بتیان تیادا دانابوو، خەڵکیش بێ ئومێد بوون لەوەی کەئەو ناوچانەیان لەدەستبسەنرێتەوە، کاتێ گەیشتینە ئەو وڵاتە ژمارەیەکی زۆر سەربازی تیابوو کەسامانی زۆر یان هەبوو و ریزەکانیشیان یەکخستبوو، بۆ جەنگی موسڵمان بەتواناتر بوون هەتاوەکو جەنگی بێ باوەڕانو فێڵی نهێنیان بەهێزو ورەشیان زۆر بەرز بوو، دیارەو سەد هەزار سەربازی پیادەی سودانیشیان لەگەڵدای بوو، کەهەموویان بیانین، هیچ خوایەك ناناسن جگە لەخاوەنی کۆشك (پاشا) روگەشیان شوێنی ئەوو جێبەجێ کردنی فرمانی ئەوە، چەند سەربازێکی ئەرمەنیشیان تیایە کە لەسەرگاورێتی خۆیان مابونەوەو، سەرانەیان لەسەرهەڵگیرابوو، بەهێزو تواناو دڵگەرمو کارامە بوون، چەند خزمەتگوزارێکیشیان لەکۆشکەکانیاندا هەبوو کەگومڕایی دەڕازاندەوەو خەڵکی بۆ کەمەند کێش دەکرد. چەند نوسەرێکیشیان کەپێنوسەکانیان ئیفلیج کار بوونو خزمەتگوزارەکانیاش لەگەڵ رەشی دەمو چاودا رەشی رەچەڵەکیشان کۆکردبویەوە، دەوڵەتەکانیان گەورەبوون بوونو دان بەگەورەکانی تردا نانێتو هێندە لوتبەرزن کەویژدان رایان

ناچڵەكێنی، جا چۆن دەبێت هەنگاو هەڵگرین و ئەم بارودخە چارەسەربكەین، هەروەها ئەمانە حەرامەكانیان بەئاشكرا حەڵاڵ كردووەو فەرزەكانیان پەكخستووە بەهۆی نەریتی ناڕواوەو بەلێكدانەوەكانیان شەرعیان شێواندووەو وازیانهێنان لەو مەبەستەی كەخوای گەورە هەیبووەو بێباوەڕییەكیان بڵاوكردۆتەوە كەناوی تری لێراوەو شەرعێك وەلادەنرێن و حوكم بەشی تر دەكرێت، ئێمەش بەردەوام ئاگامان لێیان بووەو بەهەموو شێوەیەك لەگەڵیان ڕۆیشتووین و كاری وامانكردووە كە لەتوانای مرۆڤدا نییە، بەڵام ئەوان هانایان برد بۆ فرەنجەكان و جارێك بۆ بلبیس و جارێك بۆ دمیاطو هەر جارەش دوژمنێیكی زۆریان دەهێنایە سەرمان بەتایبەت لە (دمیاط)دا، كەهەزار كەشتیان هێنابوو، لەنێوان جەنگاوەرو بارهەڵگرداو لەوشكانیشەوە دوو سەد هەزار سوارو پیادەیان هێنا، دوو مانگ گەمارۆیانداو ئێوارەو بەیانی بەشەڕ دەهاتن و دەنگی شمشێرو قەڵغانەكان دەهات كە لەهەمولایەكەوە مەرگیان دەهێنا، ئێمەش لەگەڵ هەردوو دوژمنی ئاشكراو پەنهاندا دەجەنگاین و خۆڕاگربوین بەرامبەر بەهەردوو لایەنی دووڕوو وبێ باوەڕ، هەتاوەكو خوای گەورە سەركەوتنی خۆی خەڵات كردین و میسری و فەرەنجەكان بێ ئومێدبوون، پاشان بەربوینە تایفەكانی تری وەك ئەرمەن و سودان و سەربازەكان و لەقاهیرە وەدەرماننان بەفەرمانی یەكلاكەرەوەو بەهۆی كارخراپەكانیانەوەو بەشمشێری هەڵكێشراوو ئاگری سوتێنەر، هەتاوەكو كوشك و ئەو خەڵكانەی كەتیایدا بوون لەخزمەتگوزارو منداڵی پاشا پەرتەوازەبوون و بیدعەكانیان نەماو بانگەوازیان كپبویەوە،بەم شێوەیە قسەمان سەركەوت و تارمانداو پەرچەمی رەشی مەزنمان هەڵكرد، پەروەردگار ستەمكاری گەورە لەناوبەرێت و لەو سوێندەمان خۆش بێت كەگوناهی كەوتنی لەگوناهی هێشتنەوەی كەمترە، كاتێ دەستمان بەتاڵ بوو. بیرمان لەهێرشكردنە سەر وڵاتی بێ باوەڕان كردەوەو هیچ ساڵێك نەبووە هێرش نەكەین لەوشكانی و دەریاوەو بەكەشتی و پشتی وڵاخەوە، هەتاوەكو ژمارەیەكی زۆرمان كوشت و بەدیل گرت و بەزۆر ملكەچمان كردن[1]. چەندین پێگەوەو شوێنیشمان ئازاد كرد كەپێشتر موسڵمانان پێی نەگەیشتوونەپێ یاخود بەسواری، لەوشوێنانەش قەڵایەك لەسەربازگەی ئەیلەدا كەدوژمن لەناوچەی دەریای هیندا بنیاتی نابوو، كەپێیدا تێپەڕ دەبوون بۆ هەردوو حەرەمی پیرۆزو یەمەن، هەروەها هێرشیان كردە سەر كەناری حەرەمی پیرۆز چەند دیلێكی هەبوو، بەڵام توانیمان كوفر لەم قوڵەوە بێدەنگ بكەین، لەكاتێكدا كە زۆری نەمابوو كەخەڵكانی بێباوەڕ دەست بەسەر شوێنە پیرۆزەكاندا بگرن، وخەڵكانێك بچنە زێدو

---

[1] كتاب الروضتين (٣٦١١٢).

ئارامگەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەسەر ئاینەکەی نین، پاشان خوای گەورە ئەم قەڵایەی کردەوەو بوو بەپەناگەیەك بۆ جیهادو شوێنێك بۆ باڵیۆزی وڵاتان و خەڵکانی خواپەرست.

پاشان ئەڵێ: لەیەمەنیشدا خەڵکانێك هەبوون وەك کوڕی مەهدیو گومڕاوبێ باوەڕو بیدعەچیو هەڵگەڕاوە، کە چەند شوێنەوارێکی لەئیسلامدا هەبوو، تۆڵەیەکیشی لەسەر بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) چونکە هەستابوو بەگرتنی ئافرەتی بەئابڕوو بەڕێزو بەپارەیەکی کەم فرۆشتبونی، هەروەها بیدعەیەکشی لەسەر بوو کەئەویش بانگکردنی خەڵك بوو بۆ سەر گۆڕی باوکیو نانانی بەناوی کەعبەوە، هەروەك هەستا بەبردنو لەناوبردنی پارەی هاوڵاتیانی بێ تاوان، و داوێنی حەرامی حەڵاڵکرد، ئێمەش براکەمان بەسوپاکەمانەوە بۆ نارد دوای ئەوەی پارەیەکی زۆرو چەکێکی باشمان بۆ پێکەوەناو کەوتەڕێو سەرکەوت سوپاس بۆ خوا، و ئێستا لەوێوە تا هندو قسەمان باڵا دەستە، لەمەغریبیشدا کاری سەیرترمان ئەنجام داوە، کارەکانیشمان بەخوێنو رەنج بەئاکام گەیاندووە، دیارە لەوێ بنەماڵەی بنی مۆمن بەوە ناسرابوون کەکاروباریان بەرەو پێش چووەو وڵاتیان ئاوەدانەو سوپاکەشیان بێ شومارو روبەڕوو بونەوەیان سەختە، ئێمەش سوپاس بۆ خوا چەند ناوچەیەکی فراوانمان لێسەندن کەروبەڕی مانگێك ڕێ دەبێتو هێز لەدوای هێز سوپامان بۆ دەناردو ئەوانیش سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنتان توماردەکرد ئەو شوێنە بەناوبانگو پڕ دانیشتوانەی کەدەستمان بەسەردا گرتووە: برقەو قفصەو قسطيلية و توزر هەموو ئەمانەش وتاریان بەناوی گەورەمان المستضيیء بأمر الله تیادە ئەخوێندرێتەوەو حوکمە شەرعیەکان لەژێر ئاڵای شەکاوەیدا جێبەجێدەکرێت، لەهەمانساڵیشدا وەفدێك هاتە لامان کەوەفدی شارو وڵاتەکان بینیانو لەحەفتا سوار پێکهاتبوو کەهەموویان داوایان دەکرد وڵاتەکەیان ببێتە شوێنەکەوتوی سوڵتانو ئومێدیان بەبەڵێنی ئێمە هەبوو لەهەڕەشەمان دەترسان ئێمەش ڕێو رەسمی شوێنکەوتویمان بۆ ئەنجامدانو پلەو پۆستو ئاڵاو بڵاوکراوەکانمان بۆ دەرکردنو فەرمانو دادوەری خۆمان بۆ بڕیادان، هەرچی دوژمنانی دەوروبەریشە کەچاویان بڕیبووە ئەم وڵاتە بەهێزو دەسەڵاتی گەورەوە روبەڕوومان دەبوونەوەو لەسەرو هەمووشیانەوە ستەمکاری گەورەو جالوتی بێ باوەڕی فەرمانڕەوای قوسطنتینە، خاوەنی ئەو دەوڵەتەی کەماوەیەکی زۆر دونیای خواردووەو ئاینی گاورانی پەرپاکرد کەدەوڵەتەکەی هەموو میرنشینەکانی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەگەڵ ئەم ستەمکارەدا چەند روبەڕوو بوونەوەیەکی دەریایی لەنێوانماندا رویداو چەند نێردراوێك لەنێوانماندا ئاڵوگۆڕ کرا[1] بەنهێنیو ئاشکرا، لەمیسریش نەجوڵاین هەتاوەکو نێردراوەکانیان لەماوەی

[1] کتاب الروضتين (٣٦٥١٢).

یەکهەفتەدا دووجار هاتنە لامان بەدوو نامەوە، کەلەهەریەکێکیاندا ملکەچیو چەك فرێدانی خۆی پیشان دەداو داوای ئاگر بەستو دۆستایەتی دەکرد، تەنانەت ئەو ئاگاداری کردینەوە لەفەرمانڕەوای صقلیەو کەشتیگەلەکەی کەباسدەکرێتو لامان شاراوە نەبوو.هەروەها لەو بێ باوەڕانە فەرمانڕەوای صقلیە کەکاتێ زانیبوی کەفەرمانڕەوای شامو قسطنطینیە پێکەوە کۆبونەتەوە لەجەنگی دمیاطداو هەردوولا تێکشکاو دۆڕاون، ویستی هێزی خۆی تاقیبکاتەوەو کەشتیگەلەکەی نوێ کردەوەو سامانو کاتی خۆی تیادا سەرفکرد، کەئێستا پێنج ساڵە کەرەستەکۆدەکاتەوەو باشترینیان هەڵدەبژێرێتوئەم ساڵ گەیشتە ئەسکەندەریەو سوپایەکی هێنا کەدەریای پڕ کردبوو و سوپای وشکانیشی پڕی هەرێمێك بوو کەهەرگیز پاشایەك شتی وای بۆ کۆنەکرابویەوە، بەڵام خوای گەورە سەر شۆڕی کردو شکستی پێهێنا، لەو سوپاو هێزانەش کەهێنابوونی سوپای بوندوقیەکانو بەیشەنیەکانو جەنەواییەکان هەموو ئەوانە پێکەوە هێرشیا دەهێناو بەرپەچدانەوەیان زۆر زەحمەت بوو، ماوەیەکیشە ئەوانە ئەبنە باڵیۆزو پارە دێنن بۆمانو هەر یەکێکیان ئێستا کەرەستەی کوشتاری خۆیمان بۆ دێنیۆبەکردەوە باشەکانی لێمان نزیك ئەکەوتەوەو هەموو ئەمانە بڕیارمانداوە لەگەڵیاندا بڕۆینو ئاشتەوایی لەنێوانماندا بەرقەرارە، لەسەر ئەو شتانەی کەئێمە دەمانەوێتو ئەوان پێیان خۆش نییە، کاتێ خوای گەورەش بڕیاری مەرگی نورەدینی فەرموو ئێمە بەنیازی غەزا بوینو سەربازانمان خۆیان ئامادەدەکردو فەرەنجەکانیش هاتنە بانیاسو خەریك بوو دەستی بەسەردا بگرنو ویستیان هەڵەکە بقۆزنەوە، فەرمانڕەوای ئەو شارەش هانای بۆ ئێمە هێناو ئێمەش بەرەوئەو ناوچەیە بەڕێکەوتین، بەڵام ئەوان ئاگربەستی دیمەشقیان راگەیاند کەئەگەر ئێمە نەچوینایە بەئەنجام نەدەگەیەنرا، پاشان گەڕاینەوە وڵاتی خۆمانو بەردەوام هەواڵی ناکۆکیو پەرتەوازەی وڵاتی نوریمان پێدگەشت، کەهەموو قەڵایەکی فەرمانڕوایەکی بۆپەیدا بووەو هەر تەماعکارێکیش شوێنێکی بۆخۆی دابڕیوەو فەرەنجەکانیش چەندین قەڵایان دروستکردووەو چاودێری ناوچە موسڵمانەکان دەکەنو تەنگیان بەوڵاتی شام هەڵچنیووەو گەورە ئەمیرەکانینورەدینیش زیندانی یاخود سزا دراوو دەربەدەرکرانو کویلەو ماملیکەکان بونەتە خاوەنی وڵات لەکاتێکدا ئەوان بۆ گۆشەکان دانراوننەك پێشی پێشەوەو دەبێت بەپێوە بوەستن نەك دانیشن لەمەجلیسدا، ئەوانە دەستو چاوو شمشێریان درێژکردو خراپ رەفتاریان کردو فەرمانیاندا بەخراپەو نەهیان کرد لەچاکە[1]، هەریەکەش لەم دەسەڵاتدارانە یارمەتی لەفرەنجەکانەوە وەردەگرتو بەپشتو پەنای خۆیانیان دەزانین، ئێمەش بۆمان دەرکەوت ئەگەر

---

[1] كتاب الروضتين (٣٦٥١٢).

بەیتولمەقدیس هۆکاری ئازادکردنی فەراهەم نەکرێتو فەلسەفەی بێ باوەڕیش ئەگەر بڕیاری ریشەکێش کردنی نەدرێت، ئەوا رەگو ریشە دادەکوتێتو کەلێنی زیاتر ئەکەوێتە ناو ئاینەوەو خاوەن تواناکانیش گوناهی زیاتریان دەگات، دیارە ئێمە لەمیسرەوە ناتوانین ئەم کارە بکەین لەبەر دوری شوێنەکەو نەبونی ئاوەدانیو ماندوو بوونی ولاخەکانمان، بەلام ئەگەر لەمیسر تێپەڕین ئەوا بەرژەوەندی ئاشکرایەو سودی زیاترەو توانامان باشترەو ئەو ولاتە لێمانەوە نزیک دەبێتەوەو هێرش بۆ کردنی گونجاوەو ئازوقەش دابینکراوەو ئەسپەکانیشمان پشوویان دەبێتو سەربازەکانیشمان زۆرتر دەبنو کاتو دەرفەتیش زیاترەو بیروباوەڕە ناڕەواکانیش لەشامدا ناهێڵینو ئەمیرە ئیرەیی بەرو تەماع زاڵبووەکانو ئەقڵە نائامادەبووەکان کۆتایی پێدێتو ئەو کوڕە ئەپارێزین کە لەدوای باوکی دەسەلاتی گرتە دەست، چونکە ئێمە نزیکترین لێیەوە لەوکەسانەی کە بەناویەوە دونیا دەخۆنو ئەمەکداری خۆیانی بۆ دەرئەخەن لەکاتێکدا کەستەمی لێدەکەن، مەبەستیشمان لەئێستادا هەر شتێکەکەدەوڵەت بەهێز بکاتو بانگەواز دوپات بکاتەوەو ئومەت یەکبخاتو تەبایی بپارێزرێتو ناوچەکانی تر رزگار بکات،و هەموو رێوڕەسمەکان بۆ عەباسییەکان بەرپا بکات، کەرێوڕەسمێکی گشتگیرە لەمیسرو یەمەنو مەغریبو شامو هەموو ئەو شوێنانەی کە لەژێر رکێفی دەوڵەتی نورەدین دان، هەر ناوچەیەکیش کەخوای گەورە بەشمشێری ئێمەو سەربازەکانمان رزگاری بکات، بۆ هەر کەسێکی بکەین برا بێت یان کوڕ ئەوە زیندو راگرتنی بەخششەکانو نوێکردنەوەی بانگەوازە، بەگشتیش شام کاروبارەکانی نایەتە راستە بەو خەڵکەی کەتیایداو بەیتولمەقدیس کەسێك نییە بیپارێزێت، فەرەنجەکانیش ئێمە باش دەناسن وەك رکابەرێك کەبێزار نابێت لەجەنگ هەتاوەکو ئەوان بێزار نەبن بەشێوەیەك ئەگەر روبەڕوویش ببینەوە ئەوە بەشمشێر مەسەلەکە یەکلادەکەینەوەو ئەو دیلە ئازاد دەکەین کەخوای گەورە بەندەکەی شەوو رەوی پێکرد بۆی[1]، هەروەها لەنامەیەکی تری القاضي الفاضل دا هاتووە: دەرچونی سەلاحەدینلەماڵی نورەدین رێکەوتنێك بوو کە لەنێوان ئەوو نورەدین (رەحمەتی خوای لێبێت) هەتاوەکو لەمیسرو شامەوە دوژمنمان پەلکێش بکەین، سەلاحەدینلەدەریاو وشکانییەوە نورەدینیش لەدەشتو کێوی شامەوە،بەلام کاتێ خوای گەورە مەرگی یەکێکیانی پێشخستو ئەو رووداوانە رویاندا کەئەیانزانین،و کەلێنەکان بۆ موسڵمانان ئاشکرا بوو و سەنگەرەکان دۆڕێنرانو بۆچونە نادروستەکان زاڵ بوونو باتنیەکان بوونە دەسەلاتو سەرانی موسڵمانان دەدرا بەکافران لەبری موسوڵمانان، لەلایەن ئەو ئەمیرانەوە کە بناغەی ئیسلام بوونو سەرکەوتنەکانیان

---

[1] کتاب الدولتين (٣٦٧١٢).

تۆماركردووه بەشمشێرەكانیان سكاڵای دڵێتیان دەكرد ، فەرەنجەكانو بێ باوەڕانیش دەستیان دایە باڵەخانە دروستكردن لەسەر سنوری دەوڵەتی ئیسلامی، ئاشكراشە كەدوای ئەم كارەی ئێمە فرەنجەكان هەستان بە پەنابردن بۆ گاورە لایەنگرەكانیان لەوڵاتە جۆر بەجۆرەكانداو ئەوانیش خاچەكانیان بەرزكردەوەو هەڕەشەیان لەستەمكارە سەركردەكەیان كردو پیاوە ئاینیو قەشەكانیان خستەڕێ. موسڵمانانیش وتیان: بێ ئاگایی كارێك بەمرۆڤ دەكات كە بەئاسانی قەرە بوو ناكرێتەوەو هەر یەكە لەفەرمانڕەوای صقلیەو پاشای ئەڵمانو پاشاكانی ئەو بەری دەریاو فەرمانڕەوای دورگەكان وەك بوندوقیەو بیشانیەو جەنەواو شوێنی تر. خۆیان بەكەشتیگەلی بەهێزەوە ئامادەكردبوو، ئەمڕۆ ئەی ئەمیری باوەڕداران پشتیوانانی بەهێزترن بەتایبەت كە ئەوان هێزێكی ناڕەوا سەردەخەنو ئەو هەقو راستیو سەردەخات، ئەوان مرۆڤ دەپەرستنو ئەو خوا دەپەرستێت[1]، خەلیفەش وەڵامی داخوازییەكانی سەلاحەدینی دایەوەو دەسەڵاتی میسرو شامی پێسپاردو، دار الخلافەی بۆ نارد لەكاتێكدا كەگەمارۆی حەمای دابوو لەساڵی ٥٧٠ك/١١٧٤ زدا بەتەشریفاتو مۆڵكایەتیو مەراسیمو مۆڵەت پێدانەوە[2]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئارەزووی خەلافەتی عەباسی بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ سەلاحەدیندا بەشێوەیەكی راستگۆیانە چونكە پێی وابوو سەلاحەدین ئەو كەسایەتیەیە كە ئەو بۆشاییە پڕدەكاتەوە كەنورەدین جێیهێشتووە، هەروەها ئەم داننانە بەسوڵتانێتی سەلاحەدیندا وەك كەسایەتیەكی شیاو كارامە بۆ بەرگریكردن لەموسڵمانان، ئەم نازناوەش سامو شكۆی پێدا لەبەردەم ئەمیرە موسڵمانەكاندا بەگشتیو خاچپەرستاندا بەتایبەتی، سەلاحەدینیش سەرباری ئەو هێزەی كەهەیبوو پێویستی بەپاڵپشتی خیلافەت هەبوو لەململانێیدا لەگەڵ ئەمیرە موسڵمانە ركابەرەكانیدا بەتایبەت زەنكیەكان، هەر بۆیە خەلافەتی لەسەرجەم جموجۆڵو دەسكەوتەكانی ئاگادار ئەكردەوە هەتاوەكو پاڵپشتی مسۆگەر بكات[3].

٢- **چوونە ناو دیمەشقەوە:** سەلاحەدین بەسوپاكەیەوە گەیشتە دیمەشقو پێشوازییەكی باشی لێكراو، ابن المقدم یش لەرۆژی دووەمدا كلیلەكانی شاری دابەدەستەوە، بەڵام قەڵاكەی لێیاخی بوو كە بەدەستی خزمەتكارێكەوە بوو بەناوی جمال الدین رەیحان، سەلاحەدینیش توانی قایلی بكات لەدەستی وەرگرێت، بەم شێوەیەش سەلاحەدین دەستی گرت بەسەر دیمەشقو قەڵاكەیدا بەبیانوی پاراستنی الصالح ئیسماعیل لەمەترسی خاچپەرستەكانو ئەمیرە تەماعكارەكان، توانی ئەو موڵكانە بگێڕێتەوە كەسەیفەدین غازی فەرمانڕەوای

---

[1] كتاب الروضتين (٣٦٨١٢).

[2] تأريخ الأيوبين فی المصروالشام،ل : ٨٤.

[3] تأريخ الأيوبين فی المصر والشام،ل : ٨٤.

موسڵو جەزیرە دەستی بەسەردا گرتبوو[1]، هەروەها سەلاحەدین لەدیمەشقدا سیاسەتی پشتگیری کردنی خەڵکی پەیڕەوکردو فەرمانی دا بە بەخشینی پارە بە خەڵكو هەڵوەشاندنەوەی باجەکان وەرگرتنی پارەی زیادە لەخەڵك و باش مامەڵەکردن لەگەڵ دەرونەکاندا، هەروەها ڕێزی دەنا لەزانایان لەبەر ئەو کاریگەریە زۆرەی کە لەسەر خەڵك هەیانبوو، ئەوەبوو سەردانی ماڵی قاضی کمال الدین شارەزوری کردو بەدحاڵیبوونی نێوانیانی ڕەواندەوە[2]، قاضی شارەزوریش وەلامی دایەوەو وتی: ئاسودە بە فەرمان فەرمانی خۆتەو وڵات وڵاتی تۆیە[3]،وتەکانی قاضی ش ڕایگەیاندنی خۆبەدەستەوە دانی تەواوی دیمەشقەکان بوو بۆ سەلاحەدین‌ورازی بونیان بوو بەدەسەلاتی، هەر بۆیە خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی[4] و کاروبارەکانیان پێسپاردو ئەویش بەخۆشحاڵیو ڕێزلێنانو دڵخۆشیەوە لەگەڵیاندا جولایەوە[5].

پاشان سەلاحەدین وتارێکیدا بۆ خەڵکی دیمەشقو تیایداو وتی: خوای گەورە دیمەشقی بەلوتفی خۆی پێبەخشین نەك بەزۆر، سوپاس بۆ خوا هیچ تاوانو خراپەکاریەك تیایدا روینەدا، و هەڵەیەکیشمان نەکردووە کەکەس شتێکی لەبارەوە بڵێ، ڕەنگە بوترێ:... ئەیانزانی کەبا تۆزو گەرد رادەماڵێتو بەیانیش کۆتایی بەشەو دێنێتو شمشێریش هەواڵی ڕاسترەو حەقیش بینای بەهێزترەو بەتاڵیش بەزەحمەت لەناودەچێتو کەفیش لەخۆیەوە نامێنێت، بەلام ئێمە پێمانوایە کەلێبوردن نزیکترە لەپارێزگاریەوەو نزیکترە لەرێگای ڕاستیشەوە بۆیە خوێنمان نەرشتو دڵەکانمان ئاسودە کردو دەسەلاتمان وەك خۆی هێشتەوەو بەئاگری کینەمان وت ساردو سەلامەت بەو سەیری بارودۆخی ماڵی نورەدینمان کرد (خوا پایەداری بکات) بینیمان کەروناکی خامۆش بووە[6]، دوای دەست بەسەراگرتنی دیمەشق سەلاحەدین دەستی کرد بەجێبەکردنی سیاسەتەکەی لەیەکخستنی بەرەی ئیسلامیو سەر لەنوێ بنیاتنانەوەی، بەجۆرێك کەلەباکوری عێراقەوە درێژ بێتەوە بۆ وڵاتی شامو لەوێشەوە بۆ میسر، هەتاوەکو پاش ئەوە بتوانێت دەست بداتە جیهادی

---

[1] تأريخ الأيوبين في المصروالشام،ل : ٨٦.

[2] دور المدن الفلسطينية في مقاومة الغزو الصليبي، ل:٥٣.

[3] شذرات الذهب في أخبار من ذهب (٢٤٣/٤).

[4] شذرات الذهب في أخبار من ذهب (٢٤٣/٤).

[5] النجوم الزاهرة (٢٥/١)

[6] سنا البرق الشامي، ل: ٧٧، المفكر السوقي الأبويي، ل: ٧٧.

ئیسلامی دژ بەخاچپەرستان، وموسڵمانەکان بەهێزترو توکمەترین[1]. کاتێ کەدیمەشقی کونترۆڵکردو دەستی گرت بەسەر قەڵاکەیدا، ئاڵای دادگەریو چاکەی هەڵکردو ئاسەواری ستەمو دەستدرێژکاری نەهێشتو ئەو خراپەو کارە ناڕەوایانەی نەهێشت کەئەمیرەکان لەپاش نورەدین دایان هێنابوو کەخۆی لەباجو کاری ناڕەوادا ئەبینیەوە[2] پاشان بەردەوام بوو لەپێشڕەویدا بەئاراستەی باکور بۆ روبەروو بوونەوەی کمشتکین لەحەلەبدا، دوای ئەوەی کەطغتکینی برای دانا بەوالی دیمەشقو توانی حمص بگرێتو بەرەو حەلەب پێشڕەوی بکات، دوای ئەوەی کەقەڵاکەی بۆ کۆنترۆڵ نەکرا[3].

٣- **هێرشکردنە سەر حەلەب:** الملك الصالح دوای مردنی باوکی دەسەڵاتی گرتەدەستو بەهۆی ئەوەشەوە کەبچوك بوو نەیدەزانی کاروباری فەرمانڕەوای بەڕێوەببات، بۆیە بوونی لەسەرەوەی دەسەڵاتدا تەنها بەناو بوو، لەکاتێکدا کەیاریدەرانی توانیان دەستبگرن بەسەر تواناکانی وڵاتداو ناوەندی دەسەڵاتیان لەدیمەشقەوە گواستەوە بۆ حەلەب[4]، لەحەلەبیشەوە کمشتکین کەسەرپەرشتیاری الملك الصالح بوو بەتەنیا دەستی گرتبوو بەسەر دەسەڵاتی ئەو شارەداو دەستی کرد بەجێبەجێکردنی سیاسەتێکی تایبەت کەبەسەپاندنی دەسەڵاتو کۆکردنەوەی لایەنگر بۆ خۆی کۆتایی پێدەهات، ئەوەبوو ابن الدایەی دەستگیرکردو پلانی دانا بۆ دورخستنەوەی سەلاحەدین لەحەلەب بەهەموو شێوەیك کاتێك سەلاحەدینش بەرەو حەلەب پێشڕەوی کرد، کمشتکین نامەیەکی بۆ نوسیو تۆمەتباری کرد بەوەی کەحەزی لەپەلاماردانو دەستگرتنە بەسەر موڵکی نورەدین مەحمودی گەورەو الملك الصالح کوڕیدا[5] لەراستیشدا سەلاحەدین باش لەمەبەستو مەرامەکانی کمشتکین گەشتبوو، بۆیە نامەی لەگەڵ الملك الصالحدا ئاڵوگۆڕ کرد بۆ رونکردنەوەی مەسەلەکەو ئامۆژگاریکردنی بۆ رێگرتن لەتێکچوونی پەیوەندییەکان لەنێوانیاندا[6]، وادیارە کە الملك الصالح یش رازی نەبوو لەهەڵسوکەوتی ئەمیرەکانی بەڵام لاواز بوو و نەیدەتوانی لەخۆی دووریان بخاتەوە، هەروەك خێرا دەکەوتە ژێرکاریگەریانەوە لەبەر کەمی تەمەنی، یاریکردنی کمشتکینیش بەتواناکانی دەوڵەت دیارترین بەڵگەبوو لەسەر لاوازی، هەروەك رازی نەبوونی لەسەر دەستگیر کردنی

[1] تأریخ الأیوبین فی المصر والشام،ل : ٥٦.

[2] کتاب الروضتین (٣٤٤١٢).

[3] الکامل للأبن الأثیر، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٥٦.

[4] کنز الدرر (٧/٥٨-٥٩).

[5] مرآة الزمان (٣٢٧/٨)، تأریخ الأیوبین، ل:٥٧.

[6] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل:٥٧.

عزالدين جورديك ی فەرمانڕوای حەماو نێردراوی سەلاحەدین بۆ لای بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتن، کمشتکین گوێی بەم نارەزاییە نەداو ناوبراوی بەزنجیر کۆت کردو ئازاریداو خستییە ئەو بیرەوە کە کوڕەکانی ئیبن الدایەی تێخستبوو[1]، بۆیە ئاسایی بوو کە سەلاحەدین بەرەو حەلەب بەرێ بکەوێت بۆ رزگارکردنی الملك الصالحو نێردراوەکەی لەچنگی کمشتکینو دەست گرتن بەسەر حەلەبدا، لەبەر گرنگی ئەو شارەش لە پلانەکەیدا بۆ یەکخستنی هێزە ئیسلامییەکان، ئەوە بوو کمشتکین دەرگاکانی حەلەبی داخست بەرووی سەلاحەدیندا کە لە سی جەمادی کۆتایی سالّی ٥٧٠ك / ٣٠ی کانونی یەکەمی سالّی ١١٧٤ز گەمارۆیدا[2]، خەلّکەکەشی هەموو ملکەچ بوون جگە لەشیعەکان، الملك الصالح یش بانگهێشتی کردنەبۆ پاراستنی لەپیاوێك کەئەیەوێت میراتی لێ زەوت بکات، ئەوانیش بۆپشتگیری کردنی چەند مەرجێکیان هەبوو:

٥- بەشی رۆژهەلاّتی مزگەوتەکەیان بۆتەرخان بکات.

٦- دەستەواژەی (حی علی خیر العمل) بگێڕێتەوە بۆبانگو لەبازاڕەکاندا ڕابگەیەنرێت

٧- ناوی دوازدە پێشەواو ئیمامەکە لەکاتی تەرمو جەنازەدا ببرێت.

٨- پێنج جار (الله أکبر) بکرێت لەسەر تەرم.

٩- گرێبەستی هاوسەرگیریان بسپێردرێت بە أبی الطاهر الحسینی.

ئەوە بوو الصالح اسماعیل لەژێر فشاری کمشتکین ڕازی بوو بەمەرجەکانیان[3]، ئەمە لەکاتێکدا رویدەدا کەکمشتکین پەنای برد بۆ حەشیشەو خاچپەرستەکان، بۆ دورخستنەوەی سەلاحەدین لەشورای حەلەبو سنانی سەرکردەی شیعەی باطنی ئیسماعیلیش بەمە رازی بوو و کۆمەلّێك خۆبەختکار(فیدائی)ی لەجەمادی دووەمی سالّی ٥٧٠ك/ کانونی دووەمی ١١٧٥ز دا نارد بۆ تیرۆرکردنی سەلاحەدین بەجلی سەربازیەوەو هەندێکیان توانیان بچنە خێوەتەکەیەوەو زۆری نەمابوو پلانەکەیان جێبەجێبکەن،بەلاّم کارەکەیان ئاشکرا بووو سەلاحەدین لەو هەولّە تیرۆرکاییە رزگاریبوو[4]. پاش شکستهێنانی شیعەی ئیسماعیلی لەتیرۆرکردنی سەلاحەدیندا کمشتکین نامەیەکی نارد بۆ ریمۆندی ئەمیری طرابلوسو سەرپەشتیاری تەختی شانشینی بەتولمەقدیس، کەرێ بگرێت لەگەورە بوونی هێزیسەلاحەدین چونکە خاچپەرستەکان نەیاندەتوانی رێگر بن لەیەکێتی دیمەشقو

---

[1] زبدة الحلب فی تأریخ الحلب (٢/٥٢٠)

[2] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل:٥٧.

[3] البدایة والنهایة، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٥٨.

[4] مفرج الکروب (٨٢٤١٢).

قاهیره، بەڵام حەلەب لانیکەم کەملەدەرەوەی ئەو یەکگرتنەیە، هەر بۆیە خاچپەرستەکان دەرکیان بەوە کرد کەسەربەخۆیی حەلەب‌و مانەوەی بەدەستبنەماڵەی زەنکیەوە تاکە گرنتیە بۆ ڕێگرتن لەبەرپابوونی یەکێتێکی ئیسلامی کە لەنیلەوەدرێژ دەبێتەوەبۆ فورات، لەمەشدا بەرژەوەندیان لەگەڵ زەنگیەکاندا یەکی دەگرتەوە[1]، ڕێمۆندی سێیەمیش هەوڵیدا پەنا بەرێن بۆ هۆکارە سیاسیەکان‌و نوێنەری ناردبوو بۆ لای سەلاحەدین‌و هانیدا بۆ ئاشتەوایی‌و ڕێکەوتن‌و ئاماژەی بەوەدەدا: کەفرەنجەکان یەکیانگرتووە بونەتە هێز، بەڵام سەلاحەدین لەو هەڕەشە نەترساو بەهێرش کردنە سەر ناوچەیەکی دەوروبەری ئەنطاکیە وەڵامی دایەوە[2]، لێرەشدا ئەم فەرمانڕەوا خاچپەرستە هیچ چارەیەکی نەما بۆ دورخستنەوەی سەلاحەدین جگە لەهێرشکردنە سەر حمص، ئەوەبوو لەدەوروبەری حمص دا دەرکەوت‌و هێرشی کردە سەر شوراکانی، بەهۆی ئەو پشتیوانی‌و کۆمەکیەوە کەپاسگای قەڵاکە پێشکەشیدەکرد، کە لەسەر وەفاداری بۆ زەنکیەکان مابویەوە، ئەوەبوو سەلاحەدین ناچار بوو گەمارۆ لەسەر حەلەب هەلگرێت‌و شوراکانی بەجێهێشت لەپێناو ڕزگارکردنی حمصدا ، بەڵام ڕیمۆند هێندە نەمایەوە هەتاوەکو ڕوبەڕوی ببێتەوەو گەڕایەوە بۆ قەڵای أكراد (کوردەکان) پاش ئەوەی دڵنیا بوو لەبەدیهاتنی مەبەستەکەی[3] کاتێ سەلاحەدینیش دڵنیابوو لەپارێزراوی حمص، جێی هێشت‌و بەرەو بەعلەبەك ڕۆیشت‌و دەستی بەسەرداگرت لە(٤)ی ڕەمەزانی ٥٧٠ك (٣٠) ئازاری ١١٧٠زدا[4]، ئەمیرەکانی حەلەبیش دەیانزانی کەسەلاحەدین لەڕووی مادی‌و مەعنەویەوە لەوان بەهێزترە، ئەوەبوو لەپلاندانانادا دژی بەهەڵەداچوون‌و، پشتیان بەستبوو بەئەگەری ووڕژاندنی سێ هێز لەدژی کەئەوانیش: موسڵ‌و فەرەنجەکان‌و ئیسماعیلیکان بوون، بۆ ئەم مەبەستەش نێردراوێکیان بەنامەیەکی بروسکاویەوە نارد کەئەویش قطب الدین ینال کوڕی حسان المنجي بوو، سەرباری ئەوەش کەسەلاحەدین خۆی پێشوازی لەم نێردراوە کردو زۆر بەخێری هێناو سێ ڕۆژ لای مایەوە، بەڵام ئەو لەکۆتاییدا نامەیەکی پێداو وتی: ئەو شمشێرانەی کەمولکی میسریان پێداین هێشتا بەدەستمانەوەیەو ئەو ڕمانەی کەلەکۆشکی فاطمیەکاندا بوو هێشتا بەشانمانەوەیە، ئەو پیاوانەش کەئەو سەربازانەیان لێدورخستیتەوە، ئەمڕۆ ڕێت لێدەگرن‌و بەرپەرچت دەدەنەوە، چونکە تۆ لەسنوری خۆتت تێپەڕاندووە، لەکاتێکدا کەتۆ یەکێکت

---

[1] الحركة الصليبية (٧٤٤١٢)، تأريخ الزنكيين، ل: ٥٨.

[2] كتاب الروضتين (٢/٣٥٠|٣٥١).

[3] تأريخ الزنكيين فى مصر وبلاد الشام، ل: ٥٩.

[4] الكامل فى التأريخ، له تأريخ الزنكيين، ل: ٥٩.

لەخزمەتکارەکانی نورەدین‌و پێویستە پارێزگاری لەمنداڵەکانی بکەیت[1]. سەلاحەدینیش بۆ هیچ شتێك لەمانە وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو چاوپۆشی لێکردوو بەشێوەیەکی نەرم پێی وت: چاك بزانە من بۆیە هاتووم بۆ شام بۆ یەکخستنی موسڵمانان‌و پاراستنی خەڵکەکەی‌و گرتنی کەلێنەکان‌و پەروەردەکردنی کوڕانی نورەدین، کۆتایی هێنان بەدەستدرێژی دەستدرێژکاران، ئیبن حسانیش وتی: نەخێر تۆ بۆ ئەوە هاتویت کەدەسەلات بۆ خۆت زەوت بکەیت‌و ئێمەش ڕێی ئەوەت پێنادەین، دەبێت خوێنی بۆ بڕژێت‌و منداڵی بۆ هەتیوو بخەیت، سەلاحەدینیش پێکەنی‌و ئاماژەی کرد بۆ هەندێ لەپیاوانی کەبیبەنە دەرەوەو دانی بەخۆیداگرت هەرچەندە ئەو هێرشی کردە سەر، سەلاحەدینیش وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە هاتووم ئەم الملك الصالح لەدەستی هاوشێوەکانی تۆ ڕزگاربکەم، چونکە ئێوە هۆکاری لەناوچونی دەسەلاتی بون[2]. ئەوە بوو کمشتکین رازی نەبوو ملکەچی سەلاحەدین بێت‌و هەموو هەوڵێکی خستەگەڕ بۆ بەرپەچدانەوەی لەو کارە زیرەکانەش کەکمشتکین بەرامبەر بەسەلاحەدین بەکاریهێنا:

- یاریکردن لەسەر ناکۆکی تائیفی‌و دانوستاندن لەگەڵ کۆمەڵی شیعە لەوڵاتداو ماستاو بۆ کردنیان، ئەوانیش ئەو مەرجانەیان بۆ دانا کەباسکران‌و پێشتر نورەدین قەدەغەی کردبوو، بەڵام ئەم ڕێی بەهەموو ئەو شتانەدا هەتاوەکوبەرگری لێبکەن[3].
- یاریکردن بەهەست‌و سۆزی خەڵك، ئەوە بوو خەڵکی کۆکردەوە کەبەشێکیان شیعەبوون‌و والملك الصالحی منداڵی هێنایە دەرەوەو وتارێکی بۆ خوێندەوە کەکمشتکین خستبوویە سەر زمانی وتی: من پەروەردەکراوو میوان‌و پەناهەندەی ئێوەم، گەورەتان بەلامەوە وەك باوك وایەو لاوتان وەك برا وایەو بچوکتانوەك کوڕ وایە... پاشان قورگی گیراو پڵمە گریان بوو، خەڵکیش بەمەهەڵخەڵەتان مێزەرەکانیان فڕێداو دەستیان دایە گریان‌و هاوارکردن، وتیان: ئێمەی کۆیلەی توو باوکتین‌و لەبەر دەستتدا دەجەنگێین‌و ماڵ‌و گیانمان دەبەخشین بۆت‌و دەستیان کرد بەنزا رەحمەت بۆکردن‌و بۆ ناردن بۆ باوکی[4]، ئەم هاوپەیمانێتیە حەلەبی‌و ئسماعیلی‌و موسڵی‌و فەرەنجەش نەیتوانی ببێتە بەربەست بەرامبەر پرۆژەی یەکخستنی سەلاحەدین‌و بەهاتنی مانگی نیسان هات سەلاحەدین دەستی گرتبوو بەسەر سەرجەم ناوچەکانی وڵاتی شامدا تەنانەت شاری حەماشی لەباکورەوە کۆنترۆڵکرد، پاش ئەوەی

---

[1] كتاب الروضتين (٣٤٦/٢).

[2] كتاب الروضتين (٣٤٦/٢)، صلاح الدين الملك المجاهد، ل: ١٥٩.

[3] صلاح الدين الملك المجاهد، ل: ١٦١.

[4] كتاب الروضتين (٣٤٨،٣٤٩/٢).

کاری دەکرد بۆ شەرعیەت پێدانی دەسەڵاتو بارودۆخی نوێ لەبەردەم موسڵمانانندا، دیارە پێشتر وتارەکەیمان بۆ خەلیفەی عەباسی المستضیء بالله رونکردەوەو کە لەنامە درێژەکەی القاضی الفاضلدا هاتبوو و تیایدا باسی فتوحاتەکانو جیهادی دژ بەخاچپەرستانو خزمەتەکانی دەوڵەتی عەباسیو گەڕاندنەوەی خوێندنەوەی وتار بەناویانەوەو مسۆگەرکردنی رێگای حیجازو یەمەنی کردبوو پاشان لەنامەیەکدا ئاماژەی داوە بەوەی کە ئەو بۆ چاکسازی کردن لەکاروبارەکانو پاراستنی سەنگەرەکانو خزمەتکردنی کوڕەکەی نورەدین مەحمود هاتووە بۆ شامو لەکۆتایشدا داوای کردووە کەمەراسیمی شوێنەکە وتەی خەلیفەی عەباسی لەیەمەنو میسرو مەغریبو ولاتی شامو هەموو ناوچەکانی نورەدینو هەر ناوچەیەك کەئازادی دەکات پێببەخشێت[1].

٤- **جەنگی قرون حەما:** سەیفەدین غازی فەرمانڕەوای موسڵ چاودێری فراوانخوازیەکانی سەلاحەدینی دەکرد لەولاتی شامداو نیگەران بوو بەدەستگرتنی بەسەر دیمەشقو حمصو حەماو بەعلەبکداو گەمارۆدانی حەلەبیش تورەی کرد، پاشان مەسەلەکەی بەباشی بۆ روونبویەوە، چونکە ئەگەر سەلاحەدین بەردەوام بوو لەپێشڕەویداو توانی حەلەب بخاتە سەر دەوڵەتەکەی، ئەوە دەبێتە هەڕەشەیەکی ترسناك بۆ سەر موسڵ چونکە دواتر دەبێتە ئامانجێکی ئاسان بۆی، لێرەشەوە سەیفەدین غازی دووەم دەرکی کردبەپێویستی یەکگرتنی لەگەڵ حەلەبدا لەهاوپەیمانێتیەکی بەرگریدا دژ بەسەلاحەدین[2]. ئەوە بوو لەوکاتەدا صالح ئیسماعیل کەوتە ژێر فشاری سەلاحەدینو داوای کۆمەکی ئامۆزاکەی کردکەفەرمانڕەوای موسڵ بوو بەناردنی سەرباز بۆی، پاشان وەفدەکە توانی قایلی بکات بەوەی کە پێویستە کۆمەکی الصالح ئیسماعیل بکات بۆ وەستان لەبەرامبەر سەلاحەدین، چونکە هەرکات توانی حەلەب داگیربکات ئەوە پەلاماری موسڵیش دەدات[3]، دیارە سەیفەدین غازی دووەمیش پێویستی بەوە نەبوو کەکەس هانیبدات بۆ رووبەڕوو بونەوەی سەلاحەدین، چونکە دەیزانی کەهەرکاتێك بێئاگا بوو لەسەلاحەدین ئەوە هەموو ولات دەگرێتەوە دەستو جێ پێی خۆی دەکاتەوە، هەر بۆیە سەربازەکانی موسڵو جەزیرەی کۆکردەوەو خۆی ئامادەکردبۆ پەڕینەوە لەوفوراتەوە بۆ حەلەب، ناردیشی بەدوای عیمادالدین زەنکی دووەمی براشی کەفەرمانڕەوای شەنگار بوو داوای لێکرد بەهێزەکانییەوە بگاتە لای ، بەلام عیمادالدین

---

[1] کتاب الروضتین (٢/٣٥٧- ٣٦٦).

[2] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦٠.

[3] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦٠، لە: تأریخ الأیوبین،ل: ٦٠.

داواكەی جێبەجێ نەكرد، چونكە سەلاحەدین پێشتر بەلای خۆیدا رایكێشابوو،بەوەی كە ئەو برا گەورەیەو هەقی ئەوە ببێتە گەورەی بنەماڵەی زەنكی،ئەمەش فەرمانڕەوای موسڵی ناچاركرد كەبراكەی بەزۆر ملكەچ بكاتو هێزێكی سەربازیشی نارد بۆ حەلەب بەسەركردایەتی عیزەدین مەسعودی برای[1]، عیزەدین مەسعودیش لەیفورات پەڕییەوەو بەئاڕاستەی حەلەب كەوتە رێ، كاتێ گەیشتەوە ئەوێ سەربازەكانی تر پەیوەندییان پێوەكردو بەرەو حەما بەڕێكەوتو گەمارۆی دا پاش گفتوگۆو تاوتوێكردنی مەسەلەكە لەنێوان هەردوو لای ئەیوبیو زەنگیدا، هەردوولا گەیشتینەئەو بڕوایەی كەبەرژەوەندی گشتی لەوەدایە كەلێكبگەنو خوێنی موسڵمانان نەڕژێت، بۆیە درێژەیان بەدانوستانی نێوانیانداو گەیشتنەرێكەوتن لەسەر ئەم خاڵانە:

- چاوپۆشیكردن لەو جموجۆڵەی موسڵ دژ بەسەلاحەدین.
- سەلاحەدین دەستبەرداری ئەو شارو قەلایانە دەبێت كە لەولاتی شامدا دەستی بەسەردا گرتوون بەتایبەت حمصو حماو تەنها دیمەشقی بەدەستەوە دەمێنێت، بەمەرجێك كەلەوێش وەك جێنشینی الصالح ئیسماعیل هەڵسوكەوت بكاتو وتارو دراویش بەناوی ئەوەوە بێت
- سەلاحەدین هەموو ئەو شتانە بگێڕێتەوە كە لەخەزێنە بردویەتی[2]، ئەم رێكەتنەش بارودۆخێكی باشی رەخساند بۆ زەنكیەكان هەتاوەكو لایەنگرانیان زۆر بكەن لەولاتی شامدا، شكۆی ماڵی زەنكی گەڕاندەوە، رازی بوونی سەلاحەدینیش بەبنەمای لێككەیشتن بەمەبەستی پاراستنی ولات بوولەهەلوەشانەوەودابەشبوون دورلەبەرژەوەندییەتایبەتییەكان، بەلام زەنكیەكان كەشانازیان بەهێزەكانیانەوە دەكردو هەلپەی دەسكەوتنی ئیمتیازی زیاتریان دەكرد بەتایبەت كاتێ بەكەمی ژمارەی سەربازانی سەلاحەدینیان زانی، ئەوەبوو داوای الرحبەو دەوروبەریان لێكرد، ئەویش ئامادەنەبوو داخوازییەكەیان جێبەجێ بكات بەبیانوی ئەوەی كە بەدەست ناصر الدين محمدی كوڕی ئەسەدەدین ئامۆزایەوەیەتیو بەهیچ شێوەیك بەوە رازی نابێت[3]، بەم شێوەیە سەلاحەدین رێی نەدا بەدروستبوونی هیچ جیابونەوەك لەریزەكانیدا، بەڵكو بەوەشی زانیبوو كەزەنكیەكان ئەیانەوێت لەناوەوە دەست لەریزەكانی بوەشێنن، بۆ پاراستنی ریزەكانی لا گرنگتر بوو، دەرەنجامی ئەم رازی نەبونەش زەنكیەكان بڕیاریاندا كردەوە سەربازییەكانیان دەست پێبكەنەوە، بەلام سەلاحەدین توانی

---

[1] الكامل فى التأريخ، لە: تأريخ الأيوبين، ل: ٦٠.

[2] كتاب الروضتين (٣٧٨/٢).

[3] هەمان سەرضاوة (٣٧٩/٢).

سوپای زەنکی شکست پێبێنێت لەشوێنێکدا لەسنوری حەما لەدۆڵی روباری عاصی کە بە(قرون حەما) ناسراوە لەباکوری شاری حەماوە لە١٩ی رەمەزانی ٥٧٠ك/٢٣ی نیسانی ساڵی١١٧٥ز، کۆمەڵێك لەئەمیرەکانی بەدیل گرتو پاشان ئازادی کردن‌و دوژمنانی هەتاوەکو دەروازەی حەلەب راونا گەمارۆی بەسەر ئەو شارەدا بۆ جاری دووەم سەپاندو فەرمانیدا کەوتار بەناوی الملك الصالح وە نەخوێندرێتەوەو ناوی لەدراودا سڕییەوە لەو ناوچانەی کەدەکەوتنە ژێر دەسەڵاتیەوە[1]، لەگەڵ ئەمەشدا پێی وانەبوو کەهێندە هێزی هەیە کەبتوانێت درێژە بەجەنگ بدات، لەلایان خۆشیانەوە حەلەبیەکان ئارەزووی رێکەوتنیان هەبوو[2]، دەرەنجامی ئەو گفتوگۆو دانوستانەش کە لەنێوان هەردوولادا روویدا گەیشتنە ئاگربەستێك کەبەپێی ئەو ئاگر بەستە سەلاحەدین ئەو ناوچانەی کە بەدەستییەوەیەتی لەوڵاتی شامدا دەبێتە موڵکی‌و هاوپەیمانە زەنکیەکانیش ئەو ناوچانەیان پێدەدرێت کە بەدەستیانەوەیە، لەگەڵهەندێ لەوزەویانەی کەئەکەوێتە باکوری حەما وەکو المعرَة[3]. وکفر طاب[4]، دوای مۆرکردنی ئەم رێکەتنەش سەلاحەدین حەلەبی بەجێهێشت[5]، ئەم سەرکەوتنەش کەسەلاحەدین بەدەستی هێنا یارمەتیدەر بوو بۆ چەسپاندنی پێگەی بەتەواوی لەشامدا، لەهەمان کاتیشدا پێگەی رکابەرەکانی لاوازکرد، ئەمەش پاڵی پێوەنا هەتاوەکو نازناوی (پاشای میسرو شام) لەخۆی بنێت‌و بەناویەوە نزای بۆ دەکرا لەمیمبەرەکانیدا، هەروەك دراوی زێڕیشی بەناوی خۆیەوە لێدا[6]. لەراستیشدا سەلاحەدین راستگۆ بوو لەمامەڵەکردنی باش لەگەڵ الملك الصالح ئیسماعیل داو، هەڵیدا بڕوای پێبێنێت کەئامادەی خزمەتکردنیەتی بەدڵسۆزیەوە، لەهەمان کاتدا راشکاو بوو لەوەدا کەرێ بەرکابەرەکانی نادا لێی نزیك بکەنەوە، صالحیش لەلایەن خۆیەوە ئەم خزمەتەی بەیەکێك لەپێویستیەکانی باڵادەست بوونی خۆی دەزانی‌و بەپێوستی دەزانی لەسەر سەلاحەدین، بەم رەتکردنەوە ئیجابیەش بۆ هەموو هەوڵەکانی لێکگەیشتن، سەلاحەدین هیچ چارەیەکی تری

---

[1] تأريخ الزنكيين فى مصر وبلاد الشام، ل: ٦١.

[2] تأريخ الزنكيين فى مصر وبلاد الشام، ل: ٦١.

[3] المعرَة: شارێکی گەورەیە لەناوچەی حمص لەنێوان حلبو حەمادا

[4] كفر طاب: شارۆچکەیەکە لەنێوان المعرَة وحلبدا، الحمودی (٤٧-١٤)

[5] النوادر الساطانية، ل: ٩٤.

[6] تأريخ الأيوبين فى مصرو بلاد الشام، ل: ٦١.

لەبەردەمدا نەبوو جگە لەخۆدارِنین لـە وەلاءو لایـەنگری، لـەم بارودۆخـەداو هـیچ پاسـاوێکی بەدی نەدەکرد بۆ ئەوەی کەنازناوی پاشا لەخۆی نەنێت[1]

دیارە جەنگی القرون دەنگدانەوەی مەترسیداری هەبوو وەك چۆن دەرەنجامەکەشی مەترسیدار بـوون، چـونکە سـولتان هـەر کـە لەرێگـەی حـەماوە گەڕایـەوە نێردراوەکـانی خەلیفـە مسـتـضیء گەیـشتنە لای‌و تەشـریفات‌و ڕێو رەسـم‌و ئـالا رەشـەکان‌و ئیمـزای دیـوان یـان پێبـوو بـۆ بـوون بەسولتانی میسرو شام جگـە لەحەلـەب، بـەم پێیـەش بـوو بەسـولتانی شـەرعی‌و بـەهێزو گـەورەی هـەموو ناوچـەکەو، میراتگـری راسـتەقینەی نـورەدین، ئەمـەش زەنکییـەکانی نیگـەران کـردو رقـی حەلـەبی‌و فرەنجـەکانی دژی زیـاتر کـردو، بـووە هـۆی هەڵگیرسـاندنەوەی جـەنگ‌و وەك ئـەوەی رێکەوتنی لەگەڵ حەلەبدا هیچ نەبوبێت[2].

٥- **جەنگی (تل السلطان)**: دوا هەوڵ بوو بۆ دەرپەڕانـدنی سـەلاحەدین، چـونکە جـەنگی نێـوان ئەیوبی‌و زەنکیەکان بەسەرکەوتنی لەقرون حمادا کۆتایی نەهات، چونکە سەیفەدین غازی بێ ئومێد نەبوو کاتێ هەواڵی شکستی بیستو، وەرگرتنی نازناوو تەشریعاتی خەلیفەش لەلایەن سەلاحەدینەوە بۆ حوکمکردنی میسرو وڵاتی شام ووڕژاندی، ئەمە جگە لەلێدانی دراو بەناوی سـەلاحەدینەوە، ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـەبیر لەتۆڵـە سـەندنەوە بکاتـەوەو پلانێکـی سەربازی دابنێت بۆ گەمارۆدان‌و سەرکەوتن بەسەریداو ئەمەش بەچوار میحوەر دەکرێت:

- نـاردی بـۆ لای ئـەمیرەکانی حەلـەب‌و گلـەیی لێکـردن بـۆ پەلـەکردنیان لەرێکـەوتن لەگـەڵ سەلاحەدینداو هانیدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی‌و پشتگیریکردنی لەجەنگی داهاتوویدا[3].
- باڵیۆزێکی نارد بـۆ ریمۆنـدی سـێیەمی فـەرمانڕەوای طرابلـوس‌و سەرپەرشـتیاری میرنـشینی بەیتولمەقـدیس‌و داوای لێکـرد کـە لەگەڵیـدا هاوپـەیمانێتی مـۆر بکـات‌و پـشتگیری بکـات دژ بەسەلاحەدین[4].
- ویـستی لەمەبەسـتەکانی سـەلاحەدین تێبگـات‌و نێردراوێکـی بـۆ نـارد بـەبیانوی ئاشـتەوایی‌و وەرگرتنـــی پـــەیمان لێـــی، مەبەســـتی سەرەکیـشی ئاشـــکرا کردنـــی پـــلان‌و مەبەســتەکانی سەلاحەدین‌و بەهەڵەدا بردنی بوو، بەڵام نێردراوەکە کەوتە هەڵەوەو نامەی سـەیفەدین غـازی دووەمـی بـۆ ئـەمیرەکانی حەلـەب دەرهێنـا کـاتێ سـەلاحەدینیش خوێندیـەوە لەمەبەسـتی

---

[1] تأريخ الأيوبين فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦١.

[2] صلاح الدين الفارس المجاهد،ل :١٧٠.

[3] مفرج الكروب (٣٦/٢)، تأريخ الأيوبين، ل: ٦٢.

[4] تأريخ الأيوبين فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦٢.

بنەماڵەی زەنگیو پلانیان گەیشتو لەهەمان کاتیشدا زانی کەئەمیرەکانی حەلەب ڕێکەوتنەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە لەئامادە سازیدان بۆ دەستپێکردنەوەی جەنگ[1].

- هەریەك لەفەرمانڕەوایی قەڵای کیفا[2] و ماردینو ئەمیرەکانی تری تورکمانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، هەروەك عمادالدین زەنگی براشی کەفەرمانڕەوای شەنگار بوو ئامادەیی خۆی دەردەبڕی بۆ هاوکاریکردن لەگەڵیدا[3]. دیارە سەلاحەدین لەم بارودۆخە دوژمنکارانەوەدوور نەبوو، بۆ ئەوەش کەرێ بگرێت لەهاوکاری سەیفەدین غازیو فەرمانڕەوای طەرابلوس، پێشنیاری دۆستایەتیو ئاشتەوای لەگەڵ ئەمەی دوایدا کرد ئەگەر بێتوو بەبێلایەنی بمێنێتەوە، هەروەك هەموو دیلە خاچپەرستەکانی ئازادکرد وەك هێمایەك بۆ نیەت پاکی[4]، ئەوە بوو سەیفەدین غازی ژمارەیەکی زۆر سەربازی کۆکردەوەو بەرەو نصیبین پێشڕەوی کرد[5]، ئەمەش لەمانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٧١ك/ ئەیلولی ١١٧٥ز دا بوو، هەتاوەکو کۆتایی وەرزی زستان تیایدا مایەوە، پاشان لەفوراتەوە پەڕییەوە بۆ البیرة[6]، نامەیکی نوسی بۆ سەعدەدین کمشتکینو الملك الصالحو ئیسماعیل بۆ پشتیوانی کردنی، ئەوە بووڕێکەوتن کەفەرمانڕەوای موسڵ بەرەو حەلەب پێشڕەوی بکاتو لەگەڵ برازاکەیدا کۆببێتەوە بۆ بڕیاردان لەسەر هەنگاوی داهاتوو[7]، پاشان هەردوو لا لەشوێنێکدا کۆبونەوە بە (عین المبارکة) دەناسراو بڕیاردرا سوپای حەلەب بچێتە پاڵ سوپای موسڵەوە، بەم پێیەش ژمارەی سوپا گەیشتە بیست هەزار سەرباز، پاشان ئەم سوپا زەبەلاحە بەئاراستەی دیمەشق پێشڕەوی کرد لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥٧١/مانگی ئازاری ساڵی ١١٧٦زدا، لە(تل السلطان) لەدووری بیست میل لەباشوری حەلەبەوە جێگیربوون[8]، لەم کاتەشدا کمشتکین بڕیاریدا هاوکاری خاچپەرستەکان بکات بۆ ناچارکردنی سەلاحەدین بۆ جەنگکردن لەدوو بەرەی جەنگەوە هەتاوەکو لاوازی بکات، بۆ ئەمەش هەستا بەئازادکردنی دیلە

---

[1] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦٣.

[2] قەڵای کیفا: گوندێکی گەورەیە بەسەر دنیسو دارادا دەڕوانێت.

[3] زبدة الحلب (٢/٥٢٣).

[4] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٦٣.

[5] نصیبین: شارێکی ئاوەدانە لەوڵاتی جەزیرە لەسەرجادەی کاروانەکانی موسڵو شامدا.

[6] البیرة: شارۆچکەیەکە لەنزیك سمیساط لەنێوان حەلەبو سەنگەرەکانی ڕۆمداو قەڵایەکی تۆکمەیە.

[7] الکامل فی التأریخ، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٦٣.

[8] مفرج الکروب(٢/ ٣٨)، تأریخ الأیوبین، ل: ٦٣.

خاچپەرستەکانلەحەلەبداو بەتایبەت رینۆلد شاتیونی فەرمانڕەوای رەها وەك دەستپێشخەری‌و سەلماندنی نییەت پاکی[١].

سەلاحەدینیش بەئاراستەی رکابەرەکانی جموجۆڵی کرد دوای گەشتنی کۆمەکی لەمیسرەوە بۆی‌و لە رووباری العاصی پەڕییەوە لەلای شیزەرەوە[٢] لەمانگی شەوالی/ مانگی نیسان بەقرون حەمادا تێپەڕی هەتاوەکو گەیشتە (تل السلطان)و دە رۆژ تێنەپەڕی سەیفەدین غازی بەشێوەیەکی کتوپڕ بەسەربازەکانیەوە لەبەرامبەریدا ئامادەبوو، لەو کاتەشدا سەربازەکانی بڵاوەیان کردبوو بۆ ئاودانی ئەسپەکانیان، بەڵام فەرمانڕەوای موسڵ دوو دڵ بوو لەهێرش کردنداو بڕیاریدا روبەروبوونەوەکە دوابخات بۆ رۆژی دواتر[٣]، کاتێك لەبەرە بەیانی رۆژی داهاتوودا سەربازەکانی ئامادەکرد لەدەی شەوال/ دوازدەی نیسان بۆ هێرشکردنە سەر سەربازگەی سەلاحەدین کات تێپەڕیبوو[٤]، ئەوە بوو هەردولا رووبەرووی یەکتر بوونەوە لەجەنگێکی توندا، خەریك بوو یەکەم هێرشی سوپای زەنکییەکان سەرکەوتتوبێت، بەڵام سەلاحەدین هێزە یەدەکەکانی هێنا بۆ رەتدانەوەی هێرشەکەیان‌و هێڵەکانی دوژمنی تێکشکاند، توانی هەتاوەکو ئێوارە جەنگەکە یەکلابکاتەوە،زەنکییەکان تووشی شکستی قورس بوون،ەهەندێ لەسەرکردەکانیان بوون بەدیلی سەلاحەدین، بەڵام سەلاحەدین جوامێری نواندو ئازادی کردن[٥]، ئەمەش نەرمی نواندن بوو لەبیرکردنەوەی سیاسیدا، وادیارە مەبەستی راکشانی ئەوانە بوو بەتایبەت کەخەڵکانێکی خاوەن پلەو پایەو کاریگەریان تێدا بوو، کەوای لەسەیفەدین غازی دووەم کرد ئەم شکستە قبوڵ بکات‌و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی[٦] دیارە لەم جەنگەشدا جگە لەدوژمنایەتی سەلاحەدین هیچ دەستکەوتێکی نەبوو، ئەو ماڵ‌و سامانەش کە لەسەربازگەکەیدا بەجێیهێشت سەلاحەدین بەسەر سەربازەکانیدا دابەشیکرد، ئەم سەرکەوتنە یەکلاکەرەوەش، رێ خۆشکەر بوو بۆ سەلاحەدین بۆ دەستگرتن بەسەر حەلەب‌و دەوروبەریداو لکاندنی بەدەوڵەتەکەیەوە، بەڵام لەم کاتەدا نەیدەویست سوپای سەیفەدین راوەدوو بنێت‌و گەمارۆی حەلەب بدات‌و، تەنها بەچەند پەلامارێك بۆ سەر موڵکەکانی رکابەرەکەی لەناوچەکەدا وازیهێنا، پاش ئەوەی سەربازەکانی دەستیان گرت بەسەر ئەو قەڵاو

---

[١] ولیم الصوری(٢/٩٨٦)، تأریخ الأیوبین، ل: ٦٤.

[٢] شیزر: قەڵایەکە کەکورەیەکی تێدایە لەشامدا لەنزیك المعرّة‌و لەنێوان المعرّة‌و حمادا

[٣] تأریخ الأیوبین، ل: ٦٤.

[٤] تأریخ الأیوبین، ل: ٦٤.

[٥] تأریخ الأیوبین، ل: ٦٤.

[٦] النوادر السلطانیة، ل: ٥٩، تأریخ الأیوبین، ل: ٦٥.

شورانەدا کەدەکەوێتە باکورو باشوری حەلەبەوە، دەرەنجامی ئەم پەرتەوازییەش کەریزی موسڵمانانی گرتەووە هەردوولا بڕیاریاندا کەدەست بەدانوستان بکەن بۆ چەسپاندنی ئاشتیو لەپێناو ڕێگەگرتن لەسود بردنی خاچپەرستەکان لەم بارودۆخەو لەپێناو بەرژەوەندی گشتی موسوڵمانانندا، بۆ ئەم مەبەستەش هەر لایەنەو دەستی لەچەند مەرجێك هەڵگرتو لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

- هەموان یەکدەستو یەك هەڵوێست بن بەرامبەر بەخاچ پەرستەکان.
- نابێت هیچ لایەك ئەم پەیمانە هەڵبوەشێنێتوە.
- ئەگەر یەکێك لەو دوو لایەنە ڕێکەوتنەکەی هەڵوەشاندەوە یان پێچەوانەی جوڵایەوە، ئەوە هەموان دژی دەوەستن هەتاوەکو پاشگەزببێتەوە.
- سەلاحەدین دەستبەرداریقەڵای عەزاز[1] دەبێت بۆ الملك الصالح.
- ئەم ڕێکەوتنە لەمانگی محرمی ساڵی ٥٧٢ك/تەموزی١١٧٦ز[2] دا بەسترا.

٦- **کۆچی دوایی سەیفەدین غازی دووەمو عیزەدین مسعودی یەکەم:** ئەو پێهاتانەی کە موسڵ بەخۆیەوە بینی دوبارە موسڵی کردە جێی سەرنجی سەلاحەدین ئەوە بوو لەمانگی سەفەری ساڵی ٥٧٦/ تەموزی ١١٨٠داکۆچی دوایی کرد[3] ئەوە بوو خەڵکی لەساڵی ٥٧٥ك هاتنە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە لەئاکامی ئەو قاتو قڕیو گرانییەی کەڕوی لەوڵات کردبوو، سەیفەدینیش لەکەژاوەکەی خۆی هاتە دەرەوەو خەڵکیش وروژان وپەنایان بۆهێناو داوایان لێکرد کەفەرمان بدات بەڕێگرتن لەفرۆشتنی مەی، ئەویش وەڵامی دانەوە، ئەوانیش چونەوەشارو رویان کردە ماڵی مەی فرۆشەکان دەرگاکانیان شکاندنو تاڵانیان کردو مەیەکانیان ڕژاندو، بتڵەکانیان شکاندوکاری نادروستی زۆریان کرد، خاوەنی ماڵەکانیش پەنایان برد بۆ جێگرەکانی سوڵتانو سکاڵایان کرد دژ بەپیاو چاکێك بەناوی ابوالفرج الدقاق، بەڵام ئەو لەتاڵانوخراپەکاریەکانی خەڵکدا بەشدارنەبوو بوو بەڵکو تەنها مەی ڕشتبوو، کاتێ بینی خەڵك ماڵەکان تاڵان دەکەن ڕێگری لێکردن، بەڵام ئەوان گوێیان پێ نەدا، کاتێ سکاڵای لەدژ تۆمارکرا هێنایان بۆ قەڵاو مشتەکۆڵەیەکیان کێشا بەسەریداو مێزەرەکەی کەوتە خوارەوە، کاتێ ئازادکراو ویستی دابەزێت لەقەڵاکە بەسەری ڕوتەوە دابەزیو ئەوانیش ویستیان مێزەرەکەی ببستنەوە بەسەریەوە، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو وتی: سوێند

---

[1] عزاز: گوندێکە قەڵایەکی تیایە لەباکوری حەلەب.

[2] مفرج الكروب(٤،١٢)، تأريخ الأيوبين، ل: ٦٥.

[3] تأريخ الأيوبين فى مصرو بلاد الشام، ل: ٦٦.

بەخوا سەرمدا ناپۆشم هەتاکو خوای گەورە تۆڵەم دەکاتەوە لەوکەسانەی کەستەمیان لێ کردوم، ئەوەبوو زۆری نەخایاند ئەوکەسە مرد کەئازاری دابوو،بەدوای ئەوەشدا سەیفەدین نەخۆش کەوتو نەخۆشیەکەشی هەتاوەکو کۆچی دوایی بەردەوام بوو، لەوکاتەشدا تەمەنی سی ساڵ بوو، ماوەی فەرمانڕوایشی دە ساڵو چەند مانگێك بوو و یەکێك بوو لەکەسە زۆر جوانەکانو باڵای زۆر ڕێك بوو، روخۆشو پێست سپی بوو، ریشی بازنەی بوو، لەشیشی مامناوەندبوولەنێوان لاوازیو قەڵەویداومرۆڤێکی ژیرو شکۆداربوو، زۆر خۆی پێچ نەدەدا لەکاتی سواربوونی وڵاخو دانیشتندا، پاکداوێن بوو هیچ شتێکی لێوەباسنەکراوە کەپێچەوانەی پاکێتی بێت. هەروەك بەویقارو جوامێر بوو، نەیدەهێشت هیچ خزمەتگوزارێکی بچێتە ماڵی هاوسەرەکانییەوە، مەگەر خزمەتگوزارەکە تەمەنی کەم بووایە، هەروەها رقی لەرشتنی خوێنو بردنی پارەو پول بوو کەمێکیش روژدورەزیل بوو[1] ،پاش کۆچی دوایشی موسڵ کەوتە گێژاوێکەوە لەسەر مەسەلەی جێنشینی، چونکە سەیفەدین غازی دووەم رای وابوو کەدەسەڵات بسپێردرێت بەمعز الدین سنجری کوڕی کە لەو کاتەدا تەمەنی دوازدە ساڵ بوو،بەلام لەوە دەترسا کەسەڵاحەدین دەست وەربداتە ناومیرنشینەکەی بەتایبەت کەکوڕەکەی بچووك بوو، هەروەك عیزەدین مەسعودی براشی دژ بەم بۆچوونە بوو بەبیانووی ئەوەی کە ئەو مافی خۆیەتیو ئەو شیاوترە بۆ ئەو کارەو ئەمیرەکانی موسڵیش پشتگیریان دەکرد،ئەمیر موجاهەدین قایمازیش ئەو مەترسیانەی خستە پێش چاو سەیفەدین غازی دووەم کەرووبەروی دەوڵەتی ئەیوبی دەبێتەوە، ئەگەر منداڵێکی وەك کوڕەکەی ئەو بکرێتە پاشا، واش دیارە کەسەیفەدین غازی باوەڕی هێناوە بەڕای ئەمیرەکانی بۆیە عزالدین مەسعودی کردە جێنشینی خۆی[2].

٧- **کۆچی دوای الملك الصالح ئیسماعیل کوڕی نورەدین مەحمود:** کۆچی دوای الملك صالح لە بیستو پێنجی ساڵی ٥٧٧ی کۆچیدا بوو، هۆکارەکەشی (وەك باسکرا) ئەوەیە کەئەمیر علم الدین سلێمانی کوڕی جندر لەراودا ژەهری دەرخوارد داوە لەناو هێشووە ترێدا ،هەندێکیش دەڵێن: یاقوتی ئەلئەسەدی لەنلو شەربەتدا پێی داوە،دەشڵێن: لەخشکنانجەیەکدا بوو، تووشی ئازار بوو بەو شێوەیە مایەوە هەتاوەکو مرد رەحمەتی خوای لێبێت. ئەمیش گەنجێکی جوانو پێکەوتووبوو، بیست ساڵی پڕ نەکردبویەوە، یەکێکبوو لەپاکترین پاشاکانو

---

[1] تأريخ الأيوبين فى مصرو بلاد الشام، ل: ٦٦.

[2] الكامل فى التأريخ، (٩/٤٤٧،٤٤٦)

هەر کەسێکیش لە باوکی بچێت ئەوەستەمی نەکردووە، پزیشکەکان مەی خواردنەوەیان وەکچارەسەر بۆ داناو ئەویش فتوای لەچەند زانایەك داوا کردنەوانیش فتوایان بۆ دا، پاشان پێی ووتن ئایا خواردنەوەی مەی ئەجەلم نزیك یان دوردەخاتەوە؟ ووتیان: نەخێر.وتی: سوێندبەخوا نایخۆمەوە هەتاوەکو نەچمە خزمەتی پەروەردگارو شتێکم خواردبێ کە قەدەغەی کردووە ، کاتێ لەخۆی بێزاربوو و نەخۆشی زۆری بۆ هێنا ئەمیرەکانی بانگکردو کەبەیعەت بدەن بەعزالدین مەسعودی ئامۆزای‌و فەرمانڕەوای موسڵ لەبەر بەهێزی دەسەلاتو توانای‌و هەتاوەکو نەهێڵێت دەست سەلاحەدین بکەوێت، هەروەها مەترسیشی هەبوو لەوەی بەیعەت بەعمادەدین زەنکی ئامۆزاو فەرمانڕەوای شەنگار بدات، چونکە مێردی خوشکەکەی‌و پەروەردەکراوی دەستی باوکیەتی‌و ناتوانێت لەسەلاحەدین بیپارێزێت، کاتێ کۆچی دووای کرد حەلەبیەکان عیزالدین مەسعودی کوڕی قطب الدین یان بانگکرد، کەفەرمانڕەوای موسڵ بوو، ئەویش هات بۆ لایان‌و چووە ناو حەلەبەوە بەشکۆمەندیەکی زۆرەوەو ئەو رۆژەش رۆژێکی مەزن بوو، ئەمەش لەبیستی شەوالدا روویدا خەزێنەو بەرهەمەکانی وەرگرت‌وهەموو چەکەکانی دەستبەسەرا گرت، تقی الدین عمریش لەشاری مینجدا بوو بەرەو حەما هەلاتو بینی خەڵکەکەی‌ە شوێن دروشمی عیزالدین ی فەرمانڕەوای موسڵ کەوتوون حەلەبیەکانیش تەماعیان خستە بەردەم عیزالدین مەسعود بۆ داگیرکردنی دیمەشق، لەبەر سەرقاڵ بوونی سەلاحەدین لەولاتی میسرداو ئامادەنەبوونی لەدیمەشقدا،هەروەك ئاگاداریانکردەوە لەخۆشەویستی خەڵکی شام بۆ ئەماڵە ئەتابەکیە، ئەویش وتی: لەنێوان ئێمەو ئەواندا بەڵێن‌و پەیمان هەیە، چۆن ناپاکی بنوێنم. بۆیە ماوەی چەند مانگێك لەحەلەب مایەوەو پاشان بەرەو الوقە رۆیشتو تایدا دابەزی‌و نوێنەرەکانی عمادالدین زەنکی برای هاتنە لای‌و داوایان لێکرد حەلەبیان بۆ بگۆڕێتەوە بەشەنگارو زۆر جەختیان لەسەر ئەو مەسەلەیە کردەوە، براکەشی سەرەتا ئامادەنەبوو،بەلام دواتر بەنابەدڵی ئەو کارەی ئەنجامداو حەلەبی رادەستکردن، عمادالدینیش سنجارو خاپورو رەقەی نصیبین‌و سروج‌و چەند شوێنێکی تری رادەستی ئەو کرد، کاتێك سوڵتان سەلاحەدین ئەم مەسەلانەی بیست بەسەربازەکانیەو لەمیسرەوە کەوتەڕێ بەرەو رۆژهەلات گەشتە فوراتو لێی پەڕییەوە، هەندێ لەئەمیرەکانی موسڵیش‌و ویستیان بەری پێبگرن، پاشان

سەلاحەدین دەستی گرت بەسەر هەموو ولاتی جەزیرەداو ویستی موسلیش گەمارۆ بدات ،بەلام بۆی نەچووە سەر، پاشان بەرەو حەلەب هاتوو لەعمادالدین زەنکی وەرگرت[1].

٨- **گەمارۆی یەکەمی موسڵ:** ئەو پێشهاتە سیاسیانەی کەولاتی شامو جەزیرەو موسل پاش کۆچی دوایی الملك الصالح ئیسماعیل بەخۆیەوە بینی پالی یەسەلاحەدینەوە نا بۆ بەجێهێشتنی میسرو بەرێکەوتن بەرەو رۆژهەلات هەتاوەکو نزیك بێت لەو روداوانەی کە لەوێدا روودەداتو بەپێی پێویست دەست وەربداتە بارودۆخەکە ئەو کارەش کەعزالدین مەسعودپێی هەستابوو لەحەلەبدا بەهەلوەشاندنەوەی، رێکەوتنی نێوان ئەیوبیو زەنکی دادەنا، چونکە ئەم شارەو قەلاکانی دەوروبەری سەر بەناوچەکان ژێر دەسەلاتی سەلاحەدینەو خەلیفە پێی سپاردووە هەروەکئەم کارەی عیزالدین مەسعودیش دەبێتە هۆی لەناوبردنی پرۆژەی یەکێتی ئیسلامی کەسەلاحەدین هەولی بەدیهێنانی دەدا، بۆیە چەند رێوشوێنێکی گرتە بەر لەکاتی بەرێکەوتنیدا بەرەو رۆژهەلات بۆ جیاکردنەوەی حەلەب لەناوچەکانی دەوروبەری لەو رێوشوێنانەش:

أ- داوای لەتقی الدین عمری برازای کە فەرمانڕەوای حەمابوو و فروخ شا کەفەرمانڕەوای دیمەشقو ئەمیرەکانی تر کرد کەهێرش بکەنە سەر ناوچەی رۆژئاوای جەزیرەوبیخەنە سەر ناوچەکانی تری ژێر دەسەلاتی ئەیوبی هەتاوەکو ببنە رێگر لەپەڕینەوەی سوپای موسل لەرووباری فورات، بەلام تقی الدین نەیتوانی رێ لەعزالدین مەسعودی یەکەم بگرێتو مەسعودیش هاتە ناوحەلەبەوە، هەروەها فەروخ شاش سەرقال بووبەپەرچدانەوەی هێرشەکانی رینۆلد شاتیون کەدەیویست لەقەلای کرکەوە هێرش بکاتە سەر دورگەی عەرەبی[2].

ب- نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە عەباس الناصر الدين الله (٥٧٥ك- ٦٢٢ك) (١١٨٠ز- ١٢٢٥ز). کەتیایدا باسی کارو جیهادی خۆی دەکرد لەئیسلامدا، ئەو کارە مەزنانەی کەپێشکەشی خەلافەتی عەباسی کردو رۆلی خۆی خستە روو لەروخاندنی خەلافەتی فاتمیداو گێڕانەوەی دەسەلاتی عەباسی بۆ میسر، لەهەمان کاتدا خراپی بارودۆخی ولاتی شاموهێرشکردنی خاچپەرستەکان بۆ سەر حارم[3] و ناپاکی فەرمانڕەوای موسلو دەستدرێژی کردنی سوپای حەلەب بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیو هانا بردنیان بۆ خاچپەرستەکانو نامە

---

[1] البداية والنهاية (٥٥٣/١٦).

[2] تأريخ الأيوبين في مصرو بلاد الشام، ل: ٦٩.

[3] حارم: شورایەکی تۆکمەو شارۆچکەیەکی پیرۆزە لەلای ئەنطاکیە ئێستا سەر بەحەلەبە.

گۆڕینەوەیان لەگەڵ حەشیشەکاندا بەمەبەستی هاوکاریکردنیان دژ بەپرۆژەی یەکێتی ئیسلامی کەسەلاحەدین هەوڵی پێکهێنانی دەدا.ئەوەشی یاد خستەوە کەخەلیفە مستضیء بأمر الله حەلەبو دەوروبەری خستۆتە ژێر دەسەلاتیەوە، ئەویش تەنها لەبەر کوڕەکەی نورەدین مەحمود دەستبەرداری بوو، ئێستاش داوای مافی خۆی دەکات، ئەمەشی بەم شێوەیە دەربڕی: ئێستا با هەر کەسەو مافی خۆی وەرگرێتو بە بەشی خۆی رازی بێت[1]، لەلای خۆشیەوە عیزالدین مەسعودی یەکەم رویکردە خاچپەرستەکان بۆ هێنانو هاندانیان بۆ هێرشکردنە سەر سەنگەرەکانی موسڵمانان، هەتاوەکو سەلاحەدیت سەرقاڵ بکات لەهێرشکردنە سەر وڵاتەکەی، سەلاحەدینیش بەهۆی ناپاکی فەرمانڕەوای موسڵەوە مایەوەو بڕیاریدا گرنگی بەناوچەی باکووری شامو جەزیرە بداتو روبکاتە حەلەبو موسڵو لەکاتی بەرێکەوتنیشیدا بەرەو حەلەب مظفر الدین کەوکەبەری فەرمانڕەوای حەڕان چووە پاڵیەوەو ئامۆژگاری کرد بەپەڕینەوە لەفوراتو دەستگرتن بەسەر ئەو ناوچانەدا کە کەوتونە رۆژهەلاتیەوە پێش بەرێکەوتن بۆ حەلەب، هەتاوەکو بەهۆی ئەوێوە شوێنەکانی تری لەیاد نەچێت، هەروەها بەڵێنی هاوکاریو کۆمەکیشی پێدا[2]. شایانی باسە کەوکەبەری ناکۆك بوو لەگەڵ فەرمانڕەوای موسڵو قایمازی جێگریدا کە لەولایەتی ئەربیل (هەولێر) دوری خستبویەوە[3]، ئەوە بوو سەلاحەدین بەرەو حەلەب بەرێکەوت پشت ئەستور بەبێبەری بوونی خەلیفەو بۆ ماوەی سێ رۆژ گەمارۆی حەلەبیدا لەمانگی جەمادی یەکەم/ ئەیلولدا پاشان بەرەو موسڵ بەرێکەوت بۆ دەرهێنانی لەژێر رکیفی بنەماڵەی زەنگی، ئەوە بوو سەرەتا دەستی گرت بەسەر جەزیرەو قەلاکانی دەوروبەریدا پاشان لەفوراتەوە پەڕییەوە لەنزیك البیرە ، کەمحەمەدی کوڕی ئەلیاسی ئەرتەقی فەرمانڕەوای گوێڕایەڵی بوو ئەرتەقیەکانی قەلای کیفاو ماردینیش ملکەچی بوون پەیوەندیان کرد بەسوپاکەیەوە، ئەوەبوو شارەکانی جەزیرەو رەهاو سروج[4]و نصیبینو رەققەو خاپورو هتد یەك لەدوای یەك خۆیان بەدەستوەداو سەلاحەدینیش شاری رەهای دا بەکەوکەبەریو حوسامەدین ئەبالهەیجای سەمینیشی کردە والیو کار بەدەستی نصیبین، خاپوریشی بەخشی بە جمال الدین

---

[1] مفرج الكروب(٢/١١٠-١١٢)، تأريخ الأيوبين، ل: ٧٠.

[2] الكامل فى التأريخ، لە: تأريخ الأيوبين، ل: ٧٠.

[3] تأريخ الأيوبين فى مصرو بلاد الشام، ل: ٧٠.

[4] سروج: شارۆچکەیەکە نزیك حەڕان لەوڵاتی میسر، الحموى (٢١٦١٣)

خوشترین[1]، بەم شێوەیە سەلاحەدین توانی دەست بەسەر هەموو ولاتی مصردا بگرێتو هاوپەیمانیتیەك دروست بكات دژ بەمیرنشینی موسڵ. لەم حاڵەتەشدا تەنها بەرێكەوتن بۆ موسڵو دەستبەسەراگرتنی لەبەر دەمدا مابوویەوە، چونكە موسڵ سەرچاوەی دڵەڕاوكێو مەترسیو كۆسپێك بوو لەبەردەم بەدیهێنانی ئامانجەكانیدا كە بەبێ دەستگرتن بەسەر موسڵو شەنگارو جەزیرەی ئیبن عومەردا بەدی نایەت[2]. هەروەها سەلاحەدین لەمانگی رەجەبی ساڵی ٥٧٨دا/ كانونی یەكەمی ١١٨٢ز گەشتە موسڵو ئابڵوقەیەكی توندی بەسەردا سەپاندو پاشان هێرشی بۆ كرد، بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت بەهۆی توكمەییو بەهێزی شوراكانیو ئەو ئامادەكاریە باشەی كەعیزالدین مەسعودی یەكەمو قایمازی جێگری كردبویان، هەستابوون بەكۆكردنەوەی سەربازێكی زۆر بۆ بەرگری كردن لێیو چەكو ئامێری جەنگی زۆریان لەدەوروبەری شار دامەزراندبوو[3]، سەلاحەدینیش لەكاتی گەمارۆكەدا هەستا بەگەشتێكی بەسەركردنەوە بەدەوروبەری شارداو دڵنیا بوو لەوەی كەناتوانێت دەستی بەسەردا بگرێت[4]، فەرمانڕەوای موسڵیش لەم كاتەدا بەهەموو لایەكدا كەوتە جموجۆڵ بۆپەیداكردنی هاوپەیمانو قاضی بەهائەدینی كوڕی شەدادی نارد بۆ بەغدادو پەنای بردبۆ خەلیفەی عەباسی بۆ دورخستنەوەی سەلاحەدین لەولاتەكەی،خەلیفەش نامەیەكی نوسی بۆ شیخالشیوخ صدر الدین كە لەگەڵ سەلاحەدیندا بوو، فەرمانی پێكردكەببێتە ناوبژیوان لەنێوان هەردوولادا[5]، هەروەها داوای كۆمەكی لە[6] قزل ئەرسەلانی فەرمانڕەوای ئەزەربایجان[7] و پەهلەوانی كوڕی ئیلدكزی ئەتابەكی هەمەدان كرد[8] بەڵام تەنها بكتمری سقمان هات بەهانەیەوەو هەستا بەناردنی وەفدێك بۆ لای سەلاحەدین بۆتكاكردنو وازهێنان لەموسڵ[9]، هەرچەندە سەلاحەدین داوای وەفدەكەی بكتمر رەتكردەوە، بەڵام تێكڕای ئەم هۆكارانە بونە

---

[1] مفرج الكروب(١١٩/٢)، تأريخ الأيوبين، ل: ٧١.

[2] جزیرەی ئیبن عومەر: شارۆچكەیەكی لەباكوری موسڵەوە سێ رۆژ دوورە، الحموی (١٣٨/٢).

[3] الكامل فی التأریخ، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٧١.

[4] تأریخ الأیوبین، ل: ٧١.

[5] مفرج الكروب(١٢٢/١)، تأریخ الأیوبین، ل: ٧١.

[6] خلاط: شارۆچكەی عامیرەی بەناوبانگ كەخاوەنی خێرو بێرێكی زۆرە

[7] ئازەربایجان: هەرێمێكی بەرفراوانە ناوەندەكەی شاری تەبریزە، الحموی (١٢٨/١)

[8] هەمەدان: گەورەترین شارە لەهەرێمی چیاكاندا

[9] الكامل فی التأریخ، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٧٢.

هـۆی ئـەوەی کـە بەپلانەکەیـدا بـچێتەوە بۆدەسـت بەسـەراگرتنی موسـڵ لـەرێی هێـزی سەربازییەوە، و ئارەزووی گرتنە بەری شێوازی سیاسی کرد، واش پێدەچێت کەسەڵاحەدین تووشـی تەنگـە تـاوی بوبێـت لـە لەدەسـت دانـی پلـەو پایـەو پێگـەی خـۆی ترسـابێت وەك تێکۆشـەرێك لـەپێناو ئیـسلامدا، بـەهۆی دەرکەوتنیـەوە وەك کەسـێك کەچـاوی بڕیوەتـە میرنشینی موسڵ، بۆیە سوڵحو ئاشتەوای پێشنیارکرد بۆ عیزالدین مەسعودی یەکەم، ئەویش داوای گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی کرد کە سەلاحەدین دەستی گرتبـوو، سـەلاحەدینیش رازی بوو بەمەرجێك کەرازی نـەبێت بەدەسـت بەسـەراگرتنی حەلـەب، بـەڵام فـەرمانڕەوای موسـڵ رازی نەبوو ناپاکی بەرامبەر بەبراکەی بنوێنێتو سـور بـوو لەسـەر هێڵانـەوەی لـەژێر رکیفـی براکەیداو ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ یارمەتی دانی ئەگەر روبەڕوی مەترسی ببێتەوە[1].

ج- دەست بەسەراگرتنی شەنگار: دەرەنجامی هەرەسهێنانی دانوستـانەکان لـەنێوان هـەردوولا، سـەلاحەدین رای وابـوو کەگـەمارۆی لەسـەر موسـڵ تونـد تـر بکـاتو دابڕێـت لەحەلـەب، شەنگالیش ئەو شارە بوو کەئـەم سیاسـەتەی بـۆ مـسۆگەر دەکـرد بۆیـە ئابلوقـەی هـەڵگرت لەسەر موسڵو بـەرەو شـەنگار بەرێکـەوت. لـە١٦ی شـەعبانی سـاڵی ٥٧٨/ك ١٥ی کـانوونی یەکەمی ساڵی ١١٨٢زدا، بۆ ماوەی ١٥ رۆژ گەمارۆیدا هەتاوەکو دەستی بەسەرا گرت[2].

د- دەرئەنجامەکانی دەست بەسەرا گرتنی شەنگار: دەست بەسەرا گرتنـی شـەنگار بـووە هـۆی تورە بوونی ئـەمیرەکانی جـەزیرە، بۆیـە بانگهێشتیان کـرد بـۆ بەسـتنی هاوپەیمانێتییـەکی بـەرگری دژ بەسیاسـەتی سـەلاحەدین، چـونکە هـاتنی بـۆ جـەزیرەو دەسـتگرتنی بەسـەر شـەنگاردا بـوە مایـەی بێزاریـان، بـەو پێیـەی کەئاسایـشیان دەخاتـە مەترسـییەوە، هاوپەیمانییەتیەکەش لەشاە ئەرمەن سقمان فـەرمانڕەوای خـلاطو قطب الـدینی کـوڕی نجم الدین أبـی فـەرمانڕەوای مـاردینو دەوڵـەتی شـاهی فـەرمانڕەوای بـەدلیس[3] و ئـەرزن[4] لەگـەڵ عزالدین مەسعودی یەکەمدا[5] پێکهاتبوو، پاشـان هاوپەیمانـەکان چـوونە دەرەوە بۆروبـەروو بوونەوەی بەسود وەرگرتن لەبڵاوبوونەوەی سـەربازەکانی بەجـەزیرەدا، ئـەوەبوو لەناوچـەی حرزمی ماردیندا سەربازگریان پێکەوەنا، کاتێ سەڵاحەدین بەجموجۆڵەکانی زانـی سـوپاکەی

---

[1] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٢.

[2] الكامل فى التأريخ، لە: تأريخ الأيوبين، ل: ٧٢.

[3] بەدلیس : شارۆچکەیەکە لەدەورووبەری ئەرمینیا نزیك خلاط، الحموی (١/٣٥٨).

[4] ئەرزن: شارێکی بەناوبانگە نزیك خلاط

[5] تأريخ الزمان غريغوريوس الملطى، ل: ١٩٩.

کۆکردەوەو بەرەو رأس العين بەرێکەوت[1] بۆ رووبەروبونەوەیان، بەڵام ئەوان وادیار بوو لە رووبەروو بوونەوە دەترسان بۆیە بڵاوەیان لێکردو هەریەکە گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی[2]، بەم شێوەیە عزالدین مەسعودی یەکەم لەهەوڵەکانیدا بۆ وەدەرنانی سەلاحەدین لەناوچەی جەزیرە شکستی هێنا سەرباری پشگیری کردنی هەندێ لەئەمیرەکان بۆی‌و هێندە هێزی بەدەستەوە نەما کەبتوانێت کۆسپ بۆ پڕۆژەکانی سەلاحەدین دروست بکات لەناوچەکەدا[3].

٥- دەستبەسەرا گرتنی ئامەد: سەلاحەدین سودی لەبڵاوەپێکردنی نەیارانی و لاوازیان وەرگرت‌و بەرەو ئاماد پێشڕەوی کرد پاش وەرگرتنی مۆڵەت لەلایەن خەلیفە الناصر الدین الله وە بۆهێرشکردنە سەری نورەدین محەمەدی فەرمانڕەوای قەڵای کیفاش زۆر داوای هێرشکردنە سەرو دەست بەسەرا گرتن‌و راستکردنەوەی ئەو شارەی لێکرد، بەپێی ئەو رێکەوتنەی کە لەنێوانیاندا روویدا[4]، ئەوەبوو سەلاحەدین لە١٧ی ذی الحجەی ساڵی٥٧٨ك/١٥ی نیسانی١١٨٣دا گەیشتە ئامەدو ئابلوقەی بەسەردا سەپاند فەرمانڕەواکەشی کەمحمد کوڕی ئیلدکز بوو زۆر لاواز تەنها بەناو دەسەلاتداربوو، دەسەلاتداری راستەقینەش بەهائەدین نیسان بوو، کەزۆر پیسکەو بەدرەوشت بوو، ئازوقەو ماڵ و سامانی لەخەڵك ناوچە گرتبویەوە، لەم ماوەیەشدا سەلاحەدین نامەی نارد بۆ گەورە ئەمیرەکانی ئامەدو بەڵێن‌و مژدەی پێدەدان‌و هەڕەشی لێدەدەکردن ئەگەر سور بن لەسەر جەنگ‌و کوشتار[5]. ئەم بارودۆخەش کەخەڵکی تێکەوتبوو لاوازو بێ هێزی کردن‌و بووە هۆی رسوابوون‌و خەمساردیان لەبەرگریکردندا، ئەمەش ئیبن نیسانی ناچار کرد کەداوای ئەمان‌و پەنادان بکات بۆ خۆی و خێزانەکەی و ماوەی سێ رۆژ مۆڵەتی بدات بۆ گواستنەوەی سامان‌و گەنجینەکانی، پاش کۆتایی هاتنی ئەم مۆڵەتەش سەلاحەدین لە ١٠ی موحەڕەمی ٥٧٩ك/١٦ی ئایاری ١١٨٣ز دا سەلاحەدین شارەکەی گرتەدەست‌و لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا رادەستی نورەدین محمدی کردو فەرمانی پێکرد کەدادگەری تیادا بەرپابکات‌و

---

[1] رأس العين :شارێکی گەورەو بەناوبانگە لەشارەکانی جەزیرە لەنێوان حەڕان‌و نصیبیندا

[2] الکامل فی التأریخ، لە: تأریخ الأیوبین، ل: ٧٣.

[3] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٧٣.

[4] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٧٣.

[5] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٧٣.

ستەم نەهێڵێتو گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری سوڵتان بێتو، هەرکاتێکیش داوای کۆمەکی لەئامەد کرد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی فرنجەکان ئامادەبێت[1].

**دووەم: پاش دەست گرتنی بەسەر حەلەب:**

بەسەر ناوچەی جەزیرەدا سەلاحەدین بوە دراوسێی میرنیشنی حەلەبو بڕیاریدا بیهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە پێش ئەوەی دەستبەسەر موسڵدا بگرێت، هەر بۆیە لەفورات پەڕیەوەو لەناوچەی تل خالددا بارگەو بنەی خست دەوروبەری لەدەوروبەری حەلەبو ئابلوقەی بەسەردا سەپاند هەتاوەکو لەمانگی محرم ی ساڵی ٥٧٩ك/ ئایاری ١١٨٣ز خۆی بەدەستەوەدا، پاشان لەوێشەوە بەرەو عینتاب بەڕێکەوت[2] و ناصر الدین محمدی فەرمانڕواشی ملکەچی خۆی پیشان داو داوای لێکرد کە وەك والی ئەو شوێنە بیهێڵێتەوە، سەلاحەدینیش ڕازی بوو، پاشان لە عینتابەوە بەرەو حەلەب پێشڕەوی کرد و لە٢٦ی محرەم/ ٢١ی ئایاردا گەشتە حەلەب، بەڵام یەکسەر جەنگی لەگەڵدا نەکردن، بەڵکو چووە المیدان الأخضرء دوای چەند ڕۆژێك گواستیەوە بۆ کێوی جوشنو وای پیشانی عمادالدین زەنکی دووەم دەدا کەخانوو بۆ خۆیو سەربازەکانی دروستدەکات هەتاوەکو ناچاری خۆبەدەستەوەدانی بکاتو ڕێی لەخوێن ڕشتن بگرێت[3] عیمادالدین زەنکی دووەمیش ناچار بوو دانوستان بکات لەگەڵ سەلاحەدیندا بۆ بەدەستەوە دانی شارەکەو ئەمیر حسام الدین طومان بوو ناوبژیوان لەنێوانیانداو لەسەر ئەم خاڵانە ڕێك کەوتن:

- عیمادالدین زەنکی دووەم دەستبەرداری حەلەب بێت بۆ سەلاحەدین.
- سەلاحەدین شەنگارو خاپور نصیبینو سروج بدات بەعیمالدین زەنکی دووەم.
- الرقەش بدات بەحسام الدین طومان.
- عیمادالدین زەنکی دووەم هێزەکانی دەخاتە ژێر فەرمانی سلاحەدین هەرکاتێ پێویستی پێیان هەبوو.
- سەلاحەدین هاتە شاری حەلەبەوە دوای مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی لە ١٧ی صفری ساڵی ٥٧٩ك/١٨ی حوزەیرانی ساڵی ١١٨٣ز دا خەڵکیش پێشوازیان لێکرد[4].

١- **ئاکامەکانی دەستگرتن بەسەر حەلەبدا:** بەهێزبوونی پێگەی سەلاحەدینو پتەو بونی بەرەی ئیسلامیو یەکلابوونەوەی بۆ کوشتاری خاچپەرستەکان هەندێك بون

---

[1] تأریخ الأیوبین فی مصرو بلاد الشام، ل: ٧٤.

[2] عینتاب: قەڵایەکی توکمەیە لەنێوان حەلەبو ئەنطاکیە دا پێشتر بەدلوك ناسرابوو.

[3] تأریخ الأیوبین فی الشام، ل: ٧٤.

[4] مفرج الکروب(١٤٢/٢)، تأریخ الأیوبین، ل: ٧٥.

لەدەرەنجامەکانی دەستگرتن بەسەر حەلەبدا ئەمەش ترسی خستە دڵی فەرەنجەکانو ئەم ڕووداوەیان بەگەورەترین شکۆزانی کەڕووبەڕوویان بوبێتەوە هەروەها ئەم ڕووداوە پەیوەندی سیاسیو سەربازییەکانی نێوان میسرو وڵاتی شامی دووپاتکردەوە، موڵکەکانیشیانی لەوڵاتی شامدا لەو میحوەرەدا قۆرخکرد، ئەوەبوو بوهیمندی سێیەم کەفەرمانڕەوای ئەنطاکیە بوو داوای پەنادانی لەسەلاحەدین کردو سەلاحەدینیش بەوە ڕازی بوو پاش بەئەنجام گەیاندنی پلانەکەی بۆ یەکخستنی جیهانی ئیسلامی لەرۆژهەڵاتی نزیکدا[1] .

- **گەمارۆی دووەمی موسڵ:** ئەو ڕووداو پێشهاتانەی کە لەموسڵدا ڕوویاندا سەلاحەدینی ناچارکردکەدووبارە دەسوەرداتە کاروباری موسڵ، ئەبوو لەمانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ٥٧٩ك/ئەیلولی ١١٨٣زدا عزالدین مەسعودی یەکەم گوێی بۆ قسەلۆکی هەندێ لەئەمیرەکانگرت دژ بەمجاهدالدین قایمقازی جێگری (لەوانەی کەدوژمنایەتی لەنێوانیاندا هەبوو)و دەستگیری کردو خستیە زیندانەوەو دەستی گرت بەسەر ماڵو موڵکیدا، لەئەربیل(هەولێر)و جەزیرەی ئیبن عومەر شەهرەزور[2]و دقوقا[3]،و قەڵای عقر الحمدیة کەلەژێر دەسەڵاتی قایمازدا بوو و چەند جێنشینێکی تێدا بوو کە بەناوی ئەوەوە حوکمیان دەکرد، کاتێ قایماز دەستگیرکرا، ئەو ئەمیرانەی یاخیبوونو زەینەدین یوسفی فەرمانڕەوای ئەربیلومعز الدین سنجرشای فەرمانڕەوای جەزیرەی ئیبن عومەر نامەی وەفا داریان نارد بۆسەلاحەدین بەم شێوەیەش ئەم دوو شارە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سەلاحەدینەوە، ئەم هەڵسوکەوتە نا مەسئولانەی عزالدین مەسعودی یەکەم بووە هۆی لاوازکردنی هەڵویستی خۆی بەرامبەر بەسەلاحەدین، ناچار پەنای بردە بەرسیاسەتو قاضی بەهائەدینی کوڕی شەدادی ناردبۆ خەلیفەی عەباسی لەمانگی شەوالی ساڵی ٥٧٩/ك کانووی دووەمی ١١٨٤ز دا، داوای لێکرد کەسەر لەنوێ ببێتە ناوبژیوان بۆ ئاشتەوای کردن لەنێوان ئەوو سەلاحەدیندا، خەلیفەش وەڵامی داخوازییەکەی دایەوەو شیخ الشیوخو بەشیر الخادمینارد دانوستان لەگەڵ سەلاحەدیندا بکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان ئەوەو فەرمانڕەوایموسڵ، محی الدین شارەزوریش وەك نوێنەری فەرمانڕەوای موسڵ پەیوەندی پێوەکردن لەگەڵ قاضی ئیبن شەددادا[4]، بەڵام دانوستانەکان بەهۆی چەند گرفتێکەوە وەستێنران، بەهۆی

---

[1] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٥.

[2] شەهرەزور(شارەزور): ناوچەیەکی بەرفراوانی ناو چیایە لەنێوان ئەربیلو هەمەزاندا.

[3] دقوقا: شارێکەلەنێوان ئەربیلو بەغدادا، الحموی (٤٥٩/٢)

[4] النوادر السلطانية، ل: ١١٢،١١١، تأريخ الأيوبين، ل: ٧٦.

ئەوەی کەسەلاحەدین فەرمانڕەوای ئەربیلو جەزیرەی ئیبن عومەری سەرپشککردبوو لەنێوان چوونە پاڵ خۆی یاخود هەڵبژاردنی فەرمانڕەوای موسڵدا ئەمەش لەلایەن نوێنەری عیزالدین مەسعودی یەکەمەوە رەتکرایەوەو سور بوون لەسەر پاشکۆیەتیان بۆ فەرمانڕەوای موسڵ، هەروەها سور بوون لەسەر ناوهێنانیان لەیاداشتنامەی ئاشتەوایدا، ئەمەش بووە هۆی گەڕانەوەی نوێنەرەکان بەدەستی خاڵی[1]، بەلام عیزالدین مەسعودی یەکەم پەی بەو تەنگەژەیە برد کەخۆی تێخستبوو و پەشیمان بوویەوە لەسەر ئەو کارەی کەئەنجامی دابوو و جێگرەکەی ئازادکردو دەسەلاتی جارانی بۆگێڕایەوە[2]. ئەوەبوو مجاهیدالدین قایماز لەکاتێکدا لەزیندان ئازادکرا کەموسڵ بەرەو لاوازی دەچوو دەسەلاتدارانی ورەیان بەردابوو، ئەویش کاریکرد بۆ گێڕانەوەی هێز بۆ دەزگاکانی دەوڵەت بەتایبەت سوپا، بۆ ئەم مەبەستەش داوای کۆمەکی لەهێزەکانی دەوروبەرکردو هەوڵەکانی سەرکەوتوو بوونلەراکێشانی قزڵی فەرمانڕەوای ئازربایجانو سێ هەزار سەربازی لەلایەن ئەوەوە بۆ نێردرا[3]، ئەوە بوو دوای ئەوەی کەمتمانەی بەتواناای خۆی پەیداکرد، بڕیاریدا کەناوچەکە دەست بەسەراگیراوەکانی ئەتابەکیەکەی بگێڕێتەوە، بۆئەم مەبەستەش هێرشی کردە سەر ئەربیل (هەولێر)، بەلام نەیتوانی دەستی بەسەردابگرێت[4]، سەلاحەدینیش بێ ئاگا نەبوو لەم روداوانەو بڕیاریدا بەرگری لەزین الدین یوسفی هاوپەیمانی بکات کەفەرمانڕەوای ئەربیل بوو، پاشان بەرەو موسڵ بەڕێبکەوێت بۆ دەرهێنانی لەچنگی عزالدین مەسعودی یەکەم، زۆری نەخایەندهێزەکانی کۆکردەوەو بەسەرکردایەتی خۆی بەرەو حەڕان بە رێی خست لەصفری ساڵی ٥٨١ك/ ئایاری ساڵی ١١٨٥ز داو لەرأس العین لایداو پاشان بەرەو دنیسر بەڕێکەوت[5]، لەویش عمادالدینی کوڕی قرا ئەرسەلان ئەرتەقی لەگەڵ سەربازەکانی نورەدین محەمەدی برایدا کەفەرمانڕەوای قەلای کیفاو ئامەد بوو پەیوەندیان پێوەکردو پێکەوە بەرەو نصیبین بەڕێکەوتنو لەوێش موعیزەدین سنجرو شاهی کوڕی سەیفەدین غازی یەکەمی فەرمانڕەوای ئیبن عومەر گەیشتەوە پێیاندا[6]، سەلاحەدینیش بەردەوام بوو لەپێشڕەویدا بەرەو موسڵو

---

[1] مفرج الكروب(٢/١٥٦،١٥٥)، تأريخ الأيوبين، ل: ٧٦.

[2] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٦.

[3] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٦، سەیری : مجاهدالدين قايماز نائب إربد والموصل.

[4] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٦، سەیری : مجاهدالدين قايماز نائب إربد والموصل.

[5] دُنیسر: شارۆچکەیەکی گەورەو بەناوبانگە لەدەورو بەری جەزیرەی نزیکماردین

[6] مفرج الكروب(٢/١٦٦).

لەئیسماعیلیاتی نزیك موسڵ لایدا لەمانگی رەبیعی یەکەمی ٥٨١ك/١١٨٥ز دا. وەك پاڵپشتێکیش بۆ هەڵوێستەکانی نامەیەکی نارد بۆ خەلیفەی عەباسیو ئاگاداری کردەوە لەوەی ئەیەوێت کاروباری موسڵ یەکلابکاتەوەو ئاماژەشی بەوەدا کەخەڵکەکەی بەناوی طغرلی سلجوقییەوە وتاردەدەن کەسوڵتانی عەجەمو نەیاری خەلیفەیە، دراویشی بەناوی ئەوەوەلێ دەدەنو نامەش لەگەڵ خاچپەرستەکاندا ئاڵوگۆڕ دەکەنو هانیان دەدەن بۆهێرشکردنە سەر وڵاتی موسڵمانان، هەروەها رونیکردەوە کە ئەو بۆ پاوانخوازیو لەناوبردنی بنەماڵەی زەنکی نەهاتووە، بەڵکو مەبەستی گێڕانەوەیانە بۆ گوێڕایەڵی خەلیفەو سەرخستنی ئیسلامو رێگری لەستەمکاریو بێ شەرمی نواندن بەرامبەر بەموسڵمانانو پچڕاندنی پەیوەندیان لەگەڵ سەلجوقییە بێگانەکانداو ناچارکردنیان بۆ رێزگرتن لەدراوسێو گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی[١]، ئەوە بوو فشارێکی بەهێزی خستە سەر عیزالدین مەسعودی یەکەم ئەمەش ناچاری کرد کە پەنا بۆ ئاگر بەست بەرێتو پاشان وەفدێکی ناردە لای کەکچە ئامۆزاکەی نورەدین مەحمودو ژنانێکی تری تیادا بوون، لەگەڵ کۆمەڵێك لەپیاو ماقولان بۆ داوای ئاشتەواییو دەست هەڵگرتن لەگەمارۆدانی موسڵ، رای سەلاحەدینیش لەگەڵ پەسەندکردنی رێکەوتندا بوو ئەگەر نارەزای زانا عیسی هەکاریو ئەمیر عەلی کوڕی ئەحمەد المشطوب نەبوایە کەهۆشداریان پێدا هەستان بە پەسەندکردنی سوڵحو پێیان وت: شوێنێکی وەك موسڵ لەبەر ئافرەتێك دەستی لێهەڵناگیرێت، چونکە عیزالدین مەسعود بەهۆی دەستەوسانیو بێ توانایی لەپاراستنی موسڵ ناردونی[٢]، ئەویش راکەیانی پەسەندکردوو پۆزشی هێنایەوە بۆ وەفدەکەی موسڵو هەستا بەگەمارۆدانی موسڵ، بەڵام چەند کۆسپێك هاتەڕێ کە گرنگترینیان:

- خەڵکی موسڵ لەلای رۆژهەڵاتی شارەکەوە دەهاتنە دەرەوەو دژ بەهێزە ئەیوبییەکان دەجەنگانو پاشان دەگەڕانەوە بۆ ناو شار ئەمەش سەلاحەدینی نیگەرانکرد.
- قایماز بەتەواوی موەسڵی تۆکمەو قایم کردبوو و چاکسازی لەسوپادا کردبوو هەتاوەکو بتوانێ بەرپەرچی ئەیوبییەکان بداتەوە، بەم شێوەیە سەربازەکانی خۆڕاگرانە بەرگریان دەکرد.

---

[١] مفرج الكروب(١٦٦/٢)، تأريخ الأيوبين، ل: ٧٧.

[٢] الكامل فى التأريخ(٥,٦/١٠): تأريخ الأيوبين، ل: ٧٨.

- گەمارۆدانی موسڵ لەکاتێکدا دەستی پێکرد کەپلەی گەرما بەرز بوو، بۆیە سەلاحەدین فەرمانی وەستاندی جەنگی دا هەتاوەکو ئەو گەرمایە کۆتایی دێت.
- وا رێکەوت لەو کاتەدا ئاوی روباری دیجلە زۆر کەمیکردو ئەندازیارەکان ئامۆژگاری سەلاحەدینیان کرد کەرێڕەوی روبارەکە بگۆرێتو دوریبخاتەوە لەموسڵ، هەتاوەکو خەڵکەکەی تینوو ببن‌و ناچاری خۆبەدەستەوەدان ببن، بەلام سەلاحەدین پێی وابوو کە ئم پرۆژەیە کاتێکی زۆر دەخایەنێتو هەوڵو ماندووبونێکی زۆری دەوێت دەبێتە هۆی مانوو کردنی سوپا.
- قەدەردا بوو کە لەکاتی گەمارۆکەدا هەریەك لەشاه ئەرمەنی فەرمانڕەوای خلاط بێ ئەوەی کوڕێك جێبهێڵێت کەجێی بگرێتەوەو نورەدین محەمەدی فەرمانڕەوای ئامەدو قەلای کیفا[1] مردن، سەلاحەدینیش ویستی کاروباری میرنیشینە ئەرتەقیەکان رێکبخات بەشێوەیەك کەخزمەت بەئامانجەکانی خۆی بکات[2].

٢- **هەوڵدا بۆ دەستگرتن بەسەر خەلاطدا:** لەدوای کۆچی دوایی فەرمانڕەواکەی یەکێك لەمەمالیکەکان بەناوی سسف الدین بەکتمر دەستی گرت بەسەر خەلاطدا، سەلاحەدینیش بەهیوا بوو دەستی بەسەردا بگرێت بۆ ئەم مەبەستەش راوێژی کرد بەسەرکردە سەربازییەکانی، ئەوانیش هەندێکیان رای لەگەڵ درێژەداندا بوو بەگەمارۆدانی موسڵ، بەلام هەندێکی تر رایان وابوو کەبەرێ بکەوێت بۆ خەلاط بەبیانووی ئەوەی کە ئەوە رێ خۆشکەرە بۆ دەستگرتن بەسەر شوراو قەلاکانی تری ناوچەکەدا، لەئاکامی ئەم جیاوازییەشدا سەلاحەدین دوو دڵ بوو لەبڕیاردانداو هەڵوێستی یەکلایی نەکردەوە هەتا ئەو کاتەی کەنامەی بانگهێشتی لەخەڵکی خەلاطەوە پێگەیشت کەتیایدا بانگهێشتیان دەکرد بۆ گرتنە دەستی خەلاط[3]، لەراستیشدا شمس الدینی کوڕی پەهلەوانی کوڕی ئیلدکزی فەرمانڕەوای ئازەربیجان‌و هەمەدان‌و چاوی بڕیبویە خەلاط پاش ئەوەی هەواڵی کۆچی دوایی شای ئەرمەنی بیست، بکمتریش ترسی ئەوەی لێنیشت کەپۆستەکەی لەدەست بداتو خەڵکی خەلاطیش ئامادە نەبوون ملکەچی بن، بۆ رێگرتن‌و بەرپەچدانەوەی ئیلدکز، بکتمر لەگەڵ پیاو ماقوڵانی شارەکەدا رێککەوت لەسەر نامە ناردن بۆ سەلاحەدین‌و گوێڕایەڵی نواندن بۆی، ئەم کارەشیان بەنیازی بەگژیەکدا دانی سەلاحەدین‌و ئیلدکز دەکرد هەتاوەکو ناووچەکە

---

[1] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٨.

[2] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٨.

[3] الكامل فى التأريخ ، لە: تأريخ الأيوبين، ل: ٧٩.

بەدەست خۆیانەوە بمێنێتەوە، ئەوە بوو سەلاحەدین بەرەو خەلاط بەرێکەوت بێ ئەوەی بەنیازی بکتمر بزانێت و لەپێشەوەی سوپاکەشیدا ناصر الدین محمدی کوڕی شێرکۆی ئامۆزاو مظفر الدینی کوڕی صاحبی فەرمانڕەوای حەڕان و چەند کەسێکی تری دانا، لەبطوانە لەنزیک خەلاط لایانداو، زانا عیسای هەکاری و غرس الدین قلج ئەرسەلانی نارد بۆ خەلاط بۆ بڕیاردانی ڕێ و شوێنی خۆبەدەستەوە دانەکە، خۆشی بەرەو میافارقین بەرێکەوت بۆ دەست بەسەراگرتنی، هەچی پەهلەوانیشە بەرەو خەلاط بەرێکەوت و لەنزیک ئەو شارە بارگەی خست، نێردراکانی بکمتریش سەردانی هەردوو لایانی کردو هەڕەشەیان لەپەهلەوان کرد کەئەگەر هێرش بکاتە سەر خەلاط ئەوا شارەکە رادەستی سەلاحەدین دەکەن، بەڵام پەهلەوان توانی بکتمر بەلای خۆیدا رابکێشێت و کچەکەی خۆی لێ مارە بکات، بکتمریش پۆزشی بۆ نێردراوەکانی سەلاحەدین هێنایەوەو ئەوانیش بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێک بەدەست بێنن، ناوچەکەیان بەجێهێشت، بەم شێوەیەش هەوڵەکانی سەلاحەدین بۆ دەست بەسەراگرتنی خەلاط شکستی هێنا[1]. لەلایەن خۆشییەوە قطب الدین شقمان کە بووە جێنشینی باوکی لەفەرمانڕەوایەتی ئامەدو قەڵای کیفادا دانی بەدەسەڵاتی سەلاحەدین داناو گوێڕایەڵی خۆی بۆ دووپاتکردەوە، چونکە مەترسی ئەوەی هەبوو کەئامەدی لێبسێنێتەوە[2].

٣- **دەست بەسەراگرتنی میافارقین**[3]: میافارقین لەژێر دەسەڵاتی حسام الدین یولقی کوڕی قطب الدین ئیلغازی فەرمانڕەوای ماردیندا بوو کەتەمەنی دە ساڵ بوو، تیایدا پاسگەیەکی شاە ئەرمەنی فەرمانڕەوای خەلاط هەبوو کەئەسەدەدین یەرنەفش سەرکردایەتی سەربازەکانی دەکردو ئامادەنەبوو بچێتە ژێر رکێفی سەلاحەدین و یاخی بوونی خۆی راگەیاند ئەمەش سەلاحەدینی ناچارکرد هەتاوەک و شارەکە گەمارۆ بدات، بەڵام نەیتوانی ئەم شارە کۆنترۆڵبکات، بۆیە پەنای برد بۆ شێوازی هەوڵی سیاسی و پەیوەندی کرد بەهاوسەری قطب الدینەوە کە لەماردیندا نیشتەجێ بوو بوو دوای تێگەیاند کەیرنقش لەگەڵیدا رێککەوتووە لەسەر تەسلیم کردنی شارەکە پێی، نێردراوێکیشی نارد بۆ لای قطب الدین و هەواڵی پێدا کەهاوسەرەکەی دەیەوێت شارەکەیان رادەستی سەحەدین بکات، بەم شێوازە سیاسیە توانی ئەم شارە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە لە ٢٩ی جمادی یەکەمی ساڵی ٥٨١ک/ ٢٨ی ئابی

[1] النوادر السلطانية، ل: ١١٧,١١٨.

[2] ئامەد: گەورەترین شاری دیاربەکرەو ناوبانگی باشی هەیە.

[3] النوادر السلطانية، ل: ١١٧,١١٨.

ساڵی ١١٨٥ز دا[1]، لەم کاتەشدا نامەیەك گەیشتە دەستی سەلاحەدینی لەخەلیفەی عەباسیەوە کەچاودێری‌و سەرپەرشی دیاربەکری پێ دەسپارد لەگەڵ بەرژەوەندی هەتیوی پاشاکانیان، ئەوە بوو وتار لەولایەتەکانی ئەرتەقیدا بەناویەوە دەخوێنرایەوە دراو بەناوی ئەوەوە لێدرا.

**سێیەم: گەمارۆی سێیەمی موسڵ‌و چوونە ژێر رکێفی سەلاحەدینەوە:**

کاتێ سەلاحەدین مەسەلەی میافارقینی یەکلاکردەوە، گەڕایەوە بۆ موسڵ هەتاوەکو بۆ جاری سێیەم گەمارۆی بداتو رێگای نصیبینی گرتە بەر پاشان گەشت کفرزحار لەشەعبانی ساڵی ٥٨١ك هەتاوەکو وەرزی زستان تیایدا مایەوە، پاشان نوێنەری عیزالدینی کوڕی مەسعودی یەکەمی فەرمانڕەوای موسڵی پێگەیشت کەتیایدا داوای رێکەوتن‌و سوڵحی دەکرد[2].

لەو کاتەشدا صلاح الدین نەخۆش کەوتو سەفەری کرد بۆ حەڕان‌و عیزالدین مەسعودی یەکەمیش هەلەکەی قۆستەوەو هەوڵەکانی خستەوە گەڕ بۆ رێکەوتن لەگەڵیدا دوای ئەوەی نائومێد بوو لە کۆمەکی خەلیفە بۆی‌و پشتگیری کردنی لەلایەن سوڵتانی عەجەمەوە، ئەویش بەهائەدینی کوڕی شەددادی ناردو دەسەڵاتی مۆرکردنی رێکەوتنامەکەی پێدا[3]، رێکەوتنەکەش ئەم خاڵانەی لەخۆدەگرت :

١- عیزالدین مەسعودی یەکەم ئەتابەکی اموسڵ رادەستی سەلاحەدین بکات لەگەڵ شارەزووری دەوروبەری‌و ولایەتی القوابی‌و هەموو ناوچەکانی پشتەوەی زاب‌و ویلایەتی بنی قفحاق[4].

٢- سەلاحەدین دەست لەموسڵ‌و دەوروبەری هەلگرێت بۆ عیسزالدین مەسعودی زەنکی‌و ئەو بەڕێوەی ببات بەمەرجێ کەسەر بەسەلاحەدین بێت‌و خودی موختاری هەبێت لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئەیوبیدا.

٣- پێویستە لەسەر عیزالدین کە بەناوی سەلاحەدینەوە وتار بخوێنێتەوەو وتار بۆ سلجوقیەکان کۆتای پێبێت، هەروەها عیزالدین مەسعود رازی بوو لەسەر لێدانی دراوی بەناوی سەلاحەدیەنوە لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتیدا.

---

[1] الکامل فی التأریخ (٩،٨/١٠)، تأریخ الأیوبین، ل: ٨٠.

[2] الفکر السوقی الأیوبی: ل١٨١.

[3] النوادر السلطانیة، ل: ١١٩.

[4] الفکر السوقی الأیوبی: ل١٦٢.

٤- پێویستە لەسەر عیزالدین مەسعود کەلەکاتی پێویستدا بەخۆیو سەربازەکانیەوە لەخزمەت سەلاحەدین ئامادەبن و هەردولا پێکەوە بەشداربن لەجیهادکردن دژ بەخاچپەرستەکانداو گێڕانەوەی فەلەستین.

٥- هەردوولا بەلێنی پابەند بوون بەم پەیماننامەیەوە دەدەن، کەبڕگەکانی لەمانگی ذی الحجەی سالی ٥٨١/٣ی ئازاری سالی ١١٨٦دا دانراونو کارکردن بەم ڕێکەوتنە بەردەوام بوو و سەلاحەدینیش هەتاوەکو کۆچی دوای پابەند بوو پێوەی[1]. بەم ڕێکەوتنەش سەلاحەدین توانی بەرەی ئیسلامی یەکبخات لە ژێر سەرکردایەتی خۆیداو بوو بەبەهێزترین فەرمانڕەوای موسڵمانان لەناوچەکەدا، بەهۆی ئەم دەستکەوتەشەوە یەکلابویەوە بۆ هەوڵدانی لەپێناو ئامانجی گەورەیدا کەبریتیبوو لەرزگارکردنی قودسو زەویە داگیرکراوەکانی تر لەداگیرکەرە خاچپەرستەکان[2].

٦- قسەیەك لەسەر پەیوەندی سەلاحەدین بەبنەماڵەی زەنکییەوە: لەکاتەدا گومان دەکرا لەراستی پاڵنەری سەلاحەدینو نیازو مەبەستو پەیوەندی بەبنەماڵەی زەنکییەوە، لەلایەن هەندێ لەمێژوو نووسەکانی سەردەمی خۆیو هەندێ لەلێکۆڵەرە هاوچەرخەکانەوە، بەڵام ئەو گومانکردنە بێ بایەخو بەلگەیە لەبەر ئەم هۆیانە:

- سەلاحەدین زۆر بایەخی دەدا بەوەی کەبەوردی پاڵنەرو مەبەستەکانی خۆی بەخەلیفە بگەیەنێ لەنامەکانیدا بۆی .
- هەمیشە پاڵنەرو پاساوی سەلاحەدین بریتی بوو لەجیهادو تێکۆشان دژ بەخاچپەرستەکانو ئازادکردنی بەیتولمەقدیس، ئەمە وێڕای پێویستی یەکخستنی ریزی موسڵمانان لەپێناو گەشەدان بەبەردەوامبوون لەجیهاد کردنو سەرکەوتن تیایدا.
- هەمیشە سەلاحەدین لەمامەڵەیدا لەگەڵ زەنکییەکاندا بەخشندەو بەڕێز بووە تەنانەت پاش سەرکەوتن بەسەریشیاندا لەجەنگداو لەکاتی گەمارۆدانو شێوازەکانی سەپاندنی گەمارۆ بەسەریاندا.
- پاش یەکخستنی میسرو وڵاتی شامو مسۆگەرکردنی پشتیوانی وڵاتی موسڵ، سەلاحەدین دەستی دایە هەوڵدان بۆ گەیشتن بەئامانجی دووەمی کەخەمی گەورەو سەرەکی بوو، کە ئەویش تێکشکاندنی سوپای مەیدانی میرنیشینی لاتینیو ئازادکردنی بەیتولمەقدیس بوو،

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٦٣.

[2] الفكر السوقي الأيوبي: ل١٦٣.

وەك دواتریش دەبینین ئامانجی یەکەم لەجەنگی حطیندا بەدیهاتو سەلماندی کەتوانای بڵاوکردنەوەوی هیزی ئیسلامی گەورەو یەکگرتووی هەیە لەکاتو شوێنی پێویستدا ، لەکاتێکدا کەمەسەلەی دووەم پاش جەنگی حطین بەدیهاتو دەرەنجامی سەرکەوتن بۆ لەو جەنگەدا[1].

لەو رەوشتانەش کەسەلاحەدین لەسوڵحی موسڵدا پێی ناسرابوونەوەبوو کەناوچەی موسڵی بەجیٚ نەهێشت هەتاوەکو دیاری گەورەی بەخشی بەفەرمانڕەوای موسڵو دایكو كچو خێزانەكەی نورەدینو ژمارەیەك لەپیاوانی دەوڵەت کەبەهای هەموویان دەگەیشتە دە هەزار دینار ئەمە جگە لەئەسپو بۆنی خۆشو نەخینەی رۆژئاواییو جلو بەرگ، دواتریش پاش چاکبوونەوەی لەگەڵ العادلی برایو لەسەرەتای ساڵی ٥٨٢ك دا بەرەوحەلەب و پاشتریش دیمەشق بەرێکەوتو نامەیەکی نوسی بۆ هەموو کاربەدەستانو داوای ناردنی پارەی زەکاتی لێکردنو هەستا بەبەخشینەوەیو تەنها لەدیمەشقدا پێنج هەزار دیناری میسری بەخشییەوە[2].

**چوارەم : هەوڵەکانی شیعەی ئیسماعیلی بۆ لەناوبردنی سەلاحەدین :**

ئیسماعیلیە شیعەکان پاش کۆچی دوایی خەلیفە فاطمی المستنـصر لەساڵی ٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز دا بوون بەدوو بەشەوە: نزاریەکان کەپێیان وابوو نزاری کوڕە گەورەی خەلیفە شیاوترە بۆ خەلیفایەتیو پاش ئەوەی روبەڕوی هەڵمەتی راوەدونان بونەوە هەڵاتن بەرەو رۆژهەڵات، سەرکردەشیان حەسەنی کوڕی صباح بوو کەکۆمەڵێ نزاری لەوڵاتی فارسدا دامەزراندو ناوی حەشیشیەوو باطنیەکانیان بەسەردا براوکۆمەڵی دووەمیش بەموستەعلیەکان ناودەبران، کەشوێنکەوتووی موستەعلی کوڕی دووەمی موستەنسیر بوو.

حەسەنی کوڕی صەباح قوڵبوویەوە لەلێکۆڵینەوەی بیروباوەڕی ئیسماعیلیدا[3]، ئەم پیاوە لەهۆزی حەمیریەو شاری رەی لەوڵاتی فارسدا گەورەبوو و هەر لەلاوێتیەوە کاریگەربوو بەبانگەوازی ئیسماعیلیو سەردانی میسری کردو چاوی کەوت بەالمستنصر[4]، بەم شێوەیە حەسەنی کوڕی صەباح بۆ ماوەی هەژدە مانگ لەمیسردا مایەوەو لەلایەن المستنصرەوە میوانداریيەکی گەرم کراو پارەیەکی زۆری پێبەخشیو فەرمانی پێکرد کەخەڵك بانگەواز بکات بۆ

---

[1] تأريخ الأيوبين فى مصر وبلاد الشام، ل: ٨١.

[2] صلاح الدين الفارس المجاهد والملك الزاهد، ل: ٢٣٠.

[3] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٦.

[4] الخلافة العباسية، فاروق فوزى (١٨٨/٢)

مەزهەبی ئیسماعیلی بەپێشەوایەتی المستنضر لەولاتی فارسدا[1]، هەروەها حەسەنی کوڕی صەباح پێی وابوو کەدانانی نزار بەخەلیفە لەگەڵ ڕێنمایەکانی مەزهەبی ئیسماعیلیدا دەگونجێت، کە بەمەرجی داناوە ئیمام کوڕە گەورەی باوکی بێت[2]. گومانیش لەوەدا نییە کەمانەوەی حەسەنی کوڕی صەباح لەمیسردا بواری ناسینو شارەزابوونو، بواری بارودۆخی دەوڵەتی فاطمیدا پێیداو لەگەڵ ئاشنابوون ئەو بارودۆخەی کەبانگەوازی ئیسماعیلی تێکەوتبوو لەسایەی دەسەلاتی بەدر ئەلجەمالیدا، ئەوەبوو بڕیاریدا لەولاتی فارسو خۆراساندا بانگەواز بۆ میتنصریە بکاتو سووربوو لەسەر پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئیسماعیلی[3]، هەربۆیە کاتێك گەڕیەوە بۆ ولاتی فارس دەستی بەبلاوکردنەوەی بانگەوازو بانگهێشتکردن بۆ بەیعەتدان بەنزارو ڕەتکردنەوەی بەیعەتدان بەمستعیلیو خۆشی بەبریکاری ئیمام دادەناو نەخشەی دەکێشا بۆ دامەزراندی دەوڵەتێکی نوێی ئیسماعیلی لەرۆژهەلاتی ئیسلامیدا[4]، پاش ئەوەی کەگەڕایەوە بۆ ولاتی فارسو گەیشتە ئەسفەهان لەساڵی ٤٧٣ك داو دەستی کرد بەبانگەوازکردن بەنهێنی، کاتێ نظام الملك یش تەنگی پێهەڵچنی، کۆچی کرد بۆ قەزوینو دەستی گرت بەسەر قەلای تۆکمەی (الموت)داو کردی بەبارەگا بۆ خۆیو کۆمەڵەکەی[5]. ئەوە بوو دەستیان دایە پاوانخوازیو خراپەکاری لەولاتدا[6] و هەر کەحەسەنی کوڕی صباحیش دەستی گرت بەسەر قەلاکانی دەوروبەریداو بانگخوازەکانی بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی بەناوچەکەدا بلاوکردەوە[7]، زۆری نەخایاند توانی دەستبگرێت بەسەر تەواوی ئەو ناوچەیەی کەدەکەوێتە باشووری قەزوین دوای ئەوەی کەدەستی گرت بەسەر قەلاکانی ناوچەکەدا کەنزیکەی شەست قەلا بوون، ئەم قەلایانەش بەزۆری لەناوچەیەکدا بوون کە لەباربوو بۆ کشتوکاڵ لەنزیك سەرچاوەی هەمیشەی ئاودا، هەر قەلایەکیش یەکەیەکی سەربازی ئابووری سەربەخۆی پێکدەهێناو خەڵکەکەی پشتیان بەخۆیان دەبەست بۆ کشتوکاڵو بەرگریکردن لەناوچەکە لەبەرامبەر هەر هێرشو پەلامارێکدا[8]. هەروەها حەسەنی کوڕی صەباح لەسەردەمی نظام الملك سەلجوقیدا توانی

---

[1] تأريخ الفاطميين، د. محمد طقوش، ل: ٣٩٢، ٣٩٣

[2] هەمان سەرچاوە، ل:٣٩٣.

[3] هەمان سەرچاوە، ل:٣٩٣.

[4] الخلافة العباسية (١٨٨/٢)

[5] حركة الحشاشين، ل: ٦٥، ٦٦.

[6] الجهادوالتجديد فى القرن السادس الهجرى، ل: ٩٥.

[7] دولة الأسماعيلية فى إيران، محمد السعيد، ل:٩٥.

[8] دولة السلاجقة، ل: ٩٧.

شوێنکەوتوانی کەزۆر هۆگری بوون ئاراستە بکات بۆ بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی سیاسی بۆ رووبەرووبوونەوەی دوژمنەکانی بەتایبەت خیلافەتی عەباسی سوننە، ئەوە بوو بەرهەڵستی رەوایەتیو شەرعیەتی دەکرد لەگەڵ چەند ئەمیرێکی موسڵمانی سلجوقیدا، بەهێزترین چەکێکیش کەبەکاریهێنا بریتیبوو لەتیرۆرکردن[1].

هەروەها شوێنکەتوانی هەستان بەئەنجامدانی زنجیرەیەك کاری تیرۆرستی کەبوو هۆی لەناوچوونی کۆمەڵێ لەئەمیرو پیاوانی دەوڵەتی عەباسی،ئەمەش بەهێزی کردنو بوونە جێی مەترسیو خەڵکی لێیان دەترسا، هەروەها حەسەنی کوڕی صەباحو شوێنکەوتوانی لەشیعەی ئیسلامی زۆر رقیان لەسوننە بوو، ئەوەبوو شیعەی ئیسماعیلی پەرەیسەندو توانیان چەند قەڵایکی گرگ لەشامدا کۆنترۆڵ بکەن وەك قدموسو علیقەو الکهفو مصیافو چەند قەڵایەکی تر، بەڵام وا دیار بوو کەبەهۆی رووخانی دەوڵەتی فاطمیەوەلەمیسر ترسیان لێنیشتبوو و هەستیان دەکرد کە مەترسی چاوەڕێیان دەکات لەوڵاتی شامدا بەتایبەت کەنورەدین مەحمودپاوانخوازی سنووردار کردبوون لەرۆژهەڵاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتی قەڵای الموت لەساڵی ٥٥٨ك/١١٦٣ز دا رەشیدەدین سنان البصری نارد کەناسرا بوو شێخی کێو(شیخ الجبل) بۆسەرپەرشتی کردنی هەرێمی نصریە لەوڵاتی شامدا، ئەویش بەرەو حەلەب کەوتەرێو جلی دەروێشی لەبەرکردبوو بۆ ئەوەی نەناسرێتەوەو چەند مانگێك تیایدا مایەوە، پاشان لەنێوان قەڵاکانی حەشیشیەکاندا هاتووچۆی دەکرد هەتاوەکو لەالمصیافدا نیشتەجێ بوو[2].

١- **هەوڵی تیرۆرکردنی سەلاحەدین لەلایەن شیعەی ئیسماعیلیەوە:** شیعە باطني یەکان (حەشاشیەکان) زۆر رقیان لەسەلاحەدین بوو چونکە هەستابوو بەروخاندنی خیلافەتی فاطمیو هەوڵی دەدا بۆ یەکخستنی وڵاتی شامو لکاندنی بەمیسرەوە ئەمەش هەڕەشەیەك بوو بۆ دەسەڵاتی ئەوان، هەربۆیە راشیدەدین لەگەڵ هەموو خاچپەرستو زەنکییەکان هاوکاری دەکرد بۆ لەناوبردنی[3]، راشیدەدینیش گەورەو سەرکردەی ئیسماعیلیەکان بوو ناویشی أبو الحسن سینانی کوڕی سەلمانی کوڕی محەمەدی بەسری باطنی خاوەنی بانگەوازی نزاری بوو[4]، کەسێکی بەرەوشتو چاکەکاربوو، لەفەلسەفەو مێژوو دەکۆڵییەوە

---

[1] دولة السلاجقة، ل: ٩٧.

[2] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٧.

[3] سير الأعلام النبلاء (٢١/١٨٣).

[4] سير الأعلام النبلاء (٢١/١٨٣).

پیاوەتی‌و زیرەکی‌و فێڵزانی تێدابوو[1]، الذهبی دەربارەی دەڵێت: نەیاری‌و خواپەرستی‌و ملکەچی‌و ئامۆژگاری تێدابوو، لەسەر بەردێك دادەنیشت‌و تەنها زمانی دەجولا، شوێنەکەو توانیشی ڕۆچون تیایداو هەندێکیان خوایەتیان دەدایە پاڵ، ئەویش بەهۆی جادوگەریەوە بەتەواوی گومڕایکردن، کتێبی زۆری هەبوو و خوێندنەوەشی زۆر بوو و ماوەیەکی زۆریش ژیا[2]، ئەوە بوو لەساڵی ٥٧٠ك / ١١٧٤ز کاتێك الملك الصالح إسماعیل روی لەراشددەین ناو داوای یارمەتی لێکردو پارەیەکی زۆری پێبەخشی لەگەڵ چەند گوندێکدا وەك نرخێك بۆ کوشتنی سەلاحەدین، وا دیارە بەرژەوەندییەکی هاوبەش هەبوو کەهەردوو لای کۆکردبوویەوە کەئەویش دوژمنایەتی هەردوولا بوو بۆ سەلاحەدین، بۆیە رەشیدەدین سنان کۆمەڵێکی لەشوێنکەوتتوە خۆفیدا کارەکانی نارد بۆ سەربازگەی ئەیوبی، بەلام ئەمیرێك بەناوی خمارتکین توانی پێیان بزانێت‌وئەوانیش کوشتیان‌و لەنیوەی شەودا توانییان بگەنە خێوەتەکەی سەلاحەدین کە لەناوجەرگەی سەربازگەکەیدا بوو، ئەوە بوو یەکێکیان پەلاماری سەلاحەدینی دا، هەتاوەکو بیکوژێت، بەلام پێش ئەوەی بگاتە لای کوژراو، ئەوانی تریش خۆڕاگریان نواندو بەرگرییەکی باشیان لەخۆیان کرد، پێش ئەوەی هەموویان بکوژرێن، دوریشە ئەگەر بڵێین هەڵنانی کمشتکین بەتەنها پاڵنەری سەرەکی رەشدەدەین بووە بۆ کوشتنی سەلاحەدین، چونکە ئەو بۆ مەبەستەکانی خۆی کاریدەکردو، هۆی تری هەبوو، لەوانەشە هاتنی سەلاحەدین بۆ شام‌و هەڵدانی بۆ یەکخستنی سوننەکان هۆکارێك لەسەر دروستکردن[3].

٢- **هەوڵی دووەم:** رەشیدەدەین وازی نەهێنا لەهەوڵەکانی بۆ تیرۆرکردنی سەلاحەدین وێڕای شکست هێنانی هەوڵی یەکەمی، بەڵکو سورتر بوو لەسەر ئەو کارە ئەوە بوو لەذی القعدەی ساڵی (٥٧١هـ/١١٧٦ك) کۆمەڵێك لەشوێنکەوتوانی نارد بەنهێنی‌و بەجل‌و بەرگی سەربازانی سەلاحەدینەوەو توانیان بچنە سەربازگەی ئەیوبیەوە لەکاتی گەمارۆدانی عەزازداو روبەرووی سەربازەکانی سەلاحەدین ببینەوە، لەکاتێکدا کەسەربازەکان سەرگەرمی ئابلوقەدانی قەڵاکە بوون، سەلاحەدینیش بەلای خێوەتی ئەمیر جادلی ئەسەدیدا تێپەڕی بۆ هاندانی سەربازەکان بۆ درێژەدان بەجەنگ، لەو کاتەدا یەکێك لەئیسماعیلیەکان هێرشی بۆ هێناو چەقۆیەکی دا لەسەری، بەلام سەلاحەدین لەوکاتەدا کلاوێکی ئاسنینی لەسەردا بوو، دووبارە کابرا هێرشی

---

[1] سیر الأعلام النبلاء (٢١/١٨٥).

[2] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٧.

[3] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٧.

هێنایەوەو روومەتی برینـدار کـرد، سەلاحەدینیش بەدەستی گرتـیو ویستی لەپەلاماردانی بخاتو کابراش بەردەوام بوو لەهێرشکردندا هەتاوەکو ئەمیر سیف الدین یانکوج گەیشتە لایو کابرای کوشت، پاشان خۆبەختکارێکی تر هێرشی هێناو داودی کوڕی منکلان بەرپەرچیدایەوەو کوشتی، پاشان خۆبەختکاری سێیەم پێشڕەوی کرد، بەلام ئەمیر عەلی ئەبولفەوارس رووبەرووی بویەوەو ناصرالدین محەمەدی کوڕی شێرکۆ برینداریکردو مرد، کەسی چوارەمیش لەخێوەتەکەدا هەڵهاتو سەربازەکان شوێنی کەوتنو کوشتیان[1]، ئەم رووداوە کتوپڕەش بووە هۆی شڵەژانی سەلاحەدین تەنانەت هەستا بەپشکنینی سەربازەکانیو هەرکەسێکی ئەناسیایەدوری دەخستەوەو رێو شوێنێکی خۆپارێزی زۆری گرتە بەر، بێگومان ئەم رووداوەکاریگەری خۆی هەبووە لەسەر دەرونی سەربازەکانی، و بووە هۆی وەستاندنی جەنگ دژ بەعزاز، بەتایبەت کاتێک کەدەنگوباسی کوشتنی سەلاحەدین بڵاوبویەوە، بۆ خۆپاراستنی زیاتریش سەلاحەدین بەدەوری خێوەتەکەیدا چوارچێوەیەکی بەتەختە دروستکردبوو، القاضی الفاضلیش نامەیەکی ناردبۆ دڵنیا کردنی الملك العادلی برای سەلاحەدین لەتەندروستی براکەیو تیایدا وردەکارییەکانی رودواوەکەی بۆ گێڕایەوە[2].

٣- **شێوازی رووبەرووبونەوەی ئیسماعیلییەکان لەلایەن سەلاحەدینەوە:** سەلاحەدین نامەیەکی نارد بۆ رەشیدەدینی کوڕی سنانو هەڕەشەی لێکرد ئەویش بەم دێڕانە وەڵامی دایەوە.

| | |
|---|---|
| يا للرجال لأمر هال مقطعه | ما مرَّقط على سمعي توقُّعه |
| فاذا الذى بقراع السيف هددنا | لا قام مصرع جنبي حين تصرعُهُ |
| قام الحمام الى البارى يهدَّدُهُ | واستيقظت لاسود البرِّ صبعه |

وردەکاییەکانی نامەکەتم خوێندەوەو ئەو هەڕەشانەمان بیست کەبەکردەوەو گوتار لێمانی دەکات، بەخوا سەیرە مێشێك لەبنگوێی فیلێکدا گیزەگیز بکات، یاخود مێشولەیەك رووبەڕوی پەیکەرێك ببێتەوە، پێش تۆش خەڵکانێك ئەو هەڕەشەیان کردو ئێمەش تێکمان شکاندن، کەس نەیتوانی پشتیوانیان بێت، ئایا ئێوە هەق لەناودەبەنو ناڕەواو بەتاڵ سەردەخەن؟ ستەمکارانیش دەزانن کەچۆن تێکدەشکێن، جا ئەگەر بڕیاری پەڕاندنی سەری منت دەرکرد بێت یان بڕیاری لەبنهێنانی کێوە بەرزەکانت دابێت ئەوە بزانە کەتەنها چەند هیوایەکی ناراستو خەیاڵێکی

[1] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٨.

[2] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٨.

نابەجێیە، چونکە شتە راستەکان بەخەیاڵ لەناوناچن ، هەروەك چۆن رۆحەکان بەنەخۆشی لەناو ناچن، جا ئەگەر بێینەوە بۆ رواڵەتو وازلەهەناو بێنین ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگێکی باشە بۆمان کەئەفەرموێت (هیچ پێغەمبەرێ هێندەی من ئازار نەدراوە)[1]. دەشزانێت چی بەسەر بنەماڵەو لایەنگرانیدا هات، بەڵام هێشتا بانگەوازەکەی هەر ماوە، ئێوەش بارودۆخی ئێمە دەزانن‌ودەزانن پیاوەکانمان چۆنن، چۆن ئاواتی نەمان‌و زیکبوونەوە لەمەرگ دەخوازن، لەپەندەکەشدا هاتووە: ئایا هەرەشە لەمراوی دەکرێت بەئاوی رووبار؟ جا چەند هۆکارێك بۆ بەڵاو نەهامەتی ئامادە بکەو کەوایەك بۆ ناڕەحەتی لەبەر بکە، چونکە پێش ئەوەی بجولێیت دەگەینە سەرت‌و وەك کەسێکت بەسەر دێنم کەبەدوای مەرگی خویدا بگەڕێت، ئەمەش لای خوا زەحمەت نییە، چاوەڕێمانبەو سەرەتای سورەتی (نحل)و کۆتای (ص) بخوێنەرەوە[2].

پاش هەوڵە شکست خواردووەکانیان بۆ تیرۆرکردنی سەلاحەدین هەستا بەخۆپارێزیەکی زۆر تەنانەت دەوری خێوەتەکەی بەتەختە گرتبوو[3]، هەروەك ئەم رووداوە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر دەرونی سەربازەکان‌و توشی شڵەژانی کردن‌و دەستیان لەجەنگ هەڵگرت لەبەرامبەر عزازدا، بەهەمان شێوە خەڵکیش شڵەژان، کاتێك بیستیان سەلاحەدین کوژراوە، ئەمەش سەلاحەدینی ناچارکرد کە بەناو سەربازەکانیدا بگەڕێت هەتاوەکو ببینن‌و دڵنیابن لەسەلامەتی، هەروەها القاضی الفاضلیش نامەیەکی نارد بۆ الملك العادلی برای سەلاحەدین‌و تیایدا دڵنیای کردەوەو راستی رووداوەکەی بۆ گێڕایەوە[4]. سەلاحەدینیش سور بوو لەسەر دانانی سنورێك بۆ ئەم بزوتنەوەیە کەمەترسی دروستکردبوو بۆ سەر وڵاتی شام بۆ ئەم مەبەستەش هەڵمەتێکی سەربازی ریکخست لەمانگی موحەڕەمی ساڵی ٥٧٢ك تەموزی ساڵی ١١٧٦ز داو گەمارۆی قەڵاکانی دان‌و مەنجەنیقی گەورەی بۆدابەست‌و زۆربەیانی کوشت‌و بریندارکردو مەڕو ماڵاتەکانی بردن‌و ناوچەکانی وێران کردن، هەتاوەکو شەهابەدینمەحمودی خاڵی تکای بۆ کردن کەفەرمانڕەوای حەماە بوو، ئەوانیش بەهۆی دراوسێیەتیەوە داوای تکا کردنیان لێکردبوو، سەلاحەدینیش پاش تۆڵە سەندنەوە[5] لێیان بەجێی هێشتن دوای ئەوەی کەهێزو توانایانی لەناوبرد[6].

---

[1] بەسەنەدێکی لاواز گێڕدراوەتەوە لەفەرموودەی أنسس وبریدە وجابرەوە، الجامع الصغیر.

[2] سەرەتای سورەتی النحل/ (أتی أمر الله)و کوتای ص: (ولتعلمن بأه بعد حین)

[3] العماد الأصفهانی، ل:٩٨، تأریخ الأیوبین ، ل: ٩٨.

[4] کتاب الروضتین، لە: التأریخ الأیوبین ، ل: ٩٨.

[5] کتاب الروضتین (٢/٤٢٣)

[6] موسوعة تأریخ العرب: العصر الأیوبی، ل: ٦٣.

هەروەها حەشاشەکان ناچاربوون کە لەگەڵ سەلاحەدیندا ڕێکبکەون پاش ئەوەی هەوڵە یەك لەدوای یەکەکانین بۆ تیرۆرکردنی شکستی هێناو نەیانتوانی بەرپەرچی سوپاکەی بدەنەوە، بۆیە پێیان باش بوو بەبێ لایەنی بمێنێتەوە هەتاوەکو ئەوەی کەدوژمنی سەرەکیان بێت، هەرچۆنێك بێت، سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان بەهیچ ڕووبەڕوو بونەوەیەك نەداوە پاش ڕێکەوتنیان، بەلام أبن الأثیر بەتەنها بۆمان دەگێڕێتەوە کەهاوکاریان کردووە کاتێ سەلاحەدین داوای لەرەشیدەدین سنان کرد کەریتشارد شێردڵو کۆنرادی مونتفیراتی فەرمانڕەوای صور بکوژێتو بەڵێنی پێدا کەپارەیەکی زۆری پێبدات لەبەرامبەردا، بەلام سنان لەوە دەترسا کەسەلاحەدین لەدوژمنەکانی ڕزگاری ببێتو یەکلاببێتەوە بۆ حەشیشەکانو لەناویان بەرێت، بۆیە تەنها کونرادی کوشتو وازی هێنا لەکوشتنی ریتشارد[1].

**پێنجەم: پەیوەندی سەلاحەدین لەگەڵ سەلجوقیەکانی ڕۆمەکاندا:**

عیزالدین قلج ئەرسەلانی دووەملەساڵی ٥٥٠ك– ٥٥٨ك/١١٥٥– ١١٩٢ز دا سوڵتانی سەلجوقە ڕۆمەکان بوو، لەنێوان ئەوو بیزەنتیەکانیشدا ململانێیەك هەبوو کە بەسەرکەوتنی ئەو کۆتایی پێهات لەجەنگی میریوکیفالون لەساڵی ١١٧٦/٥٧١ز دا سەرکەوتنەکەشی کاریگەری هەبوو لەسەر مانەوەی بیزەنتی، چونکە لەم جەنگەداتوانی هێزی مەیدانی سوپای بیزەنتی بەتەواوی لەناوبەرێتو مێژوونوسەکان باسی ئەوە دەکەن کە ئەم جەنگە چارەنووسی ئاسیای بچوكو ڕۆژهەلاتی بەشێوەیەکی یەکجاری دیاریکردو چیتر بیزەنتیەکان نەیان توانی پاش ئەوە هەڕەشە لەوڵاتی شام بکەن[2].

١- **ڕووبەڕوو بوونەوەی یەکەم لەنێوان سەلاحەدینو قلج ئەرسەلاندا:** قلج ئەرسەلانی دووەم لەوڵاتی شامدا بیری لەوە کردەوەو دەیویست ڕێگایەك بۆ خۆی دەستە بەربکات بۆ فورات، بۆیە نەرمی دەنواندو دەیویست بەشێوەیەکی سیاسیانە خۆی نیشان بدات، لەگەڵ صلاح الدین کۆبویەوە داوای قەلای (رُعبان)و قەلای (کیسوم)ی لێکرد کەهەردووکیان دەکەوێتە باشوری قلج ئەرسەلانەوە، رعبان شارێکە لەنێوان حەلەبو سمیساط لەنزیك فورات[3] و کیسوم گوندێکە لەدەوروبەری سمیساط[4]، ئەوەبوو نێردراوی قلج ئەرسەلان هات بۆ پێشکەشکردنی ئەم داوایە بەبیانووی ئەوەی کەپێشتر موڵکی سەلجوقیە ڕۆمەکان بووەو مەسعودی باوکی

---

[1] تأریخ الأیوبین ، ل: ٨٨.

[2] موسوعة تأریخ العرب: العصر الأیوبی، ل: ٥٨.

[3] معجم البلدان (٥١/٣).

[4] هەمان سەرچاوە (٤٩٧/٤)

خستوویەتیە سەر شام، پاشان بەناچاری دەستبەرداریان بوو بۆ نورەدین مەحمود، ئەم نامەیەشی سەلاحەدینی تورەکردو رقی هەستاو بەتوندی لەگەڵ نێردراوەکەی ئەرسەلان قسەی کرد، بەڵکو هەرەشەی لەقلجو ئەرسەلانی دووەم کرد، پاشان نێردراوەکەی گەرِایەوە بۆ قونیەو سوڵتانەکەی لەمەسەلەکە ئاگادارکردەوە، قلج ئەرسەلانیش تورە بوو هێرشی کردە سەر رعبان لەساڵی ٥٧٥ك/١١٧٩زدا بەرپرسی ئەم قەڵایەش شمس الدین کورِی مقدمی سەر بەسەلاحەدین بووە، قلج ئەرسەلانیش بەسوپایەکی زۆرەوە هێرشی کردە سەری کەچەند هەزار کەسێك دەبوون، کاتێك سەلاحەدین بەمەی زانی هێزێکی سەربازی نارد کەهەزار سوار دەبوون بەسەرکردایەتی تقی الدین عومەری کورِی شاهنشای فەرمانرەوایی حەماە[1] ئەوە بوو بەسوپاکەیەوە پێشرەوی کرد هەتاوەکو لە سەربازگەی سەلجوقی نزیك بوویەوەو بەدەوریدا دەسوڕایەوە بۆ زانینی بارودۆخی، کاتێبۆی دەرکەوت کەسوپای ئەرسەلان لەپشودانو بێ ئاگایدایە، هەلەکەی قۆستەوەو کۆمەڵێك لەسەربازەکانی بەدەوری سەربازگەکەدا بڵاوکردەوە بەئامێری مۆسیقاوە، خۆشی لەلایەکی ترەوە ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر سەربازگەکە، ئەوەبوو لەکاتی دیاریکراودا فەرمانی کرد بەلێدانی مۆسیقا (دەهۆڵو زورِنا)و بەرپاکردنی دەنگە دەنگ، کاتێ سەربازە سەلجوقیەکان دەنگی مۆسیقاو هاتو هاواری پیاوانو پێکدادانی ئاسنو تەقەی ناڵو ئەسپەکانیان بیست کە بەبەردەوامی بەدەوری سەربازگەکەدا دەسورِانەوە ترسانو واتێگەیشتن کە لەهەموو لایەکەوە بەژمارەیەکی زۆر سەرباز گەمارۆ دراونو هەموو هەڵاتنو بەشپرزەیو شڵەژاوی ناوچەکەیان بەجێهێشتوخێوەتو بارەکیان بۆ نەپێچرایەوە، لەو کاتەشدا تقی الدین عومەر بەسەربازەکانیەوە هەڵیکوتایە سەریانو زۆرینەی کوشتو بەدیل گرتنو ئەوانیش بەردەوام بوون لەهەڵاتن، پاشان دیلەکانی ئازاد کردو قلجو ئەرسەلانیش گەرِایەوە بۆ ملطیەو بەسەر شۆرِیی و شکست خواردوویەوە، ملطیەش شارێکە لەوڵاتی شامدا لەسەر سنوری شامە[2].

٢- **رووبەروو بوونەوەی دووەم لەنێوان سەلاحەدینو قلج ئەرسەلانی دووەمدا :** دوای تێپەڕاندنی ساڵێك بەسەر ئەم رووداوانەدا، سەر لەنوێ رووبەروو بوونەوە لەنێوان سەلاحەدینو قلج ئەرسەلاندا سەریهەڵداو هۆی ئەم ناکۆکیەش مەسەلەیەکی خێزانی بوو، ئەوەبوو قلج ئەرسەلانی دووەم پەیوەندی سیاسی لەگەڵ فەرمانرەوای قەڵای کیفایدا بەست. ئەم

---

[1] الکامل فی التأریخ (١٤٨/٩).

[2] معجم البلدان (١٩٢١/٥)، موسوعة تأریخ العرب، ل: ٥٩.

پەیوەندیانەشی تۆکمەتر کرد بەهاوسەرگیری کردنی کچەکەی کەناوی سلجوقە خاتوون بوو لەگەڵ نورەدین محەمەدی کوڕی قرە ئەرسەلانی فەرمانڕەوای قەڵاکەو، قلج ئەرسەلانی دووەمیش چەند قەڵایەکی پێبەخشی لەدەوروبەری ناوچەکەی خۆی....پاش ماوەیەکیش نورەدین محمد دڵی چوو لەگۆرانی بێژێكو خوازبێنی كردو دەستبەرداری هاوسەرە سەلجوقیەکەی بوو، ئەویش نامەیەکی نووسی بۆباوکی‌وتیایدا سکاڵای خۆی کرد، باوکیشی نامەیەکی ناردوپێی ڕاگەیاند کەیان دەبێ باش بێت لەگەڵیدا یان لێی جیاببێتەوە، بەڵام ئەوگوێی پێ نەدا، لەبەرئەمە قلج ئەرسەلان ی دووەم بڕیاری دا کەهەڵمەتێکی سەربازی دژبەنوورەدین محمد ئەنجام بدات بۆتۆڵە لێ سەندنەوە لێی‌و دەست گرتن بەسەر وڵاتەکەیدا، نورەدینیش پەنایی برد بۆسەلاحەدین‌و سەلاحەدینش نێردراوێکی ناردو داوای لێکرد کەواز لەو هەڵمەتەی بێنێ کەدەیەوێ دژ بەمیرنشین کیفا ئەنجامی بدات، ئەویش بەوە وەڵامی سەلاحەدینی دایەوە کەچەند قەڵایەکی دەوروبەری وڵاتەکەی پێبەخشیوە کاتێ کچەکەی پێداوە، بەڵام ئەو خراپ ڕەفتاری لەگەڵ کچەکەیدا کردووە بۆیە بڕیاری لێسەندنەوەی ئەو قەڵایانەی داوە، پاشان نێردراوەکان لەنێوان هەردوولادا بەردەوام بوون بێ ئەوەی بگەنە ئەنجامێك، ئەمەش سەلاحەدینی ناچارکرد کەبەرەو وڵاتی ڕۆم بەسوپاکەیەوە بەرێبکەوێت، بۆ ڕێگرتن لەقلج ئەرسەلانی دووەم، ئەوە بوو نورەدینیش پەیوەندی پێوەکردو بەرەو تل باشر پێشڕەویان کرد کەقەڵایەکی تۆکمەیە لەباکووری حەلەبەوە[1] پاشان بەرعباندا تێپەڕین، کاتێ قلج ئەرسەلانی دووەم بەپێشڕەوی سوپای سەلاحەدینی زانی ترسا لەوەی شکست بێنێت‌و بەپەلە یەکێك لەیاریدەرە گەورەکانی نارد کە ئەویش ئەمیر أختیاری کوڕی عفراس بوو، هەتاوەکو مەسەلەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە تێی بگەیەنێت کەپێویستە نورەدین مەحمود لەسەر ئەو ڕەفتارەی سزا بدرێت، کۆبوونەوەکان بەئامادەبوونی هەر سێ لایەن لەمانگی جەمادی یەکەم ٥٧٦ك/ تشرینی یەکەم ١١٨٠دا بەڕێوەچوو[2]. دوای تاوتوێ کردنێکی چڕوپڕ، سەلاحەدین سور بوو لەسەر بۆچونەکەی‌و هەڕەشەی هەڵکوتانە سەر ملطیەو وڵاتی سەلجوقی کرد ئەگەر قلج ئەرسەلان سور بێت لەسەر سزا دانی نورەدین محەمەد، ئەمیرە سەلجوقیەکەش لەکاتی مانەوەیدا لەسەربازگەی سەلاحەدیندا توندی سەلاحەدین‌و بەهێزی‌و زۆری چەك‌و وڵاخەکانی بینیبوو، ئەمەش ترساندبووی، هەر بۆیە هەولێکی زۆری خستەگەڕ

---

[1] معجم البلدان (٢/٤٠)، موسوعة تأريخ العرب، ل: ٦٠.

[2] موسوعة تأريخ العرب، ل: ٦٠.

بۆ رونکردنەوەی مەسەلەکە لەرووی شەرعیەوە، ئەوەبوو توانی مەسەلەکە بەسەلاحەدین بسەلمێنێتو، دوا جار لەسەر ئەمە رێکەوتن:

- نورەدین محەمەد گۆرانی بێژەکە دوای ساڵێك تەلاق بدات.
- ئەگەر ئەم کارە نەکات سەلاحەدین هاوکاری قلج ئەرسەلان دەکات بۆ جەنگکردن لەدژی.
- هەموو ئەمیرەکانی موسڵو دیار بەکروئەرتەقیەکان دێنە ناو ئەم رێکەوتنەوە.

وادیارە لەپەراوێزی دانوستانەکاندا رێکەوتنێکی کراوە لەنێوان سەلاحەدینو ئەمیری سەلجوقیدا لەسەر هاوکاریکردنی سەلاحەدین بۆ سەلجوقیەکاندژ بەئەرمەنیەکان لەکیلیکیەدا کەهێرشیان دەکردە سەر خاکی سەلجوقیەکان، بە بەڵگەی ئەوەی کەسەلاحەدین هەستا بەهێرشکردنە سەر ئەرمەن بەشێوەیەکی راستەوخۆ پاش مۆرکردنی رێکەوتنامەکەو پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی شام[1].

هەرچۆنێك بووبێت، ئەم رووبەروو بوونەوەیە کاریگەری سلبی هەبوو لەسەرپەیوەندیهەردولایەنی ئەیوبیو سەلجوقی لەداهاتوودا ئەمەشلەو هاوپەیمانیەتیدا دەردەکەوێت کەدواترلەنێوان سەلاحەدینو ئیسحاق ئەنجیلۆسی ئیمپراطوری بیزەنتی لەلایەكو قلج ئەرسەلانی دووەمو ئیمپراطور فریدریکبربووسا لەلایەکی ترەوە بەسترا[2].

**شەشەم: پەیوەندی سەلاحەدین لەگەڵ خەلافەتی عەباسیدا:**

پەیوەندی سەلاحەدین عەباسیەکاندا هەرگیز خراپ نەبووەو نەگەشتۆتە ئاستی خراپیو دوژمنایەتی، رەنگە ماوەیەك سارد بووبێت، بەڵام نەگەیشتۆتە ئاستی دوژمنایەتی ئەگەر سەرنجی سەلاحەدینیش بدەین دەبینینکەپەیوەست بووە بەخەلیفەی عەباسییەوەئەمەش بەهۆی پەیوەست بوونیەوە بووە بەزەنکییەکانەوە، بەو پێیەی سەرکردەی زەنکیەکان نورەدین مەحمود پەیوەست بووە بەخەلیفەی عەباسی المستضیء بأمر الله زۆر خۆشی دەویست، چونکە هەلگری بیروباوەڕی سوننی بوو، لەبەر ئەوە زۆر سوربوو لەسەر پشتگیری کردنی دژ بەخاچپەرستەکان[3]، لێرەشەوە سەلاحەدین پەیوەنییەکی باشی لەگەڵ خەلیفەی عەباسیدا دامەزراند کاتێك کەوەزیری خەلیفە عاضدی فاطمی بوو، لەساڵی ٥٦٧ك/١١٧١زدا، ئەوەبوو سەلاحەدین هەنگاوێکی گرنگی نا کاتێك

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ، ٩٨، الكامل فى التأريخ (٩/٤٤٧٩، ٤٧٧).

[2] تأريخ الأيوبين ، ل: ٩٢.

[3] موسوعة تأريخ العرب، ل: ٥٤.

کەوتاری بەناوی خەلیفەی فاطمیەوە هەڵوەشاندەوە و کردی بەناوی خەلیفەی عەباسییەوە لەسەر مینبەرەکانی میسر، ئەمەش راگەیاندنی گوێڕایەڵیو پشتگیریە بۆ خەلیفەی عەباسی[1].

کاتێ کەنورەدین مەحمودیش کۆچی دوایی کردو خاچپەرستەکانو بارودۆخی ناجێگیری وڵاتی شامیان قۆستەوەو پەلاماریاندا، سەلاحەدین نامەیەکی ناردبۆ خەلیفەی عەباسیو بارودۆخی ناوچەکەی بۆ خستەڕوو و باسی هێرشی خاچپەرستەکانو هەوڵەکانی خۆی بۆ لەناو برنی خیلافەتی فاطمی لەمیسرداو هەستانی بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستەکان کاتێ هێرشیان هێنایە سەرئەسکەندەریەو هۆکاری لکاندنی یەمەن بەمیسرەوە بۆ کرد، پاش ئەم نامە دورو درێژەش کەتیایدا سەلاحەدین دەسکەوتەکانی خۆی هەژمارکرد کەخۆشەویستیو گوێڕایەڵی بۆ خەلافەتی عەباسی دەسەلمێنن.

داوای کردلەخەلیفە کەڕێو رەسمێکی بۆ سازبکات کەمیسرو مەغریبو یەمەنو شام بگرێتەوە، لەگەڵ هەموو ئەو شوێنانەی کەبەشێك بوون لەویلایەتی نورەدین کەخوای گەورە بەهۆی شمشێرەکانەوە رزگاری کردووە بۆیان، ئەم رێورەسمەش دەبێت ئەو نیعمەتانە زیندوو راگرێتو هەموو ئەو شتانەی تێدا بێت کەپاشا پێویستیەتی[2]. ئەم بەرنامەیەی سەلاحەدینو ئەو دەرەنجامەی کەهەیبوو بۆ خاڵێ بوو لەبەرژەوەندی دەوڵەتی سەلاحەدین بوو، چونکە خەلیفە وەڵامی داواکارییەکانی دایەوەو دەسەڵاتی میسرو شامی پێبەخشی، دیارە خەلیفەی عەباسی وەك کەسایەتیەکی گونجاو لێی دەڕوانی کەدەتوانێت رۆڵی نورەدین ببینێو بۆشای نورەدین پڕبکاتەوە، ئەمەش وای لێکرد کەدان بەسوڵتانێتی ودەسەڵاتیدا بنێ، چونکە لەدیدی خەلیفەدا تاکە کەسێك بوو کەبتوانێت بەرگری لەموسڵمانان بکات، ئەم رێو رەسمەو شتەکانی تر وەك ناردنی دار الخلافة بۆی کاتێ کەگەمارۆی حەمای دابوو لەساڵی ٥٧٠ك/١١٧٤ز دا کەتیایدا تەشریفاتو موڵکایەتیو مۆڵەتی تیابوو هەموو ئەمانە رۆڵیان هەبوو لەبەهێزکردنو شکۆدارکردنی سەلاحەدیندا لەبەرامبەر ئەمیرە موسڵمانەکانیدا، هەروەها لەبەرامبەر خاچپەرستەکانیشدا کەدرەوشانەوەو دەرکەوتنی سەلاحەدینو ئەو پەیوەندییە باشەی کەلەگەڵ خەلافەتی عەباسیدا هەیبوو و نیگەرانی کردبوون، ئەمەش سودی هەبوو بۆ سەلاحەدین لەو ناکۆکیەکانیدا لەگەڵ ئەو ئەمیرە موسڵمانانەدا کەنەیاری بوون یاخود ئارەزووی گرتنە دەستی دەسەڵاتیان هەبوو وەك زەنکیەکان، هەربۆیە بەبەردەوامی خەلافەتی عەباسی لەدەسکەوتو کارەکانی ئاگادار دەکردەوە ئەمەشی وەك بەشێك لەگوێڕایەڵیو

[1] موسوعة تأريخ العرب، ل: ٥٤.

[2] صبح الأعشى للقلقشندي (١٣/٨٥-٩٥).

خۆشەویستیو خەمخۆری بۆ خەلافەتی عەباسی پیشان داوە[1]، بەم پێیەش پەیوەندیەکان لەسەردەمی خەلیفە مستضیءدا زۆر باش بوو.

١- **کۆچی دوای خەلیفە المستضیء بأمر الله لەساڵی ٥٧٥ك دا:** ناوی خەلیفە أبو محمد الحسین کوڕی المستنجد بالله یوسفی کوڕی المقتفی محمدی کوڕی المستظهر أحمد کوڕی المقتدی الهاشمی العباسییە، لەکاتی مردنی باوکیدا بەیعەتی خەلیفایەتی پێدرا لەرەبیعی دووەمی ساڵی ٥٦٦ك دا، بەیعەتەکەش لەلایەن عضدالدین أبو الفرج ی کوڕی سەرۆکی سەرۆکەکانەوە جێ بەجێکراو مستضیء کەسێکی نەرمو نیانو لەسەرخۆو بەبەزەییو خاوەن خێرو چاکە بوو، ابن الجوزی لە المنتظمدا دەڵێ: کاتێ بەیعەتی پێدرا باجی هەڵگرتوو مافەکانی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیانو دادگەریو بەخشندەییەکی نواند کە لەتەمەنماندا نەمان دیبوو، هەروەها سامانێکی زۆری بەسەر هاشمییەکاندا دابەشکرد[2]، ابن الجوزی دەڵێت:..... لەسەردەمی المستضیء دا دەوڵەتی عوبەیدیەکان لەمیسردا روخاو تیایدا بەناوی ئەمەوە وتار دەخوێندرایەوەو بازاڕەکان لەخۆشیدا داخرانو شیرینی دەبەخشرایەوەو گومەز دروستکراو منیش منیش کتێبێکم داناو ناوی (النصّر علی مصر)م لێناو خستمە پێش چاوی پێشەوا مستضییء[3]، هەروەها لەیەمەندا وتاری بۆ خوێندرایەوە، ئەمە وێڕای برقەو تورزو وڵاتی تورکو پاشاکان ملکەچی بوون، هەمیشەش داوای ابن الجوزی دەکردو داوای لێدەکرد کەئامۆژگاری خەڵك بکات، حەزی لە مەزهەبی حەنبەلیەکان بوو و لەدەوڵەتەکەش شیعەگەری لاواز بوو لەبەغداو میسرداو سوننە سەرکەوتو ئاسایش بەرقەرار بوو[4].

سەرەتای نەخۆشی المستضیء یش لەکۆتای مانگی شەوالی ساڵی٥٧٥ك دا بوو هاوسەرەکەشی ویستی ئەو مەسەلەیە بشارێتەوە، بەڵام نەیتوانیو ئاژاوەیەکی گەورە لەبەغدا بەرپابوو و خەڵکی شوێنی زۆریان تاڵان کردوماڵو سامانێکی زۆریان برد، رۆژی هەینی بەرواری بیستو دووی شەوال هات وتار بەناوی شازادە أبی العباس ئەحمەدی کوڕی مستضیء وکە خەلیفە الناصردین اللەیە خوێنرایەوەو رۆژێکی مەزن بوو تیایدا زێڕیان هەڵدەدا بەسەر وتاربێژو بانگویژو ئامادەبوواندا کاتێ ناوی برا لەسەر مینبەر. نەخۆشی المستضیو یش بەتا دەستی پێکرد لەرۆژی جەژنی رەمەزاندا ومانگێك بەو حاڵەتەوە مایەوەو لەشەوالدا کۆچی دوای کرد لەتەمەنی سیو نۆ ساڵیدا،

---

[1] کتاب الروضتین، لە: موسوعة تأريخ العرب وە، ل: ٥٥.

[2] المنتظم (١٠/٢٣٣).

[3] سیر الأعلام النبلاء (٢١/٧٠).

[4] سیر الأعلام النبلاء (٢١/٧٠).

ماوەی خەلیفایەتیشی نۆساڵو سێ مانگو حەفدا ڕۆژ بوو، لەبەیانیشدا نوێژی لەسەر کرا پاش شتنیو لەدار النصردا نێژرا کەخۆی بنیاتی نابوو ئەمەش لەسەر وەسیەتی خۆی، لەپاش خۆشی دوو کوڕی بەجێهێشت،یەکەمیان: شازادە و جێگری خۆی بوو کەئەویش أبو عباس أحمد الناصر دین الله، ئەویتریشیان: أبو منصر هاشم بوو، کەچەند سەرۆکێك داوای وەزیریان بۆ دەکردو کەسێك بوو زۆر فرمانی بەچاکەدەداو ڕێگری لەخراپە دەکردو باجی لەسەر خەڵکی هەڵگرتو شتە داهێنراو نەنگەکانی نەهێشتو میهرەبانو سامدارو بەخشندەبوو و یەکێك بوو لەخەلیفە باشەکان ڕەحمەتی خوای لێبێت، ئەوەبوو پاش خۆشی بەیعەت درا بەناصری کوڕی بۆ خەلیفایەتی[1].

٢- **پەیوەندی سەلاحەدین بەخەلافەتی عەباسییەوە دوای المستچیو:** خەلیفە المستضيء بالله کۆچی دوای کردو أبوعباس أحمدی کوڕی جێی گرتەوە کەنازناوی الناصر دین اللەی لەخۆی نابوو، سەلاحەدینیش بەیعەتی پێداو وەفدێکی نارد بۆ بەغداد بۆ سەرەخۆشی کۆچی دوایی باوکیو پیرۆزبایی کردن لێی بەبۆنەی بوونی بەخەلیفە[2]، لەم کاتەشدا سیف الدین غازی یەکەمی فەرمانڕەوای موسڵ کۆچی دواییی کردو عیزالدین مەسعودی یەکەمی برای شوێنی گرتەوە، سەلاحەدینیش نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەو داوای لێکرد کەکاروبارەکانی پێبسپێرێت بەو شێوەیەی لەسەردەمی باوکیدا هەبووە[3]، الناصر دین اللەش وەڵامی داواکاریەکانی سەلاحەدینی دایەوەو شێخی شێخەکان صدر الدین أبا قاسم عبدالرحمن، شهاب الدين بشير الخادمي نارد بۆ ئەوەی ئەوکارەی پێبسپێرێتو ڕێوڕەسمی بۆ ساز بدات، ئەمەش لەمانگی ڕەجەبی/ کانونی یەکەمدا بوو وچەند نازناوێکی سوننی لێنا لەوانە، الملك الأجل السيد صلاح الدين، ناصر الأسلام، عماد الدولة، فخرالملة، صفي الخلافه، تاج الملوكو السلاطين، قامع الكفره والمشركين، قاهر الخوارجو المرتدين عن المجاهدين، ألب غازى يوسفى کوڕی ئەیوب، خوا دەسەڵاتی بپارێزێتو ئەم سیفەتانەی تێدا بەدبێت[4]. هەروەها فەرمانی لەخواترسانو پاراستنی نوێژو چون بۆ مزگەوت خۆپاراستن لەقەدەغەکراوەکانو چاکبوون لەگەڵ ژێر دەستەکانو دادگەر بوونلەگەڵیانداو پاراستنی سەنگەرەکانو جیهادکرنی بێ

---

[1] البداية والنهاية(١٦/٥٤١).

[2] تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٥.

[3] كتاب الروضتين(٣/٦٥،٦١،٦٠)، تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٥.

[4] مآثر الأناقة في معالم الخلافة(٣/٨٧أ٨٨).

باوەڕان و پشت بەستن بەخواناسان لەبەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتداو پاکێتی پێداو پاشان ئاماژەی بەپێویستی سوپاسکردنی خەلافەت کرد لەسەر ئەو هەموە ڕێزلێنانو پلەو پایانە[1].

بەم شێوەیە سەلاحەدین دڵنیابوو لەپشتگیری خەلیفە بۆیو پەسەندکردنی نامەکەیبەشێوەیەکی باش، بۆیە نامەیەکی بۆنوسیو تیایدا هاتووە: سوپاس بۆخوا بە ئەندازەی ئەوکارەباشانەی کە لەئیسلامدا کراون، دەوڵەتی عەباسیش والیەکانی ئەبومسلم ئاوەدانی ناکاتەوە چونکە ئەو هاتو ڕۆشتو گفرلبکیش پێ ی ناکرێت چونکە سەرکەوتو دواتر پوکایەوە، خزمەتگوزاریش توانی بەرگی خەلافەت لەبەری نەیارانی لابەرێت بەتێکشکاندنی بتەکانی باطنی بەشمشێرە سەرکەوتوەکەی[2]،شایانی باسە لەمینبەری سەرجەم ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتیدا وتاری بۆ خەلیفە دەخوێندەوەو وتاربێژەکانیش جلوبەرگی دەوڵەتی عەباسیان لەبەردەکردو ئاڵای ڕەشەکانیان بەرزدەکردەوە[3].

لەبەرامبەریشدا، خەلیفە ئامادە نەبوو جلوبەرگی ڕەشو مێزەرەی رەش بدات بەیەکێك لەنزیکەکانی یان بەئەمیرەکان لەوانەی کە لەژێر دەسەڵاتی سەلاحەدیندا بوون، ئەمەش وەك ڕێزلێنان لەسەلاحەدینو نرخاندنی کەسایەتیو جیاکردنەوەی لەخەڵکانی تر، بۆ نمونە لەساڵی ٥٧٨ك/١١٨٢ز دا ئامادەنەبوو بەرگو مێزەری رەش بدات بەشازادە جمال الدین خۆشترین کە لەموسڵ هەڵات بوو دەیویست پەیوەندی بەسەلاحەدینەوە بکات[4]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئارەزووی راستگۆیانەی خەلیفە بۆ پاراستنی پەیوەندی باشی لەگەڵ سەلاحەدیندا[5] ، بەڵام خەلیفە ویلایەتی موسڵی پێنەبەخشی، هەرچەندە سەلاحەدین چەند نامەیەکی ئاڕاستەی بەغداد کردو پێویستی خۆی بەگرتنە دەسی ویلایەتی موسڵی تیادا روونکردەوە،بەڵام ئەم داوایەی جێبەجێ نەکرا، هەرچەندە میرنشینی ئامەدی دیاربەکری پێبەخشرا[6]، دیارە موسڵ زۆر نزیك بوو لەسنووری خەلافەتەوەو ئەمەش مەترسی لای خەلیفەدروستکردبوو، مێژوونوسانیش هۆی پێنەدانی ویلایەتی موسڵ بەسەلاحەدین بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کەخەلیفە ترساوە لە درێژەبوونەوەی دەسەڵاتی سەلاحەدینو پەلکێشانی بۆ ئەو ناوچانەی نزیکن لەخەلافەتەوە وەك جەزیرەو موسڵ، لەناکۆکی

---

[1] كتاب الروضتين(٣-٨٥،٨٦)، تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٥.

[2] رحلة أبن جبير، ل: ٥١، تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٥.

[3] تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٥.

[4] تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٦.

[5] كتاب الروضتين له، تأريخ الأيوبين ، ل: ٨٦.

[6] كتاب الروضتين، له: موسوعة تأريخ العرب وه، ل: ٥٧.

نێوان سەلاحەدین و سیف الدین غازی فەرمانڕەوای موسڵیشدا سەلاحەدین وەڵامی داواکەی خەلیفەی دایەوەو لەشەنگال پاشەکشەی کرد، بەڵام سەلاحەدین گلەیەکی ناسکی لەخەلیفەکرد بۆ ئەوەی لەگوێڕایەڵی دەرچیۆ و بەردەوام بوو لەسەر نامە ناردن و ئاگادارکردنەوەی لەدەسکەوت کارەکانی بەتایبەت لەجەنگی حطینداو پێی وت: خزمەتگوزار هەواڵی ئەم ئازادکرد مەزنەتان بۆ باس دەکات.... خەلیفەش متمانەی بەسەلاحەدین دەکردو ئەم دڵسۆزیەی لەشێوەوی ناردنی دیاری و تابلۆدا دەنرخاندو لەتاو ئەم تابلۆیانەشدا تابلۆیەکی نارد کە چەند ئایەتێکی تیادا نوسرا بوو بۆ هەڵواسینی بەدەرگای بەیتولمەقدیسداو تیایدا دەیوت: خوای گەورە ئەم ئازادکردنەی لەسەر دەستی بوژێنەری دەوڵەت و شمشێری سەرخەری خۆیو بەندەی گوێڕایەڵی دڵسۆز لەپەرستشیداو تێکۆشەر لەژێر ئاڵاکەیدا، یوسفی کوڕی ئەیوبی پیشتیوانی ئەمیری باوەڕدارانـدا بەدیهێنا[1]. خەڵکانی دوزمان و خراپەکاریشهەوڵیان دەدا بۆ تێکدانی نێوانی خەلیفەو سەلاحەدین پاش جەنگی حطین[2]، ئەمەش لەشوێنی خۆیدا بەپشتیوانی پەروەردگار لێی دەدوێین.

## حەوتەم: پەیوەندی سەلاحەدین بەدەوڵەتی بیزەنتیەوە:

ئیمپراتۆر مانوێل کومین یەکێکبوو لە سەرسەختترین دوژمنانی سەلاحەدین و هاوپەیمانی خاچپەرستەکان بوو، بەڵام کاتێ ئیمپراتۆر ئەندروس نیقوسی کومنین دەسەڵاتی لەساڵی٥٧٨ك/ ١١٨٢ز دا گرتەدەست بارودۆخەکە گۆڕاو پەیوەندی پتەوی لەگەڵ سەلاحەدیندا هەبوو بەهۆی ئەو بەرژەوەندیە هاوبەشەی کەکۆی دەکردنەوە، چونکە دوژمنی یەکەمی ئیمپراتۆرە سلجوقییەکان بوو کەسوپای بیزەنتیان تێکشکاند لەجەنگی (میربۆکیفا) لون لەکۆتای ساڵی ٥٧١ك/ ١١٧٦ زد، هەروەك ئەو رق و کینەی کەبیزەنتیەکان و ئەندرۆنیقوسی خاچپەرستە لاتین و ئیتالیەکان هەیانبوو لەبەرئەوەی کەدەستیان گرتبوو بەسەر خێرو بێرو ئابووری بیزەنتەدا، ئەمەش وایکرد لەئەنقوستی کومنین کەزیاتر لەسەلاحەین نزیك ببێتەوە، ئەم نزیکبوونەوەش بەمەبەستی بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان هەر دوولا بوو دژ بەلاتینە خاچپەرستەکان بەشێوەیەکی گشتیو سلجوقیەکان بەشێوەیەکی تایبەتی، رۆژئاواییە ئەورپیەکانیش ئەم نزیکبونەوەیان وەك پێشێل کردنی پەیوەندی ئاینیو تێپەڕاندنی دابونەریت لەلایەن بیزەنتیەکانەوەلەقەڵەم دەدا، چونکە جەنگی نێوان هەردوولایەنی موسڵمان و بیزەنتی لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوە بەردەوام بوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەندرۆنیقۆسی کومنین و ئیسحاقی دووەم ئنجیلوسی جێنشینی ئەم

---

[1] مختصرالتاريخ من اءل الزمان الى تاريخ بنى العباس، ل:٥٧.

[2] موسوعة تأريخ العرب، ل: ٥٧.

سیاسەتەیان گۆڕی و نزیك بونەوە لەسەلاحەدین کەگەورەترین دوژمنی خاچپەرستەکان بوو، بەڵکو هەوڵی زۆریان دەدا بۆ لەناوبردنی میرنیشینەخاچپەرستەکان لەرۆژهەلات دا[1]، پێش ئەمەش نزیکبونەوەیەکی کەسی هەبوکاتیّ ئەندرو نیقوسی کومینین دورخرایەوە پاش لەسەرکار لابردنی لەمیرنشینی کلیکلیەدوای ساڵی(١١١٦ز) دا، ئەوەبوو پەنای برد بۆدیمەشقو نورەدین مەحمودیش بەگەرمی پێشوازی لێکرد، ئەندرۆنیقۆسی کومنینیش بناغەی ئەم پەیوەندیانەی دانا کاتێك کەباڵیۆزی خۆی نارد بۆلای سەلاحەدین لەساڵی(٥٨ك/١١٨٥ز)داو پێشنیازی دروستکردنی هاوپەیمانێتیەکی کرد لەنێوانیاندا لەسەر چەند بنەمایەك کەگرنگترینیان.

- سەلاحەدین خۆی سەربەئەندرۆنیتوسی کومنین پیشان بدات چونکە ئەوئیمپراتۆرە.
- هەردوولا هاوکاری یەکتربن دژ بەسلجوقیەکانو ئەگەر ناوچەی ئاسیای بچوك لەسلجوقیەکان سەندرایەوە بخرێتە سەرموڵکی ئیمپراتۆریەتەکە.
- ئەندرۆنیقۆسی بەڵێن دەدا بەیارمەتیدانی سەلاحەدین لەخەباتیدا دژ بەخاچپەرستەکان لەولاتی شام دا بەلام پێش ئەوەی سەلاحەدین بڕیار لەسەر وەلامدانەوەی ئەم مەرجانەبدات ئەندرۆنیقۆسی لەقودس دا لەسەر کار لابرا لەجمادی دووەمی ساڵی ٥٨١ك ئەیلولی١١٨٥زدا پاشان کوژراوئیسحاق ئەنجیلۆسی بوە ئیمپراتۆر لەساڵی ١١٨٥–١١٩٥زدا[2].

سەلاحەدینیش ئارەزووی لەبەردەوامبوونی لێکنزیکبوونەوە هەبوو لەگەڵ ئیمپراتۆر ئیسحاقی دووەمدا وەك وەلامدانەوەیەك بۆخواستی ئەو کە پاراستنی ئەم پەیوەندییانەی بەگرنگ دەزانی بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکانی کەئەوانیش: نۆرمانەکان بوون لەصقلیە کەهەڕەشەیان لەقسطنطینیەی پایتەخت دەکرد، وێڕای خاچپەرستەکان لەشامداو سلجوقیەکانلەئاسیای بچوکدا، بۆیە رێکەوتنامەکەی پێشووی پەسەندکرد دوای ئەوەی کەچەندبڕگەیەکی هەمواركردبەجۆرێکلەگەڵ بەهێزی دەسەلاتی خۆیدا بگونجێت کە لەئاستی هێزی شکستخواردووی بیزەنتیەکاندا نەبوو[3]. ئەم رێکەوتنەش خاچپەرستەکانی لەرۆژهەلاتدا توڕە کردو، ریمۆندی ئەمیر طرابلوس هەستا بەدەستگیرکردنی ئەلکسیوسی برای ئیمپراتۆر، لەکاتێکدا کە لەدیمەشقەوە بەرەو قسطنطینیە بەرێکەوتبوو، چونکە تا ئەوکاتەش هەر میوانی سەلاحەدینبوو، ئەمەش لەکاتی تێپەڕبوونیدا بوو بەعەکادا لەساڵی ٥٨٢ك/ ١١٨٦ز و پاش دەستگیرکردنیشی خستیە زیندانەوە، ئیمپراتۆر ئیسحاقیش هانای هێنا بۆسەلاحەدینو هانی دا بۆ هێرشکردنە سەر خاچپەرسنەکانو فشار خستنە

---

[1] تأريخ الايوبيين، ل:١٠٤، ١٠٥

[2] تأريخ الأعمال المنجزة، وليم الصوری (١٠٣٥/٢)

[3] تأريخ الأعمال المنجزة، وليم الصوری (١٠٣٥/٢)

سەریان بۆرزگارکردنی براکەی، لەساڵی دواتریشدا هێرشیکردەسەر میرنشینی بەیتولمەقدیسی خاچپەرست بەسود وەرگرتن لەو رووداوانەی کا تیایدا روویان دەدا بۆ بەدیهێنانی ئامانجی یەکەمی کەبریتیبوو لەلێدانی خاچپەرستەکان، ئەوەبوو سەلاحەدین توانی قودس وشارەکانی کەنار دەریا رزگاریکات و ئەلکسیوسیش ئازادبکات ئەویش گەڕایەوە بۆ قسطنطینیەو پاش ئەوەش کەسەلاحەدین سەرکەوت بەسەر خاچپەرستەکاندا چەندنێردراوێکی بەدیاریەوە نارد بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی و لەسەرکەوتن و دەستکەوتەکانی ئاگاداریکردەوە، ئیمپراتۆریش لەکۆشکێکی ناوەڕاسی شاردا میوەنداری نێردراوەکانی سەلاحەدینی کردو هاوپەیمانێتی خۆی لەگەڵ سەلاحەحەدیندا نوێ کردەوە[1]، ئیمپراتۆریش نامەیەکی هاوشێوەی ئەوەی سەلاحەدینی بۆ ناردەوەو سەلاحەدینیش پێشوازی لەدوو نوێنەرەکە کرد لەمانگی ذی العقدەی ساڵی ٥٨٣ك/١١٨٨ز دا دوای چەندرۆژێك لەهەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر صور، بەئامادەبوونی کوڕو ئەمیرو فەرمانبەرەکانی، ئیسحاقی دووەمیش لەنامەکەیدا ستایشی ئەو کارانەی دەکرد کەسەلاحەدین پێی هەستاوە ئەو هەوڵانەی کەخستیەگەڕ بۆ ئازادکردنی براکەی و پێزانینی خۆی بۆ دەربڕی، هەروەها پرسیاری لەدوو نێردراوەکە کرد، دەربارەی بارودۆخی ئیمپراتۆریەکە، لەوانەیە گرنگترین هەواڵێکیش کەوەفدەکە پێی بوو بریتیبوو لەوەی کە لەرۆژئاوادا روویدابوو لەبانگەشەکردن بۆ هەڵمەتێکی نوێی خاچپەرستی، سەلاحەدینیش بەم مەسەلەیەی زانیبوو، لێرەشەوە دڵسۆزی ئیسحاقی دووەمی بۆ دەرکەوت هەردوولا نیگەران بوون بەم مەسەلەیەو سەلاحەدینیش ویستی هاوکاری ئیسحاقی دووەم مسۆگەر بکات لەکاتی تێپەڕبوونی شالاوەکە بە ولاتەکەیدا کەرێڕەوێکی سروشتی هەڵمەتە زەمینەکان بوو، هەربۆیە لەکاتی گەڕانەوەی دوو نێردراوەکەدا چەند نێردراوێکی لەگەڵدا نارد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا سەبارەت بەدروستکردنی هاوپەیمانیەتیەکی سەربازی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی بیزەنتی و ئەیوبیدا بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی خاچپەرستەکان، یەکێك لەو دیاردانەش کەسەلاحەدین بۆ ئیسحاقی دووەم ئنجلیوسی ناردبوو بریتی بوو لەمینبەرێك بۆ دانانی لەمزگەوتی قسطنطینیە دا، لەگەڵ گرنگیدانی بەئاوەدانی و ئەنجامدانی دروشمە ئاینیەکان تیایدا، ئیسحاقی دووەم ئنجلیوسیش ئارەزووی خۆی نیشاندا بۆ رەچاوکردنی دروشمە یۆنانیەکان لەکڵێساکانی فەلسطیندا[2]، دواتریش بەدرێژی باس لەپەیوەندی ئەیوبیەکان بەبیزەنتیەکانەوە لەشالاوی سێیەمی خاچپەرستیدا دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار.

---

[1] موسوعة تأريخ العرب العصر الأيوبي، ل: ٦٥.

[2] موسوعة تأريخ العرب العصر الأيوبي، ل: ٦٦.

**هەشتەم: پەیوەندی سەلاحەدین بەخاچپەرستەکانەوە پێش حطین:**

سەلاحەدین هەوڵیدەدا بۆ یەکخستنی میسرو وڵاتی شام، بەڵام لەهەمان کاتدا لەوەش گەیشتبوو کەرووبەروو بونەوەی خاچپەرستەکان‌و سەرقاڵکردنیان نابێت پاش بەدەستهێنانی یەکێتی‌و یەکخستنی هەموو ناوچەکان بێت، هەربۆیە سەلاحەدین لەستراتیژی کاریدا پشتی بەم دوو هێڵە بەستبوو: هێڵی یەکخستن‌و هێڵی بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستەکان‌و سود وەرگرتن لە هەر بارودۆخەکێك بۆ رووبەرووبونەوەیان، لەسەرو بەندی ئەمەشدا سەلاحەدین بێ ئاگانەبوو لەپەیرەوکردنی چەند سیتراتیژێك لەوانە:

أ- کارکردن لەپێناو زیاتر تۆکمەکردنی ناوچەکانی ژێردەسەلاتی لەمیسرو وڵاتی شامدا، لەرێی زیادکردنی هێزەسەربازەکانیەوە بەهەردوو بەشی وشکانی‌و دەریاییەوە، یاخود لەرێی کارکردن بۆ بنیاتنانی قەڵاو تۆکمەکردنی سەربازگەکان هەتاوەکو پاراستنێکی باشتر بۆ خۆی‌و سوپاکەی دەستەبەر بکات، یاخود بۆ سود لێوەرگرتنی وەك چەند ناوچەیەکی چاودێریکردنی قایمکاریەکانی خاچپەرستەکان، بۆ ئەم مەبەستەش هەستا بەتۆکمەکردنی حەسارو شورای قاهیرەو ئیسکەندەریەو دمیاطو چەند قەڵایەکی لەوڵاتی شامدا بنیاتنا وەك قەڵای عجلون، هەروەها هەوڵی دەدا بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو قەڵاو حەسارانەدا کەکەوتبوونە ژێر دەسەلاتی خاچپەرستەکان یاخود کارکردن بۆ پەکخستنی کاری خاچپەرستەکان لەبنیاتنانی قەڵاو ئەو تۆکمەکارییانەی کەمەترسی بوون بۆ سەر ناوچە ئیسلامیەکان.

ب- کارکردن بۆ مۆرکردنی رێکەوتنامە لەگەڵ ئەو هێزانەی کەدەتوانن کاریگەریان هەبێت بۆ پێشکەشکردنی کۆمەکی بەخاچپەرستەکان، یاخود توانای کارتێکردنی بەرەی ئیسلامی هەبێت لەرووی سەربازییەوە، بۆ ئەم مەبەستەش زیاتر گرنگی بەشارە بازرگانیەکانی ئیتالیا دەدات.

ج- پەنابردن بۆ مۆرکردنی ئاگربەست لەگەڵ هەندێ لایەنی خاچپەرستدا بەمەبەستی یەکلابونەوەی بۆ رووبەروو بونەوەی لایەنێکی خاچپەرستی تر، بەسود وەرگرتن لەبارودۆخ‌و ناکۆکی نێوان خاچپەرستەکان، بەتایبەت ئەو ناکۆکیەی کە لەنێوان میرنشینی بەیتولمەقدیس‌و طرابلوسدا هەبوو، هەروەها سودی لەئاگربەستەکان‌و وەردەگرت بۆ

تەواوکردنی قایمکارییە سەربازییەکانو یەکخستنی ناوچەکان، ناوچەکان، چونکە سروشتی بارودۆخەکە بواری پێنەدا. کە لەهەمان کاتدا لەچەند بەرەیەکی شەڕدا بەشداربێت[1].

ئەوە بوو سەلاحەدین سودی لەوبارودۆخە وەرگرت کە لەبەرژەوەندی بەرەی ئیسلامی بوو بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە کە بەئاراستەی یەکبووندا هەنگاویان دەنا، ئەمە لەکاتێکدا بوو کەبەرەی گاور لەدابەزیندا بوو بەپێی قسەی مێژوونوس روبەرت باینە، هەروەها سەلاحەدین سودی لەو رۆحیەتە جیهادیە وەرگرت کە لەسەردەمی عمادەدین زەنکیو نورەدینی کوڕییەوە روخسارەکانی بەئاشکرا دەرکەوتبوو، کاتێك قسە لەسەر ئەو جەنگانەش دەکەین کە سەلاحەدین لەم ماوەیەدا دژ بەخاچپەرستەکان ئەنجامیدا، دەبێ بزانین کە چەند جەنگێکی زۆر بوونو لەزیاتر لەشوێنێکدا ئەنجام دراون، بەلام لەم قۆناغەدا نەگەشتبوە ئاستی شەڕی هەمەلایەنەو سەرتاسەری لەگەڵ خاچپەرستەکاندا[2]، گرنگترینی ئەو جەنگانەش بریتیەلە:

**١- هێرشەکانی خاچپەرستان بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی سەلاحەدین ٥٧٠ك-٥٧٢ك:**

یەکەم ئەرکێك کەریمۆندی سێیەم پێی هەستا، وەك سەرپەرشتیار (وصی) تەختی شانشینی بەیتولمەقدیس بریتی بوو لەکارکردن بۆ سنوردارکردنی هێزی سەلاحەدینو رێگرتن لەدەستگرتنی بەسەر حەلەبدا، هەربۆیە خاچپەرستەکان وازیان نەهێنا لەهێرشکردنە سەر ناوچەکانی، لەکاتێکدا کەسەرگەرمی روبەرووبونەوە بوو لەگەڵ زەنکییەکاندا، هەرچەندە ئەم هێرشانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو، بەهۆی ناتەواوی بارودۆخی خاچپەرستەکانەوە[3] ئەوە بوو لەمانگی موحەڕەمی ٥٧١ك/ ئابی ١١٧٥ز دا پاشای خاچپەرست بلدوینی چوارەم هەلی سەرقالبوونی سەلاحەدینی قۆستەوە کەناچاربوو بەرەی جەنگی خاچپەرستەکان هێور بکاتەوە هەتاوەکو یەکلاببێتەوە بۆ جەنگ کردن لەدژی سیف الدین غازی ئەمیری موسڵ، بۆ ئەوەی لەیەك کاتدا لەدووبەرەدا نەجەنگێت: زەنکییەکان لەباکورو رۆژهەلاتەوەو خاچپەرستەکان لەباشوری رۆژئاواوە، بۆیە ئاگربەستی لەگەڵ شانشینی بیتولمەقدیسدا نوێکردەوە[4]، بەلام خاچپەرستەکان ئاگربەستەکەیان پێشێلکرد لەساڵی دواتردا لەگەرمەی ململانێی سەلاحەدین لەگەڵ زەنکیەکاندا، ئەوە بوو هێرشیان هێنایە سەر ئەو زەویانەی لەژێر دەسەلاتی سەلاحەدیندا بووو ریمۆندی سێیەمی فەرمانڕەوای طرابلوس پەلاماری

---

[1] دراسات فی تأریخ الأیوبین والممالیك، ل: ٩١.

[2] دراسات فی تأریخ الأیوبین والممالیك، ل: ٩٢.

[3] تأریخ الایوبیین، ل:١١٩.

[4] الكامل فی التأریخ (٤٢٢/٩)، تأریخ الأیوبین، ل:١١٩.

ناوچەی بیقاعیداو سوپای شانشینیش لەباشورەوە بەسەرکردایەتی شاهمفری سیدتبنین هێرشی هێنا، بەڵام پێدەچێت ڕێمۆندی سێیەم دوچاری شکست بووبێت لەسەردەستی أبن المقدمی ئەمیری بەعلەبەك، بەڵام هەردوو سوپای خاچپەرست پێکەوە کۆبوونەوەو پێکدادان لەگەڵ شمس الدولة توران شاداڕویدا کەبراو جێگری سەلاحەدین بوو لەدیمەشقدا لەناوچەی عنجری بیقاعدا، لەکاتێکدا کەتورانشاه بۆ بەدەمەوە چوونی بەعلەبەك بەڕێکەتبوو، بەڵام ئەو ڕووبەڕوو بونەوەیە یەکلاکەرەوە نەبوو، هەر کەسەلاحەدین لەباکورەوە هات خاچپەرستەکان لەناوچەکە پاشەکشەیان کردو ئەویش نەیویست بەدوایاندا بچێت، بەڵکو گەڕانەوەی بۆ میسر پێباشتر بوو و تورانشای براشی لەدیمەشقدا هێشتەوە[1].

٢- **خاچپەرستەکان هێرش دەکەنە سەر حمص و حەما:** گومان لەوەدا نییە کەخاچپەرستەکان هەلێکی زێڕینیان لەدەستدا بۆ لێدانی سەلاحەدین لەمیسردا لەکاتێکدا کەجێ پێی خۆی لەباکووری ئەفریقادا قایم نەکردبوو،چونکە بارودۆخەکەبەتەواوی لەبەرژەوەندی ئەواندا بوودوای ئەوەی کەئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هەموو توانایەکی خستەگڕ بۆسەرخستنی ئەم هەڵمەتە، بەتێپەڕبوونی کاتیش سەلما کەهەلی لەوشێوە بۆ خاچپەرستەکان جارێکی تر هەڵنەکەوتووە[2]، ئەمە سەرباری شکست هێنانی هەڵمەتی هاوبەشی بیزەنتی- خاچپەرستی بۆسەر میسر، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم سود وەرگرتنی خاچپەرستەکان لەشالاوی فلمنکی بۆهێرشکردنە سەر زەویە ئیسلامیەکانی ژێر دەسەلاتی سەلاحەدین لەولاتی شامدا، ئەوەبوو لەرەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٧٢ك/١١ی ئەیلولی ساڵی ١١٧٦ سەلاحەدین لەمیسرەوە بەرەو شام بەڕێکەوت، دوای ئەوەی کە لەگەڵ پاشا الصالح ئیسماعیلی فەرمانڕەوای حەلەبدا بەڕێکەوت[3]، بلدوینی چوارەمیش ئەم هەلەی قۆستەوەو داواکەی دوبارەکردەوە لەفیلیب ئەلزاسی سەبارەت بەپێویستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزە ئیسلامییانەی کە لەسەر سنوری ڕۆژهەلاتی هەردوو میرنشینی رەهاو طرابلوس داو جێگیربوون، ئەویش داواکەی پەسەند کردو بەیتولمەقدیسی لەمانگی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٧٣ك کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١١٧٧ز بەجێهێشتو بەرەو باکور بەڕێکەوت بۆ یارمەتی دانی هەریەك لەریمۆندی سێیەمی فەرمانرەوای ئەنطاکیە لەسەر داوای خۆیان، چونکە چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کەبتوانن لەئامادەنەبونی سەلاحەدیندا دەسکەوتێك بەدەست بێنن، پاشاش سەد

---

[1] وليم الصوري(٢/٨٨٦)، تأريخ الأيوبين، ل:١١٩.

[2] الحركة الصلبية(٢/٧٥٤)، تأريخ الأيوبين، ل:١١٩.

[3] النوادر السلطانية، ل: ، ٩٦، تأريخ الأيوبين، ل:١٢٢.

سوارو دووو پیادەڕەوی بەکۆمەکی بۆنارد[1]، کەتیبەیەکیش لەوسوپایە هێرشی کردە سەر حمص و کەوتە بۆسەکەیەوەو هەموو ئەو دەستکەوتانەیان لەدەستدا کەپێشتر دەستیان بەسەردا گرتبوو، لەهەمان کاتدا فیلیپو ریمۆندی سێیەم بەهێزەکانییەوە هێرشی کردە سەر حەماو زۆری نەمابوو داگیرییکەن ئەگەر خۆراگری موسڵمانەکان نەبوایە، بۆیە بەسەر شۆڕیەوە پاشەکشەیان کردو دوای گەمارۆیەکی چوار رۆژی بێ ئەوەی هیچ ئامانجێك بەدیبێنن. وادیارە ئەو وشکە ساڵیو بێ بەرو بومیەش کەناوچەکانی گرتبووەو یەکێك بوو لەهۆکارەکانی ئەم جەنگە، لەونامەیەی القاضی الفاضلدا کەناردی بۆ بەغداد بەوازۆی سەلاحەدین ئامازەی بۆ ئەم مەسەلەیە تێدایە: بێباوەڕان هاتنەدەرەوە بۆ وڵاتی شام بەشێوەیەکی بەهێز رووبەروویان بوینەوەو ناوچەکەیان بەجێهێشت وایان دانابوو کەبدەن بەسەر شامدا لەکاتێکدا کەقاتو قڕیو وشکە ساڵی رووی تێکردبوو، ئەوەبوو لەرۆژی دووشەممە بیستو یەکی جەمادی یەکەم هاتنە ناوچەی حەماوە[2].

٣- **پەلاماردانی حارم:** حارم شارێکە دەکەوێتە رۆژهەلاتی روباری عاصی لەدوری دوانزە میللەوە لەئەنطاکیە، ئەوەبوو ئەمیری ئەنطاکیە بوهیمۆندی سێیەم داوایکرد لەفیلیب ئیلزامسی کەهێرش بکاتە سەر شاری حارمو بەڵێنی یارمەتیدانی پێدا، فیلیپیش بەرەو حارم بەرێکەوت بەهاوڕێیەتی ریمۆندی سێیەم، لەو کاتەشدا حارم لەژێر دەسەلاتی کمشتكیندا بوو کەئەتابەکی پێشوو پاشای الملك الصالح ئیسماعیل بوو، کە لەو رۆژگارەدا دوچاری پشێوی بوو بوو بەهۆی پشتیوانی خەڵکەکەی لەکمشتكین لەناکۆکی لەگەڵ الملك لصالح ئیسماعیلدا[3]، ئەوە بوو حارم لەلایەن خاچپەرستەکانەوە لەسەرەتای مانگی جەمادی کۆتایی/ تشرینی دووەمدا گەمارۆدراو خەڵکی حارمیش ناکۆکیەکانیان وەلاناو بەرەنگاری ئەم گەمارۆیەبونەوە کەچوار مانگی خایاندو توانیان بەرگرییەکی جوامێرانە بکەن، لەهەمان کاتیشدا حەلەبیەکان دەستیان دایە هێرشکردنە سەر زەویە نزیکەکانی خاچپەرستەکانو الصالح ئیسماعیلیش تیپێکی سەربازی ناردو توانی هێڵەکانی خاچپەرستەکان ببڕێتو بچێتە پاڵی پاسگای شارەکەوە[4]، سەلاحەدینیش لەهەمان کاتدا میسری بەجێهێشت هەتاوەکو هێرش بکاتە سەر شانشینی بەیتولمەقدیس خاچپەرستەکانیش مەترسی ئەوەیان هەبوو کە

---

[1] تاريخ الأيوبين، ل:١١٩.

[2] الكامل فى التأريخ (٤٣٠-٤٢٩/٩)

[3] موسوعة تأريخ العرب، ل: ٧٤.

[4] الكامل فى التأريخ (٤٣١/٩).

حەلەبیەکان هانا بەرن بۆ سەلاحەدین و ئەشیانویست کە پشتیوانی لەشانشینی بەیتولمەقدیس بکەن، بەلام الملك الصالح ئیسماعیل دانوستانی لەگەڵدا کردن لەسەر هەڵگرتنی گەمارۆ کە لەبەرامبەر بڕێك پارەدا، هەروەك هەڕەشەی تەسلیم کردنی شارەکەی بەسەلاحەدین کرد، ئەوانیش گەمارۆکەیان هەڵگرت و نەیانتوانی دەست بەسەر ئەو شارەدا بگرن[1].

٤- **جەنگی رەملە (الرملە)**: ئەم جەنگە ئەزمونێکی تاڵ بوو بۆ سەلاحەدین و ئەوەی لێوە فێر بوو کەهەڵەیە رووبەرووی خاچپەرستان ببێتەوە پێش یەکخستنی بەرەی ئیسلامی ، چونکە بەیەکخستنی ئەم بەرەیە هێزێکی لەبن نەهاتووی دەستگیردەبێت کەئامادەی قوربانیدانە بۆ تێکشکاندی هێزی دوژمن ئەمە سەرباری ئەوەی کە سوپاکەی دەتوانێت لەروبەرێکی بەرفراوانتردا جموجۆڵ بکات، چونکە سەلاحەدین روبەرێکی بەرفراوانی ولاتی شامی خستبوویە سەر دەوڵەتەکەی لەمیسردا لەو کاتەشەوە کەبەرەو دیمەشق بەرێکەوت لەساڵی ٥٧٠/١١٧٤ز دا حمص وحەماو حارمی لکاند بەمیسرەوە،بەلام هێشتا ناوچەیەکی بەرفراوان لەدەرەوەی دەسەلاتیدا مابوویەوە[2]. پاش ئەوەی کەگەڕایەوە بۆ میسر لەساڵی ٥٧٢ك/ ١١٧٦ز دا بڕیاریدا کەهەستێت بەشالاوێك دژی بەخاچپەرستەکان بەبیست هەزار جەنگاوەرەوە لەمانگی جەمادی یەکەمی ٥٧٣ك/ شرینی دووەمی ١١٧٧زدا میسری بەجێهێشت و لەشاری بلبیسدا[3] خێوەتی هەڵداو کەدە قۆناغ لەشاری میسرەوە دوورە لەسەر رێگای شام[4]، پاشان لەوێوە بەرەو ناوچەکانی باشوری فەلەستین بەرێکەوتن و لەنزیك عەسقەلان لایدا کە بەدەست خاچپەرستەکانەوە بوو، توانی ژمارەیەك لەخاچپەرستەکان بەدیل بگرێت و فەرمانی کوشتنیانی دەرکرد[5]، ئەوەبوو سەلاحەدین رووبەرووی بەرگرییەکی ئەوتۆ نەبویەوە و سەربازەکانی گوندەکانیان رامالی و دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی دەستکەوتەکان، پاشان سەلاحەدین کۆمەڵێ لەسەربازەکانی کۆکردەوە و بەرەو شارۆچکەی رەملەی نزیك کەنار دەریا پێشڕەوی کرد کە لەوکاتەدا یەکێك بوو لەشارە گەورەکانی

---

[1] تأريخ الأعمال (٢/١٠٠٥)، موسوعة تأريخ العرب، ل: ٧٦.

[2] الجيش الأيوبي فى عهد صلاح الدين، ل: ٤١١.

[3] مرآة الزمان، لە: الجيش الأيوبي، ل: ٤١١.

[4] معجم البلدان (١/٤٧٩).

[5] مفرج الكروب، لە: الجيش الأيوبي، ل: ٤١١.

فەلەستین[1]، بەڵام رووبەرووی روباری تل الصافیە بونەوەو بڵاوبوونەوە بۆ گەڕان بەدوای شوێنێکدا کە لێوەی بپەڕنەوەو لەکاتێکدا کە لەم حاڵەتەدا بون هێزێکی خاچپەرست هێرشی کردە سەریان پێش ئەوەی خۆیان رێکبخەنەوە، واپێدەچێت کەخاچپەرستەکان چاودێری جموجۆڵەکانیان کردبن‌و لەکاتی گونجاودا پەلاماریان داون بەسەرکردایەتی ئەمیر ئەرناطو پشتیوانی بلدوینی سێیەم پاشای بەیتولمەقدیس[2]، لەوکاتەشدا سەڵاحەدین تەنها ژمارەیەکی کەم لەسەربازو ئەمیرەکانی لەگەڵدا بوو، چونکە زۆربەیان بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت بڵاوەیان لێکردبوو[3]، ئەوەبوو پێکدادان دەستی پێکردو سەربازەکانی سەڵاحەدین کۆبوونەوەو بەرەنگاری خاچپەرستەکان بوونەوە چەند فەرماندەیەکی سەڵاحەدین‌و هەندێك لەخزمەکانی ئازایەتی‌و خۆڕاگری زۆریان نواند بەتایبەت تەقی الدین عومەرو ئەحمەدی کوڕی‌و ضیاء عیسای هەکاری‌و ظهیر الدینی برای، بەڵام ئەو دووانەی دوایی بەدیل گیران‌و دووساڵ لەزینداندا مانەوە لەئاکامدا زانا عیسی هەکاری بەشەست هەزار دینار ئازادکرد[4]، ئەوەبوو تەقی الدین عومەر پێشڕەوی کردو ئازایانە دەستی دایە جەنگ لەبەر دەستی مامیداو چەند خاچپەرستێکی کوشت‌و پاشان ئەحمەدی کوڕی هاتە پێشەوەو ئازایەتی زۆری نواندو چەند سەربازێکی دوژمنی کوشت‌و بەسەلامەتی گەڕایەوە لای باوکی، پاشان باوکی فەرمانی گەڕانەوەی دووبارەی دا بۆ کوشتاری دوژمن‌و پێی وت: بگەڕێوە ئەی ئەحمەد، ئەوە بوو ئەحمەدیش گەڕایەوە بۆ کوشتاریان‌و بەشەڕ هات تاکوو شەهیدبوو[5]، بەڵام موسڵمانەکان نەیانتوانی لەبەرامبەریاندا خۆڕاگربن‌و سەڵاحەدینیش باسی شکستی کرد کە چۆن گۆڕینی شوێنی سەربازەکان‌و لاکانی سوپا ئەم دەرەنجامە ناخۆشەی لێکەوتەوە کاتێ وتی: لەکاتێکدا کەدوژمن نزیکیان بوویەوە هەندێ لەسەربازەکان پێیان باش بوو لەلای راستەوە بچن بۆ لای چەپ لەلای چەپیشەوە بچن بۆ ناوجەرگەی سوپا هەتاوەکو ئەو گردۆڵکەیەی کە لەزەوی رەملەدا هەیە بکەوێتە پشتیانەوە نەك پێشیان، لەکاتێکدا کە سەرگەرمی ئەمپلانەبوو دوژمن هێرشی بۆ هێنان[6].

---

[1] یاقوت وا باسی دەکات کەشارێکی گەورەیە لەفەلەستین، پێشتر شاری گەورەی بووە.

[2] الجیش الأیوبی، کاستلان، ل: ٥٩، الجیش الأیوبی، ل:٤١٢.

[3] مفرج الکروب (٢/٦١)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٢.

[4] سنا البرق الشامی (١/٢٥٦)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٢.

[5] سنا البرق الشامی (١/٢٥٦)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٢.

[6] کتاب الروضتین(١/٧٠٣)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٣.

●هۆکارەکانی شکستهێنان لەجەنگی رەملەدا.

●پەلاماردانی کتوپڕی سوپای ئەیوبی لەلایەن خاچپەرستەکانەوە لەکاتی بڵاوبوونەوەیانداپێش ئەوەی ریزەکانیان رێکبخەنەوە.

●ئەم پەلامارە کتوپڕە کاریگەری هەبوو لەشلەژانو شپرزەبوونی ریزو باڵەکانی سوپای ئەیوبی و بڵاوبونەوەی فەرماندەکانی سوپاو پەنابردنیان بۆشێوازەکانی رووبەڕووبوونەوەی تاکە کەسی کە لەم حاڵەتانەدا سودی ئەوتۆی نییە.

●ونبونی سەڵاحەدین لەبەر چاو بەشێوەیەك کەوایان دەزانی کوژراوە.

●دورکەوتنەوەی سوپای ئەیوبی لەهێڵەکانی کۆمەکیو بڕانی ئازوقەو ئاولێی[1]، ئەوەی کەزۆری زیانەکانی سوپای ئەیوبی دوپاتدەکاتەوە ئەو ووتەیەی مێژوونوسانە کە دەڵێن: ئەم شکستە سەرشۆڕیو لاوازییەك بوو کەخوای گەورە تەنها بەسەرکەوتنی حطین قەرەبووی کردەوەو کۆتای پێهێنا[2]، لەم جەنگەشدا زۆرینەی ئەوانەی کە لەگەڵ سەڵاحەدیندا بوون لەنێوان کوژراو بریندارو بەدیلگیراودا بوون[3]، بەڵام خۆی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەناوەڕاستی جەنگدا هاتە دەرەوەو، بەڵام دوای شکستەکە یەکێك لەخاچپەرستەکان هێرشی بۆ هێناو زۆری نەمابوو پێی بگات، بەڵام پێش ئەوە لەبەردەمیدا کوژرا: پاشان فرەنجەکان شوێن سەڵاحەدین کەوتنو ئەویش ماوەیەك رایدەکردو ماوەیەك دەوەستا هەتاوەکو سەربازەکان پیایدا بگەنەوە، هەتاوەکو شەو داهاتو رێگای وشکانی گرتەبەرو بەرەو میسر بەرێکەوت لەگەڵ چەند کەسێکی کەمدا، لەرێگەدا دوچاری ماندویەتیەکی زۆر بوونو خواردنو ئاویان کەمبوویەوەو وڵاخەکانیان لەبەر دوری رێگاو تینوێتیو برسێتی مرداربوونەوە[4]. لەرێگەی میسریشدا سەڵاحەدین لەبەر چاو ون بوو ئەمەش ترسو دڵەڕاوکێی خستە ریزەکانەوە، ئەوەبوو القاضی الفاضلو بەهەندێ لەهاوەڵانی کەوتنە گەڕان بەدوایداو لەدەشتدا بڵاوبوونەوەو توانیان بیدۆزنەوەو هۆی ئەو خواردمەنیەی کەپێیان بوو فریای کەوتن، پاشان کاروانەکە گەشتە قاهیرە لەناوەڕاستی مانگی جەمادی دووەمی ٥٧٣ك/ کانونی یەکەمی ١١٧٥ز دا[5]، بەڵام هەواڵی سەلامەتی پێشتر بەوشترێکی خێرادا گەیشتبووە میسر[1]. بۆ دانانی

[1] مفرج الكروب (٢/٦٠،٦١)، الجيش الأيوبي، ل:٤١٣.

[2] النوادر، ل: ٥٣، الجيش الأيوبي، ل:٤١٣.

[3] الكامل في تأريخ العرب (١١/٤٤٣)، الجيش الأيوبي، ل:٤١٤.

[4] مفرج الكروب (٢/٦٠)، الجيش الأيوبي، ل:٤١٤.

[5] مفرج الكروب (٢/٦٠)، الجيش الأيوبي، ل:٤١٤.

سنورێك بۆ هەركەسێك كەبیر لەیاخیبوون بكاتەوە بەتایبەت لایەنگرانی فاتمیەكان هەروەها بۆ ئەوەی دوپاتی بكاتەوە كەهێشتا زیندوەو لەكاتی گەیشتندا بۆ قاهیرە كۆتری نامەبەر نامەی مزگێنی برد بۆ هەموو ناوچەكانی میسر بۆ دڵنیاكردنەوەی هەموان[٢].

جەنگی ڕەملەش ئەزمونێكی تاڵ بوو بۆ سەلاحەدین و زۆر شتی لێوە فێربوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەكانی داهاتووی و یەكەم شكستی گەورەی خۆی و هێزەكانی بوو لەبەرامبەر خاچپەرستەكاندا، لەلایەكی تریشەوە سەلاحەدین راستیەكی لا ئاشكرا بوو كەپەیوەندی بەم بەرەی جەنگەوە هەبوو دژ بەخاچپەرستەكان كە ئەویش بەرفراوانی هێڵی فریاكەوتن و كۆمەكی بوو لەنێوان پایتەختی خۆی لەقاهیرەو دەشتەكانی فەلەستینداو سەختی كەمی ئاوو گژوگیا تیایدا، ئەم راستیەش لای خۆی و ئەمیرەكانی و القاضی الفاضل ئاشكرا بوو، پێش سێ ساڵ لەنامەكەیدا بۆ خەلیفە باسكرابوو كاتێك كەسەلاحەدین داوای شام و میسری لەخەلیفە دەكرد[٣]: ( ئێمە لەمیسرەوە توانای لەناوبردنی دوژمنمان نییە لەبەر دوری لێمانەوەو نەبوونی ئاوەدانی و نەبوونی لەوەڕگە بۆ وڵاخەكان كەبەهۆیەوە ئەتوانی بەهێز بێت بۆ جیهاد، جا ئەگەر بچینە شامەوە ئەوە بەرژەوەندی ئاشكرایەو سودی باشی دەبێت، دەستمان پێیدەگات و وڵاخەكان پشو دەدەن و سەربازەكان زۆر دەبن و كات لەبەرژەوەندی ئێمەدا دەبێت)[٤] ئەوە بوو جەنگی رەملە راستی ئەم بۆچوونەی سەلماند لەوكاتەشەوە سەلاحەدین بڕیار گواستنەوەی شوێنی نیشتەجێبوونی سەرەكیدا بۆ شام دوای بنیاتنانەوەی سەر لەنوێ هێزی سەربازی و سیاسی و گێڕانەوەی بۆ دیمەشق، لەوێش لەنورەدین و ئەمیرەكانییەوە ئەزمونێكی زیاتری دەستكەوت لەڕووبەڕوو بونەوەی خاچپەرستەكانداو باشر توانی جوگرافیای ناوچەكە بناسێت ئەمە وێڕای كورتی و نزیكی هێڵەكانی هاتوچۆو ئاسانی گەیاندنی ئازوقە بۆ ئەوان و دوری و زەحمەت گەشتنی دوژمن... لەبەر ئەمەو بەو پێیەی كەئامانجی سەرەكی سەلاحەدین لەكردە سەربازیەكانی لەئایندەدا بریتی بوو لەئازادكردنی قودس وگێڕانەوەی ئەو زەویانەی كەخاچپەرستەكان دەستیان بەسەردا گرتبوو، ئەوە دیمەشق گونجاوترین بنكەی سەربازی بوو بۆ ئەم جۆرە كارانە ، لەبەر ئەمە سەلاحەدین كردیە بنكەی سەرەكی و پایتەختی خۆی و تەنها بۆ سەردان و بەسەركردنەوە دەچووە میسر[٥].

---

[١] سنا البرق الشامی (٢٦٠/١)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٤.

[٢] رنسیمان (٢١٣/٢)، الجیش الأیوبی، ل:٤١٤.

[٣] صلاح الدین القائد وعصره، ل: ٢١٢.

[٤] كتاب الروضتین(٢١٣/١)، صلاح الدین القائد وعصره، ل: ٢١٣.

[٥] صلاح الدین القائد وعصره، ل: ٢١٣.

٥- **جەنگی تل القاضی:** سەلاحەدین چەند مانگێك پاش جەنگی رەملە لەمیسردا مایەوە، هەتاوەکو دڵنیابووەوە لەوەی کەهەموو شتێك لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدایە، پاشان بەجێیهێشتو بەرەو دیمەشق بەرێکەوتو لەرۆژی شەممە ٢٤ی شەوالساڵی ١١٧٩ز دا گەشتە دیمەشقو ئەو ساڵەی لەوێ بەسەر برد هەموو ئەو جەنگانەش کە لەو کاتەدا رویدا لەهەستان بەچەند هێرشێكو وەلامدانەوەی چەند هێرشێك تێپەڕ نەدەبوو، لەراستیشدا سەلاحەدین سەرقاڵ بوو بەگەمارۆدانی بەعلەبەك دوای ئەوەی کەمحەمەدی کوڕی عبدالملکی ناسراو بەأبن المقدمی فەرمانڕەوای ئامادەنەبوو دەستی لێ هەلگرێتو بۆ سالح تورانشای برای سەلاحەدین، بەلام سەلاحەدین شورای مخاضة الأحزانی فەرامۆش نەکردو بەئەمیرەکانی راگەیاند کە ئەگەر خاچپەرستەکان لەبنیاتنانی ببنەوە (ئەوە دەچین بۆیو دەیڕوخێنین)[١] دوای ئەوەی لەمەسەلەی بەعلەبەك بویەوە داوای لەخاچپەرستەکان کرد کەشورای ناوبراو بڕوخێنن ئەوانیش لەبەرامبەردا داوای ئەو پارە پولەیان کرد کە لەبنیاتنانیدا سەرفیان کردبوو ئەویش پێشنیاری شەست هەزار دیناری بۆ کردنو پاشان کردی بەسەد هەزار، بەلام ئەوان بەمە قایل نەبوون[٢]، ئەوەبوو لەمانگی ذی القعدەی ساڵی ٥٧٤ك مانگی نیسانی ساڵی ١١٧٩ز دا بلدوینی چوارەم دەستدرێژی کردە سەر چەند شوانێکی موسڵمان کە بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتەکانیان هاتبونە لەوەڕگاکانی نزیك بانیاس، همفری دی تورون سید تبینیش لەمەدا هاوکاری کردبوو، سەلاحەدنیش هێزێکی سەربازی نارد بەسەرکردایەتی عزالدین فروخشای برازای بۆ ئاگاداربوون لەراستی رووداوەکە، ئەویش لەنزیك شقیف أرنون[٣] دا رووبەرووی دوژمن بوویەوەو بەسەریاندا سەرکەوتو پاشا نەیدەتوانی رزگاری ببێت ئەگەر ئازایەتی همفری نەبوایە کە لەجەنگەکەدا بریندار بوو و بەهۆی کاریگەری برینەکانیەوە دواتر کۆچی دوایکردو کۆچیدوایشی زیانێکی گەورەبوو بۆ خاچپەرستەکان[٤].

سەلاحەدینیش کاتێ هەواڵی سەرکەوتنی بیست لەگەمارۆی بیت الأحزاندا دیمەشقی بەجێهێشت، بەلام بەهێرشکردنە سەر پاسگاکەی وازی هێنا، چونکە هێڵەکانی بەرگری هێندە تۆکمەبوون کەپاش چەند رۆژێك سەلاحەدینی ناچار بەکشانەوە کردو لەتل القاضی لەدەشتی

---

[١] مفرج الكروب (٧٢/٢).

[٢] الكامل فی تأريخ العرب (٤٤١،٤٣٩/٩)، تأريخ الأيوبين، ل:١٢٧.

[٣] شقيق أرنون: قەلایەکی زۆر تۆکمەیە لەئەشکەوتێکی چیاکەدا لەنزیك بانیاس.

[٤] تأريخ الأيوبين، ل:١٢٨.

مەرجعیون لەرۆژئاوایی بانیاسدا سەربازگەی داناو سەربازەکانی نارد بۆ هێرشکردنە سەر الجلیل‌و جبل لبنان بۆ لەناوبردنی بەروبومی ئەو زەویانەی کەکەوتونەتە نێوان صەیداو بەیروت، ئەم هێرشانەش بلدوینی چوارەمیان تورەکردو گەشتە ئەو بڕوایەی کەدەبێت سنورێك بۆ ئەم هێرشانە دابنرێت، بۆ ئەم مەبەستەش سوپاکەی کۆکردەوەو چووە دەرەوە بۆ بەرپەچدانەوەی موسڵمانەکان‌و ریمۆندی سێیەمی فەرمانڕەوای طرابلوسیش بۆ هەمان مەبەست بانگهێشت کردو زانی کەفروخشا لەکەنار دەریاوە بەدەستکەوتێکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆیە بەرەو باکور بەرێکەوت بۆ ڕێ پێ گرتنی لەدۆڵی مەرجعیون لەنێوان روباری لیطانی‌و رێڕەوی سەرەوەی روباری ئوردوندا، بەڵام سەلاحەدین ئەم جموجۆڵەی بینی‌و، لەوکاتەدا کەپاشای خاچپەرست لەگەڵ فروخشادا لەپێکداندا بوون ریمۆندی سێیەم‌و داویە بەرەو روباری ئوردن پێشڕەویان دەکرد، لەدەروازەی دۆڵەکەشدا کتوپڕچون بەسەر سەلاحەدینداو بەهۆی ئەو پلانە سەربازییەوە کەجێبەجێیکرد توانی هێرشێکی هەڵگەڕاوە بەرێت‌و سەرکەوتن بەدەست بێنێت‌و خاچپەرستەکان هەڵاتن، کاتێ گەیشتن بەسوپای شانشینی‌و روبەڕویان بونەوە ناچار بەهەڵاتنیان کردو زۆرێکیان لێ بەدیل گرتن کەأودوسانت ئەماند یان لەنێوانیاندا بوو کەسەرکردەی داویە بوو لەگەڵ بلدونینی گەورەی رەملەو هیوی فەرمانڕەوای الجلیل[1]، رووبەروبونەکەش لەسەرەتایساڵی ٥٧٥ك/ هاوینی ساڵی ١١٧٩ز دا روویدا، بەڵام سەلاحەدین سودی لەم سەرکەوتنە وەرنەگرت بۆ هێرشکردنە سەر بەیتولمەقدیس، چونکە وایدەزانی کەپاشای خاچپەرست کەهێشتا ئازاد بوو دەیتوانی لەهەموو لایەکەوە سەربازەکانی بانگهێشت بکات‌و لەدەوری کۆببنەوە، ئەمەش ئەرکی سەلاحەدین گران دەکات بەتایبەت کە لەو کاتەدا کۆمەکی زۆر سوارەی بەهێز گەیشتبوونە شانشین بۆ حەج کردن بەسەرۆکایەتی هنری دووەم ذی شامپانیای فەرەنسی، ئەمە ئومێدێکی بەخشی بەخاچپەرستەکان‌و ورەیانی بەرزکردەوە[2]، بۆیە هێرشکردنە سەر بەیتولمەقدیسش هێرشیکردە سەر شورای بیت الأقزان لەمانگی ئەیلولداو توانی دوای گەمارۆیەك پێنج رۆژی خایاند بچێتە ناویەوەو پاش تێکشکاندنی تەختی زەوی کرد، هەروەها هێرشی کردە سەر ناوچە کەنارییەکانی وەك: صورو صیداو بەیروت‌و پەلاماری کەشتیگەلی دەریایی عەکایداو ئەو کەشتییانەی تێکشکاند کەلەوێ وەستابون[3].

---

[1] الكامل فى تأريخ العرب (٤٣٩/٩)، موسوعة تأريخ العرب، ل: ١٢٨.

[2] تأريخ الأيوبين، ل:١٢٨.

[3] تأريخ الأيوبين، ل:١٢٨، وليم الصورى (١٠١٤/٢-١٠١٥).

٦- **ئاگربەستی نێوان صلاح الدین و بلدوینی چوارەم:** زیانی خاچپەرستەکان زۆر بووو بلدوینی چوارەمیش بێزاربوو بەم سەرکەوتنانەی موسڵمانەکان و هیچ چارێکی نەبوو جگە لەداواکردنی ئاگربەست، سەلاحەدینیش داواکەی پەسەندکرد لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت بەخۆی، لەوهۆیانەش:

- دەیویست حەلەب بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە پێش ئەوەی گورزێکی یەکلاکەرەوە ئاراستەی خاچپەرستەکان بکات، لەهەمان کاتیشدا خۆی لەهێرشی خاچپەرستەکان بپارێزێت لەکاتی هێرشکردنە سەر حەلەبدا.
- یەکێکی تر لەو هۆکارانە ئەوە بوو کەدەیویست هەڵمەتێك دژ بەئەرمینیان ئەنجام بدات. بۆئەوەی پەیوەندی لەگەڵ قلج ئەرسەلانی دووەمی سوڵتانی سلجوقە رۆمەکاندا ئەنجامبدات هەتاوەکو بێلایەن بیهێڵێتەوە لەنێوان ئەوو خاچپەرستەکاندابۆ ئەوەی خۆی یەکلابکاتەوە بۆهێرشکردنە سەر میرنشینی طرابلوس، چونکە هەواڵی پێگەیشتبوو کەپەیوەندی لەنێوان خاچپەرستو بیزەنتیەکاندا هەیە بۆ نوێکردنەوەی هاوپەیمانی نێوانیان، هەروەها کەشتیگەلەکەی هێرشیان کردە سەر ئەنطرنوس کەشارۆچکەیەکە لەکەناری شامداو دوا شارۆچکەی سەر بەدیمەشقە لەکەناری دەریاوە[1]. پاشان دوورگەیەکی لەدەریادا ئازادکرد لەنزیك قوستەنتینیە کەپێی دەوترا: ئەرواد، ئەمەش ریمۆندی ناچارکرد کەئاگربەستی لەگەڵدا مۆر بکاتو داوای هاتنە پاڵو بوون بەشوێنکەوتەی بکات بەهۆی ئەو ناکۆکیانەی کە لەناو شانشینی بەیتولمەقدیسدا هەبوو[2]، هەرچی بلدوینی چوارەمیشە ئەوە بەهۆی زۆری پێکدادانو رووبەرووبوونەوەکانی لەگەڵ سەلاحەدیندا ماندوو شەکەت بووبوو، بۆیە داوای ئاگربەستی کرد، چونکە پێویستی پێی بوو بۆ رێکخستنەوەی ریزەکانیو هەڵبژاردنی هاوپەیمانی نوێ، ماوەی ئاگربەستی نێوانیشیان بەدوو ساڵ دیاریکرا، لەمەشدا ئەوە روون بوویەوە کە ئەو ماوەیەی کەپێش ئاگربەستەکە دیاریکرابوو مەبەست پێی هێرشکردنە سەر خاچپەرستەکانو رازی بوون بوو بەئاگر بەستەکە لەپێناو ریکخستنەوەی ریزەکانی موسڵمانانوئاراستکردنیدا[3].

٧- **سەلاحەدینو سوارەی دز ئەرناط:** سەلاحەدین سودمەند بوو لەو ئاگربەستەی کەلەگەڵ فەرمانڕەوای میرنشینی بەتولمەقدیسدا مۆری کرد، بۆ گواستنەوەی چالاکیەسەربازیەکانی بۆ

---

[1] معجم البلدان(١/٢٣٠)، موسوعة تأريخ العرب، ل: ٨٢.

[2] الكامل فى تأريخ العرب (١٥١/٩)، موسوعة تأريخ العرب، ل: ٨٢.

[3] صلاح الدين فى بلاد مصر والشام والجزيرة، ل: ٢٨٢.

ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خاچپەرستەکان لەباکوری وڵاتی شامداو توانی چەند هێرشێکی دەریایی سەرکەوتوو ئەنجام بدات دژ بەمیرنشینی طرابلوس کەبەس بوو بۆ ناچارکردنی خاچپەرستەکان بەسەرکردایەتی ریمۆندی سێیەم بۆ مۆرکردنی ئاگربەست لەگەڵ سەلاحەدیندا، بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەساڵەکانی ١١٨٠- ١١٨٥ز[١] دا سەلاحەدینیش سودمەندبوو لەدەسکەوتە سەربازیو سیاسیەکانی بۆ گەشتن بەئامانجی سەرەکی کەبریتیبوو لەیەکخستنی وڵاتی شام، ئەوە بوو بەچەند هەڵمەتێك دەستیپێکرد. کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. دژ بەناوچەکای موسڵو پاش ئەوەش هەستا بەگەمارۆدانی حەلەبو دەستگرتن بەسەریدا، لەوکاتەشدا کەهێزەکانی سەلاحەدین گەمارۆی حەلەبیان دابوو ئیسلامییەکان لەمیسردا هەستابوون بەئەنجامدانی کردەیەکی سەرکەوتوو لەبەرەی باشوردا لەناوچەی ئەلداروم (لەنێوان غەزەو میسردا)دا، هەموو ئەم جەنگانەش ئەوەیان سەلماند کەبەرەی خاچپەرستی لەم ناوچانەدا تەنها توانای بەرگریکردنی هەیە لەهەندێ ناوچەی ژێر دەسەڵاتیداو توانای هێرشکردنیان لەدەستداوە بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی پێش دەرکەوتنی سەلاحەدیندا، تاکە حاڵەتێکیش کە ئەم راستیەی تێپەڕاندبێت، ئەو هێرشانە بوو کەفەرمانڕەوای ئەلکرکی خاچپەرست دەیکردە سەر موسڵمانەکان کەسەر بەشانشینی بەیتولمەقدیس بوو[٢].

ئەرناطیش لای فرەنجەکان بەسواری دز ناسرابوو، چونکە لەو سوارانە نەبوو کەبایەخیان بەشەرەفیان نەدەدا پابەندی بنەماکانی سوارچاکی نەدەبوون، بەڵکو تەنها توانای تاڵانیو فێڵو پەلاماردانی خەڵکانی بێ تاوان موسڵمانی هەبوو، هەربۆیە هەندێ لەمێژوونوسە ئەوروپیەکان وەك نموونەی سواری دز لە سەردەمی خۆیدا وەسفیان کردووە. چونکە سیفەتەکانی چاوچنۆکی ناپاکیو دڕەندەییو دەمارگیری کوێرانەی تیادا کۆبووبویەوەو ئەو پانزە ساڵە زیندانیکردنەی کە لەحەلەبدا بەسەریبرد هیچ سودێکی نەبوو بۆ راستکردنەوەی هەڵسوکەوتیو چاککردنی[٣]،ئەبو شامەی مێژوونوسیش بەم شێوەیە وەسفی دەکاتو دەڵێت: ناپاکترینی فەرەنجەکانو خراپترینو نزمترینو گومڕترینیانەو لەهەموویان زیاتر پەیمان هەڵدەوشێنێتەوەو سوێندی درۆ دەخوات[٤].

---

[١] الحركة الصلبية (٧٥٣/٢).

[٢] دراسات فى تاريخ الأيوبين والمماليك،ل: ٩٥.

[٣] الحركة الصلبية، عاشور(٦١٧/٢)، الجهاد والتجديد،ل: ٢٣١.

[٤] كتاب الروضتين(٧٥/٢).

ئەوەبوو ئەرناط ئەو ئاگربەستەی لەبیرخۆی بردەوە کە لەنێوان سەلاحەدینو شانشینی بەیتولمەقدیسدا مۆرکرابوو، بەسەرکردایەتی هێزێك لەپیاوەکانی بەرێکەوتو لەبیابانی عەرەبدا رۆچوو هەتاوەکو گەیشتە (تیماء)[1] ، نیازیشی وابوو لەتەیمائەوە هێرش بکاتە سەر مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە دەستگرتن بەسەر ئەو ناوچە پیرۆزانەدا[2]، بەلام فەرەخشای برازای سەلاحەدینو جێنشینی لەدیمەشقدا، پەلاماری ئوردونو ئەلکرکیداو تالانیکرد، ئەمەش ئەرناطی ناچارکرد کەبگەڕێتەوە بۆ میرنشینەکەی بۆ بەرگریکردن، دوای ئەوەی کەکاروانێکی گەورەی موسلمانانی تالانکرد کە لەدیمەشقەوە بەرەو مەککە بەرێکەوتبوو سامانێکی زۆری لێبرد[3]. ئەمەش سەلاحەدینی توڕەکردو نێردراوێکی نارد بۆ لای پاشای بەیتولمەقدیسو لۆمەی کرد لەسەر ئەو رووداوەو ئاگربەستی نێوان هەردوولای بیرخستەوەو داوای لێکرد کەئەرناط ناچاربکات بۆ گێڕانەوەی سامانە بەتالانبراوەکان، پاشاش بۆ خۆی بێزار بوو لەئەرناطو نێردراوێکی بۆ ناردو داوای سامانە تالانکراوو دەهاتو موسلمانەکانی لێکرد، بەلام ئەرناط گالتەی بەم سەرکردەیەی (پاشای نەخۆش) دەکردو ئامۆژگارییەکەی رەتکردەوە[4].

هێرشەکانی ئەرناط سەرکەوتوو نەبوون لەرووی کاتەوە، چونکە لەکاتێکدا بوو کەهێزی سەلاحەدین لەفراوانبوندا بوو، لەهەمان کاتیشدا شانشینی بەیتولمەقدیسو میرنشینە خاچپەرستەکانی تر روەو لەلاواز بوونو دوچاری قەیرانی ناوخۆی گەورە بووبوون، ئەوە بوو گومانو بێمتمانەیی زۆربوو بوو لەنێوان بلدوینی چوارەمی فەرمانڕەوای بەتولمەقدیسو بۆهیمۆندی سێیەمی ئەمیری ئەنطاکیەو ریمۆندی سێیەمی ئەمیری طرابلواسدا، هەروەها ئەم هێرشانە لەکاتێکدا بوون کەشانشینی بەیتولمەقدیس رووبەرووی چەند گرفتێك بووبویەوە وەك تێکچونی تەندروستی بلدوینی چوارەمو تەختی پاشایەتی، لەسەرئاستی دەرەکیش پەیوەندیەکانی سەلاحەدین لەگەڵ شارەکانی ئیتالیادا پتەو تر دەبون، هەروەها لەگەڵ فەرمانڕەوای ئیمپراتۆری بیزەنتیدا ئەلکس کومینی دووەم، ئەمەسەرباری ئەوەی کەئەم هەلمەتانە سەلماندی کەشانشینی بەتولمەقدیس توانای کۆنترۆلکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی نییە، چونکە ئەرناط کەسەر بەشانشینی بەیتولمەقدیسە ئامادەنەبوو پابەندبێت بەو رێکەوتنەوە کەلەنێوان ئەو شانشینەو سەلاحەدیندا مۆرکرابوو، جگە لەوەی کە ئەم هێرشەی ئەرناط بۆ سەر ناوچە پیرۆزەکان بەخێر

---

[1] الجهاد والتجديد،ل: ٢٣١.

[2] الكامل في التأريخ،حوادث سنة ٥٧٧ك، الجهاد والتجديد،ل: ٢٣١.

[3] الكامل في التأريخ(١٥٣/٩)، الجهاد والتجديد،ل: ٢٣١.

[4] الحركة الصلبية(٦٠٦/٢)، الجهاد والتجديد،ل: ٢٣١.

شکایەوە بەسەر بەرەی ئیسلامیدا ئیسمیدا، چونکە ئەم دەستدرێژیانە وایکرد لەسەرجەم هێزە ئیسلامیەکانی وڵاتی شامو جەزیرە بچنە پاڵ سەلاحەدینەوە بۆ بەرگریکردن لەناوچە پیرۆزەکان[1].

پاشان سەلاحەدین دەستیکرد بەسزادانی ئەرناط لەسەر هەموو کردەوە دزێوەکانی کەبەرامبەر بەکاروانی حاجییەکان ئەنجامیدابوو، ئەوەبوو چەند جارێك بەرەو کرك بەڕێکەوت بەمەبەستی گەمارۆدانی لەساڵی ٥٨٠ك/١١٨٤ز و ٥٨٣ك/١١٨٧ز دا ئەمە سەرباری ئەنجامدانی چەند کردەیەکی سەربازی لەبەرەی باکور لەناوچەی طبریەدا لەساڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧زدا، ئەم رووداوانە لەکاتێکدا روویاندا کەبەرەی ئیسلامی بەتەواوی یەکخرابوو دوای ئەو سوڵحەی کە لەگەڵ فەرمانڕەوای موسڵدا مۆرکرا، بەڵام بەرەی خاچپەرستان بەدەست چەند کێشەیەکەوە دەیناڵاندو پاش کۆچی دوای بلدویونی چوارەمو دانانی بلدویونی پێنجەم لەساڵی ١١٨٥دا بەرەو خراپتر چوو، ئەوەبوو بلدیونی پێنجەمیش دوای ساڵێك کۆچی دوایی کردو لێرەشەوە شانشینی بەیتولمەقدیس چووە ناو ململانێیەکەوە لەسەر دەسەڵات کەتیایدا ریمۆندی سێیەمی ئەمیری طرابلوس بەشداریکردو گومان دروستبوو لەکۆچی دوای بلدوینی پێنجەمدا ئایا بەشێوەیەکی ئاسایی بووە یاخود ئەو لایەنانەی کەچاویان بڕیوەتە دەسەڵاتی شانشینەکە لەپشت ئەم رووداوەوە بوون، چونکە دەڵێن: ژەهری پێدراوە[2]، ئەم مەسەلەیەش گەشە ئاستێك کەخاچپەرستەکان بوون بەدوو سەربازگەی دژبەیەك لەسەر میراتی شانشینی بەیتولمەقدیس: کۆمەڵێك پشتیوانیان لەجای لوزجانو دەسەڵاتی دەکرد لەقودسداو کۆمەڵێکی تریش نەیاری ئەم دەسەڵاتە بوون بەسەرۆکایەتی ریمۆندی سێیەم ئەمیری طرابلوسو بۆهیمۆندی سێیەمی ئەمیری ئەنطاکیە[3]. ئەم بارودۆخە نائاساییەی ناوخۆی بەرەی خاچپەرستەکان لەبەرامبەریەوە یەکێتیو بەهێزی بەرەی ئیسلامی بەدیدەکرا، فەرمانڕەوای کرك (ئەرناط) هەستا بەنانەوەی کێشە لەگەڵ لایەنی ئیسلامیداو، شێوازی پابەند نەبوونی خۆی بەئاگربەستو رێکەوتنەکانەوەدووپاتکردەوەو دەستدرێژی کردە سەر چەند کاروانێکی بازرگانی لەنێوان دیمەشقو قاهیرەداو تاڵانو دەستکەوتێکی زۆری بردو بازرگانو پاسەوانەکانی بەدیل گرت، هەوڵەکانی سەلاحەدینیش سەرکەوتوو نەبوون بۆ رازی بوون بەئازادکردنی دیلەکانو سامانە بەتاڵانبراوەکان، هەروەها هەوڵەکانی شانشیتی بەیتولمەقدیسیش نەیتوانی ئەرناط ناچار بکات بەگێڕانەوەی سامانەکانو ئازادکردنی دیلەکان، ئەمەش کاردانەوەیەکی ئیسلامی گەورەی

---

[1] دراسات فی تاریخ الأیوبین والممالیك، ل: ٩٦.

[2] دراسات فی تاریخ الأیوبین والممالیك، ل: ٩٦.

[3] دراسات فی تاریخ الأیوبین والممالیك، ل: ٩٧.

لێکەوتەوە لەلایەن سەلاحەدینەوەو بووە هۆکار بۆ جەنگی حطینو دەرەنجامەکانی کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین[1]، بەپشتیوانی پەروەردگار.

**نۆیەم/ گرنگترین وانەو پەندو سودەکانی لەماوەی نێوان کۆچی دوای نورەدینەوە هەتاوەکو جەنگی حطین:**

١- **ئەو ماوەیەی کەسەلاحەدین تیایدا بەرەی ئیسلامی یەکخست:** دوای دوانزە ساڵ لەتێکۆشانی پڕ چەرمەسەری سەلاحەدین بوو بەگەورەی شامو میسرو موسڵو وڵاتانی تری موسڵمانو هێزە موسڵمانەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، کەزۆربەی جار گوێڕایەڵی بوونو هەندێ جاریش بێدەنگ دەبوون، هۆکارەکانی بۆ بنیاتنانی ئەم بەرە یەکگرتووەش لەچەند مەسەلەیەکدا خۆی دەبینیەوە ئەمە جگە لەپشتبەستنی بەدەزگای سەربازی ئەیوبی کەخۆی دایمەزراندبوو[2]:

أ- بڕیاری پەنادانی بۆ هەر کەسێك دەرکرد کە بەبێ کوشتار خۆی بەدەستەوە بدات بەمەرجێك کەسەربازەکانی یەکبن لەکاتی پشتگیری کردنیدا دژ بەدوژمنی دەرەکی وەك لەحصن کیفادا رویدا[3].

ب- سەلاحەدین بەهۆی تیرەکانیەوە پارچە پێستی فڕێدەدا کەتیایدا چەندین دەستەواژەی مژدەپێدانو هەڕەشەی لەخۆگرتبوو بۆ ناو قەڵاو شورا تۆکمەکانو بۆ ناچارکردنی خەڵکەکەی بۆ خۆبەدەستەوەدان دوای ئەوەی کەشڵەژانی دەرونی دەخستە ریزەکانیانەوە.

ج- سەلاحەدی وای لەشارە بەهێزو توکمەکان دەگەیاند کە ئەوهاتووە هەتاوەکو لەنزیکیدا نیشتەجێببێتو ئەیەوێت لەتەنیشتیدا بحەوێتەوە، دوای گەمارۆدانی بەبێ ئەوەی راستەوخۆ هێرشی بکاتە سەر، ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆ خەڵکی ناو قەڵاو شارەکە داوای پەتادان بکەن یاخود هەوڵبدەن بۆ ئاشتەوایی بۆدورخستنەوەی هێزە زەبەلاحەکانی سەلاحەدین لەشارەکەیانەوە، چونکە ئەگەر لەنزیك ئەو شارە بمێنێتەوە ئەوە زیانێکی زۆریان پێدەگەیەنێت، هەر ئەمەش لەکاتی گەمارۆدانی موسڵدا بۆ جاری سێیەم روویدا لەساڵی ٥٨١ك دا[4].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٩٧.

[2] صلاح الدين المجاهدوالملك الزاهد، ل: ٢٣١.

[3] تأريخ الوطن العربي والغز والصليبي، ل: ١٦٠.

[4] تأريخ الوطن العربي والغز والصليبي، ل: ١٦١.

د- لەهەندێ کاتیشدا سەلاحەدین دەستی لەچەند داواکارییەك هەڵدەگرتو پارەی زۆری دەدا بەئەمیری هەندێ قەڵاوشوراکان لەپێناو دەستگرتن بەسەر قەڵاکیاناندا بۆ خۆلادان لەکوشتار، وەك ئەوەی کە لەگەمارۆدانی هەردوو قەڵای حارمو میافارقیندا رویدا[1].

ه- لەهەندێ کاتیشدا پەنای دەبردبۆشێوازی سیاسی وەك گرێدانی هاوپەیمانی لەگەڵ هەندێ لەئەمیرەکاندا بەمەبەستی لاوازکردنی بەرامبەرو هاندانیان بۆ خۆبەدەستەوەدان، سەلاحەدینیش ئەم شێوازەی تاقیکردەوە لەگەڵ عیمادالدینی ئەمیری شەنگاردا دژ بەعیزەدین مەسعودی فەرمانڕەوای موسڵ[2]، بەو شێوازانەی پێشوو هەندێ جاریش بەجەنگ سەلاحەدین توانی یەکێتی بەدی بێنێتو زەمینەسازی بکات بۆ خۆئامادەکردن بۆ قۆناغی ئازادسازی[3].

٢- **ڕوخسارە گشتییەکانی هەڵوێستەکانی سەلاحەدین لەهەوڵە یەکێتی خوازەکانیدا:** ئەو روخسارانەش لەچەند مەسەلەیەکدا خۆیان دەنوێنن.

أ- بەخشندەی لەساماندا و بەسوك سەیرکردنی: ئەمەش لەو سامانە زۆرەدا دەردەکەوێت کەپێیدرابووو دەیبەخشی بەشوێنکەو توانی ئەوانەی کەسەردانیان دەکرد یان گوێڕایەڵی بڕیارەکانی بوون یاخود بەڵێنی خەلاتکردنی پێدابوون، ئەمە لەگەڵ لێخۆشبوونی لەهەموو باجەکۆنەکانی ئەو وڵاتانەی کەئازادی دەکردنو هەڵوەشاندنەوەی باجوماڵیات جگە لەزەکات، ئەمەش رۆڵی خۆی هەبوو لەراکێشانی خەڵکی بەلایدا بێدەنگ کردنی نەیارەکانی.

ب- ڕەوشتی جوان: ئەوەبوو دژ بەو کەسانە دەجەنگا کەدژ بەبەرپابوونی بەرەیەکی یەکگرتووبوون، بەلام کاتێ بەسەریاندا سەرکەوت نەیدەهێشت شوێنیان بکەون یاخود برینداراەکانیان بکوژنو دیلەکانیانی ئازاد دەکردو هەندێ جار لەدوژمنانی خۆش دەبووو ئاشکراشی نەدەکرد، چونکە ئەو دەیویست ببنە دۆستو هاوپەیمانی.

ج- باوەڕی ئیسلامی قوڵو بەهێزی: کەتەنها لەپەرستشەکاندا خۆی نەدەبینیەوە، بەڵکو لەباوەڕهێنانیدا بەوەی کەجیهاد یەکەمجار لەسەر خۆی پێویستە پاشان لەسەر خەڵکانیتر بۆیە ڕازی نەدەبوو هەتاوەکو ئەو کارەی پێ ئەنجامدەدان.

د- وازهێنانی لەمیرنشینەکان بۆ ئەمیرەکان: یاخودسپاردنی بەسەرکردەکانیانو کەسانی نزیك لێیانەوە یاخود بەدوژمنانیان، چونکە ئەو چیتر گرتنە دەستی هیچ شوێنێکی ناوێتو تەنها

[1] تأريخ الوطن العربي والغز والصليبي، ل: ١٦١.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٦١.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ١٦١.

سەربازێکی دەوێت کەهێزی پێویستی لەکاتی گونجاودا پێشکەش بکەن، ئەمەش هۆکاری ئەو دانوستانە دبلۆماسیو دەست بەرداربوونانەیە (تەنازولات) کەدەیکردو ئەوپەنادانانەی کە بەدوژمنانی دەدا.

ه- لەبنەماڵەی نورەدینو ئەمیرەکانی تریدا کەسایەتییەکی نەبوو کەبتوانێت ئەو ئامانجانە بەدیبێنێت کەنورەدینو باوکی هەوڵیان بۆ دەدا جگە لەسەلاحەدین.

و- هەوڵدانی بۆ دەستەبەرکردنی ڕەزامەندی خەلیفە لەپاڵ ڕەزامەندی جەماوەری موسڵماناندا، چونکە بەردەوام پێیوابوو کەسەرچاوەی شەرعیەتی ڕۆحی هەموو موسڵمانانە، بۆیە بەبەردەوامی نامەی بۆ دەناردو هەموو هەڵێستەکانی بۆ ڕووندەکردەوە، جارجاریش نەیارانی تۆمەتباردەکردو جارێکی تریش مۆڵەتی وەردەگرتو لەجاری چوارەمیشدا مزگێنی پێدەداو بەم شێوەیە ئاڵوگۆڕ کردنی نامە بەردەوام بوو، لێرەشەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کەهێزی سەلاحەدین بەهۆی پەیوەندی پتەوی لەگەڵ جەماوەری موسڵماندا لەکاتی کارو جیهادیداو وەستانی وەك داکۆکیکارێك لەخواستی جەماوەر خۆی لەپاراستنی ئاینو بیرو باوەڕو بەرپەچدانەوەی دوژمناندا دەبینیەوە، جا ئەگەر چی سەلاحەین دژ بەهەندێ لەفەرمانڕەوا موسڵمانەکان ەنگاوە، بەڵام ئەو دژی تەماعو بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان دەجەنگا خەونو ئاواتەکانی جەماوەری لەناو دەبرد، ئەوەبوو دوانزە ساڵی لەیەکخستنی بەرەی ئیسلامیدا بەسەر برد لەساڵی ٥٧٠ك- ٥٨٢ك/١١٧٤ز-١١٨٦ز هیواو ئاواتەکانیشی گەورەتر بوو لەتوانای جەستەو نەخۆشییەکانی، چونکە ئەو پاڵەوانێکی جەنگ بوو کەدوچاری چەندین نەخۆشی جەستەی بووبوو، بەڵام خۆشەویستی جیهاد ئازارەکانی لەبیر بردبووبەسەر ئازارەکانیدا زاڵیکرد[1] .

٣- **یەکتر تەواوکردنی دوو کەسایەتی لەیەکخستنو ئازادسازیدا:** لەڕووداو بەسەر هاتەکانییەوە بەئاسانی لەوە دەگەین کەکەسایەتی نورەدینو کەسایەتی سەلاحەدین هەوڵەکانیان تێرو تەواو بووە بۆ یەکخستنی ئومەت لەسەر تێکۆشانو ئازادسازی خوای گەورەش کۆمەکی کردن بۆ ئەو کارە، سەلاحەدین هات کەیەکێك بو لەفەرمانڕەواکانی نورەدین بۆ ئەوەی درێژە بەرێڕەوی نورەدین بدات بۆ یکخستنی ئوممەتی ئیسلامی و کۆکردنەوەی لەسەر باوەڕو خۆشەویستیو لایەنگری خواو پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕدارانو بێبەریبوون لەدوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەیو باوەڕدارانو کوشتاری خاچپەرستانو وەدەرنانیان لەوڵاتی موسڵمانان،

---

[1] صلاح الدين المجاهدوالملك الزاهد، ل: ٢٣٢.

توانیشی ئومەت لەرووی زانستیو شرعیو تێکۆشانەوە ببوژێتەوەو سزاو حەددەکانی جێبەجێکردو ستەمو خراپەکاری لەناوبرد، پاشان دوای ئەوەی کەخوای گەورە ئومەتی بۆ یەکخست کەوتەڕێ بۆ جیهاد لەمیسرو شامو حیجاز و عیراقو یەمەندا هەتاوەکو بەگژ فرەنجەکاندا بچێتو لەخاکی موسڵمانان وەدەریان نێت. هەروەها سەلاحەدین خۆی رایدەگەیاند کەئەو شتانێکی زۆری لەرەوشتی نورەدینەوە وەرگرتووە بەتایبەت دادوەری لەحوکمڕانیو جیهادکردنیدا، ئەوە تا دەربارەی دادگەری نورەدین رەحمەتی خوای لێبێتو وەرگرتنی لێیەوەو لەلێدوانیدا لەسەردادگەری نورەدین لەبەرامبەر ئەو کەسانەی کەخراپ بوون لەگەڵیدا دەڵێت: ئەمەیە هەقو راستی و هەرچی دادگەری لەئێمەدا دەبینێت ئەوە لەوەوە فێری بووین[1].

هەروەها ئەبوشامە دەربارەی یەکتر تەواوکردنی ئەم دوو کەسایەتیە دەڵێت: ماشەڵڵایان لێبێت دوو پاشا بوون بەرەوشتی جوانو نهێنی پاك بەدوای یەکدا چوونو یەکێکیان حەنەفیو ئەوی تریان شافعی بوو، خوای گەورە بەهۆی ئەوانەوە هیچ نەزانییەکی نەهێشت، نورەدین سەرچاوەی هەموو ئەوو خێرەیەو بەدادگەری خۆی زەمینە سازی کردو بەسامو شکۆی لەوڵاتدا چەسپاندنی، لەگەڵ زۆری ناکۆکیو فراوانی وڵاتدا، هێند وڵاتی ئازادکرد تا بتوانێت بەهۆیەوە درێژە بەتێکۆشان بداتو ریخۆشکەر بوو بۆ دوای خۆیو بۆ درێژەدان بەرێگەکەی، بەڵام سەلاحەدین تێکوشانی زۆرترو وڵاتی زیاتر ئاوەدانکردەوەو ئارامیگرتو خۆڕاگری نواندو وچانی نەداو سەنگەری چوڵنەکرد، خوای گەورەش بەنرخترین ئازادسازی خەڵاتکرد کەئازادکردنی بەیولمەقدیس بوو، دەسا خوای گەورە لێیان رازیبێت چەند شیاون بۆ وتەی شاعیر: یەکەم چی هێشتۆتەوە بۆ دوای خۆی[2]، هەروەها عمادالدین الكاتب دەربارەی نورەدینو سەلاحەدین دەڵێت: ئەوان ئیسلامیان نوێ کردەوە دوای کۆن بوونی[3]، بینای یەکتاپەرستی بەرزکردەوە دوای داروخان، پاش ئەوانیش خوای گەورە ئیسلامی پاڵپشت کرد بە الملك الظاهر ركن الدين[4].

٤- **یەکخستنی ئوممەت لەرێی هێزەوە:** رووداوەکان باس لەوە دەکەن کەموسڵمانان لەکاتی دەستپێکردنی جەنگەکانی خاچپەرستیدا پەرتەوازەو چەند دەوڵەتێکی بەش بەش بوون، بەڵکو چەند میرنشینێکی دژ بەیەكو ناکۆکبوون، ئەوە بوو نورەدین مەحمودهات و ئومەتی

---

[1] كتاب الروضتين في أخبار الدولتين (٤١/١).

[2] هەمان سەرچاوە (٤١/١).

[3] مەبەستی کۆن بوونی تێگەیشتنە لەئاین نەك خودی ئاین، چونکە ئیسلام هەمیشە نوێیەو کۆن نابێت.

[4] مفرج الكروب(١٩٣/٢)، دروسو تأملات في الحروب الصلبية، ل: ١٣٢.

لەسەر جیهاد کۆکردەوە بەدواندنیان بەبەڵگەی شەرعی دەربارەی یەکێتی‌و دەستگرتن بەئاینی خواوەو کۆبونەوە بۆ کوشتاری خاچپەرستەکان بۆ پاککردنەوەی شوێنە پیرۆزەکان، رووداوەکانیش سەلماندیان کەیەکخستنی ئومەت تەنها بەهیواو ئاواتی خواستنی گەلان بەدی نایەت بەحەزو ئارەزوشیان نییە، بەڵکو پێویستی بەبوونی فەرمانڕەوای دڵسۆزو باوەڕدارو یەکتاپەرست هەیە کە بەدڵ تامەزرۆی یەکخستنی ئومەت بێت ئەمەش بەهەوڵی کردەیی بێوچان‌و تێکۆشانی بەردەوام بەگیان‌و ماڵ و جەستە دەبێ بەڵکو لەمەش تێپەڕ دەبێت بۆ بەکارهێنانی هێزو رووبەڕووبوونەوەی بانگخوازانی جیابوونەوەوپارچە پارچە بوون بەبێ ئەمە هەرگیزیەکێتی‌و یەکگرتن روونادات، پاش ئەم پێشەکییە کورتە سەیرنییە ئەگەر ببینین نورەدین مەحمودی کوڕی عیمادالدین زەنکی‌و بنەماڵەی زەنکی بەگشتی‌و بنەماڵەی ئەیوبیش، لەپێشەوەی هەموویاندا سەلاحەدینی ئەیوبی ئالای یەکبوونیان بەرزکردۆتەوەو یەکبوونی ئوممەت هەتاوەکو بەیەکڕیز رووبەڕوی دوژمنە داگیرکەرەکان بووەستێت و یەکخستنی لەسەر جیهاد لەپێناوی خوادا، زۆر شێلگیرانە کاریان دەکرد بۆ یەکخستنی‌و کوشتاری توندو جەنگی زۆریان بەرپاکرد هەتاوەکو وڵاتەکانیان ئازادکردو ئەمیرەکانیان ملکەچ کرد بۆ یەکێتی‌و یەکبوون وتاریشیان وەك رۆژی روناك ئاشکرا بوو، لەهەمان کاتیشدا زۆر یەکلاکەرەوەو بێ دوو دڵی بوو یان دەبێ بەڵێ بۆ یەکێتی بکرێت یاخود ئەو کاربەدەستە لەسەر کار لابرێت[1]. هەروەها سەلاحەدینی ئەیوبی لەساڵی ٥٨٠ك پێش جەنگی حطین‌و پێش رزگارکردنی قودس وتارێکی ئاڕاستەی زینەدین یوسف کوڕی زەینەدین عەلی کوچك لەئەربیل‌و ناوچەو قەڵاکانی دەوروبەری کە تیایدا هاتبوو: خوای گەورە لەزەویدا بەرقەراری‌و سەرکەوتوی کردوین بۆ سەرخستنی هەق‌و بالادەستکردنی‌و جێبەجێکردنی فەرزەکان ئێمەش پێمان باشە فەرزی جیهادلەپێناوی خوادا پێش بخەین هەتاوەکو رێگای روونبکەینەوەو روبکەینە دوژمنانی ئاین‌و باوەڕداران لەوڵاتانی موسڵمانەوە بانگهێشت بکەین بۆرووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی ئیسلام، ریزەکانیان یەکبخەین بۆبەرزکردنەوەی ئالاکەی لە زەویدا هەتاوەکو لەئاسمانەوە سەرکەوتنمان بۆ ببارێت، جا هەر کەسێك یارمەتیمان بدات بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرزەو دەسخستنی ئەم چاکەیە ئەوە خەڵاتی باش دەکرێت‌و دەستخۆشی خۆی وەردەگرێت، هەر کەسێکیش خۆی بدات بەزەویداو شوێن ئارەزووی بکەوێت‌و پشت لەئاینی راست هەڵبکات ئەوا ئەگەر تۆبەی کردوو گەڕایەوە ئەوە پەسەندی

---

[1] تأملات في الحروب الصلبية، ل: ١٣٦.

دەکەین‌و ئەگەر سوریش بوو لەسەر گومڕایی ئەوا لەکاریدەخەین‌و لایدەبین[1]. ئەوە تا هەمان مێژوو ئەمڕۆ خۆی دووبارە دەکاتەوەو موسڵمانەکان یەك ئوممەت نین‌و هیچ دەوڵەتێکیان نییە کەحوکمڕانییان بکات، بۆیە پەرتەوازە بون‌و بارودۆخیان لەسەردەمی جەنگەکانی خاچپەرستی خراپترە کەئێمە باسی لێوەدەکەین‌و وڵاتیان بەدەست دوژمنانیانەوەیەو خێرو بێریان بۆ خۆیان نییە، تەنانەت ڕێبازو یاساکانی دوژمنانیان بەسەردا سەپێنراوە.

ئیسلام پێویست دەکات لەسەر بانگخوازانی یەکبوون کەدژ بەبانگخوازانی جوداخوازی بکۆشن‌و بیانهێننە سەر ئەو ڕێگایە، خوای گەورەش بێ پێویستە لەبەندەکانی[2].

٥- **یەکبوون خواستێکی جەماوەری گشتییە و فەرمانڕەوایەکی جوداخواز ناتوانێت ڕێگربێت لەبەرامبەریدا:** کاتێك فەرمانڕەوای دیمەشق ئامادەنەبوو پێشوازی لەسەلاحەدین بکات، چونکە حەزی لەیەککگرتن‌و تێکۆشان دژ بەخاچپەرستەکان نەبوو خەڵکی دیمەشق ئەم لاوازی نواندنەیان لێقبوڵ نەکردو پێشوازیان لەسەلاحەدین‌و سوپاکەی سەلاحەدینیان کردو جەماوەر بوو بەلایەنگری سەلاحەدین‌و دەسەڵاتی کەوتە دەست[3]، ئەوەتا سەرخەکی مەملوك کەفەرمانڕەوای قەڵای حارم بوو و ڕازی نەبوو ڕادەستی سەلاحەدینی بکات کاتێك کەسەلاحەدین بەنامە ئەو داوایەی پێشکەشکرد، بۆ یەکخستنی هێزی موسڵمانەکان دژ بەخاچپەرستەکان، ئەوەبوو ڕازینەبوو ناردی بەدوای خاچپەرستەکاندا هەتاوەکو بیپارێزن لەسەلاحەدین، بەڵام کاتێ سەربازەکان ئەمەیان بیست ڕاپێچی زیندانیان کردو نامەیان ناردبۆسەلاحەدین‌وداوای هاتن‌و پەنادانیان لێکرد، ئەویش وەڵامی دانەوەو قەڵاکەیان تەسلیمکرد[4].

٦- **یەکێتی نێوان میسرو شام‌و گرنگی:** یەکێتی نێوان میسرو شام ئاسەواری باشی هەبوو لەسەر موسڵمانان، چونکە ئەوە بەرەیەکی جەنگ‌و بنکەیەکی جەماوەری بەهێزو بەرفراوانە بۆ بەرپەچدانەوەی خاچپەرستەکان چونکە ئەگەر بیانویستایە هێرش بکەنە سەر هەر ناوچەیەك لەمیسر یان لەشام ئەوە سوپای ناوچەکەی تر لەئامادە باشیدا بوو بۆ کۆمەکی کردن‌و بەرگریکردن لێی چ بەناردنی سوپای شام بۆ جەنگکردن شان بەشانیان یاخود بەکردنەوەی بەرەیەکی نوێی جەنگ بۆبڵاوەپێکردن‌و لاوازکردنی هێزەکانی دوژمن‌و

---

[1] کتاب الروضتین(٢/٣٢،٣٣)، مفرج الکروب(٢/١٦٣،١٦٤).

[2] دروس‌و تأملات فی الحروب الصلبیة، ل: ١٣٧.

[3] الکامل فی التأریخ، دروس‌و تأملات،ل: ١٣٨.

[4] الکامل فی التأریخ، دروس‌و تأملات،ل: ١٣٨.

کەمکردنەوەی فشار لەسەریان، بەهەمان شێوەش ئەگەر دەستدرێژی بکرایەتە سەر هەر ناوچەیەکی شام سوپای میسر لەئامادەباشیدا بوو بۆبەرگریکردن لەبراکانیان، ژیاننامەی سەلاحەدینیش بۆمان ڕووندەکاتەوە کەچۆن سوپای شام‌و میسر هاوکاری یەکتریان دەکرد بۆ جەنگکردن دژ بەخاچپەرستەکان بەتایبەت لەفەتحی عەسقەلان‌و شارەکانی کەنار دەریا یاخود بەرگریکردن لێیان[1]. ئەوەبوو سەلاحەدین توانی یەکێتی بەدیبێنێت هەندێ جار بەشێوازی دبلوماسی‌و هەندێ جاریش بەهەڕەشەو تۆقاندن، هەندێ جاریتریش بەکردەیەکی سەربازی سنوردار، یەکێتی نێوان میسرو وڵاتی شامی بەدیهێنا لەگەڵ بەشێکی بەرفرانی ناوچەی فوراتدا، هەموو هێزە ئیسلامییەکان پابەند کرد هەتاوەکو سنوری وڵاتی عەجەم، بە بەشداریکردن لەجیهاددا دژی خاچپەرستەکان، ئەو کارەشی بەئەنجام گەیاند بێ ئەوەی جیهاد ڕاگرێت‌و کردە سەربازییەکان بەسەرکردایەتی خۆی یاخود ئەمیرەکان بەردەوام بوو لەبنکەی سەرەکیەوە لەدیمەشق[2].

٧- **القاچی الفاچل‌و هەوڵەکانی بۆ یەکخستنی موسڵمانان:** قاضی فاضل ئەو زانا گەورەیە بوو کەکاریگەری هەبوو لەسەردەوڵەتی سەلاحەدین، سەلاحەدینیش ڕاوێژی پێدەکردو بەبێ ئەو هیچ کارێکی ئەنجام نەدەداو هیچ کارو ڕازێکی دڵی لێنەشاردەوە[3]، پێنوسی قاضیش هۆکاری سەرکەوتنە سیاسی‌و هزری‌و ڕاگەیاندنیەکانی دەوڵەتی سەلاحەدینی بوو چ لەبەردەوامبوون‌و پەیوەندی لەگەڵ خەلیفەی عەباسیدا، وەك پێشتر باسمانکرد یاخود پەیوەندی‌و پێکەوەبوونی لەگەڵ ئومەتی ئیسلامیدا لەڕێی وەرزی حەجەوە، سەلاحەدینیش ئەرکە کارگێڕی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ئاسایشیەکانی لەمیسردا پێدەسپاردو ئەویش بەباشترین شێوە ئەنجامی دەدا، هەروەها نامەی بۆ دەناردو داوای فتوای لێدەکرد لەزۆر کاروباردا، ئەمەش چەند بەشێکی ئەو نامەیەیە کە لە القاضی الفاضل‌ەوە نێردراوە بۆ سەلاحەدین لەشامدا.

أ- **شوراو حەساری قاهیرە:** سەبارەت بەشورای قاهیرە ئەوە بەو شێوەی کەگەورەمان فەرمووی دەستپێکراوەو بیناکەی بەرزبۆتەوەو بەبەرچاوەوەیەو بەتەنیشت ڕێگەی کەناردا بردومەوە، خوای گەورەش تەمەنی گەورەمان درێژ بکات هەتاوەکو وەك پشتوێنێکی چەماوە بەدەوری ئەو دوو شارەدا بیبینێت، بەڵکو بازنەیەك بێت کە دەستی ئیسلامی پێ ڕازێنرێتەوە، ئەمیر

---

[1] صلاح الدين القائد وعصره، ل: ٢٠٣.

[2] البداية والنهاية (٥٧٦/١٦).

[3] كتاب الروضتين(٦/٣).

بهاالـدين قەراقوشـيش بـەخۆیو پیاوەكانیـەوە قۆڵیـان لێهـەڵماڵیوەو بـەردەوام لەخەمیـدان بەپێچەوانەی هاوشێوەكانی، زۆر زۆر سوكانە كاردەكات لەگەڵ ئـەو هـەمووە ئەركـە گرانـەی كە لەسەرشانیەتی لەرێكخستنی كاروباری خەڵكیدا[1].

ب- **دەربارەی مافی لێ سەندنەوەی دادوەریو قەزا لەشرف الـدین كوڕی أبـی عـصرونوە:** كاتێك كەچاوی لەدەستدا چوو بۆ لای كوڕەكەی وتی: مەسـەلەكە لـەدوو شت بـەدەر نییـە، خـوای گـەورەش خـۆی باشـترین بەشـیان بـۆ گـەورەمان دیاریبكـات ، نابێـت ئـەم تەنگاوییـەش لەبیربكەین كەهیچ پاشایەك لەپاشاكانی ئیسلام پێی نەگەیشتووە یان دەبێت مەسـەلەكە بەناوی باوكیەوە بمێنێتەوە بەجۆرێك كەرای وەرگرێتو راوێژی پێبكرێتو فتـواو بەرەكـەتی وەرگیرێتو كوڕەكەی ببێت بەجێنشینی، بـەڵام دەبێت سزادانایان بكەینـە مـەرج لەیەكـەم هەڵـەو تێكەوتنـداو بەیـەك هەڵـە لەسـەر كـار لایـان بـەرین، چـونكە بـەهۆی خۆشویـستنی ململانێـوە مـرۆڤ دەكەوێتـە دەستخـستنی كـاری چـاكەوە، دەبێت مەسـەلەكان بـسپێردرێت بەپێشەوا قطب الدین چونكەئەوپاشماوەی زاناگەورەكانوپێشەنگی هاوەڵانەو نـابێ كەسێك لەوڵاتدا پێش بكەوێت ئەگەر پلەی لەو بەرزترنەبێت لەزانستدا[2].

ج- **نامەیەك دەبارەی پاساو هێنانەوە بۆدواكەوتن لەجیهاند:** سەبارەت بەنیگەرانی گەورەمان بۆ ئەوكاتانەی كە بەفیرۆئەڕوات دور لەوفەرزەی كە لەپێناویدا لەماڵ دەرچوە، وبەردەوامی كۆسپەكان كەكۆتاییان نیە ئەوەگەورەمان نیـەتی باشـی خـۆی بـۆ دەنوسـرێت، ئایـاخوای گەورە زانانیە بەنیازی بەندەكەی؟ ، خوای گەورە لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆڤ دا ناكـات لەسـەر تیرۆتـەواویی كارەكـانی، چـونكەئەوە بەدەسـتی مـرۆڤ نیـە بـەڵكو نیـەت گرنگـەو پرسـیار لەتوانای كەسەكەدەكرێتو بەپێیتوانای داوای لێ دەكرێت، جـا لەبەرئـەوەی كەگـەورەمان هۆكارەكـانی جیهـادی بـەكارهێناوەو رێخۆشـكەری بـۆ كـردوە ئـەوە هـەر لەتاعـەتی پەروەردگاردایـە بـەردەوامیو پاداشتیـشی بـەپێی ماندوبونیـەتی، چـونكە حـەج بۆیەگەورەوگرنگـە لەبەرئـەو ماندوبونـەی كەتیایدایـە جـا ئەگـەر گـەورەمان هەمووشـوێنەگرنگەكانی لەچـەند رۆژێكـدا ئازادبكرایـەو مەسـەلەی نێـوان موسـڵمانانو بـێ بـاوەڕان یەكلابكردایەتـەوە ئـەوە ئەركـەكانی جیهـاد كۆتاییـان پێـدەهاتو ئەولاپـەڕە پڕچاكانەی كە بەمانەوەی ناوسەنگەرو چاوەڕوانی تۆماركراون دەپێچرانەوە[3].

---

[1] كتاب الروضتين(٦/٣).

[2] كتاب الروضتين(٦/٣).

[3] كتاب الروضتين(٦/٣).

د- **دەربارەی یادی کوڕانی سوڵتان**: پێش وڵامدانەوەی بەشەکان، مزگێنی دەدەین بەوەی کەوەك نەریت بوەتەباو، خوای گەورە ئەو نەریتە بهێڵێتو سەلامەتیو تەندروستیولەش ساغی گەورەمانو کوڕەبەڕێزەکانی بگێڕتەوەو خوای گەورە هەواڵی خۆشیان لەگەورە مانەوە پێ بگەیەنێو لەوانیشەوە هەواڵی خۆش بگەیەنێت بەگەورەمانو زوو بەدیداری یەکترشادیان بکان.... چونکە ئەوان خۆشیو جوانی دونیانو گوڵو ڕەیحانی ژیانن، ئەو دڵەش کەتوانای دووری ئەوانی بوبێت دڵێکی گەورەیە، دڵێکیش ڕازی بووبێت بەبیستنی هەواڵیان ئەوە دڵێکی خاوەن قەناعەتە، چاوێکیش لەدووری ئەوان خەوی لێکەوتبێت خەواڵوە، پاشایەکیش دانی بەخۆداگرتبێت وەك ئەوان خۆڕاگربێت ئەوە ئارامگرو خۆڕاگرە، نیعمەتی خواش بۆیان خۆی لەژیانی خۆشگوزەرانیدا دەبینێتەوەو ئایا گەردنی گەورەمان بیری گەردانەو ملوانکەکانیان ناکاتەوە؟ چاوی تینوی بینینیان نییە؟ دڵی لێنادا بۆ دڵیان؟ حەقی گەورەمانە (خوا بیپارێزێت) کەبڵێت:

وما مثلُ هذا الشوق تحمل مضغة ولكنّ قلبي في الهوى بقلوب

لەنامەیەکی تریشدا دەڵێت: پاشا کوڕەکانی لەپارێزراویو سەلامەتیدان یاخوا ئەو پارێزراویو سەلامەتیەیان لێهەڵنەگرێت، شکۆمەندی سوڵتانیشیان پێوەدیارە، هەموو ئەمیرەکان بەوشێوەنو ملوانکەکە هەمووی گەوهەرەو هەریەکێکیان وەك مورویی گەورەو پێشەوەیەو هیچ کامیان لەو سەلامەتیو تەندروستیو پارێزراویە بەدەر نییە... خوای گەورە تەمەنی گەورەمان درێژ بکاتهەتاوەکو لەنەوەی ئەوان ئەوە ببینێت کەبە پیرەیان(ڕەحمەتی وای لێبێت) بینیویەتی لەخانەوادەی خۆیو لەسکی چوارەمیاندا، ئەو سوارچاکە مەزنانەی جەنگ، کەپاشان ئیسلام بوونو هەریەکێکیان کیسرایەك بوو بۆ ئیسلام:

وما فيهم عتد العلاء صغير وصغار أبناء الكبار كبارُ

ئەوان ئەستێرەکانی زەویو نەوەیەکن لەیەك سوارچاکی هێزو خواپەرستی لەڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەوڕۆژی وەستان لەبەرامبەر پەروەردگاردا[1].

ە- **لەو نامانەش**: ئەوەی کەفەرمانی پێکراوە وەك نەهێشتنی خراپە ئاشکراکانو لابردنی هۆکارەکانیو داخستنی دەرگاکانیو پاراستنی هەرپاکێكو پاککردنەوەی هەر لەکەدارێك[2]،

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٨).

[2] كتاب الروضتين(٣/٩)، المبتونة: ئەو ژنەیە کەتەڵاقێکی ناتەواو دراوە.

ئەوە خوای گەورە پاداشتی گەورەمان بداتەوە پاداشتی کەسێك تورەبێتو بیانەوێت رازی بکەن، خەڵکیش بخاتە سەر رێبازی شەرعو ئەدەبی خۆی[1].

و- **دەربارەی لابردنی باجو مالیات لەسەر حاجییەکان:** لەو مزگێنییانەی کەحاجییەکانی میسرپێشتر هاوشێوەیان نەدیبوو، هیچ پاشایەکیش لەپاشاکانی وڵاتی میسر شانازی وای تۆمارنەکردوە، ئەویش نەمانی باج کۆکەرەوەکانە لەشاری جددەو ناوچەکانی تر، بەسە بۆ ئەم کارەش کەبەڵگە لەسەر پێچەوانەکەی هەبوو ئەمەش پاداشتی زیاتردەکات، چەند زۆرە ئەو رزقو رۆزییەی کەخوای گەورە لەسەردەستی گەورەمان بەخشی بەخەڵك، چەند شیاوە کەشوێنی خۆی لەخزمەت ئەو دوو حەرەمە پیرۆزەدا دیارییبکات، کەخەڵکانی خاوەن توانا دەستبەرداری بوون، بێبەشیش ئەوکەسەیەتوانای هەبوبێتو هەلی لەدەستدابێت لەگەورەشمان شاراوەنییە کە فرەنجەکان چەندە گرنگی بەقودس دەدەنو لەوشکانیو دەریاوە بەکەشتیو پشتی وڵاخو لەئاشتیو جەنگو لەدوورو لەنزیکەوە هەوڵی بۆ دەدەنو دەیپارێزنو لەبەرامبەر موسڵماناندناو پەلەدەکەن لەسەرخستنی دانیشتوانەکەیداو بەماڵو گیان بەدرێژای رۆژگار پەنادەگرم بەخواو لەوەی کە لەگومڕاییدا بەرچاو روون بنو ئێمەش لەراستی دورکەوینەوەو بەم هەموو توانایەوە نەتوانین لا لەدانیشتوانەکەی بکەینەوە[2] بەندەش لەسەرەتای رەجەبدا بەپشتیوانی پەروەردگار دەیەوێت سەفەربکات بۆ حیجاز بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج بەقسەو کردار ئەوخەڵکەش کەئەمساڵ دەیانەوێت لەوەستانی هەینیدا بەشداربنو لەنەمانی باج بەهرەمەند بن لەژمارە نایەن، گەورەشمان لەپاداشتدا لەگەڵیاندا هاوبەشە بادڵخۆش بێت بەوەی کەپاشاکان ماڵەکانیان بۆ رووخان ئاوەدان کردۆتەوە، بەڵام ئەو ماڵی پەروەردگاری ئاوەدانکردەوە خوای گەورەش بەمیهرەبانی خۆی ماڵی ئەو ئاوەداندەکاتەوە پاشاکان چەند شەرمەزارن لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) لەکاتێکدا کەمتەرخەمن لەبەرامبەر تێرکردنی دراوسێکانی لەم ساڵدا[3].

ئەم حەجەش لەساڵی ٥٧٤ك دابوو، لەساڵی ٥٧٦دا قاضی الفاضل مۆڵەتی لەسەلاحەدین خواست بۆحەجو سوڵتانیش رازیبووو نامەیەکی بۆ نوسی کە لەیەکەم دێردا پاش بسم الله

---

[1] هەمان سەرچاوە (٩/٣).

[2] البرق الشامی (١٠٦/٣)، کتاب الروضتین(١١/٣).

[3] کتاب الروضتین(١١/٣).

نوسیبووی: بەپشتیوانی خوای گەورە، خۆزگە منیشتان لەگەڵ بوایە هەتاوەکو سەرفرازی گەورەم دەستکەوتایە[1].

لەریوایەتێکی تریشدا هاتووە کەسوڵتان سەلاحەدین وەڵامی داواکەی القاضی الفاضلدا نامەیەکی نوسی لەساڵی ٥٧٤ك تیایدا هاتبوو: نامەی قاضی الفاضلم پێگەیشت کەباس لەوەدەکات کە بەنیازە حەج بکات، خوای گەورە پیرۆزی بکات لەدەریاوە نەچێت لە العسکرەوە بەرەو ئەیلە بڕوات و لەوێشەوە بەرێبکەوێت و سەربازەکان شەوێك لەئەیلەدا بهێڵێتەوەو شەوێکیش یان کەمتر لە إرَم، لەقاطع إرم یش شەوێك، بەم شێوەیە دورکەوێتەوەو بەپشتیوانی پەروەردگار مەترسی لەسەرنامێنێت، دووەمیش: دەستی دەگرێت و سوێندی دەدەی کەنەبێتە هاوسێ، سێیەمیش: لەسامانی الجوالی سێ هەزار دیناری پێدەدەیت و پێیدەڵێت: دەبێت ئەمە بدەیت بەخەڵکی مەککەو مەدینە بەناوی منەوە نەك خۆت، ئەمە شتێکە دەبێت بیکەیت چونکە، خەڵکی دەبێت وابکەن و ئێمەش دەبێت بیبەخشین، ئەگەر وتیشی: ئەو شتە کەمە، ئەوا تۆ ئەو ڕێژەیەم لەپارەی خۆت بەقەرز پێبدە، ئەگەر ئەمانە نەکات، مۆڵەتی چونی پێنادەم بۆ حەج و بەو مەرجانە نەبێت، ئەگەر ویستیشی بابێت بۆ شام، چونکە من شوێن و ماڵی ترم نەماوە جگە لەشام هەتاوەکو خوای گەورە نێوانی ئێمەو فەرەنجەکان یەکلادەکاتەوە:﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ (الأعراف: ٨٧). پاش گەڕانەوەشی قاضی فاضل نامەیەکی نوسی بۆ زانایانی مەککە؛ خوای گەورە حیجاز تێرئاو بکات و کەعبەکەی زیندوو ڕاگرێت، ئەی چەندە بیری مەککە دەمەوەو هەناسەی بۆ هەڵدەکێشم، لەناوچێت کەسێك کەنەیەوێت سەردانی کەعبە بکات، خۆشبەختی بۆ کەسێك کەزانستی تیادادەخوێنێ،

| | |
|---|---|
| آها عليها ليالٍ ماتركن لنا | الأ الأسى وعُدلاتٍ من الحُلُم |
| عسى الرياح اذا سارت مبلغة | توفى فقد غَدَر الأحباب بالذّمم |

پاشان وتی: ئەو ڕێگە پیرۆزەش چەندین ڕوداوو قسە تیایدا ڕوویدا کەهەموو دەردە دڵ بوو، لەکۆتایشدا بەسەلامەت گەشتین، کاتێك لەالکرك نزیکبووینەوە دوژمن هەستاو نەیتوانی بگەڕێتەوە یان خوی لابدات، پاشان خوای گەورە لەو کێشەیە دەربازی کردین و گەشتینە وڵاتی سوڵتان و

[1] کتاب الروضتین(٣/٢٤)، وەك ئاماژەیەك بەئایەتی: ﴿وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ الله لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾

گەشتین بەو رومەتەو لەرووی گەشی بێبەش نەبوین و فەزڵیشیمان بەرچاوکەوت، بینیمان لەغەزادایەو جیهاد دەکات و کاتەکانی لەتێکۆشاندا سەرف دەکات و نیازەکانی بەدیدێنێت[1].

ز- **ئارەزووی سەلاحەدین بۆ حەجکردن لەساڵی ٥٧٦کدا:** عماد دەڵێت: لەرەجەبدا نێردراوەکانی دیوانی عەزیزی ناصری صدرالدین شێخی شێخەکان، أبو القاسم و لەگەڵیشیدا شهاب الدین بشیر گەشتن کەتایبەت بوون بەرێپێدان و خەلاتکردن و پۆستی نوێ پێسپاردن ئێمەش بەرێزو شکۆوە پێشوازیمان لێکردن، سولتانیش بۆ پێشوازی کردن سواری ولاخەکەی بوو و مژدەی بەرزبوونەوە بەروخسارییەوە دیاربوو، کاتێ نێردراوە بەڕێزەکان پێی گەیشتن و رێزو بەگەورەگرتنی لەسەر پێویست بوو، لەئەسپەکەی دابەزی و ملکەچی و بچوکی نواندو نێردراوەکانیش دابەزینو سلاوی ئەمیری باوەڕدارانیان پێگەیاندو ئەویش ئەرکەکەی قبولکردو زەوی ماچکرد پاشان سواری ولاخەکانیان بوون و چوونە ناو شار[2]. ئەوەبوو سولتان لەصدر الدین وە هاوڕێیەکی دڵسۆزی دەستکەوت، پێشتریش نیازی سەردانی ولاتی میسری هەبوو لەرێگەی ئەیلەو البریە، بۆیە داوایکرد لە الشیخ الشیوخ کەهاوڕێیەتی بکات و هانیشیدا بۆ سەردانی گۆڕی شافیعی(خوای لێ رازی بێت) وتی: ئەمساڵ دەمەوێت حەج بکەم و لەگەڵ ئێوەدا بێمە قاهیرە بەمەرجی مانەوەی دوو رۆژ، بەلام نایەمەناویانەوە، بەڵکو لە التربة الشافعية دەمێنمەوەو لەوێشەوە بەرەو دەریای عیذاب بەڕێدەکەوم[3]، بەڵکو رۆژوی مانگی رەمەزان لەمەککە بگرم، ئەوەبوو ئەوەیان بۆ جێبەجێکردو هاوڕێکانی گەڕاندەوەبۆ بەغدا، هەتاوەکو لەرێگەی ئەوێوەبێن بۆ حیجاز، ئەوەبوو شهاب الدين گەڕایەوەو لەوەلامی نامەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات ضياء الدينی شارەزور نێردراویشی لەگەڵدابوو، عمادیش نامەیەکی نوسی بۆ الدّیوان کەتیایدا هاتووە، خزمەتگوزار بەرەو ولاتی میسر بەڕێکەوتووە بۆ بەسەرکردنەوەو سەرنجدانی بارودۆخی، پاشان داوای کۆمەکی پەروەردگار دەکات بۆ بەجێگەیاندنی حەج و دواتریش دەگەڕێتەوە بۆ جیهادکردن دژ بەدوژمنانی[4]. القاضی الفاضلیش لەبری الملك العادل نامەیەکی نوسی بۆ یەمەن و پێڕاگەیاندن کەپاشاکانی رۆژهەلات هاتونەتە ژێر رکێفی سەلاحەدین و ئەویش سورە لەسەر سەردانی میسرو گرتنی مانگی رەمەزان تیایدا، دواتریش ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوا، هەروەها فەرمانی پێکردن

---

[1] كتاب الروضتين(٢٦،٢٥/٣).

[2] كتاب الروضتين(٦٦/٣).

[3] ئەو دەریایە کە لەزەوی عەرەبەوە درێژ دەبێتەوە بۆ جددەو لەوێشەوە بۆ یەمەن.

[4] سنا البرق الشامي(٣٥٣/١أ٢٥٤).

کەسامانو کەلو پەلی زۆر بێنن بۆ مەککە[1]، هەروەها قاضی نامەیەکی نوسی بۆ ئەمیری مەککەو یەنبوعو ئاگاداری کردنەوە هەتاوەکو ئامادەیی خۆیان وەرگرن[2]، هەروەها نامەیەکی نوسی بۆ سوڵتان سەلاحەدینو تیایدا هاتبوو: خوای گەورە پاشاکان لەدەوری شمشێرەکەی کۆبکاتەوەو خەوی دوژمنانی بزڕێنیو خەڵکی موسڵمان دڵنیا بکات بەدادگەرییو حەجی گەورەشی بکات بەنسیبو بەئامادەبونیشی شوێنەکەی برازێنێتەوە، خوای گەورەش رێزی تەواو ببەخشێت بەوەفدەکەی میوانانیماڵەکەشی بۆ رێکبخات[3]، لەم ساڵەدا، پاشان پیرۆزبای پشتیوانی پەروەردگاری لێکرد بەو خۆشەویستی جیهادەی کەخستویەتیە دڵیەوە، ئەوەی کە لەوڵاتی ئەرمەنو شوێنانی تردا ئەنجامی داوەو ئەو و حەجەی کە بەنیازە ئەنجام بدات، خوای گەورە بەئاواتی خۆی شادی بکات[4]. وادیارە سوڵتان حەجی لەگەڵ شێخی شێخەکاندا بۆ هەڵکەوت، بەڵام دواتر کارێك بووەرێگر لەبەردەمیداو بواری پێنەدا[5].

ح- **نەخۆشکەوتنی سەلاحەدینو کاریگەری لەسەر رەوتی رووداوەکان:** لەساڵی ٥٨١ك نەخۆشییەکی توندی توشبوو، بەڵام دانی بەخۆیدا دەگرتو ئێشوئازاری دەرنەدەبڕی، هەتاوەکو نەخۆشییەکە زۆری بۆهێنا کاتێك گەیشتە حەڕڕان، لەوێ خێوەتیان هەڵداو ئەم هەواڵەش لەو دەوروبەرەدا بڵاوبوویەوەو خەڵکیش ترسیان لێنیشتو بێباوەڕانیش قسەی زۆریان هەڵبەستو باوەڕدارانیش زۆر خەمییان بۆ دەخواردو دەترسان، أبوبکر العادلی براشی لەحەلەبەوە بەپزیشكو دەرمانەوە گەشتە لایو بینی تەواو لاواز بووە، بۆیە داوای وەسیەتو دانانی جێنشینی لێکرد، ئەویش وتی: گوێم لێنییە چونکە لەدوای خۆم ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی بەجێدێڵم (مەبەستی العادلی برایەتی) کەفەرمانڕەوای حەلەب بوو، لەگەڵ تقی الدین عەمەری فەرمانڕەوای حەماە کەلەو کەلەوکاتەدا جێنشینیبوو لەمیسرداو لەوێ لەگەڵ العزیز عثمان والأفضل علی کوڕیدا نیشتەجێبووبوو، پاشان نەزرێکی کرد کە ئەگەر خوای گەورە ئەم جارە شفای بدات ئەوە هەموو توانای دەخاتەگەڕ بۆ کوشتاری بێباوەڕانو هەرگیز چیتر بەرامبەر بەموسڵمان ناجەنگیو گەورەترین خەمیشی دەبێت بەئازادکردنی بەیتولمەقدیس، ئەگەر بێتو لەپێناو ئەوەدا هەموو ماڵو موڵکیشی دانابێتو دەبێت

---

[1] کتاب الروضتین(٣/٦٨).

[2] کتاب الروضتین(٣/٦٨).

[3] الخیف: لاپاڵی سەختی چیاو شوێنی هاتنە خوارەوەی ئاوە.

[4] کتاب الروضتین(٣/٦٨).

[5] کتاب الروضتین(٣/٦٨).

ئەلبونسی فەرمانڕەوای کرکیش بکوژرێت بەدەستی خۆی، چونکە لەو بەڵێنەی پەشیمانی بوویبوویەوە کە بەسوڵتانی دابوو وپەلاماری کاروانێکی میسری دابوو، پارەو پولی بردبوون‌و لەگەردنی دابوون‌و کوشتبونی‌و وتبووی: کوا محمەدەکەتان بۆ سەرتان ناخات؟ ئەم هەمووە نەزرەش لەسەر داوای القاضی الفاضل بوو و ئەو رێنمونیکرد بۆ ئەم کارە، ئەوەبوو خوای گەورە شیفای داو ئەو نەخۆشیەی لەکۆڵکردەوە کەبووە کەفارەتی گوناهەکانی‌و بەرزکردنەوەی پلەو پایەی، بەمەش مژدەو مزگێنی لەهەموو لایەکەوەهات‌و وڵات رازێنرایەوە سوپاس بۆ خوا[1]. القاضی الفاضلیش لەدیمەشقەوە نامەیەکی نوسی بۆ تقی الدین عومەری جێنشینی مامی لەمیسردا، کەهەواڵی چاکبوونەوەی سەلاحەدینمان پێگەیشتوەو ئەم هەواڵە هەموو شوێنێکی روناک کردەوەو نەخۆشی باریکردو ئاگری کوژایەوەو تەومژ رەوییەوەو تەنها ماوەیەك بوو خوای گەورە پاراستنی لەزیانی، چونکە خوای گەورە نزاکانی بەزایە نادات‌و ناوەستێت لەوەلامدانەوەدا باگوناهیش رێی گرتبێت‌و بەڵێنی دەروکردنەوەی دوا ناخات با هەموانیش نائومێد بووبن.

| | |
|---|---|
| نعىّ زاد فية الدهر ميماً | فأصبح بعد بؤساه نعيما |
| وما صدق النذير به لأنى | رأيت الشمس تطلع والنجوما |

ئەوەبوو گەورەمان الملك الناصر بەچالاکی‌و گەرم‌و گوڕیەوە دەستی دایەوە جیهادو بەهەشتی بۆ رازێنرایەوەو لێپرسینەوەکراو لەپردی سیراط پەڕینەوەو ناخۆشییەکانمان بینی کە لەترسدا خەریك بوو وشتر دەچوو بەکونە دەرزیدا[2]، عیمادیش وەسفی نەخۆشیەکەی سەلاحەدین دەکات‌و دەڵێت:... سوڵتان هەرچەندە ئازاری زیادی دەکرد هێندەی هیوای بەلوتفی پەروەدگار زیاتر دەبوو، هەرچەندە لاوازیشی دەربکەوتایە هێندە پشت بەستنی بەپەروەردگار بەهێزتر دەبوو، منیش شەوو رۆژو بەنهێنی‌و ئاشکرا لەگەڵیدا بووم‌و لەهەموو کاتێکدا وەسییەتەکانی پێدەنوسیمەوەو پارەو پولەکەی بەسەر خەڵکە باشەکاندا دابەشدەکرد[3].. رەوشتیشی لەکاتی تەندروستی باشتر بوو و بەرەوشتە جوانەکانی مامەڵەی لەگەڵ دەکردین‌و مەجلیسەکەشی خاڵی نەبوو لەخەڵکی خاوەن فەزڵ‌و خانەدان‌و پیاو چاك کەقسەی بەهێزو بەسودیان لەخزمەتیدا دەکرد، ماوەیەك باسی حوکمە شەرعیەکان‌و ماوەیەکیش باس لەشیعرو زمانی عەرەبی‌و مانای ئەدەبی

[1] البداية والنهاية (١٦/٥٧٠).

[2] البداية والنهاية (١٦/٥٧١).

[3] كتاب الروضتين(٣/٢٣٨).

کاتانێکی تریش دەربارەی سەروەری و جوامێرییەکانی و خۆئامادەکردن بۆ جەنگو جیهادو خێرو فەزڵی جیهاد، هەروەها نەزری کرد ئەگەر خوای گەورە لەم نەخۆشیە رزگاریبکات ئەوە بەرزگارکردنی بەیتولمەقدیسەوە سەرقاڵ دەبێتو، هەموو پارەو ماڵی لەو پێناوەدا سەرف دەکاتو دەبێت هەموو تەمەنی لەجیهادکردندا دژ بەدوژمنانی خواو بەخشینی ماڵو جێبەجێکردنی پەیمانو بردنەسەری بەڵێنەکان سەرف بکات، چەند کاتێکیش لەشەو یان رۆژدا پشووی دەدا بۆ بیستنی رێنمای پزیشکەکان، ئەو نەخۆشیەش بۆ پاککردنەوەی بوو لەگوناهەکانی لەلایەن پەروەردگارەوەو هۆشیارکردنەوەی بوو لەخەوی بێئاگای[1]. ئەوەبوو خێرو بەخشینی بەردەوام بوو توانی ئەو بەلایە بەبەخشینو خێر دوربخاتەوەو بەڵێنەکانی بباتە سەر[2].

**٨- مردنی چەند کەسایەتییەکە گرنگ لەم قۆناغەدا:**

**أ- کۆچی دوایی عیصمەت خاتون:** لەساڵی ٥٧٢دا سوڵتان سەلاحەدین هاوسەرگیری لەگەڵ خاتون عصمەت الدینی کچی معین الدین ئەنردا کرد کەخێزانی پاشا نورەدین مەحمود بوو، پاش خۆی لەقەلادا بەرێزو حورمەتەوە ژیاو سعد الدین مەسعودی برای مارەیکرد لەسەلاحەدینو قاضی کوڕی ئەبی عەسرونیش ئامادەی مارەبڕینەکە بوو، سەلاحەدینیش ئەو شەوەو شەوی دواتر لای مایەوە[3]، ئەم خاتوونەش یەکێك بوو لەباشترینو پاکترینی ئافرەتانو خێرو چاکەی زۆری دەکرد، ئەوەبوو کۆگای حجر الذهبو خانەقای خاتونی لەباب النصر لەبانیاسدا وەقفکردبوو، هەر لەو شارەشدا لەقەد پاڵی چیای قاسیوندا کۆچی دوایی کرد لەنزیك گومەزی الشّرکسیەو لەتەنیشت دار الحدیث الأشرفیةءالأتابکیةو چەندین شوێنی وەقف کردبوو وکۆچکردنیشی لەساڵی ٥٨١ك دا بوو[4].

**ب- کۆچیدوای ئەمیری گەورە سەعدەدین مەسعودی کوڕی معین الدین:** یەکێك بوو لەئەمیرە گەورەکانی سەردەمی نورەدینو سەلاحەدینو برای خاتون عصمت الدین بوو. کاتێ سەلاحەدین مارەی کرد لەبەرامبەردا خاتوو رەبیعە خاتونی کچی ئەیوبی لێمارەکرد، کەخوێندنگەی سەلاحی دەدرێتە پاڵ لەسەر مەزهەبی حەنبەلیەکان، تەمەنی ئەم ئافرەتە درێژ بوو لەساڵی ٦٤٣دا کۆچی دوایکردو دوایەمین کەس بوو کە لەبنەماڵەی ئەیوبیدا کۆچی

---

[1] کتاب الروضتین(٣/٤٠٣٨).

[2] هەمان سەرچاوە(٣/٢٤٠).

[3] البدایة والنهایة (١٦/٥١٨).

[4] هەمان سەرچاوە(١٦/٥٧٣).

دوایی کرد، ئەمەش لەجەمادی دووەمی ساڵی ٥٨١ك دا بوو بەهۆی برینێکەوە کە لەگەمارۆی مینافارقیندا دووچاریبوو[1].

ج- **کۆچی دوایی تورانشای برای سەڵاحەدین:** لەساڵی٥٧٦دا برای سوڵتانی گەورە الملك المعظم شمس الدوله توران شاەی کوڕی ئەیوب کۆچی دوایکرد کەوڵاتی یەمەنی ئازادکرد بەفەرمانی سەڵاحەدینی برایو ماوەیەك تیایدامایەوە پارەو سامانێکی زۆری تیادا دەستکەوت پاشان بوە جێنشینی تیایداو بەرەو لای سەڵاحەدین بەڕێکەوت بۆ شام چونکە زۆر بیری دەکرد، لەرێگەشدا چەند دێرە شیعرێکی بۆ نارد کە ابن المنجمی شاعیر بۆی نوسیبوو کاتێك گەیشتنە تەیماء تیایدا هاتبوو:

فهل لأخي بل مالكي علم أنّني — اليه وان طال التردّد راجع
واني بيوم واحد من لقائه — لملكي على عظم المزيّة بائع
ولم يبق الاّ دون عشرين ليلة — وتجنى المنى أبصارنا والمسامع
لدى ملكٍ تعنوا الملوك اذا بدا — وتخشع إعظاماً له وهو خشع
كتبتُ وأشواقي اليك ببعضها — تعلّمت النّواح الحمام السواجع
وما الملك الاّ راحة أنت زندها — تضمُّ على الدنيا ونحن الأصابع[2]

هاتنیشی بۆ لای لەساڵی حەفتاو یەکدا بوو پێکەوەش چەند غەزایەکی گرنگو هەڵوێستێکی ستایشکراویان هەبووو ماوەیەکیش کردی بەجێنشینی خۆی لەدیمەشقدا، پاشان بەرەو میسر بەڕێکەوتو کردیە جێنشین لەئەسکەندەریەدا، بەڵام ئەو کارەی پێنەکرا، چونکە ماوەماوە تووشی کوڵنج دەبوو، ئەوەبوو لەوێ کۆچی دوایکردو لەخوێندنگەی شامیدا نێژرا[3] لەکۆشکی ئەمیردا، توران شاهیش واتە پاشای ڕۆژهەڵات[4]، ئەم پاشایە زۆر بەخشندەو لێبوردەو ئازاو بەجەرگو سامناكو دەرون گەورەو سنگ فراوان بوو[5]، کاتێك هەواڵی مردنی گەشتە سوڵتان سەڵاحەدین خێوەتی لەحمصدا هەڵدابوو زۆر دڵتەنگ بوو و شیعری شیوەنو سەرخۆشی ئەهۆنییەوە کەپێشتر لەبەریکردبوو[6].

---

[1] هەمان سەرچاوە(٥٧٣/١٦).

[2] هەمان سەرچاوە(٥٤٦/١٦).

[3] سير أعلام النبلاء (٥٣/٢١).

[4] سير أعلام النبلاء (٥٣/٢١).

[5] البداية والنهاية (٥٤٦/١٦.)

[6] هەمان سەرچاوە(٥٣/٢١).

د- **كۆچی دوای پاشای سەركەوتوو عیزەدین فروخ شای كوڕی شاهەنشای كوڕی ئەیوب:** لەساڵی ٥٧٨ك دا كۆچی دوایكرد، فەرمانڕەوای بەعلەبەكو جێنشینی صلاح الدینی مامی بوو، لەدیمەشقدا، باوكی الملك الأمجد بەهرام شای بەعلەبەككە دوای باوكی، فروخشایش ئازارو جوامێرو پاڵەوانو ژیرو زیرەكو چاكو بەخشندەبوو، شاعیرەكانیش ستایشی بەخشندەیی‌و چاكەكاریان كردووەو یەكێك بووە لەگەورە هاوەڵانی شێخ تاج الدین أبی الیمن كیندیو چەند ستایشێكی دەربارەی هەیە، لەو هەڵوێستانەشی كەبەڵگەن لەسەر پیاوەتی‌و لێهاتوویی ئەوەیە كەرۆژێكیان چووەتە گەرماوو حەمامەوەو كابرایەكی دەوڵەمەندی بینیوە كەبارێكی خراپی بەسەردا هاتبوو تەنانەت بەدەستی لاشەی داپۆشیبوو، ئەویش بەزەیی پیاداهاتۆتەوەو فەرمانیكرد بەخزمەتكارەكەی كەپۆشاكو راخەری بۆ بەرێتو خۆشی هێسترێكی بۆ هێناو هەزار دیناری پێشكەشكردو مانگانە بیست دیناری بۆ بڕیەوە، كابراش كەهاتە گەرماوەكەوە هەژارترین كەس بوو، بەڵام كەچووە دەرەوە دەوڵەمەنترین كەس بوو، دەسا رەحمەتی خوا لەمرۆڤە ژیرو بەخشندەكان بێت[1].

ه- **كۆچی دوایی ئەحمەد الرفاعی دامەزرێنەری رەفاعیە:** ئەحمەدی ریفاعی پێشەوای خواناسو دنیانەویستو شێخی خوا ناسان، ئەبو العباس علی كوڕی ئەحمەدی رفاعی مەغریبی‌و بەطائحییە، باوكی لەمەغریبەوە هاتبوو، لە البطائح نیشتەجێبوو لەگوندی أم عبیدە، هاوسەرگیری لەگەڵ خوشكی مەنسوری زاهیدا كردبوو، لەو ئافرەتەش شیخ ئەحمەدو براكانی بوو، ئەبولحسن قورئان خوێن بووو پێشنوێژیشی بۆ شیخ مەنسور دەكردو كاتێ كۆچی دوایكرد ئەحمەدی كوڕی لەسكی دایكیدا بوو، خاڵی پەروەردەیكرد، دەڵێن: لەدایكبوونی لەسەرەتای ساڵی پێنج سەددا بووە، دەڵێن: هاوڕێكانی سوێندداوە كە ئەگەر هەڵەیەكی تیابێت ئاگاداری بكەنەوە، شێخ عمر الفاروثی پێی وتوە: قوربان من عەیبێكت تیابەدی دەكەم. دەڵێت وتی چییە؟ وتی: عەیبت ئەوەیە كە ئێمە هاوڕێتین، پاشان شێخو هاوەڵانی گریانو، هەروەها وتی: ئەی عومەر: ئەگەر كەشتی سەلامەت بێت هەموو سەرنشیەكانی هەڵدەگرێت، دەڵێن: ئەگەر پشیلەیەك لەسەردەمی شێخ ئەحمەددا بخەوتایە دەمی دادەخستو ئازاری نەدەدا، پاشان دادەنیشتو بەرێی دەكردو دەیوت: هیچ نەبووە. هەروەها دەڵێت نزكترین رێگە بۆ لای پەروەردگار شكانەوەو زەلیلی‌و هەژاری نواندن، فەرمانی خوا بەگەورە بزانیتو بەزەیت بەبەندەكانی خوادا بێتەوەو شوێن سوننەتی

---

[1] البدایة والنهایة (١٦/٥٤٦).

پێغەمبەر بکەویت(ﷺ)[1] . هەرگیز لەبەر گەورەو بەرپرسەکان هەڵنەدەستاو دەیوت: سەیرکردنی دەمو چاو یان دڵ رەق دەکات، أستغفر الله و داوای لێخۆشبوونیشی لەپەروەردگار زۆر دەکردو زۆر بەڕێزو دڵنەرمو دڵسۆز بوو لەوساڵی ٥٧٨ك و لەمانگی جەمادی یەکەمدا کۆچی دوای کرد[2].

**و- ئەو شعرانەی کەوتراون:**

**أ-لەجەنگی مرج عیوندا:** شاعیر ئیبن التعاویذی لەستایشی سەلاحەدیندا دەڵێت:

کاد الأعادی أن یصیبك کیدها ... لو لم تکِدك برأیها المأفون

تخفی عداوتها وراء بشاشة ... فتشف عن نظر لها مشفون

دفنت حبائل مکرها فرددتها ... تدوي بغیظ صدورها المدفون

وعلمت ماأخفوا کأن قلوبهم ... أفضت الیك بسرِّها المخزون

کمنوا وکم لك فی کمین سعادة ... فی الغیب یظهر من وراء کمین

فهوت نجوم سعودهم وقضی لهم ... بالنحس طائرهم بمرج عیون[3]

وەهەروەها لەهۆنراوەیە داهاتووە:

أضحت دمشقُ وقد حللْتَ بجوها ... مأوی الطرید ومَوئِل المسکین

لك عفة فی قدرةٍ وتواضعٌ ... فی عزة وشراسة فی لین

وأریتنا بجمیل ضعك ماروی ... الرّاورن عن أممٍ خلت وقرون

وضمنْتَ أن تحیی لنا أیامهم ... بالمکرمات فکنت خیر ضِمن[4]

**ب- ئەوەی کەئوسامەی کوڕ مونقیذ لەستایشی سەلاحەدیندا وتویەتی:**

حمدتُ علی طول عمری المشیبا ... وان کنت أکثرت فیة الذنوبا

لأنی حَییتُ الی ان لقیتُ ... بعد العدوِّ صدیقاً حبیباً[5]

**٩- هەڵویستی زانایان بەرامبەر بەو کەسەی کەجنێو بەهاوەڵان دەدات:** لەساڵی ٥٧٦دا شاعیرێکی شیعە لەبەغدا دەستگیرکرا بەناوی ابن قرایا کە لەبازاڕدا کۆمەڵە شعرێکی دەوت کەتیایدا باسی هاوەڵانی (ﷺ) بەخراپەدەکردو جنێوی پێدەدانو بەستەمکاری دەزانینو

---

[1] سیر أعلام النبلاء (٢١/٧٩).

[2] هەمان سەرچاوە(٢١/٨٠).

[3] کتاب الروضتین(٣/٣٣).

[4] کتاب الروضتین(٣/٣٤).

[5] هەمان سەرچاوە(٢/٤٣٣).

**د- دەربارەی یـادی كـوڕانی سولتان:** پـێش وڵامدانـەوەی بەشـەكان، مزگێنـی دەدەیـن بـەوەی كەوەك نەریت بوەتەباو، خوای گەورە ئـەو نەریتـە بهێڵێتو سـەلامەتیو تەندروسـتیولەش ساغی گـەورەمانو كوڕەبـەڕێزەكانی بگێڕتـەوەو خـوای گـەورە هـەواڵی خۆشیان لەگـەورە مانـەوە پـێ بگەیـەنێو لەوانیـشەوە هـەواڵی خـۆش بگەیـەنێت بەگـەورەمانو زوو بەدیـداری یەكترشادیان بكان.... چونكە ئەوان خۆشـیو جـوانی دونیـانو گـوڵو رەیحـانی ژیانن، ئـەو دڵەش كەتوانای دووری ئـەوانی بوبێـت دڵێكـی گەورەیـە، دڵێكیش رازی بووبێـت بەبیـستنی هـەواڵیان ئـەوە دڵێكـی خـاوەن قەناعەتـە، چـاوێكیش لـەدووری ئـەوان خـەوی لێكـەوتبێت خەواڵوە، پاشایەكیش دانی بەخۆداگرتبێت وەك ئەوان خۆڕاگربێت ئەوە ئـارامگرو خـۆڕاگرە، نیعمەتی خواش بۆیان خۆی لەژیانی خۆشگوزەرانیدا دەبینێتـەوەو ئایا گـەردنی گـەورەمان بیری گەردانەو ملوانكەكانیان ناكاتەوە؟ چاوی تینوی بینینیان نییە؟ دڵی لێنادا بـۆ دڵیـان؟ حەقی گەورەمانە (خوا بیپارێزێت) كەبڵێت:

وما مثلُ هذا الشوق تحمل مضغة　　　ولكنّ قلبي في الهوى بقلوب

لەنامەیەكی تریشدا دەڵێت: پاشا كوڕەكانی لەپارێزراویو سەلامەتیدان یاخوا ئـەو پـارێزراویو سەلامەتیەیان لێهەڵنەگرێت، شكۆمەندی سوڵتانیشیان پێوەدیارە، هـەموو ئـەمیرەكان بەوشـێوەنو ملوانكەكە هـەمووی گەوهـەرەو هەریـەكێكیان وەك مـوروی گـەورەو پێشەوەیەو هـیچ كامیـان لـەو سـەلامەتیو تەندروسـتیو پارێزراویـە بـەدەر نییـە... خـوای گـەورە تەمـەنی گـەورەمان درێـژ بكاتهـەتاوەكو لەنـەوەی ئـەوان ئـەوە ببینێـت كەبـە پیرەیـان(رەحمـەتی وای لێبێـت) بینیویـەتی لەخانـەوادەی خـۆیو لەسـكی چـوارەمیاندا، ئـەو سوارچـاكە مەزنانـەی جـەنگ، كەپاشـان ئیسلام بوونو هەریەكێكیان كیسرایەك بوو بۆ ئیسلام:

وما فيهم عتد العلاء صغير　　　وصغار أبناء الكبار كبارُ

ئـەوان ئەسـتێرەكانی زەویو نەوەیـەكن لەیـەك سوارچـاكی هێـزو خواپەرسـتی لـەرۆژی رووبەڕووبوونەوەورۆژی وەستان لەبەرامبەر پەروەردگاردا[1].

**ە- لەو نامانـەش :** ئـەوەی كەفـەرمانی پێكراوە وەك نەهێشتنی خراپـە ئاشكراكانو لابردنـی هۆكارەكانیو داخستنی دەرگاكانیو پاراستنی هـەرپاكێكو پاككردنـەوەی هـەر لەكـەدارێك[2]،

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٨).

[2] كتاب الروضتين(٣/٩)، المبتونة: ئەو ژنەیە كەتەڵاقێكی ناتەواو دراوە.

ئەوە خوای گەورە پاداشتی گەورەمان بداتەوە پاداشتی کەسێك تورەبێتو بیانەوێت رازی بکەن، خەڵکیش بخاتە سەر رێبازی شەرعو ئەدەبی خۆی[1].

و- **دەربارەی لابردنی باجو مالیات لەسەر حاجییەکان:** لەو مزگێنیانەی کەحاجییەکانی میسرپێشتر هاوشێوەیان نەدیبوو، هیچ پاشایەکیش لەپاشاکانی ولاتی میسر شانازی وای تۆمارنەکردوە، ئەویش نەمانی باج کۆکەرەوەکانە لەشاری جددەو ناوچەکانی تر، بەسە بۆ ئەم کارەش کەبەڵگە لەسەر پێچەوانەکەی هەبوو ئەمەش پاداشتی زیاتردەکات، چەند زۆرە ئەو رزقو رۆزییەی کەخوای گەورە لەسەردەستی گەورەمان بەخشی بەخەڵك، چەند شیاوە کەشوێنی خۆی لەخزمەت ئەو دوو حەرەمە پیرۆزەدا دیارییبکات، کەخەڵکانی خاوەن توانا دەستبەرداری بوون، بێبەشیش ئەوکەسەیەتوانای هەبوبێتو هەلی لەدەستدابێت لەگەورەشمان شاراوەنییە کە فرەنجەکان چەندە گرنگی بەقودس دەدەنو لەوشکانیو دەریاوە بەکەشتیو پشتی ولاخو لەئاشتیو جەنگو لەدوورو لەنزیکەوە هەوڵی بۆ دەدەنو دەیپارێزنو لەبەرامبەر موسڵماناندا و پەلەدەکەن لەسەرخستنی دانیشتوانەکەیداو بەماڵو گیان بەدرێژای رۆژگار پەنادەگرم بەخواو لەوەی کە لەگومراییدا بەرچاو روون بنو ئێمەش لەراستی دورکەوینەوەو بەم هەموو توانایەوە نەتوانین لا لەدانیشتوانەکەی بکەینەوە[2] بەندەش لەسەرەتای رەجەبدا بەپشتیوانی پەروەردگار دەیەوێت سەفەربکات بۆ حیجاز بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج بەقسەو کردار ئەوخەڵکەش کەئەمساڵ دەیانەوێت لەوەستانی هەینیدا بەشداربنو لەنەمانی باج بەهرەمەند بن لەژمارە نایەن، گەورەشمان لەپاداشتدا لەگەڵیاندا هاوبەشە بادڵخۆش بێت بەوەی کەپاشاکان ماڵەکانیان بۆ رووخان ئاوەدان کردۆتەوە، بەڵام ئەو ماڵی پەروەردگاری ئاوەدانکردەوە خوای گەورەش بەمیهرەبانی خۆی ماڵی ئەو ئاوەداندەکاتەوە پاشاکان چەند شەرمەزارن لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) لەکاتێکدا کەمتەرخەمن لەبەرامبەر تێرکردنی دراوسێکانی لەم ساڵدا[3].

ئەم حەجەش لەساڵی ٥٧٤ك دابوو، لەساڵی ٥٧٦دا قاضی الفاضل مۆڵەتی لەسەلاحەدین خواست بۆحەجو سوڵتانیش رازیبووو نامەیەکی بۆ نوسی کە لەیەکەم دێردا پاش بسم الله

---

[1] هەمان سەرچاوە (٣/٩).

[2] البرق الشامي (٣/١٠٦)، كتاب الروضتين(٣/١١).

[3] كتاب الروضتين(٣/١١).

نوسیبووی: بەپشتیوانی خوای گەورە، خۆزگە منیشتان لەگەڵ بوایە هەتاوەکو سەرفرازی گەورەم دەستکەوتایە[1].

لەریوایەتێکی تریشدا هاتووە کەسوڵتان سەلاحەدین وەلامی داواکەی القاضی الفاضلدا نامەیەکی نوسی لەساڵی ٥٧٤ك تیایدا هاتبوو: نامەی قاضی الفاضلم پێگەیشت کەباس لەوەدەکات کە بەنیازە حەج بکات، خوای گەورە پیرۆزی بکات لەدەریاوە نەچێت لە العسکرەوە بەرەو ئەیلە بڕوات و لەوێشەوە بەرێبکەوێت و سەربازەکان شەوێك لەئەیلەدا بهێڵێتەوەو شەوێکیش یان کەمتر لە إرَم، لەقاطع إرم یش شەوێك، بەم شێوەیە دورکەوێتەوەو بەپشتیوانی پەروەردگار مەترسی لەسەرنامێنێت، دووەمیش: دەستی دەگریت و سوێندی دەدەی کەنەبێتە هاوسێ، سێیەمیش: لەسامانی الجوالی سێ هەزار دیناری پێدەدەیت و پێیدەڵێت: دەبێت ئەمە بدەیت بەخەڵکی مەککەو مەدینە بەناوی منەوە نەك خۆت، ئەمە شتێکە دەبێت بیکەیت چونکە، خەڵکی دەبێت وابکەن و ئێمەش دەبێت ببیەخشین، ئەگەر وتیشی: ئەو شتە کەمە، ئەوا تۆ ئەو ڕێژەیەم لەپارەی خۆت بەقەرز پێبدە، ئەگەر ئەمانە نەکات، مۆڵەتی چونی پێنادەم بۆ حەج و بەو مەرجانە نەبێت، ئەگەر ویستیشی بابێت بۆ شام، چونکە من شوێن و ماڵی ترم نەماوە جگە لەشام هەتاوەکو خوای گەورە نێوانی ئێمەو فەرەنجەکان یەکلادەکاتەوە:﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ آمَنُواْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يْؤْمِنُواْ فَاصْبِرُواْ حَتَّى يَحْكُمَ اللّهُ بَيْنَنَا وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ (الأعراف: ٨٧). پاش گەڕانەوەشی قاضی فاضل نامەیەکی نوسی بۆ زانایانی مەککە: خوای گەورە حیجاز تێرئاو بکات و کەعبەکەی زیندوو ڕاگرێت، ئەی چەندە بیری مەککە دەمەوەو هەناسەی بۆ هەڵدەکێشم، لەناوچێت کەسێك کەنەیەوێت سەردانی کەعبە بکات، خۆشبەختی بۆ کەسێك کەزانستی تیادادەخوێنێ،

| | |
|---|---|
| آها عليها ليالٍ ماتركن لنا | الأ الأسى وعُدلاتِ من الحُلُم |
| عسى الرياح اذا سارت مبلغة | توفى فقد غَدَر الأحباب بالذّمم |

پاشان وتی: ئەو ڕێگە پیرۆزەش چەندین ڕوداوو قسە تیایدا روویدا کەهەموو دەردە دڵ بوو، لەکۆتایشدا بەسەلامەت گەشتین، کاتێك لەالکرك نزیکبووینەوە دوژمن هەستاو نەیتوانی بگەڕێتەوە یان خوی لابدات، پاشان خوای گەورە لەو کێشەیە دەربازی کردین و گەشتینە وڵاتی سوڵتان و

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٢٤)، وەك ئاماژەیەك بەئایەتی: ﴿وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ الله لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾

گەشتین بەو رومەتەو لەرووی گەشی بێبەش نەبوین و فەزڵیشیمان بەرچاوکەوت، بینیمان لەغەزادایەو جیهاد دەکات و کاتەکانی لەتێکۆشاندا سەرف دەکات و نیازەکانی بەدیدێنێت[1].

ز- **ئارەزووی سەلاحەدین بۆ حەجکردن لەساڵی ٥٧٦کدا:** عماد دەڵێت: لەرەجەبدا نێردراوەکانی دیوانی عەزیزی ناصری صدرالدین شێخی شێخەکان، أبو القاسم و لەگەڵیشیدا شهاب الدین بشیر گەشتن کەتایبەت بوون بەرێپێدان و خەلاتکردن و پۆستی نوێ پێسپاردن ئێمەش بەرێزو شکۆوە پێشوازیمان لێکردن، سوڵتانیش بۆ پێشوازی کردن سواری ولاخەکەی بوو و مژدەی بەرزبوونەوە بەروخسارییەوە دیاربوو، کاتێ نێردراوە بەرێزەکان پێی گەیشتن و رێزو بەگەورەگرتنی لەسەر پێویست بوو، لەئەسپەکەی دابەزی و ملکەچی و بچوکی نواندو نێردراوەکانیش دابەزینو سلاوی ئەمیری باوەڕدارانیان پێگەیاندو ئەویش ئەرکەکەی قبوڵکردو زەوی ماچکرد پاشان سواری ولاخەکانیان بوون و چوونە ناو شار[2]. ئەوەبوو سوڵتان لەصدر الدین وە هاوڕێیەکی دڵسۆزی دەستکەوت، پێشتریش نیازی سەردانی ولاتی میسری هەبوو لەرێگەی ئەیلەو البریە، بۆیە داوایکرد لە الشیخ الشیوخ کەهاوڕێیەتی بکات و هانیشیدا بۆ سەردانی گۆڕی شافیعی(خوای لێ رازی بێت) وتی: ئەمساڵ دەمەوێت حەج بکەم و لەگەڵ ئێوەدا بێمە قاهیرە بەمەرجی مانەوەی دوو رۆژ، بەلام نایەمەناویانەوە، بەڵکو لە التربة الشافعية دەمێنمەوەو لەوێشەوە بەرەو دەریای عیذاب بەڕێدەکەوم[3]، بەڵکو رۆژی مانگی رەمەزان لەمەککە بگرم، ئەوەبوو ئەوەیان بۆ جێبەجێکردو هاوڕێکانی گەڕاندەوەبۆ بەغدا، هەتاوەکو لەرێگەی ئەوێوەبێن بۆ حیجاز، ئەوەبوو شهاب الدين گەڕایەوەو لەوەلامی نامەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات ضیاء الدینی شارەزور نێردراویشی لەگەڵدابوو، عمادیش نامەیەکی نوسی بۆ الدّیوان کەتیایدا هاتووە، خزمەتگوزار بەرەو ولاتی میسر بەڕێکەوتووە بۆ بەسەرکردنەوەو سەرنجدانی بارودۆخی، پاشان داوای کۆمەکی پەروەردگار دەکات بۆ بەجێگەیاندنی حەج و دواتریش دەگەڕێتەوە بۆ جیهادکردن دژ بەدوژمنانی[4]. القاضی الفاضلیش لەبری الملك العادل نامەیەکی نوسی بۆ یەمەن و پێڕاگەیاندن کەپاشاکانی رۆژهەلات هاتونەتە ژێر رکێفی سەلاحەدین و ئەویش سورە لەسەر سەردانی میسرو گرتنی مانگی رەمەزان تیایدا، دواتریش ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوا، هەروەها فەرمانی پێکردن

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٢٥،٢٦).

[2] كتاب الروضتين(٣/٦٦).

[3] ئەو دەریایە کە لەزەوی عەرەبەوە درێژ دەبێتەوە بۆ جدەو لەوێشەوە بۆ یەمەن.

[4] سنا البرق الشامی(١/٣٥٣أ٢٥٤).

کەسامان و کەل و پەلی زۆر بێنن بۆ مەککە[1]، هەروەها قاضی نامەیەکی نوسی بۆ ئەمیری مەککەو یەنبوع و ئاگاداری کردنەوە هەتاوەکو ئامادەیی خۆیان وەرگرن[2]، هەروەها نامەیەکی نوسی بۆ سوڵتان سەلاحەدین و تیایدا هاتبوو: خوای گەورە پاشاکان لەدەوری شمشێرەکەی کۆبکاتەوەو خەوی دوژمنانی بزڕێنی و خەڵکی موسڵمان دڵنیا بکات بەدادگەریی و حەجی گەورەشی بکات بەنسیب و بەئامادەبونیشی شوێنەکەی برازێنێتەوە، خوای گەورەش ڕێزی تەواو ببەخشێت بەوەفدەکەی میوانانی ماڵەکەشی بۆ ڕێکبخات[3]، لەم ساڵەدا، پاشان پیرۆزبای پشتیوانی پەروەردگاری لێکرد بەو خۆشەویستی جیهادەی کەخستویەتیە دڵیەوە، ئەوەی کە لەوڵاتی ئەرمەن و شوێنانی تردا ئەنجامی داوەو ئەو و حەجەی کە بەنیازە ئەنجام بدات، خوای گەورە بەئاواتی خۆی شادی بکات[4]. وادیارە سوڵتان حەجی لەگەڵ شێخی شێخەکاندا بۆ هەڵکەوت، بەڵام دواتر کارێك بووەرێگر لەبەردەمیداو بواری پێنەدا[5].

ح- **نەخۆشکەوتنی سەلاحەدین و کاریگەری لەسەر ڕووداوەکان:** لەساڵی ٥٨١ك نەخۆشییەکی توندی توشبوو، بەڵام دانی بەخۆیدا دەگرت و ئێش و ئازاری دەرنەدەبڕی، هەتاوەکو نەخۆشییەکە زۆری بۆهێنا کاتێك گەیشتە حەڕڕان، لەوێ خێوەتیان هەڵداو ئەم هەواڵەش لەو دەوروبەرەدا بڵاوبویەوەو خەڵکیش ترسیان لێنیشت و بێباوەڕانیش قسەی زۆریان هەڵبەست و باوەڕدارانیش زۆر خەمییان بۆ دەخواردو دەترسان، أبوبکر العادلی براشی لەحەلەبەوە بەپزیشك و دەرمانەوە گەشتە لای و بینی تەواو لاواز بووە، بۆیە داوای وەسیەت و دانانی جێنشینی لێکرد، ئەویش وتی: گوێم لێنییە چونکە لەدوای خۆم ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی بەجێدێڵم (مەبەستی العادلی برایەتی) کەفەرمانڕەوای حەلەب بوو، لەگەڵ تقی الدین عەمەری فەرمانڕەوای حەماه کەلەو کەلەوکاتەدا جێنشینیبوو لەمیسرداو لەوێ لەگەڵ العزیز عثمان والأفضل علی کوڕیدا نیشتەجێبووبوو، پاشان نەزرێکی کرد کە ئەگەر خوای گەورە ئەم جارە شفای بدات ئەوە هەموو توانای دەخاتەگەڕ بۆ کوشتاری بێباوەڕان و هەرگیز چیتر بەرامبەر بەموسڵمان ناجەنگێ و گەورەترین خەمیشی دەبێت بەئازادکردنی بەیتولمەقدیس، ئەگەر بێت و لەپێناو ئەوەدا هەموو ماڵ و موڵکیشی دانابێت و دەبێت

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٦٨).

[2] كتاب الروضتين(٣/٦٨).

[3] الخیف: لاپاڵی سەختی چیاو شوێنی هاتنە خوارەوەی ئاوە.

[4] كتاب الروضتين(٣/٦٨).

[5] كتاب الروضتين(٣/٦٨).

ئەلبونسی فەرمانڕەوای کرکیش بکوژرێت بەدەستی خۆی، چونکە لەو بەڵێنەی پەشیمانی بووبوویەوە کە بەسوڵتانی دابوو وپەلاماری کاروانێکی میسری دابوو، پارەو پولی بردبوونو لەگەردنی دابوونو کوشتبونیو وتبووی: کوا محمەدەکەتان بۆ سەرتان ناخات؟ ئەم هەمووە نەزرەش لەسەر داوای القاضی الفاضل بوو و ئەو ڕێنمونیکرد بۆ ئەم کارە، ئەوەبوو خوای گەورە شیفای داو ئەو نەخۆشیەی لەکۆڵکردەوە کەبووە کەفارەتی گوناهەکانیو بەرزکردنەوەی پلەو پایەی، بەمەش مژدەو مزگێنی لەهەموو لایەکەوەهاتو وڵات ڕازێنرایەوە سوپاس بۆ خوا[1]. القاضی الفاضلیش لەدیمەشقەوە نامەیەکی نوسی بۆ تقی الدین عومەری جێنشینی مامی لەمیسردا، کەهەواڵی چاکبوونەوەی سەلاحەدینمان پێگەیشتوەو ئەم هەواڵە هەموو شوێنێکی روناك کردەوەو نەخۆشی باریکردو ئاگری کوژایەوەو تەومژ ڕەوییەوەو تەنها ماوەیەك بوو خوای گەورە پاراستنی لەزیانی، چونکە خوای گەورە نزاکانی بەزایە نادات‌و ناوەستێت لەوەڵامدانەوەدا باگوناهیش ڕێی گرتبێت‌و بەڵێنی دەروکردنەوەی دوا ناخات با هەموانیش نائومێد بووبن.

| | |
|---|---|
| نعيّ زاد فية الدهر ميماً | فأصبح بعد بؤساه نعيما |
| وما صدق النذير به لأني | رأيت الشمس تطلع والنجوما |

ئەوەبوو گەورەمان الملك الناصر بەچالاکیو گەرمو گوڕیەوە دەستی دایەوە جیهادو بەهەشتی بۆ ڕازێنرایەوەو لێپرسینەوەکراو لەپردی سیراط پەڕینەوەو ناخۆشییەکانمان بینی کە لەترسدا خەریك بوو وشتر دەچوو بەکونە دەرزیدا[2]، عیمادیش وەسفی نەخۆشیەکەی سەلاحەدین دەکات‌و دەڵێت:... سوڵتان هەرچەندە ئازاری زیادی دەکرد هێندەی هیوای بەلوتفی پەروەدگار زیاتر دەبوو، هەرچەندە لاوازیشی دەربکەوتایە هێندە پشت بەستنی بەپەروەردگار بەهێزتر دەبوو، منیش شەوو ڕۆژو بەنهێنیو ئاشکرا لەگەڵیدا بووومو لەهەموو کاتێکدا وەسییەتەکانی پێدەنوسیمەوەو پارەو پولەکەی بەسەر خەڵکە باشەکاندا دابەشدەکرد[3].. ڕەوشتیشی لەکاتی تەندروستی باشتر بوو و بەرەوشتە جوانەکانی مامەڵەی لەگەڵ دەکردینو مەجلیسەکەشی خاڵی نەبوو لەخەڵکی خاوەن فەزڵو خانەدانو پیاو چاك کەقسەی بەهێزو بەسودیان لەخزمەتیدا دەکرد، ماوەیەك باسی حوکمە شەرعیەکانو ماوەیەکیش باس لەشیعرو زمانی عەرەبیو مانای ئەدەبی

---

[1] البداية والنهاية (١٦/٥٧٠).

[2] البداية والنهاية (١٦/٥٧١).

[3] كتاب الروضتين(٣/٢٣٨).

کاتانێکی تریش دەربارەی سەروەری و جوامێرییەکانیو خۆئامادەکردن بۆ جەنگو جیهادو خێرو فەزڵی جیهاد، هەروەها نەزری کرد ئەگەر خوای گەورە لەم نەخۆشییە رزگارییکات ئەوە بەرزگارکردنی بەیتولمەقدیسەوە سەرقاڵ دەبێتو، هەموو پارەو ماڵی لەو پێناوەدا سەرف دەکاتو دەبێت هەموو تەمەنی لەجیهادکردندا دژ بەدوژمنانی خواو بەخشینی ماڵو جێبەجێکردنی پەیمانو بردنەسەری بەڵێنەکان سەرف بکات، چەند کاتێکیش لەشەو یان رۆژدا پشووی دەدا بۆ بیستنی رێنمای پزیشکەکان، ئەو نەخۆشیەش بۆ پاککردنەوەی بوو لەگوناهەکانی لەلایەن پەروەردگارەوەو هۆشیارکردنەوەی بوو لەخەوی بێئاگای[1]. ئەوەبوو خێرو بەخشینی بەردەوام بوو توانی ئەو بەڵایە بەبەخشینو خێر دووربخاتەوەو بەڵێنەکانی بباتە سەر[2].

٨- **مردنی چەند کەسایەتییەکە گرنگ لەم قۆناغەدا:**

أ- **کۆچی دوایی عیصمەت خاتون:** لەساڵی ٥٧٢دا سوڵتان سەلاحەدین هاوسەرگیری لەگەڵ خاتون عصمەت الدینی کچی معین الدین ئەنردا کرد کەخێزانی پاشا نورەدین مەحمود بوو، پاش خۆی لەقەلادا بەرێزو حورمەتەوە ژیاو سعد الدین مەسعودی برای مارەیکرد لەسەلاحەدینو قاضی کوڕی ئەبی عەسرونیش ئامادەی مارەبڕینەکە بوو، سەلاحەدینیش ئەو شەوەو شەوی دواتر لای مایەوە[3]، ئەم خاتوونەش یەکێك بوو لەباشترینو پاکترینی ئافرەتانو خێرو چاکەی زۆری دەکرد، ئەوەبوو کۆگای حجر الذهبو خانەقای خاتونی لەباب النصر لەبانیاسدا وەقفکردبوو، هەر لەو شارەشدا لەقەد پاڵی چیای قاسیوندا کۆچی دوایی کرد لەنزیك گومەزی الشّركسيەو لەتەنیشت دار الحديث الأشرفيةءالأتابكيةو چەندین شوێنی وەقف کردبوو وکۆچکردنیشی لەساڵی ٥٨١ك دا بوو[4].

ب- **کۆچیدوای ئەمیری گەورە سەعدەدین مەسعودی کوڕی معین الدین:** یەکێك بوو لەئەمیرە گەورەکانی سەردەمی نورەدینو سەلاحەدینو برای خاتون عصمت الدین بوو. کاتێ سەلاحەدین مارەی کرد لەبەرامبەردا خاتوو رەبیعە خاتونی کچی ئەیوبی لێمارەکرد، کەخوێندنگەی سەلاحی دەدرێتە پاڵ لەسەر مەزهەبی حەنبەلیەکان، تەمەنی ئەم ئافرەتە درێژ بوو لەساڵی ٦٤٣دا کۆچی دوایکردو دوایەمین کەس بوو کە لەبنەماڵەی ئەیوبیدا کۆچی

---

[1] کتاب الروضتين(٣/٤٠٣٨).

[2] هەمان سەرچاوە(٣/٢٤٠).

[3] البداية والنهاية (١٦/٥١٨).

[4] هەمان سەرچاوە(١٦/٥٧٣).

دوایی کرد، ئەمەش لەجەمادی دووەمی ساڵی ٥٨١ك دا بوو بەهۆی برینێکەوە کە لەگەمارۆی میناڧارقیندا دووچاریبوو[١].

ج- **کۆچی دوایی تورانشای برای سەلاحەدین:** لەساڵی٥٧٦دا برای سوڵتانی گەورە الملك المعظم شمس الدوله توران شاەی کوڕی ئەیوب کۆچی دوایکرد کەوڵاتی یەمەنی ئازادکرد بەفەرمانی سەلاحەدینی برای‌و ماوەیەك تیایدامایەوە پارەو سامانێکی زۆری تیادا دەستکەوت پاشان بوە جێنشینی تیایداو بەرەو لای سەلاحەدین بەڕێکەوت بۆ شام چونکە زۆر بیری دەکرد، لەڕێگەشدا چەند دێڕە شیعرێکی بۆ نارد کە ابن المنجمی شاعیر بۆی نوسیبوو کاتێك گەیشتنە تەیماء تیایدا هاتبوو:

فهل لأخي بل مالكي علم أنّني ... اليه وان طال التردّد راجع
واني بيوم واحد من لقائه ... لملكي على عظم المزيّة بائع
ولم يبق الاّ دون عشرين ليلة ... وتجنى المنى أبصارنا والمسامع
لدى ملكٍ تعنوا الملوك اذا بدا ... وتخشع إعظاماً له وهو خشع
كتبتُ وأشواقي اليك ببعضها ... تعلّمت النّواح الحمام السواجع
وما الملك الاّ راحة أنت زندها ... تضمُّ على الدنيا ونحن الأصابع[٢]

هاتنیشی بۆ لای لەساڵی حەفتاو یەکدا بوو پێکەوەش چەند غەزایەکی گرنگ‌و هەڵوێستێکی ستایشکراویان هەبووو ماوەیەکیش کردی بەجێنشینی خۆی لەدیمشقدا، پاشان بەرەو میسر بەڕێکەوت‌و کردیە جێنشین لەئەسکەندەریەدا، بەلام ئەو کارەی پێنەکرا، چونکە ماوەماوە تووشی کوڵنج دەبوو، ئەوەبوو لەوێ کۆچی دوایکردو لەخوێندنگەی شامیدا نێژرا[٣] لەکۆشکی ئەمیردا، توران شاهیش واتە پاشای ڕۆژهەلات[٤]، ئەم پاشایە زۆر بەخشندەو لێبوردەو ئازاو بەجەرگ‌و سامناك‌و دەرون گەورەو سنگ فراوان بوو[٥]، کاتێك هەواڵی مردنی گەشتە سوڵتان سەلاحەدین خێوەتی لەحمصدا هەڵدابوو زۆر دڵتەنگ بوو و شیعری شیوەن‌و سەرخۆشی ئەهۆنییەوە کەپێشتر لەبەریکردبوو[٦].

---

[١] هەمان سەرچاوە(١٦/٥٧٣).

[٢] هەمان سەرچاوە(١٦/٥٤٦).

[٣] سير أعلام النبلاء (٢١/٥٣).

[٤] سير أعلام النبلاء (٢١/٥٣).

[٥] البداية والنهاية (١٦/٥٤٦.)

[٦] هەمان سەرچاوە(٢١/٥٣).

**د- کۆچی دوای پاشای سەرکەوتوو عیزەدین فروخ شای کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوب:** لەساڵی ٥٧٨ك دا کۆچی دوایکرد، فەرمانڕەوای بەعلەبەك‌و جێنشینی صلاح الدینی مامی بوو، لەدیمەشقدا، باوکی الملك الأمجد بەهرام شای بەعلەبەککە دوای باوکی، فروخشایش ئازارو جوامێرو پاڵەوان‌و ژیرو زیرەك‌و چاك‌و بەخشندەبوو، شاعیرەکانیش ستایشی بەخشندەیی‌و چاکەکاریان کردووەو یەکێك بووە لەگەورە هاوەڵانی شێخ تاج الدین أبی الیمن کیندی‌و چەند ستایشێکی دەربارەی هەیە، لەو هەڵوێستانەشی کەبەڵگەن لەسەر پیاوەتی‌و لێهاتوویی ئەوەیە کەرۆژێکیان چووەتە گەرماوو حەمامەوەو کابرایەکی دەوڵەمەندی بینیوە کەبارێکی خراپی بەسەردا هاتبوو تەنانەت بەدەستی لاشەی داپۆشیبوو، ئەویش بەزەیی پیاداهاتۆتەوەو فەرمانیکرد بەخزمەتکارەکەی کەپۆشاك‌و راخەری بۆ بەرێت‌و خۆشی هێسترێکی بۆ هێناو هەزار دیناری پێشکەشکردو مانگانە بیست دیناری بۆ بڕیەوە، کابراش کەهاتە گەرماوەکەوە هەژارترین کەس بوو، بەڵام کەچووە دەرەوە دەوڵەمەنترین کەس بوو، دەسا رەحمەتی خوا لەمرۆڤە ژیرو بەخشندەکان بێت[1].

**ە- کۆچی دوایی ئەحمەد الرفاعی دامەزرێنەری رەفاعیە:** ئەحمەدی ریفاعی پێشەوای خواناس‌و دنیانەویست‌و شێخی خوا ناسان، ئەبو العباس علی کوڕی ئەحمەدی رفاعی مەغریبی‌و بەطائحییە، باوکی لەمەغریبەوە هاتبوو، لە البطائح نیشتەجێبوو لەگوندی أم عبیدە، هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکی مەنسوری زاهیددا کردبوو، لەو ئافرەتەش شیخ ئەحمەدو براکانی بوو، ئەبولحسن قورئان خوێن بووو پێشنوێژیشی بۆ شیخ مەنسور دەکردو کاتێ کۆچی دوایکرد ئەحمەدی کوڕی لەسکی دایکیدا بوو، خاڵی پەروەردەیکرد، دەڵێن: لەدایکبوونی لەسەرەتای ساڵی پێنج سەددا بووە، دەڵێن: هاوڕێکانی سوێندداوە کە ئەگەر هەڵەیەکی تیابێت ئاگاداری بکەنەوە، شێخ عمر الفاروثی پێی وتوە: قوربان من عەیبێکت تیابەدی دەکەم. دەڵێت وتی چییە؟ وتی: عەیبێ ئەوەیە کە ئێمە هاوڕێتین، پاشان شێخ‌و هاوەڵانی گریان‌و، هەروەها وتی: ئەی عومەر: ئەگەر کەشتی سەلامەت بێت هەموو سەرنشیەکانی هەڵدەگرێت، دەڵێن: ئەگەر پشیلەیەك لەسەردەمی شێخ ئەحمەددا بخەوتایە دەمی دادەخست‌و ئازاری نەدەدا، پاشان دادەنیشت‌و بەرێی دەکردو دەیوت: هیچ نەبووە. هەروەها دەڵێت نزکترین رێگە بۆ لای پەروەردگار شکانەوەو زەلیلی‌و هەژاری نواندن، فەرمانی خوا بەگەورە بزانیت‌و بەزەیت بەبەندەکانی خوادا بێتەوەو شوێن سوننەتی

[1] البدایة والنهایة (١٦/٥٤٦).

پێغەمبەر بکەویت(ﷺ)[1] . هەرگیز لەبەر گەورەو بەرپرسەکان هەڵنەدەستاو دەیوت: سەیرکردنی دەمو چاو یان دڵ رەق دەکات، أستغفر الله و داوای لێخۆشبوونیشی لەپەروەردگار زۆر دەکردو زۆر بەڕێزو دڵنەرمو دڵسۆز بوو لەوساڵی ٥٧٨ك و لەمانگی جەمادی یەکەمدا کۆچی دوای کرد[2].

**و- ئەو شعرانەی کەوتراون:**

**أ-لەجەنگی مرج عیوندا:** شاعیر ئیبن التعاویذی لەستایشی سەلاحەدیندا دەڵێت:

كاد الأعادى أن يصيبك كيدها ... لو لم تكِدك برأيها المأفون

تخفى عداوتها وراء بشاشة ... فتشف عن نظر لها مشفون

دفنت حبائل مكرها فرددتها ... تدوي بغيظ ضدورها المدفون

وعلمت ماأخفوا كأن قلوبهم ... أفضت اليك بسرِّها المخزون

كمنوا وكم لك فى كمين سعادة ... فى الغيب يظهر من وراء كمين

فهوت نجوم سعودهم وقضى لهم ... بالنحس طائرهم بمرج عيون[3]

وەهەروەها لەهۆنراوەیە داهاتووە:

أضحت دمشقُ وقد حللْتَ بجوها ... مأوى الطريد ومَوئِل المسكين

لك عفة فى قدرةٍ وتواضعٌ ... فى عزة وشراسة فى لين

وأريتنا بجميل ضعك ماروى ... الرّاورن عن أممٍ خلت وقرون

وضمنْتَ أن تحيى لنا أيامهم ... بالمكرمات فكنت خير ضِمن[4]

**ب- ئەوەی کەئوسامەی کوڕ مونقیذ لەستایشی سەلاحەدیندا وتویەتی:**

حمدتُ على طول عمرى المشيبا ... وان كنت أكثرت فية الذنوبا

لأنى حَييتُ الى أن لقيتُ ... بعد العدوِّ صديقاً حبيباً[5]

**٩- هەڵویستی زانایان بەرامبەر بەو کەسەی کەجنێو بەهاوەڵان دەدات:** لەساڵی ٥٧٦دا شاعیرێکی شیعە لەبەغدا دەستگیرکرا بەناوی ابن قرایا کە لەبازاڕدا کۆمەڵە شعرێکی دەوت کەتیایدا باسی هاوەڵانی (ﷺ) بەخراپەدەکردو جنێوی پێدەدان و بەستەمکاری دەزانین و

---

[1] سير أعلام النبلاء (٧٩/٢١).

[2] هەمان سەرچاوە(٨٠/٢١).

[3] كتاب الروضتين(٣٣/٣).

[4] كتاب الروضتين(٣٤/٣).

[5] هەمان سەرچاوە(٤٣٣/٢).

سوکایەتی بەو کەسانە دەکرد کەخۆشیان دەویستن، بۆیە بەفەرمانی خەلیفە مەجلیسێکی بۆگێراو هێنایان قسەیان لەگەڵدا کرد بینیان کەشیعەیەکی زیرەكو ئازایە، زانایانیش فتوای بڕینی زمانیانو دەستیان دەرکردو ئەو کارەیان پێکرد، پاشان خەڵکی پاشرفاندنی ئازاریان داو ئەویش لەترسا خۆی خستە دیجلە بەڵام توانییان دەریبهێننو بیکوژن، دواتر گوریسێکیان بردو بەستیان بەقاچییەوەو بەشاردا گێڕایان پاشان فڕێیان دایە ناو هەندێ خشتو کلسەوەو[1] پۆلیسیش نەیتوانی رزگاری بکات لەدەستیان[2].

١٠- **چوونی سەلاحەدین بۆ وڵاتی ئەرمەن:** لەساڵی ٥٧٦ك دا سەلاحەدین ئاگربەستی لەگەڵ فرەنجەکاندا مۆرکردو بەرەو وڵاتی رۆم بەڕێکەوتو ئاشتەوایی خستە نێوانی نورەدین محەمەد کوڕی قرا ئەرسەلانی کوڕی داودی کوڕی ئەرتەقی فەرمانڕەوای قەڵای کیفاو سلطان عیزەدین قلج ئەرسەلانی کوڕی مەسعودی کوڕی قلج ئەرسەلانو لەلای روبارێك کۆبونەوە کەپێیدەوترێت: کوك سو[3]، پاشان دیاریو نزاکانو خۆشیو بەخشینەکان زۆربوون[4] و لەو کاتەشدا سوڵتان چووە وڵاتی ئەرمەنەوە بۆلابردنی ابن لاونی پاشایان، چونکە کۆمەڵێ لەتورکمانەکانی کێش کردبوو هەتاوەکو لەلەوەڕگاکانی ناوچەکانیدا مەڕو ماڵات بلەوەڕێنێت، بەڵام دواتر پەلاماری دانو هەموویانی دەستگیرکرد، سوڵتانیش چووە وڵاتەکەیەوەو سەربازو لایەنگرانی شکست پێهێناو خوای گەورە ترسی موسڵمانەکانی خستە دڵیانەوەو لەترسا قەڵایەکی بەرزیان سوتاند کە بەمانقیر ناسرابوو، موسڵمانەکانیش توانیان ئامێرو دانەوێڵەکانی ناوی دەربێننو بەهۆیەوە بەهێزبوونو بەتەواوی قەڵاکەیان روخاند[(٢)]، پاشای ئەرمەنیش ملکەچ بوو و دیلەکانی ئازادکردو سوڵتانیش بەسەرکەوتوویو سەرفرازی گەڕایەوەو لەکۆتایی مانگی جەمادی دووەمداگەشتەوە حەماه[5].

١١- **ئەستێرەناسەکانو لەناوچوونی جیهان:** لەساڵی ٥٨٢ك دا، ئەستێرەکان لەهەموو وڵاتەکاندا پێیان وابوو کەجیهان کۆتایی دێت لەمانگی شەعبانی ئەو ساڵەدا لەکاتی کۆبوونەوەی شەش ئەستێرەکە لەترازودا بەهۆی رەشەباوە، بەم شێوەیەش توانیان خەڵکێکی زۆر بترسێنن

---

[1] البداية والنهاية (١٦/٥٣١)، الكلس: ئەوەی کەدیواری پێدادەپۆشرێت"گەچ".

[2] البداية والنهاية (١٦/٥٣١).

[3] روبارێکی شینە، لەلقەکانی فوراتە لەکەنار وڵاتی روم لەلای حەلەبەوە.

[4] كتاب الروضتين(٣/٥٥).

[(٢)] هەمان سەرچاوە(٣/٥٥)

[5] كتاب الروضتين(٣/٥٥).

لەوانەی کەبیروباوەڕێکی بەهێزو شارەزاییان لەحوکمە ئایینیەکاندا نەبوو، لەپاشاکانی عەجەم و ڕۆم و هەستان بەهەڵکەندنی ئەشکەوتەکانی و لێدانی ژێرزەمین و گرتنی کونە باکانی و گەیاندنی ئاوو گواستنەوەی ئازوقەو شتومەك بۆی، پاشان گواستیانەوە بۆ ناوی و چاوەڕێی ئەو وادەو کاتەیان دەکرد، هەر کاتێکیش ئێمە هەواڵیانمان ببیستایە زۆر پێدەکەنین بەئەقڵیان، سەلاحەدینیش تورە بوو لەقسەی ئەو ئەستێرەناسانەو دڵنیابوو لەوەی کەدرۆ دەکەنو قسەکانیان تەنها پێشبینیو مەزندەکردنە، کاتێك وادەی ئەو شەوە هات کەئەستێرەناسەکان دیاریان کردبوو بۆ هەڵکردنی ڕەشەبای هاوشێوەی ڕەشەباکەی عاد[1]، عیمادیش وەسفی ئەو شەوەمان بۆ دەکات دەڵێت: وادەی ئەو شەوە هات ئێمەش لای سوڵتان دانیشتبووین لەشوێنێکی فراوانو یانەیەکی پڕمۆمو روناکیدا، نەشنەباو نە هەوا هەبوو هیچ شەوێکمان نەبینی وەك ئەو شەوە لەبێدەنگیو کش ومـاتیدا[2].

١٢- **ڕەچاوکردنی مافەکانی هاوڵاتیانی جولەکە لەلایەن خەلیفەی عەباسیەوە:** لەساڵی ٥٧٣ك دا ئاژاوەیەکی گەورە کەوتە نێوان جولەکەو خەڵکی بەغداد بەگشتی، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو کەبانگوێژێك لەلای کڵێسایەکی جولەکە لەلایەن چەند جولەکەیەکەوە قسەی پێوترابوو، موسڵمانەکەش قسەی پێوتبوو و هەردوولا بەشەڕ هاتبوون، موسڵمانەکەش هات بۆ دیوانو سکاڵای تۆمارکردو بارودۆخەکە خراپ بوو وخەڵکی کۆبوونەوەو دەنگیان بەرزکردەوە کاتێ ڕۆژی هەینی هات خەڵکی نەیانهێشت لەهەندێ مزگەوتدا نوێژبکرێتو چوونە دەرەوەو بازاڕی عەتر فرۆشەکانیان تاڵانکردو کەجولەکەکانی تیابوو چـون بۆ کڵێسایەکی جولەکەو تاڵانیانکرد، پۆلیسیش نەیتوانی ڕێگریان بکات، خەلیفەش فەرمانیدا کەهەندێ کەس بکرێن بەداردا و هەندێ لەوخراپەکارانەی لەزینداندا بوون دەرهێنرانو لەسێدارەدران، کەپێشتر بڕیاری کوشتنیان دەرکرابوو، لێرەشەوە خەڵکێکی زۆر وایان زانی کەئەمە بەهۆی ئەو ڕووداوەوە بووە، بەم شێوەیە کۆتایی بەئاژاوەکە هات سوپاس بۆ خوا[3].

١٣- **کوژرانی وەزیری خەلیفە عضدالدولة:** لەساڵی ٥٧٣ك دا وەزیری خەلیفە عضدالدوله کوڕیسەرۆکی سەرۆکەکان ئیبن المسلمه بەنیازی حەج لەشاردەرچوو، خەڵکیش بۆ خواحافیزی لێکردنی شوێنی کەوتن، پاشان سێ کەس لەشیعەکان لەشێوەی خەڵکی هەژاردا لێی چونە پێشو چەند چیرۆکێکیان بەدەستەوە بوو، یەکێکیان بۆ پێدانی چیرۆکەکە لێی

---

[1] کتاب الروضتین(٣/٢٦٤).

[2] کتاب الروضتین(٣/٢٦٤).

[3] البدایة والنهایة(٦٨/٥٢٥).

چـووه پـێشو چـەقۆیەکی لێـدا پاشـان دووەمو سـێیەمیش هێرشـیان کـرده سـەریو کۆمەڵێکیشیان لەخەڵکانی دەوروبەری بریندارکرد، بـەڵام هـەر سێ کەسـەکە دەست بـەجێ کوژرانو سوتێنران، وەزیریش بەسەر شـانی چـەند کەسـێکەوه هێنرایـەوه بـۆ مـاڵی خـۆیو لەهەمان رۆژەدا گیانی لەدەست دا، ئەم وەزیـرەش بـوو کەهـەردوو کوڕەکـەی ابـن هـیبرەی کوشتو لەسێدارەی دان، خوای گەورەش کەسێکی بۆ نارد بۆ کوشتنەوەی وەك سزایەك بـۆ ئەو کارەی کەکردی ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ (فصلت:٤٦)[1]. واته: دڵنیابـه کەپـەروەردگاری تۆ بچوکترین ستەم لەبەندەکانی ناکات. تەفسیری ئاسان.ل٤٨١.

١٤- **قەرەبوکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی:** لەساڵی٥٧٧ك دا الملك الناصر سەلاحەدین لـەقاهیرەدا نیشتەجێ بوو بۆ گوێگرتن لەفەرمودەو، نامەیەکی لەعزالدین فـرخ شـای جێنـشینی خۆیـەوه لەشام دا پێگەیشت سەبارەت بـەونازو نیعمەتـەی کەپـەروەردگار بەسـەر خەڵکیدا رشـتوەو منـاڵێکی زۆری دوانـەو جمکـی پێبەخـشیوین لەبەرامبـەر ئـەو دەردو مردنـەی کـه لەسـاڵی پێشودا دوچاریان بوو بوو، هەروەها ئەو پیتو بەرەکـەتو بەروبومـەی کـه ئـەم سـاڵ شـام هەیەتی وەك قەرەبوویەك بۆ وشکەساڵیو گرانیو قاتو قڕی پار[2].

١٥- **رێکخستنەوەی کاروبـاری ئیداریو سەربازییەکانی سەلاحەدین پێش حطین:** سـەلاحەدین لەرۆژهەڵاتی فوراتەوه گەڕایەوه بۆدیمەشق لەرۆژی ٢ رەبیعی یەکـەمی ٥٨٢كو پێشوازیەکی گـەورەی لەلایـەن جـەماوەرەوه لێکـرا، وەك دەربڕینـی خۆشـی بـۆ چـاکبوونەوەی لەونەخۆشییەی کەخەڵکی بەگشتی بەهۆی ئەو قسەو قـسەلۆکەی کـەدەربارەی بڵاوبویـەوەو نیگەرانی کرد، خەڵکی تایبەتیش بەهۆی ئەوەو بەهۆی بەدەستهێنانی ئامانجی بەیەکخستنی موسڵمانانو یەککرتنی ئەو وڵاتانەی که بەدڵی جیهانی ئیسلامی دادەنرێن، بەسـەرکردایەتی خەلیفەی عەباسی لەعێراقو فەرماندەی سوڵتانو پشتگیری خەلیفه بۆی، هـەروەها نیشانەو مۆرەکانی خەلیفه بەنامەکانییەوه بوو لەهەموو شـوێنێکی جـەزیرەی فـوراتو شـامو میسرو یەمەنو شوێنەکانی تردا، یەکەم کەسێکیش کەدوای خزمەکانی لەگەڵیـدا کۆبویـەوه وەزیـری گەورەو راوێژکاری بەهێزو ئەقڵی بەڕێوەبەری دەوڵەتەکەی القاضی الفاضل بوو[3] العماد بـاس دەکاتو دەڵێت: سـوڵتان لەقـەلادا لەگـەڵ کـەسو کاریـدا کۆبویـەوەو، کۆتـایی بەقـسەلۆكو پروپاگەنده هێناو بارودۆخ بـەرەو باشـی رۆیشتو چاکەو بەخـشندەیمان بینـی بەگەشـتنی

---

[1] البداية والنهاية(٥٢٥/٦٨).

[2] هەمان سەرچاوه (٥٢٥/٦٨).

[3] صلاح الدين القائد وعصره، ل: ٢٦٣.

الفاضل بۆ لای و باسکردنی نهێنیەکان تەمو مژی دڵی رەواندەوەو بردیە باخەکەیەوەو بەروبومی پێداو چەند جارێك سەردانی کردو دەربارەی کاروبارەکانی دەوڵەت راوێژی لەگەڵ کرد[1].

ئاخۆ سەلاحەدین چی دەستکەوتبێت لەهەڵمەتەکەیدا بۆ سەر موسڵ؟ ئەو رێوشوێنە ئیداری و سەربازیانە کامانەن کەپێی هەستا دوای گەڕانەوەی بۆ دیمەشق بۆ ریکخستنەوەوی کاروبارەکانی دەوڵەتو خۆئامادەکردن بۆ رووبەڕوو بوونەوەی مەزن؟

أ- لەگەڵ فەرمانڕەوای موسڵدا کە لەبنەماڵەی زەنکی بوو رێکەوتنێکی مۆرکردو وتاری سلجوقی تیدا نەهێشتو بەناوی سوڵتان سەلاحەدینەوە پاش خەلیفەی عەباسی وتار خوێنرایەوە سوڵتانیش دەستی هەڵگرت لەهەچی لەپشت رووباری زابەوەیە(لەوڵاتو قەڵاو حەسارو ناوچانەی وەك شارەزورو دەوروبەری و ویلایەتی بەنی ففجاقو قەرابلی و بوازیجو عانە)، لەبەرامبەر مانەوەی موسڵو دەوروبەری بەدەستیەوە: بەمەرجێ کە بەبڕیاری ئێمە بجوڵێتەوەو سەربازەکانیان بنێرێت بۆ خزمەتمانو وتارو دراو بەناوی ئێمەوە بێت[2].

ب- وتارو دراوو گوێڕایەڵی بۆ سەلاحەدین یەکلابوویەوە لەناوچەکانی تری جەزیرەدا وەك دیار بەکر، بەتایبەت ئەوانەی کە بەدەستی بنی أرتق وە بوو، سوپاش دەنێردرا بۆ سوڵتان بۆجیهادکردن لەکاتی پێویستدا، چونکە: ورەی جیهادکردن لەپێناو خودادا هەمیشە وەك پێویست نیە، بەم شێوەویەش بەربەستو رێگرەکان لەبەردەمیدا لابران[3].

ج- سەلاحەدین ریهاو قەڵاکەی و ویلایەتەکەی خستە سەرناوچەی دەسەڵاتی کەوکەبەری کوڕی زەینەدین علی کوچك کە یەکەم کەسێك بوو لەسەرەتاوە پشتگیری بکات لەکردە سەربازییەکانیدا لەرۆژهەڵاتی فوراتدا، چونکە ئەو لەخزمەتی سوڵتاندا بۆ پاراستنی یاساکانو کاری وای جێبەجێکرد کەناوی پێدەرکردو پلەو پایەی هێنایە پێشەوە[4]. هەروەها ئەم ئەو ئەمیرە بوو کەسەرکردایەتی هەموو هێزە رۆژهەڵاتیەکانی پێسپێردرا لەجەنگی حطیندا[5].

---

[1] هەمان سەرچاوە (٢/٦٩).

[2] کتاب الروضتین(٢/٦٤).

[3] صلاح الدین القائد وعصره، ل: ٢٦٤.

[4] کتاب الروضتین لە: صلاح الدین القائد وعصره وە، ل: ٢٦٤.

[5] هەمان سەرچاوە، ل:٢٦٥.

د- سولّتان باجە ناشەرعیەکانی هەڵوەشاندەوەلەسەرجەمی ئەو ناوچانەدا کەراستەوخۆ کەوتبونە ژێر دەسەڵاتیەوە چ بەشێوەیەکی راستەوخۆ بێت یان ناراستەوخۆ، چونکە ئەمە: نەریتی سولّتانە لەهەموو ناوچەکانداو تەنها ئەو باجانەی هێشتەوە کەشەرع رێی پێدەدا کەئەوانیش: خەراج- باجی زەوی‌و کری‌و کشتوکاڵ چەند شتێکی تر بوون[1]. سەبارەت بەکاروبارە تایبەتیەکانی ماڵی خۆیان‌و ماڵی مامی، ئەوە چەند رێوشوێنێکی لەپێشتری گرتەبەرو العادلی لەگەڵ خۆیدا برد بۆدیمەشق هەتاوەکو ریزبەندی کۆتایی بریار بدات پاش راوێژکردن لەگەڵ القاضی الفاضل‌و خەڵکانی تردا لەرێگەشدا کاروبارەکانی حمصی رێکخست کەفەرمانڕەواکەی (کوڕەکەی شێرکۆ) کۆچی دوایی کردبوو،ئەوەبوو کوڕەکەی خۆی لەشوێنیدا دانا‌و پابەندی کرد بەپاراستنی سنورو سەنگەرەکانی‌و وەرگرتنی باجەشەرعیەکان، سەلاحەدینیش ئەو ماوەیەی کە لەو ساڵەدا ٥٨٢ك/ حوزەیرانی ١١٨٧- ئازار ١١٨٧ مابویەوە بۆ تەواوکردنی رێکخستنە ئیدارییەکان‌و ئامادەییە سەربازیەکان لەمیسرو وڵاتی شامدا بەسەربرد.

- سەلاحەدین الظاهر غازی کوڕی دەستنیشان کرد بۆفەرمانڕەوایی حەلەب لەشوێنی الملك العادلی برایدا، کەباوکی هاوسەری الظاهر بوو، بەپێی رێکەوتنێك لەنێوان هەردوو برادا، ئەمیر بشارەشی کردە بەرپرسی قەڵای حەلەب‌و شجاع الدين عیسی کوڕی بلاشۆی وەك ئەمیری‌مەدینەدەستنیشانکرد[2].
- الملك الأفضل کوڕە گەورەکەی لەمیسرەوە بانگکرد بۆ دیمەشق هاتاوەکو بیکاتە جێنشینی خۆی تیایدا، العزیز عثمانی کوڕیشی کردە جێنشینی لەمیصردا والملك العادلی براشی لەگەڵیدا دانا بۆ بەڕێوەبردنی میسرو ناوچەیەکی (زەوی) بۆبڕیەوە کەزۆر بەلایەوە پەسەند بوو.
- ئەم کارەش تقی الدين عمری برازای وروژاندو بڕیاریدا بەرەو مەغریب بەرێبکەوێت‌و دەستی بەسەردا بگرێت‌و ببێتە دەستەڵاتدار تیایدا، بەڵام ئەم کارە کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر پلان‌و نەخشەو سەربازەکانی سەلاحەدین، چونکە تقی الدين عومەر یەکێك بوو لەدیاریترین پیاوانی دەولەتەکەی‌و فەرماندەیەکی لێهاتووی سوپاو راوێژکارێکی بەتوانا بوو، هەر بۆیە سەلاحەدین وەفدێکی ناردە لای بۆ رازیکردنی‌و لەو شتانەش کە لەسولّتانەوە هاتووە،

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل:٢٦٥.

[2] كتاب الروضتين لە: صلاح الدين القائد وعصره وە، ل: ٢٦٥.

ئەوەیە کەوتویەتی: سوێند بێت ئازادکردنی مەغریب گرنگە، بەڵام ئازادکردنی بەیتولمەقدیس گرنگترەو سودی زیاترەو بەرژەوەندی تایبەتیو گشتی زیاترە، جا ئەگەر تقی الدین بڕوات پیاوانی ناسراوی ئێمە بەرێت، دەبێت تەمەنمان سەرف بکەین بۆ پێگەیاندنی پیاوی هاوشێوەی ئەو، بەڵام ئەگەر بەیتولمەقدیس رزگاربکەین ئەوە کەنار دەریا ئازاد دەبێتو پاشان بۆ ئەو شوێنانەش بەرێدەکەوین[1]. دواتر نامەیەکی نووسی بۆ تەقی الدین عمرو داوای لێکرد کەبێت بۆ شام، هەروەها القاضی الفاضلیش بەهەمان شێوە نامەی بۆ نووسی قسەی القاضی الفاضلیش گویٚ بۆ گیراوبوو: بەهۆی ئەو نامەیەی گەورەمانەوە کەداوای مۆڵەت دەکات بۆ بەرێکەوتن بەرەو مەغریب، گەورەم ئەوە چی روویداوە ئێوە تا دوێنێ پارچە زەوییەکتان بەدەستەوە نەبوو، بەڵام ئەمرۆ خوای گەورە ئەو هەموو نازو نیعمەتەی پێ بەخشیون، پاشان ئێوە هەمووتان کۆو بێخەمو گرفتبوون ئایا ئێستا بۆدونیاتان لەبەردەمدا تەنگ بووەتەوەو هیچ هۆکارێکتان بەدەستەوە نەماوە، نەخێر سوێند بەخوا گەورەم هۆکارەکان کۆتاییان پێنەهاتووە، بۆ کوێ دەچیتو مەبەستت چیە؟ ئایا ئێمە ژیانمان خۆش نییە یان ژمارەمان کەمە؟ یان وڵاتمان نییە؟ چۆن بەسەر هەڵبژاردنی خوادا شوێنهەڵدەبژێری؟ ئایا خوا باشتر لەخۆمان خەمی نەخواردوین؟ یاخود چۆن شوێنێکی وشك هەڵدەبژێرین لەکاتێکدا کەئێمە لەوڵاتی خێرو بێرداین؟ یان چۆن دەستەبەرداری جەنگکردن لەپێناو ئیسلامدا دەبینو دژ بەموسڵمانان دەجەنگین کە ئەوە نەهی لێکراوە؟ خەڵکانی خزمەتگوزارو سەربازو خاوەن عەقڵو راکان ئایا لەئێوەدا پیاوێکی هۆشیار نییە:

تعَقَّب الرأيَ وانظر في أواخره فطالما اتهمت قدما أوائله

هێشتا گەورەمان بەرادروستەکان کاردەکاتو بەوردی لێیان دەکوڵێتەوە، ئەو ماڵە نەمێنێ کەچۆڵە لەئەوو ئەو رۆژانە لەناوناچن کەئێوچەوانی تیادا هەڵنایەتو بچێتە ریزی شەوەکانەوە[2]. ئاخۆ ئەمیری گەورە چۆن دەتوانێت دوای ئەم هەموو بەڵگەیە وەڵامی فەرمانی سوڵتانی نەداتەوە، ئەوەبوو بەکەسوکارو سوپاکەیەوە بەرەو دیمەشق بەرێکەوتو سوڵتان لەمرج الصُفَّردا لە ٢٣ی شەعبانی ٥٨٢، ١٠ی تشرینی دووەمی١١٨٦ زدا پێشوازی لێکردوو پێکەوە هاتنە ناو دیمەشقەوەو سوڵتانیش حەمای پێبەخشیو داوای لێکرد کەسەنگەرو سنورەکانی بپارێزێت، ئەویش بەرەو حەما بەرێکەوت، بەم رێکخستنە ژیرانە سەلاحەدینو قاضی فاضل توانییان کاروبارەکانی دەوڵەت

[1] کتاب الروضتین لە: صلاح الدین القائد وعصره وه، ل: ٢٦٦.

[2] صلاح الدین القائد وعصره وه، ل: ٢٦٧.

ڕێکبخەن لەئەو پەڕی ڕۆژهەلاتەوە بۆ ئەپەڕی ڕۆژئاوای، لەم کاتەشدا بارودۆخی سیاسی لەشانیشینی خاچپەرستەکاندا بەرەو خراپتر دەچووو ناکۆکی لەنێوان حیزبی بارۆنە دەرەبەگەکان و حیزبی پاشاو لایەنگرانیدا گەیشتبووە چلە پۆپەی، ئەمەش پالی بەکونت ریمۆندی سێیەمەوە نا کە لەتەختی پاشایەتی دورخرایەوە بەدانانی غی دی لوزیجنیانی هاوسەری شاژنی میراتگری تەختی پاشایی، بۆ مۆرکردنی ئاشتەوای لەگەڵ سەلاحەدیندا لەسەر ولاتی خۆی (طرابلوس)و ولاتی هاوسەرەکەی (طبرية) بەجۆرێك کە لەسەرچاوە عەرەبیەکاندا دەربارەی وتراوە:.... پەنای برد بۆ سایەی سوڵتان و بوو بەشوێنکەوتووی سوڵتانیش قبوڵی کردو دەستی گوشیو بەهێزی کرد بەئازادکردنی ئەو سەربازانەی کە لەزینداندا بوون، ئەویش بوو بەدڵسۆزی موسڵمانەکان، ئەو هۆکارەش پالی نا بەریمۆندی سێیەمەوە بۆ مۆرکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیە، ئەوەبوو سەرۆکی ئەلداویە ئامۆژگاری غی پاشای کرد بەکۆکردنەوەی هێزەکانیو گەمارۆدانی ریمۆندو ناچارکردنی بۆ خۆبەدەستەوەدان، پاشاش هێزەکانی کۆکردەوە، بەلام بالیانی کوڕی بارزان (فەرمانڕەوای نابلس) توانی قایلی بکات بەهەڵە بوونی ئەم کارە، ئەویش هێزەکانی بلاوەپێکردو گەڕایەوە بۆقودس، سەلاحەدینیش لەدیمەشقدا مایەوە لەچاوەڕوانی هەلی گونجاودا بۆ کۆکردنەوەی سەربازەکانیو بەڕێکەوتن بۆ گۆڕەپانی جەنگ، ئەوەبوو دەستگیرا بەسەر ئەو کاروانەی کە لەمیسرەوە هات بۆ شامو دانوستانەکانیش شکستیان هێنا لەنێوان سوڵتان و ئەرناط پاشادا بۆچارەسەرکردنی کێشەکەو، هەردوولا دەستیاندایە ئامادەسازیو خۆڕێکخستن، سوڵتانیش نامەیەکی نووسی بۆ سەربازەکانی لەموسڵ و جەزیرەی فوراتو حەلەبو حەماو میسرداو داوای لێکردن کەبەڕێکەون بۆلای: سەربازەکانی ڕۆژهەلاتو حەلەب لەرأس الماء کۆببنەوە، ئەو ئۆردوگایەی کەسەلاحەدین هەمیشە بەکاریدەهێنا، ناوەندی کۆبوونەوەو بەڕێکەوتنی میسرییەکانیش بەسەرکردایەتی العادلی برای بەرەو کركو شوبك، سوڵتانیش خۆی بەرەو جسر الخشب بەڕێکەوتو لەوێ مایەوە هەتاوەکو هەموو هێزەکانی دیمەشق لەلای کۆبونەوە[1].

[1] صلاح الدين القائد وعصره وه، ل: ٢٦٧.

# بەشی سێیەم: جەنگی حگین و ئازادکردنی بەیتولمەقدیس و شالاوی خاچپەرستی

## باسی یەکەم: جەنگی حطین:

سەلاحەدین توانی بەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو وبەرفراوان پێکبێنێت، بەلام دەستگرتنی خاچپەرستەکان بەسەر هەندێ لەشارەکانی کەنار دەریادا لەشام، لەگەڵ هەردوو قەلای کرك و شوبكدا، بوونە بەربەستێكی گەورە لەبەردەم پەیوەندی کردنی هەردوو بەشی دەوڵەتەکەیدا، کەمیسرو زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی شام و بەشێك لەعێراقی لەخۆگرتبوو، ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەم شارانە پێگەیەکی ستراتیژی گرنگیان هەبوو، چونکە خاچپەرستەکان توانیان بەهۆی دەستگرتنیان بەسەر ئەم شارانەدا لەپەیوەندی بەردەوامدا بن لەگەڵ وڵاتو زێدی سەرەکی خۆیاندا کەئەوروپای رۆژئاواییە[1]، لەبەر ئەوە سەلاحەدین لەسەرەتای دەسەلاتیەوە بایەخی دەدا بەهێرشکردنە سەر ئەم ناوچەیە، بگرە گرنگیدانی بەم مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی پێشتر کاتێ کەوەزیری دەوڵەتی فاطمی بوو[2].

لەراستیشدا سەلاحەدین توانی زیانێکی زۆر بەخاچپەرستەکان بگەیەنێت لەئاکامی ئەم هێرشانەدا لەرووی گیانی و کەرەستەکەی جەنگەوە، ئەمەش پالی بەخاچپەرستەکانەوە هەناوەکو بیر لەکەمکردنەوەی فشار بکەنەوە بۆ سەر ئەم ناوچانە، بەدورخستنەوەی سەلاحەدین لێی و راکێشانی سەرنجی بەهێرشکردنە سەر کەنارەکانی دەریای سور، ئەمە جگە لەقۆستنەوەی بونی لەوناوچەیەدا بۆ هەرەشەکردن لەشوێنە پیرۆزەکان لەپێناو لێدانی پیرۆزترین ناوچەی ئیسلام[3]، بەلام رووداوەکان زۆر بەخێرای لەبەرژەوەندی سەلاحەدین دەرۆیشتن.

### یەکەم: پێشەکیەکانی جەنگی حطین:

١- **کۆچی دوای بلدوینی پێنجەم و کاریگەری لەسەر بارودۆخی خاچپەرستەکان:** پاشا بلدوینی پێنجەم لەمانگی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٨٢ك/ مانگی ئابی ساڵی ١١٨٦زدا دوای چەند مانگێك لەدەست بەکاربوونی کۆچی دوایی کرد، لێرەشەوە دووبارە کێشەیەکی ناوخۆیی لەنێوان خاچپەرستەکاندا سەریهەڵداو کۆچی دوایی سەرەتایەك بوو بۆ ململانێیەکی توند بۆ

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٥٧.

[2] هەمان سەرچاوە: ١٥٧.

[3] هەمان سەرچاوە: ١٥٧.

گەشتن بەتەختی شانشینی، نەیارانی وەسیەتەکەی ریمۆندی سێیەمیش بەردەوام بوون لەپلاندانانداندا هەتاوەکو دواجار توانیان دەسەلاتی لیَ زەوت بکەنودەسەلاتی لەمندالەکەیەوە بەرن بۆ سیبیلای دایکیو هەلبژاردنی پاشای نوێیان دایە دەستی، چونکە کەخۆی وەك ئافرەتێك توانای حوکمڕانی نییە، سیبیلیش تاجی پاشایەتی رادەستی جای لوزینانی هاوسەری کرد وەك نەیارانی ریمۆندی سێیەم دەیانویست[1].

٢- **سود وەرگرتنی سەلاحەدین لەو بارودۆخەی کەشانشینی بەیتولمەقدیس پیایدا تێدەپەڕی:**

سەلاحەدین لێبڕاوانە کاری دەکرد بۆ پێکهێنانی هێزێکی سەربازە پڕ چەگو تفاق، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ رووبەڕووبوونەوەی یەکلاکەرەوە دژ بەخاچپەرستەکان، لەهەمان کاتدا خۆی دەبوارد لە رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان لەچەند بەرەیەکی جەنگدا، هەتاوەکو بوار نەدات دوژمن ریزەکانی یەکبخاتو خۆی ئامادەبکات بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێزی موسلمانان، بۆ ئەم مەبەستەش لەسالی ٥٨٣ك/ ١١٨٧زدا نێردراوێکی نارد بۆلای خەلکی حەلەبو فەرمانی پێکردن بەئاشتەوایی کردن لەگەل بۆهیموندی سێیەمی ئەمیری ئەنطاکیەدا هەتاوەکو لەیەك بەرەی جەنگەوە رووبەڕووی خاچپەرستەکان ببێتەوە[2]، هەروەها سەلاحەدین بەهۆی ئەو لێهاتوویی و شارەزاییە سەربازیەی کەهەیبوو هەولیدا بارودۆخی نالەباری شانشینی بەیتولمەقدیس بقۆزێتەوە کەپاش دانانی جای لوزجیینان تێی کەتبوو، دوای ئەوەی هاوسەرەکەی تاجی لەسەر سەری خۆی لابردونایە سەر سەری ئەوو وتی: مێردەکەم بەتواناترو شیاوترە بۆپاشایەتی[3]، قومص ریموندی صەنجەلی ئەمیری طرابلوسیش شکستی هێنا لەبردنەوەی ئەو پۆستەدا، سوارەکانی داویەش رازی نەبوون خۆی بەتەنها حوکمڕانی بکاتو داوایان لێکرد کەکار بەو وەسیەتە بکات کەتەنها مافی سەرپەرشتی کردنی پێدەبەخشی، ئەمەش وایلێکرد کەخۆ بخاتە باوەشی سەلاحەدینو داوای کۆمەکی لێبمات، سەلاحەدینیش پەنای داو، بەدەم داواکەیەوە چوو وکۆمەکی پێویستی پێشکەشکرد، بەم شێوەیەش توانی هاوپەیمانێکی نوێ پەیدابکات لەناو خاچپەرستەکانداو کەلێنێکی گەورە بخاتە ریزی خاچپەرستەکان[4]، ئەوەبوو خەریکبوو پێکدادان لەنێوان پاشا جایو ریمۆندا روبدات کاتێك ریمۆند لەطبریەدا سەربازگەی داناو وەك کەسێکی خۆبەزلزانو لەخۆبایی

---

[1] تأريخ الأيوبين فى مصر وبلاد الشام، ل: ١٤٠.

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٥.

[3] الفتح القسى،ل:٦٨،٦٧، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٥.

[4] الكامل فى التأريخ،نقداً عن: صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٥.

کۆمەڵێکی زۆری لەخاچپەرستەکان لەدەوری خۆی کۆکردەوەو سوڵتانی هاندا بۆ هێرش کردنە سەریان بۆ گێڕانەوەی دەسەڵات بۆی[1]، پاشای بەیتولمەقدیسیش هەستا بەکۆکردنەوەی سوپایەکی زۆر بۆهێرشکردنە سەر طبریە، بەڵام هەستانی هەندێ لەئەمیرەکان بەناوبژیوانی بۆهێورکردنەوەی بارودۆخەکەو بانگهێشت کردنی هەردولا بۆ یەکگرتن بۆرووبەروو بوونەوەی ئەو ئامادەکارییە مەزنەی کەسەلاحەدین بۆی سازدا بوون، ئەمەش پاشا لوزینانی ناچارکرد کەخۆی بەرێبکەوێت بۆلای قومص ریموندی قونجلی بۆئاشتکردنەوەو رێکەوتن لەگەڵیدا[2]. سەرباری ئەمەش دەتوانین بڵێین کە سەلاحەدین دەرەنجامی دەستێوەردانی لەکاروباری خاچپەرستەکاندا بۆکۆمەکی کردنی یەکێکیان دژ بە ئەوی تریان چەند بەرهەمێکی دەسکەوت، کەگرنگترینیان ئەو جیاوازیە گەورەیە بوو لەدیدو بۆچونەکانیدا لەنێوان ریمۆند صنجلی و هەندێ لەئەمیرە خاچپەرستەکاندا، لەپێشەوەی هەمووشیاندا ئەرناطی فەرمانڕەوای قەڵای الکرك . رەنگە ئەمەش ئەو هۆیە بێت کەهانی مێژوونوس ابن الأثیر ی داوە بۆ وەسفکردنی هاوپەیمانێتی نێوان سەلاحەدین‌و ریمۆندی سێیەم سەرباری کورتی ماوەکەی بەوەی کە: گەورەترین هۆکاربوو بۆ ئازادکردنی وڵاتیان‌و دەرهێنانی بەیتولمەقدیس لەژێر چەپۆکیان[3]، بەم شێوەیە سەلاحەدین ئاگربەستێکی بەجیا لەگەڵ بوهیمۆندی سێیەمی ئەمیری ئەنطاکیە مۆرکرد لەسەرداوای ئەو یان لەسەرداوای سەلاحەدین، هەتاوەکو لەهێڵەکانی پشتەوەی سوپاکەی دڵنیابێتەوە یەکلاببێتەوە بۆ کوشتار لەباشوردا[4]. هەروەها ریمۆندی سێیەم مەودای رێکەوتنەکەی فراوانتر کرد هەتاوەکو ناوچەی الجلیلیش بگرێتەوە، بەم پێیەش رێی خۆشکرد بۆ سەلاحەدین بۆ چوونە نێوان ئوردون‌و فەلەستین[5].

٣- **رێنۆلد شاتیۆن دووبارە رێککەوتنامەکەی پێشێل دەکات لەگەڵ سەلاحەدیندا:** هاوپەیمانی نێوان سەلاحەدین‌و ریمۆندی سێیەم رێنۆلد شاتیۆنی تورە کرد کە لەوکاتەدا لەئاگر بەستدا بوو لەگەڵ سەلاحەدینداو بەوە ناسرابوو کە تاك لایەنە بیردەکاتەوە، بەهۆی ئەو پارێزگاریەشەوە کەئاگر بەستەکە لەخۆی دەگرت کاروانە بازرگانیەکان دەستیان کردەوە

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٦.

[2] كتاب الروضتين، لە: صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٦.

[3] الكامل في التأريخ، لە: صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٦.

[4] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٢.

[5] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٣.

بەهاتووچـۆ لـەنێوان میـسرو وڵاتـی شـامداو بەسـەلامەتی بـەخاکی خاچپەرسـتەکاندا تێپـەڕدەبوون[1]، ئەمـەش سـودی بـۆ خـودی رینوڵدشایـسۆنیش هـەبوو، بـەهۆی ئـەو باجو مالیاتەی کە لەسەری دانابوون، وەك دەریش کەوتبوو وادیار بـوو کـە ئـەو نەیـدەتوانی بـەبێ دزیو تاڵانی بژی ، بۆیـە هەسـتا بەهەڵوەشـاندنەوەی ئاگربەسـتەکەی لەگـەڵ سـەلاحەدیندا لەساڵی ٥٨٢ك/ کۆتایی ساڵی ١١٨٦زدا کاتێ کـەکاروانێکی بازرگـانی گـەورەی وەسـتاند کـە بـەخاکی کرکـدا تێپـەڕدەبوو لەکاتێکـدا کـە لەمیـسرەوە بـەرەو شـام دەڕۆشـتو تـوانی پاسەوانەکانی بکوژێتو دەستی بەسەردابگرێتو چەند سەربازێکیش بەدیل بگرێت، هـەروەك بازرگانو خێزانەکانی ناوکاروانەکەی دەستگیرکردو بردنی بۆقـەڵای الکرك[2]، زۆری نەخایەنـد هەواڵی ئەم دەستدرێژیانە گەشـتە سـەلاحەدین، بـەڵام لەبـەر سـووربوونی لەسـەر ڕێزگرتنـی ڕێکەوتنامەکە نامەیـەکی نـارد بـۆ ڕێنۆلـد شـاتیۆنو ئیدانـەی ئـەم کـارەی کـردو هەڕەشـەی ئەوەی لێکرد کەئەگەر دیلەکان ئازاد نەکاتو سامانو موڵکەکان نەگێڕێتەوە ئەوە لێی قبـوڵ ناکات، بەڵام فەرمانڕەوای کرك ئامادەنەبوو پێشوازی لەنێردراوەکانی بکات.

کاتێ سەلاحەدین پشت تێکردنی رینوڵد شاتیۆنی بینی، نامەیەکی سکاڵا ئامێزی نارد بـۆ پاشـا جای لوزینانو داوای لێکرد کەئامۆژگاری رینوڵد بکات بۆ گێڕانەوەی دیلو ماڵـە بـەتاڵان براوەکان، ئەوەبوو جای بەدەم بانگەوازەکەی سەلاحەدینەوە هات، بەڵام نەیتوانی فشار بخاتە سەر رینۆڵـد[3]، ئەم شێوازەش کەسەلاحەدین گرتیەبەر دەربارەی ئەو دیلانەی کە کەوتبونە ژێر دەسـتی ئـەرناطی فەرمانڕەوای کركو داوای ئازادکردنو گێڕانەوەی سەروەتو سامانەکانیان، ئەم شێوازە ڕۆڵی هەبوو لەدروستکردنی ناکۆکیو نەهێشتنی متمانـە لـەنێوان پاشـای بەتولمەقدیسو ئـەرناطدا کەداواکـەی ڕەتکردەوە بۆ ڕێزگرتن لەو پەیمانەی کە لەگەڵ سەلاحەدین بەستراوە، بەمەش پاشای خاچپەرست گومانی لەنیازو مەبەستەکانی ئەرناطدا بۆ دروست بووەهەریەکەیان مەترسی لەوی تر دەکرد[4].

ئـەم هاوپەیمانێتیانـەو هەڵوەشـاندنەوەی خـاڵی دەسـتپێکو سـەرەتای جـەنگی حطـین بـوو[5]، چـونکە هاوپـەیمانی سـەلاحەدین لەگـەڵ ریمۆنـدی سـێیەمدا بـواری ڕەخـساند بـۆ دەسـتێوەردانی سیاسەتی ناوخۆیی خاچپەرستەکان، نوێ کردنەوەی هاوپەیمانیەکەشـی لەگـەڵ ریمۆنـدی سـێیەمو

---

[1] مفرج الكروب (٢/١٨٥)، تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٢.

[2] الكامل فى التأريخ(١٠/١٩،١٨)، تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٢.

[3] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٢.

[4] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٦.

[5] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٣.

بوهیموندی سێیەمدا شانشینهی بەیتولمەقدیسی بێبەشکرد لەکۆمەکی دوان لەبەهێزترین میرنشینەکانیان لەشامدا، کە ئەوانیش میرنشینی طرابلوس و میرنشینی ئەنطاکیە بوو، بەم شێوەیەش سەلاحەدین سەرکەوتوو بوو لەپەرتەوازەکردنی ریزی خاچپەرستاندا، لەبەرامبەریشدا سەرکەوتووبوو لەیەکخستنی ریزەکانی موسڵماناناداو سوپای ئیسلامی لەمیسرو جەزیرەو شام و موسڵدا لەرووی مەعنەوی و سەربازیەوە ئامادەکرد بۆ ئەو جەنگەی کەدەیویست یەکلاکەرەوە بێت[1]، کاتێک کەئامادەکاریەکانی سوپاکە بەکۆتا گەیشت، سەلاحەدین دیمەشقی بەجێهێشت لەمانگی محرمی سالی ٥٨٣ك ئازاری سالی ١١٨٧ز دا بەسەرکردایەتی سوپایەکی زۆرەوە بەرەو باشوور بەرێکەوت و گەشتە رأس الماء لەباکوری رۆژهەلاتی حۆران[2]، پاشان بەرەو بصری بەرێکەوتن[3]، بۆپشتیوانی کردن لەکاروانی حاجیان کە خوشکەکەی و کچەکەی لەناویاندا بوون، لەهەمان کاتیشدا ئەگەری پەلاماردانی رینۆلدیان لێ دووردەخاتەوە، چونکە ئەو راپۆرتانەی کەدەگەیشتن باسیان لەوە دەکرد کەفەرمانرەوای کرک لە بۆسەدایە بۆ حاجییەکان[4]، دوای ئەوەی کەسەلاحەدین لەگەشتنی کاروانەکەو سەلامەتیان دلنیا بوویەوە، پەلاماری کرکی دا کاتێک رینۆلدشاتیون زانی کەسەلاحەدین هاتۆتە ناوچەکە پاشەکشەی کرد بۆ ناو حەسارو قەلاکەی، سەلاحەدینیش الأفضل نورەدین عەلی کوری لەرأس الماءدا دانابوو،چاوەرێی گەشتنی ئەو سەربازانەی دەکرد کەبانگهێشتی کردبوون بۆ جیهاد[5]، جموجۆلی سەلاحەدینیش بەئاراستەی کرک دوو ئامانجی بەدیهێنا:

**یەکەم:** شاردنەوەی مەبەستی سەرەکی، کەهێرشکردنە سەر بەیتولمەقدیس بوو.

**دووەم:** ترساندنی رینۆلدشاتیۆن (أرناط)و رێگرتن لەرۆیشتنی بۆ بەیتولمەقدیس.

ئەوەبوو سەلاحەدین سوپاکەی بەناوچەکەدا بلاوپێکردو تیایدا دەسورانەوەو خۆشی بەرەو شەوبەك بەرێکەوت و هەمان کاریشی بەرامبەر بەشەوبەك ئەنجامداو ئوردوندا مایەوە لەمانگی صفر رەبیعی یەکەمی سالی ٥٨٣ك/نیسان و ئایاری سالی ١١٨٧دا بۆ روپۆش کردنی ئەو سوپایەی کە لەدەوری الأفضلی کوری لەرأس الماودا کۆدەبونەوە[6]..

---

[1] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٣.

[2] حوران: گوندێکی گەورەیە لەدەوروبەری دیمەشق لەلای قیبلەوە.

[3] بُصری:سەر بەدیمەشقە گوندی حۆرانە.

[4] الفتح القسى فى الفتح القدسى، ل: ٥٨،٥٩.

[5] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٣.

[6] تأريخ الأيوبين، ل: ١٤٤.

٤- **رووبەڕووبوونەوەی صفوریە:** لەهەمان کاتدا کەسەلاحەدین خێوەتگەی هەڵدابوو لەنزیك قەڵای کرکو شەوبك بۆ پاراستنی حاجییەکان لەدەستدرێژی خاچپەرستەکان، هەستان بەناردنی هێزێکی هەواڵگری کەئەندامەکانی بەشێوەیەکی تایبەت دەستنیشان کردبوو، سەرکردایەتیشی دابووە دەست مظفر الدین کەوکەبەری فەرمانڕەوای حەڕان و بدر الدین دلدرمی کوڕی یاروق ئەمیری سەربازەکانی حەلەبو صارم الدین قایمازنەجمی ئەمیری سەربازەکانی دیمەشق هەتاوەکو هەستن بەهێرشکرنەسەر ماڵو موڵکی دوژمن بۆ لاوازکردنی سەربازگەکانی و پەی بردن بەپلانەکانی، ئەم سریە پڕ چەکو تفاقەش بەئاڕاستەی صفوریە بەڕێکەوت، سەرکردەکانیشی سور بوون لەسەر ئەوەی کەڕێڕەوو جموجۆڵی زۆر نهێنی بێتو بۆیە لەبەشی کۆتایی شەودا بۆی بەڕێکەوتن هەتاوەکو بەرە بەیان هێرشی بۆ بکەن ئەوەبوو ئەوپلانە زۆر بەوردی لەبەرەبەیاندا جێبەجێکراو لەبەرەبەیاندا هەڵیان کوتایە سەر صفویە[1]، هەرچی خاچپەرستەکانیشە کە لەخەوێکی قوڵدا بوون بەدەنگی شمشێرو رمەوە بەخەبەر هاتنو بەپەلە خۆیان کۆکردەوە بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەو هێرشە ئیسلامیە کتوپڕە، پاشان هەردوولا رووبەڕووبوونەوەو جەنگێکی توند لەنێوانیاندا روویداو بەسەرکەوتنێکی مەزن بۆ موسڵمانەکان کۆتایی هاتو زۆرینەی خاچپەرستەکان کوژران و بریندار بوون، لەناو کوژراوەکانیشدا سەرکردەو موقەددەمی ئسبتاریەو ژمارەیەکی زۆر لەسوارە ناودارەکانیان هەبوون، موقەددەمی داویەکانیش زۆر بەزەحمەت رزگاری بوو[2]، ئەوەی کەقورەکەی زیاتر خەست کردەوە ئەوەبوو کەکاتێ هێزێکی خاچپەرستی تر بەپەلە گەشتە صفوریە بۆ بەدەمەوە چونی براکانیان شەڕەکەی کۆتایی پێهاتبوو موسڵمانەکان توانیان تەواوی ئەو هێزە دەستگیر بکەن، پاشان موسڵمانەکان بەسەرکەوتنو دەستکەوتەوە گەڕانەوەو[3] سەرکەوتنیشیان لەمجەنگەدا نۆبەرەی بەرەکەتو پێشەکی سەرکەوتنەکانی دواتر بوو[4]. بەم شێوە موسڵمانەکان توانیان زیانی گەورە بەخاچپەرستەکان بگەیەنن و ئەم جەنگەش خاچپەرستەکانی تۆقاندو دەرکیان بەمەترسی ئەوهێزە ئیسلامیە گەورەکرد کەسەلاحەدین ئامادەی کردبوو بۆ کوشتاریان[5].

---

[1] كتاب الروضتين (٢/٧٥)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٨.

[2] مفرج الكروب (٢/١٨٧)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٨.

[3] مفرج الكروب (٢/١٨٧)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٩.

[4] كتاب الروضتين (٢/٧٦)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٩.

[5] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٩.

٥- **ئەو ئامادەكارییانەی كە پێش جەنگی حطین ئەنجامدران:** سەلاحەدین دڵخۆش بوو بەو سەركەوتنەی كە بەدەست هات لەسەردەستی ئەو سریە ئیسلامیە لەجەنگی صفوریەدا، بۆیە كركو شوبكی بەجێهێشتو بەپەلە بەئاراستەی دوژمن بەڕێكەوت لەعشترادا خێوەتگەی هەڵدا[1]، سەربازە ئیسلامیەكانیش لەدەوری كۆبونەوە بەرێژەیەكی زۆر كەلەو دەشتەدا شەپۆلیان دەدا بەپێی ووتەی ابن واصل[2]، ئەوەبوو هەستا بەریزكردنی سەربازەكانی، كەدوازدە هەزار جەنگاوەربوون[3]، پاشان سوپاكەی بەپێی یاسای جەنگی باو لەوكاتەدا رێكخستو تقی الدین عمری برازای خستە لای راستو مظفر الدین كوكبری لەلای چەپەوە دانا خۆشی لەناوجەرگەی سوپاكەدا بوو، سوپاكەش بەسەر هەردوولادا دابەشبوو بوون وەك خۆئامادەكردنێك بۆ رووبەڕووبوونەوە[4].

أ- **ئامادەكاری خاچپەرستەكان:** لەوەلامی ئەوكۆبونەوە ئیسلامیە گەورەدا،خاچپەرستەكان كاتێ بیستیان موسڵمانەكان كۆبونەتەوە سوپایەكی گەورەیان بەرێخست بۆیان، چونكە دەیانزانی كەرووبەڕووی سوپایەك دەبنەوە كەهاوشێوەیان نەدیوەو دەوڵەتو دەسەلاتیان لەتیاچونو فەوتاندایە، بۆیە هەموویان كۆبونەوەو لەهەموو لایەكەوە كەوتنە خۆیانو هەموو ناكۆكیەكانیان وەلاناو القومص لەگەڵ جای پاشادا ئاشت بویەوەو دوای ئەوەی كەچووە لایو خۆی خستەبەرپێی[5]، لێرەشەوە پاشا جای هەستا بەدەركردنی فەرمانی رەشبگیری گشتی واتە دەبێت هەموو ئەو پیاوانەی كەتوانای چەك هەڵگرتنیان هەیە بەشدارییكەن، دیارە پاشاش تەنها لەئەو پەڕی تەنگانەوەو پێویستیدا پەنا بۆ ئەم حاڵەتە دەبات[6]، ئەوەبوو خاچپەرستەكانیش كۆمەڵانێكی زۆریان پێكەوە ناو خاچیان بەرزكردەوەو خەڵكی لەدەوری كۆبوونەوە، سوپاكەش بەتەواوی ئامادەبوو، دوای ئەوەی ئەوپارەیان دابەش كرد كەهنری پاشای ئینگلتەرا ناردبووی بۆ جای پاشاو فەرمانی كردبوو كە بەسەر سوپادا دابەشی بكەن، سەبارەت بەژمارەی سوپای خاچپەرست كە لەصفوریەدا خێوەتی هەڵدابوو دوای شكستهێنانی لەبەرامبەر سریەئیسلامیەكەدا ئەوەهەندێ لەمێژوو نوسە هاوچەرخەكان

---

[1] عشترا: شوێنێكە لەحوران سەر بەدیمەشق.

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٧٩.

[3] كتاب الروضتين (٢/٨٦)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٠.

[4] وفيات الأعيان(٧/١٧٤)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٠.

[5] كتاب الروضتين (٢/٨٦)

[6] الشرق الأدنى فى العصور الوسطى، ل: ٨٤.

دەڵێن ئەوژمارەیە نویکەی پەنجا هەزار، یان زیاتر بووە[1]، هەندێکیشیان پێیانوایە کەبیست هەزاربووە[2].

ب- **هەڵبژاردنە جەنگی یەکلاکەرەوە لەلایەون سەلاحەدینەوە:** کاتێك سەلاحەدین بەکۆبونەوەی خاچپەرستەکانی زانی لەصفوریەدا پاش شکست خواردنیان لەبەرامبەر سریە موسڵمانەکەوە لەوشوێنەدا، راوێژی بەفەرماندەکانی کرد، و زۆربەیان رایان وابوو کەواز لەرووبەرووبوونەوە بێنێت و شێوازی هێرش و پەلاماری بەردەوام بگرێتەبەر وەك رابردوو لەپێناو گەیاندنی زیانی زیاتر بەدوژمن بۆ لاوازکردنی بەرگری و وەشاندنی گورزی یەکلاکەرەوە لێی، کۆمەڵێکی تریش داوای چوونە ناو خاك و رووبەروو بونەوەیاندەکرد لەجەنگێکی یەکلاکەرەوەدا[3].

لێرەدا لێهاتووی سەربازیی سەلاحەدینمان بۆ دەردەکەوێت، کاتێ پلانی دووەمی هەڵبژارد کەبریتی بوو لەپێکدادانی راستەوخۆو یەکلاکەرەوە، وادیارە سەلاحەدین زانیویەتی کەزۆربەی ئەو هێزانەی کەلەدەوری کۆبونەتەوە لەشوێنی دوورەوە هاتوون وەك میسرو دیمەشق و حەلەب و جەزیرەو موسڵ دیار بەکرو چەند شوێنێکی تر، ئەم هێزانەش لەسەر بنەمای دەرەبەگایەتی سەربازی دروست بوون و چەند ئەرکێکیان لەسەر شانەکەدەبێت لەناوچەکانی خۆیاندا رایپەڕێنن، ئەمەش لەوانەیەلەهەندێ کاتدا ناچاری مۆڵەت وەرگرتن و گەڕانەوەیان بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان[4]، ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کەرەنگە سەلاحەدین ویستبێتی لەرێی ئەم پلانەوە سود لەو ناکۆکیەوەرگرێت کەلەریزی خاچپەرستەکاندا، لەپاش کۆچی دوای پاشا بلدوینی پێنجەم و دانانی پاشا جای لوزینان کەلێکۆڵەرێك بەیەکێك لەهۆکارەکانی بێبەشبوونی شانشینی بەیتولمەقدیسی زانیوە لەپشتیوانی و کۆمەکی دوو لەبەهێزترین میرنشینە خاچپەرستەکان لەشامدا کەئەوانیش میرنشینی طرابلوس و ئەنطاکیەن[5].

بەم شێوەیە هەڵوێستی نێوان سەلاحەدین و خاچپەرستەکان زۆر توند بوو، هەردوو لا تامەزرۆی پێکدادان بوون بۆ یەکلاکردنەوەی بارودۆخەکە، هەروەك سەلاحەدین دەیزانی کۆبونەوەیان لەصفوریەدا پێگەیەکی بەهێزیان پێدەبەخشێت لەجەنگدا، چونکە یەکێکە لەباشترین و گونجاوترین شوێنەکانی بنیاتنانی سەربازگە، ئەمەش بەهۆی ئەو لەوەڕگەو ئاوو داهاتە سروشتیە پێویستانەی

---

[1] كتاب الروضتين (٢/٧٦).

[2] الشرق الأدنى فى العصور الوسطى، ل: ٨٤.

[3] تأريخ ابن خلدون، لة: صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٠.

[4] الحركة الصليبية (٢/٧٩٩).

[5] تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٢.

کەپێویستن بۆ ئەو مەبەستە[1]، بۆیە هەستا بەکێشکردنی خاچەرستەکان بۆ شوێنێکی گونجاو کەبتوانی تیایداشکستیان بەسەردا بێنێت. ئەمە سەرباری ئەوەی کەسەلاحەدین دەیویست بەماندوێتی بگەنە لای و ناچاری ڕێی ڕۆیشتنیان بکات، خۆیو سوپاکەی لەماندوو بوون بپارێزێت[2]، هەربۆیە سەلاحەدین خۆی ئامادەکرد بۆ ئەنجامدا کارێك کەبەهۆیەوە بتوانێت خاچپەرستەکان لەسەربازگەکەیان لەصفوریەبێنێتە دەرەوەو پەلکێشیان بکات بۆ ئەو جێیەی کەخۆی دەیەوێت، بەلام ئەم پەلامارە دوو بارانە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەکردە سەر خچپەرستەکان دەستبەرداری شوێنەکانیان نەبوون لەصفوریەدا بۆیە سەلاحەدین بڕیاریدا کەهێرش بکاتە سەر خودی طبریە، چونکە هەر کاتێ خاچپەرستەکان بینیان هێرش دەکات دەچن بۆ ڕووبەڕوو بونەوەیو بەم شێوەیەش ئامانجەکەی دەپێکێت[3].

ج- **ڕۆیشتنی سەلاحەدین بۆ طبریە:** سەلاحەدین بەهۆی هێرشەکەیەوە بۆسەر طبریة بۆی دەرکەوت کەدەتوانێت ریمۆندی سێیەمی ئەمیری طرابلوس کەبەبێ ئارام ناسراوە بوروژێنێت[4]، ئەمە سەرباری ئەوەی کە سەلاحەدین دەیزانی بەهێرشکردنی سەر طبریە دەتوانێت ئەو ڕێگایە بگرێت کەدەچێت بۆ طبریە هەروەها دەست بەسەر هەموو ئەو دەروازەو ڕێگایانەی تریشدا بگرێت کە بەکەناری ڕۆژهەلاتیدا تێپەڕی بەرەو طبریە و بەگەشتنی بەئاوەکەی کۆتایی دێت[5]، لەکاتێکدا کەخاچپەرستەکان لەکاتی دەرچونیاندا لەصفوریە دەمێننەوەو لەناوچەیەکی سەختدا کەئاوی تێدا نییە جێگیر دەبن[6]، ئەوەبوو لەڕۆژی پێنجشەممە ٢٣ی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٨٣ك دا دووی یولیۆی ساڵی ١١٨٧زدا سەلاحەدین فەرمانی دا بەبەشی سەرەکی سوپاکەی بۆ پێشڕەوی کردن بەرەو طبریەو هێرشکردنە سەر طبریە هەتاوەکو دەستی بەسەردابگرنو لەقەلاکەیدا خۆیان قایم بکەن[7]، هەر کەهەواڵی ئەم هێرشە گەشتە گوێی خاچپەرستەکان، شێتو هاربونو پاشا جای دوای

---

[1] الحركة الصليبية (٨٠٤/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٢.

[2] الحركة الصليبية (٨٠٤/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٢.

[3] الحركة الصليبية (٨٠٤/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٢.

[4] الشرق الأدنى فى العصور الوسطى، ل: ٨٧.

[5] الشرق الأدنى فى العصور الوسطى، ل: ٨٧.

[6] هەمان سەرچاوە، ل: ٨٧، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٢.

[7] الكامل فى التأريخ (٥٣٣/١١)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٢.

گرێدانی کۆبونەوەی ئەنجومەنی جەنگی کرد[1]، ئەوەبوو هەندێکیان رایان وابوو کەپێشڕەوی بکەنو رووبەرووی موسڵمانەکان ببنەوە، بۆرێگری کردن لەچونە ناو طبریە، بەڵام ریمۆندی فەرمانڕەوای طرابلوس داوای کرد لەپاشا کە لەشوێنی خۆیدا لەصفوریە بمێنێتەوەو پێی وت: طبریە موڵکی منو خێزانەکەمە، سەلاحەدینیش ئەوەی بەو شارەکردووە کەکردوویەتیو قەلاکەی ماوەوهاوسەرەکەمی تیایە، منیش رازیم بەوەی قەڵاکەشوهاوسەرەکەشم بەرێت، چونکە پێشترو ئێستاش سوپای ئیسلامم دیوە، بەڵام هەرگیز کۆمەڵێ ئەوەندە زۆرو بەهێزم نەبینیوەوە، ئەگەر دەست بەسەر طبریەشدا بگرێت، ناتوانێت تیایدا بمێنێتەوە بەو هەمووە سەربازەوەو ناتوانن تاسەر لەو شوێنەدا خۆیان بگرن دوور لەخێزانو نیشتمانیانو ناچار دەبێت بەجێی بهێڵێت[2].

لێرەشەوە دەردەکەوێت کەسیاسەتی جیاوازی نانەوە لەنێوان خاچپەرستەکاندا لەلایەن سەلاحەدینەوە بەرهەمی خۆی هەبووە، کاتێ ئەم رایەی ریمۆندی بەتوندی رەتکرایەوە لەلایەن هەریەك لەئەرناطی فەرمانڕەوای کرکو جیراری موقەدەمی داویە کەتۆمەتباریان کرد بەخیانەتو لایەنگری کردنی موسڵمانەکان، ئەوە بوو ئەرناط وەڵامی دایەوەو وتی: زۆر ترساندتین لەموسڵمانەکان، دیارە تۆ خۆشت دەوێنو ئارەزووت لەگەڵیاندایە. هەروەها أرناطو جیرار توانیان کاریگەری لەسەر جای پاشا دابنێنو ئەویش فەرمانی دەرکرد بۆ سەربازەکان کەبەرەو طبریە بەرێبکەون، سوپای خاچپەرستیش دەستی بەجموجۆڵ کرد لەصفوریەو ریمۆندیش لەبارودۆخێکی زۆر خراپدا پێشیان کەوتبوو، ورەو لایەنی مەعنەویان دابەزیبوو، زۆرینەشیان لەگەڵ پێشڕەوی کردندا نەبوون بەرەو طبریەو بەنابەدڵیدەڕۆیشتن[3]، ئەمە سەرباری ئەو بۆسەو پەلامارانەی کە لەرێگەدا تووشی ئەو سوپایە بوو، لەگەڵ گەرمی کەشو هەوارو سەختی رێگاو نەبوونی ئاو، بەهۆی ئەم بارودۆخە دژوارەوە سوپای خاچپەرست لەکاتی رۆیشتنیدا لەصفوریەوە بۆ طبریە توشی جیابونەوەو لێکدابڕان بوو، چونکە دواوەی سوپاکە نەیتوانی هاوشانی پاشماوەی تری سوپاکەی بڕواتو پەیوەندی بەپاشاوە بکات لەناوەڕاستدا، ئەمەش پاشا جای ناچارکرد کەپێش گەشتنە طبریە سەربازگەو خێوەتگە هەڵبدات، سەرباری ئەو هەوڵەی کەریمۆندی ئەمیری طرابلوس پێی هەستا کەلەپێشەوەی سوپاکەدا بوو، بۆ هاندانی خاچپەرستەکان بۆ پێشڕەوی کردنو گەشتن

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٨٣.

[2] الكامل في التأريخ، له، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٣.

[3] الحركة الصليبية (٢٢/٣٠٨).

بەناو، ئەمەش بووە هۆی بێزاری ریمۆند لەو هەڵسوکەوتە، دڵنیابوو لەوەی کەشکستخواردن مەسەلەیەکی حەتمیە[1].

لەراستیشدا ئەم بڕیارانە زۆر سەرپێیی‌و سەرکەشانە بوو و بەڵگە بوو لەسەر نەبوونی بیرکردنەوەی سەربازی دروست لەلای سەرکردە خاچپەرستەکان کەسۆزی ئاینی توندڕەوانە زاڵ بوو بەسەریاندا، چونکە پاشاو شانشین‌و سوپای خاچپەرستیان خستە داوی سەلاحەدینەوە، کە لەکاتی بەرێکەوتنیاندا ووتی، ئەوەی کەدەمانویست روویداو مەبەستەکەمان هاتەدی، بەپشتیوانی خوا لێبڕانمان نوێ‌و سنورمان پۆڵاین‌و جەنگمان توندو سەرکەوتنمان بەهێزە، ئەگەر ئەم جارە دووچاری کوشتن‌و دیل کردنیان بکەین ئەوە هیچ بەربەستێك لەبەردەمماندا نامێنێ‌وکەناری دەریامان بەتەواوی دەکەوێتە ژێر دەست[2]. پاشان سەلاحەدین لەو شەوەدا سوپاکەی رێکخست‌و خۆشی بەسەرکردایەتی سوپاکەی بەرێکەوت بۆ رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان لەسەر لوتکەی چیای طبریەکەدەیڕوانیی بەسەر دەشتی حطیندا کەناوچەیە کە لەشێوەی بانێکدایە کەسێ سەد مەتر لەئاستی دەریا بەرزترەو دوو لوتکەی هەیە ئەمەش وایکردوە لەعەرەب کەناوی شاخەکانی حطین‌ی لێ بنێن، بەگەشتنی خاچپەرستەکانیش بەم بانە زۆر ماندوو شەکەت بوو بوون‌و تینوێتی زۆری بۆ هێنابوون دوای ئەوەی کەسوپای سەلاحەدین بوە رێگر لەنێوان ئەوان‌و سەرچاوەی ئاودا[3]. ئەوەبوو هەردوولا لەدەشتی قەدپاڵی چیای رۆژئاوای طبریةدا رووبەڕوی یەك بونەوە، بەڵام بەهۆی هاتنی شەوەوە روبەڕوبوونەوە کەدواکەوت، وەهەرکۆمەڵەو لەشوێنی خۆیدامایەوە[4]، لەبەرەبەیانی رۆژی هەینی ٢٤ی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧ زدا هەردوو سوپا کەوتنە جموجۆڵ‌و لەشوێنێکدا پێکد داان رویدا کە بەلوبیا ناسراوە، وکوشتار لەنێوانیان دا بەردەوام بوو هەتاوەکو تاریکی بوەرێگر لەبەرامبەریاندا[5] ئەوەبوو سوپای سەلاحەدین ئەودوو شەوە بەهرەمەندبوو لەسەرجەم ئەو هۆکارانەی کەیارمەتیدەری بوون بۆ روبەڕونەوەو، توانی لەدەشتاییەکی پڕ لەوەرگەو ئاودا سەربازگەی هەڵبدات، هەرچی سوپای خاچپەرستیشە ئەوە لەو ماوەیەدا ماندوێتی‌و بەدبەختی زیادبوو بەهۆی ئەوەوە کەسەربازگەکەیان لەناوچەیەکی سەختی بێ ئاوو گەرمدا هەڵدابوو، وا دیارە سەلاحەدین لەو شەوەدا بارودۆخەکەی قۆستەوە هەتاوەکو

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٤.

[2] تأريخ الأيوبين، ل: ٧٧، له العماد الأصفهاني يەوە.

[3] الكامل فى التأريخ(٥٣٤/١١)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٥.

[4] النوادر السلطانية، ل:٧٦.

[5] كتاب الروضتين (٨١/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٥.

ئامادەکاریەکانی تەواویکات بۆ هێرش کردنەسەر دوژمن کەچوویووە قەدپاڵی چیای حطین، بۆ خۆپاراستن لەتیاچون‌ومانەوە لەکەشێکی مامناوەندا بۆ کەمکردەوەی ئاسەواری تینوێتی‌و گەرما لەسەریان، سەرباری ئەو فەرمانانەش کەشا جای دەریکردبوو داوای بەرێ کەوتنیانی دەکرد بۆ خوارەوەی گردۆڵکەکە هەتاوەکو ئەرکی خۆیان بەرامبەر خاچ‌و وەستان‌و ریزبوون جێبەجێبکەن، بەلام ئەوان پاساویان بەتینوێتی‌و نەمانی توانای روبەڕووبونەوە هێنایەوە، سەلاحەدینیش ئەمەی قۆستەوەو سوپاکەی رێکخست‌و پلانی بۆ دارشت‌و بەشێوەیەکی بازنەی گەمارۆیدان وەك ابن الأثیر دەڵێ[1].

**دووەم: رووداوەکانی جەنگەکە:**

خاچپەرستەکان لەبەرەبەیانی رۆژی شەممەی ٢٤ی رەبیعی دووەمی ٥٨٣ك دا بۆیان دەرکەوت کەئەوان دوور لەناو گەمارۆ دراون، لەم کاتەشدا جەنگێکی ترسناك روویدا ئەوە بوو سوپای ئیسلامی پێشرەوی کردو بەپەلە دابەزین بۆ شاخەکانی حطین، سوپای خاچپەرستیش دەستیکرد بەجموجۆڵی‌و وایان دانابوو بگەنە طبریە بۆ ئەوەی دەستیان بگات بەئاو، بەلام سەلاحەدین بەئەزمونی سەربازی خۆی لەمەبەستەکەیان تێگەیشت‌و بەسوپاکەیەوە رووبەڕویان بویەوەو بەناوی سوپاکەیدا دەگەڕاو هانی دەدان بۆ جیهادو ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون[2].

١- **دەستپێکردنی هێرشی ئیسلامی:** هێرشی موسڵمانەکان بۆ سەر خاچپەرستەکان دەستپێکردو موسڵمانەکان هێرشەکانیان چڕکردەوە بۆ سەر دوژمن‌و تێگەیشتن کەرووباری ئوردون لەپشتیانەوەیەو وڵاتی رۆمیش لەپێشیاندایەو تەنها خوای گەورە دەتوانێت بەهانایانەوە بێت[3] لەبەرامبەر ئەو هێرشە ترسناکەی موسڵمانەکانیشدا، خاچپەرستەکان دڵنیابوون لەوەی کەکۆتاییان هاتووەو تەنها خۆبەدەستەوەدان یاخود هەڵاتن فریایان دەکەوێت، تەنها ریمۆندی ئەمیری طرابلوسیش توانی دەربازی ببێت کاتێ دەستەوسانی خاچپەرستەکانی لەبەرامبەر سوپای ئیسلامیدا بۆ دەرکەوت، بۆیە لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەربازەکانیدا رێککەوتن‌وپەلاماری موسڵمانەکانیان دا ئەوانیش رێگەیان بۆ کردنەوە هەتاوەکو لێیەوە دەربازبن‌و دوای دەرچونیان ریزەکە یەکی گرتەوە[4]. واش دیارە کەدەربازبوونی ریمۆند بەرازامەندی سەلاحەدین بوو، ئەو فەرمانی دا بەتقی الدین عمری

---

[1] الكامل فی التأریخ(١١/٥٣٥).

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٦.

[3] النوادر السلطانية، ل:١٨٦.

[4] الكامل فی التأریخ(١١/٥٣٥).

برازای کەپێشەنگی ئەو لایەی سوپا بوو کەریمۆند هێرشی بۆ هێنا، مەبەستی سەلاحەدینیش لەم کارە ترساندنو لاوازکردنی سوپای خاچپەرست بوو کاتێ کەهەلاتنی ریمۆندو کۆمەڵەکەی بینی، هەروەك دورنیە ئەو مەسەلەیە بەرێکەوتنی هەردوولا صلاح الدینو ریمۆند بوو بێت، بەبەڵگەی ئەوەی کەخاچپەرستەکان کاتێ دووچاری هێرشی هەمەلایەنە بوونەوە شمشێرەکانیان فڕێداو خۆیان بەدەستەوەدا[1]، ئەوەی کەقورەکەی زیاتر خەستکردەوە ئەوەبوو کە لەوکاتەدا ریمۆند هەلاتو دەستبەرداری سەربازەکانی بوو، هەندێلەموسڵمانە خۆبەخشەکان هەستان بەئاگرپێوەنانی ئەو پوشو گژو گیا وشکەی کەئەو ناوچەی داپۆشیبوو، رەشەباش کردیبەرووی خاچپەرستەکاندا، بەم پێیەش گەرماو تینوێتیو دووکەڵو ئاگر زۆری بۆهێنابوون، ئەمەش ناچاری پاشەکشەی کردن بۆ سەرەوەی کێوەکەو دەیانویست خێوەتەکانیان لەسەرەوە هەڵبدەنو خۆیان بپارێزن، بەلام جەنگ لەهەموو لایەکەوە زۆری بۆ هێنابوونو بواری ئەو کارەیان پێنەدراو نەیانتوانی جگە لەخێوەتی پاشا هیچ خێوەتێکی تر هەڵبدەن[2].

٢- **جەنگی دەروونی لای سەلاحەدین:** وادیارە سەلاحەدین لەو جەنگانەدا دەیویست خاچپەرستەکان لەناوبەرێتو بەهەموو شێوەیەك ترس‌وتۆقاندن بخاتە دڵیانەوە، تەنیا رووبەرووبوونەوەی راستەخۆشی بەکاردەهێنا بۆ کارتێکردنی دوژمن، بەلگەش لەسەر ئەمە ئەوە بوو کاتێ خاچپەرستەکانی لەلوتکەی چیای حطین‌دا گەمارۆدا، بایەخی زۆری دەدا بەدەستگرتن بەسەر خاچی گەورەیاندا کە بەالصلبوت ناسرابوو و دەڵێن: پارچەیەك لەو تەختەیەی تیایە کەمەسیحی لەسەر سێدارە دراوە بەقسەی خۆیان[3]، چونکە دەیزانی دەستگرتن بەسەر ئەو خاچەدا باشترین چەکە بۆ تێکشکاندنی خاچپەرستەکان لەرووی دەرونیو مەعنەوییەوە ئەوەبوو توانی ئەو خاچەیان لەدەست بسێنێتو خاچپەرستەکان تەواو لاواز بوونو لەتیاچوونی خۆیان دڵنیا بوو، وموسڵمانەکانیش بەرەو لوتکەی چیاکە پێشرەویان کردو خاچپەرستەکانیش لەپاشەکشەدا بوونو کوژرانو دیلکردنیان بەردەوام بوو، هەتاوەکو لەگەڵ پاشای خاچپەرستدا کەگەیشتبووە لوتکەی تەپۆڵکەکە تەنها ژمارەیەکی کەم مابوویەوە کە لەسەدو پەنجا سوارەی ئازا تێنەدەپەڕی[4]، ابن الأثیریش

---

[1] مفرج الكروب (٥٣٦,٥٣٥/١١)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٦.

[2] الكامل فى التأريخ(٥٣٥/١١)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٧.

[3] كتاب الروضتين (٨٧/٢).

[4] مفرج الكروب (١٩١/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٧.

لەسەر زاری الملك الأفضلی کوڕی سەلاحەدینەوە دەڵێت: کاتێ خاچپەرستەکان پاشەکشەیان کرد لەگەڵ پاشاکەیاندا بۆ لوتکەی تەپۆلکەکە هێرشێکی بەهێزیان هێنایە سەر موسڵمانەکانی بەرامبەریان‌و خەریك بوو لەشوێنەکانیان دوریان بخەنەوە، بەڵام موسڵمانەکان توانیان ئەو هەڵمەتە تێکبشکێنن‌و خاچپەرستەکانیان گێڕایەوە بۆ لوتکەی چیاکە، الملك الأفضلیش خۆشحاڵی خۆی بەم سەرکەوتنە دەردەبڕیّ‌و دەڵێت: (تێکمان شکاندن)، لێرەشدا لێهاتووی سەربازی سەلاحەدین‌و ئەزمونی جەنگیمان بۆ دەردەکەوێت، کەپێی وابوو، خاچپەرستەکان شکست ناهێنن هەتاوەکو سەرکردەکانیان رووبەرووی کوشتن یان دیلکردن نەبنەوە، بۆیە وەڵامی کوڕەکەی دایەوەو وتی: بێدەنگ بە سەرناکەوین هەتاوەکو ئەو خێوەتە نەکەوێت، مەبەستی خێوەتی پاشا بوو، پاشان هێرشەکانی توندتر کردو پاش چەند ساتێکخێوەتەکە کەوت‌و سەلاحەدینیش دابەزی‌و کڕنوشی برد بۆ پەروەردگارو لەخۆشیدا دەستیکرد بەگریان[1].

٣- **زیانەکانی خاچپەرستان لەحطین:** لەراستیدا ئەو کوژراوو دیلانەی کەخاچپەرستەکان لەم جەنگەدا دەستیان دا یەکێك لەگەورەترینی ئەو نسکۆو کارەساتانە دادەنرێت کەبەسەریاندا هاتووە، ئەوەبوو تەنها ژمارەیەکی کەم جەنگاوەر رزگاری بوو لەگەڵ کۆمەڵێك لەسەربازانی دواوەی سوپاکە بەسەرکردایەتی ریمۆندی فەرمانڕەوای صیداو چەند سەربازێکی پێشەوەش بەسەرکردایەتی ریمۆندی فەرمانڕەوای طرابلوس[2]. زۆرینەی سوپاکەش بەخودی، ئەمە جگە لەئەرناطی فەرمانڕەوای کرك‌و ئوکی فەرمانڕەوای جبیل‌و هنفری کوڕی هنفری فەرمانڕەوای تبنین‌و کوڕی ژنە فەرمانڕەوای طبریەو جیراری پێشەنگ‌و فەرمانـدەی داویە، زۆرینەی ئەوانەش کەرزگاریان بوو لەئسبتاریەو سەرانی خاچپەرستەکان بوون[3]. سەلاحەدین نوێژی سوپاسگوزاری دەکات‌و پێشوازی لەپاشا دیلکراوەکان دەکات:

سەلاحەدین فەرمانیدا بەهەڵدانی خێوەتێك بۆی، پاشان چووە ناویەوەو نوێژی سوپاس گوزاری بۆ خوای گەورە ئەنجامدا بەرامبەر بەم نیعمەتەی کەپاشاکانی پێش خۆی بەئاواتیەوە بوون، بەو خەمەوە سەریان نایەوە[4]، پاشان داوای پاشاو فەرمانـدەکانی کردو پێشوازییەکی باشی لێکردن‌و جای پاشای لەتەنیشت خۆیەوە داناو ئەرناطیش لەتەنیشت ئەوەوە داناو

---

[1] الكامل فی التأریخ(١١/٥٣٦)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٨.

[2] الشرق الأدنی فی العصور الوسطی، ل: ٩٨، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٨٨.

[3] النوادر السلطانية، ل: ٧٧، مفرج الكروب (١٩٢/٢).

[4] مفرج الكروب (١٩٤/٢).

جامێکی پێشکەش کرد بەپاشا جای کەئاوی ساردی تێدا بوو ئەویش لێیخواردەوەو پاشماوەکەشی دا بەئەرناط بۆ خواردنەوەی، لەم کاتەدا سەلاح الدین تووڕە بووو رویکردە پاشاو دوپاتیکردەوە کەئەرناط بەپێی مۆڵەتی ئەو ئاوی نەخواردۆتەوەو پەنادان نایگرێتەوە، پاشان ئاوڕی لێدایەوەو تاوانو خیانەتەکانی یادخستەوەو پێی وت: بۆ ئەوەندە بێ بەڵێنو ناپاکی؟ وەرگێڕەکەش وەڵامی دایەوە کەدەڵێت: ئەوە نەریتی پاشاکانە[1]، پاشان سەلاحەدین وتی: ئەوە من محەمەد سەر دەخەمو پاشان پێشنیاری موسڵمان بونی بۆ کرد، بەڵام ئەو رازی نەبوو، سەلاحەدینیش شمشێرەکەی هەڵکێشاو کێشای بەشانیداو شلیکردو ئامادەبوان بەتەمای نەمان[2]، پاشان وتی: دووجار نەزری کوشتنیم کردووە ئەگەر بکەوێتە ژێر دەستم، یەکەمیان: کاتێك ویستی بەرەو مەککەو مەدینە بڕوات، دووەمیش: کاتێك ناپاکانە پەلاماری کاروانەکانی داو تالانیکردن، کاتێك پاشای بەیتولمەقدیسیش ئەم دیمەنەی بینی ترساو وایدەزانی کەسەلاحەدین لەویش دەدات، بەڵام سەلاحەدین دڵنیای کردو پێی وت: نەبووە بەنەریتو پاشا پاشا بکوژێت، بەڵام ئەمە سنوری خوی تێپەڕاندبوو بۆیە ئەوە روویدا[3].

٤- **هەڵوێستی سەلاحەدین بەرامبەر بەدیلەکان:** سەلاحەدین داوای داویەو ئەستباریەکانی کردو هێنانیانو داوای موسڵمان بوونی لێکردن ئەوەی موسڵمان بوو، هێشتیەوەو ئەوەی ئامادەنەبوو فەرمانی کوشتنیدا[4]،أبوشامەش هۆکاری کوشتنیان روندەکاتەوەو دەڵێت:من زەوی لەم دوو رەگەزە پیسە پاکدەکەمەوە، چونکە ئەوان کەس ناهێڵنەوەو دەست لەدژایەتی هەڵناگرنو خزمەتی کەس ناکەن لەدیلیداو پیسترینی بێ باوەڕانن[5]، زانراویشە کە ئەمدوو دەستەیە لەو بنەمایانە پاشەگەزبوونەوە کەژیانیان بۆ تەرخانکردبوو و جلو بەرگی ئاینی رەشیان لابردو پۆشاکی سەربازی سپیو هێمای سوری خاچپەرستیان پۆشیو چوونە ریزی جەنگاوەرانەوەو هەریەکەیان سێ ئەسپیان هەبوو لەگەڵ خزمەتگوزارێکدا کەهەمیشە بەشوێنیانەوە بوو. هەروەها چەندین سەرکردەیان تیدا هەڵکەوت کەهەڵگری پلەو نازناوی سەربازی بوونو سیاسەتی ناپاکیو لێدانی موسڵمانەکانیان دادەڕشت، ئامانجی سەرەکی ئەم دوو کۆمەڵەش لێدانی ئیسلامو لەکەدار کردنی پیرۆزیەکانی بوو بەهەر شێوەو نرخێك

---

[1] مفرج الكروب (٢/١٩٥).

[2] النوادر السلطانية، ل: ٧٨– ٧٩.

[3] النوادر السلطانية، ل: ٧٩، مفرج الكروب (٢/١٩٥).

[4] مفرج الكروب (٢/١٩٦)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٩٠.

[5] كتاب الروضتين (٢/٧٩).

بێت[1] ژمارەی ئیسبتاریەو داویەش نزیکەی سێ سەدو شەست کەسێك بوو، گومانیش لەوەدانییە کەڕۆڵی خراپیان لەجەنگدا هۆکاری سەرەکی کوشتنیان بوو، چونکە ناسراو بوون بەڕێز نەگرتنی ڕێکەوتنەکانو ناپاکی نواندن، هەروەك دڵنیاش بوو لەوەی کە ئەگەر ئازادبکرێن ئەوە دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ کوشتار بەشێوەیەکی دڕندانە تر، دەبێت لەیادیشمان نەچێت کەهەندێکیان بەشداربوون لەهەڵمەتی ئەرناطدا بۆ سەر مەککەو مەدینە، لەبەر ئەم هۆیانە سەلاحەدین دوودڵی نەنواند لەکوشتنی ئەو دیلە خاچپەرستانەدا، بەهۆی ئەمەشەوە لەلایەن کۆمەڵێك لەمێژوونوسە ڕۆژئاواییە هاوچەرخەکانەوە لەوانەی کە لەقەسابخانەکانی خاچپەرستانیان لەبیریان چۆتەوە یاخود لبیری خۆیان بردۆتەوە کە تیایدا بەدەیان هەزار موسڵمانیان لەناوبردوە، ئەمەش شتێکی نوێ نییە بۆ ئەقڵییەتی ڕۆژئاوایی کەهەندێ جار بەدوو پێوەر پێوانە دەکاتو شتانێك بۆ خۆی بەڕەوا دەبینێت کەبۆ خەڵك بەناڕەوای دەزانێت، بەڵام دەبێت ئەوەمان لەیادبێت کە ئەو سیاسەتە لەلایەن سەلاحەدینەوە حاڵەتێکی تایبەتو دەرچون بووە لەسیاسەتێکی گشتی لێبوردەو بەخشندانە بەرامبەر بەدوژمنەکانی[2]. سەبارەت بەدیلەکانی تر ئەوە سەلاحەدین فەرمانیدا کەببرێن بۆ دیمەشقو لەوێ بەنرخێکی کەم فرۆشران[3]. قاضی کوڕی ابی عصرونیش هاتە دیمەشقەوەو خاچی گەورە صلبوتی بەدەستیەوە شۆڕکردبویەوەو سوڵتانیش گەڕایەوە بۆ طبریە[4]،ڕیمۆندی سێیەمی فەرمانڕەوای طرابلوسیش کاتێ ڕزگاری بوو لەجەنگەکە گەشتە صورو لەوێشەوە چووە طرابلوسو چەند ڕۆژێکی کەم مایەوە پاشان لەغەمو داخی ئەوەی کەبەسەر خاچپەرستەکانو ئاینی گاوردا هات گیانی لەدەست دا[5].

## سێیەم: هۆکارەکانی سەرکەوتن لەجەنگی حطین:

١- **خۆئامادەکردن و گرتنەبەری سوننەتی دەستگرتن بەهۆکارەکانەوە:** سەلاحەدین (ڕەحمەتی خوای لێبێت) توانی ئومەت یەکبخاتو لەسەر قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و

---

[1] التأريخ الحزب المصرى، حسان سعداوى، ل: ١٨٦.

[2] الحروب الصليبية العلاقة بين الشرق والغرب، ل: ٢١٩.

[3] كتاب الروضتين (٢/٨٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٧٩٠.

[4] مرآة الزمان، له: صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٩٠.

[5] الكامل فى التأريخ(٣/٥٣-٥٥)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٩١.

جیهادکردن لەپێناو خودادا کۆبکاتەوە لەپێناو رزگارکردنی ولاتانی ئیسلامیدا. ئەوەبوو ولاتی شامو میسرو حیجازو یەمەنو عێراق کەوتە ژێر دەسەلاتو حوکمرانی سەلاحەدینو بۆ ئەم کارەش زانایانو شەرعناسانو سوپاو هەزاران تێکۆشەری کۆکردەوە کەزانایان لەپێشەوەیاندا بوون بۆ هاندانیان بۆ جەنگکردنو توانی سوپایەکی بەهێزی وشکانی کەشتیگەلێکی دەریایی بەهێزی پێکەوەبنێتو کەپارەو پولێکی زۆری تیادا سەرف کردبوو[1].

ئیبن شەداددەلێت: سولتان پێی وابوو کەسوپاسگوزاری نیعمەتی پەروەردگاری بەسەریەوە لەمولکو دەسەلات پێدانو گوێرایەلی خەلکی بۆیو جیهادکردن لەگەلیدا تەنها بەجیهادکردن بەرێخستنی سەربازەکانو کۆکردنەوەیان دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەعشترادا کۆیکردنەوە لە٢٤ی رەبیعی دووەمی سالی ٥٨٣دا بەرەو ولاتی دوژمن پێشرەوی پێکردن لەنیوەڕۆی رۆژی هەینیدا.... هەمیشەش لەرۆژی هەینیدا بەرێدەکەوت بۆ جەنگ، بەتایبەت لەکاتی نوێژی هەینیدا بۆ بەهرەمەند بوون لەنزای وتاربێژەکان لەسەر مینبەر، کە رەنگە وەلامدانەوەی نزیکتر بێت[2]، هەروەها سەلاحەدین بەباشی سەربازەکانی ئامادەدەکردو تیر هاوێژەکانی دیاری دەکردو تیری پێویستی پێدەدان، ژمارەی ئەو تیرانەش کە بەسەریاندا دابەشی کرد گەیشتە چوار سەد وشترو باری حەفتا وشتریشی لەگۆرەپانی جەنگدا ئامادەکرد بۆ دانانی وەك یەدەك بۆ سودمەند بوونی جەنگاوەرەکان لێی لەپێناو بەردەوامبوونی جەنگدا هەتاکو سەرکەوتن بەپشتیوانی پەروەردگار بەدەست دێت، هەروەها سەلاحەدین بەسوپایەکی بەهێزو ئەزموونی جەنگی کەم وێنەوە چووە ناو جەنگەوە، ئەمە سەرباری هەلبژاردنو دیاریکردنی گۆرەپانی جەنگ لەلایەن خۆیەوە وێرای دیاریکردنی کاتی رووبەڕووبوونەوە، ئەوەبو لەطبریەدا مایەوەو توانی ببێتە بەر بەست لەبەردەم دوژمندا سەرچاوەی ئاودا، هەروەك لەمانگی یۆلیۆ- تەممۆزدا جیهادی راگەیاند کە یەکێکە لەگەرمترین مانگەکانی سالو کەم ئاویش تیایدا زۆری بۆ دوژمن هێنابوو یەکێك بوو لەکاریگەرترین چەکەکانی سەلاحەدین[3]، لەراستیدا سەلاحەدین ئەم ئایەتەی جێبەجێ کرد کە دەفەرمووێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ (الأنفال:٦٠)، واتە: هەرچی لەتوانانتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەرو ئامادەی بکەن لەئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپو هۆکانی تری گواستنەوە

---

[1] صلاح الدين الأيوبي، علوان، ل: ١٢١.

[2] النوادر السلطانية، والمحاسن اليوسفية، ل: ٧٥

[3] صلاح الدين والصليبيون، ل: ١٩١.

کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن. (تەفسیری ئاسان ل: ١٨٤).

ئەوە بوو سوپای ئیسلامی کۆکردەوەو سوپای خاچپەرستی کێش کردو شوێنی گونجاوی هەڵبژارد بۆ جەنگەکە.

٢- **سوننەتی پلەبەندیو یەکێتی ئوممەت:** ئەمیرە سلجوقیەکانی کاری زۆریان کرد لەپێناو تێکشاکاندنی خاچپەرستەکان، ئەبوو عماد الدین زەنکی دەسکەوتێکی مەزنی بەدەست هێنا بەدانانی پرۆژەیەکی پێشەنگانە کەرەنگە زۆربەی خەڵك لەو کاتەدا بەزەحمەتیان زانیبێت، کەئەویش پرۆژەی یەکبوونو رزگارکردن بوو، کەنورەدینی کوڕی بەشی یەکەمی بەدەستهێناو سەلاحەدینیش توانی بەشی دووەمو هەرە گرنگی بەدەست بێنێت، هەربۆیە سەرکەوتنی سەلاحەدینی لەحطیندا تەواوکەری پرۆژەکەی عمادەدین بوو بۆ یەکێتیو سەربەخۆی، جا ئەگەر نورەدین شوێن پێی باوکی هەڵنەگرتایە بۆ یەکخستنی شامو دواتریش یەککگرتنی لەگەڵ میسردا ئەوا ئەم سەرکەوتنە بەدینەدەهات[1]، کە بەهۆی ئەو هەوڵە یەکێتی خوازانەوە بوو کە لەسەر بیروباوەڕی راستو دروستی ئیسلام بنیاتنرابوو کەجیاوازی لەنێوان رەگەزێكو رەگەزێکی تردا ناکاتو هەموویان بەبرای بیرو باوەڕ دەزانێت، شاعیر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ولست أدرى سوى الأسلام لى وطناً | الشام فية ووادى النيل سيان |
| وأينما ذكر أسم الله فى بلدٍ | عددتُ أرجاءه من لبّ أوطانى[2] |

دیارە ئەو هۆکارانەی کەیارمەتی یەکبونیاندا لەسەردەمی سەلاحەدیندا کارلێکیان لەگەڵ رۆژگارو کاتدا کردو بەپێی سوننەتی پلەبەندیو لەجەنگی حطینیشدا بەرهەمی خۆی دابەدەستەوە کە بەئازادکردنی قودس کۆتایی هات، موسڵمانانیش لەبرایەتیو سۆزو خۆشەویستیاندا وەك یەك جەستەیان لێهات کەکاتێك ئەندامێکی ئازاری پێدەگات هەموو جەستەی شەونخونی بۆ دەکێشێتو تا دایدەگرێت[3] سەرباری ئەو هەوڵە زۆرانەش کەداگیرکەران خستیانە گەر بۆ بەشبەشکردنی جیهانی ئیسلامی هەرچەندە توانیان هەندێ زەوی موسڵمانان بەش بکەن، بەڵام نەیانتوانی دڵیان لەیەك دابڕنو موسڵمانان هێشتا برا موسڵمانەکەی خۆش دەویستو بەزمانی حاڵ[4] دەیوت:

---

[1] العلاقات الدولية فى عصر الحروب الصلبية (٢/٣٧٥).

[2] الوحدة الأسلامية بين الأمس واليوم، ابراهيم النعمة، ل: ٩.

[3] البخارى، كتاب: الأدب، باب: رحمة الناس والبهائم.

[4] الوحدة الأسلامية بين الأمس واليوم، ل: ٢٣.

| | |
|---|---|
| لو اشتكى مسلم فى الصين أرّقني | أو اشتكى مسام فى الهند أبكاني |
| فمصر ريحانتي والشام نرجستي | وفى الجزيرة تاريخي وعنواني |
| وفى العراق أكف المجد ترفعني | عن كل باغ ومأفون وخوّان |
| ويسكن المسجد الأقصى وقبته | فى القلب لاشك أرعاه ويرعانى |
| أرى بخارى بلادى وهى نائية | واستريح الى ذكرى خراسانِ |
| شريعة الله لمت شملنا وبنت | لنا مقاماً باحسانٍ وايمانِ[1] |

٣- **دوربینی و بەئەزمونی سەلاحەدین لەرووی سیاسیەوە:** تێبینی ئەوە دەکرێت کەسەلاحەدین دەرکی بەگرنگی کاری دوولایەنە دەکرد بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی و جیهادکردن دژ بەخاچپەرستەکان، چونکە پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان ئەم دوو کارەدا هەیە، شایانی باسە سالّی ١١٨٦ز/ ٥٨٢ ك ڕێکەوتنی عزالدین مەسعودی فەرمانڕەوای موسلّ و سەلاحەدینی بەخۆوە بینی بەمەرجێ موسلّ سەر بەسەلاحەدین بێت، بەم پێیەش توانی هەر چوار شارە ئیسلامیە سەرەکییەکە یەکبخات کەئەوانیش قاهیرەو دیمەشق و حەلەب و موسلّ بوون هەریەکەشیان ڕۆلّی شیاوی خۆیان هەبوو لەپرۆژەی جیهاددا[2]، هەروەها خاچپەرستەکانیش بەسەرۆکایەتی ریمۆندی سێیەمی کۆنتی طرابلوس ئاگربەستێکیان لەسالّی ١١٨٥ز/٥٨١ك دا لەگەلّ سەلاحەدیندا مۆرکرد بۆ ماوەی چوار سالّ، هەریەکەشیان پێویستی بەم ئاگربەستە هەبوو بۆ ڕێکخستنەوەی هێزەکانی و وەرگرتنی پشوویەك، ئەوەش کە بەئەزمونی و لێهاتوویی سیاسی سەلاحەدین دووپاتدەکاتەوە ئەو ڕێکەوتنامانەبوو کەلەگەلّ هەندێ لایەنی خاچپەرستدا مۆری دەکرد لەپێناو پاراستنی هێزەکانی و بەفیڕۆنەدانی تواناکانیان لەکردەی جەنگی گەورەو بەردەوامدا دژ بەخاچپەرستەکان، هەربۆیە لەو چەند سالّەدا خۆی لەرووبەڕووبونەوەی یەکلاکەرەوە دەپاراست و پەلەی نەدەکرد، بەلّکو ئاشتی کاتی پێ باش بوو لەگەلّیاندا، گرنگیشە کەبزانین ئەو ڕێکەوتننامانەی کاتێك کەپێشێل دەکرێن بوار دەرەخسێنن بۆ بەرپاکردنی جەنگێکی یەکلاکەرەوە، کەجەنگی حطینیش بەم شێوەبوو، یەکەم هەلّگیرسێنەری پێکدادان لەنێوان سەلاحەدین و خاچپەرستەکاندا لەلایەن سوارەی خاچپەرست رینۆری شاتیۆن یان ئەرناطەوە کەهەلّەشەیی بووە هۆی تۆمارکردنی ناوی لەمێژوودا، ئەوەبوو ئەرناط ئاگربەستەکەی پێشێلکردو سەلاحەدینیش ئەمەی بەراگەیاندنی

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤.

[2] الحروب الصلبية، العلاقات بي الشرق والغرب، ل: ٢١٥.

جـەنگ لـەدژی لەقەڵامداو وەڵامـی ئەیوبییـەکانیش تونـدو یەکلاکـەرەوەبوو وەك لەجـەنگی حطـین‌دا  روویـدا لەسـاڵی ٥٨٣ك/ ١١٨٧زدا[1]، هـەروەها دوربینـی سـەڵاحەدین‌و لێهـاتوویی سیاسی لەوەدا بوو کەپێش، چونە ناو جەنگی حطین ئەم کارانەی ئەنجامدا:

أ- **ڕێکخستنی دەوڵەت‌و ناوچەکان بۆ ئەمیرەکان:** سەلاحەدین زۆر سەرکەوتوو بوو لـەرازیکردنی بەرامبـەرەکان‌و پاراسـتنی هاوسـەنگی لـەپێناو ڕازیکردنـی هەموانـدا، خـەڵکانی تریـشی بەشـداردەکرد لـەکاروبارە ئیدارییەکانـداو خـۆی بـەکارە سـەربازییەکانەوە سـەرقاڵ دەبـوو، هـەمو کارێکیـشی بەپـسپۆری خـۆی دەسـپارد، هـەروەها مـەرجی بـۆ جێنـشین‌و بریکـارو فەرمانڕەوای هەرێمەکان ئەوە بوو کەلەگەڵ هاوڵاتیاندا دادگـەربن‌و لەخەرجییـەکانی جیهانـدا بەشداربن‌و سوپاکانیان لەئامادەباشیدا بهێڵنەوە بۆ جەنگ‌و کوشتار، زۆر لەخـەمی دڵسۆزی شوێنکەوتوانیدا بوو جارێکیان بەقاضی ابن شدادی وت:  ئەگەر من بمـرم ئـەم سـەربازانەتان چیتر بۆ کۆنابێتەوە[2]، هەروەها نامەیـەکی لـە الرقـەدا نوسی کەتیایـدا هـاتبوو: بەدبـەختترین فەرمانڕەوا ئەو کەسەیە کەورگی خۆی قەڵەو خەڵکی لاوازبکات‌و دوورترینیشیان لەراستیەوە ئەو کەسەیە کەناڕەواو بەتاڵ وەك هەق‌و ڕاستی پیشانی خەڵکی بدات، هەرکەسێکیش لەبـەر خاتر خوا واز لەخەڵکی بهێنێت خوای گەورە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، هەرکەسێکیش قەرزێك بـدات بـەخوا خـوای گـەورە قەرزەکـەی دەداتـەوە[3]، ڕێکخـستنەوەی دەوڵـەت‌و ناوچـەکانی ئەمیرەکان پاش کرداری یەکخستن روویدا کەزیاتر لەدەیەیەکی خایاند.

ب- **ڕێکخستنی حەزەکانی بنەماڵەکەی‌و ڕازیکردنیان:** بنەماڵەی ئەیوبی پـاڵپـشت‌و سـەرقاڵکەری یەکـەمی سـەڵاحەدین بـوو لەیـەك کاتـدا، تـەماعی تاکەکانیـشی لەگـەڵ چـەمکەکانی ئـەو سـەردەمەدا هـاوڕابوو، بـەڵام لەگـەڵ خواسـت‌و تێگەیـشتنی سـەڵاحەدیندا بـۆ دەوڵـەت نەدەگونجا، ئـەوان تـازەبوون لـەبواری حوکمڕانیـداو واتـێ دەگەشـتن کـەحوکمڕانی بریتییـە لەدەسـتگرتن بەسـەر زەوی‌و ملـی خەڵکیـدا نـەك بـەڕێوەبردنی کاروبـاری ژیانیـان بێـت‌و بەرپرسیارێتی بێت لەبەرامبەریاندا، ئەم تێگەیـشتنەش لـەنورەدین مـەحمودی مامۆستایەوە بۆی جێمابوو، بەڵام تێگەیشتنی بنەماڵەی هەڵقولاوی ئەو واقیعە بوو کەلەو سەردەمەدا بـاوو بوو، سەڵاحەدینیش بەدەست جیاوازی ئەم دووحاڵەتـەوە دەیناڵانـد، ئـەم جیاوازیەشـی بـەم شێوەیە دەربڕی کـاتێ بـەالملك العـادلی بـرای ووت کـاتێ داوای عەقـدی موڵکایـەتی حەلـەبی

[1] الحروب الصلبية، العلاقات بي الشرق والغرب، ل: ٢١٧.

[2] النواردر السلطانية، ل: ٢١٨.

[3] صلاح الدين الفارس المجاهد والملك الزاهد، ل: ٢٥٣.

لێدەکرد لەبەرامبەر ١٥٠ هەزار دیناردا کەسەلاحەدین بەقەرز لێی وەرگرتبوو: ئایا وادەزانیت ولات کڕینو فرۆشتنی پێوەدەکرێت؟ ئەی نازانی ولات مولکی ئەو خەلکانەیە کەتیایدا نیشتەجێن، ئێمە تەنها خەزنەداری موسلمانانو پارێزەرانی ئاینو مالیانین[1] دوای حکومەلێك گۆڕانکاریو ئالوگۆڕ لەسالی ٥٨٢دا بارودۆخەکە بەم شێوەیەی لێهات:

- تقی الدین عومەری برازای بۆ ناوچەی میا فارقینو دیار بەکر دەستنیشانکرا دوای ئەوەی لەمیسردا یاخی بوو، یان خەریك بوو یاخی ببێتو میسر بەجێبهێلێت، بەلام القاضی الفاضل قایلی کرد بەدورکەوتنەوە لەسەرکەشی.
- الظاهر غازی کوڕی سەلاحەدین گەڕێنرایەوە بۆ ویلایەتی حەلەب.
- شێرکۆی کوڕی ناصر الدین محمد لەحمصدا مایەوەو نەگۆڕا(!).

ج- **کاری دبلۆماسی دەرەکی:** بەهۆی ئەزموونی بیستو ئەوەندە سالەی لەبواری سیاسیداو ئەزموونی لەفەرمانڕەوایەتیدا سەلاحەدین دەیزانی کەبازنەی دەرەکی کاریگەری زۆری هەیە لەسەر رووداوەکان، ئەو هێزە مادیانەی کەپارچە پارچە ولاتەکەی لەسەر بنیات ناوە بەس نییە بۆ دلنیا بوون لەبەڕێوەچوونی رووداوەکان بەو شێوەیەی کە ئەو دەیەوێتو پێویستە چەندین دۆستایەتیو ئاگر بەستو پەیوەندی ئاشتەوایی ببەستێ لەگەل هێزە دەرەکیەکانو تانەنەت دوژمنانیشدا، ئەوەبوو لەسالی ٥٧٧کدا پەیوەندی باشی لەگەل قوستەنتینیەدا بەرپاکردو مزگەوتی ئیسلامی تیاداکرایەوەو نزیکەی دووسەد دیلی موسلمانیش ئازادکران، ئەمەش سەلاحەدینی لەبیزەنتیەکانو قوبرس دلنیا کردەوەو دوژمنایتی نێوان بیزەنتیەکانوخاچپەرستەکانی شامیشی زیاترکرد[2]، لەلایەکی تریشەوە کەشتیگەلە ئیتالیەکان(کەشتیگەلی جەنەواو پیزاو بوندوقیەو ئەمالقا) زۆر دەهاتنو لەکەنارەکانی شامدا دەردەکەوتنو ئیمتیازایاتیان لەهەموو بەندەرەکاندا هەبوو، جەنگاوەرو چەكو پارەی بەبەردەوامیان بۆ دەگواستنەوە، بەکەلوپەلی رۆژهەلاتو بەهاراتو بابەتە خۆراکیەکانەوە دەگەڕانەوە بۆ رۆژئاوا، رۆلی کاریگەریشیان لەکۆمەکیکردنی میرنشینەفرەنجەکانو بۆماوەی سەدەیەك لەرۆژهەلاتدا هەبوو، هۆکاری یەکەمی مانەوەی ئەو میرنشینانەو بەهێز یان بوون، لەسەر سەلاحەدینیش پێویست بوو کەرێگربێت لە بەهێز بوونیان بەپێی تواناو لەدەریاشدا رووبەڕوویان نەبێتەوە، چونکە کەشتیگەلی پێویستی نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو

---

[1] کتاب الروضتین (٢/٥٢).

[2] صلاح الدین الفارس المجاهد والملك الزاهد، ل: ٢٥٦.

کارە، هەربۆیە هەندێ بەندەری لەبەردەمیاندا والآدەکردو دەیزانی کەبەرژەوەندی ئەو بازرگانانە لەدینداریان بەهێزترەو ئەو بێبەشیەیان لەبیر دەباتەوە کە لەوانەیە پاپا توشیان بکات، هەروەها ئەوان رکابەر بوون لەناو خۆیانداو ئەویش سودی لەم رکابەریە وەرگرتو هەوڵێکی زۆری دا بۆ راکێشانی بازرگانییەکانیان بۆ بەندەرەکانی میسر ، ئەمەش دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی دەوڵەتو زیادبوونی داهاتەکانیو لەبەرژەوەندی بازرگانە میسریەکانیشدایە، هەروەك لەگەڵ بەیازینەو بەیاشینەکانی بازرگانی پیزادا رێکەوتنامەیەکی مۆرکرد لەسالی ٥٦٩ك دا، لەنامەیەکی سەلاحەدینیشدا بۆ خەلیفە لەبەغدا بوونی رێکەوتنێکی هاوشێوەوی ئەو رێکەوتننامەیە لەگەڵ جەنەواو بوندو قیەدا رادەگەیەنێت، ئەو بەندەی کە لەنامەکەدا هاتووە دەڵێت: هەر هەموویان ئێستا ئامێری جەنگی خۆی دەهێننە وڵاتمانو خۆی لێمان نزیکدەکاتەوە بەپێشکەشکردنی کارەباشو دەگمەنەکانیانو لەگەڵ هەموشیاندا بڕیاری بەردەوامبونو ئاشتەواییمان داوە[1].

د- **مەسەلەی جیهاد:** ئەو دۆزە سەرەکیەیە کەسەلاحەدینی سەرقاڵ کردبوو لەهەموو کاتەکانیدا لەراوولەناو خێزانەکەیدا، مانگەکانی کۆتایی ساڵ ٥٨٢ك یش مانگی نامەو نوسینەکانی بوو بۆ جێنشینو کاربەدەستانی لەمیسر وشامو جەزیرەو بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ، هەرگیز لەکێشەو ناکۆکیەکانی شانشینی بەیتولمەقدیسیشدا بێ ئاگانەبوو، مانای ئەو ئاگر بەستەشی دەزانی کە لەگەڵ ریمۆندی سێیەمی ئەمیر طرابلوسدا مۆریکردبوو کە لەپاشای قودس تورەبوو بوو، بەهەر حاڵ هەموو سەرەداوەکان لەدەست سەلاحەدیندا بوون لەسەرەتای ساڵی ٥٨٣دا، خوای گەورەش دەرفەتی قۆستنەوەی ئەو هەلەی بۆ رەخساند کاتێك ئەرناط بەڵێنەکەی هەڵوەشاندەوەو ئەویش بەپێی سوونەتی دەستگرتن بەهۆکارەکانو پشت بەستنی بەخوا لەگەڵیدا جوڵایەوە.

٤- **لەبری من مەجەنگێنو لەپێناو خودا بجەنگێن: دڵسۆزی مەزنی بۆ پەروەردگار( جل جلاله ):** کاتێك سەلاحەدین لەجەنگی حگیندا بیستی کە سوپای خاچپەرست پێشڕەوی کردووەو بەرێوەیە بۆی وتی:ئەوەی دەمانویست هات، ئەوە بوو کۆبوونەوەو هاوەڵانی رایان وابوو کەدەست بکەن بەپەلاماردانیان، بەڵام ئەو بەمە رازی نەبوو وتی: من رام وایە بەکۆمەڵێ موسڵمانەوە روبەڕوویان ببینەوە، چونکە مەسەلەکان بەدەست مرۆڤ نینو نازانین تەمەنمان چەندی ماوە، نابێت ئەم کۆمەڵە بڵاوەپێبکەین هەتاوەکو بەباشی لەپێناو خودادا

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهد والملك الزاهد، ل: ٢٥٧.

تێنەکۆشین، هەروەها وتی بەسەربازەکان: بۆ من مەجەنگێن، بەڵکو لەپێناو خوددا بجەنگێن[1] ئەمەش جێبەجێکردنێکی کردەیی فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ﴾ (النساء:٧٦)، واتە ئەوانەی ئیماندارن تەنها لەپێناو خوادا دەجەنگن، بەڵام بێباوەڕان لەپێناوی ستەمکارو زۆردارو (طاغوت)دا دەجەنگێن... تەفسیری ئاسان لا ٩٠.

بەم پێیەش سەلاحەدین هەموو جەنگەکانی بەپێی بنەمای جەنگکردن لەپێناو خودادا بوو[2]، هەربۆیە زۆر سوربوو لەسەر ئەوەی کەجەنگ لەپێناوی خوداو بەرزکردنەوە ئاڵای ئیسلامو داگرتنی ئاڵای بێباوەڕو هاوەڵگەڕانی خاچپەرست بێت، هەروەها سەلاحەدین راستگۆ بوو لەخواستی شەهیدیداو پێویستی دڵسۆز بوونیشی بیری فەرماندەو ئەمیرەکانی دەخستەوە، هەتاوەکو خوای گەورە پاداشتی موجاهیدەکانیان پێببەخشێتو بیانگەیەنێتە پلەو پایەی شەهیدەکان، خوای گەورەش لەبەر دڵسۆزی لەجەنگو فتوحەکانیدا سەرکەوتنی پێدەبەخشی، چۆن نا لەکاتێکدا کەوڵاتێکی ئازاد دەکرد سەرکەوتنی نەدەدایە پاڵ خۆی، بەڵکو دەیدایە پاڵ خوای گەورە، چونکە ئەو بەخشەری سەرکەوتنەکانەو سەرخەری باوەڕدارو یەکتاپەرستانو شکست پێهێنەری بێباوەڕو هاوەڵگەرانە، بۆیە هەر کەموسڵمانان سەربکەوتنایە بەسەرکردایەتی سەلاحەدین یەکسەر کرنوشی سوپاسگوزاری بۆپەروەردگار دەبردو سوپاسی دەکرد لەسەر سەرخستنی، هەر ئەمەش لەحطینو شوێنەکانی تردا رویداوە[3].

٥- **جێبەجێکردنی شەریعەتو بەرەکەتی لەدەوڵەتی سەلاحەدیندا:** مێژوو ئاگادارمان دەکاتەوە کەسەلاحەدین کاتێ بوو بەسوڵتان، تەوبەیەکی نەسوحی کرد لەهۆکارەکانی تاوانو رابواردنی لەسەرخۆی قەدەغەکردو دورکەوتەوەو پەشیمان بویەوە لەهەموو ئەو شتانەی کە لەگەنجیەتیدا کردبووی، تەوبەیەکی راستگۆیانەی کرد بۆ پەروەردگارو، بەخوا پەرستیو بەندایەتیەوە خەریك بوو، هەروەها سەربازەکانی لەسەر پەیوەندی باش بەپەروەردگارەوە پەروەردەکرد، لەگەڵ پاراستنی سنورەکانی شەرعو دورکەوتنەوە لەگوناهو سەرپێچیو رووکردنە تاعەتی پەروەردگار. هەروەك گرنگی بەشەریعەتو زانایانی دەداو حوکمە شەرعیەکانی جێبەجێدەکرد بەسەر ژێر دەستەکانیداو خەڵکانی گومڕاو خراپەکاری

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهد والملك العادل، ل: ٢٩٣، كتاب الروضتين (٢٧٩/٣).

[2] صلاح الدين الأيوبي، عبدالله علوان، ل: ١١٣.

[3] دروس وتأملات في الحروب الصليبية، ل: ١٧٩.

سەرکۆنەدەکرد، فەرمانی دەدا بەچاکەو نەهی دەکرد لەخراپەو خاکی بوو لەگەڵ خەڵکداو دۆستی پێش نەدەخستو ستەمی لەناحەز نەدەکردو، بەڵکو وازی لەو کەسە دەهێنا کەبەناڕەوا ناکۆکی لەگەڵدا دەکردوبەبەخشندەییو رەوشت جوانی دەیگرتە خۆی، فەرمانی بەخێزانو فەرماندەکانی دەدا کەپەیوەندیان لەگەڵ پەروەردگاردا پتەوبکەنو هەمیشەی مردنی یاد دەخستنەوەو داوای کارکردنو خوێندنەوەو لەبەرکردنی قورئانی لێدەکردنو وەسیەتی خواپەرستیو لەخواترسانو لەیادبوونی مەرگو دوای مەرگیشی بۆ کورەکانی دەکرد، وەرن باپێکەوە سەرنجی ئەم وەسیەتەی بۆ یەکێك لەمناڵەکانی الملك الظاهر، کەحەڤدە کوڕیان تیابوو بدەین کەدەڵێت: وەسیەتی لەخواترسانت بۆ دەکەم، چونکە ئەوە بناغەی هەموو خێرێکەو فەرمانت بەو شتانە پێدەکەم کەخوای گەورە فرمانی پێکردوویت، چونکە ئەوە هۆکاری رزگاربونتە، ئاگاداریشت دەکەمەوە لەخوێنو دەستخستنە ناویەوە، چونکە خوێن ناخەوێت، هەروەها وەسیەتت بۆدەکەم بەپاراستنی دڵی ژێردەستەکانتو رەچاوکردنی پیاوە گەورەکانی دەوڵەت، چونکە ئەوەی کەمن پێی گەیشتووم بەهۆی مودارات و دڵڕاگیرکردنی خەڵکەوەیە، رقیش لەکەس هەڵنەگریت، چونکە مردن کەس ناهێڵێتەوەو ئاگات لەوە بێت کەلەنێوان تۆوخەڵکدایە، چونکە خوا لێت خۆشنابێتو هەتاوەکو ئەوان لێت رازی نەبن، بەڵام ئەوەی لەنێوان تۆو پەروەردگاردایە ئەوە بەتەوبەکردن لێت خۆشدەبێت، چونکە پەروەردگار بەخشندەو میهرەبانە[1].

لەراستیدا حوکمکردن بەوەی کەخوا دایبەزاندووە ئاسەواری دنیاییو دوارۆژی هەیە، ئەو ئاسەوارە دنیایانەشی کەلەدەوڵەتی سەلاحەدیندا دەرکەوتن ئەمانەن:

أ- **جێنشینیو پایەداربوون:** وەك دەبینین نورەدینو دواتریش سەلاحەدین سوربوون لەسەر حێبەجێکردنی شەرعی خوا لەدەرونی خۆیانداو دڵسۆزانەو لەنهێنیو ئاشکرادا گەڕاونەتەوە بۆلای پەروەردگار، خوای گەورەش بەهێزیو جێنشینی لەزەویدا پێبەخشین، سەلاحەدینیش شەریعەتی خوای لەدەوڵەتەکەیدا جێبەجێکردو خوای گەورەش پایەداری کردو ئەمەش سوننەتێکی خوایی هەمیشەییە لەو تاکو گەلانەدا کە بەلێبڕانەوە، هەوڵ دەدەن بۆپایەدارکردنی شەرعی پەروەردگار، خوای گەورەش رووی وتاری دەکاتە ئەم ئومەتەو بەڵێنیان پێدەدات بەو بەڵێنانەی کە بەباوەڕدارانی پێش ئەوانی داوە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي

---

[1] دروس وتأملات فی الحروب الصلبیة، ل: ١٨٠.

الأَرْضِ﴾ (النور:٥٥)/ واتە لەبری کافران ﴿كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ (النور:٥٥)[1]. جا هەر کەخەڵکی باوەڕیان هێنالو بەپێی شەرع جوڵانەوەو گەڕانەوە بۆی، ئەوە بەرهەمی ئەوەیان پێدەگاتو شوێنەواری دەمێنێتەوە. ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ﴾ (النور:٥٥).

کەواتە گەڕانەوە بۆئاین جێنشینی لەزەویدا لێ دەکەوێتەوەو حوکمکردن بەشەرعیش دەمانگەیەنێت بەئاین، ئەمەش لەدەوڵەتی نورەدینو سەلاحەدیندا بەدیدەکەین.

ب- **ئاسایشو هێمنی:** دوای ئەوەی کەخوای گەورە ڕێزی نا لەسەلاحەدین بە لەناوبردنی دەوڵەتی فاگمیو ئازادکردنی میسرو لکاندنی حەلەبو دیمەشق پێوەیو ڕیکەوتن لەگەڵ موسڵدا لەبەرەیەکی ئیسلامی بەرفراواندا کەهێمنیو ئاسایشی لێکەوتەوەبۆ وڵاتەکەی لەوناوچانەدا کەشەرعی خوا حوکمی تیادا دەکرد، دەبینین کەدەوڵەتی سەلاحەدین دوای جێنشینی پایەداربوون، خوای گەورە هۆکارەکانی ئاسایشو هێمنی بۆ رەخساند، هەتاوەکو پێگەی خۆی بپارێزت ئەمەش سوننەتێکی خوای بەردەوامە ، خوای گەورە گرەنتی داوە بەخەڵکانی باوەڕدارو پەیڕەوکاری شەرعو حوکمەکانی بەدڵی خۆیان هێمنیان لەدەرونو ژیانیاندا بۆمسۆگەر بکات، چونکە هەموو کارەکان بەدەست پەروەردگارە، هەر خۆشی دڵەکان دەگۆڕێت خوای گەورەش هێمنی تەواو دەبەخشێ بەو کەسانەی کەدامەزراون لەسەر یەکتاپەرستیو لەهاوەڵگەری خۆیان بەدوردەگرن بەهەموو جۆرەکانیەوە: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ (الأنعام:٨٢).

دەرونیان پارێزراوە لەمەترسیو ئازارو بەدبەختی ئەگەر پاکبێتەوە لەهاوەڵپەیداکردن بۆ پەروەردگار، لەراستیدا حوکمکردن بەشەرعی پەروەردگار پشووە بۆ دەرونەکان، چونکە بەر دادگەریومیهری پەروەردگار دەکەوێت، خوای باڵادەستیش دوای ئەوەی کەبەڵێنی جێنشینی پاشان پایەداربوونی بەباوەڕداران داوە بێبەشینەکردون لەئاسایشودڵنیاییو دور لەترسو دڵەڕاوکێ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور:٥٥)، واتە بەڵێنی دڵنیا بەخشو تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لەئێوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لەئایندەیەکی نزیکدا جێنشینو پایەداریان دەکات لەوڵاتدا هەروەك چۆن ئیمانداراني پێش

---

[1] تفسير الجلالين، ل:٤٦٦.

ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دین‌و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنن کەخوا خۆی پێی رازییە هەروەها ترس‌و بیمیان بۆ دەگورێت بەئارامی‌و هێمنی ئەو کاتە ئیتلر بەتەواوی هەمن دەپەرستن‌و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ‌و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن)) تەفسیری ئاسان لا٣٥٧.

لەراستیدا ئەنجامدانی‌بەندایەتی بۆ پەروەردگارو دورکەوتنەوە لەهەموو جۆرەکانی هاوەڵگەری ئاسایش‌و هێمنی لەدڵەکاندا بەدیدێنێت لەسەر ئاستی تاک‌و کۆ، ئەمەش لەدەوڵەتی سەڵاحەدیندا بەدیهات کاتێك ملکەچی رێبازی پەروەرگاری جیهان بوون.

ج- **سەربەرزی‌و شکۆمەندی:** سەربەرزی‌و شکۆمەندی سەڵاحەدین‌و ئەیوبیەکان کە لەمێژوودا تۆمار کراوە دەگەڕێتەوە بۆ دەستگرتنیان بەقورئانەکەی پەروەردگارو سوننەتی پێغەمبەر (د.خ)لێبێت ، چونکە هەرکەس شەرەفمەند بێت بەخۆدا نەپاڵ قورئان‌و سوننەت ئەوە سەری نەتەوەکەی بەرزدەکاتەوەو ناوبانگی بەرزدەبێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَاباً فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾ (الانبياء:١٠).

ئیبن عەباس دەربارەی راڤەی ئەم ئایەتە دەڵێت: شەرەفمەندبونتانی تێدایە[1]، چونکە ئەم ئوممەتە شەرەفمەندی‌و سەروەری تەنها لەدەستگرتنیدایە بەحوکمەکانی ئیسلامەوە، وەك عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرمووێت: (ئێمە سەرشۆڕترین گەل بووین، بەڵام خوای گەورە بەهۆی ئیسلامەوە بەهێزی کردین، جا هەتاوەکو داوای سەربەرزی بکەین لەدەرەوەی شەرعی خوای گەورە هەرسەرشۆڕمان دەکات[2]. عومەر لەم وتەیەیدا پەیوەندی نێوان بارودۆخی ئومەت‌و سەرشۆڕی‌و سەربەرزی بۆ راڤە کردوین، کەپەیوەستە بەهەڵوێستی ئەو ئومەتە بەرامبەر بەشەرع، سەربەرزی لەحوکم پێکردنیدا، هەرگیز بەبێ ئاینی خوا سەربەرز نەبووەو سەرشۆڕیشی هەمیشە بەهۆی لادانەوە بووە لێی، وەك دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعاً﴾(فاطر:١٠)، واتە: هەر کەس سەربەرزی دەوێت با بەگوێڕایەڵی خوا خۆی سەربەرز بکات[3] هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ (المنافقون:٨).

لەراستیدا سەڵاحەدین‌و موسڵمانەکان لەحطین‌دا بەفەزڵی ئەو خوایە سەرکەوتن کەشەرعیان جێبەجێکرد.

---

[1] تفسیر ابن کثیر (٣/١٧٠).

[2] الحاكة لة المستدرك داهێناویەتی لەباسی الأیحاندا(١/٦٢).

[3] تفسیر ابن کثیر (٢/٥٢)

د- **سەرکەوتن و ئازادسازی:** سەلاحەدین و موسڵمانەکان سوربوون لەسەرخستنی ئاینی پەروەردگار بەهەموو توانایەکیانەوەو سوننەتی خوایان تیادا بەدیهاتبێت بۆ سەرخستنی بۆ ئەو بەندانەی کەبەرنامەکەی سەردەخەن، چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە بەهەر کەسێك کەدامەزراو بێت لەسەر شەرع کەسەری بخات بەسەر دوژمنەکانیدا: ﴿وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٤٠ الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ (الحج: ٤٠ -٤١)

٦- **دادپەروەری:** دادپەروەری بناغەی دەسەڵاتە هەربۆیە پەروەردگار فەرمانی کردووە بەپێغەمبەرەکەی کەهەستێت بەبەدیهێنانی ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ (الشورى:١٥)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ﴾ (النساء:١٣٥)، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری دادوەری بن و شایەتی بۆ خوا بدەن، با شایەتیەکەشتان زیانی بۆ خۆتان و ...تد،(تەفسیری ئاسان، ل: ١٠٠). هەروەها دەشفەرموێت: ﴿كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ﴾(المائدة:٨)، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زۆر بەچاکی هەستن بەئەنجامدانی شایەتی دادپەروەرانە لەبەر خوا.....( تەفسیری ئاسان، ل:١٠٨).

فەرموشیەتی: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾(النساء:٥٨)، واتە: هەرکاتێکیش دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن( تەفسیری ئاسان، ل:٨٧).

دادگەریش لەبەرامبەر ژێر دەستەکانداو گەیاندنی مافەکان بەدادگەری گەڕاندنەوەی ماف بۆ ستەملێکراو سەربەرزی و شکۆمەندی لەئومەتدا دروست دەکات و نەوەیەکی ئازاو ئومەتێکی خاوەن ئیرادەی ئازادبەرهەم دێنێت کەستەم قبوڵ ناکات، ژێردەستانێککەحوکمڕانیەکانیان خۆشدەوێت و ملکەچی دەبن، چونکە دادگەریان لەخۆیانداو لەدەرەوەی خۆیاندا بەرجەستەکردووە، چونکە دادگەریان لەخۆیانداو لەدەروەی خۆیاندا بەرجەستەکردووە، چونکە ستەم تاریکیە لەرۆژی دواییداو سەرەتایەکە بۆ روخانی دەوڵەت بۆیە خوای گەورە لەخۆی قەدەغەکردووەو لەنێوان خەڵکیشدا ڕێی پێنەداوە، وەك لەفەرموودە قودسیەکەدا هاتووە کەدەفەرموێت: ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسەر خۆم حەرامکردووەو لەنێوان ئێوەشدا بەحەرامم داناوە، وریابن ستەم لەیەکتر نەکەن[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ﴾ (الصافات:٢٢)، خوای گەورە فەرماندەدات بەفریشتەکان هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە خۆیان و هاوسەرانیان...( تەفسیری ئاسان، ل:٤٤٦). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾(النمل:٥٢)، واتە: ئەوەتا ماڵەکانیان

---

[1] مختصر صحیح للمنذری، ژمارە:١٨٢٨.

کاولو چۆڵە بەهۆی ئەو ستەمەی کەکردیان(تەفسیری ئاسان، ل: (٣٨١)، جێی خۆشیەتی کەبڵێین دەوڵەتی نوری لەسەردەمی نورەدین زەنکیو دەوڵەتی ئەیوبی لەسەردەمی سەلاحەدیندا، دادگەری تیادا بالادەست بوو، مافی خەڵکی پارێزرابوو، ئەوانیش چالاکانە دەستیاندایە جیهادو بەگری کردن لەدەوڵەتەکەیان[1]، قاضی ئیبن شەداد دەربارەی سەلاحەدین دەڵێت:بۆ چەسپاندنی دادگەری هەموو دوو شەممەو پێنجشەممەیەك دادەنیشت لەمەجلیسێکی گشتیو کراوەداو زانایانو دادوەرانو مامۆستایانی ئاینی ئامادەی دەبونو دەرگای والادەکرد بۆ کەسە خاوەن سکالاو داواکان تاوەکو بگەنە لای، بەبچوكو گەورەو پیرو بەساڵاچووەوە. ئەم کارەشی لەکاتی سەفەرو لەشاردا دەکردو هەمیشە ئامادەی گوێبیست بوونی چیرۆکەکانو دەستنیشان کردنی ستەم بوو تیایدا رۆژانەهەموو رووداوو چیرۆکەکانی کۆدەکردەوەو دەستی بەرووی کەسەوە نەدەنا کەکێشەی هەبوبێت یان هانای بۆ هێنابێت گوێبیستی بووەو ستەمی لەسەر هەلگرتووە[2]، بەم شێوەیە سەلاحەدین دادپەروەری بەرجەستەکرد لەدەوڵەتەکەیداو چەندین رووداووجێبەجێکردنی پراکتیکی بۆ بەجێهێشتوین لەگەڵ ئەمیرو هاولاتیاندا بۆ پاراستنی مافی تاکەکانو مافەکانی دەوڵەت کەهەمووی لەسەر بنەمای دادپەروەریو ماف بۆ گێڕانەوە بنیات نراونو، کەهەموویان ئەم بنەمایەمان بۆ دەچەسپێنن: دادگەری بناغەی دەسەلاتەو ستەمیش دەوڵەت لەناو دەبات[3]. هەروەك ئەم دادگەریە یەکێك بوو لەهۆکارەکانی سەرکەوتن لەحطیندا.

٧- **نەوەیەکی جەنگاوەر لە پێناوی خودادا:** نەوەی سەلاحەدین لەبۆشاییەوەو نەهاتبوو، بەڵکو لەئاکامی چەندین هەوڵی زانستیو پەروەردەییەوە بوو لەسەر رێبازی ئەهلی سوننەتو جوماعەت، ئەونەوەیەش کەخوای گەورەسەرکەوتنی خەلاتکرد لەحطیندا چەندین سفەتی تیادا بەرجەستە بوو بوو کەسیفەتی (طائفەی منصورە) کۆمەڵی سەرخراونو گرنگترینیان:

أ- **لەسەر هەقو راستین:** طائفەی منصورە لەهەموو موسڵمانانی تر زیاتر پابەندی هەقو راستین، باسکردنو سەرکەوتنیشیان بەهۆی دەستگرتنیانەوەیە بەراستی تێرو تەواوەوە کاتێك کەخەڵکانی تر پشتی تێدەکەن، لەو لایەنە دیارانەش کە لەو هەقو راستییەدا هەن کەطائفەی منصورە پێوەی بەندە:

- دامەزراوی لەبیرو باوەڕداو پابەندبوون بەوەی کەپێغەمبەرو هاوەڵان لەسەری بوونو خۆپاراستن لەبیدعەو بیدعەچیەکان، چونکە ئەوان هەڵگرانی سوننەتن، سەلاحەدینو ئەو

---

[1] دروس وتأملات فی الحروب الصلبیة، ل:٢٠٨.

[2] النوادر السلطانیة فی المحاسن الیوسفیة، ل: ١٣-١٤.

[3] دروس وتأملات فی الحروب الصلبیة، ل:٢١١.

موسڵمانانەش کە لەگەڵیدا بوون، ئەوان بوون کەدەوڵەتی فاطیمی شیعەی ئیسماعیلیان لەناو برد.

● دامەزراوی لەرێنمایی‌و هەڵسوکەوتدا کەبەڕێبازی پێغەمبەرەوە دیارەو لەهاوەڵانەوە بۆمانگوێزراوەتەوەو خۆپاراستن لەو شتانەی کەدەبنە هۆی تاوان کەوتنە گومان‌و ئارەزووی ناڕەوا.

● دامەزراوی‌و پابەندبوون بەجیهادو تێکۆشانەوە بەماڵ‌و بەگیان‌و فەرماندان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە، گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانیان.

● دامەزراوی‌و سوربوون لەسەر دەستەبەرکردنی هۆکارە مادی‌و مەعنەوییەکانی سەرکەوتن‌و کۆکردنەوەی ئەو تایبەتمەندیانەی کەسەرکەوتنی خوای بۆ موسڵمانان دەستەبەردەکەن، گومانیش لەوەدا نیە کەئەوان بەهۆی ئەو ڕێگە ڕاستەوە سەردەکەون کەگوتویانە لەگەڵ ئەو هەوڵ‌و تێکۆشانەی کە بۆ دەستخستنی هۆکارەکان دەیدەن، سەلاحەدین‌و سەرکردەکانی هاوڕێشی ئەم کارەیان ئەنجامداو هەوڵدانیش بۆ دەستخستنی هۆکارەکان بەشێکە لەدامەزراوی لەسەر ئاین، چونکە شەریعەت فەرمان دەدات بەگرتنەبەری هۆکارەکان‌و گرتنەبەری شێوازە مادییە گونجاوەکان، لەپیشەسازی‌و چەك‌و پلاندانان‌و کارگێڕی ..هتد، نابێت واگومان بەرین کەسەرکەوتن بێ ئەوانە بەدیدێت، چونکەبەدیهێنانی ئەمانە لەپێداویستیەکانی دامەزراویە لەسەر ئاینی پەروەردگار[1].

ب- **ئەم کۆمەڵە فەرمانەکانی خوا جێبەجێدەکەن:** ئەمەش تایبەتمەندییەکی زۆر دیارە لەوەسفەکەی پێغەمبەر (د.خ)دا بۆ ئەم کۆمەڵە، چونکە ئەوان کۆمەڵێکن کەهەڵدەستن بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا، ناونیشان (الطائفة المنصور)یە، سەلاحەدینیش بەوە ناسرابوو کەهەڵگری ئالای بانگەوازە بۆ لای خواوئاین‌وشەرع‌و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(د.خ)وهەستا بەبڵاوکردنەوەی سوننەت لەنێوان خەڵکیدا بەهەموو شێوازێکی توانراوو دروست، تواناکانی دەوڵەتیشی بۆ ئەم مەبەستە بۆ ڕدورخستنەوەی گومان لەڕێبازی ئەهلی سوننەت‌و وڵامدانەوەی نەیارەکانیان خستەگەڕ.

● هەروەها دەوڵەتی سەلاحەدین هەڵدەستا بەفەرمان دان بەچاکەو نەهی لەخراپە بەدەست‌و زمان‌و دڵی دژ بەهەر لادانێك بوو،لەهەر بوارێکدا بوبێت چ ڕامیاری یان کۆمەلایەتی یان ئابوری یان زانستی یان بیروباوەڕی.

---

[1] تبصير المؤمنين بفقه النصر والتمكين، ل: ٤٧٣.

ج- **ئەو کۆمەڵەیەهەڵدەستێت بەئەنجامدانی ئەرکی جیهادکردن لە پێناو خودادا :** طائفەی مەنصورە لەفەرمودەکانی پێغەمبەرەو شێوە باسکراون کە(یقاتلون علی الحق[1] او یقاتلون علی امراللە[2] واتە: لەپێناو راستیدا دەجەنگێن یان لەپێناو فەرمانەکانی پەروەردگاردا. سەلاحەدین‌و سوپاکەشی هەستان بەجیهادی شەرعی لەپێناو خواداو رووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی خوا لەبێ باوەڕان‌و خەڵکانی تر.

د- **کۆمەڵێکی ئارامگرن:** خوای گەورە طائفەی مەنسورەی بەئارامگری تایبەتمەند کردوەو تۆش بینیت‌و دواتریش ئەیبینیت کەچۆن سەلاحەدین‌و سەربازەکانی ئارامگریەکی جوانیان نواندو هێزە ستەمکارەکان نەیانتوانی لەرێبازو ئامانجی خۆیان لایان بدەن، بۆیە پێغەمبەر د.خ ئەوانەی وەسف کردوە بەوەی کە:گوێ نادەن بەوانەی کە بەدرۆیان دەخەنەوە یان جیاوازن لەگەڵیاندا[3]. ئەم دەستەواژەی پێغەمبەریش د.خ ئاماژە بەو مرۆڤە کارایانە دەکات کەئامانجەکانیان دیاری کردوەو رێگەیان گرتۆتەبەرو گوێ نادەن بەجیاوازی خەڵکی نەیارو کۆسپی مرۆڤە ترسنۆک‌و لاوازەکان‌و بەدرۆخستنەوەی دوژمنە داخ لەدڵەکان‌و بەئارامگری‌و دامەزراویەوەروبەڕوی کۆسپ‌و نەهامەتییەکان دەبنەوە[4]. ئەم وەسفانەی کەبۆ طائفەی مەنصورە لەفەرمودەکانداکراوە بەسەر نەوەی سەلاحەدین دا جێبەجێ دەبێت، سەلاحەدینش وەسیەتی بەسودی بۆ سەربازەکانی دەکردو رۆژێکیان وتی: بزانن کەئێوە ئەمڕۆ سەربازی ئیسلامن‌و خوێن‌و ماڵ‌و منالی موسڵمانان لەگەردنتانداییەو خوای گەورەش لەرۆژی دوایدا دەربارەیان لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکات، ئەم دوژمنەش جگە لەئێوە کەس نییە لەولاتی موسڵمانانندا روبەڕوی ببێتەوە، جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵبکەن(پەنا بەخوا) ولات دەپێچرێتەوەو بەندەکان تیادەچن‌و ژن‌و منداڵ‌و سەرو ماڵتان دەبرێت‌و لەمزگەوتدا خاچ دەپەرسترێ‌و قورئانی لێدوردەخرێتەوەو نوێژی تیادا ناکرێت، هەموو ئەو شتانەش لەگەردنی ئێوەدایە، چونکە ئێوەبوون کەبونەتە هۆی ئەوەو ماڵی موسڵمانانتان خواردوە هەتاوەکو بەرگریان لێبکەن، کەواتە موسڵمانان لەولاتەکانی تردا چاوەڕێی ئێوەن والسلام علیکم[5].

---

[1] أبو داود، کتاب الجهاد، باب: داودالجهد (٣/١١، ژمارە: ٢٤٨٤).

[2] مسلم، کتاب: الأمارة، باب قوله: لاتزال(٣١/١٥٢٤)،ژمارە:١٧٦.

[3] سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە، کتاب، الجهاد، ژمارە:٢٣٧٦، چەند رێگەیەکی تری بەهێز دەکات.

[4] صفة الغرباء، ل: ٢٠٥.

[5] البدایة والنهایة، لە: واقدساه وە(١/٣٧٣).

٨- **پشت بەستن بەزانایان و راوێژپێکردنیان لەجەنگ و بەڕێوەبردنی وڵاتدا:** سەلاحەدین هەمیشە لەگەڵ زانایاندا بوو، لەگەڵیاندا دادەنیشت و راوێژی پێدەکردن لەجەنگ و بەڕێوەبردنی وڵات داو گوێی بۆ ئامۆژگاریەکانیان دەگرت، دەبەست، ئەو زانایەش کەزیاتر لەگەڵیدا بوو لەکاتی سەفەرو لەشاردا بریتی بوو لەالقاضی الفاضل، سەرنجی قسەولێکدانەوەکانی بدە بۆ گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتن پاش کۆمەکی پەروەردگار، ئەڵێ: وڵاتەکان بەسەرباز رزگارنەدەکران، بەڵکو بەهۆی وتەکانی الفاضل وەبوو[1] قاضی فاضل رای بەهێزو قسەی راست و بڕیاری دانایانەی پێشکەش دەکردو لەراوجەنگ و پلان و سیاسەت و فەرمانڕەوایدا راستگۆ بوو لەگەڵیدا، ابن کثیر ئەڵێ: قاضی الفاضل لەمیصردا وڵاتی بەڕێوەدەبردو سوڵتان هەر پارەیەکی پێویست بوایە بۆی دەنارد،و کەشتیگەلیشی بنیات ناو نامەکانی سوڵتانیشی دەنوسی[2]، هەروەك سەلاحەدین لەلایەن زانایانەوە پشتیوانی تەواوی لێ دەکراو ئەویش راوێژی پێدەکردن و رای وەردەگرتن، دوای سەرکەوتنی مەزنیشی لەجەنگی حطین دا سەلاحەدین رای وابوو کەدرێژە بدات بەجیهاد دژ بەخاچپەرستەکان بۆ گەڕاندنەوەی شارەکانی شام بۆ ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان، کۆمەڵێکیش لەزانایان لەم ئازادسازیانەدا بەشداریان کردکە لەشوێنی خۆیدا باسیان دەکەین بەپشتیوانی پەروەردگار[3]، ئەوەبوو سەلاحەدین پشتی بەست بەزانایان بۆ ئامادەکردنی ئوممەت لەرووی جیهادیەوەو رونکردنەوەی مەبەستی ئیسلام لەجیهادو پێویستی پابەند بوون پێوەی و کارکردن بۆی، زاناکانیش رۆڵێکی سەرەکیان هەبوو لەبەرزکردنەوەی ورەی سوپا لەجەنگی حطین و جەنگەکانی تردا.

٩- **پەیوەندی باش لەگەڵ پەروەردگاردا:** سەلاحەدین خاوەنی پەرستش و نزای زۆر بووو ئومێدی بەهێزی بەپشتیوانی و سەرخستنی پەروەردگار هەبوو، فەرمانیشی بەخەڵك دەکرد بۆ کاری چاکەو دورکەوتنەوە لەخواپەوهانی دەدان بۆ تاعەت و خواپەرستی و خۆشی پێشەنگیان بوو لەو بوارەداو بواری بۆ رەخساندن بۆ پاککردنەوەی دەرونیان و خەریك بوون بەخوێندنەوەی قورئان و وردبوونەوە لێی و لەبەرکردنی، هەروەك زۆر بایەخی بەشەو نوێژ دەداو زۆر یادی پەروەردگاریشی دەکرد، سەربازو فەرماندەکانیشی بۆ هاندەدا، ئەوەبوو لەخزمەت زانایاندا

---

[1] شذرات الذهب(٤/٣٢٧).

[2] البداية والنهاية، دروس وتأملات فی الحروب الصلبية، ل: ١٩٨.

[3] دروس وتأملات فی الحروب الصلبية، ل: ١٤٣.

دادەنیشتو قورئانی بۆ دەخوێندنەوەو گوێی لەراڤەکردنی دەگرت، هەروەها لەگەڵ خەڵکی فەرموودە ناسدا دادەنیشتو لێیانەوە فێری تێگەیشتن لەفەرموودە دەبوو، ئەمە جگە لەئامادەبوونی لەمەجلیسی زانایاندا، هەروەها زانایانو مامۆستایانو راڤەکارانی قورئانی بانگ دەکرد هەتاوەکو سوپاکەی فێری قورئانو تێگەیشتن لەئاین بکەنو پەیوەندیان بەپەروەردگارەوە بەهێز بکەن، فەرمانیشی دەدا بەسەربازەکانی کەهەستن بۆ شەو نوێژویادی پەروەردگار زۆر بکەن، سەردانی خێوەتەکانی دەکردو ئەگەر خەڵکی ناو خێوەتێك بێ ئاگابونایە بەئاگای دەهێنانو باسی پێویستی یادی پەروەدگارو پەرستشو گوێڕایەڵیکردنی بۆ دەکردن، دیارە ئەم کارانەش گرنگترین هۆکارن بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمندا[1].

١٠- **خۆدانە دەست پەروەردگار پاش خۆ ئامادەکردن:** یەکێکی تر لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەوەبوو کەپاش دەستگرتن بەهۆکارەکانەوەو فەراهەم کردنیان هانای دەبرد بۆ پەروەردگارو داوای پشتیوانیو کۆمەکی لێدەکرد، هەمیشە دەست بەنزا بوو لەتەنگانەشدا هەمیشە پەنای بۆ خوا دەبردو زۆر بەکوڵو دڵسۆزانە دەپاڕایەوە، القاضی زاناو هاوڕێی سەفەرو جیهادی دەربارەی نزاو بارودۆخی لەو کاتانەدا دەڵێت: خێری دەکردو دەیشاردەوە، لەکاتی کڕنوش بردنیشدا رازو نیازی خۆی بۆ پەروەردگار دەردەبڕیو دەیوت: پەروەردگار، هۆکارە زەمینیەکانی من بەبنبەست گەشتوونو دەستەو سانن لەبەرامبەر سەرخستنی ئاینەکەتداو تەنها پەنا هێنان بۆ تۆو دەستگرتن بەئاینەکەتەو پشت بەستن بەفەزڵی تۆ ماوەتەوە، تۆم بەسەو تۆ باشترین پشتو پەنای، بینیم لەکڕنوشدا بووو فرمێسکەکانی بەریشیدا دەهاتنە خوارەوەو ئەم دەزانی چی دەوت[2]، پاشان خێرا پەروەردگار وەڵامی نزاکەی دەدایەوەو خاچپەرستەکانی توشی شڵەژانو شکست هێنان دەکرد، بەڵێ ئەمە بەرهەمی پشت بەستنی تەواوە بەپەروەردگارو نزاکردنە لەناخی دڵەوە بۆپەروەردگار کەخۆی دەفەرموێت(وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَـهُ مَخْرَجاً ٢ وَيَرْزُقْـهُ مِـنْ حَيْـثُ لا يَحْتَسِبُ) (الطلاق: ٢ — ٣)، واتە جا ئەوەی لەخوا بترسێتو پارێزکاربێت، ئەوە خوا دەروی لێدەکاتەوەو لەشوێنێکەوە رزو رۆزی پێدەبەخشێت کەحسابی بۆ نەکردبێتو خۆی پێی نازانێت. تەفسیری ئاسان ل:.٥٥٨.

---

[1] دروس وتأملات فی الحروب الصلبية، ل: ١٤٣.

[2] النوادر السلطانية، ل:١٢.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (الطلاق:٣)، واتە: جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یارمەتیدەری دەربێت چونکە بەراستی خواکارو فەرمانی خۆی بەئەنجام دەگەیەنێت بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی دیاریکراوی برپیارداوە. (تەفسیری ئاسان،ل: ٥٥٨) دەشفەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ (البقرة:١٨٦)، واتە ئەی محمد (ﷺ) لێبێت ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزڤیکم لێیانەوە، بەهاناو هاواری دوعا گوێیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن‌و باوە{ی دامەزراو بەمن بهێنن بۆ ئەوەی رێگای هۆشیاری‌و ئاگایی بگرنەبەر (تەفسیری ئاسان، ل:(٤٧٤).

١١- **سەرکەوتنی کارە هەواڵگرییەکانی سەلاحەدین:** سەلاحەدین توانی هەواڵگرەکان دزە پێبکاتە ریزی خاچپەرستەکانەوە، ئەوەبوو پێش جەنگی حطین سەلاحەدین توانی سیبلی هاوسەری بۆهیمۆندی سێیەمی فەرمانڕەوای ئەنطاکیە رابکمێشێت‌و پەیوەندی نهێنی لەگەڵ سەلاحەدیندا هەبێت‌و بەردەوام لەنەخشەو جموجۆڵی خاچپەرستەکان ئاگاداری دەکردەوە، ئەم کارەشی لەبەرەبەیانی رۆژی حطیندا ئەنجامدا، ابن الأثیری مێژوونوسیش ئەم"راستیە دوپاتدەکاتەوە، دەڵێت: شازادەی ئەنطاکیە پەیوەندی لەگەڵ سەلاحەدیندا هەبوو لەبارودۆخی ئەنطاکیە ئاگاداری دەکردەوە[1]، أبو شامەش دەڵێت: هاوسەری البرنسی خەڵکی ئەنطاکیە، کە بەخاتوو سیبیلا ناسرابوو لایەنگری سوڵتان بوو وەك چاوێك سودی لێوەردەگرت لەبەرامبەر دوژمندا، هەواڵ‌و ئامۆژگاری پێشکەش دەکردو لەنهێنیەکانیان ئاگاداری دەکردەوەو سوڵتانیش دیاری بەنرخی پێشکەش دەکردو رێزی زۆری لێدەنا[2]، یەکێك لەهۆکارەکانی سەرکەوتن لە حطینیشدا گرنگیدانی پێویست بوو بەم لایەنەو ئەمەش سەلاحەدینی لەدەستدرێژی کتوپڕ پاراست‌و صن تزرویش دەربارەی گرنگی ئەم کارە دەنوسێت: ئەگەر دوژمن بناسیت‌و خۆشت بناسیت، ئیتر هیچ پاساوێك نییە بۆ ترسان لەسەد جەنگ، بەڵام ئەگەر خۆتت ناسی‌و دوژمنت نەناسی ئەوە لەهەموو جەنگێکدا توشی

[1] دور المرأة فی الستخبارات الأسلامیة، ل:٦٧.

[2] حین وقائع وعبر، عبدالفتاح عاشور، ل:٤٥.

شکست دەبیت[1] بلیمەتی سەلاحەدین لەپێکهێنانی تۆڕێکی پەیوەندی هەواڵگیری تۆکمەدا بوو لەریزی خاچپەرستەکاندا بەجۆرێك کەهەواڵی جموجوڵەکانی خێرا پێدەگەشت[2].

١٢- **ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندی بەخاچپەرستەکانەوە هەبوو:** خاچپەرستەکان لەم جەنگەدا بەش بەش بوو بوون لەکاتێکدا کەقومصی فەرمانڕوای طرابلوس رووبەڕووبوونەوەی پێ باش بوو، ئەرناطی فەرمانڕەوای کرکی لێ راست بوویەوەو تۆمەتباری کرد بەترسنۆکیو بونی پەیوەندی لەگەڵ موسڵمانەکانداو پڕوپاگەندەکردن بۆهێزیانو نەرمی نواندن لەبەرامبەریاندا بەهۆی ئەوەی کەسەلاحەدینو موسڵمانەکان هاوسەرەکەیان لەقەڵای طبریەدا گەمارۆ دابوو، هەربۆیە بینیمان هەر کەهەلی بۆ هەڵکەوت بەسەربازەکانییەوە هەڵاتو لەدژوارترین کاتدا خاچپەرستەکانی بەجێهێشت هەروەك چۆن خێزانەکەی لەم بارودۆخە نالەبارەدا جێی هێشت.

- ئەوەبوو بەشێوەیەکی ساویلکانە کەوتنە ناو ەو داوەوە کەسەلاحەدین بۆی تەنیبون، پێشتریش قونصی طرابلوس هەستپێکردو ئاگاداریکردنەوە لێی.
- روخانی لایەنی مەعنەوەیو ورەیان لەسەرەتای جەنگەکەدا دەرەنجامی پەلامارە بەهێزو کتوپڕەکانی موسڵمانان، کەزۆر نەبەردانە هێرشیان دەبردو بەتەواوی ورەی خاچپەرستانیان رووخاند.
- خراپی بەدرەوشتی خاچپەرستەکانو بڵاوبوونەوەی خراپەکاری لەناویاندا، چونکە بەشێکی زۆریان بۆ تالانیو خوێنڕشتنو دزی هاتبوون، سەرکەوتنی ئەوانەش بەسەر باوەڕدارانی یەکتاپەرستدا دوورە، سەبارەت بەمەش گۆستاف لوبون لەکتێبی (حضارة العرب)دا دەڵێت: ئەوەی کەجێی تێڕامانە ئەوەیە کە ئەوسوپایە زۆر بێ رەوشت بوونو هیچ بەهایەکی رەوشتیان نەبوو، بەڵکو کۆمەڵە خەڵکێکی خراپەکارو نزمو بێ ڕەوشت بوون، ئەم جۆرە کەسانەش دوژمنو لەناوبەری شارستانین، چونکە جگە لەبێباوەڕو دزو زیناکەرو پیاو کوژو خیانەتکارو راهبی بێ رەوشت کەسی تریان تیادا نەبوو[3].

١٣- **رای ابی الحسن الندوی دەربارەی نهێنی سەرکەوتنی سەلاحەدین:** شێخی نەدەوی وتارێکی لە(رابطة العالم الأسلامی)دا پێشکەشکرد کەتیایدا هاتبوو:.... چارەسەری یەکەمی کێشەی

---

[1] الأستخبارات العسکرية فی الأسلام، ل: ٣١١.

[2] تأريخ الأيوبين، ل: ١٥٣.

[3] حضارة العرب: ٣٢٨.

فەلەستین ئەوەیە کەسەلاحەدینێك لەسەر شانۆی کێشەی فەلەستین‌و جیهادی ئیسلامیدا بۆجاری دووەم دەرکەوێت: الزرکلی دەڵێت:

هاتی صلاح الدين ثانية فينا وجددی حطين أو شبه حطّينا

.. نهێنی ئەو سەرکەوتنە مەزنەی سەلاحەدین چی بوو کەجیهانی هێنایە خرۆش‌و، ڕێڕەوی مێژووی گۆڕی؟ نهێنی تەنها ئەوەیە کە ئەو موسڵمان‌و باوەڕدارو موحەمەدی بوو جگە لەزمانی قورئان هیچی تری نەدەزانی، تەنها زمانی بیرو باوەڕی دەزانی، زمانی بەهەشتی دەزانی‌و موسڵمانانیش هەروابوون... موسڵمانانیش هەتاوەکو ئەمڕۆ هەچەندە ڕەوتی مادیی‌و پەروەردەی هاوچەرخ کاریگەری خۆیان هەبووە لەسەری، بەڵام هێشتا تەنها زمانی قورئان‌و دەزانن، بێگومان موسڵمانان لەڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای زەویدا، هەرچەندە زمانیان جیاواز بێت، هەرچەندە زیرەك‌و ناودارو لێهاتوو بن ئەمڕۆ تەنها زمانی محەمەد (د.خ) دەزانن کەباوەڕیان پێهێناوە وەك پێغەمبەرێکی نەمرو هەڵگری ئاڵای جیهادی پیرۆز، ئەوان تەنها زمانی قورئان دەزانن، برایان بەزمانی قورئان بیاندوێنن نەك بەزمانی سیاسەت، سۆزو باوەڕیان بۆ ووشەی جیهاد بجوڵێنن‌و تامەزرۆی شەهیدیان بۆ باس بکەن، ئەوان تا ئەمڕۆش باش ئەو زمانە دەزانن، تاقە نهێنی هەژمونی سەلاحەدین بەسەر دڵ‌و گیانەکاندا لەوەدابوو کە ئەم نهێنیەی دەزانی ، لەڕاستیدا موسڵمانان بۆ جیهاد نەبێت ناجوڵێن، بۆیە سەلاحەدین لەژێر سەرکردایەتیدا جۆرەها سەرکردەی کۆکردەوە وێڕای چەندین گەلی جیاجیا توانی جیهادی ئیسلامی یەکبخات‌و بەسەر ئەو هەمووە دابەشبوون‌و ناکۆکیەدا زاڵ بێت، بەڵام ئایا چۆن توانی ئەم جیهانە بەرفراوان‌و جۆراوجۆرە لەرووی مەزهەب‌و ڕۆشنبیری‌و کلتورەوە یەکبخات؟ چۆن توانی لەم کاتە ناسکەدا لەژێر ئاڵای ئیسلامدا یەکگرتن بەدیبێنێت؟ ئاڵای نەتەوەپەرستی عەرەبی بەرزنەکردەوە ڕێم پێبدەن هەتاوەکو بڵێم: من بەرەچەڵەك هندیم وکلتوریشم هندیە لەهیندا لەدایکبووم‌و گەورە بووم، بەڵام باوەڕم بە محەمەد (د.خ) بەقورئان هەیەو ملیونەها دڵ هەیە تامەزرۆو بەئاواتی ئێوەوەیەو ئامادەیە گیان‌و ژیان‌وتەندروستی لەپێناوتاندا بەخت بکات، قەسابخانەیەکی گەورە لەهیندا روویدا لەئەحمەد ئاباد لەم نزیکانەدا، هۆی چیبوو؟ چونکە کۆبونەوەیەکی ئیسلامی گەورە هەبوو بۆ پشتیوانی کردن لەمەسەلەی فەلەستین، ئەم قەسابخانەیەو ئەم جەنگە تائیفیە بۆیە روویدا، چونکە موسڵمانان لەدووری خاك‌و بەربەستە دەریایەکاندا وێڕای شارەزا نەبوون لەزمانی عەرەبی، ئەم کۆبوونەوە مێژوویە مەزنەیان ئەنجامدا بۆ داکۆکیکردن لەمەسەلەی فەلەستین، ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوەی کەدڵانێکی باوەڕدارو دڵسۆز هەن کەتەنها پەروەردگار رادەی دڵسۆزیان دەزانێت‌و زمانی سیاسەت‌و دبلۆماتی نازانن، بەڵکو زمانی باوەڕو سۆزداری بۆقورئان دەزانن، بەم پێیەش

ئێوە سامانێکتان هەیە کەئەمریکاو روسیا نیانە، کەئەویش سامانی باوەڕە،باوەڕی بەهێزو لەبن نەهاتوو... ئەم سامانە هەیە، بەڵام پێویستی بەجوڵاندن هەیە جوڵاندنێکی راستگۆو باوەڕدارانە[1].

**چوارەم: کاردانەوەکانی جەنگی حگین:**

١- **خۆشحاڵی القاچی الفاچل بەسەرکەوتن لەحگیندا:** القاضی الفاضل لەسەرکەوتنی حطیندا لەدیمەشق دابوو، کاتێك ئەم هەواڵەی پێگەیشت نامەیەکی نووسی بۆسوڵتان کەتیایدا هاتبوو: با گەورەمان خۆشحاڵبێت بەوەی کەپەروەردگار ئاینی راستی بەهۆی ئەوەوە پایەدارکرد، وەك دەڵێن: ئێستا بووی بەگەورەی منو گەورەی هەموو موسڵمانان ، خوای گەورەش دوو نیعمەتی دیارو نادیاری پێبەخشیویتو دوو موڵکی پێداویت: موڵکی دونیاو دوارۆژ، بەندە ئەم نامەیەی نوسیو هێشتا سەرمان لەکڕنوش بەرزنەکردۆتەوەو فرمێسکەکان وشك نەبونەتەوەو چەندە بەئاواتەوەبووم کەکڵێسەکان ببێتەوە بەمزگەوتو، ئەو شوێنەی کەتیایدا دەوترێت خوای گەورەی سێیەمینی سێ کەسەکەیە تیایدا بوترێت: خوای گەورەیەکە سوپاسگوزاری پەروەردگار جارێك لەزمانو جارێکی لەپێڵوی چاومان دەڕژێت....

تللك المكارم لأقعبانِ من لبَنِ      وذلك الفتح لأعمّان واليَمَنِ

وذلك السيف لاسيف ابن ذى يزنِ

زمانەکانیش دوای ئەم ئازادسازیە تەسبیحاتو ستایشی بێ کۆتاییان دەبێت[2].

٢- **نمونەیەك لەشعری عیمادی ئەصفەهانی دەربارەی حطین:**

يايوم حطين والأبطال عـــــابسة      وبالعجاجة وجه الشمس قد عَبسًا

رأيت فيـــــه عظيم الكُفر مُحتقراً      معُفرا خدُهُ والأنف قد تَعَسا[3]

ياطُهْرَ سَيْفٍ برى رأس البرنس فقد      أصاب أعظم من بالشِّركِ فد نُجسا

وغاص إذ طار ذاك الرأس فى دمه      كأنه ضفدع فى الماء قد غطس

عرّى ظُباه من الأغمـــــاد مهرَقَةً      دماً من الشّرك ردَّاها به وكسا

مَمْ سَيْفُه فى دمـــاء القوم منغمسُ من      كلّ من لم يزل فى الكُفْرِ مُنْغَمِسا

أفناهم قتلهم والأسرُ فانتكـــسوا      وبيتُ كفرهم من خبثهم كُنَسا[4]

٣- **هەروەهاشەهاب فتیان الشاغوری دەڵێت:**

---

[1] محاضرات فى الفكر والدعوة (٢/٢٢٨،٢٢).

[2] کتاب الروضتين(٣/٣٠٦).

[3] هەمان سەرچاوە، ل: (٣/٣٠٠،٣٠١).

[4] هەمان سەرچاوە، ل: (٣/٣٠١).

جاشت جيوش الشرك يوم لقيتهم     يتدامرون على متون الضُمَّرِ
أوردت أطراف الدّماح صُدُوَرهم     فوَلَغْن فى علق النَّجيع[1] الأحمر
فهناك لم يُرَ غيرُ نجم مُقْبلٍ     فى إثر عِفريت رحيم مدبر
فمن الذى من جيشهم لم يُحترم     ومن الذى من جمعهم لم يُؤسر
حتى لقد بِيْعَت عقائلُ أُرهقت     بالسَّبى بالثَّمن الأخس الأحقر
سقت المماليكُ الكرامُ ملوكهم     كأساًبه سقت اللّئيم الهنفرى
وَعَجَمت عُودَ صَليبهم فكسرته     وسواك ألفاه صَليب المَكْسَرِ
أغلى الأداهم[2] من أسرتَ وأُرخصت     بيض الصوارم من نِهاب العسكر
وجعلت شرق الأرض يحسد غربها     بك فهو داعٍ دعوة المستنصر
لايَعْدَمَنْك المسلمون فكم يدٍ     أوليتهم معروفها م يُنكر
أمَّنت سِرْبَهم وصُنتَ حريمهم     ودرأت عنهم قاصمات الأظهُرِ
مإن راك الله إلا آمراً     فيهم بمعروف ومُنكِرَ ومُنْكَرِ
متواضعاً لله جلَّ جلاله     وبك اضمحلَّت سطوة المتُكبر
لم يخل سمعا من هناءٍ منهنّىءٍ     للمسلمين ومن سماع مُبَشر
واستعظم الأخبار عنك معاشرُ     فاستصغروا واستعظموا بالمخبر
مضتِ الملوك ولم تنل عشرِ الذى     أوتيتَه من منجح أو مفخر[3]

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٣٠١).

[2] الأداهم جمع، مفردها: أدهم

[3] كتاب الروضتين(٣/٣٠٤).

**٤- هەروەها ئەبو حەسەن عەلی ئەلساعاتی لەئازادکردنی گبریەدا دەڵێت:**

شاعر دەڵێت:

جَلتَ عزماتك الفتح المُبينا فقد قرَّت المؤمنينا

رددت أخِيذَةَ الأسلام لما غدا صَرفُ القضاء بها ضَمِينا

وهان بك الصليب وكان قِدما يَعِزُّ على العوالى أن يهونا

يقاتل كلَّ ذى مُلكٍ رياءً وأنت تقاتل الأعداء دينا

غدَتْ فى وَجْنَةِ الأيام خالاً وفى جِيْدِ العُلا عِقداً ثميناً

فيا لله كم سرَّت قلوباً وبالله كم أبكت عيونا

وما طبريةُ إلا هَدِىُّ ترفع عن أكُفَ الأمسينا

حصانُ الذَّيْلِ لم تُقذَف بسوء وسل عنها اللَّيالَى والسَّنينا

فَضَضْت خِتامها قَسْراً ومن ذا فكان نِتاجها الحرب الزبُونا

منالُ بدَّ أهلَ الأرضِ طُرًّا سِواك ومَعِقلُ أعيا القرونا

فست حتى رأت كفؤاً وغاية كلَّ قاس أن يلينا

قضيت فريضة الأسلام منها وصدّت الأمانى والظُنونا

تَهُزُّ معاطف القدس ابتهاجاً وتُرضى عنك مكة والحَجُونا

فلو أن الجماد يطيق نُطقاً لنادتك ادخلوها آمنينا

جعلت صباح أهليها ظلاماً وأبدلت الزَّئير بها أنينا

تخال حُماةَ حَوْزَتِها نساءً بموضْون الحديدِ مقنَّعينا

لِبيْضك فى جَماجهم غِناءُ لذيذُ علمَّ الطَّير الحنْينا

تميلُ إلى المُثقّفةِ العَوَالى فهل أمست رماحاً أم غُضُونا

يكاد النَّقع يُذْهِلها فلولا بُروُق القاضبات لما هُدينا[1]

فكم حازت قُدودُ قَنَاك منها قُدوداً كالقنا لوناً ولينا

وغيداً كالجآذر آنساتٍ[2] كفيد نداك أبكاراً وعُونا

هەروەها دەڵێت:

فلا عَدِمَ الشامُ وساكنوه ظبىَ تَشْفي بها الداء الدَّفينا

---

[1] كتاب الروضتين(٣/٣٠٥).

[2] الجآذر: بیچووی مانگای کێوییە.

سُهاد جُفُنها في كلَّ فتْح | سُهاد يمنح الغُمض الجفونا
فألِم بالسَّواحِلِ فهي صور | إليك وألحق الهام المُتُنا
فقلب القدس مسرورُ ولولا | سُطاك لكان مكتئباً حزينا
أدَرْت على الفرنج وقد تلاقَتْ | جُموعُهم عليك رحىَ طحُونا
ففي بيسان ذاقوا منك بؤساً | وفي صفد أتوك مُصَفّدينا
لقد جاءتهم الأحداث جمعاً | كان صروفها كانت كمينا
وخانهم الزمان ولاَمَلامُ | فلست بمُبغض زمناً خَوُونا
لقد جرَّدت عزماً ناصرياً | له هَوَتِ الكواكبُ ساجدين
لقد أتبعت من طلب المعالى | وحاول أن يسوس المسلمينا[1]

٥- **خەوێكى سەیر:**

دایكی سوڵتان سەلاحەدین باسی ئەوە دەكات كە لەخەویدا سكپڕبووە بەسوڵتانەوەو پێیان وتووە: سكت شمشێرێكی لەشمشێرەكانی خوا تیادایە[2].

٦- **ئازادسازیەكانی كەنار پێش ئازادكردنی قودس:**

دوای ئەوەی كەخوای گەورە سەركەوتنی بەخشی بەسەلاحەدین لەجەنگی نەمری حطین، كە ئەمەش بەكلیلی ئازادسازیە ئیسلامیەكان لەناوچەكەدا دادەنرێت[3] سەلاحەین ویستی ئەو جیهادە مەزنەی بەئازادكردنی شاری قودسو دەرپەڕاندنی خاچپەرستەكان تیایدا كۆتایی پێبێنێت، بەلام راستەوخۆ بەرەو قودس نەڕۆشتن، بەڵكو رووكردنە كەنار دەریای پێباشتر بوو بۆ ئازادكردنی شارو حەساروقەلاكانی خاچپەرستان ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك:

أ- هەستانی بەهێرشی راستەوخۆ بۆسەرشاری قودس دەبێتە هۆی وروژاندنی هەموو بەصرە هێزە خاچپەرستەكان لەناوچەكەداو هەموان لەدژی كۆدەبنەوە، رەنگە ئەمەش ئازادكردنی ئەو وشارەدوابخات.

ب- ئازادكرنی ئەم شاری لەلایەن سەلاحەدینەوە لەوانەیە نیگەرانییەكی زۆر لای جیهانی رۆژ ئاوا دروست بكاتو بەهەموو هێزێكیانەوە دەكەونە خۆیان بۆ رووبەڕووبونەوەی.

---

[1] هەمان سەرچاوە(٣/٣٠٦).

[2] مفرج الكروب (٢/٨٨.)

[3] سیاسة صلاح الدین فی بلاد میسر، ل: ٣٠٥.

ج- هەروەها لەبەر ئاشنایەتی بەو تۆکمەیی‌وقایمکاریانەی کەخاچپەرستەکان لەناو شوراو لەدەرەوەی ئەو شارەدا کردبوویان.

د- بەرۆشتنی بەرەو شارەکانی کەنار دەریا ویستی خاچپەرستەکان لەبنکەی دەریاییەکانیان بێبەش بکات‌و کەدەیان بەستێتەوە بەجیهانی دەرەوە بەتایبەت بەرۆژئاوای ئەوروپاییو، لەناو وڵاتی شامدا گەمارۆیان بدات.

ه- ویستی پەیوەندی دەریایی خێرا لەنێوان بەندەرەکانی کەناری میسرو کەناری شام ئاسان بکات[١].

لەبەر ئەم هۆیانە سەڵاحەدین هەستا بەرێکەوتن بەرەو ئەو ناوچەو سەنگەرە خاچپەرستانەی کەکەوتونەتە کەنار دەریا لەچوارچێوەی نەخشەیەکدا بۆلاوازکردنی تواناکانیان‌و رێگرتن لەگەشتنی کۆمەکی بۆیان لەئەوروپاوە[٢]. ئەوەبوو لەرۆژی یەکشەممە ٢٥ی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٨٣ك/٥ی تەموزی ١١٨٧زدا سەڵاحەدین لەطبریە لای داو دەستی گرت بەسەر قەڵاکەیدا، تارۆژی سێشەممە تیایدا مایەوەو کاروبارەکانی رێکخست، پاشان صارم الدین قایماز النجمی تیادا دانا[٣]، لەرۆژی چوارشەممە ٨ی تەموزی ١١٨٧زدا سەڵاحەدین بەرەو عەککا بەرێکەوت[٤] هەر کەگەیشتە نزیکی خەڵکەکەی هاتنە دەرەوەو تکاو داواکاری پەنادانیان لێکرد، ئەویش پەنایدان‌و لەسەرو ماڵیان دڵنیای کردنەوەو، سەرپشکی کردن لەنێوان مانەوەو کۆچکردندا ئەوانیشی کۆچیان کردو سوپای ئەیوبی هاتە ناو شارەوە لەرۆژی هەینی مانگی جەمادی یەکەمی ٥٨٣ز[٥]داو دەستیان گرت بەسەر ئەو چەك‌و پارانەی کەتیایدا بوو و دیلە موسڵمانەکانیشیان تیادا ئازادکرد کەژمارەیان چوار هەزار دیل بوو، ئەم کارانەیان ئەنجامدا بەبێ ئەوەی هیچ زیانێك بگەیەنن بەخەڵکی ناوچەکە، یان بەبازرگانە بوندوقی‌و بیازنیەکان[٦]، ئەم سیاسەتی چاوپۆشی کردنەش کەسەڵاحەدین گرتیەبەر سودی زۆری هەبوو، چونکە بووە هۆکارێك بۆ ئاسانکردنی رزگارکردنی شارە کەنارییەکان بەبێ روودانی بەرگرییەکی زۆر، هەروەك ئەم سیاسەتەش رۆڵی هەبوو لەبەردەوامبوونی ژیانی ئابوری

---

[١] صلاح الدين وتحرير القدس، عليه ى المهتدى، ل: ١٢٤.

[٢] صلاح الدين وتحرير القدس، عليه ى المهتدى، ل: ١٢٤.

[٣] كتاب الروضتين(٢/٧٩)، مفرج الكروب (١٩٦/٢).

[٤] عەككا: شارێکی گەورەو فراوانەو بەندەرێکی باشی هەیە.

[٥] النواردر السلطانية، ل: ٧٩.

[٦] سياسة صلاح الدين، ل: ٢٩٧.

لەشارەکەدا دوای هەستکردن بازرگانە ڕۆژئاواییەکان بەدادگەری و لێبوردەیی سەلاحەدین[1]. ئەوە بوو سەلاحەدین بۆ ماوەیەك لەعەککادا مایەوە، کردی بەبنکەیەك بۆ دەرچوونی سوپاکەی بۆ ئازادکردنی سەربازگە نزیکەکان) وەك: ناصرەو قیساریەو حەیفاو صفوریەو شقیقو فولەو طور شوێنە نزیکەکانی تر[2]. توانی دەستیان بەسەردا بگرێت، پاشان دەستی گرت بەسەر شاری نابلسو خەڵکی شارەکەی لەسەر ماڵو موڵکیان هێشتەوە بەهۆی ئەوەی کە موسوڵمان بوونو پاش داگیرکردنی لەلایەن خاچپەرستەکانەوە تیایدا مابوونەوە[3]. هەروەها صیداو بەیروتو ناوچەی جبیلیش ئازادکران، بەڵام سەلاحەدین بڕیاریدا کەرزگارکردنی صور دوای رزگارکردنی بەیت المقدس بێت، هەر بۆیە نیازی بەرێکەوتنی بەرەو عەسقەلانی هەبوو چونکە ئازادکردنی ئاسانترە[4] و دەکەوێتە چوار ڕێیانێکەوە لەنێوان وڵاتی شامو میسردا[5]، لەرێی عەسقەلانیشدا دە ستی گرت بەسەر رەملەو قەڵای تبنینو بیت لحمو خەلیلداو عەسقەلانیش لەرەجەبی ساڵی ٥٨٣ك/ ئەیلولی ١١٨٧زدا خۆی دا بەدەستەوە[6]. هەروەها شارەکانی غەززەو داروم و ئەرسوفو نطرونو بیت جبریلی ئازادکرد، الملك العادلی براشی لەمیسرەوە هێرشی هێناو دەستی گرت بەسەریانادا، بەم شێوەیە هەموو شارو قەڵا ناوخۆییەکان دەستیان بەسەردا گیرا جگە لەکركو شوبك کەتوانیان خۆڕاگرن بەم پێیەش تەواوی ناوچەکانی کەنار دەریا کەوتە دەست سەلاحەدینەوە لەبەیروتەوە هەتاوەکو یافا جگە لەشاری صور کەمەرکیز کونراد دی مونتفراتی تیادابوو لەو کاتەدا، کەزۆر فێڵبازو بەهێزو پارەداربوو، دەستی دایە ئەنجامدانی قایمکاری لەشارەکەداو نوێکردنەوەی هەڵکەندنی خەندەقەکەی وەك خۆئامادەکردنێك، بۆ رووبەڕووبوونەوەی سەلاحەدین[7]، بەتایبەت کەسەرجەم ئەو هێزانەی کە لەشارەکانی کەنار دەریاوە دەرچووبوون روویان کردبوویە صور، دوای ئەوەی کەسەلاحەدین سەرپشکی کردن لەهەڵبژاردن لەنێوان بەیتولمەقدیسو صورداو زۆربەیان رویان کردە صور[8].

---

[1] صلاح الدين وتحرير القدس، ل: ١٢٥.

[2] مفرج الكروب(٢/٢٠٢).

[3] هەمان سەرچاوە (٢/٢٠٢،٢٠٣).

[4] النوادر السلطانية، ل: ٨٠، صلاح الدين وتحرير القدس، ل:١٢٦.

[5] صلاح الدين وتحرير القدس، ل:١٢٦.

[6] النوادر السلطانية، ل: ٨٠، صلاح الدين وتحرير القدس، ل:١٢٦.

[7] مفرج الكروب(٢/٢٠٨،٢٠٩).

[8] صلاح الدين وتحرير القدس.

**پێنجەم: دەرەنجامەکانی جەنگی حطین:**

جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو: جەنگی حطین بەوە وەسف دەکرێت کەجەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو، چونکە نەخشەی دابەشبوونی سیاسی لەناوچەکەدا گۆڕی‌و پاش ئەم جەنگەش ئەو سوڵتانە تێکۆشەرەش کەوتەڕێ بۆ ئازادکردنی شارەکانی کەناری شام‌و یەك لەدوای یەك لەبەر دەستیدا شکستیان دەهێنا جگە لەصور کەزۆر تۆکمە بوو، بەم شێوەیە گرفتی کەناری شام چارەسەرکرا کەماوەیەکی زۆر بوو موسڵمانەکانی تیادا وەدەرنرابوو، لەراستیشدا مرۆڤ بەسەرنجدانی دەقەکانی سەرچاوە مێژووەییەکانی ئەم سەردەمە سەرسام دەبێت لەبەرامبەر شەپۆلی شکست هێنانی شارە خاچپەرستەکاندا بەشێوەیەکی کەم وێنە کەرەنگدانەوەی ئەو هەژموونە سەربازیە یەکلایەنەبوو کەموسڵمانەکان بەدەستیان هێنابوو[1]، هەروەها ئەو قەڵا خاچپەرستانە تێکشکان کە بەبەردەوامی پەلاماری موسڵمانەکانیان دەداو[2]، هەندێ جار ژیانی لێکردبوونە دۆزەخ، لەو قەڵایانەش طبریەو صفدو هونین‌و تبنین‌و بغراس‌و دربساك‌و حجر شغلن والقصیرو قەڵاکانی تر، پاش ئەوەش موسڵمانەکان بیت المقدسیان ئازاد کرد کەپایتەختی قەوارەی خاچپەرست بوو[3].

١- **سەرەتای کۆتای هێنانی بەبوونی خاچپەرستی:** جەنگی حطین گەورەترین کارەسات بوو کە بەسەر خاچپەرستەکاندا هات، بەڵکو ئەم جەنگە مزگێنی سەرکەوتنی موسڵمانەکان بوو بۆ لەناوبردنی گەورەترین بزوتنەوەی داگیرکاری کەجیهان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەخۆیەوە بینی، هەروەك سنورێك بوو کەتیایدا هەڵکشانی خاچپەرستان بەرەو رۆژهەڵاتی ئیسلامی پاشەکشەی کردو سەرەتای کۆتایی هێنانبوو بەبوونی خاچپەرستەکان[4]، ئەم جەنگەش کۆتایی بەماوەی نۆ سەدە لەلاوازی‌و تێکچوون پەرتەوازەیی ناوچەی ئیسلامی هێنا، گرنگی یەکێتی نێوان وڵاتەکانی ئەم ناوچە جوگرافیەی باشوری رۆژئاوای ئاسیاو میسری دەرخست بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکان، لەراستیدا حطین سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ هاوسەنگی هێزەکان‌و سەلماندی کەسەرکەوتن بەسەر هێزی فەرەنجەکاندا شتێکی مەحاڵ نییە، ئەو لێکۆڵینەوە مێژوویە هاوچەرخانەش کەباسیان لەوردەکارییەکانی ئەم قۆناغەکردووە سەلماندویانە کەجەنگی حطین بەسەرکەوتنی سەلاحەدین کۆتایی پێهات، بەڵام ئەم جەنگە

---

[1] الحروب الصلبية، العلاقات بين الشرق والغرب، ل: ٢١٩.

[2] النوادر السلطانية، ل: ٨٩،٩٦.

[3] الحروب الصلبية، العلاقات بين الشرق والغرب، ل: ٢٢٠.

[4] تأريخ الأيوبين فى مصر،ل:٥٣.

نەیتوانی بەتەواوی فەرەنجەکان ریشەکێش بکات، چونکە لەرووی ستراتیژیەوە ئەمە جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو لونێوان دوو قۆناغدا، بەو مانایەی کەکۆتایی بەقۆناغی پاشەکشە هێناو بناغەی سەرکەوتن‌و پێشکەوتنی داناو ئەو رێگە دوورو زەحمەتەی بڕی کەهەڵبەزو دابەزو هێرشی هەڵگەڕاوەی بەخۆوەبینی هەتاوەکو سەنگەرەکانی فەرەنجەکانی لەق کردو شانشینەکەیانی هەڵوەشاندەوەو دەرییەڕاندن لەناوچەکە[1].

٢- **بەرزبوونەوەی پلەو پایەی سەلاحەدین:** الرافع (بەرزکەرەوە) یەکێکە لەناوەکانی پەروەردگار جەنگی حطینیش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کەخوای گەورە بەهۆیەوە سەلاحەدینی بەرزکردەوەو چووە ریزی گەورە خەباتگێڕو سەرکردەوفەرماندە موسڵمانەکانەوە، هەروەها متمانەی گێڕایەوە بۆ موسڵمانەکان‌و کەرامەتیشی پێبەخشینەوە دوای ئەوەی کە بەمردنی نورەدین مەحمود لەدەستیاندا[2].

ئەم جەنگەش دەنگدانەوەی باشی هەبوو لەریزی موسڵمانەکاندا بەگشتی‌و خەڵکی دیمەشق لەو رۆژگارەدا کەپایتەخت‌و بارەگای سەرەکی بوو، دادوەرو نوسەرەکانی تیابوو کە بەدرێژای جەنگەکە لەکڕنوشدا بوون بۆ پەروەردگارو نزای سەرکەوتنیان بۆ دەکرد، کاتێك زانیشیان سەرکەوتووە، بەگریان‌و فرمێسك خۆشیان دەردەبڕی‌و سوپاس‌وستایشی خوایان کرد[3].

٣- **جەنگی حگین کلیلی بەیتولەقدیس:** جەنگی حطین جەنگی رزگارکردنی فەلەستین بوو، چونکە رێخۆشکەر بوو بۆ سەرکەوتن‌و ئازادکردنی بەیتولمەقدیس، پاشماوەی فەلەستین‌و، ئیبن واصلیش وەسفی ئەم جەنگەمان بۆ دەکاو دەڵێت: جەنگی حطین کلیلی ئازادسازیەکانی سوپای ئیسلام بوو بەهۆیەوە توانرا بیت المقدس رزگاربکرێت[4]. هەروەك بازنەی پێگەیاندنی ئازادسازیەکانی نورەدین مەحمودو ركن الدين بيبرسى بند قارى بوو لەو کاتەوە کەپاشاکانی فەرەنج هاتنە ناوچەکانی کەنار دەریاوەو دەستیان گرت بەسەریدا، جەنگی هاوشێوەی حطین لەنێوان ئەوان‌و موسڵمانەکاندا رووی نەدابوو، دەسا رەحمەتی خوا لە الملك الناصرو رۆحی شادبێت، دیارە لەپاش هاوەڵان ئیسلام پیاوی وەك ئوو

[1] هەمان سەرچاوە ، ل: ١٥٣.

[2] تأريخ الأيوبين فى مصر،ل:١٥٤.

[3] مفرج الكروب(١٨٨/٢).

[4] ابن عمر بن عبدالعزيز رحمة الله.

نورەدینی بەخۆوە نەبینیوە[1]، چونکە ئەوان تێگەیشتنیان بۆ ئاین نوێکردەوەو بینای یەکتاپەرستیان بنیاتنایەوە دوای داڕوخانی، پاش ئەوانیش خوای گەورە پاڵپشتی ئیسلامی کرد بەپاشا مظفر الدين بيبرس، کەلەوان سەرسوڕهێنەرتر بوو، چونکە ئەو دوای دەستگرتنی تەتاردا هات بەسەر زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی ئیسلامیدا، لەکاتێکدا کەخەڵك نائومێد بوو بوون لەبوژانەوەو هەستانەوە بەڵام ئەو تەتارەکانی پەرتەوازە کردوو وڵاتانی ئیسلامی پاراستو زۆربەی قەڵاکانی کەنار دەریای لەفرەنجەکان سەندەوە[2].

٤- **گرنگی هۆشیاری جوگرافی:** ئەم جەنگە گرنگی هۆشیاری تەواوی بەپێویستی سود وەرگرتن لەپێگەو شوێنی جوگرافی رۆژهەڵاتی ئیسلامیو سودوەرگرتن لەتایبەتمەندییەکانی دەرخست هەتاوەکو ببێتە فاکتەرێکی کارا لەفاکتەرەکانی هێزی خودی زاتی، لەئامازەکانی ئەم جەنگەش دەرکەوتنی گرنگی میسر وەك بنکەیەکی مادیی مرۆیی کەزۆر پێویست بۆ بەستنەوەی جیهانی ئیسلامی بەرۆژهەڵاتی نزیکەوە، هەروەها گرنگی زەوی فەلەستینیش دەرکەوت پردێك یان گوزەرێك لەنێوان شامو میسردا[3].

٥- **سامو شکۆی سەلاحەدینو ئاوێتە بوونی، لەگەڵ ڕێزو سەرسامیدا:** ناوی سەلاحەدین پاش ئەو سەرکەوتنەی ترسێکی خستبووە دڵی خاچپەرستانەوە کەئاوێتە بوو بوو لەگەڵ ڕێزو سەرسامیدا، لەبەر ئەو پیاوەتیوجوامێریو ئازایەتیەی کە لەفتوحەکانیدا پێی ناسرابوو، هەروەك لێبوردەییو هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵ دیلەکانیدا کاریگەری زۆری هەبوو لەخۆ بەدەستەوەدانی زۆر شارو قەڵای خاچپەرستدا بەبێ بەرگری، لەراستیشدا سەلاحەدین میهرەبانیو جوامێریو ئازایەتیەکی زۆری نواند لەمامەڵەی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا، بەهۆی ئەم سیفەتانەشەوە سوپاکەی دانی بەخۆیدا دەگرت لەکاتی سەرکەوتنیداو کاری دڕنداو نامرۆڤانەی ئەنجامنەدەدا، کە لەو کاتەدا باوو بوو، دەربارەی پیاوەتی سەلاحەدین لەگەڵ هاوسەرو کچی خاچپەرستەکاندا[4] ارنول دەڵنوسێت: زۆر چاك بوو لەگەڵیاندا بەرادەیەك کەسوپاسی خوایان لەسەر دەکردو لەدەرەوەش زۆر باسی ئەوسۆزو ڕێزەیان دەکرد کەسەلاحەدین لێی نابوون، هەروەها ڕێزی زۆری نا لەأسکیفای هاوسەری ریمۆندی سێیەمو

---

[1] مفرج الكروب(٢/١٩٣)، مبالغة ابن عمر بن عبدالعزيز.

[2] تأريخ الأيوبين، ل: ١٥٤.

[3] تأريخ الأيوبين، ل: ١٥٤.

[4] تأريخ الأيوبين في مصر وبلاد الشام، ل:١٥٥ .

رێی پێدا هەتاوەکو بچێتە دەرەوە بۆقەڵای طبریە بەپارێزراوی، ئەویش بەماڵو پیاوو ژنانیانەوە بەرەو طرابلوس بەرێکەوت، بالبانی إبلین یش یەکێك بوو لەو ئەمیرانەی کەرزگاری بوو، ژنو منداڵەکانیشی لەبەیتولمقدیسدا بوون، سەلاحەدینیش مۆڵەتیدا هەتاوەکو ژنومنداڵەکانی دەربکاتو بەمەرجیشی دانا کە لەشەوێك زیاتر تیایدا نەمێنێتەوە[1]، هەروەها رۆژئاوای ئەوروپایی بەتایبەت فەرەنسا هەڵوێستی ستایشو سەرسامی بۆسەلاحەدین دەربڕی، بەرادەیەك کەکتێبە ئەدەبیەکانی ئەوروپا وەك ئەفسانە یەکیان لێکردووەو لەچوار چێوەی مێژوویی راستەقینەو بابەتی دەریان کردووە[2] شکستی خاچپەرستەکانیش لە حطیندا شکۆی شانشینی بەیتولمەقدیسی نەهێشت، بەتایبەت پاش بەدیل گیرانی پاشا جای لوزجنانو کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لەسوارەکانیان، پاش کوژرانی زۆریەی سوارە خاچپەرستەکانو زۆرینەی سوارەکانی سوپای بەیتولمەقدیس دەڵێن: هەر کەس کوژراوەکانی بینیبێت وایزانیوە دیلیان نیەو هەرکەسیش دیلەکانی بینیبێت وتوویەتی کەس نەکوژاوە[3].

٦- **ئەو هەوڵە زۆرانەی کە پێش سەلاحەدین دران:** سەرکەوتنەکانی سەلاحەدین لەبۆشاییەوە نەهاتبوون ئەوئەنجامە سەربازییانەش کە بەدەستیهێنا بەبێ پێشەکی سیاسیو ریکخستنیو ئیداریو چاکسازیو بوژانەوە بۆماوەی زیاتر لەسەدەیەك نەبوو، هەتاوەکو لەسەردەمی عمادەدین زەنکیو نورەدین زەنکی بەرەکەی چنرایەوە، دوایەمینیشیان (نورەدین زەنکی) کەدادەنرێت بەدامەزرێنەری ئەو رووداو گۆڕنکاریە گەورانەی کەوڵاتی شامو پاشان میسر بەخۆیەوە بینی، ئەوەبوو نورەدین مەحمود بەکارە چاکسازیو سەرکەوتنە سەربازیو دەسکەوتە شەرعیەکان ناسرابوو، ناوبانگی بەدروستکردنی خوێندنگەو پەیمانگای پەروەردەو فێرکردنو گرنگیدان بەدادوەریو دروستکردنی مزگەوتو بنیاتنانی شوراو بلاوکردنەوەی زانست لەحەلەبو دیمەشقو شارەکانی تری شامدا دەرکردبوو، لەسەردەمیشیدا دادوەری رۆڵی شەرعی خۆی بینیلەئامادەکردنی دەرونی بۆ سوپاو گەیاندنی پەیامی خواو ئاشناکردنی فەرمانەدەکانی سوپاکەی بەبنەماکانی زمانو فیقەو فەرموودە، لەم کەشە زانستیەشدا سەلاحەدین زانستو پەروەدەی ئاینی وەرگرتو

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٥٥.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١١٥.

[3] تأريخ الأيوبين فی مصر وبلاد الشام، ل:١١٥ .

لەدەستی فەرمودەناس ئەحمەدی کوڕی محەمەدی ئەسفەهانی و مەوعیزەکانی عەلی کوڕی ابراهیمی نەجاو نجم الدین خەبوشانی زانستی وەرگرت وئەمانەش هەندێك لەو زانایانە بوون کەسەرپشتی پەروەردەکردنی نەوەی سێیەمی سەرکردە سیلسیو سەربازییەکانیان کرد کەسەروەری شکستپێهێنانی فەرەنجەکانە دوای سەد سالّ لەرپێکدادانی بچڕ بچڕ دەستە بەرکرد، کەواتە سەلاّحەدین خۆی خۆی پێنەگەیاند بەلّکو خوای گەورەسەرکەوتووی کرد کۆ، پاشان ئەو بەرهەمی مێژووی بابەتیو سەردەمێکە لەپێشکەوتن لەگەلّ دەستپێکردنی بزوتنەوەی چاکسازی ئاینیدا دەستیپێکرد[1].کە نظام الملك لەسەردەمی سلجوقیەکاندا سەرکردایەنی دەکرد، لەکەسە دیارەکانیشیان الجوینیو ابو اسحاق شیزاریو غزالیو ...هتد، بەراستی ئەم هەولاّنەش بەرهەمی خۆیان دابەدەستەوە کەگرنگرینیان جەنگی حطینو ئازادکردنی قودس بوو لەسەر دەستی سەلاّحەدین.

---

[1] صلاح الدين الأيوبى وسقوط القدس وتحريرها، ل: ٧٨،٧٩.

## باسی دووەم: ئازادکردنی بەیتولمەقدیس

جـەنگی حطـین بەجـەنگێکی یەکلاکـەرەوە دادەنرێـت لەمێـژووی ململانێـی ئیـسلامو خاچپەرستەکاندا، بەهۆیەوە شانشینی بەیتولموقدیس هێزە سەرەکیەکانی لەدەستدا، هەروەك توانرا بەهێزترینو گەورەترین سوپای خاچپەرست تێك بشکێنرێت، ئەو سەرکردەیەش کە لەم جەنگەدا بەسەر خاچپەرستەکاندا سەرکەوت توانی ببێتە خاوە دەسەڵات بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامیدا[1]، دوای حطین خاچپەرستەکان لەبەیتولمەقدیسدا هێزێکیان نەبوو شانازی پێوە بکەن، بۆیە هەر کەس عەسقەلانو غەزرە خۆیان رادەستی سەلاحەدین کرد لەئەیلولی هەمان ساڵدا، یەکسەر سەلاحەدین: بڕیاریدا بەسوپاکەیەوە کە دووبارە لەباشووری فەلەستیندا کۆیکردەوە، چونکە پێشتر بڵاوەی پێکردو لەپێناو ئازادکردنی ناوچەکانی تری وڵاتی شام، هەر کە بەم سوپایەشەوە بەرەو باکور بەئاراستەی قودس بەرێکەوت بۆ رزگارکردنی، خێراشاری قودس خۆی ئامادەکرد بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەم سەرکردە موسڵمانە پاش تێپەڕبوونی هەشتاوهەشت ساڵ بەسەر داگیرکردنیدا لەلایەن خاچپەرستانەوە[2].

### یەکەم: ئامادەکاریەکانی خاچپەرستان لەناوبەیتو لەقدیسدا:

ژمارەی جەنگاوەرە خاچپەرستەکان لەقودسدا نزیکەی شەست هەزار ئەسپ سواربوو ئەمەجگە لەژنو منداڵ وەك أبو شامە لەکتاب الروضتیندا باسی دەکات[3]، وادیارە ژمارەی دانیشتوانی شارەکەو ژمارەی جەنگاوەرەکان تیایدا زۆر بوو بوو بەهۆی هاتنی پەنابەران بۆی لەشارو گوندە فەلەستینیەکانی دەورو بەرەوە، کەدوچاری مەترسی جەنگ بونەوە لەکاتی جەنگی موسڵمانان لەگەڵ خاچپەرستاندا، هەروەها((رنسیمان)) باسی ئەوە دەکات کە: زۆربەی ئەو پەنابەرانە باش هونەری جەنگیان دەزانی، وژمارەی پیاوان تیایاندا زۆر کەم بوو، یەك پیاو بەرامبەر بەپەنجا ژنو منداڵ بوو، لەشارەکەشدا تەنهادوو سوارە هەبوون ئەوەش وای کرد لەبالیان کەهەر لاوێك تەمەنی گەیشتبێتە شازدە ساڵ بیکاتە سوارە بەمەرجێ لەخێزانو بنەماڵەیەکی خانەدان (بەگەوە)هاتبێت. پاشان هەموو ئەو کوڕانەی چەکدارکرد کەتەمەنیان گەیشتبوە شازدە ساڵو چەکیشی دابەش کرد بەسەر هەر کەسێکدا توانای هەڵگرتنی چەکی

---

[1] حروب القدس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل:٩٤.

[2] حروب القدس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل:٩٤.

[3] کتاب الروضتین(٢،٩٢).

هەبێت[1]، پاشان جەنگاوەرەکانی بەسەر قەڵاو شوراو حەسارەکاندا دابەش کردو مەنجەنیقی دا بەستو خەندەقی هەڵکەند، ئەبوشامە دەڵێت: لەسەر هەموو لوتکەی چیایەك مەنجەنیقێکیان دابەستو خەندەقەکەیان زۆر قوڵکردو هەرکۆمەڵێکیان بەسەر ناوچەیەکدا دابەش کردو بەرەیەکی تۆکمەیان پێك هێنا[2]. بەڵام ابن الاثیر جیاوازە لوگەڵ رنسیماندا دەربارەی ژمارەی ئەو سوارانەی کە لەقودس دابوون پێش چەکدارکردنی لاوە خانەدانو گزادەکان، ئەوە باسی ئەوە دەکات ئەو سوارانە کەمابونەوە لەشارەکەدا ئەوانەبوون کە لەحگین دا هەڵاتبون لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆری تردا.لەخەڵی ئەو دەوروبەرە، عەسقەلان و شوێنەکانی تر، هەموشیان چونە سەر شوراکان بەشمشێرو ئامێرەکانیانەوە ئەوەبوو مەنجەنقیان دابەستو شوراکانیان توکمەکرد بەهەموو توانایەکیانەوە[3].

**دووەم: پلانی سەربازی سەلاحەدین:**

**١- ئەو هەنگاوانەی کە پێش ئازادکردنی قودس گیرانە بەر:**

توانای جەنگی سەلاحەدین لەو پلانەدا دەرکەوت کەگرتیەبەرو دژ بەخاچپەرستەکان بۆ سەندنەوەی بیتولمەقدیس لێیان، ئەم پلانەش لەسەر بنەمای پێکهێنانی بەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو پێك هاتبوو کەمیسرو شامو چەند بەشێکی لەعێراق پێك دەهێنا، پاشان هەستان بەڕوبەڕبونەوەی خاچپەرستەکان لە خاکی خۆیانداو وەشاندنی گوزەرێکی بەهێز لێیان وەك لەجەنگی حطین دا روی دا، پاش ئەوەش بەرەو شارەکانی کەناوی شام بەڕێ کەوت بۆ لاوازکردنی خاچپەرستەکان لەروی مادیو مەعنەویەوە، دیارە ئەگەر سەلاحەدین پاش سەرکەتنی لەحطین دا روی دا لەبیت المقدس بکردایە ئەوە ئاسایشو دڵنییایی لەبەیتولمەقدیس دا بۆ دەستەبەر نەدەبوو، چونکە وا چاوەڕوان دەکرا کەڕۆژهەلاتی ئەوروپایی سوپای بناردایە بۆ کەنارەکانی شامو سوارەو سەربازەکانی لەوێوە پەلاماری سەلاحەدینیان دەدا بۆ گێڕانەوەی بەیتولمەقدیس کەکڵێسای قیامەی تیایەو بەبیروبۆچونی نارەوای ئەوان وەك عیمادی ئەصفەهانی ئەڵێ: تیایدا مەسیح لە خاچ دراوە، و ئیسماعیلیش لەوێداکراوە بەقوربانی و لاهوتیش لەوێدا بەرجەستەبوەو ناسوتیش بوە بەخواو خاچیش دانراوە[4]. ئەوەبوو بەفەزڵی خواو پاشان بەفەزڵی ئەو پلانە

---

[1] رنسیمان(٧٤٩١٢).

[2] کتاب الروضتين(٢/٩٣).

[3] حروب القدوس فی التاريخ الاسلامی والعربی، ل: ٩٤.

[4] حروب القدوس فی التاريخ الأسلامی والعربی، ل: ٩٦.

سەربازیەوە کەسەلاەدین جێ بەجێکردو توانی دەست بگرێت بەسەر ناوچە کەناریەکان داو بەیتولمەقدیس گەمارۆ بداتو رێ لەگەشتن کۆمەکی بگرێت بۆیو هیوایخاچپەرستەکانی لەئەورپاو لەولاتی شام دا بڕی بۆ گەیشتن بەبەیتولمەقدیس، و رزگارکردنی لەدەست سوپای موسڵمان، ئەوەبوو بەوەرگرتنەوەی عەسقەلان و دەوروبەری لەخاچپەرستەکان سەلاحەدین توانی دابڕانێکی تەواو بەسەر بەیتولمەقدیس دا بسەپێنێ، پاشان قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵیو روی کردە بەیتولمەقدیسو فەرمانی دا بەکۆبونەوەی سەربازە موسڵمانەکان کەپێشتر بەناوچەکەناریەکاندا بڵاوبوبونەوە[1].

۲- **بواری راگەیاندن:**

ئەو سوپایەی کەکۆبوبویەوە بەشداری سەلاحەدینی کردبوو لەجەنگی حطیندا، سەلاحەدینیش لەشام دا قۆستەوە پێش گەڕاندنەوەیان بۆ ناوچەکەنیان بۆ دەستگرتن بەسەر کەنارو بەندەرەکانی شام دا، هەروەها سوربوو لەسەر ئەوەی هەڵمەتێکی راگەیاندن ئاراستەی سەرجەم ناوچە ولایەنەکانی جیهادی ئیسلامی بکات بەمەبەستی تاودانی موسڵمانەکان بۆ جیهاد، ئەمەش وورەو ئیرادەی موسڵمانانی بەهێز کرد بۆ جیهادو پاککردنەوەی ئەو ناوچە پیرۆزە کەیەکەمی دوو قیبلەکەو سێیەمی دوو حەرەمە پیرۆزەکەو شوێنی شەورەوی پێغەمبەرە(د.خ)، ابوشامە وابن کثیریش باسی ئەوە دەکەن کەموسڵمانان هەر کەباسی سەرکەوتنی سەلاحەدینیان لەحطینو ئازادکردنی شام دا بیستو زانیان بەوەی کەنیازی ئازادکردنی بەیتولمەقدیسی هەیە پۆل پۆل رژان بەسەریداو زانایانو مۆستایانیش لەپێشەوەیاندابوون بۆ خۆبەخشین لەپێناو پاکتاو کردنی بونی خاچپەرستی لەولاتی شام دا[2].

۳- **بانگێشتکردنی هێزە میسریەکان:**

لەلایەکی تریشەوە سەلاحەدین پاش دەستگرتنی بەسەر ناوچە کەناریەکاندا سوپای میسری بانگێشت کرد بۆ یارمەتیدانی بۆ دەستگرتن بەسەر قەلاکانی باشورداو لەگەلێ الملك العزيز عوسمانی کوڕیدا لەعەسقەلان دا بەیەکگەیشتنو چاوی رون بویەوەو ورەی بەرزتر کردەوە، وادیارە سەلاحەدین سەرباری دەستگرتنی دا بەسەر کەنار دەریادا بەلام مەترسی ئەوەی هەبوو کەخاچپەرستەکانی رۆژئاوا هێرش بێنن، لەکاتی پێشڕەوی کردنیدا بەرەو بەیتولمەقدیس، هەلابۆیە فەرمانی دا بە گەیشتیگەلەکەی لەمنصورەدا کەبەرێ بکەوێت بۆ بەشداری کردن لەجیهاددا،

---

[1] النوادرالسلطانية، ل: ۸۱، صلاح الدين ءالصليبون، ل: ۲۰۸.

[2] البداية والنهاية، له: صلاح الدين والصليبيون، ل: ۲۰۹.

ئەوانیش براپەرایەتی الحاجب لۆلۆ وە بەرێکەوتنو کەوتنە برینی دەریاو ڕێگرتن لەکەشتی و بەنلەمەکانی خاچپەرستەکانیشدا لە وشکانیەوە لەمیسرەوە بۆ شام بەڕێوەبوو، کاتێ سەلاحەدین زانی کە شاری بەیتولمەقەدیس قایمکاری باشی تیاکراوە، لەبەر ئەو پلەو پایەی مەزنەی کە لەدڵی خاچپەرستەکاندا هەیەتی، دەستی کرد بەهێنانی ئامێرەکانی ئابلۆقەدان بۆ برینی شوراو بڵندو بەرزەکانی[1]، ئەوەبوو مەنجەنیقو بەرد هاوێژو نەوت هاوێژ دیوار کونکەرو چەند ئامێرو کەرەستەیەکی پێویستی تری هێنا بۆ لێدانی شوراکانو کونکردنیانو نەوت تێکردنو گرتێبەردانیان بۆ کرد ئەوەی کەلێنو چونە ناو شار[2].

### ٤- گەمارۆدانو هەڵگیرساندنی جەنگ:

خاچپەرستەکان پێش ئەوەی کەسوپای ئیسلام دابمەزرێت لەدەوری شوراکاننی شاردا پەلاماریان دانو، واتە پێش ٢٠ی ئەیلول، ئەمەش کاتێك بوو کەمەفرەزەیەك لەسوپای ئیسلامی بەسەرکردایەتی ئەمیر جمال الدین شرونی کوڕی حەسەنی رازی پێشڕەیان کرد بەئاراستەیشوراکە، ئەوەبوو مەفرەزەیەکی خاچپەرست بۆی دەرپەڕیو لەروبەڕنەوەیەکدا توانیان شکست بەموسڵمانەکان بێننو ئەمیرەکەشیان بکوژن[3]، ئەمەش پێش جێگیربوونی سەڵاحەدینو سوپاکەی بوو لەبەشی خۆرئاوای شوراکەدا، هەرچۆنێك بێت سەڵاحەدین جەنگی راستەقینەی دژ بەدوژمنی خۆ تۆمارکردوو لەشوراکانی شاردا لەبەرەبەیانی ٢٦ی ئەیلولی ساڵی ١١٨٧زدا، ٢١ی رەجەبی ٥٨٣کدا دەست پێکردو سوپاکەی لەژێر رۆپۆشی مەنجەنیقەکاندا بەرەو شوراکان پێشڕەویان کرد، ژمارەی بەردهاوێژو مەنجەنیقەکانیش دوازدە دانە بوون کەبەردی گەورەیان دەهاویشت، لەژێر ئەم رووپۆشەشدا دیوار کونکەرەکان پێشڕەویان کردو جەنگێکی توند لەنێوان هەردوولا روویدا، پاسگای شارەکەی دەیویست دەست لەموسڵمانەکان بوەشێنێتو پێشڕەویان راگرێت بەتیرو مەنجەنیقی سەر دیوارەکانیان، سەربازەکانیشیان زۆر ئازایانە دەجەنگانو سوارەکانیشیان دەهاتنە دەرەوەی شارو بەشمشێر رووبەڕووی موسڵمانەکان دەبوونەوە، بەڵام هەموو ئەمانە نەیتوانی بەر لەموسڵمانەکان بگرێتو پێشڕەویو رووخاندنی شوراکان بەردەوام بووو لەهەردوولاش ژمارەیەکی زۆر کوژران لەو کەسانەش کەکوژران: ئەمیر عیزەدینی کوڕی مالك

---

[1] وفيات الأعيان(١٨٤،٧)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٠.

[2] صلاح الدين والصليبيون،ل: ٢١٠.

[3] كتاب الروضتين(٢/٩٢).

کەباوکی فەرمنڕەوای قەڵای جعبر بوو[1]، پاش ئەوەش شەڕ بەتوندی بەردەوام بوو، غروسیە وەسفی ئەو جەنگە دەکاتکە لەنزیك شوراکانی شاردا روويد بەوەی کەهێندە گەرمو توندبووە هاوشێوەی نەبووە، هەروەك تینوێتیەکی راستەقینە بۆ شەهیدی تیادا بەدیدەکرا، دەڵێت: لەراستیدا ئەم جەنگانە توندترین جەنگ بوون، هیچ مرۆڤێك شتی وای نەبینیوە، چونکە سەبازی هەلایەك ئەم جەنگەی وەك ئەرکێکی ئاینیو زۆر گرنگ دەبینی[2]. زاڵبوونی سەلاحەدینیش لەمەنجەنیقدا بەرادەیەك بوو، کەروخانی شارەکە مسۆگەر بوو بوو، کونکەرەکانیش کەژێر روپۆشی مەنجەنیقەکاندا کاریان دەکرد توانیان کەلێنێك بکەنە دیواری شار[3]، ئەمەش وای لەسوارە دەرەبەگە خاچپەرستەکان کرد کەبڕیاردانی ئەنجامدانی هێرشێکی خۆکوژی بکەنە سەر موسڵمانان لەدەرەوەی شوراکانی شاردا، بەلام هرقلی بطریاکیان پاشەگەزیکردنەوە دوای ئەوەی پێی سەلماندن کەئەو کارە تەنها هێشتنەوەی ژنو منداڵەکانی بەتەنایی‌و بێ بەرگری لێدەکەوێتەوە لەبەرامبەر دوژمندا[4].

٥- **هێرشی یەکلاکەرەوە:**

دوای ئەم کوشتارە توندە سەلاحەدین بڕیاریدا کەهێرشێکی یەکلاکەرەوە بکاتە سەرشارو هاویشتنی مەنجەنیقی چڕتر کردەوە، بۆروپۆشکردنی هێرشبەرانو هەروەك رێژنەیەك تیری بەئاراستەی بەرگریکاران لەشوراکە هاویشت بۆ پەکخستنی بەرگریان، ئەمەش وایکرد لەو بەرگریکارانە کەپاشەکشە بکەن بۆ پێگەیاندنیان، لەهەمان کاتیشدا موسڵمانەکان پێشڕەویان کردو لەخەندەقەکە پەڕینەوە کەبەدەوری شوراکەدا لێدرابوو ، شوراکەیان کونو وێران کرد، پاشان هاویشتنی تیرو بەردەوام بوو لەتیر هاوێژی پێشکەوتووەکانەوە کە لەپشتی هێرشبەرەکانەوە بوون و پارێزگاری لێکردنیان، ئەوە بوو هێرشبەرەکان سەرکەوتتبوون لەکردنەوەی چەند کەلێنێك لەوشورایەدا کەخەریك بوو دەکەوتە دەستی هێرشبەرەکانەوە، لەکاتێکی تری ٢٩ی ئەیلولدا هێرشبەرەکان توانیان کەلێنێکی گەورە بکەنە شورا کەموسڵمانەکان لێیەوە چوونە ژوورەوەو ئالاکانیان بەسەریەوە هەڵکرد، بەلام بەرگریکارەکان خێرا خۆیان رێکخستەوەو موسڵمانەکانیان لەشوراکە دورخستەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا بەرگریکارەکان باش

---

[1] حروب القدوس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٠٠.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ١٠٠.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ١٠٠.

دەیانزانی کەبەرگردنەکەیان بێسودەو بەرو تیاچوون دەڕۆن[1]، بۆیە بەردیان دەکێشا بەخۆیانداو داوای کۆمەکیان لەپەروەردگار دەکردو ژنەکانیشیان قژی کچەکانیان بڕی بۆ هاندانی پیاوەکانیان بۆ بەرگری لێکردن و پاراستنیان لەدەستی موسڵمانەکان[2].

**٦- دانوستانەکان و بەدەستەوەدانی قودس:**

خاچپەرستەکان ڕێکەوتن لەسەر ناردنی وەفدێکی بۆ داواکردنی پەنادان بەرامبەر بەدەستەوەدانی شارەکە، سەلاحەدینیش ئامادەنەبوو وەلامیان باتەوەو وتی : دەبێت هەمان کارتان پێبکەم کە بەخەڵکەکەتیان کرد کاتێك کەدەستیان بەسەردا گرت لەساڵی ٤١٩ ك دا کاتێك هەستان بەکوشتن و بێ سەرو شوێن کردنیان پاداشتی خراپەش هەر خراپەیە[3]. کاتێك سەلاحەدین وەفدێکیانی بەسەرشۆڕی و نائومێدییەوە گەڕاندەوە، دووبارە خاچپەرستەکان لەناو بەیتولمەقدیسدا کۆبوونەوەو ویستیان چەند هێرشێکی کتوپڕ بکەنە سەر موسڵمانەکان، بەلام هەقڵی بطریاك نەیاری خۆیان نیشاندا روونیکردەوە کە ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوە ژن و مناڵەکانیان بەروەیی و کویلایەتی دەبەن وهانیدان بۆ داواکردنی پەنادان لەسەلاحەدین، پاشان بالیان دی ابلین نێردراوێکی نارد بۆسەلاحەدین و داوای پەنادانی لێکرد بۆ خۆی هەتاوەکو بێتە لای بۆ گفتوگۆکردن سەلاحەدینیش داواکەی پەسەندکردوو ئەویش لای سەلاحەدین ئامادەبووو داوای پەنادانی خاچپەرستەکانی لێکرد، بەلام سەلاحەدین سوور بوو لەسەر ئازادکردنی شارەکە بەزۆری شمشێر، کاتێك بالیان لەوە بێ ئومێد بوو ویستی سۆزی سەلاحەدین بجەوڵێنێت بەهەڕەشەی کوشتنی ژن و منداڵ و دیلە موسڵمانەکان و پێی وت: ئەی سوڵتان بزانە کە ئێمە لەم شارەدا خەڵکێکی زۆرین کەتەنها خوا ژمارەیان دەزانێت، بۆیە وازیانلەجەنگ هێناوە بەئومێدی پەنادانن و وادەزانن کەتۆ پەنایان دەدەیت وەك چۆن خەڵکی ترت پەنادا، هەروەك ئەوان رقیان لەمەرگەو حەزیان لەژیانە، جا ئەگەر بزانین کەهەر دەبێت بمرین ئەوە سوێند بەخوا منال و ژنەکانمان دەکوژین و مال و کەلوپەلەکانمان دەسوتێنێنین و ناهێڵین دینارێك یان درهەمێکتان دەست بکەوێت و هیچ کەسێکمان لێدەستگیر بکەن، کەلەوەش بوینەوە بەردەکەو مزگەوتی ئەقساو شوێنەکانی تر دەردێنین و پاشان دیلە موسڵمانەکان دەکوژین کوپێنج هەزار دیلن و ناهێڵن کەسمان لێبکوژێت هەتاوەکو هاوشێوەی خۆی

---

[1] حروب القدوس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠١.

[2] مفرج الکروب (٢/٢١٣)، صلاح الدین والصلیبیون، ل: ٢١٣.

[3] الکامل فی الأثر، له صلاح الدین والصلیبیون،ل: ٢١٣.

نەكوژێتو سەربازانەوپیاوانە دەمرین[1]، سەلاحەدینیش راوێژی بەسەربازەكانی كردو ئەوانیش بۆیان رونكردەوە كەرزگاركردنی قودس بەسە بۆ بردنە سەری سوێندەكەیو خۆبەدەستەوەدانی ئەم ارەش بەچەند مەرجێك وەك رزگاركردنی بەزۆری شمشێر وایە، لەم حاڵەتەشدا خەڵكی شارەكە دەبنە دیلی جەنگ[2]، سەلاحەدینیش پەنایدان بەمەرجێك بەدەستەوەدانی بەیتولمەقدیسو خاچپەرستەكانیش شارەكەیان بەجێهێشت لەبەرامبەر دەدیناردا دەوڵەمەندو هەژاریش لەمەدا هاوبەشن، بلام ئافرەت تەنها پێنج دینار دەدات[3]، هەریەك لەكچەزای ابن جوزیو عماد الحنبلیش ئاماژە بەوە دەكەن كە لەسەر هەر كورشێكی لاویش چوار دینار دانرابوو[4]، هەرچی منداڵیشە ئەوە جیاوازی لەسەر ئەو برە هەیە كە بۆی دیاریكرا بوو، هەندێك پێیان وایە كە یەك دینار بووە[5]، رایەكی تر هەیە كەدەڵێت دوو دینار بووە[6]، بەلام واپێدەچێت كە رای یەكەم بەهێزتربێت بەبەڵگەی یەكدەنگی سەرچاوە خاچەرستەكان لەسەری، هەرچی هەژارو بێبەشەكانیش ئەوە سەلاحەدین رازیبووە كەبالیان لەبەرامبەر ئازادكردنیان سی هەزار دینار بدات هەروەها سەلاحەدین ماوەی چل رۆژی بولینی دەستیشان كرد، هەر كەس لەو ماوەیەدا پارەكەی بدایە ئازادی دەكرد، هەركەسێكیش ئامادەی نەكردایە دەبووە كویلە، شارەكەش لەرۆژی هەینی ٢٧ی رەجەبی ساڵی ٥٨٣ك دا /١٢ی ئۆكتوبەری ١١٨٧ز ئازاد كرا[7] ئەبو شەمامەش لە العمادەوە لە البرق الشامی دا باسی ئەوەدەكات كەخاچپەرستەكان دوای مۆر كردنی رێكەوتنی خۆبەدەستەوەدان هەستان بەچۆڵكردنی ماڵكانو فرۆشتنی كەلوپەلو ئازوقەكانیان بەنرخێكی هەرزان، چوونە دەرەوەشیان هەرەمەكی بوو، چونكی زۆر كەلوپەلیان بۆ هەڵنەدەگیراو بەو شێوەبوون كەخوای گەورە فەرمووی: ﴿كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ٢٥ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ٢٦ وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ ٢٧ كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْماً آخَرِينَ﴾ (الدخان: ٢٥ – ٢٨)، واتە (ئەوانە چەند ها باخو باخاتو كانیاوی سازگاری زۆریان بەجێهێشت، چەندەها كێڵگەو بێستانو جێگەو رێگەی خۆشیان لودوا بەجێما، جۆرەها

---

[1] مفرج الكروب (٢/٢١٤)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٤.

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٤.

[3] النوادر السلطانية، ل: ٨٠– ٨١.

[4] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٤.

[5] كتاب الروضتين (٢/٩٥)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٤.

[6] النوادر السلطانية، ل: ٨٢، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٥.

[7] النوادر السلطانية، ل: ٨٢، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٥.

نمازو نیعمەتی تریش کەژیانیان بەخۆشی تیادا دەبردە سەر ئا بەو شێوەیە لەوانمان سەندەوەو کردمانە میراتی خەڵکانە تر) .(تەفسیری ئاسان، ل: ٤٩٧).

### سێیەم : چوونە ناوەوەی سەلاحەدین بۆ بەیتولمەقدیس:

سەلاحەدینو بالیان رێکەوتن لەسەر دەستەوەدانی شارەکە بەپێی ئەو مەرجانەی کە باسمان کردو پاشان سەلاحەدین چووە ناویانەوەو، لەرۆژی هەینی ٢٧ی رەجەبی ٥٨٣ك دا ، ئەمەش پاش ئەوەی کە لەدەروازەیدا فەرماندا بەپاسگاکەیی بۆ فرێدانی چەکەکانیانو خۆبەدەستەوەدان بۆ سەربازە موسڵمانەکان، ئەم رۆژەش رۆژێکی مێژووی مزن بوو ئاڵای ئیسلام بەرزکرایەوە بەسەر دیواری شورای ئەو شارە پیرۆزەدا، گەمارۆی ئەم شارە دوانزە رۆژی خایەن بەرووخانی قودسیش زۆربەی ئەو شارو پێگانەی لەبەردەم سەلاحەدیندا روخان کەهێشتا بەدەست خاچپەرستەکانەوە مابوونەوە لەزۆربەی ناوچەکانی شامدا، سەلاحەدینیش لەشەوی شەورەویدا چووە قودسەوە کەبەرامبەر بوو لەگەڵ ٢٧ی رەجەبداو فەرمانیدا کە لەهەردەروازەیەك لەدەروازەکانی شاردا ئەمیرێك دابنرێت هەتاوەکو فدیە لەخاچپەرستەکان وەربگیرێت کەشار بەجێدێڵن، لەشارەکەشدا شەست هەزار پیاو هەبوونن بەسوارو پیادە ئەمە جگە لەماڵو منداڵەکانیان[1]. ابن الأثير زیاتر دەڕواتو دەڵێت، باگوێگر سەرسام نەبێت، چونکە وڵاتەکە فراوانە، لەهەموو لایەکەوە لەعەسقەلانوشوێنەکانی ترەوە خەڵکی بۆ هاتبوو، بەجۆرێك کەکڵێساو رێگاو بانەکان پڕبوو بوون لەخەڵكو نەیدەتوانی هاتووچۆ بکات[2].

سەبارەت بەسەلاحەدینیش ئەوە دوای یەکلابونەوەی دەسەڵات بۆی لەشارەکەدا فەرمانیدا بەگەڕانەوەی بۆ دۆخی جارانی پێش داگیرکرانی لەلایەن خاچپەرستەکانەوە، چونکە ئەوان گۆڕانکاریان بەسەر زۆر شوێنەواری ئیسلامیدا هێنابوو لەشارەکەداو خاچێکی گەورەیان لەسەر قبة الصخرةدا دانابوو، سەلاحەدینیش فەرمانی لابردنیدا، سوارەکانی داویەش چەند بینایەکیان بۆ خۆیان لەرۆژئاوای مزگەوتی ئەقسادا بنیاتنابوو، هەتاوەکو تیایدا نیشتەجێبن، بەشێکی مزگەوتەکەشیان خستبویە سەری، سەلاحەدینیش فەرمانی گەڕانەوەی ئەو زەویانەی دەرکردو هەروەك فەرمانیدا بەپاککردنەوەی مزگەوتو بەردەکەی لەپیسی پاشان پێشنوێژێکی دیاریکرد بۆ مزگەوتی ئەقساو مینبەرێکی تیادا دروستکردو هەموو ئەو وێنانەی سڕییەوە کەخاچپەرستەکان

---

[1] حروب القدوس فی التاريخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠٦.

[2] حروب القدوس فی التاريخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠١.

کێشابوویان یاخود هەڵیانواسیبوو، گاورەکانی نیشتەجێی قودسیشی هێنایەوە بۆشوێنەکانی خۆیانوماڵەکانی بۆ گەڕندنەوەو مۆڵەتی کڕینی شتو مەكو کەلوپەلی فرەنجیەکانیشی پێدان[1].

١- **مێژوو رزگارکەرێکی میهرەبانتر لە موسڵمانانی بەخۆوە نەبینیوە:** ئەوەبوو سەلاحەدین بەڵێنەکەی بردە سەرو مۆڵەتیدا بەوانەی کەفدیە دەدەن بچنە دەرەوەو لەهەر دەروازەیەکی شاریشدا ئەمیرێکی دانابوو بۆ وەرگرتنی پارە لێیان، هەر کەس پارەی بدایە دەچووە دەرەوە[2]، سەرباری ئەو پارە کەمەش کەسەلاحەدین دایںابوو بۆ دەرچوونیان لەبەیتولمەقدیسو مسۆگەرکردنی گەشتنیان بە شوێنێکی سەلامەت، بەڵام زۆرینەیان نەیتوانی ئەو پارەیە بدەن دوای چل رۆژ بەدیلکراوی لای موسڵمانەکانەوە مانەوە، هیچ دەوڵەندێکی خاچپەرستیش هاوکاری هەژارەکانیان نەدەکرد بۆدانی فدیە، ئەوەبوو بطریرك هرقل بەگەنجینە زۆرەکانیەوە بەیتولمەقدیسی بەجێهێشت بەبێ ئەوەی گوێ بەکەس بدات[3]، ئەمەش بەهۆی نەبوونی پەیوەندی خێزانیەوە بوو لەنێوان خاچپەرستەکاندا لەو کاتەدا، هەروەها دیلەکان تێکەڵ یەکبوون لەرەگەزو گەلی ئەوروپی جیاوازو سەربازی نەناسراوو بەکرێگیراو کەحەزیان لەسەفەرکردن بوو بۆ رۆژهەلات بۆ رزگاربوون لەکویلایەتی زەوی لەو کاتەدا لەکۆمەڵگەی ئەورپادا باووبوو[4].

بەکورتی ئەو هەڵوێستە پڕ شەرمەزارییەی سەرانی خاچپەرستانو ئەو جوامێریو لێبوردەیەی کەسەلاحەدین نواندی نوسەری ئینگلیزی لین بولی ناچارکرد بۆ دەربڕینی سەرسامی بەسەلاحەدین ئەوەتا دوای هێرشگکردنە سەر بەتریارك دەڵێت: (ئەوە هەلێك بوو بۆ ئەو پاشا موسڵمانەکە گاورەکان فێری مانای لێبوردن بکات)[5] سەلاحەدین و سەرکردە موسڵمانەکانی تریش ئەو جوامێریو لێبوردەییەیان دوپاتکردەوە کاتێك کە الملك العادلی برای سەلاحەدین داوای لێکرد هەزار کەس لەو خاچپەرستانەی بۆ بنێرێت کە لەبەر نەدانی فدیە بەدیل گیران هەتاوەکو لەپێناو خوادا رزگاریانبکات، سەلاحەدینیش بەمەرازی بوو، ئەم کا جوامێرانەش هەستی بیتریاكو بالیانی بزواندو ئەوانیش هەمان داوایان پێشکەش بەسەلاحەدین کرد، سەلاحەدینیش وەلامی دانەوەو دیلەکانی

---

[1] حروب القدوس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠٨.

[2] کتاب الروضتین (٢/٩٥).

[3] صلاح الدین والصلیبیون، ل: ٢١٦.

[4] جیش مصر، ل: ٦٩.

[5] صلاح الدین والصلیبیون، ل: ٢١٦.

ئازادکردن، پاشان سەلاحەدین فەرمانی کرد بەپاسوانەکانی کە لەشەقامەکانی بەیتولمەقدیسدا بانگەوازبکەن کەهەرکەسێك نەیتوانیبێت فدیە بداتو بەسالاچوو بێت ئەوە سەلاحەدین ئازاد یان دەکاتو بۆیان هەیە لەدەروازەی پشتەوەی شارەوە لەکاتی گزنگەوە هەتاوەکو شەو شار بەجێبهێڵن، هەر کە ئەم راگەیاندنە بلاوکرایەوە خاچپەرستەکان بەژمارەیەکی زۆرەوە رویان کردە دەروازەی پشتەوەی شار[1]، کچە شازادەی بیرەش داوای ئازادکردنی نزیکەی پێنج سەد ئەرمەنی کردو بەسەلاحەدینیان راگەیاند کەئەوانەی خەڵکی شارەکەی خۆینی، هاتنیان بۆ بەیتولمەقدیس بۆ خواپەرستی بووە، هەروەك ئەمیر مظفر الدین علی کوچك داوای ئازادکردنی نزیکەی هەزار جدیلی ئەرمەنی کرد کەگوایا خەڵکی رەهان، سەلاحەدینیش وەلامیدانەوەو ئازادکردن[2] ، ئەو لێبوردەییەش لەلایەن موسڵمانەکانەوە تەنها خۆی لەو کارانەی سەلاحەدین والملك العادلو گەورە ئەمیرەکانیاندا نەدەبینیەوە، بەڵکو لوە تێپەڕی بۆ موسڵمانان بەگشتی، لەراستیدا سەلاحەدین لێبوردەییو رەوشتبەرزییەکی زۆری بەرامبەر بەخاچپەرستەکانی بەتولمەقدیس پیشاندا، ئەوەبوو رێزو بەخشندەی بەرامبەر بەهاوسەری ئەو سوارە خاچپەرستانەی کەکوژراون یاخود بەدیل گیران گەشتە رادەیەك، کاتێ کەکۆبوونەوە لەبەردەمیداو گریا، ئەویش بەزەییو سۆزی بۆ دەربڕینو ئەوانەیان کەمێردەکانیان لەدیلیدا بوو ئازادیکردن، ئەو ژنو کچانەش کەباوك یا مێردەکانیان کوژرابوون ئەوە سوڵتان فەرمانیدا کە لەبودجە خۆی پارەیان بۆ ببڕێتەوە بەپێی گوزرانو پلەو پایەیان، لەئاکانی ئەمەشدا ئافرەتەکان دەستیان کرد بەنزاکردن بۆی[3].

أ- **شازنێکە رۆحی خواپەرست:** لەقودسدا شاژنێکی رۆمی خواپەرست هەبوو کەبەردەوام سەرقاڵی پەرستنی خاچ بووو زۆر توندڕەو دەمارگیر بوو، هەناسە ساردەکانی بۆ شکستی خاچپەرستان کۆتایی نەدەهاتو فرمێسکەکانی وەك باران دەهاتە خوارەوە، ماڵوحاڵو کەلوپەلێکی باشو لایەنگرو شوێنکەوتووی باشیشی هەبوو، ئەوەبوو پەنای هێنا بۆسوڵتانو ئەویش پەنای داو خۆی و لایەنگرانی ئازادکردو بواری پێدا بۆ بردنی هەموو سەروەتو سامانەکەی، ماڵو موڵكو گەوهەرو خاچەزێڕو سندوقە داخراوەکانو شوێنکەوتوانی

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٦.

[2] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٧.

[3] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٨.

بەکەسانێکیشەوە کەشوێنکەوتوی نەبوون بردو بەخۆشحاڵیەوە ڕۆشت هەرچەندە بەدەست برین‌و ئازاری شکستەکەیانەوە دەیناڵاند[1].

ب- **هاوسەری پاشەیەکی دیلکراو:** ژنی پاشا (کی) بەدیلگیراو کەکچی أماری بوو لەتەنیشت قودسدا نیشتەجێبووبوو بەخۆی‌و خزمەتگوزارو کەنیزەکانییەوە هاتە دەرەوەو داوای بینینی هاوسەرەکەی کرد، لەبورجی نابلوسدا کۆتکرابوو، سەلاحەدینیش بەدانانی بارمتەیەك تاکاتی ئازادکردنی رازی بوو و ئازادی کرد هەتاوەکو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بژین[2].

ج- **ئیبرنساسەی دایکی هنفری:** ئبرنساکەی دایکی هنفری کە کچی فیلیپ‌و هاوسەری ئیبرنسەکە لەرۆژی حگیندا کوژرا، ئەم ئافرەتەش شاژنی کرك‌و ویك بوو خاوەن راو چەندین یار یدەدەر بوو، کاتێ هات داوای کوڕەکەی کردو، بەڵێنی پێدرا کە ئگەر لەقەڵاکەی هەڵگرێت‌و کوڕەکەی پێدەدرێتەوە، ئەویش ئەم داوایەی قبوڵکردو هنفری کوڕی هنفری کوڕیان لەدیمەشقوە بۆ هێناو چاوی بەبینینی کوڕەکەی گەشبوویەوە، پاشان ئەمیرەکان لەگەڵیدا چوون بۆ وەرگرتنەوەی پێگەو ناوچەکانی ، بەڵام دانیشتوانەکەی ئامادەنەبوون تەسلیمی بکەن‌و بەبێ ئومێدی گەڕاندیانەوەو کوڕە دیلکراوەکەی رادەستی سوڵتان کردەوە، ئەویش بەڵێنی پێدا کەلەکاتی وەرگرتنی ئەو شوراو قەڵایانەدا ئازادی بکات[3].

د- **رێزگرتنی سەلاحەدین لەبیروباوەری گاورەکان:** سەلاحەدینی لەهەست‌و نەستی گاورەکان دەنا، ئەوەبوو دوای ئەوەی هەندێ لەموسڵمانەکان دوای روخاندنی کڵێسای قیامەیان لێکرد دوای دەستگرتنی بەسەر قوددا وتیان: ئەگەر بیناکە بڕوخێنیت‌و سەرو ژێری بکەیت‌و گۆڕەکەی تیادا دەربێنێت ئەوە ئاگرەکەی دەکوژێتەوەو وێنەکانی دەسڕێتەوو چیتر خەڵکی سەردانی دەکەن، بەلام هەندێکی تر پێیان وابوو: کە کاتێك عومەری کوڕی خەگاب ئەم شوێنەی ئازادکرد لەسەرەتای ئیسلامدا لەم شوێنەدا هێشتنەوەو فەرمانی نەکرد بەروخاندنی[4]، هەربۆیە سەلاحەدینیش وازی لەروخاندنی هێنا[5].

---

[1] كتاب الروضتين (٣٤٣/٢)، بيت المقدس أمام أحداث التأريخ، ل:٣١٤.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: (٣٤٣/٣).

[3] كتاب الروضتين (٣٤٤/٢).

[4] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٨.

[5] مفرج الكروب (٢٣١/٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٩.

٥- **مانەوەی کۆمەڵێك گاور لەقودسدا:** هەندێ لەگاورەکان لەسەلاحەدین پاڕانەوە کەڕێنا پێبدات بۆ مانەوەی لەقودسدا دوای ئەوەی کەفیدیەیان داو، بەڵێنیاندا کەکەس بێزار نەکەنو خزمەتی شارەکە بکەن، سەلاحەدینیش بەمە رازی بوو بەرامبەر بەپابەندبونیان بەچەند مەرجێکەوە کەهەموویان قبوڵکرد بەم شێوەیە سەرانەیان لەسەردانراو وەك (ئەهلی ذمة) مامەڵەیان لەگەڵدا دەکراو مافو ئەرکیان وەك موسڵمانەکان لەسەردانرا[1]، بەڵام بەم شێوەیە موسڵمانەکان بەبەزەییەوە جوڵانەوە لەگەڵ ئەم شارەدا کەدەسەڵاتی تەواویان بەسەریدا هەبوو، بەڵام ئەگەر مرۆڤ یادەوەری ساڵی ١٠٩٩ز بێنێتەوە یاد کاتێك کەخاچپەرستەکان هاتنە ئەم شارەوە جودفریو تانکرد مەرگیان لەشەقامەکانی قودسدا بڵاوکردەوەو بەرگرێکارە موسڵمانەکان لەروباری خوێندا خنکێنران پاشان سوتاندنیان ئەمە جگە لەو دزیو تاڵانیەی کەپێی هەستان جگە لەبردنی ژنو منداڵی موسڵمانان[2]، ئەوە دەتوانێ هەست بەو جیاوازیە فراوانە بکات کە لەنێوان لێبوردەیی سەلاحەدینو درندەیی سەرکردە خاچپەرستەکاندا هەبووە، رادەی پابەندبوونی سەلاحەدین بەبنەمای لێبوردەیو حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامیەوەو دورکەوتنەوەی لەزاڵکردنی سۆزو ئارەزووی بەرامبەر بەخاچپەرستەکان کەهێشتا سەدەیەك بەسەر ئەو تاوانە دڕاندنەیاندا تێنەپەڕیبوو[3]. جیمس رستون دەڵێ: بەم شێوەیە سەربازەکانی سەلاحەدین رەوشتو هەڵسوکەوتێکی نموونەییان گرتە بەر لەکاتی داگیرکردنی قودسدا لەساڵی ١١٨٧ز داو سەلاحەدین گوێی بەکەسایەتیو ئابڕوی خۆیدا، دوای ئەوەی کەتۆڵەی لەخاچپەرستەکان کردووەو قودسی لەدەست سەندنەوە، دوای دەست بەسەراگرتنی لەساڵی ١٠٩٩داو بەهۆی پارێزگاری کردنی لەکڵێسای قیامەوە، شوێنەکانی تری گاورەکان هەمووان یادی لێبوردەیی بەرامبەر بەخاوەن ئاینەکانی ترو شوێنە پیرۆزەکانی ئاینی گاور دەکەنەوە، وادیارە هەڵسوکەوتەکانیشی وەك نمونەیەك دادەنرێت بۆ چۆنیەتی گرتنەبەری هەڵسوکەوتی راستو دروست بەهۆی لێبوردەیو کارە خێرە زۆرەکانیەوەو سروشتی خێرخوازیانەی مامەڵەی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەهەمیشەییو ناوبانگی بەنەرمیو لێبوردەیو دانایی دەمێنێتەوە[4].

---

[1] الفتح القيسى فى الفتح القدسى، ل: ١٣٩، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٩.

[2] أعمال الفرنجة، ترجمة حسن جيشي، ل: ١١٨، ١٢٠.

[3] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢١٩.

[4] مقاتلون فى سبيل الله، ل: ١٣٧.

و- **رای ستیڤن رنسیمان:** چاکەش ئەوەیە کەدوژمنان شایەتی بۆ بدەن، ستیفن رنسیمان کەیەکێکە لەمێژوونووسە فەرەنجەکان دەڵێت: لەراستیدا موسڵمانە سەرکەوتووەکان بەناوبانگ بوون بەدامەزراوی‌و مامەڵەی مرۆییانە، چونکە لەکاتێکدا کەپێش هەشتاو هەشت ساڵ فرەنجەکان لەناو خوێنی کوژراوەکانیاندا هاتوچۆیان دەکرد، ئەوان دەستیان بۆ ماڵێك نەبرد، کەس توشی ئازارو تەنگ پێهەڵچنین نەبوو، چونکە پیاوانی پۆلیس بەفەرمانی سەلاحەدین بەگەڕەك‌و شەقامەکاندا دەگەڕان‌و رێیان بەکەس دنەدا کەدەستدرێژی بکاتە سەر گاورەکان، ئەو دیمەنانەش کەمایەی خەم‌و پەژارە بوو ئەوە بوو کەروویدا کاتێك کەالعادل داوای لەسەلاحەدینی برای کرد کەهەزار دیلی پێبدات بۆ ئازادکردنیان لەبەرامبەر ئەو خزمەتانەی کەپێشکەشی کردووە، سەلاحەدینیش پێی بەخشی‌و العادلیش ئازادی کردن، ئەمەش بطریارك هرقلی خۆشحاڵکرد چونکە هۆکارێکی دەستکەوت بۆ چاکەکردن کەزۆر هەرزانەو پارەی ناوێت، ئەوەبوو ئەویش هەمان داوای پێشکەش بەسەلاحەدین کردو ئەویش حەوت سەد دیلی بۆ ئازادکرد، هەروەها سەلاحەدین پینج سەد دیلیشی بۆ بالیان ئازادکرد، پاشان رایگەیاند کەهەڵدەستێت بەئازادکردنی هەموو ژن‌و پیاوێکی بەساڵاچوو، کاتێ ژنانی بێوەژن کەمێردەکانیان کوژرابوون یاخود بەدیل گیرابوون، هاتنە لای‌و بەگریانەوە داوای چارەسەریانکرد، ئەویش بەڵێنی ئازادکردنی پیاوەکانی پێدان‌و ئەوانەش کەپیاوەکانیان کوژرابوون لەخەزێنەکەی خۆی پارەو موچەی بۆ بڕینەوە هەریەك بەپێی بارودۆخی خۆی، لەراستیدا لێبوردەیی‌و میهرەبانیی پێچەوانەی کردەوەی گاورەکان بوو لەشاڵاوی خاچپەرستی یەکەمدا[1].

ز- **غروسیەش ئەم دەقەی نوسیوە:** بەپێچەوانەی خاچپەرستەکان سەلاحەدین پابەندبوو بەبەڵێن‌و هەستی مرۆڤانەوە بەشێوەیەکی شەرەفمەندانەو گیانی سوارچاکیەوە، ئەمەش بووە مایەی سەرسامی مێژوونوسە لاتینەکان کەرووداوەکانی ئەو سەردەمەیان باسکردووە...، پاشان غروسیە دەڵێ: چەند توند تەندرەوێك داوایان لەسەلاحەدین کرد کەهەستێ بەروخاندنی پەرستگای گاورەکان بەتایبەت کڵێسای قیامەو هەڵوەشاندنەوەی حەجی گاورەکان (ئەوانەی کەباوەڕیان بەسیانەی پیرۆز هەیە) بەڵام ئەو بەرپەرچیدانەوەو وتی : بۆچی بیروخێنین، لەکاتێکدا کەئەوان ئامانجیان لەپەرستشەکەیاندا بریتییە لەشوێنی خاچ‌و گۆڕە پیرۆزەکە نەك بیناکەی دەرەوە؟ هەربۆیە ئەگەر بیناکەش لەگەڵ زەویدا تەخت

---

[1] حروب القدوس فی التاریخ الأسلامی والعربی، ل: ١٠٨.

بکەین، ئەوە تایفە گاورە جیاجیاکان هەرگیز وازناهێنن لەهەوڵدان بۆ گەشتن بەم ناوچانە، جا باوەك پێشەوا عومەر بکەین کەئەم بینایەی پاراست کاتێك کە لەسەرەتایی ئیسلامیدا قودسی رزگارکرد، غروسیەش لەسەر ئەمە دەڕوات دەڵێت: هەرچی ئازادی بیرو باوەڕو را دەربڕین لەم سوڵتانە مەزنە هەبوو لەم دەستەواژە جوانەدا بەرجەستە دەبێت[1]، شاعیر أبو الحیص بیص شهاب الدین یش راستی وتووە کاتێ وتویەتی:

ملكنا فكان العفو منا سجية — فلما ملكتم سال بالدّم أبطح

وحلّلتم قتل الأسارى وطالما — عدونا على الأسرى نمنٌّ ونصفحُ

وحسبُكم هذا التفاوت بيننا — وكل وعاءٍ بالذى فية ينضحُ[2]

لەراستیدا سەلاحەدین بەرەوشتو ئاکارە جوانەکانی پاشاو سەرکردەکانی رۆژئاوایی سەرسامکرد، کەسەرکردایەتی سوپاکانیان دەکرد لەشامدا تەنانەت فەرەنسیەکان دەیانوت: خوێنی خوێنێکی فەرەنسییە، ئیتالیو ئەڵمانیەکانیش چیرۆکی زۆریان دانابوو لەسەر ئاکاری سەلاحەدینو لەشارو گوندو شانۆکانیاندا باسیاندەکرد[3]، بەراستی سەلاحەدین پیاوێکی موسڵمانبوو بەتەواوی مانای ئەو وشەیەو شوێنکەوتووی پێغەمبەر(د.خ)بوو لەلێبوردەییو میهرەبانیو بەخشندەییدا، یەکێك لەمێژوونوسە ئەوروپیەکان دەربارەی دەڵێت: لەیاداوەریدا دەمێنێتەوە کەسەردەمێکی خوێناویو توندی وەك ئەو سەردەمە نەیتوانی مرۆڤێك بگۆرێت کەدەسەلاتێکی مەزنی هەبوو، ئەو کەسەش سەلاحەدینە[4]، گەورەترین بەڵگەش لەسەر رێزگرتنی فرەنجەکان بۆ ئەو پاڵەوانێتیە کەم وێنەو لێبوردەیە مەزنە گرنگیدانی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بوو بەسەردانی گۆڕی سەلاحەدین کاتێ کەسەردانی وڵاتی شامی کرد لەساڵی ١٣١٥ك/ ١٨٩٩ز دا بەهاوڕێیەتی شاژنی ئیمپراتۆر، لەوێش وتارێکی دا کەستایشی سەلاحەدینی تیاداکردو شاژنیش چەپکەیەك گوڵی نارد هەتاوەکو لەسەر گۆڕی ئەو پاڵەوانە مەزنە دابنرێت، ئەمیری شاعیرانیش( ئەحمەد شەوقی) لەیادی نەچووە ئەم یادەوەریە تۆمار بکاتو دەڵێت:

عظيم الناس من يبكى العظاما — ويند بهم ولو كانوا عظاما

فهل من مبلغ غليوم عني — مقالاً مرضيا ذاك المقاما

---

[1] حروب القدوس فى التاريخ الأسلامى والعربى، ل: ١٠٨.

[2] شذات الذهب(٦/٤١٠).

[3] الوجيز فى الشام أرض الأنبياء ومهد الأصفياء، ل: ٦١.

[4] الوجيز فى الشام أرض الأنبياء ومهد الأصفياء، ل: ٦١.

| | |
|---|---|
| رعاك الله من ملك همام | تعهَّد في الثرى ملكاً هماما |
| أرى النسيان أظمأه فلما | وقفت بقبرهِ كنت الغماما |
| أتدرى أىّ سلطان تحيىّ | وأىَّ مملّكٍ تهدى السلاما |
| دعوت أجلَّ أهل الأرض حرباً | وأشرفهم اذا سكنوا سلاما[1] |

**چوارەم: یەکەمین نوێژی هەینی لەبەیتولمەقدیسدا:**

کاتێك کەبەیتولمەقدیس پاککرایەوە لەو خاچو زەنگو بەرازو قەشەو راهیبانەی کەتیایدا بونو خەڵکانی باوەڕدار چوونە ناویەوە، بانگی تێدا دراو قورئانی تیادا خوێنرایەوەو شوێنەکەی پاککرایەوەو شەیتانی تیادا دەرپەڕێندرا، یەکەم نوێژی هەینیش لەچوارەمی شەعباندا بو دوای رۆژی ئازادکردنی بەهەشت رۆژ، ئەوە بوو مینبەریان لەتەنیشت میحرابەکەوە داناو فەرشی باشیش تیادا راخراو قەندیلو گڵۆپی تیادا هەڵواسراو قورئانی تیاداخوێنرا لەبری ئەو ئینجیلە شوێنراوەی کەپێشتر دەخوێنرا، پاشان نوێژی تێداکراو کڕنوشی زۆری تێدا براو پەرستیشی جۆراو جۆری تیادا ئەنجامدراو نزای زۆرو بەرەکەتی زۆری تیادا باریو کێشەکان رەوینەوەو نوێژەکان بەرپاکرانو بانگ بەرزکرایەوە زەنگ بێدەنگ کراو بانگوێژان هاتنو قەشەکان نەمانو دەرونەکان ئاسودە بوون خۆشی هاتو پەستی باری کردو خوا ناسانو دنیا نەویستەکان مزگەوتیان ئاوەدان کردەوە، ...

پاشان خوا بەتاکو تەنها پەرستراو کڕنوش زۆر بوو و مزگەوت پڕبوو دڵە نەرمەکان فرمێسکیان بەچاواندا هات، ئەمە رۆژێکی پیرۆزەو فەزڵێکی گەورەیەو ساڵێکی خۆشە، رۆژێکە نزاکان تیایدا گیرا دەبنو بەرەکەت دەبارێتو لەهەڵەو کەموکورتیەکان دەبوردرێت، پاشان بانگوێژەکان بانگی نیوەڕۆیان فەرمووو دڵەکان خەریك بوو لەخۆشیدا دەفرینو سوڵتانیش تا ئەو کاتە وتاربێژی دیارینەکردبوو، بەڵام کۆمەڵە زانایەك خۆیان بۆ ئامادەکردبوو نەبادا ئەو ئەرکەیان پێبسپێرێت، پاشان مەرسومی سوڵتانی سەڵاحی دەرکرا لەقبة الصخرةدا کەقاضی محی الدین زەنکی ئەمڕۆ ببێتە وتاربێژ، ئەوویش جبە رەشەکەی لەبەرکردو چووە سەر مینبەرو خوای گەورەش جوانی پارێزکاری پێبەخشیبوو، لەگەڵ شکۆو شکۆمەندیدا، ئەوەبوو وتارێکی گەورەی سوننی رەوانبێژانەی خوێندەوەو تیایدا پلەو پایەی بەیتولمەقدیسی باسکردوو ئەو فەزڵو مژدەو بەڵگەو نیشانانەی باسکرد کە لەبارەیەوە هاتووەو ئەو نیعمەتە گەورەیەی کەخوای گەورە بەئامادەبووانی بەخشیوە کەبەرامبەرە بەچەندین خێری گەورە، شیخ شهاب الدین أبو شامەش لەالروضتیندا بەتەواوی وتارەکەی هێناوە، یەکەم جاریش کەقسەی کرد ووتی ( الأنعام: ٤٥) خوێندەوەو ئیتر ئەو

[1] صلاح الدين الأيوبي، أحمد عبدالجواد، ل:٥١.

گەلــەی ســتەمیان کــردو بێبڕوابــوون بێبڕکــراون...(تەفــسیری ئاســان، ل: ١٣٣). پاشــان سوپاسگوزاریەکانی قورئانی وتو ئینجا وتی:

١- **توانای پەروەردگار لەبەدەستهێنانی سەرکەوتندا:** سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەدەسەڵاتی خۆی هاوەڵگەری سەرشۆڕکردو بەفەرمانی خۆی کاروبارەکانی ڕێکخستو بەسوپاسگوزاری نیعمەتەکانی بەردەوامکرد، کافرانی بەویستی خۆی لەناوبردو بەدادگەری خۆی دەسەڵاتی ئاڵوگۆڕکردو سەرەنجامی دایە دەست پارێزکارانو بەندەکانی خستە سایەی خۆیەوەو ئاینەکەی سەرخست بەسەر هەموو ئاینەکانداو بەدەسەڵاتە بەسەر بەندەکانیدا، سوپاسی ئەکەم لەسەر سەرخستنو سەرفرازکردنی لایەنگرانیو پاککردنەوەی ماڵە پیرۆزەکەی لەپیسی هاوەڵگەری.

٢- **ستایشکردنی پێغەمبەری سەروەر (د.خ)و هاوەڵانی:** گەواهی ئەدەم کەتەنها الله خوایەو هاوەڵی نییە، تاکی بێ هاوتاو بێ منداڵو هاوشێوەیە، شایەتی کەسێك کە بەیەکتاپەرستی دڵی پاکردبێتەوەو خوای لەخۆی رازیکردبێت، گەواهیشی دەدەم کەپێغەمبەر (د.خ) بەندەو نێردراویەتی رەوێنەری گومانو لەناو بەری هاوەڵگەریەو ئەو پێغەمبەرەی کە لەمسجد الحرام وە شەو رەوی پێکرا بۆ مسجدالأقصی و لەوێشەوە بڵند بوویەوە بۆ ئاسمانە بەرزەکانو سدرة المنتهی کەجنة المأوی لەلایە، (اذ یغشی السدرة مایغشی مازاغ البصر وماطغی) سڵاوی خوا لەسەرخۆشەویستو سدیقی جێنشینیو لەسەر عومەری کوڕی خەتاب یەکەم کەس کەخاچی لەم شوێنەدا نەهێشتو، لەسەر ئەمیری باوەڕداران عثمانی کوڕی عەفان ذی النورینو کۆکەرەوەی قورئانو لەسەر ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبوطالب تێکشکێنەری بتو لەبنهێنەری هاوەڵگەریو لەسەر بنەماڵەو هاوەڵانو شوێنکەوتوانیان بەچاکە[1].

٣- **رازیبوونی پەروەردگار لەموجاهیدەکان( تێکۆشەرو خەباتگێڕەکان ):** ئەی خەڵکینە، مژدە بێت لێتان رەزامەندی پەروەردگار کەئامانجی سەرەکیو پلەی بەرزە بۆ ئەو کارەی کەخوای گەورە لەسەردەستی ئێوە ئاسانی کرد، لەگەڕاندنەوەی ئەو ونبووە بۆ ئەم ئوممەتەو ونبووەو گێڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی لەئیسلامدا، دوای ئەوەی بەدەست هاوەڵگەرانەوە بۆ ماوەی سەد ساڵ سوکایەتی پێکراو، پاککردنەوەی ئەم ماڵەی کەخوای گەورە دایناوە بۆ بەرزکردنەوەی ناوی خۆی تیایداو دورخستنەوەی هاوەڵگەری لێی، دوای ئەوەی کە لەسەر یەکتاپەرستی بنیاتنرا.

---

[1] البدایة والنهایة (١٦/٥٩٠).

٤- **فەزڵ و پلەو پایەی مزگەوتی ئەقسا:** زێدی باوکتان ئیبراهیم و ڕەوگەی محمد پێغەمبەرتان (ﷺ)و ئەو ڕوگەیەیە کەڕووتان تێدەکرد لەنوێژەکانتاندا لەسەرەتای ئیسلامدا، بارەگای پێغەمبەران و نیازی پیاو چاکان و شوێنی دابەزینی سروش و وەحی و شوێنی دابەزینی ئەمرو نەهی پەروەردگار، لەدەشتی کۆبوونەوەو کەناری بڵاوبوونەوەدایەو ئەو زەویە پیرۆزەیە کەپەروەردگار لەکتێبە ڕونەکەیدا باسیکردووە. هەروەك ئەو مزگەوتەی کەپێغەمبەر (ﷺ)نوێژی بەفریشتە نزیکەکان تێداکردو ئەو وڵاتەی خوای گەورەو بەندەو پێغەمبەرەکەی خۆی و ئەو وشەیەی کەهاویشتی بۆ مەریەم کەئەویش عیسایە کەخوای گەورە شەرەفمەندی کرد بەپەیامی خۆی و پێغەمبەرێتی پێ خەڵات کرد بێ ئەوەی لەپلەی بەندایەتی بخات خوای گەورەش دەفەرموێت ﴿لَنْ يَسْتَنْكِفَ الْمَسِيحُ أَنْ يَكُونَ عَبْداً لِلَّهِ﴾ (النساء:١٧٢)، واتە: هەرگیز مەسیح لاری لەوە نییە کەبەندەی خوا بێت...، (تەفسیری ئاسان، ل: ١٠٥). هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ﴾ (المائدة:٧٢)، واتە: سوێندبێت بێگومان ئەوانە بێباوەڕ بوون کەوتیان: بەڕاستی خوا، هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە،...تد(تەفسیری ئاسان، ل: ١١٠). هەروەها قودس یەکەمین ڕووگەو دووەم مزگەوت و سێیەم حەرەمی پیرۆزەو دوای دوو حەرەمەکەی تر بۆ هیچ شوێنێك کوڵ و بار ناپێچرێتەوە دوای دوو حەرەکەی تر تەنها بۆ ئەوێ نەبێت.

٥- **پیرۆزبایکردن لەسەڵاحەدین و سەربازە موسڵمانەکانی بەهۆی سەرکەوتنەوە:** ئەگەر ئێوە لەو کەسانە نەبونایە کەخوای گەورە هەڵیبژاردوون ئەوە ئەم چاکەیەی پێنەدەبەخشین، کەکەس ناتوانێت هاوشانتان بێت تیایدا، دەسا خۆشبەختی بۆ ئێوە کەسوپایەکن سەراسیمە لەسەر دەستتان بەدیهاتووەو جەنگی بەدریتان تۆمارکردووەو لێبڕانی ئەبو بەکریتان دەستکەوتوو ئازادیسازی عومەریتان ئەنجامداوسوپای عوسمانیتان بەڕێخستوو پەلاماری عەلی ئاساتان داوو ڕۆژەکانی قادسیەو یەرموکتان بۆ ئیسلام نوێکردەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی خەیبەری و هەڵمەتی خالیدیتان تۆمارکرد، دەسا خوای گەورە پاداشتان بداتەوە لەبری محەمەد (ﷺ) بەباشترین پاداشت و ئەم داستانە مەزنەتان لێوەرگرێت و بەهەشت بکاتە شوێنتان کەشوێنی خۆشبەختانە.

٦- **سوپاسکردنی پەروەردگار لەسەر سەرکەوتن:** قەدری ئەم نیعمەتە بزانن و هەستن بەئەرکی سوپاسکردنی پەروەردگار، چونکە ئەو ئەم نیعمەتەی تایبەتکردووە بەئێوەوەو هەڵیبژاردون بۆ ئەم خزمەتە، ئەمەیە ئەو ڕزگاریەی دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کراوەتەوەو بەڕوناکی خۆی

روومەتـە تاریکـەکانی گـەش کردۆتـەوەو فریشتە نزیکـەکانی پێـی خۆشـحاڵ بـوونو چـاوی پێغەمبەرونێردراوانی پێ روونبۆتەوە، چیتان دەوێت لەوە زیاتر کەخوای گـەورەی کردوونـی بـەو سـوپایەی کـە لـەئاخر زەمانـدا قـودس لەسـەر دەسـتی ئـازاد دەکرێـتو گێڕاونـی بـەو سەربازانەی کەدوای پێغەمبەرایەتی بەماوەیەك بەشمشێرەکانیان ئاڵای باوەڕ بەرزدەکەنەوە.

٧- **فـەزڵی قـودسو مزگـەوتی ئەقـسا(الأقـصی)**: ئایـا ئەقـسا(الأقـصی) ئـەو ماڵـە نییـە کەپەروەردگار لەکتێبەکەیدا ناوی بردووە فەرموویەتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ (الإسـراء: ١)، واتـە: پـاکیو بێگـەردیو سـتایش بـۆ ئەوزاتـەی کەشـەو رەویکرد لەبەشێکی کەمی شەودا بەبەندەی خۆی محەمەد (ﷺ) لەمزگەوتی حەرام (کەعبەی پیرۆز) بـۆ مزگـەوتی (الأقـصی) لـەبیت المقـدس کـەدەورو بـەریمان پـیرۆزو پـڕ بەرەکـەت کردووە...(تەفسیری ئاسان، ل: ٢٨٢). ئایا ئەو ماڵە نییە کەپاشاکان بەگەورەیان زانیووەو پێغەمبەران ستایشیان کردووەو چوار کتێبە دابەزێنراوەکەی لەلایەن پەروەردگارتانەوە تیادا خوێنراوەتەوە؟ ئایا ئـەو مـاڵا نییـە کـەخوای گـەورە خـۆری تیـادا بەسـەر یوشـع وە راگـرت هەتاوەکو ئاوانە بێت لەبەر خاتری ئەو؟ ئایا ئـەو ماڵـە نییـە کـەخوای گـەورە فـەرمانی کـرد بەموسا کەفەرمان بدات بەگەلەکەی بۆ رزگارکردنی، کـە تـەنها دوو پیـاو وەڵامیـان دایـەوەو خـوای گـەورەش لەبـەر ئـەوە لێیـان تـوڕە بـوو، توشـی گـومڕایی کـردن وەك سـزایەك بۆیاخیبونیان؟

٨- **سوپاسو ستایشی پەروەردگار**: سوپاسی ئەو خوایە بکەن کەئیرادەی پێدان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی کە بەبەنی ئیسرائیلی نەدا، لەکاتێکدا کەفـەزڵی دابـوون بەسـەر خـەڵکانی تـرداو ئێـوەی سـەرکەوتوو کـرد بـۆ کارێـك کەخـەڵکانی تـر پـێش خۆتـان تیایـدا شکستیان هێنـاو ریزەکانی یەکخستن دوای ئەوەی کەپەرتەوازەو ناکۆك بوون، بووو بەدیهات دەبێتو بـەڵکوی لەکۆڵ کردنەوە.

٩- **فریشتەکان ستایشی پەروەردگاردەکەن بۆ موجاهیدەکان**: مژدە بێت لێتان بـەوەی کـەخوای گەورەی لای خۆی باسی کردوونو بەسەربازی خۆی لەقەڵەم داونو فریشتە دابـەزێنراوەکان سوپاسیان کردوون لەسـەرئەو دیاریـەی کەپێشکەش بـەم ماڵـەتان کـردووە لـەبۆنی خۆشـی یەکتاپەرستیو بڵاوکردنەوەی پیرۆزیو سوپاسگوزاریو ئەو ئازاری هاوەڵگەریو سێ بەشـی

خواو بیرو باوەڕە نارەووایەی کە لەرێی لاتان داوە، ئیستا فریشتەی ئاسمانەکان داوای لێخۆشبونتان بۆ دەکەن و سڵاوات و درودی پیرۆزتان بۆ دەنێرن.

١٠- **نەهێکردن لەتاوانکاری و لەخۆباییوون:** رەحمەتی خواتان لێبێت ئەو بەهرەیە لەخۆتاندا بپارێزن و ئاگاداری ئەو نیعمەتە بن، بەترسان لەپەروەردگار، چونکە هەر کەسێ دەستی پێوەبگرێت پارێزراو دەبێت، ئاگاشتان لەشوێنکەوتنی ئارەزووو پاشەکشکردن بۆ دواوەو پالدانەوە بێت لەبەرامبەر دوژمندا، هەلەکان بقۆزنەوەو لەپێناو خودادا جیهاد بکەن و خۆتان لەپێناو رەزامەندی خوادا بفرۆشن، چونکە ئێوەی کردووە بەبەندەی خۆی.

١١- **سەرکەوتن تەنها لای خوایە:** وریابن شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێت و سەرکەشی نەتانگرێتەوەو وابزانن ئەم سەرکەوتنە بەهۆی شمشێرە تیژو ئەسپە باشەکان و لێهاتووی خۆتان بووە نەخێر بەخوا(الأنفال: ١٠).

١٢- **دورکەوتنەوە لەتاوان:** ئاگاتان لەخۆتان بێت بەندەکانی خوا پاش ئەم سەرکەوتنە مەزن و بەخششە گەورەیە، نەکەن تاوانی گەورە ئەنجامبدەن، هەتاوەکو وەك ئەو ژنەتان لێنەیەت کەخوریەکەی کردەوە بەریس یان وەك ئەوەی کەخوای گەورە دەسەلاتی پێدا، بەلام لێی هەلگەڕایەوەو دوای شەیتان کەوت و چووە ریزی سەر لێشێواوانەوە.

١٣- **بانگەوازێك بۆ بەردەوام بوون لەسەر جیهاد( بۆ درێژەپێدان بەجیهاد ):** جیهاد باشترینی پەرستش و نەریتەکانە، خوای گەورە سەربخەن سەرتان دەخات و یادی بکەن یادتان دەکات،سوپاس گوزاری بن بۆتان زیادەکات و سوپاسیشتان دەکات، پەلەبکەن لەچارەسەرکردنی برین داو برینەوەی دەستی دوژمنان و پاککردنەوەی پاشماوەی ئەو زەویەی کەخواو پێغەمبەری توڕەکردوە، لق و پۆپ بێ باوەڕی ببڕن و ریشەی دەربێنن، چونکە رۆژگار داوای شۆڕشی ئیسلام و ئاینی محمد د.خ دەکات. اللەاکبر سەرکەوتنی خوایی نزیکە وەك چۆن تائێستا ئێوەی سەرخستوەو بێ باوەڕی سەرشۆڕکردوە.

١٤- **بانگەوازێك بۆ رزگارکردنی ئەو زەویە پیرۆزانەی کە بەداگیرکراوی ماونەتەوە:** بزانن رەحمەتی خواتان لێ بێت کە ئەمە هەلەو بیقۆزنەوەو ئەرکێکە بەهیمەتەوە بۆی دەرچن و سوربن لەسەری چونکە دەرەنجامی کار بەکۆتاییەکەی دا دیارەو دەسکەوتیش بەو گەنجینەیەدا دەردەکەوێت کەدەستخراوە، خوای گەورە بەسەر ئەو دوژمنە شکستخواردوە دا زالی کردن لەکاتێکدا کەهێندەی ئێوەیاخ﴾ زیاتربوون، ئەی ئێستا چۆن سەرناکەون کەئێوە بیست هێندەی ئەوانن ( إِنْ يَكُنْ مِنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ) (الأنفال:٦٥)

واتە: ئەگەر بیست خۆڕاگر هەبێت لەئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دوو سەد کەس لەبێ باوەڕاندا زاڵ دەبن (تەفسیری ئاسان، ل: ١٨٥)، خوای گەورە لەگەڵ ئێوەدا یارمەتیمان بدات بۆ شوێنکەوتنی فەرمانەکانیو دورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکانیو سەرکەوتنی خۆیان پێببەخشێ﴿إِنْ يَنْصُرْكُمُ اللَّهُ فَلا غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ (آل عمران: ١٦٠)، واتە: ئەگەر خوا سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت ئەوە هیچ کەس ناتوانێت سەرکەوێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەربدات ئەوە کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکتان بکاتو سەرتان بخات)) تەفسیری ئاسان، ل: ٧١.

١٥- **چەند نزایەك بۆ سوڵتان سەلاحەدین و موسڵمانان لەئاینو دونیایان دا:** وتاری دووەمیش نزیکە لەوتاری ئاساییەوە، ئەوەبوو دوای نزاکردن بۆ خەلیفە وتی: پەروەردگار: دەستەڵاتی بەندەکەت بەردەوام بکەیت بەملکەچی گەورەیی تۆو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانت، دانپیادانەری بەهرەکانتە شمشێری تیژو پارێزەری ئاینو بەرگریکاری ماڵەکەت پاشماوەی گەورەو سەرکەتوو، کۆکەرەوەی وشەی ئیمانو چەوسێنەری خاچپەرستان سەلاحەدینو دونیا سوڵتانی ئیسلامو موسڵمانان پاککەرەوەی بەیتولمەقدیس، باوکی سەرکەوتوومان یوسفی کوڕی ئەیوب زیندووکەرەوەی دەوڵەتی ئەمیری باوەڕداران.

- خوایە گیان دەسەڵاتی بەسەر زەویدا بڵاوبکەرەوەو بەفریشتەکانت دەوری ئاڵاکانی بدەو لەبری ئەم ئاینە پاکە بەباشی پاداشتی بدەرەوەو لەبری ئوممەتی محەمەدیش(ﷺ) سوپاسی لێهاتوییو بەردەوامی بفەرمووە.
- پەروەردگار ئەم پیاوە بهێڵەرەوە بۆ ئیسلامو بانگەوازەکەی لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوای زەویدا بڵاوبکەرەوە.
- خواە گیان چۆن لەسەر دەستی بیت المقدست رزگارکرد دوای ئەوەی گومانی جۆراو جۆر براو موسڵمانان تووشی تاقیکردنەوە بوون، بەهەمان شێوە شوێنەکانی تری زەوی لەسەر دەستی رزگار بکەنو بێباوەڕان ملکەچ بکە بۆیوهەموو کۆمەڵەکانیان لەسەردەستی پەرتەوازەبکەو سەرکەوتنی یەکجاتری پێببەخشە.
- خوایە گیان لەبری محەمەد (د.خ) سوپاسی بکەو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی بگەیەنە رۆژهەڵاتو رۆژئاواو ناوەراستو سنوورو هەموو ناوچەکانی وڵاتی بۆ چاك بکە.
- پەروەردگار لوتی بێباوەڕان بشکێنەو دەسەڵاتی بەهەموو وڵاتدا بلاوبکەرەوەو سەربازەکانی بگەیەنەرە هەموو شارو وڵاتەکان.

•خوایه گیان دەسەلآت لەخۆیو پشتو نەوەکانیدا بەردەوام بکە هەتاوەکو ڕۆژی دواییو کوڕو براکانی بپارێزەو بیانکە بەپشتیوان بۆی. پەروەردگار هەروەك چۆن لەسەردەستی ئەم کارە چاکەت بەدیهێنا کەبەدرێژای ساڵ و ڕۆژەکان دەمێنێتەوەو باس دەکرێت، بەهەمان شێوە دەسەلآتی هەتا هەتایی بێ کۆتایی لەدار المتقیندا پێببەخشەو ئەم نزایەی قبوڵ بفەرمووە: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾ (النمل:١٩).

•پاشان نزای ئاسایی کرد[1]، پاش نوێژی نیوەڕۆش شیخ زین الدین أبو الحسن علی کوڕی نجای میسری لەسەر کورسی (وەعز) دانیشت لەسەر ئیزنی سوڵتانو ئامۆژگاری خەڵکی کرد، کاتێکی خۆشو حاڵەتێکی باش بوو بۆ ستایش بۆپەروەردگارو، پاشان قاضی محی الدین کوڕی زەکی بۆ ماوەی چوار هەفتە وتاری بۆ خەڵکی خوێندەوە، دواتر سوڵتان وتاربێژێکی هەمیشەی بۆ قودس دیاریکردو ناردی بۆ حەلەبو ئەو مینبەرەیان هێنا کە الملك العادل نورەدین مەحمود دایٔنابوو بۆ بەیتولمەقدیسو بەهیوا بوو کەرزگارکردنی ئەو شارە لەسەر دەستی ئەو بێت، بەلآم لەسەر دەستی شوێنکەوتوانی بوو پاش کۆچی دوایی[2].

**پێنجەم: مینبەری نورەدین لەبەیتولمەقدیسدا:**

الملك العادل نورەدین مەحمود زەنکی ڕەحمەتی خوای لێبێت بەنوری باوەڕی هەستی بەئازادکردنی بەیتولمەقدیس دەکرد لەپاش خۆی هەر بۆیە فەرمانی دا بەدروستکردنی مینبەرێك بۆ قودس کەدارتاشو پیشەسازو ئەندازیارەکان چەند ساڵێك لەدروستکردنیدا ماندوو بوونو داهێنانیان کرد لەدروستکردنیدا لەڕووی تۆکمەو جوانییەوەو چەند هەزارێکی لەجوانکاریو تۆکمەیدا سەرف کردو بەجۆرێك بوو کەهەمیشە دەناسرایەوەو لەمزگەوتی حەلەبدا دانرابوو، هەتاوەکو سوڵتان فەرمانیدا بەهێنانی بۆبردنە سەری نەزرەکەی نورەدین، پاشان مینبەرەکە گوێزرایەوە بۆ قودسو بەم شێوەیەش کەرامەتەکەی نورەدین دەرکەوت کەڕوناکی پاش چەند ساڵێك درەوشایەوە، چونکە ئەو لەو چاکەکارانە بوو کەخوای گەورەلەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (آل عمران:١٣٤)[3]، واتە خوای مهرەبانیش چاکەکارو چاکەخوازی خۆش دەوێت.(تەفسیری ئاسان، ل: ٦٧). لەریوایەتێکی عمادی ئەسفەهانیشدا هاتووە: هەمیشە ڕوناکی

---

[1] كتاب الروضتين (٣/٣١٩).

[2] البداية والنهاية (١٦/٥٩٢).

[3] كتاب الروضتين (٣/٣٩٤).

دین لەدڵی نورەدیندا بوو، پارێزگاریشی بووە ئاسەوارێك بۆ پارێزگاران، ئەو دونیا نەویسترین خواپەرستو خواپەرسترین دونیا نەویست بوو، لەئەولیا پاكو لەخواترسە هەرە باشەكان بوو، بەنوری فیراسەتی بینی كەئازادكردنی بەیتولمەقدیس نزیكەو خوای گەورەش نزاكەی گیرا دەكات، ئەگەر چی پاش مردنیشی بێت، خوای گەورەش لەكەموكورتی دوری گرتبووو ئەو نهێنیەشی بۆئاشكرا كردبوو[1]. ئەوە بوو لەسەردەستی سەلاحەدین كەنورەدین پەروەردەی كردو خۆشیدەویستو خۆشی ڕێگەی ئازادسازی جیهادی پیشاندا ئەو شارە ئازادكرا ، دەڵێن لەسەردەمی نورەدیندا مزگەوتی حەلەب سوتاو پێویستی بەمینبەرێك هەبوو بۆیە ئەو مینبەرە دانراو دیمەنێكی جوانی بەمزگەوت بەخشی، دواتریش لەسەر شێوەی ئەوە بۆ مزگەوتی حەلەب مینبەرێكی تر دروستكرایەوەو هەركەسێك ئێستا بیبینێت مینبەری قودسی بیردەكەوێتەوە، كاتێ سوڵتان سەركەوت هەستا بەگواستنەوەی ئەو مینبەرەو دانانی لەمزگەوتی ئەقساداو هەموو لایەك نزایان بۆسەركەوتنی سەلاحەدینو بەر ڕەحمەت كەوتنی نورەدین دەكرد[2] ئەم كارەش بەڵگەیە لەسەر رادەی دڵسۆزی سەلاحەدین بۆ نورەدین كەهەوڵی زۆری دا بۆ بەدەستهێنانی یەكێتی ئیسلامی وەك ڕێخۆشكەریەك بۆ ریشەكێش كردنی بوونی خاچپەرستی لەوڵاتی شامدا، هەروەها ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەسەلاحەدین كاتێ دەوڵەتی زەنكییەكانی لەسەردەمی لاوازیدا لەناوبرد پاش كۆچی دوای نورەدین مەحمودوسپاردنی دەسەڵات بە الملك الصالح ئیسماعیلی كوڕی ، تەنها مەبەستی ئەوەبوو درێژە بدات بەو كاروانەو خۆی سازبدات بۆ جیهادكردن دژ بەخاچپەرستەكان بۆ دەرپەڕندنیان و گێڕانەوەی بەیتولمەقدیس[3].

### شەشەم: چاكسازییەكانی سەلاحەدین لەبەیتولمەقدیسدا:

سەلاحەدین هەستا بەلابردنی ئەو باڵەخانەو شورایانەی كەخاچپەرستەكان لەبەتولمەقدیسدا بنیاتیان نابوو، ئەوەبوو سوارەكانی داویە لەرۆژئاوای مزگەوتدا چەند خانوویەكیان بنیاتنابوو، بەشێك لەمزگەوتی ئەقساشیان خستبووە سەر خانوەكانیانو لەرووی میحرابەكەشەوە دیوارێكیان بنیاتنابوو و وەك خەزێنەی دانەوێڵە بەكاریان دەهێنا ، دەشڵێن: كردوویانە بەدەستشۆری

[1] خوای گەورە غەیبی پیشانی كەس نەداوە، بەڵكو ئەوە باوەڕبوونە بەسەركەوتنی خوایی دوای ئامادەكردنی هۆكارەكانی.

[2] كتاب الروضتين (٣/٣٩٣).

[3] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٣.

بۆسوکایەتی پێکردنی ئیسلام موسڵمانان[1]، هەروەها لەسەر بەردەکەی بیت المقدس کڵێسایەکیان بنیاتناو بەبینا دایان پۆشیوپڕیان کرد بوو لەوێنەوقەسابخانەیەکیان لەسەر دانابوو تیایدا شوێنی قەشەکانیان دیاری کردبوو و لەسەر لوتکەی قبة الصخرةش خاچێکی گەورەیان‌دا چەقاندبوو بەم شێویە روخساریان شێواندبوو، خەڵکە تەماعکارەکانیشیان هەستابوون بەبڕینی چەند بەشێکیو فرۆشتنی لەبازاڕەکانی قوستەنتینیەو دورگەی صقلیەداو گۆڕینەوەی بەکێشی خۆی لەزێڕ[2]، کاتێ ڕۆژی هەینی مانگی شباطی ٥٨٣ك/ ٩ی ئۆکتۆبەری ١١٨٧ز هات کەهەفتەی دووەمی ئازادکردنی قودس بوو، سەلاحەدین فەرمانیدا بەلابردنی هەموو ئەو شتانەی کەخاچپەرستەکان زیادیان کردبوو لەبیناو دیوارو دیواری بەردەم میحرابیشیان لابرد، هەروەها فەرمانیکرد بەلابردنی ئەو شتانەی کەبۆ قبة الصخرة زیادیان کردبوو لەبیناو وێنە، پاشان فەرمانیدا بە زانا ضیاء الدين هەکاری کەئەرکی سەرپەرشتی کردنی لەئەستۆبگرێتو چەند پەنجەرەیەکی ئاسنی بەدەوردا دروست کرد[3]، سەبارەت بەو خاچە ئاڵتونانەش کەخاچپەرستەکان بەسەر قبة الصخرةوە بنیاتیان نابوو، ئەوە ئیبن واصل باسی ئەوە دەکات کەموسڵمانەکان هەر کەچوونە ناو بەیتولمەقدیسەوە کۆمەڵێکیان چوونە سەر گومەزەکەو خاچەکەیان هەڵکەندو کەوتە خوارەوە، لەو کاتەشدا خەڵکەکە هەموو هاواریان کرد بەموسڵمانو فەرەنجەوە موسڵمانەکان لەخۆشیداو فەرەنجەکانیش لەخەمو داخدا[4].

کاتێك سەلاحەدین لەلابردنی زیادڕەویەکان بوییەوە دەستی کرد بەنۆژەنکردنەوەی مزگەوتی ئەقصاو هەوڵێکی زۆری دا بۆ جوانکردنو ڕەسیف کردنو ڕازاندنەوەی نەخشەکانیو جۆرەها کانزاو بەردی نایابی قوستەنتینی بۆ هێناو دەستی دایە نۆژەنکردنەوەی جوانکاریو نەهێشتنی ئەو وێنەو پەیکەرانەی کە بەدیوارەکانیەوە دروستکرابوو[5]، گرنگیەکی تایبەتیشی بەمیحرابەکەی داو جوانکاری زۆری تیادا ئەنجامدا[6]، پاشان حەوشەکەی پاکردەوەو ڕازاندییەوە بۆ ئەهلی ئیخلاصو هەموو پیساییەکانی لێدورخستەوە[7]، الملك المظفر تقی الدين عمريش چەند بارێك گوڵاوی هێنا بۆ قبة الصخرةو بەدەستی خۆی حەوشەکەی گسکدا، پاشان چەند جارێك بەئاو شتی هەتاوەکو

[1] كتاب الروضتين، له صلاح الدين والصليبيون وه، ل: ٢٢٢.

[2] مفرج المكروب(٢/٢٢٧-٢٢٩)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٢.

[3] مرآة الزمان، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٢.

[4] مرآة الزمان، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٢.

[5] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٣.

[6] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٣.

[7] كتاب الروضتين، له صلاح الدين والصليبيون ، ل: ٢٢٤.

پاکبوبیەوە پاشان دووبارە گوڵاوی پیاکردەوەو دیوارەکانی بەباشی شت، الملك الأفضل نورالدین علی کوڕی صلاح الدینیش فەرشی جوانو بەنرخی هێناو تیایدا رایخست[1].

هەروەها موسوڵمانەکان هەستان بەگسکدانی گۆڕەپانی مزگەوتو پاککردنەوەو ڕاخستنی فەرشو هەڵواسینی قەندیل تیایدا[2]، پاش لێبوونەوەی سەلاحەدین لەپاکردنەوەی مزگەوتی ئەقسا لەشوێنەواری پیسی خاچ پەرستان، هەستان بەدانانی وتاربێژو پێشنوێژو بانگوێژو موجەور بۆ مزگەوتی ئەقساو مزگەوتەکانی تر، هەروەها قورئانی زۆری بۆ هێناو هەستا بەبنیاتنانی مزگەوتو کڵێسایەکی کرد بەخوێندنگەیەك بۆ زانایانی شافیعی مەزهەب، ماڵی بەطریاکیشی کردە یانەیەك بۆ هەژارانو وەقفێکی زۆری بۆ دیاری کرد[3].

سەندنەوەی قودسیش لەخاچپەرستان گرنگیەکی تایبەتی هەبوو بۆ سەلاحەدینو پلەو پایەیەکی تایبەتی پەیدا کرد لەدڵی موسوڵمانانداو ئەتوانین بڵێین ئەگەر چی خەلیفە عومەری‌کوڕی خەتاب لەساڵی ١٥ی کۆچیدا قودسی لەژێر چنگی ڕۆمەکاندا دەرهێنا، بەڵام سەلاحەدینیش توانی ئەو یادەوەرییە نوێ بکاتەوە لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا دوای ئەوەی بەیتولمەقدیس دوچاری دەست درێژی خاچپەرستان بویەوە بۆ ماوەی نزیکەی سەد ساڵێك بەم کارە مەزنو پیرۆزەش سەلاحەدین بناغەی دانا بۆ موسوڵمانەکانی دوای خۆی بۆ لەناوبردنی پاشماوەی خاچپەرستەکان لەوڵاتی شامدا[4].

**حەوتەم: ناردنی مزگێنیو نێردراو بۆ ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی :**

بەسەندنەوەی بیت المقدس سەلاحەدین گەیشتە لوتکەی سەروەری سیاسیو سەربازی و باسی ئەو روداوە بەهەموو گۆشەیەکی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووەوە، سەلاحەدینیش خێرا مزگێنی نارد بۆ خەلیفەی عەباسی لەبەغداو بۆ سەرجەم ئەمیرو فەرمانرەوا موسوڵمانەکان، ئەبو شامە لەعیمادی ئەسفەهانییەوە ئەگێڕێتەوە کە لەئازادکردنی بەیتوالموقەدەسدا ئامادەنەبوو لەبەر نەخۆشییەك کەتوشی بوو کاتێ کەهەواڵی رزگارکردنی بەیتولموقەدیسی لەلایەن سەلاحەدینەوە بیست لەنەخۆشییەکەی رزگاری بوو، بەرەو لای سوڵتان بەرێکەوتو لەرۆژی شەممەی دووەم رۆژی ئازادکردنیدا گەیشتە لای، العماد دەڵێ: بەیانی زوو گەیشتمە لای ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو و زوو

---

[1] مفرج المكروب(٢/٢٣٠)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٤.

[2] صلاح الدين والعليبيون، ل: ٢٢٤.

[3] مفرج الكروب (٢٣٠١٢)، صلاح الدين والعليبيون، ل:٢٢٤.

[4] صلاح الدين والعليبيون، ل: ٢٢٤

مژدەی پێگەیاندم پێش ئەوەی بمبینێ، چونکە هاوەڵانی داوایان لێدەکرد کە زوو نامەی مزگێنی بنوسێت و بۆ رۆژئاواو رۆژهەڵاتی بنێرێت، ئەڵێ: لەو رۆژەدا حەفتا نامەی مزگێنیم نووسی، بەشێوەیەکی جوان و رازاوە، نامەیەکیان بۆ دیوانی بەغدا کە بەئایەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً﴾ (النور:٥٥)،

هەروەها وەفدێکیشی نارد بۆ لای ئیمپراتۆری بێزەنتی ئیسحاق ئەنجیلۆس و مژدەی ئەو سەرکەوتنە مەزنەی پێدا[1]، دواتر سەلاحەدین پێشوازی لەنێردراوو وەفدی پاشاو ئەمیرە موسوڵمانەکان کرد لەئەمیرە سەلجوقییەکانی رۆم و عێراق و خوراسان کەمەبەستی پیرۆزبایی لێکردنی بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە مەزنەوە سەردانیان کردبوو[2]، موسوڵمانەکانیش هەرکەبیستیان قودس رزگارکراوە پۆل پۆل کەوتنە رێ بۆ سەردانی مزگەوتی ئەقسای پیرۆز[3] سەلاحەدینش لەخێوەتگەکەیدا لەدەرەوەی بیت المقدس دا دانیشت بۆ پێشوازیکردن لەگەورە پیاوو ئەمیرو زانایانی کە لەهەموو لایەکەوە روویان تێکردبوو بۆ سەردانی بەیتولمەقدیس و پیرۆزبایی لێکردنی بەهۆی ئەم پلەو پایە مەزنەوە کەخۆی لەئازادکردنی بەیتولموقەدیسدا دەبینییەوە[4].

### هەشتەم: ناکۆکی سەلاحەدین لەگەڵ خەلیفەی عەباسیدا:

سەلاحەدین تووشی کەسایەتی الخليفه الناصر بوو کە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز بوو زۆر هەستیار بوو بەنازناوو رواڵەت، هەرچەندە خەلیفە ناصر کاتێ بوو بەخەلیفە، سەلاحەدینی وەك سوڵتانی ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی پەسەند کردو رێورەسمی تەواوی بۆ بەرێکرد، بەڵام پاش ماوەیەك نامەیەکی لەرێی وەزیرەکەیەوە بۆ ناردو تیایدا گلەیی ئاراستەکرد لەسەر چەند مەسەلەیەك کە پێی گەیشتبوو[5].

ابن الكثيريش ئەم ناکۆکییەی نێوان الخليفه الناصرو سوڵتان سەلاحەدینی کورتکردۆتەوەو ئەڵێ: ... خەلیفە نامەیەکی بۆ نووسی کەتیایدا گلەیی هەبوو لەچەند شتێك لەوانە ناردنی مزگێنی سەرکەوتنی حطين بەلاوێکی بەغدادی سادەدا کە بەلایانەوە شیاوی ئەوە نەبوو، مزگێنی

---

[1] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٢٠.

[2] كتاب الروختين(١٢٠١٢)، مفرج الكروب(٢٤٨١٢).

[3] السلوك (٩٧/١)، صلاح الدين والعليبيون، ل:٢٢١.

[4] كتاب الروختين (٩٦١٢)، صلاح الدين والعليبيون، ل ٢٢١.

[5] دراسة وثيقة التأريخ الأسلامى، ل: ٢٦٤.

ئازادکردنی بەیتولموقەدیسیشی بەکەسێکی خانەداندا ناردبوو، نازناوی الملك الناصریشی لەخۆی ناوبوو ئەمەش ململانێ کردنی الخلیفه الناصره، ئەوە بوو سەلاحەدین بەروویەکی خۆش‌و نەرم‌و نیانەوە پێشوازی لەنێردراوەکەی کردو گوێرایەڵی بۆ خەلیفە دەربڕی‌و نامەیەکیشی ناردو پۆزشی بۆ هێنایەوە بەوەی کەسەرقاڵبوونی بەجەنگەوە بواری بیرکردنەوەو وردبوونەوەی لەزۆر مەسەلەدا پێنەداوە،سەبارەت بەنازناوی الناصریش ئەوە لەسەردەمی خەلیفە المسبتضیءدا بووەو ئێستاش خەلیفە هەر نازناوێك دیاری بکات لاریم لێی نییە، بەم شێوەیە بەو پەڕی ئەدەبەوە لەگەڵ خەلیفەدا هەڵسوکەوتی کرد رەحمەتی خوای لێبێت[1].

**نۆیەم: ئامادەبوونی زانایان لەفتوحاتەکانی سەلاحەدیندا:**

زانایان‌و مامۆستایان لەگەڵ سەلاحەدیندا بوون‌و پشتیوانی تەواویان لێدەکرد، سەلاحەدینیش پاش حطین فتوحاتەکانی بەئازادکردنی عەککا دەست پێکرد لەرۆژی هەینی دووەمی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٨٣ك ١١٨٧ز دا چونکە لەلایەکەوە ئەوە رێگەیە کە بۆ بەتیولموقەدیس لەلایەکی تریشەوە هەتاوەکو بەئازادکردنی رێ لەو کۆمەکیانە بگرێت کە لەرێی ئەوروپاوە دەگەیشت بە خاچپەرستەکان لەم ئازاد سازییەشدا کۆمەڵێك لەزانایان بەشدارییان کرد لەپێشەوەیاندا القاضي الفاضل زانا جمال الدين عبداللطيفی کوڕی شێخ أبی النجيب سەهرەوەردی‌و زانا ضياءالدين عيسای هەکاری پاش رزگارکردنی عەککاش، القاضي الفاضل هەستا بەگۆڕینی کڵێسای گەورە تیایدا بۆ مزگەوت‌و فەرمانی دا بەدروستکردنی مینبەرو روگە پاشان نوێژی هەینی تیادا کرا. لەم بارەیەوە ئیبن ئەثیر ئەڵێ: ئەوە یەکەمین نوێژی جومعە بوو کە لەکەناری شامدا ئەنجام بدرێت، دوای دەست بەسەراگرتنی لەلایەن فرەنجەکانەوە[2]، لەو کاتەشدا زانا جەمال الدين عبداللطيف کوڕی الشيخ أبی النجيب سەهرەوەردی ئەرکی پێشنوێژو وتاربێژی گرتە ئەستۆ، پاشان سەلاحەدین دوای ئازادکردنی عەککا پۆستی وتار خوێن‌و دادوەری‌و چاودێری‌و وەستان لەشاری عەککادا پێسپارد[3]، سەبارەت بە زانا عیسی هەکاری ئەوە هەمیشە هاوڕێی سەلاحەدین بوو لە غەزاو جەنگەکانیدا، هەر بۆیە سوڵتان دوای فەتحی عەککا سەرجەم خانوو کەلوپەل‌و دانەوێڵەی سوارەکانی داویەی

---

[1] البداية والنهاية (٥٩٦/١٦).

[2] الكامل في التأرخ، لة دورالفقهاء والعلماء في الشرق الأدنى، ل: ١٤٤

[3] دور الفقهاء والعلماء في الشرق الأدنى، ل: ١٤٤

پێبەخشی ئەمەش وەك ڕێزلێنانێك بۆی‌و داننانێك بە پێگەو بەشداری لەجیهاددا دژ بەخاچپەرستەکان‌و لەپێناو هاندانی زیاتری بۆ بەخشین‌و هەوڵدان بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە[1].

ئەم هەڵوێستەی سەلاحەدینیش دەستپێشخەرییەك بوو کەکەس تیایدا پێشی نەکەوتبوو ، ئەم خەڵاتەش پێچەوانەی ئەو دەستکەوت‌و فەیئە بوو کە سەلاحەدین بەسەر سوپادا دابەشی کرد، سەرچاوە ئیسلامییەکانیش کۆدەنگن لەسەر بەشداری ژمارەیەکی زۆر زاناو شەرعناس لەگەڵ سەلاحەدیندا لەئازادکردنی بەیتولمەقدیسدا بەپێی وتەی مێژوو نوسەکان: زانایان لەمیسرو شامەوە بەجۆرێك ڕوویان تێکردبوو کەهیچ زانانیەکی ناسراو نەبوو کە ئامادە نەبێت[2]، شێخ أبو عومەری کوڕی ابنِ قدامەی مقدسی‌و موفق الدینی برای ابن قدامەش لەناو ئەو کەسانەدا بوون کە بەشدارییان لەم ئازادسازییەدا کردو لەزانا زۆر ناودارەکان بوون[3]، ابن کثیر ئەڵێ: ئەوو براکەی‌و خاڵۆزاکەیان الحافظ عبدالغنی والشیخ عمادی برای لەهیچ غەزایەك دوا نەدەکەوتن کە سەلاحەدین بۆ سەر وڵاتی فرەنجەکان ئەنجامی بدایە، وە لەفەتحی قودس‌و ناوچەکانی کەنارو شوێنەکانی تریشدا ئامادە بوون[4]، بەڵام سەلاحەدین لەگەرمەی خۆشحاڵیدا بەم سەرکەوتنە گەورەیە القاضي الفاضلی ڕاوێژکارو وەزیری لەبیر نەکرد. کە نەخۆشی بووە ڕێگر لەبەردەم ئامادەبونیداو ئەو کاتە لەدیمەشقدا بوو، ئەوە بوو سەلاحەدین نامەیەکی بۆ ناردو مژدەی پێدا ، لەڕوانگەی وشەکانی نامەکەشەوە ئەو خۆشەویستی‌و ڕێزە زۆرەمان بۆ دەردەکەوێت کە سەلاحەدین هەیبووە بۆ ئەم قاضیە بەڕێزەو تیایدا بە ئاوات بوو کە ئەو ئامادەبوایە هەتاکوو خۆشیەکە زیاترو تەواتر بوایە[5]. دوای ئەوەی کە خوای گەورە بەیتولمەقدیسی لەسەر دەستی سەلاحەدین ڕزگار کرد لەڕۆژی هەینی ٢٧ی ڕەجەبی ٥٨٣ك/ ئۆکتۆبەری ١١٨٧زدا هەستا بەدابەشکردنی ئەو موڵك‌و سامانەی کە لەخاچپەرستەکانەوە وەرگیرابوو لەبەرامبەر ڕزگارکردنی گیانیاندا بەسەر ئەمیرو زاناو ئامادەبوانی جەنگەکەدا، سەرجەمیشی سێ سەدو ئەوەندە هەزار دینار بوو[6]، پاشان لەخێوەتەکەیدا لەدەرەوەی قودسدا دانیشت بەو پەڕی تەواضوع‌و شکۆداریەوە لەنێوان زانایاندا بۆ وەرگرتنی

---

[1] دور الفقهاء والعلماء في الشرق الأدنى، ل: ١٤٤

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٥، لە : البداية والنهايةوە.

[3] هەمان سەرچاوە، ل ١٤٦.

[4] البداية والنهاية، لة (دور الفقهاء والعلماء المسلمين) وە

[5] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، ل:١٤٧

[6] هەمان سەرچاوە، ل:١٤٧.

پیرۆزباییەکان بە بۆنەی ئەم فەتحە مەزنەوە[1]. زانایانو شاعیرانیش هەستان بەپیرۆزبایی کردن لەسەلاحەدین بەچەند پارچە شعرێك کە تیایدا خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی بەم سەرکەوتنە مەزنەو لەنێوانیانیشیاندا شاعیری بەناوبانگ القاضی ابن سناء الملك هەبوو[2]. شایانی باسە کە هەردوو قاضي الفاضل و محی الدین الذکي لەناو ئەو زانایانەدا بوون کەزۆر خۆشحالو شادومان بوون بەئازادکردنی بەیتولموقەدیسو گەشبین بوون بەم کارە مەزنەو، پیرۆزباییان ئاڕاستەی سوڵتان کرد ئەمەش لەهۆنراوەیەکی ابن الذکي دا هاتووەکە بەبۆنەی سەرکەوتنی سەلاحەدین لەهێنانی حەلەب بۆ ناو یەکێتی ئیسلامی لەساڵی ٥٧٩ك/١١٨٣زدا وتوویەتی:

وفتحكم حلبا بالسيف في صفر مبشر بفتوح القدس في رجب

ئەم دێرە شعرەش یەکێکە لەو رێکەوتنە سەرسوڕهێنەرانەی کە روویداوە پێشبینییەکی باشە کەابن الذکی وتوویەتیو تیایدا مژدەی ئازادکردنی قودسی داوە لەرەجەبدا، ویستی پەروەردگاریش وابوو کە مانگی رەجەبی ساڵی ٥٨٣دا قودس رزگار بکرێت دوای ئەو مژدەیە بە ٤ ساڵ، رەنگە ئەم مزگێنیو مژدانەش پاڵنەرێك بووبێت بۆ سەلاحەدین بۆ هەوڵدانو پەلەکردن لەئازادکردنی بەیت لمەقدیس. لەم کاتە پیرۆزەدا کە هاوکاتە لەگەڵ شەوی شەوڕەویو بڵندبوونەوەدا[3]. هەروەها سوڵتان سەلاحەدین قاضی محی الدینی کوڕی زەکی هەڵبژارد بۆ وتاری هەینی وەك رێزو حورمەتێك بۆ ئەو دێرە شیعرەی کە پێشتر ستایشی سەلاحەدینی تیا کردبوو لەکاتی ئازادکردنی حەڵەبدا، کە تیاشیدا مژدەی ئازادکردنی بەیتولمەقدیسدا لەرەجەبدا پێدابوو، هەروەها لەبەر پلەو پابەی خۆیو بنەماڵە زنستخوازەکەیو راشکاویو هەقخوازیو فەزڵو لێهاتنەکانی لەبواری فیقەو ئەدەبدا، سەرباری ئەوەی کە بەهرەیەکی کەم وێنەو شێوازێکی نایابی هەبوو لەوتاربێژیو وروژاندنی گوێبیستانیدا[4].

لەمەی پێشەوەدا گەورەیی ئەو رۆڵەمان بۆ دەردەکەوێت کەزانایان پێی هەستان لەکاتی ئازادکردنی بەیتولموقەدەسدا، کاتێ کەچوونە ریزی موجاهیدە خۆبەخشەکانەوەو لەهەموو لایەکەوە بەرێکەوتن بۆ هەلگرتنی چەكو شوێنکەوتنی سەلاحەدین لەپێناو رزگارکردنی قودسی پیرۆزو ئاواتیشیان ئەوەبوو کەپلەی شەهید یان سەرکەوتن بەدەست بهێنن: خوای گەورەش

---

[1] كتاب الروختين (٩٦١٢).

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، ل:١٤٧

[3] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل:١٤٩.

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ١٥٠

هەوڵەکانیانی بەسەرکەوتن کۆتایی پێهێناو قودس‌و مزگەوتی ئەقسای گێرایەوە بۆ موسوڵمانان، بەڵام رۆڵی ئەوان پاش ئەمە کۆتایی پێنەهات، بەڵکو ئەم ئازادکردنە پاڵنەرێکی بەهێز بوو ورەیانی بەرز کردەوە وەك لە وتارەکەی قاضی ئیبن ذکي دا بۆمان دەردەکەوێت کە هەستا بەهاندانی موسوڵمانەکان بۆ درێژەدان بەجیهاد هەتاکو سەرجەم خاکی موسوڵمانان لەدوژمن پاك دەکرێتەوە، هەروەها ئەمەمان لەئاموژگارییەکەی زانا ئیبن نەجاشەوە بۆ روون دەبێتەوە[1]، لەو کردەوە مەزنانەی تریش زانایان لە بەیتولمەقدیسدا لەپاش ئازادکردنی پێی هەستان، ئەوە بوو زانا ضیاءالدین عیسی ی هەکاری پێی هەستا کاتێ پەنجەرەی ئاسنی بۆ (قبه الصخرة) دروست کرد بۆ پارێزگاری لێکردنی دوای ئەوەی کەسوڵتان سەلاحەدین ئەو شتە نارەواو وێنەو خاچانەی دەوروبەری لابرد[2].

**دەیەم: لەهۆنراوەکانی شاعیران دەربارەی ئازادکردنی قودس:**

بۆ ئەم ئامانجە مەزنانە لەسەرو بەندی ئەم سەرکەوتنە مەزنەدا[3] هۆنراوە دەوترێت.

١- دەگێرنەوە کە لاوێکی موسوڵمان دیل بووە لەبەیتولمەقدیسداو خەڵکی دیمەشق بووە چەند دێرە شعرێکی نووسیوە بۆ سەلاحەدین کە تیایدا بانگهێشتی کردووە بۆ ئازادکردنی بەیتولمەقدیس‌و تیایدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| يا أيها الملك الذي | لمعالم الصلبان نكّس |
| جاءت اليك ظلامة | تسعى من البيت المقدس |
| كل المساجد طهرت | وأنا على شرفي منجس |

٢- شاعیر الجیلانی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أبا المظهر أنت المحيي لهدى | أخرى الزمان على حبر بخبرته |
| فلو رآك وقد حزت العلا عمر | في قلة التل قضى كنه عبرته |
| ورآك وأهل القدس في وله | أبو عبيدة قدى من مسرته |
| غداة جزوا النواصي في قمامته | وأعوالوا بالتباكي حول صخرته |
| دارت بكك الملة الحسنى فنحن على | عهد الصحابة في استمرار مرته |
| وأنت كاسمك صديق وصاحبه | الملك المظفر سام في مبرته |

---

[1] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، ل:١٥٣

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، ل:١٥٣.

[3] واقدساه(٣٤٢١١).

وفي السلالة عثمان سؤيده … علا علي على إيثار نصرته

وكم لديك ذوي قربى رقوا … وكم بعيد رأى الزلفي بهجرته

يشبه القبح ما بين البزاة لقى … ملك الفرنج أخيذت بين عترته أما رأيت

معالي يوسف نسقت … حتى رمت كل ذي ملك بحسرته

أضحى لنشر الهدى في فتح منهجه … وبات يطوي العدى في سد ثغرته

واستقبح الرجس ممنوا بمشهده … فاستفتح القدس محشوا بزمرته

لكن بأس صلاح الدين أذهلهم … بوقعة التل واستشرى بسورته

تعيا الجوارح و الفرسان وهو على … بدء النشاط عشيا مثل بكرته

يا فاتح المسجد الأقصى على بهم … وقانص الجيش لا يحصى بقفزته

أبشر بملك كظهر الشمس مظلع … على البسيطة فتاح بشرته

حتى يكون لهذا الدين ملحمة … تحكي النبوة في أيام فترته

٣- أبو علي الحسن بن علي الجويني:

جند السماء لهذا الملك أعوان … من شك فيهم فهذا الفتح برهان

متى رأى الناس ما نحكيه في زمن … وقد مضت قبل أزمان وأزمان

هذي الفتوح فتوح الأنبياء وما … لها سوى الشكر بالأفعال أثمان

أضحت ملوك الفرنج الصيد في يده … صيدا وما ضعفوا يوما وما هانوا

كم من فحول ملوك غودروا وهم … خوف الفرنجة ولدان ونسوان

هذا وكم ملك من بعده نطر إلى … الإسلام يطوى ويحوى وهو سكران

تسعون عاما بلاد الله تصرخ … والإسلام نصاره صم وعميان

فالآن لبى صلاح الدين دعوتهم … بأمر من هو للمعوان معوان

للناصر ادخرت هذي الفتوح وما … سمت لها همم الأملاك مذ كانوا

حباه ذو العرش بالنصر العزيز … فقال الناس داود هذا أم سليمان

في نصف شهر غدا للشرك مصطلما … فطهرت منه أقطار وبلدان

فأين مسلمة عنها وإخوته … با أين والدهم بل أين مروان

وعد عما سواه فالفرنجة لم … يبذهم من ملوك الأرض إنسان

لو أن ذا الفتح في عصر النبي لقد … تنزلت فيه آيات وقرآن

يا قبح أوجه عباد الصليب وقد … غدا يبرقعها شؤم و خذلان

خزنت عند إله العرش سائر ما ... ملكته وملوك الأرض خزان
فالله يبقيك للإسلام تحرسه ... من أن يضام ويلفى وهو حيران
وهذه سنة أكرم بها سنة ... فالكفر في سنة والنصر يقظان
يا جامعا كلمة الإيمان قامع من ... معبوده دون رب العرش صلبان
إذا طوى الله ديوان العباد فما ... يطوى لأجر صلاح الدين ديوان

٤- شاعير نقيب الأشراف بالديار المصرية النسابة الجواني دهلّيت:

أترى مناما ما بعيني أبصر ... القدس يفتح و الفرنجة تكسر
وقمامة قمت من الرجس الذي ... بزواله ورزالها يتطهر
ومليكهم في القيد مصفود ولم ... ير قبل ذاك لهم مليك يؤسر
قد جاء نصر الله و الفتح الذي ... وعد الرسول فسبحوا واستغفروا
فتح الشام وطهر القدس الذي ... هو في القيامة الأنام المحشر
من كان هذا فتحه لمحمد ... ماذا يقال له وماذا يذكر
يا يوسف الصديق أنت لفتحها ... فاروقها عمر الإمام الأطهر
ولأمن عثمان الشريعة بعده ... ولأنت في نصر النبوة حيدر
ملك غذا الإسلام من عجب به ... يختال والدنيا به تتبختر
نشر ونظم طعنه وضرابه ... فارمح ينظم والمهند ينشر
حيث الرقاب خواضع حيث ... العيون خواشع حيث الجباء تعفر
غاراته جمع فإن خطبت له ... فيها السيوف فكل هام منبر
إذ لا ترى إلا طلى بسنابك ... تحدى نعالآ أو دماء تهدر
تمشي على جثث العدى عرجا ... ولا عرج با لكنها تتعثر

٥- أبو الحسن على كورِى محمد الساعاتى دهلّيت:

عصفت به ريح الخطوب زعازعا ... فلقين طودا لا تخف أناته
هو منقذ البيت المقدس بعدما ... طالت فما وجد الشفاء شكاته
بيت تأسس بالسكون وإنما ... عند الزحاف تحركات سكناته
أم شتت الأعداء وهي جحافل ... عن شمل دين جمعت أشتاته
أوتيت عزما في الحروب مسددا ... لازيغه يخشى ولا هفواته
أحسنت بالبيت العتيق ويثرب ... ولك الفعال كثير حسناته

هذي سيوفك محرمات دونه | لبكائهن تبسمت جحراته

٦- نجم الدين يوسف بن الحسين بن المجاور دهلّيت:

الوقت أضيق من سماع قصيدة | موسوعة بصفات أغيد أهيف
الجد في هذا الزمان مبين | والهزل فيه مع الغواية مختف
بالنصر المهدي و الهادي إلى | سبل الجهاد أبي المظفر يوسف
المستعين بربه و الواثق | المنصور و المستظهر البر الوفي
شدت قوى أركان ملة أحمد | وتجملت بجهاده في الموقف
ملك إذا أم الملوك جنابة | لاذوا بأكرم من يؤم وأشرف
وإذا أتوا اسرى إلى ابوابه | وقفوا بأعظم من يعول وأرأف
مولى غدا للدين أكرم والد | حدب على أبنائه متزفرف
عزل الفرنجة ثم ولى جيشة | أعظم به من صارف ومصرف
قد أنصف التوحيد من تثليثهم | وأقام في الإنجيل حد المصحف
مغرى بتجريح الرجال لأنه | يروي أحاديث العوالي الرعف
ملك له في الحرب بحر مفضل | فلذاك يقرؤه بسبعة أحرف
عزم وحلم أنسيا ما كان من | عزم ابن مرداس وحلم الأحنف
يا صاح قل الإنكتير الكلب دع | عنك الجنون وخذ مقالة منصف
القدس ما فيه لسرجك مطمع | كلا ولا نور الإله لمنطفي
واالميجد الأقصى فعنه نقص من | وقع الدبابيس الأليمة تعرف
واستفت نفسك فهي أخبث ناصح | واترك متابعة اللجاج المتلف
واعجب لرمح بالرؤوس معمم | واطرب لسيف بالدماء مغلف
يا أيها الملك الذي لطباعه | وسيوفه خلقا رضى وتعسف
لله يوم عروبة إذ أعربت | ساعاته هن نصرك المتعرف
سنت سيوفك في الرؤوس ختانة | ذهبت بمهجة كل علج اقلف
لآفاتهم وافت بأخذك منهم | يافافكم من حسرة وتأسف
أو ما رأى الأعلاج حين دعوتها | بلسان سيف في الكريهة ملحق
لم تستطيع عصيان أمرك بل أتت | منقادة طوعا ولم تتخلف
فاستدع جارتها وثن بأختها | وكذاك حتى تأربعين ونيف

ما للسواحل غير بحرك حافظ | بشبا سنان أو بصفحة مرهف
هذا الطراز الأخضر استفتحته | فزها بثوب من علاك مسجف
أحييت دين محمد وأقميته | وسترته من بعد طول تكشف
وضبطت ديوان الجهاد بعامل | من عامل وبمشرف من مشرفي
وبجهبذ العزم الذي لا ينثني | وبناظر الرأي الذي لم يطرف
فخذ الخراج من البسيط كلها | واستأد فرضي جزية وموظف
واقبض على دنيا بكف زهادة | وابسط لرحمتها جناح تعطف
جاءت جنود الله تطلب ثأرها | وصدورها بك عن قليل تشتفي
فانهض بها وتقاضى حقك موقنا | أن الإله بما تؤمله حفي
هم فتية تأتراك كل مجفجف | يغشى الكريهو فوق كل مجفجف
قوم يخوضون الحمام شجاعة | لاينظرون إليه من طرف خفي
إن صبحوا الأعداء في أوطانهم | تركوا ديارهم كقاع صفصف
أنت اصطفيتهم لنصرة ديننا | لله در المصطفي و النصطفى

جوانی ئەم هۆنراوەیەش تەنها لەروونو ئاسانیو یادەوەری راستگۆیانەو سۆزی گەرمیدا نییە، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئەوەشدا تێڕوانینی موسوڵمانان پیشاندەدات لە مەغریبی ئیسلامیدا بۆ سەلاحەدینو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەجیهانی ئیسلامی لەو کاتەدا یەك بووەو سنوورە دەستکردە سیاسییەکانی نێوان دەوڵەتەکانیش نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئاوێتەبوونی سۆزداری لەنێوان موسوڵماناندا، چونکە ئەوان لەهەموو شوێنێکدا هاوبەشن لەئازارو ئاواتەکانیاندا[1].

**یازدەیەم: گەمارۆدانی صور:**

لەساڵی ٥٨٣ك/١١٨٧زدا سەلاحەدین سەرکەوتنی مەزنی بەسەر خاچپەرستەکاندا بەدەست هێنا، کەتیایدا دەستی گرت بەسەر زۆربەی ناوچەکانی میرنشینی بەیتولمەقدیسدا، جگە لەشاری صور مێژو نووسە موسوڵمانەکان باسی ئەوە دەکەن کە شارێکی تۆکمە بووە لەنێوان دەریادا لەشێوەی کەشتیدا بووە هیچ ڕێگایەك نەبووە بۆ گەیشتن پێی لەوشکانییەوە جگە لەیەك ڕێگا نەبێت کەحەوت بورجی لەسەر بوە[2]، ئەمە جگە لەو شورا تۆکمەو بورجە بەرزانەی کە پڕبوو لەخاچپەرستە هەڵهاتووەکان بەهۆی ئەو پەنادانەی کە سەلاحەدین بە خاچپەرستەکانی بەخشی

---

[1] صلاح الدين الأيوبي قاهر العدوان الصليبي، ل: ٢٥٨.

[2] كتاب الروضتين(١١٩١٢)، صلاح الدين والصليبيون، :٢٢٩.

بەرامبەر بە بەدەستەوەدانی شارەکانیان[1]، ئەگەرچی خاچپەرستەکان زۆربەی سەرکردەو فەرماندەکانیان لەجەنگەکانیاندا دژ بە سەلاحەدین لەدەستدا بوو، بەلام چەند فەرماندەیەکی تریان تیادا هەلکەوت وەك کونراد مونتفرات[2] کە ئیبن شدّاد دەربارەی دەلێ: پیاوێکی مەزنو خاوەن رابوو زۆر بەهێزو توند بوو لەئایندارییدا[3]. کچەزاکەی (ئیبن الجوزی)ش وەسفی دەکاتو دەلێ: پیاوێکی ئازاو توند بوو[4].

ئەم کونرادەش یان مەرکیز (وەك سەرچاوە عەرەبییەکان ناوی دەبەن) بوو بەسەرکردەی خاچپەرستەکانو هەموو ئەمیرو سوارەکانیان لەناو شاردا قایل بوون کەبچنە ژێر رکێفیەوەو دان بەدەسەلاتیدا بنێن لەبەرامبەر بەلێندانی بەبەرگری کردن لێیانو پاراستنیان لەهێرشی موسولمانەکان، هەروەها بڕیاریاندا کەئەو مەرجانە رەتبکەنەوە کە سەلاحەدین لەکاتی دانوستانەکاندا پێشنیاری کردبوو، پەلەشی کرد لەناردنی وەفد بۆ رۆژئاوا_ ئەوروپا_ بۆ داواکردنی پشتیوانیو هەستان بەئەرکی بەرگریکردن لەپاشماوەی قەوارەی خاچپەرستی لەولاتی شامدا هەتاوەکو شالاوی خاچپەرستی سێیەم دەگاتە بەرەوە[5]، ئەوە بوو سەلاحەدین ناچاربوو گەمارۆی یەکەمی لەسەر صور هەلبگرێت پێش ئازادکردنی بەیتولمەقدیس، کونرادیش هەولی دا بۆ بەهێزکردنی ئامادەکارییەکانو ئامادەکردنی بۆ جەنگی چاوەروانکراو، بۆ ئەم مەبەستەش هەستا بەلێدانی خەندەقێك لەلای رۆژهەلاتی شارەکەوە، کە تاکە لای وشکانی ئەو شارەیەو بەم پێیەش شارەکەی وەك دورگەیەك لێکردو شوراکانیشی زۆر تۆکمە کرد، کاتێ سەلاحەدین گەرایەوە بۆ گەمارۆدانی لە٢٢ی رەمەزان/ تشرینی دووەمو گەمارۆکەی بەبەرد بارانکردنی شارەکە لەرێی مەنجەنیقێکەوەدەست پێکردو موسولمانەکان جۆرەها چەکیان بەکار هێنا بۆ دەست بەسەراگرتنی بەلام بەبێ سود، ئەم شارە توانی لەبەرامبەر هێرشە دەریاییو وشکانییەکانی موسولمانەکاندا خۆی رابگرێت ، ئەمەش سەلاحەدینی ناچارکرد کەپەنا بەرێتە بەر شێوازی سیاسی بۆ بەدەستەوەدانی شارەکە، دیارە بەسودوەرگرتن لە بەدیلگیرانی (ولیەم)ی سێیەمی باوکی مونتفرات لای سەلاحەدین، ئەوەبوو سەلاحەدین ویستی وەك کارتی فشار بەکاری بهێنێو هەرەشەی

---

[1] کتاب الروضتین(١١٩١٢)، صلاح الدین والصلیبیون، :٢٢٩.

[2] النوادر الصلطانیة، ل:٩٨

[3] مرآة الزمان، لة(صلاح الدین والعلیبیون)، ل:٢٣٠

[4] الكامل في التأریخ، لة (تأریخ الأیوبیین)، ل:٢٣٠

[5] هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٠.

لەسێدارەدانی کرد، بەڵام ئەم هەوڵە شکستی هێنا لەبەرامبەر هەڵوێستی توندی کونراددا کەرایگەیاند ئەو پێی خۆشە خۆیو باوکی سەر ببڕدرێن نەوەك بەشێك لەو شارە بدات بەدەستەوە، لەبەرامبەر ئەم پێشهاتە سیاسیو سەربازیانەشدا سەلاحەدین ناچار بوو کە گەمارۆکە لەسەر صور هەڵبگرێت، لەکۆتایی شەوالی ٥٨٣ك/سەرەتای کانوونی یەکەمی ١١٨٨زدا ئەمەش یەکەم شکست بوو کەسەلاحەدین تووشی ببێت لەکارە سەربازیەکانیدا دوای جەنگی حطین[1]، چەندین هۆکاریش هەبوون کەرۆڵیان بینی لەهەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر صور کە گرنگترینیان:

- بارودۆخی دەرونی سوپای ئەیوبی لەبار نەبوو دوای ئەوەی دووچاری گرفت بوو لەهەوڵیدا بۆ ئازادکردنی ئەو شارە.
- داواکردنی ئەمیرە دەوڵەمەندو کۆمەککارەکانی سوپا بۆ هەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر صور، چونکە لەوە دەترسان کەسەلاحەدین داوای قەرزیان لێبکات بۆ سوپاکە ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر گەمارۆکەی. ئەمە لەکاتێکدا بوو کەڕای سەلاحەدین لەگەڵ ڕای گەورە فەرماندەکانیدا یەکی دەگرتەوە، کەپێیان وابوو پێویستە لەسەر گەمارۆدان بەردەوام بن لەگەڵ داواکردنی قەرز لەدەوڵەمەندەکان، بەڵام ئەوان تکای هەڵگرتنی گەمارۆکەیان لێکرد.
- کرانەوەی صور بەڕووی دەریادا پاش شکستهێنانی ئەو ئابڵۆقە دەریاییەی کەسوپای میسری بەسەریدا سەپاندو بەردەوامبوونی گەشتنی کەرەستەو ئازوقە بۆی.
- شلگیری سەلاحەدین لەگەڵ خاچپەرستەکانی ئەو شارانەی کە ئازادی کردبوون، بوار پێدانیان بۆ کۆبوونەوە لەصوردا ئەمەش ورەی ئەوانی بەرزکردەوەو هەموو یەکیان گرت بۆ بەرگری کردن لەو شارە.
- هۆکارە سروشتییەکان رۆڵیان هەبوو لەشکستهێنانی گەمارۆکەدا، چونکەزستانی ئەو ساڵە زۆر سادو تەڕ بوو، بووە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەریزی سوپای ئەیوبیدا[2].

مێژوو نووسە موسوڵمانەکانیش نیگەرانی زۆر دەرئەبڕن بۆ شکست هێنانی سەلاحەدین لەئازادکردنی صوردا بەڵام مێژوونووس ئیبن الأثیر کە (بەهێرش کردنە سەر سەلاحەدین ناسراوە) بەرپرسیارێتی ئەو شکستەی کە بەسەر موسوڵمانەکاندا هات ئەخاتە ئەستۆی سەلاحەدین. بەو پێیەی کەسەلاحەدین خۆی خاچپەرستەکانی ئامادەکردو پارەو پیاوەکانی عەککاو عەسقەلانو

---

[1] النوادر السلطانية، :١٣٨.

[2] الحركة الصليبية (٨٤١١٢) عاشور.

قودس‌و شوێنه‌كانی تری بۆ ناردن، ئه‌مه‌ش به‌هۆی زیاده‌ڕۆیی كردنیه‌وه له لێبورده‌یی به‌رامبه‌ر به‌خاچپه‌رستان[1].

هه‌رچی كچه‌زاكه‌ی (ئیبن الجوزی) شه ئه‌وه پێی وابوو كه سه‌لاحه‌دین ئه‌م هه‌له‌ی له‌ده‌ست موسوڵمانان دا به‌هۆی مۆڵه‌تدانی به‌ڕۆیشتنی خاچپه‌رستان بۆ صورو له‌ده‌ره‌نجامی ئه‌م كاره‌ی نه‌كۆڵییه‌وه، پێویست بوو له‌سه‌ری داوای موسوڵمان بوونیان لێبكات ئه‌گه‌ر نا له‌گه‌ردنی بدانایه، هه‌روه‌ك ئه‌مه‌ی چواندووه به‌وه‌ی كه له‌جه‌نگی ئوحودو به‌دردا روویدا، وادیاره ئیبن الأثیر بۆیه دابه‌زیوه‌ته سه‌ر سه‌لاحه‌دین چونكه ئه‌و په‌روه‌رده‌كراوی بنه‌ماڵه‌ی زه‌نكیه‌و له‌بیری نه‌چووه كه ئه‌و موڵكیانی له‌شامدا له‌ناو بردووه، دووریسش نییه كچه‌زاكه‌ی (ئیبن الجوزی) ش كه‌وتبێته ژێر كاریگه‌ری (ئیبن الأثیر)ه‌وه له‌م رووداوه‌دا[2]. له‌راستیدا ئه‌و پلانه‌ی كه سه‌لاحه‌دین دایڕشت، بریتی بوو له‌په‌نادانی خاچپه‌رسته‌كان له‌به‌رامبه‌ر به‌ده‌سته‌وه‌دانی شارو قه‌لاكانیاندا، ئه‌مه‌ش هه‌لی كۆنترۆڵكردنی زۆربه‌ی ناوچه‌كانی شانشینی به‌یتولمه‌قدیس له‌چه‌ند مانگێكی كه‌مدا بۆ سه‌لاحه‌دین ره‌خساند، جگه له‌چه‌ند شوێنێكی كه‌م كه‌صوریش یه‌كێك بوو له‌وانه پاشان صه‌لاحه‌دین هیچ چارێكی تری نه‌بوو، چونكه ئه‌گه‌ر بیویستایه له‌ڕێی كوشتارو جه‌نگه‌وه ده‌ست به‌سه‌ر ئه‌و شارانه‌دا بگرێت ئه‌وه زۆری ده‌خایاند، ئه‌مه جگه له‌وه‌ی كه‌ئه‌و سیاسه‌تی خۆبه‌ده‌سته‌وه‌دان به‌رامبه‌ر به‌په‌نادانی به‌كار هێناوه كه له‌شه‌ریعه‌تی ئیسلامیدا رێی پێدراوه[3].

سه‌لاحه‌دین هه‌میشه‌و به‌درێژایی جه‌نگه‌كانی وا هه‌ڵسوكه‌وتی ده‌كرد كه له‌لای هاولاتیانی په‌سه‌ند كراو بێت‌و بناغه‌ی ده‌وڵه‌تێك دابنێت كه هه‌ردوو ئاین له‌ته‌نیشت یه‌كه‌وه تیایدا بژین له‌ژێر سایه‌ی ده‌سه‌لاتی سوڵتاندا، ئامانجیش تێكشكاندنی هێزی سیاسی خاچپه‌رسته‌كان بوو نه‌ك پاكتاوكردنی گاوره‌كان[4].

به‌راستی هه‌ڵسوكه‌وته‌كانی سه‌لاحه‌دین هه‌ڵقوڵاوی رێنماییه‌كانی ئیسلام بوو كاریگه‌ری هه‌بوو له‌سه‌ر گه‌لان‌و سه‌ركرده‌كانی ئه‌ورووپاو پێشه‌نگێكی باش بوو بۆ موسوڵمانان[5]، نموونه‌یه‌ك بو كه بۆ خه‌ڵك ده‌هێنرێته‌وه، خه‌ڵكی به‌دڵ‌و شمشێری بۆ ئیسلام كه‌مه‌ند كێش كرد، ئه‌مه‌ش وایكرد

---

[1] النوادر الصلطانية، ل:١٣٨.

[2] الكامل في التأريخ، له(صلاح الدين والعليبيون)، ل: ٣٣٥.

[3] صلاح الدين والعليبيون، ل: ٢٣٥

[4] صلاح الدين والعليبيون، ل: ٢٣٦.

[5] صلاح الدين اليوبي، قلعجي، ل: ٢٨٠.

لەتشرشل کە دەربارەی بڵێت: کە یەکێك بووە لەگەورەترین پاشاکانی دونیا، هەروەها پالی بەنوسەری ئینگلیزی ریدهجاردەوە تا هەتاکو بڵێ کە ئەو: گەورەترین پیاوە لەسەر روی زەوی[1].

**دوازدەیەم: تەواوکردنی ئازادیسازییەکان( فتوحات ):**

١- **ئازاد کردنی کرکو شوبك:** کانت ستیڤانی، فەرمانڕەوای ناوچەی پشت ڕوباری ئوردنی تەنیشت شانشینی بەیتولمەقدیس لەناو ئەو دیلانەدا بوو کە بەفدیە ئازاد کران‌و داوای کرد لەسەلاحەدین کە هفری کوڕی ئازاد بکات کەفەرمانڕەوای تیبنین بوو: سەلاحەدینش داواکەی پەسەند کرد، بەلام لەبەرامبەر ئەوەدا داوای بەدەستەوەدانی هەردوو قەلای کرکو شوبکی لێکرد کە سەر بەهەرێمەکەی ئەو بوون، وادیارە کە ستیڤانی رازی بوو بەمەرجەکەی سەلاحەدین، ئەویش هەستا بەئازادکردنی کورەکەی، لەبەرامبەریشدا ستیڤان داوای لەو دوو قەلایە کرد خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەلام ئەوان رازی نەبوون، ئەمەش بووە هۆی گێڕانەوەی کوڕەکەی بۆ زیندان، لەبەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتە جوانەیدا سەلاحەدین بە هەڵسوکەوتێکی جوانتر وەلامی دایەوە کەبریتی بوو لەهەستانی بەئازادکردنی کوڕەکەی، پاشان گەمارۆی هەردوو قەلاکەی داو گەمارۆکەش زیاتر لەساڵێکی خایاندو بەرگریکارانی تووشی برسێتی‌و تینوێتی کرد، بەلام خۆیان بەدەستەوە نەدا تاکو ئازوقەیان لێبڕاو ولاخەکانیان سەربڕی‌و نائومێد بوون لەگەیشتنی کۆمەك‌و هیچ بوارێك بۆ ئارامگری نەمایەوە، ئەمەش لەمانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٨٤ك/ ئایاری ١١٨٨م دا بوو.

٢- **ئاوڕدانەوە بەرەو باکور:** پاش ئازادکردنی ناوچەکانی باشوری ولاتی شام‌و پەیوەندیکردنی بەناوچە ئیسلامیەکانی ترەوە لەئەیلەی عەقبەوە لەباشورەوە هەتاوەکو بەیروت لەباکورەوە، جگە لەصور پاشان سەلاحەدین روی کردە باکور بۆ ئازادکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خاچپەرستەکان لەهەردوو میرنشینی ئەنطاکیەو طرابلوسدا، ریموندی سێیەمی فەرمانرەوای طرابلوسیش لەو ماوەیەدا بەغەم‌و پەژارەوە کۆچی دوایی کرد، دوای هەلاتنی لەجەنگی حطین بەماوەیەکی کەم، دیارە مندالی نەبووە بۆیە وەسیەتی کرد کەکورە گەورەی بوهیموندی سێیەمی ئەمیری ئەنطاکیە ببێتە جێنشینی، بەلام ئەم پێویستی بەکوڕی یەکەمی هەبوو هەتاکو لەتەنیشتوەوە بێت بۆ بەرگری کردن لە ئەنطاکیەکەو کوڕێکی تری نارد کەئەویش بۆهیموند بوو[2]، ئەوە بوو سەلاحەدین بقیعەی رامالی دوای

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٨٢.

[2] مفرج الكروب (٢٧١١٢)، تأريخ الأيوبيين، ل: ١٧٢.

ئەوەی کۆمەکی لەشەنگارەوە پێی گەیشت پاشان هێرشی کردە سەر قەڵای کوردان (حصن الأكراد) لەمانگی ڕەبیعی دووەم/ حوزەیراندا لەو کاتەشدا بەدەست داویەکانەوە بوو، بەڵام ڕووبەڕووی بەرگرییەکی بەهێزو قایمکارییەکی زۆر بوویەوە، بۆیە دەستبەرداری بوو ڕووی کردە کەنارەکانی طرابلوس و ئەنطاکیەو لەمانگی جمادی یەکەم/ تەمووزدا پەلاماری أنطرطوسی داو توانی بچێتە ناویەوە بەڵام قەڵاکەی لێیاخیبوو، بۆیە فەرمانی دا بەئاگر تێبەردانی گوندەکەو هەمووی سوتاند[1] پاشان گەمارۆی قەڵای (حصن المرقب)ی داو نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت، بۆیە ڕووی کردە بانیاس و لەباکوری میرنشینی طرابلوس و ئازادی کرد، پاشان چووە ناو میرنشینی ئەنطاکیە، قەڵای جبلەی کەنار دەریای کۆڵترۆڵکردو، لاذقیەش خۆی بەدەستەوە دا کەگەورەترین بەندەری میرنشینی ئەنطاکیە بوو، پاشان خاچپەرستەکان بەجێیان هێشت دوای ئەوەی کە نەیانتوانی بەرگری لێبکەن و قەڵای بکسرائیل ئازادکرد کەدەکەوێتە سەر ڕێگای حەما لەتەنیشت جبلە[2]. پاش ئەوەی سەڵاحەدین ڕووی کردە ناوچەکانی ناوەوە والظاهر غازی کوڕی کەفەرمانڕەوایی حەلەب بوو لەگەڵ خۆیدا بردو پەلاماری قەڵای صەهیۆنی ئیسبتاریەی داو توانی دەستی بەسەردا بگرێت و هەردوو پاسگای بکاس و شغریش خۆیان دا بەدەستەوە کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاواوە، لەسەر ڕووباری عاصی سرمین و برزیە کەدوایەمین قەڵایە لە بەشی هەرە خوارەوەی ڕوباری عاصی[3]. بەم ئازادسازیانەش، توانرا دەست بەسەر سەرجەم مەخفەرەکانی پێشەوەی ئەنطاکیەدا بگیرێت و تەنها قەڵاکانی بغراس و دربساک مابون لەباکوردا، ئەوەبوو سەڵاحەدین هێرشی بۆ کردن و دربساک کەدەکەوێتە چیاکانی ئەمانوس خۆی بەدەستەوەدا کەسەر بەداویەکان بوو و کۆنترۆڵی ئەورێگەیەی دەکرد کە ئەنطاکیەی دەبەستەوە بە کیلیکیەوە[4]، بەم شێوەیە سەڵاحەدین توانی پەڕو باڵی هەردوو میرنشینی ئەنطاکیەو طرابلوس بکات تەنها بەندەری سویدیەی ئەو دوو شارە مایەوەو ئیسبتاریەش توانیان پارێزگاری لەهەردوو قەڵای ئەکراد (کوردان)و مرقب بکەن، داویەکانیش ئەنطرطوسیان بەدەستەوە بوو، دەرەنجامی ئەو بارودۆخەش کەبەسەر ئەنطاکیەدا بۆ هات

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٢٩.

[2] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٧٣.

[3] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٧٣.

[4] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٧٣.

هیموندی سێیەم داوای ئاشتەوایی لەسەلاحەدین کرد بەمەرجێ دان بەهەموو ئەو ناوچانەدا بنێ کەئازادی کردووە، سوپای ئیسلامیش تووشی ماندبوون هاتبوو لەئاکامی جەنگی بەردەوامو هاتوچۆی زۆرەوە، هەر بۆیە سەلاحەدین داواکەی قبولکردو بۆ ماوەی هەشت مانگ ئاگر بەستێکیان مۆر کرد[1]، ئەم ئاگر بەستەش هەلی ئاوڕدانەوە لەباشور بۆ سەلاحەدین رەخساند، ئەوە بوو دوای ئەوەی کە بەشێك لەسوپاکەی مۆڵەتدا پەلاماری هەردوو قەلای داویەی لەصفدو ئیسبتاریە لە کوکبدا داو توانی دەستیان بەسەردا بگرێت ئەمەش لەهەردوو مانگی شوالو ذي العقدەی ٥٨٣ك/ کانوونی یەکەمی ١١٨٨زو کانوونی دووەمی ١١٨٩زدا بوو.

## سیازدەیەم: ئێمە بۆ مانەوە لەدیمەشقدا دروست نەکراوین:

بەلکو بۆ پەرستشو جیهاد کردن لەپێناو خوادا دروست کراوین:لەسالی ٥٨٤ك دا سەلاحەدین هاتەوە بۆ دیمەشق دوای گەڕانەوەی لەغەزاو لەرەبیعی یەکەمدا گەشتەوە دیمەشقو موسولمانەکانیش بەهاتنی زۆر خۆشحالبوونو شاریان رازاندەوە مزگێنییان دەدا بەیەکتر، الصفی کوڕی القابض) بریکاری خەزێنەش هەستا بوو بەبنیاتنانی کۆشکێکی گەورە لەقەلادا کە بەسەر الشرف القبلي دا دەروانی، سەلاحەدینیش لێی تووڕە بوو و لەپۆستەکەی لایداو وتی: ئێمە بۆ مانەوەو نیشتەجێبوون لەدیمەشقدا دروست نەکراوین، بەلکو بۆ بەندایەتیو تێکۆشان دروستکراوین[2]. ئەم کارەش تۆ کردووتە مرۆڤ سارد دەکاتەوە لەو ئامانجەی بۆی دروستکراوە[3]. لەراستیدا ئەو بیرو باوەڕە ئیسلامیە دروستەی کەئوممەت لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فێری بوو بالی کێشابوو بەسەر هەلسوکەوتو ویستو حەزەکانی سەلاحەدیندا، هەر بۆیە ئەم وتەیەی فەرموو کەشیاوی ئەوەیە بەئاوی ئالتون بنوسرێتەوە" ئێمە بۆ بەندایەتیو تێکۆشان دروستکراوین"، بەراستی یەکتا پەرستی دەرونی پاککردبووەوە لەئارەزوو ئاژاوەو کاریگەری شەیتانو بەهۆی باوەڕی بەهێزو تێگەیشتنی قولیەوە بۆ ئاینەکەی روبەرووی ئەستێرە ناسەکان بوویەوە کە هۆشدارییان دا لەئازادکردنی بەیتولموقەدەسو پێیان وت: قودس ئازاد ئەکەیتو چاوێکت لەدەست دەدەیت، فەرمووی: رازیم ئازادی بکەمو کوێربم، ئەوە بوو توانی رزگاری بکات پاش نەوەد سال

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٥٢– ١٥٤، تأريخ الأيوبيين، ل:١٧٤

[2] البداية والنهاية (١٦/٦٠٤).

[3] حياة صلاح الدين، محمود شلبي، ل،١١١

داگیرکاری لەلایەن فرەنجەکانەوەو[1] قسە پڕو پوچەکانی ئەستێرە ناسەکانی بەدرۆ خستەوە، چونك ئەو تەنها گوێی بۆ بانگەوازی خواو پێغەمبەر دەگرت(ﷺ)[2]. زمانحاڵیشی ئەم وتەیەی شاعیر بوو:

وممّا زادني عزاً وتيها | وكدت بأخمصي أطأالثريا
دخولي تحت قولك يا عبادي | وأن صيرت أحمد لي نبيا

**چواردەیەم: کۆچی دوایی ئوسامەی کوڕی مونقیز:**

لەساڵی ٥٨٤کدا زانای گەورەو سوار چاکی شام مجد الدين مؤيد الدولة أبو مظفر أسامەی ئەمیر مورشدی کوڕی مقلدی کوڕی نصری کوڕی منقذی کنانی شەیزەری کۆچی دوایی کرد[3]، الذهبی ئەڵێ: ماوەی نەوەدو حەوت ساڵ ژیاو لەمانگی رەمەزانی ساڵی٥٨٤ك[4] دا لەدیمەشق کۆچی دوایی کردو چەند هۆنراوەیەکی هەیە لەستایشکردنی سەلاحەدین لەوانە:

والناصر الملك المتوّج ناصري | وعلاه قد خطت كتاب أماني
قد كنت أرهب صرف دهري قبله | فأعاد صرف الدهر من أعواني
أنا جاره ويد الخطوب قصيرة | عن أن تنال مجاور السلطان
ملك يمنُ على أسارى سبيه | فيعيدهم في الأسر بإحسان
خضعت له صيد الملوك فمن برى | أقلامه غرر على التيجان
ملا القلوب محبة مهابة | فخلت من البغضاء و الشان
لي منه إكرام علوت به على | زهر النجوم .. ونائل إناني
قرن الكرامة بالنوال مواليا | فعجزت عن إحصاء ما أولاني
فنداه أخلف ما مضى من ثروتي | وبقاؤه عن أسرتي أسلاني
فلأهدين إلى علاه مدائحا | تبقى عن الأحقاب والأزمان
مداحا أفوق بها زهيرا مثلما | فاق المليك الناصر ابن سنان
يا ناصر الإسلام حين تخالت | عنه الملوك ومظهر الإيمان
بك قد أعز الله حزب جنوده | وأذل حزب الكفر و الطغيان
لما رأيت الناس قد أغواهم | الشيطان بالإلحاد و العصيان

[1] الحروب الصلبية موافق وتحديات، ل: ٩٩
[2] الحروب الصلبية موافق وتحديات، ل: ٩٩
[3] سير أعلام النبلاء(٢١/١٦٥).
[4] هەمان سەرچاوە (٢١/١٦٥).

جردت سيفك في العدا لا رغبة — في الملك، بل في طاعة الرحمن
فضربتهم ضرب الغرائب واضعا — بالسيف ما رفعوا من الصلبان
وغضبت الل الذي أعطاك — فصل الحكم غضبة ثائر حران
فقلت من صدق الوغى ووسمت — من نجى الفرار بضله وهوان
ويذلت أموال الخزائن بعدما — هرمت وراء خواتم الخزان
في جمع كل مجاهد ومجالد — ومبارز ومنازل الأقران
من كل من يرد الحروب بأبيض — عضب ويصدر وهو أحمر قان
ويخوض نيران الوغى وكأنه — طمآن خاض موارد الغدران
قوم إذا شهدوا الوغى قال الورى — ماذا أتى بالأسد من خفان
لو أنهم صدعوا الجبال لزعزعوا — أركانها بالبيض و الخرصان
فهم الذخيرة للوقائق بالعداء — ولفتح ما استعصى من البلدان
والسعد يشهر الصوم فهو مبشر — لعلاك بالتأييد والغفران
في دولة عمت بنائلها الورى — فدعا لها بالخلد كل لسان
حمدت على طول عمري المشيبا — وإن كنت أكثرت فيه الذنوبا
لأبي حبيب إلى أن لقيت — بعد العدو صديقا حبيبا
سمعت صروف الدهر قول العاتب — وتجنبت حرب المليك الحارب
وتجافت الأيام عن مطلوبه — ومراده أكرم به من طالب
هو من عرفت فلو عصاء نهاره — لرماه نقع جيوشه بغياهب
وإذا سطا أضحت قلوب عداته — تلوى كمحراق ردى ومواهب
وإذا سرى خلت البسيطة لجة — أمواجها بيض و بيض قواضب
ملك القلوب محبة ومهابة — فاقتادها طوعا بهيبة غاضب
تهن يا أطول الملوك يدا — في يسط عدل و سطوة وندى
تهن وذكرا من ذلك الشكر — في الدنيا ومن ذلك الجنان غدا
لا تستقل الذي صنعت فقد — قمت بفرض الجهاد مجتهدا
وحبست أرض العداء و أفنيت من — أبطالهم ما يجاوز العددا
وما رأينا غزا الفرنج من — الملوك فب عقر دارهم أحدا
فسر إلى الشام فالملائكة — الأبرار تلقاك ملتقى حمدا

| | |
|---|---|
| فهو فقير إليك يأمل أن | تصلح بالعدل منه ما فسدا |
| والله يعطيك فيه عاقبة | الناصر كما في كتابه وعدا |
| فم حياك الورى و أهمك | العدل و أعطاك ما ملكت سدى |
| فم أنت إلا الشمس لولاك لم تزل | على مصر ظلماء الضلالة سرمدا |
| وكان بها طغيان فرعون لم يزل | كما كان لما أن طغا وتمردا |
| فبصرتهم بعد الغواية و العمى | وأرشدتهم تحت الضلال إلى الهدى |
| قال للملوك تزحزحوا عن ذروة | العلياء للملك الهمام الناصر |
| يعطى الألوف ويلتقيها باسما | طلق المحيا في القنا المتشاجر |

ئوسامەی کوڕی مونقزیش یەکێك بوو لەکەسە بەتەمەنەکانو تەمەنێکی زۆرو پڕ پیاوەتیو داستانو نەهامەتی بەسەربردووە، ئامادەی شالاوە خاچپەرستەکان بوو بۆ سەر وڵاتی شامو لەبزوتنەوەی جیهادو تێکۆشاندا دژ بەخاچپەرستانو لەپێناو رزگارکردنی خاکی موسوڵماناندا لەشیزەرو شوێنەکانی تردا لەژێر ئاڵای زەنکیەکاندا بەشداربوو،هەروەك رۆڵی هەبوو لەژیانی سیاسیدا لەرۆژگارەکانی شەڕو ئاشتیدا پاش سەردەمی زەنکیو لەکۆتایی سەردەمی فاتمییەکاندا کە لەسەردەستی سەلاحەدین روخێنراون میسرو شامی لەژێر سایەی دەوڵەتێدا کۆکردەوە، وەك زەمینەسازییەك بۆ رزگارکردنی قودس، ئەوەش سوپاس بۆ خوا بەدی هات، بەکۆچی دوایی ئوسامەی کوڕی مونقیزیش دواین لاپەرەی مێژوی بنەماڵەی مُنقِذ لەشامدا پێچرایەوە، وئیبن عدیم بەوە وەسفی دەکات کەئەمیرێکی پیاوچاكو ئەدیبو شاعیرێکی بەجەرگ بووە چەندین نوسراوو کتێبی بەنرخو هەڵوێستی بەناوبانگو چاکەی تۆمارکراوی هەیە، وئیبن تغری بردیش دەڵێ: دەستێکی باڵای هەبووە لەئەدەبو نوسینو شعرداو سوارێکی ژیرو کارساز بوو بیست هەزار دێڕ شعری جاهیلی لەبەر بوو[1].

**پازدەیەم: گرنگترینی وانەو پەندو سودەکان:**

لەروانگەی سەرنجدانی ئەم روداوانەی پێشەوە ئاشنا دەبین بەچەندین پەندو وانە کە بۆ ژیانی هاوچەرخمان گرنگن لەوانە:

١- **گرنگی زانا خوا ویستەکان بۆ هۆشیارکردنەوەی ئوممەت:** نەتەوەی ئیسلام زۆر پێویستی بەکەسانێك هەیە کەلەخەوی غەفلەت بەئاگای بێننو لەنەزانی رزگاری بکەن، ئەو خێرو کارە گەورانەش کە لەسەر دەستی سەلاحەدین بەدیهات یەکێك لەهۆکارەکانی هەستانی زانایان

---

[1] أوسمامة بن منقذ والجديد من آثاره وأشعاره، ل: ١٣٥.

بوو بەپەروەردە ئاراستەو فێرکردنو رێنوێنی خەڵك، چونکەرۆڵی گەورەو مەزنی زانا خواویستەکان بریتیە لەپاککردنەوەی بیرو باوەڕی خەڵك لەبیرو بۆچونە نارەواو شتە پڕو پوچو هاوەڵگەرییەکان (شرکیات)و پاڵفتەکردنی سوننەت لەو شتانەی کەپێوەی لکاوەو پاککردنەوەی مێژووی ئیسلامی لەوئاژاوانەی کەتێیکەوتووە، لەپێناو دەرخستنی رووی جوانی ئوممەتی مەزنەی ئیسلامو دەرهێنانی پەندو سود وەرگرتن لێی، پاکتاوکردنی فیقە لەو شتە داهێنراوو نارەواکانو پاڵفتەکردنی مەوعیزەوو تاریش لەو ئیسرائیلیاتو شتە پڕو پوچو چیرۆکە هەڵبەستراوانەی کەپێوەی لکێنراوەو پەروەردەکردنی ئەم نەوەیە لەسەری، ئەمەیە بنەماکانی چاکسازی بۆ هەر بوژانەوەو رابونێك، لەسەر زانایانی بەرێزیش پێویستە کە پەروەرشیاران رێنمایی بکەن بۆ چاکسازی کردن لە پرۆگرامەکانی پەروەردەو فێرکردندا لەپێناو ئامادەکردنی پێگەیاندنی نەوەکان لەسەرخۆشەویستی جیهادو تێکۆشانو ئەبێ مێژووی سەرکردە مەزنەکانی ئەم ئوممەتەیان بخەنە پێش چاو، کەبێ باوەڕانیان وڕکردبوو، لەو سەرکردانەش خەلیفەکانی راشدینو أبو عبیدەو معاذو خالیدی کوڕی وەلیدو مثنی ی کوڕی حارثە ونورالدین وصلاح الدین وقطزو بیبرسو ئەبێ جەنگە یەکلاکەرەوەکانی ئیسلامیان بەوانە پێبوترێتەوە بۆ هاندانیان لەمنداڵیەوە بۆ خۆشویستنی هەوڵدانو ماندوبوون لەپێناو ئاینەکەیاندا، هەروەها لەسەر زانا بەرێزەکان پێویستە کە فەرمان بەچاکەو رێگری لەخراپە بکەنو روبەروی شەڕو دابەزینی ورەو ساردبوونەوە ببنەوە، ئوممەت بپارێزن لەوەی کە خەڵکانی خراپەکاریان پێ بکات، پێویستە زانایان لاریو خوارو خێچی ئوممەتو سەرکردەکانیان راست بکەنەوە کەستەم کارو یاخیو نزمو لاوازیشیان تیایە، شلگیری خەزنەکردن لەجددیەت خوی هەندێکیانەو ستەمکاریو راکردن لەدادگەریش بەشێکیانی گرتوەتەوەو، هەروەك تیایاندایە کەفەرمان بەخراپەو رێگری لەچاکە دەکات، هەرگیز قودس ناگەڕێتەوە هەتاوەکو زانا خواویستەکانرابەرایەتی کاروانی ئوممەت نەگرنەوە دەستو فەرمانڕەواکانیان بەرەو چاکە نەبەن.

٢- **پەروەردەکردنی نەوەکان لەسەر بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت:** بانگخوازان بۆ ئیسلامو تێکۆشەران بۆ رزگارکردنی قودسو ئەقسا ئەبێ هەستن بەپەروەردەکردنی نەوەی سەرکەوتن لەسەر ئەو بیروباوەڕەی کەپێغەمبەر (د.خ)و هاوەڵانی لەسەر بوو، بیرو باوەڕیان پاڵفتە بکەن لەو شتانەی کەلێی نیشتوەوەی لکاوە لەشتی نارەواو پڕو پوچو هاوەڵگەرانەوە داهێنراو، خوای گەورە لەپێشەوا مالکی کوڕی ئەنەس رازی بێت پێشەوای دار

الهجره که فه‌رموویه‌تی: نه‌وه‌کانی داهاتووی ئومه‌ت به‌هیچ شتێك چاك نابن جگه له‌وه‌ی که‌پێشینان پێی چاك بوون، وته‌ی ئه‌و که‌سه‌ش چه‌ند جوانه که‌وتوویه‌تی: ده‌وڵه‌تی ئیسلام له‌دڵتاندا به‌رپا بکه‌ن، له‌سه‌ر زه‌ویدا به‌رپا ده‌بێت، دیاره قودس له‌سه‌ر ده‌ستی بیدعه‌چیه فاطمیه کان رزگاری نه‌بوو، له‌ده‌ستیش نه‌درا هه‌تاوه‌کو وه‌لاو ئینتما بۆ ئیسلام له‌ده‌ست درا، پیاوانی شۆرشی عه‌ره‌بیش بوونه هاوپه‌یمانی ئینگلیزه‌کان له‌دژی تورکه موسوڵمانه‌کان، قودسیش له‌ده‌ست نه‌درا هه‌تاوه‌کو خه‌ڵکی له‌راسته شه‌قام لایان نه‌داو که‌شتیوانه‌کان ئیسلامیان له‌ململانێکه دوور خسته‌وه. مه‌حاڵیشه قودس له‌سه‌ر ده‌ستی خه‌ڵکانێك ئازاد بکرێت که جنێو به‌هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر ده‌ده‌ن‌و به‌بێ باوه‌ڕیان ده‌زانن‌و تانه له‌بنه‌ما نه‌گۆره‌کانی ئیسلام ده‌ده‌ن ئه‌وان‌و ئه‌وانه‌ش که‌هاوشێوه‌یانن چه‌ند خه‌نجه‌رێك بوون که له‌پشته‌وه له‌ئوممه‌ت دران، خوای گه‌وره‌ش دڵی که‌سانێك گوشاد ده‌کات که راستگۆیی ئیراده‌و راستی رێبازو یه‌کتاپه‌رستی ته‌واوی تیادا به‌دی بکات[1].

٣- **ساغکردنه‌وه‌ی وه‌لاو لایه‌نگری بۆ خواو پێغومبه‌رو باوه‌ڕداران:** ئه‌مه مه‌به‌ستی سه‌ره‌کییه‌و ده‌بێ دورو نزیك‌و گه‌وره‌و بچوکی ئه‌م ئوممه‌ته بیزانێت، رقبوونیش له‌جوله‌که‌و گاور به‌پله‌ی یه‌که‌م له‌به‌ر بێ باوه‌ڕییانه‌و دووه‌میش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خاك‌و وڵاتیان داگیر کردووین، لیدوانی سه‌رکرده‌کانیشیان به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که‌جه‌نگی نێوانمان ئایینیه، بۆ نموونه ده‌سه‌ڵاتدارانی ئه‌مریکا له‌روانگه‌یه‌کی ئاینی ته‌وراتییه‌وه جوله‌که‌یان خۆش ده‌وێت، ئه‌وان ته‌ورات به‌پیرۆز ده‌زانن "العهد القديم" وه‌ك چۆن ئینجیل"العهد الجديد" به‌پیرۆز ده‌زانن، دروستکردنی ئیسرائیل‌و پاراستنیشی له‌سه‌ر بنه‌مای پابه‌ندبوونێکی ئاینی له‌لایه‌ن ئینگلته‌راو ئه‌مریکاوه بنیاتنراوه، جا شوره‌ییه بۆ ئه‌م ئوممه‌ته که‌کاروباری خۆی‌و رۆڵه‌کانی‌و سامان‌و خاکی بداته ده‌ست دوژمنانی، هه‌روه‌ها شوره‌ییه بۆ ئوممه‌ت که له‌ئیسلامه‌که‌ی هه‌ڵگه‌رێته‌وه‌و له‌به‌رده‌م زبڵدانی بیری یۆنانی‌و رۆمانیدا چۆك دابدات، چونکه سواڵ کردن نه‌نگیه بۆ ده‌وڵه‌مه‌ند[2]. سه‌رکرده‌کانی ئه‌مریکاش باسی ئه‌وه‌یان کردووه که ئیسرائیل چی ده‌گه‌یه‌نێت بۆ ئه‌وان، رۆژنامه‌ی هیراڵدتریبیونی نێو ده‌وڵه‌تی راپۆرتێکی تایبه‌تی بڵاوکرده‌وه له‌ژماره (٣٥٨١٨)یدا له‌به‌رواری ١٩٩٨/٤/٢٩دا تیایدا وته‌ی ده له‌سه‌رکرده‌کانی ئه‌مریکای له‌ماوه‌ی په‌نجا ساڵی یه‌که‌می دروست بوونی ئیسرائیلدا

---

[1] واقدساه(٣/٥٢١-٥٢٣).

[2] واقدساه(٣/٤٩٤).

بڵاوکردەوە تیایدا هەموویان پابەندبوونیان بەپاراستنی ئاسایشی ئیسرائیلەوە دووپات دەکەنەوە، ڕۆژنامەکەش لەلێدوانێکیدا نووسیبووی: لەسەربەخۆیی ئیسرائیلەوە لەساڵی ١٩٤٨ەوە هەتاکو ئێستا ئیسرائیل پێگەیەکی تایبەتی هەبووە لەدڵی سەرۆکەکانی ئەمریکاداو لەهەموو ئیدارەکاندا سەرۆك دانی بەوەدا ناوە کەپاراستنی ئاسایشی ئیسرائیل زۆر گرنگە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە نەتەوەیەکانی ئەمریکا[1]. بیل کلنتۆن ئەڵێ: ئەمریکاو ئیسرائیل بەڵێننامەیەکی تایبەت پێکەوەیان دەبەستێ‌و پەیوەندییەکانیان بێ وێنەو دەگمەنن، چونکە ئیسرائیلیش بەهەمان شێوەی ئەمریکا دیموکراسیەتێکی بەهێزی تێدایە وەك هێمایەك بۆ ئازادی‌و گوڵزارێك بۆ سەربەخۆیی‌و پەناگەیەك بۆ ستەم لێکراوو چەسێنراوان.

**جۆرج بوش:** ئەمریکاو ئیسرائیل بۆ ماوەی چل ساڵ بەهرەمەند بوون لەدۆستایەتییەکی بنیاتنراو لەسەر ڕێزگرتنی دوو لایەنە، پابەند بوون بە بنەماکانی دیموکراسی‌و، بەردەوامبوونیشمان لەگەڕان بەدوای ئاشتی لەڕۆژهەڵاتی ناوڕاستدا هەڵقوڵاوی ئەو ڕاستییەیە کە پەیوەندی نێوان هەردوولامان هەرگیز جیابوونەوە هەڵناگرێت.

**ڕۆناڵد ریگان:** پیاوو ئافرەتە ئازدیخوازەکانی ئیسرائیل هەموو ڕۆژێ ئازایەتی‌وبەهێزی بیرو باوەڕیان دووپاتدەکەنەوە، بەگەڕانەوە بۆ ساڵی ١٩٤٩ز کاتێ ئیسرائیل پەیدا بوو، ڕەخنەگران پێیان وابوو کەئەم دەوڵەتە ناتوانێت بەردەوام بێت، بەڵام ئێستا کەس گومانی لەوەدا نییە کەئیسرائیل زەوی ئارامی‌و دیموکراسیە لەناوچەی ستەمکاری‌و پشێویدا.

**جیمی کارتەر:** مانەوەی ئیسرائیل تەنها مەسەلەیەکی سیاسی نییە، بەڵام ئیلتیزامێکی ئەخلاقییە، ئەمەش ئەو باوەڕە بەهێزەیە کەدەمبەستێتەوە بەئیسرائیلەوە، ئەو باوەڕەی کەزۆرینەی هەرەزۆری خەڵکی ئەمریکا هاوبەشن لەگەڵمدا تیایدا، لەڕاستیدا ئیسرائیلێکی بەهێزو ئارام تەنها بۆ ئیسرائیلیەکان جێی بایەخ نییە، بەڵکو ئەوە جێی بایەخی ئەمریکاو هەموو جیهانی ئازادیخوازە[2].

**جیرارد فۆرد:** پابەندبوونم بەئاسایش‌و داهاتووی ئیسرائیلەوە لەسەر چەند بنەمایەکی سەرەکی بنیاتنراوە، لەهەمان کاتدا بایەخدانێکی کەسی تایبەتە وەك کەسێکی ڕۆشنبیر، هەروەك ڕۆڵیشمان

---

[1] واقدساه(٣/٤٩٤).

[2] واقدساه(٣/٤٩٢).

لەپشتگیری کردنی ئیسرائیلدا سەروەریە بۆ کلتوری نیشتمانیمان[1]. ریتشارد نیکسۆن: ئەمریکیەکان سەرسامن بەو گەلەی کەبیابان هەڵدەکەنێو دەیکات بە باخچە، لەراستیدا ئیسرائیلیەکان سەلماندیان کە ئاوایەتیو نیشتمانپەرەوەریو میسالیەتو تامەزرۆی ئازادییان تێدایە، ئەمەم بینیوەو باوەڕی تەوام پێی هەیە[2].

**جۆن کەنەدی:** ئیسرائیل بۆ سڕینەوەو نەمان دروست نەبووە، بەڵکو دەمێنێتەوە گەشە دەکات، چونکە ئەو لەدایکبووی ئاسایشەو وڵاتیش بۆ مرۆڤە ئازاکانە، بەدرۆو دەلەسە ناروخێت یاخود بەروخاندنی ورەی ناروخێت، چونکە ئەو هەڵگری قەڵغانی دیموکراسیەو شمشێری ئازادی هەڵکێشاوە[3].

**دوایت ئایزنهاوەر:** هێزەکانمان پاشماوەی گەلی جولەکەیان لەئەوروپادا رزگار کردلەپێناو ژیانێکی نوێو هیوایەکی نوێ لەسەر زەویەکی نوێداو ئێمە لەگەڵ هەموو ئەو پیاوانەداین کەخاوەنی ئیرادەیەکی راستگۆیانەنو سڵاو ئەنێرم بۆ ئەو دەوڵەتە ساوایەو هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم[4].

**هاری ترومان:** باوەڕم بەئیسرائیل هەبووە پێش دروستبوونی، هەروەك چۆن ئیستا باوەڕم پێی هەیەو دڵنیام کە ئایندەیەکی پرشنگداری لەبەردەم دایە، نەك لەبەر ئەوەی کەنەتەوەیەکی سەربەخۆو نوێیە، بەڵکو وەك بەرجەستەکاری میسالیاتە مەزنەکانی شارستانیەکەمان[5].

٤- **یەکێتی ئوممەت لەسەر بنەمای یەکێتی بیرو باوەڕ:** خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ﴾ (الصف:٤)، واتە: بەراستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کەدەجەنگن لەپێناو رێبازی خودادا بەیەك ریزو پارچەو یەك دڵ هەروەك کۆشکێکی بەرزی قایمی داڕێژراو بەقوڕقوشم. (تەفسیری ئاسان ل ٥٥٣) نەتەوەی یەك ریز بەهێزترە لەکاتی روبەڕووبوونەوەدا لەچەند بەرەیەك کەهەڵبەودابەزی تیادا بێتو بەرژەوەندی کاتی کۆیان بکاتەوە، ئەوە سوننەتی خوایە لەژیاندا کاتێ ئوممەت یەکدەگرێت لەسەر بنەمای بیرو باوەڕ ئەوە بەهێزترو سەرفرازترە هەرچەندە ژمارەشی کەم بێت ئەمەش

---

[1] واقدساه (٣/٤٩٢)

[2] واقدساه (٣/٤٩٢)

[3] واقدساه (٣/٤٩٢)

[4] واقدساه (٣/٤٩٢)

[5] واقدساه (٣/٤٩٢)

لەرەوتی مێژووەوە دەردەکەوێت: چەند جیاوازە ئەو کاروانەی کە ئارەزوو و بۆچونی مرۆڤ ئاراستەی دەکات لەگەڵ کاروانێکدا کە بنەما خواییەکان ئاڕاستەی بکەن، چەند جیاوازە ئەو ئوممەتەی کە ڕێبازی پەروەردگار ڕێی روناك دەکاتەوە لەگەڵ خەڵکانێکدا کەئارەزوو تروسکاییەکیان پێدەداتو پاشان دەکوژێتەوە، دیارە بەیەککەیشتن لەجەنگی یەکلاکەرەوە لەگەڵ شیعەی رافیزەدا ئەوە بەدیناهێنێت، چونکە سەلاحەدین دەوڵەتی فاطمی لەناو بردو پاشان توانی بەیتولمقدیس رزگار بکات دوای لەناوبردنی بیری شیعەگەری رافیزر، مێژووش رۆڵی شیعەی رافیزەمان پیشان دەدات لەناپاکی نواندن بەرامبەر بەئوممەتو کوشتنی تێکۆشەرانیو کۆسپ خستنە سەر رێی بزووتنەوە جیهادیەکان دژ بەخاچپەرستان بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی، لەمێژووی نوێشدا لەگەڵ ئەمریکادا بوونە هاوپەیمان لەسەر حسابی ئەفغانستانو عێراقو بەرژەوەندیەمەزهەبیەکان لەسەرووی هەموو شتێکەوە دانا، لەراستیدا خەڵکانی بیدعەچی وەك دووپشك وانو سەرو جەستەیان لەخاکدا دەشارنەوەو کلکیان دەردێنن هەرکات توانایان هەبوو پێتەوە دەدەن، خەڵکی بیدعەچیش بەهەمان شێوەن، لەناو خەڵکیدا خۆیان دەشارنەوە، بەڵام هەر کە بواریان بۆ رەخسا هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجەگلاوەکانیان دەدەن[1].

٥- **رووبەڕووبوونەوە لەژێر ئاڵای ئیسلامدا:** ئالای ئیسلام ژیانو ئومێدو نووری چاوو دیدەمانە، تاکە ئاڵاشە بۆ جەنگەکانی داهاتوومان، لەراستیدا جولەکەو گاورەکان بەتەورات جەنگێکی ئاینییمان لەدژ بەرپا دەکەن لەژێر دروشمی خاچو ئەستێرەدا ئێمەش دەبێ بەقورئان رووبەروویان بینەوە، ئەگەر ئەوان گەڕانەوە بۆ رێنماییەکانی تلمود ئێمەش ئەگەڕێینەوە بۆ بوخاریو موسلم، ئەگەر وتیشیان شەممە بەگەورە دەزانین، ئەڵێین ئیمەش جومعە بەگەورە دەزانین، ئەگەر وتیان هەیکەل (پەیکەری سولەیمان) علیه السلام ، ئەڵێین: مزگەوتی ئەقسا، ئەگەر لەژێر ئاڵای جولەکەو گاوردا لەگەڵماندا جەنگان لەژێر ئاڵای ئیسلامدا روبەروویان دەبینەوە[2]. جمال حەمدان دەڵێت: پێش ئیسلام عەرەبی دورگەی عەرەب نەتەوە نەبوون بەڵکو چەند تیرەیەکی بەشەڕ هاتوو دژ بەیەك بوون کەهەمیشە سەرگەرمی قەتڵو عام کردنی یەکتر بوونو چەند شێوە زارێکیان هەبوو. ئەگەر لەنیوە دوورگەی عەرەبیشدا

---

[1] واقدساە (٣/٤٩٠).

[2] هەمان سەرچاوە (٣/٤٩٥)

نەژیانایە ئەوە تەنها خاوەنی مێژوویەکی فۆلکلۆری دەبوون[1]. هەروەها دەڵێت: بەهۆی ئیسلامەوە عەرەب لەبیابان دەرچوون و هاتنە ناو مێژووەوە، ئەگەر ئیسلام نەبوایە هیچکام لەو دوو کارەیان بۆ نەدەکرا، ئیسلامیش بۆ عەرەب تەنها پەیامێکی ئاسمانی نەبوو بەڵکو فریادرەسێکی ئاسمانیش بوو[2]، هەروەها دەڵێت: ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە. دەشڵێت: گەرانەوەی ئیسلام بۆ ئەوەیە کە دووبارە سەرکردایەتی بکات[3]. سەلاحەدین و نورەدینیش لەجەنگەکانیاندا ئاڵای ئیسلامیان بەرزکردەوە هەر بۆیە سەرجەم گەلە موسوڵمانەکان چوونە ژێر ڕکێفیانەوە بەعەرەب و کوردو تورک و فارس و ....هتد. بەم شێوەیەش توانیان سەرکەوتنی مەزن بەدەست بهێنێت.

٦- **ستراتیژێکی ئیسلامی درێژ خایەن و کادری زانستی کە بەباشی شارەزای واقیع بێت:**

ئازادکردنی قودس لەسەردەستی سەلاحەدین فێری ئەوەمان دەکات کە ئەو کاروانەی کەدەیەوێ سەر لەنوێ قودس ڕزگار بکات ڕێبازو پەیرەوی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەک ئامرازوئامانج و شێوازەکانیشی شەرعین، بەڵام نابێ بەبێ ڕێبازێکی ڕوون و ورد هەنگاو بنێت کەتاکەکانی بەرچاو ڕوون بکاتەوە لەمەبەستەکانیان، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لا تُظْلَمُونَ﴾(الأنفال: ٦٠).

لێرەدا پێویستە چەند ڕاستییەک ڕوون بکەینەوە:

أ- دوژمنەکان کێن ؟

ب- ئەو دوژمنانە چۆن بیردەکەنەوەو توانایان چەندە؟

ج- ئایا خۆمان ئامادەکردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستەکان؟ بۆچی دوژمن سەرکەوت لەگەیشتن بەئامانجەکانیدا؟

د- ئەو دوژمنە جۆراوجۆرانەمان چییان ئامادەکردوە بۆمان؟

ه- بۆچی دوژمن سەرکەوتوو بووە لەکۆتکردنی ئوممەت بەو کۆت و بەندانە؟ ناچارکردنی بۆ خۆبەدەستەوەدان و زەوی و پیرۆزی و سامانەکانی زەوت بکات و گاڵتە بەبیرو باوەڕی و بکات؟

---

[1] واقدساه (٣/٤٩٦)

[2] واقدساه (٣/٤٩٦)

[3] واقدساه (٣/٤٩٦)

و- بۆچی ئوممەت هێندە خەم ساردە بەرامبەر بەو مەترسییە گەورەیەی کەهەڕەشە لەبوونی دەکات؟

هۆکاری ئەمە لەناشارەزایی ئەم ئوممەتەدایەبەرامبەر بەئاینەکەی، بەو پەیامەی کە لەپێناوێدا دروستکراوەو لەسەر زەویدا جێنشین کراوە، ئەمەش بووتە هۆی گەندەڵی بیروباوەڕو سیاسەت رەوشتو ئاکارو لێرەوەشە خەڵکی کەوتنە ناو حەرامەوە فەرزەکانی خوایان وازلێهێناو وە لاو بەرائیان لەدەستداو نەیانتوانی خۆیان بۆ خوا یەکلابکەنەوە. چارەسەریش دوورنیە ئەگەر نیەتی پاکو پشت بەستنی تەواو بەپەروەردگار هەبێت، ئەشتوانین، لەئەزموونە مێژووییەکان کەڵك وەرگرین بۆ ئامادەکردنی پلانێکی ستراتیژی درێژخایەن بۆ رووبەرووبوونەوەی کۆسپو لەمپەڕە هاوچەرخەکان، ستراتیژێك کە لەو " شوناسەی ئیسلامیەوە" ، وەرگیرابێت کەبە لەدەستدانی کەسایەتیمان لەدەستدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ﴾ (البقرة:١٣٨)، واتە: ئەم ئایینو بەرنامەیە ئەو رەنگ نەخشەیە کە خوا دایڕشتووە، کێ هەیە لەخوا چاکتر رەنگو نەخشەی جوان بکێشێتو دایڕێژێت، لەهەموو بارودۆخێکدا ئێمەی ئیماندار هەر ئەو دەپەرستین.( تەفسیری ئاسان ل:٣١).

٧- **تەوبەکردنی ئوممەتی ئیسلامیو گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگارو دورکەوتنەوەی لەتاوان:** سەرکەوتنی خوایی هەرگیز بۆ ئوممەتێکی بەدڕەوشتو بێ ئاگاو سەرکەردانو دوور لەپەیامی خوا دانابەزێ، سەرکەوتن بۆ ئوممەتێك نیە کە لەزۆنگاوی تاواندا گەوزابێتو یاخی بووبێت لەرێبازی خوا، پێوەرەکان بگۆڕێتو لەرێبازو سوننەتەکانی خوا یاخی بێت. بەڵکو سەرکەوتن بۆ ئوممەتێکی خۆڕاگرە کەبزانێت تەنها بەهۆی گوێڕایەڵی خواوە بەسەر دوژمنانیدا زاڵ دەبێتو دوژمنانیشی بەهۆی سەرپێچی فرمانی پەروەردگارە شکست دێنن، هەروەها بزانێ کە شکۆمەندی لەئیسلامدایەو هەرکاتێ بیەوێ شکۆمەندی لەشکستی تردادەست بکەوێت ئەوە خوای گەورەسەرشۆڕی ئەکات، چونکە سەرکەوتن پێویستی بەپاڕانەوەو فرمێسكو نزاو لێدانی قاپی پڕ لەمیهری پەروەردگارە، پرسیار لەشەوی بەدریش بکەن دەربارەی گریانو نوێژەکانی پێغەمبەر (د.خ)، پرسیار لەشەوی جەنگی ئەحزابو شەوی جەنگەکانی تری ئەم ئوممەتە بکەن، کەواتە گەڕانەوە بۆ لای خوا لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی مەزنە.

٨- **جیهادکردن لە پێناو خوادا تاکە رێگەی گێرانەوەی قودسە:** تاکەرێگە بۆ گێڕانەوەی قودس بریتیە لەتێکۆشان لەپێناوخوادا کەکرۆکی دابینکردنی ئاسایشو چڵە پۆپەی ئاینەکەمانە

بەڵكو دەرگايەكە لەدەرگاكانی بەهەشت، كە ئەویش دەرچوونە لەكۆتو بەندەكانی زەوی‌و بەرزبوونەوەیە لەقورسایی گۆشت‌و خوێن، هەرگیز ئەم ئوممەتە نەیدەتوانی بون‌و شوێنە پیرۆزەكانی بپارێزێت بەبێ پەرستشی جیهاد لەپێناو خوادا ، ئەو پەرستشەی كە نورەدین‌و سەلاحەدین پراكتیزەیان كردو هۆكاری بەرپەرچدانەوەی داگیركاری خاچپەرستی بوون خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ١٠ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ١١ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ١٢ وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الصف: ١٠ – ١٣)، واتە: ئەی ئەو كەسەی هێناوە دەستنیشانی بازرگانیەیكتان بۆ بكەم كە لەسزایەكی بەئێش رزگارتان بكات، سەرەتا باوەڕهێنانتانە بەخواو پێغەمبەرەكەی، ئینجا هەوڵ‌و تێكۆشانتانە لەرێگەی خوادابەبەخشینی ماڵ‌و سامانتان، بەخشینی خۆتان (واتە: ماندووكردنی جەستەو بیرو هۆشتان، تا بەخت كردنیان لەپێناو خوادا) بیگومان ئەو كارەتان چاكترو بەفەڕترە بۆتان ئەگەر بزانن‌و تێبگەن، ئەوسا خوا لەگوناهەوە هەڵەكانتان خۆشدەبێت‌و دەتانخاتە باخەكانی بەهەشتەوە كەچەندەهاروبار بەژێر درەختەكانیدا تێدەپەڕێت‌و جایە هەروەها كۆشكو تەلاری خۆش‌و رازاوەو پاك‌و خلوێن لەباخەكانی بەهەشتی عەدندا بەراستی ئائەوەیە سەرەوتن‌و سەرفرازی‌و دەسكەوتی گەورەو بێ سنور، جاشتێكی تریش هەیە كەحەزی لێدەكەن، ئەویش بەخشینی سەركەوتنە لەلایەن خواوەو كردنەوەی وڵاتان‌و دڵەكان، ئەم مژدەیەشبدە بەئیمانداران. (تەفسیری ئاسان ل: ٥٥٣).

لەو پەندو وانەو سودانەشدا گرنگی پشت بەستنی تەواو بەپەروەردگارو متمانە بوون پێی‌و دڵنیابوون لەسەركەوتنی‌و مامەڵەكردن لەگەڵ سوننەتەكانیداو تێگەیشتن لێیان، وەك سوننەتی گۆڕینی دەرونەكان، سوننەتی بەگژیەكداداان‌و، سوننەتی خوا سەبارەت بەسەركەوتن‌و شكست‌و زانینی هۆكارە مەعنەوییەكانی سەركەوتن وەك باوەڕبوون بەپەروەردگارو ترسان لێی‌و تێكۆشان‌و دڵسۆزی‌و پشت بەستن‌و ئارامگری‌و یەكێتی‌و راوێژكردن‌و یادی خواو نزاو گوێڕایەڵی‌و ئازایەتی‌و دامەزراوی‌و هۆكارە مادیەكانی سەركەوتن وەك بەخشین لەپێناو خواداو ئامادەكردنی چەك‌و كەرەستەی جەنگی‌و ئامادەكردنی تێكۆشەران لەرووی سەربازی‌و بەرگریەوەو پلان دانان و بەكارهێنانی بنەماكانی جەنگ‌و پیادەكردنیان وەك هەڵبژاردنی شوێنی مەبەست‌و كۆكردنەوەی هێزو دەست پێوەگرتنی‌و بەكارهێنانی هێرشی كتوپڕو غافڵگیرو رێ پێگرتن‌و نەرمی نواندن‌و خۆ

قایمکردن‌و هاوکاری‌و راوەدوونان، هەروەها شارەزابوون لەسوننەتی خوادا لەسەرخستنی حەق‌و لەناوبردنی بەتاڵداو ململانێی نێوان حەق‌و بەتاڵ‌و سوننەتی پەروەردگار لەسزادانی نەتەوەکاندا بەریشەکێشکردنیان لەسەر بێ باوەڕی‌و ڕەتکردنەوەی ڕۆژی دوایی‌و ئەوەی کە بێ باوەڕی‌و تاوانەکانیان دەدەنە پاڵ خواو ئازاردانی پێغەمبەران بەهەموو شێوەکانی ئازاردان‌و بەدرۆ خستنەوەو داواکردنی هاتنی سزاو نکوڵی کردن لەراستی‌و سەرقاڵبوون بەدونیاو لەبیرکردنی‌ڕۆژی دوایی خۆشگوزەرانی‌و رابواردن‌و لەخۆباییبوون‌و پێنەزانینی نازو نیعمەتەکان‌و لوت بەرزی‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازی‌و قەدەغەکردنی مزگەوت لەخەڵك‌و تاوانکاری‌و....تد.

## بەشی سێیەم: شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی و کۆچی دوایی سەڵاحەدین:

### یەکەم: خاچپەرستەکان پەنا دەبەن بۆ رۆژئاوا:

هێشتا جەنگی حطین کۆتایی نەهاتبوو خاچپەرستان شکستی تەواویان نەهێنابوو، خێرا نێردراوەکانیان بەرەو رۆژئاوا خستە رێ بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەمیرو پاشاکانی ئەوروپا لەو بارودۆخەی کەتێی کەوتبوون، پاش ئازادکردنی بەیتولمەقدیس کۆمەڵە نێردراوێکی تریان بەدوادا ناردن، لەراستیشدا ئەو سەرکەوتن و ئازادکردنە کاردانەوەیەکی توندی هەبوو لەمۆمەلگەی رۆژئاوادا و ئەم دوو نسکۆو کارەساتە بەتەواوی تۆقاندنی، هەروەها گاورەکان لەرۆژئاوادا پێیان وابوو کەئەم دوو شکستە لەئاکامی فەرامۆشکردنی ئەو بانگهێشتە بەردەوامانەوە بوو کە لەشانشینی بەیتولمەقدیسەوە دەهات لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو خاچپەرستانەش کە لەصوردا مابونەوە دڵنیا بوون کەئەگەر کۆمەکیان پێنەگات ئەوە هەلی مانەوەیان زۆر لاوازە، بەڵام زۆری نەخایاند کونرادی مونتفرات جوسیاسی سەرۆکی ئەسقوفەکانی صوری نارد بۆ رۆژئاوای ئەوروپایی لەناوراستی ساڵی ٥٨٣ك و کۆتایی هاوینی ١١٨٧دا هەتاوەکو داوای کۆمەکی بەپەلە لەپاپاو پاشاکانی ئەوروپا بکات ئەوە بوو جوسیاس گەیشتە صقلیەو لەگەڵیاندا کۆبوەوە هەتاکو داوای کۆمەکی بەپەلە لەپاپاو ئەمیرەو پاشاکانی ئەوروپا بکات پاشان جوسیاس گەیشتە صقلیەو لەگەڵ ولیەمی دووەمی پاشایدا کۆبووەوە کەبەدەم داواکەیەوە هات دوای ئەوەی سەرسام بوو بەو هەواڵە کارەسات ئامێزەی کەبەسەر خاچپەرستەکانی لەرۆژهەڵاتدا هاتووە، لەبەر ئەوەی لەحاڵەتی شەڕدا بوو لەگەل بیزەنتیەکاندا هەستا بەمۆرکردنی ئاگر بەستێك لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتی ئیسحاق ئینجیلوس لەمانگی موحەڕەمی ساڵی ٥٨٤ك دا ئازاری/١١٨٨زدا هەتاوەکو یەکلا ببێتەوە بۆ کێشەی خاچپەرسەتەکان، پاشان کەشتی گەلێکی نارد کەچەند سوارێکی تێدابوو بۆ طرابلوس بەسەرکردایەتی ئەمیری صقلیە مرجریت برندیزیو توانی ببێتە رێگر لەئازادکردنی ئەو شارە لەلایەن سەڵاحەدینەوە[1]. پاشان جوسییاس لەصقلیەوە برێکەوت بەرەو رۆما بەهاوڕێیەتی وەفدی صقلیە هەتاکو راستی بارودۆخی خاچپەرستان لەشامدا بۆ پاپا ئوربانی سێیەم روون بکاتەوە، بەڵام پاپا بەرگەی ئەو دەنگو باسانەی نەگرتو لەداخو غەمدا لە١٤ی شەعبانی ٥٨٣/ تشرینی یەکەمی ١١٨٧دا مرد، بەڵام جێنشینەکەی واتە گریگۆری هەشتەم خێرا پەیوەندی کرد بەهەردوو پاشای فەرەنساو ئینگلتەراو ئیمپراتۆری ئەڵمانیاوەو هانی دان بۆ لەبیرکردن و وەلانانی

---

[1] تأريخ الأيوبيين في مصر بلاد الشام والجزيرة، ل:١٧٦.

ناكۆكیەكانیان و یەكخستن و ئامادەكرنی هێزەكانیان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی موسوڵمانەكان، ئەگەرچی پاپا گریگۆری هەشتەمیش لە١٣ی شەوال/١٧ی كانوونی یەكەمدا كۆچی دوایی كرد پیش ئەوەی بەرهەمی هەوڵەكانی ببینێت، بەڵام كلیمنتی سێیەمی جێنشینی (٥٨٣ك/١١٨٧ز-١١٩١ز) خێرا پەیوەندی كرد بەفریدریكی یەكەم بربوسای ئیمپراتۆری ئەڵمانیاوە و قەناعەتی پێكرد بەپێویستی بەشداریكردنی لەشاڵاوێكی خاچپەرستیدا بەرەو رۆژهەڵات، ئەمەش لەكاتێكدا ڕووی دا كەجوسیاس بەرەو رۆژئاوا بەرێ كەوتبوو بۆ چاوپێكەوتن لەگەڵ هەردوو پاشای فەرەنساو ئینگلتەرادا (فلیب ئوغسطس و هنری دووەم) ئەوە بوو لەجیزورزدا لەسەر سنووری نێوان نۆرماندیاو فەرەنسا لەگەڵیاندا كۆبوویەوە قایلی كردن بە لەبیركردنی ناكۆكیەكانیان (كەزۆر توند بوو) هانیدان بۆ مۆركردنی رێكەوتنامەو بەشداریكردن پێكەوە لەهەڵمەتی خاچپەرستیدا، بەڵام هەردوولا خۆیان لەجێبەجێكردنی رێككەوتنەكە دەدزییەوەو دوبارە جەنگ لەنێوانیاندا هەڵگیرسا، پاشان هنری دووەمی پاشای ئینگلتەرا كۆچی دوای كرد لەساڵی ٥٨٥ك/١١٨٩زداو رێتشارد شێردڵ دۆق بواتوی كوڕی شوێنی گرتەوەو هەستا بەمۆركردنی رێكەوتننامەیەك لەگەڵ پاشای فەرەنساداو خۆی ئامادەكرد بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێكی هاوبەش بۆ رۆژهەڵات[1].

لێرەشدا رۆڵی پیاوانی ئاینی مەسیحی دەردەكەوێت لەكاتی قەیراندا لەروانگەی ئەو كارەوە كە جوسیاس و پاپا پێی هەستان، لێرەشەوە وانەیەكی گرنگ فێردەبین كەئەویش ئەوەیە كە پێویستە لەسەر زانایان و بانگخوازان و بیریاران و ئەدیبان و سیاسیەكانی ئوممەتەكەمان كە قۆناغی هەستكردن بەداخ و هەناسە هەڵكێشان تێپەرێنن لەكاتی ئەو نسكۆو نەهامەتیانەدا كەڕووبەڕووی ئوممەتەكەمان دەبێتەوە پێویستە هەوڵی بێوچان و كاری راست و دروست ئەنجام بدرێت كەخواو پێغەمبەر (د.خ) پێیان خۆشە وەك تەوزیف كردنی ئیهاتوویی توانا سەركردەییەكان بۆ قەناعەت پێكردنی یەكترو پلانی باش دانان و پێشكەشكردنی تێڕوانینێكی شارستانی پێشكەوتوانەو ....هتد، لەپێناو سەرخستنی ئاینی خواو بەرپەرچدانەوەی داگیركەراندا.

خاچپەرستەكان بەرێژەیەكی زۆرەوە ڕوویان كردە وڵاتی شام كە لەژماردن نەدەهات، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو نامەیە بوو كەسەلاحەدین ناردی بۆ خلیفەی عەباسی لەبەغدا لەساڵی٥٨٦ك/١١٩٠زدا تیایدا ئاگاداری ئەكردەوەو دەیوت: ئیسلام تووشی كۆمەڵێكیان بووە كە ئارەزووی مەرگیان هەیەو هاتوون بەدەم بانگەوازەوەو خۆشەویستانیان جێهێشتووەو خاك و زێدیان لەبیر چووەو هاتوون بۆ حەج هەموو ئەمەشیان وەك وەڵامدانەوەی بانگهێشتی قەشەو

---

[1] تأريخ الأيوبيين في مصر بلاد الشام والجزيرة، ل:١٧٦.

مەركەيزەكەيان كردووە[1]. هەموو چین و توێژەكانی خاچپەرستان بەرەو رۆژهەلات كەوتنە رێ هەركەسێكیش نەیتوانیبایە بڕوات بەپارەو كەرەستەكانی كەسێكی لەبری خۆی دەنارد[2]، ژنانیش هاتنە دەرەوە بۆ بەشداری كردن لەشالاوی سێیەمی خاچپەرستاندا، هەندێكیان لەگەڵ سوارەكاندا دەرچوون و ئازوقەو كەرەستەكانیان دەگرتە ئەستۆی خۆیان، بۆ نموونە ئەبوو شامەو كەسانی تریش ئەگێڕنەوە كە لەساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩زدا لەدەریاوە ئافرەتێكی خانەدانی گاور گەشتە ولاتی شام كەپێج سەد سواری لەگەڵدا بوو بەئەسپ و شوێن كەوتووەكانیەوە، ئەم ژنە هەموو پێداویستییەكانیانی گرتبووە ئەستۆ[3]، هەندێكیش لەئافرەتەكان بەجلی پیاوەوە هاتبوون و زرێ پۆشیان پۆشیبوو، هەتاوەكو خۆیان لەجەنگەكاندا بەشدار بن چونكە ئەم كارەیان بەپەرستن دەزانی[4]. هەندێكیشیان بۆ فریاكەوتن و بەدەمەوە چوونی كەسە نەزانراوو بێ كەسەكان و دڵخۆشكردنی خاچپەرستان بۆ رابواردن لەگەڵیاندا هەتاوەكو بێزاری روویان تێ نەكات[5]. سەبارەت بە ولیەمی پاشای دووەمی صقلیەش ئەوە هەستابەناردنی كەشتیگەلێك لەساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩زدا كەشەست پارچەی لەخۆی دەگرت و دە هەزار جەنگاوەری تیادا بوو، ئەم كەشتیگەلەش چووە صورو پاشان گەڕایەوە طرابلوس سودێكی ئەوتۆی نەبوو بۆ خاچپەرستان چونكە ئازوقەكەی بەشی پیاوانی ناو كەشتییەكەی نەدەكرد[6].

**دووەم : ئیمپراتۆری ئەڵمانی بەرەو رۆژهەلات بەرێ دەكەوێت:**

پاشاو فەرمانرەواكانی ئەوروپا ناكۆكی و كێشەكانی نێوانیان لەبیر كردبوو سوربوون لەسەر بەدەمەوە چوونی بانگەوازەكەی پاپاو بەرێخستنی شالاوی خاچپەرستی بۆ ولاتی شام یەكەم كەسێكیش كە بەدەم ئەم بانگەوازەوە هات فردریك بربروسای ئیمبراتۆری ئەڵمانیا بوو[7]، ئەوەبوو لەبەهاری ساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩زدا سوپای ئەڵمانیا دەستی كرد بەكۆبوونەوە لەشاری (راتسبون) وەك ئامادەكارییەك بۆ بەرێكەوتن بۆ ولاتی شام، ئەو سوپایەش سەرباری زۆری ژمارەی،

---

[1] تأريخ الأيوبيين في مصر و بلاد الشام والجزيرة، ل:

[2] كتاب الروختين (٢/١٦١-١٦٢)، صلاح الدين والصليبيون، ل:٢٣٨

[3] مفروج الكروب (٢/٣٠٨) صلاح الدين والصليبيون، ل:٢٣٨

[4] كتاب الروختين (٢/ ١٤٩)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٣٨

[5] هەمان سەرچاوە (٢/١٤٩) صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٣٨

[6] مفروج الكروب (٢/٥٥٨) صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٣٩

[7] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٤٠.

بەشێوەیەکی باشرێکخرابوو، هەرکەسێکیش تیایاندا تاوانێکی بکردایە ئەوە پاداشتی سەربڕین بوو وەك بەرخ[1].

ئەم سوپایە کەوتە ڕێو ئیمپراتۆر فریدریك بربروساش پێشی کەوتبوو بەهاوڕێیەتی یەکێك لەکوڕەکانیو ڕێگای وشکانی بەئاراستەی قوستەنتەنیە گرتە بەر، بەڵام روبەرووی دوژمنایەتییەکی زۆر بووەوە لەلایەن ئیمپراتۆری بیزەنتی ئیسحاقی دووەم ئینجیلۆسەوە کە هەواڵی بەڕێکەوتنی ئەڵمانەکانی بۆ سەلاحەدین ناردو بەڵێنی پێدا کەرێیان پێنەدا بەوڵاتەکەیدا تێپەڕن، بەڵام سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن کەئیمپراتۆری بیزەنتی نەیتوانی ڕێگرییان بکات، بەڵام بەهیچ شێوەیەك کۆمەکی نەکردن، ئەمەش بووە هۆی کەمبوونەوەی ئازوقەیانو لەکەنداوی سفۆڕ پەڕینەوەو زۆر تەنگاو بوو بوونو تووشی ناڕەحەتییەکی زۆر بوو بوون[2]. کاتێ پەڕینەوە بۆ ئاسیای بچوك دووبارە تووشی کێشەی زۆر بوون بەهۆی نەشارەزاییانەوە لەناوچەکە ئەمەش وایکردبوو کە قۆناغە ڕێیەك بەدوو ڕۆژ ببڕنو هەندێ چاریش لەلایەن دانیشتووە تورکمانەکانی ناوچەکەوە دەفڕێنران، هەروەها هاتنی زستانیش کارگەری زۆری هەبوو لەسەر ڕێو ڕۆشتنیان، چونکە بەفرێکی زۆر باریبوو، ئەمەش ناچاری خواردنی وڵاخەکانو سوتاندنی کەلو پەلەکانی کردن لەبەر نەبوونی دار بۆ سوتاندن. هەروەها نەمانی ئالف بووە هۆی ماندووبوونی وڵاغەکانیانو نەمانی توانای بارهەڵگرتنیان، بۆیە ناچار بوون ئەو کەلو پەلانە بشارنەوە کە پێیان هەڵنەدەگیرا[3]. کاتێ کەنزیك بوونەوە لەناوچەی سەلجوقە ڕۆمەکان کەسوڵتان قلج ئەرسەلانی کوڕی مەسعود سلجوقی سەرکردایەتی دەکردن، قطب الدین مەلیکشای کوڕی لێیان ڕاست بوویەوەولەجەنگێکی گەورەدا ڕووبەڕوویان بوویەوە، بەڵام توانییان بەسەریدا سەرکەون ئەویش پاشەکشەی کرد بۆ قونیەی پایتەختی میرنشینەکەی، بەڵام ئەڵمانەکان شوێنی کەوتن چوونە شارەکەیەوەو بازارەکانیان سوتاند پاشان ناردیان بەدوای ئەرسەلانی باوکیداو پێیان وت: ئێمە بۆ دەستگرتن بەسەر وڵاتی تۆدا نەهاتووین، بەڵکو هاتووین بۆ تۆڵەکردنەوەی دەست بەسەراگرتنی بەیتولمەقدیس[4]، پاشان چەند دیاریەکیان بۆ ناردو داوای ئاگر بەستیان لێکردو ئەویش ڕازی بوو، بە لام خۆیو کوڕەکەی نامەیەکیان نارد بۆ سەلاحەدینو پۆزشیان بۆ هێنایەوە بۆ ڕێگەدان بەهاتنی ئەڵمانەکان بۆ

[1] النوادر الصلطانية، ل:١٢٦، ل:٢٤٠.

[2] الكامل في التأريخ، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٤١

[3] مفروج الكروب (٣١٨/٢) صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٤١

[4] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٤٢

ولاتەکەیان و روونیان کردەوە کەزۆر پێکراوە، سوپای ئەڵمانیش بۆ ماوەیەك لەولاتی قلجدا مایەوەو خۆیان بەهێز کرد بەئازووقەو کەرەستەو پاشان بەجێیان هێشت و درێژەیان دا بەڕێ و رۆیشتنەکەیان، ئیبن شەدادو ئەبو شامەش ئاماژەیان بەپەیوەندی دۆستایەتی نێوان سوڵتان قلج ئەرسەلان و ئیمپراتۆر فردریك بربروسا داوە، گوایە قلج کاتێ پزشکی هێناوەتەوە بۆ سەلاحەدین وویستوویەتی خۆی وەك دوژمنی پاشای ئەڵمانی پیشان بدات لەحالێکدا کە دۆستی بووە، هەروەك چاو ساغ و رێنیشاندەری لەگەڵدا ناردووە هەتاوەکو بەسەلامەتی تێپەڕێ[1]، ئەمە لەکاتێکدایە کەئیبن الأثیر چەند هۆکارێك باس دەکات کەپاڵی بەپاشا قلج ئەرسەلانەوە ناوە بۆ رێگەدان بەتێپەڕبونی پاشای ئەڵمانی بەخاکیدا، لەوانە ئەو لاوازییەی کەولاتەکەی پێیدا تێدەپەڕدەبوو بەهۆی کێشەی ناوخۆییەوە دەرەنجامی دابەسکردنی موڵکەکەی لەنێوان کورەکانیدا[2]، ئەمە وێرای ئەو فشارەی کە لەسەری بوو بەهۆی هاوپەیمانێتی نێوان هەردوو رکابەرەکەی، صەلاحەدین و ئیمپراتۆری بیزەنتی،[3] بەهەر حاڵ ئەو هەمووە ئاسانکاریەی کە قلج بۆ سوپای ئەڵمانی بکرد سودی بۆیان نەبوو، چونکە لەکاتی تێپەڕبوونیاندا رووبەڕووی چەندین هێرش بوونەوە، ئەمەش پاشای ئەڵمانی تورە کردوچاوساغ و رێنیشاندەرەکانی گرت و خستنیە زیندانەوە[4].

١- **چوونە ناوەوەی ولاتی ئەرمەن لەلایەن ئەڵمانەکانەوە:** ئەڵمانەکان درێژەیان بەڕێ و رۆیشتنیان دا سەرباری ئەو کۆسپانەی کەهاتە رێیان، هەتاوەکو گەیشتنە ولاتی ئەرمەن لەوێ ئیبن لاونی ئەمیری پێشوازییەکی گەرمی لێکردن و هەموو پێداویستییەکی پێشکەشکردن و ئاسانترین رێگەی پیشاندان[5]، ئەمیری ئەرمینیەش بەهیوا بوو کە ببێتە پاشا لەئەرمینیای بچوکدا هەتاوەکو بچوکتر لەئەمیرە خاچپەرستەکانی تر دەرنەکەوێت کە لەولاتی شامدا بوون، هەروەها خۆی لەتەماع و چاوتێبڕینی ئیمپراتۆری بیزەنتی دوربخاتەوە، وادیار بوو کەئەمیری ئەرمینیە بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە ئومێدی زۆری بەپاپاو ئیمپراتۆری ئەڵمانیا هەبوو[6].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٢.

[2] الكامل في التأريخ، لە (صلاح الدين و الصليبيون)ەوە ل: ٢٤٢

[3] الحركة الصليبية (٨٤٧/٢) سەعید عاشور

[4] مفرج الكروب (٣١٩/٢)، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٣

[5] مفرج الكروب (٣١٩/٢)، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٣

[6] صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٤٣.

٢- **مردنی ئیمپراتۆری ئەڵمانی:** مانەوەی ئەڵمانەکان لەوڵاتی ئیبن لاوندا زۆری نەخایاند بەڵکو درێژەیان دا بەرێو ڕۆیشتن دوای ئەوەی کە رێی نیشاندان‌و پاشان بەو پەڕی ماندوێتییەوە گەیشتنە طرطوس‌و[١] ویستیان چەند رۆژێك لەوێ بمێننەوە بۆ پشودان، بەڵام قەدەری شتێکی تری بۆ بڕیار دابوون، ئەوە بوو روداوێکی کتوپڕ روویدا کە هەموو هاوکێشەکانی سەرو خوار کرد ئەویش خنکانی ئیمپراتۆر فریدریك بربروسا بوو لەیەکێك لەروبارەکاندا ئەمەش لەساڵی ٥٨٦ك /١٥ی یۆنیۆی ١١٩٥زدا ، مێژوو نووسانیش جیاوازییان هەیە سەبارەت بە هۆی مردنی، عمادو ئیبن واصل‌و باس لەوە دەکەن کە ئەڵمانەکان کاتێ لە روباری سالف پەڕینەوە بەر شەپۆلێکی ئاوەکە کەوتن پاشاش داوای شوێنێکی کرد کە بەتەنها لێیەوە بپەڕێتەوەو چووە ناو ئاوێکی خوڕەوە شەپۆلی ئاو بردی‌و کیشای بەدرەختێکداو سەری بریندار بوو کاتێ دەریان هێنا لەدوا ساتی ژیانیدا بوو پاش کەمێك مرد[٢]، ئیبن شدادو مێژوو نوسانێکی تر باس لەوە دەکەن کەفریدریك بربروسا چووە کەناری یەکێك لەرووبارەکان‌و مەلەی تیادا کرد، بەڵام بەهۆی ساردنی ئاوەکەوە نەخۆش کەوت‌و پاش چەند رۆژێکی کەم گیانی لەدەست دا[٣]. هەرچی ئیبن (الأثیر)یشە ئەوە باسی ئەوە دەکات کە فریدریك ویستویەتی خۆی بشواتو خنکاوە[٤]. بەهەرحاڵ ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە ئیمپراتۆر پێش ئەوەی بەئامانجی خۆی بگات گیانی لەدەست دا ئەمە جگە لەوەی کەئەو رووداوە کتو پڕە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر شکسهێنانی شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی، چونکە بەشێکی زۆری سوپای ئەڵمانی پاش کۆچی دوای ئیمپراتۆر گەڕایەوە بۆ ئەوروپا[٥]، سەرباری ئەوەی کەخاچپەرستەکان بەمردنی کەسایەتیەکی گەورەو دڵسۆزیان بۆ پڕۆژەی خاچپەرستی لەدەست دا کە ئەگەر بگەشتایەتە عەککا ئەوە صەلاحەدین دەردی سەری زۆری تووش دەبوو[٦].

٣- **پەرتەوازە بوونی ئەڵمانەکان دوای مردنی پاشاکەیان:** بەمردنی ئیمپراتۆر فردریك بربروسا ئەڵمانەکان تووشی نەهامەتی زۆر بوون، چونکە لەسەرەتاوە ناکۆك بوون لەسەر ئەوەی کێ

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٣.

[٢] مفرج الکروب (٢/٣١٩)، صلاح الدین و الصلیبیون، ل: ٢٤٤

[٣] کتاب الروختین (٢/ ١٥٥)، صلاح الدین والصلیبیون، ل: ٢٤٤

[٤] الکامل في التأریخ، لە (صلاح الدین و الصلیبیون)ەوە ل: ٢٤٤

[٥] الکامل في التأریخ، لە (صلاح الدین و الصلیبیون)ەوە ل: ٢٤٤

[٦] التأریخ العربي، ل: ٢٣٩

ببێته جێنشینی لەرابەرایەتیکردنی هەڵمەتی خاچپەرستی ئەڵمانیدا، هەندێکیان ئارەزوویان لێبوو کەفریدریك سوابی کوڕی دابنێن، بەڵام ئەوانی تر پێیان باش بوو کە برا گەورەکەی فریدریك سوابی دەست نیشان بکەن[1]، هەرکە پاشای ئەرمەنەکان ئەم بارو دۆخەی بینی کە بەسەر ئەڵمانەکاندا هات دوای مردنی فریدریك بربروسا خێرا خۆی لێ دورخستنەوە، چونکە ئەو نازانێ چییان بەسەر دێ، پاشان ئەو ئەرمەنیو ئەوان فرەنجن، هەربۆیە لەقەڵایەکی تۆکمەدا خۆی دورگرت[2]، ئەڵمانەکانیش پاش مردنی پاشاکەیان بڵاوبوونەوە هەندێکیانن گەرانەوە بۆ ئەوروپاو هەندێکیشیان لەگەڵ ئەمیر فریدریك سوابی دا رۆشتن کەبووە جێنشینی باوکی لەسەرکردایەتی کردنی سوپاکەدا، دوای بەڕێکەوتنی پاشماوەی هەڵمەتەکە بەرەو ئەنطاکیە دەردێ پەتایەکی کوشندەیان تیادا بڵاو بووەوە کە بووە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانیانو ئەوانەی کەدەربازبوون گەشتنە ئەنطاکیەو ئەتوت لەگۆڕ دەرهێنراون وەك مێژوو نووس ئیبن الأثیر دەڵێ[3]، هەر کەئەڵمانەکان گەشتنە ئەنطاکیە بوهیمۆندی سێیەم بێزاری خۆی دەربڕیو چاوی بڕیە سامانو شتومەکەکانیانو هەوڵی دەست بەسەراگرتنی دا، ئەویش بەوەی کەپێشنیاری پێشڕەوی کردن بۆ حەلەبی خستە پێش چاویانو باسی ئاسانیو خۆشی رێگەکەی بۆ کردن، بەڵام فریدریك سوابی وەڵامی پێشنیازەکەی نەدایەوەو داوای لێکرد کە قەڵای ئەنطاکیەی پێبدات بۆ دانانی کەلو پەلو سامانو کەرەستەکانی تیایداو بوهیمۆندیش رەزامەندی لەسەر داواکەی پیشاندا، بەئومێدی ئەوەی کەدەست بگرێت بەسەر ئەو سامناو ئازوقەدا هەرواش دەرچوو کەویستی چونکە ئەڵمانەکان کاتی ئەنطاکیەیان بەجێهێشت دووبارە نەگەڕانەوە بۆیو بوهیمۆند دەستی بەسەر کەلو پەلەکانیاندا گرت[4]، لەهەمان کاتدا تیپێکی تری ئەڵمانەکان تووشی کارەساتێك بوون کەرۆڵی هەبوو لەدابەزاندنی ورەیان، ئەوە بوو ئەم تیپە بەرەو بغراس بەرێکەوت چونکە وایان دەزانی کەبەدەست خاچپەرستەکانەوەیە، هەر کە گەشتنە پێشەوە دەرگاکانی قەڵاکە کرایەوەو موسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەریانو دەستیان گرت بەسەر سەروەتو سامانو چەكو کەرەستەکانیانداو ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتو دەستگیر کرد، هەروەك هەندێ

---

[1] تأريخ إبن خلدون(٥/٣٢٢)، صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٤٤.

[2] النوادر الصلطانية، ل: ١٢٤، صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٤٤

[3] كتاب الروختين (٢/ ١٥٦)، صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٤٥

[4] مفرج الكروب (٢/٣٢٢)، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٥

لەدانیشتوانی حەلەبیش هاتنە دەرەوەو دەستیان دایە فڕاندنی ئەڵمانەکانو ژمارەیەکیان لێفراندنو بەنرخێکی هەرزان لەبازاڕدا فرۆشتیان[1] ئەمەش رادەی ئەو دابڕانەمان بۆ دەردەخات کەسەلاحەدین سەپاندی بەسەر سوپای خاچپەرستەکان لەشامدا، دوای بەهێزکردنی دەسەلاتی بەسەر ناوچە کەنارییەکاندا، تەنانەت خاچپەرستە رۆژئاوایەکان نەیان دەتوانی جیاوازی لەنێوان ئەوقەلاو شارانەدا بکەن کە بەدەست براکانیانەوەیە لەگەل ئەوانەی کە بەدەست سەلاحەدینەوەبوو لەرۆژهەلاتدا[2]، دواجار فریدریك سوابی پاش ئەو نەهامەتیانەی کە رووبەرووی سوپاکەی بوویەوە بڕیاری دا بەرەو عەککا بەرێبکەوێتو لەرۆژی چوار شەممە ٢٥ی رەجەبی ساڵی ٥٨٦ك/١١٩٠زدا بەسەرۆکایەتی سوپاکەی بەرەو عەککا بەڕێ کەوت لەرێگەی جبلەو لاذیقەوە، موسڵمانەکانیش لەلانیقەدا هەلی تێپەڕبوونی سوپای بەش بەش بووی ئەڵمانیایان قۆستەوەو هاتنە سەر رێیانو ژمارەیەکی زۆرریان لێکوشتو بەدیل گرتن، کاتێ ئەڵمانەکان گەشتنە طرابلوس بۆ پشودان تیایدا مانەوە، بەلام دووبارە تووشی پەتایەکی کوشندە بوونو لەئاکامدا زۆرینەیان گیانیان لەدەست داو تەنها هەزار کەسیان لێ مایەوە، ئەوانیش بەدەریادا پەڕینەوە بۆ عەککاو لە١٦ی رەمەزانی ساڵی ٥٨٦ك /ئۆکتۆبەری ١١٩٠زدا گەشتنە بەرەوە[3].

٤- **هەڵوێستی سەلاحەدین بەرامبەر بەشالاوی ئەڵمانەکان:** سەلاحەدین مەسەلەی شالاوی ئەڵمانەکانی فەرامۆش نەکردو هەرکە زانی خەڵکی هاندا بۆ جیهاد لەرەمەزانی ساڵی ٥٨٥/ ١١٩٠زدا نێردراوێکی نارد کە ئەویش قاضی بەهادین ئیبن شداد بوو بۆ لای خەلیفە عەباس کە لەو کاتەدا الناصردین الله أبو العباس أحمەدی کوڕی المستضیء بوو بۆ ئاگادارکردنەوەی لەهاتنی ئەڵمانەکان بۆ وڵاتی شام، هەروەها سەلاحەدین فەرمانی کرد بەقاضيئیبن شەداد کەسەردانی ئەمیرەکانی موسڵو شەنگارو جزیرەو ئەربیل بکات بۆ بانگهێشتکردنیان بۆ جیهاد، ئەوانیش وەلامیان دایەوەو خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرێکەوتن بۆ لای سەلاحەدین، خەلیفەش بەڵێنی باشی پێداو پارەو کەرەستەی بۆ نارد[4].

---

[1] مفرج الكروب (٢/٣٢٣)، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٥.

[2] تأريخ إبن الفرات، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٥

[3] تأريخ إبن الفرات، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٥

[4] النوادر السلطانية، ل: ١١٥، صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٤٧.

لەهەمان کاتدا سەلاحەدین بەردەوام بوو لەچاودێریکردنی پێشڕەوی ئەڵمانەکاندا لەرێگەی ناردنی سیخوڕوچاوساغەوە بۆ ئاگادار بوون لەجموجوڵی دوژمنو بەرلێگرتنی، هەروەها جێنشینەکانی لەناوچە جیاجیاکانی شامدا سەربازەکانیان نارد بۆ بەدواداچوونی دوژمنو روبەڕووبونەوەی لەکاتی پێویستدا، ئەوە بوو تووشی تیپێکی سوپای ئەڵمانی بوون کە بۆ پەیداکردنی ئالف بۆ ولاغەکانیان دەرچووبوونو نزیکەی پێنج سەد کەسیان لێ کوشتو دیل کردن[1]، کاتێ سەلاحەدین دڵنیا بوویەوە لەگەشتنی ئەڵمانەکان بۆ ولاتی ئەرمەنو نزیك بوونەوەیان لەخاکی موسوڵمانان، ئەمیرەکانی دەوڵەتەکەی کۆکردەوەو راوێژی پێکردن دەربارەی چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەیان، ئەوانیش کۆ دەنگ بوون لەسەر بەگەڕخستنی سوپایەکی گەورە بۆ رووبەڕووبونەوەی دوژمن لەرێگەداو پاراستنی چەند شارێك، ئەوەبوو سوپاکە بەسەرکردایەتی چەند ئەمیرێکی موسوڵمان بەرێکەوتو توانی زیانی گەورە لەرێگەدا بەسوپای ئەڵمانی بگەیەنێت[2]. هەروەها سەلاحەدین فەرمانی دا بەروخاندنی شوراکانی طریەو یافاو أرسونو قیسارییەو صیداو جبیل چونکە مەترسی ئەوەی هەبوو کەخاچپەرستەکان دەستی بەسەردا بگرنو لەدژی موسوڵمانەکان بەکاریبهێنن[3]، لەراستیشدا هەڵمەتی ئەڵمانەکان کاتێ شکستی هێنا کە ئیمپراتۆر فریدریك بربروسای سەرکردەیان لەیەکێك لەرووبارەکانی ئاسیای بچوکدا خنکاو سوپاکەیان پەرتەوازە بوو لەشامدا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە نەتوانن بگەنە بەیتولمەقدیس، ئەمە جگە لەوەی کەفریدریك بربروسای پەلەی کرد لەبەرێکەوتن بۆ رۆژهەلاتو رێگای وشکانیشی هەڵبژارد بۆ گەیشتن بەولاتی شام لەکاتێکدا فیلیپ ئوغسطسی پاشای فەرەنساو ریتشارد شێردڵی پاشای ئینگلتەرا ئەوروپایان جێنەهێشت لەشالاوی خاچپەرستیدا تەنها لەهاوینی ساڵی ٥٨٦ك/١١٩٠زدا نەبێت کاتێك لەرێی دەریاوە روویان لەشاری عەککا کرد[4].

**سێیەم: خاچپەرستەکان عەککا گەمارۆدەدەن:**

ئەو فەرەنجانەی کە لەصوردا کۆبوونەوە کۆمەکی زۆریان پێگەیشت، لەوەش گرنگتر بەڵێنی پاپا بوو بەوەی کە پاشاکانی ئەوروپا بەرێوەن بۆ بەدەمەوە چونیان، ئەمەش وایکرد کە بەرگرییان توند ترو بەهێز تر بێت، لەکاتێکیشدا کە ئەوروپا گەرم بوو بوو بۆ هێرشکردنە سەر رۆژهەلاتی

---

[1] مفرج الكروب (٢/٣٢٣)، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٧.

[2] صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٤٧

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٧

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٨

ئیسلامیو گێڕانەوەی قودس، سەلاحەدین لەهەوڵی ئازادکردنی صوردابوو، گیانی بەرگریکردنیش لەم شارەدا کونرادی مونتفرات بوو کەچاوی بڕیبوویە تەختی شانشینی قودس، بەو هۆیەشەوە ئامادە نەبوو رێبدات بەجای لوزینانی پاشای قودس بۆ چوونە ناوشاری صور دوای ئازادکردنی لەلایەن سەلاحەدینەوە، ئەوە بوو بۆ ماوەی شەش مانگ لەدەوروبەری طرابلوسدا مایەوە لەسەربازگەیەکی دوور لەشارەکەوەو دەستی کرد بەکۆکردنەوەی چەند هێزێک لەدەوری خۆی بۆ رووبەڕووبوونەوەی مونتفرات، پاشان هەردوو لایان رێککەوتن لەسەر رووبەڕووبوونەوەی سەلاحەدینو هێشتنەوەی مەسەلەی تەختی فەرمانڕەوایی بۆ پاپاو پاشاکانی ئەوروپا، ئەوە بوو بڕیاری چوونە دەریایاندا لەصوردا بەهۆی زۆری ژمارەیانەوە بۆ گەمارۆدانی عەککا، سەلاحەدینیش پێشتر ئەرکی قایمکردنو نۆژەنکردنەوەی شورای عەککاو هێنانی ئازوقەو کەرەستە بۆی سپارد بوو بە ئەمیر بەهادین قەراقوش، ئەویش قەڵاو شوراکەی وەک کۆشکێکی تۆکمەی لێکردبووو بەفەرمانی سەلاحەدینیش جەنگاوەری باشی بۆ هێنابوو، لەمیسریشەوە کەشتیگەلی ئەو ناوچەیەی بانگهێشت کرد بۆ بەندەری ئەو شارە، فەرەنجەکانیش لەرەجەبی ساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩زدا بەرێکەوتنو کەشتییەکانیان لەتەنیشتیانەوە لەدەریاوە دەهاتن، هەرچەندە هاتنیان مەسەلەیەکی کتوپڕو چاوەڕواننەکراو نەبوو بۆ سەلاحەدین چونکە لەرێ چاو ساغو سیخورەکانیەوە پاسگاکەی عەککا ئاگادار کردبوویەوە کە لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بێت، فەرەنجەکانیش لەدەریاو وشکانییەوەو هاتنە ناو عەککا، بەهێزێکی زۆرەوە گەمارۆیان دا ئەمەش لەرەجەبی ساڵی ٥٨٥ك/ ١١٨٩زدا، رای سەلاحەدینیش ڕای وابوو کەپێش گەشتنی فەرەنجەکان بەعەککا رووبەڕوویان ببنەوە، چونکە بەگەیشتنیان بەو شارە دەرپەڕاندنیان زەحمەت دەبێت، بەڵام فەرماندەکانی بەمە رازی نەبوونو بەبیانووی ئەوەی کە ئەو رێگەی کە فەرەنجەکان گرتوویانەتە بەر تەسکو خلیسکەو ئاسان نییە تیایدا رووبەڕووبوونەوە ئەنجام بدرێت، سەرباری ئەمە سەلاحەدین چەند بۆسەیەکی دانا بۆ فەرەنجەکان لەرێی خەڵکی گوندەکانەوە بۆ فڕاندنیان، بەڵام ئەمە سودی نەبوو فەرەنجەکان توانیان لەدەریاو وشکانییەوە بگەنە بەرامبەر عەککا، سەلاحەدینیش پێشتر نامەیەکی نووسی بوو بۆ سەربازەکانی کە لەبەرامبەر ئەنطاکیەو طرابلوسو صورو کەنارەکانی میسردا لەئەسکەندەریەو رمیاط لەگەڵ عادلی برایدا بڵاوبوو بوونەوەو ژمارەیەکی زۆریان گەڕانەوە پاشان سەربازەکانی شامو جزیرە هاتنو بەم شێوەیە توانی پشتوێنەیەک بەدەوری گەمارۆی فەرەنجەکاندا دروست بکاتو فەرەنجەکان کەوتنە نێوان پاسگای شارەکەو سەربازەکانی سەلاحەدین[1]، عماد دەڵێت: لەکۆتایدا

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهدو الملك الزاهد، ل: ٢٨٥.

بۆمان دەردەكەوێت كەڕای سوڵتان راستتر بوو، چونكە رووبەڕوونەوەیان دوای جێگیر بوونیان قورستر بوو، ئەوەبوو فرەنجەكان گەشتنە عەككا لەدەریاوە بۆ دەریاو رووبەڕووبوونەوەش ڕۆژانە روویدەداو هەندێ رۆژ زۆر توند بوو، لەسەختترینی ئەو جەنگانەش ئەوە بوو كەموسوڵمانەكان ویستیان كۆمەكی بگەیەننە عەككاو هێرشیان كردە سەر خاچپەرستەكانو لەشوراكان دووریان خستنەوەو سوپایەكی زۆر كە لەمیسرەوە هاتبوو لەگەڵ چەند ئەمیرێكدا ناردە ناو شارەكەو، لەبەرامبەریشدا فرەنجەكان پێش گەشتنی پاشماوەی كۆمەكییەكان لەمیسرەوە هەستان بەهێرشكردنە سەر موسوڵمانەكانو توانیان لەسەرەتاداشكستیان پێبهێننو گەشتنە خێوەتی مەلیك عادلو سەلاحەدینو پاسەوانەكانیان كوشت، بەڵام سوڵتان بەناو سوپاكەیدا هاواری كرد: هاوار بۆ ئیسلامو لەگەڵیاندا پەلاماری فرەنجەكانی داو تێكیان شكاندنو پاسگای عەككاش لەپشتەوە تیر بارانی كردنو بەپەلە قاچە رزگاریان بوو كشانەدواوە، عمادیش دوپاتی دەكاتەوە كە لەو رووبەڕووبوونەوەدا هەزارانیان لێكوژراوەو ئەو جەنگەش بە (الوقعه الكبرى) ناوی دەركرد[1].

١- **ئەو زانایانەی كە لەوجەنگەدا بەشدار بوون:** زانا (ضیاء الدین عیسی)ی هەكاری سەرپەرشتی پێشەوەی دڵی سوپای دەكردو[2] القاضی بەهادینی كوڕی شەددادو زانا عمادی ئەسفەهانیش لەم جەنگەدا بەشداربوون، بەشێوەیەكی ورد وەسفیان كردووە وەك دوو شایەتحاڵ[3] بەڵام باسی ئەركی خۆیان لەوجەونگەدا نەكردووە،سەركەوتنیش لەكۆتایی ئەم جەنگەندا بۆ موسوڵمانەكان بوو و خاچپەرستەكانیش زیانێكی زۆریان لێكەوت كە بەدە هەزار كوژراو مەزەندە دەكرێت[4]. هەروەها لەم جەنگەدا زانا ظهیر الدین هەكاری برای زانا عیسای هەكاری شەهید بوو كەوالی بەیتولمەقدیس بوو، ئازایەتیو زانستو دینداری تیادا كۆبوبویەوە[5]، كاتێ زانا عیسای هەكاریش بەشەهید بوونی زانی رازی نەبوو خەڵكی سەرەخۆشی لێبكەنو وتی: ئەمە رۆژی خۆشییە نەك سەرەخۆشیو پرسە[6]، هەروەها زانا ئەبو عەلی كوڕی رواحە لەگەڵ چەند كەسێكدا لەنزیك خێوەتەكەی سەلاحەدین شەهید بووە، لەكاتێكدا كەبەرگری لەخێوەتەكەی سەلاحەدین دەكرد لەكاتی پەلاماردانیدا لەلایەن

---

[1] صلاح الدین الفارس المجاهدو الملك الزاهد، ل: ٢٨٦.

[2] مفرج الكروب (٢/٢٩٦).

[3] دور الفقهاء والعلماء المسلمین في الشرق الأدنی، ل: ١٦٣

[4] البدایة والنهایة، لە: (دور الفقهاء والعلماء)دوە، ل: ١٦٣

[5] دور الفقهاء والعلماء، ل: ١٦٤

[6] دور الفقهاء والعلماء، ل: ١٦٤.

خاچپەرستانەوە[1]، لەناو ئەو دادوەرو قاضیانەشدا کە بەشدار بوون لەمجەنگدا دژ بەخاچپەرستەکان لەعەککا لەساڵی ٥٨٦ك/١١٩٢زدا قاضی المرتضی ی کوڕی قریش کە بەشداری کرد لەهەوڵەکانی موسوڵمانەکاندا بۆ تێکشکاندنی گەمارۆی سەر عەککا، بەڵام دواجار لەرۆژی هەینی دەی جەمادی یەکەمی ساڵی ٥٨٦ك/١١٩٠زدا شەهید کرا[2].

٢- **کاریگەری مەعنەوی زانایان لەسەر جەنگاوەرەکان:** رۆڵی زانایان لەکاتی گەمارۆی عەککادا لەلایەن خاچپەرستەکانەوە لەچەك هەڵگرتن و رووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستاندا کورت نەبوبویەوە، بەڵکو بەناو سەربازگەو سەربازەکاندا دەگەڕان و هانیان دەدان و ورەیان بەرزدەکردنەوە، قورئان خوێنەکان قورئانیان دەخوێندو سەربازەکانیان لەهەڵاتن ئاگادار دەکردەوەو پاداشتی پەروەردگاریان بیر دەخستنەوەو ئایەت و فەرموودەیان دەربارەی پاداشتی شەهیدان لەبەهەشتدا بۆ دەخوێندنەوە، هەتاوەکو ورەیان بەرز بکەنەوەو خۆڕاگرییان زیاتر بکەن، ئەمەش لەهەموو جەنگ و رووبەڕووبوونەوەکانی سەلاحەدیندا روویدەداو قاضي بەهادین کوڕی شەدادیش رۆڵێکی مەزنی هەبوو لەم بوارەدا، ئەوە بوو کاتێ هەواڵی بەرێکەوتنی هەڵمەتی خاچپەرستی و سوپای ئەڵمانیا بەسەرکردایەتی فردریك بربروسای بۆ رۆژهەڵات بەدەمەوە هاتنی خاچپەرستەکان لەشامدا بەسەلاحەدین گەیشت خەم دایگرت و هەستا بەهاندانی خەڵك بۆ جیهادو ئاگادارکردنەوەی خەلیفە لەم پێشهاتە، بۆ ئەم مەبەستەش داوای لەقاضی بەهادینی کوڕی شەداد کرد کە بەرێبکەوێت بۆ لای خەلیفەی عەباسی پێشەوا ناصر ئەبو عەباس ئەحمەدو سەردانی سەرجەم ئەمیرو سەرکردەکان بکات هەتاوەکو رۆڵی خۆیان ببینن لەهاندان و کۆکردنەوەی موسوڵمانان بۆ جیهادو هاوکاریکردنی موسوڵمانان لەشامدا ئیبن شەدداد لەو بارەیەوە دەڵێت: بۆ ئەو مەبەستە بانگی کردم و داوای لێکردم کە بەرێبکەوم بۆ لای فەرمانرەوای شنگارو جزیرەو موسڵ و ئەربیل و بانگهێشتیان بکەم بۆ جیهاد بەخۆیان و سەربازەکانیانەوە، پاشان فەرمانی پێکردم کە بەرێبکەوم بۆ بەغدا بۆ ئاگادار کردنەوەی خەلیفەو داوای کۆمەکی کردن لێی، بەرێکەوتنیشم لە یازدەی رەمەزاندا بوو، خوای گەورە گەیاندنی ئەو پەیام و نامانەی ئاسانکردو هەموان بەدەمەوە هاتن و بەڵێنی پێشکەشکردنی هەموو کۆمەکیەکیان دا، پاشان گەڕامەوە بۆ خزمەتی (رەحمەتی خوای لێبێت) لەرۆژی پێنجی رەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٨٦ك دا خۆشم پێش

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ، النوادر السلطانية، ل: ١٦٤.

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل: ١٦٧

سەربازەکان کەوتمو هەواڵم پێدا کەهەمووان گوێڕایەڵنو خەریکی خۆ ئامادەکردنن، ئەویش بەمە زۆر دڵخۆش بوو[1]. لێرەدا تێبینی توانای سەلاحەدین ئەکەین لەچاودێریکردنی دوژمنداو دەسخستنی زانیاری ورد دەربارەیان ئەمەش وایکرد کە کاتی پێویستی لەبەر دەستدا بێت بۆ خۆئامادەکردنو بەرێککەوتنو خەڵك کۆکردنەوە.لەم قسانەی ئیبن شەدادەوە گرنگیو ترسناکی ئەم ئەرکەمان بۆ دەردەکەوێت کە پێی سپارد بۆ بەغدا بەتایبەت لەو بارودۆخە دژوارەدا کە خاچپەرستەکان هەڕەشەیان لەعەککا دەکردو زۆری نەمابوو بکەوێتە دەستیانەوە، بۆیە سەلاحەدین پێشنیاری کرد بۆ خەلیفە کەخۆخی تەشریف بێنێت بۆ هاندانی زیاتری موسوڵمانان بەرامبەر بەدەستەهەڵگرتنی لەسەرجەم ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیدا بۆی[2]، بەلام وادیارە خەلیفە زۆر دڵگەرم نەبوو کە لەکۆشکەکانیەوە بگوازێتەوە بۆ بەرەکانی جەنگ هەر بۆیە وەلامی پێشنیارەکەی سەلاحەدینی نەدایەوەو تەنها چەند بارێك نەوتو واژوی وەرگرتنی پارەی لەچەند بازرگانێك بۆ نارد، ئەمەش سەلاحەدینی تورەو بێزار کرد[3]، لەراستیدا پێویست بوو لەسەر خەلیفە کە خۆی سەرکردایەتی جیهاد دژ بەخاچپەرستان لەئەستۆ بگرێت، وەك ئەرکی خۆیو لەپێناو بەشداریکردنی لەجیهاد کردن لەپێناو خودا بەماڵو بەگیانو وەك هەولێکیش بۆ گێڕانەوەی رۆڵی خەلافەتو زیندوکردنەوەی لەژیانی خەڵکیدا، چونکە ئەمە دەبێتە پاڵنەرێکی گەورە بۆ موسوڵمانان دژ بەو هەڵمەتە خاچپەرستیە زەبەلاحە، ئەوەی کە بۆ سەلاحەدینیش تۆمار دەکرێت دەرونبەرزیو دنیا نەویستییەتی کاتێ پێشنیاری کرد بۆ خەلیفە کەئامادەیە دەست لەسەرجەم ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی هەڵبگرێت بەرامبەر بەهاتنی بۆ بەرەکانی جەنگ.

٣- **سەلاحەدین ئەنجومەنی شورا کۆدەکاتەوە:** پاش کۆتایهاتنی جەنگ سەلاحەدین داوای کۆبوونەوەی ئەنجومەنی شورای کردو خاوەن راو ئەمیرەکان تیایدا بەشدارییان کرد وەك قاضی ئیبن شەددادو عمادی ئەسفەهانی نوسەر، ئەم کۆبوونەوەیەش بۆ تاوتوێ کردنی مەسەلەی عەککا بوو، سەرەتا سەلاحەدین وتارێکی پێشکەشکردنو تیایدا وتی :بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگار درودو سەلام لەسەر محەمەد(د. خ))، بزانن کە ئەمە دوژمنێ خواو دوژمنی ئێمەیەو پێی ناوەتە خاکمانەوە، بەلام

---

[1] النوادر السلطانية،، ل: (٩٨-٩٩)، دور الفقهاء، ل: ١٦٨.

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين في الشرق الأدنى، ل: ١٦٨

[3] مفرج الكروب (٢/٣٤٠)، دور الفقهاء والعلماء، ل: ١٦٥

ئێمە بەرپەرچمان دایەوەو سەرکەوتن نزیکە بەپشتیوانی خوا، ئێستا کۆمەکی کەمیان ماوەو دەبێ لەخەمی ریشەکێشکردنیاندا بینو خوای گەورەش ئەمەی لەسەر فەرز کردووین، ئێوەش دەزانن کەئەمە سوپاکەی ئێمەیەو چیتر کەس نەماوە کۆمەکیمان بکات جگە لەمەلیك عادل کەبەڕێوەیە، ئەم دوژمنەش ئەگەر مانەوەی درێژە بکێشێت کۆمەکی پێ دەگاتو بەهێز دەبێت، بۆیە بەرای من دەبێت هێرشیان بۆ بەرینو ئێوەش رای خۆتان بلێن[1]. پاش گفتووگۆو قسەو باسێکی زۆر بوون بەدوو دەستەوە: کۆمەڵی یەکەم پشتگیریان لە راکەی سوڵتان دەکرد بۆ هێرشکردنە سەریان پێش خۆکۆکردنەوەیو گەشتنی کۆمەکی بۆیان، بەڵام کۆمەڵی دووەم داوایان کرد کەسەربازەکان ببرێن بۆ خروبە بۆ پشودانو وتیان: پەنجا رۆژە لەسەر ئەسپ دانەبەزیوینو چەندین شەوە نەخەوتوین، ئێستا ماندوو بێتاقەتو شەکەتینو زستانیش بەرێوەیەو دوژمنیش بەسوپایەکی زۆر نەبێت لەناونابرێت، بۆیە باشتروایە ئەم زستانە مۆڵەتیان بدەین دواتر بەهێزو گوڕوتینەوە رووبەروویان دەبینەوەو دەگەینە ئاکامێك.

... باشتروایە خۆمان بپارێزینو نامەو نێردراو بەرێبخەین بۆ ناوچەو شوێنەکانو موسوڵمانان لەشامدا، چونکە موسوڵمانان دێن بەهانامانەوە ئەو کات واز لەدان بەخۆدا گرتن دێنینو پاش زۆربوون هێرشیان بۆ دەکەینو ئەگەر کێویش بن لەبنیان دێنین[2]. ئەوە بوو رای نەیارەکان سەرکەوتو سەلاحەدین ناچار بوو بچێتە سەر راکەیانو سەربازەکان روویان کردە خروبە لەچواری رەمەزانی ٥٨٥ك /١١٨٩زداو لەوێش زانا عیسای هەکاری تووشی نەخۆشییەك بوو بووە هۆی کۆچی دوایی کردنی[3]، بەجێهێشتنی عەککا لەلایەن سەلاحەدینو سەربازەکانیەوە هەلێکی گەورە بوو بۆ خاچپەرستەکان کە بەباشی قۆستیانەوەو گەمارۆکەیان لەسەر عەککا توندتر کردو هەموو رێو شوێنێکیان گرتە بەر بۆ خۆپاراستن لەسەلاحەدین[4]، ئەمەش بووە هۆی لەدەستدانی عەککا دوای دوو ساڵ گەمارۆدان لەحەڤدەی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٨٧ك/ ١١٩١زدا[5].

---

[1] قەلایەکە لەکەناری شام بەسەر عەککادا دەروانێ، معجم البلدان (٢/٢٦٢).

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، ل: ١٦٥

[3] هەمان سەرچاوە، ل:١٦٦

[4] هەمان سەرچاوە، ل:١٦٦

[5] هەمان سەرچاوە، ل:١٦٦

**٤- دوای کۆمەکی لە پاشای مەغریب (موەحیدین) ئەبو یەعقوب مەنصوری کوڕی عبولمولمنی موەحیدی:** بەڵام ئەم سوڵتانە توڕە بوو لەسەلاحەدین چونکە یەکێك لەمەمالیکەکانی برازاکەی بەناوی قەراقوشی تەقەوی هێرشی کردبوە سەر برقەو طرابلوسی رۆژئاواو تونس، بەهۆی ئەوەی کە تەقی الدین عمری گەورەی بەئومێد بوو لەوێ دەسەڵاتێك پێکەوە بنێ، پرۆژەکە شکستی هێنا[1]. ئەوە بوو سەلاحەدین دیارییەکی نارد بۆ پاشای مەغریب کەدوو قورئانو سەد درهەمو دە رەتڵ دارو شەش سەد مسقاڵ میسکو عەمبەرێو پەنجا کەوانی عەرەبی بەوەتەرەکانیانەوەو بیست تیری هندیو چەند زینێکی رازاوەی ئەسپی تێدابوو[2]، لەگەڵ ئەم دیاریەشدا نامەیەکی ناسکی بۆ نووسیبوو کە تیایدا هاتبوو: سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی کەبەسەر موسوڵمانانەوە کەسێکی داناوە کەزەوی ئاوەدان کردۆتەوەو خەڵکەکەی دەوڵەمەند کردووەو فەرزو سوونەتی لەسەر دەستی جێبەجێ کردووەو ئاسمانی نەوەکانی رۆشن کردووەتەوە سەرەتای ئەم نامەیەش بەم شێوەیە بوو: لەسەلاحەدینەوە بۆ ئەمیری موسوڵمانان لەسەرەتاشیدا هاتبوو: بەندەی هەژاری پەروەردگار یوسفی کوڕی ئەیووب، السلاویش باسی ئەوە دەکات کە ئەبو یەعقوبی کوڕی مەنسور پێی خۆش بوو سەلاحەدین بەنازناوی ئەمیر المؤمنین نەك مسلمین بانگی بکات، بەڵام ئەمەی دەرنەبڕیو رێزی زۆری نێردراوەکەی سەلاحەدینی گرت بێ ئەوەی هیچ کارێکی بۆ بکات دەشڵێن: لەگەڵ ئەوەشدا مەنسور سەدو هەشتا کەشتی ئامادەکردووە بۆ ناردنی، بەڵام دەستگرتنی خاچپەرستەکان بەسەر کەنارەکانی شامدا بووە رێگر لەبەرامبەر گەشتنی ئەو کۆمەکیەدا، ئیبن خەلدونیش[3] ئەمە دەکاتە بەڵگە لەسەر بەهێزی پاشاکانی مەغریبو دەسەڵاتدارییان بەسەر پاشاکانی رۆژهەڵاتدا لەبنیاتنانی کەشتیگەلی دەریاییدا[4].

هەرچەندە ئەوەی کە هەندێ لەمێژوونووسان باسیان کردووە کە مەنصوری موحیدی خۆشحاڵ نەبوو بەنامەکەی سەلاحەدین چونکە نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لێ نەنابوو نابێتە بەڵگە بۆ یارمەتی نەدانو بەدەمەوە نەهاتنی داواکەی سەلاحەدین، بەڵکو هۆی ئەوە بوو کەیەعقووبی کوڕی

---

[1] صلاح الدين الفارس المجاهدو الملك الفارس، ل: ٢٨٦.

[2] تأريخ الأسلام، حسن إبراهيم (٢١٦/٤)

[3] تأريخ ابن خلدون (٤٩٠/٦)

[4] تأريخ الأسلام (٢١٦/٤)، صفحات مشرقة من التأريخ الأسلامي (٥١٨/٢)

مەنصور هەمیشە لەئامادە باشیدا بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستان لەئەندەلوسدا[1]، هەروەك موەحیدینەكان لەلێدوانەكانیاندادا دووپاتیان كردووەتە كەئارەزووی بەرێكەوتنیان هەبوو بەرەو ڕۆژهەلات بۆ لكاندنی بەدەولەتەكەیانەوە، الذهبش ئاماژە بەوە دەكات كە سلطان مەنصور ئارەزوی چوون بۆ میسری هەبووە[2]، ئەم ئارەزووەش بەراشكاوی لەلایەن ئەبو عەباسی كوڕی عەبدولسەلام الجراوی شاعیری موەحیدینەكانەوە دەبڕاوە كاتێ لەستایشی خەلیفە یەعقوبی كوڕی مەنصوردا دەڵێ:

إنّ الخلافة نالت من محاسنكم — أو في الحظوظ فابدت منظراً عجباً

أعلى المراتب بعد النبوة قد حبا — بها اللة أعلى الخلق وانتخبا

سينظم السعد مصراً في ممالكه — حتي يدوخ منها خيله حلبا

الى العراق الى أقصى الحجاز الى — أقصى خراسان يتلو جيشه الرعبا

هو الذي كانت الدنيا تؤمله — وكل عصر له مازال مرتقبا[3]

لەراستیدا موەحیدینەكان پلانیان داڕشتبوو بۆ داگیركردنی ولآتانی ڕۆژئاوای ئیسلامی، یەككەم ئامانجیشیان میسر بوو، سولتانی موەحیدیش راشكاوانە ئارەزوی خۆی بۆ هێرشكردنە سەر ولآتی میسر دەربڕیو باسی ئەو هەمو شتە ناڕەواو بیدعەیەی كرد كەتیایدایەو، وتی: ئێمە بەشتیوانی خوا پاكی دەكەینەوە، ئەمەی لەبەرنامەدا بوو هەتاوەكو گیانی لەدەستدا ڕەحمەتی خوای لێبێت[4]، كەواتە موەحیدینەكان پلانیان داڕشتبوو بۆ هێرشكردنە سەر ڕۆژهەلات بەگشتیو ئەمیرەكانی دەولەتی ئەیوبیو نوریش بەمەیان دەزانی، بۆیە ویستیان دەست پێشخەری بكەنو ئەوە بوو ئەیوبییەكان هەستان بەراسپاردنی هەندێ لەگەورە پیاوانیان بۆ ناردنیان بۆ ولآتی مەغریب بۆ دۆزینەوەو پەیداكردنی لایەنگری بۆیان هەتاوەكو ئەمانە ببنە هێڵی بەرگری یەكەم لەبەرامبەر تەماعكاری موەحیدینەكاندا، هێرشی قەراقوشیش بۆ سەر مەغریب یەكێك بوو لەو هەنگاوانەو ئەچووە چوار چێوەی ئەو هەوالآنەوە[5]، ئەوە بوو سوپای ئەیوبی بەرێی بیاباندا بەرەو مەغریب بەرێكەوت ئەمەش لەبەر كورتیو نزیكی نەبوونی مەترسی تیایدا، هەربۆیە وازیان لەرێگەی

[1] صفحات مشرقة من التأريخ الأسلامي (٢/ ٥١٩).

[2] هەمان سەرچاوە، (٢/ ٥١٩).

[3] دراسات في تأريخ الغرب، ل: ١١٥

[4] دراسات في تأريخ الغرب، ل: ١١٥

[5] سقوط الدولة الموحدين، ل: ١٩٨

کەنار دەریا هێنا کەتیرەو هۆزەکانی بەنی سەلیمو بەنی هیلالی تێدا بوو کە توانیبوویان رۆژهەڵاتی لیبیا کۆنترۆڵ بکەن ژیانێکی خۆش بۆ خۆیان دەستەبەربکەن و بەجددی کاریان دەکرد بۆ پارێزگاری کردن لەو ناوچانەو رووبەڕووبوونەوەی هەر هێزێك کەنیازی نزیکبوونەوەو دەست بەسەرا گرتنی ئەو ناوچانەی هەبێت[1]. لەراستیدا نەناردنی کۆمەکی لەلایەن مەنصورەوە بەهۆی چەند گرفتێکی دەرونیو باری شڵەژاوی ناوخۆییو دەرەکییەوە بوو، هەرچەندە رێزی زۆری لەباڵوێزی سەلاحەدین ناو کاتێکیش کە باڵوێزەکەی سەلاحەدین شەمسەدینی کوڕی مونقیذ ستایشی مەنصوری کرد بەهۆنراوەیەکی چل دێڕی مەنصور لەبری هەر دێڕیك هەزار درهەمی خەڵات کرد، لەهۆنراوەکەشدا[2] هاتووە:

سأشكر بحراً ذاعُباب قطعته ... الى بحر جُود مالِنعماه ساحِلُ

الى معدن التقوى الى كعبة الهدى ... الى من سمت بالذكر منه الأوائل

اليك أمير المسلمين ولم تزل ... الى بابك المأمول تزجى الرواحل

قطعت اليك البرّوالبحر موقناً ... بأنَّ نداك الغَمر بالنّجح كافل

فما راعى من وجبة البّرائع ... ولاهالني من زاحر البحْر هائل

ومن كان غايات لمعالي طلابه ... يهون عليه كلُّ أمر يحاول

رجوتُ بقصدك العلا فبلغتها ... وأدنى عطاياك العُلا والفضائل

فلا زِلت للعلياء والجود ثانياً ... تبلغّك الأيام ما أنت آمِلُ

لەراستیدا سەلاحەدینی ئەیوبی دانی نەنا بەخەلیفایەتی سوڵتانی موەحیدینەکانداو نازناوی ئەمیر موئمنینیشی بۆ بەکار نەهێنا لەو نامەیەدا کە بە ئیبن منقزی نێردراویدا ناردی، ئەم مەسەلەیەش گرنگی خۆی هەیە، چونکە ئەوە داننانە بە خیلافەتی موەحیدینەکاندا کە لەسەر بەنەمای رێنماییە چەوتەکانی ئیبن تومرت بنیاتنرا بوو، ئەمەش لەلایەن القاضی الفاضلی گەورە راوێژکاری سەلاحەدینەوە روون کرایەوە کاتێ وتی : ... ئەو گوتارە بەسەو بواری ئەوەی تیایە کە نکوڵی لێبکەین، نوسینیش بەڵگەیەکە زمان ئەبەستێتەوەو ئەگەر لەسەر مینبەرێك لەمینبەرەکانی مەغریبدا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئێمە لەبەیعەت دان بەخەلیفەی عەباسی پاشگەزبووینەتەوەو بەیعەتمان بەکەسێك داوە کە خوا پشتیوانی نییە شوێنکەوتنی دروست نیە، بەم پێیەش خاوە رێزمان سوك کردوەو خۆمان خستووەتە خوار شتی رێزدارو رێزی موسوڵمانانمان جێهێشتووەو

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٨.

[2] صفحات مشرقة من التأريخ الأسلامي (٢/٥٢٠).

سەرپێچی خوامان کردووە، هەروەك گوێڕایەڵی کەسێکمان کردووە کە گوێڕایەڵی دروست نیەو رابەرێکمان دیاریکردووە کە شیاو نییە[1]. رەنگە ئەگەر سەلاحەدین لەگەڵ سوڵتانی موەحیدینەکاندا بەیەك بگەیشتنایە لەژووری گفتوگۆدا ئەو لەسەر کۆمەڵە شتێك رێك بکەوتنایە کە بەسود بوایە بۆ هەموان، بەهۆی ئەو مرونەتو لێهاتووییە سیاسیە کەم وێنەیەی کە لەسەلاحەدیندا هەبوو، هەروەها لەبەر سوربوونی سوڵتان مەنصور لەسەر چاکسازی کردن لەبیرو باوەڕی موەحیدینەکانداو نزیك بوونەوە لەبیرو باوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت. بەڵام خوای گەورە بەدانایی خۆی کاروبارەکان ئاراستە دەکات بەو شێوەیەی کە دەیەوێت، بەهەر حاڵ جیاوازی سیاسەتو بیروباوەڕی نێوان سەلاحەدینو پاشای موەحیدینەکان نەبووە رێگر لەبەرامبەر هاوکاری گەلانیان لەکاتی خۆشیو تەنگانەدا وەك لەهەموو کاتو شوێنێکدا روودەدات، چونکە وەك لەکتێبەکانی ژیاننامەی ناوداراندا دەردەکەوێت ژمارەیەکی زۆر لەمەغریبیەکان بەشدارییان لەجەنگ کردن لەدژی خاچپەرستەکان شان بەشانی براکانیان لەرۆژهەڵاتدا کردو ژمارەیەکی زۆریشیان لێ شەهید بووە هەر لەفەلەستینیشدا بەخاك سپێردراون[2]. لەراستیدا سەلاحەدین ئەیویست سود لەموەحیدینەکان وەرگرێت دژ بەهەڵمەتی خاچپەرستان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەرمیو دانایەکی فراوان لەبواری سیاسیدا. ئەو بەمە بەئەرکی خۆی هەستا، بەڵام سوڵتانی موەحیدینەکان نەیتوانی ناکۆکیە مەنهەجییەکان تێپەڕێنێتو لەگەڵ سەلاحەدیندا هاوکاری بکات بۆ بەرگری کردن لەئومەتی ئیسلامی

٥- **رۆڵی القاضی الفاضل لەکاتی گەمارۆدانی عەککا لەلایەن خاچپەرستەکانەوە:** القاضی الفاضل رۆڵێکی زۆر گرنگی بینی لەماوەی گەمارۆی خاچپەرستەکاندا، دیارە لەو کاتەدا لەمیسر سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەکرد لەبری سەلاحەدین، لەروانگەی ئەم پۆستەشەوە کاروبارەکانی سوڵتانی رێکدەخست وەك ئامادەکردنی سەربازەکانو نۆژەنکردنەوەی کەشتیگەلو هەڵگرتنی پارەو گواستنەوەی ئازوقە بۆ عەککا، سوڵتانیش سەبارەت بە ئەرکەکانی نامەی بۆ دەنوسی، ئەویش وەڵامەکانی بەباشترین دەستەواژە دەردەبڕیو ئامۆژگاریو تێبینیپێشکەش دەکردو بەدوای بەرژەوەندی ئیسلامدا دەگەڕا[3]، نامەکانیشی بۆ سەلاحەدین لەماوەی گەمارۆدانی عککا لەلایەن فرەنجەکانەوە بەردەوام بوو پڕ بوو

---

[1] صفحات مشرقة من التأريخ الأسلامی (٥٢١/٢).

[2] صفحات مشرقة من التأريخ الأسلامی (٥٢١/٢).

[3] كتاب الروضتين (١٦٥/٢)، دور الفقهاء والعلماء، ل: ١٦٩

لەدەستەواژەی پرۆلیۆانلێو لەهەستی پڕ خۆشەویستیو دڵسۆزی لەپێناو سووککردنو رەواندنەوەی ماندوێتی ئەو گەمارۆیەو بەشداری کردنی براکانی لەغەمو ئازارو ئاواتەکانیاندا، ئەوەبوو لەنامەکانیدا هانی دەدا بۆ خۆڕاگری‌و ورەی بەرزدەکردەوە بۆ درێژەدان بەجیهادو بێ ئومێد نەبوون لەرەحمەتی پەروەردگارو داوای دەستگرتن بەهیواو ئومێد بوون بەسەرکەوتنی خوایی لێدەکرد، بەڵام ئەم پەیوەندییەشیان لەسەر بنەمای برایەتی بیرو باوەڕو یەك مەبەستی بنیاتنرا بوو، نەك گەورەو بچوك‌و سەرکردەو خزمەتگوزار، لەیەکێك لەونامانەشدا هاتووە: باگەورەمان درێژبوونەوەی ماوەی ئەم تاقیکردنەوەیەی پێ ناخۆش نەبێت چونکە پاداشتی دەست دەکەوێت، چاکەکانی زیاد دەبن‌و سەرکەوتنەکانی بەردەوام دەبن، سەرئەنجامیش بۆ خواپەرستی و خواپەرستانە، خوای گەورەش ئەو کەسە سەردەخات کە خوای سەرخستبێت لەژیاندا، خوای گەورەش پاداشتی تێکۆشانی گەورەمان بداتەوە بەخۆی‌و کاربەدەستو براو کوڕو سەربازەکانی[1]. لەو نامانەی تریش کە قاضی فاضل دەینارد بۆ سەلاحەدین ئەو نامانەی کە تیایدا پۆزشی بۆ هێنایەوە بەهۆی دواکەوتنی گەیشتنی کەشتیگەلی میسرەوە بۆ شام بەو کۆمەکیانەوە کەسەلاحەدین لەمیسری داواکردبوو، تیایدا روونی کردەوە کە هۆکار هەڵکردنی دژە بایەکی توند بووە نەك کەمتەرخەمی ئەو[2] گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم نامەیە ئەو رۆڵە دووپات دەکاتەوە کە ئەم قازیە بەرێزەو زانایانی تر پێی هەڵدەستان بۆ یارمەتیدانی سەلاحەدین‌و دابینکردنی پێداویستی سەربازەکان[3]، شایانی باسە قازی هەموو شێوازو رێگەیەکی دەگرتە بەر بۆ یارمەتیدانی سەلاحەدین‌و موسوڵمانەکان لەکاتی ئەم ئابلۆقەیەدا، لەم بوارەشدا نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفەی عەباسی‌و بەجوانترین‌و بەهێزترین دەستەواژە داوای لێکرد هانی دا بۆ پشتیوانیکردن لەسەلاحەدین لەم هەلومەرجەدا سەختەدا لەپێناوسەرخستنی ئاینی خواو پێغەمبەرەکەی‌و بەرز ڕاگرتنی پلەوە پایەی موسوڵمانان، رەنگە بەهێزترینی ئەو دەستەواژانەش کە لەم نامەیەدا بەکاریهێنابێت ئەوە بێت: ئەی جێنشین‌و خانەوادەی محەمەد (ﷺ)، بەجۆرێك رابەرایەتی ئوممەتەکەی بکە کە ئەو ئاسودە بکات، مافی ئەو بدە بەچاودێریکردنی ئێمە، چونکە ئێمەو موسوڵمانان سپاردەی ئەوین لای تۆ، نموونەی

---

[1] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، في الشرق الأدنى، ل: ١٦٩.

[2] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، في الشرق الأدنى، ل: ١٦٩.

[3] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، في الشرق الأدنى، ل: ١٦٩.

خزمەتگوزاریشتان ئێستا وەك ئەو بەندەیەی کە ئەگەر بۆ بکرایە لەشوێنە پیرۆزەکاندا دەپارایەوەو زەوی‌و خاکی ماچ دەکردو خۆی لەبەر قاپیدا دەدا بەزەویدا هەتاکو خوای گەورە کۆمەکی دەنارد، ئەگەر وتنی هەموو شتێکیش نەنگی نەبوایە ئەوە شتانێکم دەوت کە چاوەکانی بیهێنایەتە گریان‌و دڵەکانی راچڵەکاندایە، بەڵام ئارامگرو چاوەڕوانی پاداشتی خواین بەئومێدی سەرکەوتنێکی خوایی نزیکین[1]. بەم شێوەیە قاضی فاضل توانی ئەو نەهامەتییە بەسەلاحەدین تێپەڕێنێ‌و خۆی بەتەنها وەك سوپایەك وابوو کە لەتەنیشت سەلاحەدینەوە دەجەنگا[2]. لەو نامانەش کە قاضی فاضل وەك ئامۆژگارییەك بۆ سەلاحەدینی نووسی: ئەمە ئاینێکە نە بەزۆری سەردەکەوێ‌و نە بەسامان، بەڵکو خوای گەورە کەسانێکی نیەتپاك‌و دڵسۆزی بۆ هەڵبژاردووە، جا باگەورەشمان پاشماوەیەکی باش بێت بۆ ئەو پێشینە چاکانە،﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (الأحزاب:٢١)

قەیرانەکانتێپەڕدەبن‌و سەرقاڵییەکان کۆتاییان پێدێت‌و خوای گەورەش هەواڵێك دەنێری کە دڵەکان ئاسودە بکات. نەهامەتی‌و ناخۆشی لەئیسلام‌و موسوڵمانان دوردەخاتەوە، داوای لێخۆش بوون لەپەروەردگار دەکەین، چونکە بەڵاو ناخۆشی هەمیشە دەرئەنجامی تاوانە[3]. لەنامەیەکی تریشدا دەڵێ: ئێمە گیرۆدەی دەستی دەروونی خۆمانین‌و ئەگەر راست بکەین ئەوە خوای گەورە دەرئەنجامی ئەو راستگۆییەمان بۆ پێش دەخات‌و ئەگەر گوێڕایەڵی بووینایە بەدەست دوژمنەکەیەوە گیرۆدەنەدەبووین، ئەگەر ئێمە ئەو فەرمانانەی جێبەجێ بکەین کە لەتواناماندیە ئەوە پاداشتمان دەداتەوە بەجێبەجێکردنی ئەو کارانە بۆمان کە بەبێ ئەو ناکرێت، جا باکەس بەدوژمن نەزانین جگە لەکردەوەکانمان‌و گلەیش تەنها لەخۆمان بکەینو ئومێدیشمان تەنها بەپەروەردگار بێت نەك بەزۆر بونی سوپاو سەرباز یاخود ماڵ‌و سەروەت، یان بەکوشتاری فلان‌و راو نەخشەی فیسار، هەموو ئەم شتانە خوامان لەیاد دەباتەوەو نامانەوێ خوای گەورە بماندات دەست هۆکارەکان چونکە سەرکەوتن هەر لەزاتی ئەوەوەیە، داوای لێخۆشبوونی تاوانەکانمانی لێدەکەین، چونکە ئەگەر تاوان رێی نزاکانی نەگرتینایە ئێستاوەڵامان درابووەوەو شەپۆلی فرمێسکی لەخوا ترسان دڵانی پاك کردبووەوە، بەڵام کۆسپێك لەڕێدایە[4]، لەنامەیەکی تریشدا هاتووە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٠

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٠

[3] دور الفقهاء والعلماء المسلمين، في الشرق الأدنى، ل: ١٧٠

[4] كتاب الروختين (١٧٩/٤)

سوپاکەمان سوپاس بۆ خوا لاوازی تێدا نییە، بەڵام ماندوو بووەو توانای مرۆڤیش سنوری هەیە، قەدەری خواش شتێکەو هەموو خاوەن ئامانجێکیش بۆ ئامانجەکەی هەوڵ دەدات لەسنوری توانایدا، خزمەتگوزارتان ئەمە بۆیە باس دەکات هەتاوەکو گەورەمان تورەو بێزار نەبێت لەسەربازە لاوازو تەمەڵەکانی‌و سوپاس‌و ستایشی پاڵەوانەکانیشیان لەیاد نەکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل عمران:١٥٩)، واتە: کەواتە (چاوپۆشیان لێبکەو لێیان ببورە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لەکارو پێشهاتدا پرسو ڕایان پێبکە) (تەفسیری ئاسان، ل: ٧١).

گەورەم: ئایا خوای گەورە سەیری دڵی خەڵکی سەرزەوی نەکردووەو کەسی بەباش‌و شیاو نەزانیوەو بەکارینەهێناوە بۆ بەرپاکردنی ئایین‌و بەرزکردنەوەی وشەو بڵاوکردنەوەی دەسەلاتو پاراستنی دروشم‌و پارێزگاری کردن لەروگە(قیبلە)ی یەکتا پەرستی جگە لە تۆ؟ ئەمە لەکاتێکدایە کە لەسەر زەوی خەڵکانێك هەن نزیکترن لەپێغەمبەرەوە(د.خ)و دەسەلاتو موڵك‌و سامانیان زۆرترە، بەڵام ئەوانی دانیشتاندووەو تۆی هەستاندەوە، ئەوانی تەمەڵ‌و تۆی وریاو چالاك‌و ئەوان دەست بەستراوو تۆی دەستکراوەو دونیای لای ئەوان خۆشەویست کردوەو لەدڵی تۆ خۆشەویستی دەرهێناوە، بۆ تۆ ئەم کارەی ئاسان‌و بۆ ئەوان گرانکردووە، دەستی ئەوانی بەستووەتەوەو دەستی تۆی والاکردووە، شمشێری ئەوانی خستۆتە کێلان‌و شمشێری تۆی هەڵکێشاوە، ئەوانی بەدبەخت‌و تۆی خۆشبەخت کردووەو ئەوان دانیشتوون‌و تۆی خستۆتە جوڵە، ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَكِنْ كَرِهَ اللَّهُ انْبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾ (التوبة:٤٦)، واتە ئەگەر ئەو دوو ڕووانە بیانەوێت دەرچن بۆ غەزا ئەوە خۆیان بۆ ئامادەکردوە، بەڵام خوا چالاکی نواندن‌و دەرچوونی ئەوانی نەویست لەبەر ئەوە سستی کردون لەشی قورس کردن‌و پێیان وترا: ئەوانیش بۆ خۆتان لەگەڵ پیرو منداڵ‌و پەککەوتەکاندا. (تەفسیری ئاسان ل: ١٩٤).

بەڵێ شتی تری لەمەش گەورەتر هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێ بێباوەڕان لەهەموو گۆشەو کەنارێکی سەر زەوییەوە، لەرۆژئاواو دەریاوە، بێ دواکەوتن هەمووان، بێ گوێدان بەدوری ڕێگەو بەئارەزوی خۆیان بێێ ئەوەی پاشایەك پارەیان بۆ خەرج بکات یان کەسێك ڕاپێچیان بکات لەهەموو لایەکەوە هاتن بەدەم بانگەوازەکەیانەوە وەك دەڵێن:

ولست بملكِ هازم لنظيره ولكنك السلامُ للشّرك هازم

ئەمە لەکاتێکدایە کە تۆ لەناو هەموو موسوڵمانەکاندا هاوکارێکت نییەو کەس لەگەڵتا نایەتە دەرەوەو کەسیش بەزمان جیهادت لەگەڵدا ناکات‌و بەبێ کرێ لەگەڵدا نایەتە دەرەوەو هەنگاوێکت

بەباڵێكو باڵێكت بەزیاتر پێ دەفرۆشن بانگیان ئەكەیت بۆ بەهەشت، بانگیان ئەكەیت بۆ لای خوا وا دەزانن بۆ لای خۆتیان بانگ دەكەیتو داوای ئەنجامدانی فەرزیان لێدەكەیت وا دەزانن باسی سوننەتیان بۆ دەكەیتو بەهەشتیان ئەخەیتە پێش چاو وا ئەزانن دەتەوێ بۆ خۆتی قۆرغ بكەی[1]، هەروەها لەنامەیەكی تردا دەڵێ: تاوانەكانمان ڕێگەی نزای لێگرتوین جێی خۆیەتی لۆمەی خۆمان بكەین، خوای گەورەش قەدەرێكی هەیە كەتوانای لادانیمان نیەە تەنها ئەوە نەبێت كەبڵێین: لاحول ولا قوة الله بالله، ئێستاش چەند ناخۆشییەك بەڕێوەیە ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُمْ مِنْهَا وَمِنْ كُلِّ كَرْبٍ﴾ (الأنعام:٦٤)، واتە: جا لەوەلامیاندا بڵێ: خوا لەو تاریكیانەو لە هەموو كۆسپێك ڕزگارتان دەكاتكەچی..... هتد (تەفسیری ئاسان، ل: ١٣٥). دوژمنیش سوپایەكی زۆری بۆ كۆكردینەوەو خەڵكیش وتیان بترسن، ئێمەش وتمان: پشتو پەنامان خوایەو هەر ئەویش باشترین پشتیوانە، بەو شێوەیەش ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان مسۆگەر كرد كە دەفەرموێت: لەفەزڵو نیعمەتی خوا بەشیان درا، ئێمەش تەنها ئەو فەزڵە گەورەیەمان دەوێ پشتو پەناشمان هەر خوایە، خوای گەورەش تەنها نزاكردنی پیشان داوین لەكاتی تەنگانەداو دەبێ هەمیشە لەدەرگای ڕەحمەتو میهری بدەینو لێی بپاڕێینەوە: ﴿فَلَوْلا إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَكِنْ قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ (الأنعام:٤٣)، واتە كاتێك سەركەشو یاخی بوون تووشی تاڵاوی جەنگو بەڵاو تەنگانەمان كردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوە بلاڵێنەوە، بەڵام دڵیان ڕەقو ڕەش بوو. (تەفیسری ئاسان: ل: ١٣٢).

پەناش دەگرین بەخوا لەدڵڕەقیو بێئومێد بوون لەڕەحمەتی پەروەردگار هیوا بڕان لەدەروی، چونكە تەنها كەسانێك هیوا بڕاو دەبن كە هۆشو ژیرییان لەدەست دابێت، لەخوا دوورو بێبەش بن لەڕەحمەتی، هیچ فێڵو چارەیەكیش نییە جگە لەواز هێنان لەفێڵ، جا ئەگە رخوای گەورە بزانێت كە سەربازەكانی گەورەمان هەموو توانایان خستووەتە گەڕ ئەوە عوزری بۆ داناون باگەورەشمان گلەییان لێنەكات، ئەگەر بشزانێت كەمتەرخەمییان نواندووەو زۆر هەوڵی زۆریان نەداوە ئەوە تورەیی پەروەردگاریان بەسە[2]، بەندەش ئارامگریو سینە فراوانیو ڕەوشت جوانیو پارێزكاری بیری گەورەمان دەخاتەوەو داوای دڵ ڕاگرتنو پاكی دڵی لێدەكات هەتاوەكو جەستەشی پاك بێت ﴿وَإِنْ كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ...﴾، واتە: خۆ ئەگەر پشت هەڵكردنو سەرپێچی خوانەناسان زۆر لەساختە ..... هتد. (تەفسیری ئاسان، ل: ١٣١). هەتاوەكو﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَى﴾

[1] كتاب الروختين (١٨٢/٤).

[2] كتاب الروختين (١٨٢/٤).

(الأنعام:٣٥) واتە: ئەگەر خواش بیویستایە لەسەر هیدایەت و ڕێبازی دروست ئەوە کۆی دەکردنەوە بەمەرجێك خۆیان مەبەستیان بێت. (تەفسیری ئاسان، ل: ١٣١).

گەورەشمان لەپێشترە بەم دێڕە شعرە:

ولا بطرءُ إن تتابعت نِعَمُ          و صابرُ في البلاءِ محتسبُ

وتیان بەالمهلّب: ئایا حەزت لەسەرکەوتنێکە بەبێ ماندوو بوون؟ ئەویش وتی: رقم لە نەریتی دەستەوسانیەو هەر دەبێ ویستی خوا لەبەندەکانیدا بەدیبێت، کەس ناتوانێ حوکمو بڕیاری رەت بکاتەوە جا با گەورەشمان بەهیچ قەدەرێکی پەروەردگار بێتاقەت نەبێت، چونکە ئەگەر قەزاو قەدەر تێپەڕێو ئەویش پێی رازی بێتو پاداشتی وەرگرێت باشترە لەوەی کە ناڕازیو گوناهبار بێت، خوای گەورە پاداشتی کەسێك بداتەوە کە غەمو بێزاری بۆ پەروەردگار دەربڕێو پەنا بۆ خاوەن دەسەلات بەرێت، هەرکەسێکیش بەنهێنی هاوار لەپەروەردگار بکات بەئاشکرا وەلامی دەداتەوە، جا باسکالای گەورەمان بۆ پەروەردگار بەنهێنی بێت، هەتاکو باری شانو غەمی سینەی قورس نەکات کە بەبێ خوا هیچیان پێناکرێت، ئەوەش کە هێرش بەرانی لاواز کردووە بیرو هزری هەموانی گرتووەتەوە تەنها قەیرانی بێ ئازووقەییە لە عەککا... گەورەشمان بە ئەزموون بۆی دەرکەوتووە کە بەڕێوەبەری زەمانە تەنها پەروەردگاری زەمانەیەو کاریش بەخاوەن کار دەکرێتو زۆر بیر کردنەوەش خەمو خەفەت کەم ناکاتەوە.

قد قلت الرجل المقسَّم أمره          فوّض اليه تنم قرير العين[1]

هەموو شتێك بەدەمەوە چوونی هەیە جگە لەسەربازگەیەك کە دوای موسوڵمان بوون بێت بە گاورو وڵاتێك کە مینبەرەکەی پاش وتاردان بێدەنگ کرابێت، گەورەم ئەو شەوانەی کە تۆ لەسەنگەردا بوویتو خەڵك خەوتوونو لەئامادەباشیدا بویتو خەڵك بێزابوونو شەو نخونیت تیا کێشاوەو خەڵکی بێئاگا بوون ئەم رۆژانەش کەتیایدا بانگەواز دەکرێت: ئەی ئەسپەکانی جیهاد خەڵك سەرخەن ئەم کاتانەش کەسەرەکان تیایدا سپی دەبن هەموو نیعمەتی پەروەردگارن بەسەرتەوەو ئەمامن بۆن لەبەهەشتداو سپی کەرەوەی لاپەرەی کردەوەکانتن ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَراً﴾ (آل عمران: ٣٠). واتە: رۆژێك دێت هەموو کەس کارو کردەوەکانی خۆی دەبینێت ئامادەکراون بەخێرو شەڕیەوە. (تەفسیری ئاسان، ل: ١٥٤).

ئەمانە لەصراط دەتپەڕێننەوەو تای ترازووت قورس دەکەنو رەزامەندی خوات بۆ مسۆگەر دەکەن[1] تۆش سوپاسی خوایان لەسەر بکە هەروەك چۆن لەسەر سەرکەوتنە مەزنەکان سوپاسی

---

[1] كتاب الروختين (٤/١٨٧).

دەکەیت، بشزانە کە پاداشتی ئارامگرتن لەسەرووی پاداشتی سوپاسگوزارەوەیە، لەدڵدامەزراوی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتابیش ئەوەبوو کە ئەیفەرموو: ئەگەر ئارامگریو سوپاسگوزاری (صبر شکر) دوو حوشتر بونایە گوێم پێنەدەدا سواری هەرکامێکیان ببم. بەم ورە بەرزەوە پێشمان کەوتنو جێیان هێشتینو ئێمەش حەزمان لەتەپو تۆز نیە، ئەوان هەنگاوی باشیان ناو پەنا ئەگرم بەخوا لەکەوتنو گلان. خوای گەورەش بۆ جێبەجێکردنو گەیاندنی حەق باشترین دروستکراوەکانی هەڵبژاردووە، خۆشی باش دەزانێ کە لەپێشیاندا چی روویداوەو بەسەرهاتی پێغەمبەران چی بووە، خوای گەورەش پێغەمبەرەکەی هانداوە کەچاو لەوان بکاتو شوێن پێیان هەڵبگرێت بەتایبەت پێغەمبەرانی أولی العزم لەناویاندا، هیچ نرخێکیش بۆ بەهەشت زۆر نیە، خوای گەورەش تەنها ئەو بەندانەی تاقیدەکاتەوە کە دەزانێ توانای ئارامگرتنیان هەیە، دونیاش هەندێکی ئەوی تری دەسڕێتەوەو شتانێك روویداوە وەك روونەدابێت وایە، ماندوو بوونیش دەڕواتو پاداشت دەمێنێتەوە، گرنگترین وەسیەتیش ئەوەیە کە گەورەمان خەمێك نەخوات کە جەستەی لاواز بکاتو میزاجی تێك بدات، چونکە ئومەت بینایەو ئەویش (خوا بیپارێزێ) بناغەو پایەکانیەتی خوای گەورەش ئەو پایانە دامەزراو بکات بۆ سەرخستنی حەق لەو وەسیەتە باشانەش کە فارسەکان کردوویانە ئەوەیە کە وتویانە: ئەگەر شتێکت توش بوو کە لەتواناتدا بوو ئەوە دەستەوەسان مەبە، ئەگەر شتێکیش هاتەڕێتو لەتوانات بەدەر بوو (پەنا بەخوا) ئەوە بێزارو نائومێد مەبەو نارەزایی دەرمەبڕە، لەوانەشە خاوەن کێشەیەك ئەگەر لەبری خەمخواردن بیر لەدەسەڵاتو توانای خوا بکاتەوە ئەوە خوای گەورە بۆ چارەسەر دەکات ﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (الانسان: ٣٠). واتە: ئێوە هیچ کارێکتان پێناکرێت مەگەر خوایویستی لەسەر بێت. (تەفسیری ئاسان، ل: ٥٨٠).

ئەمە دەسەڵاتێکە لەسەرو هەموو دەسەڵاتەکانەوەیە، پاشاکان بەهۆی تەماعەوە جەنگاون ئەو بەهۆی ئیمانو باوەڕەوە دەجەنگێ، جا ئەگەر پەروەردگارمان سەیری دڵی گەورەمانی کردو بینی تەنها پشت بەو دەبەستێو متمانەشی هەر بەزاتی ئەوە، ئەوە دەروی لێدەکاتەوەو لوتفی خۆی بەسەردا دەبارێنێ، با هەرگیز لەخوا نائومێد نەبینو نەڵێین " کەی خوا سەرمان دەخات"و با ئارامبگرین چونکە ئێمە بۆ ئارامگرتن دروست کراوین، بەڵکو باسوپاسگوزار بین، چونکە سوپاسگوزاری لەشوێنی ئارامگریدا بەرزترین جۆری سوپاسگوزارییە، بابەو کەسانەش بڵێین کە تووشی ناخۆشی بوون تۆ پارێزراویتهەتاوەکو رازیبن لەپەروەردگار، سەبارەت بەئاژاوەی وڵاتی

---

[1] هەمان سەرچاوە، (١٨٧/٤).

عەجەمیش ئەوە پاك‌و بێگەردی بۆ پەروەردگار كە دڵ‌و زمانی پێكەوە كۆكردوونەتەوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنْزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدىً لِلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُمْ مَا لَمْ تَعْلَمُوا أَنْتُمْ وَلا آبَاؤُكُمْ قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (الأنعام:٩١). واتە پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دایبەزاندووەو فێریشی كردووە لەوە دوا وازیان لێبهێنێت با لەبەتاڵ‌و نادروستی خۆتاندا رۆبچن‌و گەمەو یاری بكەن(تەفسیری ئاسان، ل: ١٣٩) سوڵتانیش نامەیەكی نووسی بۆ قاضی فاضل لەوڵاتی فەرەنجەكانەوەو ئاگاداری كردەوە لەو ئاماژانەی سەركەوتن كە بۆی ئاشكرا بووە تیایدا ئەیوت: تەنها لەوە دەترسم كە پەروەردگار بەپێی تاوانەكانمان لەگەڵماندا بجوڵێتەوە، چونكە تاوانەكان پێش ئێستا هەبوون‌و لەم كاتەدا سڕانەوەو پێشتر تۆمار كرابوون ئێستا لێخۆشبوون گرتنیەوە، چونكە شمشێرە سورەكان بەسن بۆ تكاكاری‌و بەیەكدا كێشانی شمشێرەكان بەس بوون بۆ لێدانی قاپی بەهەشت‌و ئەو ولێدانانەشن لەگۆڕەپاندا لەبەر خوای مەزنەو خۆشبەختی بۆ قاچێك كە لەگەل تۆدا هەنگاوی نابێت بۆ جیهادو دەم‌و چاوێك كە لەگەڵ تۆدا تۆزاوی بووبێت‌و كەسێك لەژێر سایەی تۆدا كوشتاری كردبێت‌و كوژرا بێت[1]، ئەمەیە قاضی فاضل‌و ئەو زانا خواویستە، خاوەنی دەربڕینی نایاب‌و تێگەیشتنی قوڵ‌و بۆ سوننەتەكانی پەروەردگار لەسەركەوتندا، دوای ئەم نووسینانەش نابێ سەرسام بین بەقسەی سەلاحەدین كەوتوویەتی: بەشمشێری خۆم هیچ شوێنێكم رزگار نەكردووە، بەڵكو بەقەڵەمی قاضی فاضل بووە، لەراستیدا بوونی كەسایەتی هاوشێوەی قاضی فاضل لەتەنیشت سەركردە موسوڵمانەكاندا كارێكی زۆر گرنگە چ سەركردایەتی سەربازی یان سیاسی‌و رۆڵ‌و كاریگەری مەعنەوی زۆری هەیە لەسەریان‌و خوای گەورە دەرگای ئومێدو هیوا بەهۆیانەوە واڵا دەكات‌و لەخەمی پاداشتی خوادا دەبن‌و دەبنە هۆكارێك بۆ ئارامگری‌و دامەزراوییان.

٦- **هەوڵەكانی سەلاحەدین بۆ هەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر عەككا:** سەلاحەدین موسوڵمانان‌و ئەمیرەكانیانی هاندا بۆ جیهاد كردن لەپێناو خوادا لەگەڵ كۆمەڵی موسوڵماناندا هێرشی دەبردە سەر بێباوەڕان‌و جەنگیش لەنێوان ئەو و خاچپەرستەكاندا هێنان‌و بردن بوو، هەركە كەتیبەیەكیانی لەناو دەبرد كەتیبەیەكی تر دەهاتە شوێنی، ئەورووپاش لەپشت سوپاكانیەوە بوو و بەسامان‌و كەشتی‌و جەنگاوەر پاڵپشتی دەكردو ڕق‌و كینە بەرامبەر بەموسوڵمانان دڵی داگیر كردبوو، كاتێ گەمارۆ لەسەر عەككا توند بوو، خەمی سەرەكی سەلاحەدین ئەوە بوو كە جەنگاوەرو پارەو نەوت بگەیەنێتە دەست گەمارۆ دراوەكان، چونكە بەئاسانی

[1] كتاب الروضتين (١٩٠/٤).

کۆمەکی لەرێی دەریاوە بەخاچپەرستەکان دەگەیشتو هیچ فێڵو نەخشەیەکی سەربازی نەما کەفەرماندەکان بیری لێبکەنەوەو سەلاحەدین بەکاری نەهێنابێت، لەو فێڵو پلانانەش[1]:

أ- برینی گەمارۆی دەریایی سەر عەککا: سەلاحەدین رەحمەتی خوای لێبێت لەبەیروتدا کەشتییەکی نۆژەنکردەوەو چوار سەد فەردە گەنمو برێك پەنیرو پیازو مەڕو ئازووقەی تری تێکرد، فرەنجەکانیش کەشتییەکانیان بەدەوری عەککادا دانا بوو بۆ پاراستنی لەهاتنەوەی کەشتی موسوڵمانان، موسوڵمانانی ناو عەککاش زۆر پێویستیان بەخواردەمەنیو ئازووقە بوو، بۆیە کۆمەڵێك لەموسوڵمانەکان لەبەیرووتەوە سواری کەشتیەك بوونو جلی فرەنجەکانیان پۆشیو ریشیان تاشیو بەرازیان خستە پێشەوەی کەشتییەکە هەتاوەکو لەدوورەوە ببینرێنو خاچیان هەڵواسیو توانیان خۆیان تێکەڵ بەکەشتییەکانی دوژمن بکەن، بەڵام ئەوان رێیان پێگرتنو وتیان: دەتانەوێ بەرەو شار بچن؟ وایان دەزانی لەخۆیانن، ئەوانیش وتیان بۆ ئێوە دەستتان بەسەریدا نەگرتووە؟ وتیان: نەخێرهێشتا دەستمان بەسەردا نەگرتووە، وتیان : زرێپۆش ئەبەین بۆ سەربازەکان بەڵام کەشتییەکی ترمان بەدواوەیە ئاگاداریان بکەنەوە هەتاکو نەچنە شارەکەوە دیارە کەشتییەکی فرەنجی بەدوایانەوە بوو کاتێ ئەمانی بینی ویستی ئاگاریان بکاتەوە، بەڵام کەشتییە موسوڵمانەکە خێرا تر بوو، با یارمەتی داو توانی بگاتە بەندەری شارەکە سوپاس بۆ خوا بەسەلامەتی گەیشتە بەرەوەو ئەمەش سەرکەوتنێکی مەزن بوو چونکە خەڵکی شار زۆر برسیو ماندوو بوونو بەبێ کۆمەکی هیچیان پێنەدەکرا[2]. لەدەیەی ناوەراستی شەعبانیشدا بەهادین قەراقوش کەوالی عەککا بوو لەگەڵ پێشەنگی کەشتیگەلدا کە لۆلۆی حاجب بوو سوڵتانیان ئاگادار کردەوە کە ئازووقە لەشاردا تەنها هەتاوەکو شەوی نیوەی شەعبان لەشاردا دەمێنێ، یوسفیش ئەمەی بەنهێنی لای خۆی هێشتەوەو بۆ کەسی دەرنەبری نەوەکو بڵاوبێتەوە بگاتە لای دوژمنو کاریگەری لەسەر ورەی موسوڵمانان دابنێت، پێشتریش نامەیەکی نووسیبوو بۆ میسرو داوای سێ کەشتی خۆراکو ئازووقەی کردبوو لەگەڵ ئەو شتانەی کە لەگەمارۆدا پێویستی پێیەتی بەدرێژایی زستان، ئەوەبوو سی کەشتییەکە بەرێکەوتن لەمیسرەوەو چاوەڕێی هەڵکردنی بابوون بۆ بەرێکەوتنو خۆشبەختانە بایەکی باش هەڵیکردو پاش بەرێکەوتنیان لەشەوی پازدەی شەعباندا گەیشتنە عەککا، ئەمەش

---

[1] كتاب الروضتين (٤/١٩٠).

[2] كتاب الروضتين (٤/١٥٤).

لەکاتێکدا بوو کە ئازووقە لەعەککادا نەمابوو دوژمنیش بەردەوام بوو لەپەلاماردانیداو کەگەشتە بەرەوە سەربازە موسوڵمانەکان الله أکبر والحمدلله یان دەکرد دوای ئەوی کە ئازوقەو خۆراکیان لێبڕابوو، موسوڵمانەکان هاتنە کەنار دەریاو نزای گەشتنیان دەکرد بەسەلامەتی چونکە پێش گەشتنی بەکەنارەکانی عەککا لەگەڵ کەشتیەکانی دوژمندا رووبەڕووی یەك بوونەوە بۆیە نزای سەرکەوتن‌و گەیشتنیان بۆ دەکرد جەنگیش لەهەموو لایەکەوە لەگەڵ کەشتییەکەدا بەردەوام بوو خوای گەورەش دەیپاراست‌و باش توند تر دەبوو، دەنگیش لەهەر دوو لاوە بەرز دەبوویەوە هەتاوەکو دواجار بەسەلامەتی دەربازیان بوو خەڵکیش وەك بارانی دوای وشکە ساڵی بەدەمیانەوە چوون[1].

ب- عیسی عەوام (مەلەوان) گەمارۆکە دەشکێنێ لەو شتە سەیرانەی کە لەم جەنگەدا روویداوە ئەو بوو کە سوارێکی موسوڵمان بەناوی عیسا ئەهاتە ناو شارەوە بەشەودا نامەو پارەی دەهێنا بەدزی دوژمنەوەو پاشان بەمەلە لەبەردەم کەشتییەکانی دوژمنەوە دەربازی دەبوو ئەوە بوو شەوێکیان سێ توورەکەی لەخۆی بەست کەهەزار دیناری تێدا بوو لەگەڵ چەند نامەیەکدا بۆ سەربازەکان‌و خۆی فڕێدایە ناو دەریاوەو بەڵام تووشی شتێك هات‌و خنکاو هەواڵی لەموسوڵمانەکان دواکەوت نەریتیش وابوو هەرکە بگەیشتایەتە شار باڵندەیەك دەفڕی‌و موسوڵمانەکان دەیانزانی کەگەشتووەتە بەرەوە، بەڵام ئەو شەوە باڵندەکە نەفڕی بۆیە هەستیان بە لەدەستدانی کرد، پاش چەند رۆژێك کاتێك خەڵکی لەقەراغ دەریادا ووەستابوون ئاوەکە مردوویەکی فڕێدایە کەنار دەریا کاتێ چوونە سەری بینییان کە عیسای مەلەوانە لەناو قەدیدا پاشماوەی نامەو زێڕەکەیان بینی کە بۆ موجاهیدەکان نێردرابوو، هەرگیز کەسێك نەبینراوە وەك ئەم کەچۆن لەکاتی ژیانیدا سپاردەی گەیاندووە خوای گەورە لەدوای مردنی بۆی گەیاندبێت[2]. العماد دەڵێ: عیسا ون بوو هیچ هەواڵ‌و شوێنەوارێکی نەبوو گومانی زۆریان لا دروست بوو بەڵام وا دیار بوو لای خوای گەورە پلەو پایەیەکی بەرزی هەبوو بۆیە نەیویست بەو شێوەیەی لەناو بچێت‌و جێی گومان بێت‌و گەیاندیە کەنار دەریاو راستی مەسەلەکەیان بۆ دەرکەوت[3].

---

[1] کتاب الروضتین (٤/١٥٤).

[2] کتاب الروضتین (٤/١٦٠).

[3] کتاب الروضتین (٤/١٦٠).

ه- بەئامانج کردنی ئامێرەکانی گەمارۆو بەرگری لەلایەن موسوڵمانەکانەوە: چاو تێبڕینی خاچپەرستەکان بۆ عەککا زیادی کردبوو، لەهەموو لایەکەوە مەنجەنیقیان دابەستو بەنۆرە بەشەوو بەرۆژ بەردیان دەهاویشت کاتێ کەموسوڵمانەکان ئەم بارودۆخەیان بینی غیرەتیان جوڵاو بڕیاری کردنەوەی دەروازەکانی شارو هێرشکردنە سەر خاچپەرستەکانیاندا لەدەرەوەدا، ئەوەبوو ئەم کارەیان کردو بەیەکجار لەهەموو لایەکەوە پەلاماری خێوەتی خاچپەرستەکانیان داو ئەوانیش سەرقاڵ بوون بەبەرگری کردن لەخێوەتەکانیانو مەنجەنیقەکانیان بەجێهێشتو گروپی ئاگرهاوێژی ناوموسوڵمانەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوەو مەنجەنیقەکانیان ئاگر باران کردو هەر هەموویان سوتاند[1].

و- گەمارۆدانی بورجی الذبان لەلایەن خاچپەرستەکانەوە: لەشەعبانی هەمان ساڵدا ٥٨٦ك خاچپەرستەکان هەستان بەگەمارۆدانی بورجی الذبان کە ئیبن شەداد وەسفی دەکات بەوەی کە بورجێکە لەناوەڕاستی دەریادا لەسەر بەرد بنیاتنراوە لەدەروازەی بەندەری عەککادا بۆ پاراستنی بەندەرەکە چونکە کەشتی هەر کە تێپەڕبوو لێی ئەوە لەمەترسی دوژمن رزگاری دەبێت هەروەك دەستگرتن بەسەر ئەم بەندەرەدادەبێتە هۆی رێگرتنو دەستگرتن بەسەر ئەو کەشتیانەدا کە وەك کۆمەکی ئاراستەیبەندەرەکە دەکرێن، ئەوە بوو خاچپەرستەکان چەند کەشتیەکیان هێناو چەند بورجێکیان تیادا درووست کردو پڕیان کرد لەدارو نەوت، بەڵام هەموو ئەو سەربازانەی کە ئەم کارەیان دەکرد کوژران، دووبارە کەشتیەکی تریان پڕکرد لەدارو نەوتو هەتاوەکو بینێرنە ناو کەشتی موسوڵمانەکانو پاشان گڕی تێبەردەن، هەروەها کەشتی سێیەمیشیان بەهەمان شێوە ئامادەکردو پڕیان کرد لەجەنگاوەر وبەربەستێکیان بۆ دروست کرد بۆ ئەوەی ببێتە رێگر لەبەرامبەر تیر هاویشتنی موسوڵمانەکاندا، ئەم بەربەستەش لەشێوەی ژوورێکدا بوو هەتاکو لەکاتی سوتاندنی هەر شتێکدا خۆیان بچنە ناویەوە، سەرەتا ئاراستەی با بەدڵی ئەوان بوو، بەڵام ویستی پەروەردگار وابوو کاتێ ئاگریان کردەوە ئاگرەکە بەربووە بورجەکانی خۆیانو ئەو کەشتییەی کە بەنیازبوون بیبەننە نێوان کەشتی موسوڵمانەکان، پاشان ئاگر پەرەی سەندو ناو کەشتیەکانی گرتەوە کاتێ چوونە ناو بەربەستەکەوە بەهۆی باوە دزەی کردە ناویەوە هەموویانی تیادا سوتا[2]. سەرباری ئەم کارەساتەش کەبەسەر خاچپەرستکاندا هات لەکاتێکدا

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٣٤.

[2] النوادر السلطانية، ل: ١٣٨، ١٣٩، صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٦٠.

که لەهەوڵی دەستگرتن بەسەر بورجی الذباندا بوون، بەلام لەدەست بەسەرا گرتنی بێئومێد نەبوون و جارێکی تر هاتنەوەو ئامێرێکی گەورەیان هێنا کە لەشێوەی تانك (دەبابە)دا بوو[1] کەسەرێکی گەورەو ملێکی ئەستووری ئاسنی هەبوو پێیان دەوت بەران و قۆچی لەبورجەکە دەداو هەڵیدەکەند، هەروەها ئامێرێکی تریان بەکارهێنا کە شێوەیەکی گومەزی هەبوو چەند سەربازێکی تیا بوو سەرەکەشی لەشێوەی گاسنی زەوی کێڵاندا بوو پێی دەوترا سنوور، سەری بەرانەکە خڕبوو بەقورساییەکەی شتی دەروخاندو سەری سنورەکەش بەنوکە تیژەکەی شتی دەڕوخاند، هەروەها پلیکانەو پەردەی گەورەیان بەکاردەهێنا، لەدەریاشدا کەشتییەکی گەورەیان ئامادە کردبوو کە بورجێکی گەورەی تیا بوو دەیانویست بیخەن بەسەر شوراکەداو بەجوڵان وەردەگەڕاو وەك رێگەیەك بەکاردەهات بۆ ئەو شوێنەی کەبەسەریا دەکەوێت و جەنگاوەرەکان بەسەریدا دەڕۆیشتن، ئەوەبوو ویستیان لەبورجی الذبان نزیکی بخەنەوەو دەستی بەسەردا بگرن کاتێ ئامادەکارییەکانیشیان تەواو بوو، لەهەموو لایەکەوە پەلاماری بورجەکەیان داو بەژمارەیەکی زۆرەوە، موسوڵمانەکانیش سەرەتا گوێیان پێنەدان هەتاوەکو چرنوکی تەماعیان لەعەککا گیربوو و ئامێرەکانیان راکێشاو پێکردو لەشوراکان نزیکیان کردەوە، کاتێ ئەمەیان کرد موسوڵمانەکان بەیەك دەنگ هاواریان کردو دەرگاکانیان کردەوەو گیانی خۆیان فرۆشت بەپەروەردگار، مێژوونووس ئیبن شەداد دەڵێ:لەهەوو لایەکەوە پەلاماری دوژمنیان داو لەخەندەقەکانیاندا خەفەیان کردن، کاتێ بینیان خاچپەرستەکان تووشی سەر شۆڕی و شکست هاتوون پەلاماری بەرانەکەیان داو ئاگرونەوتیان تێ فڕێداو توانییان ئاگری تێبەربدەن و جەنگاوەرە خاچپەرستەکانیش لەناویدا هەڵاتن پاشان ئاگرەکە گەشتە سنوورەکەو سوتاندی و دواتریش موسوڵمانەکان قولاپیان لەبەرانەکە گیرکردو توانییان بەئاگرەکەوە رایکێشن و بیهێننە ژێردەسەڵاتی خۆیان، ئەم بەرانەش لەچەند ئامێرێك پێك هاتبوو،ئەوە بوو ئاویان پیاکردو پاش چەند رۆژێك ئاسنەکەی سارد بووەوە، ئەمەش لەرەمەزانی ساڵی ٥٨٦ك دا / ئۆکتۆبەری ساڵی ١١٩٠زدا بوو[2].

ژ- زاڵبوونی موسوڵمانەکان بەسەر جەنگەکەدا: بەمەی کە باسکرا رادەی زاڵبوونی موسوڵمانەکانمان بەسەر جەنگەکەدا بۆ دەردەکەوێت، هەروەك ڕادەی ئەو ترس و دڵە

---

[1] صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٦٠

[2] صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٦١ ، النوادر السلطانية، ل: ١٤٠.

راوكێیـەی کەخاچپەرستەکانی گرتبوویـەوە ئاشکرا دەبێت، چونکە موسـوڵمانەکان تـەنها بەزیانگەیاندن بەئامێرەکانیان وازیـان نـەهێنا بـەڵکو ئـەو ئامێرانەشیان لـەدڕیان بـەکارهێنا، کاتێ ڕۆژی چوارشـەممە نیـوەی مـانگی رەمـەزان هـات موسـوڵمانەکان بەکەشتیەکایانەوە چوونە دەرەوەو کتوپڕ هێرشـیان کـردە سـەر ئـەو کەشـتیە خاچپەرستەی کـە دانرابـوو بـۆ دەست بەسـەراگرتنی بـورجی الـذبـان‌و دایانـە بـەر شوشـەی نـەوت‌و توانییـان شکست بـەم هەوڵەی خاچپەرستەکان بێنن[1].

ح- ئازایەتییەکی کەم وێنە: لەجـەمادی یەکـەمی سـاڵی ٥٨٧ك /یۆنیـۆی ١١٩١زدا خاچپەرستان پەلاماری کەشتییەکی موسوڵمانەکانیان دا کە لەبەیرووتـەوە هـاتبوو پڕبـوو لـەئامێرو چەك‌و ئازووقەو جەنگاوەر، فەرماندەی ئەو کەشتیەیش کەسێکی ئازابوو، کاتێ هێـرش‌و هـەژمووني دوژمنی بینی ، داوای نووقومکردنی کەشتیەیکەی کرد هەتاکو دوژمن سودی لێنەبینێ، ئـەوە بوو کەشتیەکەیان نوقوومکردو نەیانهێشت دوژمن سودی لێبیبنێت[2].

هێرشێکی ئیسلامی بۆ سەر تانکێکی گەورە کە لەچوار چین پێکهاتبوو: ئـەو موسـوڵمانەی کـە لەعـەککادا بـوون بـەنیاز بـوون هێـرش بکەنـە سـەر دوژمـن‌و زیـانی زۆری پێبگەیـەنن، هـەتاوەکو بیسەلمێنن کە نوقووم بوونی کەشتییەکە کاری تێنەکردوون، لـەو کاتەشـدا دوژمـن تـانکێکی چـوار قاتی گەورەی دروست کردبوو، کە قاتی یەکەمی لەتەختـە دروسـتکرابوو دووەمیشی لەڕەصـاص‌و سێیەمیشی لەئاسـن‌و چوارەمیشی لەمـسبەرزییەکەشی لەبـەرزی شـوراکە زیـاتر بـوو پڕکـرا بـوو لەجەنگاوەرو نزیککرابووەوە لەشوراکە هەتاکو لێیەوە هێرش بکەنە سەر موسـوڵمانەکان لەعـەککا، بەڵام موسوڵمانەکان دەست پێشخەرییان کردوو شەوو ڕۆژێك بە نـەوت لێیـان دان‌و توانیـان ئـاگری تێبەربـدەن[3]، سـەرباری ئـەم زیانانـەش کـە موسـوڵمانەکان بەخاچپەرستەکانیان گەیانـد، بـەڵام ئەورووپییەکان بەردەوام بوون لە ناردنی کۆمەکی بۆ شام، ئەمەش یارمەتی خاچپەرستەکانی دا بـۆ درێژەدان بەگەمارۆکەیان بۆسەر عەککا، ئەوە بـوو لەکاتێکدا کـە سـەلاحەدین سـەرکەوتنی مـەزنی بەدەست هێنا بەسەر خاچپەرستەکاندا چ لەجەنگو رووبەڕووبوونەوەکاندا بێت یان بەلەناو بردنـی ئـامێرو کەرەستەکانیان ، لـەم کاتـەدا گـەورەترین پاشـاکانی ئـەورووپا لـەو سـەردەمەدا گەشـتنە ناوچەکە کە ئەوانیش فلیپ ئۆغسگۆسی پاشای شاری فەەرنساو ریتشارد شێردڵی پاشای ئینگلتەرا

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٤٣، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦١.

[2] النوادر السلطانية، ل: ١٤٣، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦١.

[3] النوادر السلطانية، ل: ١٦٢، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٢

بوون، کە بەرێگای دەریادا هاتبوون، بێگومان گەیشتنیان کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بەرزکردنەوەی ورەو لایەنی مەعنەوی خاچپەرستەکان[1].

أ- هێنانە دەرەوەی سەربازەکانی ناو عەککاو ناردنی سەربازی تر لەجێیاندا: کاتێ زستان هاتو دەریا شەپۆلی دەداو دوژمن وازی لەهێرش کردن هێنا لەبەر زۆری باران و نالەباری کەش و هەوا، سولتان مۆڵەتی بەسەربازەکانی دا بۆ گەڕانەوە بۆ ولاتەکانیان هەتاوەکو وچانێك بدەن.... تەنها چەند کەسێکی کەم لەئەمیرو پیاوە تایبەتەکانی لای مانەوە[2]، سولتانیش دەستی دایە ئاڵوگۆڕکردنی سەربازەکانی ناو عەککاو ناردنی سەربازی تر لەشوێنیاندا ئەمە جگە لەناردنی ئازووقەو کەرەستەی جەنگی بۆیان و هێنانەدەرەوەی ئەو ئەمیرو جەنگاوەرانەی کەتیایدا بوون، چونکە ماوەیەکی دورو درێژ تیایدا مابوونەوە ماندوو بون بێزاری کردبوون، ئەو موقەدەمەش کەجێی ئەوانی گرتەوە سەیف ئەلدین مشطوب بوو کە لەشازدەی موحەرەمی ساڵی نۆی کۆچیدا چووە عەککا، ئەو موقەدەمەی ناردەوە کەپێشتر تیایدا بوو کە ئەویش ئەمیر حسام ئەلدین ئەبو لهیجاء بوو لەگەڵ چەند ئەمیرو جەنگاوەرێکی تردا، لەگەڵ (مشطوب) یشدا کۆمەڵێك ئەمیرو ناودار چوونە شارەکەوەو هەریەکەیان ئازووقەی ساڵێکیان لەگەڵ خۆیاندا برد[3].

ب- بەڵایەکی گەورە بەسەر موسوڵماندا: مەلیك عادل بەسەربازەکانیەوە چوو بۆ حەیفا لەکەناری دەریا، ئەو شوێنەش شوێنی وەستان و هاتن و چوونی کەشتیەکان بوو، ئەوە بوو ماوەیەك مایەوە پاشان خەڵکی هاندا بۆ چوونە ناوی و لەهەمان کاتدا ئازووقەو کەرەستە سەربازییەکانیشی دەپاراست نەوەکو دوژمن دزەی بۆ بکات، لەم کاتەدا حەوت بەلەم کەپڕ بوو لەئازووقەو کەرەستەو کەلوپەل لەمیسرەوە هێنرابوون،کەشتە ناو شارو ئەمەش لەڕۆژی دوو شەمەی دووەمی ژی الحجەدا بوو، بەڵام بەلەمێکیان تێکشکا لەئاکامی پێکدادانی لەگەڵ ئەوبەردەی کە لە بەندەرەکەدا بوو، ئەمەش وایکرد کەهەموو سەربازەکان بچنە قەراغ دەریاوە بۆ کۆکردنەوەی ئازووقەو کەرەستە، کاتێ دوژمن بەمەی زانی ژمارەیەکی زۆریان کۆکردەوەو لەوشکانییەوەپەلاماری شارەکەیان داو لەشوراکان نزیك بوونەوەو چوونە سەر پلیکانەیەك ، بەڵام بەویستی پەروەردگا پلیکانەکە شکاو خەڵکی شارەکە پەلاماریان داو

---

[1] صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٢.

[2] النوادر السلطانية، ل: ٢٣١.

[3] كتاب الروضتين (٢٣٢/٤).

ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن‌و بەشکست خواردوویی گەڕانەوە[1]، سەبارەت بەبەلەمەکانیش ئەوە شەپۆلی بەهێزی دەریاکە پێکدادانی لەنێوانـدا دروست کرد بەخۆیان‌و سەر نشینەکانیانەوە نوقوم خەڵکێکی زۆری تیادا لەناوچوو، کەدەڵێن شەست کەس بوون‌و ئازووقەیەکی زۆریشی تیا بوو بەشی ساڵێکی شارەکەی دەکرد، ئەمەش موسوڵمانەکانی لاواز کردو سوڵتانیش تەنگاوو بێتاقەت بو[2]، هەروەك یەکەم ئامـاژەی لەدەست دانی ئەو شـارە بوو.

ج- موسوڵمان بوونی هەندێك لەفرەنجەکان: کۆمەڵێکی زۆر لەفرەنجەکان داوای پەنادانیان لەصلاح الدین کردکە برسێتی زۆری بۆ هێنابوون‌و وتیان: ئێمە بەچەند بەلەمێکی بچوکەوە دەچین‌و پەلاماری خاچپەرستەکان دەدەین‌و چەند دەستکەوتێك دێنیینەوە، ئەویش مۆڵەتی پێدان‌و بەلەمێکی بچوکیان بۆ ئامادەکردن‌و توانیان پەلاماری چەند بازرگانێکی دوژمن بدەن‌و هەرچی زیوو کەلەپەلی تیابوو کەوتە بەردەستیان‌و سەرنشینەکانیشیان بەدیل گرت‌و هێنایانیان بۆ بەردەستی سوڵتان، سوڵتانیش هەموو دەستکەوتەکانی بەخشی بەخۆیان، کاتێ ئەم خەڵاتە کران ژمارەیەکیان لێ موسوڵمان بوو، پاشان بڕێکی زۆر زیوویان هێنا کە بارێك دەبوو، بەڵام سەلاحەدین گوێی پێنەداو بەهیچ شێوەیەك سەرنجی نەدا[3].

د- شەهید بوونی جەمالەدینی محەمەدی کوڕی ئەرکز: لەم ساڵەدا کەشتییە موسوڵمانەکان رووبەڕووی کەشتی خاچپەرستەکان بوونەوەو توانیان ژمارەیەکیانلێ بسوتێنن، بەڵام لەکاتی گەڕانەوەدا کەشتییەکیان لێجێما کەئەمیر جەمالالدینی محەمەدی کوڕی ئەرکزی تیادا بوو، لەئاکامدا کەشتیەکانی دوژمن گەمارۆیان داو کەشتیوانەکانی خۆیان فڕێدایە ناو دەریا، بەڵام ئەو خۆی نەدا بەدەستەوەو بەردەوام بوو لەکوشتارداو خۆڕاگری نواند، ئەوەبوو خاچپەرستەکان پێشنیاری پەنادانیان بۆ کرد ئەویش وتی ئەبێ گەورەکەتان بانگ بکەن، کاتێ بانگیان کرد باوەشی پیادا کردو لەگەڵ خۆیدا خستییە ناو دەریاکەوەو پێکەوە خنکان و لەسەر ڕێی بەهەشت‌و دۆزەخدا لەیەك جیا دەکرێنەوە[4].

---

[1] كتاب الروضتين (٤/٢٣٢).

[2] هەمان سەرچاوە، (٤/٢٣٣).

[3] كتاب الروضتين (٤/٢٣٦).

[4] كتاب الروضتين (٤/٢٣٦).

ه- گەشتنی قاضی فاضل بۆ سەربازگەی سولّتان سەلاحەدین: قاضی فاضل لەمیسرەوە گەشتە سەربازگەی سولّتان لەمانگی ذی الحجەو سولّتانیش تامەزرۆی دیداری بوو چونکە ماوەی دوو سالّ بوو نەیدیبوو، بەهۆی سەرقالّبوونی بەسەر پەرشتیکردنی کارو باری میسرەوە لەو ماوەیەشدا بارو دۆخی میسر زۆر جێگیرو ئارام بوو وسام خۆشەویستی سولّتانی خستبووە دلّی خەلّکەوە، سولّتانیش متمانەی زۆری پێی هەبوو و لەزۆربەی کاروبارەکانیدا پشتی پێدەبەست، کاتێ بانگی دەکرد خەمی ئەو ئەرکانەی بوو کەجێیدەهێشت، لەکاتێکیشدا کەئەوی لەگەلّدا نەبوایە هەستی بەبێتاقەتی دەکردو لەو بڕیاو حوکمانە دەترسا کە دەریدەکرد، هەمیشە نامەی بۆ دەنووسیو پرسو ڕای پێدەکرد لەکاروبارەکانیدا، کاتێ قاضی گەیشتە قودس بارانێکی زۆر باریو فەزلّی پەروەردگار بلاّو بووەوە سولّتانیش بەبینینی راوێژکارو دۆستەکەی دلّشاد بوو[1].

و- کۆچی دوایی (قاضی القضاة) گەورەی دادوەران قاضی کەمال الدین شارەزووری لەموسلّدا: لەم سالّەدا قاضی گەورە محی الدین ئەبو حامد کوڕی قاضی القضاة کەمال الدینی کوڕی شارەزووری کۆچی دوایی کردو العماد کاتبیش لە(الحدیدە)دا ستایشی زۆری کرەو چەند هۆنراوەیەکی پیادا هۆنییوەتەوە لەیەکێکیاندا دەربارەی یەکتاپەرستی دەلّێ:

| | |
|---|---|
| قامت بإثبات الصفات أدلّة | قصمتَ ظهور أئمة التَعطيل |
| وطلائع التزي لما أقبلت | هزمت ذوي التشبيه والتمثيل |
| فالحق ماصرنا اليه جميعنا | بأدلة الأخبار والتنزيل |
| من لم يكن بالشرع مقتدياًفقد | القاه فرط الجهل في التضليل |

لەبارەی ستایشی هاوەلانیشەوە دەلّێ:

| | |
|---|---|
| لائمي في هوى الصحابة | أوجع الى سقر |
| لا بلغت المنى ولا | نلتَ من رفضك الوطر |
| كيف تنهى عن حب قومٍ | هم السمع والبصر |
| وهم سادة الورى | وهم صفوة البشر |
| فأبو بكر المقدّم | من بعده عمر |
| ثم عثمان بعده | وعليٌّ على الأثر |

---

[1] كتاب الروضتين (٤/٢٣٨).

ايها الرافضي حسبك          فاحلق قد ظهر[1]

ز- هەردوو پاشای فەرەنسیو ئینگلیزی لەعەککادا: ئەوەبوو گەورەترین پاشاکانی ئەورووپا لەو کاتەدا گەشتنە رۆژهەڵاتی ئیسلامی، کە ئەوانیش پاشا فلیپ ئوگۆستسی پاشای فەرەنساو ریتشارد شێردڵی پاشای ئینگلتەرا بوون کەرێگەی دەریایان گرتە بەرو گەیشتنیشیان کاریگەری زۆری هەبوو لەبەرزکردنەوەی ورەو لایەنی مەعنەوی خاچپەرستەکاندا، پاشای فەرەنسا لەشاری جەنەواوە کەوتە رێو پاشای ئینگلتەراش لەمارسیلیاوە بەرێکەوتو لەصقیەدا بەیەکگەیشتنو لەوێش بۆ ماوەی شەش مانگ مانەوەو لەهەوای خۆشی زستانی ئەو ناوچەیە بەهرەمەند بوون، لەکاتێکدا کەخاچپەرستەکان بەو پەڕی نیگەرانییەوە لەبەرامبەر عەککادا چاوەڕوانیان بوون. پاشان فلیپ ئۆگۆستسی لەمیسیناوە لەدوانزەی رەبیعی یەکەمی ٥٨٧ك /١١٩١زدا لەدەریاوە کەوتە رێو[2] گەشتە صورو کونراد مونتیفرات بەگەرمی پێشوازی لێکردو پێکەوە بەرەو عەککا بەرێکەوتن لەنێو خۆشحاڵی خاچپەرستەکاندا ئەمەش لە ٢٣ی رەبیعی یەکەمی ٥٨٧ك /٣١ی ئازاری ساڵی ١١٩١زدا[3] لەبەرامبەریشدا هەڵوێستی موسوڵمانەکان زۆر زەحمەت بوو سەربازەکان لەدرێژە کێشانی جەنگ بێزار بوونو فەرمانڕەوای شەنگارو جزیرەو موسڵ ناوچەکەیان بەجێهێشت[4]، وادیارە فلیپ ئۆگستس چاوەڕێی گەشتنی ریتشارد شێردڵی نەکرد بەڵکو راستەو خۆ گەمارۆی سەر عەککای توندتر کرد، دوای رێکخستنەوەی ریزی خاچپەرستەکانو بنیاتنانی چەند بورجێك بۆ یان، بەشێوەیەکی بەردەوام شاریان بەرد باران دەکردو هەوڵی پڕکردنەوەی خەندەقەکەی دەوری شارەکەیان دەدا، بەڵام پەلاماردانی شووراو حەسارەکە دواخرا بۆ کاتی گەشتنی ریتشارد شێردڵو هاوەڵانی[5]، ریتشارد شێردڵیش بەسەردانی دوورگەی قوبرس دوای بەرێکەوتنی لەمیسیناوە، لەو کاتەشدا قوبرس لەژێر فەرمانڕەوایەتی دوکاس کومنین دا بوو کە بەنەیاری بۆلاتینەکان ناسرا بوو، ئەوە بوو لە ١٠ی رەبیعی دووەمی ساڵی ٥٨٧ك /ئایاری ١١٩١زدا گەیشتە ئەوێو دەستی بەسەردا گرتو ئیسحاقی

---

[1] هەمان سەرچاوە، (٤/٢٣٩).

[2] صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٢

[3] النوادر السلطانية، ل: ٢٣٧، تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٣

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٣٠، هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٣

[5] تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٣

بەدیل گرت پاشان بەجێی هێشتو بەرەو شام بەرێکەوتو لە١٠ی جمادی یەکەم /٥ی حوزەیراندا کەشتییەکانی گەشتنە کەنارەکانی شامو خۆی دابەزیە سەر وشکانی لەنزیك صور، بەڵام پاسگای شارەکە ئامادە نەبوو مۆڵەتی هاتنە ناو شاری پێبدات ئەمەش لەسەر داواو بەپێی رێنمایەکانی دی مونتیفرات لەو کاتەدا، بۆیە لەدەریاوە بەرەو عەککا بە ٢٥ کەشتییەوە بەرێکەوت لە ١٣ی جەمادی یەکەم/ ٨ی حوزەیراندا گەیشتە بەرەوەو گەیشتنیشی ئومێدی لەدڵی خاچپەرستەکاندا بوژاندەوە سەرباری ئەو ساردییەی کە لەپەیوەندیەکانیدا هەبوو لەگەل پاشای فەرەنسادا[1]، لەبەرامبەریشدا هەڵوێستی پاسگا ئیسلامیەکی شارەکە خراپتر بوو لەبەرامبەر فشاری ئەو کۆمەڵە زۆرانەی خاچپەرستاندا کە گەمارۆیان بۆ سەر شارەکە توندترو هێرشەکانیان چڕتر کردەوە[2].

**چوارەم: داگیرکردنی عەککا:**

سەلاحەدین لەسەنگەرەکانیەوە لەشفعمر چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد،پاشان لە الخروبەو دواتر لە العیاضیەوە، لەکۆتایی جەمادی یەکەم/حوزەیرانیشدا لەجزیرەوە کۆمەکی باشی پێگەیشتو هەستا بەئەنجامدانی چەند هێرشێك بۆ سەرخاچپەرستەکان، لەبەرامبەریدا خاچپەرستەکانیش چەند هێرشێکیان کردە سەر سەربازەکانی بێ ئەوەی هیچ ئاکامێکی هەبێت، پاش ئەوەی موسوڵمانەکان خۆڕاگرییەکی باشیان نواند[3]، ئامانج لەم جەنگانەش زانینی توانای بەرامبەر بوو، سەلاحەدین ویستی بۆ ریتشارد شێردڵی بسەلمێنێت کە سوپاکەی هێشتا بەهێزە، ریتشارد شێردڵیش دەیویست لەوە دڵنیا بێت کە ئایا دەتوانێت بەهێز داواکارییەکانی بەسەر سەلاحەدیندا بسەپێنێت، یاخود ناچاری دانوستانی بکاتو هەموو مەرجەکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێت دیارە دڵنیا بوون لەوەی کە بارودۆخی سەربازی بۆ ئەم مەبەستە زۆر لەبارە[4].

سەرجەم ئەو هێرشانەش کەموسوڵمانەکان کردیان بۆ تێکشکاندنی گەمارۆی سەر عەککا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام خۆڕاگری موسوڵمانەکان لەبەرامبەر دژە هێرشەکاندا، ریتشارد شێردڵی ناچار کرد کە لەداوای دانوستانو کۆبوونەوە لەگەڵ سوڵتاندا بکات، بەئومێدی گەیشتن بەچارەسەرێکی ئاشتییانە، بەڵام سوڵتان بەوریاییەکی زۆرەوە وەڵامی دایەوە" کەژیرانە نییە دوو

---

[1] تأريخ الأيوبين في مصر وبلاد الشام، ل: ١٨٤.

[2] تأريخ الأيوبين في مصر وبلاد الشام، ل: ١٨٤.

[3] النوادر السلطانية، ل: ٢٤١، ٢٤٢، تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٤

[4] تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٤

پاشای دووژمن کۆببنەوە بەبێ ئەوەی ئاگر بەستێك لەنێوانیاندا هەبێت"، بەڵام لەهەمان کاتدا رێی دا بەکۆبوونەوەی مەلیك عادلی برای بۆ ئەنجامدانی کۆبوونەوە لەگەڵ پاشای ئینگلیزدا داو بڕیاری وەستاندنی کوشتار بۆ ماوەی سێ رۆژ دراو رێککەوتن لەسەر ئەوەی کە کۆبوونەوەکە لەو دەشتەدا ببەسترێت کەدەکەوێتە نێوان سەربازگەی هەردوو لاوە، بەڵام کتوپڕ هەردوو پاشای فەرەنساو ئینگلتەرا نەخۆش کەوتن‌و نەخۆشی زۆری بۆ ریتشارد شێردڵ هێنا، بەڵام ئەمە کاریگەری لەسەر ورەی خاچپەرستەکان نەبوو کە سورترو توندتر دەبوون[1].

١- **دانوستانەکان بۆ بەدەستەوەدانی عەککا:** لەراستیدا ئەو هێرشانەی کەسەلاحەدین کردیە سەر خاچپەرستەکان سەرکەوتوو نەبوون، عەککاش زۆر لاواز بووبوو موسوڵمانەکانیش تەنگیان پێهەڵچنرا بوو مەنجەنیقی خاچپەرستەکانیش بەشێکی شوراکەیانی رووخاندبوو بەشەکەی تریش درزی تێکەوتبوو، ماندوێتی‌و شەونخونی خەڵکی شارەکەی ماندوو کردبوو بەهۆی کەمی ژمارەو زۆری ئەرکەکایانەوە، ئەوەبوو لە ٧ی جەمادی دووەم / تەموزدا پاسگاکە نامەیەکی نارد کەتیایدا هاتبوو: هێندە لاواز بووین کە جگە لەخۆبەدەستەوەدان کارێکی ترمان پێناکرێت، سبەینێ ئەگەر کارێکمان بۆ نەکەن داوای پەنادان ئەکەین‌و خۆمان رزگار دەکەین[2]. ئەم هەواڵە گەورەترین کارەسات بوو بۆ موسوڵمانەکان، چونکە عەککا گەنجینەیەکی گەورەی چەك بوو لەناوچەی کەنار دەریاو بەیتولمقدیس‌و دیمەشق‌و حەلەب‌و میسرداو گەورە ئەمیرەکانی سەلاحەدینی تێدابوو وەك سەیفەدین عەلی کوڕی ئەحمەدی هەکاری ناسراوە بە مەشطوب‌و بەهادین قەراقوش[3]. پاسگاکەش تازە بڕیاری راگرتنی جەنگی داوەو سەیفەدین عەلی مەشطوب خۆی چوو بۆ سەربازگەی خاچپەرستەکان بۆ چاوپێکەوتنی پاشای فەرەنسی‌و رێککەوتن لەگەڵیدا لەسەر مەرجەکانی بەدەستەوەدان. نەریتی موسوڵمانەکانیش وابوو کاتێ شارێك خۆی بەدەستەوە دەدا، لەبەرامبەردا سەربازەکانی ناو شارەکەیان ئازاددەکردو پەنایان دەدان، بەڵام پاشای فەرەنسا زۆر دور بوو لەو سیفەتی جوامێری‌و پیاوەتیەی کە لەسەلاحەدیندا هەبوو ئامادە نەبوو داوای پەنایان قبول بکات ئەمەش غیرەتی سەیفەدین مەشطوبی جوڵاندو بەتوندی وەڵامی دایەوەو پێی وت: ئێمە ئەو شارە بەدەستەوە نادەین هەتاوەکو هەریەکەمان پەنجا کەس لەگەورە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٥.

[2] النوادر السلطانية، ل: ١٨٥، تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٥

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥٢

پیاوانتان نەکوژێت پاشان گەڕایەوەو چووە عەککاو راوێژی بەخەڵکی کرد بۆ جیهادو بەخشینی گیانیان لەپێناو خوادا[1]. وێڕای ئەو توندی نواندنەی پاشای فەرەنساش، بەڵام خاچپەرستەکان حسابێکی گەورەیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەو هێزەی موسوڵمانان بەبەڵگەی ئەوەی کەئیبن الأثیر باسی دەکات کە خاچپەرستەکان تەنها بەدانوستان لەگەڵ پاسگاکەی عەککادا وازیان نەهێنا بەڵکو دانوستانیان لەگەڵ سەلاحەدینیشدا کردوو وەفدێکیان نارد بۆ مەسەلەی بەدەستەوەدانی شارەکە، ئەویش رازی بوو لەبەرامبەر ئازادکردنی موسوڵمانەکانی ناو شارەکە، لەبەرامبەریشدا ئەو هێندەی ژمارەی ئەوان دیلیان لێی ئازاد دەکات[2].

٢- **سەلاحەدین هانی موسڵمانانی عەککا دەدات بۆ دان بەخۆدا گرتن:** هەرچۆنێك بوو سەلاحەدین کاتێ توندی هەڵوێستی خاچپەرستەکانی بینی، نامەیەکی نووسی بۆ موسوڵمانەکانی عەککاو داوای دان بەخۆداگرتنو دەرچوونی بەکۆمەڵی لێکردن لەشارەکە، بەجۆرێك کە هەمووان بەکۆمەڵ هەڵمەت بەرنە سەر خاچپەرستەکانو بەڵێنی دا کە لەو شوێنەوەی کەئەوان هێرش دەکەن پێشڕەوی بکاتو لەگەڵ خاچپەرستەکاندا بجەنگێت هەتاوەکو دەرباز دەبن، بەڵام ئەو هەوڵەش سەرکەوتوو نەبوو بەهۆی دەستگرتنی خاچپەرستەکان بەسەر شارەکەدا[3]، بەمشێوەیە ئەو موسوڵمانانەی کە لەعەککادا بوون دڵنیا بوون لەوەی کە جگە لەتێکۆشانو رووبەڕووبوونەوەی جوامێرانە چارەیەکی تریان نەماوە بۆیە نامەیەکیان نووسی بۆ سەلاحەدینو پێیان راگەیاند کە بەڵێنی مەرگیان داوەو بەردەوام دەبن لەجەنگدا هەتاوەکو لەژیاندا مابنو ئەو شارە نادەن بەدەستەوە[4]. سەرباری ئەو قوربانیدانە مەزنەو ئارەزووی شەهیدبوونەی کەخەڵکێکی عەککا نواندیان، بەڵام وادیار بوو سەلاحەدینو ئەو ئەمیرانەی کە لە لەناو عەککادا بوون وەك سەیفەدین مەشطوب زۆر لەخەمی پاراستنی سەرو گیانی موسوڵماناندا بوون، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ئەمیر سەیفەدین مەشطوب کاتێ ئەم بارودۆخەی بینی دووبارە چووە لای خاچپەرستەکان لەگەڵیاندا رێککەوت لەسەر بەدەستەوە دانی شارەکە بەرامبەر بەهاتنە دەرەوەی موسوڵمانەکانی ناو شارەکە بەسەلامەتی ئەممە جگە لەپێشکەشکردنی

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٦٨، تأريخ الأيوبين، ل: ٢٦٥

[2] الكامل في التأريخ، له صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٦.

[3] مفرج الكروب (٣٥٨/٢)، صلاح الدين و الصليبيون، ل:٢٦٦

[4] النوادر السلطانية، ل: ١٩٦، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٦

دوسەد هەزار دینارو ئازادکردنی پێنج سەد دیلو گێڕانەوەی خاچی صلبوتو دانی بڕێك پارە بەکۆنراد نتیفراتی فەرمانڕەوای صور[1].

٣- **ناپاکی نواندنی خاچپەرستەکانو هەڵوەشاندنەوەی بەڵێنەکانیان:** خاچپەرستەکان رازی بوون بەو رێککەوتننامەیەو سوێندیان خوارد بۆ سەیفەلدین مەشطوبو ئەویش شارەکەی تەسلیم کردنو بەبێ جەنگ هاتنە ناویەوە، کاتێ ئەمە روویدا خاچپەرستەکان وەك نەریتی هەمیشەییان لەبەڵێنەکانیان پاشگەزبوونەوەو ناپاکییان نواند بەرامبەر بەموسوڵمانەکانو دەستیان بەسەر خۆیانوماڵو موڵکیاندا گرتو زیندانیان کردن، ئەمەش لە ١٧ی جەمادی کۆتایی ٥٨٧ك /یۆنیۆی ١١٩١زدا بوو وایان پیشاندا کەهۆکاری ئەم هەڵسوکەوتەیان ئەوەیە هەتاوەکو ئەو پارەیەیان پێبگات کەوەك فیدیە بڕیاردراوە لەگەڵ ئەو پێنج سەد دیلەدا کەبەڵێنی ئازادکردنیان داوە، لەم کاتەشدا سەلاحەدین دەستی دایە کۆکردنەوەی پارەو بڕێکی زۆری لا کۆبووەوەو پاشان راوێژی بە هاوەڵانی کرد دەربارەی تەسلیمکردنی بەخاچپەرستەکان، ئەوانیش رایان وابوو کەدووبارە خاچپەرستەکان سوێند بداتو لەسەر ئازادکردنی هاوڕێکانیو داویەکان گرنتی ئەوەی پێبدەن چونکە ئەوان دیندارنو بەڵێن دەبەنە سەر، بەڵام داویەکان ئەوەیان رەتکردەوەو وتیان: ئێمە سوێند ناخۆینو گرنتییش نادەین چونکە دڵنیا نینو دەترسین ئەوانەی کە لەگەڵماندان ناپاکی بنوێنن[2]، لێرەدا سەلاحەدین ناپاکیانی بۆ دەرکەوتو پارەکەی پێنەدان[3]، ئەوەبوو ئاڵای خاچپەرستەکان لەو کاتەدا بەسەر عەککاوە دەشەکایەوەو دوای دوو ساڵ ئابڵوقەدان توانیان بچنە ناو ئەو شارەوە ئەمەش بووە مایەی غەمو پەژارەو مێژوو نووسە موسوڵمانەکان تۆماریان کردووە، وادیارەبوو خاچپەرستەکان دەستی دەستیانی دەکرد لەجێبەجێبەکردنی بەشی یەکەمی رێککەوتنامەکە کە پەیوەست بوو بەوانەوە، سەلاحەدینش بەشی یەکەمی پارەو دیلەکانی بۆ ناردبوون، کاتێ داوای جێبەجێبەجێکردنی بەشەکەی خۆیانی لێکردن رازی نەبوونو بەتەواوی رەتیان کردەوە، ئەویش دڵنیا بوو لەناپاکیو پاشگەز بوونەوەیان رازی نەبوو بڕی دووەمی پارەو دیلەکانیان پێبدات[4]، کاتێ ریتشارد شێردڵ بینی کەسەلاحەدین پارەو دیلو

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٧٠، ١٧١، صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٦

[2] الكامل في التأريخ، له صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٧.

[3] صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٧

[4] صلاح الدين و الصليبيون، ل: ٢٦٧

خاچی صلبوتیان تەسلیم ناکات پەیوەندی پێوە نەکرد، بەڵکو سەرکەشیو نەفامی پاڵی پێوەنا بۆ هێنانی ئەو دیلە موسڵمانانەی کە لەعەککادا بوونو نزیکەی سێ هەزار دیل دەبوون بۆ ناوچەی العیاضیەو بەستنەوەیان بەگوریسو دواتریش خاچپەرستەکان بەکۆمەڵ هێرشیان بۆ هێنانو هەموویان کوشتن ئەمەش لە٢٧ی ڕەجەبی ٥٨٧ك/ ٢٠ی ئابی ١١٩١زدا بوو[1] گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم هەڵسوکەوتە دڕندانەی کەریتشارد شێردڵ لەگەڵ دیلە موسوڵمانەکاندا گرتیە بەر، هیچ ئەنجامێکی نەبوو جگە لەوروژاندنی غیرەتی موسوڵمانەکان کە بەجدیی دەرکیان بەمەترسیو دڕندەیی خاچپەرستەکان کردو لەهەموو وڵاتە ئیسلامیەکانەوە بەدەم بانگەوازی جیهادەوە هاتنو لەئاکامی ئەم بەدەمەوە هاتنەشدا خاچپەرستەکان نەیانتوانی پاش داگیرکردنی عەککا هیچ سەرکەوتنێك تۆمار بکەن، ئەمەش بەهۆی دڵسۆزی سوپای ئیسلامی لەبەرەکانی جەنگداو بەهۆی هەستکردنی بەبەمەترسی خاچپەرستەکان، ئەمە جگە لەو ناکۆکیو دووبەرەکییەی کە کەوتە نێوان خاچپەرستانەوە پاش هاتنە ناو عەککا لەئەنجامی ناکۆکی سەرکردەکانیان،کە بووە هۆی لاواز بوونو پەرتەوازە بوونیانو دەستەوەستان بوون لەتۆمارکردنی هیچ سەرکەوتنێکی تر جگە لەداگیرکردنی عەککا. کە تیایدا زیانێکی زۆریان لێکەوت[2] کە بەهای ئەو سەرکەوتنەی دابەزاند، ئەگەر سەرنجیش بدەین جیاوازی نێوان هەڵوێستی دڕندانەی ریتشارد شێردڵ بەامبەر بەدیلەکانی عەککاو هەڵ،یستە مرۆڤانەی سەلاحەدینمان لە بۆنە جیاجیاکاندا بۆ دەردەکەوێت، کەیەکێکیان ئەو هەڵوێستە بوو بەرامبەر بەدیلەکانیان گرتیە بەر دوای جەنگی حطینو پاش ئازادکردنی بەیتولمەقدیسن ئەوەبوو هەمیشە سور بوو لەسەر ڕێگەدان بەخەڵکی ئەو شارانەی کە دەشتی بەسەردا دەگرتن هەتاوەکو بەسەلامەتی شارەکە بەجێبهێڵن[3]، لەو هەڵوێستە ئیسلامییە مۆرییانەیش ك سەلاحەدین نواندنی لەکاتی گەمارۆدانی عەککادا.

٤- **ئەو ژنە گاورەی کە بەدوای کوڕە شیرەخۆرەکەیدا دەگەڕا:** موسوڵمانەکان چەند دزێکیان هەبوو کە دەچونە خێوەتەکانی دوژمنو شتیان لێدەفڕاندن تەنانەت هەندی جار پیاوەکانیشیان دەفڕاند، ئەوەبوو شەوێکیان منداڵێکی بچوکی سێ مانگەیان فڕاند، کاتێ

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٨

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٨

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٨

دایکی زانی هاواری لێهەستاو ئەو شەوە تابەیانی دەگریاو ئەم هەواڵەش گەشت بەپاشاکانیان وئەوانیش پێیان وت: ئەو(سەلاحەدین)ە پیاوێکی دڵنەرمو بەبەزەییەوە ئێمەش مۆڵەتت دەدەین سەردانی بکەیتو برۆ داوای لێ بکەو بۆت دەگێڕێتەوە، ئەویش هاتوو هاواری هێنا بۆ یەزەکی ئیسلامیو باسی رووداوەکەی بۆ کردن، ئەوانیش بردیانە لای سوڵتان کە لەگردی خروبەدا بەسوار ئەسپێکەوە بوو، قاضی ئیبن شەدادیش لەخزمەتیدا بوو هەر ئەویش ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، لەو کاتەشدا خەڵکێکی زۆری لای سەلاحەدین بوون ئافرەتەکە هاتو گریانێکی زۆری کردو خۆڵی کرد بەسەرو چاوی خۆیدا، سوڵتانیش پرسیاری لەبارەوە کردو ئەوانیش ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش بەزەیی پیادا هاتەوەو فرمێسک بەچاویدا هاتە خوارەوەو فەرمانی کرد بەهێنانەوەی منداڵەکە بۆی، کاتێ ڕۆیشتن بۆ هێنانەوەی بینییان لەبازاردا فرۆشراوە، سوڵتانیش فەرمانی دا کەپارەی کڕیارەکە بگێڕنەوەو خۆی بەپێوە وەستا (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەتاوەکو منداڵەکەیان بۆ هێنایەوە، دایکەکەش لەباوەشی گرتو گریانێکی بەکوڵی بۆ کردو خەڵکیش سەیریان دەکردو دەگریان، منیش لەناویاندا وەستا بووم، ئەوە بوو ماوەیەك شیری پێداو پاشان سوڵتان فەرمانی دا بەهێنانی ئەسپێك بۆیو لەگەڵ منداڵەکەیدا بردیانەوە بۆ سەربازگەکەیان، سەیری ئەم میهرەبانییە گشتگیرو فراوانەی بکە بۆ مرۆڤەکان.

٥- **مامەڵەی لەگەڵ پاشای ئینگلتەرادا:** فرەنجەکان نامەیەکی زۆریان بۆ سوڵتان نووسی کە زۆربەی کات کوشتنو بێ سود بوو، یەکێك لەو نامانەش ئەوە بوو کە پاشای ئینگلیزەکان دەیەوێ لەگەڵیدا کۆببێتەوە، بەڵام پاش چەند ڕۆژێك بێدەنگ بوون، پاشان نێردراویان هاتو داوای مۆڵەتی کرد بۆ پێشکەشکردنی دیارییەك کەلەگیانەوەرێکی دەریایی پێکهاتبوو بەرەو لاوازی تێکچوون چووبوو بوو داوای باڵندەو مریشکی دەکرد بۆ دەرخواردداندو بەهێزکردنیو پاشان بەدیاری ناردنی بۆ سوڵتان بەڵام سەلاحەدین تێگەیشت کەریتشرد ئەمەی بۆخۆی دەوێ چونکە تازە نەخۆش کەوتووە، هەر بۆیە دیلێکی مەغریبی ئازاد کردو ناردی بۆ هێنانی میوەو بەفرو سەهۆڵ بۆیو پاشان بۆی نارد.[1]

**پێنجەم: هۆکارەکانی ڕووخانی عەککا:**

کۆمەڵێك هۆکار هەبوون کە بوونە هۆی ڕووخانی عەککا دوای دوو ساڵ لەبەرگری موسوڵمانەکان لەو هۆکارانە:

[1] کتاب الروضتن (٤/٢٤٥).

١- **گەیشتنی هێزی ئەوروپی نوێ:** ئەم هۆکارە بارودۆخەکەی یەکلاکردەوە لەبەرژەوەندی خاچپەرستەکان یەکلایکردەوە، چونکە سەرباری ئەو ژمارە زۆرەی کە لێیان کوژرا، بەڵام لەدەریاوە کۆمەکی زۆریان پێدەگەیشتو ژمارەیان زۆر زیادی کردو چەندین نەتەوە بەشدارییان کردو لەو شاڵاوە خاچپەرستییە زەبەلاحەدا، ئەوە بوو ئەمیرەکانیان بەماڵو کەرەستەکانیانەوە بەکۆمەکی شارە ئیتالیەکان کە بەشدار بوون لەگواستنەوەی سەربازو کەرەستەو ئازوقەو رێنەدان بەکەشتییە ئیسلامییەکان بۆ گەیاندنی ئازوقەو کەرەستەی پێویست بۆ ئەو شارە گەمارۆ دراوە هەژموونیان بەسەر دەریادا پەرەی سەند[1]، ئەو شارەش (عەککا) دوو ساڵ لەبەرامبەر گەمارۆی خاچپەرستەکاندا خۆی ڕاگرتو لەو ماوەیەدا گەورەترین کردەی سەربازییان بەخۆوەبینی، خاچپەرستەکان بەنزیکەی چارەکە ملیۆنێک سەربازەوە تیایدا بەشدارییان کردو چەندین ئامێری زەبەلاحو کەشتیگەلێکی بەهێزیان بەکاردەهێنا[2].

٢- **بەکارهێنانی چەکی نوێو هەمە جۆر لەلایەن خاچپەرستەکانەوە:** خاچپەرستەکان لەعەککادا جۆرەها چەکی نوێیان بەکارهێنا جگە لەئامێرە جەنگییە کۆنەکان کە گۆڕانکاریو چاکسازیان لەهەندێکیاندا کردبوو بەتایبەت ئەوانەیان کە بۆ هێرش کردنو لێدانی شوراکانی شار یاخود بۆ پاراستنی خۆیان بەکاریان دەهێنا لەپشت ئەو دیوارو خەندەقانەوە کە بنیاتیان نابوو بۆ رێگری کردن لەگەشتنی هێزەکانی سەلاحەدین، پاشان خۆراگرییەکی زۆریش لەنێوان شوراکانی عەککاو هێزەکانی سەلاحەدیندا توانیان کەلێن لەدیواری شوراکاندا دروست بکەن[3]، ئەوەتا لەنامەیەکدا کە قاضی فاضل نوسیبوویو سەلاحەدین بۆ خەلیفەی عەباسی نادر هاتووە: بەجارێك بورجەکان دەجەنگێنو جارێك بەمەنجەنیقو تانكو بەرانەکانو هەندێ جاریش دیوار کونکەر بەکار دەهێنن، شەویش سریە دەنێرن، جارێك بۆ خەندەق پڕکردنەوەو جارێکیش بۆ دانانی پلیکانە، هەندێ جاریش بەشەوو رۆژ هێرش دەکەنو جارجاریش بەکەشتی لەدەریاوە[4]، هەروەها پیاوەکانیان دەیانتوانی بچنە سەر دیواری شوراکان ئەمەش بەهۆی ئامێرێکی نوێوە بوو کە دروستیان کردبوو پێیان دەوت

---

[1] کتاب الروضتين (٢/ ١٨٤)، الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٥.

[2] صلاح الدين الأيوبي، قدري قلجي، ل: ٢٠٤

[3] الجيش الأيوبي في العهد صلاح الدين، ل: ٤٦٥

[4] كتاب الروضتين (٢/ ١٨٥)، الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٦

(الهر)و جۆره مەنجەنیقێك كە توانای فرێدانی بەردی گەورەی هەبوو کە لەکاتی کەوتنیدا شارەکەی دەهەژاند[1].

٣- **درێژی ماوەی گەمارۆی دەریایی و وشکانی:** ئەمە بووە هۆی ماندوو کردن و بێزارکردنی موسوڵمانەکان، سەرباری ئەو ئاڵوگۆڕو شوێن گۆڕکێیەی کە سەلاحەدین بەسوپاکەی دەکرد، جەنگاوەرەکانی ناو شاری ناوە ناوە دەگۆڕی، بەلام نەیتوانی لەپیادەکردنی ئەم شێوازەدا بەردەوام بێت، بەتایبەت لەکاتێکدا کە خاچپەرستەکان گەمارۆیان توند کرد لەسەری، هەروەها ئەو سەرکەوتنانەش کە سوپای سەلاحەدین بەدەستی دەهێنا لەگەمارۆی بۆ سەر سوپای گەمارۆدەری خاچپەرستەکان کاریگەرییەکی ئەو تۆی نەبوو بەتایبەت لەسەرەتای گەمارۆی خاچپەرستاندا[2]، دەرئەنجامی حەتمیش بریتی بوو لە کەمکردنەوەی هەوڵە راستەقینەکان و بێزاری دەربڕین لەسەلاحەدین و ئەم بێزارییەش وردە وردە بوو بەنەریت دواتر لەبێزارییەوە بوو بە رەخنەو پاشان لەناو سوپای سەلاحەدیندا دروست بوو کە بووە هۆی لاوازکردنی ریزی موسوڵمانان[3]، لەنامەیەکیشدا کە سوڵتان بۆ خەلیفەی عەبباسی نارد بوو تیایدا رەهەندەکانی بارودۆخی ناو عەککاو کشانەوەی یەك لەدوای یەکی ئەمیرەکانی بۆ روون دەکاتەوە کە بەهۆی: ئەو ماوە درێژو ئەرکە قورسەوە بوو کە کاری کردووەتە سەر توانایان نەك گوێڕایەڵییان و کێشەکە لەبارو دۆخەکەدا بووە نەك لەلاوازی ئەواندا چونکە جلەکانیان دڕاو چەکەکانیان سواو درهەمەکانیان تەواو بوو لەکاتێکدا کە دەریا لەشەپۆلەکانی زیاتر کەشتی بۆ فرەنجەکان دەنارد جا ئەگەر موسوڵمانەکان یەکێکیان لەوشکانیدا بکوشتایە لەدەریاوە هەزارانیان بۆ دەهات پێدەگەیشت ئەگەر کۆمەڵێکیشیان لەناو ببردایە ئەوە ئەوە دەستەو کۆمەڵێکی تر لەشوێنیاندا ئامادە بوون[4]. هەرچەندە سوڵتان بەهیچ شێتێکەیەك هێندەی ئامادە نەبوونی تەقیەدین عومەری برازای کە چوبوویەوە بۆ میرنشیەکەی لەجزیرە تاوەکو لەزوترین کاتدا بگەڕێتەوە، دلگران نەبوو، کەرووداوەکانی

---

[1] الجيش الأيوبي في العهد صلاح الدين، ل: ٤٦٦

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٤٦٦.

[3] الجيش الأيوبي في العهد صلاح الدين، ل: ٤٦٦

[4] صلاح الدين الأيوبي، قدري قلجي، ل: ٣٠٠

میرنشینەکەی سەرقاڵی کردبوو نەیتوانی خێرا بگەڕێتەوە، سوڵتان سەلاحەدینش ئامادە نەبوونی تەقیەدین عومەری بەیەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی رووخانی عەککا دەزانی[1].

٤- لاوازی دەزگای دارایی لەسوپای سەلاحەدیندا: ململانێی دورو درێژی لەگەڵ خاچپەرستەکاندا رووخانی عەککا پەردەی لەسەر لاوازی بواری دارایی لەسوپای سەلاحەدیندا هەڵماڵینی لادا، ئاشکراشە کە سەلاحەدین گرنگی پێویستی بە بەڕێوەبردنی دارایی نەداو هیچ پارەیەکیشی پاشەکەوت نەکردبوو بۆ تەنگانە ئەو پارە بەخشینەش کە پێی ناسرابوو وا لێکدەدرێتەوە کە بارودۆخی جیهاد ئەوەی خواستووە، ئەوەبوو گەورەمان دارایی میسری لەئازادکردنی شامد سەرف کردو دارایی شامیشی لەئازادکردنی جزیرەدا سەرفکردو دارایی هەموو ئەو شوێنانەشی بۆ ئازادکردنی کەنار دەریا سەرفکرد[2]. هەر بۆیە خێرا خۆی لەهەژاریو نەدارییەکی زۆردا بینییەوە کە پێویست بوو بۆ دابینکردنی چەكو ئازووقەو ئالفو کەرەستەو موچەی سەربازەکانی، هەروەها نەیتوانی چارەسەری ئەو نەدارییەی کەجەنگاوەرەکانی ناو عەککای گرتبووەوە ئەمەش ناچاری قەرز کردنی کردن، هەروەها نەیتوانی ئەسپو چەکی نوێیان بۆ دابین بکات لەبری چەکە کۆنو بەکارهاتووەکان، چونکە ئەسپەکان ماندوو بوونو کەرەستەکانیش تەواو تێکشکابوون هەروەها کەوانەکانیشیان بێ تیر کەوتبوون[3]. عماد زیاتر لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێ: لەم ساڵانەدا پێداویستیەکان زۆر بوون کە جرێك کە پیشە سازەکان پێیان دابین نەدەکراو کرێکارەکانیش نەیاندەتوانی پێی هەستن[4]، ئەمانە گرنگترین ئەو هۆکارانە بوو کە بوونە هۆی لەدەستدانی عەککا.

٥- **پاش عەککا:** لەدەستدانی عەککا کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بارودۆخی موسوڵمانەکان هەرچەندە ئەم گورزە یەکلاکەرەوە نەبوو بەڵام توانی موسوڵمانەکان زۆر لاوز بکات بەجۆرێك کە پاش ئەو دەستیان کرد بە بەرگریکردنێکی سلبی کە خۆی لەرووخاندنی هەندێ قەڵاو شورادا دەبینیەوە هەتاوەك نەکەوێتە دەست دوژمن، راستە کە شکست هێنانی سوپای سەلاحەدین لەگەمارۆدانی صوردا بەسەرەتای تێکشکانی موسوڵماەکان دادەنرێت، بەڵام ئەم شکستە سوپای سەلاحەدیندا دادەنرێت، نەك لەناو سەرکەوتنەکانی خاچپەرستاندا،

[1] صلاح الدين الأيوبي، قدري قلجي، ل: ٣٠٠

[2] كتاب الروضتين (٢/ ١٧٧)، الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٧.

[3] الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٧

[4] الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٧، الفتح القسي، ل: ٥٣٣

مەبەست ئەوەیە کە ئەوەی لەصوردا روویدا بریتیبوو لەشکستهێنانی موسوڵمانەکان لەگەمارۆدانی شارێکدا، بەڵام لەعەککاداو موسوڵمانە بەرگریکارەکان تێکشکان‌و خاچپەرستەکان سەرکەوتن[1].

**شەشەم: جەنگی ئەرسوف:**

ریتشارد شێردڵ نەخشەیەکی دانا بۆ گێڕانەوەی ئەو شارانەی کە کەوتبوونە کەناری فەلەستین لەعەککاوە هەتاکو عەسقەلان، پێش ئەوەی کەبەرەو ناوچەکانی ناوەوە بەڕێبکەوێت بۆ گێڕانەوەی بەیتولمەقدیس، بۆئەم مەبەستەش لەرۆژی پێنج شەممەی ٢٩ی رەجەبی ٥٨٧ك / ٢٢ی ئابی ١١٩١زدا سەرکردایەتی سوپای خاچپەرست عەککای بەجێهێشت‌و رێگەی کەنار دەریای گرتە بەر چونکە باڵی ڕاستی سوپاکەی لەلایەن کەشتیگەلی خاچپەرستەوە پارێزرابوو، دیارە بارودۆخی گەشتەکە ئاسان نەبوو خاچپەرستەکان بەدەست گەرماو کەمی ئازوقەو رووخانی ئەو گوندو شارانەوە دەیانناڵاند کە پیایدا تێپەردەبوون، هەروەها تەنگ پێهەڵچنینی دواووەی سوپاکەشیان لەلایەن موسوڵمانەکانەوە بۆ خۆی گرفتێك بوو[2]، لەڕاستیشدا سەلاحەدین نەیەەویست سوپای خاچپەرست بەسەلامەتی تێپەڕبێت بەڵکو شوێنی کەوتو لەوە دەترسا کە ریتشارد شێردڵ بەرەو عەسقەلان بڕوات‌و داگیری بکات‌و وەك بنکەیەك بەکاریبهێنێت‌و پەیوەندی نێوان ئەوو بەیتولمقەدیس‌و میسر بپچڕێت کەسەرچاوەی ناردنی هێزی لێدەرە، ئەوەبوو دوای دەستگرتنی خاچپەرستەکان بەسەر حەیفادا بەهۆی چۆڵکردنیەوە لەلایەن پاسگاموسوڵمانەکەیەوە بەرەو قیساریە بەرێکەوتن، کاتێ کەلێی نزیك بوونەوە لە ٧ی شەعبان/ ٣٠ی ئابدا پێکدادان لەنێوان هەردوو سوپادا نزیك بوویەوە موسوڵمانەکان بواری ئازادی جموجۆڵیان هەبوو، بەڵام خاچپەرستەکان خۆیان لەنێوان موسوڵمانەکان‌و دەریادا گەمارۆدابوو[3]، رووبەڕووبوونەوەی توندیش خەریك بوو رۆژانە لەنێوانیاندا هەڵبگیرسێت‌و سەلاحەدینیش دەیویست خاچپەرستەکان پەلکێش بکات بۆ ناوەوە هەتاکو لەرێڕەوی خۆیان لایانبدات‌و لەکەنار دەریا دوور بکەونەوەو تایبەتمەندی پشتگیری کەشتیگەل لەدەیستبدەن، بەڵام ریتشارد شێردڵ کە بەئەزموون‌و لێهاتویی سەربازی ناسرابوو نەکەوتە ئەو داوەی سەلاحەدینەوەو رێڕەوی خۆی پاراست‌و سەربازەکانی بانگهێشت کرد بۆ پاراستن‌و پابەندبوون بەیاساوە، نەکەوتنە داوی سوپای موسوڵمانەکانەوە، بەم شێوەیەش

---

[1] الجيش الأيوبي، ل: ٤٦٨

[2] النوادر السلطانية، ل: ١٨٩.

[3] تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٩

هەلێکی لەکیس سەلاحەین دا کەزۆر تامەزرۆی بوو[1]، پاشان خاچپەرستەکان دەستیان گرت بەسەر قیساریەی وێران کراودا کە لەلایەن موسوڵمانەکانەوە روخێنرابووو هیچ سودێکیان لەو کارە دەست نەکەوت، پاشان درێژەبان دا بەهەڵکشانیان، هەتاوەکو گەشتنە نزیك ئەرسوف و چوونە باکوری رۆژهەلاتی شارەکە کە دوو میل لە دەریاوە دوور بوو دەشتەکەی هێندە فراوان بوو کەبەشی رووبەڕووبوونەوەو پێکداداني دەکرد[2]. سەلاحەدیش کەپێش دوژمن کەوتبوو بۆ دارستانەکە بڕیاری دا کە لەم شوێنەدا رووبەڕووی دوژمن ببێتەوەو هێزەکانی ئامادەکرد بۆ رووبەڕووبوونەوەن کاتێ ریتشارد شێردڵ بەمەی زانی لەدوو قۆڵەوە رێو شوێنی گرتە بەر:

- ناردی بەدوای کۆمەکی خاچپەرستان لەعەککا.
- هەوڵی رێککەوتنی دا لەگەل سەلاحەدیندا.

دیارە سەلاحەدینیش دەویستی سود لەکات وەربگرێت هەتاوەکو ئەو هێزە تورکمانانە دەگەنە بەرەوە کەداوای کردبوون، هەربۆیە خۆی وا پیشاندا کەدانووستانی لاپەسەندەو عادلی برای نارد لەبری خۆی‌و ئەویش لەگەل ریتشارد شێردڵدا کۆبووەوە لە ١٢ی شەعبانی/ ٥ی ئەیلوولدا، بەڵام گفتوگۆکان بەهۆی سوربوونی ریتشارد لەسەر هەڵوێستی شکستیان هێنا، چونکە ئەو سور بوو لەسەر دەستهەڵگرتنی موسوڵمانەکان لەسەرجەم ئەو ناوچانەی کە لەشانشینی بەیتولمەقەدیسدا دەستیان بەسەردا گرتووە، هەر بۆیە عادل خێرا کۆتایی بەگفتوگۆکان هێناو کوشتار بووە تاکە چارەسەر[3] لەنێوان هەردوو لادا ن لەم کاتەدا کۆمەکی سەربازی گەشتە هەردوو لاوو، خۆیان ئامادە کرد بۆ رووبەڕووبوونەوەو جەنگ لەچێشتینگای رۆژی شەممە ١٤ی شەعبان ٥٨٧ك/٧ ئەیلوولی دەستی پێکردو سەرەتا موسوڵمانەکان گەمارۆیان دان‌و زۆری نەمابوو لەناویان بەرن، بەڵام ریتشارد شێردڵ خۆڕاگری نواندو بەخێرایی ریزەکانی رێکخستەوەو جەنگ لەبەرژەوەندی ئەوان بوو توانی ریزەکانی موسوڵمانەکان ببەزێنێت، کاتێ سەلاحەدین بینی موسوڵمانەکان لاواز بوون[4] هاواری کردو هانی دان بۆ جیهاد کردن لەپێناوی خوادا، خۆی بەدامەزراوی مایەوە، کاتێ

---

[1] تأريخ الأيوبين، ل: ١٨٩

[2] الكامل في التأريخ، له تأريخ الأيوبين ەوە، ل: ١٩٠

[3] النوادر السلطانية، ل: ٢٧٣- ٢٧٥، تأريخ الأيوبين، ل:١٩٠

[4] تأريخ الأيوبين، ل: ١٩٠

موسوڵمانەکان ئەم هەڵوێستە ئازاو خۆڕاگرانەی سەلاحەدینیان بینی پەلاماری خاچپەرستەکانیان داو توانییان پاشەکشەیان پێبکەن بۆ شوێنەکانیان[1].

**حەوتەم: رووخاندی عەسقەلان:**

دوای جەنگی ئەرسوف ریتشارد بەرەو یافا بەرێکەوتو بەبێ بەرگری دەستی بەسەردا گرت، چونکە کەسی لەموسوڵمانەکانن تیادا نەبوو، وەك ئیبن ئەثیر دەڵێت[2]، پاشان دەستی کرد بەبنیاتنانەوەی سەنگەرو قایمکردنی سەربازگەو شوراکەی سەلاحەدینیش بەرەو رەملە بەرێکەوتو لەوی ئەنجومەنی جەنگی کۆکردەوەو راوێژی پێکردن و ئەمیر علم الدین سولەیمانی کوڕی جەندەر ڕای وابوو کە عەسقەلان چۆڵ بکاتو دواتر بیڕوخێنێت چونکە ئامانجی دوژمن دوای عەککاو یافاو عەسقەلانو پاشان قودسە، یافاش کەریتشاردی تیایە دەکەوێتەنێوان قودسو عەسقەلانەوەو ناشتوانرێ بەرگری لە هەردوو شارەکە بەیەکجار بکرێت[3]، هەروەها ئەو ئەمیرانەی کە داوای رووخاندنی عەسقەلانیان دەکرد ڕایانگەیاند کەبەرگریکردن لەو شارە پێویستی بەبوونی پاسگایەکی گەورە هەیە تیایدا کە ٢٠تا ٣٠ هەزار جەنگاوەر لەخۆ بگرێتو[4] وتیشیان بەسەلاحەدین: دەزانی دوێنێ چیمان بەسەر هات، ئەگەر فرەنجەکان بێنە عەسقەلان ڕووبەڕوویان ببینەوە هەوڵی دەربەڕاندنمان دەدەن ئەگەر ئەوەش روویدات وەك عەککامان بەسەر دێتو ئەمەش مەترسیدارە، بەڵام سەلاحەدین بەم ڕایە ڕازی نەبوو داوای لەهەندێ لەئەمیرەکانی کرد کە بچنە عەسقەلانەوەو بەرگری تیادا رێبخەن، بەڵام ئەوان ئەو کارەیان نەکرد، بەڵکو جیا لەجاران زۆر توند وەڵامیان دایەوەو دواتریش لەسەر ئەم شێوازە ڕاهاتن وەك عمادو ئیبن أثیر دەیگێڕنەوە کە وتوویانە: ئەگەر دەتەوێت بەرگری لێبکەیت ئەوە یان خۆت یان یەکێ لە کوڕە گەورەکانت لەگەڵماندا بنێرە، ئەگینا کەسمان ناچینە ناویەوە چونکە وەك خەڵکی عەککامان بەسەردێت[5]. سەلاحەدینیش نەیتوانی قەناعەتیان پێبێنێتو ئەمەش زۆر دڵتەنگی کردو شەو بەغەمباری مایەوە، ئیبن شەداد دەڵێ: ئەو شەوە زۆر کەم خەوتو بەرەبەیان بانگی کردم بۆ خزمەتیو منیش چووم مەلیك ئەفضەلی کوڕیشی بانك کردو ڕاوێژی پێکرد دەربارەی ئەم مەسەلەیەو پاشان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو

---

[1] صلاح الدين و الأيوبين، ل: ٢٧٠، النوادر السلطانية، ل: ١٨٤

[2] الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٦، له كامل في التاريخ ەوە.

[3] الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٦، له كامل في التاريخ ەوە.

[4] كتاب الروضتين ، له الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٧.

[5] الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٨

منالەکانم لەدەست بدەم پێم خۆشترە لەوەی کە یەک بەرد لەعەسقەلان بڕوخێنم، بەڵام ئەگەر خوای گەورە ئەوەی بڕیاردابێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندی موسوڵمانان چی بکەم[1]. دواجار ناچار بوو ڕای ئەمیرەکانیپەسەند بکاتو ڕازی بوو بەرووخاندنیو فەرمانی دا بەوالی شارەکە کە خۆی ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ والیش لەبەرەبەیانی ١٩ی شەعبانی ٥٨٧ك /١٢ی ئەیلولی ١١٩١زدا دەستی بەرووخاندن کردو خەڵکیشی هانداو شورای شاری بەسەردا دابەشکردنو بۆ هەر کۆمەڵێك بەشێك لەشوراکەی دیاریکردو سەلاحەدینو کورەکەشی لەرووخاندنیدا بەشدارییان کردو ناردی بەدوای عادلی برایدا کەلەگوندێکدا خەریکی خانوو دروستکردن بوو لەنزیك ڕەملەو یافاو داوای لێکرد کە دەستی دەستیان پێبکات گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵیاندا درێژبکاتەوە، هەتاوەکو لەرووخاندنی شار دەبنەوە[2]. خەڵکیش زۆر غەمبار بوون بەم کارەو گریان هاوریان لێبەرز بوویەوە، چونکە عەسقەلان شارێکی دڵگیرو خۆش بوو، بینای گەورەو شورای تۆکمەی تیادا بوو نیشتەجێبوونی خۆش بوو تەنانەت بەبوکی شام ناسرابوو[3]، دوای لێبوونەوە لەروخانی فەرمانی سوتانیدا، خەڵکەکەشی کۆچیان کردو بەمیسرو شامدا بڵاوبوونەوە، کرداری وێرانکاریو سوتاندن هەتاوەکو سەرەتای ڕەمەزانی ٥٨٧ك کۆتایی ئەیلولی ١١٩١ز خایاند، هەرکە لەرووخاندنی عەسقەلان بوونەوە سوپا دەستی کرد بەبنیاتنانی بنکەی فەرماندەی العادلو پاشان بەرەو ڕەملە بەرێکەوت[4]. ریتشارد شێردڵیش هەستا بەتۆکمەکردنی یافاو هێرشی نەکردە سەر بەیتولمەقدیس، چونکە ئەگەر ئەم کارەی بکردایە ئەوە لەوانە بوو سوپای سەلاحەدین ڕێگای پەیوەندی نێوان ئەوو دەریایان ببچڕاندایە، بۆیە کارێکی ژیرانە بوو کە سەرەتا یافا تۆکمە بکات، چونکە ئەگەر دەستی بەسەر قودسدا بگرتایەو دواتر پاشەکشەی لێبکردایە ئەوە بۆ ئابڕویان خراپتر دەبوو[5]، هەرچەندە دان بەخۆدا گرتن دواخستن درێژەی کێشاو هەولێك بۆ سەلاحەدین ڕەخسا بۆ بەهێزکردنی بەرگریقودس و ڕێکخستنەوەی ریزەکانی سوپاکەی بۆ جەولەی دووەم لەکاتێکدا کەخاچپەرستەکان لەپشودا بوون لەعەککا، دوبارە بایەخدانی ریتشارد بەتۆکمەکردنی عەککا لەبایەخدانی سەلاحەدین بەرووخاندنی عەسقەلان کەمتر نەبوو، چونکە ئەو سەرکردە خاچپەرستە

---

[1] الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٨

[2] النوادر السلطانية، ل: ١٨٨

[3] معجم البلدان (٤/١٢٢)، آثار البلاد، ل: ٢٢٢.

[4] النوادر السلطانية، ل: ١٨٩، كتاب الروجتين (٢/ ١٩٢)

[5] الجيش الأيوبي، ل: ٤٧٩

دەیزانی کەناتوانێ دەست بگرێت بەسەر بەیتولمەقدیسدا بەبێ بەهێزکردنی دەسەڵاتی لەیافادا، بەتایبەت کە عەسقەلان رووخێنرابوو[1].

**هەشتەم: رێکخستنی بەرگری لەقودس:**

سەلاحەدین تاکاتێکی درەنگ نەگەڕایەوە بەیتولمەقدیسدا ، گەڕانەوەشی لەکۆتایی ذي القعدەی ٥٨٧ك دا بوو، بەڵام پێشتر الملك عادلی نارد بۆ بەسەرکردنەوەو چاودێریکردنی ئاوەدانی تیایە[2]، دیارەبەباشی دەزانی کخۆی لەو ناوچە وێرانکراوانەدا بێت کە سوپا رووخاندنی لەنزیك قودس‌و رەملە، مەبەستیشی لەم کارەی ئەوە بوو کە لەهەمان کاتدا لەقودس‌و لەدوژمنیشەوە نزیك بێت، هەتاوەکو ئەگەردوژمن ویستی هێرش بکاتە سەر قورسترێیان پێبگرێت‌و لەشوێنێکی دەشتایدا رووبەروویان ببێتەوە، لە٦ی شەوالیشدا سەلاحەدین گەورە ئەمیرەکانی کۆکردەو راوێژی پێکردن دەربارەی چۆنێتی رووبەڕووبونەوەی هێرشی دوژمندا، چونکە هەواڵەکان وایان بڵاودەکردەوە کەخاچپەرستەکان بڕیاری بەرێکەوتنیان داوە بەرەو سەربازگەی ئیسلامی، موسوڵمانەکانیش یەك دەنگ بوون لەسەر مانەوەیان لەجێی خۆیانداو ئەگەر فرەنجەکان هاتن رووبەڕوویان دەبنەوە[3]، ئەوەبوو دوو پیاو لە خاچپەرستە پەنادارەکان گەشتنە سەربازگەکەی‌و ئاگاداریان کردەوە کە دوژمن دوو سبەی دیاریکردووە بۆ هێرش کردن، دواتر دیلێکی موسوڵمان کە لەسەربازگەی خاچپەرستەکان هەڵهاتبوو گەشتە سەربازگەی موسوڵمانەکان‌و ئاگاداری کردنەوە کە بەیازی هێرشکردنن، ئەوە بوو سەلاحەدین دەستی کرد بەتۆکمەکردنی قودس‌و ناردی بۆ شارەکان بەدوای پیاوانی شارەزا لەم بوارەداو سوڵتان‌و کوڕەکانی‌و ئەمیرەکانیشی کاریان تیادا کردو زانایان‌و مامۆستایان‌و دادوەرانیش هاوکاریان کردن[4].

لەموسڵیشەوە کۆمەڵێکی زۆر گەشتن کە بەپەنجا کەس مەزەندە دەکران‌و هەموویان بەرد تاش بوون بۆ تۆکمەکردنی شوراو خەندەقی شارەکە هاتبوون[5]، هەرکە لەم کارە بوویەوە فەرمانی دا بە چاوەش کە بانگەواز بکات بۆ کۆبوونەوەی سەربازەکان‌و هەڵگرتنی ئاڵاکان بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمن لەم کاتەشدا سوپای ئەیوبی تووشی کارەساتێك بوو بەکۆچی دوایی تقی الدین عمر

---

[1] الجیش الأیوبی، ل: ٤٧٩

[2] النوادر السلطانیة، ل: ١٩٢، الجیش الأیوبی، ل: (٢/ ١٩٢)

[3] النوادر السلطانیة، ل: ١٩٦– ١٩٧، الجیش الأیوبی، ل: ٤٨٠.

[4] مفرج الکروب (٢/٣٧٥)، کتاب الروضتین ، ل: (١٩٤/٢)

[5] مفرج الکروب (٢/٣٧٥)، الجیش الأیوبی، ل: ٤٨١.

لەناوچەی جزیرەداو ئەمەش سوڵتانی زۆر ئازار دا، بەڵام ئەم هەواڵەی لەسەربازەکان شاردەوە، هەتاوەکو ئەم هەواڵە نەگات بەدوژمن لەم کاتە ناسکەدا[1]، هەروەها سەرکردەی لێهاتوو ئەمیر حسام محەمەدی کوڕی عومەری کوڕی لاجینی خوشکەزای سەلاحەدین کۆچی دوایی کرد بەهۆی نەخۆشییەکەوە لەهەمان رۆژی کۆچی دوایی تقی الدین عمر دا لە ١٩ی رەمەزانی ساڵی ٥٨٧ك/ پایزی ١١٩١زدا[2]، واپێدەچێت کە هەواڵی ئامادەکاریەکانی سوپای سەلاحەدین بەریتشارد شێردڵ گەشتبێت، هەربۆیە نەیدەویست رووبەڕووی ببێتەوە زۆر داوای دانوستانی دەکرد، هەتاوەکو بناغەی پەیوەندی نێوان هەردوو لابێت وەك رووداوەکانی رۆژانی داهاتوو دەریان خست، ئەوەبو هەرکە زستانی ساڵی ٥٨٧ك/ ١١٩١ز هات هەردوو لا وەستان‌و هیچ رووبەرووبوونەوەیك رووی نەداو سەلاحەدینیش لەکاتی توندبوونی باران باریندا چووە قوودس‌و خاچپەرستەکانیش گەڕانەوە بۆ یافاو بەشێکیشیان گەرانەوە بۆ عەككا بەڵام ریتشارد زوو زوو نێردراوەکانی دەنارده لای سەلاحەدین‌و هانی دەدا بۆ رێککەوتن، هەرچەندە سەلاحەدین زۆر ئارەزووی مۆرکردنی رێککەوتن‌و ئاگر بەستی نەبوو لەهەمان کاتیشدا دەیویست سود لەبارودۆخی دانوستان وەربگرێت لەم وەرزەدا کەسوپای ئەمیرەکانی لەلا نەمابوو بۆیە داوای کرد لە مەلیك عادل کەدووبارە دەستی بەریتشارد بکات هەتاوەکو سەربازەکانی دەوروبەر دەگەنە بەرەوەو مەلیك عادلیش قودسی بەجێهێشت لەسەرەتای رەبیعی یەکەمی ٥٥٨ك ئاداری ١١٩٢زدا[3]، بەڵام دانوستانەکان بێ بەرهەم بوون، بۆیە چەند کۆمەڵێك لەخاچپەرستەکان هەستان بەداگیرکردنی چەند شوراو قەڵایەك کە بواری بەرگریکردنی کەم بوو، وەك عەسقەلان کەریتشاردنۆژەنی کردبووەوە[4]، بەجۆرێك کە تۆکمەترین قەڵا بوو لەتەواوی ناوچە کەنارییەکان فەلەستیندا[5]، هەروەها قەلای دارومیان داگیر کرد کە سەلاحەدین پێشتر فەرمانی کرد بەرووخاندنی کاتێکیش ریتشارد داگیری کرد تۆڵەی لەبەرگریکاران سەندەوە[6]، هەروەك چەندین پێگەی بچوکیان لەکەناری فەلەستیندا داگیرکرد[7].

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ١٩٨

[2] الجيش الأيوبی، ل: ٤٨٠، كتاب الروضتين ، (١٩٥/٢)

[3] النوادر السلطانية، ل: ٢٠٥، الجيش الأيوبي، ل: ٤٨٢.

[4] الكامل في التأريخ، له (الجيش الأيوبي) هوه، ل: ٤٨٢

[5] النوادر، ل: ٢١٠

[6] الجيش الأيوبي، ٤٨٢

[7] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٣

**نۆیەم: سروشتی دانوستانەکان لەنێوان عادلو ریتشارد لەم قۆناغەدا:**

دانوستانەکان لە١٨ی شەوالی ساڵی ٥٨٨/ ٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١١٩٢دا دەستی پێکرد لەکاتێکدا کە ریتشارد نامەیەکی ئاراستەی سەلاحەدین کرد لەسەربارگەکەیەوە لەنزیک بازورداوای دانوستانی لێکرد لەپێناو ئاشتەوایدا بەبیانووی ئەوەی کە کوشتار خەڵکێکی زۆری لەهەردوو لا لەناو بردووەو وڵاتیشی وێران کردووە[1]، بەڵام ئەم دانوستانەش کە سەلاحەدین مەلیك عادلی تیادا نارد شکستی هێنا بەهۆی سوربوونی ریتشارد لەسەر گێڕانەوەی بەیتولمەقدیسدا و ئەو ناوچانەی کە دەکەونە رۆژئاوای دەریای ئوردنەوە بەهەموو قەڵاو شوراکانو خاچی الصلبوتەوە، ئەمە وێڕای سوربوونی لەسەر عەسقەلان، سەرجەمی ئەم مەرجانەش لەلایەن سەلاحەدینەوە ڕەتکرانەوە، بەڵام پاش چەند رۆژێك ریتشارد چەند پێشنیارێکی نوێی خستە بەردەم سەلاحەدین کە تیایدا هاتبوو:

١- مەلیك عادلی برای سەلاحەدین هاوسەرگیری لەگەڵ شازادە جوانای خوشکی ریتشاردو هاوسەری پاشای صقلّیە بکات.

٢- سەلاحەدین هەموو ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەستیدایە لەفەلەستیندا رادەستی براکەی بکاتو ریتشارد شێردڵیش ناوچە کەناریەکانی پێدەدات بەعەسقەلانیشەوە کە بەم دواییانە داگیری کردبوو.

٣- بووکو زاوا لە بەیتولمەقدیسدا نیشتەجێ بنو گاورەکانیش سەردانی کڵێسای قیامە بکەن.

٤- خاچی الصلبووت بگێڕدرێتەوە بۆ گاورەکان.

٥- دیلی هەردوو لا ئازاد بکرێن.

٦- هەندی گوندو ئاوایی ناو فەلەستین بدرێتەوە بە داویەو ئسبتاریەکان[2].

عادل ئەم پێشنیارنەی پێباش بووو پێشوازی لێکردو زۆر بەدروستی دەزانی بۆ یەکخستنی موسوڵمانەکانو خاچپەرستەکان لەژێر دەسەڵاتیدا لەوڵاتی شامو چەسپاندنی کاروبارەکان لەسەر بنەمای خۆشەویستیو پێکەوە ژیان لەنێوان هەردوو لادا[3].

سەلاحەدینش ئەم پێشنیارەی بەجۆرە گاڵتەیەك دەزانی، بەڵام خۆشحاڵ بوو بەپەسەند کردنی، وادیار بوو کە رازی بوونی بەم پرۆژەیەش لەو بارەیەوە سەرچاوەی گرتبوو کەپاشای

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ٢٩٢، تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٤

[2] الحركة الصليبية، عاشور (٨٨٢/٢).

[3] النوادر السلطانية، ل: ٢٩٣، تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٤

ئینگلتەرا ناتوانێت ئەم پرۆژەیە جێبەجێ بکات، ئەمە تەنها فێڵو گاڵتەیە[1]، ئەوەبوو خێرا کۆسپ لەلایەن جواناوە بۆ ئەم پرۆژەیە دروست کرا کە تووشی شۆك بوو کاتێك ئەم هەواڵەی بیست وتی: هیچ پێویستییەك بەدیناکات بۆ شووکردن بەپیاوێکی موسوڵمان، ئەمەش وایکرد لەریتشارد کە داوا لەمەلیك عادل بکات کەببێتە گاور بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپە بەڵام عادل ئەوەی رەتکردەوە[2].

لەراستیشدا پەسەندکردنی ئەم پرۆژەیە لەلایەن ئەو سێ سەرکردەیەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەو نزیکییە رامیاریو شارستانیەی کە لەوڵاتی شامدا پەیدا بوو دوای تێپەڕبوونی سەدەیەك بەسەر دەستپێکردنی جەنگەکانی خاچپەرستیدا، ئەمە جگە لەگەشەکردنی گیانی لێبوردەیی کە بەئاشکرا لەرەفتاری هەردوو لادا بەدیدەکرا، بەبەڵگەی کۆبوونەوەی ریتشارد لەگەڵ مەلیك عادل لەسەر خوانێکی رازاوەو تایبەت لە١٨ی شەوالی ٥٨٨ك دا، پاش پتەوکردنی دۆستایەتی نێوانیان لەیەك جیابوونەوە، هەروەها پاشای ئینگلیزی ئارەزووی خۆی نیشاندا بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ سەلاحەدیندا، مەلیك عادل داواکەی رەتکردەوە وتی: پاشاکان کاتێ کۆدەبنەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان بۆیە دەبێ پاش رێککەوتن کۆبوونەوە ئەنجام بدرێت[3]، ریتشارد شێردڵیش سەرقاڵ بوو بەچارەسەرکردنی کێشەی خاچپەرستەکان بەتایبەت ناکۆکی نێوان کونراددی مونتیفراتو جای لوزینان[4].

**دوەم: تێگەیشتنێکی سیاسی سەلاحی کەهاوتا بوون لەگەڵ جەنگدا:**

لەو کاتەدا کە دانووستان لەگەڵ ریتشارد شێردڵدا بەردەوام بوو، سەلاحەدین پێشوازی کرد لەرینۆڵدی فەرمانڕەوای صیدا کەوەك نێردراوی کونراددی مونتیفرات هاتبوو پێشنیاری هاوپەیمانێتی کرد لەگەڵ سەلاحەدیندا لەبەرامبەر بەپێدانی صیداو بەیروت، تەنانەت پێشنیاری گێڕانەوەی عەککای کرد بۆ مموسوڵمانەکان، مەبەستیشی لەمە گۆڕینی ئاراستەی دانوستانەکان بوو لەبەرژەوەندی خۆی[5].

کاتێ ریتشارد شێردڵ بەجموجوڵەکانی کونراددی زانی هەوڵی زۆری دا بۆ گێڕانەوەی بۆ ریزی خاچپەرستان، بەڵام هەوڵەکانی بێئاکام بوون، دی مونتیفراتیش هەوڵی لێکتێگەیشتنی لەگەڵ

---

[1] الجيش الأيوبى، ٤٨٢

[2] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٤

[3] النوادر السلطانية، ل: ٣٠١،٣٠٠، تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٤

[4] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٥

[5] النوادر السلطانية، ل: ٢٨٥، ٢٨٦، ٢٩٧

سەلاحەدیندا دووبارە کردەوە، سەلاحەدینیش کۆبوونەوەیەکی سازکرد بۆ فەرماندەکانی سوپاکەی هەتاوەکو بزانێت لەگەڵ کام لایەنی خاچپەرستدا درێژە بەگفتوگۆکانی بدات، مەلیک عادلو هەندێ لەئەمیرەکانی لەگەڵ درێژەدان بەدانوستان لەگەڵ پاشای ئینگلیزدا بوون، چونکە ئەو رۆژهەلات بەجێدەهێڵێت، لەکاتێکدا کە دی مونتیفرات دەیویست لەفەلەستیندا نیشتەجێبێت، ئەوەبوو بڕیاردرا پێشنیارەکانی ریتشارد شێردڵ قبوڵ بکەن[1]. سەرباری هەوڵەکانی لێکگەیشتنو ئەو جەنگە سنوردارەی کە لەنێوانیاندا روویدا بەلام هیچ پاڵنەرێك نەبوو بۆ لەیەك نزیکبونەوە، لەم کاتانەشدا لەرۆژئاواوە هەواڵی ناخۆش گەیشتە ریتشارد شێردڵ، چونکە یوحەنای برای هەستابوو بەئەنجامدانی کودەتایەك لەدژی ئەمەش دەیخواست کە بەزوترین کات بگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی، بەلام نەیویست رۆژهەلات بەجێبهێڵێت پێش ئەوەی کێشە ناوخۆییەکانی خاچپەرستان چارەسەر بکاتو لەگەڵ موسوڵمانەکانیشدا لێك تێگەیشتن مۆر بکات هەرچی کێشە ناوخۆییەکانیش بوو ئەوە بەتیرۆرکردنی دی مونتیفرات لەلایەن حەشیشیەکانەوە کۆتایی پێهات لە١٣ی رەبیعی دووەمی سالی ٥٨٨ك/ ٢٨ی نیسانی سالی ١١٩٢زدا[2]، بەم شێوەیەش ریتشارد شێردڵ لەرکابەرێکی سەرسەخت رزگاری بوو و دەستی بەسەر صوردا گرتو هنری دی شامبازی هەڵبژارد بۆ پاشایتی مەملەکەتی بەیتولمەقدیس دوای ئەوەی ئیزابیللای هاوسەری کونرادی مارەکرد کە میراتگری تەختی پاشایەتی بوو[3]، سەبارەت بەکێشەکانیان لەگەڵ لایەنی ئیسلامیدا ئەوە پێویستی بەجۆرێکی تر لەچارەسەر بوو، کەئەویش بوونی هێزو گێرانەوەی بەیتولمەقدیس بوو، ئەوەبوو لە٩ی جەمادی یەکەم/ ٢٣ئایاردا دەستی گرت بەسەر قەلای دارومدا دوای بەرگری کردنە پاسگاکەی بەلام نەیتوانی دەست بگرێت بەسەر مەجدەلو یافادا، بۆیە بەرەو عەسقەلان بەرێکەوتو لەوێوە بەرەو بەیتولمەقدیس هەڵکشاو لە٢٧ی جەمادی یەکەم/ ١١ی حوزەیراندا گەیشتە بەیت النوبە[4]، سەلاحەدینیش خۆی ئامادەکرد بۆ رووبەڕووبوونەوەی و بەرەو بەیتولمەقدیسدا بەرێکەوت.

---

[1] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٥

[2] النوادر السلطانية، ل: ٣١، تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٥

[3] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٥

[4] هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٦

### یازدەیەم: ڕێو شوێنەکانی سەلاحەدین بۆ بەرگریکردن لە قودس:

سەلاحەدین هەستا بەگرتنە بەری چەند ڕێو شوێنێکی کاتی بۆ بەرگریکردن لەو شارە پیرۆزە لەوانە:

١- شوراکانی بەسەر ئەمیرەکانیدا دابەشکردو هەموو پێداویستیەکانی بەرگری بۆ دابین کردن.

٢- سەرچاوەکانی ئاوی لەدەوروبەری قودسدا تێکداو هیچ سەرچاوەیەکی ئاوی خواردنەوەی بەدەوری قودسدا نەهێشت، ئەمەش دوژمن تووشی تینوێتی دەکات ئەگەر ویستی هێرش بکات.

٣- هەموو هێزەکانی لەدەوروبەرەوە بانگهێشت کرد،ئەوە بوو مەلیك الأفضل لەگەڵ سەربازانی ڕۆژهەڵاتو بدرالدین دلدرم یاروقی لەتورکمانو عزالدینی کوڕی موقەدەمدا هاتن[1].

٤- هەستانی سوارە موسوڵمانەکان بەئەنجامدانی هێرشی کتوپڕ بۆ سەر سەربازگەی خاچپەرستەکان[2].

پاشان سەلاحەدین لە١٩ی جەمادی دووەم / سەرەتای تەموزدا کۆبوونەوەیەکی لە بەیتولمەقدیسدا سازداو لەگەڵ فەرماندەکانی سوپاکەیدا بۆ ڕاوێژکردن سەبارەت بەباشترین ڕێگەچارە بۆ بەرگریکردن لەشارەکە لەبەرامبەر هێزی زەبەلاحی خاچپەرستەکاندا، ئەوەبو سوڵتان داوای لەقاضی ئیبن شەداد کرد کە دانیشتنەکە دەست پێبکات ئەویش لەسەرەتای قسەکانیدا باسی فەزڵی جیهادو تێکۆشانی کردو داوای لێکردن کەشوێن پێغەمبەری مەزن (د.خ) بکەونو هەموان قسەکانیان پێ باش بوو، پاشان بێدەنگ بوونو دوای کەمێك سەلاحەدین دەستی بەقسەکردن کردو لەوشتانەش کەباسی کرد: خوێنو سەروماڵی موسوڵمانان لەئەستۆی ئێوەدایە، ئەم دوژمنەش لەناو موسوڵماناندا کەسێك نییە ڕووبەڕووی ببێتەوە جگە لەئێوە، جا ئەگەر ئێوە کەمتەرخەمی بنوێنن وڵاتمان وەك کاغەز دەپێچنەوەو تاوانیش لەگەردنی ئێوەدایە، ئەگەر ئێوەش بەرپەرچیان بدەنەوە ئەوە موسوڵمانان لەناوچەکانی تردا چاو لەئێوە دەکەنو والسلام[3]. ئەوەبوو ئەمیر سەیف الدین مەشطوب هاتە گۆو وتی: گەورەم: ئێمە خزمەتگوزاری تۆین، تۆ گەورەت کردینو نیعمەتی خۆتت پێبەخشینو دەوڵەمەندت کردینو تەنها گەردنمان هەیە ئەویش لەبەر

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٦

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٦

[3] مفرج الكروب (٢/٣٨٦)، الجيش الأيوبي، ل: ٤٨٥.

دەستی تۆدایە، سوێند بەخوا کەسمان پاشەکشە ناکەین تا دەمرین، ئامادەبوانیش بەم قسانەی مەشطوب رازی بوون ئەمەش سوڵتانی دڵخۆش کرد، بەڵام ئەمیرەکان خێرا لەرۆژی دواتردا لەم هەڵوێستەیان پاشگەزبوونەوە وەك ئەبو الهیجاء هەواڵی داوە. ئەوەبوو رایان گەیاند کەهەڵەیە خۆیان لەناو ئەو شارەدا گەمارۆ بدەن،چونکە دەترسن وەك خەڵکی عەککایان بەسەر بێتو بۆیە رووبەروو بوونەوەیان لەدەرەوەی شوراکانی قودسدا پێ باشترەو وتیان: ئەگەر خوای گەورە نوسیبێتی بەسەریاندا سەربکەوین ئەوە پاشماوەی وڵاتەکەیان دەکەوێتە دەستمانەوە، ئەگەر شکستیمان هێنا ئەوە سەربازەکان دەرباز دەبنو قودسیش دەستی بەسەردا دەگیرێت[1]، سەلاحەدینیش بەوەڵامی ئەمیرەکان قەناعەتی نەکرد چونکە مەسەلەی قودس لای ئەو مەسەلەیەکی مەزنەو بەکێوەکانیش هەڵناگیرێت، بەڵام ئەمیرەکان وەڵامێکی توندیان دایەوە کە لەو کاتەوە کە پێشتر باسمان کرد فێربووبوون وادیار بوو ململانێی نێوان سەربازو ئەمیرە کوردو تورکمانەکانی گەشتبووە لوتکەو ئاستێکی مەترسیدار ئەمەش بەقسەکانیاندا دیار بوو کاتێك وتیان: تۆ ئەگەر دەوتەوێت بچینە ناو قودس ئەوە دەبێت لەگەڵماندا بێیت ئەگینا کوردەکان متمانەیان بەتورکەکانو تورکەکانیش متمانەیان بەکوردەکان نییە[2]، لەراستیشدا سەلاحەدین لەبارودۆخێکدا بوو کە ئێرەیی پێنەدەبرا، ئیبن شەدادیش باشی کرد کە کاتێ ئامۆژگاری کرد بەوەی کە کاروباری خۆی بسپێرێت بەپەروەردگارو دان بەدەستەوەسانی خۆی لەبەرامبەر ئەو ئەرکە دابنێ کە گرتوویەتیە ئەستۆو بەڵکو خوای گەورە بەهانایەوە بێت، ئەوە بوو ئیبن شەداد بینی نوێژی دەکردو فرمێسك هۆن هۆن بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوەو دەتکاتەسەر شوێنی کڕنۆش بردنی ن پاشان رۆژی هەینی قودسو دورو درێژ تێپەڕیو پیاوانی هەواڵگری هاتنو رایانگەیاند کەخاچپەرستەکان بڕیاریان داوە هێرشەکەیان بەرەو قودس ڕابگرن[3]، ئیبن الأثیر دەڵێ: ریتشارد داوای لەخاچپەرستە پێشینەکان کرد(گاورەکانی شام) کە بارودۆخی شاری قودسی بۆ باس بکەن، قایمکاریەکانی سەلاحەدینی بخەنە پێش چاو ئەوانیش ئەو کارەیان کرد کاتێ بەتەواوی لەبارودۆخی شارەکە دڵنیا بوو، وتی: ئەمە شارێکە ناتوانرێت گەمارۆ بدرێت هەتاوەکو سەلاحەدین زیندو بێتو موسوڵمانان یەك بن[4]، ئەمەش وای لەخاچپەرستەکان کرد کە ببن بەدوو بەشەوەن

---

[1] مرآة الزمان (٤١٦/٨)، الجیش الأیوبی، ل: ٤٨٥.

[2] النوادر السلطانیة، ل: ٢١٧، الجیش الأیوبی، ل: ٤٨٥

[3] الجیش الأیوبی، ٤٨٦.

[4] الکامل في التأریخ، لە (الجیش الأیوبی) ەوە، ل: ٤٨٢

بەشێکیان کە داوای هێرشکردنە سەر قودسیان دەکردو بەشی دووەمیش کەداوای وەستان‌و دەست هەلگرتنیان دەکرد، ریتشاردیش لەگەڵ دەستەی دووەمدا بوو، بەلام فەرەنسیەکان لەگەڵ رای یەکەمدا بوون‌و وتیان: ئێمە بەهۆی قودسەوە ولاتەکەمان بەجێهێشتووەو بەبێ قودس ناگەڕێینەوە، ریتشاردیش وەلامی دانەوەو وتی: ئەم شوێنە ئاوی تیادا نەماوە لەکوێ ئاو بخۆینەوە؟ وتیان: لەئاوی گوندی نقوع دەخۆینەوە، رۆژی یەکجار ئاو دەخۆینەوە[1]، پاشان خاچپەرستەکان پەنایان برد بۆ بنەمای هەڵبژردن‌و کۆکردنەوەی دەنگ بۆ کارکردن بەڕای زۆرینە، لەئاکامدا ڕای وەستاندنی هێرش زۆرتر بوو هەر بۆیە بەرەو رەملە بەڕێکەوتن[2] و سوڵتانیش بەمە زۆر دڵخۆش بوو[3].

### دوازدەیەم: جەنگی یافا:

جەنگی یافاو ئاکامەکەی بەدوایەمین رووبەڕووبونەوەی دیارو گرنگ لەنێوان موسوڵمانەکان‌و خاچپەرستەکانی شالاوی سێیەمدا دادەنرێت، ئەوە بوو ریتشارد شێردڵ ئەم شارەی کردبوویە بنکەیەك بۆ سوپاکەی پاش سەرکەوتنی بەسەر سەلاحەدین لەئەرسوفدا، ئەمەش بەهۆی نزیکیەوە لە بەیتولمەقدیسدا،[4] لەهەمان کاتیشدا کەدانوستانەکان لەنێوان موسوڵمانەکان‌و خاچپەرستەکاندا بەردەوام بوو بۆ گەیشتن بەرێککەوتننامەیەك، ریتشارد شێردڵ یافای بەجێهێشت‌و بەرەو عەککا بەرێکەوت‌و پلانێکی دانابوو بۆ گەڕانەوە بۆ ولاتەکەی ئەگەر هات‌و دانوستانەکە نەگەشتنە ئاکامێك‌و پلانەکەش بەهەڵکشان بەرەو بەیروت‌و لەوێشەوە گەڕانەوە بۆ ئەوروپا پێك دەهات[5]. ئەم جموجوڵەش هەلێکی بۆ سەلاحەدین رەخساند کە توانی بیقۆزێتەوە بۆ رێکخستنی هەڵمەتێك بۆ سەر یافاو پێدەچێت چوار ئامانجی لەم هێرشە هەبێت:

- ویستویەتی دەستبگرێت بەسەر یافادا لەکاتی ئامادەنەبوونی پاشای ئینگلیزدا.
- بەهیوای بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە بوو لەیافادا.
- هەوڵێك بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سەربازەکانی.
- بۆ رێگرتن لەداگیرکردنی بەیروت لەلایەن ریتشارد شێردڵەوە[6].

---

[1] النوادر، ل: ٢١٧، ٢١٨، الجيش الأيوبى، ٤٨٦

[2] شفاء القلوب، ل: ١٧٥، الجيش الأيوبى، ٤٨٧

[3] الجيش الأيوبى، ٤٨٧

[4] تأريخ الأيوبيين في مصر و بلاد شام والجزيرة، ل: ١٩٩

[5] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٩

[6] تأريخ الأيوبيين، ل: ١٩٩

هەرکە سەلاحەدین لەیافا نزیك بووەوە لە١٥ی رەجەبی ٥٨٨ی ك/ ٢٧ی تەموزی ١١٩٢زدا ئەوە خێرا خاچپەرستەکان نامەیەکیان ئاراستەی ریتشارد شێردڵ کرد کە تیایدا هەواڵی هێرشکردنە سەر یافاویان پیٚ راگەیاند، ئەویش خێرا رێگەی دەریای گرتە بەر بۆ بەدەمەوە چوونی‌و بیزایی‌و جەنەواییە ئیتالییەکانیش کۆمەکیان کردو سوپایەکیشی لەرێی وشکانیەوە نارد، بەڵام بای پێچەوانە (دژەبا) لەنزیك کێوی الکرمل دا هێشتیەوەو سوپای وشکانیش ئامادە نەبوون بچنە یافا پێش گەیشتنی پاشاکەیان، بۆیە هێواش دەڕۆیشتن[1]، ئەم پێشهاتەش هەلێکی باشی بۆ سەلاحەدین رەخساند بۆ ئازادکردنی یافا، ئەوەبوو لە١٨ی رەجەبی / ٣٠ی تەموزدا توانیان بچنە ناو شارەکەوە دوای جەنگێکی توند لەگەڵ پاسگاکەداو پاشان ئابڵوقەی قەڵاکەیان داو خاچپەرستەکان ناچاربوون کەداوای رێککەوتن بکەن، لەو کاتەشدا کەدیاریکرابوو بۆ تەسلیمکردنی قەڵاکە بەموسوڵمانان ریتشارد شێردڵ دابەزیە سەر وشکانی‌و دژە هێرشێکی کردە سەر موسوڵمانەکان‌و توانی بچێتە ناو شارەکەوەو موسوڵمانانی لەشارەکە وەدەر ناو سەلاحەدینیش پاشەکشەی بەسوپاکەی کرد[2]. لەم کاتەشدا نەخۆشی زۆری بۆ ریتشارد هێنابوو بەردەوام بوو لەناردنی نێردراو بۆ داواکردنی میوەو بەفر لەسەلاحەدین، هەروەها بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە ئارەزووی خواردنی قۆخ‌و بەهیٚ دەکرد سەلاحەدینیش بەلێبوردەیی خۆی بۆی دەنارد[3]، هەروەها ریتشارد شێردڵ دووبارە ئاشتەوایی خستە پێش چاوی سەلاحەدین‌و کۆمەلێك هۆکاریش پاڵنەری بوون بۆ لەوانە:

- ئازار زۆری بۆ هێناو نەخۆشی تەنگی پێهەڵچنی‌و تەندروستی بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو خراپی دەرۆیشت ئەمەش وای لێکرد دەستەوەستان ببێت‌و توانای سەرکردایەتیکردنی سوپاکەی‌و پلاندانانی دروستی نەمێنێت.
- چەند هەواڵێکی تری ناخۆشی لە ئینگلتەراوە پێگەیشت کەباسیان لەوە دەکرد کە یوحەنای برای چەند کارێکی خراپی ئەنجامداوەو پێویست بەگەرانەوەی بەپەلەی ریتشارد دەکات.
- نەهاتنی کۆمەکی سەربازی لەئەورووپاوە.
- بێئومێد بوون لەگێرانەوەی بەیتولمەقدیسدا.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٠

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٠

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٠

● ئـەو ماندوو بـوونو شـەکەتییەی کەتووشـی خاچپەرسـتەکان بـوو بـوو و ئـەو بێـزاریو بێمتمانەییـەی کـەهێنری خوشـکەزاو تایەفـە مەسـیحیە ئـاینیو سـەربازییەکان بەرامبـەر بەسیاسەتەکانی دەریان بڕی[1].

سەلاحەدینیش ئاماژەی داوە بەو هۆکارانەی کەپاڵیان پێوە ناوەو بۆ قایـل بـوون بەرێککـەوتن لەوانە:

● ناکۆکی نێوان کوردو تورکەکان لەسوپاکەیدا.

● بێزار بوونی سەربازەکانیو ئاشکراکردنی نەیاریو نارەزایی دەربڕین.

● زیادبوونی هێزی دوژمن.

● ترسی لەروودانی ناکۆکی لەنێوان بنەماڵەکەیدا لەکاتی کۆچی دوایداو وازهێنانیان لەگرنگیدان بەبەرژەوندی گشتی[2].

**سیازدەیەم: گفتوگۆکانو رێککەوتنی ڕەملە:**

گفتوگـۆ لەگـەڵ فرەنجەکانـدا بـۆ مـاوەی ١٥ مـانگ بـەردەوام بـوو چـڵو دوو وەفـد تیایـدا بەشـدارییان کـرد، هەمیـشەش پاشـای ئینگلیزدەستپێـشخەربوو لەداواکردنیـدا[3]، گـرنگترین ئـەو قۆناغانەش کەدانوستانەکان پیایدا تێپەڕ بوون هەتاوەکو سولّحو ئاشتەوایی بریتیبوون لە:

**قۆناغی یەکەم:** پاش دە ڕۆژ لەگەشتنی ریتشاردی پاشای ئینگلیز هەستا بەناردنی نوێنـەرێك بۆ لای سەلاحەدینو مۆڵەتیشی پێدا کەسـەرەتا بـچێتە لای مـەلیك عـادلو لەگـەڵ ئـەودا پێکـەوە چـوونە خزمـەت سـەلاحەدین، کورتـەی نامەکەشـی ئـەوەبو کـە ریتـشاردی پاشـای ئینگلیـز داوای ئەنجامدانی کۆبوونەوە لەگەڵ سەلاحەدیندا دەکاتو سەلاحەدینیش بـەبێ دوولّـی وەلامـی دایـەوەو وتی: پاشاکان پاش ئـاگر بەسـت کۆدەبنـەوە، جـا ئەگـەر ریتـشارد دەیـەوێ لەگـەڵ سـەلاحەدیندا کۆببێتـەوە پێویـستە سـەرەتا ئـاگر بەسـت مـۆر بکـات پـێش کۆبوونـەوەو پێویـستە وەرگێرێکـی باوەڕپێکراو لەنێوان هەردوو لادا هەبێت کە بەباشی لەقسەی هـەردوو لا بگـات، ئەگـەر ئـاگر بەسـت مۆرکرا ئەوە کۆبوونەوە ئەنجام دەدەین. پاشان نێردراوەکـە گەڕایـەوە بـۆ لای ریتـشاردو دووبـارە هاتەوەو ئـەم جـارە لەگـەڵ مـەلیك عـادل قـسەی کـردو رێککـەوتن لەسـەر ئەنجامـدانی کۆبوونـەوە لەنێوان مەلیك عادلو ریتشارد شـێردڵ دا لـەمرج عکـاو بـەئامادەبوونی سـەربازەکانو وەرگێڕەکـە،

---

[1] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠١

[2] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠١

[3] صلاح الدين المفترى عليه ، ل: ٣٢٥

پاشان نێردراوەکە گەڕایەوە، بەڵام بەهۆی نەخۆشییەوە چەند ڕۆژێك دوا کەوت، هەرچەندە ڕاستییەکەی ئەوە بوو کەریتشارد خۆی نەخۆش بوو نەوەك نێردراوەکەی، لەریوایەتێکی تریشدا هاتووە کەفەرماندە خاچپەرستەکان ڕێککەوتنیان لەگەڵ موسوڵمانەکاندا ڕەتکردووەتەوەو وتویانە: ئەمە مەترسیدارە بۆ ئاینی گاوران، پاشان نێردراوەکە دووبارە گەڕایەوەو پۆزشی بۆ دواکەوتنەکەی هێنایەوە بەوەی کە بەهۆی نەخۆشییەوە بووە، لەو شتانەش کە وتی: پاشانکا کە لێك نزیکبوونەوە دەبێ خەڵاتو دیاری بۆ یەکتر بنێرن، هەروەها وتی: دیارییەکی شیاوم پێیە بۆ موسوڵمانانو داوای مۆڵەت دەکەم بۆ گەیاندنی پێی، مەلیك عادلیش ڕازی بوو لەبەرامبەر ناردنی دیاریەك بۆ پاشای ئینگلیز، پاشان نوێنەرەکە وتی: دیارییەکەمان گیانەوەرێکی دەریایە لەدەریاوە بۆمان هێناوە، بەڵام لاواز بووەو واباشە باڵندەو مریشکمان بۆ بێنن هەتاوەکو بەهێز بێتو بۆتانی بێنین، مەلیك عادلیش بەگاڵتەوە وتی: پاشاکەتان پێویستی بەپەلەوەرو مریشك هەیەو دەیەوێ بەبیانوی ئەمەوە بۆی بنێرین، پاشان بۆ چەند ڕۆژێك بێدەنگ بوون، دواتر نێردراوەکە هاتەوەو کەسێکی مەغریبی موسوڵمانی هێنابوو کەخاچپەرستەکان ماوەیەکی زۆر بوو دیلیان کردبوو وەك دیارییەك بۆ سوڵتان ئەویش دیارییەکەی وەرگرتو ئازادی کردو بەرێزەوە نێردراوەکەی بەرێخست[1].

مێژوونووس ئیبن شەدادیش ئەو هۆکارانەی ئاشکرا کردووە کە لەپشت ئاڵوگۆڕکردنی نێردراوەکانەوە بووە دەڵێ: مەبەستی خاچپەرستەکان لەناردنی ئەو نامانە زانینی بەهێزیو لاوازی دەروونی موسوڵمانەکان بوو، مەبەستی موسوڵمانەکانیش لەوەرگرتنی نامەکان زانینی هەمان شت بوو لای خاچپەرستەکان[2].

**قۆناغی دووەم:** لە٩ی جەمادی دووەمی ساڵی ٥٨٧/ ٤ی یۆلیۆی ١١٩١ز داو لەکاتی هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوان موسوڵمانەکانو خاچپەرستەکاندا لەعەککاو کاتێ کە پاسگا ئیسلامییەکەی عەککا بڕیاری دا واز لەجەنگو کوشتار بێنێتو ئەمەشیان بەنامەیەك بۆ ریتشارد ناردو ئەویش ئەمەی ڕەتکردەوە، بەڵام لەهەمان ڕۆژدا سێ نێردراوی نارد بۆ لای سەڵاحەدین بۆ داوای میوەو بەفر، نێردراوەکانیش باسی ئەوەیان کرد کە پێشەنگو فەرماندەی ئسبتاریە سبەینێ دێت بۆ قسەکردن لەبارەی ڕێککەوتنەوە هەروەها سەڵاحەدین ڕێزی لەنێردراوەکاندا سەردانی بازاڕی سەربازەکانی پێکردنو لەهەمانرۆژیشدا گەڕانەوە سەربازگەکەی خۆیان، پاش ئەوەش شاری عەککا ڕادەستی خاچپەرستەکان کراو سەڵاحەدینیش پێشوازی لەنێردراوەکان کرد بۆمەسەلەی

---

[1] تأريخ الحروب الصليبة، محمود سعيد عمران، ل: ١٧٥.

[2] تأريخ الحروب الصليبة، محمود سعيد عمران، ل: ١٧٥.

بەبەدەستەوەدانی عەککا، ئەمەش لایەنێکە تەنها پەیوەندی بەشاری عەککاوە هەیە، وەك پێشتر روونمان کردەوەو پەیوەندی بەناوەڕۆکی مەسەلەی ئاشتەوایی گشتییەوە نییە کەلەم لاپەڕانەدا تاوتوێ دەکەین[1]. لاپەڕە ٩٤٣ نیە واتە پەڕەك بەو ناوەوە نیە.

**قۆناغی سێیەم:** قۆناغی سێیەمی گفتوگۆکانیش، لەقۆناغی پێش جەنگی ئەرسوفدا بوو، ئەوەبوو لەیازدەی شەعبانی ٥٨٧ك/ سێی سێپتەمبەری ١١٩١زدا چەند نێردراوێك لەلایەنی خاچپەرستەکانەوە هاتنو داوای قسەکردنیان لەگەڵ مەلیك عادل کردو، رێیان پێدراو ئاکامی قسەکانیش ئەوەبوو کە: جەنگ درێژەی کێشاوەو لەهەردو لا چەندین پاڵەوانکوژراوە، ئێمەش بۆ سەرخستنی فرەنجەکانی کەنار دەریا هاتووینو جا ئێوە لەگەڵ ئەواندا رێك بکەونو باهەریەکەمان بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی، سەلاحەدینیش بەناوەڕۆکی قسەکانی نێردراوەکانی زانیو نامەیەکی نووسی بۆ مەلیك عادلی برایو داوای لێکرد کەدرێژە بدات بەگفتوگۆکان لەگەڵ ریتشارددا هەتاوەکو کۆمەکی بەموسوڵمانەکان دەگات. ئەوەبوو رۆژی دواتر مەلیك عادل لەگەڵ پاشا ریتشارد شێردڵ دا کۆبوویەوەو هیمفری سید تبنین وەرگێڕی نێوانیان بوو، مەلیك عادل پرسیاری لەریتشارد کرد دەربارەی مەرجەکانی بۆ ئاشتەوایی، ئەویش وتی:" هەموو ناوچەکانمان بۆ بگێڕنەوەو بچنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، ئەمەش گەڕانەوە بۆ پێش جەنگی حطین دەگەیەنێت، مەلیك عادلیش ئەم جۆرە مەرجانەی قبوڵ نەکردو بەتوندی وەڵامی پاشای ئینگلیزی دایەوە، چەند قسەیەك چوو بەبەینیاندا کە پێویستی کرد پاشای ئینگلیز و هاوەڵانی شوێنەکە بەجێبهێڵن، پاشان جەنگی ئەرسوف روویدا کەتیایدا هێزە خاچپەرستەکان سەرکەوتن هەرچەندە سەرکەوتنەکەیان یەکلاکەرەوە نەبوو، پاش هەشت رۆژ لەکاتی مانەوەی خاچپەرستەکان لەیافادا بەسەرکردایەتی ریتشاردو هەستانی سەلاحەدین بەرووخاندنی شاری عەسقەلان، لەنۆزدەیەمی شەعبانی ساڵی ٥٨٧ك/ یازدەی سێپتەمبەری ١١٩١زدا کەسانێك لەلایەن مەلیك عادلەوە گەشتنە لای سەلاحەدینو ئاگاداریان کردەوە لەوەی کەخاچپەرستەکان لەگەڵ مەلیك عادلدا دەربارەی سوڵحو رێککەوتن قسەیانکردووەو مەرجەکانیشیان بریتییە لەگێڕانەوەی ناوچەکانی کەنار دەریا، سەلاحەدینیش داوای لە عادلی برای کرد کەدەرگای گفتوگۆ بکاتەوە بەهۆی ئەو بێزارییەی لەریزی موسوڵمانەکاندا بەدیدەکرد، هەروەها داوای درێژکردنەوەی ماوەی دانوستانەکانی لێکرد هەتاوەکو بەتەواوی عەسقەلان دەڕوخێنێت.

---

[1] تأريخ الحروب الصليبية، ل: ١٧٧

لەچەند رۆژی دوایشدا روداوێك roویدا کە گرنگی خۆی هەبوو لەمێژووی شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستیدا، ئەوەبوو لەدوازدەی رەمەزانی ساڵی ٥٨٧ك/ سێیەمی ئۆکتۆبەردا نێردراوەکانی کونراد سەرچاوە عەرەبیەکان بە مەرکیز ناویان دەبەن گەشتنە لای سەلاحەدین، دیارە کونراد هەستی کردبوو کەخاچپەرستەکان دەیانەوێ دەست بەسەر صوردا بگرن، بۆیە خۆی لەهێزە خاچپەرستەکان جیاکردەوەو ناردی بۆ لای سەلاحەدینو داوای سوڵحی کرد لەبەرامبەر دەست هەلگرتن لەصیداو بەیروت بۆی، لەبەرامبەریشدا ئەو هەڵدەستێت بەراگەیاندنی دوژمنایەتی خۆی بۆ ریتشاردو بەهێزەکانیەوە گەمارۆی عەککا دەداتو دەستی بەسەردا دەگرێت ئاشکراشە کە کونراد زۆر ناپاكو خیانەتکار بوو، بۆیە سەلاحەدین ویستی لەنیەتپاکی دڵنیا ببێت ئەوە بوو لەسەرەتادا داوای گەمارۆدانی عەککاو دەست بەسەراگرتنی لێکرد، پاشان ئازادکردنی دیلە موسوڵمانەکان لەعەککاو صوردا پاشان سەلاحەدین عەککاو صوری بدات بەدەستەوە، لەئێوارەی هەمان رۆژیشدا نێردراوەکانی پاشا ریتشارد هاتنەوە بۆ گفتوگۆکردنی دووبارە دەربارەی مەسەلەی سوڵح هەروەها ریتشارد بەناردنی باڵوێزی کونرادی زانی بۆ لای سەلاحەدینو گەڕایەوە بۆ عەککا بۆ هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی رێککەوتن کە کونراد هەوڵی بۆ دەداو کارکردن لەپێناو گێڕانەوەی کونراد بۆ ریزی خاچپەرستەکان، گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم رووداوە سەلاحەدینی لەرادەی ئەو دووبەرەکییە ئاگادار کردەوە کەکەوتووەتە ریزی خاچپەرستەکان بەتایبەت لەنێوان خاچپەرستەکانی ناوچەکەو ئەوانەی کە لەئەوروپاوە هاتبوون، هەروەها ریتشارد درەکی بەوە کرد کەئەوەی کە کونراد کردوویەتی گورزێکەو ئاراستەی ئەو شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی کراوە کەباجی زۆری داوە لەپێناوبەرگریکردن لەخاچپەرستانی ناوچەکە، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر رێڕەوی گفتوگۆکانو مەرجەکانی لەقۆناغەکانی داهاتوودا[١].

**قۆناغی چوارەم:** لەبیستو چواری رەمەزانی ساڵی ٥٨٧ز / پازدەی ئۆکتۆبەری ١١٩١زدا نێردراوێك لەلایەن پاشای ئینگلیزەوە بەئەسپێکەوە کەدیاری بوو بۆ مەلیك عادل لەبەرامبەر دیارییەکدا کە پێشتر مەلیك عادل ناردبووی بەرێکەوت، ئەمەش پێشەکییەك بوو بۆ قۆناغی چوارەمی گفتوگۆکان، دوای دوو رۆژیش ریتشارد بەنێردراوێکدا داوای لەمەلیك عادل کرد کە نوێنەری بنێرێت بۆ قسەکردن دەربارەی سوڵح، مەلیك عادلیش بەدەم داواکەیەوە چوو نوێنەرێکی نارد لەگەڵ ریتشارددا کۆبووەوە، ریتشاردیش لەکۆبوونەوەکەدا وتی: موسوڵمانو خاچپەرستەکان تیا چوونو وڵاتیان وێران بوو لەدەست هەردوو لا دەرچوو سەرو ماڵی هەردوو لا تیا چوو، ئەم

---

[١] تأريخ الحروب الصليبية، ل: ١٧٧.

مەسەلەیە حەقی خۆی پێدراوو هەمیشە باسی قودس‌و خاچ‌و قودسە، سەبارەت بەقودس ئەوە ئێمە هەرگیز دەست بەرداری نابین هەتاوەکو یەکێکمان لەژیاندا مابێت چونکە رووگەو پەرستگامانە، بۆ ناوچەکانی تریش ئەوە ئێمە رۆژئاوای روباری ئوردنمان دەوێت، خاچەکەش دارێکەو لای ئێوە هیچ نرخێکی نییە، بەلاَم لای ئێمە بەنرخەو باسولّتان بیبەخشێتەوە پێمان‌و هەردوو لا رێکبکەوین‌و لەممەینەتیەە بەردەوامە رزگارمان ببێت‌و پشوو بدەین.

کاتێ داواکارییەکانی ریتشارد بەمەلیك عادل گەشت، هەستا بەئاگادارکردنەوەی سەلاحەدین ئەمیش لەوەلاّمە پاشای ئینگلیزدا وتی: قودس وەك چۆن موڵکی ئێوەیە موڵکی ئێمەشەو لای ئێمە گەورەترە هەتاوەکو لای ئێوە، چونکەشوێنی شەو رەوی پێغەمبەرو جێی کۆبوونەوەی فریشتەکانە، جانابێ چاوەڕێی ئەوە بکرێت کەدەستی لێهەڵبگرین‌و هەرگیز ناشوێرین قسەی وا لەناو موسولّماناندا بکەین، هەرچی ولاّتەکەشە ئەوە لەبنەرەتدا موڵکی ئێمەیەو دەست بەسەراگرتنی لەلایەن ئێوەوە شتێکی کاتی بوو بەهۆی لاوازی موسولّمانەکانەوە لەو کاتەدا، سەبارەت بەخاچەکەش ئەوە لەناوبردنی خێرێکی گەورەی تیادایە بەلای ئێمەوە نابێت کەمتەرخەمی تیادا بکەین مەگەر لەبەرامبەربەرژەوەندییەکی گەورەتردا[1]، دوای سێ رۆژیش پاشا ریتشارد لەیافاوە بەچەند پێشنیارێکەوە گەڕایەوە، کورتەی ئەم پێشنیارەش ئەوەبوو مەلیك عادل لەگەڵ شازادە جواناى پاشای پێشوی صقلّیەو خوشکی ریتشارددا هاوسەرگیری بکات، هەردوولا لەقودسدا جێنشین بن‌و ریتشاردیش ناوچەکانی کەنار دەریای بخاتە ژێر دەسەلاّتیان وەك یافاو عەککاو عەسقەلان‌و....تدو بیکات بەپاشای کەنار دەریا سەلاحەدینیش ناوچەکانی کەنار دەریا رادەستی مەلیك عادل بکات‌و بیکات بەپاشای کەنار دەریا ئەمە جگە لەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەلاّتیدان، هەروەها خاچی صلبوت بداتەوە بەریتشاردو گوندەکانیش بگێڕێتەوە بۆ داویەو ئسبتاریەکان‌و قەلاّو شوراکانیشیان بۆ هەردوو لایان بێت، پاشان هەردوو لا دیلەکانیان ئاڵوگۆڕبکەن‌و ریتشارد بچێتەوە بۆ ولاّتی خۆی، کاتێ ئەم پێشنیارانە بەدەست سەلاحەدین گەیشت خێرا پێی رازی بوو چونکە دەیزانی کەئەو مەرجانە بەریتشارد جێبەجێناکرێت‌و ئەمە تەنها فێڵ‌و ساختەیە، کاتێ جواناش بەپێشنیاری براکەی زانی توورِ بووو سوێندی بەئاینەکەی خوارد کەئەو کارە نەکات، هەر بۆیە ریتشارد پێشنیاری بەگاوربوونی بۆ عادل کردو ئەویش ئەم کارەی رەتکردەوەو دەرگای دانوستانی بەکراوەیی هێشتەوە[2].

---

[1] تأريخ الحروب الصليبية، ل: ١٧٨، كتاب الروضتين، (٢/٢٨٦)

[2] تأريخ الحروب الصليبية، ل: ١٧٩.

**قۆناغی پێنجەم:** قۆناغی پێنجەمی گفتوگۆکان بەدوو هێڵی تەریب بەڕێوە دەچوو، هێڵی یەکەم پەیوەندی بەدانووستان لەگەڵ نوێنەری کونراددا هەبوو، هێڵی دووەمیش پەیوەندی بەدانوستان لەگەڵ پاشای ئینگلیزی ریتشاردەوە هەبوو، ئەم قۆناغەش لە١٥ی شەوالی ٥٨٧ك/ پێنجەمی نۆڤەمبەری ساڵی١١٩١زدا دەستی پێکرد کاتێ کەریناڵد جارنیەی فەرمانڕەوای صەیدا وەك نوێنەری کونراد گەیشتە لای سەلاحەدین، لەدەقە مێژووییەکانیشەوە بۆمان دەردەکەوێت کەدانوستانەکان لەگەڵ کونراددا رانەگیراوەو موسوڵمانەکان بەباشی مامەڵەیان لەگەڵ نوێنەرەکەیدا کرد هەتاوەکو چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەلاحەدیندا دەست پێدەکات، پاش چوار ڕۆژ سەلاحەدین پێشوازی کرد لەریناڵد جارنیەو رێزێکی زۆری لێنا، سەرچاوە ئیسلامییەکانیش کونراد بەسەرسەختترینو بەهێزترین فەرماندەی خاچپەرست دەزانن‌و پێشنیارەکەی کونرادیش خۆی لەدەست هەڵگرتنی موسوڵمان لەصیدادا دەبینیەوەو لەبەرامبەر بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ موسوڵمانەکاندا دژ بەهێزەکانی شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی‌و ئاشکراکردنی دژایەتی خۆی بۆیان، سەلاحەدینیش گوێی بۆ ئەم پێشنیارانە گرت لەنوێنەری کونرادەوەو بەڵێنی پێدا کەدواتر وەڵامی بداتەوە، لەهەمان ڕۆژدا همفری سید تبنینی نوێنەری پاشای ئینگلیزی ریتشارد گەشتە بەرەوەو سەلاحەدینیش پێشوازی لێکردو پێشنیارەکانی پێشکەش کرد، شایانی باسە بەدرێژایی ئەم دانوستانانەش جەنگ هەر بەدەوام بوو لەچواری رەبیعی یەکەمی ٥٥٨ك/ بیستی مارسی ١١٩٢ز دا مەلیك عادل قودسی بەجێهێشت بەپێشنیارێکی دیاریکراوی سوڵحەوە کە تیایدا هاتبوو خاچپەرستەکان دەتوانن شاری بەیروت بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە بەمەرجێك کە بەوێرانی بمێنێتەوەو ئاوەدان نەکرێتەوە، هەروەها شوێنەکانی تریش‌و خاچی صلبوتیشیان پێدەدرێتەوەو قەشەیەکی فەرەنجیش دیاری بکرێت بۆ کڵێسای قیامەو دەروازەکانی قودس بۆ خاچپەرستەکان واڵابکرێت بۆ سەردان بەمەرجێ چەکیان پێنەبێت[1]، پاڵنەری ئەم پێشنیارەش نوێیانەش ئەو ماندوو بوونە زۆرو دووری وڵات‌و قەرزاریە بوو کەموسوڵمانەکان بەدەستیەوە دەیانناڵاند، هەروەها ئارەزووی پاشا ریتشارد بۆ رێککەوتن‌و گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی زیادی کرد کاتێك نێردراوێك گەیشتە سەربازگەکەی‌و ئاگاداری کردەوە کە ئەمیر یوحەنای برای بەنیازی گرتنە دەستی دەسەڵات‌و دەستگرتنە بەسەر ئینگلتەراداو بەناوی گەورە وەزیرانی ئینگلتەروە بانگهێشتی دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ ئینگلتەرادا، ئەم هەواڵانەش ریتشاردیان نیگەران کرد، ئەمە جگە لەوەی کە لەنزیکەی بیستی مارسی ١١٩٢ز/ چوارەمی رەبیعی یەکەمی ٥٨٨ك دا هیوی دۆقی برجاندیا

[1] تأريخ الحروب الصليبية، ل: ١٨١.

کەسەرپەرشتی پاشماوەی سوپای فەرەنسی دەکرد هەستا بەپاشەکشە پێکردنی سوپاکەی لەسەربازگەکەی ریتشاردەوە بەبیانووی ئەوەی کەپاشا ئازوقەی پێویستیان بۆ دابین ناکات، لەمانگی دواتریشدا کونراد تیرۆرکرا وەك پێشتر باسمان کردو قۆناغێکی نوێ لەدانوستان دەستی پێکرد لەبارودۆخێکی جیاوازدا بەهۆی نەمانی کونراد لەسەر شانۆی سیاسەتی خاچپەرستەی‌و تێکچوونی بارودۆخی ئینگلنەرا کەوای دەخواست پاشای ئینگلیزی کۆتایی بەجەنگ بێنێت‌و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی[1].

**قۆناغی شەشەم:** قۆناغی شەشەم‌و کۆتای داوستانەکان درێژخایەن‌و ئاڵۆز بوبوو نزیکەی پێنج مانگی خایاند[2]، لە٢٢ی شەعبانی ساڵی ٥٨٨ك/ ٢ی ئەیلوولی ١١٩٢زدا نوێنەرەکانی سەلاحەدین دوا پێشنیاریان بردو ریتشاردیش واژۆی کردو نوێنەرەکان ناوی خۆیان لەتەنیشت ناوی ئەوەوە لەرێککەوتننامەکەدا جێگیر کرد کە برگەکانی پێکهاتبوو لە:

- ناوچە کەناریەکان لەصورەوە لەباکور هەتاوەکو یافا لەباشورەوە بەقیساریەو حەیفاو ئەرسوفیشەوە دەدرێت بەخاچپەرستەکان.
- عەسقەلان بەدەست موسوڵمانەکانەوە دەبێت بەمەرجێ بروخێندرێت.
- ناوچەکانی اللدو رەملە لەنێوان هەردوو لادا دابەش دەکرێت.
- خاچپەرستەکان مافی خۆیانە ئازادانە سەردانی قودس بکەن.
- موسوڵمان‌و خاچپەرستان مافیان هەیە هەریەکەیان بچنە ناو خاکی ئەوی تریانەوە.
- ماوەی ئەم رێکەوتنە سێ ساڵ‌و سێ مانگە

هەروەها سەلاحەدین بەمەرجی دانابوو کەناوچەی حەشیشیەکان بکەوێتە چوار چێوەی سوڵحەوە بەمانای ئەوەی کەئەو ناوچانەی کەئەوان دەستیان بەسەردا گرتووە بەبەشێك لەو ناوچە ئیسلامیانە دادەنرێت کە رێککەوتننامە دەیانگرێتەوە، لەبەرامبەریشدا ریتشارد شێردڵ بەمەرجی دانا کەفەرمانڕەوای ئەنطاکیەو طرابلوس[3] بێنە ناو رێککەوتنەکەوە کاتێ کە رێککەوتنەکە جێبەجێکرا، جەنگاوەرە موسوڵمانەکان لەگەڵ خاچپەرستەکاندا تێکەڵبوون‌و کۆمەڵێ لەموسوڵمانەکان بۆ بازرگانی بەرەو یافا بەرێککەوتن، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەخاچپەرستەکان بۆ حەج کردن روویان کردە قودس‌و سەلاحەدینیش داوای لەسەربازەکانی کرد کە بیانپارێزن

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٢

[2] هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٢

[3] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠٢، الدبلوماسية الإسلامية، ل: ٣٩٤.

...اوەکو مەراسیمی حەج ئەنجام دەدەن‌و دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان[١]. دەرئەنجامەکانی شاڵاوی ...یەمی خاچپەرستی‌و گرنگترین ڕووداوەکانی پێش کۆچی دوایی سەلاحەدین:

- بەگەڕانەوەی ڕیتشارد شێردڵ بۆ وڵاتەکەی، شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی بەکۆتا گەیشت‌و جارێکی تر کۆمەڵێ ئەمیرو پاشای لەم شێوە ڕوو ناکەنە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، هەرچەندە ئەورووپای ڕۆژئاوایی لەو کارەدا یەکی گرتبوو هەڵمەتێکی گەورەی پێکەوە نابوو، بەڵام ئەو دەرئەنجامانەی کەدەستی کەوت زۆر کەم بوون، ئەوەش کەڕوویدا لەئازادکردنی صوردا لەسەر دەستی کونراد دی مونتیفرات‌و بەدەمەوەچوونی طرابلوس لەلایەن کەشتیگەلی صقلیەوە ئەوە پێش گەیشتنی شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی بوو، تەواوی ئەو کارانەش کەئەوان تیایدا بەشدار بوون لەدەستگرتن بەسەر عەککاو شارە کەنارییەکان تا یافا تێپەڕ نەدەبوو جگە لەدوورگەی قوبرس، بەڵام یەك ئامانجیان بەدیهێنا کەئەویش کۆتایهێنان بوو بەئازاد سازییەکانی سەلاحەدین[٢].
- مێژوونووسان شاڵاوی سێیەمی خاچپەرستی بەیەکێك لەهەڵمەتە شکستخواردووەکان لەقەڵەم دەدەن لەمێژووی جەنگەکانی خاچپەرستیدا، چونکە ئەو ئەنجامانەی کەتێیدا بەدیهاتن گونجاو نین لەگەڵ ئەو هەوڵە زۆرو زەبەندەی کەبۆی درا ئەمە جگە لەوەی کە نەیتوانی ئەو ئامانجە بپێکێت کە لەپێناویدا هاتبوون کەبریتی بوو لەسەندنەوەی بەیتولمەقدیسدا لەدەست موسوڵمانەکان.
- ئەو بارودۆخە سیاسی‌و سەربازییەی کەئەم شاڵاوەی پیادا تێپەڕ بوو ڕۆڵی هەبوو لە ئەو کۆتاییە شکستخواردووەدا، چونکە لەتوانای هیچ سوپایەکدا نیە کەسەرکردایەتیەکی یەکگرتووی نەبێت‌و ناکۆکی پەرتەوازی کردبێت‌و لەزەوی بێگانەدا جەنگابێ کەسەرکەوتن بەسەر سوپایەکدا بەدەست بێنێت کە یەکریزو یەك ئامانج کۆی کردبنەوەو لەژێر سایەی یەك سەرکردەی وەك سەلاحەدیندا جەنگابن.
- ٤- هینانی ناکۆکیە سیاسیەکانی نێوان پاشای فەرەنساو ئینگلتەرا بۆ ڕۆژهەڵات هەرچەندە بەرواڵەت لەسەرچاوپۆشی کردن‌ووەلاوەنانی لێی ڕێککەوتبوون پێش ئەوەی لەئەورووپاوە بەرێبکەون.

---

[١] صلاح الدين والصليبيون، ل: ٢٨٠

[٢] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠٤.

٥- جیاوازی مۆرکی روحی شاڵاوەکە، چونکە پاپا رۆڵێکی گەورەی تیادا نەدەبینی وەك لەشاڵاوی یەکەمدا بەدیدەکراو مۆرکێکی سیاسی بەسەریدا زاڵ بوو بەهۆی ئەو باکگراوندە جیاوازو دژ بەیەکانەی کە هەڵی گرتبوو[1].

٦- خۆڕاگری و یەکڕیزی بەرەی ئیسلامی پاش نەمانی ململانێی ئاینی و سیاسییەکان ئەمە سەرباری پاشەکشە کردنی هێزی موسوڵمانەکان بەهۆی ماندووبوونەوە، چونکە دەبوایە هێزە ئیسلامیەکان بەبەردەوانی لەهێرش کردن و کردەی سەربازیدا بوونایە بەدرێژایی سێ ساڵ و لەبارودۆخێکی نائاساییدا، ئەمە سەرباری ئەوەی کەسەلاحەدین توانی هەموو ناکۆکی و ناڕەزاییەکانیان بەشێوەیەکی ژیرانە چارەسەر بکات بۆ نموونە ئەو ناکۆکیەی کە لەنێوان کوردو تورکمانەکانی ناو سوپاکەیدا روویدا[2]، ئەگەر رەحمی خواو پاشان سەرکردایەتی سەلاحەدین نەبوایە ئەوە زیانەکان زۆرو چاوەڕوان نەکراو دەبوون، بەلام سەرکردایەتی بەهێزی سەلاحەدین و خۆڕاگری موسوڵمانەکان لەبەرامبەر ئەم هەڵمەتە درندانەیەدا پاشاکانی ئەوروپای شڵەژاندو پلانەکانیانی شکست پێهێناو نەیانتوانی بیتولموقەدەس بگێڕنەوە، ئەمەش بەسەرکەوتنێکیی مەزن دادەنرێت بۆ سەلاحەدین سەرباری ئەو زیانانەی کە لەموسوڵمانان کەوت.

٧- ئەم شاڵاوە بەوە ناسرا بوو کەتێگەیشتنێکی زۆری لەگەڵ موسوڵمانەکاندا لێکەوتەوەو هەردوو لا پەیوەندی توندوتۆڵیان پێکەوە هەبوو، بەڵکو لەمەش تێپەڕیوو بۆ پێشنیارکردنی پرۆژەی رێککەوتن و ناردنی میوەو بەفر بۆ ریتشارد شێردڵ لەکاتی نەخۆشییەکەیداو ناردنی پزیشکی تایبەتی سەلاحەدین بۆ چارەسەرکردنی[3]. ئەم تێکەڵاوییەش چەند سودێکی هەبوو بۆ فرەنجەکان لەوانە:

أ- زۆر زانست و زانیاریان لەموسوڵمانەکانەوە گواستەوە کە لەو کاتەدا بڵاو بوو لەنێوانیانداو چەندین کتێبیان دانا کە نوێگەری و ئەو زانستانەیزۆرو دانانی یاسای بۆئەو زانستانە لەخۆگرتبوو[4].

---

[1] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠٥.

[2] تأريخ الأيوبيين، ل: ٢٠٥.

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٥، الفتوح الأسلامية عبر التأريخ، ل: ٢٩٩.

[4] أسباب الضعف في الأمة الأسلامية، ل:٢١٨

ب- چەندین پیشەسازیو هونەریان گواستەوە وەك پیشەسازی چنینو بۆیاخکردنو بەندەر سازیو کانزاکانو شوشەسازیو هەروەها هونەری بیناسازییان گواستەوەو ئەم گواستنەوەیەش کاریگەری قوڵی هەبوو لەسەر ژیانی پیشەسازیو بازرگانیو هونەری ئەوروپا، گۆستاف لۆبۆن دەڵێ: لەموسوڵمانەکانەوە ئەوروپیەکان هونەری چنینی ئاوریشمو بۆیاخکردنی پڕ وردەکاریان وەرگرتو.... زۆریی نەخایاند هونەری بیناسازی لەئەوروپادا بەتەواوی گۆڕا[1].

ج- کاریگەر بوونی شارستانی رۆژئاوا بەشارستانی ئیسلامی بەشێوەیەك کە بووە هۆی گەشەکردنو بوژانەوەی شارستانی رۆژئاوا، ئەگەر جەنگەکانی خاچپەرستیش نەبوایە ئەوە گەشەی شارستانی خۆرئاوا بۆ ماوەیەکی دورو درێژ دوادەکەوت، رۆژهەلاتناسە دادگەرەکانیش دانیان بەم راستیەدا ناوە پێش ئەوەی مێژوونووسە موسوڵمانەکان باسی بکەن[2].

لۆبۆن دەڵێ بەلام ئەگەر سەیری ئەو دەرئەنجامە دورانە بکەین کە لەجەنگەکانی خاچپەرستی کەوتنەوە، ئەوەگرنگی ئەو دەرئەنجامانەمان بۆ دەردەکەوێت، لەراستیدا پەیوەندی رۆژئاوا بەرۆژهەلاتەوە بەدرێژایی دوو سەدە واتە ماوەی مانەوەی خاچپەرستان لەولاتانی ئیسلامیدا گرنگترین هۆکار بوو بۆ گەشەکردنی شارستانی ئەوروپا، بەم پێیەش جەنگەکانی خاچپەرستی چەند دەرئەنجامێکی لێکەوتووەتەوە جیا لەوانەی کەخۆی مەبەستی بووە، دیارە رۆژهەلات شارستانیەکی پێشکەوتووی هەبوو بەهۆی موسوڵمانەکانەوە، بەلام رۆژئاوا لەو کاتەدا لەدەریای دواکەوتوییو درندەیدا نقوم بووبوو[3]. ئەمەبوو کە ئەوروپا لەجەنگە خاچپەرستیەکانەوە دەستی کەوت، جانەگەرچی زیانی زۆرو شکستی کوشندەی تووش بوو نەیتوانی بدیبینێیت ئەو مەبەستەشی بەدینەهێنابێت کە لەپێناویدا هاتبوو کە ئەویش گێڕانەوەی بەیتولمەقدیسدا بوو، بەلام توانی دەستکەوتی زۆر بەدەست بێنێت کە ئەوروپای بوژاندەوەو بەخێرایی شارستانی پێگەیاند[4]. سەبارەت بەموسوڵمانەکانیش ئەوە خاچپەرستەکان هیچ شتێکیان نەبوو کە ئەمان سودی لێببینن، چونکە ئەوان لەرەفتاریاندا وەك گیانلەبەری درندە وابوونو دۆستو دوژمنیان تالان دەکردو

---

[1] حضارة العرب، ترجمة عادل زعيتر، ل: ٣٣٧،٣٣٦.

[2] أسباب الضعف في الأمة الأسلامية، ل:٢١٩

[3] حضارة العرب، ل: ٢٢٣-٢٢٤.

[4] أسباب الضعف في الأمة الأسلامية، ل:٢١٩.

پێکەوە سەریان دەبڕین[1]، ئۆسقیفی عەککاش جاك دوفیتری وەسفی داگیرکەران دەکات دەڵێ: لەبەرەی جەنگدا تەنها بێ باوەڕو ملهوڕو دزو زیناکەرو پیاو کوژو خیانەتکارو قەشەی بەدرەوشتو ژنە گاورە بەد ڕەوشتەکانیان تیادا دەبینرا[2]. هەروەها لەگەڵ شاڵاوەکەدا سسوپای بەدرەوشتەکان هەبوون کە بەتایبەت بۆ رابواردنی جەنگاوەرەکان هێنرا بوونو تەنها بۆ خاچپەرستەکانیش نەبوو بەڵکو کەسە خراپەکارو بەدڕەشتەکانی ناو موسوڵمانەکانیشی دەگرتەوە[3]، ئیبن کەثیر دەڵێ: کۆمەکی فرەنجەکان لەدەریاوە دەهاتو ئافرەتەکانیان بەنیەتی کوشتارو هەندێکیان بەنیازی رابواردنی جەنگاوەرەکان دەهاتن هەتاوەکو لەغەریبیدا هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەنو خزمەتو پشودانو هاوسەرگیریان دەست بکەوێت، چونکە ئەگەر ئەمەیان دەست بکەوێت ئەوە خۆڕاگری دەنوێنن لەجەنگو غەریبیدا، تەنانەت زۆرێك لەخەڵکانی خراپەکاری ناو موسوڵمانەکانیش پشتگیریان دەکردن بەهۆی ئەو ژنانەوەو ئەمەش بڵاو بوویەوە[4]، مێژونوس ئەبو شامەش باسی ئەوە دەکات کە لەکاتی گەمارۆدانی عەککادا لەلایەن خاچپەرستانەوە: کەشتیەك گەیشتە بەرەوە کە سێ سەد ئافرەتی فرەنجی جوانی تیادا بوو لەدوورگەکانی ناو دەریاوە هاتبوون بۆ رابواردنی سوپای بێگانە، خۆیان تەرخانکردبوو بۆ گەنجەکانو ئەم کارەشیان بەخێرێکی گەورە دەزانی چونکە ئەوان بەتەنگو هانای لاوو کەسانی غەریبەوە دەچن[5]، هەروەها دەڵێ: ژنانیش هاتن بۆ بەشداریکردن لەشاڵاوی خاچپەرستیداو هەندێکیان زرێپۆشیان لەبەرکردبوو هەتاوەکو خۆیان لەجەنگەکاندا بەشدار بن چونکە ئەو کارەیان بەپەرستش دەزانی[6]، هەندێکیشیان خۆیان تەرخانکردبوو بۆ رابواردنو تێرکردنی ئارەزووی جەنگاوەرەکان بۆ رێگرتن لەبێزارییو ماندووبوونیان[7].

٨- تێگەیشتن بۆبەرژەوەندیو زیانەکان: سوڵحی رەملە بەهۆی چەند بارودۆخێکی سیاسیو سەربازیەوە بوو کە سەلاحەدینی ناچارکرد پێی رازی بێت، هەرچەندە دەیزانی کە هەڵوێستی فرەنجەکان لاوازە، چونکە راوێژکارانی پێیان وابوو کە گەڕانەوەی هێزە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٠.

[2] أسباب الضعف في الأمة الأسلامية، ل: ٢٢٢

[3] أسباب الضعف في الأمة الأسلامية، ل: ٢٢٢

[4] البداية والنهاية لە: أسباب الضعف فى الأمة، ل٢٢٢.

[5] كتاب الروضتين(١٤٩/٢)، الجهادو التجديد، ل:٢٨١

[6] الجهادو التجديد، ل:٢٨١

[7] الجهادو التجديد، ل:٢٨١.

فرەنجەکان بۆ وڵاتەکانیان لەبەرژەوەندی ئەوانەو مانەوەشیان دەبێتە هۆی هاتنی هێزی ئەورووپی زیاتر کە زیانبەخشە بۆ سەربازگەی ئیسلامی[1]، ئەگەر سەرنجی مێژووی ئەو رێککەوتننامەو ئاگر بەستانە بدەین کەموسوڵمانەکان لەگەڵ خاچپەرستەکاندا بەمۆریانکردووە، وەك عمادەدین نورەدین ممرودزەنکیو سەلاحەدین ئەوە تێبینی دەکەن کە چەند ئامانجێکی دیاریکراوی هەبوو کەئەویش رەخساندنی بوار بووە بۆ هێزە موسوڵمانەکان بۆ خۆئامادەکردنو بەهێزکردنی توانا سەربازییەکان لەپێناو ئەنجامدانی هێرشی نوێ بۆ سەر دوژمن، زۆربەی ئەم رێککەوتنانەش لەسەر داوای خاچپەرستەکان بووەو سەرکردە موسوڵمانەکانیش کەمتەرخەمیان نەدەنواند، چونکە بەرژەوەندی ئەوانیشی تێدا بوو،چ بۆ رووبەرووبوونەوەی میرنشینی تر بێت کە لەگەڵیاندا رێککەوتننامەی نەبووبێت یان بۆ ئاسانکاری کردن بۆ موسوڵمانانو ئازادی هاتووچۆو گەشتیان لەنێوان میسرو وڵاتی شامو ئاسانکردنی هاتووچۆی کاروانە بازرگانیەکان لەناوچەی عەرەبیدا، یاخود بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشو دڵنیایی بۆ کاروانەکانی حاجیانو جێبەجێکردنی دروشمەکانی حەج بەبێ مەترسی، دوا سوڵحیش سوڵحی رەملە بوو، کەسێ ساڵی بۆ دیاری کراو سەلاحەدین راوێژکارەکانی بەپێویستیان زانی بەهۆی خراپی باری تەندروستی سوپاکەیو ئەو ماندوبوونو بێزارییەی کەرووبەڕووی دەبوون، ئەمەیان بەهەلێك دەزانی بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەنگو رووبەڕووبونەوەکانی داهاتوو، هەروەها ئیبن شەدادیش باسی ئەوە دەکات کە سەلاحەدین بەو رێککەوتنە رازی نەبووە، بەڵام بەهۆی بێزاری سەربازەکانیەوە پێی قایل بووە[2]، هەروەها ئیبن شەداد پێی وایە کە ئەو رێککەوتنە لەبەرژەوەندی موسوڵمانەکان بوو، چونکە پاش مۆرکردنی سەلاحەدین کۆچی دوایی کردو ئەگەر کۆچی دوایی لەکاتی جەنگەکاندا بوایە ئەوە مەترسی زۆری هەبوو بۆ موسوڵمانان، هەبۆیە ئەم رێککەووتنە پشتیوانیو خۆشبەختی بوو[3].

٩- کوژرانی ریتشارد شێردڵ: دوای رێککەوتنی رەملە ریتشارد شێردڵ لەعەککاوە لەرێی دەریاوە بەرەو ئینگلتەرا بەرێکەوتو کەشتیەکەی لەدەریادا نوقووم بوو، بەڵام توانی بەسەلامەتی خۆی بگەیەنێتە کەنار دەریا، پاشان بەدزیەوە بەزەوی نەمسادا تێپەڕ بوو

---

[1] معاهدات الصلح والسلام بين المسلمين والفرنج، ل: ٤٣

[2] معاهدات الصلح والسلام بين المسلمين والفرنج، ل: ٥٧

[3] النوادر الصلطانية، ل:٢٣٥، معاهدات الصلح والسلام، ل: ٥٨.

هەتاوەکو لەیەکێك لەیانەکاندا لەنزیك شاری ڤیەنا پێیانزانی لە١١ی کانوونی یەکەم/ دیسەمبەرداو ڕاپێچکرا بۆ لای لیوبۆڵدی دۆقی نەمسا کەتۆمەتباری کرد بەکوشتنی کونراد مونتیفراتو ویستی بیفرۆشێو دوژمنەکانی هاتن بۆ کرینی بەڵام پاش ماوەیەك رادەستی ئیمپراتۆر هنری شەشەمی ئیمپراتۆری دەوڵەتی جێرمانی پیرۆز کراو لەزینداندا مایەوە هەتاوەکو لەبەرامبەر فدیەیەکی زۆردا ئازادی کرد[1]، ئازادکردنیشی لەمانگی ئازار مارسی ١١٩٤ك بوو، پاشان درێژەی دا بەکوشتاری شازادە نەیارەکانی هەتاوەکو تیرێکی کوشندەی بەرکەوتو لە٢٦ی ئازاری ساڵی ١١٩١دا گیانی سپارد[2].

١٠- چەند داواکارییەك لەدیوانی العزیزەوە: دوای رووخانی عەسقەلان لەجێنشینانی دیمەشقەوە نامەیەك گەیشت کەنامەیەکی بەغداشی تیادا بوو لەدیوانی العزیز النبوی کەسێ بەشی لەخۆ گرتبوو: یەکەم، گلەیی کردن لەمەلیك المظفر (سەلاحەدین) بەهۆی رۆشنیەوە بۆ بکتمر، دووەمیش، گلەیی کردن لەمظفرالدین سەبارەت بەدەستگیرکردنی حەسەنی کوڕی قفجاقو فەرماندان بەگێڕانەوەی بۆ الکرخانی، سێیەم: فەرمانی دا بەناردنی القاضی الفاضل بۆیان هەتاوەکو چەند شتێکی پێبوترێت، سوڵتانیش وەڵامی داواکاری یەکەمی دایەوە بەوەی کەئێمە فەرمانمان بۆ ئەو کارە پێنەکردووە، سەبارەت بەدووەمیش وەڵامی وابوو کە کوڕی قفجاق دەیشارێتەوە کەچ خراپەکارییەکی ئەنجامداوە، هەروەها دەربارەی سێیەمیش وەڵامی ئەوەیە کە ئەو بەتەمەنەو نەخۆشەو ناتوانێ جموجوڵ بکاتو[3] بگاتە عێراق، القاضی الفاضلیش نامەیەکی پۆزش هێنانەوەی نووسی لەوەی کەناتوانێ بگاتە دیوانی العزیزو لەنامەکەشیدا ئەم دوو دێرە شعرەی نووسیوە:

ماكنت أولَّ غزةّ قمرة — ورائد خدعته خضرة الدِّمَن
مثِّل لنفسك شخصي إني رجل — مثل المعيدي فاسمع بي ولا ترني[4]
ويح الفرنجة بل امهم أوما — فيهم لبيب على العلات يعتبر
فكم نثرتهم ضربا إذا انتظموا — وكم نظمتهم طعنا إذا انتشروا
كم قد سقيتهم ذلا فلا عجب — إن عربدوا سقها بالقوم قد سكروا

---

[1] صلاح الدين الأيوبي، قدري قلعجي، ل: ٣٢٩

[2] صلاح الدين الأيوبي، قدري قلعجي، ل: ٣٢٩

[3] الموسوعة الشاملة في تأريخ الحروب الصليبية (٢٤/٢٠٥).

[4] كتاب الروضتين (٢/٢٨٥).

إن يمموك فلا بدع لجهلهم ... تسعى إلى الأسد في غاباته الحمر

زاروا نموارا ولا تغني وقاحتهم ... إذا أسودك في أبطالهم زأروا

فحام عن حوطة البيت المقدس لا ... خوف وحاشاك من خوف ولا ضرر

هو الشريف وقد نادات معتصما ... فما على مجده من بعدها حذر

وسوف تستغفر الأيام هفوتها ... وتحصد الفئة الأوغاد ما بذروا

منعت طباء طباء المنحنى بأسودة ... وأشد ما أسكوه فتك ظبائه

فغلت بنا وهي الصديق لحاظها ... كظبى صلاح الدين في أعدائه

سل عنه قلب الإنكتار فإن في ... خفقانه ما ئشت من أبنائه

لولاك أم البيت غير مدافع ... ولسال سيل نداك في بطحائه

وبكت جفون القدس ثانية دما ... لترنم الناقوس في أفنائه

١١- تۆكمەكردن‌و بەسەركردنەوەی قودس پاش رێككەوتن: عماد دەڵێ: سوڵتان پـاش رێككـەوتن گەڕایـەوە بـۆ قـودس بـۆ بەسـەركردنەوەی‌و دەسـتی كـرد بـەبنیاتناوەی شـوراكان‌و تۆكمـەكردنیان‌و زینـدوڕاگرتن‌و باشـكردنی شـوێنەوارەكانی، هـەروەها هەسـتا بـەقوڵكردنی خەندەقەكەی‌و باشكردنی رێگاو بانەكانی، بازاڕێكیشی بەسەرجەم دوكانەكانیەوە بۆ وەقفی خوێندنگـە زیـاد كـرد، لەگـەڵ زەویـەیك بەباخەكانیـەوەو كاروبـاری سـۆفیەكانی رێكخسـت‌و وەقفی پێویستی بۆ دیاریكردن‌و ئەو كڵێسایەش كە لەشەقامی قمامەدایە كرد بەنەخۆشخانەو دەرمان‌و پێداویستی پزیشكی ئەوكاتەی بۆ گواستەوە، شورای قودسیشی بـەدەور گومـەزی صهیوندا گێڕاو لكاندی بەشارەكەوە، هەروەها بڕیاری حەجكردنیشی دا، بەڵام قـەدەر بـواری نـەداو زۆر دڵتـەنگ بـوو بەلەدەستـچوونی پاشـان مـانگی رەمـەزان مایـەوەو خێـرو چاكەی بەردەوامبوو، ولایەتی قودس‌و دەوروبەریشی دایـە دەسـت عیـزەدین جوردیك‌و حسامەدین سـیاروغی لەسـەر كـار لابـراو علـم الـدین قیـصری خزمەتگوزاریـشی كـردە والی ناوچـەكانی پشتەوەی قودس، وەك الخلیل‌و غەززەو داروم‌و عەسقەلان[1].

نارازیبونی القاضی فاضل بەحەجكردنی صەلاحەدین: كاتێ القاضی الفاضل بیستی كەسوڵتان بەنیازی حەجكردنە نامەیەكی بۆ نووسـی‌و داوای ئەنجامنـەدانی لێكرد،چونكە هێشتا فرەنجـەكان شامیان بەجێنەهێشتبوو قودسیشیان لەبیر نەچوبووەوەو متمانەش بەبەڵێن‌و بڕیاریشیان نـەدەكرا، لەبەر ئەوە لەگەڵ رۆشتنی سوڵتان بۆ سـەفەرو بـڵاو بوونـەوەی سـەربازەكانماندا گرەنتییـەك نییە

---

[1] كتاب الروضتين (٤/٣٣٢).

کەشەوێك نەدەن بەسەر قودسداو بەیانی بەدەستیانەوە نەبێتو لەدەست موسوڵمانان بچێت حەجەکەش ببێتە تاوانێکی گەورە کە خوالێی خۆش نەبێت، پاشان دەڵێ: حاجیەکانی عێراقو خۆراسانیش ئایادو سەد هەزاریان سێ سەد هەزاریان زیاتر نابن، ئایا گرەنتی ئەوە دەکرێت کەنەوترێت سوڵتان بۆ تۆڵەسەندنەوەو خوێن ڕشتنو تێکدانی وەرزەی حەج چووە، ئەمەش دەبێتە مێژوویەکی خراپ پەنائەگرم بەخوا، ئەم کارە خراپە دوور نییە رووبداتو بۆ خەڵکی گەوج زۆر نییە، گەورەم بەدەمەوە بوونی خەڵكو چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەهەموو ئەو شتانە گرنگترە کە لەخوا نزیکمان دەخاتەوە، ئەمەش تەنها دانەیەك نییە، ئەوەتا لەدەوروبەری دیمەشقدا هێندە ستەم لەجوتیارەکان بینراوە کەنازانم چۆن بارانیان بۆ دەبارێت، هەروەها خۆسەپاندنی خاوەن زەویەکان بەسەر کرێکارەکانداو ئەو ئاژاوەیەی کە لەدۆڵی بَرَدَی واللّذبداني دا هەیەو شمشێریان خوێنی لێدەتکێت، ئەمە جگە لەو سەنگەرانەی موسوڵمانان کە پێویستیان بەتۆکمەکردن هەیەو هێنانی ئازووقەو کەرەستەی سەربازیو دیاریکردنی داهاتو خەرجی گشتی یەکێکن لەئەرکەکان، چونکە ناکرێت بەبێ داهات پارە خەرج بکرێتو ئەمەش پێشتر قسەی زۆرمان تیادا کرد، بەڵام گەورەمان کاری زۆری بۆ هاتە پێشو کاری بەو شێوەیە بەردەوام بوو. بەڵام دواتر بینیمان کە چۆن لەو پەڕی تەنگانەدا بەیتولمال خاڵی بوو[1]، ئەم نامەیە بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتنی قوڵی القاضي الفاضل لەمەبەستەکانی شەریعەتو هەروەها گرنگی بونی زانایانی خواویستمان لەتەنیشت سەرکردە سیاسیو سەربازیەکانەوە بۆ دووپات دەکاتەوە. ئەوە بوو سوڵتان سەلاحەدین گوێی بۆ ئامۆژگاریەکانی القاضي الفاضل گرتو سوپاسیشی کرد، بڕیاری دا ئەو ساڵە حەج نەکات و ئەم بڕیارەشی گشتاند بۆ سەرجەم شوێنەکان، پاشان سوڵتان مانگی رەمەزانی پیرۆزی بەنوێژوو رۆژوو قورئان خوێندن لەقودسدا بەسەر بردو هەرکاتی وەفدێکی گاورەکان سەردانیان بکردایە رێزو چاکەی زۆری دەنواند بۆ راکێشانی دڵیان بەرەو ئیسلام، ئەوەبوو هەموو پاشاو سەرکردەکانیان بەدزیەوە سەردانی القُمامة یان. کردو لەناو جەماوەری گاوراندا لەسەر خوانی سوڵتان ئامادەئەبوون بەجۆرێك کەنەزانرێت، بەڵام سوڵتان بەگشتی لەمە ئاگادار بوو بۆیە زۆر رێزی لێدەنانو چاکەو رەوشت بەرزی پیشان دەدان[2].

١٢- گەڕانەوە بۆ دیمەشق: لەپێنجەمی شەوالی ٥٨٨ك دا سوڵتان لەگەڵ سەربازەکانیدا سوار بوو لەقودسەوە بەرەو دیمەشق بەرێکەوت عیزەدین جوردێکی لەقودسدا کردە جێنشینو بەهادین

---

[1] كتاب الروضتين (٤/٣٣٤).

[2] البداية والنهاية (١٦/٦٤٦).

یوسفی کوڕی رافعی کوڕی تمیمی شافعیشی دانا به دادوەر تیایدا بەوادی الجیبدا[1] تێپەڕیو گەیشتنە نزیك بیری الداویە، پاشان گەشتنە نابلسو کاروبارەکانیانی بەسەر کردەوەو دواتر بەجێیهێشتو بەهەر سەنگەرو شوراو شارێکدا تێپەڕ ببوایە لەبارودۆخی خەڵكو دارایی‌و تاوانکاری‌و کارە قەدەغەکراوەکان دەکۆڵیەوەو لەرێگەشیدا بوهیمۆندی فەرمانڕەوای ئەنطاکیە هاتە خزمەتی ئەویش رێزی زۆری لێناو پارەو خەڵاتێکی زۆری پێبەخشی، عیمادی کاتبیسش لەم گەشتەدا هاوڕێی بوو شوێن بەشوێن بەقۆناغو قۆناغ بۆی باسکردوین هەتائەوەی کە دەڵێ لەرۆژی دووشەممەدا لەعین الجرّ[2] بۆمرج یبوس[3] و لەوێ پیاو ماقوڵو ناودارانی دیمەشق هاتنو رۆژی سێ شەممە لەالعرّادة[4] لاماندا، لەبەرە بەیانی رۆژی چوار شەممە شازادەی شەوال گەشتینە بەهەشتی دیمەشق بەسەلامەتی هەرچەندە هەتاهەتایە تیایدا نامێنینەوە، سوڵتانیش چوار ساڵ بوو بەجێی هێشتبوو هەربۆیە دیمەشق خۆی رازاندەوەو ژنو پیاوی هاتنە دەرەوە و چێشتینگا لەهەموو وڵاتەکانەوە عاتنە لای‌و پاشماوەی ئەو ساڵەی لەراوکردنو ئامادەبوون لەیانەی داد (دار العدل)و چاکەکاریدا بەسەر برد، کاتێ جەژنی قوربانیش هات چەند شاعیرێك بەهۆنراوەیەك ستایشیان کرد کە تیایدا هاتووە:

| | |
|---|---|
| وأبيها لولا تغزّل عينها | لما قلت في التغزّل شعرا |
| ولكانت مدائح الملك الناصر | أولى ما فيه أعمل فكرا |
| ملكُ طبّق الممالك عدلا | مثل ما أوسع البريّة برّا |
| فيحلُّ الأعياد صوماً وفطرا | ويلقَ الهناءَ برّا وبحرا |
| يامُسِرَّ الطاعات لله إن | أضحى مليك على الهنّات مُصِرّا |
| نلتَ ماتبتغي من الدين والدنيا | فتيها على الملوك وفخراً |
| قد جمعت المجدين أصلاً وفرعاً | وملكت الدارين دنيا وأخرى[5] |

[1] دوو قەڵان پێیان دەوترێت: حەبیبی سەرو خواروو لەفەلەستین.

[2] عين الجر: شوێنێکی بەناوبانگە لەبیقاع لەنێوان بەعلەبەكو دیمەشقدا.

[3] مرج يبوس یبوس چیایەکە لەشام لەدۆڵی النسيم ی دیمەشقدا.

[4] العّرادة: گوندێکە لەسەر گردۆڵکەیەك لەشێوەی قەڵایەکدا لەنێوان رأس العينو ننصبیبیندا

[5] البداية والنهاية (١٦/٦٤٧).

١٣- تۆمەتبارکردنی ئەمیری حەج بەنامە نوسین بۆ سەلاحەدین لەدژی خەلیفە: لەساڵی ٥٨٨ك دا ئەمیری حەج لەبەغدا طاشتكین كەبیست ساڵ بوو ئەو كارەی لەئەستۆ گرتبووو زۆر رەوشت جوانو كاربەجێیە تۆمەتباركرا بەوەی كە نامەی بۆ سەلاحەدینی كوڕی ئەیوب نووسیوە بۆ هاتن بۆ عێراق بۆ دەست بەسەراگرتنی چونكە كەس نیە بتوانی بەرگری لێبكات، ئەم پیاوەش زۆر بەرەوشت بوو ئەم كارەیان بۆ هەڵبەستبوو بوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا رووبەڕووی زیندانی كردنو سوكایەتیو دەستگرتن بەسەر ماڵو موڵكیدا بوویەوە[1].

١٤- كۆچی دوایی شاعیر أبو المرهف نصیری كوڕی مەنصوری نمیری: لەساڵی ٥٨٨ك دا شاعیر أبو المرهف نصیر كۆچی دوایی كرد، ئەم شاعیرە گوێبیستی فەرمودە دەبوو و بەئەدەبەوە سەرقاڵ بوو،لەتەمەنی چواردە ساڵیدا تووشی نەخۆشی گولی بوو بینایی لەدەست داو تەنها شتی نزیكی دەبینی، بەلام پێویستی بەچاو ساغ نەبوو، ئەوە بوو بۆ چارەسەری چاوەكانی روویكردە عێراق بەلام پزیشكەكان بێ هیوایان كرد، پاشان بەلەبەركردنی قورئانو هاوڕێیەتی كردنی پیاو چاكەكانەوە خەریك بوو سودی زۆری بینی، خاوەنی دیوانێكی شیعری گەورەو باشە، جارێكیان دەربارەی مەزهەبو بیرو باوەڕی پرسیاریان لێكرد ئەویش وتی:

| | |
|---|---|
| أحبُّ عليّا واوالتولَ ووُلدَهاولا | أجحد الشيخين فضل التقدم |
| وأبرأ مّمن نال من عثمان بالأذى | كما لأتبرأ من وَلاءِ ابن مُلجم |
| ويعجبنى أهل الحديث لصِدقهم | فلستُ الى قومِ سواهم بمنتهي[2] |

هەروەها لەشعرەكانی:

| | |
|---|---|
| وزهّدني في جميع الأنام | قلّة الأنصاف من تصحَبُ |
| هم الناس مالم تجرّ بهم | وطُلْسُ الذّئاب اذا جُرّبوا |
| وليتك تسلم عند البعاد | منهم فيكن اذا تقرُبْ[3] |

**چواردەیەم: نەخۆش كەوتنو كۆچی دوایی سەلاحەدین لەساڵی ٥٨٩ك دا:**

١- **رۆژەكانی كۆتایی لەژیانی سەلاحەدیندا:** عیماد دەڵێ: سوڵتان لەماڵەكەیدا نیشتەجێ بوو لەدیمەشقداو هەموان چاوەڕێیاندەكردو نێردراوی شارەكانیش لەبەرماڵەكەیدا كۆبووبوونەوەو

---

[1] هەمان سەرچاوە،(١٦/٦٤٨)

[2] البداية والنهاية (١٦/ ٦٥٠)

[3] كتاب الروضتين (٤/ ٣٥٦).

چاوەڕێی وەڵامی بوونو میوانەکانیش دەستە ددەستە دەهاتنو هەزارانیش لەباخچەی بەخشینیدا پشویان دەداو ڕۆژانە دادەنیشت بۆ دەربڕینی خۆشیو بەخشینی ماڵو بڵاوکردنەوەی ڕەوشتی جوانو نەهێشتنی ستەم، پاشان بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ چوو بۆ ڕاو بۆ ڕۆژهەڵاتی دیمەشقو العادلی برای لەگەڵ خۆیدا بردو نێچیرو هەلی باشی بۆ هەڵکەوتو بەنێچیرەوە گەڕایەوە لەڕۆژی دووشەممە ١١ی سەفەرداو گەڕانەوەشی هاوکات بوو لەگەڵ گەڕانەوەی حاجیەکاندا، هەر بۆیە چووە دەرەوە بۆ پێشوازی کردنیان، لەکاتێ حاجیەکانی بینی چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسک چۆن ئاواتی حەجکردنی لەدەست دا، پاشان هەواڵی مەککەو ئەمیرەکەیو خەڵکەکەی و بڕی ئەو دانەوێڵەیەی کە لەمیسرەوە پێیان دەگاتو هەزارانی دەوروبەرو موچەو داهاتی لێپرسین، حاجیەکانیش بەمە زۆر دڵخۆش بوونو لەیەمەنیشەوە سیف الأسلامی برازای گەشتە بەرەوەو ئەویش بەگەرمی پێشوازی لێکرد[1].

- **نەخۆشکەوتنی سەلاحەدین:** کاتێ شەوی شەممە هات هەستی بەماندویەتییەکی زۆر کرد، هەر کە نیوە شەو هات تایەکی توند گرتی کە زیاتر لەسکیدا بوو، هەتاوەکوبەرەبەیانی شەممە ڕۆژ بووە بەتەواوی کاریگەری تاکەی پێوە دیار بوو، بەڵام ئەمەی بۆ خەڵك ئاشکرا نەکرد، بەڵام القاضی الفاضلو قاضي ئیبن شەداد لای ئامادەبوون الأفضلي کوڕیشی هاتە لای، قاضی ئیبن شەداد دەڵێ: زۆر لای ماینەوەو نیگەران بوو لەوەی بەشەودا بێتاقەتی رووی تێدەکاتو حەزی دەکرد قسە بکات لەگەڵ کەسانی نزیکیدا، پاشان بەجێمان هێشتو دڵمان هەر لای بوو، دواتر بانگ کراینبۆ سەر خوان لەخزمەتی الملیك الأفضل ی کوڕیدا بەڵام قاضی ئەوەی نەکردبوو بەنەریتو ڕۆیشت، چوومە بەر دەرگا بینیم خواردن دانراوەو تەنها مەلیك الأفضلی کوڕی دانیشتووە منیش بەجێم هێشت، چونکە نەمدەتوانی بەبێ سەلاحەدین دابنیشم، لەو ڕۆژەشدا وەك خۆشی دەربڕینێك بۆ دانیشتنی کورەکەی لەشوێنێکدا دەستیان کرد بەگریانو پاشان نەخۆشییەکەی بەرە بەرە زیادی کرد. لەوکاتەشەوە ئێمە بەیانیو ئێوارە سەردانیمان دەکردو پاشان چەند جارێك لەگەڵ القاضی الفاضل دا دەچوینەلای هەندێ جاریش دەهێنرایە دەرەوە بۆ گەڕانو ڕۆیشتن لەکاتێکدا کەئازاری کەم-دەبوویەوە، نەخۆشیەیکەشی زیاتر لەسەریدا بوو، یەکێك لەنیشانەکانی کۆتایی هاتنی تەمەنیشی ئامادەنەبوونی پزیشکەکەی بوو لەو کاتەدا، لەکاتێکدا کەهەمیشە هاوڕێی بوو لەماڵەوەو لەسەفەردا، پزیشکەکانیش پێیان باش بوو کەدەماری سەری ببڕنو هەستان بەبڕینی

---

[1] ب الروضتین (٣٥٧/٤).

لەچوارەم ڕۆژیدا، بەڵام نەخۆشییەکەی توند تر بوو جەستەی وشك دەبوویەوەو هەناسەی سوار دەبوو، نەخۆشییەکەشی بەردەوام لەزیادبووندا بوو هەتاوەکو بەتەواوی لاوازی کرد، لەشەشەم ڕۆژی نەخۆشییەکەیدا دامانناو پاڵماندا بەپشتییەکەوەو ئاوێکی ساردی بۆ هێنرا هەتاوەکو دوای شەربەتێکی خۆش بیخواتەوە، کە خواردیەوە زۆر بەگەرمی دەزانی ئێمەش بۆمان گۆڕیو ئاوێکی ترمان بۆ هێنا، بەڵام تەنها وتی ساردە. نەتوڕە بوو نەهاواری کرد، تەنها وتی: سبحان الله کەس ناتوانێ ئاوەکە بگۆڕێت، ئیتر منو قاضی فاضل هاتینە دەرەوەو زۆر گریاینو قاضی فاضل دەیوت: سەیری ئەو خوڕەوشتە جوانەی بکە خەریکە لەناو موسوڵمانەکاندا نامێنێ، سوێند بەخوا ئەوە خەڵکی تر بوایە پەرداخەکەیان دەکێشا بەسەری ئەو کەسەدا کە هێنای، ئەوەبوو لەشەشەمو حەوتەمو هەشتەم ڕۆژدا نەخۆشیەکەی توندتر بوو هۆشی لەسەر خۆی نەما لەڕۆژی نۆیەمیشدا تووشی لەرز بوو وازی لەئاو خواردن هێناو پڕوپاگەندە لەشاردا بڵاو بوویەوەو خەڵکی ترسیان لێنیشتو قوماشو کوتاڵەکانیان لەبازاڕدا لابردو هێندە غەمو خەفەت دایگرتن کەباس ناکرێت، منو قاضی فاضلیش هەموو شەوێك هەتاوەکو سێیەکی شەو تێپەڕ دەبوو دادەنیشتینو پاشان دەچووینە لای دەرگای ماڵەکەی جا ئەگەر بوار هەبوایە دەچووینە لای ئەگینا هەواڵیمان دەپرسیو دەهاتینەوە، خەڵکیش سەرنجی دەمو چاوی ئێمەیان دەدا هەتاوەك بەنێوچاوانماندا باری تەندروستییان بۆ دەرکەوێت[1]، لەڕۆژی دەیەمیشدا دوو دەرزی لێدراو کەمێك پشووی داو ئازاری سوك بوو و ئەندازێك ئاوی جۆی خواردەوەو خەڵکیش زۆر دڵخۆش بوونو ئێمەش وەك هەمیشە تا شەوێکی درەنگ نەخەوتین، پاشان هاتینو هەواڵمان پرسی لەجمال الدولە إقبال ئەویش چووە ژوورەوەو پاشان لەگەڵ مەلیك المعظم تورانشاهدا هاتە دەرەوەو وتی: عارەق قاچی گرتووەتەوە، ئێمەش سوپاسی خوامان کردو داوامان کرد کەدەست لەشوێنەکانی تری جەستەی بکاتو بزانی لەگەڵ عارەق کردنسدا چۆنە، پاش کەمێك هاتەوەو وتی: عارەق هەموو لەشی گرتووەتەوە، ئێمەش سوپاسی خوامان کردو بەدڵخۆشیەوە ڕۆیشتینو پاشان لەبەرەبەیانی یازدەیەمین ڕۆژی نەخۆشییەکەیدا ڕۆژی سێ شەممە ٢٦ی سەفەر هاتینە بەردەرگاو هەواڵمان پرسی، وتیان عارەق ڕاخەرەکەی ژێری تەڕکردووەو داییاوەتە زەوی‌و

[1] النوادر السلطانية، ل: ٤١٩.

وشكبوونەوە زۆری بۆ هێناوەو بەتەواوی لاوازی کردووەو پزیشکەکانیش هەستیان بەنزیک بوونەوەی وادەی مەرگی کردووە[1].

٣- **سوێند دانی خەڵکی لەلایەن مەلیك الأفضلەوە:** کاتێ مەلیك الأفضل باوکی لەم بارودۆخەدا بینیو بێهیوا بوو لەمانەوەی، دەستی کرد بەسوێند دانی خەڵكو لە دار الرضواندا دانیشتو دادوەرەکانی بانگ کردو لاپەرەیەکی سوێندانی کورتو پڕمانای بۆ ئامادەکرا تیایدا خەڵکی سوێند دەدا بەوەفادار بوون بۆ سوڵتان بەدرێژایی ژیانیو پاشان بۆخۆی پاش کۆچی دوایی سوڵتان، پاساویشی ئەوە بوو کەنەخۆشی زۆری هێناوە بۆ سوڵتانو نازانین چی روودەدات، ئەوەش تەنها بۆ خۆ پاراستنە وەك نەریتی هەمیشەیی پاشاکان[2]. سوێندەکەش نوسرابووەوەو بریتی بوو لە: من لەم ساتەوە نیەتم یەکلا دەکەمەوەو دڵسۆزی دەنوێنم بۆ مەلیك الناصر تا لەژیاندا مابێتو من هەوڵی تەواو دەدەم بۆ بەرگری کردن لەدەوڵەتەکەی بەگیانوماڵو شمشێرو پیاوانمەوەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبمو پاش خۆشی بۆ مەلیك الأفضل علی کوڕی سوێند بەخوا گوێڕیەڵی دەبمو بەرگری لەدەوڵەتەکەی دەکەم بەگیانو ماڵو شمشێرو پیاوانم، فەرمانو نەهیەکاننی جێبەجێ دەکەمو رواڵەتو ناخیشم لەمەدا وەك یەك وایەو خوای گەورەش شاهیدە لەسەر ئەمەی کەدەیڵێم[3].

٤- **کۆچی دوایی سەلاحەدین ( ڕەحمەتی خوایی لێبێت ):** لەشەوی دوازدەیەمی نەخۆشییەکەیدا کەهاوکات بوو لەگەڵ بیستو حەوتەمی سەفەری ساڵی ٥٨٩ك دا، نەخۆشیەکەی توند تر بوو بەتەواوی لاوازیکرد لەسەرەتای شەودا کەوتو ژنان کەوتنە نێوان ئێمەو ئەوەوە، منو قاضی فاضل و ئیبن زکی لەو شەوەدا ئامادە بوین کە ئەو لەو کاتەنەدا ئاماد نەبوو ، مەلیك الأفضلیش داوای لێکردین کە ئەو شەوە لای بمێنینەوە، بەلام القاضی الفاضل ئەمەی پێباش نەبوو، چونکە خەڵکی هەموو شەوێك چاوەڕێی دابەزینی ئێمەیان دەکرد لەقەلاکەو ئەویش دەترسا لەوەی کە ئەگەر دانەبەزین پروپاگەندە بلاو بێتەوەو تالانیو راوو رووت رووبدات، بۆیە بەباشی زانی ئێمە دابەزینو شێخ ئەبی جەعفەری ئیمامی الكلاسە بانگ بکەن، کەپیاوێکی چاك بوو لەقەلاکەدا دەمایەوە، بەلام ئەوە بوو شەو کاتی سەرەمەرگی هاتو هاتینەوە بۆ لای بەلام ژنان بووبوونە بەربەست لەنێوانماندا و خێرا شایەتومانیو یادی

---

[1] النوادر السلطانیة، ل: ٤١٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل:٤٢٠

[3] هەمان سەرچاوە، ل: ٤٢١

خوامان بیرخستەوەو ئەویش هێنای کاتێ دابەزین هەریەکەمان پێی خۆش بوو خۆی بکات بەفیدای و ئەو شەوە دیار بوو دوا شەوی بوو ئەبو جەعفەریش بەسەریەوە قورئانی دەخوێندو خوای گەورەی یاد دەخستەوە، چونکە لەنۆیەم شەوەوە بێهۆش بووو تەنها ناو بەناو هۆشی بەخۆیدا دەهاتەوە، شێخ ئەبو جەعفەریش باسی ئەوە دەکات کە ئایەتی ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾ (الحشر:٢٢).

خوێندەوە گوێی لێ بووە وتوویەتی: راستە، ئەمەش بەئاگاهاتنەوەیە لەکاتی پێویستداو کۆمەکی پەروەردگارە بۆی دەسا سوپاس بۆ پەروەردگار[١]. کۆچی دواییشی (رحمەتی خوای لێبێت) پاش نوێژی بەیانی رۆژی چوار شەممە بیستو حەوتەمی صەفەری ساڵی ٥٨٩ك دا بوو، القاچی الفاچل یش پاش گزنگ کۆچی دوایی راگەیاندو شێخ جەعفەریش بۆی گێرامەوە کە کاتێ گەیشتووەتە ئایەتی ﴿لا إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ عَلَيْـهِ تَوَكَّلْـتُ﴾ (الرعد:٣٠) زەردەخەنەیەکی کردو گیانی سپاردووە بەپەروەردگار[٢]، ئەو رۆژەش کۆستێکی گەورە بوو کەدوای کۆچی دوایی خولەفای راشیدین موسوڵمانان کۆستی وایان نەکەوتبوو و غەمو پەژارەیەکی بێ ئەندازە قەڵاو موسوڵمانانو دونیای گرتەوە[٣]، قاچی ئیبن شەدادیش دەڵێ: سوێند بەخوا بیستبووم لەزۆر کەس ئامادەن خۆیان فیدایی بکەن پێم وابوو ئەوە ئەگەرێکەو زیادەڕەویە هەتاوەکو لەو رۆژەدا بەخۆمو بەخەڵکدا بۆم دەرکەوت کەئەگەر خۆ فیداکردن رێی پێ بدرایە ئەوە خەڵکی خۆی فیدا دەکرد[٤].

٥- **بەخاکسپاردنو دانیشتن بۆ پرسە:** ئەوە بوو مەلیك الأفضل لەهەیوانی سەرەوەدا دانیشت بۆ پرسەو سەرەخۆشیو دەرگای قەڵاکە قەدەغەکرابووو تەنها رێ بەئەمیرو زانا مێزەرە بەسەرەکان دەدرا، ئەو رۆژەش رۆژێکی گەورە بوو هەرکەسەو لەتاوی غەمو پەژارە کەسی لەیاد نەبوو، لەمەجلیسی پرسەشدا نەیانهێشت شیعرو وتاری تیادا بخوێنرێت. مناڵەکانیشی لەناو خەڵکیدا هاواریان دەکردو خەریك بوو گیانی مرۆڤ دەردەچوو لەتاو خەفەتدا بۆیان، ئەم حاڵەتەش تا نوێژی نیوەڕۆ بەردەوام بوو، پاشان هەستان بەشتنو کفنکردنی، نەمانتوانی بەشدار بین لەئامادەکردنی تەرمەکەیدا بەنرخی دەنکە گەنمێکیش مەگەر بەقەرز لەنرخی ئەو کایەدا کەقورەکەی پێخۆش دەکرێت، ئەوە بوو زانا الدّولعی شوشتیو داوایان

[١] النوادر السلطانية، ل: ٤٢٢

[٢] النوادر السلطانية، ل: ٤٢٢

[٣] النوادر السلطانية، ل: ٤٢٢

[٤] النوادر السلطانية، ل: ٤٢٢

لێکردم کەئامادەی شتنەکەی بم، بەڵام توانای بینینی ئەو دیمەنەم نەبوو دواتر پاش نوێژی نیوەڕۆ لەتابوتێکدا کە بەخاولیەك داپۆشرا بوو هێنرایە دەرەوە، ئەمەو سەرجەم ئەو پۆشاکانەی کە پێویستی بوو القاضی الفاضل لەعەرەفات بۆی هێنابوو، کاتێ تەرمەکەی بینرا خەڵکی بەیەك دەنگ هاواریان کردو دونیا دەنگی دایەوە، هەروەك هێندە گریان‌و هاواریان کرد کەنوێژەکەیان لەبیر چووو پاشان خەڵکی دەستەدەستە نوێژیان لەسەر دەکردو یەکەم کەسیش کە نوێژی لەسەر کرد قاضی محی الدین کوڕی زەکی بوو، پاشان هێنایانەوە بۆ ئەو خانووەی کەلەو بێستانە کەتیایدا نەخۆش کەوتبوو لەکەناری رۆژئاوایدا نێژرا، دەهێڵانە ناو گۆڕیشی لەنزیك کاتی عەسردا بوو، پشان الظافری کوڕی لەو رۆژەدا هات‌و سەرەخۆشی لەخەڵك کردو دڵی هێور کردنەوە، خەڵکیش لەتاو خەم‌و خەفەت تاڵانیان لەبیر چووبوو دڵێك نەبوو کە غەم داینەگرتبێت‌و چاوێك نەبوو فرمێسك نەرێژێت، مەگەر کەسێك کە خوا ویستبێتی، پاشان خەڵکی بەناخۆشترین شێوە گەرانەوە بۆ ماڵەکانیان‌و ئەو شەوە کەسمان نەچوینەوە، ئێمەش سەرقاڵ بووین بەقورئان خوێندنەوە، مەلیك الأفضلیش لەو رۆژەدا سەرقاڵی نامە نوسین بوو بۆ براکانی‌و مامی بۆ ئاگادار کردنەوەیان لەم رووداوە، رۆژی دواتریش بۆ پرسەی گشتی دانیشت‌و دەرگای قەلای کردەوە بۆ زانایان‌و وتار خوێنرایەوە بەڵام هیچ شاعیرێك شیعری نەخوێندەوە، پاشان مەجلیسەکە پاش نیوەڕۆ هەڵگیراو هاتنی خەڵکیش ئێوارەو بەیانی بەردەوام بوو بۆ قورئان خوێندن‌و نزاکردن بۆی[1].

ئیبن کەثیر دەڵێ: پاشان پرسەکەی بۆ ماوەی سێ رۆژ لەمزگەوتی ئەمەویدا بەڕێوە چوو خەڵکی بەگشتی‌و خەڵکانی فەرمانرەواو دەسەڵاتداران سەردانیان دەکرد، شاعیرانیش شیعرو شیوەنی زۆریان بۆ کردووە کەباشترینیان ئەو شیعرانە بوو کە عماد الکاتب لەکتێبی (البرق الشامي) دا هۆنیویەتیەوە کە لەسەدو سی‌و دوو دێڕ شیعر پێك هاتبوو[2]:

٦- **شمشێرەکەی سەلاحەدین لەگۆڕەکەیدا:** ئەڵێت: شمشێرەکەی لەگەڵیدا نێژراوە ئەمەش بەفەرمانی القاضي الفاضل بەهیوای ئەوەی کە لەرۆژی قیامەتدا لەگەڵیدا بێت‌و خۆی بەسەریدابدات هەتاوەکو دەچێتە بەهەشت، چونکە هۆکارێك بووە بۆ تێکشکاندنی دوژمنان‌و سەرخستنی دۆستان[3].

---

[1] النوادر السلطانیة، ل: ٤٢٣.

[2] البدایة والنهایة، (٦٥٣/١٦).

[3] البدایة والنهایة، (٦٥٣/١٦).

٧- **وەسیەتی سەلاحەدین بۆ مەلیك القاهری کوڕی:** وەسیەتت بۆ دەکەم بە لەخوا ترسانو فەرمانت پێدەکەم بەوەی کە خوا فەرمانی پێکردویت، چونکە ئەوە هۆکاری رزگار بوونتە، هەروەها ئاگادارت دەکەمەوە لەخوێن رشتنو دەست تێخستنی، چونکە خوێن ناخەوێت، هەروەها وەسیەتت بۆ دەکەم بەراگرتنی دڵی ژێردەستەکانتو بەسەرکردنەوەی کاروباریان، چونکە تۆ ئەمینداریت، وەسیەتیشت بۆ دەکەم بەڕاگرتنی دڵی ئەمیرو گەورە پیاوانی دەوڵەت، چونکە ئەوەی من پێیگەیشتووم بەهۆی ڕاگرتنی دڵی خەڵکیەوە بووە، هەرگیز ڕقیش لەکەس هەڵنەگریت، چونکە مەرگ کەس ناهێڵێتەوە، ووریای نێوانی خۆتو خەڵکیش بە چونکە بەرەزامەندی ئەوان نەبێت خوا لێت خۆش نابێت، بەڵام ئەوەی لەنێوان تۆو پەروەردگاردایە ئەوە بەتەو بەو پەشیمان بوونەوە لێی خۆش دەبێ چونکە ئەو بەخشندەیە[1].

٨- **ئەو میراتەی کە بەجێیی هێشت:** لەخەزینەکەیدا تەنها یەك دیناری ئاڵتونو سیو شەش درهەمو دەشڵێن چلو حەوت درهەم هەبووە، نەماڵ نەخانوو نە بێستان نەکێڵگەو نەهیچجۆرە موڵکێکی تر[2]، هۆی ئەوەش ئەو بەخشینو خێرکردنە زۆرەیە کە لەگەڵ ئەمیرو وەزیرو پیاو چاکان بگرە دوژمنەکانیشدا دەیکرد، هەروەها بەکەم رازیبوون لەخواردنەوەو سواربوونیدا، کە هەمیشە لۆکەو کەتانو خوری لەبەر دەکرد، نەزانراویشە کارێکی نەخوازراوی ئەنجام دابێت لەو کاتەوەی کەبوەتە پاشا. بەڵکو خەمی گەورەو سەرەکی سەرخستنی ئیسلامو تێکشکاندنی دوژمنانی بوو، بۆ ئەم کارەش راو هزری خۆی بەکار دەهێناو هاوکاریشی لەو کەسانەوە وەردەگرت کەمتمانەی پێیان هەبوو ئەمە لەگەڵ ئەو هەمووە فەزڵو چاکەو کارە مەزنانەدا کەهەیبوو لەبواری ئەدەبو زمانەوانیدا، تەنانەت ئەوترا: کەشیعری حەماسەی بەتەواوی لەبەربووە، نوێژەکانیشی بەکۆمەڵ لەکاتی خۆیدا ئەنجامی داوەوەو تەنانەت لەنەخۆشیو مەرگیشدا نوێژی بەکۆمەڵی لەکیس نەچووە. ئەو چووە ژوورەوە بۆ لای ئیمامو زۆری لەخۆی دەکرد بۆ وەستان بەو لاوازیەشەوە[3].

٩- **جوانترین نامە لەبارەی هەواڵی کۆچی دوایی سەلاحەدینەوە:** لەساتی کۆچی دواییکردنی سوڵتان سەلاحەدیندا القاضی الفاضل نامەیەکی بۆ مەلیك الظاهر فەرمانڕەوایی حەلەب

---

[1] الموسوعة الشاملة في تأريخ الحوب الصليبية (٢١٦/١٦)

[2] البداية والنهاية، (٦٥٥/١٦).

[3] البداية والنهاية، (٦٥٦/١٦).

نووسی کەئەمە پوختەکەیەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ) (الحج:١) ئەم نامەیە بۆ گەورەمان مەلیك ظاهر نوسراوە خوای گەورەدڵنەوایی بکاتو ئەو کۆستەی بۆ قەرەبوو بکاتەوە بیکاتە جێنشینی پاشای خوا لێخۆشبوو، بەراستی ئەم روداوە موسوڵمانانی هەژاندو فرمێسك جۆگەلەی بەستو گیان گەشتە گەرو، هەروەها من باوکی تۆو گەورەی خۆمم ماچ کردو خواحافیزیەکم لێکرد کەچیتر یەکتر بینینی لەدوا نییەو لەبری من تۆ ماچم کردو رادەستی پەروەردگارم کرد بەبێ فێڵ بەو پەڕی لاوازییەوە بەرەزامەندییەوە لەپەروەردگارو هێزو دەسەڵاتیش تەنها بۆ خوایە، لەدەرگاشدا هەزاران سەربازی ئامادەو شمشێری لەکێلان نراو هەبوو کە نەیاندەتوانی بەڵایەك دوربخاتەوەو بڕیاری خوا رەت بکەنەوە چاو فرمێسك دەڕێژێو رازییەود شتێك ناڵێین کە خوا پێی خۆش نەبێتو ئێمەش بۆ لەدەست دانی تۆ ئەی یوسف دڵگرانین، سەبارەت بەوەسیەتیش ئەوە هیچ پێویستمان پێی نییەو بیرو ڕاکانیشم بەهۆی ئەم موسیبەتەوە لەیادم چووو بۆ داهاتوش ئەگەر ئێوە رێکبکەون ئەوە تەنها سوکترینیان مردنی باوکتە، کەچەند کۆستێکی گەورەیە والسلام[1].

١٠- **خەوێکی مژدە بەخش: ئەبو شامە لەکتێبی الروچتیندا ئەڵێ:** لەیەکێك لەنامەکانی الفاضلدا بینیم کە لەشەوی کۆچی دوایی سوڵتاندا لەخەویدا کەسێك پێی وتووە: ئەمشەو یوسف لەزیندان دەرچوو، ئەمەش لەو "أثر" ەوە هاتووە کە پێغەمبەری (ﷺ) فەرموویەتی: (دنیا زیندانی باوەڕدارو بەهەشتی بێباوەڕە)[2]، ئەو بارو دۆخەی کە یووسفی تیادا بوو لەو دونیا لەبەرامبەر ئەوەی لەرۆژی دواییدا پێی دەگات وەك زیندان وایە، خوای گەورە لەرۆحە پاکەکەی رازیبێتو دەرگای بەهەشتی بۆ واڵا کات، چونکە ئەوە دوایەمین سەرکەوتنە کە بەئاواتیەوە بوو بیت[3].

١١- **هۆنراوەکەی عیماد ئەسفەهانی دەربارەی شیوەن بۆ سەلاحەدین:**

| | |
|---|---|
| شمل الهدى والملك عم شتاته | والدهر ساء وأقلعت حسناته |
| أين الذي مذ لم يزل مخشية | مرجوة هباته وهباته |
| أين الذي كانت له طاعاتنا | مبذولة ولربه طاعاته |
| بالله أين الناصر الملك الذي | لله خالصة صفت نياته |

[1] النجوم الزاهرة (٦/ ٥٢،٥٣).

[2] مسلم، ژمارە ٢٩٥٦.

[3] كتاب الروچتين، (٤/٣٧٠).

أين الذي ما زال سلطانا لنا يرجى نداء وتتقى سطواته
اين الذي شرف الزمان بفضله وسمت على الفضلاء تشريفاته
أين الذي عنت الفرنج لبأسه ذلا ومنها أدركت ثاراته
أغلال أعناق العدى أسيافه أطواق أجياد الورى مناته
لم يجد تدبير الطبيب وكم وكم أجدت لطب الدهر تدبيراته
من في الجهاد صفاحه ما أغمدت بالنصر حتى أغمدت صفحاته
من في صدور الكفر صدر قناته حتى توارث بالصفيح قناته
لذ المتاعب في الجهاد ولم تكن مذ عاش قط لذاته لذاته
مسعودة غدواته محمودة روحاته ميمونة ضحواته
في نصرة الإسلام يسهر دائما ليطول في روض الجنان سباته
لا تسبوه مات شخص واحد فممات كل العالمين مماته
ملك عن الإسلام كان محاميا أبدا لماذا أسلمته حماته
قد أظلمت مذ غاب عنها دوره لما خلت من بدره داراته
دفن السماح فليس تنشر بعدما أودى إلى يوم النشور رفاته
الدين بعد أبي المظفر يوسف أقوت قواه و أقفرت ساحاته
جبل تضعضع من تضعضع ركنه أركاننا تهدنا هداته
ما كنت أعلم أن طودا شامخا يهوي ولا تهوي بنا مهواته
ما كنت أعام أن بحرا طاميا فينا يطم وينتهي زخراته
بحر خلا من واردية ولم تزل محفوفة بوفوده حافاته
من لليتامى و الأرامل راحم متعطف مفضوضة صدقاته
فعلى صلاح الدين يوسف دائما رضوان رب العرش بل صلواته
لضريحه سقيا السحاب فإن يغب تحضر لرحمة ربه سقياته
وكعادة البيت المقدس يحزن البيت الحرام عليه بل فرفاته
من للثغور وقد غداها حفظه من للجهاد ولم تعد عاداته
بكت الصوارم و الصواهل إذ خلت من سلها وركوبها غزواته
ويسيفه مدا لحزن مصابه إذ ليس يشفى بعده صدياته
يا وحشة للبيض في أغمادها لا تنتفيها للوغى عزماته

يا وحشة الإسلام يوم تمكنت في كل قلب مؤمن روعاته

يا حسرتا من يأس راجيه الذي يقضى الزمان وما انقضت حسراته

ملأت مهابته البلاد فإنه أسد وإن بلاده غاباته

ما كان أسرع عصره لما انقضى فكانما سنواته ساعاته

لم أنس يوم السبت وهو لما به يبدي السبات وقد بدت غشياته

والبشر منه تبلحت أنواره والوجه منه تلألأت سبحاته

ويقول لله المهيمن حكمه في مرضة حصلت بها مرضاته

وقف الملوك على انتظار ركوبه لهم ففيم تأخرت ركباته

كانوا وقوفا أمس تحت ركابه واليوم هم حول السرير مشاته

وممالك الآفاق ساعية له فمتى تجيء بفتحهن سعاته

هذي مناشير الممالك تقضي توفيعه فيها فأين دواته

هذي الجيوش من البلاد تواصلت فعلام لا تسمو لها راياته

قد كان وعدك في الربيع بجمعها هذا الربيع وقد دنا ميقاته

والجند في الديوان جدد عرضه وإذا أمرت تجددت نفقاته

والقدس طامحة إليك عيونه عجل فقد طمحت إليه عداته

والغرب منتظر طلوب نحوه حتى نافيء إلى هداك بغاته

والشرق يرجو غرب عزمك ماضيا في ملكه حتى تطيع عصاته

مغرى بالإسداء الجميل كأنما فرضت عليه كالصلاة وصلاته

هل للملوك مضاؤه في سعيهم رجحت وقد نجحت به مسعاته

كم جاءه التوفيق في وقعاته من كان بالتوفيق توقيعاته

هەروەها وتی:

يا راعيا للدين حين تمكنت منه الذئاب وأسلمته رعاته

ما كان ضرك لو أقمت مراعيا دينا تولى منذ رحلت ولاته

أضجرت منا أم أنفت فلم تكن ممن تصاب لشدة ضجراته

أرضيت تحت الأرض يا من لم تزل فوق السماء عليه درجاته

فارقت ملكا غير باق متعبا ووصلت ملكا فاقيا راحاته

أعزز على عيني برؤية بهجة الدنيا ووجهك لا ترى بهجاته

أبني صلاح الدين إن أباكم — ما زال يأبى ما الكرام أباته
لا تقتدوا إلا بسنة فضله — لتطيب من مهد النعيم سناته
وردوا موارد عدله وسماحه — لترد من نهج الشمات شماته
ولئن هوى جبل لقد بنيت لنا — ببنيه من هضباته درواته
وبفضل أفضل وعز عزيزه — وظهور ظاهره لنا سرواته
الأفضل الملك الذي ظهرت — على الدنيايزهر جلاله جلواته
والدين بالملك العزيز عماده — عثمان حالية لنا حالاته
والملك غازي الظاهر العالي الذي — صحت لإظهار العلى مغزاته
ولنا بسيف الدين أظهر نصره — بالعادل الملك المطهر ذاته

هەروەها وتی:

من للعلا من للذرى من للهدى — يحميه من للبأس من للنائل
طلب البقاء لمكله من آجل — إذ لم يثق ببقاء ملك العاجل
بحر أعاد البر بحرا بره — وبسيفه فتحت بلاد الساحل
من كان أهل الحق في أيامه — وبعزه يردون أهل الباطل
وفتوحه والقدس من أبكارها — أبقت له فضلا بغير مساجل
فسقاك رضوان الإله لأنني — لا أتقي سقيا الغمام الهاطل

بەراستی هەموو خەڵك كاریگەر بوون بەكۆچی دوایی سەلاحەدین بەمێژوو نووسە ئەورووپییەكانیشەوە ڕەحمەتیان ناردووە بۆ سەلاحەدینو ستایشی دادگەریو هێزو لێبوردەیان كردووە بەگرنگترین كەسایەتیان داناوە كەسەردەمی جەنگەكانی خاچپەرستی بەخۆیەو بینیبێت، پلەو پایەی سەلاحەدینیش بەردەوام بەمەزنی دەمێنێتەوەو چونكە ئەو كارە مەزنانەی بەسن كە لەپێناو یەكخستنی موسوڵمانانداو بەرگری لێكردنیانو درێژەدان بەجیهادو تێكۆشان بەشێوەیەكی ماندوو نەناسانە بۆ دەرپەڕاندنی داگیر كەرانی خاچپەرست[1] ئەنجامی داوە. لەراستیشدا خۆشەویستیو تامەزرۆی بۆ جیهاد باڵی كێشا بوو بەسەر دڵو ئەندامەكانی جەستەیدا بەجۆرێك كە بوو بوو بەباسو خواسی سەرەكیو هەمیشە سەرنجی كەرەستەكانی دەداو سەرگەرمی سازدانی پیاوانیو بیستنی باسو خواسی بوو، بۆ جیهاد كردن لەپێناو پەروەردگاریشدا لەماڵو منداڵو زێدو نیشتمانی دوركەوتەوەو رازی بوو بەدانیشتن لەژێر خێوەتێكدا كە ڕەشەبا بەچەپو راستدا یاری

[1] الحركة الصليبية، د. سعيد عبالفتاح عاشور، ل: ٧١٨.

پێدەکرد[1]، بێگومان کۆچی دوایی ئەم سەرکردە مەزنەش زیانێکی گەورە بوو بۆ بەرەی ئیسلامی یەکگرتوو چونکە زەنگی ئاگاداری بوو بۆ بەرپابوونی ململانێ لەنێوان ڕۆڵەکانی بنەماڵەی ئەیوبیدا کە بەپشتیوانی پەروەردگار لەکتێبی چوارەمماندا لەزنجیرەی جەنگەکانی خاچپەرستیدا باسی لێوە دەکەین کە بەناونیشانی (ئەیوبیەکان دوای کۆچی دوایی سەلاحەدین)ە.

ئەمەو لەڕۆژی سێ شەممە کاتژمێر سێی بەیانی بەرواری ٥/١٤٢٨ك- ٢٠٠٧/٥/٢٢ لەم کتێبە بوومەوە فەزلیش لەپێش‌و پاشدا هەر بۆ پەروەردگارە، لەقاپی پڕ میهری دەپاڕێمەوە کە ئەم کردەوەیەمان لێوەرگرێت (نوسەرو وەرگێڕ) سینەی بەندەکانی ولا کات بۆ سود لێوەرگرتنی‌و بەمیهرو بەخشش‌و فەزلی خۆشی پیت‌و بەرەکەتی بەسەردا برژێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلا مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلا مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (فاطر:٢).

لەکۆتایی ئەم کتێبەشدا تەنها ئەوەندەم پێدەکرێت کە بەدڵێکی پڕ خشوع‌و پەشیمانەوە لەبەرامبەر پەروەردگاری مەزندا بوەستم دان بەفەزڵ‌و بەخشش‌و میهریدا بنێم‌و بێبەری بوون لەهێزو دەسەلاتی خۆم ڕابگەیەنم‌و پەنای بۆ بەرم لەهەموو جوڵەو هەڵس‌و کەوت‌و ژیان‌و مردنمدا چونکە،الله پەروەردگارم فەزڵی بەسەردا ڕشتوم‌و هەر ئەو پشت‌و پەناو کۆمەکمە، سوپاس‌و ستایشی دەکەم لەسەر ئەو بەهرەو تواناو بەخششەی کە لەژیانمدا لەپێش‌و لەپاش پێی بەخشیوم، هەروەها بەناوە جوان‌و سیفەتە بەرزەکانی لێی دەپاڕێمەوە کە ئەم کردەوەیەم تەنهاو تەنهاو دڵسۆزانە لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت و سودی هەبێت بۆ بەندەکانی‌و لەبری هەر پیتێک کە نووسیومە پاداشتم بداتەوەو بیخاتە ترازووی چاکەکانمەوە، هەروەها پاداشتی ئەو برایانەم بداتەوە کەیارمەتییان داوم بۆ تەواوکردنی ئەم هەوڵە خاکییە، تکاشمان لەهەموو موسوڵمانێك وایە کە ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە کە هەردوو بەندەی هەژار نووسەرو وەرگێڕ بە لێبوردن‌و لێخۆشبوون‌و ڕەحمەت‌و میهری پەروەردگار لەنزاکانیدا لەیاد نەکات ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾ (النمل:١٩) ئەم کتێبەش بەفەرمایشی پەروەردگار ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالأِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (الحشر:١٠).

کۆتایی پێدێنم، هەروەها بەو وتەیەی شاعیر ابن الوردي کە بەکوڕەکەی دەڵێت:

أطلب العلم ولا تكسل فما      أبعد الخير عن أهل الكسل

---

[1] النوادر السلطانية، ل: ٤٣، ٤٤، الحركة الصليبية، د. سعيد عبالفتاح عاشور ، ل: ٧١٨.

إحتفل للفقه في الّدين ولا تشتغل عنه بمال وخول

واهجر النوم وحصله فمن يعرف المطلوب يحقرما بذل

ولا تقل قد ذهبَتْ أربابه كلٌّ من سار على الدرب وصل

**"سبحانك اللهم و بحمدك أشهد أن لا اله الا أنت استغفرك وأتوب اليك وىٓخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين".**

**بەندەی هەژار بۆ لێخۆشبون و ڕەحم و رەزامەندی پەروەردگار**
**عەلی محەمەد محەمەد الصَلابی**
**خوا لەخۆی و دایك و باوكی و هەموو موسوڵمانان خۆش بێت.**

**برایانی بەڕێز/ خۆشحاڵم بەگەشتنی تێبینی و سەرنجەكانتان سەبارەت بەم كتێبەو كتێبەكانی تریشم، داوای نزای پاشملەتان لێدەكەم لای پەروەردگار بۆ دڵسۆز بوونم لەم كارەداو گەیشتن و پێكانی راستییەكان و بەردەوامبون لەم كاروانەدا بۆ خزمەتی مێژووی ئومەتی ئیسلامی.**

Mail: abumohamed٢@maktoob.com

# پوختە:

١- مێژوو نووسان جیاوازن لەبارەی سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی ئەیوبییەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە بۆی دەچین ساڵی ٥٦٩ك/ ١١٧٤ز یە واتە پاش کۆچی دوایی نورەدین مەحمود.

٢- کەسایەتی سوڵتان سەلاحەدین خاوەنی ڕەسیدێکی رەوشتی مەزن بووە کەیارمەتی داوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی، گرنگترینی ئەو ڕەوشتانەش: پارێزکاریو پەرستشو دروستی بیروباوەڕو دادگەریو ئازایەتیو بەخشندەییو گرنگیدان بەجیهادو هێمنیو لێبوردەییو پاراستنی پیاوەتیو ئارامگریو خواویستیو وەفاو خاکیبوون بووە.

٣- گەڕانەوە بۆ شوناسی ئومەتی ئیسلامیو بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەدیارترین تایبەتمەندیەکانی نوێگەریە لەسەردەمی زەنکیو ئەیوبیدا، چونکە لادان گەشەی کردبوو وبیدعە بڵاو بویەوە لەژێر چاودێری دەوڵەتێکی ستەمکاردا کەئەویش دەوڵەتی فاطمی عوبەیدی بوو لەمیسردا، بۆیە گەڕانەوە بۆ حوکمەکانی قورئانو سوونەت لەمەزنترین دەستکەوتەکانی دەوڵەتی نوریو سەلاحی بوو، بەردەوام بوو لەسەر ڕێڕەوی نورەدین زەنکی بۆ جێبەجێکردنی شەرع لەسەرجەم کاروبارەکانی دەوڵەتدا.

٤- سەلاحەدین توانی ئەو پلانە جێبەجێ بکات کەنورەدین زەنکی داینا بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی فاطمی عوبەیدی رافیزیو کاری دەکرد لەپێناو ریشەکێشکردنی بیرو باوەڕە ناڕەواکان لەمیسرداو گێڕانەوەی هزری ئیسلامی راستو دروست بۆی.

٥- دەوڵەتی ئەیوبی سودی لەو هەوڵە زانستیو هۆکارە بانگخوازیانە وەرگرت کە دەوڵەتی سلجوقیو زەنکیو غەزنەوی دەیانگرتە بەر.

٦- سەلاحەدین گرنگی دەدا بەپاراستنی بنەماکانی بیرو باوەڕی ئیسلامی بەپێی مەزهەبی ئەهلی سوننەت.

٧- سەلاحەدین بایەخی دەدا بەبزووتنەوەی بوژاندنەوەی سوننی لەدەوڵەتەکەیدا ئەمەش لەڕێیی بنیاتنانی مزگەوتو ڕاکێشانی زانایان بۆ دەوڵەتەکەیو چاکەکردن لەگەڵیاندا.

٨- بایەخدانی سەلاحەدینی ئەیوبیو ئەو سوڵتانانەی کەپاش ئەو هاتن بۆ چەسپاندنی مەزهەبی ئەهلی سوننەت لەو وڵاتانەی کەحوکمیان تیادا دەکرد بایەخدانێکی گشتگیرو چڕو پڕ بوو لەو شارانەی کەسەر بەو بوون وەك قاهیرەو ئەسکەندەریەو دیمەشقو حەلەبو..تد، لەگرنگترین ئەو ڕەگەزانەی ڕۆشنبیریو زانستە شەرعیەکان کە ئەیوبیەکان بایەخیان پێدەدا: قورئانی پیرۆزو فەرمودەی پێغەمبەر(د.خ)و لێکۆڵینەوە فیقهیو ئەدەبیو زمانەوانیەکان بوو.

